**كَرَثَهُ الأمرُ وغيرهُ كرثاً:** شتەكەی لەسەر قورس بوو ٥ تەواو پێیەوە ماندو بوو ٥ (فهو كارث).

**أكْرَثَهُ الأمرُ وغيره:** بەمانا (كَرَثَهُ) دێ.

**إكترثَ له:** بۆی غەمبار بوو، خەفەتی بۆ خوارد ٥ دەگوترێ: (ما اكتَرِث لـه) گرنگی پێ نادەم خەمی بۆ ناخۆم ٥ (وأراك لا تكتَرِث لـذلك) دەتبینم گرنگی بەوە نادەی‌و خەمی بۆ ناخۆی ٥ جەو جۆلی بۆناكەی ٥ بەزۆری لەسیاقی نەفی دا بەكاردێ.

**الكارِثة:** بەلای گەورە ٥ (ك: كوارث) ٥ دەگوترێ: (كرثته الكوارث) بەلای رۆژگار خستویانەتە دڵەڕاوكێوە.

**الكُراثُ:** رووەكێكی تەمەندرێژە لەپێری (الزنبقية)یە بنكی وەكوو سەلكی پیاز وایە ٥ گەلای درێژو شكاوە بەملاو بەولای خۆیدا شۆڕدەكاتەوە لەناوەڕاستی دا نێركێك دەردەكا گوڵی زۆر دەگرێ‌و بۆنی خۆشی هەیە ٥ چەند جۆرێكی هەیە (الكراث المصري، كراث المائدة، كراث الشامي).

**كَرِجَ الشيْءُ كَرَجاً:** شتەكە كەڕوی هەڵێنا ٥ دەگوترێ: (كَرِجَ الخبزُ) نانەكە كەڕوی سەركەوت.

**الكُرَجُ:** ئەسپەدارینە بۆ یاری منداڵ.

**كَرَدَهُ كَرْداً:** دەری كرد ٥ مەنعی كرد.

**الكَرْدُ:** بنكی مل، لای خواروی مل.

**الكُرْدُ:** نەتەوەی كورد، نەتەوەیەكە لەبانوێكی پانو پۆڕدا لەئاسیای ناوەڕاست دا دەژین‌و وڵاتەكەیان بەسەر ولاتی ئێران‌و توركیاو عێراق‌و سوریادا دابەشكراوە.

**چل ملیۆن كوردین لەرۆی ئاسیادا**
**كۆنترین میللەت لەناو دونیادا**
**وەحشی ئیستعمار بەسەرمان زاڵە**
**ژێردەستەو بەخسیر ژیانمان تاڵە**

**الكِرديدُ:** پارچەو پاشماوە لەبنكی سەبەتەی خورمادا ٥ پوشە خورما.

**كَرْدَسَ القائِدُ الخيلَ أو الجيشَ:** سەرلەشكرەكە ئەسپ سوارەكانی یان سوپاكەی پۆل پۆل كرد.

**تكردَسَ الرجلُ:** پیاوەكە وێكهاتەوەو چووەوە بەیەك دا.

**الكُرْدُوسُ:** هەر ئێسقانێك گەورەو تەواو بێ ٥ سەری ئێسقانێك مۆخی هەبێ ٥ هەردوو ئێسقانێك لەجومزگەدا بەیەك بگەن ٥ وەكوو ئێسقانی شان و ئەژنۆ و سمت ٥ (ك: كراديس).

**الكردوسة:** كۆمەڵێكی زۆر گەورە لە ئەسپو لەسوپا.

**الكِـــردانُ**: ملەوانكـــە ٥ لـــەبواری مۆسیقادا مەقامی ڕەستە.

**الكردون**: پشتێن‌و سیاچ‌و شورا.

**الكردينــال**: یەکێکـە لـە مالـەکان‌و حەبرو پیاوە ئاینییەکانی هاوەڵی پاپاو ڕاوێـژکارەکانی ٥ کـە ئـەوان مافی ئەوەیان هەیە پاپا هەڵبـژێرن ٥ (ك: كرادلة).

**كَـرَّ الرجلُ او الفرسُ كريراً**: پیاوەکە نیخە نیخی لەسنگی هات.

**كَـرَّ فلانٌ كـروراً**: پیاوەکـە گەڕایـەوە ٥ دەگـوترێ: (كَـرَّ الفــارس) سـوارەکە گەڕایـەوەو هەڵمـەتی بـردەوە بۆسـەر دوژمن.

**كَـرَّ الشَّيْئَ كَرّاً**: شتـەکەی ڕەت کـردەوە گێڕایەوە.

**كَـرَّ الليـلُ والنهـارُ**: شـەو و ڕۆژ یـەك بەدوایـەك دا گەڕانـەوەو دووبـارە بوونەوە.

**كَرَّ على العدوّ**: هێرشی بردەسەر دوژمن.

**كَرَّ عنه**: لێی گەڕایەوە.

**كَرَّ عليه الحديثَ**: قسەکەی سەرلەنوێ بۆ کردو بۆی دووبارە کردەوە.

**كَـرَّرَ الـشَّيْئَ تكريـراً وتِكـراراً**: جاردواجـار شـتـەکەی بـۆ دووبـارە کردەوە.

**تَكَرَّرَ عليه كذا**: جاردواجار ئەوەی بۆ دووبارەکردەوە.

**الكَـرُّ**: هەڵمـەت بـردن‌و پـەلاماردان پێچەوانەی (الفَرّ) ٥ هـەروا نـاوە بـۆ حـــەبلێك لـــە لیفـــی خورمـــا دروســـتکراوە پێـــی ســـەردەکەون بۆســـەر دارخورمـــا ٥ حـــەبلی بەستنەوەو شتی وای کەشتییە.

**الكُـرُّ**: ئـامێرێکی پێوانـەی دانەوێڵەیـە وەکوو قسناغ ٥ ئەندازەکەی شەست قەفیز یان چل ئەردەبە.

**الكَـــرَّةُ**: گەڕانـــەوە ٥ ســـەرلەنوێ زیندوبوونـــەوە ٥ هێـــرش بۆســـەر دوژمن لەشەڕدا ٥ بەیانی‌و ئێوارە ٥ زینـدو بوونـەوەی مـەخلوقات سـەر لەنوێ دوای هەستانی قیامەت.

**الكريرُ**: پەڵەیەکە لەتەپوتۆز تووشـی قوڕگ دەبێ.

**المَكَـرُّ**: شـوێنی جـەنگ، گۆڕەپـانی جەنگ.

**المِكَرُّ**: دەگوترێ: (فـرس مِكـرّ مِفَـرّ) ئەسـپێکی ڕەسـەن‌و ڕاهێنـراوە بـۆ هەڵمەت بردن‌و پاشەکشەکردن سەر نەرم‌و هەوسار خۆشە، جوان دەڕواو دێتەوە.

**كَرَزَ كروزاً**: چووە زوور، چووە نـاوەوە ٥ خۆی لە پەناپەسێوو ئەشکەوت‌و شتی وادا حەشار دا.

**كَرَزَ إليه**: پەنای بۆلابرد ٥ مـەیلی ئـەوی کرد.

**كارَزَهُ:** ڕۆیی‌و لەبەری هەڵات.
**كارَزَ عن فلان:** لەبەر فلان هەڵات.
**كـارَزَ الی المكـان:** خـۆی کوتـا بـۆ شوێنەکەو خۆی تێدا حەشار دا.
**كـارز في المكـان:** لەشـوێنەکەدا خـۆی حەشار دا.
**كارَزَ الی ثقة من إخوان ومال:** پـەنای بردە بەر شتێکی متمانە پێکراو لە برادەر یان لەشتی تر.
**كَرَزَ الصَّقْرَ:** چاوی هەڵۆکـەی بەسـتو دوری‌و خـواردنی دایـە بۆنـەوەی ژێرباری بکاو ڕام ببێ.
**الكُرّازُ:** سوراحی‌و دیزە.
**الكَـرَزُ:** درەختێکـە بـەرێك دەگـرێ وەکـوو بـەرقوق وایـە وەلێ بیـچمی کـەمێ بـچوکترە ٥ پێـشی دەگـوترێ: (كُرَيْز).
**الكُـرَزُ:** هەمبانـەو خـورجی شـوان ٥ جەواڵ ٥ (ك: أكراز).
**كَـرْزَمَ الرجـلُ:** پیاوەکـە نیـوەڕۆ شـتی خوارد
**الكَرْزَمَةُ:** ژەمەنانی نیوەڕۆ.
**كَـرِسَ الرجـلُ كَرْسـاً:** پیاوەکـە زانـابوو سنگی پڕبوو لە عیلم‌و زانـست ٥ (فهـو كرِسٌ).
**كَـرَّسَ الـشَّيْءَ:** شـتەکەی خـستە پـاڵ یەك‌و لێکی دان.
**كَرَّسَ البناءَ:** باڵەخانەکەی دامەزراند.
**إنْكَـرَسَ علیـه:** خـۆی بەسـەردا کوشمەڵەکرد.
**إنْكَـرَسَ في الـشَّيْءِ:** چـووە نـاو شتەکەوە بەکۆماوەیی.
**تكارَسَ الشَّيْءُ:** شتەکان کەوتنە سەر یەك‌و پێکەوە نووسان.
**تَكَرَّسَ الشيءُ:** بەمانا (تَكَارَسَ) دێ.
**تَكَـرَّسَ أُسُّ البنـاءِ:** بناغـەی باڵەخانەکە پتەو بوو.
**الكُرّاسَةُ:** بەشێك لەکتێب ٥ دەگوترێ: (هـذه الكراسـة عـشر ورقـات) ئـەم پەڕەگرافـە دە وەرەقەیـە ٥ (هـذا الكتاب عِـدَّة كـراريس) ئـەم کتێبـە چەند پەڕەگرافێکە ٥ هەروا ناوە بۆ دەستەیەك کاغەزی پێکەوە نووساو و ئامادە کراو بۆ لەسەر نووسین ٥ (ك: كرّاس، وكراريس، وكراسات).
**الكِرْيـاسُ:** گـەمرە؛ ئـەو گـڵ‌و ڕیـخ‌و زبڵەی لە تەویلەو ئاغەڵ دا تـەبارە دەبەستێ‌و ڕەق دەبێ.
**الكِرْسـاءُ:** پارچـە زەویەکـە درەختـی تێدا ڕوابێ‌و لێك نزیـك بـن‌و ڕەگـو ڕیشاڵیان تێك هاڵابێ.
**الكرسـي:** تـەخت‌و تـاراج، عـەرش ٥ کورسییەکە لەدارو نـایلۆن‌و شتی وا دروسـت دەکـرێ‌و تاکـە کەسـییە ٥

پلەیەکی زانستییە لەزانکۆداو دەدرێ بە مامۆستایانی زانکۆ ئەوانەی کە پلەیەکی زانستییان هەیە لە زانکۆداو ماوەیەك بەسەر خزمەتیان دا تێپەڕیوە ◦ (ك: کراسي).

**المُكَرْسَةُ من القلائد**: ئەو ملوانکە گەوهەرمیە میروەکانی بەچەند تاڵە دەزووەوە هۆنرابنەوەو ناوە هەموو تاڵەکان کرابنە ناوکونی میرۆیەکی گەورەوەو کەوتبێتە نێوان میروە گەوهەرەکانەوە.

**كَرسَعَ فلاناً**: بەشمشێر لەمەچەکی فلانکەسی دا.

**الكُرْسُوعُ**: لایەکی مەچەك، ئەو ئێسقانەی لە جومگەدا بەرز بۆتەوە ◦ لەقاچی مەڕدا بریتییە لەو ئێسقانە بچکۆلەی لەپشت سمی دایە پێشی دەگوترێ پێچك.

**كرسوع القدم**: مەچەکی قاچ، باریکایی قاچ (پشت سمی).

**المُكَرْسِعُ**: قاپ دەرپەڕیو، کەسێك قاپەڕەقەی زۆر دەرچوبن‌و گۆشت داینەپۆشیبن.

**الكُرْسُفُ**: لۆکە.

**الكُرْسفِيُّ**: جۆرە هەنگوێنێکی سپییە دەڵێی لۆکەیە لە سپییەتیدا.

**الكِرْسِنَةُ**: گیایەکی ساڵانەیە لە پێری (القرنیة)یە بۆ سود وەرگرتن لە دانەوێڵەکەی دەروێندرێ‌و دەکرێ بە ئالیکی ڕەشەوڵاخ ڕەنگە (کزن) بێ.

**كَرِشَ الرجلُ**: پیاوەکە ماڵ‌و خێزانی زۆر بوو.

**كَرِشَ الجلدُ**: پێستەکە ئاگر گەستی‌و وێکهاتەوەو چرچ بوو.

**كَرَّشَ فلان**: فلانکەس دەموچاوی گرژ بوون وێکهاتنەوە ◦ خواردەمەنی گیپەی دروست کرد.

**كَرَّشَ اللحمَ**: گۆشتەکەی لەناو گیپەدا کولاند.

**تكَرَّشَ وَجْهُهُ**: دەموچاوی وێکهاتنەوە ◦ پێستی ڕوخساری گرژبوو.

**تكَرَّشَ الناسُ**: خەڵکەکە خڕ بوونەوە.

**إسْتَكرشَ الجدي**: کاریلەکە ورگی گەورە بوو لەوەڕی خوارد.

**إستَكرَشَ الوَجْهُ**: دەموچاوی گرژبوو وێکهاتەوە.

**الأكْرَشُ**: ورگ زل ◦ (وهي كرشاء).

**الكِرْشُ**: جڵێدانەو ورگ‌و شوێنی مانەوەی خۆراك بۆ ئاژەڵە کاوێژکەرەکان وەکوو مەعیدە بۆ ئادەمیزاد ◦ هەروا ناوە بۆ گیایەکی

لووس لەپێری (السعدیة)یە لاسك و قەدی ئەستورەو لەلای خوارەوی گەڵای درێژی هەن بەدرێژایی قەدەکەی، بەرێکی خاکی مەیلەو ڕەشی هەیە ٥ حەصیرو شتی وای لێ دروست دەکرێ لە وڵاتی میصرو شام دەڕوێ ٥ (السّمار) یشی پێ دەگوترێ.

**الكَرِشُ:** بەمانا (الكِرْشُ) دێ ٥ (كرش الرجل) دەست و پێوەندی پیاو و کەسە نزیکەکانی، پیاوە تایبەتییەکانی.

**الكَرْشاءُ:** قاچێك زۆر گۆشتن بێ و قاپەڕەقەی لەگۆشت دا ون بووبێ و لەگەڵ پاژنە پێی ڕێك بووبێ و پەنجەکانیشی کورت بن.

**الكريش:** چندراوێکە لە ئاوریشم ڕەنگی ڕەش یان سورە کراس و چارەکەو دەسماڵی بۆ ئافرەت لێ دروست دەکرێ.

**الكُرَيشَةُ:** چندراوێکە لە لۆکەو شتی وا وێك دێتەوەو لێك دەکشێتەوە.

**المُكَرَّشَةُ:** خواردنێکە وەکوو گیپە وایە.

**كَرَعَ في الماء أو الإناءِ كَرْعاً وكروعاً:** دەمی خستە ئاوەکەوەو خواردیەوە قاپ و گڵاس و مشتی بەکارنەهێنا.

**كَرَعَتِ النخلةُ وغيرها:** درەختە خورماکە هەمیشە ڕەگەکانی لەناو ئاودا بوون و ئاویان لێ نەبڕا ٥ (فهي كارعة).

**كَرِعَ الوحشَ وغيره كَرْعاً:** تیری ئاڕاستەی حەیوانە وەحشییەکە کردو باریکایی قاچی هەنگاوت.

**كَرِعَتْ الساق كَرَعاً:** قاچی باریك بوو ٥ یان پێشەوەی باریك بوو.

**كَرِعَ فلان:** فلانکەس باریکایی قاچی ژانی کرد.

**اكْرَعَ القومُ:** خەڵکەکە باریکایی قاچی وڵاخەکەیان هەنگاوت.

**تَكَرَّعَ:** لەکاتی دەستنوێژ شتن دا باریکایی قاچیشی شت.

**الكُراعُ من الإنسان:** نێوان ئەژنۆو قاپەڕەقەیە خوار ئەژنۆی تا جومگەی قاچی ٥ لەئاژەڵ دا بە باریکایی قاچی دەگوترێ، ئەو شوێنەی هیچ گۆشتی پێوە نیە ٥ هەروا ناوە بۆ کۆمەڵێك ئەسپ و سیلاح بەیەکەوە.

**الكُراعِيُّ:** سەلك و پێچك فرۆش ٥ (سەروپێ فرۆش).

**الكَرَعُ:** ئاوی باران کە ڕاستەوخۆ دەمی تێبخرێ و بخورێتەوە ٥ دەگوترێ: (شربنا الكَرَعَ) ٥ ئاوی

بارانمان خواردەوە ٥ سەرو پێی ئاژەڵ ٥ سەلك و پێچك.

**كَرَفَ الشَّيْئَ كَرْفاً كرافاً**: بۆنی بەشتەکەوە کرد.

**كَرَفَ الحمارُ**: نێرە کەرەکە بۆنی بەمیزی دێڵە کەرەکەوە کردو ڕوی لەحەوا کردو لیچەکانی هەلگێڕانەوەو بای دان.

**الكَرَّاف**: ئەو کەسەی بەدزییەوە دەڕوانێتە ئافرەت.

**كَرَفَات القِدْرُ**: مەنجەڵەکە بەهۆی کوڵینەوە کەفی دەردا.

**كَرْفَا القوم**: خەڵکەکە تێکەڵاو بوون.

**كَرْفَا الشَّعرُ**: مووەکان زۆربوونو کەوتنە سەر یەك.

**تكَرْفَا السَّحابُ**: هەورەکە کەوتە سەر یەكو چڕ بۆوە.

**تكَرْفَا الشَّعرُ**: بەمانا (كَرْفَا) دێ.

**تكَرْفَا القوم**: خەڵکەکە تێکەڵاو بوون.

**الكَرَفْسُ**: کەرەوز.

**كَرَكت الدجاجة**: مریشکەکە لەهێلکە چۆوە.

**الكَرَّاكَةُ**: ئامێرێکە بۆ پاککردنەوەو جۆماڵ کردنی روبارو جۆگا ئاوەکان.

**الكُرْكُ**: پەشتەماڵێکی فەروەدارە، بەزۆری لەفەروەی سمۆرە دروست دەکرێ.

**الكركي**: باڵندەیەکی گەورەو ڕەنگ خۆڵاوییە ٥ مل درێژو قاچ درێژو کلك کوڵە، داڵگۆشتو لاوازە ٥ لە وشکانی دەژی، جاری وایش هەیە پەنا بۆ ئاو ئاو دەباو لەناو ئاودا دەژی ٥ (ك: كراكي).

**الكُرَيْكُ**: تیرۆکی نان پان کردنەوە ٥ بێڵو خاکەناز.

**الكركدن**: حەیوانێکی جەستە گەورەیە، گوانداره ورگ زلو قاچ کورتە، سمدارە، پێست ئەستورو پتەوە یەك شاخی هەیە لەسەری لبوزی قیت بۆتەوە، هەیە دووشاخی یەك لەسەر یەکی هەن.

**الكَرْكَدِية**: ڕوەکێکە لەپێڕی (الخبازية) شوێنی سەرەکی وڵاتی سەنیگالە، غینیا، لەسودانیش دەڕوێ، لە گوڵە سورەکانی شەرابێکی خۆش نیشات بەخش بەرهەم دەهێندرێ.

**كَرْكَرَ**: قاقا پێکەنی.

**كَرْكَرَت النارجيله**: نێرگەلەکە قوڵتە قوڵتی کرد، دەنگی وەکوو قاقای پێکەنین وابوو.

**كَرْكَرَ بالدجاجة**: بانگی مریشکەکەی کرد.

**كَرْكَرَ فلاناً عن الشَّيْئ**: فلانکەسی لەشتەکە گێڕایەوە، پاڵی پێوەنا.

**كَرْكَرَ الشيئُ**: شتەکەی جاردواجار هێنایەوە ٥ کۆی کردەوە ٥ دەگوترێ: (كَرْكَرَت الريحُ السحابَ) بایەکە هەورەکەی گرد کردەوە لەملاو لاوە کۆی کردنەوە.

**كَرْكَرَ الرحى**: ئاشەکەی خولاندەوە.

**كَرْكَرَ الحبّ**: دانەوێڵەکەی هاڕی.

**تَكَرْكَرَ**: لەهەوادا سەرمنگرێ بوو، ئەمدیو و ئەودیوی کرد.

**تَكَرْكَرَ الماء**: ئاوەکە لە ڕێرەوی خۆی گەڕایەوە.

**تَكَرْكَرَ في أمره**: ڕاڕا بوو لەکارەکەی دا.

**الكَرْكَرَةُ**: قۆرەقۆری سك ٥ پێکەنینی بەرزو بەشێوەی قاقا.

**الكِرْكِرَةُ**: سنگی گیانلەبەری سمدار ٥ دەگوترێ: (بَرَكَ على كِرْكِرتِه) بەسەر سنگی دا پاڵ کەوت ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد ٥ (ك: كراكِر).

**كَرْكَسَ فلان**: فلانکەس ڕاڕا بوو ٥ بەشێوەی ڕۆیشتنی پێوەند گراو ڕۆیشت ٥ لەسەرەوە بۆ خوارەوە گلۆر بۆوە، تلۆر بۆوە.

**كَرْكَسَ الشَّيئَ**: شتەکەی دووبارو سێ بارە کردەوە.

**كَرْكَسَ الدابةَ**: وڵاخەکەی پێوەند کرد، بەستیەوە.

**تَكَرْكَسَ**: تلۆر بۆوە، گلۆر بۆوە.

**المُكَرْكَسُ**: ئەو کەسەی دایکی ئەمەتەو کۆیلە بێ.

**الكُرْكُمُ**: ڕوەکێکی دەرمانییە لە پێڕی (الزنجبارية)، کوتراوی ڕەگەکانی دەکرێتە داو و دەرمانی چێشت لێنانو بۆ ڕەنگکردنی شتیش بەکاردێ (زەردەچەوە).

**الكُرْكُمانُ**: گیایەکی ساڵانەیەو لەپێڕی (الشفوية)یە گوڵێکی سپیو شینی هەیە، میوەیەکی دەندوك درێژی هەیە، تۆوەکەی وەکوو دەنکە حەلەبە وایەو کەمێك بچوکترە ٥ وڵاخو ئاژەڵی بەرەڵا دەیخوا.

**المُكَرْكم**: شتی ڕەنگکراو بەکورکوم.

**كَرَمَه كرماً**: لەسەخاوەت دا بەسەری دا زاڵ بوو، دەگوترێ: (كارَمَهُ فَكَرَمَهُ) ٥ لەسەخاوەتو بەخشندەیی دا شانازی بەسەردا کرد ٥ لێی تێپەڕاند.

**كَرُمَ فلان كَرماً وكرامةً**: فلانکەس سەخی سروشت بوو بەزۆری حاڵی خۆی بەخشی ٥ (فهو كريم وهي كريمة).

**كَرُمَ الشَّيئُ**: شتەکە بەنرخو بەهابوو، ناوەزە بوو.

**كَرُمَ السَّحابُ**: هەورەکە بارانی باراند.

**كرمت الأرضُ**: زەوییەکە رووەکەکانی گەش‌ونمایان کرد.

**اکرم الرجلُ**: پیاوەکە منداڵی رەوشت بەرزو سەخی سروشتی بوون.

**اکرم فلاناً**: ڕێزی فلانکەسی گرت‌و لەعەیب‌و رەخنە بەدووری گرت.

**اکرم نَفسَهُ عن الشائنات**: نەفسی خۆی لەشتی خراپ‌و بەد پاراست.

**كارَمَـهُ**: شانازی بەسەردا کرد لە سەخی سروشتی دا.

**كارم الرجلَ**: شتێکی بەدیاری‌و پاداش دا بەپیاوەکە.

**كَرَّمَ فلاناً**: ڕێزی لەفلان گرت ٥ وای نیشان دا سەخییە، خۆی بەسەخی زانی.

**تَكارَمَ عن الشَّيْءِ**: خۆی لەشتەکە بەدوور گرت.

**تَكَرَّمَ عن الشَّيْءِ**: بەمانا (تكارم) دێ.

**إستَكرَمَ الشَّيْءَ**: داوای شتی بەنرخی کرد ٥ بەبەنرخ هاتە بەردەستی.

**إستكرم العَقائِلَ**: ئافرەتی خانەدان‌و نەجیب زادەی مارەکردن.

**الإكرامية**: عەتاو بەخشش.

**الأكرومية**: کرداری پیرۆز.

**التَّكْرِمَةُ**: شوێنی تایبەتی بۆ دانیشتنی پیاو لەناو ماڵ دا یان سیسەمی نوستنی: کەنیشانەی ڕێز لێ گرتنیەتی.

**الكُرامُ**: بەمانا (الكريم) دێ.

**الكَرامَةُ**: کەرامەت؛ کاری سەر ئاساو لەعادەت بەدەرو ڕودانی لەسەردەستی کەسانێك ئیدیعای پێغەمبەری نەکەن ٥ ئەو پەرۆو پەردەیەی دەخرێتە سەر زارکی دیزەو مەنجەڵ ٥ ڕێزو نرخ بۆ دانان ٥ دەگوترێ: (أفعل ذلك كرامة لك) ئەو ئیشە لەبەر خاتری تۆ ئەنجام دەدەم.

**الكَـرّامُ**: خاوەن ترێ‌و رەزو باخ ٥ باخەوان، رەزەوان.

**الكَرَمُ**: دەگوترێ: (رجل كَرَمٌ) پیازی سەخی ٥ (أرض كرم) زەوییەکی پاك‌و بەپیتە.

**الكَرْمُ**: داری مێو، رەز، ترێ ٥ (إبنة الكَرْمِ) شەراب.

**الكُرْمُ**: دەگوترێ: (أفعل ذلك كُرْماً لك).

**الكريمُ**: ناوێکە (صیفەتێکە لە صیفەتەکانی خودا) لێبوردە ٥ هەرکەسێکە یان هەرشتێك جێگای ڕەزامەندیی خەڵك بێ.

**الكريمة**: مێینەی (الكريم) ٥ پیاوی وەجاخزادە ٥ دەگوترێ: (إذا جاءكم كريمة قوم فأكرموه) کە ڕێزداری نەتەوە هاتە لاتان ڕێزی بگرن ٥

(كريمة الرجل) كچى پياوهكه، (كچه نازدارهى پياو).

**كريمتك**: لوتت ٥ هەر ئەندامێكى رێزدارى جەستە وەكوو گوێچكە، دەست، ڕيش ٥ (الكريمتان) دووچاو.

**المُكَرَّم**: پياوى رێزدارو شكۆمەند.

**المَكْرُومَةُ**: كردەوەى خێرو ئيشى باش.

**المَكْرَمة**: (أرض مَكْرُمة) زەوييەكى بەپيت ڕوەك ساخ.

**الكُرْنُبُ**: قەرنابيت ٥ ڕوەكێكە سالانەيەو بنكى ئەستورە گەلاكانى دكەونە سەر يەك لە شوێنى هەوا مامناوەند دەڕوێ ٥ لە ولاتى شام پێى دەگوترێ: (الملفوف).

**كَرْنَفَ النَّخلةَ**: درەختە خورماكەى لەلق و پۆپەكانى ڕوت كرد.

**كَرْنَفَ فلاناً بالعصا**: بەعەصا لەفلانكەسى دا.

**كَرْنَفَ الشَّيْئَ بالسيف**: شتەكەى بەشمشێر بڕى.

**الكِرْنَافُ**: بنكى لقەبڕاوى درەختى خورما كەدواى بڕينى لقەكە بەشێكى بەقەدى درەختە خورماكەوە دەمێنێتەوە.

**الكُرْنافة**: قونداخى تفەنگ.

**كَرِهَ الشَّيْئَ كُرهاً وكراهَةً وكراهيةً**: شتەكەى ناخۆش ويست.

**كَرُهَ الأمرُ والمنظرُ**: كارەكە ناشيرين بوو ديمەنەكە ناشيرين بوو.

**اكْرَهَهُ على الأمر**: زۆرە ملى لێ كرد لەسەر ئيشەكە.

**كَرَّهَ اليه الأمرَ**: شتەكەى لەلا ناشيرين كرد، كارەكەى لەلا دزێو كرد.

**تكارَهَ الشَّيْئَ**: شتەكەى بەلاوە ناشيرين و دزێو بوو ٥ دەشگوترێ: (فعل كذا متكارهاً) كارەكەى بەنابەدڵى كرد.

**تَكَرَّهَ الشَّيْئَ**: شتەكەى ناخۆش ويست.

**إسْتَكْرَهَ الشَّيْئَ**: شتەكەى بەلاوە دزێو بوو.

**إسْتَكرَهَ فُلانةَ**: فلانە ئافرەتى ناچاركرد خراپەكارى بكا.

**الكَرْهاءُ**: قولكەى گيزەرەى مل قولكەى پشتەمل.

**الكَرْهُ**: پێناخۆش بوون ٥ نارەحەتى و ماندويى ٥ شتێك بە زۆر پێت بكەن ناچارت بكەن بە ئەنجامدانى.

**الكُرْهُ**: بەمانا (الكَرْهُ) دێ.

**الكريهة**: شەڕو هەرا، تەنگانەو چورتم، ٥ شەڕى سامناك ٥ دەگوترێ: (شهِدْتُ الكريهة) ئامادەى شەڕ بووم و لەجەنگەى شەڕەكەدا بووم.

**كرائه الدهر**: بەلاو چورتمى ڕۆژگار.

**المَكْرَهُ**: ئەوەى لەسەر شانى ئادەميزاد گرانەو زۆرى پێ ناخۆشە، دەگوترێ: (لقيت دونه مكاره الدهر).

**المكروهة**: دەگوترێ: (رجل ذو مكروهة) پیاوێکی خاوەن هەڵمەتو جەربەزەیە.
**كَرا الغلامُ كرواً**: منداڵەکە تۆپێنی کرد، یاری بەتۆپەکە کرد ٥ دەگوترێ: (كرا الكرةَ وبها) یاری بەتۆپەکە کردو شەقی تێهەڵدا بۆئەوەی بەرز بێتەوە بۆ حەوا.
**كرا الأرضَ**: زەوییەکەی هەڵکۆڵی.
**كرا البئرَ**: بیرەکەی داپۆشی.
**كرى النَّهرَ كرياً**: لەناو ڕوبارەکەدا چاڵی هەڵکەند.
**كرى الأرضَ**: زەوییەکەی هەڵکۆڵی.
**كَرِيَ الرجلُ**: پیاوەکە نوست ٥ (فهو كَرٍ وكريٌّ وكَرْيانٌ) ٥ دەگوترێ: (أصبح فلان كريان الغداةِ).
**اكرى**: کەم بوو ٥ دەگوترێ: (أكرى الرجلُ) پیاوەکە ماڵو سامانی کەم بوو ٥ تێشوی نەما بڕایەوە.
**اكرى الدار أو الدَّابَّةَ**: خانوەکە یان وڵاخەکەی بەکرێ دا.
**كاراه مكاراةً وكراءً**: بەکرێی دا (فهو مكارٍ).
**إكترى الدارَ وغيرها**: خانوەکەی بەکرێ گرت.
**الكرى**: هەنۆز، وەنەوز.
**الكُرى**: چەند گۆڕێک بەپەنا یەکترەوە.
**الكِراءُ**: کرێی کرێکار.
**الكُرَةُ**: فتبۆڵ، هەرشتێك خڕبێ ٥ (الكرة الأرضية) گۆی زەوی ٥ شتێکی خڕو بازنەییە یاری پێ دەکرێ ٥ چەند جۆرێکی هەیە ٥ تۆپی صولەجان، تۆپی پێ تۆپی تێنس ٥ تۆپی دەستهاوێژ ٥ تۆپی ئاو ٥ تۆپی سەلە.
**الكَرَوَانُ**: باڵندەیەکی قاچ درێژو ڕەنگ خۆڵاوی وەکوو کۆتر وایەو دەنگێکی خۆشی هەیە.
**الكِرْوَةُ**: کرێی کرێکار.
**الكَرَوْيَا**: ڕوەکێکی نیومساڵییە، ڕەگەکەی بەناخی زەویدا ڕۆدەچێ لاسکەکانی پەلپەل‌و کۆمەڵن، لە بەرەکەی شەرابێکی هۆشیارکەرەوە دروست دەکرێ.
**الكُرَوِيُّ**: هەرشتێك بیچمەکەی خڕ بێ.
**الكَرِيُّ**: کرێکار، کرێ گرتە ٥ ئەو کەسەی وڵاخ بدا بە کرێ.
**المُكارِي**: وڵاخ بەکرێدەر، بەزۆری بەکەسێك دەگوترێ: گوێدرێژ بەکرێ بدا ٥ (ك: مكارون).
**الكرومُ**: عونصورێکی فلزی ڕەنگ خۆڵەمێشی مەیلەو سپییە بۆ ڕوکەشکردنی هەندێ مەعدەن‌و

لەوحەو شتی وا بەکاردێ، هەندێ پێکهاتەشی بۆ ڕەنگکردنو شتی وا سودی لێ دەبینێدرێ.

**الكروميت**: کانێکە لە عونصوری ئاسنو کرۆمو ئۆکسجین پێك دێ.

**الكُرَيّات** (الكريات الحمر): خڕۆکە سورەکانی خوێن.

**الكريات البيض**: خڕۆکە سپیەکانی خوێن.

**كَزِبَ مُشط الرِّجل كزباً**: سنگەپێی بچوكو وێکهاتوەوە بوو (جۆرە عەیبێکی قاچی ئادەمیزادە).

**الكُزْبُ**: ڕۆنێك بەهۆی گوشینەوە دەرهێندرابێ ٥ (عصارة الدهن).

**الكَوْزَبُ**: پیاوی ڕژدو دڵ تەنگ.

**المكزوبة من الألوان**: ڕەنگێکە لەنێوان ڕەنگی ڕەشو سپی دایە.

**الكُزْبَرَةُ**: ڕوەکێکی کشتوکاڵیو ساڵانەیە، گەڵاکەی تێکەڵ بەهەندێ خواردن دەکرێ، تۆوەکەشی بۆ خۆشکردنی هەندێ خواردنو بۆ گرتنەوەی دەرمان بەکاردەهێندرێ.

**كَزَّ الشَّيْئَ كَزّاً**: شتەکەی تەسك کردەوە.

**كَزَّ الشَّيْئُ كزازة وكزوزة**: شتەکە بەهۆی سەرماوە وشك بوو وێکهاتەوە.

**كَزَّ الوَجْهُ**: ڕوخساری ناشیرین بوو.

**كَزَّ فلان كزازاً وكزازةً**: فلانکەس بێ خێر بوو پارمەتی نەدا ٥ دەگوترێ: (رجل كز اليدين) پیاوێکی ڕژدو چروکە.

**كُزَّ فلان**: فلانکەس توشی نەخۆشی دەمار گرژبوون بوو ٥ یان توشی لەرزینو شەپلە بوو.

**اكَزَّهُ الله**: خودا توشی نەخۆشی دەمارگرژیی کرد .یان توشی لەرزینو شەپلە بوو.

**إكْتَزَّ الرجلُ**: پیاوەکە وێکهاتەوە تێچو بچوك بۆوە.

**التَّكَزُّزُ**: وێکهاتنەوەی دوو شەویلەیە بەهۆی گرژبوونی ماسولکەی شت جوینو دەبێتە هۆی ئەوەی کابرای توشبو بەو نەخۆشییە دەمی بۆ نەکرێتەوە.

**الكَزَازُ**: وشك بونو وێکهاتنەوە ٥ ڕژدیو چروکی.

**الكُزاز**: دەمارگرژیو لەرزینو شەپلەیەکە تووشی ئادەمیزاد دەبێ بەهۆی سەرمای زۆر یان لەبەر ڕۆیشتنی خوێنی زۆر لە جەستە ٥ نەخۆشییەکی کوشندەیە توشی بریندار دەبێ کاتێ بریندارەکە برینەکەی بەگڵو خۆڵ پیس ببێ کەمادەی (باسل التيتانوس)ی تێدا بێ.

**كَزَمَ فلان كزْماً**: فلانکەس دەمی نوقاندو بێ دەنگ بوو.

**كَزَمَ الشَّيْئَ الصُّلْبَ كزماً**: شته توندو رهقه‌كه‌ی گه‌ست ٥ شته‌كه‌ی به‌كه‌لبه‌كانی پێشه‌وه‌ی ده‌می شكاندو ناوكه‌كه‌ی ده‌رهێنا بۆئه‌وه‌ی بیخوا.

**كَزِمَ فلان كَزَماً**: فلانكه‌س هه‌لێنا بۆ پێشكه‌وتن ٥ به‌خێرایی‌و به‌په‌له له‌شته‌كه‌ی خوارد ٥ لوت‌و په‌نجه‌ی كورت بوون ٥ چه‌ناگه‌و لێوی خواره‌وه‌ی ده‌رپه‌ڕیو بوون ٥ لێوی سه‌ره‌وه‌ی چووه به‌ناودا ٥ ده‌گوترێ: (أنف أكزم ويد كزماء).

**اكزم فلان**: فلانكه‌س جه‌سته‌ی وێكهاته‌وه.

**كزُمَ**: وشك بووه‌و وێكهاته‌وه تێچو.

**كَزُمَ العملُ و نحوه بنانَهُ**: كاركردن چاوه قامكه‌كانی وشك‌و گرژ كرد.

**المُنكَزِمُ**: كه‌سێك به‌ری ده‌ستی بچوك بن.

**كَسَبَ لاهله كَسْباً**: هه‌ولی بژێوی دا بۆ ماڵ‌و منداڵی.

**كَسَبَ الشَّيْئَ**: شته‌كه‌ی كۆكرده‌وه.

**كَسَبَ المالَ كَسْباً**: قازانجی كرد ٥ ماڵ‌و سامانی ده‌ستكه‌وت.

**كَسَبَ الإثْمَ**: تاوانه‌كه‌ی هه‌لگرت.

**كَسَبَ فلاناً مالاً او علماً**: ماڵ‌و سامانی بۆ فلانكه‌س ده‌سته‌به‌ر كرد.

**اكسَبَ فلاناً مالاً او علماً**: یارمه‌تی فلانكه‌سی دا له‌سه‌ر وه‌ده‌ستهێنانی ماڵ‌و سامان یان زانست‌و زانیاری یان وای له‌فلانكه‌س كرد ماڵ‌و سامان په‌یدا بكا یان عیلم‌و زانیاری به‌ده‌ست بێنێ.

**إكتَسَبَ**: هه‌ولی دا و كۆششی كرد.

**إكتَسَبَ المالَ**: ماڵ‌و سامانی ده‌ست خۆی خست.

**إكتَسَبَ الإثْمَ**: تاوانه‌كه‌ی خسته ئه‌ستۆی خۆی.

**تَكَسَّبَ المالَ**: ماڵ‌و سامانی به‌ده‌ست هێنا ٥ ده‌شگوترێ: (هو يتَكَسَّب من الشعر) شیعری كرد به‌هۆی پاره‌په‌یدا كردن.

**الكَسْبُ**: كاسبی‌و هه‌وڵدانی بژێو ٥ ده‌گوترێ: (فلان طيب الكسب).

**الكُسْبُ**: پاڵفته‌ی ڕۆن؛ ڕۆنی قالكراوی پالێوراو ٥ توێكڵ‌و سۆی تۆو كه‌تان‌و تلپه‌كه‌ی دوای گوشین‌و ڕۆن لێ گرتنی.

**الكواسِبُ**: برینداركه‌رو درنده چ ئاده‌می چ باڵنده.

**المَكْسَبُ**: ده‌ستكه‌وت ٥ (ك: مكاسِب).

**الكُسْتُبان**: بروانه ماده‌ی (الكشتبان) كه بریتییه له‌و ئاسنۆكه‌ی خه‌یات ده‌یكاته سه‌ری په‌نجه‌ی بۆ ئه‌وه‌ی ده‌رزییه‌كه ئازاری په‌نجه‌ی نه‌دا.

**كَوْسَجَ فلان**: فلانكەس لاجانگی موویان پێوە نەمان.

**تَكَوْسَجَ**: بێ ئەقڵ بوو ٥ دەگوترێ: (من طال لحيته تكوسَجَ عَقْلُهُ) کەسێك ریشی درێژ بێ عەقڵی کورتە، سوکە.

**الكَوسَجُ**: کەسێك لاجانگی ڕوتابنەوەو مووی پێوە نەبێ ٥ ددان کەم؛ کەسێك ددانی کەمی لەدەم دان ٥ بارگیری تەمبەڵ ٥ (ك: كواسج) ٥ هەروا ناوە بۆ ماسییەکی گەورەی دەریایی؛ پەیکەرێکی غوزروفی هەیە لای پێشەوەی درێژو پانەوەبووە، ئەملاو ئەولای ددانی مشاری پێوەن، ئەم جۆرە ماسییە لەئاوە گەرمەکان دا دەژیو زۆرە.

**كَسَحَ البَيْتَ كَسْحاً**: ماڵەکەی ماڵی.

**كَسَحَت الريحُ الأرضَ**: ڕەشەباکە گڵو خۆڵی سەرزەوی هەموو ڕامالی.

**كَسَحَ البِئْرَ او النَّهرَ**: بیرەکە یان جۆگاکەی پاك کردەوە ٥ دەشگوترێ: (أتينا بني فلان فكسَحناهم) هاتینە سەر هۆزی فلانو لەبێخ دەرمان هێنان.

**كَسَحَ فلان من مالي ماشاء**: فلانکەس بەئارەزۆی خۆی لەماڵی منی هەڵگرت.

**كَسِحَ كَسَحاً**: دەستی یان قاچی ئیفلیج بوون ٥ (فهو أكسح وهي كسحاء).

**إكْتَسَحَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ڕادا، ڕایماڵی ٥ دەگوترێ: (أغاروا عليهم فاكتسحوهم).

**الكُسَاحُ**: نەخۆشییەکە توشی حوشتر دەبێو شەلی دەکا ٥ نەخۆشییەکە توشی ئێسقانی منداڵ دەبێ.

**الكُسَاحَةُ**: دایبی ٥ شوێنی فڕی دانی زبڵو زاڵ، (حاوية).

**الكَسِيحُ**: کەسێك لێقەوماو هانای بۆ بەرێو ئەو نەتوانێ بەهانای لێقەوماوەکەوە بێ.

**المِكْسَحُ**: گەسکە ٥ ئەوەی شتی پێ بماڵی.

**المُكَسَّحُ**: کەسێك توشی نەخۆشی ئێسقان بێ، توشی شەلی بووبێ ٥ چەڵەداری توێکڵ لێ کراوەو ڕێك کراو.

**كَسَدَ الشَّيْءُ كساداً وكُسُوداً**: شتەکە ڕەواجی نەبوو، نەفرۆشرا، دواکاری لەسەر نەبوو ٥ دەگوترێ: (كَسَدَت السوق) بازاڕ کەوتو مامەڵەی تێدا کەمبوو ٥ دەشگوترێ: (سلعة كاسدة).

**كَسُدَ الشَّيْءُ كساداً وكسوداً**: بەمانا (كَسَدَ) دێ.

**اكْسَدَ القومُ**: خەڵکەکە بازاڕی نەبوو کڕینو فرۆشتنیان کەم بوو.

**اكْسَدَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ناڕەواج کرد.

**كَسَرَ فلان من طرفه**: فلانكەس کەمێك چاوی خۆی نوقاند.
**كَسَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی شکاند، تێکی شکاندو پەرتەوازەی کرد ◊ دەشگوترێ: (كسر من برد الماء وحره) ساردی ئاوەکەیان گەرمیەکەی کەم کردەوە.
**كَسَرَ الكتابَ على عشرة فصول مثلاً**: کتێبەکەی بەسەر دە بەش دا دابەش کرد.
**كَسَرَ التاجر متاعه**: بازرگانەکە پارچە پارچە شتەکانی فرۆشتن.
**كَسَرَ الوسادَ**: سەرینەکەی نوشتاندەوە و شانی لەسەر دادا.
**كَسَرَ الطائرُ جناحيه**: باڵندەکە باڵەکانی خۆی شکاندەوە بۆ نیشتنەوە ◊ دەگوترێ: (باز كاسر وعقاب كاسِر).
**كَسَرَ الرجلَ عن مراده**: پیاوەکەی لەمەبەستی خۆی لادا.
**كَسَرَ القومَ**: هۆزەکەی شکاندو بەسەریان دا زاڵ بوو.
**كَسَرَ الحَرْفَ**: بزوێنی ژێری خستە سەر پیتەکە.
**كَسَّرَ الشَّيْئَ**: زێدەڕۆیی کرد لە شکاندنی شتەکەدا.
**كَسَّرَ الكلمة**: وشەکەی بەشێوەی (جمع تكسير) جەمع کردەوە.
**إنْكَسَرَ الشَّيْئُ**: بۆ موتاوەعەی (كَسَرَهُ) دێ ◊ شتەکە کەم بوو ڕەوییەوە، دەگوترێ: (إنْكَسَرَ الحَرُّ وبرد الماءُ).
**إنْكَسَرَ العسكر**: سوپا شکاو تارومار بوو.
**إنْكَسَرَ الشِعْرُ**: شیعرەکە لەنگ بوو.
**إنْكَسَرَ العجينُ**: هەویرەکە شل بوو هەڵات.
**تَكَسَّرَ الشَّيْئُ**: بۆ موتاوەعەی (كَسَّرَهُ) دێ ◊ دەشگوترێ: (فلان فيه تخنّثٌ وتَكَسُّرٌ).
**الكُسارُ**: ئەو پارچە وردانەی لەشتەکە دەبێتەوە ◊ وەکوو وردە کاشی وردە شوشە، وردەنان.
**الكُسَارَةُ**: بەمانا (الكُسارُ) دێ.
**الكِسْرُ**: قەراخی خانوو ◊ لای شتو کەناری شت.
**الكَسْرُ**: بەمانا (الكِسْرُ) دێ ◊ شتی کەم ◊ لەبواری حیسابو ریازیات دا ژمارەی کەرتو شتی وایە وەکوو ($\frac{1}{2}$، $\frac{1}{3}$، $\frac{1}{4}$)...هتد. دەگوترێ: (ضرب الحُسَابُ الكسورَ): ژمێریارەکە کەرتەکانی زەربی یەك کردن.
**الكَسْرَةُ**: تێشکان، دەگوترێ: (وقعت على القوم الكَسْرَةُ): خەڵکەکە

شكانيان بەسەردا هاتو كەوتنە نشوستييەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان بعينە كَسْرَة من السَّهر) فلانكەس چاوی لێڵو پێڵ بوونو ومنەوز تينی بۆ هێناوە ٥ (رجل ذو كسرات) پياوێكە لەهەموو شتێك دا تێدەشكێو زەرەر دەكا.

**الكِسْرَةُ**: پارچە شكاوی هەرشتێك بێ ٥ بۆ نموونە دەگوترێ:

**الكِسْرَة من الخبز**: كوێچكە نان.

**الكَسّارَةُ**: شتێكە وەكوو گازو پلايس گوێزو شتی وای پێ دەشكێنن.

**الكسور من الجلد والثوب**: چرچو لۆچی پێستو قوماشو شتی وا ٥ دەشگوترێ: (أرض ذات كسور) زەوييەكە بەرزونزمی تێدايە ٥ (كسور الأودية والجبال) قۆرتو پێچی شيو و دۆڵو كێو و كەژ.

**المكاسِرُ**: جيرانی نزيك، ئەوەی ديواری بەديواری خانوەكەتەوەيە ٥ دەڵێی: (فلان مكاسِري) واتە فلان جيرانمە.

**المَكْسِرُ**: شوێنی شكاندنی شت.

**المُكَسَّرَاتُ**: گوێزو بادامو بندەقو فستەقو شتی وا.

**كَسَّ الشَّيْئُ كَسّاً**: شتەكەی كوتاو وردوهاڕی كرد.

**كَسَّ الرجل كَسّاً**: پياوەكە ددانی دەركەوتن ٥ ددانی خوارەوەی بەرز بوونەوە دەركەوتنو مەلاشوی و شەويلەی سەرەوەی بۆ دواوەو شەويلەی خواروی هاتەپێشەوە (فهو أكسُّ وهي كسّاء).

**تَكَسَّسَ**: بەئەنقەست شەويلەی خۆی پاشو پێش كردن.

**الكَسيسُ**: گۆشت كەلەسەر بەردی گەرم وشك كرابێتەوە پاشان ورد بكرێو بكرێتە توێشوی سەفەر ٥ هەروا ناوە بۆ شەرابێك لەزوراتو جۆ دروست بكرێ.

**كَسَعَ فلاناً كَسْعاً**: لەپاشەوەی دا، بەدەستی يان بەپێشەوەی قاچی لەفلانكەسی دا ٥ دەگوترێ: (كَسَعَ القومَ بالسيف) بەشمشێر كەوتە وێزميانو لەپاشەوەيانی دا.

**كَسَعَ الشَّيْئَ كذا بكذا**: شتەكەی كردە شوێنكەوتەی ئەوەو بەو شێوەی لێ كرد.

**وردت الخيلُ يَكسَعُ بعضها بعضاً**: وڵاخە بەرزەكان يەك لەدوای يەك هاتن بۆسەر ئاو.

**كَسَعَ فلاناً بما سَاءَهُ**: قسەی كردو وەڵامی ناشيرينی قسەی فلانكەسی دايەوە ٥ فلانكەسی دەركرد.

إكْتَسَعَت الخيلُ باذنابِها: ولاخە بەرزەكە شتەكەيان خستە ژێر قاچیانەوە.

إكْتَسَعَ الفَحْلُ: كەڵەكە كلكی لەڕانی دا.

تَكَسَّعَ في ضلالە: لەگومڕایی خۆیدا ڕۆچوو.

الأكْسَعُ: دەگوترێ: (حمام أكسع) كۆترێكە لەژێر كلكی دا پەڕی سپی هەن.

الكُسْعَةُ: خاڵی سپی لەناوچەوانی هەرشتێك دا بێ ٥ پەڕی سپی لەژێر كلكی باڵندەدا ٥ گوێچكەنان.

كَسَفَتِ الشمسُ كسوفاً: خۆر گیراو ڕوناكی نەما.

كَسَفَ الوجه: دەموچاو زەرد هەڵگەڕاو ڕوناكی نەما.

كَسَفَ الرجلُ: پیاوەكە چاوی داگرت، چاوی خۆی داشكاند ٥ دەشگوترێ: (كَسَفَ بصره) چاوی خۆی داخست.

كَسَفَ بَصَرُهُ: بەهۆی چاو ئێشەوە چاوی بۆ نەكرانەوە.

كَسَفَ بالُهُ: وەزعو حاڵی ناخۆش بوو.

كَسَفَ أمَلُهُ: هیواو ئاواتی پوكانەوە.

كَسَفَ الشَيْئَ كَسْفاً: شتەكەی داپۆشی.

كَسَفَت الشمسُ النجومَ: خۆر بەڕوناكی خۆی ڕوناكی ئەستێرەكانی داپۆشی.

كَسَفَ الشيئَ: شتەكەی بڕیەوە.

اكْسَفَ القمرُ الشمسَ: مانگ بەری ڕوناكی خۆری گرت.

اكْسَفَ الحزنُ فلاناً: خەفەت وەزعو حاڵی فلانكەسی گۆڕی.

كَسَّفَ الشَيْئَ: شتەكەی بڕیەوە.

الكاسِفُ: دەگوترێ: (یوم كاسف) ڕۆژگارێكی ناخۆشو پڕ بەلاو كارەساتە ٥ پڕ شەڕو شۆڕو چورتمە.

الكِسْفَةُ: پارچەی شت ٥ پەتو كەرت.

الكُسوف: خۆرگیران یان كەمبوونەوەی ڕوناكییەكەی بە هۆی ئەوەی دەكەوێتە نێوان خۆرو زەوییەوە.

الكِسيفَة: بەمانا (الكِسْفَة) دێ.

كَسْكَسَ الشَيْئَ: شتەكەی بەتوندی كوتاو وردوهاڕی كرد.

الكَسْكَسَةُ: پێوەلكاندنی پیتی سینە بە (كافی تەئنیسەوە) لەكاتی ڕاوەستانی لەسەر كافەكە ٥ دەگوترێ: (أعطيتكِسْ).

الكُسْكُسِيُّ: خواردەمەنییەكە خەڵكی ولاتی مەغریب لەئاردی گەنم بەهۆی كولاندن لەسەر ئاگر دروستی دەكەن.

كَسِلَ الأمرُ الرجلَ: كارەكە پیاوەكەی تەمبەڵ كرد.

**كَسِلَهُ**: بەمانا (أكسَلَهُ) دێ.

**تكاسَلَ**: بەئەنقەست تەمبەڵی نواند.

**إستَكسَلَ المتاكاسِلُ**: بیانوی بەچەند جۆرە تەمبەڵییەك هێنایەوە.

**المكسلة**: هەرشتێك سەر بكێشێ بۆ تەمبەڵی ٥ دەگوترێ: (الفراغ مكسلة).

**كَسَمَ كَسْماً**: تێكۆشاو هەوڵی دا لەپێناو پەیداكردنی بژێو بۆخۆیو ماڵو منداڵی.

**كَسَمَ الحَرْبَ**: شەڕی هەڵگیرساند.

**كَسَمَ الشَّيْئَ اليابِسَ**: شتە وشكەكەی بەدەستی خۆی وردوهاڕ كرد.

**الأكسوم من الرياض**: باخێك ڕوەكو گیاو گژی كەوتبێتە سەریەك ٥ (ك: أكاسيم وأكاسم).

**الكَسْمُ**: باقی ماندەی شتی وشك كەدوای شكاندنو ورد كردن بەدەستیەوە بمێنێتەوە.

**الكَسُومُ**: ماندوو شەكەت لەئیشو كاردا.

**كسا فلان ثوباً كَسْواً**: كراسێكی دا بەفلان.

**كَسِيَ كَساً**: پۆشاكی پۆشی.

**إكتسى**: پۆشاكی پۆشی.

**إكتَسَتِ الأرضُ بالنبات**: زەوی بەڕوەكو گیاوگژ خۆی ئارایش دا، خۆی داپۆشی.

**تكسّى بالكساءِ**: پۆشاكی پۆشی.

**إستَكْسَاهُ**: داوای پۆشاكی لێ كرد.

**الكِساءُ**: پۆشاك ٥ (ك: أكسية).

**الكُسْوَةُ**: كراسو پۆشاكێكە بۆ خۆڕازاندنەوە دەپۆشرێ.

**كَشَأَ اللحمَ كَشْئاً**: گۆشتەكەی ئەوەندە برژاند تا وشك بۆوە ٥ (فهو كشيءٌ).

**كَشَأَ الطعامَ**: خواردنەكەی داكرۆشتو خواردی.

**كَشَأَ الشَّيْئَ**: شتەكەی پاك كرد توێكڵەكەی لێ كردەوە.

**كَشِئَ من الطعام كَشَأً وكشاءً**: پڕبوو لە خواردەمەنی.

**كَشِئَتْ يده**: پێستی دەستی ئەستوورو پتەو بوو، گرژبوو.

**اكْشَأَ**: گۆشتی برژاوی خوارد.

**تَكَشَّأَ الأديمُ**: پێستەكە داماڵدرا لێ بۆوە.

**تَكَشَّأَ الرجلُ من الطعام**: پیاوەكە لەخواردن تێربوو.

**تَكَشَّأَ اللحمَ**: گۆشتی وشكەوەبوی خوارد.

**الكَشِيئُ**: برژاوی تازەو پێگەیشتوو.

**الكُشْتِبانُ**: جامیلكەیەكی زۆر بچكۆلە خەیات دەیكاتە سەری پەنجەی بۆئەوەی دەرزییەكە ئازاری نەدا ٥ هەروا ناوە بۆ بۆرییەكی بچكۆلە

مۆسیقار لەسەر پەنجەی دەکاو ئامێری قانونی پێ لێ دەدا.

**کَشَحَ القوم عن الماء کَشْحاً**: خەڵکەکە لەدەوروبەری ئاوەکە ڕۆیشتن‌و پەرتەوازە بوون.

**کَشَحَ الطائرُ**: باڵندەکە بەگورجی هات.

**کَشَحَ لفلان بالعداوة**: دژایەتی فلاّنکەسی کرد.

**کَشَحَتِ الدَّابَّةُ**: وڵاخەکە کلکی لەناوگەڵی خۆی نا.

**کَشَحَ القومَ**: خەڵکەکەی دەرکرد.

**کَشَحَ البعیرَ**: لاکەلەکەی حوشترەکەی بەئاگر داخکرد.

**کَشَحَ فلاناً**: زەبری لەلاقەبرغەی فلاّنکەس دا.

**کَشَحَ العودَ**: شورکە دارەکەی سپی کرد؛ توێکڵی لێ کردەوە.

**کَشِحَ کَشَحاً**: لاکەلەکەی هێشا.

**کاشَحَهُ**: دوژمنایەتی کرد.

**کَشَّحَ العودَ**: لقەدارەکەی سپی کرد، توێکڵەکەی لێ کردەوە.

**إنْکَشَحوا عن الماء**: لەئاوەکە دوور کەوتنەوەو پەرتەوازە بوون.

**الکاشح**: دوژمنی سەرسەخت‌و دڵ پیس.

**الکِشاحُ**: شوێنکەی داخ ئەو شوێنەی بەهۆی سوتاندن بەداخ توکی لێ نەڕوێ.

**الکشاحَةُ**: موقاتەعەو دەنگ دابڕین.

**الکَشْحُ**: کەلەکە، خالیگە ○ خوار پەراسو ○ ویشاح‌و ویسام کە دوو خەتی گەوهەر یان ئاوریشم لێك دەدرێن‌و بەسەر شان دا بۆ بن هەنگڵ ڕاست‌و چەپ دەهێندرێن ○ دەشگوترێ: (طوی کَشْحَهُ علی الأمر) کارەکەی شاردەوە ○ وازی لە کارەکەی هێنا.

**الکَشَحُ والکُشاحُ**: دەردێکە توشی لاکەلەکەی دەبێ.

**المِکْشاحُ**: پاچ ○ تیزایی شمشێر.

**کَشَدَ الشَیْئَ کَشْداً**: بەددان شتەکەی بڕی (قرتاندی).

**کَشَدَ النَّاقَةَ**: بەسێ پەنجە گوانی حوشترەکەی دۆشی.

**اکْشَدَ**: ڕۆنەکەرەکەی لەماستەکە جیاکردەوە.

**الکاشِدُ**: کەسێك زۆر هەوڵ‌و تەقەلاّ بدا بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی ماڵ‌و خێزانی ○ کەسێك سیلەی ڕەحم بەجێ بێنێ.

**الکشود**: بەمانا (الکاشِدُ) دێ.

**کَشَرَ عن اسنانه کَشْراً**: ددانی دەرخستن لەکاتی پێکەنین دا ددانی دەرخستن.

**کَشَرَ فلان لصاحبه**: فلاّنکەس زەردەخەنەی بۆ هاوەڵەکەی کرد ○ بەڕوی هاوەڵەکەیدا پێکەنی.

**كَشَرَ السَّبُعُ عن نابه**: دڕندەکە ددانی دەرخستن و خۆی ئامادەکرد بۆ پەلاماردان و نێچیر کردن.
**كَشَرَ العَدُوُّ عن أنيابه**: دوژمن خۆی گیف کردەوەو هەڕەشەی توندی لەبەرامبەری کردو خۆی وەکوو شێرو پڵنگ ڕانواند.
**كاشَرَهُ**: بەدەمیەوە پێکەنی و روخۆش بوو.
**كَشَّرَ**: بۆ موبالەغەی مادەی (كَشَرَ) دێ.
**الكَشَرُ**: هێشومتریێ یان هێشوەخورما کە بۆڵەکانیان لێکرابنەوەو لاسك و قونچکیان مابێ.
**الكُشَرِيُّ**: خواردەمەنییەکە لەبرنج و نیسك دروست دەکرێ.
**كَشَّتِ الأفعى كشيشاً**: مارەکە: کەهەندێ جەستەی لەهەندێکی تری خشا دەنگی لێ هات ٥ یان بەدەمی فیشکانی.
**كَشَّ الجملُ**: حوشترەکە باڕاندی و باڕاندنەکەی لەقوڕگیدا خواردەوە.
**كَشَّ القِدْرُ**: مەنجەڵەکە کوڵی و کەوتە قڵپە قڵپ ٥ هەروا دەگوترێ: (كَشَّ الثوبُ بعد الغسل) قوماشەکە دوای شتن تێچو وێکهاتەوە.
**كَشَّ الثوبُ او الجِلْدُ**: قوماشەکە یان چەرمەکە تێچوو وێکهاتەوە.

**كَشَطَهُ عنه**: لێی داڕنی ٥ دەگوترێ: (كَشَطَ الجلدَ عن الذبيحة) پێستەکەی لە کوشتییەکە داڕنی.
**كَشَطَ الجلُ عن الفرس**: زینەکەی لە ئەسپەکە کردەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (لأكشِطَنَّ عن أسرارك) هەموو نێهێنییەکانت ئاشکرا دەکەم.
**كَشَطَ الحرفَ**: پیتە نووسراوەکەی سڕیەوە.
**كَشَطَ غِلالَةَ اللبن**: سەرتوێژی ماستەکەی کۆکردەوە.
**إنْكَشَطَ**: بۆ موتاوەعەی (كَشَطَ) هاتووە ٥ دەشگوترێ: (إنْكَشَطَ روعُهُ) ترسەکەی ڕۆیی.
**تَكَشَّط السحابُ**: هەورەکە لێك بڵاو بوون و نەمان.
**الكُشَاطُ**: حەیوانکوژەرەوە، قەساب.
**كَشَفَ الشَّيْءَ وعنه كَشْفاً**: شتەکەی دەرخست و پەردەی سەری لادا ٥ دەگوترێ: (كَشَفَ الأمر وعنه) شتەکەی ئاشکرا کرد.
**كَشَفَ الله غَمَّهُ**: خودا خەم و خەفەتی لەدڵ دا لابرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ﴾.
**كَشَفَ الكواشف فلاناً**: شتە دەرخەرەکان فلانیان فەزح کرد، حەیایان برد.

**كَشَفَ عليه الطبيب**: پزیشکەکە وردبینی بۆ کردو نەخۆشییەکەی دەرخست.

**كَشِفَ فلان**: فلانکەس پێشەسەری ڕوتایەوە ٥ یان فلانکەس لەشەڕدا مەتاڵی پێ نەبوو ٥ کڵاو خودەی لەسەر نەکرد ٥ لەشەڕدا خۆی نەگرتو هەڵات.

**كَشِفَ الفرسُ**: ئەسپەکە ئێسقانی کلکی یان لای سەرە کلکی خوار بوو.

**اكشَفَ فلان**: فلانکەس پێکەنی تاپوکی دەرکەوتن.

**كاشَفَهُ بالأمر**: کارەکەی لەلا ئاشکرا کرد.

**كاشَفَهُ بالعداوة**: دوژمنایەتیەکەی بۆ ئاشکراکردو بەئاشکرا دژی وەستا.

**كَشَّفَ**: بۆ موبالەغەی (كَشَفَ) دێ.

**إكْتَشَفَت المراةُ**: ئافرەتەکە زۆری لەجەستەی خۆی ڕوت کرد، دەرخست.

**إكتشف الأمرَ**: بەهەوڵو ماندوبونێکی زۆر توانی ئیشەکە ئاشکرا بکا.

**إكْتَشَفَ الشَّيئَ**: بۆ یەکەمجار شتەکەی ئاشکرا کرد پەردەی لەسەر لادا.

**إنْكَشَفَ الشَّيئُ**: شتەکە دەرکەوت.

**تَكَشَّفَ الشَّيئُ**: بەمانا (إنْكَشَفَ) دێ.

**تكاشَفَ القوم**: خەڵکە نهێنی خۆیان بۆ یەکتری ئاشکرا کرد.

**تَكَشَّفَ فلان**: فلانکەس فەزح بوو حەیای چوو.

**تَكَشَّفَ البرقُ**: هەورەبروسکە ئاسمانی داگرت.

**تَكَشَّفَتِ الأرضُ**: زەوییەکە وشك هەڵاتو هەندێ شوێنی شەقار شەقار بوو.

**إستَكشَفَ عنه**: داوای لێ کرد شتەکەی بۆ ڕون بکاتەوە نهێنییەکانی لەلا بدرکێنێ.

**الكَشْفُ**: پاسایەکی پوختەکەرو بژارکەرە هەوڵ دەدا کەسایەتی وا لەکۆمەڵگا دا دروست بکا گیانی هاریکاری‌و پشت بەخۆبەستن‌و فریادڕەسی تێدابێ لایەنگرانی خۆی بەسەفەر کردن‌و کردنەوەی خێمەتگاو ژیانی زبر ڕام بکا.

**الكشّاف**: یەکێکە لەئەندامانی کۆمەڵەی کەشافەو چەند پلەو پایەیەکی هەیە ٥ ناوێی کتێبێکی تەفسیری قورئانە.

**الكَشْفاءُ** (جَبْهَةٌ كشفاء): پێشەسەری ڕوتاوە.

**المِكْشافُ الكهربي**: ئامێرێکی کارەبایە جۆری شوحنەی کارەبایی‌و شوێنکەی لەسەر شت دیاری دەکا ٥ پێشی دەگوترێ (ئیلیکترۆسکوب).

**الكِشْك**: دۆینە؛ خواردنێکە لەئاردو ماست دروست دەکرێ‌و وشك دەکرێتەوەو هەڵدەگیرێ کاتی پێویست دەکرێ بەکێشت، یان دەکرێتە ناو ئاوەوو دەخورێ ٥ وادەبێ لەجۆ و ماست دروست دەکرێ.

**الكُشْك**: خانوی بچوك، کۆشك، قۆختە، کەوشەك.

**كَشْكَسَ فلان**: فلانکەس هەڵات.

**كَشْكَشَ الأفعى**: مارەکە پێستەکەی خشەخشی هات ٥ دەشکوترێ: (بئر لایکشکش ماؤها) بیرێکە ئاوەکەی هەڵناهێنجرێ بەهۆی ناعورەوە.

**كَشْكَشَ الثوبَ**: چرچ‌و لۆچ‌و نوشتانەوەی لەقوماشەکەدا دروست کرد.

**الكشكشة**: زاراوەی هۆزی بەنی ئەسەدو هۆزی رەبیعەیە لەشوێنی کافی راناوی مێینە پیتی (شین) بەکاردێنن، واتە لەجیاتی (عَلَيْكِ یان مِنْكِ، مثلا) دەڵێن: (عَلَيْشِ مِنْشِ) یان لەدوای کافی خیتابەکە پیتی (شین) زیاد دەکەن‌و دەڵێن: (عَلَيْكِشْ مِنْكِشْ).

**كَشَمَ انْفَهُ كشماً**: لەبن را لوتی بری.

**كَشَمَ القِثّاءَ او الجُزَرَ**: خەیارەکە یان گێزەرەکەی بەخێرایی‌و بەهەڵپە هەڵپ خوارد.

**كَشِمَ كَشَماً**: بە زگماك کەم ئەندام بوو یان لەبنەچەو نژاد دا کەم‌و کوری هەبوو (فهو أكشم).

**اكتَشَمَ انفَهُ**: بەمانا (كَشَمَهُ) دێ.

**كَشْمَرَ**: لەپرمەی گریانی دا.

**كَشْمَرَ انْفَهُ**: لوتی شکاند.

**الكُشَامِرُ**: ئادەمیزادی ناشیرین.

**الكِشْمِشُ**: کشمیش مێوژو ترێی دەنك وردیلە.

**كَشا الشَّيْئَ كَشْواً**: شتەکەی بەددانەکانی گەست‌و دەری هێنا.

**كَصَّ كَصّاً وكصيصاً**: وێکهاتەوە تێچو، لەترسان گرمۆڵە بوو زەعیف‌و لاواز بوو، لەترسا چووە ناو یەکەوە.

**اكَصَّ فلان**: فلانکەس هەڵات‌و قاچاندی.

**الكصيصُ**: دەنگی نزم بەهۆی ترس‌و بیمەوە ٥ تێچوون‌و وێکهاتنەوە بەهۆی ترس‌و زەندەق چوونی ٥ گرمۆڵە بوون بەهۆی زۆر ماندووبونەوە ٥ سیرەسیری کوللەو سیسرەو شتی وا.

**كَصَمَ كَصْماً وكُصُوماً**: چۆن هات ئاوا بەدەستی بەتاڵ گەرایەوە هیچی دەست نەکەوت.

**كَظَبَ كظوماً**: پربوو لە رۆن.

**كَظَرَ القَوْسَ كَظراً**: لایەکی کەوانەکەی بڕبڕکرد کەلی کرد بۆئەوەی ژێیەکەی تێدا چەسپ بکرێو بەرنەبێ.

**الكُظْرُ**: بەزی دەوروبەری گورچیلە ٥ شوێنو جێگای بەزی دەوری گورچیلە کە بەزەکەی لێکرابێتەوە ٥ غودەیەکە لەژوور گورچیلەوە.

**كَظَّ المَسِيلُ بالماء كَظّاً**: ڕێڕەوی ئاوەکە ئاوەکەی نەکێشا لەبەر زۆری ئاوەکە.

**كَظَّ الحَبْلَ**: حەبلەکەی کشت باداو.

**كَظَّ الطعامُ او الشرابُ الحيوانَ**: خواردنو خواردنەوەکە گەدەی حەیوانەکە نەیکێشاو هەناسەی توند کرد.

**كَظَّ الغَيْظَ صدرَهُ**: بوغزو کینە دڵو دەرونی پڕ کرد.

**كَظَّ الأمرُ فلاناً**: کارەکە فلانکەسی ناڕەحەت کرد.

**كَظَّ فلان خَصْمَهُ**: فلانکەس ڕکابەرەکەی خۆی بۆڕداو هەموو ڕێگاچارەیەکی ڕزگاربوونی لێ بڕییەوە.

**كاظَّهُ**: ماوەیەکی زۆر تەنگی پێ هەڵچنیو وازی لێ نەهێنا.

**كاظَّ فلاناً في الحرب**: فلانکەسی باش فێری شەڕ کرد.

**إكْتَظَّ**: باش پڕبوو ٥ دەگوترێ: (إكْتَظَّ المكانُ بالناس) شوێنەکە پڕە لەخەڵكو بەتەواوی قەرەباڵغ بووە.

**إكْتَظَّ الوادي بالسيل**: شیوەکە لافاوەکە ناکێشێو پڕاوپڕو لێوان لێوە ٥ (إكْتَظَّ بطنه بالطعام) گەدەی پڕبوو لەخواردن.

**تكاظُّوا**: لەگۆڕەپانی جەنگ دا تەنگیان بەیەکتر هەڵچنی.

**تكاظَّ القومُ**: خەڵکەکە سنووری یاساییان شکاندو زیادەڕەوییان کرد لەدژاییکردنی یەکتری.

**الكِظاظُ**: توندو تیژیو چورتەمو ناخۆشی ٥ هەرشتێك دڵ ناخۆش بکا.

**الكَظُّ**: دەگوترێ: (رجل كظٌّ) پیاوێکە ئیشو کاری تەنگی پێ هەڵدەچنو ناڕەحەتی دەکەن.

**الكِظَّةُ**: ورگنی ٥ ورگ شۆڕی ٥ (ك: أكِظَّةٌ).

**كَظْكَظَ السِّقاءُ**: کوندە ئاوەکە بەئاو تێکردن لێك کشاو فش بوو.

**تَكَظْكَظَ عند الأكل**: چوارمەشقی دانیشت بۆئەوەی ورگی پڕبکا لە خۆراك.

**كَظَمَ السِّقاء**: کوندەکەی پڕکرد لەناو و دەمی توند بەست.

**كَظَمَ مجرى الماء**: ڕێڕەوی ئاوەکەی گرت.

**كَظَمَ الرجلُ غيظه**: پیاوەکە ڕقی خواردەوەو ددانی بەخۆیا گرت ٥ لێبوردەیی ڕاگەیاند.

**كَظَمَ نَفْسَهُ**: نەفسی خۆی گرت نەیهێشت سەرکەشی بکا.
**كَظَمَ كظوماً**: بێدەنگ بوو.
**الكـاظمُ**: ئـەو کەسـەیە لـەکاتی تورەبـوون‌و ڕق هەڵـسان دا ددان بـەخۆی دا دەگـرێ‌و جڵـەوی خـۆی بەرنادا.
**الكِظـام**: تۆپەوانـەو سـەدادەی شـت ٥ دەگوترێ: (أخذ بكظام الأمر) شوێنی گرنگـی کارەکـەی خـستەژێر کۆنترۆڵی خۆیەوەو دەستی بەسەردا گرت.
**الكظامـةُ**: سـەدادەو تۆپەوانـە ٥ حەبلێکـە لـوتی حوشـتری پـێ دەبەسـترێ بۆئـەوەی ژێربـار بـێ ٥ پێـشی دەگـوترێ: مـەهار ٥ هـەروا ناوە بۆ دەراوی شیو ٥ ئـەو ئەڵقـەی حـەبلی تاکـە تـەرازوی لایـەکی تێدەخرێن‌و تێیدا کۆدەبنەوە.
**الكَظْـمُ**: بـۆری هەناسـە بـەلای بینـە قاقاوە، ئەو شوێنەی هەناسەی لێوە دێتـەدەر بۆنـاو دەم ٥ دەگـوترێ: (أخذ بكظمِهِ) بینەقاقای گرت.
**الكظيمُ**: بەمانا (الكـاظِمُ) دێ ٥ هـەروا بـەمانا خەفـەتباریش دێ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَابْيَـضَّتْ عَيْنَـاهُ مِـنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ٥ قفڵ‌و کیلـۆنی دەرگـا ٥ دەشـگوترێ: (إنهـا لكظـيم

الخلخـال) پـوزی ئەوەنـدە گۆشـتن‌و خڕە خڕخاڵ تێیدا دەنگی نایە.
**كظا لحمُهُ كظاً**: گۆشـتی زۆر بـوو، خـۆی دارِشت.
**تَكَظَّى لحمُهُ سِمْناً**: گۆشـتی سـواری یەك بوو، قەڵەو بوو.
**كَعَبَت الفتـاة كعوبـاً**: کـچەکە مـەمکی خڕکردن، مەمکی بەرز بوونەوە.
**كَعَـبَ فلانـاً**: زەبـری لەشـوێنی ڕەقـایی جەستەی دا وەکـوو (سـەرو قاپەڕەقـەو دەفەی شان).
**كَعَـبَ الإنـاء أو الحـوضَ**: قاپەکـە یـان حەوزەکەی پڕکرد.
**اكعَـبَ الرجـلُ**: پیاوەکـە بـەخێرایی ڕۆیی.
**كَعَّبَـت الفتـاةُ**: کـچەکە مـەمکی خڕکـردن مـەمکی بەرزبوونـەوە ٥ دەشگوترێ: (كَعَّبَ الثديُ).
**كَعَّبَ الشَّيْئَ**: شتەکەی موکەعەب کرد (سوچ سوچی کرد).
**كَعَّبَ العـددَ**: ژمارەکەی دووجار زەربی خۆی کرد.
**كَعَّبَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕکرد.
**كَعَّـبَ الثـوبَ**: قوماشـەکەی تونـد پێچایەوە.
**تَكَعَّبَ ثـديُ الفتـاة**: مـەمکی کـچەکە خڕبوون.

**التكعيبة**: کەپری مێو.

**التكعيبيـــةُ**: جـۆره بیروبۆچـــونێکه لـــەبواری وێنـــەگرتن دا یـــەکێك لەهونەرمەندە بەناوبانگەکانی ئەم بواره بیکاسۆیه.

**الكَعْبُ**: هەر جومزگەیەك لەنێسقان ٥ قاپەڕەقـــە؛ ئـــەو دوو ئێـــسقانه ڕەقەی خوار گوزنگی قاچ ٥ هەموو قاچێك قاپەڕەقەی بەملاو بەو لاوه هەیه ٥ هـەروا وشـەی (كَعْب) نـاوه بۆ گرێی قەفەژاژو لاسکی گنـدۆڕو هەر لاسکه ڕوەکێك کە کلۆر بێ ٥ دەشـگوترێ: (رجـل عـالي الكعـب) واتـــه پیـــاوێکی خـــاوەن ڕێـــزو خانەدانه.

**الكَعْبَـةُ**: کابــە، مــاڵی خــودا ٥ هــەر خانویـــــــەك چـــــــوارلایەکەی چوارگۆشەیی بێ.

**المكعّـبُ**: بـودرەو عـەبای پـەڕاوێز چـــندراو ٥ لـــەبواری مەســـاحەو ڕوپێـــوی دا قەبارەیەکـــە شـــەش چوارگۆشه دەوریان دابێ ٥ لەبواری ژمـــارەو حیـــساب دا ئـــەو ژمـــاره بەدەســـــــتهاتویه کەلـــــەئاکامی زەربکردنـــی دوو چـــەندانەی خـۆی پەیدابووبێ؛ بۆ نمونه ژماره هەشت موکەعەبی ژماره دووه.

**كَعْبَرَهُ بالسيف**: بەشمشێر بڕی.

**تَكَعْبَرَ**: بۆ موتاوەعەی (كَعْبَرَ) دێ.

**الكُعْبُرَةُ**: گرێـی لاسـکی هـەر ڕوەکێکه کـه کلـۆره وەکـوو لاسـکی قەفـەژاژو گـەنم و جـۆ و گنـدۆڕو شـتی وا ٥ بەیەك گەیشتنی هـەردوو ئێـسقانی جومزگـــەکان ٥ وەکـــوو جومزگـــەی مەچەکی دەست.

**كُعْبَـرَةُ الوظيـف**: جومزگـەی نێـوان گوزنگ و قاچ.

**كُعْبَرَةُ الكتِفْ**: قەپیلکی شان ٥ کۆتایی مـل و سـەرەتای سـەر ٥ کلۆتی ڕان ٥ کوتەگۆشت ٥ بن ژێل و سەرگوێزری گـەنم و جـۆ کەلـه بێـژنگ دەدرێ و زیزانەو شتی وا دەکەوێته ژێـرەوەو پل و پوشیشی دەکەوێته سەر ٥ (ك: كعابر).

**الكعبورة**: هـەردوو ئێـسقانێك بەیـەك بگەن.

**كَعْـبَسَ الرجـلُ**: پیاوەکـه بـەخێرایی هەنگاوی نا ٥ یان بـه هێواشـی بـازی دا.

**اكْعَمت فلان**: فلانکـەس بەشێوەی ڕق هەڵساوی و خۆ گیفکەرەوه ڕۆیشت.

**الكُعَيْتُ**: باڵندەیەکه لەپێری بولبول و جەســته بـچوك و گـورج و گۆڵـەو هەمیـــشه لـــەجم و جۆڵدایـــەو هـــەدادانی نیـــه، دەنـــگ خۆشـــترین

بالندەی بولبول ئاسایە، سەرو ملو لای ژوروی سنگی ڕەشە ٥ لەولاتانی میصرو سودانو ئەو ناوچانەی دارستانو باخو باخاتی هەیە.

**كعتر في مشيه**: لەڕۆیشتن دا وەكوو سەر خۆش بە لۆز لۆز هەنگاوەكانی هەڵێنان.

**كَعِرَ الصَّبِيُّ كَعَراً**: منداڵەكە ورگی پڕ بوو قەڵەو بوو ٥ (فهو كَعِرٌ وهي أكعر).

**كَعِرَ الفصيلُ**: بێچوە حوشترەكە پیو لە دوگی دا كۆبۆوە.

**أكْعَرَ البعيرُ**: حوشترەكە دوگی گەورە بوو، پیوی زۆری هەڵپەچنی.

**الكَعْسُ**: ئێسقانی پەنجەی دەستو قاچ.

**كَعْطَلَ بيدِهِ**: خۆی كێشایەوەو دەستی هەڵبڕین خۆی درێژ كرد.

**كَعَّ فلان كَعّاً وكعوعاً وكعاعةً**: فلانكەس ترسنۆكو لاواز بوو.

**أكَعَّ فلاناً**: فلانكەسی ترساند.

**الكَعكُ**: كەعك، شەكرلەمە، خواردنێكە لەئاردو شەكرو ڕۆن دروست دەكرێ.

**كَعْكَعَ في كلامِهِ**: زمانی گیراو قسەی بۆ نەكرا.

**كَعْكَعَ فلاناً**: فلانكەسی ترساند.

**تَكَعْكَعَ**: ترساو پاشەكشەی كردو گەڕایەوە.

**كَعَمَ البعيرَ كَعْماً**: دەمی حوشترەكەی شەتەك دا بۆئەوەی گاز نەگرێ یان لەوەڕی بۆ نەخورێ ٥ (فهو كعيم ومكعوم).

**كَعَمَ الوعاءَ**: دەمی قاپەكەی گرت، زاركی تورەكەكەی بەست.

**كَعَمَ الخوفُ فلاناً**: ترسو بیم زمانی فلانكەسی بەست.

**كاعَمَها**: دەمی بەدەمیەوە نا، ماچی كرد، دەمی خستە سەر دەمی.

**الكِعامُ والكِعامَةُ**: ئەوەی دەمی حەیوانی پێ دەبەسترێ بۆئەوەی نەتوانێ گازبگرێ یان شت بخوا.

**كُعْنِبَ قَرْنُ التَّيْسِ**: شاخی نێرییەكە كەلكەلو بادراو بوو.

**الكاغِز**: كاغەز.

**كَفَأَ الإناءَ كَفْئاً**: قاپەكەی سەرنقوم كردەوە.

**كَفَأَ القومَ عن الشَّيْءِ**: خەڵكەكە ڕویان لەشتەكە وەرگێڕاو جێیان هێشت.

**كَفَأَ فلاناً**: فلانكەسی گێڕایەوە.

**اكفأ الإناءَ**: بەمانا (كَفَأ) دێ.

**اكْفَأَ في سيره**: لەڕێگای مەبەستو ڕێڕەوی خۆی لای دا.

**اكْفَأَ في الشعر**: لەشیعرەكەدا پیتی ڕەوی گۆڕی بۆ پیتێك كەلێی نزیك بێ لەدەنگو مەخرەج دا ٥ وەكوو گۆڕینی پیتی (ر) بۆ پیتی (ل) یان

بەپێچەوانەوە ٥ یان پیتی (ل) بکرێ بە (م).

**اكْفَأَ لونه**: ڕەنگی گۆڕا.

**اكفأَ له**: هاوكوفو هاوشانی بۆ دانا.

**اكْفَأَ الخِباءَ**: پەردەیەكی تری بۆ خێمەكە دانا ٥ پەردەیەكی ئیزافی یەدەگی بۆ خێمەكە دانا.

**اكْفَأَه علی الشَّیْئ**: پاداشی دایەوە لەسەر شتەكە.

**كافَأه بِصُنعه مكافأة وكفاءً**: پاداشی دایەوە لەسەر كردەوە باش و ڕەسەنەكانی.

**كافَأ فلاناً**: فلانكەسی یەكسان كرد بەهاوتای خۆی ٥ دەشكوترێ: (لنا ظُلّة نكافِئُ بها عین الشمس) ئێمە سێبەركەرێكمان هەیە بەرگری پێ دەكەین لەگەرمای خۆر.

**كَفَأ الإناءَ**: قاپەكەی سەرەو نقوم كرد.

**إكْتَفَأ لونهُ**: ڕەنگی گۆڕا.

**إكْتَفَأ الإناءَ**: قاپەكەی سەرەو نقوم كرد.

**إنْكَفَأَ علی الشَّیْئ**: خۆی بەسەر شتەكەدا شۆڕكردەوە.

**إنْكَفَأت علی ولده ترضعه**: خۆی بەسەر منداڵەكەیدا كۆم كردەوە شیری دەداتێ.

**إنْكَفَأ عنه**: ڕوی لێ وەرگێرا.

**إنْكَفَأ الیه**: بۆی گەڕایەوە.

**إنْكَفَأَ الی وطنه**: گەڕایەوە بۆ زێدی خۆی.

**إنْكَفَأَ لونه**: ڕەنگی گۆڕا.

**إنْكَفَأَ القومُ**: خەڵكەكە شكان و هەڵهاتن.

**تكافَأ الشیئان**: دوو شتەكە وەكوو یەك وابوون و هاوتابوون ٥ دەگوترێ: (تكافَأ القوم وتكافَأت الفرص).

**تَكَفَّأ لونه**: ڕەنگی گۆڕا.

**إسْتَكْفَأ شجرةً**: داخوازی ئەوە بوو درەختەكە ساڵێك بەری بداتێ.

**إسْتَكْفَأ فلاناً الشرابَ**: داوای لەفلانكەس كرد لەپیاڵەكەی خۆیەوە شەراب بكاتە پیاڵەی ئەمەوە.

**الكُفْءُ**: هاوشان ٥ مرۆڤی بەتوانا لەسەر بەڕێوەبردنی كارەكانی ٥ (ك: أكفاء وكِفاء).

**الكِفاءُ**: هاوشان ٥ دەگوترێ: (لا كِفاءَ له) هاو وێنەی نیە ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو پەردەیەی دەدرێ بەسەر چادردا تا سەرزەوی دایدەپۆشێ وەكوو چۆن پەشتەماڵ عەورەتی مرۆڤ دادەپۆشێ.

**الكَفاءَةُ**: هاوشان لەهێزو توانا و خانەوادەو وەجاخزادەیی دا، هەر

لەم ڕووەیە هاوکوفی کوڕو کچ بۆ هاوسەر گیری ڕەچاو دەکرێو دەڵێن: دەبێ کچوکوڕ هاوکوفی یەکتر بن لەبنەماڵەییو ئایینی دا ٥ لێهاتویی بۆ ئەنجامدانی کارو بەڕێوەبردنی کارەکانی بەشێوەیەکی ڕێكو پێك.

**الكُفْـأةُ**: (كفـأة الـشّيء) بەرهەمی سالآنەی شت.

**كُفْأةُ الأرض**: بەروبوومی کشتوکاڵی ساڵێکی زەوی ٥ بەرهەمی سالآنەی زەوی کشتوکاڵی ٥ (كُفْـأةُ الـشجر) بەرهەمی سالآنەی درەختی بەردار (كُفْـأة الغَـنَم) بەروبوومی مەڕ بەشیرو خوریو بێچوویەوە.

**الكَفِئ**: بەمانا (الكفوء) دێ.

**كَفَتَ الشَّيْئَ كَفْتاً**: شتەکەی هەڵەوگێڕ کرد.

**كَفَتَ الطائِرُ وغيره**: باڵندەکە لەفڕین دا پەلەی کردو باڵەکانی لێك دان.

**كَفَتَ فلاناً**: فلآنکەسی لەمەبەستی خۆی گێڕایەوە.

**كَفَـتَ الـشَّيْئَ واليه**: شتەکەی لەخۆی گرتو بۆلای خۆی کێش کرد.

**كَفَـتَ المتـاع**: کاڵاکەی کۆکردەوە هەندێکی خستە سەر هەندێکی.

**كفت ذيله**: داوێنی هەڵکرد.

**كفت الله فلاناً**: خودا گیانی فلآنکەسی کێشا.

**كَفَتَ الشَّيْئَ**: شتەکەی لەخۆگرت.

**كفـت الـدِرْعَ بالـسيف**: زرێیەکەی بەشمشێرەکەوە هەڵواسیو خستنیە پەنایەك.

**إكْتَفَت المالَ**: هەموو ماڵەکەی لەخۆ گرت ٥ جێگای هەموو ماڵەکەی تێدابۆوە.

**إنْكَفَت الرجلُ**: پیاوەکە جەستەی خۆی داڕشت.

**إنْكَفَت الفرسُ**: ئەسپەکە ورگی باریك بوو.

**إنْكَفَت الرجلُ**: پیاوەکە گەڕایەوە.

**إنْكَفَت القوم الى منازلهم**: خەڵکەکە گەڕانەوە بۆ شوێنو مەنزڵگای خۆیان.

**تَكَفَّتَ الثوبُ**: چاکی پۆشاکەکە هەڵدرایەوە.

**تَكَفَّتَ في سيره**: لە ڕۆیشتن دا پەلەی کرد خێرا ڕۆیی.

**الكِفَـاتُ**: (أرض كِفـات) زەوییەکە مردوو و زیندوی تێدا کۆبووەتەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا﴾ ٥ دەشگوترێ: (موضع كِفـات) شوێنێکە شتی زۆرو هەمەجۆری لەخۆ گرتووە.

**الكَفْتُ**: (رجل كَفْتٌ) پیاوێکی چوستو چالاکە.

**الكُفْتُ من الخيل**: ئەسپێك بازی بەهێزو توند بهاوێو سوارەکەی نەتوانێ جڵەوی بگرێتەوە.

**الكُفْتَةُ**: کفتە: خواردنێکە لەگۆشتی هەنجندراو و هەندێ تەوابیلو پیازو ساوەرو برویش یان برنج دروست دەکرێ.

**الكَفِيتُ**: رجل کفیت: پیاوێکی قەد باریكو چوستو چالاکە ٥ کوندەیەکی پتەو و ڕەختەیە.

**المُكْفِتُ**: کەسێك دوو زرێ بەسەر یەکدا لەبەر بکاو کراسێك لەنێوانیان دا لەبەر بکا.

**كَفَحَ الشَّيْئَ كَفْحاً**: پەردەی شتەکەی لادا خستیە بەرچاو.

**كَفَحَ فلاناً**: ڕوبەڕو توشی فلانکەس بوو.

**كَفَحَ بالعصا**: بەگۆچان لێی دا.

**كَفَحَ لجام الدابة**: هەوسارو جڵەوی وڵاخەکەی ڕاکێشا بۆئەوەی ڕایبوەستێنێ ٥ دەشگوترێ: (كَفَحَ باللجام).

**كَفِحَ عنه كَفْحاً**: ترسا.

**اكْفَحَ فلاناً عنه**: فلانکەسی گێڕایەوە.

**كافَحَهُ**: ڕوبەڕو تووشی بوو ٥ دەشگوترێ: (كافَحَ القومَ أعداءهم) خەڵکەکە بەسنگی روت ڕوبەڕوی دوژمنیان بوونەوە.

**كافَحَ قِرْنَهُ**: بەتوندیی ڕوبەڕوی ڕکابەرەکەی بۆوە.

**كافَحَ الأطباءُ الأمراضَ**: پزیشکەکان بەرەنگاریی نەخۆشییەکانیان کرد ٥ (کافحت الدولة البطالة) دەوڵەت بەرەنگاری بێ ئیشی بۆوە.

**كافَحَ الأمورَ**: بۆخۆی سەروکاری ئیشەکانی کرد.

**تكافح المقاتلون**: شەڕکەرەکان ڕوبەڕوی یەکتر بوونەوە.

**تكافح الأمواج**: شەپۆلەکان تێکیانەوە هاویشت.

**الكفيحُ**: هاوشان ڕکابەر ٥ ڕاکشاو، پاڵکەوتوو ٥ میوانی چاوەڕوان نەکراو ٥ میوانی ناوەخت.

**كفر الرجلُ كُفْراً وكفراناً**: پیاوەکە کافربوو، بڕوای بەتاكو تەنهایی خودا نەبوو یان بڕوای بەپێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد نەبوو یان بڕوای بەهیچ پێغەمبەرییەتێك نەبوو.

**كفر بهذا**: خۆی لەوە بێبەری کرد.

**كَفَرَ الشَّيْئَ وعليه كفراً**: شتەکەی داپۆشی.

**كَفَرَ الزارعُ البذر بالتراب**: کشتیارەکە تۆوەکەی بەگڵ داپۆشی، تۆوەکەی ژێر گڵ دا.

**اكفر غَيْرَهُ**: خەڵكانی دی بەكافر دانان ٥ بەكافری لەقەڵەم دان.

**اكفر من يطيعه**: گوێڕایەڵیەكەی خۆی واڵ كرد یاخی بێ.

**كَفَّرَ لسيده**: دەستی بەسنگیەوە گرتو سەری دانەواند بۆ گەورەكەی.

**كَفَّرَ عن يمينه**: كەفارەتی سوێندەكەی دا.

**كَفَّرَ الشَّيْئَ**: شتەكەی داپۆشی شاردیەوە.

**كَفَّرَ فلاناً**: فلاَنكەسی بەكافر لەقەڵەم دا ٥ یان پێی گوت كوفرت كردوە.

**كَفَّرَ الله عنه الذنب**: خودا لەتاوانی خۆش بوو.

**تَكَفَّرَ بالشيئ**: شتەكەی داپۆشیو شاردیەوە.

**تَكَفَّرَ في سلاحِهِ**: چووە ناو چەكو سیلاحی خۆیەوە، خۆی بەست.

**الكافِرُ**: بەرگی پۆخی خورماو میوە ٥ تاریكی ٥ زەوی چۆڵەوانیو دوردەست كە كەس لێی نەمێنێتەوەو پێیدا نەڕوا ٥ كەسێك خۆ لە شوێنێك حەشاربدا ٥ كەسێك بڕوای بە بوونی خودا نەبێ.

**الكافور**: درەختێكە لە پێری (الغارية) مادەیەكی ڕونی شەفافو بلوریی مەیلەو سپی لێ دەردەهێندرێ بۆنێكی عەتر ئامێزی خۆشی هەیەو تامی تاڵەو چەند جۆرێكی هەیە ٥ (ك: كوافير).

**الكَفْرُ**: تاریكایی شەو و ڕەشی شەو ٥ گۆڕ ٥ گڵ ٥ پارچە زەوییەك لەئاوەدانییەوە دوور بێ ٥ گوندی بچوك ٥ داری كورتو ئەستور ٥ (ك: كفور).

**الكُفْرُ**: ئینكاریكردنی ڕاستیو حەق ٥ قیر كە كەشتیو شتی وای پێ ڕوكەش دەكرێ.

**الكَفَرُ**: پەردەی پۆخی خورما ٥ كێوی درێژەوەبوو كە ڕێگای پێدابڕوا.

**الكَفَّارَةُ**: كەفارەتو قەرەبوو كردنەوەی تاوان بەماڵ بەخشینو تاعەت كردن كەلەشەرع دا دیاریی كراون.

**المُكَفَّرُ**: خاوەن چاكەو نیعمەت كەسوپاسگوزاری نیعمەتەكانی نەكرێ ٥ كەسێك بەلا لەنەفسی خۆی دا بێ یا لەماڵو سامانی دا بێ بۆئەوەی كەفارەتی هەڵەكانی بدا ٥ كەسێك چەكی لەخۆی دابێ ٥ چەكو سیلاحی لەخۆی بەستبێ ٥ دەستو پێ كەلەبچە كراو.

**المَكْفورُ**: (أثر مكفور) ئاسەوارێك ڕەشەبا گڵو خۆڵی بەسەردا دابێو

شاردبێتیەوە ٥ ژێر گڵو خۆڵی خستبێ ٥ (عمل مكفور) کارێکی باش کەچاکەی نەدرابێتەوە.

**كَفَّ عن الأمر كفّاً**: وازی لەکارەکە هێناو بەجێی هێشت.

**كَـفَّ بَـصَرُهُ**: بینـایی نـەما ٥ هـەروا دەگوترێ: (كُفَّ بَصَرُهُ) (فهو مكفوف).

**كَـفَّ الثوبَ**: جارێکی تـر قوماشـەکەی دوریيەوە، بەسەر دورمانەکەدا چۆوە.

**كَـفَّ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی پێکـەوە لکانـد، هەنـدێکی بـە هەنـدێکیـەوە نووسـاند ٥ دەگوترێ: (كَفَّ رِجْلَـهُ بخرقـة) بەپـەڕۆ قاچی خۆی بەست.

**إنْكَفَّ عن الأمر**: وازی لە کارەکە هێنا.

**تكافّوا**: خەڵکەکە هەنـدێکیان وازیـان لە هەندێکیان هێنا.

**تَكَفَّفَ السَّائلُ**: سواڵکەرەکە دەستی بۆ سواڵکردن پانکردەوە.

**تَكَفَّـفَ الـدَّمعُ**: فرمێـسکەکان وشـك بوون.

**تَكَفَّفَ عن الأمر**: وازی لەکارەکە هێنا.

**تَكَفَّـفَ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی بەبـەری دەست هەڵگرت.

**تَكَفَّفَ الناسَ**: سواڵی لەخەڵك کرد.

**كَفَّفَ الثوبَ بالحرير وغيره**: دامێنـی قوماشەکەی بەئاوریشم پەراوێزچـن کـــرد، سەردەســـتەو یەخـــەی کراسـەکەی پەراوێزچـن کـرد ٥ نەخـشی ئاوریـشمی لـەداوێنی کراسەکە دروست کرد.

**إسْـتَكَفَّ الـشَّيْئُ**: شـتەکە کەوانـەیی بـوو ٥ دەگـوترێ: (إسْـتَكَفَّ الحَيَّـةُ) مارەکـە پاپۆکـەی بەسـتو خـۆی خڕکردەوە.

**إسْتَكَفَّ الشجرُ والشعرُ**: درەختەکە یان مووەکان تێکچرژان.

**إسْـتَكَفَّ القـومُ الـشَّيْئَ وبالـشيئ**: خەڵکـــە لـــە دەوری شـــتەکە گردبوونـــەوە ٥ چـــەمبەرەیان لەدەوری شتەکە بەست.

**إسْتَكَفَّ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی بەدەست هەڵگرت.

**إسْتَكَفَّ النـاسَ**: دەستی لەخەڵك پـان کردەوە و داوای پارمەتی لێ کردن.

**إسْتَكَفَّ فلاناً عن الشَّيْئَ**: داوای لـە فلانکەس کرد واز لەشتەکە بێنێ.

**إسْـتَكَفَّ عَيْنَـه**: لەپەدەسـتی خـستە سـەر چـاوی لەبەرامبـەر تیـشکی خـۆردا بۆئـەوەی بزانـێ ئاخۆ شت دەبینـــێ یـــان نـــا ٥ دەشـــگوترێ: (إسْـتَكَفَّ الـشَّيْئَ) هـەوڵی بینینـی شـتەکەی دا واتـە: لـەپی دەسـتی خـستە سـەر بـرۆی وەکـوو ئـەوە سـێبەر لەچـاوی بکـا بۆئـەوەی کاریگـەری تیـشکی خـۆر کـەم بکاتـەوەو بتوانـێ شـتەکە ببینـێ

٥ دەشگوترێ: (إستَكَفَّت عينه) لەژێر لەپی دەستییەوە چاوی شتەکەی بینی.

**كافة**: هەموو ٥ دەگوترێ: (جاء الناس كافة) خەڵكەکە هەموویان هاتن.

**الكَفَافُ**: (كفاف الشَّيْء) بەئەندازەی شتەکە ٥ دەگوترێ: (كفاف هذا) بەئەندازەی ئەوە.

**الكَفَافُ من الرزق**: بژێوی پێویست بێ زیادو کەم ٥ دەگوترێ: (ليتني أخرجُ من هذا كفافاً) خۆزگە لەم کارەم دا بەبێ قازانجو زیان ڕزگارم بوایە ٥ (دَعْنِي كفافِ) وازم لێ بێنە وازت لێ دێنم.

**الكِفَافُ**: ئەوەی دەورەی شتێکی دابێ ٥ وەکوو دەوران دەوری گوێچکە.

**الكِفَافُ من الثوب**: پەراوێزو قەراغو بێجاخی قوماش.

**الكِفاف من السيف**: تیژایی شمشێر ٥ (ك: أكِفَّة).

**الكَفُّ**: بەری دەست، لەپەدەست بەپەنجەکانیشەوە ٥ (ك: كفوف وأكُفّ) ٥ قاچ ٥ لابردنی پیتی حەوتەمی زەنەدار وەکوو لابردنی پیتی (نون) لە (مفاعيلن وفاعلاتن).

**الكَفَفُ من الرزق**: بژێوی بێ کەمو زیاد.

**الكِفَّةُ**: هەرشتێك کەوانەیی بێ ٥ (كفة الميزان) تاکی تەرازو ئەو تاکەی کێشراوەکەی تێدایە یان تاکەکەی تری ٥ خاڵی دروستکراو بەکوتان ٥ تەڵە و داوی نێچیرەوان ٥ چاڵاییەك ئاوی تێدا کۆبێتەوە ٥ (الكُفَّةُ) دەوران دەوری کلك ٥ کاتی بەیەك گەیشتنی شەوو ڕۆژ لەبەرەبەیانا یان دەمەو ئێوارەو خۆرئاوابوون ٥ پەراوێزی هەر شتێك ٥ تۆپەڵاکی درەخت ٥ لای خواروی زرێ.

**كَفْكَفَ دَمْعَهُ**: جار دواجار فرمێسکی سڕین بۆئەوەی وشك ببنەوە.

**كَفْكَفَ فلاناً**: فڵانکەسی لەشتەکە گێڕایەوە.

**تَكَفْكَفَ عنه**: وازی لێ هێنا بەجێی هێشت.

**كَفَلَ فلان كفلاً وكفولاً**: فڵانکەس بەردەوام بەڕۆژو بوو. بڕیاری دا لەکاتی بەڕۆژوبوونی دا قسە لەگەڵ کەس نەکا ٥ دەشگوترێ: (كفل في صيامه) لەکاتی بەڕۆژوبوونی دا قسەی لەگەڵ کەس نەکرد ٥ نانی بێ پێخۆری خوارد.

**كَفَلَ الرجلَ وبالرجل**: بوو بەکەفیلی پیاوەکە، بەرعۆدەی بوو ٥ دەشگوترێ: (كفل المالَ) یان (كفل عنه المالَ لِغريمه).

**كَفَلَ الصغيرَ**: منداڵەکەی گەورەکرد بەخێوی کرد.
**اکفل فلاناً المالَ**: فلانکەسی کردە بەرعودەو کەفیلی ماڵەکە.
**اکفَلَ فلاناً مالَهُ**: ماڵو سامانەکەی دا بەفلانکەس بۆئەوەی چاودێری بۆ بکا.
**کافَلَهُ**: پەیمانی لەگەل بەست ٥ هاوسێیەتی کرد.
**کَفَّلَ فلاناً المالَ**: بەمانا (أکفل) دێ.
**کَفَّلَ فلاناً الصغیرَ**: فلانکەسی کردە کەفیلو چاودێری منداڵەکە.
**إکْتَفَلَ بالشيءِ**: شتەکەی خستە سەر لایەکی سمتی.
**إکْتَفَلَ البعیرَ**: بارگەنەیەکی خستە سەر پشتی حوشترەکەو ئەمجار سواری بوو.
**تَکَفَّلَ بالشيءِ**: شتەکەی خستە ئەستۆی خۆیو بەرعودەی بوو ٥ دەگوترێ: (تَکَفَّلَ بالدین) بەرعودەی قەرزەکەی بوو.
**تَکَفَّلَ البعیرَ**: بارگەنەی خستە سەر پشتی حوشترەکەو سواری بوو.
**الکَفَلُ**: سمتی ئادەمیزادو ولاخو ئاژەڵ ٥ (ك: أکفال).
**الکِفْلُ**: بەش ٥ هاوشانو هاو وێنە ٥ دەگوترێ: (ما لِفلان کِفْلُ) فلانکەس هاوشانی نیە ٥ هەروا وشەی (الکِفل) ناوە بۆ ئەو پارچە پەڕۆو لبادەی دەخرێتە سەر ملی گای جوتکردن لەژێرنیر بۆئەوەی نیرەکە ملی ئازار نەدا ٥ ئەو توكو کوڵکەی دوای ڕوتانەوەی توكو کوڵکی پێشوو سەر لەنوێ دەڕوتێتەوە ٥ کەسێك ئەركو نارەحەتی دەخاتە سەر کەسانی دیکە ٥ کەسێك لەسەر پشتی ئەسپ خۆنەگرێ.
**الکفیل**: هاوشانو هاو وێنە ٥ دەگوترێ: (ما لفلان کفیل) ٥ فلانکەس هاوشانی نیە ٥ بەرعودەو کەفیل.
**کَفَنَ الصُّوفَ کفناً**: خوریيەکەی ڕست.
**کَفَنَ المیتَ**: کفنی بۆ مردووەکە کرد، مردووەکەی کفن کرد.
**کَفَنَ الخُبْزَةَ**: نانەکەی ڕاداشتە سەر قولکە ئاگرەکە.
**کَفَّنَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (کَفَنَ) دێ.
**الکَفَنُ**: کفن؛ بەرگێکە لەمردووەوە دەپێچرێ ٥ (ك: اکفان).
**إکْفَهَرَّ الرجلُ**: پیاوەکە دەمو چاوی خۆی گرژ کردن.
**إکْفَهَرَّ اللیلُ**: شەوەکە تاریکی زۆر پەرەی سەند.
**إکْفَهَرَّ النجمُ**: ئەستێرەکە لەناو تاریکی زۆر بەهێزدا ڕوناکی دەرکەوت.

**المُكْفَهِرُّ**: هەرشتێك بکەوێتە سەر یەك ٥ هەوری پڕی چین لەسەر چین و ڕەش ٥ دەم و چاوی بێ شەرم و حەیا ٥ (عام مُكفَهِرٌّ) ساڵێکی گرانی و بێ بارانی.

**كفاه الشَّيْئُ**: شتەکە بەسی کردو شتی تری پێویست نەبوو ٥ (فهو كاف وكَفِيٌ).

**كفى فلاناً الأمْرَ**: لەجیاتی فلان کارەکەی ئەنجام دا ٥ دەگوترێ: (كفاه مؤنته) پێداویستی ژیانی ئەوی دابین کرد.

**كفى الله فلاناً فلاناً او شرّ فلان**: خودا فلانکەسی لەشەڕو داوی فلان پاراست.

**إكْتَفى بالشيئ**: بەشتەکە قنیاتی کردو پێویستی بەشتی تر نەبوو.

**إكْتَفَى بالأمر**: کارەکەی ئەنجام دا، پێی هەڵسا.

**تَكَفَّى النباتُ**: ڕوەکەکە درێژ بوو.

**إسْتكفاه الشَّيْئَ**: داوای لێ کرد لەشتەکە بەشی پێویستی بداتێ ٥ دەگوترێ: (إستَكْفيته الشَّيئَ فكفانيه).

**الإكتفاء الذاتي**: ئەوەیە هەرێمێك، دەوڵەتێك بەروبوومی خۆی پێداویستییەکانی دابین بکاو پێویستی بەهاوردەکردن نەبێ.

**الكُفْيُ**: ئەوەیە بەس بکا، پێداویستی دابین بکا ٥ دەگوترێ: (هذا رجل كِفْيُكَ من رجل).

**الكُفْيَةُ**: بژێوی تەواو، بژێوی کیفایەت ٥ دەگوترێ: (قنعتُ بالكُفْيَة) قنیاتم بە بژێوەکە کرد.

**كَوْكَبَ الحديدُ**: ئاسنەکە بریسکەی دا، ئاگری لێ بۆوە.

**كوكب الحصى**: بەردە وردەکان لەکێشتەنگاو دا بریسکەیان دا.

**الكَوْكَبُ**: بریسکەی ئاسن، یان بریسکەی بەردو ئاگر لێ بوونەوەیان ٥ پیاوکە چەك لەخۆی دەبەستێ ٥ گەنجی تازە پێگەیشتوو ٥ دەگوترێ: (غلام كوكب) گەنجێکی ڕوخسار جوانە ٥ زۆرینەی شت ٥ وەکوو دەگوترێ: (كوكب العشب) و (كوكب الماء) و (كوكب الجيش) ٥ هەروا وشەی (الكوكب) ناوە بۆ سپێنەی چاو ٥ بزمار ٥ شمشێر ٥ کێو ٥ گوڵی باخ ٥ کانگای ئاوی بیرو شوێنی ئاو هەڵقوڵانەکە ٥ قەترە قەترەی ئاو کە لەسەهۆڵ دەچۆڕێتە خوار بەشەو و دەکەوێتە سەر گیاو گژو پێیدا بڵاو دەبێتەوە وەکوو ئەستێرە ٥ دەشگوترێ: (ذهبوا تحت كل كوكب) پەرتەوازە بوون ٥

هــەروەها دەگــوترێ: (يـــوم ذو كواكب) ڕۆژێكى ڕەش‌و تاريك‌و پڕ بـەڵاو كارەسـات بـەجۆرێك كـەوەك شـەوەزەنگى لێ هـات‌و ئەسـتێرەى تێدا هەڵاتن.

**الكَوْكَـبُ:** لـەبوارى ئاسمانـشوناسى دا قەبارەيـەكى ئاسمانييـەو بـەدەورى خۆردا دەسوڕێتەوەو ڕوناكى لەخۆر وەردەگـرێ ٥ بـەناوبانگترين ئـەم ئەسـتێرە گەڕۆكانــە بــەگوێرەى نزيكيـان لـەخۆر: عـەتارد، زوهـرە، زەوى، مـەريخ، موشـتەرى، زوحـەل، يۆرانس، نبتۆن، بلۆتۆن.

**الكَوْكَبَـةُ:** ئەسـتێرە ٥ يـان ئەسـتێرەى زوهـــرە بەتايبـــەتى لـــەبوارى ئاسمانـــــشوناسى دا كۆمەڵـــــە ئەستێرەيەكن وێنەى شتێكيان پێك هێنـاوە و پێـى دەناسـرێن ٥ وەكـوو ئـەو كۆمەڵـە ئەسـتێرەيەى پێيـان دەگوترێ: (النـسر الواقـع) يـان ئـەو كۆمەڵـــە ئەســـتێرەيەى پێـــان دەگـوترێ: (النـسر الطـائر) ٥ هـەروا ناوە بۆ كۆمەڵە ئادەميزادێك.

**كَـلأ الـدينُ كَلْئـاً:** قەرزەكـە دواكـەوت ٥ (فهو كالٍ وكالِئ).

**كلأ بَصَرَهُ في الشَّيْءِ:** چـاوى بەشـتەكەدا گێـڕاو چـەند جارێـك چـاوى لێ لاداو سەيرى كردەوە.

**كَـــلأ الله فلانـــاً:** خـــودا پارێزگـــاريى فلانكەسى كرد.

**كَـلأ فـلان القـومَ:** فلانكـەس چـاودێرى گەلەكـــەى كـــردو ســـەرو كـــارى ئيشەكانيانى گرتە ئەستۆ.

**اكلأتِ الأرضُ:** زەوييەكە لـەوەڕى زۆر بوو.

**اكلأ في الدَّينِ:** قەرزەكەى دواخست.

**اكْلأ عَيْنَهُ:** چاوى ماندوو كرد.

**كالَأَهُ:** موراقەبەى كرد.

**كَلَّـأ فـلان:** پێـــشەكى (عـــەرەبونى) وەرگرت.

**كَلَّأ في الأمر:** بەسەرسامييەوە سـەيرى كرد.

**كَلَّأ إليـه في الأمـر:** فـەرمانى پێ كـرد بەئەنجامدانى كارەكە.

**كَلَّأ فلاناً:** فلانكەسى بەند كرد.

**كَلَّـأ السفينة:** كەشـتييەكەى لەكـەنار نزيك كردەوەو لەشوێنێكى لاباو بێ ترس دا وەستاندى.

**إكْتَلَأتْ عَيْنُهُ:** چاوى نەچوونە خـەو و شەو بەخەبەر بوو.

**إكْتَلَأ منه:** پارێزگارى لێ كرد.

**إكْتَلأت الكُلأةَ:** عەرەبوونى وەرگرت.

**تَكَلَّأ:** عەرەبوونى وەرگرت.

**إسْـــتَكْلأ فـــلان:** فلانكـــەس داواى دواخستنى قەرزەكەى كرد ٥ قەرزى

كــردو داواى كــرد درمنــگ داواى لێ بكەنەوە.

**إستَكْلأت الأرضُ**: زەوییەکە لـەوەڕی زۆر بوو.

**الكَـلأ**: لـەوەڕ ج تـەڕ ج وشـك ٥ (ك: أكلاء).

**الكُلأةُ**: عەرەبوون ٥ قەرز.

**الكلاّءُ**: بەندەری وەستاندنی کەشتی.

**الكَلُـوءُ**: دەگـوترێ: (رجــل كَلُــوءٌ) پیاوێکـە چـاوی بـەتوانان بـۆ شـەو بەخەبــەری‌و وەنــەوزی نایــەنێ ٥ (عـين كلـوءة) چاوێکە بـەهێزە بـۆ شەو بێداری.

**المَكْلَــأةُ**: شـــوێنێکە کەشـــتی تێـــدا ڕادەگیرێـــن‌و پـــەناو لاپایـــە بـــا نایگرێتەوە.

**كَلَبَ الفرسَ كَلْباً**: ئاوزەنگی لەئەسپەکە دان..

**كَلِـبَ الرجـلُ وغـيره**: پیاوەکــە ســەگ گەستی ٥ زۆری خـواردو تێرنـەبوو ٥ زۆری تینو بوو.

**كَلِـبَ الـشجَرُ**: درەختەکـە تینـوی بـوو لەتینوان گەڵاکەی زبر بوو، هەرکەسێ بەلای دا بڕوا بەجلەکانیەوە دەنوسێ.

**كَلِـبَ الـسَّيرُ علـى الأسير**: ڕۆیـشتنەکە کاریگەری زۆری لەسەر دیلەکە هەبوو زۆری شەکەت‌و ماندو کرد.

**كَلِبَ الدَّهرُ على اهله**: ڕۆژگار زۆر توندو تیژ بوو لەگەڵ خەڵکەکە ٥ دەگوترێ: (كَلِبَ العَدُوّ و كَلِبَ السائل).

**كَلِبَ على الشَّيْئِ**: زۆر سور بـوو لەسـەر وەدەستهێنانی شتەکە.

**كَلِبَ عليه**: ڕقی لێ هەڵسا.

**كُلِـبَ كَلاباً**: بـەهۆی نەخۆشـی هاریـەوە عەقڵی لەدەست دا.

**كالَبَهُ**: دژایەتی کرد.

**كَلَّبَ الأسير**: دیلەکەی کەلەبچە کرد.

**كَلَّبَ الكَلْبَ**: سەگەکەی ڕاهێنـا لەسـەر ڕاوکردن‌و نێچیرگرتن.

**تكالَـبَ القـومُ**: خەڵکەکـە بەئاشــکرا دژایەتی خۆیان ڕاگەیاند.

**تكالَبَ علـى الأمـر**: لەسـەر کارەکـەی سوربوو دەستی لێ بەرنەدا.

**تكالَبَ القومُ على الـشَّيْئِ**: خەڵکەکـە عــــەمبازی شــــتەکە بــــوون‌و گەلەکۆمەکێیان لەسەر کرد.

**إسـتَكْلَبَ الرجـلُ**: پیاوەکـە لورانـدی بۆئـەوەی سـەگەکان بیبیـسن‌و بـەو بۆنەوە شوێنی خێڵ‌و ئاوەدانیەکانی خاوەن سەگەکان بدۆزێتەوە.

**الكالِـبُ**: خـاوەن سـەگی ڕامکـراو بـۆ ڕاوکردن ٥ کۆمەڵە سەگ.

**الكَلْـبُ**: ســەگ ٥ ســەگ جــۆری زۆرە هەنـدێکی بـۆ پاسـەوانی‌و هەنـدێکی

بۆ ڕاو و هەندێکی بۆ ڕاکێشانی گالیسکە بەکاردێ ٥ هەروا وشەی (الکلب) ناوە بۆ هەر حەبل‌و تەل‌و قەیدێك شتی پێ شەتەك دەدرێ ٥ ئاسنی سەر گۆچانی کە بەقەراخ کەژاوەو بارگەنەدا شتەك دەدرێ‌و تێشو و شتی وای پێدا هەڵدەواسرێ ٥ سنگی دارینە کەلەدیوار دەکوترێ بۆ شت پێدا هەڵواسین ٥ ئاسنی سەربستەی بەرداشی ئاشی ئاویی ٥ ماسییەکە لەشێوەی سەگ.

**الکلَبُ**: نەخۆشییەکی پێوە چوو گواستراوەیە فایرۆسەکەی لەڕێگەی گەستن‌و لیکەوە لەپێری سەگەوە دەگوازرێتەوە بۆ مرۆڤو گیانلەبەری تر، دیاردەی ئەم جۆرە نەخۆشییە گرژبوونی ماسولکەی هەناسەدان‌و شت قوت دان‌و ترسان لەئاو و شێتی‌و تێکچوونی جیهازی عەصەبییە ٥ هەروا ناوە بۆ کوشەندەیی زستان‌و سەرماو زریانی.

**الکَلْبَةُ**: دێڵە سەگ ٥ چقڵ بەسەر لق‌و پۆپی درەختەوە ٥ (أم الکلبة) لەرزوتا.

**الکلبتان**: پلایسی گەورە کە ئاسنگەر ئاسنی سورەوەبووی پێ دەگرێ بۆئەوەی لەسەر سندانەکە بیکاتە ئامێری جۆراوجۆر ٥ گازێکە ددانی پێ دەکێشرێ.

**الکُلْبَةُ**: توندوتیژی لەهەر شتێك بێ ٥ گوزەرانی تەنگ‌و دەست کورتی ٥ قات‌وقڕی‌و گرانی ٥ سەرمای کوشندە ٥ ئەو موانەی لەم لاو لەولای لوتی سەگ‌و پشیلە دەڕوێن.

**الکَلِبَةُ**: (أرض کَلِبَة) زەوییەکە گیاو گژی تێراو نەبووبێ ٥ درەختێك لەتینوانا گەڵاکەی زبر بووبێ، ئەگەر بەلای دا بڕۆی بەپۆشاکەکەتەوە دەنووسێ.

**الکَلْبِیةُ**: مەزهەب‌و ڕاو بۆچوونێکە بەگوێرەی سروشت هەڵس‌و کەوت دەکاو گوێ بەداب‌و نەریت نادا ٥ ئەمەش مەزهەب‌و ڕێبازی (أنتستانس)و هەوادارانیەتی.

**الکَلْبیون**: ڕێڕەوانی کەلبیەن: کە کۆمەڵێك فەیلەسوفی یۆنانین، بە کۆمەڵی فەیلەسوفی ئەخلاقی ناسراون‌و دوای مردنی سوکرات پەیدابوون، گرنگترین بیروباوەڕیان لەژیانی زبرو پاشکوێ خستنی لەزەت‌و چێژی مادی دا ڕەنگ دەداتەوە، گاڵتەیان بەو کەسانە دێ کە وێڵی ژیانی نەرم‌و نۆڵ‌و هەوڵی وەدەستهێنانی لەزەتە مادییەکان دەدەن.

**الكَلاَّبُ**: خاوەنی سەگی ڕامکراو بۆ ڕاو ٥ بەخێوکردنی سەگی ئامادەکراو بۆ ڕاوکردن.

**الكُلاَّبُ**: نوکە ئاسن کە بەپاژنەی قۆنـدەرەو کلاشـی ئەسـپ ڕامکەرەکەوەن‌و کەسواری ئەسپەکە دەبیێ ئەو نوکە ئاسنە لەلاقە برغەی ولاغەکە دەدا بۆئەوەی غاربدا ٥ ئاسنێکی سەر چەماوەی سێپەل‌و چوارپەلە قولاپ ئاساشتی پیێ دەردەهێندرێ یان شتی پێدا هەڵدەواسرێ ٥ چنگ‌و نینۆکی بازو هەڵۆو چەقەڵ ٥ ئامێرێکی ددان کێشانە ٥ (ك: کلالیب).

**الكليب**: کۆمەڵە سەگ (ڕەوەسەگ).

**المكالِبُ**: ئازاو چاو نەترس.

**المَكْلَبَةُ**: (بلدة مَكْلَبَةٌ) ولاتێکە، گوندێکە سەگی زۆرە.

**كَلَتَ الشَّيْئَ كَلْتاً**: شتەکەی کۆکردەوە ٥ فرێی دا.

**كَلَتَ الفَرَسَ**: ئەسپەکەی تاودا.

**الكلْتَةُ**: شتی کەم ٥ بەشە خۆراك‌و شتی وا.

**كَلْثَمَ وَجْهُهُ**: دەموچاوی گۆشتن بوون بەبێ ئەوەی چرچی تێبکەون.

**الكلثومُ**: کوڵم خڕو گۆشتن ٥ ئاوریشم بەلای سەروی ئالاوە.

**كَلَحَ فلان كُلُوحاً**: فلانکەس ڕوگرژبوو، زۆر ڕوگرژبوو.

**اكْلَحَهُ الهمُّ**: خەم‌و خەفەت ڕوخساری پوکاندەوەو دەموچاوی چرچ‌و لۆچی تێکەوتن.

**كالَحَهُ**: بەکێشەو ڕوگرژییەوە بەرەو ڕوی بۆوە.

**كَلَّحَ وَجْهَهُ**: ڕوی خۆی گرژ کرد.

**كَلَّحَ في وجه الصَّبيّ**: منداڵەکەی ترساند.

**تَكَلَّحَ**: بەمانا (كَلَحَ) دێ.

**الكالِحُ**: دەگوترێ: (دَهْرٌ كالِحٌ) ڕۆژگاری توندو تیژ ٥ (شتاء كالِحٌ) زستانی سەخت‌و توش ٥ کەسێك زاری قـزبێ لێوەکانی ددانی دانەپۆشن.

**كَلاحِ**: ناوی ساڵی گرانی‌و قات‌و قڕییە.

**كَلَدَ الشَّيْئَ كَلْداً**: شتەکەی کۆکردەوەو خستیە سەریەك.

**كَلَّدَ الشَّيْئَ**: بەمانا (كَلَدَهُ) دێ.

**تَكَلَّدَ الشَّيْئُ**: شتەکە کۆبۆوە.

**تَكَلَّدَ فلان**: فلانکەس گۆشتی پتەو بوو.

**الكَلَدُ**: شوێنی توندو پتەو، زەوی پتەو بەبێ ئەوەی بەردی تێدابن.

**كَلَّزَ البازي**: هەڵۆکە خۆی لول کردو خۆی وێکهێنایەوە بۆ پەلاماردانی نێچیرەکەو فڕاندی‌و ڕفاندی.

**كَلَزَ الشَّيْئَ كَلْزاً**: شتەکەی کۆکردەوە.
**كَلَّزَ الشَّيْئَ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (كَلَزَ) دا دێ.
**كَلَّسَ البناء كَلْساً**: بەمادەی کەلس دیواری باڵەخانەکەی ڕوکەش کرد.
**كَلِسَ كَلَساً**: ڕەنگی تەپوتۆزاوی بوو مەیلەو ڕەش بوو ٥ (فهو أكْلَسُ).
**كَلَّسَ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (كَلَسَ)دا دێ.
**كَلَّسَ على قِرنه**: هەڵمەتی بۆ هاوشانو ڕکابەرەکەی بردو بەتوندوتیژی پەلاماری دا.
**كَلَّسَ عنه**: لێی ترساو لەبەری هەڵات.
**تَكَلَّسَ**: بۆ موتاوەعەی (كَلَّسَ) دێ ٥ بازی توندو بەهێزی دا.
**الكِلْسُ**: جیری بەرد؛ ئەو مادە ماوەی دوای گەرمکردنی بەردی جیری دەمێنێتەوەو هەندێ پێکهاتەی لێ دەردەکەوێ.
**الكلاّسُ**: فرۆشیاری مادەی کەلس ٥ وەستای کەلسکاری، ئەو کەسەی دیوارو شتی وا بەمادەی کەلس ڕوکەش دەکا.
**الكلاسَةُ**: ئەو شوێنەی کلسی لێ دروست دەکرێ.
**التَكلُّسُ**: لەبواری کیمیادا ڕەقبونو کۆبوونەوەی خوێی کالیسیۆمە کە ناتوێتەوە.
**الكلسيت**: مەعدەنێکە لەکاربۆناتی کالیسیۆمی بلوری پێك دێ.
**كَلْسَمَ**: قونگگرانی کرد لەدانەوەی مافەکان بەخاوەنەکەیان.
**الكلسيوم**: عونصورێکی فلزیو جیرییە تێکەڵاوی هەندێ پێکهاتەی جەستە دەبێ، بەتایبەتی هی ئێسقان.
**كَلِعَ الوسَخ عليه كَلَعاً**: چڵکەکەی بەسەرەوە کۆبۆوەو ڕەق بوو گەمرەی کرد ٥ دەگوترێ: (كَلِعَ رأسُه) (كَلِعَ الإناءُ) ٥ چڵك بەسەریەوە گەمرەی کرد ٥ قاپەکە چڵکی پێوە ڕەق بوو ٥ (كَلِعَت رِجْلُهُ) قاچی چڵکی پێوە ڕەق بوو شەقار شەقار بوو، قەڵشت.
**أكْلَعَةُ الوَسَخُ**: چڵکی لەسەر کۆبۆوە گەمرەی بەست.
**الكُلاعُ**: وشکبوونەوەی چڵكو گەمرەبەستنی ٥ نارەحەتیو چورتم.
**الكلاعِيُ**: ئازاو چاونەترس.
**الكَلَعُ**: گرویی زۆر.
**الكِلْعُ**: شێوە وشكو مرو مۆچ.
**كَلَفَ الماشية كَلْفاً**: ئالفی دا بەولاغو ئاژەڵەکان.
**كَلِفَ وَجْهُهُ كَلَفاً**: دەمو چاوی پەڵەی تێدا پەیدا بوو تەڵخ بوو (فهو أكلف وهي كَلْفاء).

**كَلِفَ الشَّيْئَ وبه**: حەزی لەشتەکە بوو، ئارەزۆی کرد.

**كَلِفَ الأمْرَ**: بەزۆرەملێو ناچاری چووە ژێر کارەکەو لە ئەستۆی گرت ◊ بەناڕەحەتیو ئەرکی زۆر ئەنجامی دا.

**اكْلَفَهُ بِه**: وای لێ کرد وەگری بێ، حەزی لێ بکا.

**كَلَّفَهُ امْراً**: ئەنجامدانی کارەکەی لەسەر پێویست کرد ◊ کارێکی قورسو ناخۆشی خستە ئەستۆیو داوای لێ کرد ئەنجامی بدا.

**كَلَّفَ على اسمه ارضاً**: زەوییەکی لەسەر تۆمار کرد.

**كَلَّفَ بالأمر**: کارەکەی خستە ئەستۆی.

**تَكَلَّفَ**: خۆی بەکاری لاوەکی خەریك کرد، کارێکی خستە ئەستۆی خۆی کە ئیشی ئەو نیە.

**تَكَلَّفَ الأمْرَ**: بەزۆرە ملێو ناچاری کارەکەی لەئەستۆ گرتو بەماندوبوونو ناڕەحەتی ئەنجامی دا.

**تَكَلَّفَ الشَّيْئَ**: شتەکەی خستە سەر شانی خۆیو ئیشی ئەویش نیە.

**التَّكليفُ بالأمر**: کارخستنە ئەستۆی کەسێك کەبتوانێ ئەو کارە ئەنجام بدا ◊ (أمر التّكليف) فەرمانێکە لە کەسێکەوە دەردەچێ کە دەسەلاتی ئەوەی هەیە ئەرك بخاتە سەر شانی فەرمان پێکراو.

**التُّكْلِفَةُ**: ئەركو ماندوبوون ◊ دەگوترێ: (حملت الشّيْئَ تكلِفَة) کارەکەم خستە ئەستۆی خۆم بەئەركو ماندوبوون ئەنجامدانەکەی لە وزەی من بەدەربوو ◊ هەروا ناوە بۆ ئەو بڕە پارەی لە پڕۆژەیەك دا خەرج دەکرێ بەبێ لەبەرچاوگرتنی قازانج ◊ دەگوترێ: (باعه بسعر التكلِفَة) بەنرخی تێچوونی شتەکەی فرۆشتو قازانجی مەبەست نەبوو.

**الكَلَفُ**: پەڵەو خاڵو شتی وا کەلەسەر ڕوخسار دەردەکەون ◊ سوراییی یان لێڵی کە لەسەر دەموچاو دەردەکەون ◊ پەڵە.

**الكلِفُ**: پیاوی عاشقو شەیداو دێوانە.

**الكُلْفَةُ**: ڕەنگێکە لەنێوان ڕەنگی ڕەشو سوردایە ◊ ئەو بڕەپارەی لەبەدی هێنانی شتێك دا خەرج دەکرێ.

**الكلّافُ**: کەسێکە ئەرکی ئالفدانی ئاژەڵی لەئەستۆ بێو ئاژەڵ بەخێوبکا (ئاژەڵدار).

**الكلوف**: کاری قورسو گران.

**المُتَكَلِّفُ**: کەسێك بەشێوەی ناواقیعی خۆی نمایش بکا لافی شتێك لێ بدا کە تێیدا نەبێ.

**المِكلافُ**: دڵدار، کەسێك ڕەگەزی مێینەی زۆر خۆش بوێ (پیاوی ژنانی).

**المكلَّفُ**: مرۆڤێك باڵغو ڕەشید بێ تەمەنی گەیشتبێتە ئەندازەیەك لەڕوی شەرعو یاساوە بەرپرسیار بێ ٥ کەسێك خۆ هەڵەو گیری کاری لاوەکی بکا.

**المُكلَّفَةُ**: دیاریکردنی ڕوبەری زەوی تایبەت بەهەر کشتیارێكو ڕونکردنەوەی ئەو دانەوێڵەو بەروبومەی تێیدا دەچێندرێ.

**الكُلاكِلُ**: کورتە باڵای چوارشانەو مل ئەستور.

**الكلكال والكَلْكَلُ**: سنگ.

**الكِلْكِلَةُ**: تاقمو پێڕو کۆمەڵ ٥ (ك: كَلاَكِل)

**كَلَّ كلولاً وكلالةً**: ماندوبوو، لاواز بوو، کول بوو ٥ دەگوترێ: (كَلَّ السَيْفُ) شمشێرەکە کولو نەبڕ بوو.

**كَلَّ فلان**: فلانکەس ماندوبوو ٥ (فهو كالٌ) ٥ دەگوترێ: (كَلَّ لسانُهُ وكَلَّ بصره) زمانی گیراو نەیتوانی بەباشی قسەکەی بکا، چاوی باش نەبینی ٥ (كَلَّت الريحُ) بایەکە زەعیف بوو.

**كَلَّ عن الأمر**: شتەکەی لەسەر شان قورس بوو.

**كَلَّ كلاً وكَلاَلَةً**: بنەچەو نەوەی میراتگری لەدواجێ نەما یان میراتگری باوك یان منداڵو نەوەی نەبوو.

**اكَلَّ فلان**: فلانکەس ئەسپەکەی ماندوبوو.

**اكَلَّ غَيْرَهُ**: غەیری خۆی ماندو و لاواز کرد ٥ دەگوترێ: (أكلَّ الرجلُ فَرَسَهُ وأكَلَّهُ السيرُ).

**كَلَّلَ السيف وغيره**: شمشێرەکەی زۆر کولو نەبڕ کرد.

**كَلَّلَ فلان**: فلانکەس ڕۆیی‌و ماڵو منداڵی خۆی لەشوێنی نەگونجاو جێ هێشت.

**كَلَّلَ في الأمر**: لەکارەکەدا دڵسۆزی نواندو خۆی تێدا ماندوکرد.

**كَلَّلَ عن الأمر**: لەکارەکەدا دەغەڵی کردو نەیکردو لێی ترسا.

**كَلَّلَ عليه بالسيف**: بەشمشێر هەڵی کوتایە سەر.

**كَلَّلَ فلاناً**: تاجی خستە سەر سەری فلانکەس.

**كَلَّلَ الشَيْءَ**: شتەکەی بەگەوهەرو شتی وا ڕازاندەوە.

**إكْتَلَّ الغمامُ بالبرق**: هەورەکە بروسکەی دا ٥ دەگوترێ: (أكْتَلَّ السحابُ عن البرق).

**إنْكَلَّ السيف:** شمشێرەکە تیژایی نەما، کول بوو.

**إنكَلَّ فلان:** فلاَنکەس پێکەنیو زەردەخەنەی هاتێ.

**إنْكَلَّ البرقُ:** بروسکەی هەورەکە هێواش بوو ٥ دەشگوترێ: (إنْكلَّ السحابُ عن البرق).

**تَكَلَّلَ الشَّيْئَ بالشيئ:** شتەکە بەدەوری شتەکە خەرمانەی داو وەکوو تاج چۆن سەر لەخۆ دەگرێ ئەویش ئاوا شتەکەی دەورەدا ٥ دەشگوترێ: (تَكَلَّلَ الشَّيْئُ الشَّيْئَ).

**الإكْليلُ:** تاج ٥ شتێکە دەورەی سەر دەداو بەگەوهەرو شتی وا دەرازێندرێتەوە ٥ دەوران دەوری نینۆك ٥ کۆمەڵێك گوڵی ڕەنگاوڕەنگ لەسەر شێوەی تاج ڕیك دەخرێنو دەخرێنە سەر سەر بۆ جوانیو ڕازاندنەوە.

**إكليل الجبل:** ڕووەکێکی گیاییە لەبواری پزیشکی دا سوودی لێ وەردەگیرێ ٥ پێشی دەگوترێ: (حصى لبان).

**الكلالة:** ئەوەیە مرۆڤێك بمرێ نەباوکی لەدوا جێ مابێ نە منداڵ ٥ خزمەکانی تری میراتی لێ بگرن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ﴾.

**كُلّ:** هەموو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾ یان دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾.

**الكلّ:** کەسێك نەباوکی لەژیان دا مابێ نەمنداڵی هەبن ٥ کەسێك ئەرکی لەسەر کەسانی دیکە بێو باربێ بەسەریانەوە ٥ پیاوی لاوازو هیچ لەبارانەبوو ٥ پشتی چەقۆ و شمشێر ٥ پەردە کوللە ٥ پەردەیەکی تەنك بۆ خۆپاراستن لە مێشولەو شتی وا.

**الكليلُ:** زەعیفو ماندوبوو ٥ دەگوترێ: (رجل كليل الظُّفْرِ) (ذئب كليل) گورگێکە ناتوانێ پەلاماری کەس بدا.

**المُكِلُّ:** دەگوترێ: (أصبح فلان مُكِلّاً) فلاَنکەس خزمەکانی بوونە بار بەسەرەوە ٥ (إنطلق مُكِلاًّ) ڕۆیشتو گوێی بەوە نەدا چی لەدواوە جێ ماوە.

**المُكَلَّلُ:** (غمامٌ مُكَلَّلٌ) هەورێکی بارانـاوی کەچەند هەورێکی تر بەدەورییەوە بن ٥ (سحاب مُكَلَّلٌ) هەوری بروسکاوی.

**المكلَّلَةُ:** (روضة مُكلَّلَةٌ) باخێکە دەورە دراوە بە گوڵو غونچە.

**كَلَمَهُ كَلْماً**: برینداری کرد ٥ (فهو مكلوم وكليم).

**كالَمَهُ**: قسەی لەگەڵ دا کرد.

**كَلَّمَهُ تكليماً**: ئاخاوتنی ئاڕاستە کرد ٥ بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (كَلَم)دا دێ.

**تَكَالَمَ المتقاطعان**: دوو مرۆڤە لێك دابڕاوە (لێك زویربووەکە) دەستیان کردەوە بە قسەکردن لەگەڵ یەکتری.

**تَكَلَّمَ**: قسەی کرد ٥ دەگوترێ: (تَكَلَّمَ كلاماً وبكلام حسن).

**التَّكلامُ والتِّكلامةُ**: قسەی بەنرخو چاكو زۆر.

**الكلام**: دەنگێکی مانا بەخشو موفید بەجۆرێك گونجاو بێ لەسەری بوەستی.

**الكَلْمُ**: برین ٥ (ك: كلوم وكِلام).

**الكَلِمَةُ**: وشە کە مانایەکی تاك بگەیەنێ.

**الكَلِيمُ**: ئەو کەسەی قسەت لەگەڵ بکا ٥ نازناوێکی حەزرەتی موسایە سەلامی خودای لێ بێ، چونکە پەروەردگار ئاخاوتنی لەگەڵدا کردووە.

**الكِلِمُ**: لباد؛ ڕاخەرێکی ئەستوورە لە خوری دروست دەکرێ.

**المُتَكَلَّمُ**: شوێنی قسە لەسەر کردن ٥ دەڵێی: (ما أجِدُ لي مُتَكَلَّماً).

**كَلاهُ كَلْياً**: گورچیلەی توشی ئازار بوو ٥ زەبری لەگورچیلەی داو ئازاری بوو.

**كَلِيَ كلىً**: گورچیلەی تووشی ئازار بوو ٥ گورچیلەی هێشا.

**كَلَّى الرجلُ**: پیاوەکە هاتە شوێنێك پەردەی تێدا بوو.

**إكْتَلى الرجلُ**: پیاوەکە گورچیلەی هێشا.

**الكُلْيَةُ**: گورچیلە ٥ پێشی دەگوترێ: (الكُلْوَةُ).

**كُلى الطائر**: چوار پەڕن بە تەنیشتی باڵندەوە کەوتونەتە کۆتایی باڵەکانی.

**كِلاَ**: ئیسمێکی مەقصورە هەمیشە ئیزافە دەکرێ ٥ مانای دووانی دەگەیەنێو وشەکە موفرەدە ٥ بەدوو شێوە لەڕستەدا بەکاردەهێندرێ:

١- ئیزافە بکرێ بۆلای ڕاناو وەکوو (جاء الرجلان كِلاهما).

٢- ئیزافە بکرێ بۆلای ئیسمی زاهیر وەکوو (جاء كِلا الرجلين).

**كِلتا**: بۆ مێینەی (كِلا) بەکاردەهێندرێ.

**كَلاَّ**: نەخێر وانیە ئیشەکە بەشێوەیەکی ترە ٥ وەکوو (كلاّ إنّ مَعِيَ ربي سيهدين)

ە ڕەتدانەوەو نەفی كردنی شتێك‌و چەسپاندنی شتێكی تر: وەكوو ئەوە نەخۆش بڵێ: ئاوم خواردۆتەوە، پزیشك بڵێ: (كَلاّ بل شربت لبناً) نەوەالله ئاوت نەخواردۆتەوە شیرت خواردۆتەوە.

**كَمْ**: چەند؟ یان زۆر.

**كَمَا القومَ كَمْئاً**: قاچكی دەرخواردی خەڵكەكە دا.

**كَمِئَ كَمْئاً**: پێ خاوس بوو.

**كَمِئَتْ يده ورِجلُهُ من البرد**: دەست‌و قاچی بەسەرماو بەفر قەڵشان وەكوو قارچك شەقار بوون.

**كَمِئَ عن الأخبار**: لەهەواڵەكە بێ ئاگا بوو.

**اكْمَا المكانُ**: شوێنەكە قارچكی زۆر بوو كارگاویی بوو.

**اكْمَأ القومَ**: كارگی دەرخواردی خەڵكەكە دا.

**اكْمَاتِ السنُّ فلاناً**: ڕۆژگار فلانی پیر كرد.

**تَكَمَّات عليه الأرضُ**: زەوی داپۆشی ە دەگوترێ: (خرجوا يتكَمَّؤون) ڕۆیشتن بۆ دەشت قاچك دەچنن ە یان دەگوترێ: (تَكَمَّانا في أرض بني فلان) لەزەوی خێڵی فلان دا قارچكمان چنی.

**الكَمْءُ**: قاچك، كارگ، جۆرە فیتریاتێكە لەزەوی دەدرێ پاك دەكرێ‌و دەكوڵێندرێ‌و دەخورێ.

**الكَمَّاءُ**: قاچك فرۆش ە قاچك چن.

**المَكْمَأُ**: شوێنێك كارگی زۆر بێ.

**الكُمْبِيالَة**: كومپیالە (قەواڵە).

**كَمَتَ الفَرَسُ كماتَةً وكَمتَةً**: ئەسپەكە ڕەنگی شێ بوو (ڕەنگی لەنێوان ڕەش‌و سوردایە).

**اكمت الفرسُ**: ئەسپەكە ڕەنگی شێ بوو.

**كَمَّتَ الثَّوْبَ**: قوماشەكەی بەڕەنگی سوری مەیلەو ڕەش ڕەنگ كرد.

**إكْمَتَّ الفَرَسُ**: بەمانا (أكمت) دێ.

**الكُمْتَةُ**: ڕەنگی ڕەش ڕەنگی سووری تێكەڵاو بووبێ.

**الكُمَيتُ**: ئەسپێكە ڕەنگی لەنێوان ڕەش‌و سوردایە.

**كَمْتَرَ**: بەشێوەی شەقاو هاویشتنی كورت ڕۆییشت.

**كَمْتَرَ الشيئَ**: شتەكەی پڕكرد.

**كَمْتَرَ القِرْبَةَ**: دەمی كوندەكەی بەبەنەكە بەست.

**الكُمَّثْرى**: درەختێكی بەردارو گوڵدارە زۆر جۆری هەیە پێشی دەگوترێ: (الإنجاص).

**كَمَحَ الدَّابَّةَ باللجام كَمْحاً**: جڵەوكێشی ولاخەكەی كرد ە جڵەوی ولاخەكەی

بۆ دواوە توند کرد بۆئەوەی بەخێرایی نەڕوا یان بیوەستێنێ یان سەری بەرز بکاتەوە.

**اَكْمَحَ الكَرْمُ**: دارمێوەکە پۆخی کردو خەریکە گەڵا بکا.

**اَكْمَحَ الدَّابَّةَ**: جڵەوکێشی وڵاخەکەی کرد.

**اُكْمِحَ فلان**: فلانکەس بەهۆی تەڕدەماخییەوە سەری بەرزکردەوە.

**الكامِحُ**: ئەو کەسەی ئەسپو وڵاخە بەرزە ڕام دەکا بۆ سواربوونو بارهەڵگرتنو جوتکردن ◊ (ك: كَمَحَةٌ).

**الكَوْمَحُ**: کەسێکە ددانی دەمی پڕ دەکەن، بەجۆرێك ناتوانێ لەسەر خۆ قسە بکاو بدوێ ◊ دەگوترێ: (فَمٌ كومح) دەمێکە پڕە لەددانی گەورە ◊ (رجل كَوْمَحٌ) پیاوێکە سمتی گەورەن.

**كَمَخَ بانفه كَمْخاً وكماخاً**: لوتبەرزی نواند، فیزی کرد.

**كَمَخَ الفَرَسَ باللجام**: جڵەوکێشی ئەسپەکەی کرد.

**اَكْمَخَ الرجلُ**: پیاوەکە لوتبەرزی نواند فیزی کرد، خۆی بەزل زانی.

**اَكْمَخَ الكرمُ**: دارمێوەکە پۆخی کردو خەریکە گەڵا بکا.

**الكامَخُ**: پێخۆر، یان ترشو زەڵاتەو شتی وا کە ئیشتیهای خواردن دەکەنەوە ◊ (ك: كوامِخ).

**كَمَدَ لونه كَمَداً**: ڕەنگی گۆڕاو ڕەونەقی نەما ◊ (فهو كامِدٌ).

**كَمَدَ القَصَّارُ الثوبَ كَمْداً وكموداً**: جل شۆرەکە کراسەکەی بەکوتکی جل شۆرین کوتا ◊ (فهو كامِدٌ).

**كَمِدَ فلاناً**: پەڕۆی گەرمی لەسەر شوێنی هاوساوی فلانکەس دانا بۆئەوەی ئازارەکەی لابەرێ.

**كَمِدَ الشَّيْئُ كَمَداً**: ڕەنگی گۆڕا.

**كَمِدَ الرجلُ**: پیاوەکە خەمو خەفەتی خۆی شاردەوە ◊ یان زۆر خەفەتبار بوو.

**اَكْمَدَ الحُزْنُ فلاناً**: فلانکەسی غەمبار کرد.

**اَكْمَدَ الغَسَّالُ او القَصَّارُ الثوبَ**: جل شۆرەکە یان جل کوتەکە کراسەکەی باش پاك نەکردەوە.

**اَكْمَدَ العُضْوَ**: ئەندامی جەستەی بەپەڕۆی گەرمکراو داخ کرد.

**كَمَّدَ العُضْوَ**: بەمانا (أَكْمَدَهُ) دێ.

**الكِمادُ والكِمادَةُ**: پەڕۆیەکە گەرم دەکرێو لەسەر شوێنی هاوساو دادەنرێ.

**الكُمْدَةُ**: گۆڕانی ڕەنگو نەمانی ڕەونەقی.

مكواة
كير
كوب
كمنجة
كلبتان
كلبتان
كمّاشة
كوفيّة
إكليل
كعب أو مكعّب
كمام
كنانة
كلية
إكليل دائريّ
كفّ
كور
مكنسة
كفل الدابّة
كعب
كمأة
كينا
كافور
كستنة الحصان
كاميليا
كاكاو
كوكة
كستنة
إكليل الجبل
كاكي
إكليل الملك
كشمش
كوسا
كشوث
كولا
كولان
أنكليس
كمّون
كندور
كلب
كلب الماء
كناريّ

**الكِمْـرُ مـن البـسر**: خورمایەكـە بەدارەكەیـەوە شـیرین نـەبوبێ بەڵكوو كەوتبێتە خوارەوەو لەسەر گڵ شیرین بووبێ.

**كَمَزَ الشَّيْئَ كَمْزاً**: شتەكەی لەناو دەستی دا خرِهەڵدا ◦ دەگوترێ: (كمز العجينَ) هەنگوتكە هەویرەكەی خرِهەڵدا.

**الكُمْـزَةُ**: هەرشتێك بەسەری پەنجە هەڵبگیرێ ◦ پارچە خورمای پێكەوە نووسـاو، گرِموڵـە كـراو ◦ كۆمەڵـە لمو گڵ.

**كَمَسَ كموساً**: گرژ بوو.

**كَمَشَ الزاد كَمْشاً**: تێشوەكە تەواو بوو.

**كَمَـشَ فلانـاً بالـسيف**: ئەنـدامی فلانكەسی بەشمشێر برِین.

**كَمِشَ في أمره كَمَشاً**: لەكردنی كارەكەیدا پەلـەی كـردو سـووربوو لەسـەر ئەنجامدانی.

**كَمُـشَ في السير وغيره**: لـە رِۆیـشتن دا پەلەی كرد.

**كَمُشَ الرجلُ**: پیاوەكە ئازاو چاونەترس بوو ◦ (فهو كميش).

**كَمُـشَت المـرأةُ**: ئافرەتەكـە مـەمكی بچوك بوون.

**كَمُـشَت الناقـةُ**: حوشـترەكە گـوانی بچوك بوون.

**اكْمَشَ في السير وغيره**: لە رِۆیشتن دا پەلەی كرد ◦ دەشگوترێ: (أكْمَشَهُ) پەلەی پێ كرد.

**كَمَّشَ الحـادي الإبلَ**: حوشـترەوانە گۆرانی بێژەكە (حودیە خوێنەكە) دەنەدەنی حوشترەكانی دا بۆ خێـرا رِۆیشتن.

**كَمَّشَ فلاناً**: پەلەی لەفلانكەس كرد.

**كَمَّشَ ذَيْلَهُ**: داوێنی هەڵكردن.

**إنْكَمَشَ الفَرَسُ في سَيْرِه**: ئەسپەكە لە رِۆیشتن دا پەلەی كرد.

**إنْكَمَـشَ الجلدُ**: پێستەكەی گـرژ بـوو وێكهاتەوە.

**تَكَمَّشَ**: بەمانا (إنْكَمَشَ) دێ.

**الأكْمَشُ**: كەسێك چاوی نەبینێ ◦ قاچ كورت.

**الإنكِمـاش**: كـەمبوونی پـارە لـەناو بـازارِدا ◦ (كـەمبوونی سـیولەی نەقدی).

**الكَمْشُ**: گوانی بچوك و كورت.

**الكَمْشَةُ مـن الإنـاث**: مێینـەی گـوان بـچوك (مـەمك چـكۆلە) (خُـصْيَة كمش) گونكورت و گون بچكۆلە.

**الكَمَّاشَـةُ**: گاز كە بزمارو شتی وای پێ دەردەهێنـدرێ.

**الكمـيشُ (رجـل كمـيش الإزار)**: پیـاوێكی داوێـن هـەڵكراو، چـاك و

دامێن هەڵگراو، دڵسۆزو جیدی لە ئیشکردن دا.

**كَمَعَ فِي الإناء كَمْعاً**: دەمی خستە ناو قاپە ناوەكەو دەمی تێناو ئاوی خواردەوە.

**كَمَعَ الرجلُ وغيره في الماء**: پیاوەكە چووە ناو ئاوەكە.

**كَمَعَتْ الدَّابَّة**: وڵاخەكە بەهێواشی‌و لاوازیی ڕۆیی.

**كَمَعَ قوائمَ الدابة**: قاچی وڵاخەكەی بڕیەوە.

**كامَعَ المرأةَ**: ئافرەتەكەی خستە لای خۆی‌و پاراستی.

**الكِمْعُ**: ڕاكشاوو پاڵكەوتوو ٥ دەگوترێ: (فلان في كِمْعِهِ) فلانكەس لەناو ماڵی خۆی دا ٥ زەوییەك چواردەوری بەرزبێ‌و ناوەڕاستی نزم بێ ٥ ئەملاو ئەولای دۆڵ‌و شیو.

**الكمعُ**: پیاوی بێ هەڵوێست.

**الكميعُ**: ڕاكشاوو پاڵكەوتوو ٥ دەگوترێ: (بات السيف كميعي).

**المُكامِعُ**: كەسێك زۆر لێت نزیك بێ‌و ئاگاداری هەموو شتێكت بێ.

**كمْكَمَ الشَّيْئَ**: شتەكەی شاردەوە.

**تَكَمْكَمَ في ثيابه**: بەپۆشاكی خۆی خۆی داپۆشی.

**الكَمْكامُ**: پیاوی كورتەباڵای تێكسمڕاو ٥ توێكڵی دارەبەن.

**كَمَلَ الشَّيْئَ**: شتەكەی تەواو كرد.

**إكْتَمَلَ الشَّيْئُ**: شتەكە تەواو بوو.

**تكامَلَ الشَّيْئُ**: وردە وردە شتەكە تەواو بوو.

**إسْتَكْمَلَ الشَّيْئَ**: شتەكەی تەواو كرد.

**التكامُلُ في الأقتصاد**: بریتییە لە كۆبوونەوەی چەند جۆرە بوارێكی ئابوری لە وڵاتێك دا و تەواوكەرو هاریكاری یەكتر بن بۆ مەبەستی سەرەكی ئەو وڵاتە.

**التَّكْمِلَة**: تەواوكەری شتی تر.

**الكامِلُ من الرجال**: كەسێكە ڕەوشتی بەرزی تێدابن ٥ هەروا ناوە بۆ بەحرێكی عەروزی شیعر كە كێشەكەی شەش جار (متفاعلن)ە.

**الكَمَلُ**: بەمانا (الكامِلُ) دێ ٥ دەگوترێ: (أعطاه حقه كَمَلاً).

**المِكْمَلُ**: پیاوێك ڕەوشتی خێر یان هی شەڕی زۆر تێدابن.

**كَمَّ الناسُ كمّاً وكموماً**: خەڵكەكە كۆبونەوە.

**كَمَّ الشَّيْئُ كمّاً**: شتەكەی داپۆشی پەردەی پێدا دا.

**كَمَّ الدنَّ**: سەری كوپەكەی بەست، گرتی.

**كَمَّ الشهادَةَ**: شایەتییەكەی شاردەوە.

**كَمَّ البَعيرَ**: دەمی حوشترەكەی بەست ٥ دەمبێنی لەسەر دەمی حوشترەكە دانا.

**اكَمَّت النخلة**: دارخورماكە پۆخی كردو خەریكە بەرسیلەی دەربكەوێ.

**اكَمَّ قَميصَهُ**: دوو قۆڵی بۆ قوماشەكە دروست كرد.

**كَمَّمُ النَخْلَةُ**: بەمانا (أكَمَّت) دێ.

**كَمَّمُ الشَيْئَ**: شتەكەی داپۆشی، زاركی بەست.

**كَمَّمَ النخلة**: خورماكەی داپۆشی بۆئەوەی پێ بگاو شیرین بێ.

**كَمَّمَ الدَنَّ ونحوه**: كوپەكەی داپۆشی، زاركی هاختنی ٥ زاركی كوپەكەی سواخ دا، قوڕ بەستی كرد.

**كَمَّمَ فَمَ الحيوان**: دەمبێنی كردە دەمی ئاژەڵەكە.

**كَمَّمَ القميصَ**: قۆڵو فەقیانەی بۆ كراسەكە دروست كرد.

**تكَمَّمَ بثيابه**: بەپۆشاكەكەی خۆی داپۆشی.

**الكِمامُ**: ئەو شتەیە دەكرێتە دەمی حوشتر وەكوو لغاو و دەمبێن بۆئەوەی شتی بۆ نەخورێ ٥ یان نەتوانێ گازبگرێ ٥ مێش ڕەتێن؛ شتێكە كونكونەو لای خواروی ڕیشاڵ ڕیشاڵە دەكرێتە سەری ولاخ بۆئەوەی مێشو مەگەز لەخۆی دووربخاتەوە.

**الكِمامَةُ**: بەمانا (الكِمامُ) دێ ٥ پۆخی هێشوە خورما ٥ پەردەی غونچە ٥ ئەو مێش ڕەتێنەی دەكرێتە سەروی لوتی گوێدرێژو حوشتر بۆئەوەی مێشو مەگەز نەتوانن ئازاریان بدەن ٥ (ك: كمائم).

**الكُمُّ**: قۆڵی كراسو كەواو پاڵتۆ كەدەستی لێوە دێنەدەر ٥ (ك: أكمام وكِمَةٌ) ٥ (كَمُّ السبُع) پەردەی سەر نینۆكی درندەو شتی وا ٥ (كَمُّ النَور) پەردەی غونچە ٥ (ك: أكمام) ٥ (أكمام النخلة) پەردەی جوماری خورما ٥ لقو پرژو پاڵی دارخورما.

**الكَمُّ**: ئەندازەی شت.

**الكِمُّ**: چرۆو تەرزەی داری بەردار پەردەی پۆخی خورما پەردەی غونچە ٥ (ك: أكمام).

**الكُمَّةُ**: هەرشتێك شتێكی تر داپۆشێو ببێتە پەردە بۆی ٥ كڵاو و مێزەرو عەگاڵو فێسو شتی وا.

**الكَمِّيةُ**: چەندییەت.

**المِكَمُّ**: ماڵماڵو شتی وا كە دوای كێڵان زەوی پێ تەخت دەكرێ.

**كَمَنَ في المكان كموناً**: لەشوێنەكەدا خۆی حەشاردا.

**كَمَنَ له**: لەحەشارگەیەك دا خۆی حەشار دا کەکەس پێی نەزانیٚ.

**كَمَنَت الناقة لقامها**: حوشترەکە کەلگرتنی نهێنی بوو ٥ بەنهێنی کەڵی گرت.

**كَمِنَتْ عَيْنُهُ كُمْنَةً**: چاوی بەهۆی نەخۆشییەوە تاریك بوو.

**اكتَمَنَ**: خۆی شاردەوە.

**الكمّون**: ڕوەکێکی کشتوکاڵیو ساڵانەیە تۆوەکەی دەکریٚ بەداو و دەرمانی کێشت.

**الكُمْنَةُ**: تاریکییەکە بەسەر چاودا دیٚ بەهۆی نەخۆشییەك کە توشی ڕەگی چاو دەبیٚ.

**الكَمِينُ**: کۆمەڵێك لە شەرکەرو پێشمەرگە خۆ حەشار دەدەن بەهیوای ئەوەی فرسەت لە دوژمن بێنن‌و زەبری کوشندەی لیٚ بدەن ٥ چەواشەکاری‌و تەم‌و مژاوی ئیشێك سەرەگوریسەکانی نەزانرێن ٥ دەگوتریٚ: (هذا أمر فيه كمين) ئەم کارە چەواشەکاری تێدایەو نازانریٚ چۆنەو چۆن نیە.

**المَكْمَنُ**: حەشارگە کە خۆی تێدا حەشار بدەی.

**الكَمَنْجَةُ**: کەمانچە ٥ (الكَمَانُ) هەر بەمانا کەمانچەیە.

**كَمِهَ النهارُ كَمَهاً**: ڕۆژێکی تەپ‌و تۆزاویی بوو.

**كَمِهَتِ الشمسُ**: خۆر بەری گیرا تەپ‌و تۆز بەری گرت‌و دیار نەما.

**كَمِهَ الرجلُ**: پیاوەکە کوێر بوو شەو کوێر بوو ٥ (فهو أكمه وهي كمهاءُ)، دەگوتریٚ: (كَمِهَ بصره)چاوی نابینابوو.

**كَمِهَ**: عەقڵی نەما ٥ ڕەنگی گۆڕا ٥ سەرسام بوو ٥ ڕاڕا بوو.

**تَكَمَّه في الأرض**: بەناو زەوی دا وێڵ‌و سەرگەردان بوو نەیزانی ڕو لەکویٚ دەکاو بۆ کویٚ دەچیٚ.

**الأكمه (كلاً اكْمَهُ)**: لەوەڕەکە زۆرە نازانی دەست بەکوێی بکەی.

**الكامِهُ**: کەسێك سەری هەلگریٚ‌و بیٚ مەبەست بکەوێتە گەڕان.

**الكَمَهُ**: کوێری زکماك.

**المُكَمَّهُ**: کەسێك چاوی پێکەوە نووسابن‌و نەکرێنەوە.

**إكْمَهَدَّ الرَّجُلُ**: پیاوەکە بەهۆی پیری‌و کەنەفتییەوە لەرزی.

**إكْمَهَدَّ الفرخُ**: بێچوەکە شێوە لەرزین‌و شەپلەیەکی توش بوو ٥ لەکاتێك دا باوك‌و دایکەکەی خواردنیان پێدا.

**كَمْهَلَ**: جل‌و پێداویستی خۆی پێچایەوە و خۆی ئامادە کرد بۆ سەفەر.

**كَمْهَلَ علينا**: مافی خۆمانی لێ زەوت کردین.

**كَمْهَلَ الحديثَ**: قسەکەی شاردەوە، چەواشەی کرد.

**المُكَمْهَلُ**: لۆکە لەو کاتەدا تۆوەکەی تێدایە.

**كَمَى إليه كَمْياً**: لێی چووە پێش.

**كَمَى نَفْسَهُ**: بەزرێ خۆی پاراست زرێی لەبەر کردو کڵاو حوزەی خستە سەر سەری ٥ (فهو كامٍ).

**كَمَى الشهادَةَ**: شایەتیەکەی خۆی شاردەوە.

**كَمَى فلاناً مافي ضميره**: ئەوەی لەدڵی دا بوو ئاشکرای نەکرد.

**اكْمَى فلانٌ**: پاڵەوانی سوپای کوشت.

**اكمى مَنْزِلَهُ**: ماڵو مەنزڵی خۆی لەخەڵکی شاردەوە.

**اكْمَى الشهادَةَ**: شایەتی شاردەوە.

**اكْمَى على الأمر**: سوربوو لەسەر کارەکە.

**إكْتَمَى**: خۆی شاردەوە.

**إنْكَمَى**: خۆی شاردەوە، خۆی پەنادا.

**تَكَمَّى في سلاحه**: بەچەكو زرێ خۆی پۆشی.

**تَكَمَّى الشَّيْئَ**: شتەکەی داپۆشی.

**تَكَمَّى الفِتَنُ القَوْمَ**: فیتنەو ئاشوب هەموو خەڵکەکەی داگرت.

**تَكَمَّى قِرْنَهُ**: چوو بەرەو ڕوی ڕکابەرەکەی.

**تَكَمَّى البطلُ القومَ**: پاڵەوانەکە زرێپۆشی ئەوانی کوشت.

**الكَمِيُّ**: چەك پۆش چەك لەخۆبەست ٥ پیاوی ئازاو چاو نەترس ٥ (ك: أكماء).

**كَنَبَ فلان كنوباً**: دوای هەژاری دەوڵەمەند بوو.

**كَنَبَ الشَّيْئُ**: شتەکە پتەو و ئەستور بوو.

**كَنَبَ الشَّيْئَ في جرابه**: شتەکەی کۆکردەوەو خستیە هەمبانەکەیەوە.

**كَنَبَتْ يده من العمل كَنْباً**: دەست پتەو و زبر بوو.

**اكْنَبَ الشَّيْئُ**: شتەکە پتەو بوو (فهو مُكنِبٌ و مُكْنَبٌ) ٥ دەگوترێ: (أكْنَبَت اليدُ) دەستەکە پێستی ئەستورو پتەو بوو بەهۆی کارکردنی گرانو ناخۆشەوە.

**اكْنَبَ عليه بطنُهُ**: گەدەی توندبوو.

**اكنَبَ عليه لسانه**: زمانی گیرا.

**الكانِبُ**: کەسێك تێرو پڕ بێ.

**الكِنابُ**: لقە دارخورما.

**الكَنْبَةُ**: سەکۆیەکە، قەنەفەیەکە دۆشەكو شتی وای لەسەر ڕادەخرێو جێگای زیاد لەنەفەرێك دەبێتەوە.

**الكَنِيبُ**: داری وشك يان ئەو وشكەڵو چقڵو چاڵەی لەدرەخت دەكەوێتە خوار.

**الكِنْبارُ**: حەبلی دروستكراو لەتوێكڵی دار نەرجيل.

**الكِنْبَرَةُ**: ئەرمايی لوتی گەورە.

**كَنَتَ فلان في خلقه كَنْتاً**: فلانكەس لەجەستەو قەبارەدا زەلامو كەتەبوو.

**كَنِتَ السقاءُ كَنَتاً**: مەشكەكە يان تەنكييەكە چڵكی ماستو شتی وای پێوە بوو پێيەوە ڕەق بوو بۆنی كرد ٥ (فهو كنيت وقنيت).

**إكتَنَت الرَّجلُ**: پياوەكە ملكەچ بوو، ڕازی بوو.

**الكُنْتِيُّ**: بەهێزو بەتوانا ٥ پياوی پيرو بەساڵاچوو، لەم ڕووەوە لەقسەكردنو گێڕانەوەی ڕابردوی خۆی وشەی (كُنْتُ) زۆر بەكاردێنێ.

**الكَنْتِيْنُ**: شوێنێكە شەرابو خۆراكی تێدا دەفرۆشرێ وەكوو حانووتی قوتابخانەو خواردنگەكان.

**كَنَدَ الشَيْئَ كَنْداً**: شتەكەی بڕيەوە.

**كَنَدَ النِّعْمَةَ كنوداً**: بڕوای بەنازو نيعمەتە جۆراو جۆرەكانی خودا نەبوو ٥ (فهو وهي كنود).

**الكِنْدَةُ**: پارچەيەك لەكێو.

**الكنود**: سپڵەو پێنەزان بەرامبەر نيعمەتەكانی خودا ٥ گلەييكەر لەخودا ٥ باسی نەخۆشیو كەمو كوڕييەكانی ژيانی دەكاو نيعمەتەكانی خودا لەبير دەكا ٥ ڕژدو چروك ٥ ياخی بوو لەخودا ٥ زەوييەك هيچی لێ نەڕوێ.

**الكَنَادِرُ من الرجال**: پياوی كوڵەبنەو خەپەتۆڵە ٥ كەرەكێوی بەهێزو قەڵەو و بەخۆوە ٥ دەگوترێ: (حمار كُنادِرٌ).

**الكِنْدارَةُ**: جۆرە ماسييەكە دوگی هەيە.

**الكُنْدُرُ**: بەمانا (الكَنَادِرُ) دێ ٥ دەگوترێ: (فتيان كنادِرة) كۆمەڵە مرۆڤێكی كوڵەبنەو كورتەباڵا.

**الكُنْدُورَةُ**: زەوی ڕەقو پتەو و بەرزەوەبوو ٥ هێلانەی بازو هەڵۆ كەلەدارو چيلكە دروست دەكرێ.

**كَنَوَ فلان**: فلانكەس كەتەو ناقۆڵابوو.

**الكُنَّارُ**: درەختی سيدر؛ درەختی نەبگ.

**الكَنَّارِيّ**: كەناری؛ جۆرە چۆلەكەيەكە دەنگ خۆشو جوانكيلەيە.

**الكِنَّارَةُ**: عود يان دەفو تەپڵ يان تەنبور.

**كَنَزَ المالَ كَنْزاً**: ماڵو پارەوپولەكەی ژێر خاك كرد ٥ كۆی كردەوەو هەڵی گرت ٥ (فهو كانز وكتاز).

**كَنَـزَ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی پێـچایەوە، پەستاوتی ٥ لەزەوی دا شاردیەوە.
**كَنَزَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕکرد ٥ باش پڕی کرد.
**إكْتَنَزَ الـشَّيْئَ**: شـتەکە کۆبـۆوە، پتـەو بوو ٥ دەگوترێ: (هذا الكتاب مكتنز الفوائد).
**إكْتَنَزَ المالَ**: ماڵەکەی پەزمەندە کرد.
**تَكَنَّـزَ اللَّحـمُ**: گۆشـتی کۆبـۆوەو پتـەو بوو.
**الكَنـازُ**: کـاتی خورمـا هــەڵگرتن‌و کەبسکردنی.
**الكِنـازُ**: کۆبوونـەوەی گۆشـت‌و قەڵـەو بوون ٥ دەگوترێ: (جا به كناز).
**الكَنْزُ**: مـاڵ‌و سـامانی شاردراوە لـەژێر گڵ دا ٥ گەنجینەو قاسە شوێنی ماڵ تێدا هەڵگرتن.
**كَـنَسَ الظَبْـيُ كَنْساً**: ئاسـکەکە چـووە کۆزەو لانەی خۆیەوە.
**كَنَسَت النجومُ كنوساً**: ئەسـتێرەکان بەردەوامبون لەگەڕان‌و سـوڕانەوەی خۆیـان‌و سـەرلەنوێ گەڕانـــەوە بـەڕێڕەوی خۆیـان دا ٥ (الجـــواري الكـنس) ئەسـتێرە گەڕۆکـەکان، یـان هەموو ئەستێرەکان.
**كَـنَسَ المكـانَ كَنْساً**: شـوێنەکەی مـاڵی هەرچی زبڵ‌و زاڵی بڵاوەبـوو هـەمووی مـاڵی ٥ دەشـگوترێ: (مَـرّوا بهـم فكنـسوهم) بـەلایان ڕۆیـشتن‌و لـەبێخ دەریان هێنان.
**كَنَسَ في وجه فلان**: گاڵتـەی بەفلانکـەس کرد ٥ دەشگوترێ: (کـنس أنفَـه) لـوتی هەڵقرپنجاندو گاڵتەی پێ کرد.
**إكْتَنَسَ الظبيُ**: ئاسکەکە چووە کۆزو لانەی خۆیەوە.
**تَكَـنَّسَ الرجـلُ**: پیاوەکــە خــۆی شاردەوە.
**تَكَنَّـسَت المـراةُ**: ئافرەتەکـە چـووە کەژاوەوە.
**تَكَـنَّسَ الظـبيُ**: ئاسـکەکە چـووە کۆزەوە.
**الكِناسُ**: شوێنی چونە ناو درەخت کە ئاسـك خـۆی تێـدا حەشـار دەداو دەیکاتـە کـۆزو لانـەی خـۆی ٥ (ك: كُنُس وأكنسة).
**الكُنَاسَـةُ**: شـوێنی فڕێـدانی پیـسی‌و زبڵ‌و زاڵ.
**الكَنَّـاسُ**: کەسـێك پیـشەی شـوێن مـاڵین‌و شـەقام‌و کۆڵان پاککردنـەوە بێ.
**الكَنيسُ**: پەرستگای جولەکە.
**الكَنيـسةُ**: کەنیـشتە، عیبادەتگـای جولەکەو گاور ٥ جۆرە کەژاوەیەکە بەسادەیی دروست دەکرێ بـەمجۆرە

چەند دارێك لە كورتانی ولاخەكە دەچەقێندرێن‌و پارچە قوماشێكیان پێدا دەدرێ بۆئەوەی سێبەر لە سوارەكە بكاو بیشارێتەوە ○ (ك: كنائس).

**المَكْنَسُ**: مۆلگەو كۆزو لانەی حەیوانە كێوی‌و ئاسك‌و گاكێوی لەكاتی گەرما.

**المِكْنَسَةُ**: گەسكە؛ ئامێری شت مالّین.

**كَنَشَ الكِسَاءَ كَنْشاً**: قەراخ‌و بێجاخی قوماشەكەی هەڵپێچان.

**كَنَشَ السِّوَاكَ الخَشِنَ**: سەری سیواكە زبرەكەی نەرم كرد.

**الكِنْشَاءُ**: پیاوی موگرژی ڕوخسار ناشیرین.

**الكُنَّاشَةُ**: بنكی شتێك كە لق‌و پۆپی لێ ببنەوە ○ كۆمەڵە پەڕەكاغەز كە پێكەوە دەبەسترێن‌و وردە زانیاری جیاجیایان تێدا تۆمار دەكرێ.

**كَنَظَهُ الأمْرُ كَنْظاً**: كارەكە ناڕەحەتی كرد تا گەیاندیە گیانەلاو.

**الكُنْظَةُ**: تەنگەبەری.

**كَنَعَ الشَّيْءُ كَنْعاً وكنوعاً**: شتەكە وێكهاتەوە چرچ‌و لۆچ بوو وشك هەلات.

**كَنَعَ العُقَابُ**: دالاشەكە باڵی شوش كردن بۆ پەلاماردان‌و پردانی نێچیر ○ (فهي كانعة).

**كَنَعَ النجمُ**: ئەستێرەكە مەیلی ئاوابوونی كرد ڕومو ئاوابوون ڕۆیی.

**كَنَعَ الأمْرُ**: كارەكە نزیك بوو.

**كَنَعَ فلان**: فلانكەس سەری شۆڕكرد بەهۆی عەیبەو لەكەدارییەك كەبەسەر شانی دا هاتبوو ○ فلانكەس لە كاتی سوالكردن‌و دەست پانكردنەوە لەخەڵك زۆر خۆی بێ ڕێز كردو خۆی بچوك كردەوە ○ (فهو كانع).

**كَنَعَ عن الأمر**: لەكارەكە ترساو لێی ڕاكرد.

**كَنَعَ عن الطريق**: لە ڕێگاكە لای دا.

**كَنَعَ في الشَّيْءِ**: تەماعی كردە شتەكە.

**كَنَعَ المِسْكُ بالثوب**: میسكەكە بە قوماشەكەوە نووسا یان لەسەری كۆبۆوە.

**كَنِعَ الشَّيْءُ كَنَعاً**: شتەكە پێوەی نووساو دەوامی كرد ○ وشك بۆوەو گرژ بوو.

**كَنِعَ فلان**: بەرەو دەم بەسەر چەناگەی دا كەوت ○ (فهو كَنِعٌ) ○ یان فلانكەس جەستەی توشی شەلەل‌و ئیفلیجی بوو (فهو أكنع وهي كنعاء).

**اكْنَعَتِ العُقَابُ**: دالاشەكە باڵی شوشكردن بۆ پەلاماردان‌و پردانی نێچیر.

**اكْنَعَ فلان**: فلانكەس بۆ شتەكە زۆر خۆی زەلیل‌و داماو كردو ملكەچی نواند ○ یان سوالّی شتەكەی كرد.

**اكْنَعَ الإبلَ إليه**: حوشترەکانی لەخۆی نزیك کردنەوە.

**اكْنَعَ اصابِعَهُ او يَدَهُ**: لەپەنجەی دا یان لەدەستی دا وشکەڵ بوون‌و گرژ بوون.

**كَنَعَ عن الشَّيءِ**: لەشتەکە لای دا.

**كَنَعَ اصابعه او يده**: بەمانا (أكنعها) دێ.

**كَنَعَ فلاناً**: لەسەری فلانکەسی دا.

**كَنَعَ فلاناً بالسيف**: بە شمشێر لە فلانکەسی دا تامەچەکی خوار بوون.

**إكْتَنَعَ القوم**: خەڵکەکە گردبوونەوە.

**إكْتَنَعَ الليلُ**: شەو نزیك بۆوە.

**إكْتَنَعَ عليه**: بەزەیی پێدا هاتەوە.

**تَكَنَّعَ فلان**: فلانکەس خۆی قایم کرد چووە ناو قەڵاو شوراو دژەوە.

**تَكَنَّعَت يداه ورجلاه**: دەست‌و قاچی بەهۆی برین‌و شتی واوە گرژ بوون و وشك هەڵاتن.

**تَكَنَّعَ مني**: لێم نزیك بۆوە.

**تَكَنَّعَ به**: خۆی پێوە هەڵواسی.

**تَكَنَّعَ الأسيرُ**: دیلەکە خۆی گرمۆڵە کردو خۆی وێکهێنایەوە.

**الأكْنَعُ**: کەسێك هەردوو دەستی بڕابن ٥ کارێك کەم‌و کوڕی تێدابێ.

**الكانِعُ**: کەسێك خۆی ملکەچ‌و زەلیل بکاو ڕێزی خۆی نەگرێ ٥ (رجل كانِعٌ) پیاوێکە بەخۆی‌و ژن‌و منداڵیەوە بچێتە لای یەکێکی ترو داوای پارمەتی لێ بکاو زۆر بپاڕێتەوە.

**الكِنْعُ**: ئەو ناوەی لەدامێنی کێو لە گۆماودا بمێنێتەوە.

**الكنيع**: کەسێك لە ڕێبازێکەوە لابدا بۆ ڕێبازێکی تر ٥ دەست شکاو ٥ برسیایەتی زۆر ٥ (رجل كنيع) پیاوێکی گرمۆڵە بوو، خڕبۆوە.

**المكنوع**: دەست قرتاو، دوودەست بڕاو.

**كَنَفَ الكيّالُ كَنْفاً**: پێوەرەکە دەستی بەسەر ئامێری پێوانەکە دا گرت بۆئەوەی شتە پێوراوەکە نەکەوێتە خوار.

**كَنَفَ القومُ**: خەڵکەکە متاڵ‌و سامانی خۆیان شاردەوەو هەڵیان گرت لەترسی قات‌و قڕی.

**كَنَفَ عن الشَّيءِ**: لەشتەکە لای دا ٥ (فهو كانف).

**كَنَفَه عنه**: لێی گرتەوە، لێی قەدەغە کرد.

**كَنَفَ الشَّيءَ**: شتەکەی پاراست‌و پارێزگاریی کرد ٥ دەگوترێ: (فلان

مخذول لا تكنفه من الله كانِفة) فلآنكەس ڕیسوایەو هیچ شتێك نیە پارێزگاریی لێ بکاو نەهێڵێ حەیای بچێ.

**كَنَفَ فلان وبفلان:** فلآنكەسی لە خۆگرتو کردی بەیەکێك لەماڵو منداڵی خۆی.

**كَنَفَ يَدَهُ:** دەستی خۆی کردە لوێچ، دەستی خۆی کۆکردەوە بۆئەوەی ئاو و شتی وای تێدا بوەستێ.

**كَنَفَ الكنيفَ كَنْفاً وكنوفاً:** کۆختەو حەشارگەی دروست کرد.

**كَنَفَ الدارَ:** ئاودەستی بۆ خانووەکە دروست کرد.

**كَنَفَ الإبلَ والغَنَمَ:** تەویلەو گەوڕو ئاغەڵی بۆ حوشترو مەڕو بزنەکان دروست کرد بۆئەوەی لەسەرماو گەرما بپارێزرێن.

**كَنَفَ لإبله:** ئاغەڵی بۆ حوشترەکان دروست کرد.

**اكْتَنَفَ الشَّيْئَ:** شتەکەی پاراستو هەڵی گرت.

**اكْتَنَفَ فلاناً:** یارمەتی فلآنكەسی دا بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی.

**اكْتَنَفَه الصَّيْدَ والطَّيْرَ:** یارمەتی فلآنی دا بۆ نێچیر کردنی نێچیرو باڵندەکە.

**كانَفَهُ:** یارمەتی دا.

**كَنَّفَ الشَّيْئَ:** دەوران دەوری شتەکەی دا.

**تَكَنَّفَهُ:** بەمانا (إكْتَنَفَهُ) دێ.

**الكانِفَةُ:** پەردەو پەناگەو حەشارگەو شوێنی حەوانەوە ٥ دەگوترێ: (اِنْهَزَمَ القوم فما كانت لهم كانِفَة).

**الكُنَافَةُ:** جۆرە حەڵوایەکە لەهەویری گەنم دروست دەکرێ لەسەر شێوەی تاڵتاڵو هەودا هەودا لەناو ڕۆن دا سور دەکرێتەوە، دوایی شەکری پێوە دەکرێ بەزۆری لەمانگی ڕەمەزان دا دەخورێ.

**الكَنَفُ:** پەنا شت ٥ سێبەر ٥ (ك: أكناف).

**كنَفَا الرَّجُل:** باوەشو کۆشی پیاو چ لە ڕاستەوە چ لەچەپەوە.

**كَنَفَ الطائر:** باڵی باڵندە ٥ (كنف الله) ڕەحمەتو پارێزگاری پەروەردگار.

**الكِنْفُ:** هەر کیفو پەردەیەك پارێزگاری شتی تر بکا.

**كِنْف الراعي والصانع والتاجر:** ئەو مەخزەنو گەنجینەی پیشەوەرو بازرگان شتی خۆیانی تێدا هەڵدەگرن.

**الكَنَفاني:** حەڵواچی، دروستکاری حەڵوا یان فرۆشیاری ٥ حەڵوافرۆش.

**الكَنُوفُ:** حوشتر کە خۆ بخاتە ناو حوشتری ترەوە لەسەرما ٥

حوشترێك له حوشترى تر كەنارگیر ببێ‌و بەتەنیا لە ئاغەڵى خۆى دا پاڵ بكەوێ ٥ مەڕو بزنى تار بوو لەڕانە مەڕ.

**الكنيف**: پەردە ٥ مەتاڵ‌و دێوجامە ٥ ئەو دیكۆڕو سەردەرانەى لەسەر دەرگاى مەدخەلى خانوو دروست دەكرێ ٥ تەویلەو ئاغەڵ كە بۆ حوشترو مەڕو بزن دروست دەكرێ ٥ ئاودەست.

**المُكَنَّفُ**: (رجل مُكَنَّف اللحية) پیاوێكى ڕیش پان‌و زلە.

**كَنْفَشَ**: كابرا لەماڵى خۆى دانیشت لە ڕۆژانى شەڕو هەراو فیتنەو ئاشوب دا ٥ لاشەویلەى هاوسا.

**كَنْكَنَ فلان**: فلانكەس هەلات ٥ تەمبەڵ‌و تەوەزەل بوو لەماڵى خۆى دانیشت.

**الكُنْكانُ**: كۆنكەن، جۆرە یارییەكى كاغەزە.

**كَنَّ الشَّيْئُ كنوناً**: خۆى حەشاردا.

**كَنَّ الشَّيْئَ**: شتەكەى پەردەپۆش كرد ٥ دایپۆشى.

**اكَنَّ الشَّيْئَ**: شتەكەى شاردەوە.

**كَنَّنَ الشَّيْئَ**: بۆ زێدەڕۆیى لەماناى (كَنَّ) دا دێ.

**إكتَنَّ الشَّيْئُ**: شتەكەى خۆى حەشاردا ٥ خۆى داپۆشى ٥ چووە پەردەوە ٥ دەگوترێ: (إكْتَنَّت المرأةُ) ئافرەتەكە ڕوخسارى خۆى داپۆشى.

**إكْتَنَّ الشَّيْئَ**: شتەكەى پەردەپۆش كرد.

**إستَكَنَّ**: شتەكەى خۆى داپۆشى، چووە پەردەوە خۆى حەشاردا.

**الكانون**: ئاگردان ٥ پیاوى كەتەو ڕەزاگران‌و ورگ زل ٥ كەسێك دابنیشێ چاوەڕێی هەواڵ بكا بۆئەوەى ببیسێ‌و لێكۆڵینەوەى تێدا بكاو بیگوازێتەوە ٥ (ك: كوانین).

**كانون الأول**: مانگى دیسەمبەرە ٥ (مانگى دوانزە).

**كانون الثاني**: مانگى یەنایەرە ٥ (مانگى یەك).

**الكِنان**: پەردە ٥ هەرشتێك شتێكى تر دابپۆشێ‌و پارێزگاریى بكا.

**الكِنانةُ**: تورەكە چەرمێكە تیرى تێدا هەڵدەگیرێ ٥ (تیردان) ٥ هەمبانەى سەرەتیر ٥ وڵاتى میصر.

**الكِنُّ**: بەمانا (الكِنان) دێ ٥ هەرشتێك گەرماو سەرما لەخانو و خێمەو كەپرو ساباط بگێڕێتەوە ٥ (ك: أكنان و أكِنة) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا﴾.

**الكَنَّةُ**: كەنى؛ ژنى كوڕ یان ژنى برا (براژن) ٥ (ك: كنائن).

**الكُنَّةُ**: سوێبان، دیکۆر کەلە دیواری خانو دەردەچێ ٥ یان سەردەران و سەقفی سەردەرگای سەرەکی خانوو ٥ سەکۆ و ڕەفەی لەناو خانوودا بۆ لەسەر نوستن و شت لەسەر دانان ٥ (ك: كِنان).

**الكَنينة**: ژنی پیاو (ك: كنائن).

**المُسْتَكَنَّةُ**: ڕق و کینە.

**المكْنُون**: شاردراوە و پارێزراو و دوور لەبەرچاوی خەڵك ٥ نادیار و دەست پێ نەگەیشتو و دەست لێ نەدراو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ﴾.

**كَنَهَ الأمْرَ كَنْهاً**: ڕاستی شتەکەی زانی ٥ حەقیقەتی کارەکەی بۆ دەرکەوت.

**اكْنَهَ الأمْرَ**: بەمانا (كَنَهَهُ) دێ.

**إكْتَنَهَ الأمْرَ**: بەمانا (كَنَهَهُ) دێ.

**الكُنْهُ**: کرۆك و جەوهەری شت ٥ حەقیقەت و کۆتایی شت ٥ دەگوترێ: (بلغت كُنْهَ هذا) ٥ (وأعرف كُنْهَ المعرفة) ٥ هەروا بەمانا ئەندازە دێ ٥ دەگوترێ: (فعل فوق كُنْه استحقاقه) زیاد لە ئەندازەی مافی خۆی کاری کرد ٥ کات و زەمان ٥ دەگوترێ: (فعلت هذا الشئ في غير كُنْهِهِ) ئەو شتەم لەکاتی خۆی دا ئەنجام نەدا.

**الكَنَهْوَرُ من السحاب**: هەوری گەورەی وەکوو کێو ٥ یان هەوری سپی گەورە ٥ تاکەکەی (كَنَهْوَرَةٌ).

**كَنهف**: بڕوانە (كَهَفَ).

**كَنَّى عن كذا كناية**: بەکنایەو درکە لەو شتە دوا ٥ ڕاستەوخۆ باسی شتەکەی نەکرد ٥ (كَنَّى الرجلَ) بەشێوەی کونیە ناوی فلانکەسی هێنا وتی: (أبو فلان وأبو فيسار).

**اكْنَاهُ وكَنَّاهُ بكذا**: بەشێوەی کونیە ناوی هێنا، بانگی کرد.

**إكْتَنَى بكذا**: بەو ناوە ناوی نا.

**تَكَنَّى فلان**: فلانکەس لەکانی شەڕدا کونیەو ناو و عینوانی خۆی ئاشکرا کرد بۆئەوەی بناسرێ ٥ ئەم شێوە داب و نەریتی پاڵەوان و شەڕکەرانی جەنگە.

**تَكَنَّى**: خۆی داپۆشی، خۆی حەشاردا.

**تَكَنَّى بكذا**: بەو ناوە ناوی نا.

**الكناية**: لە بواری زانستی بەیان دا بریتییە لە گوتنی وشەو ڕستەیەك دیاردەو تایبەتمەندی شتێکت مەبەست بێ بشتوانی مانای ئەصلیش بەرچاو بگرێ لەم ڕووەوە قەرینەیەك نەبێ مانیع بێ لەوە ٥ بۆنمونە بڵێی:

**امة الدولار**: مەبەستت ئەمریکا بێ.

**الناطقين بالضاد**: نەتەوەی عەرەب.

**نظافة اليد**: ئەمین‌و ڕەوشت بەرز.

**الكُنْيَة**: هەر ئیسمێك بە (أب، أم، إبن، بنت) دەست پێ بكا وەكوو (أبو الحسن، أم الخير، إبن عباس).

**كَهَبَ لَوْنُهُ كَهَباً وكُهْبَةً**: ڕەنگی تەپو تۆزی ڕەشبوی كەوتە سەر ◊ (فهو أكهب وهي كهباء) ◊ (ك: كُهْبٌ).

**إكْهابَّ لَوْنُهُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (كَهِبَ) دێ.

**الكَهْبُ**: پیرە حوشتر، پیرە گامێش.

**الكُهْبَةُ**: تاریكی، یان تەپوتۆزێكی مەیلەو ڕەش.

**كَهَدَ فلان كَهْداً وكَهَداناً**: ئیلحاحی كرد لە داواكارییەكەی دا ◊ ماندوو بوو، شەكەت بوو.

**كَهَدَ في الشَّيْءِ**: پەلەی كرد لە ڕۆیشتن دا.

**كَهَدَ فلاناً**: فلانكەسی هەڵنا بۆ خێرا ڕۆیشتن.

**اكْهَدَ فلاناً**: فلانكەسی ماندوكرد.

**إكْوَهَدَّ الشيخُ والفرْخُ**: لەلاوازی‌و زەبوونی دا پیرەمێردەكە یان بێچوەكە لەرزی.

**الكَهْداءُ**: چەتیو، كارەكەر لەم ڕووەوە كە چوست‌و چالاكە لە خزمەتكردنی ئاغاژنی دا.

**الكَهُودُ**: گورج‌و خۆشڕۆ.

**الكَوْهَدُ**: كەسێك بەهۆی پیرییەوە توشی لەرزین بووبێ.

**كَهَرَ النهار كَهْراً**: ڕۆژەكە بەرزبۆوە درەنگ بوو ◊ دەگوترێ: (كَهَرَ الضحى) چێشتەنگاو درەنگ بوو.

**كَهَرَ الحَرُّ**: گەرما تاوی سەند.

**كَهَرَ فلان**: فلانكەس پێكەنی.

**كَهَرَ الغلامُ**: گەنجەكە خەریكی گاڵتەو گەپ بوو.

**كَهَرَ فلاناً**: فلانكەسی ملكەچ كرد ◊ بەڕوی گرژ و مۆنەوە پێشوازی لە فلانكەس كردو بەچاوی بێ ڕێزییەوە سەیری كرد.

**كَهَرَ القومَ**: ژن‌و ژنخوازی لەگەڵ خەڵكەكەدا كرد.

**الكهرور والكهرورة**: ڕو گرژو خەڵك ڕەتێن.

**كَهْرَبَ مَسْقط الماء**: شوێنی هەڵڕژانی ئاوەكە كارەبای بەرهەم هێنا.

**كَهْرَبَ الشَّيْءَ**: شتەكەی شەحن كردەوە، هێزی وزەی كارەبایی خستە ناو.

**كَهْرَبَ الأسلاك، و كَهْرَبَ المصْنَع**: شوێنەكە كارگەكە ئامێرەكانی تەزویركردن بەهێزی كارەبایی.

**كَهْـرَبَ الخـط الحديـدِيّ**: هێڵـی ئاسـنینەکە وارغۆنـەکانی بـەوزەی کارەبایی کەوتە گەڕ.

**كَهْـرَبَ الخـط الحديـدي**: وارغـۆنی شـەمەندەفەرەکەی بـە وزەی کارەبا ڕۆیاند.

**كَهْـرَبَ الـشَّيْئَ او الـشَخْصَ**: کارەبـا شتەکەی گرت یان لـە شەخـصەکەی داو کوشتی.

**تَكَهْرَبَ**: بۆ موتاوەعەی (كَهْرَبَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تكَهْرَبَ الشلالُ: تكَهْرَبَ المصنعُ)

**الكَهْرَباءُ**: مادەیەکی ڕاتینجییە ڕەنگی زەردە، یەکەم مادەیەکە کە زاندراوە بەهۆی شێلان‌و دەست پێداهێنان دا کارەباوی دەبێ، هەر لە ئەمیشەوە وشـەی (الكهربائيـة) داتاشـراوە ٥ هـەروا نـاوە بـۆ ئـەو هۆکـارە سروشتییەی کە بەشێوەیەکی گشتی کێشکردن‌و فڕێدان (تجاذب وتنافر)ی لێ پەیدا دەبێ لەئاکامی دەست پێدا هێنـان‌و لێـك خـشان‌و گـەرمبوون‌و تەفاعولی کیمیاوی.

**الكهربا**: بەمانا (الكهرباء) دێ.

**الكهربائي**: پسپۆڕ لـە زانیـاری بـواری کـەهرەبا ٥ یـان کەسـێك پیـشەی ئیـشی کارەبـایی بـێ ٥ تـەیاری کارەبـایی وزەی کارەبـایی ناوەمـادە ٥ گڵۆپی کارەبایی.

**الكَهْرَبَـة**: پەیـداکردنی وزەی کارەبـا بەهەر شتێك بێ ٥ کارەبا لێدراو.

**الكَهْرَمان**: جۆرە بنێـشت‌و جەوییەکـە هەنـدێ درەختـی تایبـەتی لـە ڕۆژگـارە جیۆلۆجییـە کۆنـەکان دا دەریان داوە.

**إكْتَهَفَ**: ئەشکەوت نشین بوو.

**تَكَهَّفَ**: بەمانا (إكْتَهَفَ) دێ.

**تَكَهَّفَ الجَبَلُ**: کێوەکە ئەشکەوتی زۆر تێدا بوون.

**تَكَهَّـفَ البِئـرُ**: ئـاو لای خـواروی بیرەکەی هـەڵۆڵ کـرد، ئەگـەر گوێی بـۆ هەڵبخـەی دەنگێکـی نایاسایی لێ دەبیسترێ.

**تَكَهَّفَـت الرئـة**: سـییەکان بـەهۆی نەخۆشی سیلەوە کونکون بوون.

**كَنْهَـف عنـا**: بەپەلـە ڕۆیـی‌و جێـی هێشتین.

**الكهف**: ئەشکەوت، کونە شاخ.

**كَـهْ كَـهْ**: لاسـایی کردنـەوەی دەنگـی پێکەنین‌و حیلکەی ئەسپ‌و نـەڕەی شێر.

**كَهْكَـهَ المقـرور**: کـابرای سـەرمابوو هەناسـەی گـەرمی خـۆی کـردە نـاو دوودەستی خۆیەوە.

**كَهْكَهَ الأسَدُ أو البعيرُ**: شێرەکە یان حوشترەکە دەنگی خۆی لە قورگی دا هێناو برد.

**كَهْكَهَ الرجُلُ**: پیاوەکە لەقاقای پێکەنینی دا.

**تكَهْكَهَ عنه**: لاواز بوو.

**الكُهاكِهُ**: پیاوێکە بەرواڵەت وادەزانی پێدەکەنێ کەچی وایش نیە.

**الكَهْكاهُ**: لاوازو زەبوون.

**الكَهْكاهَةُ**: پیاوی بەساموو هەیبەت ٥ کارەکەری قەڵەو.

**كاهَلَ فلان**: پیاوەکە پیر بوو ٥ ژنی هێنا.

**إكْتَهَلَ**: بەمانا (کاهَلَ) دێ.

**إكْتَهَلَت النعجة**: مەڕەکە ددانی تەواو بوون.

**إكْتَهَلَ النَبْتُ**: ڕوەکەکە پێگەیی و گوڵی کرد.

**إكْتَهَلَت الروضةُ**: باخەکە ڕوەك و گوڵەکانی تێکچرژان و خۆیان ئارایش دا.

**تَكَهَّلَ النباتُ**: ڕوەکەکە پێگەیی و گوڵی کرد.

**الكاهِلُ**: ناوشانی مرۆڤ ٥ شوێنی بەیەك گەیشتنی مل و پشت ٥ دەشگوترێ: (فلان كاهل بني فلان) فلانکەس پشتیوان و ڕاگری هۆزی فلانە، لەکاتی تەنگانەو ناخۆشی دا ڕێبەرو پەنایانە ٥ دەشگوترێ: (انه لشديد الكاهل) ئەو پیاوە پیاوێکی خۆڕاگرو ورەبەرزو بەرگریکەرە ٥ هەروا ناوە بۆ دەنگی ڕق هەڵساو ٥ بۆ حیلکەو بارەی کەڵی چەموش، دەگوترێ: (إنه لذو كاهل) ٥ (ك: كواهِل) ٥ (كواهل الليل) سەرەتای شەو نیوە شەو.

**الكَهْلُ**: کەسێك تەمەنی لە سی تێپەڕی تا تەمەنی پەنجا ساڵی ٥ (ك: كهول و كُهَلٌ وكُهْلان) ٥ دەشگوترێ: (طار له طائر كهل) بەخت و شانسی چاکی هێنا.

**الكُهْلُولُ**: سەخی و نانبدەو دەست و دڵ فراوان.

**كَهَمَ الرجلُ كَهامةً**: پیاوەکە تەمبەڵ بوو لەیارمەتیدانی لێقەوماو، خۆی پاش دا لەچوون بۆ هاوکاریکردن لە شەڕی بەرگری دا ٥ (فهو كهام).

**كَهَمَ السَّيفُ**: شمشێرەکە کول و نەبڕ بوو.

**كَهَمَت الشدائدُ الرجلَ كهماً**: ڕوداوو کارەسات پیاوەکەی ترسنۆك کرد.

**كَهُمَ بَصَرُهُ**: چاوی کەم بینا بوو.

**كَهُمَ لِسانُه**: زمانی گیراو نەیتوانی بدوێ.

**كَهَّمَتْهُ الشدائد**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (كَهَم)دا دێ.

**تَكَهَّمَ فلان**: بەمانا (كَهَمَ) دێ ◦ ڕوبەڕوی شەڕو ناخۆشی بۆوە.
**كَهْمَسَ**: قاچەكانی خۆی لێك نزیك كردنەوەو تەپو تۆزی بەرپاكرد.
**الكَهْمَسُ من الرجال**: پیاوی كورتە بالا ◦ ڕەزاگران‌و ڕوخسار ناشیرین ◦ شێر ◦ گورگ ◦ حوشتری دوگ گەورە.
**كَهَنَ له كَهانَة**: هەواڵی غەیب‌و نادیاریی پێدا ◦ (فهو كاهن).
**كَهَنَ لهم**: قسەی كاهینانەی بۆ كردن ◦ وتەی كاهینەكەی بۆ گێڕانەوە.
**كَهُنَ كَهانَةً**: بوو بە كاهین‌و كوڵەوەنانی ◦ یان پیشەی كوڵەوەنانی بوو بە سروشت‌و غەریزە.
**كاهَنَهُ**: دوڕویی بۆ كرد، ماستاوچیەتی بۆ كرد.
**تَكَهَّنَ له**: بەمانا (كَهَنَ) دێ ◦ قسەكانی شوبهان بەقسەی كاهین‌و كوڵەوەنانی.
**الكاهِنُ**: كوڵەوەنانی، هەركەسێك لافی زانینی زانیارییەكی ورد لێ بدا، لافی زانینی عیلمی نهێنی لێ بدا ◦ لە كۆن دا عەرەبەكان بە ئەستێرەناس‌و پزیشك‌و ئەو جۆرە كەسانەیان دەگوت كاهین ◦ كەسێك ئیش‌و كاری یەكێكی تر لەئەستۆ بگرێ‌و هەڵی سوڕێنێ ◦ لەلای جولەكەو گاور كاهین بەكەسێك دەگوترێ بگاتە پلەی كەهەنوتی ◦ لەلای ئایینەكانی تر جگە لە ئیسلام بەكەسێك دەگوترێ: سەروكاری داب‌و نەرێتە ئایینییەكان بكاو كوشتنی قوربانییەكان ئەنجام بدا.
**حلوات الكاهن**: سەرقەڵەمانەی كوڵەوەنانی ◦ (سَجْع الكهان) قسە ڕێكخراوەكانی كوڵەوەنانی: كە جۆرە سەرەواو وەقعێكیان هەیە.
**الكِهانَة**: پیشەی كوڵەوەنانی.
**الكَهنوت**: ئەركی سەرشانی كوڵەوەنانی ◦ (رجال الكهنوت) پیاوی ئایینی جولەكەو گاور ◦ مالەو قەشە.
**كَهَّ كهوهاً**: پیر بوو.
**كَهَّ السكران في وجه من يستنكِهه**: سەرخۆشەكە هەناسەی دا.
**كَهَّ كُهوهاً**: هەناسەی دا.
**الكَهَّةُ**: حوشتری كەتەی پیر ◦ پیرە ژن.
**كهي فلان كهيً**: فلانكەس ترسنۆك بوو، لاواز بوو بۆنی دەمی گۆڕا دەمی بۆنی ناخۆشی لێ هات ◦ دەم‌و چاوی پەڵەی لێ پەیدا بوو.
**اكهى فلان**: فلانكەس بەهەناسەی گەرمی خۆی سەری پەنجەكانی گەرم كردەوە.

**اكهي عن الطعام**: وازى لەخواردنەکە هێنا.

**إكْتَهَى فلاناً ان يُكَلِّمَهُ**: فلانکەسی بە گەورەو شکۆمەند زانیو زاتی نەهێنا قسەی لەگەڵ بکا.

**الأكهى**: بەردێکە درزی تێدا نەبێ.

**الأكهاء**: پیاو ماقوڵ.

**الكَهَاةُ**: پیرە حوشتری کەتەو گەورە.

**كابَ كَوْباً**: بەکوپ شلەمەنییەکەی خواردەوە.

**كوِبَ كَوَباً**: ملی باریكو سەری زل بوو (فهو أكوب وهي كَوْباء).

**كَوَّبَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بەدەسکە سندۆڵ ورد کرد.

**الكُوبُ**: کوپو پیاڵەی شوشە کە قلفەی پێوە نەبێ.

**الكُوبَةُ**: بەردێکی ڕاستەو پاستە کراوو درێژە دەرمانو شتی وای پێ ورد دەکرێ (دەسکە سندۆڵ) ٥ ئامێرێکی موسیقایە دەشوبهێتە عودو کەمان ٥ نەرد یان شەترەنج.

**كَوَّثَ الزرعُ**: کشتوکاڵەکە چوار پێنج پەلکی دەرکردن.

**الكَوْثُ**: کشتوکاڵێك چوار پێنج پەلکە گەڵای لێ دەرکەوت ٥ خوففی کورت.

**تَكَوْثَرَ**: بڕوانە مادەی (كَثَرَ).

**الكوثر**: بڕوانە مادەی (كَثَرَ).

**الكوثَلُ**: بڕوانە مادەی (كَثَلَ).

**كاحَ فلاناً كوحاً**: شەڕی لەگەڵ فلانکەس کردو بەسەری دا زاڵ بوو.

**كاحَ الشَّيْئَ**: شتەکەی نوقمی ناو ئاو کرد، یان ژێرخاکی کرد.

**كاوَحَهُ**: شەڕی لەگەڵ کرد ٥ جوێنی پێدا، دژایەتی خۆی بۆ ئاشکرا کرد.

**كَوَّحَهُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (كاح)دا دێ.

**كَوَّحَ الزمامُ البعيرَ**: لغاوەکە حوشترەکەی ژێربار کرد.

**تكاوَحا**: کێشەیان تێکەوتو بوو بە ناخۆشییان.

**الكوخ**: کۆخ؛ خانوێکی بچکۆلەیە بانەکەی وەکوو پشتی وڵاخ لێژو سەر تەلانەو بێ هەواکێشو کونەبانە ٥ هەر کۆخو خانوێك کشتیار و ڕەزەوان بیکاتە شوێنی حەوانەوەی خۆیو لێیەوە چاودێری کشتو کاڵو ڕەزو باخەکەی بکا.

**كاد يفعل كذا كوداً**: نزیك بوو ئەوە بکاو نەیکرد.

**كاد**: فیعلی ڕابردوە ناقیصە ئیسمەکەی مەرفوعەو خەبەرەکەی فیعلێکی موزاریعە، نزیکبوونەوەی شت دەگەیەنێ (واتە: نزیك بوونەوەی

هاتنـه جێـی مانـای خەبەرەکـە بـۆ ئیسمەکە).

**کادَ**: بەمانا (أرادَ) دێ.

**کـادَ فلاناً عـن الـشَّيْئِ کَـوْداً ومکـاداً**: فلأنکەسـی لـەو شـتە مـەنع کـردو نەیهێشت بیکا.

**کاد بنفسه**: خۆی کردە قوربانی ٥ گیانی خۆی بەخت کرد.

**کَـوَّدَ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی کـۆکردەوەو کردیە کۆمەڵێکی تەواو.

**إکْوادَّ الشیخُ**: بڕوانە مادەی (کَأدَ).

**الکَـوْدَةُ**: هەرشـتێك کـۆی بکەیـەوەو بیکەیـە کۆمـەڵ لـە دانەوێڵەو گڵو لبو شتی وا.

**المکـادَةُ**: دەڵێـی: (لا مُهِمَّـةَ لـي ولا مُکَـادَةَ) نەدەمـەوێ ئـەوە بکـەمو نەنزیکە بمەوێ بیکەم.

**کَوْدَنَ في مشیه**: بڕوانە مادەی (کَدَن).

**کَوَّدَ الإزارُ**: دەرپێیەکە گەیشتە تـۆپی سمتی.

**کَـوَّدَ فلانـاً بالعـصا**: بەگۆچـان لەفلأنکەسـی داو لێدانەکـەی ناڕاستەی نێوان ڕانو کلۆتی کرد.

**الکاذانُ**: پیاوی کەتەی قەڵەو.

**الکاذَةُ**: گۆشتی لای ژوروی ڕان ٥ واتـە گۆشتی تۆپی سمت.

**الکـاذِيُ**: جـۆرە درەختێکـە ٥ بڕوانـە مادەی (کَذَو).

**کـارَ في مِـشیته کَـوْراً**: لـە ڕۆیـشتن دا پەلەی کرد.

**کـارَ الکـارَةَ**: تێشوی سـەفەری لـەکۆڵی خۆی شەتەك دا.

**کار الأرض**: زەوییەکەی هەڵکۆڵی.

**اکَارَ علیه**: زەلیلی کرد، لاوازی کرد.

**کَـوَّرَ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی لـول کـرد پێچایەوە.

**کَـوَّر المتـاعَ**: کـاڵاو شـتومەکەکانی خستنە سەریەكو شەتەکی دان.

**کَـوَّرَ الله اللیـلَ علـی النهـار والنهـار علـی اللیـل**: خـودا شـەو و ڕۆژی زیـادو کـەمو درێـژو کـورت کـردن لەمی هـەڵگرت خـستیە سـەر ئـەو و بەپێچەوانەشەوە.

**کَوَّر فلانـاً**: فلأنکەسـی بـەزەوی دا داو سەرەنگرێی کرد.

**کُـوِّرَت الـشمس**: خـۆر ڕوناکییەکـەی پێچرایەوە وەکوو قوماشو شتی وا لـول درا ٥ یـان ڕونـاکی پوچـایەوەو نەما.

**إکتارَ الرجلُ**: پیاوەکە سەرەنگرێ کرا، بەزەوی دا درا.

**إکتـار الفَـرَسُ**: ئەسـپەکە لـەکاتی غـاردانو بـازدان دا کلکـی بـەرز کردەوە.

**إکتـارت الناقـة**: حوشـترەکە لـەکاتی کەڵدان دا کلکی بەرز کردەوە.

**إكتار لفلان:** خۆی ئامادە کرد بەجنێودان بەفلان.

**إكتار الشَّيْئ:** شتەکەی خستە سەر یەك.

**تَكَوَّرَ الرجلُ:** پیاوەکە قاچی هەڵکردن خۆی گورج کرد، خۆی گیف دا.

**تَكَوَّرَ الجبلُ:** کێوەکە ڕوخا.

**تَكَوَّرَ السائِلُ:** شلەمەنیەکە تکەی کردو داچۆڕایە خوار.

**الكارَةُ:** ئەوەی کۆدەکرێتەوەو شەتەك دەدرێ‌و لەکۆڵ دەدرێ لە بژێو و لە پۆشاك.

**الكِوارُ:** کۆڵەسە هەنگ: شوێنی تەنگەبەر: کە دروست دەکرێ بۆ ئەوەی هەنگ شانە هەنگوێنی تێدا ڕابەستێ‌و هەنگوێنی تێ بکا.

**الكِوارَةُ:** بەمانا (الكِوارُ) دێ ٥ پەڕۆیەکە ئافرەت دەیخاتە سەر سەری خۆی.

**الكَوْرُ:** کۆمەڵی زۆر لە حوشترو ڕەشەوڵاخ (جەڵەبە حوشترو گایەل‌و گاڕان) ٥ زیادە ٥ دەگوترێ: (نعوذ باللە من الحور بعد الكوْر) پەنادەگرین بەخودا لەکەم‌و کورتی دوای زێدەبوون.

**الكور:** کورەی ئاسنگەر ٥ بارگەنەو کەژاوە ٥ (ك: أكوار وكيران) هێلانە ژەنگەسورەو زەردەواڵە.

**الكورَةُ:** دەڤەرو ناوچە ٥ چەند شارو گوندو هۆبەیەکە پەیوەندییەکی تایبەتییان پێکەوە هەیە.

**الكُوارَةُ:** شانەهەنگ‌و خەلیە هەنگ‌و کۆڵەسە هەنگ.

**المِكْوَرُ:** (رجل مِكْوَرٌ) پیاوێکی خراپ‌و ڕەوشت ناشیرینە ٥ زۆر بڵێ‌و چەقەچەناوە.

**كازَ كَوْزاً:** بە گۆزەو کیتەڵە ئاوی خواردەوە.

**كاز الشَّيْئَ كَوْزاً:** شتەکەی کۆکردەوە.

**إكْتازَ:** بەمانا (كازَ) دێ ٥ دەگوترێ: (إكْتازَ الماءُ) ئاوەکەی کۆکردەوە.

**تَكَوَّزَ القومُ:** خەڵکەکە گردبوونەوە.

**الكوز:** گۆزە (گۆزەی ئاو).

**المُكَوَّزُ:** (رجل مكوّز الرأس) پیاوێکە سەر درێژە.

**الكَوْزَبُ:** بڕوانە مادەی (كَزَبَ).

**كاسَ الإنسان كَوْساً:** مرۆڤەکە لەسەر ڤاچ ڕۆیشت.

**كاست الحيوانُ:** ئاژەڵەکە ڤاچێکی پەڕی‌و لەسەر سێ ڤاچ ڕۆیشت.

**كاسَ العقيرُ:** حوشترە ڤاچ پەڕیوەکە بەسەر پێشەوەی دا تریل بوو.

**كاست الحية:** مارەکە لە شوێنی خۆی پاپۆکەی بەست‌و خۆی خڕکردەوە.

**كاس في سيره**: له ڕۆیشتن دا قونگرانی نواندو تەمبەڵ بوو.

**كـــاس في البيـــع**: لـــه مامەڵەكـــەی دا نرخەكەی كەم كردەوە ٥ دەگوترێ: (لا تكُسْني يـا فـلان في البَيـع): فلاّنـكـەس نرخی كالاّكە كەم مەكەرەوە.

**كاس فلاناً**: فلاّنكەسی خستە سەر زەوی، یان بەسەر سەری دا ترێلی كرد.

**اكاسَ فلاناً**: بەمانا (كاسَهُ) دێ.

**كَوَّسَهُ**: بەسەر سەری دا ترێلی كـرد ٥ یان ژێرەو ژوری كرد.

**إكْتاسَـهُ عـن حاجتـه**: لەنیـشەكەی مـەنعی كـردو نەیهێـشت ئـەنجامی بدا.

**تكـاوَسَ لَحْمُـهُ**: گۆشـتی كەوتـە سـەر یەكو قەڵەو بوو.

**تكاوَسَ العُشْبُ ونحوه**: گیـاو گژەكـە زۆر بوو تێك هالاّ.

**تَكَـوَّسَ الرجـلُ**: پیاوەكـە تـێ شـكاو نشوستی بەسەردا هات.

**الكاسُ**: سوككراوی وشەی (الكأسُ).

**الكَـوْسُ**: جونبـوش هـاتنی دەریایـەو نزیكبوونـــەوەی دەریاوانەكانـــە لـــە خنكان.

**الكُـوسُ**: تـەپڵ ٥ دارێكـی سـێ سوچـە (ســێ گۆشـــەیە) دارتـــاش گۆشـــەی تەختەدارەكانی پێ مەزندە دەكا.

**الكَوْسـاءُ**: (أرض كَوْسـاء) زەوییـەكی فـرە گیـاو گـژە، گیـاو گژەكـەی پـڕو تێكچرژاوەو سواری یەك بووە.

**الكُوسَـــــــةُ**: كولەكەیـــــــەكی وردە دەكوڵێندرێو دەخورێ.

**الكُوسِيُّ من الخيل**: ئەسپی قاچ كورت (دەست كورت).

**كَوْسَجَ**: بڕوانە مادەی (كَسَجَ).

**تَكَوْسَجَ**: بڕوانە مادەی (كَسَجَ).

**الكَوْسَجُ**: بڕوانە مادەی (كَسَجَ).

**كاعَ الكلْبُ كَوْعاً**: سەگەكە بەناو لمبەلاّن دا ڕۆیـیو بـەهۆی گـەرمی لمبەكـەوە قاچـەكانی ڕاسـت دانـەدەنان ٥ لەسـەر چۆكی ڕۆیی نەیتوانی هەڵسێ.

**كاعَ عن الشَّيْئ**: لەشتەكە ترسا.

**كَوِعَ فلان كَوْعاً**: فلاّنكـەس لەپەدەسـتی پـەنا مەچـەكی ئەسـتوور بـوون ٥ مەچـەكی وشـكو باریـك بـوو ٥ دەستەكانی ڕویان لەیەكتر كرد ٥ (فهـو أكوَع وهي كَوْعاء).

**كَوَّعَـه بالـسيف**: بەشمـشێر لێـی دا تالەپەدەستی خوارو خێچ بوو.

**تَكَوَّعت يده**: دەستی خوار بوو.

**الكـاع**: لەپەدەسـت بـەلای قامكـە بـچكۆلەوە، كـە پێـشی دەگـوترێ: (الكرسوع).

**الكـــوع**: لەپەدەســت بــەلای قامكــە گەورەوە ◊ (ك: أكواع).

**كـــاف الأديـمَ كَوْفـاً**: قـەراخو بێجـاغی چەرمەكەی بڕی.

**كَـوَّفَ الرَّجُـلُ**: پیاوەكـە هاتـە شـاری كوفە.

**كَوَّفَ الشَّيْئَ**: شتەكەی دوور خستەوە.

**كَوَّفَ الأديمَ**: چەرمەكەی بڕی.

**كَوَّفَ الكافَ**: پیتی كافی نووسی.

**تَكَوَّفَ الرجلُ**: پیاوەكە خۆی شوبهاند بـە دانیـشتوانی شـاری كوفـە ◊ یـان خۆی بەكوفەیی لەقەڵەم دا.

**تَكَوَّفَ القومُ**: خەڵكەكـە كۆبوونـەوەو خەرمانەیان بەست.

**الكَوْفَى**: دەگوترێ: (الناس في كوفى من أمـرهم) خەڵكەكـە دەربـارەی ئیشی خۆیان ڕێكو پێك نین.

**الكَوْفانُ**: لمبی خڕەوەبوو، كۆمەڵە لمبی خڕكـراوە ◊ قەصـەبو درەختـی بـێ كــەڵكو شــین بــوو لــە شــوێنی نــەگونجاو ◊ نارەحــەتیو چــورتمو ناخۆشــی ◊ شــەڕی ســامناك ◊ بــــەرگریو پارێزگــــاری لــــەمافو نەتەوەو ناموس.

**الكوفيـة**: پارچـە قوماشـی ئاوریـشمو شتی وا كەدەكرێتـە گـۆترمو لـەژێر عەگاڵەوە سەری پـێ دادەپۆشـرێ ◊ یان لەمل دەئاڵێندرێ.

**كَوْكَبَ**: بڕوانە مادەی (كَكَبَ).

**الكَوْكَبُ**: بڕوانە مادەی (كَكَبَ).

**الكَوْكَبة**: بڕوانە مادەی (كَكَبَ)..

**الكوك**: خەڵوزی كوك ◊ خەڵوزی ماوە لــە عەمەلیــەی چــۆڕاندنەوەی خەڵوزی بەرد.

**الكوكــايين**: مادەیــەكی ســـڕكەرە لەگــەڵای ڕوەكــی كۆكــا بەرهــەم دەهێنـدرێو لەبواری پزیشكی دا بـۆ كاری سڕكردن بەكاردەهێندرێ.

**تَكَوَّلَ القومُ**: خەڵكەكە خڕبوونەوە.

**تَكَـــوَّلَ علــــى فــــلان**: خەڵكەكــە گەلەكۆمــەكیان لــە فــلان كــردو بــەجنێو و بەلێـدان پـەلاماریان داو وازیان لێ نەهێنا.

**إنْكــالوا عليــه**: لێــی خڕبوونـــەوە، گەلەكۆمەكێیان لێ كرد.

**الأكْوَلُ**: گرد، تەپۆڵكە، كێوی بـچوك ◊ (ك: أكاول).

**الكولان**: ئەسەل (درەختی ئەسەل).

**الكولايا**: تـوێكڵی درەختـی كۆلایا كـە مــــادەی صــــابونی تێدایــــە بــــۆ پەیـداكردنی كـەفو هەڵـچون لـە مەشروبات بەكاردەهێندرێ.

**كومَ الشَّيْئُ كَوْماً**: شتەكە گـەورە بـوو ◊ بەزۆری بۆ گەورەبوونی دوگی حوشتر دەگوترێو بەكاردێ ◊ دەگوترێ: (كـومَ البعيرُ، فهو أكوم والناقة كوماء).

**كَــمَ الـشَيْئَ**: شــتەكەی كــۆكردەوەو هەندێكی خستە سەر هەندێكی.

**اكتامَ الرجُلُ**: پیاوەكە لەسەر سەری پەنجەكانی قاچی هەڵتروشكا.

**الكَــوْمُ**: كۆمەڵــە شــتی خڕكــراوە لەهەرشــتێك بــێ ٥ بــەرزایی‌و تەپۆڵكە ٥ (ك: أكوام وكيمان).

**الكَوْمَةُ**: بەمانا (الكَوْمُ) دێ.

**كان كوناً وكياناً**: پەیدا بوو.

**كَوَّنَ الشَيْئَ**: شتەكەی لە پارچەكانی پێك هێنا ٥ پارچەكانی لێك دان‌و شتەكەی دروست كرد.

**كَـوَّنَ الله الـشَيْئَ**: خــودا شــتەكەی لەنەبوونــەوە هێنایــە گۆڕەپــانی بوونەوە.

**إكْتانَ الشَيْئُ**: شتەكە پەیدا بوو.

**تَكَـوَّنَ الـشَيْئُ**: شـتەكە پەیـدا بـوو ٥ دەگوترێ: (كَوَّنَهُ فَتَكَـوَّن) ٥ پەیـدای كردو پەیدا بوو ٥ كەوتە جم‌و جۆڵ ٥ عەرەب بەناحەز دەڵێن: (لا كـان ولا تكَوَّنْ) نەبووە نەجولاوەتەوە.

**تَكَـوَّنَ فلانــاً**: چــووە ســەر شــێوەی فلانكــەس ٥ شــێوەی ئــەوی گــرت ٥ لەفــەرموودەی پێغەمبــەردا (د.خ) هاتووە: (من رآني في المنام فقد رآنـي فان الشيطان لا يَتَكَوَّنُني).

**إستكان**: ملكەچ‌و زەلیل بوو.

**الكائنة**: ڕوداو، هەبوو ٥ (ك: كوائن).

**الكانون**: بڕوانە مادەی (كَنَنَ).

**الكَوْنُ**: هەبوونی ڕەهاو گشتی ٥ هەروا نـاوە بـۆ ئـەو شـتەی بەیـەك تـەكان پەیـدا دەبـێ ٥ وەكـوو پەیـدا بـوونی ڕوناكی لەدوای تاریكی.

**الكونان**: دونیاو قیامەت.

**الكينـــة**: حاڵـــەت‌و چـــۆنیەتی ٥ دەگوترێ: (بـات فـلان بكينـة سـوء) فلانكـەس بـەحاڵێكی نـاخۆش ڕۆژی لێ بۆوە.

**المكانُ**: مەنزڵ‌و شوێن، پلەو پایە.

**المكانة**: شوێن، پلەو پایە.

**كاهَهُ كَوْهاً**: بۆنی دەمی كرد.

**كَوِهَ الرجلُ كَوَهاً**: پیاوەكە سەرسام بوو.

**تَكَوَّهت عليه اموره**: ئیشەكانی زۆرو پەرتەوازە بوون.

**كَوَّى في البيت كَوَّةً**: كونی دوكەڵكێش‌و هەواكێشی لەخانوەكە كرد.

**تَكَــوَّى**: چــووە نـــاو شــوێنێكی تەنگەبەرەوە تێیدا وێكهاتەوە.

**الكَـوُّ**: كـونی دیـوار (پەنجـەرە) بـۆ دوكـەڵ دەركـردن‌و هـەوا هێنـان‌و گۆڕین‌و ڕوناكی ناو خانوەكە.

**الكَوَّةُ**: بـەمانا (الكَوُّ) دێ ٥ (ك: كوّات وكِواء).

**كَواه كَيّاً وكِيَّةً**: داخی كرد ٥ بەئاسنی گەرم كراو پێستی سوتاند.

**كـــوى الثـوبَ**: قوماشـەكەى ئوتـوكرد ئوتـوى بەسـەردا هێنـاو بـرد بۆئـەوەى چرچ‌و لۆچى نەمێنن.

**كوى فلاناً بعينه**: چاوى بڕيە فلاّنكەس.

**كَـــوَتَ العقـــربُ فلانـــاً**: دووپـــشك بەفلاّنكەسيەوە دا.

**كاواهُ**: جوێنى پێدا.

**إكْتوى**: بۆ موتاوەعەى (كوى) دێ.

**إكتـوى فـلان**: فلاّنكـەس هەنـدێ لـە جەسـتەى خـۆى داخكـرد ٥ خـۆى هەلْكێشاو لافى كـردەوەى پەسـندى بۆخۆى لێداو وايش نەبوو.

**تَكـوّى بالـشيئ**: بەگـەرمى شـتەكە خۆى گەرم كردەوە.

**تَكوّى الرجلُ بجسد إمراته**: پياوەكە خـۆى بەجەسـتەى ژنەكـەى گـەرم كردەوە.

**إستكوى**: هەولّى داخكردنى دا.

**الكاوياء**: كاوييە، داخ، پارچە ئاسنێكە گەرم دەكرێ‌و داخ كردنى جەستەى ئاژەلّ‌و شتى واى پێ ئەنجام دەدرێ.

**الكَوّاءُ**: كەسـێك زۆر ئيـشى داخكـردن ئـەنجام بـدا ٥ كەسـێك ئيـشى جـل ئوتـوكردن بـێ (ئوتوچـى) ٥ زمـان پيس‌و فيتنەو جنێو فرۆش.

**الكَيَّةُ**: شوێنى داخ كردن.

**المِكـواةُ**: ئوتـو، ئـامێرى ئوتـوكردن ئامێرى داخكردن.

**كي**: پيتێكە لەو پيتانەى فيعلى موزاريع مەنصوب دەكا ٥ وايش دەبێ حـەرفى جەڕەو ماناى (إلى) دەگەيـەنێ ٥ جارى وايش هەيە بەمانا (كَيْفَ) دێ.

**كاءَ عن الأمر كَيْئاً و كِيئةً**: لەكارەكە بێـزار بـوو پێـى نـاخۆش بـوو، لـەپێش چاوى شيرين نەبوو بەر دلّى نەكەوت.

**اكــاءه إكــاءً و إكــاءَةً**: لەكارەكــەى گێڕايـەوە نەيهێـشت بـچێ ئـەنجامى بدا.

**الكاءُ**: زەعيف‌و ترسنۆك‌و ورە ڕوخاو.

**الكَيْئُ والكِيئُ**: بەمانا (ألكاء) دێ.

**كَيَّتَ الجهازَ**: ئامێرەكـەى ئامـادە كـرد بۆ ئيش پێ كردن.

**كَيَّتَ الوعاءَ**: زەرفەكەى پڕ كرد.

**كَيْـتَ و كَيَـتَ**: ئـاواو ئـاوا، شـێلەدرو بێلەدر.

**كاح فيه السيفُ كَيحاً**: شمشێرەكە كارى تێكرد.

**كَيِحَ كَيَحـاً**: ناشـيرين‌و زبـرو نـاقۆلاّ بـوو (فهو أكيح وهي كيحاء).

**اكاحَ**: بـەمانا (كـاحَ) دێ ٥ دەگـوترێ: (ما أكاحَ فيه الـسيف) شمـشێر كـارى لێ نەكرد.

**اكاحَ فلاناً**: فلاّنكەسى بەهيلاك برد.

**الْكَـاحُ**: بنـارى كێـو پێدەشـت ٥ (ك: أكياح وكيوح).

**الكيحُ**: بەمانا (الكاح) دێ.

**كادَ الغرابُ كيداً ومكيدةً**: قەلەڕەشەکە بەهەموو هێزی قیڕاندی.

**كادَ الزَّنْدُ**: چەرخەکە ئاگری کردەوە.

**كادَ بنفسه**: بەناڕەحەتی گیانی لەدەست دا، لەکاتی گیانەلاو دا زۆر ناڕەحەت بوو.

**كادَ فلاناً**: فێڵی لە فلانکەس کرد، هەڵی خەڵەتاند.

**كادَ لـه**: فێڵی بۆ کرد ٥ پیلانی بۆ نایەوەو ویستی زیانی پێ بگەیەنێ.

**كادَ القومَ**: شەڕی لەگەڵ خەڵکەکە کرد.

**كادَ الشَّيْئَ**: چارەسەری شتەکەی کرد.

**كايَدَهُ**: بەمانا (كادَهُ) دێ.

**تكايد الرجلان**: دوو پیاوەکە فێڵیان لەیەکتر کرد ٥ دەشگوترێ: (في فلان تكايد) فلانکەس جۆرە توندو تیژییەکی هەیە.

**الكَيدُ**: فێڵ کردن لەکەسانی دیکەو هەوڵی زیان پێگەیاندنیان بەدزیو پەنامەکی ٥ ئەنجامدانی کار بەرێکو پێکیو بە شێوەی عەدالەت ٥ وشەی (كَيْد) ئەگەر پاڵ ئادەمیزاد بدرێ مەبەست مانای یەکەمە ٥ ئەگەر پاڵ خودا بدرێ مانای دووەم مەبەستە ٥ هەروا وشەی (كَيْد) بەمانا شەڕو جەنگ دێ، دەگوترێ: (غزا فلان فلم يلق كَيداً) فلانکەس غەزای کردو توشی شەڕو جەنگ نەبوو (ك: كيود).

**الكيَّادُ**: فێڵەزانو تەڵەکەباز ٥ ڕێوی سروشت.

**المكِيدَةُ**: فێڵ ٥ (ك: مكايد).

**كـارَ الفَرَسُ كياراً**: ئەسپەکە کەوتە ڕۆیشتنو کلکی بەرز کردەوە ٥ (فَهوَ كَيِّرٌ).

**اكار عليه يضرب بـه**: دەستی کرد بەلێدانی.

**تكايَرَ الرجلان**: دوو پیاوەکە لێکیان دا.

**الكِيرُ**: موشەدەمە؛ ئامێرێکە لە پێست دروست دەکرێو ئاسنگەر بەکاری دێنێ بۆ گەشانەوەو خۆشکردنی ئاگری کورەکەی ٥ (ك: أكيار وكِيَرَة).

**الكيروسين**: شلەمەنییەکە ئامادەباشی زۆری تێدایە بۆ گرگرتن لەمادەی پیترۆڵ دەردەهێندرێ.

**كـاسَ الوَلَدُ كَيْساً وكِياسَةً**: منداڵەکە عاقڵ بوو ٥ زیرو ئاغر بوو ٥ (فَهو كَيْسٌ وكَيِّسٌ) ٥ (ك: أكياس و كَيَسَةٌ وكَيْسى) (وهو الأكْيَسُ وهي الكَوْسى والكِيسى).

**كاس فلاناً**: بەعەقڵو زیرەكی بەسەری دا زاڵ بوو.

**اكـاسَ، واكْـيَسَ الإنسان**: منـداڵی عـاقڵو ئـاغری بـوون (فهـو مُكْـيِسٌ وهي مُكيِسَة).

**كايَسَهُ**: وای لێ كرد عاقڵ بێ.

**تَكَيَّسَ فـلان**: فلاّنكەس ئـاغری خۆی نیشان دا ٥ زیرەكو وریا بوو.

**الكُوسى**: عاقڵو ئاغر.

**الكِياسَةُ**: بۆچونی زیرەكانەو بەسودو هەڵبژاردنی ڕێبازی ڕاست.

**الكَيْسُ**: سـەخی سروشتـیو گفـتوگۆ خۆشـی ٥ عــەقڵو ئــاغری ٥ (ك: كُيُوسٌ).

**الكِـيسُ**: كیــسەباخەڵ، كیــسەیەكی تایبەتییە بۆ تێدا هەڵگرتنی پارەو درو مـرواریو شـتی لـەو جـۆرە ٥ تورەكە پارە، سەردەمێك بـووە پـارە زیو و نیكڵو شتی لـەو جۆرە بـووە هـەموو كیـسەیەك ئەندازەیـەكی تێكراوەو مامەڵە بـەو كیسە پارانـە كـراوە ٥ گـوتراوە: (إشـتريت فرسـي بخمسة أكياس) ئەسپەكەم كڕیوە بـە پێـنج كیسە پـارە ٥ هـەروا وشـەی (الكـيس) نـاوە بـۆ ئـەو پەردەیـەی منداڵ لەناو سكی دایكی دا تێیدایە.

**المِكْياسُ**: (إمْـرَأة مِكْيـاسٌ) ئافرەتێكە كـوڕی عاقـڵو ئـاغری بـوون ٥ (ك: مكاييس).

**كاصَ الرجلُ كيصاناً وكيوصاً**: پیاوەكە ترسنۆك بوو، وورەی ڕوخاو لەكارەكەی دا ســەركەوتوو نــەبوو ٥ پیاوەگــە بەخێرایی ڕۆیی.

**كــاص مـن الطعـام والـشراب**: زۆری خواردن خواردو شلەمەنی خواردەوە.

**كــاصَ عنـد فـلان مـن الطعـام**: لای فلاّنكەس خواردنی خوارد.

**كاص طعامَهُ**: بەتەنیا نانی خوارد.

**كايَصَهُ**: پراوەی كرد.

**الكَيْصُ**: ڕژدی تەواو.

**الكـيصُ**: پیـاوی تەنگــەتیزە ٥ دڵ پیسو ڕژدو درۆزن.

**كاف الشَّيْئَ كَيْفاً**: شتەكەی بڕیەوە.

**كَيَّفَ الشَّيْئَ**: شتەكەی پارچە پارچە كـرد ٥ چـۆنیەتییەكی تایبـەتی بـۆ دیاریی كرد.

**كَيَّفَ الهواءَ**: پلەیەك هەواكەی گۆڕی بـۆ ساردی یـان بـۆ گـەرمی بـەهۆی ئـامێری گـەرم كـەرەوە یـان سـارد كەرەوە.

**إنْكافَ الشَّيْئُ**: شتەكە بڕایەوە.

**تَكَيَّـفَ الشَّيْئُ**: شتەكە چۆنیەتیەكی بۆخۆی وەرگرت.

**تَكَيَّفَ الهواءُ**: پلەی کەش‌و هەوا گۆڕا ◊ پلەی گەرمی یان ساردی گۆڕدرا ◊ پلەی ساردی لەهاوین دا دابەزی و لەزستان دا بەرز بۆوە.

**تَكَيَّفَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کەم کردەوە.

**كَيْفَ**: ئیسمێکە مەبنییە لەسەر فەتحە ◊ بەزۆری مەعنای ئیستفهام دەگەیەنێ ◊ وایش دەبێ بۆ مەعنای تەعەججوب‌و سەرسام بوون دێ.

**الكِيفَة**: پارچە چەرم‌و شتی وا ◊ یان پارچە پەڕۆیەك داوێنی کراسی لەلای پێشەوە پێ پینە بکرێ.

**الكيفية**: حاڵ‌و چۆنیەتی شت.

**مُكَيِّف الهواء**: هەوا گۆڕ گەرمکەرو ساردکەر.

**كَالَ الزندُ كيلاً ومكالاً**: چەرخەکە ئاگری نەکردەوە.

**كالَ البُرَّ وغَيْرَهُ**: گەنمەکەی پێوا، نیسك‌و نۆك‌و جۆو چەلتوکەکەی پێوانە کرد ◊ دەگوترێ: (كِلْتُ فلاناً الطعامَ) خواردنم بۆ فلانکەس پێوانە کرد.

**كَالَ الصيْرَفُ الدراهِمَ**: پارە خوردکەرەوەکە دیرهەمەکانی کێشانە کردن.

**كالَ الشَّيْئَ بالشيئ**: شتەکەی بەیەك گرتن، بەرامبەری پێ کردن.

**كال الفرسَ بغيره**: مەزەندەی ڕۆیشتنی ئەسپەکەی کرد بە ئەسپێکی تر.

**كِيلَ وكولَ القَمْحُ**: گەنمەکە بەئامێری پێوانە مەزەندە کرا ◊ (فهو مكيل ومكول).

**كايلت فلاناً**: بۆ فلانکەسم پێواو ئەویش بۆی پێوام.

**كايَلَ الرجلُ صاحِبَهُ**: پیاوەکە قسەی وەکوو هاوەڵەکەی کردن، کردەوەی ئەوی کرد ◊ یان جنێوی پێدان‌و تێرجوێنی کرد.

**كَيَّلَ فلان**: فلانکەس ترسا، ترسنۆك بوو.

**كَيَّلَ لفلان البُرَّ**: زۆری گەنم بۆ فلانکەس پێوا.

**إكْتالَ منه وعليه**: لێی وەرگرت، بۆخۆی سەرو کاری پێوانەکەی کردو نەیهێشت خاوەنەکەی بۆی بپێوێ.

**تَكايَلَ الرجلان**: ئەو دوو پیاوە هەریەکەیان دانەوێڵەی بۆ ئەوی تر پێوا ◊ یان جنێویان بە یەکتر دان‌و یەکتریان تێرجنێو کرد.

**الكِيالَة**: کرێی پێوانەکردن ◊ پیشەی پێوانەکردن.

**الكَيْلُ**: ئەو ئامێرەی شتی پێ پێوانە دەکرێ وەکوو قسناغ‌و تەنەکەو

ڕیەو شتی وا ، ئەو پریشك و شتانەی لەچەرخ و بەردو ئەستێ لەكاتی ئاگركردنەوەدا بڵاو دەبنەوە.

**الكَيْلَةُ**: ئامێرێكە دانەوێڵەی پێ پێوانە دەكرێ ، لەڕیەو تەنەكەو قسناغ بچوكترە.

**الكَيْلَجَـةُ**: ئامێرێكی پێوانەی عێراقیانە، دەڵێن مەنێك و حەوت لەسەر هەشتی مەنێك دەگرێ.

**الكيلَـةُ**: شێوەی پێوانە كردنی دانەوێڵەو مێوژو خورما ڕەقە.

**الكَيّالُ**: پێوانەكەر ، (قەپانچی).

**الكَيُّلُ**: ئەو وردەیەی لەكاتی بڕینەوەو كرانـدنی زێڕو زیو و شتی وادا هەڵدەوەرێ.

**الكَيّـول**: دواسەنگەرو دواڕیزی جەنگاوەران لەشەڕدا ، ترسنۆك ، تەپۆلكەو بەرزایی لە زەوی دا.

**الكيلو**: هەزار ، دەگوترێ: (كيلو غرام وكيلومتر).

**الكيلوس**: خواردەمەنی كە لەمەعیدەدا خڕدەبێتەوە پێش ئەوەی بچێتە ناو ڕیخۆڵەوە.

**الكيمياء**: فێڵ زانی و وریایی و لێزانی بۆ گۆڕینی هەندێ مەعدەن بۆ مەعدەنی تر.

**علم الكيمياء**: لەزاراوەی كۆن داو لای زاناكان بریتی بووە لە لابردن و دارنینی هەندێ تایبەتمەندی لە جەوهەرە مەعدەنییەكان داو تێدا خوڵقاندنی هەندێ تایبەتمەندی ترو گۆڕینی مەعدەنەكە بۆ زێڕ ، بەڵام زانستی كیمیا بەلای زانا تازەو سەردەمەكانی پێشكەوتنی پیشەسازی بریتییە لەزانیارییەك كە لێكۆڵینەوە لە تایبەتمەندییە عونصورە مادییەكانی جەوهەرە مەعدەنییەكان دەكاو ئەو گۆڕانكاری و دیاردانەی بەسەریا دێن لەكات و ساتی دیاریكراودا، بەتایبەتی كاتێ هەندی مەعدەن لەهەندێكی تردا تێكەڵ دەبن، یان هەندێكیان لەهەندێكیان جیادەكرێنەوە.

**الكيميائي**: كیمیاگەر، شارەزا لەبواری كیمیادا ، یان ئەو كەسەی یاسا كیمیاوییەكان بەتەواوی پەیڕەو دەكا ، (ك: كيميائيون وكيماويون).

**التفاعل الكيميائي**: ئەومیە مادەیەك كاربكاتە سەر مادەیەكی ترو پێكهاتەكەی بگۆڕێ ، یان گۆڕانی كیمیاویانەی شت لەمادەدا بەهۆی گەرمی یان كاریگەریی كارەبائییەوە.

**الكَيْمُوسُ**: پاڵفتەی بزێو، مادەیەکی شیر ئامێزە سپییە گونجاوە بۆ هەڵمژین ڕیخۆڵەکان وەری دەگرن لەخۆراك کاتێ ئەو خۆراکە بەناویان دا تێپەڕ دەکا.

**الكيوسية**: پێویستی جەستە بۆ خواردنو بزێو.

**كان كيناً**: ملکەچ بوو.

**اكان اللهُ**: خودا زەلیلو ملکەچی کرد.

**إكتان**: غەمبار بوو ٥ خەفەتی خۆی شاردەوە.

**إستكان**: زەلیل بوو.

**الكينا**: تویکڵی ڕووەکێکە لە پێڕی (الكرّية) لەئەمریکای باشورو وڵاتی هیندوستانو جاوە دەڕوێ، مادەی کینینو کۆندینو چەند شتێکی تری لێ دەردەهێندرێ.

**الكَيْنَةُ**: کەفالەتو بەرعۆدەبوون.

**المُكْتَانُ**: کەفیلو بەرعۆدە بوو.

**كاهَهُ كَيْهاً**: بۆنی دەمی کرد.

**الكيّة**: کەسێك فرتو فیڵ نەزانێ.

# جدول العناصر الكيمائية

| الاسم | الرمز | الرقم الذري | الثقل الذري |
|---|---|---|---|
| اربيوم | Er | ٦٨ | ١٦٧،٢ |
| ارغون | A | ١٨ | ٣٩،٩٤٤ |
| ازوت | N | ٧ | ١٤،٠٠٨ |
| استتين | At | ٨٥ | ٢١٠ |
| اكتينيوم | Ac | ٨٩ | ٢٢٧ |
| اكسيجين | O | ٨ | ١٦ |
| الومنيوم | Al | ١٣ | ٢٦،٩٨ |
| امريسيوم | Am | ٩٥ | ٢٤٣ |
| انتيموان | Sb | ٥١ | ١٢١،٧٦ |
| إنديوم | In | ٤٩ | ١١٤،٧٦ |
| اورانيوم | U | ٩٢ | ٢٣٨،٠٧ |
| اوروبيوم | Eu | ٦٣ | ١٥٢ |
| أوسميوم | Os | ٧٦ | ١٩٠،٢ |
| ايتربيوم | Yb | ٧٠ | ١٧٣،٠٤ |
| إيتريوم | Y | ٣٩ | ٨٨،٩٢ |
| إيريديوم | Ir | ٧٧ | ١٩٣،١ |
| باريوم | Ba | ٥٦ | ١٣٧،٣٦ |
| برازيوديميوم | Pr | ٥٩ | ١٤٠،٩٢ |
| بركليوم | Bk | ٩٧ | ٢٤٥ |
| بروتكتينيوم | Pa | ٩١ | ٢٣١ |
| بروم | Br | ٣٥ | ٧٩،٩١٦ |
| بروميثيوم | Pm | ٦١ | ١٤٥ |
| بريليوم | Be | ٤ | ٩،٠١٣ |
| بسموت | Bi | ٨٣ | ٢٠٩ |
| بلاتين | Pt | ٧٨ | ١٩٥،٢٣ |
| بلاديوم | Pd | ٤٦ | ١٠٦،٧ |
| بلوتونيوم | Pu | ٩٤ | ٢١٠ |
| بوتاسيوم | K | ١٩ | ٣٩،١ |
| بورق | B | ٥ | ١٠،٨٢ |
| بولونيوم | Po | ٨٤ | ٢١٠ |
| تاليوم | Tl | ٨١ | ٢٠٤،٣٩ |
| تربيوم | Tb | ٦٥ | ١٥٩،٢ |
| تكنيسيوم | Tc | ٤٣ | ٩٩ |
| تلّوريوم | Te | ٥٢ | ١٢٧،٦١ |
| تنتاليوم | Ta | ٧٣ | ١٨٠،٨٨ |
| تنجستين | W | ٧٤ | ١٨٣،٩٢ |
| توريوم | Th | ٩٠ | ٢٣٢،١٢ |
| توليوم | Tm | ٦٩ | ١٦٩،٤ |
| تيتانيوم | Ti | ٢٢ | ٤٧،٩ |
| جرمانيوم | Ge | ٣٢ | ٧٢،٦٠ |
| حديد | Fe | ٢٦ | ٥٥،٨٥ |
| ديسبروسيوم | Dy | ٦٦ | ١٦٢،٤٦ |
| ذهب | Au | ٧٩ | ١٩٧،٢ |
| رادون | Rn | ٨٦ | ٢٢٢ |
| راديوم | Ra | ٨٨ | ٢٢٦،٠٥ |
| رصاص | Pb | ٨٢ | ٢٠٧،٢١ |
| روبيديوم | Rb | ٣٧ | ٨٥،٤٨ |
| روثينيوم | Ru | ٤٤ | ١٠١،٧ |
| روديوم | Rh | ٤٥ | ١٠٢،٩١ |
| رينيوم | Re | ٧٥ | ١٨٦،٣١ |
| زئبق | Hg | ٨٠ | ٢٠٠،٦١ |
| زركونيوم | Zr | ٤٠ | ٩١،٢٢ |
| زرنيخ | As | ٣٣ | ٧٤،٩١ |
| زنك | Zn | ٣٠ | ٦٥،٣٨ |
| سترونشيوم | Sr | ٣٨ | ٨٧،٦٣ |
| سريوم | Ce | ٥٨ | ١٤٠،١٣ |
| سكانديوم | Sc | ٢١ | ٤٤،٩٦ |
| سليسيوم | Si | ١٤ | ٢٨،٠٩ |
| سلينيوم | Se | ٣٤ | ٧٨،٩٦ |
| سماريوم | Sm | ٦٢ | ١٥٠،٤٣ |
| سيزيوم | Cs | ٥٥ | ١٣٢،٩١ |
| صوديوم | Na | ١١ | ٢٢،٩٩٧ |
| غاليوم | Ga | ٣١ | ٦٩،٧٢ |
| غدولينيوم | Gd | ٦٤ | ١٥٦،٩ |
| فاناديوم | V | ٢٣ | ٥٠،٩٥ |
| فرانسيوم | Fr | ٨٧ | ٢٢٣ |
| فرميوم | Fm | ١٠٠ | ٢٤٨ |
| فضّة | Ag | ٤٧ | ١٠٧،٨٨٠ |
| فلور | F | ٩ | ١٩ |
| فوسفور | P | ١٥ | ٣٠،٩٧٥ |
| قصدير | Sn | ٥٠ | ١١٨،٧ |
| كادميوم | Cd | ٤٨ | ١١٢،٤١ |
| كبريت | S | ١٦ | ٣٢،٠٦٦ |
| كربون | C | ٦ | ١٢،٠١ |
| كروميوم | Cr | ٢٤ | ٥٢،٠١ |
| كريبتون | Kr | ٣٦ | ٨٣،٨٠ |
| كسينون | Xe | ٥٤ | ١٣١،٣ |
| كلسيوم | Ca | ٢٠ | ٤٠،٠٨ |
| كلور | Cl | ١٧ | ٣٥،٤٥٧ |
| كليفورنيوم | Cf | ٩٨ | ٢٤٦ |
| كوبالت | Co | ٢٧ | ٥٨،٩٤ |
| كوريوم | Cm | ٩٦ | ٢٤٣ |
| لنتانم | La | ٥٧ | ١٣٨،٩٢ |
| لوتاسيوم | Lu | ٧١ | ١٧٤،٩٩ |
| ليثيوم | Li | ٣ | ٦،٩٤٠ |
| مغنيزيوم | Mg | ١٢ | ٢٤،٣٢ |
| منغنيزيوم | Mn | ٢٥ | ٥٤،٩٣ |
| موليبدانم | Mo | ٤٢ | ٩٥،٩٥ |
| نبتونيوم | Np | ٩٣ | ٢٣٧ |
| نحاس | Cu | ٢٩ | ٦٣،٥٤ |
| نيكل | Ni | ٢٨ | ٥٨،٦٩ |
| نيوبيوم | Nb | ٤١ | ٩٢،٩١ |
| نيوديميوم | Nd | ٦٠ | ١٤٤،٢٧ |
| نيون | Ne | ١٠ | ٢٠،١٨٣ |
| هفنيوم | Hf | ٧٢ | ١٧٨،٦ |
| هلميوم | Ho | ٦٧ | ١٦٤،٩٤ |
| هليوم | He | ٢ | ٤،٠٠٣ |
| هيدروجين | H | ١ | ١،٠٠٨٠ |
| يود | I | ٥٣ | ١٢٦،٩١ |

**اللام (ل)**: پیتی بیست و سێههمه له پیتهکانی هیجا ◦ شوێنی لێ دەرهاتنی سەری زوبان کەلەبنکی ددانی پێشەوەی لای سەرو بدا.

**لاتَ**: نەفیو نەرێیی دەگەیەنێ، وشەیەکه پێك هاتووه له (لا)ی نافیەو (تێی) تەئنیس وەکوو وشەی (لیس) لەماناو لەفز دا کاریگەریی خۆی هەیەو مانای زەمان نەفی دەکاو بەزۆری یەکێك لەئیسمو خەبەری حەزف دەکرێو حەزف کراوەکە ئیسمەکەیەتی ◦ وەکوو (ولاتَ حینَ مناص) لێرەدا ئیسمەکەی حەزف کراوەو لەبناغەدا بەم جۆرە بووە (ولات الحینُ حینَ مناص).

**اللاّزَوَرْدُ**: جۆرە بەردێکی بەنرخە، رەنگی شینی ئاسمانییە یان رەنگی وەنەوشەیی هەیە لەئەفغانستانو ئەمریکا زۆرە بۆ جوانیو رازاندنەوە بەکاردێ.

**لأطَهُ لأطاً**: فەرمانی پێکردو زۆری لێ تامیلا کردەوە ◦ داوای کردو وازی لێ نەهێنا هەر سووربوو لەسەر داواکردنەکەی چاوی تی بری تا تارمایی دیار بوو چاوی لێ هەڵ نەبری.

**لأطَهُ بسهم**: تیری لێ دا، بەتیر هەنگاوتی.

**لأطَهُ بالعصا**: بەگۆچانو دار عەصا لێی دا.

**لأطَهُ علیه**: شتەکەی لێ قورس کرد پێی لێ داگرت.

**لأطَ في مروره**: بەشێوەی هەڵاتن ڕۆییو ئاوڕی لەهیچ نەدایەوە.

**لأفَ الطعامَ لأفاً**: خواردنەکەی بەباشی خوارد.

**ألأكَهُ الی فلان**: بۆلای فلانکەس ناردی بۆئەوەی نامەو ڕاسپاردەی پێ بگەیەنێ ◦ دەگوترێ: (ألِكني الی فلان) ئەوەم بۆ بەفلانکەس بگەیەنە ◦ لەبناغەدا (الئِكني) بووە سەنگو سوکی تێداکراوە.

**إستَلْأَكَ له**: نامەو پەیامی ئەوی برد.

**المَلْأَكُ**: نامە ◦ پەیام، بزوێنی هەمزە کە گوازراوەتەوە بۆ سەر لامەکەو هەمزەکە حەزف کراوە وشەکە بووەتە (مَلَك) ◦ (ك: مَلائِك و ملائِكة).

**المَلْأكَةُ**: نامەو پەیام.

**لألأ النجمُ أو البرقُ**: ئەستێرەکە درەوشایەوە.

**لألأ بعينه**: چاوی بریقەی دا.

**لألأ الثــور بذنبــه**: کەڵەگاکــە کلکــی ڕاوەشاند.

**لألأت النارُ**: ئاگرەکە هەڵگیرسا.

**لألأ الدَمْعَ**: فرمێسکی بەسـەر ڕومـەتی دا وەکوو مرواری هێنانە خوارەوە.

**تلألأ النجم أو البرق**: بەمانا (لألأ) دێ.

**تلألأ وجهه**: ڕوخساری درەوشایەوە.

**تلألأت النار**: ئاگرەکە هەڵگیرسا.

**اللّآء**: مرواری فرۆش.

**اللّآل**: بەمانا (اللّآء) دێ.

**اللّئالَةُ**: پیشەی مرواری فرۆش.

**الــلألاءُ**: ڕونــاکی چــراو شــتی وا ٥ دەگوترێ: (أبْصَرْتُ لألاء السراج).

**اللُؤلــؤ**: مــرواری ٥ ئــەم مــادە زۆر بەنرخـــە، لـــەناو صـــەدەف دا پەردوەردە دەبێ لەپاشەڕۆك‌و شتی ڕەق بــووی ڕون‌و درەوشــاوە کــە لــەگۆڕانکاری‌و بــەردەوام بــوونی عەمەلیـــەی کیمیـــاوی نێـــوان پاشەڕۆکی برێ زیندەوەری دەریایی دروست دەبێ.

**اللؤلؤان**: شتێك ڕەنگی وەکوو ڕەنگی مرواری وابێ لـەڕونی‌و بریقـەداریی دا ٥ دەگوترێ: (لون لُؤلُؤآن).

**لأمَهُ لأماً**: دڵ پیسی‌و نامەردیی پاڵدا.

**لأمَ الشَيْئَ**: شتەکەی چاك کردەوە، ڕێکی خستەوە ٥ دەگوترێ: (لَأمَ بین الـشیئین) دوو شتەکەی پێکەوە گونجاندن، ڕێکی خستن.

**لأم الجُرْحَ**: برینەکەی چاك کردەوە، وێکی هێنایەوە.

**لأمَ الصَدْعَ**: درزەکەی پڕکردەوە.

**لَؤَمَ فلان لُؤْماً**: فلانکـەس نـاڕەسـەن بـوو، بنەچەو نـژادی پەسـت‌و خـوێڕی بـوو، نـەفس‌و دەروونـی پەسـت‌و نـزم بـوو ٥ (فهو لئیم) ٥ (ك: لِئـام، ولؤمـاء) (وهـي لئیمة) ٥ (ك: لِئام).

**ألْأمَ فلان**: فلانکـەس ڕەوشـتی پەسـت‌و ناشیرینی خۆی دەرخستن ٥ منداڵی خوێڕی‌و هیچ‌و پوچی بوون.

**ألْأمَ الـشَيْئَ**: شـتەکەی چـاك کـردەوە ٥ دەگـوترێ: (ألْأمـتُ الجـرحَ بالـدواء) برینەکەم بەدەرمان چاك کردەوە.

**ألْــأمَ الــصَدْعَ**: قەڵــشت‌و درزەکــەی پڕکردەوە.

**لاءَمَهُ الأمْرُ**: کارەکەی بۆ گونجاو بوو.

**لاءَمَ فلاناً**: لەگەڵ فلانکەس دا گونجا.

**لاءَمَ بین الفریقین**: دوو بەرەو تاقمەکـەی ڕێـك خـستن پێکیـەوە گونجانـدن ٥ لێکی دان، ڕێکی خستن.

**لَأمَ الرَجُلُ**: پیاوەکـەی نیـسبەت دا بـۆلای ڕەوشــت نزمــی، بــەخوێڕی‌و هــیچ‌و پوچی لەقەڵەم دا.

**لأمَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ڕێك خستەوە.

**إلْتَأمَ الشَّيْءُ**: بۆ موتاوەعەی (لأمَه) دێ، واتە گونجاو سازا یەکی گرتەوە، تەباو پێکەوە گونجاو بوون.

**إلْتَأمَ القومُ**: خەڵکەکە پێکەوە گونجاو بوون.

**إلْتَأمَ الشَّيْئان**: دوو شتەکە پێکەوە گونجان و یەکیان گرت ◦ (هذا کلام لا یَلْتَئِمُ علی لساني) ئەو قسەیەکە ناتوانم بیڵێم، لەسەر زوبانم قورسە.

**إلْتَأمَ الرَّجُلان**: دوو پیاوەکە ڕێك کەوتن و سوڵحیان کرد.

**إلْتَأمَ الشَّيْءُ**: شتەکە یەکی گرت و پێکەوە نووسا.

**تلاءَمَ الشَّيْئان**: دوو شتەکە پێکەوە نووسان و یەکیان گرت.

**تلاءَمَ الکلامُ**: قسەکە ڕێك و پێك بوو.

**تَلَأَّمَ**: بەمانا (إلْتَأمَ) دێ.

**تَلَأَّمَ فلان لأمَتَهُ**: فلانکەس زرێیەکەی پۆشی.

**إسْتَلْأمَ**: ژنی لە بنەماڵەی نارەسەن و خوێڕی هێنا.

**إسْتَلْأمَ فلان**: فلانکەس چی زرێ و چەکی شەڕی لا هەبوو هەمووی پۆشی.

**إسْتَلْأمَ الجنديُ**: سەربازەکە زرێ و کڵاو خودەی پۆشی.

**اللُّؤومُ**: ئەوەیە مرۆڤ ڕژد بێ و نەفسی نزم بێ و لە بنەماڵەی خوێڕیش بێ.

**اللَّـأْمُ**: (شيء لأم) شتێکی پێکەوە گونجاوە و ڕێکە شتێکی قایم و بەهێز و گونجاوە.

**اللَّئْمُ**: ڕێکخستن و پێکەوە گونجاندنی خەڵك و خستنەوەی باری ناشتەوایی لەناویان دا ◦ هەروا بەمانا هاوشان و هاو وێنەش دێ، دەگوترێ: (فلان لَئْمُ فلان) ◦ (ك: ألْآم).

**الْأمان واللُّؤْمانُ**: کەسێك بەسروشت خوێڕی و نەفس نزم بێ ◦ هەر بەشێوەی بانگ لێکراو (منادی) بەکاردێ.

**اللَّأْمَةُ**: ئامێری شەڕە (وەکوو زرێ و مەتاڵ و شمشێر و شتی وا).

**اللُّؤْمَةُ**: ئەوەی لاسایی کردەوەی یەکێکی تر دەکاتەوە ◦ هەر شتێك مرۆڤ بەخێلی پێ ببرێ لەڕوی جوانی و دەوڵەمەندی، خانووی سەرنج ڕاکێش ◦ ئامێری جوتکردن.

**اللَّئيمُ**: پێچەوانەی (الکریم) ◦ هاو وێنەو هاوشێوە ◦ دەگوترێ: (هو لئیمُهُ) ئەو دەشوبهێتە ئەو ◦ وەکوو ئەو وایە، لەو دەچێ.

**اللُّمَةُ**: شكڵو ڕوخسار ٥ كۆمەڵێك پیاو ژمارەیـان لـە سـێوە بـۆ دە ٥ (ك: لُمات).

**لأي فلان لأياً**: فلاّنكەس تەمبەڵی نواند ٥ بەندو بوو، گیری خوارد.

**الأيَ فـلان**: فلاّنكـەس كەوتـە حالـەتی چورتمو ناخۆشییەوە.

**لأى في حاجتـه**: لـە پێداویـستیو ئیـشی خۆی دا تەمبەڵی كرد.

**إلْتأى فلان**: فلاّنكەس تەمبـەڵی كـرد ٥ ئیفلاسـی كـردو ژیـانی تـەنگو چەڵەمەی تێكەوت.

**إلْتأى عليه الحاجـة**: كارەكەی زەحمـەت بــوو، پێداویــستییەكەی ئــەنجام نەدرا.

**الّــلأواءُ**: گــوزەرانی تــەنگ ٥ ژیــانی كولەمــەرگی ٥ نەخۆشــی كوشــندەو ترسناك.

**الّـلأيُ**: نارەحـەتیو ناخۆشـیو مانـدوو بوون ٥ دەگـوترێ: (فعـل ذلـك بعـد لأي، ولأياً عرفت الشّيْئ).

**الّــلاءون**: ئیــسمی مەوصــوله بــەمانا (الذين) دێو وایـش دەبـێ نونەكـەی لادەبرێ بۆ تەخفیف.

**اللّــائي**: ئیــسمی مەوصــولەو بــەمانا (اللّـواتي)یـە ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَاللّـائِي يَئِـسْنَ مِـنَ الْمَحِـيضِ مِـن نِّسَائِكُمْ﴾.

**لَبَأَ البقـرةَ ونحوهـا لَبْـأً**: ژەكـی مانگاكـەی دۆشی.

**لبأت الأمُ ولَـدَها**: دایكەكـە ژەكـی دایـە بێچوەكەی.

**لَبَأَ القومَ**: ژەكی دەرخواردی خەڵكەكە دا.

**لَبَأَ اللّبأَ**: ژەكەكەی كوڵاند.

**لَبَــأ الرجـلُ مــن الطعـام**: پیاوەكـە زۆری لەخواردنەكە خوارد.

**لَبَأ الفسيلَ ونحوه من الأغراس**: شـەتڵەكەی چـــــەقاندو ئـــــاوی دا لـــــەكاتی چەقاندنەكەی دا ئاوی دا.

**لَبَّـأت الناقـةُ ونحوهـا**: ژەك كەوتـە نـاو گوانی مانگاكەوە.

**لَبَّــــأ بــــالحج**: لــەكاتی ڕێو ڕەسمــی حـەجكردن دا (لبيك اللـهمَّ لبيـك)ی گوت.

**لَبَّــأت الأم ولَــدَها**: دایكەكــە ژەكــی دەرخواردی بێچوەكەی دا.

**إلْتَبَأ الراعـي البقـرة ونحوهـا**: شوانەكە ژەكی مانگەكەی دۆشی.

**إلْتَبَأ فلان**: فلاّنكەس ژەكی خواردەوە.

**إلْتَبأ لَبَأ فلان**: یەكـەم كـەس ئـەو بـوو هەواڵی ڕوداوی فلاّنی بـڵاو كـردەوە ٥ دەشگوترێ: (بنـو فـلان لا يلتبئـون فتاهم) خێڵی فـلاّن بەگـەنجی ژن بـۆ كوڕیان ناهێنن.

**اللِّبَأُ**: ژەك؛ شیری ئاژەڵو گیانلەبەری تر لەسەرەتای بێچوبونیان دا تا شیرەکەیان کەمی رون دەبێتەوە.

**اللِّبْوَةُ**: بەمانا (اللُّبُوَّةُ) دێ.

**لَبَّ لَبابَةً**: بوو بەخاوەن عەقڵو فام (فهو لَبیب).

**لَبَّ بالمكان لَبّاً ولُبُوباً**: لەشوێنەکە مایەوەو جێگیر بوو.

**لَبَّ فلاناً**: لەگەردنی فلانکەسی دا.

**لَبَّ اللوزَ**: بادامەکەی شکاندو ناوکەکەی دەرهێنا.

**ألَبَّ الزَّرْعُ**: کشتوکاڵەکە بەروبوومەکەی دەرکەوت.

**لَبَّ لك الشَّيْءُ**: شتەکە خۆی دەرخست بۆ تۆ.

**ألَبَّ بالمكان**: لە شوێنەکە مایەوە.

**ألَبَّ على الأمر**: پابەندی کارەکە بوو، وەگری بوو لێی جیا نەبوەوە.

**ألَبَّ الدّابَّةَ**: بەرسنگی بۆ وڵاخەکە کرد بۆنەوەی کورتانو بارەکەی بۆ دواوە نەڕوا ٥ دەگوترێ: (ألَبَّ السَّرْجَ) بەرسنگی بۆ زینەکە دروست کرد.

**ألَبَّ داري دار فلان**: خانوەکەم بەرامبەر خانوی فلانکەسە.

**لَبَّبَ الحَبُّ**: دانەوێڵەکە بوو بەئارد.

**تَلَبَّبَ فلان**: فلانکەس چاکی دامینی هەڵکردو پشتێنی بەست ٥ چەکی لەخۆ بەست.

**تَلَبَّبَ الرجلان**: دوو پیاوەکە بینەقاقای یەکتریان گرت، دەستیان نایە بینەقاقای یەکتر.

**إسْتَلَبَّ الرجلَ**: عەقڵو دەرونی پیاوەکەی بەتاقی کردەوە.

**التَّلْبِيبُ**: ئەو پەڕۆو خاولییەی دەکرێتە مل، بۆینباخو شتی وا، مل پێچ ٥ دەگوترێ: (أخذ فلان بتلبيب فلان وبتلابيبه) فلانکەس یەخەی فلانکەسی گرت.

**اللُّبابُ**: پوختەو کاکڵەی شت ٥ دەگوترێ: (فلان لباب قومه) فلانکەس پاڵفتەی هۆزو قەومەکەیەتی ٥ دەگوترێ: (حسب لُبابٌ): بنەچەو نژادێکی خاوێنو نەجیبە ٥ (عيش لَباب) ژیانێکی خۆشو بەنازپەروەردەیە.

**لباب الجوز واللوز**: کاکڵەی گوێزو بادام.

**اللُّبَاب**: ئاردی زۆر ورد.

**اللَّبَبُ**: گەردن: شوێنی ملوانکە لەژور سینگەوە ٥ لبی ورد کە داروخابیێو لەتەبارە لب هاتبێتە خوار ٥ بەرسنگی کورتانو زین؛ حەبلێکی پانە بەبەرسنگی وڵاخەکەدا دەهێندرێو لەهەردوو سەرەوە لەکورتان یان لەزینەکە شەتەك

دەدرێ وەکوو چۆن پاڵو لەدواوەی ولاخەکەوە لە کورتانەکە قایم دەکرێ ٥ هەروا وشەی (اللبب) بەمانا دڵ دێ، دەگوترێ: (إنه لرخي اللبب) ئەو کابرایە دڵنەرمە ٥ دەشگوترێ: (فلان في لبب رخي) فلانکەس لە ژیانێکی خۆش‌و ئاسایش دایە.

**اللُّبُّ من كل شيئ:** کاکڵەو پوختەی شت لەهەرجۆرێك بێ ٥ نەفس‌و حەقیقەتی شت ٥ (لُبُّ الجوز واللّوز) کاکڵەی گوێزو بادام ٥ هەروا بەمانا عەقڵ‌و هۆش دێ ٥ (ك: ألْباب وألُبُّ).

**لُبُّ الأرض:** ئەو توێژە شاخ‌و کەنەکەیە دەوران دەوری زەوی داوە.

**اللَّبَّةُ:** شوێنی ملوانکەو بەرمور لەمل دا ٥ خودی ملوانکەکە ٥ ئەو پەتەی مورووەکانی پێ هۆنراونەوە ٥ (ك: لَبّات لِباب).

**اللَّبيب:** خاوەن عەقڵ‌و هۆش.

**اللَّبيبةُ:** پۆشاکێکە لەبەر دەکرێ ئەقۆڵی هەیە نەیەخە.

**لَبَّيْكَ:** حازرو ئامادەم لە خزمەتت دا گەردن کەچ‌و فەرمانبەردارم ٥ هەموو کات‌و ساتێك‌و جار دواجار، ملکەچ‌و گوێڕایەڵم ٥ یان ڕوم لەتۆیەو بەهیوای قاپی ڕەحمەت‌و بەخششی تۆم.

**المُتَلَبَّبُ:** گەردن، شوێنی ملوانکە لەگەردن دا.

**المَلْبُوب:** (رجل ملبوب) پیاوێکی عاقڵ‌و ژیرە.

**لَبِثَ بالمكان لَبْثاً ولُبْثاً:** لەشوێنەکە مایەوە و جێگیر بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ﴾ ٥ دەشگوترێ: (ما لَبِثَ أن فعل كذا) زۆر نەمایەوە ئەو کارەی ئەنجام دا.

**ألْبَثَهُ:** هێشتیەوە، وای لێ کرد بمێنێتەوە.

**ألْبِثْ عن فلان:** چاوەڕوانی فلان بکە لێی بگەڕێ بابەعەقڵی خۆی بەرێگادا بڕوا پاش ماوەیەك دەردەکەوێ چەند ڕێبازی خواری گرتووە.

**لَبِّثْ:** چاوەڕوان بکە.

**لَبَّثَ فلاناً:** فلانکەسی هێشتەوە.

**تَلَبَّثَ بالمكان:** لە شوێنەکە وەستاو مایەوە.

**إسْتَلْبَثَهُ:** دوای خست ٥ (بە فونگی دا خستەوە).

**إسْتَلْبَثَ فلاناً:** داوای لە فلانکەس کرد بمێنێتەوە. اللَّبْثَةُ: ڕاوەستان‌و سەرمنجدان ٥ دەڵێی: (لي على هذا

الأمر لُبْثة) من لەسەر ئەم كارە سەرنجێکم هەیە، تێبینیم هەیە.

**اللبيثةُ من الناس:** کۆمەڵو پێری ئادەمیزاد هەریەکەیان لەهۆزو خێڵێك بێ.

**لَبَجَ فلاناً بالعصا لَبْجاً:** بەگۆچان لەسەرەخۆ لەفلانکەسی داو لێدانەکەشی زۆری خایاند.

**لَبِجَ بفلان الأرضَ:** فلانکەسی بەزەوی دا دا

**لُبِجَ بالرجل:** پیاوەکە خراو کەوتە سەر زەوی.

**اللَّبيجُ:** نیشتەجێ ە دەگوترێ: (حي لَبيج) گەڕەك و هۆبەیەکە ئاوەدان و فەرمبالغە خەڵکی تێدا نیشتەجێیە.

**لَبَخَ جِلدُهُ لُبوخاً:** گۆشتی زۆر بوو، گۆشتن بوو.

**لَبَخَ فلاناً:** جنێوی بەفلانکەس دا ە لێی دا، کوشتی.

**لَبَّخَ على العضو عند الألم:** مەڵهەمی لەسەر ئەندامە ئازاراوییەکە دانا بەگەرمی یان بەساردی بۆئەوەی ئازاری بشکێ.

**تَلَبَّخَ بالطِّيب:** بۆنی خۆشی لەخۆدا.

**اللَّبَخُ:** درەختێکە لەپێری (القرنية) لەولاتی گەرمەسێردا دەڕوێ.

**اللَّبْخَةَ:** دەرمانێکە وەکوو مەرهەم وایە بەساردیی یان بەگەرمی دەخرێتە سەر شوێنی ئازاراوی لەجەستەدا.

**اللبيخةُ:** بۆنی میسکی کەسکۆن.

**لَبَدَ بالمكان لُبوداً:** لە شوێنەکە مایەوەو پێوەی نووسا.

**لَبَدَ الشَّيْئُ بالأرض:** بەزەوییەکەوە نووسا.

**لَبَدَ الشَّيْئُ بالشيئ:** شتەکە بەشتەکەوە نووساو جۆشیان خوارد.

**لَبَدَ الصوفَ لَبْداً:** خوریەکەی بشکنیەوەو تەڕی کردو سویەوە تا کردی بەلباد.

**لَبِدَ بالمكان لَبَداً:** لە شوێنێکە مایەوە.

**لَبِدَ الشَّيْئُ:** شتەکە نووسا بەشتی تەڕەوەو چەسپ بوو.

**لَبِدَ الطائرُ بالأرض:** باڵندەکە وەگرێ خاکەکە بوو تێیدا مایەوە.

**أَلْبَدَ بالمكان:** لەشوێنەکە مایەوە.

**أَلْبَدَ الشَّيْئُ بالشيئ:** شتەکە بەشتەکەوە نووسا.

**أَلْبَدَ الفرسَ:** لبادی لەپشتی ئەسپەکە کرد لبادی خستە سەر پشتی ئەسپەکە.

**أَلْبَدَ السَّرْجَ:** لبادی بۆ زینەکە دانا.

**أَلْبَدَ راسَهُ عند الدخول الباب:** لەکاتی چونەژوورەوە لەدەرگاکەوە سەری دانەواند.

**لَبَّدَ الشَّيْئَ بالشيئ:** شتەکەی بەشتەکەوە نووساندو چەسپاندیو پێوەی جۆش دا.

**لَبَّدَ المطرُ الأرض**: باران تێکەڵاوی زەوی بوو گڵەکەی پێکەوە نووساندو پتەوی کرد، قاچی تێ ناچەقێ.

**لَبَّدَ شَعْرَهُ**: قژی سەری موی جەستەی بەمادەیەکی لینج پێکەوە نووساند تاوەکوو لبادی لێ هات.

**لَبَّدَ الصوفَ**: خورییەکەی کرد بە لباد.

**إلْتَبَدَ الشَّعْرُ والصوفُ ونحوهما**: موو و خورییەکە بەیەکەوە نووساو بوو بەلباد.

**إلْتَبَدَت الشجرَةُ**: درەختەکە گەڵای زۆر بوو.

**تَلَبَّدَ الشَّعرُ والصوف ونحوهما**: بەمانا (إلْتَبَدَ) دێ.

**تَلَبَّدَت الأرض بالمطر**: بەهۆی بارانەکەوە زەوییەکە پندر بووە و قاچی تێ ناچەقێ.

**تَلَبَّدَ الطائر بالأرض**: باڵندەکە لەسەر زەوییەکە هەڵنیشت.

**تَلَبَّدَ فلان**: فلانکەس تێفکرێو بیری لێ کردەوە سەرنجی دایە.

**الّابِدُ**: شێر ٥ (مال لابِدٌ): ماڵو سامانی زۆر.

**اللُّبادى**: باڵندەیەکە لەسەر شێوەی (السماني) کە لەزەوی نزیک بوو پێوەی دەنووسێو حەزی لە فڕین نامێنێ بەزۆر هەڵی نەفڕێنی نافڕێ.

**اللَّبَّادُ**: لباد دروستکەر.

**اللُّبَادَةُ**: فەرەنجی، لبادێك وەكوو فەرەنجی کوڵەباڵو شتی وا لەبەر بکرێ بۆ خۆپاراستن لەبارانو سەرما.

**اللَّبَدُ**: خوری ٥ دەگوترێ: (مالە سَبَدٌ ولا لَبَدٌ) نە موی هەیە نەخوری، نەکەم نەزۆر هیچی نیە.

**اللِّبْدُ**: هەر کوڵكو مو و خورییەك پێکەوە بنووسێو ببێتە لباد ٥ ئەو پارچە قوماشو لبادەی دەخرێتە ژێر زینو کورتانەوە ٥ جۆرە ڕاخەرێکە ٥ (ك: ألباد ولُبود).

**اللُّبَدُ**: ماڵو سامانی زۆر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا﴾.

**أبو لُبَد**: شێر.

**اللِّبْدَةُ**: هەر مو و خورییەك پێکەوە بنووسێو ببێتە لباد ٥ یاڵی شێر، ئەو مووانەی لەناو شانی شێردا کۆدەبنەوە ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (هو من أمْنَعُ من لِبْدَة الأسد): ئەو لەناو شانی شێر قایمترە کەس ناوێرێ توخنی بکەوێ ٥ جۆرە کڵاوێکە لەسەر دەکرێ لەخوریو شتی وا دروست دەکرێ.

**اللُّبْدَةُ**: بەمانا (اللِّبْدَةُ) دێ ٥ (ك: لُبَدٌ).

**لَبَزَ لَبْزاً**: خواردنێکی خێراو زۆری خوارد.

**لَبَزَ فلاناً**: لێدانی زۆری ئاراستەی فلان کرد، زۆری لێ دا فلانی ترۆ کرد.

**لَبَزَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ژێر قاچی دا بەقاچی شێلای و پێخوستی کرد.

**لَبَسَ عليه الأمرَ**: کارەکەی لێ شیواند بۆئەوەی ڕاستییەکان نەزانێ.

**لَبِسَ الثوبَ لُبْساً**: بەقوماشەکە خۆی داپۆشی ○ دەگوترێ: (لَبِسَ الحياءَ) شەرمو حەیای پۆشی.

**لَبِسَ الناسَ**: لەگەڵ خەڵکەکە ژیا.

**لَبِسَ فلان فلانةَ عُمْرَهُ**: فلانکەس لەگەڵ فلان ئافرەت بوو هەموو ڕۆژگاری گەنجی لەگەڵ دا بەسەر برد.

**لَبِسَ فلاناً على ما فيه**: لەگەڵ فلان دا گونجاو فیوڵی بوو ○ دەگوترێ: (لَبِسْتُ على كذا أذني) گوێی خۆم لەو شتە کەڕکردو گرنگیم پێ نەدا.

**أَلْبَسَ عليه الأمرُ**: کارەکەی لێ شێواو شتەکەی لێ چەواشەبوو.

**أَلْبَسَ الشَّيْءَ بالشيءِ**: شتەکەی بەسەر شتەکەدا داو دایپۆشی.

**أَلْبَسَ النباتُ الأرضَ**: گیاو گژەکە زەوی داپۆشی.

**أَلْبَسَ الغيمُ السماءَ**: هەورەکە ئاسمانی داپۆشی، بەری ئاسمانی گرت.

**أَلْبَسَ فلاناً الثوبَ**: وای لەقوماشەکە کرد فلانکەس لەبەری بکا.

**لابَسَهُ**: تێکەڵاوی بوو، پەیوەندیی پێوە کرد.

**لابَسَ فلاناً حتى عَرِفَ دِخْلَتَهُ**: تێکەڵی فلان بوو تا ناوەڕۆکی زانیو چاك لێی شارەزا بوو.

**لَبَّسَ الأمرُ**: کارەکەی لێ شێوا، لێی تێکچوو.

**لَبَّسَ فلان**: فلانکەس فرتو فێڵی لێ کرد.

**لَبَّسَ عليه الأمرَ**: ئیشەکەی تێکەڵو پێکەڵ کرد.

**إلْتَبَسَ الظلام**: تاریکی تێکەڵ بوو ○ دەشگوترێ: (إلْتَبَسَ عليه الأمرُ) ئیشەکەی لێ چەواشە بوو.

**أُلْتُبِسَ به**: عەقڵو هۆشی شێوا.

**تَلَبَّسَ بالثوب وبالأمر**: قوماشەکەی لەخۆوە پێچا، تێکەڵی کارەکە بوو (تَلَبَّسَ حُبُّ فلانة بدمي ولَحمي) خۆشەویستی فلان تێکەڵ بەخوێنو گۆشتم بووە.

**اللِّبَاسُ**: پۆشاك ○ هەرشتێك جەستە داپۆشێ ○ (ك: ألبسة ولُبُسٌ) ○ ژنو مێرد بۆیەکتری، هەریەکەیان بۆ ئەوی تر پۆشاکو داپۆشەری حەیاو شەرەفیەتی، قورئان دەفەرموێ: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾.

اللِّبَّاسُ: دەگوترێ: (رجلٌ لَبَّاسٌ) پیاوێکە زۆر پۆشاك لەبەر دەکا ٥ پۆشاکی زۆری هەیە ٥ زۆر سەر لێ تێکدەرو فێڵاوییە.

اللَّبَّاسَةُ: پاژنەهەڵکێش، ئامێرێکە لەپێ کردنی قۆندەر ئاسان دەکا.

اَللَّبْسُ: تێکەڵبونی تاریکی ٥ پۆشاك.

اَللِّبْسُ: هەرشتێك لەبەر بکرێ‌و بکرێتە پۆشاك.

لِبْسُ الكعبة والهودج: پەردەی کابە، پەردەی کەژاوە ٥ تەنکە پێستێکە دەکەوێتە نێوان پێست‌و گۆشتەوە.

اللُّبْسُ: شوبهەو تەم‌و مژاوی ٥ نادیارو شێردراوە.

اللِّبْسَةُ: حاڵەتێکە لەحاڵەتەکانی جل پۆشین، دەگوترێ: (لِكلِّ زمان لِبْسَةٌ) بۆ هەر وەرزو سەر دەمێك پۆشاکی شیاوی خۆی هەیە.

اللُّبْسَةُ: شوبهەو لێڵی‌و گومان ٥ دەگوترێ: (في أمره لُبْسَةٌ).

اللَّبُوسُ: هەرشتێك لەبەر بکرێ‌و بکرێتە پۆشاك ٥ دەگوترێ: (إلْبَسْ لكل حالة لَبُوسها) بۆ هەر حاڵەت‌و کارێك پۆشاکی شیاوی خۆی بۆ بپۆشە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ﴾.

رَجُلٌ لَبُوسٌ: پیاوێکە پۆشاکی زۆرە زۆر پۆشاك لەبەر دەکا ٥ هەروا وشەی (اللَّبوس) دەرمانێکە لەسەر شێوەی فومات لەسەر کۆم دادەنرێ یان دەخرێتە ناو مەهبەلەوەو بۆخۆی وردەوردە دەتوێتەوە.

اللَّبوسةُ واللُّبُوسَةُ: شوبهەو گومان ٥ دەگوترێ: (في كلامه لَبْسة ولُبُوسة) لە قسەکانی دا شك‌و گومان‌و لێڵی هەیە.

اللَّبيسُ: پۆشاکێك زۆر لەبەر کرابێ‌و رزی بێ ٥ (حَبْلٌ لَبيس) حەبلێکی بەکارهاتووە ٥ (دار لَبيسٌ) خانوی کۆن‌و بەکارهاتوو ٥ (ك: لبائس) هەروا وشەی (لبيس) بەمانا هاوشان‌و رکابەر دێ ٥ دەگوترێ: (ليس له لَبيسٌ) هاوشانی نیە کەس نیە بتوانێ رکابەری بکا.

المُلَبَّسُ: گوێزو لۆزو شتی وا کە بکرێنە توێژێك‌و لەسەر تەبەقی حەڵوا دابنرێ ٥ (ك: مُلَبَّسات).

المَلْبَسُ: پۆشاك ٥ (ك: ملابس).

لَبَطَ فلاناً لَبْطاً: فلانکەسی بەزەویدا دا ٥ خستی ٥ دەشگوترێ: (لَبَط به الأرض).

لُبِطَ بفلان: پیاوەکە لەحەواوە بەراوەستانەوە کەوتەسەر زەوی ٥ (فهو ملبوط).

إلْتَبَطَ فلان: فلانکەس سەری لێ شێوا.

**إِلْتَبَطَ فِي أمره:** لەکارەکەی دا سەرسام بوو سەری لێ شێوا نازانێ چی بکا.

**إِلْتَبَطَ القومُ به:** خەڵکەکە دەورەیان داو لێی گردبوونەوە.

**تَلَبَّطَ:** خرایە سەر زەوی، بەزەوی دا درا.

**تَلَبَّطَ في امره:** سەرسام بوو، دەگوترێ: (تَلَبَّطَ فلان) فلانکەس کاروباری لێ شێواو نازانێ چی بکا.

**اَلْلَبْطَةُ:** هەلامەت، پەتا، درم ٥ کۆکە.

**لَبِقَ فلان لَبَقاً:** فلانکەس نەجیب زادەو خانەدان بوو ٥ هەرکارێکی خرایە ئەستۆ بەباشی ئەنجامی دا.

**لَبِقَ الثوبُ والأمرُ بفلان:** قوماشەکە یان کارەکە شیاوی فلان بوو.

**لَبُقَ لَبَاقَةً:** لەهەموو کارەکانی سەرکەوتوو بوو، بەباشی ئیشەکانی ئەنجام دا.

**لَبُقَ الثوب والأمر بِفلان:** قوماشەکە ٥ یان کارەکە بۆ فلان گونجاو بوو ٥ (فهو لَبِقٌ).

**لَبَّقَ الثَّرِيدَ وغيره:** تێکوشاوەکەی تێکەلاو کردو نەرمی کردەوە ٥ لەحەدیسدا هاتووە: (فصنع ثريدةً ثُمَّ لبقها) تێکوشاوی دروست کردو دوایی تێکی هەڵدا.

**لَبَكَ الشَّيْءَ والأمْرَ لَبْكاً:** شتەکەی تێکەلاو کرد ٥ دەگوترێ: (لَبَكَ السويق بالعسل) قاوتەکەی تێکەلاوی هەنگوین کرد.

**لَبِكَ الأمرُ لَبَكاً:** کارەکەی لێ تێکەڵو پێکەڵ بوو (فهو لبِكٌ).

**أَلْبَكَ فلان:** فلانکەس قسەی ناشیرین و نەگونجاوی گوتن، لەقسەکردن دا هەڵەی کرد.

**لَبَّكَ الشَّيْءَ:** شتەکەی تێکەلاو کرد.

**إِلْتَبَكَ الأمرُ:** کارەکە شێواو تێکەڵو پێکەڵ بوو.

**تَلَبَّكَ الأمرُ:** بەمانا (إِلْتَبَكَ) دێ.

**تَلَبَّكَت المِعدةُ:** گەدەی تێکچوو باش خواردن هەزم ناکا.

**اَلتَّلَبُّكُ المِعوي:** تێکچوونی مەعیدەو باش هەزم نەکردنی.

**اَلَّبْكُ:** شتی تێکەڵ کراو.

**اَلَّلَبْكَةُ:** شتی تێکەڵ کراو ٥ دەگوترێ: (وقع في لَبْكة) کەوتە ناو کێشەو تێکەڵو پێکەڵەوە.

**اَللَّبِيكُ:** دەگوترێ: (أمر لبيك) کارێکی تێکەڵو پێکەڵە.

**اَللَّبِيكَة:** خواردنێکە لەکەشك و ئارد یان خورما تێکەڵ دەکرێ دوایی رۆن یان زەیتی بەسەردا دەکرێ و ناکوڵێندرێ.

**لَبْلَبَ به وعليه:** بەزەیی پێداهاتەوە ٥ دەگوترێ: (لَبْلَبَت الشاةُ ونحوها بولدها) کەرەکە یان ئاژەڵەکەی لەو

جۆرە سۆزی خۆی بۆ بێچوەکەی نواندو لستیەوە.

لَبَالِبُ الغنم: مرقەو بارە بارِی مەڕو بزن.

اللَّبْلابُ: ڕوەکێکی عوشبییە بەدارو دەوەن دا هەڵدەگەڕێ و بەسەریان دا بڵاو دەبێتەوە، وەکوو گیاترِترە وایە.

اللَّبْلَبُ: گەردن.

لَبَنَهُ لَبْناً: شیری دەرخوارد دا (فهو لابن) ٥ ئەو خاوەن شیرە.

لَبِنَتْ لَبَناً: شیر هاتە ناو مەمکیەوە یان شیر هاتە ناو گوانیەوە ٥ (فهي لَبِنَة).

الْبَنَتْ: شیر هاتە ناو مەمکیەوە یان ناو گوانیەوە.

أَلْبَنَ القومُ: خەڵکەکە شیریان زۆر بوو (فهم مُلْبِنون) دەشگوترێ: (هم لابنون) ئەوان خاوەن شیرن.

لَبَّنَ الرجلُ: پیاوەکە خشتی دروست کرد بۆ خانوو.

لَبَّنَ القَمِيصَ: بۆ کراسەکە دوو کونە قۆپچەو شتی وای بۆ کردن.

التَبَنَ الرضيعُ: شیرەخۆرەکە شیری خوارد.

تَلَبَّنَ فلان: فلانکەس مایەوە.

إسْتَلْبَنَ: داوای شیری کرد بۆ خاو و خێزانی یان بۆ میوانەکانی.

التَّلْبينةُ: حەڵوایە کە لەئاردی بێژراو و شیرو هەنگوین دروست دەکرێ.

اللاَّبِنُ: کەسێك شیری زۆر بێ ٥ خاوەنی شیر بێ ٥ (ك: لَوابِنْ).

اللَّبَّانُ: شیرفرۆش ٥ خشت دروستکەر ٥ (خشت بڕ) ٥ فرۆشیاری خشت.

اللِّبانُ: حەبلی بەرسنگ ٥ بەرسنگی ئاژەڵ و وڵاخ.

اللِّبَانُ: شیر خواردنی منداڵ، شیردان بەمنداڵ ٥ دەگوترێ: (هو أخوه بِلِبان أمه).

لِبَان السفينة: حەبلی ئەستورو پتەوی کەشتییە لەکەتان دروست دەکرێ و لەکاتی وەستانی (بای بەهێزدا کەشتییەکەی پێ ڕادەکێشرێ).

اللُّبَان: ڕوەکێکە لەپێری (البخورية)یە صمغێك دەردەدا پێشی دەگوترێ: (الكندر).

اللُّبانَةُ: پێداویستی بەهۆی چلێسییەوە نەك لەبەر هەژاری.

اَللَّبَنُ: شیر ج هی ئادەمیزاد بێ یان هی ئاژەڵ بێ ٥ (لَبَن الشجرة) ئاوی درەخت.

اللَّبِنُ: خشتی لەقوڕ دروستکراو بۆ بیناکردن.

لَبِن القميص: کونە قۆپچەو قوڵفەی کراس.

لُبْنى: درەختێكە یان ڕووەكێكە جۆرە صمغێك دەردەدا پێی دەگوترێ: (المَیْعة)و لەوڵاتی شام زۆرە.
لبنان: كێوێكە لە وڵاتی شام ٥ وڵاتێكی عەرەبییە زوربەی ڕوبەرەكەی كێو و شیو و دۆڵە، هەندێكی دەشتاییە، لە ڕوی جوگرافیایەوە بەشێكە لەوڵاتی شام.
اللِّبْنَةُ: كونە قۆپچەو قوفڵەو شتی وای كراس (بنیة القمیص).
اللِّبتَةُ: كونەقۆپچەو قوڵفەی كراس.
اللَّبونُ: ئەو گیانلەبەرە مێینەی شیر لەگوان و مەمكی دا پەیدابووبێ.
إبن لبون: بێچوە حوشتر دووساڵی تەواو كردبێ و چوبێتە ساڵی سێیەمی تەمەنیەوە ٥ ئەگەر بێچوەكە مێینە بوو پێی دەگوترێ: (بنت لبون).
اللَّبینُ: ئەو گیانلەبەرەیە بەشیر پەروەردە بكرێ تاپێ دەگا.
المِلْبَنُ: شیر پاڵێوك ٥ یان مەمەی شیر ٥ مەنجەڵ و سەتڵی شیر ٥ قاپی شیر ٥ ئەوزەرف و حاجەتەی شیری تێدا دەگوێزرێتەوە.
المَلْبَنُ: جۆرە حەڵوایەكە بەشلی دروست دەكرێ وادەبێ گوێزی تێدەكرێ یان شتی تری لەو جۆرە.
المِلْبَنَةُ: كوپی شیر تێدا خواردنەوە.
المَلْبَنَةُ: دەگوترێ: (عشب أو بقل ملبنة) گیاو لەوەڕێكە كە ئاژەڵ بیخوا شیری زۆری دەبێ.
اللُّبْوَةُ: بڕوانە مادەی (لَبَأَ).
لَبِيَ من الطعام: زۆری لەخواردنەكە دروست كرد، خوارد.
لَبّىٰ بالحج: لەكاتی حەجكردن دا وتی: (لَبَّيْكَ اللّهم لبيك).
لَبّىٰ الرَّجلَ: بەپیاوەكەی گوت (لَبَّيك) بەڵێ ئامادەم.
لَتَأَهُ في صدره لَتْأً: دەستی بەسنگیەوە نا
لَتَأَ الشَّيْءَ بعینه: چاوی بڕیە شتەكە.
لَتَأَ الشَّيْءَ: شتەكەی كەم كردەوە.
لَتَبَ بالشيئ لُتوباً: بەشتەكەوە لكا پێوەی نووسا.
لَتَبَ في الشَّيْئ: لەشتەكەدا چەسپا.
لَتَبَ فلاناً و علیه لَتْباً: وەگری فلان بوو.
لَتَبَ ثوبَهُ: قوماشەكەی زۆر لەبەركرد حەزی لێ بوو قەت داینەكەنێ.
أَلْتَبَ علیه الأمْرَ: كارەكەی لەسەر فەرز كرد.
إلْتَتَبَ الثوبَ: پۆشاكەكەی زۆر لەبەر كرد حەزی لێ نەبوو دایكەنێ.
المَلاتِبُ: پۆشاكی ڕزیو.

**المُلتَبُ**: کەسێك لەماڵ دەرنەچێ بۆئەوەی توشی فیتنەیی نەبێ.

**لَتّ السَّويق ونحوه لَتّاً**: قاوتەکەی تێکەڵی ڕۆن‌و شتی وا کرد.

**لَتَّ العجينَ ونحوه**: هەویرو شتی وای بەئاو تەڕکرد.

**فلان يَلُتُّ ويَعْجِنُ**: فلانکەس هەردەڵێ‌و ئاگای لەدەمی خۆی نیە ٥ هەڕمشەو فشە دەکا.

**لَتَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی وردوهاڕ کرد.

**لَتَّ الحَصَى**: بەردەکانی هاڕین.

**اللاّت**: بتێك بوو لە پێش هاتنی ئیسلام دا تایبەت بووە بەهۆزی سەقیف لەولاتی تائیف‌و بەهۆزی قورەیش لەناوچەی نەخلەو چەند هۆبەیەکی تر.

**اللُّتَات**: توێکڵی درەخت کە وردبووبێ ٥ قاوەت کەتێکەڵ بە ڕۆن‌و چەوری کرابێ.

**لَتَحَهُ لَتْحاً**: لەجەستەی داو پواندی بێ ئەوەی برینداری بکا یان برینی گەورەی لێ بکا ٥ دەگوترێ: (لَتَحَهُ بيده) بەدەست لێی دا.

**لَتَحَ عَيْنَهُ**: لەچاوی داو کوێری کرد.

**لَتَحَ فلاناً ببصره**: فلانکەسی بەچاو هەنگاوت.

**لَتَحَ فلاناً**: هەرچی لای فلانکەس بوو بردی هیچی بۆ نەهێشتەوە.

**لَتِحَ لَتْحاً**: برسی بوو ٥ (فهو لَتْحان ولَتْحى).

**اللاّتِحُ**: (رجل لاتِحٌ) پیاوێکی زیرەك‌و عاقڵ‌و زیرە.

**اللُّتّاحُ**: بەمانا (اللاّتِحُ) دێ ٥ (قوم لُتّاحٌ) نەتەوەیەکی زیرەك‌و وریان.

**اللَّتْلَتَةُ**: سوێندی قورس‌و بەدرۆ ٥ قسەی بێ سودو بێ مانا ٥ خۆ خەریك کردن بە کاری لاوەکی‌و بێ سودو بەدەر لە مەبەست.

**لَتَمَ مِخر البعير**: لەگەردنی حوشترەکەی دا.

**لَتَمَ الشَّيْءَ بيده**: بەدەست لەشتەکەی دا.

**لَتَمَ الرجلَ بالسهم**: تیری هاویشتە پیاوەکە ٥ تیری پێونا.

**اللاّتيني**: لەبناغەدا بەشتێك دەگوترێ: نیسبەت درابێ بۆلای (لاتیوم) کەناوە بۆ دەشتێك لە ولاتی ئیتالیا ٥ دەگوترێ: (لسان لاتيني ولغة لاتينية) واتە: زمانی ئیتالی لەسەردەمی ڕۆمای کۆن دا، لەم ڕووەوە کە ئەو زمانە زمانی نمونەیی‌و ستانداردی زوربەی ولاتانی ژێردەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بووە.

**الّتي، اَللّتِ، اللّتْ**: ئیسمی مەوصولن بۆ مێینە بەکاردێن.

**الّتي واللّتيا**: دەگوترێ: (وقع في الّتي

واللّتيا) كەوتە ناو چورتەو كێشەی گەورەو بچوكەوە (كەوتە ئەوەو ئەوەوە).

**لَثَّ بالمكان لَثّاً:** لەشوێنەكە مایەوە جێگیر بوو.

**لَثَّ المطرُ:** بارانەكە بەردەوام بوو چەند ڕۆژێك هەڵی نەبڕوكاند.

**لَثَّ علیه:** ئیلحاحی لێ كرد.

**ألَثَّ:** بەمانا (لَثَّ) دێ.

**لَثَغَ فلان لَثغاً:** زمانی ناتوانێ پیتەكان بەدەنگی خۆیان بڵێ ٥ بۆ نمونە پیتی (لام) بەدەنگی (ڕێ) دەڵێ یان بەپێچەوانەوە ٥ یان زمانی پیسكە پیتی (سین) بەدەنگی (ث) دەڵێ ٥ یان (ڕێ)بە (غەین) (فهو ألثغ وهي لَثغاءُ).

**تلاثَغَ:** زمان خواریی بەسەر خۆی دا هێناو وای كرد پیتەكان بەدەنگی خۆیان نەڵێ.

**اللُثغة:** گۆڕینی زوبان لەوتنی پیتێك بەدەنگێكی تر وەكوو وتنی (سین)بە دەنگی (ث) یان وتنی (ڕێ) بەدەنگی (غەین).

**لَثِقَ یومُنا لَثقاً:** ئەمڕۆمان هەواكەی نزم بوو ٥ شێی زۆر بوو.

**لَثِقَتْ ثیابُهُ:** پۆشاكەی شێی هەڵێنایەوە.

**لُثِقَتْ الأرضُ:** زەوی نماوی بوو شێی هەڵێنا.

**لَثِقَ الطائرُ:** باڵندەكە پەڕو پۆڵی تەڕبوون ٥ (فهو لَثِقٌ).

**ألْثَقَ الشيءَ:** شتەكەی تەڕ كرد، نماوی كرد، شێداری كرد.

**لَثَّقَ الشَّيْءَ:** شتەكەی خراپ كرد.

**إلْتَثَقَ الشَّيْءُ:** شتەكە تەڕ بوو شێی هەڵێنایەوە.

**تَلَثَّقَ الشَّيْءُ:** بەمانا (إلْتَثَقَ) دێ.

**اللَّثَقُ:** شەونم ٥ ناووگڵ كەتێكەڵ بن ٥ دەگوترێ: (مشینا في لَثَقٍ) بەناو قوڕدا ڕۆیشتین.

**لَثْلَثَ بالمكان:** لەشوێنەكە مایەوە.

**لَثْلَثَ الغَیْمُ والسَّحابُ:** هەورەكە لەشوێنێك هاتوچۆیان بوو هەركە لەبەرچاو دەڕۆیشتن سەریان هەڵدەدایەوە.

**لَثْلَثَ الشَّيْءَ في التراب:** شتەكەی لەگڵ دا گەوزاند، لەگڵی وەردا.

**لَثْلَثَ في الأمر:** لەكارەكەی دا دوودڵ بوو، ڕاڕا بوو.

**لَثْلَثَ كلامە وفیه:** قسەكەی ڕون نەكردەوە.

**لَثْلَثَ الرَّجُلَ عن حاجته:** پیاوەكەی مەنع كرد ڕێگەی نەدا پێداویستی خۆی بەرێ، نەیهێشت بەئامانجو ئاواتی خۆی بگا.

**تَلَثْلَثَ بالمكان:** لەشوێنەكە گیری

خـــواردو مايـــەوە ڕێگـــای نـــەبوو دەربچێ.

**تَلَثْلَثَ الغيمُ والسحابُ:** بـەمانا (لَثْلَـثَ) دێ.

**تَلَثْلَـــثَ في الأمـــر:** لەكارەكـــەدا ڕاڕاو دوودڵ بوو.

**تَلَثْلَثَ في أمره:** لەكارەكەی دا تەمبـەڵی كرد بەگورجی ئەنجامی نەدا.

**تَلَثْلَـــثَ في الـــتراب:** خـــۆی لەخۆڵـــدا گەوزاند؛ خۆی لەگڵ وەردا.

**اللَّـثْلاثُ واللَّثْلاثـة:** تەمبـەڵ، كەسـێك ئیشو كـار ئـەنجام داو تەمبـەڵی بكا تێیـــان دا بـــەجۆرێك هـــەركاتێ گومانت برد كە كارەكە ئـەنجام دەدا دوابكەوێو جێ دەستی دیارنـەبێو هیچی پێ نەكرێ.

**لَثَمَ فَمَ المرأة:** دەمی ئافرەتەكەی ماچ كرد.

**لَـــثَمَ الإبريـــق:** زاركـــی مەســـینەو سوراحییەكەی بەستو بۆشاییەكی لێ هێشتەوە بۆ هەناسەدان.

**لاثَمَ المرأةَ:** لەگـەڵ ئافرەتەكە دەمیـان بەدەمی یـەكترەوە نـا یـەكتریان مـاچ كرد.

**لَـثَمَ فـاه:** پـەرۆی بەبـەردەمی خـۆی هەڵـدا، بـەقوماش دەمـــی خـــۆی داپۆشی.

**لَـــثَمَ الإبريـــقَ:** زاركـــی مەســـینەو سوراحییەكەی داپۆشی.

**اِلْتَثَمَـتِ المـرأةُ:** ئافرەتەكـە سـەرپۆشو ڕوپۆشی پۆشی.

**تلاثَمَا:** هەریەكـە لـەو دوانـە یـەكتریان ماچ كرد.

**تَلَثَّمَـــتِ المَـــرْأةُ:** ئافرەتەكـــە (ڕوپـــۆش) سەرپۆشی پۆشی.

**اللِّثَـــام:** پارچـــە قوماشـــێكە ئـــافرەت دەیكاتـە ڕوپـۆش لـەخوار چاویەوە ڕومـــەتو دەمو لـــوتو چـــەناگەی دادەپۆشـــێ ٥ یـــان هـــەردەمی دادەپۆشێ.

**المَلْثَمُ:** لوتو دەوروبەری ٥ شوێنی ماچ.

**المُلَثَّمـــــُون:** نەتەوەیـــەكن لـــەوڵاتی مـــەغریب، ســـەردەمێك دەســـەڵاتیان هـــەبوو لەئـــەفریقاو ئەنـــدەلوس فەرمانڕەواییان كردووە.

**لَثِيَتِ الشجرةُ لَثيً:** درەختەكە جەوی‌و بنێشتی دەردا.

**لَثِيَ الشَّيْئُ:** شتەكە شەی هەڵێنا ٥ (فهو لَثٍ) ٥ دەشـگوترێ: (لَثِيَ خف البعير) سمـی حوشـترەكە بـەهۆی ڕۆیـشتن بەناو ئاو و تەڕی‌و خوێنـاو دا نـەرم بوو.

**لَثِـــيَ الثـــوبُ وغـــيرُهُ:** كراســـەكە بـــەهۆی ئارەقەوە تەڕ بوو چڵكن بوو.

**لَثِيَ الرجـلُ مـن الطـين:** پیاوەكـە قوڕاوی بوو.

**أَلْثَتِ الشجرةُ**: درەختەکە جەوی و شتی وای دەردا، صمغی لێ دا چۆڕا.

**أَلْثى فلاناً**: جەوی یان بنێشتو شتی وای دەرخواردی فلانکەس دا.

**تَلَثّى الشجرُ**: درەختەکە جەوی‌و شتی وای لێ دا چۆڕا.

**اللَّثى**: ئەوەی لەهەندێ درەخت دێتەدەر وەکوو جەوی کەلەداری بادامو چەقالەو شتی وا دێتەدەر، یان بنێشت کە لەدارەبەن (دار قەزوان) دێتە دەر یان کەتیرە کەلەگوێنی‌و هەندێ درەختی تر دێتە دەر ٥ هەروا ناوە بۆ لینجی‌و چەورایی ڕۆن.

**اللَّثاةُ**: ئەملاو ئەولای قورگ ٥ ناڵو.

**اللُّثَةُ**: پوك ٥ گۆشتی دەوروبەری ددان ٥ (ك: لِثاث، ولثيٌ).

**الحروف اللَّثوية**: الثاء والذّال والظاء.

**لَجا الى الشَّيْئِ والمكان لَجْئاً**: پەنای بۆ شوێنەکە بردو خۆی تێدا قایم کرد ٥ دەگوترێ: (لَجَأ الى فلان) پەنای بۆ فلانکەس برد، داوای کۆمەکی‌و پارێزگاریی لێ کرد.

**اَلْجَأَ اَمْرَهُ الى الله**: ئیشی خۆی حەواڵەی خودا کرد.

**اَلْجَأَ فلاناً**: فلانکەسی پاراست.

**اَلْجَأه من الشَّيْئِ**: لەشتەکە پاراستی‌و خستیە ناو پەناگەی ئەمینەوە.

**اَلْجَأَ فلاناً الى كذا**: فلانکەسی ناچاری ئەوە کرد.

**لَجَّأَهُ الى كذا**: بەمانا (لَجَأ) دێ.

**لَجَّأَ مالَهُ**: ماڵو سامانەکەی بۆ هەندێ لە میراتگرەکانی داناو هەندێکیانی بێ بەش کردن.

**اِلْتَجَأَ اليه**: بەمانا (لَجَأ) دێ.

**اِلْتَجَأَ الى فلان**: پەنای بۆ فلانکەس بردو داوای لێ کرد پشتی بگرێ.

**اِلْتَجأ عنه**: لێی لادا، وازی لەو هێناو چو بۆلایەکی تر.

**تَلَجَّأَ اليه**: پەنای بۆ بردو پشتی پێ بەست.

**تَلَجَّأَ عنه**: لەولای لای دا بۆ یەکێکی تر.

**تَلَجَّأَ من القوم**: لەنەتەوەکە جودا بۆوە و چووە گەڵ نەتەوەیەکی تر ٥ لەحەدیسی کەعب دا هاتووە دەڵێ: (من دخل ديوان المسلمين ثُمَّ تَلَجَّأَ منهم فقد خرج من قبة الإسلام).

**اللاّجِئ**: پەنابەرو ئاوارە؛ کەسێك پەنابەری بۆ وڵاتێکی بێگانە لەترسی چەوساندنەوە یان لەترسی شەڕو ئاژاوە یان لەبەرپرسیاریەتی.

**اَلْجَأ**: پەناگاو شوێنی حەوانەوە ٥ (ك: ملاجئ).

**لَجَبَ القومُ لَجباً**: خەڵکەکە کردیانە هەراو هۆریاو هاتو چۆو تێکەوە هاویشتن.

**لَجِبَ البَحْرُ**: دەریا کەوتە جونبوش‌و شەپۆل هاویشتن ◦ دەگوترێ: (لَجِبَ الموجُ) شەپۆلەکان تێکیانەوە هاویشت.

**اللَّجَبُ**: دەنگ بەرزکردنەوەو نەڕەنەڕی پاڵەوانان لەمەیدانی جەنگ دا ◦ حیلکەو حیلاندنی ئەسپە.

**لَجَّ في الأمر لَجّاً**: ملی نایە کارەکەی‌و بڕیاری دا وازی لێ نەهێنێ.

**لَجَّ في الأمر لَجاجاً ولَجَاجَةً**: دەستی بەکارەکەی کردو بڕیاری دا وازی لێ نەهێنێ ◦ قورئان دەفەرموێ: (ولو رحمناهم و كشفنا مابهم ضرّ لَلَجّو في طغيانهم) (فهو لجوج ولجوجة).

**لَجَّ فلان**: فلان بەردەوام بوو لەکێشە ونیزاع دا.

**لَجَّ القومُ**: خەڵکەکە دەنگیان تێکەڵاو بوو کردیانە گەڕە لاوژێ.

**أَلَجَّ القوم**: خەڵکەکە سواری شەپۆل بوون ◦ خەڵکەکە کردیانە هەراو هۆریاو گەڕەلاوژێ.

**لاجَّ خَصْمَهُ**: بەردەوام بوو لەبەربەرەکانی کردنی ڕکابەرەکەی.

**لُجِّجَتِ السفينة**: کەشتییەکە کەوتە ناو شەپۆلی دەریاوە، بەناو شەپۆلی دەریادا ڕۆیی.

**إلْتَجَّ البحرُ**: دەریا شەپۆلەکانی تێکیانەوە هاویشت.

**إلْتَجَّت الأرضُ بالسَّراب**: تراویلکە لەزەوی دا وەکوو شەپۆلی دەریا هاتە بەرچاو.

**إلْتَجَّ الظلامُ**: تاریکی تێکەڵ بوو ◦ چەواشە بوو.

**إلْتَجَّت الأصواتُ**: دەنگەکان تێکەڵ‌و پێکەڵ بوون، بوو بەگەڕەلاوژێ.

**إلْتَجَّ الأمرُ والموجُ**: کارەکە گەورە بوو تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو شێوا.

**تَلَجْلَجَ متاعَ فلان**: دوای کاڵای فلانی کرد.

**إسْتَلَجَّ متاعَ فلان**: داوای کاڵای فلانی کرد.

**إسْتَلَجَّ بيمينه**: سوێندی خواردو کەفارەتەکەی نەدا چونکە بڕوای وابوو سوێندەکەی لێ نەکەوتووە.

**الألَنْجَجُ**: چیلکەی ڕوەکی بۆنخۆش ◦ دەگوترێ: (عود ألَنْجَجُ) عودێکی بۆنخۆشە.

**اللُّجاجُ**: (بحر لُجاج) دەریایەکی شەپۆل فراوان ◦ قوڵ.

**اللَّجاجَةُ**: دەگوترێ: (في فؤاده لَجَاجَة) دڵی تەپەتەپیەتی لەبرسان.

**لُجُّ**: قوڵایی دەریا، ئەو شوێنەی

ئەوەنـدە قولـە نازانـدرێ ئەنـدازەی چەندە.

**لُجُّ البحر**: پانتایی دەریا ○ (لُـجُّ الليـل) چڕی تـاریکی شـەو جەنگەی شـەوە زەنگ.

**اللُّجَّـــةُ**: زوربـــەی دەریــاو تێکـــەوە هاویشتنی شەپۆلەکانی ○ دەگوترێ: (فلان لُجَّةٌ واسعة) فلانکـەس وەکوو دەریایـەکی فـراوان وایـە؛ نانبـدەو سەخی سروشتە.

**لُجَّةُ الأمر**: زوربەی ئیش، زوربەی شت.

**اللَّجَّـــةُ**: تێکـــەڵو پێکـەڵی دەنـــگو هاتوهـاواری خـــەڵك ○ دەگـوترێ: (سَـمعت لجـة النـاس) هـاتو هـاوارو قیڕەو هەرای خەڵکەکەم بیست.

**اللُّجِّـيُ**: شـتێك نیـسبەت بـدرێ بـۆلای (اللُّجَّـة) ○ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ﴾.

**اللَّجَجُ**: ئەستوری پێڵوی چاوو گۆشـتنی ○ هەلاشـی قـولایی دەوری چـاو کـە برۆ دەوری داوە.

**اللُّجْجُ**: شێوە کونێکە دەمەکەی تەسكو ژێـرەوەی پـان لـەبنکی بـیردا لـەژێر کێودا دەبێ.

**لُجْـجُ العـين**: قـولایی دەوروبـەری چـاو ئەشکەوتی چاو.

**لَجِذَ الكلبُ لَجْذاً**: سەگەکە دەمی نایە ناو قاپەکـە ○ دەگـوترێ: (لَجِـذَ الكلــبُ الإنــاءَ) سـەگەکە نـاوەوەی قاپەکـەی لستەوە.

**لَجِذت الماشيةُ الكلأ**: ئاژەڵەکە بەسەری زوبـــانی خواردنەکـــەی خـــوارد نەیتوانی بەددانەکانی هەڵی بگرێ.

**لَجَــذَ الـسَّائِلُ فلانــاً**: سـوالکەرەکە زۆری ئیلحـاح کـرد لەداواکردنەکـەی دا، دوای ئـەوەی شـتێکیان پێـدابوو هـەرداوای دەکرد زیاتری پێ بدەن.

**المَلْجُــوذُ**: دەگـوترێ: (نبـت ملجــوذ) ڕووەکێکە ددانی لێ گیر نابێ، بۆیـە حوشـــترەکە بەپێـــشەوەی دەمـــی خواردی.

**لَجَفَ الظَّبْيُ وغيره في الكناس ونحوه لَجْفـاً**: ئاسـکەکە ژێــر خـۆی هــەڵکۆڵی یــان لەتەنیـــشتییەوە دەســـتی کـــرد بـــە هەڵکۆڵین.

**لَجَفَتْ البئرُ لَجْفاً**: بیرەکـە قەراغـەکانی داخوران‌و پان بوو.

**اللَّجـافُ**: بـەربێلای دەرگا؛ بـەردەرانی دەرگـا ○ ئـەو لوتکـە شـاخو درکـە شاخانەی لە کێوەکە بـەرز بوونـەوە بەسەر ئەشکەوتو کاودا دەڕوانـن ○ (ك: الْجفَةٌ ولُجُف).

**لَجَّفَ الشَّيْئَ**: شتەکەی لەدەوران دەوری بەرفراوان کرد.

**لَجَّـــفَ القَـــومُ مِكْيـــالهم أو بئـــرهم**:

خەڵکەکـــە ئـــامێری پێوانەکـــەیان تەنەکـەو قـسناخ و ڕبەکـەیان فـراوان کردن یان بنکی بیرەکەیان فراوان بوو.

**اللُّجُفُ**: چاڵێکە لەلایـەکی بـیرو شتی واوە هەڵدەکەندرێ ٥ یان بیرێك ئـاو لـەدەوران دەوری داخـورێنیو بـن هـەڵۆڵی بکـا بیکاتـە بـن کـەورگ ٥ ناوقەدی شیو.

**اللُّجْفَـــةُ**: ئەشـــکەوت لــە کێـــو دا ٥ بــەربێلای دەرگـــا ٥ ســـەر دەرانــی دەرگاو بن دەرانی.

**لَجْلَـجَ فـلان**: فلانکـەس لەقـسەکانی دا ڕاڕابـــوو، نـــەیتوانی مەبەســـتو نیازەکەی بگەیەنێ ٥ (فهو لَجْلاجٌ).

**لَجْلَجَ الشَّيْئَ في فيه**: شتەکەی لەدەمی دا هەڵـــسوڕاندو هێنـــایو بـــردی بۆئـــەوەی بیجـوێو قـوتی بـدا ٥ دەگوترێ: (لَجْلَجَ اللُّقْمَةَ) پاروەکەی بەناودەمی دا هێناو برد بۆئـەوەی قوتی بدا.

**لَجْلَـجَ فلانـاً عـن الـشَّيْئ**: فلانکەسـی بـــەدەوری شـــتەکەدا هەڵـــسوڕاند بۆئـــەوەی لەشـــتەکە بگـــرێ، لێـــی بتاشێ.

**تَلَجْلَجَ**: بەمانا (لَجْلَجَ) دێ.

**اللَّجْلاجُ**: کەسێك زمان قورس بێ زمان ڕەوان نـــەبێ بـــەگرانی قـــسەی بـــۆ بکرێ.

**اللَّجْلَجُ**: تێکەڵو پێکەڵو خـوارو خـێچ ٥ دەگـوترێ: (اَلْحَـقَ اَبْلَـجُ والباطِـلُ لَجْلَج).

**اَلْجَـمَ الدَّابَّـةَ**: وڵاخەکـەی لغـاو کـرد، لغاوی لەدەمی کرد.

**اَلْجَمَ الماءُ فلاناً**: ئاو گەیشتە بینە قاقای فلانکەس.

**اَلْجَمَ فلانـاً عـن حاجتـه**: فلانکەسـی لـە پێداویـــستییەکانی مـــەنع کـــرد ٥ دەگـوترێ: (تَکَلَّـمَ فاُلْجَمْـتُهُ) قـسەی کردو بۆڕم دا.

**لَجَّمَهُ الماءُ**: ئاو گەیشتە بینە قاقای.

**اللِّجامُ**: لغاو؛ ئاسنێکە دەکرێتـە دەمـی ئەسـپەوە، دوایـی کـراوە بـەناو بـۆ هەموو قایشو قوڕو شێ لەگەڵی دایە ٥ دەگـوترێ: (لَفَـظَ لَجامَـهُ): دوای مانـــــدووبوونێکی زۆر وازی لـــــە پێداویستییەکانی خۆی هێنا ٥ (ك: ألجمة ولُجُمٌ ولُجْمٌ).

**اللَّجّامُ**: لغاو دروستکەر، لغـاو فـرۆش ٥ شـــوێنی لغـــاو لـــەدەمو چـــاوی ئەسپەکەدا.

**اللُّجْمَةُ**: کێوێك لە کێوەکـانی نـاو زەوی نیـشانەیەك لەنیـشانەکانی زەوی ٥ کێـوی پانـەوە بـوو کـە زۆر گـەورە نەبێ ٥ لایەکی شیو و دۆڵ.

**لَجَنَ في المشي**: لە ڕۆیشتن دا گرانو تەمبەڵ بوو ٥ (فهو وهي لجون).

**لَجَنَ وَرَقَ الشجر ونحوه لَجْناً**: گەڵای درەختەکەی تێکەڵ بەئاردو جۆو شتی وا کرد بۆنەوەی دەرخواردی حوشترەکانی بدا.

**لَجِنَ لَجَناً**: چلکن بوو.

**لَجِنَ لِلُشْطُ في رأسه**: شانە لەناو قژی سەری دا هەڵنەسوڕا لەبەر چڵك.

**لَجَّنَ الوَرَقَ**: گەڵاکەی وردو هەنجن هەنجن کرد تاوای لێ هات لینج بوو.

**تَلَجَّنَ الشَّيْئُ**: شتەکە لینج بوو.

**تَلَجَّنَ الرأسُ**: سەرەکە شۆردراو لەچڵكو پلك پاك نەبۆوە.

**تَلَجَّنَ الرأسُ**: سەری چڵکن بوو.

**اللَّجْنَةُ**: کۆمەڵێك ئادەمیزاد کۆببنەوە بۆکارێکی دیاریکراو ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد ئەرکێکی تایبەتییان بخرێتە ئەستۆ و داوایان لێ بکرێ ئەنجامی بدا.

**اللُّجَيْنُ**: زیو.

**اللَّجِينُ**: کەفی دەمی حوشتر ٥ هەموو تێکەڵەیەك لە ئاردو خورما هاڕاو و شتی وا کە بەئاو ڕشێندرابێ تا لینج بووبێ.

**لَحَبَ الطريق لُحوباً**: ڕێگاکە ئاشکراو ڕون بوو.

**لَحَبَ الشَّيْئَ**: لەشتەکەی داو شوێنکەی لێ کرد، یان بەهۆی لێدانو بڕینەوەوە شوێنکەی لەشتەکە کرد.

**إلْتَحَبَ الطريقَ**: بەڕێگاکەدا ڕۆیی.

**اللاحِبُ**: ڕێگای ئاشکراو ڕون.

**اللَّحْبُ**: بەمانا (أللاّحِبُ) دێ.

**المِلْحَبُ**: زوبانی ڕەوان ٥ پیاوی جنێو فرۆشو زمان پیس، هەر کێردو چەقۆ و ئامێرێك شتی پێ ببڕدرێ یان توێکڵی شتی پێ داماڵدرێ.

**لَحَجَ إليه لَحْجاً**: پەنای بۆ برد ٥ مەیلی لای ئەوی کرد.

**لَحِجَ بالمكان**: پەنای بۆ برد ٥ کەیلی لای ئەوی کرد.

**لَحِجَ السيفُ وغيره لَحَجاً**: شمشێرەکە لە کالان دا ئاخێ بوو ٥ دەشگوترێ: (لَحِجَ الخـاتَمُ في الأصْبُع) ئەنگوستیلەکە لەپەنجەدا ئاخێ بوو.

**لَحِجَ بالمكان**: لە شوێنەکەدا مایەوەو پێوەی ڕاهات ٥ دەگوترێ: (لَحِجَ في الأمر) چووە ناو ئیشەکەوە.

**لَحِجَ بينهم شرٌ**: شەڕو هەرا لەناویان دا بەرپا بوو.

**لَحِجَ الشَّيْئُ**: شتەکە تەنگ بۆوە.

**لَحِجَ اللُّحْيُ**: پوکیو شوێنی لێ ڕوانی ددانەکان خوار بوو (فهو ألْحَجُ).

**لَحْوَجَ عليه الأمر**: کارەکەی لێ تێکەڵو پێکەڵ بوو.

**اَلْحَجَهُ اليه**: ناچاری کرد پەنا بۆ ئەو بەرێ ◦ خواری کرد.

**لَحْــجَ عليــه الخَبَــرَ**: هەواڵەکــەی لێ پێچەوانە کــردەوە ◦ ئــەوەی پێــی ڕاگەیانــد پێــچەوانەی ئــەوەبوو کەلەدڵی دا بوو.

**إلْــتَحَجَ إليــه**: مــەیلی کــرد بــۆلای ◦ دەگوترێ: (أتي فلان فلاناً فلم يجد عنده مؤمّلاً ولا مُلْتَحَجاً) فلانکەس هــات بــۆلای فــلان هــیچ هیــواو مەیلێکی لەلا نەبینێ.

**تَلَحَّجَ عليــه الأمْـرَ**: پێچەوانەی ئەوەی لەدڵی دا بوو بۆی ئاشکرا کرد.

**إسْتَلْحَجَ البابُ أو القُفْـلُ**: دەرگاکە یــان قفڵەکە داخراو نەکرایەوە.

**اللَّحَجُ**: زیبکەو کوانولەی ناوچاو.

**المَلْحَـجُ**: پــەناگا ◦ دەربەنــدو تــەنگڵ ◦ (ك: مَلاحِج).

**المَلحوجَـةُ**: دەگـوترێ: (خِطـة ملحوجـة) پلانو پرۆفایلێکی نارێکو پێکە ◦ هــەروا نــاوە بــۆ ڕێگــای تەنگەبــەر لەکێودا ◦ (ك: ملاحِج).

**لَحَّـتِ القرابــة بيننــا لَحّــاً**: خزمایــەتی نێوانمــان نــزیکتر بــۆوەو باشــتر پێکەوە لکاین ◦ دەگـوترێ: (هــو إبــن عمي لَحّاً) ئەو کوڕی مامەو خزمــی نزیکمە.

**لَحِحَــت عينــه لَحَحــاً**: چــاوی بــەهۆی ڕیبۆقەوە پێکەوە نووساو هەڵنایە.

**اَلَحَّ السَّحابُ**: هەورەکە بارانی بەردەوام بوو.

**اَلَحَّ فلان على الشَّيْئ**: فلانکەس لەسەر شتەکە بەردەوام بــوو ◦ دەشــگوترێ: (أَلَــحَ عليــه بالمَــسألة) لــەداواکردنو ســـواڵ کــردن دا زۆر نــوزە درێــژی کرد.

**تَلَحَّحَ**: بەمانا (أَلَحَّ) دێ.

**اللاّحُ**: دەگوترێ: (مكان لاحّ) شوێنێکی تەنگەبـــەرە ◦ (وادٍ لاحّ): شــیو و دۆڵێکی چڕو نزاراوییە درەختەکانی تێك چڕژان.

**اللَّحَّةُ**: (خُبْزَة لَحَّةٌ) نانێکی وشکە.

**اللَّحوحُ**: جۆرە نانێکە لــەولاتی یەمــەن دەکـــرێو بەماســـتو شــــیرەوە دەخورێ.

**المِلْحَـــاحُ**: بـــەمانا (اللَّحـــوح) دێ ◦ دەگـــوترێ: (ســـحاب مِلْحـــاح) هەورێکە بارانەکەی بەردوامە.

**لَحَـدَ لَحْـداً**: لــەرێگادا لایــدا ◦ دەگـوترێ: (لَحَــدَ الــسهم عــن الهَــدَف) تیرەکــە لەنیشانەکە لایداو نەیپێکا.

**لَحَدَ إليه**: مەیلی کرد.

**لَحَدَ فلان**: فلانكەس ستەمی كردو لەحەق لایدا.

**لَحَدَ في الدين**: تانەی لەئایین دا.

**لَحَدَ عَليٌّ في الشهادته**: عەلی لە شایەتیدانەكەی دا تاوانبار بوو.

**لَحَدَ اللَّحْدَ**: گۆڕیچەی بۆ مردومكە هەلكەند.

**لَحَدَ المَيِّتَ**: مردووەكەی لەگۆڕیچەدا شاردەوە، ناشتی.

**أَلْحَدَ السهمُ عن الهدف**: تیرەكە لەهەدەف لایدا.

**أَلْحَدَ فلان**: فلانكەس لەحەق لایدا، شتێكی بەحەق دانا كەحەق نەبوو.

**أَلْحَدَ في الحرم**: پیرۆزی حەرەمی شكاند، كاری نەگونجاوی لەحەرەمی مەككەدا ئەنجام دا.

**أَلْحَدَ في الدين**: تانەی لەئایین دا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي آيَاتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَا﴾.

**أَلْحَدَ الرجلُ**: پیاوەكە ویرە ویرو كێشەو دەمەدەمێ كرد.

**أَلْحَدَ اللَّحْدَ**: گۆڕیچەی هەلكەند.

**أَلْحَدَ الميت**: مردومكەی لەگۆڕیچەدا شاردەوە.

**أَلْحَدَ بفلان**: گالتەی بەفلان كردو شتی بۆ هەلبەست.

**إِلْتَحَدَ إليه**: مەیلی بۆلای كردو چووە ژێر باڵیو هانای بۆ برد ٥ (فهو ملتحد).

**إِلْتَحَدَ في الدين**: تانەی لەئایین دا.

**اللاحِد**: (قبر لاحد) گۆڕی وا گۆڕیچەی هەبێ.

**اللَّحْدُ**: كونێكە لەلایەكی گۆڕەكەوە هەلدەكەندرێ مردووەكەی تێدەخرێ ٥ (ك: ألحاد ولحود).

**المُلْحَدُ**: بەمانا (اللَّحْدُ) دێ.

**المُلْحِدُ**: تانەدەر لە ئایینو بێدین دەرچوو لەئایین ٥ (ك: مُلْحِدون وملاحِدَة).

**لَحَزَهُ لَحْزاً**: ئیلحاحی لێ كرد.

**لَحِزَ فلان لَحَزاً**: فلانكەس ڕژدو چروك بوو ٥ دڵتەنگ بوو.

**تلاحَزَ القومُ**: خەلكەكە قسەیان تێك گێڕایەوە ڕەدی یەكتریان دایەوە.

**تلاحَزَ الصِّبيانُ**: منداڵەكان شەڕە شیعریان كرد.

**تلاحز الشجرُ**: درەختەكە تێك چرژاو چووە ناویەكەوە.

**تَلَحَّزَ فلان**: فلانكەس ڕژدو چروك بوو.

**تَلَحَّزَ عنه**: لێی دواكەوت ٥ چاكی داوێنی هەلكرد، قۆلی لێ هەلكرد بۆ شەڕ كردن یان بۆسەفەر كردن.

**تَلَحَّزَ فَمُهُ**: بەهۆی خواردنی هەنارو شتی واوە ئاوی شیرین كەوتە ناو دەمیەوە.

**المَلْحَزُ**: دەربەندو تەنگلّ ٥ (ك: ملاحِز) ٥ دەگوترێ: (وقعوا في الملاحِز).

**لَحِسَ الإناءَ لَحْساً**: قاپەكەی بەپەنجە یان بەزوبان لستەوە.

**لَحِسَ الدودُ الصوفَ لَحْساً**: كرمەكە خوریەكەی خوارد ٥ دەگوترێ: (لَحِسَ الجَرادُ الخِضرَ والشّجَرَ) كوللە بێتان سەوزایی ڕوەك‌و درەختی خوارد.

**ألحَسَتِ الأرضُ**: زەوی سەوز بوو ڕوەك‌و گیاو گژەكەی سەری دەرهێنا.

**ألْحَسَ الماشيةَ**: كەمێك ئاژەڵەكانی لەوەڕاندن.

**إلْتَحَسَ منه حَقَّهُ**: مافی خۆی لێ ستاند.

**اللاّحِسَةُ**: دەگوترێ: (سنة لاحِسة) ساڵێكی قات‌و قڕی‌و نەهات بوو، هەرچی ڕوەك‌و سەوزایی هەبوو هەمووی كڕاندەوە ٥ دەگوترێ: (أصابتهم لواحِسُ) ساڵانی قات‌و قڕی یەخەی گرتن‌و هەرچی بژێو و بەروبوومیان هەبوو لرفیان دا.

**اللاّحوس**: نەگبەتی‌و شوم ٥ حەریص‌و سوور بوو لەسەر مەبەست.

**اللَّحْسُ**: ئەو جروزەو تەرزەو گلۆكەی بەسەر ڕوەك‌و گیاو گژەوە دەردەكەوێ.

**اللُّحْسَةُ**: دەگوترێ: (ما لك عندي لُحْسَةٌ) هیچت لای من نیە.

**اللُّحُوسُ من الناس**: كەسێك بەشوێن شیرنایەتی دا بگەڕێ وەكوو مێش.

**اللُّحُوسُ**: ئەوسن‌و زۆرخۆر ٥ مرۆڤی زۆرخۆرو ئەوسن.

**المِلْحَسُ**: حەریص‌و سووربوو لەسەر هەڵوێست‌و مەبەست ٥ ئەوەی هەرچی بەردەستی بكەوێ‌و دەسەڵاتی بەسەردا بڕوا لرفی بداو بۆ خۆی كۆنترۆڵ بكا ٥ ئازاو چاونەترس ٥ (ك: مَلاحِس).

**المَلْحَسُ**: بەمانا (اللَّحْس) دێ ٥ شوێنی لستنەوەو ڕامالین ٥ دەگوترێ: (تركته بملاحِس البقر أولادَها) لە شوێنێكی ڕوتەن‌و چۆڵ‌و هۆڵ دا جێم هێشت وەكوو چۆن مانگاكێوی بێچووەكانی لەشوێنی چۆڵ‌و هۆڵ دا نەبێ دانانێ.

**لَحَصَ في الأمر لَحْصاً**: چووە ناوكارەكەوە، ملی لەكارەكە نا.

**لَحَصَ فلاناً عن كذا**: فلاّنكەسی لەو شتە پشت سارد كردەوە ٥ ژێوانی كردەوە.

**لَحِصَت عينه لَحَصاً**: پێلۆی چاوی بەهۆی ڕیپۆق بەیەكەوە نووسا ٥ لێواری پێلوی چاوی وێكهاتەوە، هەلگەڕایەوە.

**لَحَّصَ في الأمر**: لەكارەكەی دا

تونـدڕەوی نوانـد ٥ ڕێبـازی ژیـانی بەرتەسك كردەوە.
لَحَّصَ فلاناً عن كذا: فلاّنكەس لەو شتە پشت سارد كردەوە ٥ فێری تەمبەڵی كرد.
لَحَّصَ الكتابَ: كتێبەكەی جزو بەند كرد.
إلْتَحَصَ الأمْرُ: كارەكە قورس بوو، پتەو بوو.
التَحَصَتْ عَيْنُهُ: چاوی نووسان.
التَحَصَت الإبـرة: دەرزییەكە كونەكەی گیرا.
الـتَحَصَ فلانــاً الى الأمــر: فلاّنكەسـی ناچار كرد بۆ كارەكە.
التَحَصَ فلانـاً عـن كـذا: فلاّنكەسی لە فـلاّن شـت پـشت سـارد كـردەوە ٥ لەكردنی فلاّنشت دا تەمبەڵی كرد.
الــتَحَصَ الــشَّيْئُ فلانــاً: شــتەكە بەفلاّنكەس دا چوو، شـتەكە چووە ناو جەستەیەوە.
إلْـتَحَصَ البيـضةَ ونحوهـا: ئـەوەی نـاو هێلكەكەی هەڵقوڕانـد ٥ خواردیـەوە ٥ دەگـوترێ: (الـتَحَصَ الـذئب عـينَ الـشاة): گورگەكـە چـاوی مەڕەكـەی كوێر كردو هەڵیلوشی.
لَحَـاصِ: ناخۆشـیو بـەلاّو كارەسـات ٥ ساڵی قاتو قڕی.

المَلْحَصُ: پەناگاو شوێنی تێداحەوانەوە.
لَحَـظَ المكـانَ لَحْظـاً: شـوێنەكەی مـاڵیو بەئاورشـاندیو پـاكی كـردەوە ٥ (فهـو لاحِظٌ).
التَحَظَ: رقی هەڵسا.
لَحَظَـهُ بـالعين واليـه لَحْظـاً ولَحَظانــاً: بەتیلـەی چـاو سـەیری كـرد ٥ (فهـو لاحِـظ ولَحّـاظ، وهـي لاحِظـة) ٥ (ك: لواحِظ) ٥ دەگـوترێ: (أنا عنده محفوظ وملحوظ): ئەمن پـارێزراوو چـاودێر كراوم بەچاوی پارێزگاریی.
لاحَظَه ملاحظة ولحاظاً: چـاودێری كـردو سەرنجی لـێ دا.
لاحظَ عليه كذا: ڕەخنەی لـێ گرت.
تلاحَظا: هەریەكە لەودوانـە تێبینیـان لەسەر یەكتر هەبوو.
اللِحـاظ: قولینـچكی چـاو، تیلـەی چـاو بەلای لاجانگەوە ٥ (ك: لُحُظٌ).
اللَّحْظَـةُ: چـاوتروكاندنێك ٥ ماوەیـەكی كەم بەئەنـدازەی چـاوتروكاندنێك ٥ دەگوترێ: (سكت عن الكلام لحظة).
الملاحَظَـةُ: سـەرنجدانی شـت بـە تیلـەی چـاو ٥ سـەرنجو ڕاوبۆچـون لەسـەر شــت ٥ چــاودێری كردنــی شــتو ســـەرنجدانی حـــاڵو ومزعـــیو تۆمـــاركردنی دیاردەكـــانی بـــۆ مەبەستی زانیاری، وەكوو چـاودێری

کردنـــی گەشـــەکردنی روەك یـــان هەڵـــچونی بورکـــانو تێکـــەوە هاویـشتنی شـەپۆلەکانی دەریـا یـان جـەو جـوڵی ئەسـتێرەو چـونیەتی ڕۆیـشتنەکانیان ◊ یـان چـاودێری حاڵەتی نەخۆشیو چارسـەرەکانیو کاردانەوەیان لەسەر نەخۆشەکە.

**المَلْحَظ**: بەمانا (اللّحظ)دێ.

**الملحوظــــة**: وشـــەیەکە دادەنـــرێ لەپـــەراوێزی قـــەراخی نوســـراوی ســـەرکتێب بەمەبەســـتی ئاگـــادار کردنـەوەی نووسـەر لەهەڵەو کـەمو کوڕییەکانی.

**لَحَـــفَ القمـــرُ**: مـــانگ چـــووە حاڵـــەتی مەحاقەوە ◊ ناڵی دەڵێ:

لەدەوری تۆیە ئەی خورشیدی پرتەو بەخشی سەوکەرەدان
کـە نـاڵی وا لـە حـاڵەتی مـەحاقی مـاهی ئـەو دایـە

**لَحَفَ فلاناً**: فلانکەسی بەلیفە داپۆشی.

**لَحَفَ فلاناً الثَوْبَ**: کراسی لەبەر فلانکەس کرد ◊ دەگوترێ: (لَحَفَهُ فَضْلَ لحافه): بەنوێنە زیادەکەی داپۆشی.

**لَحَـفَ النـار الحَطَـبَ**: داری خـستنە سـەر ئاگرەکە ◊ داری بەئاگرەکەوە نا.

**لَحَـــفَ اللحـــمَ عـــن الحیـــوان**: گۆشـــتی حەیوانەکەی گرو، گۆشتەکەی داماڵی.

**لَحَفَ فلاناً بِجُمْع کفـه**: بەهـەموو دەسـتی لەفلانکەسی دا، مستەکۆڵەی پێ کێشا.

**لَحَفَ فلاناً سهماً ویه**: تیری لەفلانکەس دا تیری پێوەناو هەنگاوتی.

**اللُحْظَـةُ**: چـاوتروکاندنێك ◊ ماوەیـەکی کـەم بەئەنـدازەی چـاوتروکاندنێك ◊ دەگوترێ: (سکن عن الکلام لحظة).

**لَحَـفَ اللّحـافَ**: لێفـەی دروسـت کـرد ◊ لێفەی درو.

**اَلْحَـفَ الـسائِلُ**: سـوالکەرەکە ئیلحـاحی کـرد بـۆ شـت وەرگـرتن یـان سـواڵی کـــردو پێویـستیـــشی پێـــی نـــەبوو چـونکە دەوڵەمەنـد بـوو ◊ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿لاَ یَـسْأَلُونَ النَّـاسَ إلْحَافًا﴾.

**اَلحَـفَ فـلان**: فلانکـەس داوێنـی بەسـەر زەوی دا راکێـشاو فیـزو تەکـەببوری کرد ◊ بەدامێنی کێودا رۆیی.

**اَلحَفَ به**: زیانی پێ گەیاند.

**اَلحَفَ فلاناً**: لێفەی بۆ فلانکەس کڕی.

**اَلحَـفَ ضَـیْفَهُ**: میوانەکـەی پـێش خـۆی خـست، خزمـەتی کـردو خواردنـە خۆشەکانی بۆ ئەو دانا.

**اَلحَـــفَ شـــارِبَهُ**: سمێڵـــی زۆر کـــورت کردنەوە.

**اَلحَـفَ فلانـــاً الثـوبَ**: کراســی لەبــەر فلانکەس کرد.

**لاحَفَـهُ**: چـووە بـن بـاڵیو وەگـری بـوو کەوتە گەڵیو لێی جیانەبووەوە.

**لَحَفَ فلان:** فلانكەس داوێنی لەزەوی خشاند بەسەر زەوی دا رایكێشا بەشێوەی لوتبەرزیو خۆبەزلزانی.

**التَحَفَ لِحافاً:** لێفەی بۆ خۆی درو.

**التَحَفَ باللِحاف:** لێفەی بەخۆی دادا ٥ خۆی بە لێفە داپۆشی ٥ دەگوترێ: (التَحَفَت الدابّة بالسمن): ولاخەکە بەبەز خۆی داپۆشی.

**تَلَحَّفَ لِحافاً:** لێفەی بەخۆی دا دا.

**اللِحاف:** هەرشتێك بەخۆدا بدرێو خۆی پێ داپۆشی لەکاتی نوستن دا ٥ پۆشاکی سەر پۆشاك، وەکوو جبەو عەباو پالتو ٥ پارچە قوماشێکی ناواخن کراو بە لۆکە لەکاتی نوستنو پالکەوتن دا بەخۆدادەدرێ ٥ (ك: لَحُفٌ).

**اللّحْفُ:** دامێنی کێو، بنی کێو.

**المِلْحَفُ:** پۆشاکێك کەلەسەر هەموو پۆشاکێکەوە لەبەر بکرێ وەکوو جوبەو عەباو شتی وا.

**المِلْحَفَةُ:** بەمانا (المِلْحَفُ) دێ ٥ عەبای ئافرەت، کە ئافرەت لەسەر هەموو پۆشاکێکەوە لەبەری دەکاو خۆی پێ بالاپۆش دەکا.

**لَحَقَ الفَرَسُ لحوقاً:** ئەسپەکەی کزو لاواز بوو ٥ دەگوترێ: (لَحَقَ بَطْنُهُ): ورگی بچوك بۆوە.

**لَحِقَ الثَمَنُ أو اليَمينُ فلاناً:** نرخەکەی کەوتە سەر، سوێندی کەوتە سەر.

**لَحِقَ به لَحاقاً وَلَحَقاً:** پێی گەیی ٥ (لَحِقَ به لُحُوقاً): پێوەی نووسا.

**أَلْحَقَ به:** پێی گەیی.

**ألحق فلاناً به:** فلانكەسی شوێن ئەو خست ٥ بەدوو ئەودا ناردی ٥ دەگوترێ: (ألحق القائِفُ الولد بأبيه): سەرناسو قائیفەکە منداڵەکەی پاڵ باوکی داو دوای سەرنجدانی خۆی وتی ئەم منداڵە کوڕی ئەوپیاوەیە لەبەر لێکچونی دیاردەی نێوانیان.

**الحَقَ فلاناً فلاناً:** فلانكەسی کردە کوڕی فلان ٥ فلانكەسی والێ کرد بکاتە فلان.

**التَحَقَ به:** پێی گەیی ٥ پێوەی نووسا، چووە پەنای ئەوو پالی بەئەوەوە دا.

**تلاحَقَتْ المطايا ونحوها:** کاروانەکان یەك بەدوا یەك دا هاتنو بەیەك گەیشتن ٥ دەگوترێ: (تلاحق القَوْمُ): خەلکەکە گەیشتنە یەکتر.

**تلاحَقَتْ الأخبار وأحوال القوم:** هەواڵەکانو رووداوەکان یەك بەدوو یەك دا هاتن.

**استَلْحَقَ فلاناً:** فلانكەسی بەکوڕی خۆی داناو پاڵ خۆی دا.

**اللّحِقُ:** (أبو لاحق): بازو هەڵۆ.

**اللاّحِقَـةُ:** میوە چینی دووەمجاری، دووەم بەری میوە ٥ میوە کەپێدەگا یەکەم چینی نا دووەم چینی ٥ (ك: لواحق).

**اللَّحَقُ:** ئەوەی دوای شتێکی تر دێ ٥ پاشکۆی کتێبو شتی وا دوای ئەوەی دانەرێك لەدانانو نووسینی کتێبەکەی دەبێتەوە هەندێ تێبینیو هەڵەبڕیو پڕکردنەوەی کەمو کوڕی دەکاتە پاشکۆیەك یان زیاترو دەیخاتە کۆتایی کتێبەکەی ٥ لەبواری قانونی دەولی دا وشەی (اللُّحَق) بەو حوکمو شیکردنەوانە دەگوترێ: (کە دەکرێنە پاشکۆی رێککەوتنامە نێو دەوڵەتییەکە یان هی برگەیەکی تایبەتی ئەو موعاهەدەیە ٥ کەسێك کرابێتە کوڕی یەکێك یان کچی یەکێك واتە نەزاندرێ باوکی کێیە ٥ کوڕی باوکی خۆی نەبێ ٥ روبەرێکی شیوو کێو وشك بوبێتەوەو تۆوی پێوە کرابێ بۆ کشتوکاڵ ٥ (ك: ألحاق).

**المُلْحَقُ:** لەبواری قانونی نێودەوڵەتی دا فەرمانبەرێکە لەسەفارەتی دەوڵەتێك دا دادەمەزرێ لەکارێکی تایبەتی دا ٥ وەکوو مولحەقی عەسکەری مولحەقی سەقافی مولحەقی رۆژنامە نووسی ٥ پەرێك یان زیاتر لە رۆژنامە یان گۆڤارێك دوای دەرچوونی ژمارەکە پاشکۆکەی چاپو پەخش دەکرێ ئەمەش بەهۆی هەواڵێکی گرنگ کە پێویست دەکا زوو بڵاوبکرێتەوە.

**لَحَكَ الشَّيْءَ بالشَّيْءِ لَحْكاً:** شتەکەی بەشتەکەوە نووساند ٥ (لاحَكَ الشَّيْءَ بالشَّيْءِ): شتەکەی بەشتەکەوە نوساند، جۆشی دا، دەگوترێ: (لوحِكَ فَقَار ظهره): فەقەرەکانی پشتی چوونە ناویەکەوە.

**تلاحَكَ الشَّيْءُ:** شتەکان چونە ناویەکەوە ٥ دەگوترێ: (تلاحك البنیانُ): دیوارەکە چووە ناویەکەوەو تێکەڵ کێش بوو ٥ هەروا دەگوترێ: (دابة مُتَلاحِكَة): وڵاخێکی جەستە دامەزراوو تێکسمراوو بەهێزە.

**لَحْلَحَ القومُ:** خەڵکەکە لەشوێنی خۆیان جێگیر بوونو مانەوە، زێدی خۆیان جێ نەهێشت.

**تَلَحْلَحَ القوم:** خەڵکەکە لەزێدی خۆیان جێگیر بونو جێیان نەهێشت.

**تَلَحْلَحَ فلان عن المكان:** فلانکەس ئەو شوێنەی بەجێ هێشت.

**اللَّحْلَحُ**: شوێنی تەنگەبەر ٥ (خبزة لَحْلَحَ): نانی وشك.

**لَحَمَ الشَّيْءَ لَحْماً**: شتەکەی پێکەوە نووساند، جۆشی دا ٥ دەگوترێ: (لَحَمَ الصائغ الذهب والفضة): ئاڵتونچیەکە پارچە زێڕەکەی لەحیم کردو شکاویەکەی چاك کردەوە.

**لَحَمَ الأمْرَ**: کارەکەی بناوان شێل کرد بەرێكو پێکی ئەنجامی دا.

**لَحِمَ العَظْمَ لَحْماً**: گۆشتی لەئێسقەکە داماڵی.

**لَحَمَ القومَ**: گۆشتی دەرخواردی قەومەکە دا ٥ (فهو لاحِمٌ).

**لَحَمَ بالمكان لَحَماً**: چووە ناو شوێنەکە.

**لَحِمَ الرجُلُ**: پیاوەکە حەزی لەگۆشت بوو ٥ زۆری گۆشت خواردو پێی توشی نەخۆشی بوو ٥ (فهو لَحِمٌ): دەگوترێ: (لَحِمَ الصَّقْرُ ونحوه): بازو هەڵۆکە حەزی لەگۆشت بوو.

**لَحِمَ الرَّجُلَ**: زەبری ئاڕاستەی پیاوەکە کرد گۆشتی هەنگاوت، لەگۆشتی دا ئێسقانی بەرنەکەوت ٥ لەپیاوەکە نزیك بۆوە چووە پەنایەوە شانی بەشانییەوە نا.

**لَحُمَ فلان لَحامَةً**: فلانکەس گۆشتن، قەڵەو بوو ٥ (فهو لَحِمٌ).

**لَحُمَت الدابَة لَحامَةً ولُحُوماً**: ولاخەکە گۆشتی زۆر بوو قەڵەو بوو ٥ (فهي لَحِمة).

**ألحَمَ الرجلُ**: پیاوەکە بوو بەخاوەن گۆشت ٥ لەماڵی دا گۆشت زۆر بوو.

**ألحَمَ الزَرْعُ**: کشتوکاڵەکە دانەوێڵەی تێدا پەیدابوو، هاتە بەر.

**ألحَمَ بالمكان**: لەشوێنەکە مایەوەو دڵی پێوەی نووسا ٥ دەگوترێ: (ألحَمَتْ الدابة): ولاخەکە ڕاوەستاو نەڕۆیی.

**ألحَمَ الشَّيْءَ**: شتەکەی پێکەوە لکاند.

**ألحَمَ الثوبَ**: قوماشەکەی چنی، دەشگوترێ: (ألْحِمْ ما أسديت): ئەوەی دەستت پێ کردووە تەواوی بکە.

**ألحَمَ القومَ**: گۆشتی دەرخواردی خەڵکەکە دا ٥ دەشگوترێ: (ألحَمَه عِرْضَ فلان): ڕێی خۆش کرد بۆئەوەی جنێو بەناموسو شەرەفی فلان بدا.

**ألحَمَ بَصَرَهُ كذا**: چاوی تێ بڕیو بەچاو هەنگاوتی.

**ألحَمَ بين بني فلان شراً**: شەڕو ئاژاوەی بۆ خێڵی فلان نایەوە.

**لاحَمَ الصَّدْعَ**: درزەکەی پڕکردەوە ٥ چاکی کردەوە ٥ لەحیمی کردەوە ٥ دەگوترێ: (لاحَمَ بين الشيئين): دوشتەکەی پێکەوە نووساند.

**لاحَمَ الشَّيْئَ بالشَّيْئِ**: شتەکەی بەشتەکەوە نووساند ٥ (فهو مُلاَحَمٌ): ئەوشتە پێکەوە لکێندراوە ٥ دەشکوترێ: (حَبْلٌ ملاحم): حەبلێکە گشت بادراوە.

**التَحَمَ الجرحُ**: برینەکە وێکهاتەوە چاکبۆوە، گۆشتەوە زونی هێنایەوە.

**التَحَمَتْ الحربُ**: شەڕەکە گەرم بوو پەرەی ساند ٥ دەشکوترێ: (التَحَمَ الجيشان): دوو سوپاکە پەلاماری یەکیان داو تێك چرژان.

**تلاحَمَتْ الأشياء**: شتەکان پێکەوە لکان و پێکەوە چەسپان.

**تلاحَمَتِ الأشياءُ**: شتەکان پێکەوە لکانەوە دوای ئەوەی لێك ترازابوون.

**تَلاَحَمَتِ الشَجَّةُ**: برینەکە گۆشتەوەزونی هێنایەوە.

**اسْتَلْحَمَ الطريقُ**: ڕێگاکە بەرفراوان بوو.

**اسْتَلْحَمَ الزرعُ**: کشتوکاڵەکە تێك چرژا گەشەی کردو لێك هاڵا.

**اسْتَلْحَمَ الشَيْئَ**: شوێن شتەکە کەوت.

**اسْتَلْحَمَ الرجلُ الطريق**: ملی ڕێگاکەی گرت و پێیدا ڕۆیی بەری نەدا ٥ یان بەپانایی ڕێگاکە دا ڕۆیی، ڕێگا پانەکەی گرتەبەر.

**اسْتُلْحِمَ فلان**: فلانکەس لەشەڕدا دوژمن دەوری گرت.

**الإلتحام**: لەبواری زانستی (الأحياء)دا بریتییە لە یەکگرتنی چەند ئەندامێك کەنەوعەکانیان جیابێ.

**اللاحِمُ**: گۆشت خۆر چ ئادەمیزاد بێ یان گیانلەبەری تر ٥ (ك: اللّواحِم) ٥ هەروا بەمانا خاوەن گۆشت دێ.

**اللّحام**: مادەیەك شتی پێ لەحیم بکرێ ٥ شتی پێ پێکەوە بنووسێندرێ.

**اللّحَامَةُ**: پێشەی شت لەحیم کردن.

**اللّحَّامُ**: گۆشت فرۆش ٥ یان کەسێك پیشەی شت پێکەوە لەحیم کردن بێ.

**اللّحْمُ**: گۆشت ٥ ئەومادە ماسولکەیی و نەرمەی نێوان پێست و ئێسقان ٥ دەگوترێ: (أكَلَ لحم فلان): غەیبەتی فلانکەسی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أيحِبُ أحَدُكُمْ أن يَأكُلَ لَحْمَ أخِيهِ مَيْتًا﴾: اللّحِمُ: (بيت لَحِمٌ): ماڵێکی گۆشت زۆر ٥ گۆشتیان زۆرە ٥ ماڵ و خێزانێك زۆر غەیبەت بکەن ٥ دیاردەی غەیبەت کردن لەناویان دا بەربلاو بێ ٥ (باز لَحِمٌ): بازێکی گۆشت خۆرە یان زۆری حەز لەگۆشتە.

**اللّحْمَةُ**: کوتە گۆشت ٥ ئەوەی بازو هەڵۆ لەنێچیرەکەیان دەیخۆن ٥

لەبواری قوماش دا ناوە بۆ ئەو هەودایانەی دەگرێن بەتێوەدانو پۆ ٥ هەروا ناوە بۆ خزمایەتی.

**اللُّحْمَةُ:** کوتە گۆشت ٥ ئەوەی بازو هەڵۆ لەگۆشتی نێچیرەکەیان دەیخۆن.

**لُحْمَةُ جلدة الرأس:** ئەو پەردە تەنکەی ژێر پێستی سەر ٥ لەبواری قوماشو شتی وا ناوە بۆ تێوەدانو پۆ ٥ هەروا ناوە بۆ خزمایەتی ٥ دەگوترێ: (بينهما لُحْمَةُ نسب): لەنێوانیان دا خزمایەتی نەسەبو نەژاد هەیە.

**اللَّحِيمُ:** دەگوترێ: (هذا الكلام لحيم هذا): ئەو قسەیە وەکوو ئەو قسەیە وایەو لەوشێوەیە.

**المتلاحِمة:** برینێك گۆشتی سەر ببڕێو ئێسقانی نەشکاندبێو دوایی وێکهاتبێتەوەو گۆشتەوەزونی هێنابێتەوە.

**المُلْتَحِمُ:** لەبواری زانستی (الأحياء)دا بریتییە لە یەکگرتنی دو ئەندام یان زیاتر بەبێ ئەوەی یەك جۆربن.

**المُلْتَحِمَةُ:** پەردەی ناوەوەی پێڵوی چاو.

**المُلْحَمُ:** هەر قوماشێك رایەڵو تێوەدانی لێك جیابن، یان بەم شێوە رایەڵی خوری بێو تێوەدانو پۆی لۆکەبێ یان بەشێوەی تر رایەڵ ئاوریشم بێو تێوەدان نایلۆن بێ.

**المَلْحَمَة:** شەڕو کوشتاری سامناك ٥ گۆڕەپانی شەڕەکە بەرهەمێکی چیرۆك ئامێزە دابو نەریتی تایبەتیو یاساو رێسای خۆی هەیەو تێیدا بەرێزەوە باسی پاڵەوانو پاشاو خوداوەندەکانیان دەکرێو بەشێوەی ئەفسانەو خورافاتی سەر سوڕهێنەر، وادەبێ بەشیعر ئەدا دەکرێ وەکوو ئەلیازەی ئیفریقیەکانو شانامەی فارسی ٥ وایش دەبێ بەپەخشان دەگوترێ وەکوو ژینامەی عەنتەرە.

**لَحَنَ في كلامه:** لەقسەکانیدا زمانخواریی و هەڵەکردن دیاربوو ٥ وشەکانی بەهەڵە خوێندەوەو پەیڕەوی یاساو رێسای زانستی نەحوی نەکرد.

**لَحَنَ الرجلُ:** پیاوەکە بەزمانی زگماکی خۆی ئاخاوتنی ئەنجام دا ٥ دەشگوترێ: (لَحَنَ بِلَحْنِ بني فلان): بەشێوە زاراوەی هۆزی فلان قسەی کرد.

**لَحَنَ لَحْناً:** قسەیەکی لەگەڵ دا کرد، ئەو لێی حاڵی بوو جگە لەو خەڵکی تر تێی نەگەیشتن.

**لَحَنَ فلان لَحْناً**: فلاَنكەس زیرەك بوو لە بەلگە هێنانەوەدا.

**لَحِنَ قولَه لَحْناً**: لەقسەكەی حالّی بوو.

**أَلْحَنَ في كلامه**: لەقسەكانی دا هەڵەی كرد.

**أَلْحَنَ فلاناً القَوْلَ**: قسەكەی لەفلاَنكەس گەیاند.

**لاَحَنَه**: بەشێوە زاراوەیەك قسەی لەگەڵ دا كرد ئەو لێی حالّی بێ‌و كەسانی كە تێی نەگەن.

**لَحَّنَ في قِرَائَتِهِ**: بەدەنگی مۆسیقای بۆ گۆرانییەكە دانا.

**لَحَّنَ فلاناً**: فلاَنكەسی بەهەڵە دانا لەقسەكردنەكەی دا.

**اللَّحْنُ**: شێوەزاراوە ٥ دەگوترێ: (هذا كلام ليس في لحني ولا من لحن قومي): ئەمە گوفتارو قسەیەكە لەشێوەزمانی من‌و شێوەزمانی نەتەوەكەم نیە.

**لَحْنُ القول**: مانای قسەكەو ئەوەی بیسەر بە تێفكرین‌و سەرنجدان لێی حالّی دەبێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ﴾ ٥ لەبواری مۆسیقادا وشەی (لَحْن) بەمانا دەنگی مۆسیقی كە دانراوە بۆ گۆرانی‌و سرودەكە دێ دەگوترێ: (فلان لايعرف لحن هذا الشعر): فلاَنكەس شێوە مۆسیقای ئەم شیعرە نازانێ‌و نازانێ بیكاتە گۆرانی‌و بیلێ ٥ (ك: ألحان ولحون).

**اللَّحْنُ**: زمان، شێوە زاراوە ٥ گوتراوە: (إنَّ القرآن نزل بلحن قريش): قورئان بەشێوە زاراوەی قورەیش نازڵ بووە ٥ هەروا وشەی (اللّحن) بەمانا زیرەكی دێ.

**اللُّحَنَة**: كەسێك زۆر لەحن‌و شێوە زاراوە بزانێ.

**الملاحِنُ**: لەغەزو موعەمما كەشیكردنەوەیان پێویستی بەزیرەكی هەبێ.

**لَحَا الشَّجَرَةَ والعَصَا لَحْواً**: تویكڵی درەختەی داماڵی.

**لحا فلاناً**: لۆمەو سەر زەنشتی فلاَنی كرد ٥ (فهو لاح وهي لاحنة).

**لَحَى الشجرة والعصا لَحْياً**: دارەكە یان عەصاكەی داماڵی توێكڵەكەی لێ كردەوە.

**لَحَى اللهُ فلاناً**: خودا نەفرینی لەفلاَن كردو لەرەحمەتی خۆی دووری خستەوە ٥ (فهو مُلْحيّ وهي مُلْحية).

**أَلْحَى العودُ**: شورِكەدرەختەكە كاتی ئەوەی هاتووە توێكڵی لێ بكرێتەوە.

**أَلْحى فلان**: فلاَنكەس كاری ناشیرینی ئەنجام دا، كاری وای كرد سەرزەنشت بكرێ.

**لاحَاهُ ملاحاةً ولِحاءً:** كێشەی لەگەڵ نايەوە سەرزەنشتی کرد.

**الْتَحَى:** دەگوترێ: (إلْتَحَى الرجلُ): پياوەکە بوو بە ريشدار.

**إلْتَحَى الغلامُ:** کوڕەکە ريشی ڕوا، ريشی هات.

**إلْتَحَى العودَ ونحوه:** تويکڵی لەشوڕکەکە کردەوە.

**تلاحَى الرجلان:** دوپياوەکە کێشەيان کەوتە ناوەوەو جنێويان بەيەکتر دا.

**تَلَحَّى فلان:** فلانکەس بەشێك لەمێزەرو جامانەکەی بەبەرچەناگەی خۆی داهێنايەوە سەرو بەشێك لە روخساری خۆی داپۆشی.

**الألْحَى (رجل ألحى):** پياوێکی ريش درێژە، ريش پانە.

**اللِحَاءُ:** تويکڵی هەرشتێك ٥ دەگوترێ: (لا تدخل بين العصا ولِحائها) ٥ (ك: الحِية ولَحِيٌّ).

**لحاء التمرة:** تويکڵی دەوران دەوری دەنکە خورما ٥ هەروا وشەی (اللّحاء) ناوە بۆ پەردەی دەماغو پەردەی گورچيلە.

**اللِحْيُ:** شوێنی لێ ڕوانی مو لەلا ڕومەت ٥ ئەو دوو ئێسقانەی ددانی پێوە ڕواون.

**لِحْيَا الغدير:** ئەمبەرەو بەری زەلکاو کارێز ٥ (ك: لُحِيٌّ وَلِحَاءٌ).

**اللِّحْياني:** (رجل لحياني): پياوی ريش درێژو ريش پان.

**اللِّحيَةُ:** موی لا ڕومەتو چەناگە ٥ (واتە: ريش) ٥ (ك: لِحيً ولُحيً).

**لِحية التيس:** روەکێکی کشتوکاڵییە ڕەگەکانی دەکوڵێندرێنو دەخورێن ٥ پێشی دەگوترێ: (ألفومی).

**المِلْحَاءُ:** ئەوەی تويکڵی پێ دادەماڵدرێ.

**لَخَّ في کلامه لَخاً:** قسەکەی بەتێکەڵیو پێکەڵی هێناو بەزمانێکی خوارو خێچ قسەکانی کردن.

**لَخَّ الخَبَرَ:** هەواڵەکەی زانیو چووە بنجو بناوانی.

**لَخَّ فلاناً:** شەپلاغەی لەفلانکەس دا.

**لَخَتْ عينه لَخاً:** چاوی بەهۆی ريپۆقەوە پێکدانوسانون.

**التَخَ العُشْبُ:** گياو گژە کە تێکهالان ٥ دەشگوترێ: (إلْتَخَ عليه الامر): کارەکەی لێ تێکەڵو پێکەڵ بوو ٥ دەگوترێ: (سكرانٌ مُلْتخ): سەرخۆشێکە لەهيچ حاڵی نابێ چونکە عەقڵی لەدەست داوە.

**تَلاَخَّ الوادي:** شيوەکە تەنگەبەر بوو، درەختی زۆرو چڕو پڕ بوو.

**اللَّخة:** لوت ٥ (إمرأة لَخَّةٌ): ئافرەتێکی چڵکنو بۆگەنە.

**اللَّخوخ**: عەیبدار (أصل لَخوخ): بنیچەی نارەسەن.

**لَخِصَتْ عینه**: پێڵوی چاوی ئەستور بوون‌و گۆشتیان زۆر بوو بەشێوە سروشتی یان بەهۆی هاوسانەوە ٥ دەگوترێ: (لَخِصَ الإنسانُ فهو الخَصُ وهي لخصاء).

**لَخَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی پوختە کرد، کاکڵەکەی گرت.

**لَخَّصَ القولَ**: قسەکەی کورت‌و پوخت کردەوە.

**لَخَّصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی رونکردەوە ٥ دەگوترێ: (لَخَّصَ لي خَبَرَكَ): هەواڵ‌و حاڵ‌و وەزعی تۆی بۆرون کردمەوە جاردواجار هەواڵی تۆی بۆشی کرومەوە.

**اللَّخِصُ** (ضرع لَخِصٌ): گواندێنێکی قەڵەوو گۆشتنە بەناخۆشی شیری لی دەدۆشرێ.

**اللَّخَصَةُ**: بەزی چاو پێڵوی سەرو خوارەوەی چاو ٥ (ك: لِخاصٌ).

**لَخَفَ فلاناً لَخْفاً**: بەتوندی لە فلانی داو ئازاری پێگەیاند.

**لَخَفَ عَيْنَهُ**: لەچاوی خۆی دا ٥ بەدەست لەچاوی خۆی دا.

**اللَّخافَةُ**: بەردێکی تەنکی تیژە.

**اللَّخْفُ**: کەفی تەنك.

**اللَّخْفَةُ**: بەردێکی سپی درێژو تەنکە ٥ (ك: لخاف).

**اللَّخلَخانِيّ**: پیاوێك نەتوانێ مەبەستی خۆی دەرببڕێ.

**اللَّخلخانية**: زمانی ناعەرەبی‌و خوارو خێچ لەمئاخاوتن دا ٥ دەگوترێ: (أتانا رجل فيه لخلخانية) ٥ لەزاراوەی عەرەبی عومان‌و چەند شوێنێکی تردا نەگوتن‌و حەزف کردنی هەندێ پیتە لەوشەدا لەکاتی دەرج‌و لکان دا، بۆ نمونە لەوشەی (ماشاء الله)دا دەڵێن: (مشا الله).

**لَخَمَ الشَّيْءَ لَخْماً**: شتەکەی بڕی، بڕییەوە.

**لَخَمَ وَجْهَهُ**: شەپلاغەی لەدەم‌و چاودا.

**لَخَمَ فلاناً**: بەئەرکی قورس مەشغوڵی کرد.

**لاخَمَهُ ملاخمةً ولِخاماً**: شەپلاغەی لی دا.

**التَخَمَ**: بەکاری قورس مەشغوڵ بوو.

**اللُّخْمُ**: جۆرێکە لەماسی دەریا، لوتێکی مشاری هەیە لەهەر شتێك بدا دەیبڕێ، بەم جۆرە ماسییە دەگوترێ ماسی قیرش.

**اللَّخَمَةُ**: سەردەم ٥ نەفس قورسی، دلگرانی، دەگوترێ: (بالرجل لَخْمَةٌ): پیاوەکە دلگرانی پێوە دیارە.

**لَخِنَ السِّقاءُ وغيره لَخَناً**: بۆگەن بوو.

**لَخِـنُ الرجـل ولخِنَـت المـرأةُ**: ئافرەتەکـە بنهەنگڵو بـن ڕەفیـسكو شوێنی تێـدا کۆبونـــەوەی چـــڵكو شـــتی وا لەجەستەیان دا بۆگەن بوو ٥ (فهو لَخِن والْخَنُ وهي لَخنـاء) ٥ لـەبواری جنێـودا دەگـوترێ: (یا ابن اللخنـاء): هـۆ کوڕی فاتە بۆگەن!.

**اللَّخَنُ**: ئەو سپیاییەی بەسـەری چوکی کوڕەوەیە پێش خەتەنەکردنی.

**لـخَاهُ لَخْـواً**: دەرمـانی کـردە لوتیـەوە ٥ یان دەمیەوە.

**لَخِيَ لَخاً**: قسەی پڕو پوچی زۆر گوتن.

**لَخِـــيَ الـــشَّيْئُ**: شـتەکە خـوار بـوو ٥ دەگـوترێ: (لَخِـيَ اللَّخـيُ): لاشـەویلەی خواربوو.

**لَخِيَ البَطْنُ**: ورگەکە لای خواروی داچۆڕا، شۆڕبۆوە.

**لِخِيَ العُقاب**: دالاشەکە دەندوکی سەرەوە لەهی خواروی درێژ تر بوو.

**لَخِيَ البعيرُ**: حوشترەکە ئەژنۆیەکی لەوی تری ئەستور تر بـوو ٥ (فهو ألْخى وهي لَخوَاءُ).

**الْخــاهُ**: هــەوای کــردە لوتیــەوە یــان دەمیەوە.

**التَخى فلان**: فلانکـەس دەرمـانی کـردە لوتیەوە.

**التَخى الصَّبِيُ**: منداڵەکە نانی تەڕکردو خواردی.

**اللَّخا واللَّخاءُ**: ئامێری شت هەڵمژین.

**اللَّخاء**: بژێوی منداڵ جگە لەشیر.

**المِلْخى والمِلْخاءُ**: بەمانا (اللِخا)دێ.

**لدَّ فلاناً لَدّاً**: دوژمنایەتیەکەی فلانکەسی توند کرد.

**لَدَّهُ**: کێشەی لەگەڵ ئایەوەو بەسەری دا زاڵ بوو ٥ (فهو لَدّاً ولادةٌ ولدودٌ).

**لَدَّ المريض لدّاً ولدوداً**: نەخۆشـەکە زمـانی خستە لایەکی دەمیەوەو دەرمانی کردە لایەکی تریەوە.

**لَدَّ فلاناً عـن الأمـر**: فلانکەسـی لەکارەکە حەبس کرد.

**لَــدَّ لَـدَداً**: کێـشەو دوژمنایەتیەکـەی زۆر توند کرد ٥ (فهو لَدٌّ وهي لَدّاءُ).

**ألَدَّهُ**: دژایەتی کرد ٥ دەگوترێ: (ألَدَّبه): لەکێـشەو دژایـەتی کردنـی دا تونـد ڕەو بــوو ٥ پاشــگوێی خــست ٥ بـەترومپاو شـتی وا دەرمـانی کـردە ناو دەمیەوە.

**لادَّهُ مُـلادةً ولِـداداً**: لەکێـشەو نیـزاع لەگەڵ کردنی دا توند ڕەوی نواند.

**لَدَّدَهُ**: سەرسامی کرد.

**لَدَّدَهُ بـه**: هەڕەشـەی لـێ کـرد ٥ قـسەی ڕەقی ئاڕاستە کرد.

**اِلْتدَّ فلان**: فلانکـەس بـەترومپاو شـتی وا دەرمـانی خـوارد.

التدَّ عنه: لێی لادا، مەیلی لای تری کرد ◦ دەگوترێ: (مالي عنه مُحتدّ ولا ملتدّ): هیچ چارەیەکم نییە.

تلدّدَ: بەسەر سامی سەیری ئەم لاو ئەولای خۆی کرد، مایەوە، حەوق بوو.

الألَدُّ: دوژمنی کێشەکارو ئاشتی نەویست.

اللَّدَدُ: کێشەو جەدەل زۆرو ملنەدان بۆ حەق‌و راستی ◦ ئەو دەرمانەی بە ترومپا دەکرێتە دەمی نەخۆشەوە ◦ نەخۆشییەکە توشی ناو دەم‌و قورگ دەبێ.

اللّدیدُ: بەمانا (اللّدودُ)دێ ◦ دیوی دەرەوەی ئەستۆ ◦ (لدیدا الفم): ئەملاو ئەولای هەرشتێك بێ ◦ دەگوترێ: (نزل لدیدی الوادي): لەمبەرەو بەری شیوەکە جێگیر بوو مایەوە.

اللّدیدة: باخچەی سەوزی پرگوڵ‌و گوڵزار.

المُتَلَدِّدُ: مل ◦ دەگوترێ: (ضربه على متلدّده): لەئەستۆی دا.

لدَسَه بیده لَدْساً: بەدەستی لێیدا ◦ دەشگوترێ: (لَدَسَهُ بحجر): بەردی تێگرت، بەردی پیادا.

ألْدَسَتِ الأرض: زەوییەکە کەمێك لەڕووەکەی دەرخست.

اللّدیس: چرووزەی رووەك ◦ گیاوگژ لەسەرەتای سەر دەرهێنانی لەزەوی.

المِلْدَسُ: دەسکە سندۆڵ ◦ بەردێکی گەورەیە دانەوێڵەی پێ ورد دەکرێ، پێی دەهاڕدرێ ◦ (ك: مَلاَدِس).

لَدَغَتْهُ الحیَّةُ لدْغاً وتَلْداغاً: مار پێوەی دا، گەستی ◦ (فهي لادِغة وهو ملدوغ) ◦ (ك: لَدْغى ولُدَغاء).

لَدَغَ فلاناً بكلمة: قسەی توانج‌و تانەو تەشەری ناڕاستەی فلان کرد ◦ قسەی ناخۆشی پێ گوت ◦ دەشگوترێ: (أصابه منه ذباب لادغ): شەڕو ناخۆشی لەوەوە توشبوو.

الْدَغَ فلاناً: مارێکی لەفلان بەردا پێوەی بدا ◦ مارێکی بۆنارد بیگەزێ.

اللّداغة من الرجال: کەسێك تانەو تەشەر لەناموسی خەڵك بدا.

المِلْدَغُ: پیاوێك داب‌و ڕەوشتی وابێ تانە لەناموسی خەڵك بدا.

لَدَمَ الشَّيْءَ لَدْماً: لەشتەکەی دا.

لَدَمَ فلاناً: شەپلاغەی لەفلان دا، یان شتی قورسی پیا کێشا شەقەی لێ هەڵساند تەپەی لێ هەڵساند ◦ (فهو لادِم) ◦ (ك: لَدَمٌ) ◦ دەگوترێ: (لَدَمت المرأة صَدْرَها): ئافرەتەکە لەسنگی خۆی دا (لَدَمَت

وجهها): لەدەمو چاوی خۆی دا.

**لَـدَمَ الثـوبَ:** قوماشـەکەی پینـەکردو دوریيەوە.

**أُلْدِمَت عليه الحُمّى:** لەرزو تای بەردەوام بوو.

**لَـدَّمَ الثـوب والخُـفَّ:** قوماشـەکە يـان خوفەکەی پینەکرد.

**التدم الرجلُ:** پياوەکە تێك چوو، شڵەژا.

**إلْتَـدَمَت المـرأةُ:** ئافرەتەکـە لەسـنگی خۆی دا، لەدەمو چاوی خۆی دا.

**التـدم فلانـاً:** لەفلانکەسـی داو پـاڵی پێوەنا.

**تَلَدَّمَ الثوبُ:** کراسـەکە ڕزیو کۆن بـوو کاتی ئەوەی هاتووە پينە بکرێ.

**تَلَدَّمَ الرجلُ الثوبَ:** پياوەکە کراسەکەی پينەکرد.

**اللِّدامُ:** پينـە کـەکراسو شـتی وای پـێ پينە بکرێ.

**اللَّـدْمُ:** دەنگی بـەرد کـە لەبەرزاييـەوە بەزەوی دەکەوێو دەنگێکی لـێ دێ، تەپەی لـێ دێ ◊ دەشگوترێ: (فـلان لـــدم فـــدم): فلانکـــەس گێـــلو نەحمەقە.

**اللَّدْمُ:** وشەيەکە عەرەب لەکاتی سوێند خـۆریو پەيمانبەسـتن دا دەيڵـێن بەمەبەستی جەختکردنـەوە لەسـەر پەيمانەکەيان.

**اللَّدِيمُ:** قوماشی کۆنو ڕزيو، پينەکراو.

**المِلْـدَامُ:** بەردێکـە دانەوێڵـەو شـتی وای پێ دەهاڕدرێ.

**المُلَـدَّمُ:** (ثـوب مُلَـدَّم): قوماشـە کـۆن، کراسەکۆن.

**المِلْـدَمُ:** بـەمانا (الملـدامُ) دێ ◊ گێلـی گۆشتنو قەڵەو ◊ (أم مِلْدَم): نازناوی لـەرزو تايـە ◊ دەگـوترێ: (أخَذَتْـهُ مِلْدَم).

**لَدُنَ الشَّيْئُ لدانة ولدونة:** شتەکە نەرم بوو ◊ (فهـو لَـدْن وهـي لَدْنـة) ◊ دەگـوترێ: (إمرأة لَدْنة): ئـافرەتێکی نـەرمو نيـانو گەنجو تازە پێگەيشتووە.

**لَـدُن أخلاقـه:** ڕەوشـتی نـەرمو نيـان بـوو لەسەرە خۆو بار قوڵو بەصەبر بوو.

**لَدَّنَ الشَّيْئَ:** شتەکەی نەرم کرد.

**لَـدَّنَ ثوبَـهُ:** قوماشـەکەی ڕشـاند، تـەڕی کرد.

**لَـدَّن فلانـاً بـالأمر:** فلانـی بەشـتەکەوە هێشتەوە.

**تلَـدَّن في الأمـر:** لەکارەکـەدا مايـەوەو چاوەڕوانی کرد.

**تَلَـدَّن في حاجتـه:** لەنيـشەکەی دا تەمبەڵی کرد.

**تَلَدَّنَتْ عليّ راحلتي:** وڵاخەکەم وەستـاو نەڕۆيی.

**تَلَدَّنَ:** هەڵوێستەی کردو وەستا.

تَلَدَّنَ بالمكان: لەشوێنەکە جێگیر بوو مایەوە.

اللَّدُنُ: خواردەمەنیەك نانەکەی باش نەبێ یان باش نەکولابێ.

اللَّدُنَةُ: پێویستی ە دەگوترێ: (لي إليه لُدْنَةٌ): لای ئەو پێداویستیم هەیە.

لَـدُنْ: زەرفی زەمان‌و مەکانە بەمانای (عِنْـدَ)دێ ە وەلێ (عِلْـم لَـدُنيٌّ): زانیارییەکی خوداییە لەرێگەی‌ئیلهامەوە دەدرێ بەبەندە راستالّەکان.

اللَّدينة: مادەیەکی هەویری نەرمەو چەند شکڵو قەبارەیەکی لێ دروست دەکرێ.

الـدی فـلان: فلانکەس هاوشانی زۆر بوون.

اللِدَةُ: کەسێك لەگەڵ تۆ لەدایك بوو هاوتەمەنت بێ.

لدی: زەرفی مەکانە بەمانا (عِنْدَ)ەیە.

لَذَجَ الماء في حلقه: ئاوەکەی قوت دا.

لَذَّ الشَّيْئُ لذاذاً ولذاذةً: شتەکە بەتام بوو، خۆش بوو ە (فهو لَذ ولذيذ) ە دەگوترێ: (عيش لَذٌ، وشراب لذ) ە (ك: لُذ ولِذاذ وهي لَذة).

لَـذَّ بالشيئ لَـذاً: شتەکەی بەتام هاتە دەست.

لَذَّهُ: وای لێکرد تامی خۆشی لێ بکا، بەلایەوە بەتام بێ.

اِلْتَذَّ الشَّيْئَ وبه: بەتام‌و لەزەت هاتە بەردەستی.

تَلاذَّ الرجلُ والمرأةُ: هەریەك لەژن‌و پیاوەکە لەزەت‌و خۆشییان لەیەکتر دی.

تَلَـذَّذَ الشَّيْئُ وبه: شتەکەی بەتام‌و لەزەت هاتە بەردەست.

اسْتَلَذَّ الشَّيْئَ: شتەکەی بەلەزەت‌و بەتام دەسکەوت.

اللُّـذُّ: قسە خۆش ە دەگوترێ: (رجل لَذٌّ): پیاوێکی قسە خۆشە.

اللَّذَّةُ: هەستکردن بەشتێك گونجاو بێ لەگەڵ جەستەو دەرون‌و زەوقی دا.

الْمَلَذُّ: شوێنی لەزەت‌و خۆشی.

الْمَلَذَّةُ: شەهوەت‌و ئارەزو.

لَـذَعَ الطـائرُ لَـذْعاً: باڵندەکە باڵی رێك کردن‌و دوایی بەهێواشی جوڵاندنی.

لَـذَعَت النـارُ برأيـه وذكائـه: فلانکەس بەخێرایی لەشتەکە حاڵی بوو ە (فهو لوذعي).

لـذعت النـارُ الـشَّيْئَ: ئاگرەکە رێی کەوت‌و سوتاندی ە دەشگوترێ: (لَذَعَـهُ الحَرُّ ولـذع القَيْحُ القرحـة): کێم‌و زوخاوەکە برینەکەی سوتاند.

لَـذَعَ الحُـبُّ قَلْبَـهُ: خۆشەویستی‌و دڵداری دڵی سوتاندو ئازاری دا.

**لَـذَعَ فلاناً بلسانه:** بـەزوبانی ئەزیـەتی بەفلانکەس گەیاند.

**التذع:** داخ بوو ئازاری پێ گەیاند.

**تلَذعت النارُ:** ئاگرەکە هەڵگیرسا.

**تَلَذَّعَ فلان:** فلانکـەس زەینـی هەڵایساو شتی زانی ٥ زمانی خۆی هێناو بـرد بـەملاو بـەولای خـۆی دا ٥ ئـاوڕی دانەوەو رقی هەڵسا بوو ئـاگری لـێ دەباری ٥ دەگـوترێ: (کلمته فاذا هـو غضبان یتلـذع): قـسەم لەگـەڵ کـرد بینیم رقی هەڵسابوو جۆش بو بـوو ئاگری لـێ دەبووەوە.

**تَلَـذَّعَ الغـلام:** گەنجەکـە بەشـێوەیەکی جوانو خێرا ڕۆیی.

**اللَّذّاعُ:** بۆ زێدە رۆیی لـەمانای (لاذِع) دا دێ ٥ دەگـوترێ: (فـلان مـذاع لذّاع): فلانکەس وادە بەخیلافە.

**اللُّذَّعُ:** (نبیذ یلْذَعُ): سرکەیەکی تیژە.

**اللَّـوْذع واللـوذعي:** گـورج‌و گـۆڵو زیرەك‌و زەین تیژ ٥ بەلگە دروست هەردەڵێ ئاگرە پریشك دەهاوێ.

**لَذْلَـذَ فـلان:** فلانکـەس پەلـەی کـردو گـورج‌و گـۆڵ بـوو لـە راپەڕانـدنی کارەکانی دا ٥ (فهو لَذلاذ).

**لذِمـه بالمکـان لَـذْماً ولَـذوماً:** وەگـری شوێنەکە بوو تێیدا مایەوە.

**لذِم بالشَّيْ:** دڵی پێوەی نووساو سور بوو لەسەریو وازی لـێ نەهێنا.

**الذَمَ بالمکان:** لەشوێنـەکە جـێ گـیر بـوو مایەوە.

**الْـذَمَ فلانـاً الـشَّيْءَ ربـه:** فلانکەسـی بەوشـتەوە پەیوەسـت کـرد ٥ وەکـوو پەیوەسـت بـوونی دوکـەڵو گـەرمی بەئاگرەوە.

**الـلاّذَنُ:** ڕەگـەزی (جەنبەیـە) لـەپێڕی (اللاّذنیـة)یـە صـەمغی راتینجی لـێ دەردەهێنـدرێ، دەکرێتـە بنێـشتی جوین‌و عەترو دەرمان.

**لَذِيَ بالأمر لَـذىً:** بەکارەکـەوە هەڵـەوگیر بوو لێی جیا نەبووەوە.

**الَّــذی:** ئیـسمی مەوصـووله مـەبنیو مەعریفەیە.

**اللّذان:** بۆ دووکەسی نێرە.

**الّذین:** بۆ سێ کەس‌و زیاترە لەنێرینە.

**لَـزَبَ الـشَّيْءَ لَزوبـاً:** شتەکە جێگیر بـوو چەسپا ٥ (فهو لازب).

**لَزَبَ الشيءُ:** شتەکە پتەو بوو.

**لَـزَبَ الطـین:** قوڕەکـە لینـج بـوو یـەکتری گرت.

**لَزَبَ بالشَّيْ:** بەشتەکەوە نووسا ٥ (لَـزَبَ العامُ): ساڵەکە قاتو قڕی بوو.

**لَزَبَـت العَقْـرَبُ فلانـاً لَزْبـاً:** دوپـشك بەفلانکەسیەوە دا.

**لَزِبَ الطینُ لَزَباً:** بەمانا (لَزَبَ)دێ.

**لَزِبَ الـشَّيْءُ:** شتـەکە تـەنگ بـۆوە ٥ کـەم

بۆوە ٥ (فهو لَزِبٌ) ٥ دەگوترێ: (طريق لَزِبٌ وعيش لَزِبٌ) ٥ (ك: لِزابٌ).

**لَزُبَ الشَّيْئُ لزباً ولزوباً:** شتەكە هەندێكی چووە ناو هەندێكیەوەو تێكەڵكێش بوو ٥ دەگوترێ: (لَزُبَ الطينُ ونحوه).

**تلازَبَ الشَّيْئُ:** شتەكە كەوتە سەریەك.

**اللَّزْبُ:** رێگای تەنگ.

**اللَّزْبَةُ:** تەنگانەو چورتمو قاتو قڕیو گرانی ٥ دەگوترێ: (أصابَتْهُمْ لَزْبَة): قاتو قڕیو چورتم یەخەی گرتن.

**لَزِجَ الشَّيْئُ لَزَجاً ولَزوجاً ولُزُوجَةً:** شتەكە لینجو لێك كشاوەو مەطاطی بوو بنێشت ئاسا بە شتەوە دەنووسا تێی دەهاڵێ ٥ دەگوترێ: (لزج العسلُ بأصْبَعِهِ): هەنگوین بەپەنجەیەوە نووسا لێی هاڵا.

**لَزِجَ بالشَّيْئِ:** بەشتەكەوە نووسا وەگری بوو حەزی لێ كرد.

**تَلَزَّجَ الشَّيْئُ:** شتەكە هەندێكی بەهەندێكیەوە نووسا.

**تَلَزَّجَ الطعامُ أوالطيبُ:** خواردنەكە یان بۆنەكە لینجو مەطاطی تێك هاڵابوو.

**تَلَزَّجَ البقلُ:** گیاو گژەكە نەرم بوو لێك هاڵابوو بەسەریكدا كەوتبوو.

**تَلَزَّجَ شعر الرأس:** قژی سەر شۆرابوو باش پاك نەكرابۆوەو تێك هاڵابوو بو بوە لبادو پێكەوە نووسا بوو.

**اللَّزْجَةُ:** لەزگە ٥ دەگوترێ: (رجل لزجة): پیاوێكی لەزگەییە بەو شوێنە دا نووساوەو جێی ناهێڵێ.

**اللَّزوجَةُ:** لینجیو پێكەوە نوسانو یەككرتنی مادەیە، بەجۆرێك بەئاسانی شێوەكەی تێك نەچێو نەگۆڕێ وەكوو قەترانو هەنگوینو شتی وا.

**لَزَّ لَزّاً ولَزَازاً:** شەتەكی دا پێوەی نووساند.

**لَزَّ الشَّيْئَ بالشَّيْئِ:** شتەكەی بەشتەكەوە پەیوەست كرد ٥ پێوەی نووساند ٥ دەگوترێ: (لَزّ بفلان): بەفلانكەسەوە نووساو لێی جیانەبوەوە.

**لَزَّ الشَّيْئَ:** پارچە شتەكەی لێك نزیك كردنەوە پێكەوەی نووساندن.

**لَزَّ البعيرين:** دوو حوشترەكەی خستنە پەنا یەكو جوتی كردن ٥ (لَزَّ البابَ): دەرگاكەی پێوەدا، دایخست.

**لَزّ فلاناً بالرمح:** بەرمب لەفلانكەسی دا.

**لَزَّ فلاناً الى كذا:** فلانكەسی ناچاركرد بۆئەوە.

**الَزَّ الشَّيْئَ:** شتەكەی شەتەك دا پێوەی نوساند ٥ چەسپی كرد.

**لازّه ملازاة ولِزازاً:** پێوەی نووساند چەسپاندی.

**لَـزَّزه الله**: خـودا بەتـەواویی دروسـتی کرد، هەموو ئەندامەکانی جەستەی هەمئاهـەنگی یـەکترن‌و چ کـەم‌و کوری تێدا نییە.

**التَزّ بالشَّيْئِ**: بەشتەکەوە نووسا.

**تَلَـزَّزَ الـشَّيْئُ**: شـتەکە کۆبـومو پێکـەوە نووساو یەکتری گرت.

**تَلَزَّز الشَّيْئُ**: شتەکە کۆبـوەومو پێکـەوە نووساو یەکتری گرت.

**اللِـزَازُ**: پاشـکۆڵ‌و کیلـۆنی دەرگـا ◊ شمشێری دەرگا ◊ دەگوترێ: (فـلان لِـزاز خـصومة): فلانکـەس کـان‌و بنکـەی کێـشەو نیزاعـەو بـاش دەتوانـێ ئیـدارەی بکـا ◊ دەگـوترێ: (فـلان لِـزاز مـال): فلانکـەس چاکسازیکارە لە بەرێوەبردنی ماڵ‌و سامان ◊ هـەروا دەگوترێ: (جَعَلـت فلانـا لِـزازاً لفـلان): فلانکەسـم بـەرعودە بـەفلان کـردوە بۆئـەوەی نەهێڵێ کێشەو نیزاع بەرپابکا.

**اللُّـزُّ**: ئەڵقـەی دەرگـا ◊ یـان شوشـەی مەرەکـەب‌و شـتی وا ◊ دەگـوترێ: (فلان کـزٌّ لُـزٌّ): فلانکـەس بـەخیل‌و حەسودە.

**اللِـزُّ**: لەزگـەو نووسـاوو چەسـپاو بەشتەوە ◊ دەگوترێ: (هو لِزّ شـرّ): بەخیل‌و دەست قوچاو.

**اللَزَزُ**: کیلۆن‌و پاشکۆڵی دەرگا.

**المِلَـزُّ**: کەسـێك زۆر توندـدڕەو بـێ لەکێـشەو نیـزاع دا ◊ دەسـت قوچـاو بـێ بەزەحمـەت شـتێکی لەدەسـت بێتـەوە ◊ دەگـوترێ: (رجـل مِلَـزّ وامرأة مِلَزّ).

**لَزِقَ الـشَّيْئَ لُزُوقـاً**: بەشـتەکەوە نووسـا ◊ پێوەی چەسپا بەهۆی مادەیەکی لەزگە ناسـا ◊ پێـوەی نووسـاو بۆشـایی لـەنێوانیان دا نییـە ◊ دەشـگوترێ: (لَزِمـت الرئـة بالجنـب): ریخۆڵـەی بەتەنیشتەوە نووسا بەهۆی تینوایەتی یان نەخۆشی ◊ (فهو لاذق وهي لاذقة).

**ألْزقـه بالـشَّيْئِ**: لکانـدی بەشـتەکەوە، پێـوەی چەسـپاند ◊ وای لـێ کـرد بەشتەکەوە بنووسێ.

**لازقـه ملازَقَـةً ولزاقـاً**: پێـوەی نووسا ◊ کارەکـەی ئـەنجام دا بـەبێ رێـك‌و پێکی‌و توندو تۆڵی.

**التَـزَقَ الـشَّيْئُ بالـشَّيْئُ**: شـتەکە بەشتەکەوە نووسا.

**تلازَقَ الشَيْئان**: دوو شتەکە بەیەکترەوە نووسان.

**اللاَّزُوق**: دەرمانێکـە بـۆ چاککردنەوەی بـرین، برینەکـە دەگـرێ تاچـاك نەبێتـەوە بـەری نـادا ◊ قوماشـێکی شـاش چـنراوە یـان قوماشـێکی

موشـەممەعە دەخرێتـە سـەر برین
بۆئەوەی برینەکە پیس نەبێ.
**اللِـزّاق**: ئـەوەی شـتی پـێ بلکێنـدرێ
بەشتی ترەوە.
**اللّزاق**: تیپـی کاغـەزی لەزگـە ٥ جـۆرە
کاغەزێکــە مادەیــەکی لەزگــەیی
پێوەیە دەلکی بەشتی ترەوە.
**اللِزْقُ**: بـەمانا (اللاّزِق)دێ ٥ دەگـوترێ:
(هـذا لِـزْق هـذا): ئەمـە نووسـاوە
بەئەوەوە لێی نابێتەوە.
**اللّزقــاءُ**: (أذن لزقــاء): گوێــچکەکە
قەراخەکەی بەسەرەوە نووساوە.
**اللّزقـة**: لەزگـە؛ چـندراوێکی دەرمـان
لێدراوو تێکەڵکراوە، دەخرێتـە سـەر
بـــرینو تاچـــاکی نەکاتـــەوە
شوێنکەبەرنادا.
**اللّزيقـي**: ئـەوەی دوای بـارینی بـاران
لەشـوێنی چـەقەن بـەدوو سـێ ڕۆژ
دەڕوێ.
**اللِزوق**: بەمانا (ألّلاّزق) دێ.
**اللّزيقُ**: بەمانا (اللاّزق)دێ ٥ دەگـوترێ:
(هو لزيق هذا).
**لَـزِمَ الـشّيْءُ لُزومـاً**: شـتەکە جـێگیرو
بەردەوام بوو.
**لَزِمَ كذا من كذا**: ئەمە لەوە پەیدا بـوو ٥
لەئەمە ئەوە دێتە دی.
**لَـزِمَ الـشّيْءُ فلانـاً**: شـتەکەی لەسـەر
چەسپو پێویست بـوو ئـەنجامی بـدا ٥
دەگوترێ: (لَزِمه الغرمُ ولزمه الطلاق).
**لَــزِمَ العمــلَ**: بــەردەوام بــوو لەســەر
کارەکەی.
**لَزِمَ المريض السريرَ**: نەخۆشـەکە لەسـەر
جێگا کەوتو هەڵنەسایەوە.
**لَزِمَ الغريمَ**: قەرزدارەکەی گـرتو مۆڵـەتی
نەدا.
**أَلْــزَمَ الــشّيْءَ**: شــتەکەی چەسـپاندو
بەردەوامی کرد.
**أَلْـزَمَ فلانـاً الـشّيْءَ**: شـتەکەی لەسـەر
فلانکەس پێویست کرد ٥ دەگوترێ:
(أَلْزَمَه المالَ والعمل والحجة): هـەروا
دەگــوترێ: (أَلْزَمْــتُ خــصمي):
بەرامبــەرو رکابەرەکــەی خــۆمم
بۆردا.
**لازمه ملازَمـةً ولِزاماً**: بـەردەوام بـوو،
یەخەی گرتو بەری نەدا.
**لازَمَ فلاناً**: لەگەڵ فلان دا مـاچو مـۆچو
چاكو چۆنی کرد.
**إلْتَـزَمَ الأمْـرَ او الـشّيْءَ**: کارەکـە یـان
شتەکەی لەسەر خۆی پێویست کرد.
**إلْتَزَمَ فلان للدولة**: فلانکەس بڕیاری دا
وادەی دا بڕێك پـارە بـدا بەدەوڵـەت
لــەپای بــەکارهێنانی پارچــەیەك
زەوی دەوڵەت بۆ بەرژەوەندی خـۆی
٥ (فهو مُلْتَزِم).

**اسْتَلْزَمَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بەپێویست زانی ○ داخوازی شتەکە بوو.

**اللاّزِمة:** ئاکامو دەرەنجامی عەمەلیەکی ماتماتیکی بەدابو نەریتو کردەوە یان گفتێکە مرۆڤ باری پێوە دەگرێو بەبێ ویستنی خۆی ئەنجامی دەدا ○ بۆ نمونە هی واهەیە باری گرتووە بەزمان دەرهێنان، هی واهەیە لەکاتی قسە کردنێکی بەبێ شعور وتەیە دەخاتە نێو قسەکانیەوە زۆری دوبارەو سێ بارە دەکاتەوە.

**اللِّزامُ:** شتی زۆر پێویست ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾.

**اللُّزَمةُ:** دەگوترێ: (رجل لُزَمةٌ): پیاوێکە خوبەشتێکەوە دەگرێو وازی لێ ناهێنێ، باری پێوە دەگرێو لێی نابێتەوە.

**المُلازِمُ:** پلەیەکە لەناو پیاوانی سوپاو پۆلیس دا لەژوور (المساعد) و لەخوار (الملازم الأول) دایە.

**المـلازِم الأول:** پلەیەکی سوپایە یان پۆلیسییە لەژوور (الملازم)و خوار نەقیبەوەیە.

**المُلتَزِم:** سەپانو وەرزێر لەسەر زەوی حکومەت، کەسێکە بەڵێن دەدا بەحکومەت کەبرێك پارە بدا بەحکومەت لەپای ئەوەی لەزەوی دەوڵەت دا جۆرەکارێك دەکا.

**المِلْزَمُ:** جەرو مەنگەنە چ لەئاسن یا لەداربێ.

**المَلْزَمَةُ:** مەلزەمە؛ بەشێکە لەکتێب هەشت پەڕەیان شانزە پەڕە یان سیو دوو بەگوێرەی پانی کاغەزەکە پێش شکانەوەییو کردنی بەمەلزەمە.

**لَزَنَ القومُ لَزْناً:** خەڵکەکە قەرەباڵغییان کردو پاڵەپەستۆیان کرد ○ دەگوترێ: (لَزِنَ القوم على البئر): خەڵکەکە لەسەر بیرەکە بۆناو هەڵکێشان پاڵەپەستۆی یەکتریان کردو تەنگیان بەیەکتر هەڵچنی.

**تلازن القومُ:** بەمانا (لَزِنَ)دێ.

**الألزن من الزمان:** رۆژگاری سەخت.

**اللَّزْن:** تەنگانەو چورتم ○ دەگوترێ: (أصابَهُمْ لَزَنٌ من العيش): توشی ژیانی تاڵو کولەمەرگی بوون ○ (ماء لَزْنٌ): ئاوی کەم ○ (مَنْهَلٌ لَزْنٌ): شوێنی تەنگەبەر بۆ ئاو هەڵکێشان.

**اللَّزْنَةُ:** بەمانا (اللّزن)دێ ○ ساڵی قاتو قڕیو پڕ کارەساتو چورتم.

**اللِّزْنَة:** بەمانا (اللّزنة)دێ.

**لَسَبَتْهُ العقربُ ونحوها:** دوپشك پێوەی دا، گەستی، دەشگوترێ: (بات

البعوض يَلْسبُنا): شەو تابەیانی مێشولە ئێمەی گەست، پێوەی داین ٥ هەروا دەگوترێ: (لَسَبَ فلاناً بالسَّوْط): بەقامچی لەفلانکەسی دا ٥ دەشگوترێ: (لَسَبَه بلسانه): جنێوی پێدا ٥ (فهو لاسِبٌ ولَسّابه).

**لَسِبَ به لَسْباً**: پێوەی نووسا.

**لَسِبَ العَسَلَ ونحوه**: هەنگوینی خوارد هەڵی قوڕاند.

**السَبَهُ عقرباً ونحوها**: دوپشکی ئاراستەکرد بۆئەوەی پێوەی بدا.

**اللَّسوب**: دەگوترێ: (ماترك لَسُوباً): هیچی نەهێشتەوە.

**لَسَدَ الفصيلُ ونحوه أمه لَسْداً**: بێچووەکە هەموو شیری ناو گوانی دایکەکەی خوارد.

**لَسَدَ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵقوڕاند، خواردیەوە.

**لَسَدَ العَسَلَ**: هەنگوینی لستەوە ٥ (لَسَدَ الوحشيةُ): گیانلەبەرەکە بێچووەکەی لستەوە.

**المِلْسَدُ**: بێچووە ئاژەڵێك زۆر شیر بخوا.

**لَسَّ الشَّيْءَ لَسّاً**: شتەکەی لستەوە، خواردی ٥ دەگوترێ: (لَسَّتِ الدابةُ الحَشيشَ): وڵاخەکە دەمی بۆ لەوەڕو گیایەکە بردو هەڵیپچڕی ٥ دەشگوترێ: (فلان يَلَسُّ لي الأذى): فلانکەس زۆر ئەزیەتم دەدا.

**ألَسَّتِ الأرْضُ**: زەوی یەکەم جار رووەکی لێ ڕواو گیاو گژەکەی سەری لەزەوی دەرهێنا.

**ألَسَّ النباتُ**: ڕووەکەکە کاتی ئەوەی هات دەستی بۆ ببرێو بدورێتەوە.

**اللُّسَاسُ**: گیاو گژ کەتازە سەری لەزەوی دەرهێنابێو بەردەمی ئاژەڵ نەکەوێ.

**اللَّسُّ**: یەکەمجار کەلەوەڕ پێ دەگاو بەردەمی ئاژەڵ دەکەوێ.

**اللُّسُسُ**: کۆڵبەرو حەماڵی لێزان.

**لَسَعَتْهُ العَقْرَبُ**: دوپشك پێوەی دا ٥ دەشگوترێ: (أتَتْني منه اللواسِعُ): قسەی ناخۆشو نابەجێم لێ بیستنەوە ٥ (فهو ملسوع وهي مَلْسُوعة وهو وهي لسيع).

**لَسَّعَ فلاناً بلسانه**: بەزمانی خەڵکی ئەزیەت دا غەیبەتی کردن، ڕەخنەی لێ گرتن.

**ألْسَعَهُ عقرباً**: دوپشکی ئاراستەکرد بۆ ئەوەی پێوەی بدا.

**ألْسَعَ بين الناس**: ئاکۆکی خستە ناو خەڵکەکەوە ٥ فیتنەو ئاشووبی خستە ناو خەڵکەکەوە.

**اللَّسّاعُ**: زمان پیس، دەم درێژو تانەو تەشەر هاوێژ.

**اللَّسْعَةُ**: بەمانا (اللَّسَّاع)دێ.

**اللُّسُوع**: ئافرەتێك مێردەكەی ناخۆش بوێو دەمدرێژو جنێو فرۆش بێ بەهاوسەری ئەزیەتی بدا.

**المِلْسَعُ**: شارەزاو چاوساغی لێهاتوو.

**لَسِقَ**: بڕوانە مادەی (لَزِق ولصق).

**اللُّسُوقُ**: لەزگەیە بەشوێنی برینەوە دەنرێ تا چاك نەبێتەوە بەری نادا.

**لَسَنَ فلاناً لَسْناً**: غەیبەتی كرد تانەی لێ دا ٥ بەخراپە باسی كرد ٥ لەقسەكردن دا بۆڕی دا بەسەری دا زاڵ بوو ٥ دەگوترێ: (لاسَنَهُ فَلَسَنَه): گفتو گۆی لەگەڵ دا كردو بۆڕی دا.

**لَسَنَ اللِّيفَ**: توێكڵەكەی شیتاڵ كردەوەو شی كردەوە، دوایی كردی بەتاڵتاڵو ئامادەی كرد بۆ ڕستنو بادان.

**لَسِنَ فلان لَسِناً**: فلاّن زمان ڕەوانو فەصیحو قسە شیرن بوو ٥ (فهو لَسِنٌ وهي لَسِنةٌ وهو أَلْسَنُ وهي لَسْناء).

**أَلْسَنَ فلان**: فلاّنكەس فەصیحو زمان ڕەوان بوو ٥ زۆری قسەكرد.

**أَلْسَنَ فلاناً قوله أو رسالته**: قسەكەی بە فلاّنكەس ڕاگەیاند ٥ دەگوترێ: (أَلْسِنّي فلاناً): فلاّنكەسم بۆ ئاگادار بكەنەوە.

**لاسَنَهُ**: قسەی لەگەڵ دا كرد ٥ دەگوترێ: (كان بينهما ملاسَنة): گفتو گۆ كەوتە نێوانیان، پێكەوە قسەیان كرد.

**لَسَّنَتَ فلان**: فلانكەس زمانی خۆی گەستو سەرسام بوو لەكارەكە.

**لَسَّنَ الشَّيْءَ**: شتەكەی وەكوو زوبان لێ كرد ٥ دەگوترێ: (لَسَّنَ الحِذاءَ): پێشی پێڵاوەكەی تاشی وەكوو قەراخی زمانی لێ كرد.

**تَلَسَّنَ الجَمْرُ**: پشكۆ ئاگرەكە بڵێسەی لێ هەڵسا وەكوو زوبان سەرەوەی خۆی باریك نواند.

**تَلَسَّنَ عليّ**: درۆی لەگەڵ دا كردم، درۆی بەدەمەوە هەڵبەستم.

**اللِّسان**: زوبان؛ ئەو پارچە گۆشتە لاكێشەییەی لەناو دەم دایە ٥ بۆ قسەكردن بۆ چەشتن بۆ شت قوتدان بەكاردەهێندرێ ٥ بەمانا شێوە زمانو لوغە دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ﴾ ٥ فلاّنكەس بەبەڵگەی خودایی قسەدەكا ٥ وەسپو سەنا ٥ دەگوترێ: (لسان الناس عليه حسنة): خەڵك وەسپو سەنای دەدەن ٥ (لسان القوم): قسەكەری نەتەوە ٥ (لسان الحال): دیاردەو نیشانەی شت.

**ذو اللسانين**: فیتنەو دوو زمان، دوو ڕوو.

لسان الحذاء: ئەو زیادۆکەی دەکەوێتە ئاستی پشتەپێ ٥ (لسان المیزان): زوبانەی تەرازو ٥ (لسان النار): بلێسەی ئاگر ٥ دەگوترێ: (طفي لسان النار): ئاوە بۆ ئەو پارچە غوضروفەیەی بەبنی زمانەوەیەو لەکاتی شت قوتدان دا بۆری هەناسە دەگرێ بۆئەوەی خواردنی تێ نەچێ.

لسان الثور: روەکێکی ساڵانەیە شێوەی لەزمانی رەشەوڵاخ دەچێ، لەبواری پزیشکی دا سودی لێ دەبیندرێ.

لِسان الحمل: روەکێکی کێوی پزیشکییە تەمەن درێژە.

لِسان العصافیر: جۆرە درەختێکە ٥ (لسان العصفور): جۆرە مەعکەرۆنەیەکە پارچەکانی بچوکن وەکوو زمانە چۆلەکە وەهان.

اللِسْنُ: قسەو ئاخاوتن ٥ زمانو زاراوە ٥ دەگوترێ: (لکل قوم لِسْنٌ): هەر نەتەوەو زاراوەی خۆی هەیە.

اللِسنُ: هەرشتێك قەراخەکانی وەکوو قەراخی زمانی لێ کرابێ.

المَلْسُون: (رجل ملسون): پیاوی زمان شیرین ٥ قسە خۆشی بێ کردەوە.

لَشْلَشَ فلان: فلانکەس لەکاتی ترس وەقرەی لێ هەڵگیراو نەیتوانی ئارام بگرێ، هەر هاتو چۆی بوو.

اللَّشْلَشُ: پیاوی گورجو گۆڵو جەستە بچوك ٥ دەگوترێ: (فلان جبان لشلاش): فلانکەس ترسنۆكو بێ وەقرەیە.

لَشَأَ فلان: فلانکەس دوای پلە بەرزبونەوەی نزم کرایەوە.

لاشاء الله: خودا لەناوی برد ٥ وای لێ کرد ناوی نەما هەروەکوو نەبوو بێ.

لَصِبَ الجِلْدُ باللحم لَصَباً: پێستی بە ئێسقانەوە نووسا لەبەر کزو کۆڵەواری گۆشتی پێوەنەما.

لَصِبَ الخاتم في الأصبع: هەنگوستیلەکە لەپەنجەدا جێگیر بوو، دەرنایە.

لَصِبَ السیفُ في الغمدِ: شمشێرەکە لەکالان دا ئاخنێ بوو ٥ (فهو مِلْصاب).

إلْتَصَبَ الشَيْئُ: شتەکە تەنگ بوو.

اللاَّصِبَة: بیری تەنگەبەرو قوڵ ٥ (ك: لواصِب).

اللِصْبُ: تەنگەڵانو رێگەی تەنگەبەری ناوکێوو کەژ ٥ (ك: لصوب ولِصَاب).

اللَصِبُ: پیاوی رژدو چروك رەوشت نالەبار.

لَصَّ الشَيْئَ لَصّاً: شتەکەی دزی ٥ بەدزی کارەکەی کرد.

**لَصَّ البابَ**: دەرگاکەی داخست، پێوەی دا ٥ (فهو ملصوص).

**لَصَّ فلان لَصَصاً ولَصوصية**: فلانکەس ناوشانی تەسك بوون ٥ یان ددانەکانی جوت بون‌و بۆشاییان تێدا نەبیندرا.

**لصّت المرأة**: ئافرەتەکە ڕانی لێك نزیك بوونــەوە بۆشاییان لــەنێوان دا نەبوو.

**لَصَّت الجبهة**: ناوچاوانی تەسك بوو.

**لَصِقت الشاة**: مەڕەکە شاخێکی بۆ پێشەوەو شاخێکی بۆ دواوە بوو ٥ (فهو أَلَصّ وهي لَصّاء).

**تَلَصَّصَ فلان**: فلانکەس دزی کردنی دوبارەو سێبارە کردوە ٥ یان بەنابەدڵی دزی کرد ٥ جاسوسی کرد.

**اللِّصُّ**: دز ٥ (ك: لصوص).

**المَلَصَّة**: (أرض مَلَصَّة): ولاتێکە دزی زۆرە.

**لَصَغَ الجلدُ لَصْغاً ولصوغاً**: پێستی بەئێسقانەوە نووساو وشك بووە بەهۆی کزی‌و لاوازی.

**لَصَفَ لونه لصوفاً ولَصِيفاً**: ڕەنگی درەوشایەوە.

**لَصَفَ البعيرُ لَصْفاً**: حوشترەکە دڕوی خوارد ڕوەکی چقلاوی خوارد.

**اللاّصِفُ**: کلی لەچاو ڕادراو.

**اللَّصَفُ**: درەختێکە چقلاوی لەولاتانی دەوروبەری دەریای سپی ناوەڕاست گەشەدەکا، گوڵەکانی سپین.

**لَصِقَ الشَيْئُ بغيره لَصَقاً ولُصُوقاً**: شتەکە بەشتی ترەوە نووسا ٥ (فهو لاصِق ولصاق).

**الصَقَ الشَيْئَ بالشَيْئ**: شتەکەی بەشتەکەی ترەوە نووساند.

**لاصَقَه**: پێوەی نووسا ٥ ئەویش بەئەمەوە نووسا.

**إلْتَصَقَ به**: پێوەی نووسا.

**تلاصَقا**: بەیەکەوە نووسان.

**الإلصاق**: پیتی (الإلصاق): پیتی (ب)ی یە دەگوترێ: (مررت بزید): بەلای زەیددا تێپەڕیم.

**الإلْتِصاق**: لەبواری ئەندازیاری دا جۆشخواردن‌و پێوەلکانی قەبارەیەکە بەقەبارەیەکی تر.

**الإلْتِصاقية**: (اللّغة الإلتصاقية): ئەو زمان‌و شێوە ئاخاوتنەیە کەبەهۆی وشەی زیادەوە پەیوەندی قسەکان ئەدا بکرێ وەکوو لوغەی ئاجەری‌و بۆلۆنی‌و تورکی.

**اللاّصوق**: ئەو دەرمان‌و لەفاف‌و لەزگە پزیشکییانەی دەخرێنە سەربرین.

**اللَّصْق**: دەگوترێ: (هو لَصْقي وبَلَصْقي): ئەو بەتەنیشتمەوەیە ٥

هەروا دەگوترێ: (هو بلصق الحائط):
ئەو لەپەنا دیوارەکەوەیە.
**اللُّصُوقُ**: بەمانا (اللاّصوق)دێ.
**اللَّصيق**: مرۆڤی باوك نادیار، هەلگیراوە، پێوەلکاو پالدراو بۆ لای کەسێك کەباوکی ئەو نییە، بەناڕەوا خۆی پالّ کەسێك داوە کەباوکی ئەو نییە.
**جارِ لَصيق**: جیرانی وا کەمالّی بەمالّی تۆوەبێ.
**المُلْصَقُ**: مرۆڤی باوك نادیار ٥ باوك نەزاندراو.
**لَصْلَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لەقاند بۆئەوەی دەری بێنێ ٥ دەگوترێ: (لَصْلَصَ الضرس من الفم): ددانەکەی لەقاند بۆئەوەی دەری بێنێ.
**لَصْلَصَ**: زۆری بەملاو بەولای خۆی دا ڕوانی.
**اللَّصْلاَصُ**: چاوساغی شارەزاو لێهاتوو لەرێ نیشان دان دا.
**لَضَمَهُ لَضْماً**: توندو تیژی لەگەلّ نواند، زۆری ئیلحاح لێ کرد.
**لَطَأَ بالشَّيْءِ لَطْئاً**: بەشتەکەوە نووسا ٥ دەگوترێ: (لَطَأَ بالأرض): بەزەوییەکەوە نووسا.
**لَطَأَ فلاناً بالعصا**: بەگۆچان لەفلانی دا.
**لَطِيءَ بالأرض لطوءاً**: بەزەوییەکەوە نووسا.
**لَطِئَت لِسَانُهُ**: زوبانی وشك بوو.
**اللاّطِئَة**: برینێك ئەوەندە قوول بێ بگاتە توێکلّەتەنکەی سەر ئێسقان ٥ کلاّوی بچوك.
**لَطَثَ الشَّيْءُ لَطْثاً**: شتەکە خراپ بوو، تێکچوو، کەلکی نەما.
**لَطَثَ فلاناً أو الشَّيْءَ**: بەبەری دەستی لەفلاّنکەسی دا، شەپلاّغەی لەفلاّن دا ٥ یان بەشەپکەی دار لەفلاّنکەسی دا.
**لَطَثَ فلاناً بحجر**: بەردی لەفلاّنکەس گرت.
**لَطَثَ الأمرُ فلاناً**: کارەکە لەسەر فلاّنکەس زۆر گران ٥ دەگوترێ: (لَطَثَهُ الحَمْلُ): کۆلّەکەماندوی کرد ٥ بەلایەوە گران بوو.
**تلاطَثَ القَومُ**: خەلّکەکە شەڕە شمشێریان کرد ٥ بەشمشێر لەیەکیان دا ٥ یان بەمستەکۆلّەو شەپازلە کەوتنەو ویژەی یەکتری.
**تلاطَثَ الموجُ**: شەپۆلەکان تێکیانەوە هاویشت.
**المَلاَطِثُ**: شوێنی جەستەکە زەبری لێ دەدرێو بەو هۆیەوە ئازاری لێ پەیدا دەبێ.
**لَطَخَهُ بكذا لَطْخاً**: ئەوەی تێهەلّسو ٥ دەگوترێ: (لَطَخَ ثَوبَهُ بالمداد وغيره): پۆشاکەکەی بەمەرەکەب ڕەنگ کرد.

**لَطَخَ فلاناً بسوء**: بوختانی بۆ فلانکەس کرد.

**لَطَخْتُ فلاناً بأمر قبيح**: فلانکەسم تاوانبار کرد بەکارێکی ناشیرین، کاری ناشیرینم پاڵ دا.

**لَطَّخَهُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (لَطَخَهُ)دێ.

**تَلَطَّخَ الشيءُ بكذا**: شتەکە بەوە پیس بوو.

**تَلَطَّخَ فلان بأمر قبيح**: فلانکەس بەکارێکی ناشیرینەوە تۆمەتبار کرا ◊ کاری ناشیرینی پاڵ درا.

**اللَّطْخُ**: شتی کەم لەهەرشتێك بێ ◊ دەگوترێ: (في السماء لَطْخ من السحاب): کەمێك هەور بەئاسمانەوە هەیە ◊ (سمعت لَطْخاً من الخبر): کەمێکم لەهەواڵەکە بیست ◊ هەروا وشەی (اللَّطْخُ) ناوە بۆ مرۆڤی ئەحمەق و گێل.

**اللَّطِخُ**: خواردنی پیس (پیسخۆر) ◊ هەرشتێك شتی تری تێهەڵسوری.

**اللُّطْخَةُ**: دەگوترێ: (رجلٌ لُطخَةٌ): پیاوێکی ئەحمەق و گێلە خێرو بێری تێدا نییە.

**اللَّطيخُ**: ئەحمەق و گێل.

**اللَّطوخ**: ئەوەی لەشتی تر هەڵدەسورێ و ڕەنگی دەگۆڕێ.

**لَطَسَهُ لَطْساً**: بەتەختە دارێکی پان لێی دا، بەشتێکی پان لێی دا، چەپەوانەی پێ کێشا ◊ مستە کۆڵەی لێ دا.

**لَطَسَ فلاناً بالحجر**: بەردی بەفلان دادا ◊ (لَطَسَ الحجر بالحجر): بەردی بەبەرد کێشا بۆ ئەوە بیشکێنێ.

**لَطَسَ الشيءَ**: شتەکەی وردو هاڕ کرد ◊ شتەکەی پان و پلیش کردەوە.

**لاَطَسَهُ**: تێی هەڵسو ◊ پێی ڕەنگ کرد.

**تلاطست الأمواج**: شەپۆلەکان تێکیانەوە هاویشت.

**المِلْطَاسُ**: کوین، پێك، چەکوچی گەورە بۆ شکاندنی بەرد ◊ بەردی گەورە بۆ هاڕینی دانەوێڵە ◊ بەرداش.

**لَطَّ الامر وغيره لَطّاً**: خەریکی کارەکە بوو خۆی پێوە گرت.

**لطّ بفلان**: کەوتە گەڵ فلان.

**لَطّ الشيءَ**: شتەکەی شاردەوە داپۆشی ◊ دەگوترێ: (لَطّ عليه): لێی شاردەوە.

**لطّ الحَقَّ بالباطل**: حەق و بەتاڵی تێکەڵاو بەیەك کرد.

**لَطّ عنه الخَبَرَ**: هەواڵەی لێ شاردەوە.

**لَطّ عليه الخَبَرَ**: هەواڵەکەی لێ شاردەوەو هەواڵێکی تری پێدا.

**لَطّ السِتْرَ أو الحجابَ**: پەردەکەی دادایەوە، ڕوپۆشی دادایەوە.

**لَطّ حقَّهُ وعن حقه**: ئینکاریی مافی ئەوی کرد، دانی بەمافی ئەودانەنا.

**لَطَّ البابَ**: دەرگاکەی داخست.
**لَطَّ الشَيْئَ**: شتەکەی پێوە لکاند.
**لَطَّ فلاناً بالعصا**: بەگۆچان لەفلانکەسی دا.
**لَطَّ فلان لَطَطاً**: فلانکەس ددانی کەوتن یان ددانەکانی داخوران و بنەکەیان ماوە ٥ (فهو ألط).
**ألَطَّ الرجلُ**: پیاوەکە توندو تیز بوو لەکارەکەدا.
**ألطّ الأمْرَ عليه**: کارەکەی لێ شاردەوە.
**ألَطّ القَبْرَ**: گۆڕەکەی بەزەوییەوە تەخت کرد.
**ألَطّ فلاناً**: یارمەتی فلانکەسی دا، پشتگیری کرد.
**إلْتَطَّت المرأة**: ئافرەتەکە خۆی داپۆشی.
**ألتَطَّتِ المرأةُ بالمسك**: ئافرەتەکە بۆنی میسکی لەخۆدا.
**تَلَطَّطَ حَقَّهُ**: ئینکاری مافی فلانی کرد ٥ دەشگوترێ: (تَلَطّى حَقَّهُ): بۆئەوەی پیتی (ط) سێ جار بەپەنایەکەوە نەیەن.
**اللاّط**: پیس.
**المِلْطاط**: سەرانسەری کێو ٥ قەراخی کێو ٥ ئاش ٥ چەقەنەی ئاش ٥ لێواری شیو ٥ قەراخ و دەریا ٥ یان ڕێگا بەقەراخ دەریادا ٥ بەربێلای خانوو ٥ ماڵەی سواخکردن و گەچکاریی ٥ برینێك بگاتە مۆخی سەر.
**لَطَعَ الشَيْئَ لَطْعاً**: شتەکەی لستەوە، خواردی ٥ (فهو لاطع ولطّاع).
**لَطَعَ الكلبُ أو الذئبُ الماءَ**: سەگەکە یان گورگەکە ئاوی خواردەوە.
**لَطَعَ فلاناً**: شەقی لەپاشەوەی فلانکەس هەڵدا.
**لَطَعَ فلاناً بالعصا**: بەگۆچان لەفلانکەسی دا.
**لَطَعَ عينه**: مستەکۆڵەی لەچاوی دا.
**لَطِعَتِ الأسْنانُ لَطَعاً**: ددانەکانی داخوران و بنەکەیان ماوە.
**لَطِعَت شفة الزنجي**: دیوی ناوەوەی لێوی ڕەش پێستەکە (قولە ڕەشەکە) سپی دەنوێنێ ٥ (فهو ألْطَعُ وهي لَطعاء).
**لَطِعَ الشَيْئُ**: شتەکە کزو لاواز بوو.
**لِطَعَ الشَيْئَ لطعاً**: شتەکەی لستەوە، خواردی.
**لَطَعَ فلاناً**: شەقی لەپاشەوەی فلانکەس هەڵدا.
**إلْتَطَعَ الشَيْئَ**: شتەکەی لستەوە، خواردی ٥ دەگوترێ: (إلتطعَ ما في الإناء): هەر چی لەقاپەکەدا بوو خواردی.
**اللِطْعُ**: مەلاشو ٥ (ك: ألطاع).
**اللُطَعُ**: (رجل لُطَعٌ): پیاوی خوێڕیو

هیچو پوچو دڵ پیس.

**اللُّطْعَةُ**: سپیایی کرمی لۆکەیە لەسەر بەری پەلکە گەڵا رۆی دەکا.

**لَطَفَ بە ولـە لُطْفاً ولَطَفَاً**: لەگەڵی دا هێواشو لەسەرە خۆ بوو ◊ دەگوترێ: (هو لطيف بهذا الأمر): شارەزاو لەسەرەخۆیە بۆ بەرێوەبردنی ئەم کارە.

**لَطُفَ الشَيْئُ لُطْفاً ولطافَةً**: شتەکە ناسكو جوانو لەسەرە خۆ بوو ◊ تەنكو نەرم بوو پێچەوانەی ئەستورو خەستی ◊ دەگوترێ: (الهواء جسم لطيف): هەوا قەبارەیەکی نەرمو شلە ◊ (فتاة ذات خلق لطيف): کچێکی رەوشت جوانو لەسەرە خۆیە ◊ (لَطُفَ عنە) لەو بچوکتر بوو ◊ (فهو لطيف).

**ألْطَفَ لـە في القول**: پرسیاری لەسەرەخۆی ئاراستەکرد.

**ألْطَفَ فلاناً بكذا**: دیاری دا بەفلان، چاکەی لەگەڵ فلان کرد بەفلان کردەوە.

**ألْطَفَ الشَيْئَ بجنبـە**: شتەکەی بەتەنیشتیەوە لکاند.

**لاَطَفَهُ**: چاکەی لەگەڵ دا کرد ◊ لەگەڵی هێدیو هێمن بوو.

**لَطَّفَ الكتابَ**: کتێبەکەی سوكو ئاسان کرد شوێنە گرانەکانی رون کردنەوە.

**تلاطَفَ القومُ**: خەڵکەکە چاکەیان لەگەڵ یەکتر کرد.

**تلاطَفَ القومُ في الأمر**: خەڵکەکە لەکارەکەدا لەگەڵ یەکتر هێدیو لەسەرە خۆ بوون.

**تَلَطَّفَ للأمر**: بۆکارەکە هێدیو لەسەرە خۆ بوو.

**تَلَطَّفَ بفلان**: لەگەڵ فلان دا بەهێدیو لەسەرەخۆ جوڵایەوە فێڵی لێ کرد بۆئەوەی نهێنیەکانی لێ دەربێنێ.

**تَلَطَّفَ فلان**: فلانکەس خوشوعو ترسی پێوە دیاربوو، بەئەدەبو خوشوعەوە جوڵایەوە.

**استَلْطَفَ الشَيْئَ**: شتەکەی لەخۆی نزیك کردەوە، بەتەنیشتی خۆیەوە نوساند ◊ بەنەرمو نیانو جوانو ناسکی لەقەڵەم دا.

**اللَّطَفُ**: هێدی و هێمنی، دیاری، دەگوترێ: (أهدى اليە لطفاً): دیارییەکی پێشکەش کرد ◊ دەشگوترێ: (هؤلاء لطف فلان): ئەوانە هاوەڵو هەواداری فلانکەسن.

**اللُّطْفُ**: لوتف لەلایەن خوداوە توفیقدانو پاراستنی بەندەکانییەتی لەتێشکانو هەڵخلیسکان.

**اللُطفُ في العمل**: بەهێدیو لەسەرە خۆیی ئەنجامدانی کار.

**اللُطَفَةُ**: دیاری.

**اللَطیف**: یەکێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار ٥ چاکەو رەحمو بەزەیی خودایە بۆ بەندەکانی ٥ زانا بەنهێنی روداو وردەکارییەکان ٥ هەروا ناوە بۆ کەلامێك ماناکەی رونو ئاشکرا نەبێ ٥ قەبارەیەك رەقیو پتەوی تێدانەبێ ٥ (الجنس اللطیف): مەبەست لێی رەگەزی ئافرەتە.

**اللَطیفَةُ**: مێینەی (اللَطیف) ٥ ناوە بۆ قسەی ناسكو عەنتیکە ٥ (جاریة لطیفة الخصر): کچۆڵەیەکی قەدباریکە.

**اللَواطِف من الأضلاع**: ئەو پەراسوانەی بەلای سنگەوەن.

**لَطَمَهُ**: شەپلاغەی لەکولمی دا، بەلا رومەتی کێشا ٥ بەبەری دەستی لێی دا ٥ دەگوترێ: (لطمت المرأة وجهها): ئافرەتەکە بەدەمو چاوی خۆی کێشا.

**لَطَمَ الشَيْئَ بالشَيْئِ**: شتەکەی بەشتەکەوە نووساند، شتەکەی تێکەڵاوی شتەکە کرد.

**لاطَمَهُ ملاطمة**: ئەو دوکەسە چەپەوانەیان لەیەکتر دا، مشتەکۆڵەیان ئاراستەی روخساری یەکتر کرد.

**لَطَّمَهُ**: زۆری مستەکۆڵە لێدان ٥ (فهو مُلَطَّم).

**لَطَّمَ الکتاب**: کتێبەکەی تەواو کرد.

**إلتطمت الأمواج**: شەپۆلەکان لێکیان دا.

**التَطَمَ القومُ**: خەڵکەکە بەمستەکۆڵە لێکیان دا.

**تلاطمت الامواجُ**: شەپۆلەکان لێکیان دا.

**تلاطَمَ القومُ**: خەڵکەکە بەمستەکۆڵە لێکیان دا.

**تَلَطَّمَ وجهُهُ**: دەمو چاوی تۆزاوی بوون.

**اللَطیمُ**: بەمستەکۆڵە لێدراو ٥ کەسێك منداڵ بێو باوكو دایکی بمرنو هەتیو بێ ٥ ئەسپی نۆیەم لەئەسپەکانی ناو حەلەبەی پێشبرکێ.

**اللَطیمةُ**: قوتوی میسك ٥ دەگوترێ: (فاحت اللطیمة) یان دەگوترێ: (کأن فاها لطیمة تاجر) ٥ هەروا وشەی (اللَطیمة): ناوە بۆ کاروانی بازرگانی کە بارەکانیان میسكو ئاوریشمو کاڵای لەو جۆرە بێ ٥ (ك: لطائم).

**المُلَطَّمُ**: خوێڕیو خاڵی لەرەوشتی بەرز.

**المَلْطَمُ**: کولم، رومەت ٥ (مَلْطِمُ البحر): ئەو شوێنەی دەریاکە شەپۆلەکانی

تێدا دەشکێنەوە ◦ (ك: مَلاطِم).

**لَطَا لَطْواً**: پەنای بردە بەر ئەشکەوتو بن بەردو پەناگای کێو.

**لَطَى لَطْياً**: بەزەوییەکەوە نووساو جێی نەهێشت.

**تَلَطَّى على العدوّ**: چاوەڕوانی پێشەتای دوژمنی کرد.

**اللَّطَاةُ**: زەوی ◦ شوێن ◦ ناوچاوان یان ناوەڕاستی ناوچاوان ◦ دەگوترێ: (بَيَّضَ الله لطاتك): خودا ناوچاوانت سپیو درەوشاوە بکا ◦ دزو جەردە کەلێتەوە نزیك بن ◦ بارگرانیو قورسایی ◦ دەگوترێ: (ألقى عليه لطاته): قورسایی خۆی خستە سەر ◦ هەروا دەگوترێ: (ألقى لطاته وبلطاته): لەوشوێنە جێگیر بوو نەڕۆیی جێی نەهێشت ◦ هەروا دەگوترێ: (فلان لايعرف قِطاته من لطاتهِ): فلانکەس پاشو پێشی خۆی نازانێ، ئەحمەقو گێلە.

**اللُّطَـاةُ**: دزو جەردە کەلێت نزیك ببنەوە.

**المِلْطى والمِلْطاء والمِلْطاةُ**: ئەو پەردە تەنکەی نێوان ئێسقانی کاپێژەی سەرو گۆشتەکەیەتی.

**لَـظَّ بـه لَظّـاً**: لەگەڵی کەوتو لێی جیانەبوەوە.

**لَظَّ عليه**: پێکێشی لێ کرد.

**لَظَّ فلانٌ**: فلانکەس ی دەرکرد ◦ (فهو لاظّ ومِلْظاظ).

**اَلَظَّ به**: بەمانا (لَظَّ)دێ ◦ لەحەدیس دا هاتووە دەفەرموێ: (اَلِظّوا بياذاالجلال والإكرام): خۆ بەخوێندنی دوعاو پارانەوەی (يا ذاالجلال والإكرام) بگرنو هەمیشە ئەم ڕستەیە بڵێنو بڵێینەوە.

**اَلَظَّ بالمكان**: لەشوێنەکە جێگیر بوو ◦ (اَلَظَّ بفلان): لەگەڵ فلانکەس کەوتو لێی جیابوونەوە.

**اَلَظَّ المَطَرُ**: بارانەکە بەردەوام بوو.

**لاظَّ في الحرب ملاظّةً ولظاظاً**: بەردەوام بوو لەسەر شەڕو وازی لێ نەهێنا.

**تلاظّوا في الحرب**: سوارەکان یەکتریان ڕاونا یەکتریان هێناو برد.

**تَلَظْظَت الحَيةُ**: مارەکە لەبەر زۆر ڕق هەڵسانی سەری خۆی باداو سەری خۆی هێناو برد.

**اللَّظُّ**: پیاوی وشکە تەبیاتو توندڕەو.

**المِلْظَاظُ**: بەمانا (المِلْحَاحُ)دێ ◦ واتە کەسێك زۆر پێکێشیو ئیلحاح بکا بۆ شت ◦ (رجل مِلْظاظ): پیاوێکە تەنگە تاو کراوە.

**المِلَظُّ**: تەنگە تاو.

**المُلِظَّةُ**: نامەی پێکێشیو زۆر ئیلحاح تێداکردن.

**لَظْلَظَتِ الحيّةُ رأسها**: مارەکە لەرق هەڵساوی‌و تورەیی زۆر سەری باداو سەری هەڵسوڕاند.

**تَلَظْلَظَتِ الحيّةُ رأسَها**: مارەکە لەرق هەڵساوی خۆی سەری هەڵسوڕاند.

**اللَظْلاَظُ**: پیاوی توند تەبیات‌و توند ڕەو ٥ زمان ڕەوان‌و قسەزان ٥ دەشگوترێ: (یوم لظلاظ): ڕۆژێکی گەرمە.

**لَظِيت النارُ**: ئاگرەکە بڵێسەی دا.

**لَظِيَّ النارُ**: ئاگرەکە هەڵگیرسا، بڵێسەی دا.

**إلتظَّ فلان**: فلانکەس رقی هەڵساو وەکوو پشکۆ ئاگر سور هەڵگەڕا.

**تَلَظَّتِ النارُ**: ئاگرەکە هەڵگیرسا بڵێسەی کرد ٥ دەشگوترێ: (تَلَظِّي الحَرُّ وتَلَظَّت المفازَةُ وتَلَظَّى فلان على فلان).

**اللَّظى**: بڵێسەی ئاگر بەبێ دوکەڵ.

**لَظى**: ناوێکە لەناوەکانی دۆزەخ‌و (دو بزوێنی ناچنە سەر) هەمیشە دەبێ بێ تەنوین بێ.

**لَعَبَ الصَّبِيّ لَعْباً**: منداڵەکە لیك لەدەمی هاتە خوار.

**لَعِبَ لَعِباً ولِعْباً**: منداڵەکە یاری کرد ٥ پیاوەکە کاری بێ سوودی کرد.

**لَعِبَ بالشَّيْئ**: یاری بەشتەکە کرد.

**لَعِبَ في الدين**: ئایینی کردە گاڵتەو گرنگی پێ نەدا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَذَرِ الَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا﴾.

**لَعِبَت بهم الهمومُ**: خەم‌و خەفەت تێکی دان یاری پێکردن سەری لێ شێواندن.

**لَعِبَتِ الريحُ بالمنزل**: ڕەشەباکە مەنزڵ‌و نشینگەکەی سڕیەوە ٥ کوێری کردەوەو ئاسەواری نەهێشت.

**ألعَبَ الصَّبِيَّ**: منداڵەکەی والێ کرد یاری بکا ٥ شتێکی وای بۆ هێنا یاری پێ بکا.

**لاعَبَهُ مُلاعَبَةً ولِعاباً**: یاری لەگەڵ دا کرد.

**لَعَّبَ الرَّجُلُ**: بەمانا (لَعِبَ)دێ.

**لَعَّبَ القِرْدَ ونحوه**: یاری بەمەیمەونەکە کرد ٥ هەڵی پەڕاند.

**تَلَعَّبَ فلان**: فلانکەس جار دواجار یاری کرد ٥ دەگوترێ: ((تَلَعَّبَت بهم الهمومُ).

**الأُلْعُبَان**: کەسێك زۆر یاریی بکا ٥ فێڵ زان‌و بەپێچ‌و پەنا.

**الأُلْعُوبَةُ**: یاریی ٥ دەگوترێ: (بینهم العوبة) ٥ (وهذه ألعوبة حسنة).

**التِّلْعَابُ**: کەسێك زۆر یاریی بکا.

**التِّلْعَابُ**: بەمانا (التِّلْعاب)دێ.

**التِّلْعَابَةُ**: بەمانا (التِّلْعاب)دێ.

**اللُّعَــابُ**: تــف ○ (لعــاب النحــل): هـەنگوینی هـەنگ ○ (لَعابُ الحَيَّـة): ژەهری مار ○ (لُعابُ الـشمس): ئـەو تارماییەیە کەلەکاتی گەرمادا دێتە بەرچـاو وەکـوو تـەونی جلْجالۆکـە لەئاسمانەوە دێتە خوار ○ دەگوترێ: (سال لُعاب الشمس): تیشکی خۆرو گەرمییەکـەی هاتـە خـوار بۆسـەر زەوی.

**اللُّعْبَــةُ**: هەرشـتێك یـاریی پـێ بکـرێ وەکوو دامەو دۆمینەو سێ ڕسکێن‌و نۆڕسکێن‌و شتی وا ○ نەحمەق‌و گێل کـە گاڵتەچـی کەسـانی دیکـەبێ ○ دەگـوترێ: (رجــل لُعْبَــة): پیاوێکـە خـەڵك گاڵتـەی پـێ دەکـەن ○ نـۆرە یـاریی ○ دەگـوترێ: (لِمَـن اللّعْبَـةُ؟): سـەرەیاری کێیـە؟ ○ یـان دەگـوترێ: (فَرَغ من لعبته): لـەنۆرە یارییەکـەی خۆی بۆوە.

**اللُّعَبَةُ**: کەسێك زۆر یاریی بکا.

**اللّعّــابُ**: بــەمانا (اللّعْبَــةُ)دێ ○ هــەر ئــاژەڵ‌و گیانلەبــەرێك پیــشەی هەڵپەڕین‌و سەمابێ وەکوو مەیمون.

**اللَّعُــوبُ (إمــرأة لَعُــوب)**: ئـافرەتێکی دەلال‌و لارو لەنجەکەرو سوعبەتـچی ○ (ك: لعائب).

**المُلاعِـبُ**: (ملاعِـب ظلـه): باڵندەیەکـە لەسارا یاریی لەگەڵ سێبەری خۆی دەکا ○ بڕوانە مادەی (القِرلّى).

**المَلْعَبُ**: یاریگا ○ (ك: ملاعب).

**ملاعِـب الريـاح**: ئـەو شـوێنانەی بایـان لێـوە دێ ○ دەشـگوترێ: (ترکتــه في ملاعــب الجــن): لەشوێنێکی نادیـار جــێم هێــشت ○ کـــەس نازانـــێ لەکوێیە.

**المِلْعَبَةُ**: کراسی بێقۆڵ منداڵ یاری پێوە دەکا ○ (فانیلەو شۆرت).

**لَعْـــثَمَ في الأمـــر**: لەکارەکـــە وەســـتا ○ هەڵوێستەی لەسەر کردو لێی وردبـۆوە ○ بەهێواشی ئەنجامی دا.

**لَعَـــجَ الـضربُ فلانـــاً**: لێدانەکـە ئـازاری بەفلانکەس گەیاند ○ پێستی سوتاند.

**لَعَجَ الحُبُّ والشوقُ فؤاده**: سۆزو دڵداری دڵی فلانکەسی پرژاند.

**لَعَجَ الهَـمُّ في الـصدر**: خـەم لـەدەروونی دا تێکیانەوە هاویشت.

**العَجَ النار في الحَطَب**: ئـاگری لـەدارەکان بەردا ○ ئاگرەکەی داگیرساند.

**لاَعَجَهُ الأمْـرُ**: کارەکـەی لەسـەر قـورس بوو ○ توشی دڵەڕاوکێی کرد.

**العَـجَ الرجـلُ**: پیاوەکـە بـەهۆی خـەم‌و خەفەتەوە نەخۆش کەوت.

**اللاّعِجُ**: عیشق‌و سۆزی سـوتێنەری نـاو

دەروون ٥ دەگوترێ: (هَمٌّ لاعج): خەمو خەفەتێکە دڵ دەسوتێنێ ٥ دەشگوترێ: (به لاعج الهوى ولواعجه): کاریگەری سۆزی دڵداریو عیشقی پێوە دیارە.

لَعَسَهُ لَعْساً: گەستی.

لَعِست الشَّفَةُ: لێوەکە دیوی ناوەوەی ڕش هەڵگەڕا بوو کەئەم جۆرە لێوە لای عەرەب پەسەندەو بەجوانی دەزانن ٥ (فهي لَعْساءُ).

لَعِسَت النَباةُ: گیاو گژەکە پڕو چڕ بووتێکهاڵاو بەهۆی تیر ئاوییەو ڕەش هەڵگەڕا.

تَلَعَّسَ فلان: فلانکەس خواردنی خێرا خێراو بەهەڵپە بوو.

اللَّعَسُ: ڕەشییەکە بەدیوی ناوەوەی لێوەیە.

اللُّعْسَة: ڕەنگی ڕەش ٥ دەگوترێ: (في شَفَتَيْها لُعَسَةٌ): دیوی ناوەوەی لێوی ڕەشایی هەیە.

اللَّعُوسُ: دەگوترێ: (ماذقت لَعُوساً): هیچ شتێکم نەچەشتووە.

اللَّعْوَسُ: زۆر خۆرو چلێس، هەڵپەکەر بۆ خواردن هەروا ناوە بۆ گورگ چونکە ئەو دڕندەیە چلێسو بەهەڵپەیە کەدەکەوێتە ناو مێگەلو شتی واوە هەوڵ دەدا زۆر ترین خەسار بداو ئاژەڵ بخنکێنێ ٥ (ك: لَعَاوِس).

المَلْعوسُ: (لَحْمٌ مَلْعوسٌ): گۆشتی سوری نەکوڵاو.

لَعَصَ علينا لَعَصاً: شتەکەی گرانو نەستەم کرد لەسەرمان چلێس بوو لەخواردنو خواردنەوە دا ٥ (فهو لَعِصٌ).

تَلَعَّصَ: بەمانا (لَعِصَ)دێ.

لَعَطَهُ بالنار لَعْطاً: پانەو پان ملی داخ کرد، دەگوترێ: (لَعَطَ الشاةَ): ملی مەڕەکەی داخ کرد.

لَعَطَ فلاناً بحقه: مافی فلانی پاش خست خستیە ژێر لێوەوە.

مَرٌّ لاعِطاً: ڕۆیی بەشێوەی دزە هەڵوێستو خۆی خستە پەنا دیوار یان پەناکێو.

ألْعَطَ فلان: فلانکەس بەبناری کێوەکەدا ڕۆیی.

اللَّعْطُ: تاکی (الألْعَاط) کە بریتییە لەو هێڵانەی حەبەشەییەکان لەسەر روخساری خۆیان دروستی دەکەن.

اللُّعْطُ: شوێنی بناغەی خانوو یان بناری کێو ٥ دەگوترێ: (مَشَى في لُعْطِ الجبل) ٥ (ك: ألعاط).

اللَّعْطَاءُ: مەڕێك کە دەوران دەوری ملی ڕەش بێو باقی جەستەی سپی بێ.

**اللُّعْطَـةُ**: ڕەشـایی کـە سـوری تێکـەڵ بووبـێ ٥ دەگـوترێ: (بوَجْهِـهِ لَعُطَـة کلعطـة الـصقر) روخـساری ڕەشـی مەیلەو سوری پێوە یە وەکوو ئەو شـێوە ڕەش‌و سـورەی بەروخـساری بازەوەیە ٥ هەروا هێڵێکی رەش یان زەرد ئـافرەت لەرومـەتی خـۆی دروسـتی دەکـا بـۆ خۆرازاندنـەوە ٥ ڕەشـایيەکە بـەدەوران دەوری گەردنی مەڕەوەیە ٥ ملەوانکە.

**لَـــعْ**: وشـەیەکە ئاڕاسـتەی مرۆڤـی هەڵەنگوتو دەکرێ.

**اَلْعَـتِ الأَرضُ**: زەوییەکـە روەکـی هیندوبای رواند.

**تَلَقى العَسَلُ**: هەنگوینە کە پارچەیەکی لـێ هەڵدەبرێ لەبەر لینجییەکەی شـۆڕابەکەی درێـژ دەبێتـەوەو لێـك نابێتەوە ٥ (تَلَقى اللُّعَاعَ): هیندوبای خوارد.

**اللُّعَاعَةُ**: تاکی (اللّعَاع)ە ٥ لەحەدیس دا هـاتووە (إنما الـدنیا سـاعة، ومتاعها لعاعـة): دونیـا سـاتێکەو کاڵاکـانی تەمـەن کـورتن‌و وەکـوو روەکـی هینـدوبا وایـە ٥ بـەرماوەی کـەم لەهەرشتێك بـێ ٥ دەگـوترێ: (بقي في الإناء لعاعـة): بەرماوەیـەکی کـەم لەقاپەکەدا ماوە ٥ قومە ئاو.

**اللُّعَاعَـةُ**: کەسێك بەنـەزانی لـەحن دا دادەنــێ بــۆ گــۆرانی ٥ دەگــوترێ: (مُطْرِبُ لُعَّاعة).

**اللّعَّةُ**: ئافرەتی خان‌و مانی داوێنپاکی ناسـك‌و جـوان‌و قـسە خـۆش ٥ ئافرەتی رۆح سوك.

**لَعِـقَ العَسَلَ ونحـوه لَعْقـاً**: هەنگوینەکـەی لـستەوە، خـواردی، بـەزمانی یـان بەقامکی دەستی لستیەوە ٥ (فهو لاعِقٌ) ٥ (لعقة الدم):چەند هۆزێکی عەرەبن پێك هاتوون لە (بني مخزوم، وعدی وسَهم وجمح) ٥ ئەمانـە حوشترێکیان سەربڕی‌و سوێند یان بۆیەکتر خواردو خوێنەکەیەان لـستەوە یـان دەسـتیان خـستە نـاو خوێنەکـەوە ٥ بۆیـە ئـەم ناوەیان لـێ نـراوە ٥ دەشگوترێ: (لِعِقَ فلان أصبَعه): فلانکەس قامکی خۆی لستەوە ٥ (واتە مرد).

**لَعْـوق في عملـه**: لەکارەکەی دا پەلـەی کردو کورج‌و گۆڵ بوو.

**اَلْعَقَــه العَــسَلَ**: وای لــێ کــرد هەنگوینەکە بلێسێتەوە.

**العقَ النَّسَّاجُ**: جۆلاکە ریسەکەی خاو ڕست زۆری گشت نەڕست.

**لَعَّقَهُ العَسَلَ**: بەمانا (اَلْعَقَهُ)دێ.

**التَعِقَ لَوْنُهُ**: ڕەنگی گۆڕا.

**اللُّعَـاقُ**: پاشمـاوەی خـواردن لـەدەمی

خۆراك خۆرەكەدا ◦ دەگوترێ: (مالي فيَّ لعاق من طعامك ومن فضلك).

**اللَّعْقَةُ:** دەگوترێ: (في الأرض لعقة من ربيع): لەزەوی دا كەمێك تەڕايی هەيە ◦ هەروا دەگوترێ: (رجل وعقة لَعْقة) پياوێكی ڕەوشت بەدو خوێرپيیە.

**اللُّعْقَةُ:** شتی كەم بەئەندازەی پێوانەی كەوچكێك يان لويچێك.

**اللَّعْوَقُ:** مرۆڤی كەم عەقڵ، عەقڵ سوك.

**اللَّعُوقُ:** هەرشتێك هەڵقوڕێندرێ، بخورێتەوە بەكەوچك وەكوو دەرمانو هەنگوينو شتی وا تێشوی كەم ◦ دەگوترێ: (ما معنا الالعوق): شتێكی كەم نەبێ لەتێشو پێمان نييە.

**المِلْعَقَةُ:** ئامێرێكە خواردنی پێ دەكرێتە ناو دەم (كەوچك).

**لَعَلَّ:** پيتێكە لەو پيتانەی پێيان دەگوترێ (حرف مشبه بالفعل) بۆ ڕەجاو تەمەنناو مانای تريش دێ.

**لَعْلَعَ السَّرابُ:** تراويلكەكە درەوشايەوە، بريسكەی دا.

**لَعْلَعَ الرعد:** هەور گۆڵاندی، گرماندی.

**لَعْلَعَ فلان من كل شيئ:** فلانكەس لەهەمووشتێك دەرەنجێ ◦ لەهەموو شتێك تورە دەبێ.

**لَعْلَعَ العَظْمَ:** ئێسقانەكەی شكاند.

**تَلَعْلَعَ من الجوع:** لەبرسان سكی قوڕە قوڕی دێ، هاواری لێ هەڵساو دەستی كرد بەپاڕانەوە ◦ هەروا دەگوترێ: (تَلَعْلَعَ فلان): فلانكەس بەهۆی نەخۆشی يان ماندوبونەوە كزو لاواز بوو.

**تَلَعْلَعَ في كلأ ضعيف:** حوشترەكە لەلەوەڕگای كەم لەوەڕدا سەرە خولەی بوو، دەهاتو دەچوو بۆئەوەی شتێكی دەست بكەوێ.

**تَلَعْلَعَ السرابُ:** تراويلكەكە درەوشايەوە.

**تَلَعْلَعَ الكَلْبُ:** سەگەكە لەتينوان زمانی دەركێشا.

**تَلَعْلَعَ العسلُ:** هەنگوينەكە بەهۆی لينجييەوە كەپارچەيەكی لێ هەڵگرت درێژ بۆوەو لێك نەپچڕا.

**اللَّعْلاَعُ:** ترسنۆك.

**اللُّعْلُعُ:** تراويلكە ◦ گورگ ◦ درەختێكی وڵاتی حيجازە.

**اللَّعْلَعَةُ من السراب:** بريسكەی تراويلكە.

**لَعَمَظَ اللَّحْمَ لَعْمَظَةً ولِعْماظاً:** گۆشتەكەی لەئێسقانەكە بەددانی پێشەوەی پچڕی.

**لَعْمَظَ فـلان:** فلآنكەس چلێس‌و خۆرا بوو.

**اللَّعْمَاظُ:** کەسێك هەوالّی بۆ بناغەو ناڕاستت پیّ بلّیّ.

**اللَّعْمَظُ:** چلێس‌و بەهەڵپە بۆ خواردن ٥ (ك: لَعامِظَ).

**اللُّعْموظ واللُّعْموظة:** بەمانا (اللّعمظ)دیّ ٥ کەسێك بەنانەسکی کار بۆیەکێکی تر بکا ٥ (ك: لعاميظ).

**لَعَنَـه الله:** خـودا لەڕەحمـەتی خـۆی نائومێـدی کـرد، دووری خـستەوە لەڕەحمەتی خۆی ٥ (فهو ملعـون) ٥ (ك: ملاعين).

**لَعَنَ فلاناً:** فلآنکەسی ڕیسوا کرد، جوێنی پێدا ٥ (فهو لاعن ولعّان).

**لاعَـنَ الرجـل زوجتـه ملاعنـة ولعانـاً:** پیاوەکـــــە خـــــۆی لەســـــزای بۆختانکردنی بەژنەکەی ڕزگار کـرد بەهۆی لیعانەوە.

**لاعَـنَ الحـاكم بينهمـا:** دادوەر بڕیـاری لیعانی دا لەنێوان ژن‌و مێردەکەدا.

**لَعَّنَـهُ:** زۆری لەعنـەت لـیّ کـرد زۆری جوێن پێدان‌و ڕیسوای کرد.

**إلْـتَعَنَ القـومُ:** خەلّکەکـە هەنـدێکیان لەعنەتیان لەهەندێکیان کرد.

**إلْـتَعَنَ فـلان:** فلآنکـەس لەعنــەتی لەخۆی کرد.

**تلاعنــا:** دو مرۆڤەکـە هەریەکـەیان لەعنەتی لەوی تریان کرد.

**تلاعن القومُ:** خەلّکەکە تفو لەعنـەتی یـەکتریان کـردو جنێویـان بەیـەکتر دا.

**تلاعن الزوجان:** ژن‌و مێردەکە بەشێوە لیعـــان ڕاســـتی داوای خۆیـــان چەسـپاندو داوای ئـەوی تـری ڕەت کـردەوە ٥ دەگـوترێ: (فـلان یـتلاعن علينا): فلآنکەس بەناڕەوا جنێومـان پێـدەداو هێرشــی خــراپ دەکاتــە سەرمان.

**تَلَعَّنَ القَـوْمُ:** خەلّکەکـە یـەکتریان تـفو لەعنەت کرد.

**اللاّعِن:** دەگـوترێ: (أمر لاعِـن): ئەمـە کارێکە نەفرین ئامێزە دەبێتە هۆی نــەفرین کـــردن ٥ لەحـــەدیـــث دا هاتووە دەفەرموێ: (إتقوا اللاعـنين): خۆ بپارێزن لەو دووشتەی کەدەبنە هــۆی نــەفرینی خـــەلّك ئــەویش پیـسایی کردنــە لەســەر ڕێگـا یـان لـەژێر سێبەری درەختـی وەهـا کـە خەلّك لەژێریا پشودەدەن.

**اللِعَان:** لەشەریعەتی ئیسلام دا ئەوەیە مێـرد چـوار جـار سـوێند بخـوا کـە ڕاسـتگۆیە لـەوەدا کـەدەلّیّ ژنەکـەم داوێن پیـسی کـردوەو خیانـەتی لـیّ کردووە جاری پێنجەم بلّیّ نەفرینی

خودا لەسەرم بێ ئەگەر درۆبکەم ئەمجا ژنەکە ڕەدی بداتەوەو چوار جار سوێند بخوا کە مێردەکەی بوختانی بۆدەکاو راست ناکا لەداواکەی دا جاری پێنجەم بڵێ نەفرینی خودام لەسەر بێ ئەگەر مێردەکەم راست بکا، بەمەش ژنەکە سزای داوێن پیسی لەسەر لادەدرێو بۆ هەتا هەتایە ئەم ژنو مێردە لەیەکتر حەرام دەبنو بەهیچ شێوەیەك ناگرێنەوە بەهاوسەری یەکتری.

**اللَّعْنُ**: (أبيت اللَّعنَ): وشەیەکە کاتی خۆی عەرەب بۆ سڵاو کردن لەپاشاو سەرەك خێڵەکانیان بەکاریان هێناوە.

**اللَّعْنَةُ**: بەمانا سزا دێ ◦ دەگوترێ: (أصابته لعنة من السماء): سزای ئاسمان لێی دا ◦ (ك: لِعان ولَعَنَات).

**اللُّعْنَةُ**: کەسێك ئەوەندە خراپو شەڕانی بێ خەڵك تفو لەعنەتی بکا ◦ کەسێك زۆر لەعنەتو نەفرین لەخەڵك بکا.

**اللَّعِينُ**: شەیتان، نەفرین لێکراو ◦ داوەڵ؛ کەلەناو باخو کشتوکاڵ دا لەسەر شێوەی ئادەمیزاد هەڵدەواسرێ بۆ ترساندنو ڕەوینەوەی درەندە لەوباخو زەوییانە بەزۆری پاڵتۆیەکی درێژ دارێکی تێدەخرێ بۆئەوەی باڵەکانی بکرێنەوە ◦ پێشی دەگوترێ: (الفَزّاعَة) ◦ هەروا ناوە بۆ گورگ.

**المَلْعَنَة**: کارێك ببێتە هۆکاری نەفرین کردن لەبکەرەکەی ◦ لەحەدیث دا هاتووە دەفەرموێ: (إتقوا الملاعن الثلاث، التغوط على قارعة الطريق، أوفي ظل الشجرة أو جانب النهر).

**الْعَى ثدي الأنثى**: مەمکی مێینەکە گۆڕانی بەسەردا هات گەورە بوون شیریان تێدا پەیدابوو.

**الألْعَاءُ**: جومژگەی قامکەکان.

**اللاّعي**: ئەوکەسەی لەهەموو شتێك دەترسێ.

**اللاّعِيَة**: درەختۆکێکە لەبناری کێودا دەڕوێ گوڵێکی زەردی هەیە.

**اللَّعَا**: چڵێسو بەچەپو گوپ.

**لَعاً**: دەنگێکە ئاراستەی کەسێك دەکرێ کە هەڵەنگوتبێو توشی ئەدامەتیو ناخۆشی بوبێ، دوعاکردنە بۆی بۆ ئەوەی لەچورتمەکەی ڕزگاری ببی.

**اللَّعْوُ**: بەدڕەوشت ◦ چڵێسی بەچەپو گوپ.

**اللَّعْوَةُ**: سەگ، چڵێسو بەچەپو گوپ ◦ ڕەشایی دەورو بەری گۆی مەمکی ئافرەت.

لَعْوَة الجوع: برسيايەتی زۆر کوشندەو برست بڕ.
كَلْبَة لَعْوَة: سەگێکە شەڕ لەسەر لاك دەکا.
لَعْوَق: بڕوانە مادەی (لَعَقَ).
اللَّعْوَقُ: بڕوانە مادەی (لَعَقَ).
لَغَبَ فلان لَغباً ولغوباً: فلانکەس ماندوبوو ٥ (فهو لاغب).
لَغَبَ على القوم لَغْباً: خەڵکەکەی تێك بەردا وەزعی شێواندن.
لَغَبَ القومَ: قسەی ناڕاستی بۆ خەڵکەکە گێڕایەوە.
لَغِبَ لَغباً: ماندوو بوو.
ألْغَبَهُ: ماندوی کرد، دەگوترێ: (ألْغَبَ الدابة): وڵاخەکەی ماندو کرد ٥ (ألغَبه السَّيْرُ): ڕۆیشتن وڵاخەکەی ماندو کرد.
لَغَّبَهُ السَّيْرُ: ڕۆیشتن ماندوی کرد ٥ دەگوترێ: (تَلغَّبَتْ بهم القفار وتَلَغَّبْتُهُم القفار).
لَغَّبَ الحيوانَ: ئاژەڵەکەی ڕەتاندو دوری خستەوە تا ماندوی کرد.
لَغَّبَ الأمْرَ: سەروکاری ئیشەکەی کردو باش نەنجامی دا لێی ماندو نەبوو لەبەرامبەری دا دەسەوەسان نەبوو.
اللَّغْبُ: قسەی پڕو پوچو بێ بنەما ٥ دەگوترێ: (أكفف عنّا لغبك): وازبێنە چیتر قسەی پڕو پوچی خۆتمان بۆمەکە ٥ هەروا ناوە بۆ گێلو نەفامی بێ دەسەڵات ٥ گۆشت لەنێوان ددان دا.
اللَّغُوبُ: مرۆڤی گێلو نەفامو بێ دەسەڵات.
لَغَدَهُ لَغْداً: زمانە بچکۆلەی هەنگاوت، بنکی زمانی پێکا.
لَغَدَ فلاناً عَنْ حاجته: فلانکەسی لەپێداویستییەکانی مەنع کردو نەیهێشت پێیان بگا.
لَغَدَ أُذُنَهُ: گوێچکەی ڕاکێشا بۆئەوەی ڕێك بن.
لاغَدَهُ: دەستی گرتو نەیهێشت بەئامانجی خۆی بگا.
إلْتَغَدَهُ: بەمانا (لاغَدَهُ)دێ.
تَلَغَّدَ فلان: فلانکەس رقی هەڵساو تەنگەتیزە بوو.
اللُّغْدُ: گۆشتوکەی نێوان مەلاشوو لامل ٥ (ك: ألغاد) ٥ دەگوترێ: (هو من الأوغاد ضخم الألغاد): ئەوبێ عەقڵەو لامل پانە.
اللُّغْدود: بەمانا (اللُّغْدُ)دێ.
اللُّغديد: بەمانا (اللُّغدود)دێ ٥ (ك: لغاديد).
لَغَزَ اليربوع أجْحارَهُ لغزاً: یەربوعەکە کونەکەی پێچاو پێچ هەڵکۆڵی

بۆئـــەوەی کەدەرپندەیـــەکی دژی خـــۆی هێرشی کردەسەر لەلانەکەی دا بتوانێ خۆی رزگار بکا.

**لَغَزَ الـشَّيْئَ:** شـتەکەی لەرِوخـساری خـۆی گـۆڕی‌و چەواشـەی کـرد ٥ دەگـوترێ: (لَغَزَ في كلامه).

**ألْغَزَ اليبوعُ أجحارَهُ:** بەمانا (لغزها)دێ.

**الْغَزَ كلامَهُ وفيه:** قسەکەی خۆی پێچاو پـێچ کـرد مەبەسـتەکەی خـۆی چەواشەکرد.

**ألغَزَ في يمينـه:** لەسوێند خواردنەکەی فێڵی کـرد، لەسـەر شـتێك سوێندی خواردو مەبەستی شتێکی تر بوو.

**لاغَـزَهُ:** قـسەی بـەتوێکڵ‌و موعـەممای لەگەڵ دا کرد.

**لَغَّـزَ کلامَـهُ:** بـەمانا (أغـزَهُ)دێ ٥ دەگوترێ: (لَغَّزَ في يمينه): لـە سوێند خواردنەکەی فێڵی لەکابرای سوێند بۆخوراو کرد.

**الألغُـوزَةُ:** مەتـەڵ‌و موعـەمما ٥ (ك: الاغيز).

**اللُّغْزُ:** کونە ژیشك، کونـە مـشك، کونـە یەربوع ٥ مەتـەڵ‌و قسەی موعەمما ٥ (ك: ألغاز).

**اللَّغّازُ:** ئەوکەسەیە بەخراپە لەخـەڵك دەدوێ‌و تانـەو تەشـەریان ناڕاسـتە دەکا.

**لَغْـوَسَ في الأكـل:** پەلـە پـەلی کـرد لەخواردن دا، هەڵپەی کرد.

**لَغْـوَسَ الطَّعـامُ:** خواردنەکـە کـاڵ‌و نەکوڵیو بوو پێنەگەیشتبوو.

**اللُّغْوَسُ:** کەسێکە خێرا نان بخوا پەلە پەل بکا لەخواردن دا ٥ کەسێك نـاز پـــەروەردەبێ‌و ژیـــانی خـــۆش‌و بەختـــەوەر بـــێ هـــەروەکوو گیـــاو گـــزێك کەناسـك بـێ‌و بەخۆشـی بخورێ.

**لَغَـطَ القَـومُ لَغْـطاً ولغاطـاً:** خەڵکەکـە کردیانە هات‌و هاوارو قیڕەو هەرا کەس لەقسەیان حاڵی نەدەبوو.

**لَغَطَ القطا أو الحمامُ لغيطاً:** کوڕ کوڕەکە (قەتێکە) یان کۆترەکە خوێندی (فهـو لاغِـط) ٥ دەگـوترێ: (أتيتـه قبـل لغـيظ القطا): هـاتم بـۆلای پـێش ئـەوەی کـوڕ کـوڕە بخوێنـێ (واتـە بـەیانی زوو) ٥ هـەروا دەگـوترێ: (أتيتـه قبـل القطـا اللاغظ).

**الْغَـطَ القومُ:** خەڵکەکە هـات‌و هـاوارو قیڕەو هەرایان کرد.

**الْغَـطَ القطـا أو الحمـام:** قەتێکـە یـان کۆترەکە خوێندی.

**لَغَّطَ القومُ:** خەڵکەکـە هـات‌و هاواریـان کرد کەس لێیان حاڵی نەبوو.

**اللَّغطُ:** دەنگە دەنگ‌و قیڕەو هەرا.

**لَغَفَ فلان لَغْفاً**: فلانكەس ستەمی كرد ٥ چاوی تێ بڕی ٥ دەگوترێ: ((لَغَفَ الأَسَدُ): شێرەكە بەدیقەت ڕوانی چاوی لە نێچیرەكە بڕی بۆئەوەی پەلاماری بدا.

**لَغَفَ الإناء**: قاپەكەی لستەوە.

**لَغِفَ ما في الإناء لَغْفاً**: ئەوەی لەقاپەكەدا بوو لستیەوە.

**لَغِفَ الطعامَ**: خواردنەكەی خێرا خێرا خوارد.

**الغَفَ فلان**: بەمانا (لَغَفَ فلان)دێ.

**الْغَفَ في السَّيرِ**: لەڕۆیشتن دا پەلەی كرد ٥ بوو بە شەریكە دز.

**الْغَفَ بعینه**: چاوی تێ بڕی.

**الْغَفَ علی الرجل**: زۆری قسەی ناشیرین بەپیاوەكە گوت.

**الْغَفَ الصَّبِيُّ لُقْمَةً**: پارویەكی خستە دەمی منداڵەكەوە.

**لاغَفَهُ**: هاوڕێیەتی ئەوی كرد.

**لاغَفَ المرأة**: ئافرەتەكەی ماچ كرد.

**تَلَغَّفَ الطعامَ**: بەچنگ خواردنی كردە دەمیەوە.

**اللُّغْفَةُ**: پارو ٥ دەگوترێ: (اُلْغِفْني لُغْفَةً).

**اللَّغیفُ**: تایبەتمەندیی پیاوو دەستو پێوەندەكانی ٥ كەسێك دۆستایەتی لەگەڵ دزو جەردە بكاو نانو ئاویان لەگەڵ بخوا وەلێ دزیو جەردەییان لەگەڵ نەكا ٥ كەسێك لەنوسراوی خەڵك شت ڕاگوێزبكاو ئاماژە بەسەر چاوەكەی نەكا.

**اللَّغیفَةُ**: پەلو، حەلوا، ئاردو ڕۆن تێكەڵ بەیەك بكرێو بكوڵێندرێ.

**المُلْغَفَةُ**: هۆزو بنەماڵەیەك دابو نەریتی دزییان تێدا باو بێ.

**لَغْلَغَ طعامَهُ**: خواردنەكەی كردە خواردنی بەپێخۆر ٥ نانی بەڕۆنو پیوو شتی وا خوارد دەگوترێ: (لَغْلَغَ ثریده): تێكوشاوەكەی چەور كرد، ڕۆنو بەزی تواوەی تێكەڵ كرد.

**اللَّغْلَغَةُ**: ئاخاوتنی ناعەرەبێ قسەو ئاخاوتنێك بەزوبانی عەرەبی نەبێ.

**لَغَمَ فلان لَغْماً**: هەواڵی ناڕاستی دا بە هەڤاڵەكەی ٥ لەسەر چاوەی دڵنیاییەوە هەواڵی بەهەڤاڵەكەی نەدا ٥ قسەی تەمو مژاوی كردن.

**لَغَمَ المرأة**: دەمی ئافرەتەكەی ماچ كرد، دەورو بەری دەمی ماچ كرد.

**لَغَمَ الجملُ لُغامَهُ**: حوشترەكە كەفی چاند.

**لَغَمَ فلان لَغْماً**: هەواڵی لەشتێك دا كەلێی دڵنیا نەبوو ٥ هەواڵی لەشتی نادیارو نامەعلوم دا.

**لُغِمَ بالطیب**: بۆنی خۆشی لەدەمو لێوی دا.

**الْغَمَ الذهبَ وما شابَهه**: جیوەو شتی وای تێكەڵ بەئاڵتونەكە كرد.

**لَغَّمَهُ بالطيب ونحوه:** بۆنی خۆشی لەدەمو لوتی دا.

**لَغَّمَ المكانَ:** شوێنەکەی مین ڕێژ کرد.

**إلْتَغَمَ الذهَبَ ونحوه:** زێڕەکەی تێکەڵ بەئاڵتون کرد.

**تَلَغَّمَ القوم بالكلام:** خەڵکەکە کەوتنە قسەو باس‌و دەم بادان.

**اللُّغام:** کەفی دەمی حوشتر.

**اللُّغْمُ:** بۆنی کەم، بۆنی خۆشی کەم‌و کوڕ ٥ قەصەبەی زوبان ٥ دەماری زوبان ٥ لەرزینی بەتەوژم ٥ شتێکە وەکوو صندوق وایە مادەی تەقینەوەی تێدەکرێ‌و ژێرخاك دەکرێ بۆئەوەی کەسێك بەسەریدا بڕوا بتەقێتەوە ٥ (ك: أَلْغام).

**اللَّغيمُ:** نهێنی.

**المَلْغَمُ:** دەم‌و لوت‌و دەوروبەری ٥ (ك: ملاغم).

**إلْغانَّ النَّبْتُ:** ڕوەکەکە درێژ بوو تێکهالا.

**الغانَّت الأرض:** زەوی لەوەڕی زۆر بوو.

**اللَّغَنُ:** هەڕەتی گەنجی.

**اللُّغْنُ:** لایەکی ئاڵو کەبەسەر گەرودا دەڕوانێ.

**اللُّغْنُونُ:** بەمانا (اللُّغْنُ)دێ ٥ کۆتایی لوت نزیك مەلاشو.

**لَغَا في القول لَغْواً:** لەقسەکردن دا هەڵەی کرد ٥ قسەی پڕو پوچی گوتن ٥ دەگوترێ: (لغا فلان لغواً) فلانکەس قسەی پڕو پوچی کردن ٥ (لغا بكذا): ئەو قسەیەی کرد.

**لغا عَنْ الصواب:** لەڕێگای ڕاست لای دا.

**لغا عَنْ الطريق:** لەڕێگە لای دا.

**لَغَا الشَّيْئ:** شتەکە پوچ بوو.

**لَغِيَ في القولِ لغاً:** بەمانا (لغا)دێ.

**لَغِيَ بالأمر:** حەزی لەئیشەکە بوو.

**لِغِيَ بالشَّيْئ:** وەگری شتەکە بوو پێوە لکاو وازی لێنەهێنا لێی جیانەبووەوە.

**لِغِيَ بالماء والشراب:** زۆری خواردو خواردەوە تینوایەتی نەشکا، تێراو نەبوو.

**لِغِيَ الطائر بصوته:** باڵندەکە خوێندی.

**ألغى الشَّيْئ:** شتەکەی پوچ کردەوە ٥ دەگوترێ: (ألغى القانون).

**الإلغاء في النحو:** ئەوەیە عەمەلی عامیل لەئەفعال القلوب دا پوچ بکەیەوە دو مەفعولەکانی مەنصوب نەکرێن، بۆ نمونە لەجیاتی ئەوەی بڵێی (علمت العلمَ نافعاً) بڵێی (العِلْمُ نافع علمت).

**اللاَّغِيَّة:** شتێك گرنگی پێ نەدرێ‌و سودی لێ نەبیندرێ ٥ (كلمة لاغية): قسەی پڕو پوچ ٥ (ك: اللواغي).

**اللَّغا:** شتێك کە ئیعتباری پێ نەکرێ ٥ گرنگی پێ نەدرێ ٥ شتێك لەبەر

بێ ئەهمیەتی حیسابی بۆنەکرێ ٥ کالای بێ نرخ ٥ دەنگ.

**اللُّغـــة**: زمـــانو زاراوە کـــە گـــەلو نەتەوەیەك مەبەستەکانی خۆی پێ دەردەبـڕێ ٥ (ك: لُغـىً ولغـات) ٥ دەگـوترێ: (سمعـتُ لغـاتهم): گـوێم لـەجوداوازی زمـانو گفـتو گۆیـان بوو.

**اللّغـو**: قسەیەك بـڕوای پـێ نـەکرێ، سودو قازانجی تێدا نـەبێ، وشەیەك بـێ مەبەسـت بگـوترێو لـەدەم دەرچـێ ٥ (لَغـوُ الـیمین): سـوێندی دانەمـەزراو بـێ مەبەسـت گـوتراو وەکـوو ئـەو سـوێندانەی کـابرا دەیخاتـە نـاو قـسەو گفتوگۆیـەوە وەکوو (ناوەڵلا ئـەرێ وەڵلا) ٥ شتی بێنرخو فڕێدراو.

**لَغوَسَ**: بڕوانە (لَغَسَ).

**لَفَأَ العـودَ لَفْـئاً ولَفـاءً**: شـوڕکەکەی سپی کرد ٥ دەگـوترێ: (لَفَأَ العَظـمَ): هەنـدێ گۆشتی لەئێسقانەکە داماڵی.

**لَفَأَ اللّحمَ عَنْ العظم**: گۆشتی لەئێسقانەکە داماڵی.

**لَفَأَت الریحُ السحاب عَنْ وجـه الـسماء**: ڕەشـەبا هـەوری بـە ئاسمانـەوە نەهێـشت هـەمووی ڕامـاڵی دەشگـوترێ: (لَفَأَت الریحُ التراب عَنْ وجـه الأرض): ڕەشـەبا تـەپو تـۆزی لەسەر زەوی ڕاماڵی.

**لَفَأَ فلاناً**: غەیبەتی فلانکەسی کرد ٥ هیچ ڕێـزو نرخێکـی پێـوە نەهێـشت، فلانکەسی لەویستی خۆی لاداو ژیوانی کردەوە.

**لَفَأَ فلاناً حقه**: مافی فلانکەسی دا، هەموو مافو بەشی خۆی پێدا ٥ لـەمافی کـەم کردەوە هەمووی نەدایە.

**لَفَأَ فلاناً بالعـصا**: بەگۆچـان لەفلانکەسـی دا.

**لَفِئَ الشَّیْئُ لَفَأً**: شتەکە مایەوە.

**ألفأ الشّیْئ**: شتەکەی هێشتەوە.

**إلتَفَأَ العودَ**: شوڕکە دارەکەی سپی کرد توێکڵەکەی لـێ داماڵی.

**اللّفـــاءُ**: شـتی کـەم ٥ ئەوەیـە کـەمتر لەمافی خۆی.

**اللَّفْأَةُ**: پارچە گۆشت ٥ کوتە گۆشت.

**اللّفیئة**: نەرمە گۆشت بـەبێ ئێـسقان ٥ (ك: لفایا).

**لَفَـــتَ الـــشّیْئ لَفْتـــاً**: شـتەکەی لـول دا بەڕاسـتو چـەپ دا بـای دا بـەم لاو بـەولای دادا ٥ دەگـوترێ: (أخـذ بعنقـه فلفَتَهُ): ملی گرتو بای دا.

**لفت فلاناً عَنْ الشَّیْئ**: فلانکەسی لەشتەکە لادا.

**لفـــت رداءهُ عُنُقَـــه**: چـاكى عەباكـەى هەڵدايەو بۆسەر شانو ملى.

**لَفَتَ الكـلامَ**: قسەكەى لـەزمانى عـەرەبى لادا بۆسەر زمانى ناعەرەبى.

**لَفَتَ الشَّيْئَ**: شتەكەى تێـك هەڵدا وەكوو چـۆن ئـاردو ڕۆن تێـك هەڵـدەدرێ ٥ دەگـوترێ: (لَفَـتَ الـدقيق بالـسمن): ئاردى تێكەڵاوى ڕۆن كرد.

**لَفَـتَ الراعـي الماشـية**: شوانەكە كوێرانـە لەئاژەڵەكانى داو لێدانەكـەى ئاڕاسـتەى ئاژەڵێكى تايبـەتى نـەكرد ٥ زەبرەكـەى هاويـشت بـۆ هـەموانيانو مەبەسـتى نەبوو ڕێى كامەيان دەكەوێ.

**لَفَتَ الريش على السهم**: پەڕەكەى كێـزرى لەتێرەكە شەتەك دا.

**لَفَـتَ الكـلامَ**: قسەى فـرێ داو مەبەسـتى نەبوو كێ دەگرێتەوە كێ پێى خۆشـەو كێ پێى ناخۆشە.

**لَفَـتَ اللحـاءَ عَـنْ العـود**: توێكڵەكـەى لەشوڕكە كردەوە.

**لَفَتَ الشَّيْئَ**: شتەكەى فرێ دايە تەنيشتى خۆى.

**لَفَـتَ فلانـاً بالـشَّيْ**: شـتەكەى رادەسـتى فلان كرد.

**لِفِتَ الرجلُ**: پياوەكە گێلو نەحـمـەق بـوو ٥ بەدەسـتى چـەپى كـارى كـرد نـەك بەدەسـتى راسـتى ٥ پياوەكـە دەسـتو مەچـەكى بـەهێزو پتـەو بـون دەسـتى بگاتـە هەرشـتێك بـاى دەداو خـوارى دەكاتەوە.

**لَفِتَ التيسُ**: نێريـە فەرەكـە شاخەكانى خوارو خـێچ بـون ٥ (فهـو ألفـت وهـي لفناء).

**لَفَّتَ الشَّيْئَ**: شـتەكەى خـوار كـردەوە ٥ باى دا.

**إلْتَفَتَ الى الشَّيْئ**: ڕوى وەرگێڕا بۆلاى شتەكە ٥ دەشـگوترێ: (إلْتَفت بوجهه عنـه أو يـسره): ڕوى خـۆى وەرگێـڕا بەلاى راست دا يان بەلاى چەپ دا.

**إلتَفت عنه**: ڕوى لـێ وەرگێڕا.

**تَلَفَّتَ الى الشَّيْئ**: بەمانا (إلتفت)دێ.

**اللاّفِتة**: دروشم، لەوحەيەكە لەدار يـان شـتى تـر يـان پارچـە قوماشـێكە ناوێـك يـان هەڵوێـستێكى لەسـەر دەنووسـرێ بۆئـەوەى سـەرنجى لـێ بدرێ ٥ (ك: لوافت).

**اللّفْتُ**: ڕوەكێكى كشتوكاڵييە، بـەكاڵىو بـــەكوڵاوى دەخـــورێ ٥ قـــەراخو تەنيـشتى شـت ٥ دەگـوترێ: (ولا تلفـت لِفْـتَ فـلان): مەڕوانـە بـۆ دەوروبـەرى فـلان ٥ هـەروا وشـەى (اللّفـت): نـاوە بـۆ ئـافرەتى گێـل ٥ بۆمانگا.

**اللّفـوت مـن النـساء**: ئافرەتێـك زۆر بەملاو بـەولادا بڕوانـێ ٥ ئافرەتێـك مێـردى هـەبێو لـەمێردێكى تـرى

منـــــدالّی هـــــەبن بـــــەهۆی پـــــەروەردەکردنی منداڵـــــەکانی نەیپەرژێتـە سـەر ئیشی ناومـاڵو دابینکردنی پێداویستی مێردەکەی ٥ ئافرەتێـك چـاو بـەدەروەبیّو چاوەڕوانی نـەوەبیّ مێردەکەی لێی بیّ ئاگابیّو چـاو بڕکیّو دڵـداری لەگـەڵ پیـاوی تـر بکـا ٥ ئـافرەتی فیتنـــەو دوزمـــان ٥ حوشـــتری چەموشو شیر نەدەرو گازگر لەشیر دۆشەکەی.

**اللِّفيتة:** پەلّوی توند.

**المُتَلَفِّتَةُ:** ئێسقانی لای ژوروی ئەستۆ کە نووساوە بەسەرەوە.

**الفَـجَ فـلان:** فلاّنکـەس بەزموییـەوە نووسـاو لـەجێگادا کـەوت توانـای هەڵـسانی نییـە ٥ ئیفلاسـی کـردو ماڵو سامانی نەما.

**الفَجَ فلاناً:** وای لەفلاّنکەس پەنابەری بۆداواکردن لەکەسێك کەشیاوی شت لــێ داواکــردن نییــە ٥ دەگــوترێ: (أُلْفجي الى ذلك الإضطرار): ناچاری وای لـێ کردم پەنا بۆئەوە بەرم.

**اسْـتَلْفَجَ فـلان:** بـەمانا (أَلْفـجَ)دێ ٥ فلاّنکـەس لەترسـا بـێ هـۆش بـوو ئاگای لەخۆنەما.

**اللَّفْجُ:** زەلیلیو گەردنکەچی.

**اللُّفْجُ:** ڕێڕەوی لافاو.

**لَفَحته النار أو السمومُ لَفْحاً ولَفَحاناً:** ئاگر یان بای سەموم لـەدەمو چـاوی داو سوتاندی ٥ هەڵیقرچاند.

**لَفَـحَ فلانـاً بالـسيف لَفْحـاً:** بەهێواشـی شمشێری لـێ دا.

**اللَّفْحُ:** گەرما.

**اللُّفَّاحُ:** ڕوەکێکی بەتەمەنە ژەهراوییـە پزیشکی یە لەپێڕی (الباذنجانيـة)یە، پێشی دەگوترێ: (الـبيروج) لـەزەوی دێمی ولاّتی شام دەڕوێ.

**لَفَخَـهُ علـى رأسـه لَفْخـاً:** بەگۆچـان لەسـەری دا ٥ دەگـوترێ: (لَفَخَـهُ في رأسـه): لەسـەری دا ٥ چـەپەوانەی لەدەمی دا.

**لَفَـخَ الـبعيرَ:** بەپاژنـە پێـی لـەدواوەی حوشترەکەیەوە ژەنیو هەلینگی دا.

**لَفَظَ بالكلام لَفْظاً:** ئاخاوتنی کرد ٥ (لفـظ بالشَّيء): شتەکەی گوت.

**لَفَظَ الرجلُ:** پیاوەکە مرد.

**لَفَظَ الشَّيءَ من فيه وبه:** شتەکەی فڕێ دا ٥ (فهو لافظ، وهي لافظـة) ٥ دەگـوترێ: (لفظـــت الـــبلادُ أهلَهـــا): ولاّتەکـــە خەڵکەکـەی وەدەرنـا ٥ (لفظـت الحيـةُ سمها): مارەکـە ژەهـری خـۆی ڕشـت ٥ (لفـظ البحـرُ الـشَّيءَ): دەریـا شـتەکەی فڕێ دایە کەناری.

**تَلَفَّظَ بالكلام:** قسەی کرد.

**التَّلَفُظُ:** ئاخاوتن ٥ چەند شەپۆلێکی هەوایە سەرچاوەکەی گەروە بەشەکانی ناودەمو قورگ ئەو هەوایە دەگۆڕنو دەیکەنە دەنگ لەقەبارەی پیتو وشەدا.

**اللاّفِظَةُ:** دەریا ٥ ئەو باڵندانەی بێچووەکانیان بەخێو دەکەن خواردنیان دەکەنە ناو دەندوکیانەوە لەچیکڵدانەی خۆیانەوە خواردن دێننە دەرەوە بۆ بێچووەکانیان ٥ هەروا ناوە بۆ ئاشی ئاو لەم ڕووەوە هەرچی دەیهاڕێ فڕێی دەداتە دەر ٥ کەڵەشێر لەم ڕووەوە کەبە دەندوکی دانەوێڵەکە هەڵدەگرێ بەڵام نایخوا بەڵکوو دەیهاوێ بۆ مریشکەکە ٥ هەروا ناوە بۆ جیهان ٥ لەم ڕووەوە کەچی تێدایە دەینێرێ بۆ قیامەت.

**اللُّفاظُ:** ئەوەی تف بدرێتەوە.

**اللُّفاظَةُ:** بەمانا (اللُّفَاظُ)دێ ٥ باقی ماندەی شت، بنکڕ.

**اللَّفْظُ:** بەمانا (اللَّفاظ)دێ ٥ قسەی گوتراو، ئەو وتانەی لەدەم دێنە دەر.

**اللَّفيظ:** بەمانا (اللُّفاظ)دێ.

**المَلْفَظُ:** ئەو قسانەی لەدەم دێنە دەر ٥ (ك: مَلافِظ).

**لَفَغَ الشَيْبُ رأسَهُ:** پیری هەموو قژی سەری گرتەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (لَفَغَ الشَيْبُ لِحْيَتَه).

**لَفَغَت النارُ فلاناً:** ئاگر هەموو جەستەی فلانی داگرت.

**لَفَّعَ الشَّيْبُ رأسَهُ:** پیری هەموو سەری گرتەوە.

**لَفَّعَ رأسَهُ:** سەری داپۆشی.

**لَفَّعَ المرأةَ:** ئافرەتەکەی بەخۆوە گوشی.

**التَفَعَ بالثوب:** جەستەی خۆی بەقوماش داپۆشی.

**التَفَعَت الأرض:** زەوییەکە سەوزاییو ڕووەکی خشت بوو ٥ دەشگوترێ: (التفعت الأرضُ بالنبات): زەوی بەگیاو گژ خۆی داپۆشی.

**تَلَفَّعَ فلان:** فلانکەس پیری هەموو جەستەی گرتەوە موی سەرو ڕیشی هەمووی سپی بوو.

**تلفَّعَ بالثوب:** بەقوماش خۆی داپۆشی ٥ هەروا دەگوترێ: (تَلَفَّعَت المرأةُ بمرطها): ئافرەتەکە بەچارەکەکەی بەدەسماڵەکەی خۆی داپۆشی ٥ (تَلَفَّعَ الشجر بالورق): درەختەکە بەگەڵا خۆی داپۆشی.

**تَلَفَّعت الحربُ بالشّر:** شەڕ هەموو ناخۆشیو کارەساتەکانی گرتنەوە هەمووی تێدابوون ٥ دەشگوترێ:

(تَلَفَّعنا على جيش العدو): دەوران دەوری سوپای دوژمنمان دا.

**تَلَفَّعَت النار**: ئاگرەکە بلێسەی دا، هەڵگیرسا.

**اللِّفَاعُ**: ئەوەی جەستە دادەپۆشیٚ‌و دەکرێتە پۆشاکی.

**اللِّفَاعَةُ**: فەقیانەی کراس یان هەر پارچە قوماشێك کە بەزێدە بەکراسەوە بلکێندریٚ.

**اللِّفيعَة**: بەمانا (اللِّفاعَةُ)دیٚ.

**المِلْفَعَةُ**: هەر پۆشاکێك سەرانسەر جەستە داپۆشیٚ.

**لفّتِ الأشجار لَفّاً**: درەختەکان تێکچرژان‌و پەل‌و پۆیان چوو بەناو یەك دا.

**لَفّت في الأكل**: زۆر جۆر خواردنی تێکەڵاو بەیەك کردن‌و ئامادەی کردن بۆخواردن.

**لَفّتَ الشيْئَ بالشيْئِ**: شتەکەی خستە پەنایەك‌و پێکەوەی لکاندن ٥ شتەکانی خستنە پەنایەك‌و کۆی کردنەوە.

**لَفّتَ الميتَ في أكفانه**: کردوەکەی خستە ناو کفنەکانیەوە.

**لَفّتَ الكتيبتين**: دوکەتیبە سەربازەکەی لەشەڕدا ٥ تێکەڵ بەیەك کردن ٥ دەشگوترێ: (لَفّ الكتيبة بالأخرى).

**لَفّ فلاناً حَقّه**: فلانکەسی لەمافی خۆی مەنع کرد.

**لَفّ فلان لَفَفاً**: فلانکەس تەمبەڵ‌و قونگران بوو ٥ لاڵ بوو زمانی گیراو بەتەمبەڵی قسەی بۆکران .فلانکەس کەقسە دەکا زوبانی دەمی پڕدەکا بروکانی وێك دێنێتەوە.

**لَفّ في الأكل**: خواردنی جۆراو جۆری زۆری تێکەڵ بەیەك کردن‌و زۆری خوارد.

**لَفّ فلان**: فلانکەس شادەماری دەست‌و مەچەکی خواربوو، دەستی لەکار کەوت ٥ فلانکەس لەبەر قەڵەوی هەردو ڕانی لێك نزیك بوونەوە (ئەم حاڵەتە بۆ پیاو بەعەیب دادەنرێ بەلام بۆئافرەت پەسەندە) ٥ (فهو ألفّ وهي لَفّاء).

**لَفّ الشَجَرُ لَفّاً**: درەختەکە تێك چرژاو پڕو چڕبوو.

**الفّ فلان رأسه**: فلانکەس سەری خۆی خستە ژێر پۆشاکەوە.

**ألَفّ الطائِرُ رأسَه**: باڵندەکە سەری خۆی خستە ژێر باڵیەوە.

**لأفّ القومُ القومَ**: خەڵکەکە تێکەڵاوی قەومی تربوون.

**لافّ الصَّقْرُ الصيدَ**: هەڵۆکە دەورەی نێچیرەکەی داو خستیە ژێر چنگی

خۆیەوە ٥ دەشگوترێ: (لافَ الطیارُ طائرة عدوّه): تەیارە چیەکە تەیارەی دوژمنی خستە خوار خۆیەوەو وای لێ کرد بتوانێ قەزفی بکا.

**لَفّفَهُ:** بۆ زێدە ڕۆیی لەماناى (لَفّه)دێ.

**إلْتَفَّ الشَّيْئُ:** شتەکە کۆبۆوەو چووە ناویەکەوە ٥ دەگوترێ: (إلْتف الشجر بالمکان): درەختەکان لەوشوێنە زۆر بونو شوێنەکە یان تەنگەبەر کرد.

**إلتفَّ بثوبه:** پۆشاکەکەی لەبەر خۆ کردو خۆی پێ داپۆشی.

**اِلْتَفَّ عَلَيْهِ السَّلاَمْ القومُ:** خەلکەکە لەسەری خڕبوونەوە.

**اِلْتَفَّ الغلامُ:** کوڕەکە ریشی پڕ بووە.

**تلاَفّوا:** تێکەلاو بوون، دەگوترێ: (ماتصافّوا حتى تلافّوا): ریزنەبوون تاتێکەلاو بن.

**تَلَفَّفَ في ثوبه:** کراسەکەی لەبەرکرد لەخۆیەوە پێچا.

**تَلَفَّفَ القوم عَلَيْهِ السَّلاَمْ:** خەلکەکە لێی کۆبوونەوە.

**الإلتفاف:** (الإلتفاف الزهري): لەبواری زانستی ئیحیادا ناوە بۆ حالەتو چۆنیەتی پەڕە گولەکان لەناو خونچەکەیان دا پێش پشکوتن.

**الألَفُّ:** دەمارێکە لەمەچەکی دەست دایە ٥ هەروا ناوە بۆ شوێنێك کە زۆر ئاوەدانو قەرەبالغ بێ.

**التلافیف:** دەگوترێ: (في أرضهم تلافیف من عشب): لە زەویو زاریان دا گیاو گژی تێکهالاو زۆرە ٥ بۆ پارچەو کۆمەلە ڕوەکی کەم.

**اللّفافةُ:** ئەو قوماشەو لەفافەی قاچی پێ دەپێچی ٥ (ك: لفائف) ٥ دەشگوترێ: (طار لفائف النبات): پەردەو توێکلی سەر خونچەی گولە ڕەکەکان هەلوەری ٥ هەروا دەگوترێ: (هَمٌّ یذیب لفائف القلوب): بەزێکە دەوران دەوری دلی داوە ٥ جگەرەی پێچراوە ٥ پەردەیەکە حەبلی مەنەویو هێلکە گون دادەپۆشێ.

**اللّفُ:** باخی تێکچڕژاو ٥ دەگوترێ: (جاءوا بلَفِهِمْ) بەهەمووتاقمو پێڕیانەوە هاتن ٥ هەروا دەگوترێ: (جاءوا ومن لفّ لفّهم): هۆزەکە هەموویان هاتنو هەموو ئەوانەش کەپەیوەنییان بەوانەوە هەبوو هاتن.

**اللِّفُ:** تاقمو کۆمەلو چینو توێژ ٥ دەگوترێ: (عنده الفاف من الناس): هەروا وشەی (اللِّف): بەمانا هۆزو

نەتــەوەی كۆبــوەوە دێ دەگــوترێ: (كنّــا لِفــاً): ئێمــە كۆبوینــەوە لەشوێنێك ٥ حیزبو تاقمو كۆمەڵ ٥ دەگـوترێ: (في لِـفّ مـن كنـت؟) ئـەتۆ لـەتاقمو پێـرى كـێ بـوى ٥ ئـەوەی لێـرەو لـەوێ كۆدەكرێنـەوە وەكـوو چـۆن كابرایــەك شـایەتی بـەدرۆ لێـرەو لـەوێ كۆدەكاتـەوە ٥ باخێـك باخـچەیەك درەختــەكانی تێكچرژابن ڕوەكەكانی تێكچرژابن، دەگـوترێ: (حدیقـة لِـفّ): بـاخێكی تێكـچرژاوە درەخــتو ڕوەكــەكانی لێك هاڵاوتن ٥ (ك: الفاف ولفوف) ٥ دەگوترێ: (جاءوا ومن لـفّ لِفّهـم): هـاتن بـەخۆیانو ئەوانەشـیان كـە پەیوەندییان پێیانەوە هەبوو.

**اللِفّـاء**: ئافرەتێـك سمـتو كەفـەڵی گــەورەو گۆشــتن بــن ٥ بــاخو دارستانی چڕو پڕ.

**اللُفّةُ**: (حدیقة لُفّة): باخێكی چڕو پڕە، دەشـگوترێ: (جـاء القـوم بلفّـتِهِمْ): خەڵكەكــە بەهــەموو چــینو توێژەكانیانەوە هاتن.

**اللّفیــف**: خــەڵكی كۆبــۆوە لــەهۆزو نەتـەوەی جیاجیـا ٥ یـان كۆمـەڵگای تێكــەڵ لــەمرۆڤی خــوێڕیو وەجــــاخزادەو خوێنـــــدەوارو نەخوێندەوارو چاكو خراپ، بـەهێزو بێ هێـز ٥ وشـەی (اللّفیـف): لـەبواری عیلمــی صــەرف دا بەوشــەیەك دەگوترێ دوو حەرفی عیللەی تێدابن ٥ وەكوو (طِوي وعی).

**اللّفیفة**: گۆشتی حوشتر (هی گوڵمەی رانی).

**المِلَـفُ**: لێفـەو بـەتانی ٥ دۆسـییەیەك چــەند ئــەوراقو نوســراوی تێــدا ڕەزمەكرابن ٥ هەڵگیرابن.

**الملفوف**: پێچراوە، یاپراخو دۆڵمە.

**لَفَـقَ الثـوبَ**: لكی قوناشـەكەی بەلاكـەی تریەوە دوری ٥ دەشـگوترێ: (لفـق بـین ثــوبین): هــەروا دەگــوترێ: (كــلام ملفوق): قسەی هەڵبەستراوو بێ سەرو بەرە.

**لفـق الأمـرَ**: هـەوڵی بـۆ كارەكـەداو بـۆی نەكرا.

**لَفَقَ فلان**: فلانكەس هـەوڵی كارەكـەی داو بۆی نەكرا.

**لَفِــقَ الــشّيْ**: شـتەكەی گــرت، زانــی، ئـەنجامی دا ٥ دەشـگوترێ: (لَفِـقَ یفعـل كـــذا): دەســتی پێكــردو خــەریكی ئەوكارەیە ٥ بەمانا (طفِقَ)دێ.

**لَفَّـقَ فـلان**: فلانكـەس داوای كـارێكی كردو هەوڵی دا ئـەنجامی بـداو بـۆی نەكرا.

لَفَّقَ الشَّقَّتين: دو پارچەکەی لێکدان‌و پێکیەوە دورین ٥ دەگوترێ: (لَفَّقَ بين الثوبين): هەردو پارچە قوماشەکەی لێکدان‌و پێکیەوە دورین.

لَفَّقَ الحديث: قسەی هەڵبەست‌و بەشتی بێ بناغەو پوچ رازاندیەوە ٥ (فهو مُلَفِّق).

تلافَقَ القومُ: خەڵکەکە کارو باریان رێك‌و پێك هات.

تَلَفَّقَ مابينهما: نێوانیان رێك بوو ناخۆشییان لەنێودا نەما.

تَلَفَّقَ به: پێی گەیشت.

التِّلْفَاق: دووپارچە قوماش بەیەکەوە بدورێن.

اللِّفَاقُ: بەمانا (التِّلْفاق)دێ.

اللَّفَّاق: کەسێك بەئاوات‌و ئامانجی خۆی نەگا، هەوڵ بداو سەرکەوتوونەبێ لەبەدەستهێنانی ئامانجی دا.

اللِّفْقُ: پارچەیەك، لایەك لەدوو شتی پێکەوە لکێنراو.

اللِّفْقَان: دوو پیاو حاڵ‌و وەزعیان پێکەوە باش بێ ٥ پێکەوە ئاشناو رۆشنابن، گونجاو بن ٥ دەگوترێ: (هذا لِفْقُ فلان).

لَفْلَفَ في ثوبه: خۆی لەقوماشەکەیەوە پێچا، پۆشاکەکەی لەخۆیەوە پێچا.

لَفْلَفَ فلان: فلانکەس زمانگیراو بوو بەناخۆشی قسەی بۆدەکرێن ٥ کەقسەدەکا زمانی دەمی پردەکا ٥ دەشگوترێ: (بلسانه لَفْلفة): زمانی گیری تێدایە.

لَفْلَفَ فلان: زۆری لەخواردن کۆڵیەوە زۆر لێی ورد بۆوە ٥ قوڵی خوارو خێچ بوو بەهۆی بادرانی ڕەگی سەرەکی قوڵی.

تَلَفْلَفَ بثوبه: خۆی بەقوماشەکە داپۆشی.

اللَّفْلاف: (رجل لَفْلَافٌ): پیاوێکی لاوازو زەعیفە.

اللَّفْلَفُ: بەمانا (اللَّفْلافُ)دێ.

لَفَاه حَقَّهُ لَفْواً: مافی ژێر پێ خست، لەمافی کەم کردەوە.

لَفَا اللَّحْمَ عَنْ العظم: گۆشتەکەی لەئێسقانەکە داماڵی.

أَلْفَاه: دەستی کەوت، توشی بوو.

تَلافى الشَّيْئَ: فریا شتەکە کەوت ٥ کەم‌و کوڕیەکانی پڕکردنەوە.

التَّلافي: تۆڵە سەندنەوە.

اللَّفي: شتی فڕێدراو.

اللَّفَاءُ: هەمووشتێکی هیچ‌و پوچ‌و بێ نرخ ٥ دەگوترێ: (رَضِيَ فلان من الوفاء باللفاء): لەپاساوی ئەو هەموو پیاوەتی‌و چاکەیەی بەشتێکی کەم‌و بێ نرخ رازی بوو ٥ هەروا ئاوە

بـۆگڵ، شـتی پـڕو پـوچو بـێ نـرخ لەسەر زەوی.

**لَقَّبَـهُ بكـذا:** بـەو نازنـاوە ناسـاندی ٥ ئەوەی كردە نازناوی ئەو.

**تلاقَـبَ القَـومُ:** خەڵكەكـە نازناويـان بۆيەكتر دانا.

**تَلَقَّبَ بكذا:** ئەوەبوو بەنازناوی ئەو.

**اللَّقَبُ:** نازناوێكە دوای نيـسمی يەكەم دادەنـرێ بۆناسـاندن ٥ يـان بـۆ ڕێزلێنان يان بۆ سوكايەتی پێكـردن ٥ وادەبێ نازناوی ناشيرين دەكرێتـە نـاوو پيـشی نـاخۆش نيـە وەكـوو (الأخفش، الجاحظ)و ئەو ناوانە.

**لَقِحَـتْ الناقـةُ ونحوهـا لَقْحـاً ولقاحـاً:** حوشـترەكە كـەڵی گـرت، تۆمـاوی كەڵەكەی پێكـەوت ٥ (فهـي لاقـح) ٥ (ك: لُقَـحٌ ولـوافح وهـي لقـوح) ٥ دەشـگوترێ: (لَقِحَـت النخلـة ولِقِـحَ الزرعُ).

**لَقَحَـت الحـربُ أو العـداوة:** شـەڕ هەڵگيرسايەوە ٥ (فهي لاقح).

**أَلْقحَت الشجرةُ:** درەختەكە پەڵو پۆی دەركردن.

**أَلْقَحَت الفحلُ الناقَة:** كەڵەكـە حوشـترە مێينەكەی ئاوس كرد ٥ كەڵی دا.

**أَلْقَحَ النخلـةَ:** دراخورماكەی موتوربـە كـرد ٥ دەشـگوترێ: (ألقحـت الـريحُ الـسَّحَابَة): هەورەكـە موتوربـە بـوو بارانی باراند ٥ (فهي مُلقِحة ولاقـح) ٥ دەشگوترێ: (ألقحت الريحُ النبـاتَ والـشَّجَرَ): بايەكـە ڕوەكو درەختەكـەی موتوربـەكرد ٥ تۆوەكـەی لەئەنـدامی نێرينـەوە گواستەوە بۆ ناو ئەندامی مێينە.

**أَلْقـح بيـنهم شـراً:** بـوو بـەهۆكاری نانەوەی شەڕ لەنێويان دا.

**لَقَّحَ النخلةَ:** دارخورماكەی تەلقيح كرد ٥ دەشـگوترێ: (جرّب الأمور فلقحت عَقْلَـهُ): بـەزۆر تاقيكردنـەوە دا تێپـەڕيوەو عـەقڵو هۆشـی پێيـان قـاڵبووە ٥ هـەروا دەگـوترێ: (فـلان مُلَقَّح مُنَقَّحٌ): فلانكەسی تەجرەبەی بينيونو قاڵبووە.

**لَقَّحَ جسم الإنسان أو الحيوان:** جەسـتەی مـرۆڤەكەی كوتـا بـەدەرزی دەرمـانی دژە نەخۆشی كردە ناو لەشيەوە.

**تَلَقَّـحَ فـلان علـى فـلان:** فلانكـەس دەستدرێژی كردە سەر فلاّن شتێكی پاڵ دانەكردبووی نەگوتبووی.

**اسـتلقَحَتِ النخلـةُ:** دارخورماكـە كـاتی موتوربەكردنی هاتووە.

**اللَّقاحُ:** تۆماوی كـەڵ ٥ ئـاوی نێرينـە ٥ ئـەو تـۆوەی درەخـتو ڕوەكـی پـێ موتوربە دەكرێ ٥ دەگـوترێ: (جاءنا

زمـن اللقـاح): كـاتى موتوربـەكردن هـاتووە ◊ وەرزى تـەلقيح كردنـى خورمـا هـاتووە ◊ دەگـوترێ: (قـوم لَقاح): گەلو نەتەوەيەكن ملكەچى كـەس نـەبوونو كـەس نـەيتوانيوە ستەميان لـێ بكا.

اللّقاحُ: تۆماوى حوشترە نێرەو ئەسپ ◊ يان تۆماوى هەر نێرينەيەكى تر.

اللّقاحِيـة: لـەبوارى پزيـشكى دا ئـەو تەفاعولو هەستكردنە وەرزييە يە كەجەسـتە بـەهۆى هـەواوە لەموتوربەبوونى ڕوەكەكانەوە بۆى دێ.

اللّقَـحُ: كـەلگرتن ◊ دەگـوترێ: (إمـرأة سريعة اللّقح): ئافرەتێكە زوو سكى دەبێ ◊ هەروا بەمانا (اللّقاح)دێ.

اللّقْحَةُ: حوشترى شيردەرى شير زۆر.

اللِقحَةُ: بـەمانا (اللّقحـة)دێ ◊ ئـافرەتى شيردەر.

المُلقِـحُ مـن الرجـال: پيـاوى بـەزڕوێت، پێچەوانەى نەزۆكى.

لَقَسَهُ لَقْساً: عـەيبى لـێ گـرت ◊ (فهـو لاقس ولقّاس).

لَقَسَتْ نفسُهُ الى الشَّيْئِ لَقْساً: نەفسى كێشى كـرد بـۆ لاى ئـەو شـتەو سور بوو لەسەر بەدەستهێنانى.

لَقَسَتْ نفسُهُ مـن الـشَّيْئِ: نەفسى لـەو شـتە بێـزراو ڕەتـى كـردەوە ◊ بـەنا بەنابەدڵى دەستى بۆ بردو حەزى لـێ نەبوو.

لَقِسَ بە: پێى وريا بۆوە.

لاقَـسَهُ: عـەيبى لـى گـرت، نازنـاوى ناشيرينى بۆدانا.

تلاقَـس القـومُ: خەلكەكـە جوێنيـان بەيەكتر دا.

تَلَقَّـسَتْ نفـسُه مـن الـشَّيْئِ: نەفـسى لەشـتەكە تـەنگ بـوو ڕژدو چـروك بوو.

اللاّقِسُ: گروێيى.

اللّقِسُ: كەسێك عەيب لەخەلك بگرێو نازنـاوى ناشـيرينيان بۆدابنـێ، فيتنەيى بخاتە ناويانـەوە ◊ كەسێك هـەر ڕۆژە خـەريكى شـتێك بـێو لەسەر كارێك بەردەوام نەبێ.

لَقِصَ الشَّيْئُ جِلْدَه لَقْصاً: شتەكە پێستى سوتاند.

لَقِصَ فلان لَقَصاً: فلاَنكەس دلتەنگ بوو.

إلْتَقَصَ الشَّيْئَ: شتەكەى هەلگرت.

اللّقِصُ: شەرەنگێزو شەڕانى ◊ زۆربلێو چەقەچەناو.

لَقَطَ الشَّيْئَ لَقْطاً: شـتەكەى لەسـەر زەوى هەلگرتـەوە ◊ (فهو لاقط ولقاط ولقاطة) ◊ هەلگيراوەكە (ملقوط يان لقيط).

لقـط الطـائرُ الحَـبَّ: بالندەكـە دانەوێلـەى لێـرەو لـەوێ بەدەنـدوك هەلگرتـەوە.

**لَقَطَ العِلْمَ من الكتب**: زانیاری لەم کتێبو لەو کتێب کۆکردەوە.

**لَقَطَ أصول الشِّعْر**: بەموکێش مووەکانی هەڵکێشان.

**لَقَطَ المَنْظَرَ**: وێنەی دیمەنەکەی گرت بەئامێری وێنەگرتن.

**لاقطه ملاقطة ولِقاطاً**: بەرامبەریی کرد ◦ کەوتە بەرامبەری.

**إلْتَقَطَ الشَّيْءَ**: بەمانا (لقطه) دێ ◦ دۆزیەوە، بەبێ بۆگەڕانو هەوڵدان دۆزیمەوە هەڵم گرتەوە ◦ لێرەو لەوێ کۆم کردەوە ◦ دەگوترێ: (فلان یلتقط کلام الناس) فلانکەس قسەی خەڵك کۆدەکاتەوە، سیخوڕیو جاسوسی دەکا ◦ عەرەب دەڵێن: (إنّ عندك دیکاً یلتقط الحصی) کەڵەشێرێکت لایە بەردە وردە هەڵدەگرێتەوە ◦ مەبەست ئەومیە فیتنە جۆیەکت لایە قسە دەدزێ لەناو مەجلیسەکەدا.

**تَلَقَّطَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لێرەو لەوێ گردکردەوە.

**الألقاط**: کۆمەڵە مرۆڤێك کەلەهەتیومچەو خوێڕی پێکهاتووە دەگوترێ: (جاءنا ألقاط من الناس) خوێڕیو هەتیومچە هاتن بۆلامان.

**قوم ألقاط**: گەلو نەتەومیەکی پەرتەوازبوون.

**اللاقِطُ**: ئەو کەسەی گوڵە گەنمو پاشەڕۆك کۆدەکاتەوە ◦ لەدوا دروێنە گوڵەگەنم دەچنێتەوە.

**اللاقطة**: دەگوترێ: (لکل ساقطة لاقِطة) بۆ هەموو شتەفرێدراو و نەویستراوێك هەڵگرەومیەك هەیە ◦ یان هەر قسەیەك بگوترێو لەدەم بێتەدەر گوێچکەیەك هەیە دەیبیستێو بڵاوی دەکاتەوە.

**اللِّقاط**: ئەو گوڵە گەنمو شتەیە دەبنە پاشەڕۆكو یەکێکی تر کۆیان دەکاتەوە دەیانچنێتەوە.

**اللِّقاط**: کۆکردنەوەی گوڵەگەنمو شتی وا، پاشەڕۆك کۆکردنەوە.

**اللُقاط**: ئەو گوڵە گەنمانەی کۆدەکرێنەوە لەپاشەڕۆك دا.

**اللُقاطَةُ**: ئەوەی لەناو زەوی دا بچندرێتەوە ◦ شتی فرێدراو بۆئەوەی هەرکەسێك بیەوێ هەڵی بگرێتەوە.

**اللَّقَطُ**: هەر دەنکە دانەوێڵەی ڕژاو دەنکە میوەی بەربۆوە ◦ پارچە زێڕو زیو لەناو کانەکەیان دا ◦ دەگوترێ: (وجدت في المعدن لقطاً) لەکانەکەدا پارچە زێڕو زیوم دۆزینەوە.

**اللَّقْطَةُ**: دیمەنێك لەفیلم کە بەجیا بگیرێ.

**اللُّقَطَةُ**: بەمانا (اللُّقْطَةُ) دێ.

**اللُّقَطَةُ**: هەرشتێك فرێدرابێو بتەوێ هەڵی بگریەوە ٥ لە جیۆلۆجیدا بریتییە لەپارچە زێڕێك پڕبەدەست بێ یان زیاتر بێ لەکان دا بدۆزرێتەوە.

**اللَّقيطُ**: منداڵی فرێدراو کە نەزاندرێ باوکی کێیە.

**اللَّقيطة**: پیاوی خوێڕیو بێ ڕێز ٥ هەروا ناوە بۆ ئافرەتی چەتیوەو نارەسەن.

**المِلقاة**: موکێش ٥ مقاشی بچوك بۆ هەڵگرتنەوەی شتی وردیلە.

**المِلْقَطُ**: بەمانا (المِلْقاط) دێ ٥ (ك: مَلاقِط)

**المَلْقَطُ**: کان ٥ مەبەستو مەتڵەب ٥ (ك: ملاقط) ٥ دەگوترێ: (أصبحت مراعينا مَلاقِط من الجدب) لەوەرگاکانمان بوونە سوتەمەڕۆو هیچ لەوەڕێکیان تێدا نەماوە.

**الملقوط**: بەمانا (اللّقيط) دێ ٥ (ك: ملاقيط).

**لَقَعَ الشَّيْءَ لَقْعاً**: شتەکەی فڕێ دا.

**لَقَعَ فلاناً بعينه**: فلانکەسی بەچاوی هەنگاوت.

**لَقَعَ بالكلام**: بەقسە زاڵ بوو بەسەری داو بۆڕی دا.

**لَقَعَ فلاناً**: ڕەخنەی لەفلان گرت.

**اللّقَعَة**: کەسێك هەرقسەی هەبێو کردەوەی نەبێ.

**اللّقّاعُ**: مێشە سەوزە کە ئادەمیزاد دەگەزێ.

**اللُّقّاعَةُ**: گێلو ئەحمەق ٥ کەسێك نازناوی ناشیرین بۆخەڵك دابنێ.

**المِلْقاعُ**: ئافرەتی دەمدرێژو جنێو فرۆش.

**لَقِفَ الشَّيْءَ لَقْفاً ولقفاناً**: خێرا شتەکەی لول داو قوتی دا ٥ پڕی دایەو تێکیەوە پێچا.

**لَقَفَ الفرسُ في عَدْوِهِ**: ئەسپەکە لەغاردان دا پێکۆڵی کرد خێرا خێرا بەتوندی قاچی بەزەوی کێشا.

**لَقَّفَ فلاناً الشَّيْءَ**: شتەکەی بۆ فلانکەس هاویشت بۆ ئەوەی خێرا لولی داو قوتی دا.

**لَقَّفَ الطعامَ**: خواردنەکەی قوت دا ٥ دەشگوترێ: (لَقَّفَهُ الطعامَ) خواردنەکەی پێ قوت دا.

**إلْتَقَفَ الشَّيْءَ**: شتەکەی خێرا گرتو پێچایەوە.

**تَلَقَّفَ الشَّيْءَ**: بەمانا (إلْتَقَفَهُ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَلَقَّفَ الكلامَ من فمه) خێرا قسەکەی لەدەم وەرگرتو قۆزتیەوە.

**تَلَقَّفَ الطعام**: خواردنەکەی قوت دا.

**اللَّقْفُ**: دەگوترێ: (رجل ثقفٌ لَقْفٌ) پیاوێکە هەرچی بۆ هەڵدرێ خێرا بەدەست دەیگرێتەوە ٥ یان هەر

قسەیەکی بۆ بکرێ خێرا دەیقۆزێتەوەو وەری دەگرێ.

**اللَّقِفُ**: دەگوترێ: (ثَقِفٌ لَقِفٌ) بەمانا (ثَقْفٌ لَقْفٌ) دێ.

**اللَّقِيفُ**: دەق بەمانا (اللَّقِفُ) دێ.

**لَقَّ عَيْنَهُ**: بەبەری دەستی لەچاوی دا؛ شەبلاغەی لەچاودا.

**اللَّقُّ**: کەندری ناو زەوی ◦ پیاوی زۆر بلێو چەقەچەناو.

**اللَّقَّاقُ**: (رجل لقاق بقاق) پیاوێکی زۆر بلێو چەقەچەناوە.

**لَقْلَقَ اللَّقْلاقُ**: لەقلەقەکە قرِاندی.

**لَقْلَقَتِ الحية**: مارەکە شەویلەی جولاندو زمانی دەرهێنا.

**لَقْلَقَ لسان فلان**: زوبانی فلانکەس هەدانادا هەمیشە لەجولەو قسەکردندایە.

**لَقْلَقَ نَظَرَهُ**: خێرا چاوی کەوتنە ڕوانینو شتەکانی بەسەرکردنەوە.

**لَقْلَقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی جولاند.

**اللَّقْلاقُ**: لەقلەق: باڵندەیەکی قاچو ملو دەندوک درێژو سوورە.

**اللَّقْلَقُ**: بەمانا (اللَّقْلاقُ) دێ ◦ هەروا بەمانا زوبان دێ ◦ دەگوترێ: (حرّك لَقْلَقَهُ) زوبانی خستە کارو کەوتە قسەکردن.

**اللَّقْلَقَةُ**: گیرانی زوبان ◦ دەنگی بەرزو نزمو پرپێچو پەنا ◦ دەنگێک لەرینەوەو لاواندنەوەی تێدا بێ.

**لَقَمَ الطريقَ**: دەمی ڕێگاکەی گرت.

**لَقِمَ الشَّيْءَ لَقْماً**: شتەکەی خێرا خوارد ◦ دەگوترێ: (لَقِمَ اللُّقْمَةَ) پاروەکەی بەدەم گرتو وردە وردە قوتی دا.

**أَلْقَمَهُ الطعامَ**: وای کرد خواردنەکەی قوت بدا ◦ دەگوترێ: (أَلقَمته أذني فصبَّ فيها كلاما، وأَلقَمَهُ الحجر) لەکاتی دەمەدەمێو موناقەشەدا بێدەنگی کرد.

**لَقَّمَهُ الطعامَ**: بەمانا (أَلْقَمَهُ) دێ.

**اِلْتَقَمَ الشَّيْءَ**: شتەکەی قوت دا ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ﴾.

**تَلَقَّمَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەخێرایی خوارد.

**التِّلْقامُ والتِّلْقامَةُ**: پاروی زۆر یان پاروی گەورە ◦ (پاروزل).

**اللَّقَمُ**: ڕێگای ئاشکرا ◦ دەگوترێ: (خذ هذا اللَّقَمَ) ئەم ڕێگا ڕاستە بگرەو بەری مەدە.

**اللَّقِمُ**: دەگوترێ: (رجل لِهِم لقِمٌ) پیاوێکە هەمیشە بەسەر بەرامبەرەکانی دا سەرکەوتووبووە.

**اللُّقْمَةُ**: پارو، ئەو برە خواردنەیە مرۆڤ ئامادەی دەکا بۆئەوەی بیخاتە ناو دەمیەوەو قوتی بدا.

**لَقِنَ فلان لَقَناً ولقانةً**: فلانکەس عاقڵو زیرەك بوو.

لهب
لولب
ملطاس
ملطاط
ملطاط
ملفّ
لأمة
ملزّة
ملعقة
اللهاة
اللوزتان
اللسان
جمجمة
ملزمة
لجام
ملقط
ملقط
لفافة او لفيفة
لبلاب الحقول
لسان الكلب
لسان السبع
لثام
لواء
لبلاب
ليمون
ليمون
لحية التيس
لايمون
لوف
ليمون هندي
لعاعة
لزّاب
لوز
لينوفر
لفّاح
لفت
لاذن
لاحسة السكّر
لقلق
لويحق
لوّاء
لبدة الأسد
لسان الحمل

**لَقِنَ المعنى**: لەماناکە حاڵی بوو ◦ (فهو لقن).

**لَقَّنَهُ الكلامَ**: قسەکەی بەگوێ دادا بۆئەوەی بیڵێتەوە.

**لَقَّنَ الممثل على المسرح**: لەسەر شانۆکە ئەکتەرەکەی فێری قسەکردن کرد ◦ بەدەنگی نزم ئەکتەرەکەی دەرس دادا.

**لَقَّنَ المحتضرَ**: لەلای نەخۆشەکەی لەگیانەوڵادایە زیکری خودا (لا إله الا الله)ی دووبارەو سێبارە کردەوە بۆئەوەی نەخۆشەکەش یادی خودا بکاو شایەتومان بێنێ.

**لَقَّنَ الميتَ**: تەلقینی مردووەکەی کرد، ئامۆژگاری مردووەکەی کرد کە بەرێك و پێکی وەڵامی فریشتەکان بداتەوە.

**تَلَقَّنَ الشَّيْءَ والكلام**: لەشتەکە حاڵی بوو ◦ فێری قسەکە بوو.

**اللَّقَنُ**: لەگەن دەست شۆر؛ قاپێکی بن تەسکی سەربڵاوە.

**اللَّقِنُ**: دەگوترێ: (لَقِفٌ لَقِنٌ) تێگەیشتووەو باش تێی دەگا.

**المُلَقِّنُ**: تەلقین دادەر (مەلای تەڵقین خوێن) ◦ ئەو کەسەی مردو تەڵقین دەدا ◦ ئەوکەسەی لەسەر شانۆ تەڵقینی ئەکتەر دەکاو بۆخۆی دەرناکەوێ.

**لَقَاهُ الله لَقْواً**: خودا توشی نەخۆشی شەویلە خواربوونی کرد.

**لُقِيَ لَقْوَةً**: توشی نەخۆشی شەویلە خواربوون بوو.

**اللَّقْوَةُ**: نەخۆشییەکە توشی دەموچاو دەبێ و شەویلە خواردەبێ ◦ هەروا ئاوە بۆ هەڵۆو باز کە بەگورجی نێچیر دەگرێ.

**لَقِيَهُ لقاءً ولقاءً ولُقياً ولُقياناً ولُقْيَةً**: پێشوازی لێ کرد توشی بوو.

**لَقِيَ فلان رَبَّهُ**: فلانکەس مرد.

**أَلْقى الشَّيْءَ**: شتەکەی فڕێ دا هاویشتی ئاراستەی کرد.

**أَلقى الله الشَّيْءَ في القلوب**: پەروەردگار ئەو شتەی خستە دڵەکانەوە.

**أَلقى القرآن**: قورئانی نازڵ کرد.

**أَلقى المتاعَ على الدابة**: کاڵاو شتومەکەکانی خستە سەر پشتی وڵاخەکە.

**أَلقى عَلَيْهِ القولَ**: قسەکەی بەسەردا خوێندەوە فێری کرد ◦ دەشگوترێ: (القى اليه القول وبالقول) قسەکەی پێ ڕاگەیاند.

**أَلقى اليه بالاً**: دڵی دایە شتەکەو گوێی بۆ گرت ◦ هەروا دەگوترێ: (ألقى فلان السَّمْعَ والقى الى فلان السمع).

**أَلقى اليه خيراً**: پیاوەتی لەگەڵ دا کرد.

**القى اليه السلام**: سڵاوی لێ کرد.

**لاقــاه ملاقــاةً ولقــاءً**: تووشــی بــوو، چاوپێکەوتنی لەگەڵ دا کرد.

**لاقـی الله**: گەڕایـەوە بـۆلای خـودا بـۆ حیسابو لێکۆڵینەوە.

**لاقــی بــین الــرجلین**: دوو پیاوەکــەی یەکخـستنەوە ٥ دەشـگوترێ: (لاقـی بین فلان وفلان) و (لاقی بـین طـرفي القـضیب) دارەکـەی چـەماندەوە تـا هەردووسەری بەیـەك گەیـشتنەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (هو جاري ملاقـی) ئەوە هاوسێمە بەرامبەرم.

**لَقّاهُ الـشَّیْئَ**: شـتەکەی واڵێ کـرد توشـی بێ ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَقّـاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا﴾.

**إلْتَقَیـا**: ئـەو دوو کەسـە یـان ئـەو دوو تاقمـــە توشـــی یـــەکتر بـــوون ٥ دەگوترێ: (إلتقـی الـرجلان، والتقـی الجیشان).

**إلتقـی الـشیئان**: دوو شـتەکە بەیـەك گەیـشتنو کۆبوونـەوە ٥ بەرامبـەری یـەك بـوون ٥ قورئـان دەفـەرموێ: (مرج البحرین یلتقیـان بینهمـا بـرزخ لایبغیان).

**إلتقی الشَّیْئَ**: توشی شتەکە بوو.

**تلاقیا**: توشی یەکتر بوون.

**تَلَقّتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە ئاوس بوو، سکی بوو ٥ (فهي مُتَلَقّ).

**تَلَقّــی الـشَّیْئَ**: توشـی شـتەکە بـوو ٥ دەگـوترێ: (تَلَقّـی فلانـاً) توشـی فلانکەس بوو.

**تَلَقّــی العلــم عَــنْ فــلان**: زانــستی لەفلانکـەس وەرگـرت لـەلای ئـەو فێری خوێندن بوو.

**إسـتلقی علـی ظهـره**: لەسـەر پـشتی نوست.

**الأُلْقیــة**: ئـەو لەغـەزو موعەممایانـەن کــەزەینی بەرامبــەری پــێ تــاقی دەکەیەوە ٥ دەگـوترێ: (ألقیت عَلَیْهِ القیة) و (ألقیت الیه القیـة) لـەغزێکم لێ پرسی بۆئەوەی حەلی بکاو بزانـێ مەبەسـت چـیە ٥ بـەلاّو کارەسـاتی ڕۆژگـار (ك: الألاقــي) ٥ دەگـوترێ: (لقیت منه الألاقي).

**التَّلاقي**: (یوم التلاقي) ڕۆژی قیامەت.

**التِّلْقــاءُ**: چاوگی (لَقِـيَ)یـە دەگـوترێ: (یسرني تلقاؤك) پێم خۆشە بتبینم، بینینـی تـۆ دڵخۆشـم دەکـا ٥ دوایـی ئـەم وشـەیە بـۆ زەرفـی مـەکانیش بەکارهێنراوە، گوتراوە: (توجّه تِلقاءَ النـار) و (تِلْقـاء فـلان) ٥ و (جلَـسَ تلقاء) بەرامبەری دانیشت ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَمّـا تَوَجَّـهَ تِلْقَــاء مَـدْیَنَ﴾ ٥ دەشـگوترێ: (فعـل ذلـك تِلقائیــاً) لـەخودی خۆیـەوە ئـەوەی کرد.

**اللُّقــى**: شــتێك لەبــەر كەمبايــەخی فڕێـدرابێ ◦ هـەروا نـاوە بـۆ شـتی هەڵگیراو.

**اللَّقاءَةُ من الطريق**: ناوەڕاستی ڕێگا.

**اللِّقيُ**: شوێنی بەیەك گەیشتن ◦ (هما لَقِيان) ئەو دوانـە بەیـەك گەیشتن ◦ هـەروا دەگـوترێ: (هـو لقـي شـقيّ) هەمیشە ئەو لەشەڕو ناخۆشیدایە.

**المَلْقــى**: كـۆزو لانـەی حەیوانـە كێـوی كەلەترسـی ڕاوچـی خـۆی تێـدا حەشـــار دەدا ◦ یـــان نـــاوە بـــۆ سەرانسەری كێو ◦ (ك: المَلاقي).

**المَلاقي**: دیوی ناوەوەی وانێكی ئافرەت ◦ دەگـوترێ: (إمـرأة ضـيقة الملاقـي) ئافرەتێكە وانێكەی تەسكە.

**المُلْقى**: زبڵدان؛ شوێنی شت لێ فڕێدان ◦ دەگـوترێ: (هـذا ملقـى الكناسـات) ئـەوە شـوێنی فڕێـدانی زبـڵ‌و زاڵ‌و قومامـــەو شـــتی وایـــە ◦ هـــەروا دەگـوترێ: (فِـناؤه مُلقـى الرحــال) ماڵەكەی شوێنی دابەزینی میوانە.

**المُلَقّى** (رجل مُلَقّى): پیاوێكە تەجرەبە كـراوەو هەمیـشە بـەڵاو كارەسـات توشـی دێـن ◦ هـەروا دەگـوترێ: (الشجاعُ مُوَقّى والجبان مُلَقّى).

**لَكَأهُ بالسَّوط**: بەقامچی لێی دا.

**لَكَأَ فلاناً**: هەموو مافی فلاّنكەسی دایەوە ◦ هەروا دەگوترێ: (لَعَنَ اللهُ اُمّاً لَكَأت بە) نەفرین لەو دایكەی ئەوی لێ بووە.

**لَكِـئَ بالمكان لَكَأً**: لەو شوێنە مایەوە.

**تَلَكَّأَ عَلَيْهِ**: لەسەری وەستا ◦ تەمبەڵی كردو وەستا.

**لَكَثَهُ لَكْثاً ولِكاثاً**: بـە مـستەكۆڵە لێـی دا، یان شەقی تێهەڵدا.

**لَكِثَ الوَسَخُ عَلَيْهِ وبه لَكَثاً**: چڵك پێیـەوە نووسا.

**اللُّكـاثُ**: بـەردی بریـسكەدارو لـوس ◦ بەزۆری لەگەچدا دەبێ.

**اللُّكاثِيُ**: پیاوی پێـست سـپی زۆر سـپی پێست.

**اللَّكَثُ**: شیرو ماست كەبەلێواری قاپو مەنجەڵەوە ڕەق دەبێ‌و دەمێنێتەوە.

**لَكِدَ عَلَيْهِ الوسَخُ وبـه لَكَـداً**: چـڵكی پێـوە نووسا.

**لَكِدَ الشَّيْئُ بفيه**: شتەكە بەدەم‌و لێویـەوە گەمرەیان بەست قژی پێكەوە نووسان.

**لَكِــدَ شَــعْرُهُ مــن الوسـخ**: قـژی بـەهۆی چڵكەوە گەمرەیان بەست قژی پێكـەوە نووسان.

**لَكِدَ فلان**: فلاّنكەس بەخێڵ‌و چروك بوو ◦ (فهو لَكِد)

**لاكَدَ الغُلّ**: لەگەڵ زنجیرو پێوەندەكەدا گونجا.

**لاكَدَ قَيْدَهُ:** بەپێوەندەوە ڕۆیی، پێوەندەکە نەیهێشت خێرا بڕوا.
**لاكَدَ فلان فلاناً:** فلانکەس لەگەڵ فلانکەس کەوتو لێی جیانەبووەوە.
**إلْتَكَدَهُ:** لەگەڵی کەوتو لێی جیانەبووەوە.
**إلْتَكَدَ به:** پێوەی لکا، چووە گەڵیەو.
**تَلَكَّدَ الشَّيْءُ:** شتەکە پێکەوە نووسا، یەکتری گرت.
**تَلَكَّدَ به الوَسَخُ:** چڵکی پێوە نووسا ٥ چڵکن بوو.
**تَلَكَّدَ فلان:** فلانکەس گۆشتی پتەو بوو.
**الأَنْكَدُ:** پیاوی خوێڕیو هەتیو مچە کەخۆی بەهۆزێکەوە هەڵواسیو خۆبکا بەیەکێك لەوانو لەڕاستیدا لەوان نەبێ.
**المِلْكَدُ:** ئامێرێکە وەکوو سندۆڵ شتی پێ ورد دەکرێ.
**لَكَزَهُ لَكْزاً:** مستەکۆڵەی لەسنگی دا.
**لاكَزَهُ:** ئەو دوو کەسە یەکتریان بەر مستەکۆڵە دا.
**تلاكزا:** ئەو دوو کەسە یەکتریان بەر مستەکۆڵە دا.
**اللِّكازُ:** پینەیەکە دەخرێتە ناو دڕاویەکە.
**المُلَكَّزُ:** زەلیلو سوالکەری دەرکراو لە دەرگاو کۆڵان.
**لَكَشَهُ لَكْشاً:** مستەکۆڵەی لێ دا.

**لَكَعَ فلان لَكْعاً:** فلان خواردیو خواردیەوە.
**لَكَعَ الصَّبِيُّ:** منداڵەکە قونگەجوڵەی کرد لەکاتی شیر خواردندا.
**لَكَعَ الرجل الشاةَ:** پیاوەکە بەبەری دەستی لەگوانی مەڕەکەی دا بۆئەوەی شیر بدا.
**لَكَعَتِ العقربُ فلاناً:** دووپشك بەفلانکەسیەوە دا.
**لَكَعَ الرجلَ:** قسەی ناشیرینی بەگوێچکەی پیاوەکەدا دا.
**لَكِعَ لكعاً لكاعة:** بەدخو بوو، خوێڕیو بەدکار بوو ٥ گێلو ئەحمەق بوو ٥ (فهو أَلْكَعُ وهي لكعاء).
**لَكِعَ عليه الوسخ لَكَعاً:** چڵکی پێوە نووسا.
**لَكَعَ لَكَعاً ولكاعة:** بەدخوبوو بەدکار بوو ٥ گێلو ئەحمەق بوو ٥ (فهو لكيع).
**لَكاعِ:** لەسەر کێشی (فَعالِ) بۆ جنێودان بەئافرەت بەکاردێ ٥ دەگوترێ: (يالَكاعِ) ئەی بێ ڕەوشت ئەی ئافرەتی گێلو ئەحمەق.
**اللُّكَعُ:** خوێڕیو هەتیومچە لەبانگ کردن دا.
**يا لُكَعُ:** بۆ دووکەس دەگوترێ: (يا ذَوَيْ لُكَع) ٥ ئەم وشەی (لُكع) کە کرا بەناو بۆ یەکێك دوو بزوێنی نادرێتێ چونکە غەیرە مونصەریفە لەبەر

عـەدلو عەلەمییـەت ٥ هـەروا وشـەی (لَكَعْ) بـەمانا گێـلو ئەحمـەق دێ ٥ بـەمانا لالـە پەتـەو زمـانگیراو دێ ٥ بـــەمانا منـــداڵی بـــچكۆلە دێ ٥ پێغەمبەر (د.خ) چووە ماڵی فاتیمەی كچیو فەرمووی (أَثَمَّ لُكَعُ) ئـەرێ كـوڕە بچكۆلەكە لێرەیە؟ مەبەستی حەسەن یان حوسەین بوو.

**اللُّكَعَةُ**: ئافرەتی گێلو پڕوپوچ.

**المَلْكَعانُ**: وشـــەی جنێـــو ئـــامێزە ئاڕاســـتەی پیـــاو دەكـــرێ واتـــە: خـوێڕی، سەرسـەری ٥ بـۆ جنێـودان بەئافرەت دەگوترێ: (یا مَلْكعانةُ).

**لَكَّـــهُ لَكّـــاً**: بەهـــەموو دەســـتی پـــــــشتەملەیەكی پیاكێـــــــشا مـــستەكۆڵەیەكی دا لەپاشـی شـانی لەپشتە ملی.

**لَـكَّ الـشَّيْءَ**: شـتەكەی تێكـەڵاو كـرد ٥ پەستاوتی.

**لَكَّ اللحمَ**: گۆشتەكەی لەئێسقان داماڵی.

**إِلْتَكَّ**: چووە نـاو یەكـەوە ٥ دەگوترێ: (إِلْتَـــكَّ العَـــسْكَرُ) ســـەربازەكان خڕبوونـەوە، تێكـچڕژان ٥ (إِلْتَـــكَّ الـوُرّادُ علـى المنهـل) ئاوخۆرەوەكـان لەســـەر شـــوێنی ئاوخواردنـــەوە پاڵەپەستۆی یەكتریان كرد.

**إِلْتَـكَّ في حُجَّتِـهِ**: لەبەڵگـە هێنانـەوەدا تەمبەڵ بوو.

**إِلْتَكَّ في كلامه**: لەقسەكردنی دا هەڵەی كرد.

**اللُّكـــاكُ**: پاڵەپەســـتۆو زەحمەتـــدانی یەكتری.

**اللُّكُّ**: پشتی گۆشتنو پتـەو ٥ ڕەنگێكـی ســورە لــە دورگــە خۆرهەڵاتیــەكانی هینـد دا بـڕی مێشو مەگەز دەری دەدەنو لەســـەر گـــەڵای هەنـــدێ درەخت دا دەمێنێتەوە، ئەم مادەیە لـەناو مـادەی كحول دا دەتوێتـەوە، جـۆرە ڕۆنێكـی لێ پێـك دێ بـۆ چەوركردنی دارو تەختە بەكاردێ ٥ لـــەبواری ژمـــاردن دا لـــەلای ئێرانیـــەكانو هیندیـــەكانو یەمەنییـەكان نـاوە بـۆ ژمـارەی سـەدهەزار، ئێـستا هەنـدێ كـەس بەكاری دێنن بۆ ژمارەی دە ملیۆن.

**اللُّكیـــكُ**: پـشتی گۆشـتنو پتـەو ٥ دەگـوترێ: (فـرس لكیـك اللَّحـم) ئەسـپێكی پشت گۆشـتنو پتـەوە ٥ شـتێك پەســتێورابێو چــوبێتە ناویـەكترەوە ٥ دەگـوترێ: (عـسكر لكیـــك) ســوپایەكی گردەوەبــووی تێكـچڕژاو و تێكـسمڕاوە ٥ مـادەی قەتران ٥ (ك: لِكاك)

**لَكَمَـــهُ لَكْمـــاً**: بەهـــەموو دەســـتی مستەكۆڵەی لێ دا.

**لَكَمَ السيلُ عُرْضَ الجبل**: لافاوەکە لەپانتایی کێوەکەدا زەوییەکەی دادڕی.

**لاكَمَهُ مُلاكَمَةً**: ئەو دوو پیاوە بەمستەکۆڵە کەوتنە وێزەی یەکتری یەکتریان بەر مستەکۆڵە دا.

**تلاكما**: بەمستەکۆڵە دووپیاوەکە لێکیان دا.

**إلْتَكَمَ**: شەپۆلەکان تێکیانەوە هاویشت.

**المِلْكَمُ**: (رجل مِلْكَمٌ) پیاوێکی مستەکۆڵە وەشێنەو مستەکۆڵەی توند دەوەشێنێ یان زۆر مستەکۆڵەی لێ دەدا.

**المُلاكَمَةُ**: جۆرە وەرزشێکی جەستەییە یاریکەرەکان بە مستەکۆڵە لەیەکتر دەدەن، ئەم یاریە یاساو ڕێسای خۆی هەیە و هەر دوو لایەنی یاریکەر دەبێ پەیڕەوی ئەو یاساو ڕێسایە بکەن.

**المُلاكِمُ**: کەسێك پیشەی وەرزشی مستەکۆڵە بێ.

**لَكِنَ فلان لَكَناً ولُكْنَةً**: فلانکەس زمانی گیراو لاڵ بوو ٥ نەیتوانی بەزوبانی عەرەبی قسەبکاو زوبانی زکماکی نەبوو ٥ (فهو ألكن وهي لكناءُ) ٥ (ك: لُكْنٌ).

**تلاكَنَ في كلامه**: زمانی خۆی خوار کرد بەشێوەی نارەوان قسەی کرد بۆئەوەی هاوڕێکانی بێنێتە پێکەنین.

**لكِن**: ئەصلەکەی (لاكِن) بووە ئەلیفەکەی حەزف کراوە.

**لكِنَّ**: حەرفی موشەبەهە بەفیعلە دەچێتە سەر دوو ئیسم کە لەبناغەدا (مبتدأ وخبر) بوون ئیسمەکە مەنصوب دەکا خەبەر مەرفوع دەکا.

**لَكِيَ بە لكَى**: کەوتە گەڵی و لێی جیانەبۆوە تێیدا مایەوە ٥ دەگوترێ: (لَكِيَ بالمكان) لەشوێنەکە مایەوە.

**اللّاكي**: بەمانا (اللائك) دێ.

**لَمْ**: حەرفی جەزمو نەفیو قەلبە دەچێتە سەر فیعلی موزاریعو مەجزومی دەکا، ماناکەی لەزەمانی حاڵو داهاتووەوە دەباتەوە زەمانی ڕابردوو نەفی دەکا.

**لَمَأَهُ لَمْئاً**: هەمووی هەلگرت ٥ دەشگوترێ: (ما يَلْمَأُ فَمَهُ بكلمة) هەرچی وشەی ناشیرین هەیە بەدەمی دا دێو دەیڵێ هیچ بەلایەوە مەبەست نیە.

**ألْمَأَ عَلَيْهِ**: کۆنترۆڵی کرد، هەمووی داگیر کرد.

**ألْمَأَ اللّصُّ على الشَّيْئ**: دزەکە شتەکەی دزیو بردی ٥ دەگوترێ: (ذهب ثوبي فما أدري من ألْمَأَ به) کراسەکەم نەماوە نازانم کێ دزیویەتی؟.

**ألْمَأَ عليَّ حَقّي**: مافی خۆم لێ زەوت دەکاو دانی پیانانێ.

**اَلْمَأَ بِما في الجَفْنَة**: ئەوەی لەسوێنەو تەشتەکەدا بوو هێشتیەوە بۆ خۆی هەڵی گرت.

**اَلْمَأَت الدَّوابُ المكان**: ئاژەڵەکان شوێنەکەیان چۆڵ کرد ٥ دەگوترێ: (ما ادري أين أَلْمَأَ من بلاد الله) نازانم لەم وڵاتی خودایەدا بۆ کوێ چووە.

**اِلْتَمَأَ بِما في الجَفْنَة**: ئەوەی لە سوێنەو تەشتەکەدا بوو هێشتیەوە بۆ خۆی ٥ دەشگوترێ: (اُلْتُمِيَ لَوْنُهُ) ڕەنگی گۆڕا.

**تَلَمَّأَتِ الأرضُ به وعليه**: زەوی دایپۆشی، شاردیەوە.

**تَلَمَّأَ بِما في الجفنة**: ئەوەی لە سوێنەو تەشتەکەدا بوو هێشتیەوە بۆ خۆی.

**المَلْمُوءَةُ**: شوێنی دەستکەوتنی شت ٥ داوی ڕاوکەر.

**لَمَجَ الشَّيْءَ لَمْجاً**: شتەکەی خوارد.

**لَمَجَ الصَّبِيُّ أُمَّهُ**: منداڵەکە شیری دایکی خوارد.

**لَمَّجَ فلاناً**: زەڵاتەو موقەبیلاتی دایە فلانکەس بۆئەوەی پێش نانخواردن پێیانەوە خەریك بێ ٥ دەگوترێ: (ما لَمَجوا ضَيفهم بشيءٍ) هیچ زەڵاتەو موقەبیلاتیان نەدا بەمیوانەکەیان.

**تَلَمَّجَ فلان**: فلانکەس پێش نانخواردن زەڵاتەو موقەبیلاتی خوارد ٥ فلانکە حەزی لەخواردن و خواردنەوە بوو ٥ دەگوترێ: (ما تَلَمَّجَ عندنا بِلَماجٍ) لەلای ئێمە دەمی لەهیچ نەدا، هیچی نەخوارد.

**تَلَمَّجَ بالطعام**: خۆی بەخواردنەکەوە خافڵاند.

**اللَّمّاجُ**: کەمترین خواردن ٥ دەگوترێ: (ما ذُقْتُ شَماجاً ولا لَماجاً) هیچم نەچەشتووە حەشتەبای خودام نەخواردووە.

**اللَّمِجُ**: (رجل لَمِجٌ) پیاوێکی چڵێسە زۆری حەز لەخواردن و خواردنەوەیە ٥ دەگوترێ: (سَمِجٌ لَمِجٌ).

**اللُّمْجَةُ**: ئەو زەڵاتەو موقەبیلاتەی پێش نانخواردن مرۆڤ خۆی پێوە دەخافڵێنێ ٥ (ك: لُمَجٌ).

**اللُّمُوجُ**: بەمانا (اللُّماجُ) دێ.

**اللَّمِيجُ**: چڵێسی، زۆر خۆر.

**لَمَحَ البَصَرُ لَمْحاً وتِلماحاً**: بینینی گەیشتە شتەکە ٥ چاوی ڕوانییە شتەکە ٥ دەگوترێ: (لَمَحَهُ ببصره) بەچاوی بینی ٥ بینینی خۆی ئاڕاستەی ئەو شتە کرد.

**لَمَحَ اليه**: بەدیتنێکی بێ هێزەوە چاوی پێکەوت ٥ یان تیلەی چاوی دایە، بەدزییەوە بۆی ڕوانی ٥ (فهو لامح).

اللُّمَّاحُ: بازی زیرەك ٥ (وهو لمح ولَمّاح).

أَلْمَحَ الشَّيْئَ واليه: بەچاوی كزو دیتنی لاواز شــــتەكەی بینـــی ٥ یـــان بەدزییەوە سەیری شتەكەی كرد.

أَلْمَحت المرأةُ من وجهها: ئافرەتەكە وای كــرد ڕوخـــساری ببینــدرێ (واباوە ئافرەتی ڕوخسار جوان جوانی خۆی پیـشانی ئەوانــە دەدا كەدەمیانــەوێ بیبینـــنو خێـــرا خۆیـــان لێ نەدیودەكا).

لامَحَهُ مُلامَحَةً: بەدزییەوە بۆی ڕوانی، تیلەی چاوی دایە.

إلْتَمَحَهُ: بەچاوی كزەوە سەیری كــرد ٥ دەگــوترێ: (أُلــتُمِحَ بَــصَرُهُ) چــاوی بینایان نەما.

الألْمَحِيُ: كەسێك زۆر بڕوانێو هــەوڵی دیتن بدا.

اللّامِحُ: دەگوترێ: (فلان لامِحٌ عِطْفَيْـهِ) فلانكــەس زۆر بـــەخۆی دەنـــازێو خۆی پێ گرنگە.

اللَّمْحُ: دەگوترێ: (لأُرينَك لَمْحاً باصراً) شتێكی ئاشكراو نمایانـت پـێ نیشان دەدەم ٥ بـەزۆری ئـەم ڕسـتەیە بـۆ هەڕەشە بەكاردێ.

اللَّمْحَةُ: سەیركردنی بەپەلە، چاو پێدا خـشانێك ٥ دەگـوترێ: (رأیتــه لمحــة البرق) وەكوو بروسكە بینیم هاتە بەرچـاوم و گـوم بـوو ٥ دەشـگوترێ: (في فـلان لمحـة مــن أبیــه) فلانكــەس شێوەیەكی لەباوكی دەچێ.

اللَّمّـاحُ: زۆر ئاشكرا ٥ دەگوترێ: (هــو أبیض لَمّاح) ئەو زۆر سپییە.

المَلامِحُ: شكلو شێوەی دەمو چاو یـان لێكچون لە هەموو ئاكارو ڕەفتاردا.

لَمَزَهُ لَمْزاً: لێی دا، پاڵی پێوەنا ٥ عەیبی لێ گـرت ٥ بەچـاو ئامـاژەی بـۆكرد، چاوی لێ داگرت ٥ بەسـەری ئاماژەی بۆكرد، لێوی لێ داگرت ٥ سرتەیەكی بۆ كرد.

لَمَـزَ الـشیبُ فلانـاً: پـیری لەفلانكـەس دا دیاری دا.

لامَــزَهُ: بەلەغــەزو موعــەمما قــسەی لەگەڵ دا كرد.

اللُّمَزَةُ: عەیبگر لەخەڵك بەزۆریی ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (لَمّازة).

لَمَسَهُ لَمْساً: دەستی لێ دا.

لَمَسَ المرأةَ: لەگەڵ ئافرەتەكە جوتبوو ٥ دەشگوترێ: (شعاع یكاد یلمس البـصر) بروسكەو تیشكێكە لەوانەیە نوری چاو بەرێ بینایی كوێر بكا.

لامَسَهُ ملامسة ولِماساً: دەستی لێ دا.

لامــسَ المــرأةَ: لەگــەڵ ئافرەتەكــە جوتبوو.

إلْتَمَقَ الشَّيْئَ: داوای شتەكەی كرد.

**تَلَمَّقَ الشَّيْءَ**: جار دواجار داوای شتەکەی کرد.

**الإلْتِماسُ**: داواکاریی ٥ داواکردن ٥ لەبواری قانونی (المرافعات)دا رێگەی تانەدانە لەبڕیاری کۆتایی لەبەرچەند هۆیەكو داوا لەو دادگایە دەکرێ کە بڕیارەکەی دەرکردوە چاو بەبڕیارەکەدا بگێڕێتەوە.

**اللَّمِس**: دەگوترێ: (إمرأة لاتردُّ يَدَ لامِس) ئافرەتێکە دەستی کەس ناگێڕێتەوە بۆ ڕەوشتە داوێن پیسە ٥ (فلان لايَرُدّ يد لامِس) فلانکەس هیچ بەرگرییەکی تێدا نیە.

**اللَّماسَة**: پێداویستی نزیك.

**اللُّماسَةُ**: بەمانا (اللَماسَة) دێ.

**اللَّمْسُ**: یەکێکە لە هەستە زاهیرەکان بریتییە لەهێزێك لەڕەگو ڕیشاڵەکانی جەستەدا بەهۆیانەوە هەست بە ساردیو گەرمیو تەڕیو وشکیو گەورەییو بچوکیو ئەو شتانە دەکرێ.

**اللَّمْسَةُ**: یەکجار دەست لێدان ٥ (اللَمسة الأخيرة) چاوپێداخشاندنی کۆتایی کاری فەننیو شتی وا.

**اللَّمُوسُ**: زۆڵو زۆڵەزا ٥ کەسێك باوکی نەزانراوبێ.

**اللَّمِيسُ**: ئافرەتی نەرمو شل.

**المُلْتَمَسُ**: لەبواری مورافەعات دا بەو کەسە دەگوترێ: داوای چاو پێداخشاندنەوەی بڕیاری کۆتایی دادوەر دەکرێ لەدژی.

**المُلْتَمِسُ**: ئەو کەسەیە داوای پێداخشاندنەوەی بڕیاری کۆتایی دادوەر دەکا.

**لَمَصَ العَسَلَ وَ شِبْهَهُ لَمْصاً**: قامکی خستە ناو هەنگوینەکە یان دۆشاوەکەوە هەندێکی لێ هەڵگرتو خواردی.

**لَمَصَ فلاناً**: لاسایی فلانکەسی کردەوە دەمو لیچی لێ بادان.

**ألْمَصَ الشَّجَرُ**: درەختەکە ئەوەندە نزمە ئاژەڵ دەتوانێ گەڵاکەی بخوا.

**ألْمَصَ الكَرمُ**: دارمیوەکە ترێیەکەی گەیی نەرم بوو.

**اللَّامِصُ**: ڕەزەوان.

**اللَّمْصُ**: حەڵوا.

**اللُّمْصُ**: بەمانا (اللَّمَص) دێ.

**اللَّمُوصُ**: درۆزنی فێڵباز ٥ غەیبەتکەر، غەیبەتچی.

**لَمَظَ فلان لَمْظاً**: دەستی بەناو خواردنەکەدا گێڕاو پاروبزێری کردو لێی چەشت.

**لَمَظَ الماءَ**: بەقەراخی زوبانی ئاوەکەی خواردەوە.

**أَلْمَظَهُ**: ئاوی کرده سەرلێوی.
**أَلْمَظَ فلاناً على فلان**: فلانکەسی لەفلانکەس پڕکرد لەڕق و کینە.
**لَمَظَهُ كذا**: ئەوشتەی دەرخوارد دا.
**لَمَّظَ فلاناً من حقه**: بەشێکی زۆر کەمی دا بەفلان لەمافی خۆی، دەبوایە زیاتری بداتێ و کەمی دایە.
**إِلْتَمَظَ بشفتيه**: لێوی خستە سەر لێوی و فیتوی لێ دا ◦ فوی کرد، پسکەپسکی کرد.
**إِلْتَمَظَ بالشيئ**: خۆی لەشتەکە وەرهێنا.
**إِلْتَمَظَ الشيْئَ**: شتەکەی خوارد ◦ خێرا خستیە دەمیەوە.
**تَلَمَّظَ فلان**: بەمانا (لَمَظَ) دێ ◦ دەگوترێ: (ماتَلَمَّظْتُ اليومَ بشيئ) ئەمرۆ هیچم نەچەشتووە.
**تَلَمَّظَ بذكره**: ڕەخنەی لێ گرت.
**تَلَمَّظَت الحية**: مارەکە چزوی دەرهێنا.
**اللَّماظُ**: دەگوترێ: (ماله لَماظٌ) هیچی نییە ◦ (ما ذقتُ اليوم لَماظاً) ئەمرۆ شتێکم نەچەشتووە.
**شرب الماءَ لِماظاً**: ئاوەکەی بەقەراخی زوبانی خواردەوە.
**اللُّماظَةُ**: پاشماوەی خۆراك لەناودەم دا ◦ دەگوترێ: (أَلْقى لُماظة من فيه) ◦ هەروا ناوە بۆ باقی ماندەی شت ◦ دەگوترێ: (ما الدنيا إلا لُماظَة أيام) دونیا چەند باقی ماندەیەکی ڕۆژگارە.
**اللُّمْظَةُ**: پارچە ڕۆن ◦ گڵمتکە ڕۆن بەئەندازەی گوێزێك.
**المُتَلَمِّظُ**: دەم بەزەردەخەنە.
**لَمَعَ البَرْقُ والصُبْحُ وغيرهما**: بروسکەکە چەخماخەی دا، بەیانی ڕوناك بوو؛ ڕوناکایی لەئاسۆوە بڵاوبۆوە ◦ (فهو لامع وهي لامِعة).
**لَمَعَ بالشيئ لمعاً**: شتەکەی برد.
**لَمَعَ بثوبه ويده وسيفه**: بەپارچە قوماشەکە ئاماژەی کرد یان بەدەستی یان بەشمشێرەکەی ئاماژەی کرد.
**لَمَعَ الطائر بجناحيه**: باڵندەکە لەکاتی فڕین دا باڵی لێکدان.
**لَمَعَ فلان ألباب**: فلانکەس لەدەرگاکەوە دەرکەوت.
**لَمَعَ الشيْئَ**: شتەکەی فڕێ دا.
**أَلْمَعَ بثوبه ويده وسيفه**: بەمانا (لَمَعَ) دێ.
**أَلْمَعَ بالشيئ وعليه**: شتەکەی دزی، بردی.
**أَلْمَعَ بما في الإناء من الطعام والشراب**: چی لەقاپەکەدا بوو لەخواردن و خواردنەوە بردی.
**أَلْمَعَ الطائر بجناحيه**: باڵندەکە لەکاتی فڕین دا باڵی لێکدان.

**أَلْمَعَت الناقة بذنبها:** حوشتره مێینهكه كلكی هەڵبڕی تـا بزانـدرێ كه كـەڵی گرتووه ٥ دەشكوترێ: (أَلْمَعَت الناقة) حوشـترەكه نیـشانەی ئاوسبوونی لێ دەركەوت.

**أَلْمَعَـت الأنثـى:** مێینەكـه بێـچوی ناوسكی جوڵایەوه.

**أَلْمَعَـت الأرضُ:** زەوی پەڵەپەڵـەی گیاوگژی تێدا دەركەوت لەوەڕی زۆر بوو.

**لَمَّـعَ النَّسيجَ أو الحجـر:** چـندراوەكەی نەخشاندو ڕەنگاوڕەنگ چنی ٥ یـان بەردەكەی ڕەنگاوڕەنگ كرد.

**لَمَّعَ الشَّيْءَ:** شتەكەی واڵـی كـرد ڕەنـگ بداتەوه.

**إِلْتَمَـعَ الـبرقُ وغـيره:** بروسـكەكه چەخماخەی دا، ڕوناكی خستەوه.

**إِلْتَمَعَ الشَّيْءَ:** شتەكەی دزی.

**أُلْتُمِعَ لَوْنه:** ڕەنگی گۆڕا ٥ كـه مرۆڤێك ترسا یـان ڕقـی هەڵسا یـان خـەمبار بـوو بـەو هۆیانـەوه ڕەنگـی گـۆڕا دەگوترێ: (أُلْتُمِعَ لونُهُ).

**تَلَمَّـعَ الـبرقُ وغـيره:** بروسـكەكه چەخماخەی دا، ڕوناكی خستەوه.

**تَلَمَّعَ الشَّيْءَ:** شتەكەی دزی.

**الأَلْمَعُ:** زیـرەك و وریـاو دووربـین زەیـن ڕاستو شت پێك.

**الأَلْمَعِـيّ:** بـەمانا (الأَلْمَـعُ) دێ ٥ قسەخۆش و سوعبەتچی.

**التَّلْمِيـعُ في الخيـل:** ئەوەیـه ئەسـپەكه خاڵی جۆراوجۆری پێوەبن ٥ بەڵـەك بێ ٥ هەر ڕەنگێك بەجەستەوه بێ و لەڕەنگەكەی تر نەچێ ٥ (ك: تلاميع) ٥ دەگـوترێ: (فيـه تلميـع وتلاميـع) ڕەنگـی جیـاو جـۆراو جـۆری پێـوه هەن.

**اللاَّمِـعُ:** بروسـكەی ڕوناككـەرەوه ٥ دەشـگوترێ: (مابالـدار لامـع) كـەس لەخانوەكەدا نیيه.

**اللامِعَـةُ:** مەڵاشـوی منـداڵ لـەكاتی ساوایی دا ٥ (ك: لوامِع).

**اللَّماعُ:** دەگـوترێ: (ذهبت نفـسه لماعـاً) خـودی شـتەكه پارچـه پارچـەو وردەوردە فەوتا.

**اللُّمْعَـةُ:** كۆمەڵـه مـرۆڤ ٥ نـەرمو شـلی جەسـتەو درەوشـاوەیی و جـوانی ٥ ڕەشایی دەوران دەوری گۆی مەمك ٥ خـاڵی ڕەش بەجەسـتەوه ٥ هـەر ڕەنگێـك لـەڕەنگی تـری جەسـته جـوداواز بـێ ٥ بەشـێك لەئەنـدامی دەست نوێژ كەئاوی ڕێ نەكەوتبێ ٥ دەگوترێ: (به لُمْعَةٌ لم يصبها الوضوء) ٥ هەروا نـاوه بـۆ پارچـەیەكی ڕوەك كەبەرەو وشكبون بچێ.

**اللَّمّاعةُ**: دەشتو سارای کاکی بەکاکی کە تراویلکە تێیدا بدرەوشێتەوە ٥ مەلاشوی منداڵ لەکاتی ساوایی دا.

**اللَّموعُ**: بەمانا (اللاّمع) دێ ٥ هەڵۆی گورجو گۆڵ لەرفاندنی نێچیرەکەی دا.

**المُلَمَّعُ**: (خَدٌّ مُلَمَّعٌ) کوڵمی لوسو درەوشاوە.

**المِلْمَعُ**: (مِلْمَعا الطائر) دووباڵی باڵندە کە باڵندەکە لێکیان دەدا ٥ دەگوترێ: (خَفَقَ الطائرُ بِمَلْمَعَيْهِ) باڵندەکە باڵەکانی لێکدان.

**المُلْمِعَةُ**: دەگوترێ: (أرض مُلمِعَةٌ) زەوییەکە تراویلکە تێیدا دەدرەوشێتەوە.

**المُلَمَّعُ**: دەگوترێ: (فرس مُلَمَّعٌ) ئەسپێکی بەڵەکە.

**المُلَمَّعَةُ**: (أرض مُلَمَّعة) بەمانا (مُلْمِعَة) دێ.

**اليَلْمَعُ**: هەورەبروسکەی پێچاو پێچ ٥ دەگوترێ: (أخْدَعُ مِن يَلْمَع) ٥ درۆزنترو سەر لێ تێکدەر ترە لەتراویلکە ٥ دەشکرێتە موشەبەهوبیهی ٥ دەگوترێ: (إنما هو يلمع) ٥ هەروا وشەی (يَلْمَعُ) بەمانا زیرەکی و هەستیار دێ ٥ هەرشتێك بریسکەی لێ پەیدا بێ، وەکوو شمشێرو کڵاو و خودەو زرێ ٥ (ك: يلامع).

**اليَلْمَعيّ**: مرۆڤی زیرەكو زەین تیژو وریا.

**لَمَقَ لَمْقاً**: سەیری کرد ٥ دەشگوترێ: (لَمَقَهُ ببصره) بەچاو بۆی ڕوانی، سەیری کرد.

**لَمَقَ فلاناً**: چەپەوانەی لەدەمو لوتی فلانکەس دا.

**لَمَقَ عينه**: مستەکوڵەی لەچاودا ٥ بەدەست لەچاوی دا.

**لَمَقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کوژاندەوە، نووسیەوە.

**تَلَمَّقَ**: پێش نانخواردن زەلاتەو موقەبیلاتی خواردو خۆی پێوە خافلاندن.

**اللَّماق**: خواردنو خواردنەوەی کەم؛ پاروە خواردنێك قومە ئاوێك ٥ دەگوترێ: (ما ذقت لماقاً) هیچ شتێکم نەخواردوە و نەچەشتووە ٥ هەروا دەگوترێ: (مابالأرض لماق) لەسەر زەوی شوێنی ئاژەڵ لەوەڕانێك نەماوە.

**لَمَقُ الطريق**: پانتایی‌و ناوەڕاستی ڕێگا.

**اليَلْمَقُ**: کەوای ناو هاخندراو و پۆشاکی لەو جۆرە ٥ بەفارسی پێی دەگوترێ: (یەلمە).

**لَمَكَ العجينَ**: هەویرەكەی شل كرد.

**تَلَمَّكَ فلان**: فلانكەس شەویلەی خۆی جولاندن بەنان خواردن یان قسەكردن ◦ دەگوترێ: (تلمك البعیر) حوشترەكە لیچی خۆی بادان.

**اللَّماك**: دەگوترێ: (ما تَلَمَّكَ بِلَماك) هیچی نەچەشتووە.

**اللُّماك**: كل‌و شتی وا كەچاوی پێ جوان دەكرێ.

**اللَّمْكُ**: بەمانا (اللُّماكُ) دێ.

**اللَّمیكُ**: چاو ڕێژراو.

**لَمْلَمَ الشَّیْئَ**: شتەكەی كۆكردەوە.

**لَمْلَمَ الحجر**: بەردەكەی خڕهەڵدا كردی بەهەڵمات.

**تَلَمْلَمَ**: بۆ موتاوەعەی (لَمْلَمَ) دێ.

**اللَّمْلَمُ**: سوپای زۆرو كۆبۆوە (حيّ لملم) گەڕەكی كۆبۆوە قەرەباڵغ.

**اللُّمْلُومُ**: كۆمەڵ‌و تاقم‌و پێڕ.

**المُلَمْلَمُ**: (رجل مُلَمْلَمٌ) پیاوی تێكسمڕاو (شعر ململم) قژی چەوركراو.

**المُلَمْلَمَةُ**: دەگوترێ: (كتیبة مُلَمْلَمة) دەستە سەربازی گردەومبوو ◦ (ناقة مُلَمْلَمَةٌ) حوشتری كەتەو گۆشتن ◦ (صخرة مُلَمْلَمَةٌ) بەردی خڕو گۆناسا، خڕكراو.

**لَمَّ الشَّیْئَ لَمّاً**: شتەكەی چاك‌و خێرا كۆكردەوە ◦ دەگوترێ: (لَمَّ الله شَعْثَهُ) خودا كاروباری بۆ ڕێك‌و پێك‌و كۆكراوە كرد ◦ خزم‌و كەس‌و كاری دوورە وڵاتی بۆ گڕكردنەوە.

**لَمَّ بفلان**: هاتەلای فلانكەس‌و بوو بە میوانی.

**لَمَّ فلانٌ**: فلانكەس توشی جۆرە شێتییەك هات ◦ (فهو مَلْمُومٌ).

**أَلَمَّ الشَّیْئُ**: شتەكە نزیك بۆوە.

**أَلَمَّ باللوم وعلیهم**: هاتەلای خەڵكەكەو ماوەیەكی كورت لایان مایەوە.

**أَلَمَّ بالمعنى**: مانای شتەكەی زانی.

**أَلَمَّ بالطعام**: زۆری خواردنەكە نەخوارد.

**أَلَمَّ بالأمر**: زۆر لەكارەكەدا قوڵ نەبۆوە نەچووە بنج‌و بناوانی.

**أَلَمَّ فلان**: فلانكەس تاوانی بچوكی ئەنجام دا ◦ یان لەگوناهی بچوك نزیك كەوتەوە.

**أَلَمَّ الغلامُ**: كوڕەكە نزیكە باڵغ بێ‌و پێ بگا ◦ دەشگوترێ: (هذه ناقة قد أَلَمَّت للكبر) حوشترێكە نزیكە پیر ببێ.

**أَلَمَّت النَّخْلَةُ**: خورماكە خەریكە بەرەكەی شیرین ببێ‌و پێ بگا ◦ (فهي مُلِمٌّ ومُلِمَةٌ).

**أَلَمَّ الشَّعْرُ**: قژی سەری لەنەرمایی گوێچكەی تێپەڕین ◦ بەمانا وشەی (كاد)مش دێ ◦ واتە دەبێتە یەكێك لە ئەفعالی موقارەبە.

**لَمَّ الشَّعْرَ**: قژی چەورکردن ٥ (فهو مُلَمَّمٌ).

**إلْتَمَّ بالقوم**: هاتەلای خەڵکەکەو بوو بەمیوانیان.

**اللاَّمَّةُ**: هەرشتێك جێگای ترس بێ وەکوو دڕندەو مارو دوپشکو شتی وا ٥ چاوی پیس.

**اللِّمامُ**: چاوپێکەوتنو بەیەکگەیشتنی کەم خایەن ٥ دەگوترێ: (هو یزورنا لِماماً) ئەو تاوتاوە دێتە لامانو دەبێتە میوانمان.

**اللَّمَمُ**: گوناهی بچوك ٥ نزیکبوونەوە لەگوناه ٥ جۆرێك لەشێتی کەتوشی مرۆڤ دەبێو دەمدەمە دەیگرێ ٥ هەروا دەگوترێ: (کان ذلك منذ شهر أو لَمَمِهِ) ئەوە مانگێك یان نزیك لەماوەی مانگ دەبێ.

**اللَّمَّةُ**: ناخۆشیو چورتم ٥ ڕۆژگار ٥ دەگوترێ: (أعیذه من حادثات اللُّمَّة) پەنادەگرم بەخودا لەکارەساتی ڕۆژگار ٥ دەست لێوەشاندنی جندۆکە ٥ دەگوترێ: (أصابته من الجن لَمَّةٌ) دەست لێوەشاندنی جندۆکەی توشبووە ٥ (جندۆکە دەستی لێ وەشاندووە) دەگوترێ: (للشیطان لَمَّةٌ) شەیتان دەست لێوەشاندنی هەیە، ختوکەو جنەجنەی هەیە ٥ هەروا وشەی (اللُّمَّة) بەمانا خەڵکی کۆبۆوە دێ، شتی کۆبۆوە ٥ دیداری کەم ٥ (ك: لِمامٌ).

**اللُّمَّةُ**: هاوەڵو هاوڕێ.

**اللِّمَّةُ**: قژی سەر کەلەنەرمایی گوێچکە تێپەڕێ ٥ (ك: لِمَمٌ ولِمام).

**المِلَمُّ**: شتی بەهێزو پتەو و کۆکەرەوە لەهەر شتێك بێ ٥ دەگوترێ: (رجل مِلَمٌّ) پیاوێکی بەتواناو لێهاتووە خزمو کەسوکاری خۆی گرد کردونەوە نەیهێشتووە پەرتەوازە بن (رجل مِلَمٌّ) پیاوێکە خێرو پیاوەتی هەموو کەسی گرتۆتەوە.

**المُلِمَّةُ**: بەڵاو کارەساتی ترسناكو جەرگبڕ.

**الملمُوم**: کۆمەڵگای خڕەوەبوو ٥ دەگوترێ: (رجل ملموم) پیاوێکە کارەکانی ڕێكو پێكو کۆکراوەن ٥ پیاوێکی شێتە.

**لَمَّا**: حەرفی جەزمو نەفیو قەلبە ٥ دەچێتە سەر فیعلی موزاریعو مەجزومی دەکا.

**لَمَّا**: دەگوترێ: (مایلمو فَمُ فلان بکلمة) فلانکەس گوێ ناداتێو بەلایەوە گرنگ نیە چ دەڵێو چە ناڵێ.

**لَمـا الشَّيْءَ لَمْواً**: شتەکەی هەموو هەڵگرت.

**أَلْمَى على الشَّيْءَ**: شتەکەی برد.

**اللُّمَـةُ**: کۆمەڵـە پیـاو یـان کۆمـەڵێك ئـافرەت لەسـێ کەسـەوە بـۆ (دە) ، هاوشـانو هـاو تەمـەنو شـێوە ، دەگـوترێ: (لِيَزوَّجْ كل إنـسان لُمَّتَـهُ) باهەر کەسەو هاوشانی خۆی بکاتـە هاوسـەری خـۆی ، ڕەچـە شـکێنیو مامۆستایی. دەگوترێ: (لك فيه لُمَّة) بـۆ تـۆ هەیـە لـە فلانکـەس دا پێشەوایەتیو مامۆستایی لەژیانت دا چاو لەو بکە.

**لمي الغـلامُ لُمْيـاً**: منداڵەکە لێوی ڕەش بـوو ، هەروا دەگـوترێ: (لَمَـتِ المـرأةُ) ئافرەتەکە لێوی ڕەش بوو.

**لَمِيَ لَمىً**: بەمانا (لَمَى) دێ ، (فهـو ألْمـى وهي لمياءُ) ، دەشگوترێ: (لميـت الـشَفَةُ) لێوەکە مەیلەو ڕەش بوو.

**لَمِيَ الشَجرُ**: درەختەکە سێبەرەکەی ڕەش بوو.

**تَلَمَّـتِ الأرضُ بـه وعليـه**: زەوییەکـە دایپۆشی.

**الألْمى**: (ظل ألْمى) سێبەری چڕو ڕەش دیمەن.

**ظـلّ ألْمـى**: سـێبەری فێنـك ، (رِمـحٌ ألْمى):ڕمبێکی ئەسمەرو پتەوو ڕەق.

**اللَّمَـى**: گـەنم ڕەنگییەکـە لەلێودا ئـەم ڕەنگە بۆ لێو زۆر پەسەندە.

**اللّمياءُ**: (شفه لمياءُ) لێوی کـەم خـوێنو تەنك ، (لثة لمياء) پوکی کەم خوێن ، یان کەم گۆشت.

**لن**: حـەرفی نـەصـبو نـەفیـە بـۆ زەمـانی داهاتوو.

**لَهَبَ الرجلُ لَهَباً**: پیاوەکە تینوی بوو (فهو لهبان وهي لَهْبى).

**أَلْهَبَ البرقُ**: هەورەبروسکەکە درێـژەی کێشا.

**أَلْهَبَ الفرسُ**: ئەسپەکە غارکردنەکەی درێــژەی کێــشاو تــەپو تــۆزی بەرپاکرد.

**أَلْهَبَ في الكلام**: قسەی بەخێرایی کـرد ، دەشـگوترێ: (أَلْهَبَــهُ للأمــر) بـۆ کارەکــە وروژانــدی ، هــەڵینا بــۆ کارەکە.

**أَلْهَبَ النـارَ**: ئەاگرەکـەی هەڵگیرسـاندو بڵێسەی سەند، گڕی بەرز بۆوە.

**إِلْتَهَبَت النّارُ**: ئاگرەکە هەڵگیرسا.

**إِلْتَهَـبَ علـى فـلان**: ڕقـی لەفلانکـەس هەڵساو لێی سوربۆوە ، دەشـگوترێ: (فــلان يلتهــب جوعــاً) فلانکــەس لەبرسـان ناوسـکی هەڵدەقرچـێو گڕی لێ دەبێتەوە.

**تَلَهَّبَتِ النارُ**: ئاگرەکە هەڵگیرسا.

**الأُلْهُوبُ**: ڕاپەڕینی ئەسپە بـۆ غـاردان تا تەپوتۆز بەرپا دەکا.

**اللُّهَابُ**: تینوایەتی.

**اللَّهَابَةُ**: پۆشاکێکە بەردی تێدەخرێ بۆ تەرازوکردنی لاباری کەژاوە یان لاباری سەرپشتی وڵاخ.

**اللِّهْبُ**: بۆشایی نێوان دوو کێو ٥ دیمەنی کێو کە وەکوو دیوار دێتە بەرچاو و ناتواندرێ کەس بچێتە سەری ٥ لادرو کارێز لە ژێر زەوی دا.

**اللَّهَبُ**: بڵێسەی ئاگر ٥ لای سەروی بڵێسەی ئاگر ٥ لەبواری کیمیادا بریتییە لەئاگرێك کەلە هەڵگیرسانی ئاگرێکی تر پەیدا ببێ یان لە گرگرتنی بوخارێك کە هەڵگیرسابێ ٥ دوکەڵی ئاگر.

**اللَّهبان**: پەرەسەندنی گەرما ٥ تینوایەتی ٥ (یوم اللّهبان) ڕۆژی زۆر گەرم ٥ ڕۆژێکی گەرم.

**اللُّهْبَةُ**: تینوایەتی ٥ درەوشانەوەی پێستی جەستە.

**اللَّهیبُ**: گەرمی ئاگر.

**المِلْهَبُ**: شۆخ و شەنگ و زۆر جوان ٥ پیاوی توکن.

**المُلْهَبُ**: قوماشێك زۆر سورنەبێ.

**اللاهُوت**: خودایەتی، سروشتی خودایی ٥ وەکوو چۆن (الناسوت) ناوە بۆ سروشتی ئادەمیزادیی.

**لَهَثَ الكلب لَهْثاً ولُهاثاً**: سەگەکە زمانی دەرکێشا لەگەرمان یان لەتینوان.

**لَهِثَ الرَّجُلُ**: پیاوەکە ماندوبوو (فهو لَهْثانُ وهي لَهْثى).

**إلْتَهَثَ الكلبُ وغيره**: بەمانا (لَهِثَ) دێ.

**اللُّهَاثُ**: گەرمی تینوایەتی لەدەروون دا ٥ دەشگوترێ: (هو يقاسي لُهاث الموت) ئەو ئازاری مردن دەچێژێ.

**اللُّهاثِيُّ**: کەسێك زۆر خاڵی سوری بەروخسارەوە بن ٥ دەم و چاوی زیبکاوی بن.

**اللُّهْثَة**: تینوایەتی ٥ ماندویی.

**لَهِجَ بالأمر لَهَجاً**: وەگری کارەکە بوو، بەردەوام بوو لەسەری و باری بەئیشەکەوە گرت ٥ (فهو لهِج ولاهج).

**لَهِجَ الفصيل بضرع أمه**: بێچوەکە گوانی دایکی گرت.

**لَهِجَ الفصيلَ أمُّهُ**: بێچوەکە گوانی دایکەکەی گرت و دەیمژێ ٥ (فهو لَهوج)

**ألهَجَ بالأمر**: بەمانا (لَهَجَ) دێ.

**ألْهَجَ فلان**: فلانکەس بێچوە ئاژەڵەکانی گوانەکانی دایکیان گرت و شیریان مژی.

**ألْهَجَ الفصيلَ**: دەمبێنی لەدەمی بێچوەکان کرد بۆ ئەوەی نەتوانن گوانی دایکیان بمژن.

**لَهْجَةُ**: زەلاتەو موقەبیلاتی دەرخوارد دا.

**لَهْوَجَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بەشێوەیەك هێشتەوە نەباش قایمی كردبوو نەبەرەللای كردبوو.

**لَهْوَجَ الطعامَ**: خواردنەكەی باش نەكولاند ◦ هەروا دەگوترێ: (حديث ملهوج قسەی نەچەسپاو، قسەیەك بەبێ لێ وردبوونەوە بێژرابێ.

**تَلَهْوَجَ الشَّيْءَ**: بەپەلە شتەكەی كرد.

**تَلَهْوَجَ اللَّحم**: گۆشتەكەی نەكولاند.

**إلْهاجُ الشَّيْءِ**: شتەكە هەندێكی تێكەلاوی هەندێكی بوو بەتەواوی خەست نەبۆوە.

**إلهاجت عينُه**: چاوی لیلۆ پێل بوون بۆخەو.

**اللَّهْجَة**: زمان، زاراوەی زكماكی مرۆڤ ◦ دەگوترێ: (فلان فصيح اللهجة): فلانكەس زمانڕەوانە ◦ شێوە زاراوە ◦ جەرەسی قسەكە.

**اللُّهْجَة**: زەلاتەو موقەبيلاتی پێش نانخواردن، دەق بەمانا (اللُّمَجَةُ) دێ.

**الْمُلَهَّجُ**: كەسێك بنوێۆ پالبكەوێ و نەتوانێ ئیش بكا.

**لَهَدَهُ الحِمْلُ لَهْداً**: كۆلۆ كۆلبار تينی بۆ هێناو پشتی چەماند ◦ (فهو ملهودٌ وهيد).

**لَهَدَ دابَّتَهُ**: ولاخەكەی تاودا، دەنەدەنەی دا بۆئەوەی خێرا بڕوا.

**لَهَّدَ فلاناً**: پاشەو پاش پالی بەفلانكەسەوە ناو دەری كردو بێ ڕێزی بەرامبەر كرد.

**لَهَدَ ماني الإناء**: ئەوەی لەقاپەكەدا بوو خواردیۆ لستیەوە.

**ألْهَدَ الرجلُ**: پیاوەكە ستەمی كرد.

**ألْهَدَ الى الأرض**: داهێزایە سەر زەویۆ پالێ كەوت.

**ألْهَدَ به**: گالتەی پێ كرد.

**ألْهَدَ بفلان**: فلانكەسی گرتو یەكێكی تری دەنگ دا لێی بدا ◦ فلانكەسی فێری وەلامدانەوەو قسەكردن كرد.

**اللَّهْدُ**: پیاوی قونگرانی زەلیلۆ بێ دەسەلات ◦ دەردێكە توشی قاجۆ ڕانی مرۆڤ دەبێ.

**المُلَهَّدُ**: (رجل مُلَهَّدٌ) پیاوێكە هیچۆ پوچۆ بێ دەسەلات لەبەردەرگای مالان دەردەكرێۆ پالی پێوە دەنرێ.

**لَهْذَمَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بڕیەوە، دوولەتی كرد.

**تَلَهْذَمَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بڕیەوە، دوولەتی كرد ◦ خواردی.

**اللَّهاذمة**: دزو جەردە.

**اللَّهْذَمُ**: هەرشتێك بڕندە بێ (ددان، كەلبە، كێرد، شمشێر) ◦ دەگوترێ: (سيف لَهْذَمٌ) شمشێرێكە تیژە.

**لَهَزَ الشيبُ فلاناً**: پیری لەفلانكەس دا دەركەوت ◦ دەگوترێ: (لَهَزَهُ الشيبُ)

پیری تێکەڵاوی بووەو مووی سپی بەسەرو ڕیشی دا بڵاو بوونەوە ٥ (فهر ملهوز).

**لَهَزَ القومَ**: تێکەڵاوی خەڵکەکە بوو چووە ناویانەوە.

**لَهَزَ فلاناً بالرِمح**: بەرمب لەسنگی فلانکەسی دا.

**لَهَزَ فلاناً**: بەمستەکۆڵە لەسەرو گوێلاکی فلانکەسی دا.

**لَهَزَ البعيرَ**: لالغاوی حوشترەکەی نیشانەکرد.

**لَهَزَ الفصيلُ أمَّه**: بێچوەکە لەکاتی شیرخواردنی دا قۆچی لەگوانی دایکەکەی هەڵدەدا بۆئەوەی شیری بداتێ.

**لَهَّزَ فلاناً**: بەهەموو دەستی لەلاشەویلەو لاملی دا.

**اللّاهِزُ**: کێو یان تەپۆڵکە کە ڕێگا تەنگ بکەنەوە.

**اللِّهازُ**: پینەیەکە کونی گەورەی پێ تەسك دەکرێتەوە ٥ دەگوترێ: (ضَبَّقَ البكرة باللِّهاز).

**اللُّهزُ**: بەهێز.

**اللَّهْزَةُ**: لاشەویلە.

**المِلْهَزُ**: ئەوەی مستەکۆڵەو شەپلاغە لەلاشەویلەو ئەستۆو لاملی خەڵك دەدا.

**المُلَهوزُ**: تێکسمڕاو.

**لَهْزَمَ فلاناً**: لاشەویلەی هەنگاوت.

**لَهْزَمَ الشيبُ خديه**: پیریو مووی سپی لەسەر لاڕومەتی پەیدا بوون ٥ دەشگوترێ: (لَهْزَمَهُ الشّيْبُ) پیریو مووی سپی لەسەر لاڕومەتەکانی پەیدابوو.

**اللِّهْزِمَةُ**: ئێسقانی لاشەویلە ٥ بەهەردوو لا دەگوترێ (لهزمتان).

**لَهَسَ على الطعام لَهْساً**: پاڵەپەستۆی لەسەر خواردنەکە کردو هەوڵی زۆری دا بیگاتێ بۆ ئەوەی بیخواو بیلێسێتەوە.

**لَهَصَ الصبي ثدي أمه**: منداڵەکە بەدەست لەمەمکی دایکی داو نەیمژی.

**لاهَسَ على الشّيْئ**: بۆ شتەکەی چوو هەوڵی دا بیگاتێو سوور بوو لەسەر بەدەستهێنانی ٥ دەگوترێ: (لاهَسَ على الطعام) فلانکەس خۆی کوتاو هەوڵی دا بگاتە سەر خواردنەکە ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان يلاهِسُ بني فلان) فلانکەس هەمیشە دەچێتە سەر سفرەو خوانی خێڵی فلان.

**اللّهاسُ**: خواردنی کەم.

**اللُّهاسَةُ**: بەمانا (اللُّهاس) دێ.

**اللُّهْسَةُ**: دەگوترێ: (ما لك عندي لُهْسَةٌ) ئەتۆ هیچت لای من نییە.

**لَهَسَمَ ماعلى المائدة**: چی لەسەر سفرەکە بوو خواردی.

**اللُّهْسُمُ**: دەراوی شیوی تەنگ ٥ (ك: هاسم).

**لَهَطَت الأم به لَهْطاً**: دایکی بەوەڵەدی هێنا ٥ دەگوترێ: (لَعَنَ الله أماً لَهَطَتْ به) نەفرین لەو دایکەی ئەوی بەوەڵەدهێناوە.

**لَهَطَ فلان**: فلانکەس بەدەستو بەقەمچی لێی دا.

**لَهَطَهُ**: لێی دا، بەبەری دەستی شەپلاغەی لێ دا.

**لَهَطَ الشَّيْءَ بالماء**: بەئاو لەفلانی دا ئاوی لەفلان گرت.

**لَهَطَ به الأرضَ**: بەزەویدا دا.

**لَهَطَ فلاناً بسهم**: تیری لەفلانکەس گرت.

**لَهَطَ الثوبَ**: قوماشەکەی درو.

**اللَّاهِطُ**: کەسێکە بەردەرگای خۆی ئاو رشێن بکاو بیمالێ.

**لَهِعَ فلان لَهَعاً ولهاعَةً**: فلانکەس وەلامی نارد بۆلای هەموو کەس.

**لَهِعَ في الكلام**: لەقسەکردن دا درێژەی دایە.

**تَلَهْيَعَ في كلامه**: زۆری قسەکرد، زۆر بلێ بوو.

**اللُّهاعَةُ**: بێ ئاگایی ٥ دەگوترێ: (رجل فيه لُهاعَةُ) پیاوێکە بێ ئاگایی تێدایە.

**اللُّهيعَةُ**: بەمانا (اللُّهاعَةُ) دێ ٥ تەمبەڵیو بێ ئاگایی ٥ دەگوترێ: (في فلان لُهيعةٌ) فلانکەس لەکرینو فرۆشتن دا گێلیو نەفامیەکی پێوە دیارە هەمیشە زەرەردەکا.

**لَهِفَ على الفائت لَهَفاً**: خەمو خەفەتی بۆ شتە فەوتاوەکە دەربڕی ٥ (فهو لَهِفٌ ولَهيف ولاهِفٌ ولهفان) ٥ (وهي لاهف ولاهفة ولَهْفى) هەروا دەگوترێ: (هو لاهف القلب) ئەو دڵ سوتاوە.

**لُهِفَ لَهَفاً**: ستەمی لێ کرا ٥ (فهو ملهوف).

**أَلْهَفَ**: چلێس بوو هەڵپەی بۆ کرد.

**لَهَّفَ**: هاواری بۆ برد ٥ هانای بردە بەر.

**لَهَّفَ فلان نَفْسَهُ وأمَّهُ**: فلانکەس دایکەڕۆی کرد وتی: دایەگیان! دایکەڕۆ، بۆ خۆم ڕۆ.

**تَلَهَّفَ على الفائت**: خەمی فەوتاوەکەی خوارد ئاخو ئۆفی بۆ کرد.

**اللَّهْفُ**: غەمو ئاهو حەسرەت ٥ دەگوترێ: (يالَهْفَ فلان) ئای داخی بەجەرگم بۆ فلانکەس ٥ دەشگوترێ: (يالهفي عليه) داخو ناسۆرم بۆی، بۆ نەمانی.

**اللَّهفان**: غەمبار ٥ کۆست کەوتو.

**اللَّهْفَةُ**: دەربڕینی غەمو ناڕەحەتی لەسەر فەوتانی شتێك، لەدەستدانی خۆشەویستێك.

**اللّهيف**: ستەم لێكراو ناچار بوو بۆئەوەی هاوار بكاو خەمو پەژارە دەربېرێ ٥ دەگوترێ: (رجل هيف القلب) پیاوێكی دڵ سوتاو ٥ دڵ برژاو.

**المَلْهوفُ**: بەمانا (اللّهيف) دێ.

**لَهَقَ الشَّيْئُ لَهَقاً**: شتەكە سپی بوو ٥ (فهو لَهِق ولَهَق).

**لَهْوَقَ فلان**: فلانكەس شتێكی دەرخست لەسروشتی دا نیە ٥ چەند ڕەوشتێكی جوان دەخاتە پاڵ خۆی كە تێیدا نین.

**لَهْوَقَ العملَ أو الكلامَ**: كردارەكەی باش ئەنجام نەدا ٥ قسەكانی بەرێك و پێكی نەكردن.

**تَلَهَّقَ الشَّيْئُ**: شتەكە سپی بوو.

**تَلَهَّقَ الرجلُ**: پیاوەكە زۆری گوت و درێژەی بەقسەكانی دا.

**تَلَهْوَقَ**: بەمانا (لَهْوَقَ) دێ ٥ ماستاوچی بوو.

**اللّهاقُ**: گای سپی ٥ هەرشتێك سپی بێ ٥ دەگوترێ: (أبيض لَهاق أو لِهاق) سپی زۆر سپی.

**المُلَهَّقُ**: (شيئ مُلَهَّقُ اللون) شتێكە ڕەنگی زۆر سپیە.

**لَهِمَ الماءَ لَهْماً**: ئاوەكەی خواردەوە.

**أَلْهَمَهُ اللهُ خيْراً**: خودا خێرو چاكەی خستە دڵیەوە ٥ فێری كرد.

**إلْتَهَمَ الشَّيْئَ**: بەیەكجار شتەكەی قوت دا، ئاودیوی كرد.

**إلْتَهَمَ الفصيلُ مافي الضرع**: بێچووە ئاژەڵەكە چی لەگوانی دایكی دا بوو خواردی.

**أُلْتُهِمَ لَوْنُهُ**: ڕەنگی گۆڕا.

**تَلَهَّمَ الشَّيْئَ**: بەیەكجار شتەكەی قوت دا.

**إسْتَلْهَمَ اللهَ خيْراً**: داوای لەخودا كرد خێرو فەڕ بخاتە ناو دڵیەوە.

**الإلهام**: ئەوەیە شتێك بهاوێژرێتە ناو دڵەوەو دەرون پێی ئارام بگرێ، هاویشتنی ئیلهام بۆ ناو دڵەكان حاڵەتێك و پلەو پایەیەكە پەروەردگار تایبەتی دەكا بە هەندێك لەبەندە هەڵبژاردەكانی.

**اللُّهامُ**: (جيش لُهامٌ) سوپایەكی گەورە، وەكوو ئەوە هەموو شتێك قوت بدا.

**اللَّهْمُ**: بەتەمەن، تەمەندرێژ.

**اللَّهِمُ**: زۆر خۆر.

**اللَّهَمُ**: خاوەن خێرو بێری زۆر، بەخشندەو سەخی ٥ ئەسپی ڕەسەن ٥ مرۆڤی وەجاخزادە ٥ دەگوترێ: (رجل لَهِمٌ) پیاوێكی ڕادروست و

بەخۆچاراوە ٥ هەروا وشەی (اللُّهِمُ) ناوە بۆ دەریای گەورەو ئاو زۆر.

**اللُّهُومُ**: زۆر خۆر.

**اللَّهَـيْمُ**: (أمُّ اللَّهـيم) بـەلاو كارەسـات ٥ لـەرزوتا ٥ مـردن ٥ (لـەم رووەوە كـە مـــردن خـــەڵك و زينـــدەوەر قـــوت بدات).

**اللَّهَمُ من الرجال**: پیاوی زۆر خۆر.

**اللِّهَمُ من الرجال**: پیاوی زۆر خۆر.

**اللَّهِـــمُ**: ئەســـپی رەســـەن، پیـــاوی وەجاخزادەو چوست و چالاك.

**اللُّهْمُومُ**: بەمانا (اللُّهْمِـمُ) دێ ٥ خێـرەو مەنـــدو ئانبـــدە، ســـوپای زۆر ٥ حوشترێك شیری زۆر بێ ٥ هـەورێك بـارانی زۆر ببارێنـێ ٥ ژمـارەی زۆر لەهەر شتێك بێ.

**اللُّهْمِـــمُ**: بـــەمانا (اللُّهْمِـــمُ) دێ ٥ دەگـوترێ: (جَمَـلٌ لِهْمِـمٌ) حوشـتری گەدە زل ٥ (ك: لهامم).

**اللَّهَنَـــةُ**: شـتێكی بـەدیاری بـۆ هێنـا لەســـەفەر ٥ كەهاتـــەوە لەســـەفەر خواردنێكی بەدیاری دایە.

**لُهْنَـــةُ**: زەلاتـەو موقـەبیلاتی پـێش نانخواردن پێدا ٥ یان كـە لەسەفەر هاتـەوە خـواردنێكی بـەدیاری بـۆ هێنا.

**اللُّهْنَـــةُ**: ئـەو دیاریەیــە بەموســافیر كەهاتـەوە دەیـدا بەخۆشەویـستی ٥ زەلاتـــەو موقـــەبیلات كـــەپێش نـــانخواردن كـــابرا خـــۆی پێـــوە دەخافڵێنـــێ ٥ دەشـــگوترێ: (مـــا وجـدت الماشـیة إلا لَهْنَـةً) ئاژەڵـەكان لەوەڕی زۆر كەمیان دەست كەوت.

**لها بالشيئ لَهْواً**: یاری بەشتەكە كرد.

**لَهَتِ المرأة الى حديث صاحبها**: ئافرەتەكە بەقسەی دەستە خوشكەكەی سەرسام بوو جوان گوێی بۆ گرت.

**لهـا عَـنْ الـشَّيْئِ لُهِيـاً ولِهْيانـاً**: بـڕوی شتەكەی ئاو باسی نەكردەوە.

**لَهِيَ به لهاً**: خۆشی ویست.

**لَهِيَ عَنْ الشَّيْئِ**: بڕوی شتەكەی ئاو باسی نەكردەوە.

**الْهـى فـلان**: فلانكـەس بەخـشـشی زۆر بوو.

**الهاه اللَّعِبُ عَنْ كذا**: گاڵتەو یاری ئـەو شتەی لەیاد بردەوە.

**الهى الرَّحى**: لوێـچێكی دانەوێڵە كردە نـاو زاركـی دەســتاڕەكە بـۆ ئـەوە بیهاڕێ ٥ دەشگوترێ: (ألْهيت لفـلان لهوة من المـال) شـتێكم مـاڵ و سامان دایە فلان.

**لاهىَ الـشَّيْئَ**: لەشـتەكە نزیـك بۆوە ٥ شتەكەی لەخۆی نزیك كردەوە.

**لاهى الغلامُ الفطـامَ**: منداڵەكە لـەكاتی شیر لێ بڕینەوە نزیك بۆوە.

**لاهيَ فلاناً**: كێشەی لەگەڵ فلان نایەوە ٥ چاکەی دایەوە بەرامبەر پیاوەتی ئەو ئەمیش پیاوەتی لەگەڵ کردەوە.

**لَهّاهُ بكذا**: بەو شتە بەلگەی بۆ هێنایەوە، بەو شتە پاساوی بۆ هێنایەوە.

**إلْتهى بالشيئِ**: یاری بەشتەکە کرد.

**إلْتهى عنه بغيره**: بەشتی تر مەشغوڵ بوو ئەمی لەیاد چوو.

**تلاهى بالملاهي**: بەنامێری یاری کردن یان بەیاری کردنەوە مەشغوڵ بوو.

**تلاهى القومُ**: خەڵکەکە یارییان لەگەڵ یەکتر کرد.

**تَلَهّى بالشيئِ**: یاری بەو شتە کرد ٥ پاساوی بەشتەکە هێنایەوە.

**إسْتَلْهى صاحِبَهُ**: هاوەڵەکەی ڕاگرت، هەڵوێستەی پێ کرد ٥ چاوەڕوانی کرد.

**إسْتَلهى الشَّيْئَ**: زۆری لەو شتە وەدەست هێنا.

**الألْهُوةُ**: شتێك مرۆڤ یاری پێ بکاو خۆی پێ بخافڵێنێ ٥ دەگوترێ: (بينهم أُلْهُوَةٌ يتلاهون بها).

**الألْهِيَّةُ**: بەمانا (الألْهُوَةُ) دێ ٥ قسەو حیکایەتێك کاتی پێ بەسەر بەرێو خۆتی پێ بخاافڵێنی.

**اللُّهاءُ**: ئەندازە ٥ دەگوترێ: (هم لُهاء مائة) ئەوان ئەندازەی سەد کەس دەبن.

**اللُّهاةُ**: ئاڵو ٥ ئەو گوشتەی بەسەر گەرووەوەیە یان زمانەبچکۆلە ٥ (ك: لُهوات ولَهيات ولُهِي ولَهاً) دەگوترێ: (فلان تُسَدُّ به لَهوات الثغور) فلانکەس کەلێن‌و کونی سەر سنوری لێ دەگیرێن.

**اللَّهْوُ**: گاڵتەو گەپ ٥ هەرشتێك یاری پێ بکرێ‌و مرۆڤ خۆی پێ بخافڵێنێ ٥ تەپڵ‌و دەف.

**اللُّهْوَةُ**: بەخشش ٥ باشترین دیاری‌و بەخشش ٥ دەشگوترێ: (إشتراه بلُهْوَة من ماله) بەچنگە پارەیەك کڕی ٥ هەزار دینار هەزار درهەم ٥ لێچە دانەوێڵە کە دەکرێتە زارکی دەستاڕەوە.

**اللَّهْوَةُ**: بەمانا (اللُّهْوَةُ) دێ ٥ ئافرەتێك پیاو لەگەڵی ڕابوێرێ.

**اللُّهُوُّ**: دەگوترێ: (فلان لَهُوٌّ عَنْ الخير) فلانکەس زۆر پشت لەخێرو پیاوەتی دەکا ٥ شوێنی یاری (یاریگا).

**المَلْهى**: شوێنی یاری‌و ڕابواردن ٥ دەگوترێ: (هذا ملهى القوم) ئەمە شوێنی مانەوەی خەڵکەکەیە ٥ (ك: الملاهي).

**المَلاهي**: ئامێری یاریو ڕابواردنو خۆ خلافاندن ٥ وەکوو عودو کەمانو سازو سەمتور.

**المَلهاةُ**: شانۆنامەیەکی پەخشان ئامێز یان هۆنراوە، باسی عەیبو عاری خەڵك دەکا بەشێوەی گاڵتەجاڕی.

**لَهْوَجَ**: بڕوانە مادەی (لَهَج).

**تَلَهْوَجَ**: بڕوانە مادەی (لَهَجَ).

**تَلَهْوَقَ**: بڕوانە مادەی (لَهَقَ).

**لَوْ**: حەرفی شەرتە.

**لابَ الرجلُ أو البعيرِ لَوْباً ولواباً ولَوَباناً**: پیاوەکە تینوی بوو ٥ بەدەوری ئاوەکەدا خولایەوە و تینوایەتی تینی بۆ هێنا بوو دەستی نەدەگەییە ئاوەکە ٥ (فهو لائِبٌ) ٥ (ك: لُووبٌ).

**الأبَ فلان**: فلانکەس حوشترەکانی بەدەوری ئاوەکەدا خولانەوە تینویان بوو دەمیان نەدەگەیە ئاوەکە.

**لَوَّبَ الشَّيْئَ**: شتەکەی تێکەڵاوی شتی بۆندار کرد، یان شتی بۆنخۆشی لەشتەکە هەڵسو.

**اللّابَةُ**: گارانە حوشتری کۆبۆوەی ڕەنگ ڕەش ٥ زەوییەك خاکەکەی بەرداوی بێو بەردەکانی ڕەش بن ٥ (ك: لابات ولابٌ).

**اللّوبُ**: هەنگ ٥ پارچە گۆشت کەلەناو مەنجەڵ دا هەڵدەخولێن.

**اللّوبَةُ**: قەومێك لەگەڵ قەومێکی تردا بژینو پرسو ڕایان بەیەکتر نەبێ ٥ زەوی بەردەڵان بەردەکانی ڕەش بن.

**اللّوبِيا**: دانەوێڵەیەکە، بەکوردیش هەرناوی (لۆبیا)یە جۆرەکانی زۆرن.

**المَلابُ**: جۆرە بۆنێکی خۆشە وەکوو خەلوقو زەعفەران.

**المُلَوَّبُ**: ئاسنی بادراو.

**لاث لَوْثاً**: هەواڵی شتێکی دا کەپرسیاری لێ ناکرێ لەو شتە.

**لاث فلاناً**: مافی فلانکەسی کەم کردەوە.

**اللاّتُ**: بتێك بوو لەوڵاتی تائیف هۆزی سەقیف دەیان پەرست بڕوانە مادەی (لتت).

**لاتَ**: وشەیەکە بەمانا (لَيْسَ) دێو مانای (نیە) دەگەیەنێ ٥ بەتایبەتی دەچێتە سەر وشەی (حين) ٥ دەگوترێ: (ولات حين مناص) کەلەبناغەدا ڕستەکە بەم جۆرە بووە (ولات الحينُ حين مناص).

**لاثَ الشجرُ والنباتُ لَوْثاً**: درەختەکە یان ڕووەکەکە بەیەکدا هاتنو تێکهاڵان ٥ (فهو لائث ولاثٌ ولاثٍ).

**لاثَ فلان في الأمر**: فلانکەس تەمبەڵی کرد لەنەنجامدانی کارەکەدا ٥ (مالاث فلان ان غلب فُلاناً) هێندەی نەبرد فلانکەس بەسەر فلانکەس دا زاڵ بوو.

**لاثَ عَنْ الحاجة:** ئیشەکەی بەتەمبەڵی بەرێوە برد.

**لاثَ العمامةَ علی رأسه:** مێزەری لەسەری پێچاو بەستی.

**لاثَ الشَّيْئَ:** شتەکەی دووجار دەوران دەور کردەوە وەکوو چۆن مێزەر بەدەوری سەردا دەهێندرێ.

**لاثَ الشَّيْئَ بالشيئ:** شتەکەی تێکەڵ بەشتەکەی تر کرد.

**لاثَ الشَّيْئَ في التراب:** شتەکەی لەگەڵ وەردا ٥ قوڕاوی کرد.

**لاثَ الشَّيْئَ:** شتەکەی لەناو ئاودا هێناو بردو دەستی پێداهێناو باش باش تەڕی کرد ٥ (لاثَ الشيئَ في الفم): شتەکەی لەدەمی دا جو، هێنای‌و بردی ٥ دەگوترێ: (لاثَ لَوْثاً من كلام) قسەیەکی بەتوێکڵ‌و پێچ‌و پەنای کرد ڕوی نەهات ڕاستەوخۆ و بەڕەوانی قسەکە بکا چونکە قسەکە شەرمی لێ دەکرا.

**لاثَ فلان:** فلانکەس لەقسەکردنی دا هێواش بوو زمانی کول‌و کۆڵ بوو، لاوازو شل‌و شێواو بوو ٥ ئەحمەق‌و گێل بوو ٥ توشی شێتی بوو (فهو ألْوَثُ وهي لوثاء).

**ألاَث:** دەگوترێ: (ألث به مالي) ماڵەکەم بەئەمانەت لای ئەو دانا.

**ألْوَثَتِ الأرضُ:** زەوی لەژێر پوش‌و پەڵاشی ساڵی ڕابردو دا گیای تەڕی ڕواند، تەڕو پوش تێکەڵاو بوو.

**ألْوَثَ النباتُ والشجرُ:** ڕوەکەکە یان درەختەکە تێکهاڵان.

**ألْوَثَ الشَّيْئَ:** شتەکەی هێشتەوە.

**ألْوَثَ المطرُ النَّباتَ:** بارانەکە ڕوەکەکانی بەملاو بەولادا خست.

**لَوَّثَ الشَّيْئَ بالشيئ:** شتەکەی تێکەڵاو بەشتەکەی تر کرد ٥ دەگوترێ: (لَوَّثَ الشَّيْئَ في التراب) شتەکەی لە خۆڵ وەردا.

**لَوَّثَ الشَّيْئَ:** شتەکەی لەناودا هەڵگلۆفت‌و دەستی پێدا هێنا تاباشباش لەگەڵ ئاوەکەدا تێکەڵ بوو.

**لَوَّثَ فلاناً عَنْ كذا:** فلانکەسی لەو شتە مەنع کرد.

**لَوَّثَ الماءَ:** ئاوەکەی لیڵ کرد.

**إلْتاثَ النباتُ:** ڕوەکەکە هەندێکی لەهەندێکی هاڵاو تێکچرژان.

**إلْتاثَ الشَّيْئُ بالشيئ:** شتەکە بەشتەکەی تر تێکەڵ بوو ٥ دەگوترێ: (إلْتاثَتِ الخطوب) کارەساتەکان تێکەڵ بوون‌و تێك بوونەوە.

**إلتاثَ بالدم:** بەخوێن ڕەنگ بوو خوێنی تێ هەڵسوا.

**إلْتاثَ عَلَيْهِ الأمْرُ:** کارەکانی لێ تێکەڵو پێکەڵ بوون.
**إلْتاثَ في العمل:** لەکارەکەدا تەمبەڵی کرد.
**إلْتاثَ في کلامه:** لەبەڵگە هێنانەوەکەی دا زمانی تێکەڵو پێکەڵ بوو زمانی تەتڵەی کرد.
**تَلَوَّثَ ثوبُهُ بالطين:** قوماشەکەی قوڕاوی بوو، تەپو تۆزو خشتو خۆڵی پێوە نیشت.
**تَلَوَّثَ الماءُ، الهواءُ:** ئاو و هەواکە پیس بوو مەوادی زیانبەخشو نامۆیان تێکەڵ بوو.
**اللُّوَاثُ:** پەیینکە (ئارد: کە بەکەوڵو شوێنی دانانی هەنگوتکە هەوێرە وەدەکرێ بۆئەوەی هەویرەکە پێوەی نەنووسێ ٥ ئەو ئاردە پێی دەگوترێ: پەیینکە).
**اللُّواثَةُ:** بەمانا (اللُّواثُ) دێ ٥ هەرشتێك لەشتی تر هەڵبوسورێ.
**اللَّوْثُ:** هێزو توانا ٥ شەرو نەگبەتی ٥ شێوە بەڵگەیەك لەسەر ڕوداوێكو نەبێتە بەڵگەی تەواو ٥ دەگوترێ: (لم يفهم على إتهام فلان بالجناية إلا لوثٌ) هەروا وشەی (اللَّوث) ناوە بۆ برین ٥ بانگەشە بۆ قینو کینە لەیەکتر.
**اللَّوْثَةُ:** گێلیو هارەبەتانی.
**اللُّوثَةُ:** گێلیو ئەحمەقی ٥ شلو شێواویو تەمبەڵی ٥ زمانگیران ٥ جۆرە شێتییەك ٥ تۆپی لەپەڕۆو پیتاڵ دوراوو دروستکراو بۆ یاری.
**اللَّويثَةُ:** کۆمەڵو تاقمی پێکهاتو و لەهۆزو خێڵی جیاجیا.
**اللَّيِّثُ:** دەگوترێ: (نبات لَيِّثٌ) ڕوەکێکە تێکهاڵاوەو بەسەر یەکدا لاڵو پاڵ کەوتووە.
**المُلَيِّثُ:** تەمبەڵ لەبەر قەڵەوی.
**لاجَ الشَّيْئُ لَوْجاً:** شتەکەی لەدەم دا هێناو برد، جوی.
**اللَّوْجاء:** پێداویستی ٥ دەگوترێ: (ما ترکت في صدره حوجاء ولا لوجاءً إلا قضيتها).
**لاحَ الشَّيْئَ لَوحاً:** شتەکە دەرکەوت ٥ دەگوترێ: (لاح الشيبُ في رأسه) پیری لەسەری دا دەرکەوت.
**لاحَ الرجلُ:** پیاوەکە ناسراو دەرکەوت ٥ (لاح لي أمرك) کاری تۆم بۆ ڕون بۆوە ٥ (لاح النجم) ئەستێرەکە دەرکەوتو درەوشایەوە.
**لاحَ فلان لَوْحاً ولِواحاً:** فلانکەس تینوی بوو.
**لاحَ الی الشَّيْئِ لوحاً:** لەدورەوە بۆ شتەکەی ڕوانی.

**لاحَ العطشُ أو السَّفرُ أو الحزنُ فلاناً:** تینوایەتی یان سەفەر یان خەمو خەفەت فلانکەسی کزو کۆڵەوار کرد.

**لاحَ البرقُ:** بروسکە چەخماخەی دا.

لاحە ببصرە: بەچاو بینیو لێی گوم بوو.

**ألاحَ الشَّيْئُ:** شتەکە دەرکەوتو ناسرا ٥ دەگوترێ: (ألاحَ الرجلُ، و ألاحَ النجم و البرق).

**ألاحَ بسيفه:** شمشێرەکەی ڕاوەشانو بریسکەی لێ پەیدا بوو.

**ألاحَ بثوبه:** لکێکی قوماشەکەی گرتو سوڕاندیەوە بۆئەوەی هرکەسێ حەزی لەبینینی بێ لەدورەوە بیبینێ.

**ألاحَ بحقه:** مافی خۆی برد.

**ألاحَ من فلان:** شەرمی لەفلان کرد، ترسی لێی بوو، بەزەیی پێدا هاتەوە.

**ألاحَ على الشَّيْئ:** پشتی بەشتەکە بەست.

**ألاحَ فلاناً:** فلانکەسی فەوتاند.

**لَوَّحَ بالشيئ:** شتەکەی دەرخست، بریسکەی لێ پەیدا کرد.

**لَوَّحَ بسيفه:** شمشێرەکەی ڕاوەشاندو بریسکەی لێ پەیدا کرد ٥ (لَوَّحَ بثوبه) لکێکی قوماشەکەی گرت ڕاینواند بۆئەوەی لەدوورەوە ببیندرێ.

**لَوَّحَ للكلب:** نانی نیشان سەگەکە دا بۆئەوەی شوێنی بکەوێ.

**لَوَّحَ فلاناً بالعصا أو السيف أو السَّوْط أو النعل:** لەفلانکەسی دا بەگۆچان یان بەشمشێر یان بەقامچی یان بەنەعل.

**لَوَّحَ البردُ أو السُّقْمُ فلاناً:** سەرما یان نەخۆشی فلانکەسی کزو کۆڵەوار کرد ڕەنگو ڕوی گۆڕی ٥ دەگوترێ: (لَوَّحَته الشمسُ) خۆر ڕەنگی گۆڕی.

**لَوَّحَ الشيبُ فلاناً:** پیری ڕوخساری فلانکەسی سپی کردووە.

**لَوَّحَ الشَّيْئَ بالنار:** شتەکەی بەئاگر سوورکردەوە.

**إلْتاحَ:** تینوی بوو، گۆڕا.

**تَلَوَّحَ الأمرُ:** کارەکە ڕون بۆوە ئاشکرا بوو.

**إستلاحَ:** لەکارەکەیدا وشیار بوو.

**اللائحة:** دیاردە ٥ (ك: لَوائح) ٥ دەگوترێ: (نظرت الى لوائحه) سەیری دیاردەکانیم کرد ٥ کۆمەڵێك مادەی یاسایین دادەنرێن بۆ ڕێکخستنی کاروبار لە فەرمانگەیەك دا یان لە کۆمپانیاو مەصلەحەو مونەسەسەیەك دا.

**اللَّـوْحُ**: هـەر صـەفیحەو فەبارەیـەکی تەختەئاسا لەدار بێ یان لە ئێسقان یان لەشتی تر بێ.

**لَـوْح الإردواز**: لەوحەیـەکی بەردینـە بەناسانی نووسینی لەسەر دەسڕێتەوە (لَوح الجسد) هـەر ئێسقانێك یان بێ وەکـوو شـەپیلکی شـان ٥ دەگـوترێ: (فـلان تـام الألـواح) فلانکـەس جەسـتەگەورەیە ٥ هـەروا دەگـوترێ: (ولم یبق منه إلا الألواح) فلانکەس تەنها ئێسقانەکەی ماوەتـەوە ٥ دەشگوترێ: (نظـرت الی ألواحـه) روانیمـە دیـاردەو دیمەنەکانی.

**ألواح السلاح**: ئەوەی لەشمشێرو ڕمبو شـتی وا بریسکەی لێ پەیـدا دەبێ لەبەر سپیەتی.

**اللَّوْحَـة**: چـاو تێهەڵـەنگوتن ٥ سەیرکردنێکی خێرا ٥ لەوحەیـەکی کاغـەزی ئەستورە یـان چندراوێکی ئەستوورە، دیمەنێکی سروشتی یـان ڕوداوێکـی مێـژوویی بەشـێوەیەکی فـەننیو سـەرنج ڕاکـێش لەسـەری نەخش دەکرێ.

**اللُّوحُ**: تینوایەتی ٥ هەوای نێوان زەوی و ئاسمان.

**اللَّیاحُ**: شتی سپی لەهـەر شتێك بـێ ٥ دەگوترێ: (أبـیض لَیـاحٌ) سـپی زۆر سـپی ٥ دەگـوترێ: (لقیتـە بلیـاح) لەکاتی دەمـەو عەسـردا خـۆر هێشتا بەئاسمانەوە بوو توشی بووم ٥ هەروا وشەی (اللّیاح) ناوە بۆ بەیانی.

**المِلْـواحُ**: ئێـسقان ئەسـتورو کەتـە ٥ مرۆڤـی قـەدباریك ئەسـپی ورگ بچوك ٥ تینـو ٥ ئافرەتێـك زۆر کـزو لاواز بێ ٥ درێـژ ٥ ئاژەڵێـك زوو زوو تینـــوی بـــێ ٥ کوندەپـــەپو دەبەسترێتەوە بۆئەوەی بکرێتـە داو و تەڵــە بــۆ گرتنــی بــاز ٥ (ك: ملاویح).

**المِلْـوَحُ**: هـەر گیانلەبـەرێك زوو تینـوی ببێ.

**المِلْیاحُ**: بەمانا (المِلْواحُ) دێ.

**لاخه لَوْخاً**: تێکەڵاوی کرد.

**إلْتـاخَ الـشَّیْئُ**: شـتەکە تێکـەڵ بـوو ٥ هەویر کەبگورێو هەڵبێ.

**اللُّواخَةُ**: ڕۆنی تواوە لەناو ماستو شتی وادا.

**لَوِذَ لَوَذاً**: ملی ئەداو ژێربار نـەبوو ٥ ڕوی لەعەدالـەتو حـەقخوازی نـەکرد ٥ لەکارەکەی ئەکۆڵیەوە ٥ (فهو ألْوَذُ).

**الألْـوَذُ**: دەگـوترێ: (عنـق الـوَذُ) ئەستۆیەکی ئەستورو پتەو.

**لاذ بالشیئ لَوْذاً ولیاذاً**: پەنای بۆ شتەکە برد، خـۆی خـستە پاڵیـەوە خـۆی لەپـەنا قـایم

كرد ٥ دەگوترێ: (لَجَأ إليه وأستغاث به) هانــای بــۆ بــردو داوای یارمــەتیو بەهاناوە چوونی لێ كرد.

لاف الطريــق بالــدار: ڕێگاكــە بــەدەوران دەوری خانوەكەدا كراوە بوو.

ألاذ بالشيئ: خۆی خستە پەناشتەكەو شــتەكەی كــردە قــەڵاو ســەنگەر بۆخۆی.

ألاذ الطريــقُ بالــدار: ڕێگاكــە دەوران دەوری خانوەكەی داوە.

لاوَذ بالشيئ لواذاً وملاوَذةً: بەمانا (لاذ) دێ.

لاوذ القــومُ: خەڵكەكــە هەنــدێكیان پەنایان بۆ هەندێكیان برد.

لاوز فــلان: فلانكــەس چــەندو چــونی كــردو فــرتو فێڵی هێنایە پێشەوە بۆئەوەی ڕزگاری بێ.

التَلْــواذُ: دەگــوترێ: (للقــوم تِلــواذ) خەڵكەكــە هانــا بۆیــەكتر دەبــەنو بەهانای یەكترەوە دێن.

لِــواذ الــشّيْئ: نزیكــی ئــەو شــتە: دەگوترێ: (لــه مــن الــدراهم مائــة أو لواذها) سەد درهەم یان نزیكی سەد درهەمی هەیە.

اللاّذُ: قوماشێكی ئاوریشمییە لەچین دەچندرێ.

اللّــوْذُ: قــەراخی كێــو ٥ دەگــوترێ: (إعْتَصَمَ بَلَوْذِ الجبــل وبلــواذه) هــەروا وشەی (اللُوذ) ناوە بۆ چاڵو چوێڵی نــاو شــیو ٥ ناحیــەو دەڤــەر ٥ دەگــوترێ: (هــو یطــوف في ألــواذ الــبلاد) ئــەو بــەناو دەڤــەرو ناوچــەكانی وڵات دا دەســوڕێتەوە ٥ دەشگوترێ: (هــو لَــوْذە) ئــەو لێــی نزیكە.

لَوْذان الشّيْئ: ناحیەو ناوچەی شت.

الملاذ: پەناگە ٥ قەڵاو سەنگەر.

المَلاوِذُ: پشتیوان.

لاز علیه لَوزاً: پەنای بۆ برد.

لاز الشّيْئَ: شتەكەی خوارد.

لاز منه: لێی ڕزگار بوو.

لَــوَّزَ القطـــنُ: پەمۆكــە بەرەكــەی دەركەوت.

لَوَّزَ التَمْرَ: خورماكەی بەبادامو شتی وا ناواخن كرد.

اللّوز: درەختێكی بەردارە گوڵ دەكا، وادەبێ بادامەكەی شیرینە وادەبێ تاڵ دەبێ ٥ (بایەوە شیرینەو بایەوە تاڵە).

اللّــوْزَةُ: گۆشــتێكە لەپــەنا قــوڕگ ٥ لــەملاو ئــەولای گــەرو پێیــان دەگــوترێ: ئــاڵو ٥ دەگــوترێ: (هــو یــشكو لوزتیــە) ئــەو مرۆڤــە لەوزمتەینی (ئاڵوی) ئازاریان هەیە ٥ هــەروا وشــەی (اللّــوزة) نــاوە بــۆ تۆپی سمت.

**لَوْزَةُ القطن**: بەری پەمۆ.

**اللَّوْزِين**: لەبواری کیمیادا بەمادەیەکی سپی دەگوترێ کەلەناوکە بادامی تاڵ دەردەهێندرێ، هەروا لەناوکی کشمیش‌و ناوکە قۆخ دەردەهێندرێ‌و تێکەڵ بەناو دەکرێ‌و بری ترشەڵۆکی لێ پەیدا دەکرێ

**اللَّوزینج**: جۆرە حەڵوایەکە ڕۆنی بادامی تێدەکرێ.

**اللَّوَّازُ**: بادام فرۆش.

**المَلازُ**: پەناگە.

**المَلازَةُ**: (أرض مَلازَة) زەوییەکە درەختی بادامی زۆرە.

**المُلَوَّزُ**: ڕوخساری جوان‌و شیرین ◦ (رجل مُلَوَّز) پیاوی ڕۆح سوک.

**لاسَ الشَّيْءَ لَوْساً**: شتەکەی چەشت، خواردی.

**لاس الحلاوات**: بەشوێن شیرینیەکاندا گەڕاو خواردنی (فهو لائِسٌ) ◦ ئەو شیرینی خۆرە.

**لاس الشَّيْءَ في فمه**: بەزمانی شتەکەی لەناو دەمی دا هێناو برد ◦ دەشگوترێ: (هو لا يلوس كذا) ئەو مرۆڤە دەستی ناگاتە ئەوە.

**اللَّواسُ**: دەگوترێ: (ماذقت لَواساً) هیچم نەچەشتووە.

**اللُّواسَةُ**: پارو یان کەمتر لەپارو.

**اللُّوْسُ**: دەگوترێ: (ماذاق عنده لَوْساً) هیچی لەلا نەخوارد.

**لاصَ الشَّيْءَ بعينه لوصاً**: لەکون‌و کەلەبەرڕا سەیری شتەکەی کرد، یان لەژێر پەردەوە بۆی ڕوانی.

**لاصَ عَنْ الأمر**: لەکارەکە دوورکەوتەوە، خۆی لێ پاراست.

**لاصَ بالشيئ لياصاً**: بەدەوری شتەکەدا سوڕایەوە.

**ألاصَهُ على الشَّيْئ**: بەدەوری شتەکە سوڕاندیەوە، لە شتەکەی هاڵاند، لێی داواکرد ◦ دەگوترێ: (ألصت أن آخذ منه شيئاً) ویستم شتێکی لێ داوا بکەم ◦ لێی وەربگرم.

**لاوَصَهُ بعينه**: چاوی بەدەوریدا گێڕا.

**لاوَصَهُ إليه**: سەیری کرد، تێی ڕوانی وەکوو ئەوە کارێکی پێی بێ.

**لاوَصَ فلاناً**: فێڵی لەفلانکەس کردو ماستاوچیەتی بۆ کرد.

**لاوَصَ الشجرة**: ئەمدیو و ئەو دیوی لەقەدی دارەکە کرد بۆ ئەوەی بزانێ چۆنی دەبڕێتەوە و لەکوێوەی دەست پێ دەکا.

**لَوَّصَ**: هەنگوینی صاف‌و بێ کەرەشانی خوارد.

**تَلاوَصَ**: ماستاوچیەتی کرد، فێڵ‌و تەڵەکەی کردن.

تَلَوَّصَ: پێچو پەنای کردن هەڵسوڕو داسوڕی کرد.

اللَّواصُ: هەنگوێنی صاف ٥ حەڵوای دروستکراو لەئاردو ئاو و هەنگوین ٥ (لوقمەقازی).

اللَّوْصُ: ئازاری گوێچکەو نەستۆ ٥ ئازاری بینەخڕە.

اللَّوصَةُ: پشت ئێشان بەهۆی سەرماو شتی وا.

المُلَوَّصُ: حەڵوای لەهەنگوینو ئاو و ئارد دروستکراو (لوقمەقازی).

لاطَ الشَّيْئُ بالشيئ لوطاً: پێوەی نووسا.

لاط الشَّيْئُ بقلبِي: ئەو شتەم بەدڵەوە نووسا ٥ (هو أَلْوَط بقلبِي) ئەو باشتر بەدڵمەوە دەنووسێ.

لاط فلان لِواطاً: فلانکەس نێربازی کرد، پیشەو کرداری گەلی لوطي پەیڕەو کرد.

لاط بحقه: مافی برد مافی خۆی نەدایە.

لاط القاضي فلاناً بفلان: دادوەر بڕیاری دا کەفلان کوڕی فلانە.

لاط الحوض بالطين: حەوزەکەی بەقوڕ سواخ دا.

لاط فلاناً بسهم وعين: فلانکەسی بەچاو هەنگاوت یان بەتیر پێکای.

لاط الشَّيْئَ: شتەکەی شاردەوە ٥ پەردەپۆشی کرد.

لاوَطَ: نێربازی کرد پیشەو ڕەوشتی قەومی لوطي ڕەچاو کرد ٥ (شذوذی جینسی هەبوو).

لَوَّطَ بالطيب: بۆنی خۆشی لێ دا ٥ بۆنی خۆشی تلێهەڵسو.

إلتاطَ به: پێوەی نووسا.

إلْتاطَ الوَلَدَ: کوڕی کابرایەکی تری بەکوڕی خۆی لەقەڵەم دا.

إستلاط ولداً ليس منه: کوڕێکی بێگانەی بەکوڕی خۆی دانا.

اللَّوْطُ: شتێك بەشتی ترەوە بنووسێ ٥ دەگوترێ: (إني لأجِدُ في قلبِي لَوْطاً) هەست دەکەم دڵم خۆشەویستییەکی پێوە نووساوە ٥ پیاوی کردار جوان ٥ پاڵتۆو عەبا.

اللُّطِيُّ: کەسێك ڕەوشتی قەومی لوط پەیڕەو بکا.

اللُّوطية: کەسێك کارو ڕەوشتی قەومی لوط پەیڕەو بکا.

اللُّويطة من الطعام: خواردنێك تێکەڵاو بووبێ تێکهاڵابێ.

لاطَهُ لَوْطاً: دەری کرد لەخۆی دوورخستەوە ٥ بەربەرەکانی کرد.

إلتاطَت عَلَيْه الحاجةُ: پێداویستییەکەی نەهاتەدی.

لاعت الشمس فلاناً لوعاً: خۆر ڕەنگی فلانکەسی گۆڕی.

**لاعَ الحبُ فلاناً**: خۆشەویستیو دلّداری فلاّنکەس نەخۆشی خست (فالحب لائع) ٥ دەشگوترێ: (لاعه الهمُ والحزن) خەمو خەفەت نەخۆشی خست، دلّی سوتاند.

**ألاعَ الثديُ**: گۆی مەمکەکە ڕەش هەلگەڕا.

**ألاعت الشمسُ الشّيْئَ**: خۆر ڕەنگی شتەکەی گۆڕی.

**لَوَّعه الشوْقُ**: شەوقو دلّداری دلّی برژاند.

**إلتاعَ فؤاده**: دلّی بەهۆی عیشقو دلّدارییەوە برژا.

**اللاّعَةُ**: ئەو سۆزو ئەوینەیە کە مرۆڤ بەرامبەر مندالّو کەسو کاری خۆی هەیەتی ٥ لەحەدیس دا هاتووە ٥ (إني لأجد من اللاّعَة ما أجد لولدي) هەروا وشەی (اللاّعة) ناوە بۆ مرۆڤی ورەبەرزو مەرد ٥ ئافرەتی قسەخۆشو زمان شیرینو دوور لەشكو گومانی خراپ.

**اللوعــةُ**: ئازارو هەلّقرچانو سوتاوییەکە مرۆڤ لەناکامی خۆشەویستی یان خەمو خەفەتو شتی وا لەناخی دا هەستی پێ دەکا ٥ ڕەشایی دەوری گۆی مەمك.

**لافَ الطعامَ لَوْفاً**: خواردنەکەی خوارد لرشی دا ٥ یان خواردنەکەی جو ٥ دەگوترێ: (أصبح فلان يلوف الطعامَ لوفاً حتى إعتدل وإستقامَ شِبَعاً).

**لافت الدَّابةُ الكلأ**: ولاّخەکە لەوەڕەکەی بەوشکی خوارد.

**اللُوفُ**: ڕوەکێکە بەدارو دیوار هەلّدەگەڕێو لەلقو پۆپی شت دەهالّێ چەند جۆرێکی هەیە خۆڕسكو ڕوێندراو.

**اللُوفَةُ**: لەلەوەڕی ئاژەلّو خواردنی مرۆڤ بەو جۆرەیان دەگوترێ: کەناخۆشەو حەزی لێ ناکرێ.

**اللّوّافُ**: تەونکەر ئەوکەسەی مافورو بەڕەو قالّی تەون دەکا.

**اللّيّفُ**: وشکە لەوەڕ.

**المَلوُفُ**: دەگوترێ: (کلأ ملوف) لەوەڕێکە باران شۆڕ بۆوە ٥ باران شتویەتیەوە.

**لاقَ الشّيْئَ لَوَقاً**: شتەکەی نەرم کرد.

**هو لا يَلوقُ عندك**: ئەو لای تۆ داناسەکنێو جێگیر نابێ.

**لَوِقَ لَوقاً**: ئەحمەقو گێل بوو ٥ (فهو ألْوَقُ) ئەحمەقو گێلێك کە نەزانێ قسە بکا پێی دەگوترێ: (ألْوَق).

**لَوَّقَ الشّيْئَ**: شتەکەی نەرم کردەوە.

**لَوّقَ الطعامَ**: خواردنەکەی بەڕۆن چاك کرد ٥ دەگوترێ: (لا آكل إلا مالُوِّقَ لي) من خواردنێك نەرم

نەکرابێتــەوە نــایخۆم، خواردنێــك نەخرابێتە ناو ڕۆنەوە نایخۆم.

**اللَّوَاقُ**: دەگوترێ: (ماذاق لَوَاقاً) هیچی نەچەشتووە.

**اللُّــوقُ**: هەرشــتێك نــەرم کرابێتــەوە لەخواردن‌و شتی وا.

**اللُّوْقَةُ**: سەعات.

**اللُّوَقَةُ**: رونەکەرە ◦ ڕۆنەکەرەو خورمـا ◦ یان ڕۆن‌و خورما.

**لاکه لوکاً**: شـتەکەی لـەدەمی دا هێنـاو بردو جوی.

**لاك اللُّقمـةَ**: پارووەکـەی جـو ◦ بەهێواشـی جوی.

**لاك الفـرسُ اللِّجـامَ**: ئەسـپەکە لغاوەکـەی گەست، جوی ◦ دەشکوترێ: (فلان یلوك أعراض الناس) فلانکەس عـەیب‌و عـار پــاڵ خــەڵك دەداو هەمیــشە زوبــانی لەغەیبەتکردن دا بەکاردێنێ.

**اللُّواكُ**: دەگوترێ: (ماذاق لَواکا) هیچی نەچەشتووە.

**لولا**: پیتێکە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە فلان شت نابێ لەبەر بوونی فلان شـت ◦ بەعـەرەبی پێـی دەگـوترێ: (حـــرف إمتنـــاع لوجـــود) ◦ جـاری واهەیە (لَوْلا) مانای هەڵنانی تێدایە ◦ وادەبێ لۆمەو سەرزەنشتی تێدایە.

**اللُّــولاءُ**: زیـــان‌و تـــەنگ‌و چـــەڵەمە ◦ دەگوترێ: (وقعوا في اللُّولاء) کەوتـە ناو چورتم‌و تەنگانەوە.

**اللَّوْلَبُ**: ئاوی زۆر کەبەفیـچقەو تـەوژم لـەزارکی گـۆزەو بـۆری‌و شـتی واوە دێتــە دەر ◦ ئامێرێکــە لــەدار یــان لەمەعـــدەن بـــە شـــێوەیەکی حەلـەزۆنی کۆتـایی دێ ◦ لـەبواری میکانیکــا بــە ئــامێرێکی شــت بەرزکردنەوەی قورس دەگوترێ.

**اللَّــولَبِيُّ**: ئـەو شتەیە لەسـەر شێوەی لەولــەب بــێ ◦ دەگــوترێ: (ســلم لولبـــي) پەیــژەو قالدرمەیــەکی حەلەزۆنییە.

**الحركة اللَّولَبية**: سواڕنەوەی قەبارەیەکە بــەدەوری ســەنتەرێکی چەســپاودا وێـڕای جوڵەیـەکی گواسـراوە بـەرەو ئەوسەنتەرە.

**لامَهُ على كذا لَوْماً**: سەرزەنشتی کرد ◦ (فهــو لائــم) ◦ (ك: لُــوَّم، ولــیم) ◦ دەگـوترێ: (أنت ألوم مـن فـلان) تـۆ زیــاتر شــیاوی ئــەوەی سەرزەنــشت بکرێی تا فلانکەس.

**لــیمَ بالرجــل**: لەمپــەر خرایــە نێــوان پیاوەکــەو مەبەســتەکەی ◦ هۆکــاری گەیـشتن بەمەبەستەکانی دەستە بـەر نەبوون.

**ألام فــلان**: فلانکــەس کــارێکی کــرد سەرزەنشتی بکرێ ◦ یـان فلانکـەس بوو بەلۆمەکار.

**ألام فلاناً**: سەرزەنشتی فلانکەسی کرد.

**لاومَهُ ملاومة ولِواماً**: هەریەك لەوانە سەرزەنشتی ئەوی تریانی کرد.

**لَوَّمَهُ**: سەرزەنشتی کرد، زۆری سەرزەنشت کرد.

**إلتامَ**: قبوڵی سەرزەنشتی کرد.

**تَلاوَموا**: خەڵکەکە هەریەکەیان لەناستی خۆیەوە لۆمەی ئەوی تری کرد.

**تَلَوَّمَ على الأمر**: لەسەرکارەکە مایەوە ە هەڵوێستەی لەسەر کارەکە کرد ە دەگوترێ: (تَلَوَّمَ في الأمر) لە کارەکەدا مایەوەو چاوەڕوان بوو ئاخۆ ئاکامی چی دەبێ.

**إستلام**: شیاوی لۆمەکردن بوو.

**إستلام الى ضيفه**: باش خزمەتی میوانەکەی نەکرد.

**اللائمة**: سەرزەنشتکار ە دەگوترێ: (إستحق اللائمة وانحى عَلَيْهِ باللائمة).

**اللاّمُ**: دەنگێکە لەدەنگەکانی هیجا واتە پیتی (لام) ە بەهێزو پتەو لەهەر شتێك بێ ە کارەسات‌و بەلا ە کەسایەتی مرۆڤ.

**اللاّمة**: بەڵاو کارەسات ە کارێك جێگای سەرزەنشت بێ.

**اللُّوامَةُ**: پێداویستی ە دەگوترێ: (قضى القوم لُوامات هم) خەڵکەکە پێداویستی خۆیان جێبەجێ کرد.

**اللَّوْمُ**: بەڵاو جۆرتم.

**اللَّومى واللُّوماء**: ئافرەتی سەرزەنشتکار.

**اللَّوْمة**: هەڵە ە دەگوترێ: (جاء بلومة) تاوانی ئەنجام دا.

**اللُّوَمَةُ**: (رجلٌ لُوَمة) پیاوێکە زۆر سەرزەنشت دەکرێ.

**الْمُتَلَوِّم**: کەسێك خۆ بخاتە حاڵەتێکەوە لۆمە بکرێ ە کەسێك چاوەڕوان بێ کاری بۆ جێبەجێ بکرێ.

**المَلامُ والمَلامَةُ**: سەرزەنشت.

**لَوما**: وشەیەکە وەکوو وشەی (لولا)وایە دەچێتە سەر ڕستەی نیسمی‌و فیعلی ئەوە دەگەیەنێ کە ڕستەی دووەم نابێ لەبەر بوونی ڕستەی یەکەم ە وادەبێ مانای هەڵنانی تێدایە ە قورئان دەفەرموێ: ﴿لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِالْمَلَائِكَةِ﴾: ئەوە بۆچی فریشتە نایەتە سەرمان؟.

**لَوَّن**: ڕەنگی لێ پەیدا بوو ە دەگوترێ: (لَوَّن البُسْرُ) خورماکە ئاڵ‌و بۆڵی تێکەوت.

**لَوَّنَ الشيبُ فيه**: موی سەروریشی سپی بوون‌و نیشانەی پیری تێدا دەرکەوت.

**لَوَّنَ الشَّيْئ**: شتەکەی ڕەنگ کرد، ڕەنگێکی تێدا پەیدا کرد.

**تَلَوَّن الشَّيْئُ**: شتەكە ڕەنگی گرت.
**تَلَوَّن فلانٌ**: فلاّنكەس لەسەر ڕەوشتێك بەردەوام نەبوو.
**إلْوَنَّ**: بەمانا (تَلَوَّن) دێ.
**التَّلْـــوِينُ**: پێـــشكەشكردنی جۆرەهـــا خواردەمـــەنی بـۆ لـەزەت وەرگـرتن، گۆڕانكاری لەئوسلوبی قسەكردن دا.
**اللَّـــوْنُ**: ڕەنـــگ: كـــە دیاردەیەكـــە بەقـــەبارەوە، یـان بلـێ: عەرەزێكـە بەجیسمەوە ٥ (ك: ألـوان) ٥ هـەروا وشـەی (اللَّون) نـاوە بـۆ جـۆری شـت دەگـوترێ: (أتی بـألوان مـن الحـدیث والطعـــــام) جۆرەهـــا قـــسەو خواردەمەنی هێنایە پێشەوە.
**المُلَوَّنــون مــن النــاس**: بــەو خەڵكانــە دەگوترێ كە سپی پێست نین.
**لاهَ الــسَّرابُ لَوْهــاً ولوهانــاً**: تراویلكەكـە شەپۆلی داو بریسكایەوە.
**تَلَوَّهَ السَّرابُ**: بەمانا (لاهَ) دێ.
**اللُّهَةُ**: مار.
**لَوْهُ الــسَّرابِ ولَوْهَنَــهُ**: بریقەو بریـسكەی تراویلكـە ٥ دەگـوترێ: (رایــت لَــوْهَ السراب ولَوْهَنَهُ).
**ألْـوی فـلان**: فلاّنكـەس زۆری خۆزگـە خواســتنو زۆرجـار وشـەی (لَــوْ)ی دوبــارەكردەوە وتــی: خۆزگــە وام بكردایەو وام نەكردایە.

**الألُـوَّةُ**: ڕەگـەزی ڕوەكـی (الزنبقیـة)یـە لەوڵاتی گەرمە سێر دەڕوێ.
**الألُـــوَّةُ**: درەختـــی (المارزبونیـــة)یـە ٥ نـــەمامی درەختـــی (الألنجوجیـــة) كەبسوتێندرێ بۆنێكی خۆشی لێ دێ ٥ پێشی دەگوترێ: (العود الهندي).
**اللَّــوُّ**: ئاخـاوتنی بەئەسـپایی ٥ پـوچو بەتاڵ ٥ دەگوترێ: (لایعرف الحَوَّ من اللَّوِّ) حەقو بەتاڵ لێك جیاناكاتەوە ٥ خۆزگــە خواسـتنو بریـاگوتن ٥ دەگـوترێ: (إیّاك من اللَّوّ فإن اللَّوَّ من الــشیطان) خــۆ بپــارێزە لــەگوتنی وشـەی (لَـوْ) دوای چـووە مەكـەوە، مـەڵێ خۆزگـە وام بكردایـە كاشكێ وام نەكردایــە، بریــا وام بگوتایــە چونكە ئـەم حاڵەتـە لـە وەسوەسـەو ئاڕاستە كردنی شەیتانە.
**اللَّــوَّةُ**: خــراپو ناشـیرین ٥ دەگــوترێ: (لَــوَّةً لِفــلان بمــا صــنع) خراپــیو ناشـیرینی بــۆ فــلان بــەهۆی ئــەو كردەوەیەوە.
**اللُّوَّةُ**: بخور سوتاندن.
**لــوی عَلَیْـهِ لیـاً ولویـاً**: لای لێ كـردەوە ٥ چــاوەڕوانی كــرد ٥ دەگــوترێ: (مَــرّ لایلــوی علــی أحــد) ڕۆیــشتو ئــاوڕی لەهیچ نەدایـەوەو هەڵوێستەی لەسـەر هیچ نەكرد.

**لَـوى الـشَّيْئَ**: شـتەکەی بـاداو دوولای کردەوە ◊ (لوی الحَبْلَ) حەبلەکەی بادا دوولای کـردەوە ◊ هـەروا دەگـوترێ: (لوی یَدَه وإصبَعَه) دەستی نوشتاندەوە، قامکی نوشتاندەوە.

**لَـوى الثـوب**: قوماشـەکەی گوشـیو هـــەڵیگلۆفت بۆنـــەوەی ئـــاوی پێوەنەمێنێ.

**لوى رأسَهُ وبرأسه**: سەری خۆی ڕاوەشاند ◊ جاری وایش دەبێ مانای ڕو لێوەرگێران دەگەیەنێ.

**لَوى الحزنُ قلبه**: خەمو خەفەت دڵی ناسك کردۆتەوە.

**لَـوى فلانـاً دینَـهُ ویدینـه**: قـەرزی فلانـی دواخست.

**لَوى فلاناً حَقَّهُ**: ئینکاری حەقی فلانکەسی کردو نەچووە ژێری.

**لَوى أمرُهُ**: کارەکەی شاردەوە پەردەپۆشی کرد.

**لَوى عنه الخَبَرَ**: هەواڵەکەی بەناڕاست پێ ڕاگەیاند.

**لَوى سِرَّهُ**: نهێنیەکەی شاردەوە.

**لَوى فلاناً على فلان لَیّاً**: فلانکەسی پێش فـلان کـرد، هـەروا دەگـوترێ: (لَـوّت اللیالي کَفَّهُ علـى العـصا) ڕۆژگـار پیری کردو ناچاری کرد گۆچان تاوداتێ ◊ بۆ پیاوی ئازا دەگوترێ: (مـایُلْوى ظهـرُهُ) پشتی ناچەمێ ◊ کەس ناتوانێ پشتی لەزەوی بدا.

**لَوِيَ الفرسُ**: ئەسپەکە پشتی خوار بوو ◊ (فهو لَوٍ) (لَوِی القرن) شاخ خوار.

**لَوِيَ الطریقُ**: ڕێگاکە دووربوو، نەزانـدراو بوو.

**لَـوِی الکـلأ**: لەوەڕکـە وشـك بـوو، یـان وشكو تەڕە.

**اَلْوى برأسه**: سەری خۆی خـوارکردەوە، سەری دانەواند.

**اَلْـوى الإنسان**: مرۆڤەکـە ڕۆیـشت بـۆ لمبەلانەکـە ◊ مرۆڤەکـە زۆر وتـەی خۆزگـەو کاشـکێو بڕیـاری دوبـارە کردەوە.

**اَلْوى فلان**: فلانکەس کشتو کاڵەکەی وشك بۆوە ◊ ئەو شتەی بەدانیسقە هـەڵی گرتبـو بـۆ خۆیـان میـوان خواردی.

**اَلْـوى البقـلُ**: گیـاو گژەکـە ڕوتایـەوەو وشك بوو.

**اَلْوى بالشيئ**: شتەکەی برد.

**اَلـوى بیـده أو بثوبـه**: بەدەسـتی یـان بەدەستەسڕو شتی وا ئاماژەی کرد.

**اَلْوى بحقه**: ئینکاری مافی ئەوی کرد.

**اَلْوى بهم الدهر**: ڕۆژگار لەناوی بردن.

**اَلْـوى العقـابُ بالـشیئ**: داڵاشـەکە شتەکەی فڕاندو بردی.

**أَلْوى اللِّواءَ:** ئالای دروستکرد یان ئالای بەرزکردەوە.

**لاوَتِ الحيةُ الحيةَ ملاواة:** مارەکە خۆی لەمارەکە باهەڵدا.

**لَوَّى عَلَيْهِ الأمْرَ:** کارەکەی لێ قوڵ کردەوە.

**لَوَّى أعناق الرجال في الجدال:** بەسەر پیاوەکاندا زاڵ بوو.

**إلْتَوى الشَّيْئُ:** شتەکە بادراو دوولا هاتەوە.

**إلْتوى الأمْرُ:** کارەکە قورس‌و ئەستەم بوو.

**إلْتَوَت على حاجتي:** کارەکەم لەسەرم گران وەستا.

**إلْتَوى عَنْ الأمر:** لەکارەکەدا قونگرانی کرد.

**تلاووا عَلَيْهِ:** لێی کۆبوونەوە.

**تَلَوَّى الشَّيْئُ:** شتەکە بادراو دوولا بۆوە.

**تَلَوَّتَ الحيَّةُ:** مارەکە پاپۆکەی بەست.

**تَلَوَّى البرقُ في السحاب:** هەورە بروسکەکە چەخماخەی داو بەچەند لایەك دا بروسکەکە ڕوناکی دا.

**إسْتلوى بهم الدهرُ:** ڕۆژگار لەناوی بردن.

**الإلْتِواء:** لەزاراوەی ئەندازیاریی دا بریتییە لەحاڵەتێکی قەبارە کەلایەکی بچەسپێ‌و لاکەی تر لەسوچێکەوە باهەڵبدرێ.

**الألْواءُ:** قولایی شێو ٥ دەفەرو ناوچەی وڵات.

**اللاّوِياء:** ئامێری داخکردن.

**اللَّوى:** بەمانا (اللاّئي) دێ، ئازارێکە لەگەدەدا پەیدا دەبێ.

**اللّوىَ:** لمبەڵان کەبەرزونزمی تێبکەوێ ٥ یان کۆتایی لمبەڵان.

**اللِّواءُ:** ئالا؛ ئەمە ئالایەکە لەئالای فەرمی بچوکترە ئالای ڕەسمی پێی دەگوترێ: (الراية) ٥ لەزاراوەی عەسکەریدا (اللّواء) پلەیەکی سەربازییە لەژوور پلەی عەقیدەوە لەخوار پلەی فەریقەوەیە.

**اللُّوَاءُ:** باڵندەیەکە لەوڵاتی شام ناسراوەو پێی دەگوترێ: (أبو لُوَي) ئەم باڵندە دەتوانێ ملی خۆی بۆ دواخۆیەوە وەرچەرخێنێ‌و بای بدا.

**اللّوِيُّ:** لەوەڕی وشك ٥ یان لەوەڕی تێکەڵ بوو لەتەڕوپۆش.

**اللَّوِيَّةُ:** ئەو خواردنەی لەخەڵکی تری دەشاریەوە و پەزمەندەی دەکەی بۆخودی خۆت یان بۆ میوان.

**اللَّيَّانُ:** بەندکردن پێچەوانەی بەرەڵایی‌و ڕەهابوون.

**اللِّيَّةُ**: خزمی نزیكو نزیكتر ٥ داری عودو بخورد.

**الملاوي**: ڕێگەی خوارو خێچ ٥ لەمزاراوەی مۆسیقادا بریتییە لەپارچە دارێك بۆ پێكەوەبەستنی ژێیەكان.

**ملتوى الوادي**: چاڵی‌و قورت‌و پێچی شیو ٥ دەگوترێ: (بلغوا ملتوى الوادي).

**لاتَهُ عَنْ الأمر لَيْتاً**: مەنعی كرد لەكارەكەو لای دا.

**لات فلاناً حقه**: حەقی فلانكەسی كەم كردەوە.

**لات فلاناً**: هەواڵی ناڕاستی دا بەفلان ٥ دەگوترێ: (ما ألاته من أجره شيئاً): هیچی لەكرێیەكەی كەم نەكردەوە.

**اللَّيْتُ**: لامل.

**لَيْتَ**: حەرفی موشەبەهـ بەفیعلەو تەمەنناو خۆزگە دەگەیەنێ ٥ بەزۆری بۆشتی محاڵ بەكاردێ وەكوو شاعیر دەڵێ (ألا لَيْتَ الشبابَ يعود يوما فأخبره بما فعل المشيب).

**لايَثَهُ ملايَثَةً ولياثاً**: بازی بۆدا، شانازی كرد بە خۆ شوبهاندنی بەشێر.

**لَيَّثَ فلان**: فلانكەس وەكوو شێری لێ هات ٥ خۆی بەیەكێك لەهۆزی (بنی لیث) لەقەڵەم دا ٥ یان وەكوو هۆزی بەنی لەیس دەمارگیر بوو.

**تَلَيَّثَ فلان**: بەمانا (لَيَّثَ) دێ.

**إسْتَلْيَثَ فلان**: فلانكەس وەكوو شێری لێ هات لەئازایەتی دا.

**الألْيَثُ**: ئازاو چاونەترس ٥ دەگوترێ: (هو ألْيَثُ أصحابه) ئەو ئازاترینی هاوەڵەكانیەتی، لەهەمووانیان زیاتر وەرەبەرزو چاونەترسە ٥ (ك: ليثٌ).

**اللاّئث**: شێر.

**اللَّيْثُ**: بەهێزو توانا ٥ شێر ٥ ئازاو چاونەترس ٥ زمانڕەوان ٥ جۆرێكە لەجاڵجاڵۆكە مێش‌و شتی وا نێچیر دەكا ٥ (ك: ليوث).

**لَيْث عِفْرين**: پیرۆیەكە وەكوو جانەوەری حەرباو وایە.

**اللَّيثةُ**: دێڵە شێر ٥ (ك: لَيْثات) ٥ هەروا ناوە بۆ حوشتری بەهێز.

**المِلْيَثُ**: بەهێزو تواناو بەهەڵمەت‌و چوست‌و چالاك.

**المُلَيَّثُ**: قەڵەو (فَحْلُ مُلَيَّثٌ) كەڵێكی بەهێزو توانایە دەڵێی شێرە.

**لَيِسَ فلان لَيَساً**: ئازا بوو ٥ لەماڵ دانیشت‌و نەهاتەدەر.

**لَيِسَ عنه**: لێی بێ ئاگابوو ٥ (فهو ألْيَسُ) ٥ (ك: لِيسٌ).

**تلايَسَ فلان**: فلانكەس ڕەوشت بەرز بوو.

**تلايَسَ عَنْ كذا**: چاوی لەو شتە نوقاند.

**الأَلْـيَسُ**: ئـەو كەسـەيە لـەماڵی خـۆی دەرنـەچـێو لەچـوار دیـواری مـاڵی خـۆی دانیـشێ ◊ (خـوێڕیو گـەواد، ئـەو كەسـەی دەزانـێ مـاڵو منـداڵی ڕەوشت نزمن بەلام هیچ هەڵوێستی پیاوانـە نانوێنـێ ◊ شـێر ◊ حوشـتر كـەباری لێ دەنـرێو مـل درێـژ دەكا جینگە جینگ ناكا ◊ (ك: لِیس).

**المُلاپِسُ**: تەمبەڵو قونگران.

**لَیْسَ**: وشەیەكە نـەفی وەزعو حـاڵ دەكا ◊ ئەمـە فیعلێكـی نـەگۆڕەو یـەك شـێوەی هەیـە ◊ ئیسم مـەرفوع دەكـاو خـەبـەر مەنصوب دەكا ◊ دەگوترێ: (لَـیْسَ زیـدٌ قائماً).

**لاصَ عنه لَیْصاً**: لێی كلابوو لێی لاداو لێی دووركەوتەوە.

**لاصَ الشَّیْئَ**: شتتەكەی لەقاندو جولاندی بۆئەوەی شتەكە دەربهێنێ.

**ألاصَ الشَّیْئَ**: بەمانا (لاصَهُ) دێ.

**ألاصَ فلاناً عَنْ كـذا**: فلانكـەس چاو و ڕاوی كرد، فێڵی كرد.

**لاطَ بالـشیئ لَیْطـاً**: بەشـتەكەوە نووسـا ◊ دەشـگوترێ: (فـلان مـایلیط بـه النعیم) فلانكەس شیاوی نازو نیعمەت نیە.

**لاطَ الـشَّیْئُ بقلبـه**: شـتەكە بەدڵیـەوە نووساو لای خۆشەویست بوو.

**لاطَ القاضي فلاناً بفلان**: دادوەر فلانكەسی كـردە كـوڕی فـلانو بەوەچـەو نـەوەی ئەوی دانا.

**لاطَ اللّهُ فلاناً**: خودا نەفرینی لەفلانكەس كـردو لەڕەحمـەتی خـۆی دووری خستەوە.

**ألاطَهُ**: پاڵ ئەوی دا، كردیە كوڕی ئەو.

**اللِّیاط**: ڕەنگ ◊ كلسو گەچ.

**اللِّـیطُ**: تـوێكڵی هەرشـتێك ◊ پێـست ◊ (ك: أَلیـاط) ◊ ڕەنـگ ◊ دەگـوترێ: (أتیته ولِیطُ الـشمْسِ لم یُقـشر) هـاتم بۆلای بەیانی هێشتا ڕەنگو سورایی كەناری ئاسمان هەرمابوو واتە خۆر هەڵنەهاتبوو.

**اللِّیطَـةُ**: تـوێكڵی قەصـەب ◊ كـەوان ◊ هەرشتێك پتەوبێ.

**لاعَ لَیعاً ولیعاناً**: هاتو هاواری كرد، گریا ◊ ناڕازی بوو ◊ غەمبار بوو.

**لاعَ الجوعُ فلاناً لَیْعَةً**: برسایەتی فلانكەسی برژاند.

**لاعَ لَیْعَـةً**: ناڕەحـەت بـوو هـاواری كـرد ◊ (فهو لائع وهي لائعة).

**ألاعَ**: ناڕازی بوو، خەمو خەفەتی خۆی دەربڕی.

**اللِّیاع**: (ریح لیاع) ڕەشەبای بەهێز یان گەرم.

**لَیْعَـةُ الجـوع**: ناوسـك چـوزانەوەو هەڵقرچانی گەدە.

**المِلْياع**: حوشترێك زوو تینوی بێ ٥ یان ئەو حوشترەیە پێش گاڕانە حوشترە دەكــەوێو دەڕواو پاشــان بۆلایــان دەگەڕێتەوە.

**لاغَــهُ الــشَّيْءَ لَيْغــاً**: داوای شــتەكەی لێ كرد بۆئەوەی لێی بستێنێ.

**تَلَيَّغ**: ئەحمەق بوو.

**الأَلْيَغُ**: ئەو كەسەی لەقسەو ئاخاوتنی دا زۆر پیتـــی (ی) بـــەكاربێنی ٥ دەگوترێ: (فلان ألثغ أليغ).

**اللاّئـغ**: (طعام سـائغ لائـغ) خواردنێكە بەئاسانی قوت دەچێ.

**لاف الطعام**: خواردنەكەی خوارد.

**لَيَّفَــت الغــسيلة**: ئەمامەكە پتەو بــوو توێكڵی ئەستور بوو.

**لَيَّفَ الشَّيْءَ**: شتەكەی بە (لیفە= پڕزو پاڵی درەخت) شت.

**لَيَّف اللِّيفَ**: لیفەی كردن.

**اللِّيـــــفُ**: تــــوێكڵی دارخورمــــا كــــە بەتەنیشت لقەكانیەوەیە.

**اللِّيفاني**: ڕیش پڕوپانو درێـژ ٥ (لحيـة ليفانيــة) ڕێـشێكی پــڕو پــانو بــڵاوە بوو.

**لاقــــت الــــدواةُ لَيْقــــاً**: مەرەكەبەكــــە بەلیقەكەوە نووسا.

**لاق الدَّواةَ**: بۆ قەڵەمو ئوچەكەی لیقـەی باشی دانـاو ئـوكی قەڵەمەكەی خـاوێن كردەوە.

**لاق الشَّيْءُ به لَيْقاً ولِياقاً**: شـتەكە پێـوەی نووسا ٥ دەگـوترێ: (لاق الشَّيْءُ بقلبـي) شتەكە بەدڵمەوە نووسا ٥ (هـذا أمـر لا يليق بـك) ئەمـە بۆتـۆ ناگونجـێ ٥ (مـا لِقْتُ بعدك بأرض) دوای تۆ دڵم بـەهیچ شـوێنێكەوە نانوسـێ ٥ (فـلان مـا يليـق بكفــــه درهــــم) فلانكــەس پــارە بەدەســـتیەوە نامێنـــێ ٥ هــــەروا دەگوترێ: (هذا سيف لايُلِيقُ شيئاً) ئەمـە شمشێرێكە هەرشتێكی بەربێ دەیبڕێ ٥ هەروا دەگـوترێ: (ليق الثريـد بالـسمن) تریتەكەی زۆر چەوركرد.

**التاق لـه**: لەگـەڵی كـەوت وەگـری بـوو لێی جیانەبۆوە.

**التــــاق فــــلان بفــــلان**: فلانكــــەس بەفلانكەســەوە نووسـا ٥ دەگـوترێ: (إلتـــاق قلـــبي بفـــلان) دڵــم بەفلانكەســەوە نووســاوە خۆشــم دەوێ.

**التاق بالشيئ**: قینایەتی بەشتەكە كرد پێویستی بەشتی تر نەبوو.

**إستلاقه به**: پێوەی نووساند ٥ شتەكەی لكاند بەشتێكی ترەوە.

**اللِّيــاق**: پــاوانو لــەوڕگا ٥ دەگــوترێ: (مالي الأرض لِيـاق) لـەوڵات دا پـاوان لــەوڕ نــەماوە ٥ جــێگیر بــوونو بەردەوامبوون لەسەركار.

**اللّياق**: بلێسەی ئاگر.

**اللّياقـةُ**: سـولوك‌و ڕەوشـتی جـوان‌و بەئەدەب.

**اللّيقُ**: شتێکی ڕەشە دەکرێتە کلەوە.

**اللّيَـقُ**: پارچە هـەوری بـچوك بـچوك‌و پەرتەوازە بەئاسمانەوە.

**اللّقَـةُ**: لیقـەی نـاو شوشـە مەرەکـەب ٥ پەڕۆیەکـە دەخرێتـە نـاو شوشـە مەرەکەبـــەوە مەرەکەبەکــــە هەڵدەمـژێ بۆئـەوەی کـە ئوچـەکە دەخاتــە ناویـــەوە زۆر مەرەکـــەب هەڵنەگرێ ٥ قوڕی لینج کەبەدەست خـۆش دەکـرێ‌و دیـواری پـێ سـواخ دەکرێ.

**المُلتـاقُ**: دەم‌و چـاو جـوان، ڕوخـساری تــەڕو تــازە هەرکەســێ ببینـــێ شەیدای دەبێ.

**ألالَ القـومُ والْيَلُـوا**: خەڵکەکـە کەوتنـە شەوەوە.

**لايَلَهُ ملايَلَةً ولِيالاً**: بۆ شەوێك بەکرێی گرت ٥ شەوەو شەو مامەڵەی لەگەڵ کرد ٥ وەکوو چۆن وشەی (مـشاهرة) بۆ مامەڵەی مانگەو مانگـو (مُياوَمَة) بـۆ مامەڵـەی ڕۆژو بـەڕۆژ بـەکار دەهێنـدرێ.

**الألْيَلُ**: (ليل ألْيَلُ): شەوی زۆر تاریك.

**اللاّئِلُ**: (ليل لائل): شەوی زۆر تاریك.

**اللّيْـلُ**: شـەو: کەبەشـوێن ڕۆژی دا دێ لەخۆرئاوابوونــەوە تــا دەرکــەوتنی خۆر لەخۆر هەڵاتـەوە سەرلەنوێ ٥ لـــــــەزاراوەی شـــــــەرع دا لەخۆرئاوابوونـەوە دەسـت پێدەکات تا دەرکەوتنی بەیانی‌و ڕوناکی ئاسۆ لەلای خۆرهەڵاتەوە.

**اللّيلـةُ**: یـەك شـەو ٥ ئەمـشەو، تـاکی (اللّيل) ٥ (ك: ليال).

**ليلـى الخمـر**: سـەرەتای سەرخۆشـی‌و لەزەت‌و خۆشی مەستی ٥ (أم ليلي) شەراب‌و مەی.

**ليلة ليلي**: شەوی زۆر تاریك‌و درێژ.

**اللّيْلاءُ**: (ليلة ليلاء) شەوی زۆر تاریك ٥ یان شەوی سێیەم‌و کۆتایی مانگ.

**المُلَيّلُ**: (ليلٌ مُلَيّلٌ) شەوی زۆر تاریك.

**اللّيمُ**: بڕوانە مادەی (لأمَ).

**اللّيْمـون**: درەختـی لیمـۆ؛ درەختێکـی بـــەردارە، درەختـــی پورتــــەقاڵ‌و نـارنج‌و لیمـۆ بەشـیرینی‌و مزریـەوە بەهــەموویان دەگــوترێ: لیمــۆن، لــەوڵاتی میــصر بــەم درەختانــە دەگـوترێ: (المـواح) لـەوڵاتی شـام پێیان دەگوترێ: (الحوامض).

**الليمونيـــت**: لــەبواری زەوی ناســی دا بریتییـە لـەکانی ئۆکـسیدی ئاسـتی ئاوی.

**لان الشَّيْءُ ليناً ولَياناً:** نەرم بوو، ئاسانو بەیدەست بوو ٥ (فهو لينٌ ولَيِّنٌ) ٥ دەگوترێ: (رجلٌ لَيِّن الجانب) پیاوێکە نەرمو نیانو مامەڵە خۆشە.

**ألانَ الشَّيْءَ والْيَنَهُ:** شتەکەی نەرمو نیان کرد ٥ دەشگوترێ: (ألان للقوم جناحَهُ) بەهێدیو هێمنی لەگەڵ خەڵکەکەدا جوڵایەوە.

**لايَنَهُ ملاينَةً:** نەرمی لەگەڵ دا نواندو ئاسانکاریی لەگەڵ کرد.

**لَيَّنَ الشَّيْءَ:** شتەکەی نەرم کرد.

**تَلَيَّنَ الشَّيْءُ:** شتەکە نەرم بوو.

**تَلَيَّنَ لفلان:** ماستاو چیەتی بۆ فلانکەس کرد.

**إستلانَ العَيْشَ:** ژیانی بەنەرمو نیان هاتە بەرچاو ٥ یان ژیانەکەی بەرنەرمو خۆش دانا.

**الأَلْيَنُ:** نەرم ٥ (ك: لاين).

**اللِّيَان:** نەرم ٥ دەگوترێ: (نزلوا بليان الأرض) لەنەرمەلانی زەوی دا جێگیر بوون ٥ ژیانی نەرمو نیان بەناز پەروەردە ٥ دەگوترێ: (هو في ليان من العيش).

**اللَّينُ:** نەرم ٥ دەگوترێ: (نزلوا بلين الأرض).

**حروف اللين:** (أ، و، ي)ن هەروا وشەی (اللِّينُ) ناوە بۆ هەموو جۆرێك لەجۆرەکانی دارخورما جگە لەدارخورمای عەجوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ﴾.

**اللِّيْنَةُ:** پشتیو سەرین کەسەریان دەخرێتە سەر.

**اللَّيَّانُ:** بڕوانە مادەی (لَوَى).

**المَلْيَنَةُ:** دەگوترێ: (إنه لذو مَلْيَنة) ئەو خاوەنی ڕەوشتی نەرمو نیانەو مامەڵە خۆشە.

**المُلَيِّن:** دەرمانێکە بەکاردێ بۆ ڕەوانیو ئاسان هاتنەدەری پیسایی لەڕیخۆڵەوە.

**لاه لَيْهاً:** خۆی شاردەوە ٥ بەرزبۆوە.

**اللِّيَاءُ:** شتێکە وەکوو نۆك وایە، زۆر سپییە، لەوڵاتی حیجاز زۆرەو دەخورێ ٥ ئەم وشەیە دەکرێتە ئاوەڵناو بۆ ئافرەتی سپی پێست ٥ هەروا ناوە بۆ ڕەگەزی ماسی لەپێری (الأشلاق).

**اللِّيَاءُ:** زەوی دوورە ئاو.

**الـميم**: پيتــى بيــستو چــوارەمينى هيجايـــە، شـــوێنى هاتنـــە دەرەوەى نێـوانى دولێـوە، لەگـەڵ گـوتنى دا هـــەوا لەلوتـــەوە دەچـــێتە نـــاو جەستەوە.

**ما**: بۆچەند مانايەك دێ:

١. نـــەفى دەگەيـــەنىٚو دەچـێتە سـەر ڕستەى فيعلىو ئيسمى.

٢. وادەبێ لەگەڵ ڕستەكەى دا دەبێتە مەصدەرى مونەووەل.

٣. جــارى واهەيـــە مانـــاى پرســـيار دەبەخـشێ، پێـــى دەگـــوترێ: (مـــا الإستفهامية).

٤. وادەبــێ مانـــاى شـــەرت دەگەيـــەنێ پێى دەگوترێ (ما الشرطية).

٥. ماناى سەرسام بوون دەگەيەنێ.

٦. بەمانا وشەى (ألذى)دێ.

زۆرماناى تـريش دەگەيـەنىٚو لەكتێبـە نەحوييەكان دا رونكراوەتەوە.

**مَأَجَ مَاجاً**: شەڕى كرد.

**مَؤُج مُؤجَةً**: شێوا، تێكچوو.

**مَـؤُجَ المـاءُ**: ئاوەكـە سـوێر بـوو ٥ (فهـو مَأجٌ).

**مَـادَ النبـاتُ والـشَجَرُ مَـاداً**: ڕووەكەكـە درەختەكە گەشەى كرد ئاوى تێكەڕا ٥ ناسكو نەرمو نيان بوو.

**أمَادَ الـريُّ او الربيع النبـاتَ**: ئاوەكە يــان هــەوا بەهاريەكــە ڕوەكەكــەى نەرمو ناسك كرد.

**امْتَادَ خَيْراً**: خێرو بێرى پەيدا كرد.

**المَأدُ**: هەرشتێك نەرمو نيانو ناسك بـێ ٥ دەگـوترێ: (غُـصْنٌ مَـأدٌ): لقـە درەختێــكى نـــەرمو نيانـــە ٥ (فتــى مَأدٌ): گەنجێكى تەڕو ناسكە ٥ (مَـأدُ الشباب): تەڕو تازەيى گەنجايەتى.

**المَئِيدُ**: لقە درەختى نەرمو شل.

**مَارَ بين القوم مَاراً**: نێوانى خەڵكەكەى تێك دا، فيتنەيى خستە نێوانيانەوە.

**مَئِرَ الجُرْحُ مَاراً**: برينەكە هەڵتەقيەوە.

**مَئِـرَ علـى فـلان**: پێـى وابـوو فلانكـەس دوژمنيەتى.

**أمْأرَ مَالَهُ**: ماڵو سامانەكەى تێك دا.

**مَـاعَرَ بـين القـوم ممـاعرة وميئـاراً**: نێوانى خەڵكەكەى شێواند.

**المَئِـرُ**: نێـــوان تێـــكدەرو فيتنـــەو دوزوبـــان ٥ (أمـــر مَئِـــرٌ): كارێـــكى قورسو گرانە.

**المِئـــرَةُ**: تۆڵـــە ٥ دوژمنايـــەتى ٥ فيتنەيى.

**مَئِسَ الدباغ الجلدَ**: دەباغچيەكە

پێستەکەی پاك کردەوە.

**مَئِسَ الجرحُ مَاساً**: برینەکە گەورە بوو.

**المَاسُ**: فیتنەو دوزبان.

**مَاشَ المطر الأرْضَ مَاشاً**: بارانەکە زەوییەکەی شۆردەوە.

**المَئِطُ**: دەگوترێ: (إمتلأ فلان فلا يجد مَئِطاً): فلانکەس خۆی دارِشت‌و پڕبۆوە.

**مَئِقَ الصَّبِيُّ مَاقاً**: منداڵەکە گرِوی گرت.

**مَئِقَ الرجلُ**: پیاوەکە لەرِق هەڵساوی خۆی خەریکە بگری.

**امْأَقَ فلان**: فلانکەس چووە ناو رق‌و کینەوە.

**امْتَأَقَ الصَّبِيُّ**: بەمانا (مَئِق) دێ.

**إمْتَأَقَ غَضَبُ فلان**: رقی فلانکەس زۆر توندو تیژ بوو.

**إمْتَأَقَ إليَّ بالبكاء**: لەبەرچاوی من لەپرمەی گریانی دا.

**المَأْقُ والمَاقُ**: قلینچکی چاو بەلای لوتەوە ٥ (ك: آماق وآمَاق).

**المُؤْقُ والمُوقُ**: قلینچکی چاوی بەلای لوتەوە.

**المُؤْقُ والمُوق من الأرض**: قەراخ‌و بیجاغی زەوی ٥ (ك: آمَاق وأمْآق).

**المَأْقَةُ**: جۆرە لرخەو پرخەیەکە توشی مرۆڤ دەبێ ٥ رەق هەڵسان‌و توڕە بوونی زۆر.

**مَامَات الشاةُ او الظبيةُ**: مەرِەکە درێژەی بە بارِەبارِی خۆی دا.

**مَأَنَ القومَ مَأْناً**: ئەرکی بژێوی خەڵکەکەی خستە ئەستۆی خۆی.

**مَأَنَ الرجُلَ**: خۆی لەپیاوەکە پاراست ٥ زەبری لەناوکی پیاوەکەدا.

**مَأَنَ في الأمر**: لەکارەکە ورد بۆوە بیری لێ کردەوە.

**مَأَنَ فلاناً**: فلانکەسی فێرکرد.

**مَأَنَ الشَّيْئَ**: شتەکەی ئامادەکرد.

**المَأْنُ**: تەنکایی دەوران دەوری جەنگ ٥ دارێکە ئاسنێکی بەسەرەوە زەوی پێ دەکێڵدرێ.

**المَأْنَةُ**: ناوك‌و دەوروبەری ٥ (ك: مَأنات ومؤون).

**المَئِنَةُ**: نیشانەی شت ٥ نارمی شت ٥ دەگوترێ: (انّ قِصَر الخطبة مَئِنَةٌ من فقه الرجل) ٥ کورتی وتار نیشانەیەکە لە نیشانەکانی ژیری پیاوەکە.

**المُؤْنة**: بژێو ٥ (ك: مُؤَن).

**المَؤُونة**: بەمانا (المؤنه)دێ.

**المَمْأَنَةُ**: شیاوو لایەق ٥ دەگوترێ: (هو مَمأنة لكذا).

**مَأَى الشَّجَرُ مَأْياً**: درەختەکە گەڵای کرد، پشکوت.

**مَـأى في الـشَّيءِ**: زێدەڕۆیی لەشتەکە دا کردو تێیدا قوڵبووە.

**مَـأى السقاءَ**: کوندەکەی پانو پۆڕکرد لێکی کێشایەوە بۆئەوەی فراوان ببێ.

**مأى بين القوم**: فیتنەو ئاشوبی خستە نێوان خەڵکەکە.

**مَـأى القومَ**: خۆی بوو بە تەواوکەری سەد، ژمارەی سەدی تەواو کرد ٥ (فهم مَمْئِيون) ئەوانە سەدی تەواون.

**أمأى القومُ**: خەڵکەکە بون بەسەد.

**أمـأت الـدراهمُ**: دیرهەمەکان بون بەسەد.

**أمـأى فـلانٌ القـومَ**: فلاّنکەس خەڵکەکەی بەکەسانی دی کردە سەد.

**مـاءِی**: دەگوترێ: (شـارطة مُمَـاءة): لەسەد تێپەڕی ٥ هەر وەك دەگوترێ: (شارَطه مؤالفة): لەهەزار تێپەڕی.

**تمـاءى الجلـدُ**: پێستەکە کشاو فراوان بوو.

**المِـاْة**: دەجار دە ٥ (ك: مئـات ومِئون).

**مَتَّ اليه بقرابة ونحوها مَتَّـاً**: هانای بۆ برد ٥ (فهو ماتّ).

**مَتَّ الحبلَ**: حەبلەکەی لەبیرەکە هێنایە دەر بەبێ ئەوە چەرخو فەلەك بەکاربێنێ.

**ماتَّهَ**: خزمایەتی وەبیر هێنایەوە.

**تَمَتَّـى في الحبـل**: ویستی حەبلەکە بقرتێنێ.

**المَاتَّةُ**: حورمەتو هۆکار.

**المَتَّـاتُ**: ئەوەی هانای پێ دەبرێ وەکوو خزمایەتی.

**مَتَحَ النهار مَتْحاً**: ڕۆژگار درێژ بۆوە.

**مَـتَحَ الجـرادُ**: کوللەکە کلکی لەزەوی چەقاند بۆئەوەی هێلکە بکا، گەرا دابنێ.

**مَـــتَحَ الـشَّيءِ**: شتەکەی هەڵکەند ٥ دەگوترێ: (مَـتَحَ فلانـاً): فلاّنکەسی خستە سەرزەوی ترێلی کرد.

**مَتَحَ الدَلْوَ**: پەتی دۆڵچەکەی ڕاکێشا.

**مَـــتَحَ المـاءَ**: ئاوی دەرهێنا ٥ ئاوی هەڵێنجا.

**أمْـــتَحَ النهـــارُ والجـــرادُ**: بەمانا (مَتَحَ)دێ.

**إمْتَـتَحَ الـشَّيءَ**: شتەکەی لەشوێنی خۆی دەرهێنا.

**تَمَتَّحَـت المَطِيـة بايـديها في الـسير**: وڵاخەکە قاچەکانی بەتەمبەڵی هەڵێنا لەڕۆیشتنەکەی دا.

**المَتُـوحَ**: کەسێك بەتوانابێ بۆ ئاو هەڵکێشان لەبیر ٥ (بئـر مَتُـوحٌ): بیرێکە بەدەست ئاوی لێ دەدەهێندرێ.

**مَتَحَ الشَّيْئَ:** شتەکەی لەشوێنی خۆی هەڵکەند.

**مَتَحَ فلاناً:** لەفلانکەسی دا.

**مَتَرَ الشَّيْئَ مَتْراً:** شتەکەی بڕیەوە.

**مَتَرَ الحَبْلَ:** حەبلەکەی درێژکردەوە.

**مَتَرَ الشَّيْئَ:** بەمەتر مەزندەی شتەکەی کرد.

**تماترت النار من الزند:** ئاگر لەچەرخەکە کەوتە خوار.

**تماتر القومُ الشَّيْئ:** خەڵکەکە شتەکەیان لێك کێشایەوە هەریەکەیان لەلای خۆیەوە بۆلای خۆی کێش کرد.

**إمْتَرَ الحبل إمْتاراً:** حەبلەکە درێژ بوو، کشا.

**المِتْرُ:** مەتر ئامێری پێوان ٥ ئامێری ئەندازەگرتن ٥ ئامێرێکە سەرەتا لەفەرەنسا کاری پێ کراوە دوایی زوربەی گەل و نەتەوەکان بەکاریان هێنا.

**مَتَشَهُ الشَّيْئَ مَتْشاً:** شتەکەی کۆکردەوە ٥ بەپەنجەکانی بڵاوی کردەوە.

**مَتِشَت عينه مَتْشاً:** چاوی کز بوون باش نەیان بینی.

**المَتْشُ:** سپیاییەکە لەسەر نینۆکی زارۆکان دەردەکەوێ.

**مَتَعَ الشَّيْئُ متوعاً:** شتەکە لەباشی دا گەیشتە ئەوپەڕ ٥ شتەکە درێژبۆوە، بەرزبۆوە ٥ دەگوترێ: (متع النهار والضحى).

**مَتُعَ فلان:** فلانکەس لەرەوشتی بەرز دا پێشکەوت و ڕەوشت جوان بوو.

**مَتَعَ الحبلُ:** حەبلەکە گشت بوو پتەو بوو، باش بادرا.

**مَتَعَ النبيذُ:** سرکەکە زۆر سور بوو ٥ (فهو ماتع).

**مَتَعَ بالشيئ:** شتەکەی برد.

**مَتَعَ الله فلاناً بكذا:** خودا جڵەوی بۆ فلانکەس درێژکرد بۆئەوەی درێژە بەسود مەندبوون لەوشتە بدا.

**مَتُعَ الشَّيْئَ متاعةً:** شتەکە باش بوو، ساغ بوو.

**أمْتَعَ بالشيئ:** شتەکەی بۆ پایەدار بوو لێی سود مەند بوو.

**امتع الله فلاناً:** خودا تەمەنی فلانکەسی درێژ کرد ٥ دەگوترێ: (أمتعه الله بكذا): خودا هێشتیەوە بۆئەوەی بەوشتە سودمەند بێ و بەشوێنی ئەو کەیف خۆش بێ.

**امْتَعَ بماله:** لەزەت و خۆشی لەماڵ و سامانی خۆی بینی.

**امتعني بِفِراقِه:** بەجودا بونەوە لەو سودی پێ گەیاندم.

**امْتَعَني عن كذا:** لەوشتە بێ ئاتاجی کردم.

**مَتَّعَ الشَّيْءَ**: شتەکەی درێژکردەوە.

**مَتَّعَ اللهُ فلاناً**: خودا تەمەنی فلانکەسی درێژ کرد ٥ دەشگوترێ: (مَتَّعَهُ الله بکذا): خودا بەوشتە لەزەتو خۆشی بۆ بەرقەرار کرد.

**مَتَّعَ الرجلُ مُطَلَّقَتَهُ**: پیاوەکە لەدوای تەلاقدانی ژنەکەی هەندێ پێداویستی ژیانی پێدا.

**تَمَتَّعَ بکذا**: لەزەتو خۆشی بەوشتە بۆدەستە بەر بوو.

**تَمَتَّعَ العمرة الى الحج**: لەنیەتو پۆشاکی عەمرەدا مایەوە تا ئەرکەکانی حەجیشی ئەنجام دان، واتە ئەرکەکانی عەمرەو حەجی پێکەوە ئەنجام دان.

**استمتع بکذا**: لەزەتو خۆشی لەوشتە وەرگرت.

**المَاتِعُ**: شتی باشو بێ غەش لەهەر شتێك بێ.

**المَتَاع**: لەزەتو خۆشی ٥ هەرشتێك سودی لێ ببیندرێو هەوڵ بدرێ پەزمەندە بکرێ ٥ وەکوو خۆراكو کاڵای ناومالّو کەرەستەی تر.

**المُتْعَةُ**: هەرشتێك لەزەتو خۆشی لێ دەستەبەر بێ وەکوو راوەشکارو یاریو پیاسە ٥ ئەنجامدانی حەجو عەمرە بەیەکەوە ٥ ژن مارەکردنی کاتی وەکوو لەلای هەندێ پێری شیعە باوە ٥ ئەو ماڵو سامانەی پیاو دەیدا بەژنی تەلاقدراوی.

**مَتَكَ الشَّيْءَ مَتْكاً**: شتەکەی بڕیەوە کەرتی کرد.

**ماتکه في البیع**: لەمامەڵەکەدا زاڵ بوو بەسەری دا.

**تَمَتَّكَ الشرابَ**: وردە وردە شلەمەنییەکەی خواردەوە.

**المُتْكُ**: لوتی مێشو مێشولە ٥ بەروبوومی نارنج.

**مَتَلَ الشَّيْءَ مَتْلاً**: شتەکەی جوڵاندو لەقاندی.

**مَتَنَ بالمکان مَتْناً**: لەشوێنەکە جێگیر بوو مایەوە.

**مَتَنَ فلان**: فلانکەس سوێندی خوارد.

**مَتَنَ بفلان**: هەموو رۆژەکە بەرێگادا بردیو ڕەوی پێ کرد.

**مَتَنَ الشَّيْءَ**: شتەکەی درێژ کردەوە.

**مَتَنَ فلاناً**: زەبری لەپشتی فلانکەس دا.

**مَتَنَ الکَبْشَ**: لەڕەگەوە گونی بەرانەکەی دەرهێنان.

**مَتُنَ الشَّيْءُ مَتَانَةً**: شتەکە ڕەقو پتەو بوو ٥ دەگوترێ: (حَبْل متین ورأی متین).

**المتین**: صیفەتێکی پەروەردگارە بەمانا خاوەن هێزو توانایە، بەدەسەڵاتی ڕەهایە.

**أمْتَنَ فلاناً**: زەبری لەپشتی فلانکەس دا.

**ماتنـه**: کـێ برکێـی لەگـەڵ دا کـردو لەمەبەسـت دوری خسـتەوە ◊ بەربـەرەکانی کـردو دژی وەسـتا ◊ دەگوترێ: (ماتنـه في الـشعر): شـەڕە شـیعری لەگـەڵ دا کـردو بـۆڕی دا ◊ هەروا دەگـوترێ: (سار سيراً مماتناً): بەخێرایی ڕۆیشت.

**مَـتُنَ الـشَيْئَ**: تونـدو پتـەوی کـرد ◊ دەگوترێ: (مَتَّنَ القوس ومَتَّنَ البنـاءَ): دیوارەکەی پتەو کرد.

**تَمَـاتَنَ الـشاعران في الـشعر**: دوو شـاعیرەکە شـەڕە شـیعریان کـردو بەرپەرچی یەکتریان دایەوە.

**الثِّمنـان**: ئـەو پەتـەی باقـە قەسـەڵو شتی وای پێ دەبەسترێ.

**المـاتن**: لـەزاراوەی نوسـەران دا ئـەو کەسـەیە بناغـەو مـەتنی کتێبەکـە دەنووسـێ ◊ پێـچەوانەی ڕاڤەکـەرو شیکەرەوە.

**المَتْنُ**: پشت.

**مَـتن الأرض**: تەپۆڵکـەو شـوێنی پتـەوی ناو زەوی.

**مَـتن الکتـاب**: دەقـە سـەرەکیو ئەصڵییەکانی کتێب.

**مَتن النهار**: تەواوی ڕۆژ ◊ هەموو ماوەی ڕۆژ ◊ (ك: متان ومتون).

**المتنـان**: ئـەملاو ئـەولای موراغـەی پشت لەڕاستو چەپەوە.

**المتنـة**: ئـەوەی لـەزەوی پتـەوو ڕەقەلانە ◊ تەپۆڵکەو تمبار ◊ لایەکی پشتە چ ڕاست یان چەپ.

**مَتَهَ فلان مَتْهاً**: فلان گومڕا بوو، سەری لـێ شێوا.

**تَمَاتَهَ عنه**: خۆی لـێ گێل کرد.

**تَمَاتَـهَ القـومُ**: خەڵکەکـە دوور کەوتنەوە.

**تَمَتَّـهَ**: سەرسـام بـوو ◊ خـۆی گێـلو ئەحمەق کرد ◊ دورکەوتەوە.

**تَمَتَّهَ في الشَيْئ**: زێدەڕۆیی لەشتەکەدا کرد.

**مَتَا الحبلَ وغيره مَتْواً**: حەبلەکەی درێـژ کردەوە.

**مَتَا فلاناً بالعصا**: بەگۆچان لەفلانکەسی دا.

**مَتَا في الأرض**: لـەزەوی دا کۆششی کـردو پەلەی کرد.

**امتـى**: تەمـەنی درێـژ بـوو ◊ رزقو ڕۆزی زۆرو هەمە جۆر بوو.

**تَمَتَّى**: بەمانا (تَمَطَّى)دێ.

**مَتـى**: زەرفـی زەمانـەو بـۆ پرسـیار لەڕۆژگارو کات دێ.

**مَتَّ الرجلُ مَتّاً**: پیاوەکـە نـارەقی کـرد ◊

بەسەر پێستی جەستەیەوە شتێك بیندرا وەکوو رۆن وابوو.

**مَثَّ السِّقاءُ:** کوندە ئاوەکە، گۆزە ئاوە کە ئاوی لێ چوو، تەڕەشوحی پەیدا کرد.

**مَثَّ العَظْمُ:** ئێسقانەکە هەرچی مۆخی تێیدا بوو هاتە دەر.

**مَـثَّ يَدَهُ وأصابعه بالمنديل:** دەستو پەنجەی بەدەستە سڕ سڕینەوە.

**مَثَّ شارِبَه:** سمێڵی چەوربونو بەدەستی سڕینی بەڵام شوێنەواری چەورییان پێوەیە.

**مَثَّ الجُرْحَ:** کێمو زوخاوی ناو برینەکەی دەرکردو پاکی کردەوە.

**المِثَّاثُ:** (نبت مَثَّاث): ڕوەکی شێدار.

**مَـثَجَ الشَّيْئَ مَثْجاً:** شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**مَثَجَ فلاناً:** خواردنی دەرخواردی فلاّن دا.

**مَثَـدَ بين الحجـارة مَثْـداً:** لەنێوان دو بەرددا خۆی مەڵاس داو لەوێوە سەیری جمو جوڵی دوژمنی کرد.

**مَثَـدَ فلانـاً:** فلاّنکەسی کردە حەشارگە، ڕەبینەو سەنگەر.

**المَاثِدُ:** ڕەبیەو سەنگەر.

**مَثَـلَ الرجـلُ بين يـدي فـلان مثـولاً:** پیاوەکە لای فلاّن دەستەو نەزەر راوەستا، ئامادە باشی خۆی بۆ خزمەت نیشان دا.

**مَثَـلَ فـلان فلانـاً:** فلاّنکەس تەمپیلی فلاّنی کردو لەجیاتی ئەو کارەکانی ئەنجام دان ٥ خۆی بەئەو شوبهاند.

**مَثَّلَ التماثيل:** پەیکەرەکەی تاشی.

**مَثَّلَ بفلان مَثْلاً ومُثْلَةً:** سوکایەتی بەفلاّن کرد دەمو لوتی برینو ئەتکی کرد.

**مَثَـلَ فـلان بين يـدي الـوالي مثـولاً:** فلاّنکەس لەبەردەم پاشا راوەستا.

**مَثُـلَ الرجـلُ مَثَالَـةً:** پیاوەکە ڕێزدارو شکۆمەند بوو.

**امْثَلَ فلانـاً:** فلاّنکەسی ئەتك کرد ٥ لەتۆڵەی کوژراوی خۆی کوشتیەوە ٥ پیاو بەدادوەر دەڵێ: (أمثلني من فلان): لەجیاتی فلاّن بم کوژە ٥ هەروا دەگوترێ: (قد أمثله الحاكم منه).

**ماثَلَ الشَّيْئَ:** وەکوو ئەوشتەی بوو لەو دەچوو ٥ دەشگوترێ: (ماثَلَ فلاناً بفلان): فلاّنکەسی بەفلاّنکەسەوە شوبهاند.

**مَثَّلَ بفلان:** سوکایەتی بەفلاّن کرد، دەمو لوتی فلاّنکەسی بڕی.

**مَثَّـلَ الشَّيْئ بالشَّيْئ:** شتەکەی بەشتەکە شوبهاند.

**مَثَّلَ الشَّيْئَ لفلان:** شتەکەی بۆ فلاّنکەس وێناکردو راینواند.

**مَثَّـلَ المسرحية:** شانۆگەرییەکەی رانواند.

**مَثَّلَ التماثيلَ:** پەیکەرەکانی رانواند، وێنای کردن.

**إمْتَثَـلَ امـره:** فەرمانبەرداری فەرمانەکانی بوو، پابەندی فەرمانو ئامۆژگارییەکانی کرد ٥ شوێن رێبازی ئەو کەوتو لای ئەدا ٥ دەشگوترێ: (امتثلوه غرضاً): کردیانە نیشانەو هەدەفی خۆیان قسەو تیرەکانیان ئاراستەی ئەوکردن.

**إمْتَثَلَ المَثَلَ:** پەندو مەسەلەکەی تەصەور کرد.

**إمْتَثَلَ من فلان:** تۆڵەی لەفلانکەس ستاند.

**امتثلَ عندهم مثلاً حسناً:** دێرە شیعرێکی خوێندەوە ئەمجار بەدو ئەودا شیعرێکی تری خوێندەوە.

**تَمَاثَلَ الشَّيْئان:** دوشتەکە لێك چون.

**تَمَاثَلَ العليل من علته:** نەخۆشەکە خەریکە چاك بێتەوە.

**تَمَثَّلَ الشَّيْءَ:** وێنەی شتەکەی کێشا ٥ وەکوو وێنەی شتەکە خۆی دەرخست.

**تَمَثَّلَ بين يديه:** لەپێش دەمی دا راوەستاو ئامادەباشی فەرمانبەرداری بوو.

**تَمَثَّلَ بالشَّيْءِ:** شتەکەی بەنمونە هێنایەوە.

**الأمثَل (اسم تفضيل):** باشتر ٥ دەگوترێ: (فلان أمثل بني فلان): فلانکەس باشترین مرۆڤی هۆزی فلانە ٥ دەشگوترێ: (المريض اليومَ أمثَلُ): نەخۆشەکە ئەمرۆ تەندروستی باشترە لەرۆژانی پێشوو.

**الأمثولة:** ئەو جۆرە شیعرانەن کە بەنمونە دەهێندرێنەوە.

**التِّمْثَالُ:** پەیکەری لەبەرد داتاشراو یان لەمس‌و شتی وا دارێژراو.

**التمثيلية:** کارێکی فەننی‌و ناوازەیە بەپەخشان یان بەشیعر ئەنجام دەدرێ وێنای شتێکی حەقیقی‌و روداو یان هەڵبەستراو دەکێشێ.

**المِثَالُ:** نمونەو قاڵب کەشتی تری لەسەر وێنا دەکرێت.

**المِثَاليّ:** نمونەیی ٥ شتێك لەبوارو جۆری خۆی دا تەواو بێ.

**المَثَّالُ:** پەیکەر تاش.

**المِثْلُ:** هاوشێوەو هاو وێنەو هاوشان.

**المَثَلُ:** هاوشێوە ٥ پەندو عیبرەت ٥ رستەیەکە لەدەقێك دەردەهێندرێ‌و بۆنمونەو پەند

دەهێندرێتەوە بەبێ ئەوەی گۆڕانکاری تێدابکرێ وەکوو پەندی (في الصيف ضيعت اللبن) یان (الرائد لایکذب أهله) ٥ چیرۆكو حیکایات لەسەر زمانی گیانداران وەکوو چیرۆکەکانی کتێبی کلیلەو دیمنە.

**المَثُلَةُ**: تۆڵەو سزاو ئەتکردن ٥ (ك: مثلات).

**المُثْلَةُ**: تۆڵەو سزاو ئەتکردن.

**المَثِيلُ**: هاوشێوە، هاو وێنە ٥ (ك: أمثال) ٥ بەمانا شکۆدارو رێزدار دێ ٥ (ك: مُثَلاءُ).

**المُمَثِّلُ**: ئەکتەر؛ ئەوکەسەی لەسەر شانۆ کاربکا.

**مَثْمَثَ زِقُّ السمنَ**: هیزەکە رۆنی لێچوو.

**مَثْمَثَ فلان الشَّيْئَ**: شتەکەی لەناو دا نقوم کرد.

**مَثْمَثَ الفتيلة**: رۆن یان نەوتی لەچراکە کرد.

**مَثْمَثَ الشَّيْئَ**: شتەکەی جوڵاند ٥ دەگوترێ: (أخذه فَمَثْمَثَهُ): شتەکەی گرتو ئەمدیوو ئەودیوی کرد.

**مَثَنَهُ مَثْناً**: میزەڵدانی هەنگاوت.

**مَثِنَ مَثْناً**: میزە چرکەی بوو، میزەڵدانی ئازاری بوو.

**المَثَانَةُ**: میزەڵدان.

**مَجَّ الماءَ او الشرابَ من فيه**: ئاوەکەی تف دایەوە ٥ دەگوترێ: (کلام تَمُجُّهُ الأسماع): قسەیەکە گوێچکە وەری ناگرێ ٥ (مَجَّت النحلُ العسلَ): هەنگەکە هەنگوینەکەی تف دایەوە ٥ (النّبات يمج الندى): رووەکەکە شەونمی دەردا.

**مَجَّ شِدْقا الهرم**: هەردو لاشەویلەی پیرەکە شل بوون.

**مَجَجَ العِنَبُ**: ترێیەکە پێگەیشتو شیرین بوو.

**إنمَجَّت نقطة من القلم**: پرژێك لەقەڵەم پرژا.

**المَجَاجُ**: هەرشتێك لەدەم تفی دەیەوە.

**مضجاج الفم**: تفی ناودەم.

**مَجَاجُ النحل**: هەنگوین.

**مَجَاجُ العِنَب**: شیلەی ترێ.

**مَجَاجُ المزن**: بارانی هەور.

**المُجَاجَةُ**: تف ٥ (مجاجة الشَّيْئ): گوشراوی شت.

**المَجَّاجُ**: کەسێك زۆر ئاو لەدەم ڕادا.

**مَجَدَ فلان مَجْداً**: فلانکەس خاوەن مەجدو شکۆ بوو.

**مَجَدَ فلاناً**: لەشکۆداری دا بەسەر فلان دا زاڵ بوو ٥ دەگوترێ: (ماجَدَهُ فَمَجَدَهُ).

**مَجُدَ فلان مجادة**: فلانکەس خاوەن شکۆ

بوو ◊ (فهو مجيد).

**امْجَدَهُ:** بەگەورەو شكۆمەندی لەقەڵەم دا ◊ وەسپی دا.

**امْجَدَ العَطَاءَ:** بەخششەكەی زۆر كرد.

**ماجَدَهُ:** لەشكۆداری دا پێشبڕكێی لەگەڵ دا كرد.

**مَجَّدَهُ:** وەسپی كردو بەگەورەی زانی.

**مَجَّدَ العَطَاءَ:** بەخششەكەی زۆر كرد.

**تماجدوا:** شانازییان بەسەر یەكتر دا كرد ◊ هەركەسە پیاوەتیو ڕێزداری خۆی خستە ڕو وەسپی خۆی دا ◊ دەشگوترێ: (تَمَاجَدَ القومُ فيما بينهم): خەڵكەكە لەناو خۆیان خۆیان هەڵنایەوە.

**تَمَجَّدَ:** شكۆدار بوو.

**اسْتَمْجَدَ:** بوو بە خاوەن مەجدو شكۆمەند.

**استَمْجَدَ المرخ والغفارُ:** درەختی مەرخو غەفار بڵێسەی ئاگرەكەیان خۆش كرد.

**الماجِدُ:** ڕێزدارو خاوەن شكۆ.

**المَجْدُ:** ڕێزو شكۆمەندیو وەجاخزادەیی ◊ ڕەوشتی بەرزو بۆماوە لەباوكو باپیرانەوە.

**المَجيد:** خاوەنی زۆر ڕەوشتی بەرزو شكۆمەندی ◊ ناوێكە لەناوە جوانەكانی پەروەردگار.

**مَجِرَ من الماءِ:** وەرگی پڕ بوو لەئاوو تینوایەتی نەشكا.

**مَجِرَت الشاةُ:** مەڕەكە بێچووەكەی لەورگی دا گەورە بوو بۆخۆشی لاواز بوو.

**امْجَرَت الشاةُ:** بەمانا (مَجِرَت)دێ.

**الأَمْجَرُ:** ورگ زلو جەستە لاواز.

**المَجْرُ:** هەرشتێك زۆر بێ ◊ سوپای زۆرو بێ شومار.

**المَجَرُ:** عەیارێكی ئاڵتونە سەرەتا لەوڵاتی مەجەڕ داهاتووە لەبواری خشڵی ئافرەتان داو بۆ بەهادانانو دیاری كردنی نرخ كاری پێ دەكرێ ◊ هەردانە مەجەڕێك نرخەكەی بیستو هەشت قیراتە ◊ یان سێ بەش لەچواربەشی مسقاڵێكە.

**المُمْجِرُ من النساءِ:** ئەو ئافرەتەیە بەسكێك دوو منداڵی ببن ◊ مەڕێكی ئاوس كەورگی گەورە بێو نەخۆش بێو جەستەی لاواز بێ بەناخۆشی بێچوی ببێ ◊ حوشترێكە لەسك وەستابێتەوە.

**مَجَسَهُ:** كردی بە مەجوسیو ئاگر پەرست.

**تَمَجَّسَ:** چووە پێڕی مەجوسیانەوە، بوو بەئاگر پەرست.

**المَجُوسُ:** گەلو هۆزێك یان چەند

هۆزو نەتەومن کە رۆژیان پەرستووە یان مانگو ئاگریان پەرستووە لەسەدەی سێیەمی پێش زایینەوە ئەم ناوەیان بەسەردا براوە.

**المجوسيّ**: کاهین و کولەومنانی لای ئاشورییەکان و فارسە کۆنەکان.

**المجوسية**: بیرو باوەڕی ئاگرپەرستەکان لەبەرێز راگرتنی ٥ ئەستێرەو ئاگر ٥ یان دەگوترێ: (مەجوسیەت) ئایینێکی کۆنە زەرادەشت تازەی کردەوەو لێی زیاد کرد.

**المِجَسْطي**: کتێبێکی کۆنە لەبواری ئەندازیاری و ئاسمانشوناسی بەطلیموسی فەلەکی سالی ١٤٠ زایینی دایناوە لەسەردەمی خەلیفە مەئمون دا وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی و لەبواری خۆی دا سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو بوو.

**مَجَعَ مَجْعاً**: شیرو خورمای بەیەکەوە کردە پێخورو خواردی.

**مَجِعَ مجاعةً**: قسەی راست و گالتەی تێکەڵ بەیەك کرد.

**مَجُعَ مَجَاعَةً**: بەمانا (مَجِعَ)دێ.

**ماجَعَهُ**: قسەی گالتەو گەپی ئاراستە کرد.

**إمْتَجَعَ**: شیرو خورمای کردە پێخۆرو خواردی.

**تماجَعَا**: قسەی گالتەو سەیریان ئاراستەی یەکتر کرد.

**تَمَجَّعَ**: شیرو خورمای خوارد.

**المَجَاعة**: پاشماوەی پێخوری شیرو خورما.

**المَجَّاعُ**: کەسێك هەوەسی لەقسەی گالتەو سەیربێ کەسێك حەزی لەکێشتی خورماو شیربێ واتە خورماو شیر بکاتە پێخۆرو حەزی لێ بێ.

**المَجْعَةُ**: ئافرەتی بێ حەیا.

**المَجِيعُ**: جۆرێکە لەپێخۆر لەشیرو خورما دروست دەکرێ.

**مَجَلَتْ يده مَجْلاً ومجولاً**: دەستی بلۆقی کرد ٥ پێستی دەستی پتەو زبر بوو.

**مَجَلَ الحافِرُ**: سمی ولاخەکە سواو رەق و پتەو بوو.

**مَجِلَتْ يدُهُ**: بەمانا (مَجَلَتْ)دێ.

**امْجَلَ العملُ يده**: ئیشکردن بلۆقی لەپێستی دەستی دا پەیدا کرد.

**تَمَجَّلَ الجلدُ قيحاً ودماً**: پێستی بلۆقی کردو کێم و زوخاوی تێدا پەیدا بوو.

**المَجْلُ**: کرانەوەو شل بوونی رەگی پاشوی ولاخە ٥ کەدەبێتە عەیب بۆ ئەسپ.

**المَجْلَةُ**: توێکلێکی تەنکە ژێرەوەی

دەبێتە بلۆق‌و ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە لەناکامی ئیش کردن دا.

مَجْمَجَ فلان في خبره: فلانکەس لەهەواڵ گێڕانەوەکەدا منجە منجی کردو شتەکەی باش رون نەکردەوە.

مَجْمَجَ الکتابَ: نوسینی کتێبەکەی تێکەڵ‌و پێکەڵ کرد بەقەڵەم شێواندی.

تَمَجْمَجَ الکفلُ: سمتی لەقەڵەوی‌و بەختەوەری دا دەلەرێنەوە.

المَجْمَاجُ: شل‌و شێواو تەمبەڵ.

مَجَنَ الشَّیْئُ مُجوناً: شتەکە ڕەق‌و پتەو بوو.

مَجَنَ فلان مجوناً ومجانةً: فلانکەس بێ حەیاو بێ چاوو ڕو بوو ٥ (فهو ماجن وهي ماجنة) ٥ فلانکەس راست‌و درۆی تێکەڵ کردو هەڵوەر بوو ٥ دەگوترێ: (مَجَنَتْ فأسكتّ): قسەی ناشیرینی کردو بێ دەنگ کرا.

ماجَنَهُ: سوعبەت‌و یاری لەگەڵ کردو راست‌و درۆی تێکەڵ کرد.

تماجَنا: سوعبەت‌و گاڵتەو گەپیان بەیەکەوە کرد.

المجان: بەخۆڕایی بەبێ بەها ٥ دەگوترێ: (أخذ الشَّیْئَ مجاناً) ٥ هەروا وشەی المجان بەمانا زۆر وزەبەندە دێ ٥ دەگوترێ: (ماء مجان وتمر مجان).

المُمَجَّنُ: دەگوترێ: (طریق مُمَجَّنٌ): رێگای راست‌و رێکخراوو تەخت کراو.

مَجْنَق القومُ: خەڵکەکە بەقۆچەقاینی بەردیان هاویشت.

المَنْجَنیق: ئامێرێك بووە کاتی خۆی بەردیان پێ هاویشتووە وەکوو قۆچەقایینی بۆ روخاندن‌و گرتنی قەڵاو شورە.

مَحَتَه مَحْتاً: پڕی کرد لەڕق‌و کینە.

مَحُتَ الیوم محاتةً: رۆژەکەی زۆر گەرم بوو.

المَحْتُ: پتەوو توندو تیژ لەهەرشتێك دا بێ ٥ دەگوترێ: (یوم محت): رۆژێکی گەرم‌و کوشندەیە.

مَحَجَ الشَّیْئَ مَحْجاً: شتەکەی ماڵی‌و کراندی تامادەسەرەکییەکەی دەرکەوت.

مَحَجت الریح الأرضَ: ڕەشەباکە گڵ‌و خۆڵی سەر ڕوی زەوی ڕاماڵی.

مَحَجَ العودَ: شورکە دارەکەی سپی کرد توێکڵی داماڵی.

مَحَجَ الجلدَ: پێستەکەی شێلا هەڵی گلۆفت بۆئەوەی نەرم بێ.

مَحَجَ اللبنَ: ماستەکەی هەژاند بۆئەوەی بیکاتە دۆ.

مَحَجَ الدَلْوَ: دۆڵچەکەی ڕاوەشاند.

**مَاحجه مَحاجاً**: دوای خست ماتڵی کرد.
**مَحَّ الثوبُ مَحَحاً**: قوماشەکە ڕزیو کۆن بوو.
**أمَحَّ الثوبُ**: بەمانا (مَحَّ)دێ ٥ دەگوترێ: (امَحَّ الکتابُ): کتێبەکە ڕزی ٥ (مَحَّت الدار): خانوەکە شوێنەکەی کوێر بۆوە ئاسەواری دیارنەما.
**المُحُّ**: پاڵفتەی شت ٥ زەردێنەو سپێنەی ناو قاوغە هێلکە.
**المَحّاحُ**: درۆزن ٥ کەسێك قسەی هەبێو کردەوەی نەبێ.
**المَحارَة**: بڕوانە مادەی (حَوَرَ).
**مَحَشَ الجلدَ مَحْشاً**: پێستەکەی لەگۆشتەکە داماڵی.
**مَحَشَتْ النارُ جلدَه**: ئاگر پێستی سوتاند ٥ دەگوترێ: (هذه سنة أمْحَشَتْ كل شيئ): ساڵەکە قاتو قڕی بوو هیچی نەهێشت.
**المُحاشُ**: سوتێنەر ٥ دەشگوترێ: (خبر محاش وشِواء محاش).
**مَحَصَ مَحْصاً**: هەڵات.
**مَحَصَ الظَّبيُ**: ئاسکەکە بازێکی توندی هاویشت.
**مَحَصَ الثوبُ**: قوماشەکە توکەکەی ڕوتایەوە.
**مَحَصَ اللهُ مابه**: خودا نازو نیعمەتی لێ ستاند.
**مَحَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لەعەیبو لەککە پاك کردەوە.
**مَحَصَ المعدِنَ بالنار**: مەعدەنەکەی بەئاگر پوختە کرد.
**مَحَصَ السيف**: شمشێرەکەی مشتو ماڵ کرد.
**أمْحَصت الشمسُ**: خۆر دوای گیرانی دەرکەوتەوە.
**أمْحَصَ المريضُ**: نەخۆشەکە چاك بۆوە.
**مَحَّصَ الشَّيْءَ**: شتەکە لەعەیبو خەوش پاك کردەوە ٥ دەگوترێ: (مَحَّصَ الذهب بالنار): ئاڵتونەکەی بەئاگر پاك کردەوە.
**مَحَّصَ اللهُ التائبَ من الذنوب**: خودا تۆبەکارەکەی لەتاوان پاك کردەوە.
**مَحَّصَ فلاناً**: فلانکەسی بەتاقی کردەوە.
**تَمَحَّصَت الظلماءُ**: تاریکییەکە ڕەویەوە ٥ دەشگوترێ: (تَمَحَّصَتْ ذنوبه): لەگوناهەکانی پاك بۆوە.
**الأمْحَصُ**: کەسێك پاساوی ڕاستو درۆ قبوڵ بکا.
**المَحيصُ**: گشت بادراو، دەمار گشتو توند.
**المُمَحَّصُ**: پاڵفتەکراو لەعەیبو عار.
**مَحَضَ فلاناً**: ماستی خاڵصی دەرخوارد دا.

**مَحَضَ فلاناً الـوُدَّ:** بەدڵسۆزی ئامۆژگاری کرد.
**مَحِضَ مَحضاً:** ماستی خاڵصی خوارد.
**مَحُضَ فلان في نسبه مُحوضة:** فلانکەس نەژادی پاكو خاوێن بوو.
**أمْحَضَ الرجلَ:** بەدڵسۆزی ئامۆژگاری پیاوەکەی کرد ٥ دەگوترێ: (أمْحَضَهُ الحديث والنّصيحة).
**امْتَحَضَ فلان:** فلانکەس ماستی خاڵصی خواردەوە.
**الأمْحُوضَة:** ئامۆژگاری دڵسۆزانە.
**المَحْضُ:** شتی بێ خەوشو لەککە ٥ (لَبَنَ محض): ماستی خاڵصو بێ خەوش جا شیرین بێ یان ترش.
**مَحَطَ الوَتَرَ:** دەستی بەژێی کەمانەکەدا هێنا بۆئەوەی چاکی بکا.
**مَحَقَ الشَّيْئَ مَحْقاً:** شتەکەی کەم کردەوە ٥ فەوتاندی لەناوی برد ٥ دەگوترێ: (مَحَقَ اللهُ العمـلَ): خـودا پیـتو بەرەکەتی کارەکەی برد فەوتاندی ٥ کارەکەی بەتاڵ کردەوە.
**مَحَقَ الحرُّ الشَّيْئَ:** گەرما شتەکەی سوتاند.
**امْحَقَ الشَّيْئُ او المالُ:** شتەکە فەوتا مرد، دەگوترێ: (امْحَقَ الرجلُ): پیاوەکە مرد.
**أمْحَقَ القمرُ:** مانگ چووە حاڵەتی مەحاقەوە.
**مَحَّقَ الشَّيْئَ:** شتەکەی بەتاڵ کردەوە.
**أمْتَحَقَ الشَّيْئُ:** شتەکە کەم بوو بەرەکەتی نەما.
**امْتَحَقَ القمرُ:** مانگ روناکی کەم بوو، روناکی نەما ئەمە لەدوشەوی کۆتایی مانگ دا دەبێ.
**إنْمَحَقَ وامَّحَقَ الشَّيْئُ:** بەمانا (إمتحق)دێ.
**إمْحَقَ القمرُ:** مانگ گوم بوو چووە حاڵەتی مەحاقەوە.
**تَمَحَّقَ الشَّيْئُ:** شتەکە هێدی هێدی کەم بۆوە بەرەو نەمان رۆیی.
**المُحَاقُ:** بچوکبونەوەی مانگ لەدوای کامڵ بوونی تادەگاتە کۆتایی مانگو ئەمجار تازە بوو نەوەی.
**ليالي المَحَاق:** ئەو شەوانەی مانگ دەکەوێتە حاڵەتی مەحاقەوە.
**المَحَقَةُ:** فەوتان ٥ حوشترێك هەربێچوە نێرەی ببن.
**المَحيقُ:** (نصل محيق): سەرە تیری تیژە.
**مَحَكَ مَحْكاً:** توندو تیژی نواند لەکێشەو نیزاع دا.
**مَحِكَ:** بەمانا (مَحَكَ)دێ.
**أمْحَكَهُ الغَضَبُ:** رق هەڵسان وای لێ کرد لەکێشەو نیزاع دا سەرسەخت بێو بەئاسانی مل بۆ ئاشتی نەدا.
**ماحَكَهُ:** کێشەی لەگەڵ نایەوەو سەرسەختی نواند.

**تَماحَكَ البيعان:** كڕیارو فرۆشیار زۆریان منجه منجو دانو سان کردو چەندو چونیان کرد.

**تَمَحَّكَ:** لەکێشەو نیزاع دا زۆری قیرەو گیرە گیری کرد.

**المِحْكانُ:** کەسێك زۆر گیرە گیڕ بکا.

**مَحَلَ بالأمر مَحلاً:** ویستی بەفرتو فێڵ کارەکە ئەنجام بدا.

**مَحَلَ المكانُ:** شوێنەکە بێ بژێوو بەرو بووم بوو ٥ دەگوترێ: (أرض مَحْلٌ ومَحْلَة، ومَحُول ومُحُولٌ).

**مَحِلَ بِه الى ذي سلطان مَحْلاً:** لەلای دەسەڵاتدار فیتنەیی لەدژی کرد.

**مَحِلَ المكانُ:** شوێنەکە بێ پیتو بەرەکەت بوو بژێوی تێدا نەبوو.

**مَحُلَ المكانُ مَحالَةً:** بەمانا (مَحَلَ)دێ ٥ دەشگوترێ: (امحل الزمان): ڕۆژگارەکە قاتو قڕی بوو.

**أمْحَلَ القومُ:** خەڵکە توشی ساڵی بێ بارانیو قاتو قڕی بون.

**أمْحَلَ اللهُ الأرضَ:** خودا زەوییەکەی کردە زەوی سوتەمەڕۆو بێ بژێوو بێ بەروبووم.

**ماحَلَهُ مُماحَلَةً ومِحالاً:** کێشەی لەگەڵ نایەوە ٥ فێڵی لێ کرد، هەڵی خەڵەتاند.

**مَحَّلَ فلاناً:** فلانکەسی بەهێز کرد.

**تَماحَلَ المكان:** شوێنەکە دوور کەوتەوە ٥ دەشگوترێ: (فلاة متماحلة): دەشتێکی کاکی بەکاکیو بەرفراوانە ٥ (فتنة متماحلة): فیتنەو ئاشوبێکی درێژخایەنو نەبڕاوەیە.

**تَمَحَّلَ:** فێڵی کرد ٥ دەشگوترێ: (تَمَحَّلَ خيراً): داوای خێرو بێری کرد.

**الماحِلُ:** وڵاتی سوتەمەڕۆو بێ بژێو ٥ بەرهەڵستکارو ڕکابەری سەر سەخت.

**المِحَالُ:** فێڵو هێزو توانا ٥ دەسەڵاتی تۆڵە سەندن ٥ تەگبیرو پلان.

**المَحْلُ:** نەبونی باران، وشکە ساڵی ٥ دەگوترێ: (أرض مَحْلٌ): زەوی بێ گیاو گژو لەوەڕ ٥ دەشگوترێ: (رجل مَحْلٌ): پیاوێکی بێ خێرو بێرە.

**المحِلُ:** کەسێك دەربکرێو بەرە تێندرێ تاماندو دەبێ ٥ (رجل مَحِلٌ): پیاوێکی فێلاویو بەسیاسەتە.

**المِمْحالُ من الأرض:** زەوی سوتەمەڕۆ.

**المُمَحَّلُ:** قاپی شیر ٥ مەنجەڵی شیر.

**مَحَنَ فلاناً مَحْناً:** فلانکەسی بەتاقی کردەوە ٥ سزای دا ٥ زۆری ئەزیەت دا.

**مَحَنَ الفِضَّةَ:** زیوەکەی قاڵ کردو پاڵفتەی کرد بەئاگر.

**مَحَنَ الأديمَ:** چەرمەکەی نەرم کردو

لێکی کێشایەوە.

**مُحِـنَ فـلان:** فلانکەس کەوتـە چـورتمو ناخۆشییەوە.

**مَحْنَ الأديمَ:** بەمانا (مَحَنَهُ)دێ.

**إمْـتَحَنَ فلانـاً:** فلانکەسـی بـەتاقی کردەوە.

**إمْـتَحَنَ الـشَّيْئَ:** لەشـتەکە وردبـۆوە، سەیری کرد.

**إمْـتَحَنَ الفِـضّةَ:** زیوەکـەی قـاڵ کـرد پوختـەی کـرد ٥ دەگـوترێ: (أمـتُحِنَ فلان): فلانکـەس کەوتـە میحنـەتو ناخۆشییەوە.

**الإمتحـان:** تاقیکردنـەوە ٥ توشـبونی بەڵاو کارەسات.

**المِحْنَةُ:** بەڵاو چورتم.

**مَحـا الـشّيْئُ مَحْـواً:** شـتەکەی سـڕیەوە شـوێنەواری کوژانـدەوە ٥ دەگـوترێ: (مَحَـت الـريحُ الـسحابَ): ڕەشـەباکە هەورەکـەی رامـاڵی ٥ (مَحَـا المطَـرُ الجَدْبَ): بارانو وشکە ساڵی نەهێشت ٥ (محـا الـصبحُ الليـلَ): گزنگـی بـەیانی تاریکی شەوی لابرد ٥ (الإحـسان يمحـو الإساءَةَ): چاکە خراپە دەسڕێتەوە.

**إمَّحـى الـشّيْئُ:** شـوێنەواری شـتەکە کوژایەوە.

**تَمَحَّى من القوم:** داوای لەخەڵکەکە کرد کە لەخراپەکانی خۆش بن.

**المَحْوُ:** تەڵخایی ناو مانگ.

**المِحَاةُ:** پەڕوی شت سڕینەوە، پەڕوی کاشـی سـڕینەوە یـان لاسـیکی خەتکوژانەوە.

**مَخَى الشَّيْئَ مَخْياً:** شوێنەواری شتەکەی نەهێشت.

**أمَـخَّ العظـمُ:** ئێسقانەکە مـۆخی تێـدا پەیدا بوو.

**أمَخّت الدابة:** وڵاخەکە قەڵەو بوو.

**أمَـخَّ العـودُ:** ئەمامـە درەختەکـە ئـاوی تێکەڕا.

**أمَخَّ حبُ الزرع:** دانەوێڵەکە ئاردی تێـدا پەیدا بوو.

**مَخْـخَ العظـمَ:** مـۆخی ئێـسقانەکەی دەرهێنا.

**إمـتَخَّ العظـمَ:** مـۆخی ئێـسقانەکەی دەرهێنا.

**المُخاخَــةُ:** ئــەوەی لەئێــسقان دەردێ بەهۆی هەڵمژینەوە.

**المُخُّ:** مـۆخ مێشك ٥ ئـەو مـادە مۆخـەی لـەناو سـەردایە ٥ پاڵفتـەی شـتو کرۆکی شت ٥ لەحـەدیـث دا هـاتووە دەفـەرموێ: (الـدعاءُ مُـخّ العبـادة): نـزاو پاڕانـەوە لـەخودا پوختـەی خودا پەرستییە.

**المُخّةُ:** پارچەیەك لەمۆخ ٥ دەشگوترێ: (هذه مُخّةُ الشّيء): ئەمـە باشـترینی شتەکەیە.

**المَخيخُ**: دەگوترێ: (عظم مَخيخٌ): ئێسقانێکە مۆخی تێدایە.

**المُخَيْخُ**: بەشێك لەدەماخ کە مەرکەزی هاوکێشەیی ئەندامەکانی جەستەیە.

**المُمِخُّ**: دەگوترێ: (لە لسان مُمِخٌ): زمانێ تیژو ڕەوانی هەیە ٥ بەتوانایە بۆ قسەکردن.

**مَخَرَت السفينةُ مَخْراً ومُخوراً**: کەشتییەکە کەوتە ڕۆیینو ئاوی دەریای دڕدا.

**مَخَرَ السابحُ**: مەلەوانەکە بەدەستی ئاوی دڕدا.

**مَخَرَ الزارعُ الأرضَ مَخْراً**: کشتیارە زەوییەکەی کێلا بۆ کشتوکاڵ.

**مَخَرَ المحور مدارَهُ**: قەراخی شتەکە لێی خوراو فراوان بوو.

**امْتَخَرَ العَظْمَ**: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا.

**امْتَخَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی هەڵبژارد.

**امتَخَرَ القومُ**: پیاوی پیاوانەی لەخەڵکەکە هەڵبژارد.

**الماخِرَةُ**: کەشتی ٥ (ك: مواخِر).

**الماخور**: خانوی خراپەکاریی ٥ قومار خانە ٥ شوێنی کۆبونەوەی ئەهلی فیسقو فەساد ٥ (ك: مواخِر ومواخير).

**المَخْرُ**: (بنات مَخْرٍ): هەوری تەنکی سپی کەپێش وەرزی هاوین بەئاسمانەوە دەردەکەون.

**اليَمْخورُ**: (رجل يمخور، وعنق يمخور): پیاوی درێژ ملی درێژ.

**مَخَضَ الشَّيْءَ مَخْضاً**: بەتوندی شتەکەی ڕاوەشاند.

**مَخَضَ اللَّبَنَ**: ماستەکەی هەژاندو ڕۆنەکەی لێ دەرهێنا ٥ (فهو مخيض).

**مَخَضَ البئر بالدلو**: بەدۆڵچەکە بیرەکەی شڵەقاندو زۆری ئاو لی هەڵێنجا.

**مَخَضَ الرأيَ**: ڕاوو بۆچونەکەی سەرەو ناو کردو زۆر لێی ورد بۆوەو ئاکامەکەی لێك دایەوە.

**مَخِضَت الحامِلُ**: ژنە سك پڕەکە ژانی منداڵبوونی هاتێو خەریکە منداڵی ببێ ٥ (فهي ماخِضٌ) ٥ (ك: مُخَّضٌ ومواخض).

**امْتَخَضَ اللَّبَنُ**: ماستەکە لەناو مەشکەکەدا هەژا.

**امْتَخَضَ الولدُ**: زارۆکەکە لەناو سکی دایکی دا جوڵایەوەو کاتی لەدایکبوونی هات.

**تَمَخَّضَ اللبن والولد**: بەمانا (امْتَخَضَ)دێ.

**تَمَخَّضَ السماءُ**: ئاسمان خەریکە باران ببارێنێ.

**تَمَخَّضَ الحامِلُ**: بەمانا (مَخِضَتْ)دێ ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (تَمَخَّضَ الجبلُ فولد فأراً): کێو ژانی هاتێو مشکێکی بوو ٥ هەروا دەگوترێ: (تَمَخَّضَت الليلة عَنْ يوم سوء): شەوەکە بەیانیەکی ناخۆشی بەدو دا هات.

**الْمَخَاضُ**: ژانی منداڵبون ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَجَاءهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ﴾. هەروا وشەی (المخاض): ناوە بۆ حوشترێك دەمانگ بەسەر ئاوسبوونی دا تێپەڕیبێ ٥ هەروا ناوە بۆ بێچوە حوشتر کە دایکی کەڵ درابێ ٥ یان بۆ گۆلکە حوشترێك ساڵی تەواو کردبێو چوبێتە ساڵی دووەمی تەمەنیەوە ٥ (ك: بنات مخاض).

**الْمِخْضَةُ**: ئامێری هەژاندنی ماست بۆ جیاکردنەوەی ڕۆنەکەرەکەی ٥ (ك: مَمَاخِض).

**مَخَطَ السَّهْمُ مَخْطاً**: تیرەکە چووە ناو جەستەکەوە ئەمدیواو دیوی کرد.

**مَخَطَ المرأ في الأرض**: پیاوەکە بەناو زەوی دا ڕۆیی بەخێرایی.

**مَخَطَ الشَّيْءَ**: بەتوندی شتەکەی کێش کرد.

**مَخَطَ السَّيْفَ**: شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا.

**مَخَطَ الْمُخَاطَ**: چڵمی لەلوتی هێنایە دەر.

**امْخَطَ السَّهْمَ**: تیرەکەی هاویشتو لەجەستەکەی دا.

**مَخَّطَ الصَّبِيَّ**: چڵمی لەلوتی منداڵەکە دەرهێنا.

**إمْتَخَطَ فلان**: فلانکەس چی لەلوتی دا بوو دەری هاویشت.

**إمْتَخَطَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ڕفاند.

**إمْتَخَطَ مافي يده**: ئەوەی لەدەستی دا بوو لێی دزی.

**إمْتَخَطَ السيف**: شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا.

**تَمَخَّطَ فلان**: بەمانا (إمْتَخَطَ)دێ ٥ لەڕۆیشتن دا بەشێواوی و لارە لار ڕۆیی ٥ دەکەوتو هەڵدەستایەوە.

**الْمُخَاط**: چڵم ٥ صمغی درەختو ڕوەك.

**مُخَاط الشيطان**: ئەو تیرو تیشکانەن کەلەکاتی نیوەڕۆدا کەدەڕوانی بە خۆر دێنە بەرچاو ٥ پێشی دەگوترێ: (مخاط الشمس، لعاب الشمس، ريق الشمس).

**الْمُخَاطَة**: درەختێکە لەپێری (المخاطية) بەرێکی هەیەکاتی خۆی بەکارهاتووە بۆ نەرم کردنەوەی سنگ، ئەمڕۆ بۆ باڵندە گرتن بەکاردێ.

**المَخْيط**: بەمانا (المخاطة)دێ.

**المَخْطَةُ**: ئەو چڵمو جۆرە شلەمەنییەیە کە مرۆڤ لەلوتیەوە فڕێی دەداتە دەر.

**مَخْمَخ العَظْمَ**: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا.

**مَخَنَ مَخْناً**: گریا.

**مَخَنَ الأديمَ**: پێستەکەی پاك کردەوەو سپی کرد توکی لێ کردەوە.

**مَخَنَ البِئرَ**: ئاوی بیرەکەی هەڵێنجا.

**المَخنُ**: درێژ.

**المَخْنُ**: بەمانا (المِخِنُ)دێ ٥ پیاوی مەیلەو کورتی جەستە سوك.

**المِخْنَةُ**: بەردەرگا، حەوشەی خانوو.

**المُمَخَّنُ**: دەگوترێ: (طريق مُمَخَّن): ڕێگایەکە خەڵکی زۆر پێدا ڕۆیشتووە خۆش بووە.

**مَخَى الرجلَ عَنْ الأمر**: پیاوەکەی لەکارەکە دوورخستەوە.

**تَمَخَّى العظمَ**: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا ٥ (بناغەی ئەم وشەیە (تَمَخَّخ) بووە وەکوو چۆن بناغەی (تظنّ)بریتیبووە لە (تظَنَّنَ).

**مَدَحَهُ**: مەدحی کرد ڕەوشتە جوانەکانی باس کردن.

**مَدَّحَهُ**: زۆری مەدح کرد.

**امْتَدَحَ المكانُ**: شوێنەکە فراوان بوو ٥ دەگوترێ: (إمْتَدَحت خاصرة الماشية): کەلەکەی وڵاخەکە کشا بەهۆی تێری و زۆر خواردنەوە.

**امتَدَحَ فلاناً**: مەدحی فلانکەسی کرد.

**تمادحَا**: هەریەك لەو دووکەسە مەدحی یەکتریان کرد.

**تَمَدّحَتْ حاصرة الماشية**: بەمانا (إمتدحَتْ)دێ.

**تَمَدَّحَ فلان**: بەزۆر حاڵەتی وای بەسەر خۆی دا هێنا مەدح بکرێ ٥ دەگوترێ: (هو يَمتَدّح الى الناس): داوا دەکا خەڵك مەدحی بکەن ٥ شانازی کرد بەشتێك کەنەی بوو نەیکرد بوو.

**إمتدح فلاناً**: مەدحی فلانکەسی کرد.

**الأُمْدُوحة**: ئەوەی مەدحی پێ دەکرێ ٥ (ك: أماديح).

**المِدْحة**: بەمانا (الأمدوحة)دێ ٥ (ك: مَدَحٌ).

**المَديحُ**: بەمانا (الأمدوحة)دێ ٥ (ك: مدائح).

**المَادحُ**: ئەو ڕەوشتە جوانانەن کە لەمەدح کردن دا دەگوترێن.

**مَدَخَ مَدْخاً**: گەورە بوو.

**مَدَخَ فلاناً**: باش یارمەتی فلانکەسی دا، چاك مەدحی کرد.

**مادَخَهُ**: یارمەتی دا بۆچاکە یان بۆ خراپە.

امْتَدَخَ عَلَيْهِ السَلاَمْ: ستەمی لیٚ کرد.

المديخ: گەورەو خۆشەویست.

مدَّ النهارُ مداً: روناکایی رۆژ بلاو بووەوە.

مَـدَّ فـلان في سـيه: فلانکـەس دریـژەی بەرۆیشتنی دا.

مَـدَّ الـشَّيْئَ: لەشـتەکەی زیـاد کـرد ٥ دەگـوترێ: (مـدّ الـنهرُ النهـرَ): روبـارە بچوکەکە ئاوی روبارەکەی زیاد کرد.

مَدَّ الجَيْشَ: سوپاکەی بەهێز کرد.

مَـدَّ القـومُ الجَـيْشَ: خەلکەکـە پـشتیوانی سوپایان کردو سوپایان بەهێز کرد.

مَدَّ الـدَّوَاةَ: مەرەکـەبی قەلەمەکـەی زیـاد کرد.

مَـــدَّ القَلَـمَ: قەلەمەکــەی خــستە نــاو مەرەکەبەکە.

مَدَّ الله الأرض: خـودا زەوی راخـست پـانی کردەوە.

مَدَّ الأجَلَ: ماوەکەی درێژ کردەوە.

مَدَّ المدين: مۆلەتی قەرزدارەکەی دا.

مَـــدَّ الحَبْــلَ: حەبلەکــەی کــێش کــرد ٥ حەبلەکەی درێژکردەوە.

مَدَّ الحرفَ: پیتەکەی بەدرێـژی خوێنـدەوە ٥ یــان لەنوســین دا بەشــێوەی درێــژ نوسی.

مَدَّ بَصَرَهُ الى كذا: چاوی لەشـتەکە بـڕی ٥ تەماعی تێکرد.

مَدَّ الرَّجُلَ في غَيِّهِ: پیاوەکەی دەنە دەنـەدا بۆ گومڕا بوونی.

أمـدَّ الجـرحُ: برینەکـە کێمو زوخـاوی تێدا پەیدا بوو.

أمَدَّ النهرَ: روبارەکەی زۆر کرد.

أمَدَّ الدواةَ: لیقەکە مەرەکەبەکەی زیاد کرد.

أمَدَّ الأرْضَ: زەوی پان کرد، رایخست.

أمَدَّ له في الأجل: ماوەکەی بۆ زیادکرد، بۆی درێژ کردەوە.

أمَـدَّ فلانـاً: یارمـەتی فلانکەسـی دا ٥ مۆلەتی دا.

مَادَّه مداداً ومادة: ماتلی کرد.

مـادّ فلانـاً الثـوبَ: قوماشـەکەی بـۆ فلانکەس کێش کرد.

مَـدَّدَ الـشَّيْئَ: شـتەکەی پـان کـردەوەو درێژی کردەوە.

امْتَـدَّ الـشَّيْئُ: شـتەکە فـراوان بـوو، راخرا.

إمْتَـدَّ الحبـلُ: حەبلەکـە درێـژ بـوو ٥ دەگوترێ: (امتدَّ الظِلُّ والنهارُ، وامتـدّ عمُـرهُ، وامتـدت العِلّـة، وامتـد بهـم السَّيْرُ).

تمادّا الثـوبَ: هەریەکـە لـەلای خۆیـەوە قوماشەکەی راکێشا.

تَمَـدَّدَ الـشَّيْئُ: شـتەکە بـلاو بـۆوە، پـان بـۆوە ٥ دەگـوترێ: (تَمَـدَّدَ الأديـمُ): چەرمەکە لێـك کشاو پان بوو.

تَمَدَّدَ الجسمُ بالحرارة: قەبارەکە بەهۆی گەرمبوونەوە لێك کشا.
تَمَدَّدَ القومُ الشَّيْءَ بينهم: خەڵکەکە لەناو خۆیان دا شتەکەیان لێك کێشایەوە، درێژو پانیان کرد.
تَمَدَّدَ فلان: فلانکەس خۆی لێك کێشایەوە.
اسْتَمَدَّ القَومُ الأميرَ: خەڵکەکە داوایان لەفەرمانڕەوا کرد یارمەتییان بدا.
الإمدان: جمو جوڵ.
الأمِدَّةُ: ریسی تەشی.
الأُمْدُودُ: دابو نەریت.
التَمَدُّدُ: لێك کشانەوەو گەورە بوونی قەبارە.
المادّة: مادەو قەبارە ٥ هەرشتێك بۆشاییەك پڕبکا.
مادة الشَّيْء: بنەماو پێکهاتەی شت.
مادة الخشب: پێکهاتەی دار.
مادة البحث العلمي: ئەو بابەتانەی باسە زانستییەکەی لێ پێکهاتووە.
مواد اللغة: وشەکانی زوبا.
مواد القانون: ئەو ڕستانەی بڕیارەکەیان لەخۆ گرتووە.
المادّية: بیرو باوەڕو مەزهەبێکە تەنها بڕوای بەمادە هەیە ٥ هەموو شتێك بەمادە تەفسیر دەکا.
المِداد: مەرەکەب ٥ نەوتو ڕۆنی فتیلەو چرا ٥ میثالو ڕێبازو پرۆگرام ٥ دەشگوترێ: (سبحان الله مِداد السموات): بەئەندازەی بەرفراوانی ئاسمان سوپاسو تەقدیس بۆ پەروەردگار.
المَدُّ: لافاو ٥ ئاوی زۆر ٥ مەسافەو مەودا ٥ دەگوترێ: (بيني وبينه قدر مدّ البصر).
المُدُّ: پێوەرێکی کۆنە بۆ پێوانەکردنی دانەوێڵەو شتی وا.
المَدَدُ: ئەوەیە شتی تری پێ زۆربکەی.
مَدَدُ الجيش: ئەو کۆمەڵە سەربازو کەرەستەیە دەخرێتە پاڵ سوپا بۆبەهێزکردنی.
المِدّان: ئاوی زۆر سوێر.
المَدّة: نیشانەیەکە دەخرێتە سەرپیتی هەمزەی درێژ کراوە.
المُدَّة: ماوەیەکە لەکات ئەندازەیەکی زەمەند چ زۆرو چ کەم ٥ دەگوترێ: (بقيت عنده مُدّة طويلاً).
المِدّة: کێمو زوخاو.
المَديدُ: درێژ ٥ دەگوترێ: (قدّ مديد ورجل مديد الجسم) ٥ هەروا ناوە بۆ بەحرێکی عوروز لەبواری کێشی شیعردا کێشەکەی دوجار (فاعلاتن فاعلن فاعلاتن).
المَمْدودُ: دەگوترێ: (مال ممدود) ماڵی

زۆر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَّمْدُودًا﴾ ٥ لەزاراوەی زانستی صەرف دا وشەی (ممدود) ناوە بۆ نیسمێکی موعرەب کە کۆتایی بە هەمزە بێو لەپێشیەوە ئەلفێکی زیادە هەبێ ٥ وەکوو (سمراء، صحراء).

مَدِرَ الحَوضَ مَدْراً: درزو کەلێنی دیواری حەوزەکەی بەنکەشی کرد.

مَدِرَ مَدَراً: گەدەی زل بوو لاکەلەکەی فش بوون.

مَدِرَ الصَّبِيُّ وغيره: منداڵەکە پیسایی کردە ناو دەرپێو جلەکانیەوە ٥ گوی بەخۆدا کرد.

مَدِرَ الضُّبُعُ: کەمتیارەکە لاتەنیشتی خۆڵاوی بوو.

أمْدَرَ الحوضَ: کەلێنو درزی دیواری حەوزەکەی پڕکردنەوە.

مَدَّرَ الحَوضَ: بەمانا (مَدَرَه)دێ.

الأمْدَرُ: ئەوکەسەی گرنگی بەپاکو خاوێنی جەستەو پۆشاکی نادا.

المَدَرُ: قوڕی لینجو تۆپەڵ بوو ٥ پارچە قوڕی لینج.

أهلُ المَدَر: خانوو نشین پێچەوانەی دەوار نشینەکان.

المَدْراءُ: (بنو مدراء): شارەستانیو گوندنشین.

المَدَرَةُ: گوندێک خانوەکانی بەقوڕ خشتی گڵ دروست کرابێ ٥ دەگوترێ: (ما رأيتُ في الوَبَر والمدَر مثله): لەناو ڕەشماڵ نشینو گوندنشین دا وێنەی ئەوم نەدیوە.

المَدِيرُ: (مكان مَديرٌ): شوێنێکە بەقوڕ تەخت کراوە.

المِمدَرُ والمُمْدَرُ: شوێنێک قوڕی لێ بێ بکرێ بەدیوار.

مَدَشَ لفلان من العطاء مَدْشاً: بەخششی لەفلان کەم کردەوە.

مَدِشَ فلان مَدَشاً: فلانکەس لاواز بوو ٥ (فهو أمدش وهي مدشاء).

مَدِشت العينُ: چاوەکە بینینی کەم بوو.

مَدِشَ عَصَبُ اليد: ڕەگی دەست شل بوو.

مَدِشَت الرِّجْلُ: قاچەکە قەڵشا شەقار شەقار بوو.

مَدِشَ باطن رسغي الفرس: دوقاچی ئەسپەکە لێک خشان ٥ فەیزەن بوو.

مَدَقَ الصَّخْرَةَ: بەردەکەی شکاند.

تَمَدَّلَ بالمنديل: بەدەسە سڕەکە دەمو چاوی سڕینەوە ٥ پارچە قوماشەکەی لەسەری بەستو کردی بەمێزەر.

مَدَنَ فلان مدوناً: فلانکەس هاتە شارو بوو بەشارەستانی.

تَمَدَّنَ: بەژیانی شارەستانیانە فێربوو، ڕاهات.

تَمَدّيَن: بەشێوەی ژیانی شارستانیانە ژیـاو کـالاو کەرەسـتەی شارەستانیانەی بەکارهێنان.

المدنيـة: شارستـانیەتو پێـشکەوتنی باری ژیان.

المدينة: شار، گەورە شار ٥ (ك: مدائن) ٥ نـاوی مەدینـەی منەوەرەشـە، مەدینەی پێغەمبەر (د.خ).

أمدى فلان: فلانکەس پیر بوو، تەمەنی زۆر بوو.

أمدى فلاناً: مۆڵەتی فلانکەسی دا.

ماداه مماداةً: بۆماوەیـەك هاوسێی کـرد، بووبە جیرانی.

تمـادى في الأمـر: گەیـشتە ئەوپـەڕ لەکارەکەدا.

تمادى في غيّه: لەگومڕایی دا ڕۆچوو.

المدى: مەسافە ٥ ئامانج.

مَدى البصر: مەسافەی دیتنی چاو تاچاو بڕبکا ٥ هەروا دەگوترێ: (مدى الأجل، مدى الصوت، مدى الدهر).

المُدْيَةُ: کێرد، چەقۆ.

المَـدِيُّ: جۆگایـەکی بـچوکە ئـەو ئـاوەی لەحـەوز یـان لـەبیر دەڕژێ بـەهۆی ئـەو جۆگەلـەوە ئاوەکـە لـە بیرەکـە دوور دەکەوێتەوە.

المِيداءُ: ئامانجو کۆتایی شـت ئەنـدازەو قەبارەی شت ٥ دەگوترێ: (مـا أدري ما ميداء هذا الأمـر) ٥ هـەروا وشـەی (میـــداء) بـــەمانا بەرامبـــەر دێ، دەگوترێ: (هـذا بميـداء أرض كـذا): ئەمە بەرامبەر زەوی فلانە.

مَـذِحَ الـشَّيْءُ بالـشَّيْء مَـذْحاً: شـتەکە لەشتەکە خشاو شەق بـوو درزی بـرد ٥ دەشـگوترێ: (مَـذِح فـلان): فلانکـەس رانی لێـك دەخشێن.

تَمَذَّحت خاصرته: کەلەکەی فش بـوو ٥ دەگـوترێ: (شَـرِبَ حتـى تَمَـذّحت خاصرته): ئەوەنـدەی ئـاو خـواردەوە تا کەلەکەی هەڵاوسان.

تَمَـذَّحَ الـشَّيْءَ: شـتەکەی هەڵمژیـست، هەڵمژی.

الأمْذَحُ: کەسێـکە لەڕۆیـشتن دا دوڕانـی لێـك بخشێن لەبەر قەڵەوی.

مَـذِرَت البيـضة مَـذَراً: هێلکەکـە پـیس بوو.

مَذِرَت مَعِدَتُهُ: مەعیدەی پیس بوو.

مَذِرَ فلان: فلانکەس زۆر چوو بۆ سەرئاو ٥ (فهو أمذر).

أمـذرت الدجاجـةُ البيْـضَة: مریـشکەکە هێلکەکەی پیس کرد.

مَذَّرَ الشيءَ: شتەکەی بڵاو کردەوە.

تَمَذَّرَت مَعِدَتُهُ: بەمانا (مذِرَتْ)دێ.

تَمَذَّرَ الشَّيْءُ: شتەکە بڵاو بۆوە.

تَمَذَّرَ اللَّبَنُ: ماستەکە لەناو مەشکەکەدا بڵاو بۆوە.

المَذَرُ: دەگوترێ: (ذهب القوم شذر مَذَر): خەڵکەکە پەرتەوازە بوون.
مَذْرَقَ به: فڕێی دا.
المَاذَرْيُونُ: درەختێکە گەڵاکەی وەکوو گەڵای زەیتوون وایە، گوڵەکەی مەیلەو سپییە ٥ دەشگوترێ: (المازريون).
مَذَع فلان مَذْعاً: فلان درۆی کرد لافو گەزافی لێ دا.
مَذَعَ المياهُ: ئاو لەسەر کێوەکانەوە بوو بەلافاو.
مَذَع يميناً: سوێندی خوارد.
مَذَعَ لي الخبرَ: هەندێکی لەهەواڵەکە بۆ گێڕامەوەو هەندێکی شاردەوە ٥ یان هەواڵەکەی لەنیوە دابڕی‌و چووە سەر باسێکی تر.
مَذَعَ الضَرعَ: نیوە گوانەکەی دۆشی نیوەی هێشتەوە.
تَمَذَعَ الشرابَ: شەرابەکەی وردە وردە خواردەوە.
المذّاعُ: درۆزن ٥ کەسێك وەفاو ئەمەکی نەبێ ٥ پاشملە باسی کەسانی دی بکا بەخراپە، کەس لەزمانی رزگاری نەبێ ٥ کەسێك نهێنی پێ هەڵنەگیرێ.
مَذَقَ اللَّبَنَ والشرابَ بالماء مَذقاً: شیرو شەرابەکەی تێکەڵ بەئاو کرد.
مَسذَقَ فلاناً: شیری ئاو تێکەڵکراوی دەرخواردی فلان دا.
مَذَقَ الوُدَّ: خۆشەویستییەکەی بێ خەوش نەبوو.
ماذق فلاناً في الوُدُّ: خۆشەویستییەکەی بێ خەوش نەبوو ٥ بەڕاستی فلانکەسی خۆش نەویست.
إمْتَذَقَ الشرابُ أو اللَّبَنُ بالماء: شەراب یان شیرەکەی تێکەڵ بەئاو کرد.
إمَّذَقَ الشراب أو اللبن بالماء: بەمانا (إمْتَذَقَ)دێ.
المَذّاق: درۆزن، زۆر درۆزن ٥ غەمبارو خەمۆك.
المَذِقُ: (لبن مَذِق): شیری ئاو تێکەڵکراو ٥ (رجل مَذِق): پیاوی خەمۆك.
المَذقَة: شیری ئاوتێکراو ٥ (أبو مذقة): گورگ ٥ لەم ڕووەوە کەشیر ئاوی زۆر تێبکرێ مەیلەو بۆر دەبێ.
مَذَلَ بِسِرِّه مَذْلاً ومذالاً: نهێنییەکەی بۆ هەڵنەگیراو توشی قەلەق بوو ناچار درکاندی.
مَذَلت نفسه بالشيئ: نەفسی شتەکەی قبوڵ بوو.
مَذِلَ فلان مَذَلاً: فلانکەس نارەحەت بوو توشی قەلەق‌و دڵەڕاوکێ بوو ٥ بەهەڵگرتنی نهێنییەکە توشی دڵەڕاوکێ بوو بۆیە درکاندی.

**مَذِلَ بمضجعه**: بەشوێنی نوستنەکەی نارەحەت بوو بۆیە لەو شوێنە گواستییەوە.

**مَذِلَ بماله**: بەمانەوەی ماڵو سامانەکەی لەدەستی دا نارەحەت بوو بۆیە بەخشیو خۆی نارام کرد.

**مَذِلَ على فراشه**: لەسەر جێگاکەی هەدای نەداو ناچار گواستییەوە.

**مَذِلَت رجله**: قاچی تەزی قاچی شل بوو.

**أمْذَلَ فلاناً**: فلانکەسی جارِس کرد، توشی دڵەڕاوکێی کرد.

**إمَّذَلَ فلان**: بەمانا (أمذَلَ)دێ.

**إمَّذَلَ مَفاصِلُه**: جومزگەکانی شل بوون.

**المُذْلَةُ**: شوێنێکەو نوختە لەسەر بەردو شاخ ٥ دەنکە خورما.

**المَذِيلُ**: نەخۆشێك کە حەجمینی نەبێ ٥ ئاسنێك بەئاسانی بشکێ.

**المِـذَلُ**: کەسێك نەتوانێ نهێنی بپارێزێو ناچاربێ بیدرکێنێ ٥ کەسێك زۆرجار قاچی توشی تەزین ببێ.

**مَذْمَذَ فلان**: فلانکەس درۆی کرد.

**المَذْماذُ**: کەسێك زۆر قیزەو قارەو قیرە بکا دەم بەهاوار بێ.

**المَذْمَذِيُ**: بەمانا (المَذماذُ)دێ ٥ مرۆڤی فێڵبازو قسە خۆش.

**مَذَى الرجلُ مَذياً**: پیاوەکە لەکاتی یاریکردنو شتی وا لەگەڵ ئافرەت دا مەزی هاتەوە ٥ (فهو ماذ ومذّاء).

**مَذى الفَرَسَ**: ئەسپەکەی بەرەڵای پاوان کرد.

**أمذى الرجُلُ**: بەمانا (مذى)دێ.

**امذى شرابَهُ**: شەرابەکەی زۆر ڕون کردەوە.

**أمذى الفَرَسَ**: ئەسپەکەی بەرەڵای لەوەڕگا کرد ٥ دەگوترێ: (أمْذِ بِعنان فرسك): ڕێشمەی ئەسپەکەت بەرەڵابکە وازی لێبێنە بابۆخۆی بلەوەڕێ.

**الماذي**: هەنگوینی سپی ٥ ئاسنی بێ خەوشو چاك.

**الماذِيَّةُ**: شەرابو عەرەق ٥ زرێی نەرم.

**المذاءُ**: نەرمو شلەپەتە.

**المَذْيُ**: ئاوێکی ڕونە لەڕێڕەوی میزەوە دێتەدەر لەکاتی یاری کردن لەگەڵ ئافرەت دا.

**المَذِيّ**: بەمانا (المَذْيُ)دێ.

**المَذْيَةُ**: ئاوێنەی رومالکراو ٥ (ك: مَذي، مذيات ومِذاء ومِذى).

**المِذْيَةُ**: بەمانا (المَذْيَةُ) دێ ٥ (ك: مِذاء).

**مَرَأَ الطعامُ مَراءةً**: خۆراکەکە بەلەزەتو گونجاو بوو.

**مَرَأَ فلان**: فلانکەس خواردنی خوارد.

مَرِءَ مَرَأً: پیاوەکە لەشێوەدا یان لەگفتو گۆدا ژنانە بوو.
مَـرِءَ الطعـامَ: خۆراکەکـەی پێـکەوت بەلایەوە بەلەزەت بوو.
مَرُءَت الأرضُ مَرَاءةً: زەوییەکە کەش‌و هەوای خۆش بوو.
مَرُءَ فلان مروءةً: فلانکەس بوو بەخاوەن پیاوەتی‌و شکۆمەندی.
مُرُءَ الطعام مراءةً: خۆراکەکە بەلەزەت‌و گونجاو بوو.
أمْرَءَ الطعـامَ: خواردنەکەی بەلەزەت کردو وای لێ کرد بەخۆشی بۆی قوت چوو.
أمْرَأ الطعامُ فلانـاً: خواردنەکە سودی باشی بەفلانکەس گەیاند.
تَمَـرَّأ فـلان: فلانکـەس بوو بەخاوەن شـکۆمەندی‌و رێـز ٥ بەتەکـەللوف شکۆمەندی بەسەر خۆی دا هێنا.
تَمَـرَّأ بـالقوم: هـەوڵی دا خەڵکەکـە بـەخاوەن شـکۆو رێـزداری وەصـف بکەن.
إستَمْرَأ الطعامَ: خواردنەکەی بەخۆش‌و بەلەزەت هاتە دەست.
المَـرْءُ: مـرۆڤ پیـاو ٥ ئەگـەر (ال) بەوشەکەوە نەبوو دەگوترێ: (إمْرُءٌ) ٥ بۆ مێیینە دەگوترێ: (مراه).
المُـروءةُ: ئـادابی نەفـسانی‌و هەڵس‌وکەوتێـکە کەلەبـەر چاوگرتنی ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ پابەنـدبوون بەڕەوشـتی جـوان‌و داب‌و نـەریتی پەسـەند ٥ یـان بریتییـە لـەپیاوەتی‌و مەردایـەتی تەواو.
المَرِيُّ: گـەرو، ڕێـڕەوی خـواردن بـەناو گـەرودا بـۆ مەعیـدە ٥ (ك: أمرئـة ومَـرُءٌ) ٥ (طعـام مَـرِئٌ): خـواردنی خۆش‌و بەلـەزەت‌و بەسـود ٥ (كـلام مَـرِئٌ): قـسەیەك کەلـەکردنی دا پەشیمان نەبی.
مَرَتَ الشَّيْءَ مَرْتـاً: شـتەکەی تـاس‌و لـوس کرد.
مـاروت: هـاوڕێی (هـاروت)؛ کـە دووفریـشتەن لـەقورئان دا ناویـان هاتووە.
المَـرْتُ: دەشتێـکی بـێ گژوگیایـە ٥ دەگوترێ: (أرض مرت، مكان مرت): شوێنێـکە روتـەن‌و بـێ درەخـت‌و ڕووەکـە ٥ (رجـل مَـرْتُ الحاجـب): پیاوێکە بڕۆی نین بڕۆکانی مویان لێ نەڕواوە ٥ (رجل مَـرْتُ الجسدِ): پیاوێـکە جەسـتەی مـوی لـێ نەهاتووە.
المَرُوتُ: سارای بێ گیاو گژو درەخت.
مَرَثَ الشَّيْءَ في الماءِ مَرْثاً: شتەکەی لەناو

هەڵكێشا ٥ دەشگوترێ: (مَرَثَ الشعرَ وغيره بيده): دەستی بەقژی دا هێناو لەناو ئاودا هەڵیگلۆفت بۆئەوەی باش تەڕببن.

**مَرَثَ الشَّيْئَ:** شتەكەی مژی ٥ دەگوترێ: (مَرَثَ الصَّبِيُّ اصبعه او ثدي أمه): منداڵەكە قامكی خۆی مژی یان مەمكی دایكی مژی.

**مَرَثَ به الأرضَ:** بەزەوی كێشا ٥ بەزەوی دادا.

**مَرِثَ على الخِصام مرثاً:** پشوو درێژبوو بۆ كێشەو ململانێ لەگەڵ ناحەزانی دا.

**مَرِثَهُ:** بەمانا (مَرَثَهُ)دێ.

**مَرُثَ الماءَ:** ئاوەكەی پیس كرد ٥ میكرۆباوی كرد.

**المِمْرَث:** پشو درێژو بەصەبرو بار قوڵ بۆ كێشەو ململانێ لەگەڵ ركابەرەكەی دا ٥ (ك: مَمَارث).

**المُمَرَّثَةُ (أرض ممرثة):** زەوییەكە بارانێكی كەمی لێ باری.

**مَرَجَ اللهبُ مروجاً:** بڵێسەكە بەرز بۆوە.

**مَرَجَ الخاتمُ في اليد:** هەنگوستیلەكە لەپەنجەدا شل بوو.

**مَرَجَ الشَّيْئَ مرجاً:** شتەكەی تێكەڵاو كرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ﴾ ٥ هەروا دەگوترێ: (لايزال فلان يمرج علينا مروجاً): هەمیشە فلانكەس بەشێوەی لەناكاوو گۆزو گوممەت دێ بۆلامان.

**مَرَجَ لسانَهُ في أعراض الناس:** پاشملە بەخراپە باسی خەڵكی كرد.

**مَرَجَ الدابَّةَ:** ولاخەكەی بەرەڵاكرد بۆئەوەی بلەوەڕێ.

**مَرَجَ السلطانُ رعيّتَهُ:** پاشا خەڵكەكەی لەخراپەكاریو فەسادو گەندەڵی نەگێڕایەوە.

**مَرَجَ الكذبَ:** كەوتە درۆكردن ٥ (فهو مَرَّاج) ٥ یان دەگوترێ: (سَراج مرّاج): زۆر درۆزن.

**مَرَجَ أمْرُهُ:** ئیشی خۆی فەوتاند شێواندی.

**مَرِجَ الناسُ مَرَجاً:** خەڵكەكە تێكەڵاو بوون دەشگوترێ: (مَرِجَ الأمْرُ مرجاً ومُروجاً): ئیشەكە تێكەڵو پێكەڵ بوون ٥ (فهو مارج ومريج).

**مَرِج الدينُ او العهدُ:** ئایینەكە شێوا وادەو بەڵێن تێك چونو خەڵك پەیڕەوییان ناكا.

**أمْرَجَ الشيئَ:** شتەكەی تێكەڵو پێكەڵ كرد ٥ دەگوترێ: (أمْرَجَ البحرين): دوو دەریاكەی تێكەڵ بەیەك كردن.

**أمْرَجَ لسانه في اعراض الناس:** غەیبەتی خەڵكی كردو دەمی خستە ناموسو كەسایەتی خەڵكانی ترەوە.

**أمْرَجَ الدابَّةَ:** وڵاخەکەی بەرەڵای ناو لەوەڕگا کرد.

**أمْرَجَ فلان عهده:** فلانکەس پابەندی پەیمانی خۆی نەبوو.

**المارج:** بڵێسەی ئاگر کە بەرزدەبێتەوە ٥ یان ئەو بڵێسە ئاگرەی کەلەگەڵ دوکەڵ تێکەڵە ٥ دەشگوترێ: (رجل مارِج) پیاوی ڕەوانەکراو کەلەهیچ لەمپەرو سەیتەرە دا مەنع نەکرێ.

**المَرْجُ:** زەوی پانو پڕ گژوگیا بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ.

**المَرَجُ:** گەندەڵی ٥ فیتنەو ئاشوب ٥ تەنگژەو چورتم ٥ حوشترێك بێ شوان بلەوەڕێ ٥ دەگوترێ: (بعیر وابل مَرَجٌ).

**المَرْجان:** ڕەگەزی حەیواناتی دەریاییە، لەپێری (المرجانیات)ە پەیکەرو کلسی هەیە بەباشترین بەردی گرانبەها دەژمێردرێ، مادەی مەرجان لەدەریای سوردا زۆرە ٥ جۆرێکە لەماسی کەپەرو پۆلەکانی سورن ٥ ڕوەکێکی بەهارییە بەئەندازەی نیو مەترێك بەرز دەبێتەوە ٥ لقو پۆپی سورن، گەڵاکەی پانو نەرمو ئاودارە ٥ ئەگەر ئاژەڵ بیخوا شیری زۆر دەبێ.

**المَریج:** (أمر مَریج): کارێکی چەواشەکارو پشێوییە، قورئان دەفەرموێ: ﴿فَهُمْ فِي أَمْرٍ مَّرِيجٍ﴾ ٥ (سهم مریج): تیری خوارو خێچ ٥ (غصن مریج): لقەداری خوارو چەماوە ٥ ئێسقانۆکەی نێوان دووشاخ.

**المِمْراجُ:** کەسێك ئیشەکانی ڕێكو پێك نەبن ٥ کارەکانی باش ئەنجام نەدا.

**مَرِحَ فلان مَرَحاً:** فلانکەس زۆر کەیفخۆش بوو زەوق نیشاتی زۆر بوو ٥ لارو لەنجەی کرد ٥ (فهو مَرِحٌ).

**مَرِحَت الأرض بالنبات:** زەوی ڕوەکی ڕواند.

**مَرِحَ الزرعُ:** کشتوکاڵەکە گوڵی کرد.

**مَرِحَ السَّحابُ:** هەور بارانی باراند.

**مَرِحَتْ عینه مرحاً ومرحاناً:** چاوی خراپ بوو شێوا، ئاوی کرد، زۆری فرمێسك داباراندن ٥ دەگوترێ: (وهي عین مِمْراح): چاوێکی شێواوو نەخۆشە ٥ دەشگوترێ: (مَرِحَت عینه بمائها وقذاها): چاوەکە ئاوی ڕشتو ڕیپۆقی دەردا ٥ کەم بینا بوو ٥ هەروا دەگوترێ: (لا تَمْرَحْ بعرضك): ناموسو شەرەفی خۆت مەخەرە ژێر تانەو تەشەر.

**أمْرَح فلاناً:** فلانکەسی هەڵنا بۆکەیف خۆشی.

أَمْرَحَ الكلأ الفرسَ: لەوەڕو ئالفەکە گەشەو نیشاتی بەولاخە بەرزەکە بەخشی.
مَرَّحَ المُهْرَ: جوانوەکەی ڕاهێناو ژێرباری کرد.
مَرَّحَ الجِلدَ: پێستەکەی هەنو، چەوری کرد.
مَرَّحَ القريةَ الجديدةَ: کوندە تازەکەی پڕکرد لەناو تاکونە دورمانەکانی پڕببنەوەو بگیرێن‌و ئاویان لێ نەچێ.
مَرَّحَ البُرَّ: گەنمەکەی پاك کرد بەردو گڵ‌و پڵ‌و پوشی لێ جیاکردەوە.
المِرَاحَ: کەیفخۆشی‌و تەڕدەماخی.
التَّمْرَاحَة: کەسێك زۆر بەنیشات بێ ◦ گورج‌و چوست بێ ◦ دەگوترێ: (هو تِلْعابة وتِمْراحة).
المَرَحُ: ئەوپەڕی کەیفخۆشی‌و نیشات ◦ بەخۆنازین‌و لارو لەنجەکەر ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحًا﴾.
مَرْحَى: وشەیەکە سەرسوڕمان دەگەیەنێ ◦ واتە دەست خۆش ئافەرین.
المِرْحَةُ: کەندوە مێوژ، عەنبارە مێوژو شتی وا.
المَرُوحُ: خاوەن نیشات‌و تەڕدەماغ ◦ مەیی‌و شەراب ◦ لەم ڕووەوە کەئەوکەسەی دەیخواتەوە تەڕدەماغ دەبێ گەشەو نەشە دەیگرێ (قوس مروح): کەوانێکە تیرەکانی باش ئاراستە دەکا.
المِمراحُ: خاوەن نیشات‌و تەڕدەماغ ◦ چاوێك زۆر فرمێسك بڕێژێ ◦ زەوییەکە زوو گیاو گژی پێ بگەیەنێ.
مَرْحَبَ فلاناً: مەرحەبای لەفلانکەس کرد پێی گوت مەرحەبا.
مَرْحَبَهُ الله: خودا خستیە خۆشییەوە.
مَرِخَ جَسَدُهُ مَرْخاً: لەشی خۆی بەڕۆن‌و شتی وا هەنوو ◦ (فهو مارخ).
مَرِخَ العَرْفَجُ: درەختی عەرفەج گەڵاکەی جوان بوو قەدی بەرز بۆوە ◦ (فهو مَرِخٌ).
أَمْرَخَ العَجينَ: ئاوی زۆر کردە هەویرەکە تا بەتەواوی شل بوو.
مَرَّخَ جَسَدَهُ: زۆری جەستە هەنو ◦ زۆری چەور کرد.
تَمَرَّخَ بالمروخ: بەچەوری‌و شتی وا جەستەی هەنوو.
الأَمْرَخ: (ثور أَمْرَخ): گایەکە پەڵەی سپی‌و سوری بەجەستەوە هەن.
المَرْخُ: درەختی (العِضاة) زوو گڕدەگرێ‌و ئاگری پێ دەکرێتەوە

لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (في كل شجر نار واستمجد المرخ والعَفَارُ).

**المَرخُ**: درەختێك ڕۆن و بۆنی زۆر بێ ٥ درەختی نەرم و شلك.

**المِـرِّيخُ**: ئەستێرەی مـەریخ؛ یەكێـكە لەئەستێرە گەڕۆكەكانی كۆمەڵەی خۆریی ٥ بەفارسـی پێـی دەگـوترێ: (بەهرام) ٥ تیرێـكی درێژی دوسـەرە ٥ گـــورگ ٥ نـــاوی خودایـــەكی ئەفسانەیە بەخودای شەڕ ناسراوە.

**المَرُوخُ**: هەرشتێـك جەستەی پـێ چـەور بكرێ.

**المَرِيخُ**: شاخ ٥ (ك: أمرِخَةٌ).

**إمْرَخَدُ الشَّيْئُ**: شتەكە شل بۆوە.

**مَـرَدَ الإنـسانُ**: مرۆڤەكـە توغیـانی كـردو لەسنور تێپەڕی ٥ یاخی بوو.

**مَـرَدَ علـى الـشَّيْئِ**: بەشـتەكە ڕاهـاتو وەگری بوو ٥ خۆی پێوەگرت.

**مَـرَدَ الـشَّيْئَ**: شـتەكەی نـەرم كـردەوە، مشت و ماڵی كرد.

**مَرَدَ الصَّبِيُ ثديَ أمـه**: منداڵەكە مـەمكی دایكی مژی.

**مَـرَدَ فلانـاً**: ناموسـی فلانكەسـی لەكـەدار كرد.

**مَـرَدَ الدابـةَ**: بـەخێرایی و تونـدو تیـژی وڵاخەكەی لـێ خوڕی.

**مَـرَدَ المـلاحُ الـسفينة**: كەشـتییەوانەكە بەسـەوڵەكە كەشـتییەكەی لێخـوڕی ٥ بەلەمـەوان بەسـەوڵ بەلەمەكـەی پـاڵ پێوە نا.

**مَرِدَ الغُلامُ مَرَداً ومروداً ومرودةً**: گەنجەكە سمێڵی هاتن ٥ كاتی ئەوەی هـات ریـشی بـڕوێ وەلـێ مـوی لـێ نـەهاتن، كۆسـە بوو ٥ (فهو أمْرَدُ).

**مَرِدَ الغُـصنُ**: لقەدرەختەكـە گـەڵای پێـوە نەبوو روت بوو ٥ دەشـگوترێ: (شـجرة مرداء): درەختی روت و بێ گەڵا.

**مَرِدَ فلان**: فلانكەس بەردەوام بوو لەسـەر خـواردنی خـۆراكی پێـكهاتە لەشـیرو خورما ٥ یان خـواردنی خورمـای لـەناو كراو ٥ خورمای لەشیر هەڵكێشراو.

**مَرَّدَ الـشَّيْئَ**: شـتەكەی نـەرم كـردەوە ٥ مـشت و مـاڵی كـرد ٥ لـوس و پوسـی كرد.

**مَرَّدَ البنـاءَ**: باڵەخانەكـەی ڕێكخـست و لـــەبغ و كاشـــی كـــرد ٥ قورئـــان دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ﴾.

**مَـرَّدَ الغُـصْنَ**: لقەدرەختەكـەی گـەڵا گوش كرد گەڵاكەی ڕنی.

**مَرَّدَ للحَمَام تمريداً**: شوێنی هێلكەكردنی بۆ كۆترەكە دروست كرد.

**تَمَـرَّدَ الغـلامُ**: كـوڕە گەنجەكـە سمێڵـی ڕوان بـەڵام ریـشی نـەهات و كۆسـە بوو.

**تَمَرَّدَ علـى الـشَّئِ:** بەشـتەکە راھـاتو خوی پێوە گرت.

**تَمَـرَّدَ علـى القـوم:** لەخەڵکەکـە یـاخی بوو.

**تَمَرَّدَ على الشَّرّ:** یاخی بوو بوغرا بوو.

**التِّمْرادُ:** هێلانەیـەکی بـچوکە بـۆ کـۆتر دروسـت دەکـرێ بۆئـەوەی هێلکـەی تێدا بکا ◦ ئەگـەر بـەرێكو پێـکیو چین لەسەر چین دروست کراو پێـی دەگوترێ: (التّماريد).

**المـارِدُ:** ملـهوڕ ◦ عـیملاق ◦ کەسێـك بەکەیف خۆشی بیو بچێ ◦ بـەرزو بڵند ◦ دەگوترێ: (بناء مارد).

**المَرَادُ:** مل، گەردن.

**المَـــرْداءُ:** زەوی ســوتەمەڕۆو خـــاڵی لــەڕوەكو درەخــت ◦ لمبەلانێـــك کەهیچی لێ نەڕوێ.

**المَرْدُ:** میوەی درەختی ئـیراك بـەتازەیی ◦ یان پێـگەیشتویی.

**المَرَدُ:** تێـگوشاو.

**المُـــرْدِيّ:** ســـەوڵە؛ دارێـــکی درێـــژە بەلەمـــەوان بەهۆیـــەوە پـــاڵ بەبەلەمەکەیـــەوە دەنـــێ ◦ (ك: مرادیّ).

**المَرَادُ:** بەمانا (المَرَادُ)دێ ◦ (ك: مَراريد).

**المِرّيد:** تونـدڕەوو سەر ڕەق.

**المَـــرودُ:** ئەوکەســـەی دێو دەچـــێ بەشێوەی تەڕدەماخییەوە.

**المَريـدُ:** بـەمانا (المِرّيـدُ): دێ ◦ پـیسو ڕەوشت ناشیرینو یاخی بوو شەڕانی ◦ (ك: مَرداء) ◦ هەروا نـاوە بـۆ هـەر شتێـك بەهـەڵگلۆفتنو شـێلان نـەرم ببێ ◦ خورما بکرێتـە ناوشـیرەوە تـا بەتەواوی نەرم دەبێ ◦ ماستاو.

**المَرْدقـــوش:** ڕوەکێـــکی کـــشتوکاڵی عەتریيـــە، دەرمـــانی لێدروســـت دەکرێ پێشی دەگوترێ (السَّمْسَقُ).

**مَـرْدَلَ فـلان:** فلانکـەس کردەوەکـانی ڕێـكو پێـك ناکـا، ئیـشەکانی بـە ناکامڵی جێ دێڵێ.

**مَرَّ الأمْرُ أو فلان مراً ومروراً ومَمَراً:** کارەکە روداوەکـە یـان فـلان هـاتو ڕۆیـی ◦ بەسەریدا تێپەڕی.

**مَرَّ البعيرَ:** حەبلو شتەکانی لەحوشترەکە شەتەك دان.

**مَـرَّ القِرْبَـةَ ونحوهـا:** کونـدەکانی پڕکـردن لەئاو.

**مَرَّ الشَّيْئُ:** شتەکە بەتەواوی تاڵ بوو (فهو مرير).

**مُرَّ بفـلان مَـرّاً ومِـرَّةً:** سفراو یان بەڵغەم بەسەر فلانکەس دا غاڵب بـوو ◦ (فهـو ممرور).

**أمَـــرَّ الـــشَّيْئُ:** شـتەکە تـاڵ بـوو ◦ دەگـوترێ: (قـد أمَـرَّ هـذا الطعامُ في

فمي): ئەم خواردنەم لەدەم دا تاڵ بوو (ما أمرّ فلان وما أحلى): فلانكەس نەتاڵ نەشیرین هیچی نەگوت ◦ (فلان ما یُمِرُّ وما یحلی): فلانكەس نەزیان نەسود هیچی لێ چاوە ڕوان ناكرێ.

أمَرَّ البُرُّ: گەنمەكە مرۆری تێدا پەیدا بوو مرۆراوی بوو.

أمَرَّ الشَّيْءَ: شتەكەی تاڵ كرد ◦ یان شتەكەی والێكرد بگونجێ ◦ (أمَرَّ یدَه علی الشَّيء): دەستی بەشتەكەدا هێنا.

أمَرَّ الحَبْلَ: حەبلەكەی گشت بادا ◦ دەشگوترێ: (أمَرَّ الأمرَ): كارەكەی قایم كرد، بنەوانی شێلا.

أمَرَّ فلاناً: لەملی فلانكەسی دا بۆئەوەی بیخا.

مَارَّ الرجلَ مِراراً ومُمارَّةً: پێپیلكەی هێنایە پیاوەكە پاشقوڵی لێگرت بۆئەوەی بیخا، بەزەوی دا بدا ◦ (إمرأتُهُ تُمَارُّهُ): ژنەكەی بەگوێی ناكاو فێڵی لێ دەكا.

مَرَّرَ الشَّيْءَ: شتەكەی راخستو پانی كردەوە بەسەر زەوی دا ◦ شتەكەی تاڵ كرد ◦ وای لێكرد بگونجێو بەكاری بێ.

إمْتَرَّ عَلَيْهِ: بەسەریدا تێپەڕی.

إسْتَمَرَّ الشَّيْءُ أو الرجلُ: شتەكە یان پیاوەكە یەك ڕێبازی پەیڕەو كرد ◦ دەگوترێ: (هذه عادة مستمرة): ئەمە دابو نەریتێكی بەردەوامو نەگۆڕە ◦ دەشگوترێ: (استَمَرَّ فلان): فلانكەس دوای گەندەڵی ئیشو كارەكانی ساز بوونەوە.

استَمَرَّ بالشَّيْءِ: توانای بەسەر شتەكەدا شكا ◦ دەگوترێ: (هو بعید المُستَمَرّ): ئەو بەتواناو دەسەڵاتە بۆ دژایەتی بەربەرەكانی ◦ دەشگوترێ: (استَمَرَّ مریرە): عەزمو ورەی بەرز بوو.

إسْتَمَرَّ الشَّيْءَ: شتەكە تاڵ بوو.

الأمَرُّ: دەگوترێ: (فلان أمَرُّ عقداً من فلان): فلانكەس لەفلان بەوەفاترو ورە بەرز ترە ◦ (وهي مُرَّی) ◦ هەروا وشەی (الأمَرُّ): ناوە بۆ ریخۆڵەی پیسایی.

الأمَرّان: هەژاریو پیری ◦ پیریو نەخۆشی ◦ دەشگوترێ: (لقي منه الأمرین): لەوەوە توشی دوو بەڵای گەورە بوو.

المَارورة: دانەوێڵەیەكی ڕەشە تێكەڵ بەگەنمو جۆ دەبێ بەكوردی پێی دەگوترێ: (مرۆر) ئەگەر لەگەڵ گەنمو شتی وا بهاڕدرێ ئاردەكە تاڵ دەكا ◦ هەروا ناوە بۆ كچۆڵەی تازە

پێکەیشتوی نەرمو شل.

المَرارُ: ڕوەکێکی کێوییە لەپێری (الفصيلة المركبة)یە پێشی دەگوترێ: (المُرَيْرُ).

المِرَارُ: حەبل.

المرارة: زراو ◊ کێسێکی نووساو بەجگەرەوەیە سفرای تێدا خەزن دەبێو یارمەتیدەرە بۆ هەزمکردنی چەوری.

المَرُّ: حەبل ◊ خاکەنازو بێل ◊ یان کلکە خاکەنازو کلکە بێل ◊ هەروا دەگوترێ: (جئته مَرّاً أو مرّين): هاتم بۆلای جارێك یان دووجار.

المُرُّ: پێچەوانەی شیرینییە ◊ جۆرە صمغو جەوییەکە لەدرەخت دێتە دەرەوە وەکوو بنێشتە تاڵ، دەرمانێکی باشە بۆ کۆکە، بۆکەسێك دوپشك پێوەی دابێ، هەر وا بۆ قەلاچۆکردنی کرمی ناو ریخۆڵە باشترین دەرمانە.المَرّە: جارێك ◊ (لقيته مَرَّةً وذات مَرّةٍ) ◊ هەروا دەگوترێ: (لقيته ذات المِرار): زۆرجار تشی بووم.

المِرَّةُ: عەقل، یان زۆر عاقڵی ◊ عەقڵو ژیری ◊ هێزو توانا ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى﴾ ◊ هەروا ناوە بۆ گشت بادانی حەبلو شتی وا ◊ بەڵغەمو شتی وا.

المُرَّةُ: تاڵ، پێچەوانەی شیرین ◊ (أبو مُرَّة): نازناوی شەیتانە.

المُرِّيُّ: جۆرە پێخۆرێکە.

المَرِيرُ: زەوی سوتەمەڕۆو روتەنو بێ ڕوەكو درەخت ◊ حەبلی توند بادراو (زۆر بادراو) ◊ عەزیمەتو سوور بون لەسەر شت ◊ (رجل مرير): پیاوی بەهێزو خاوەن عەزمو ورە ◊ (أمرٌ مَرير): کاری توندو تۆڵ.

المُرَيْراءُ: بەمانا (المارور)دێ واتە دانەوێڵەی مرۆر.

المِيرَّةُ: تواناو هێزی حەبل ◊ عیزەتی نەفسو نەفسی بەرزی عەزیمەتو سووربوون لەسەر شت ◊ دەگوترێ: (استمرت مريرته على كذا): سوور بوو لەسەر ئەو کارەو وڕەی دانەبەزی.

مَرَزَ جِلْدَهُ مَرْزاً: نەقورچکی بەنەسپایی لەپێستی گرت ◊ بە قەراخی پەنجەکانی نەقورچکی لێ گرت نەك بەنینۆکی.

مَرَزَ الرجلَ: ڕەخنەی لەپیاوەکە گرت ◊ بەدەست لەپیاوەکەی دا.

مَرَزَ الصَّبِيُّ ثَدي امه: منداڵەکە بەپەنجەکانی گوێ مەمکی دایکی هەڵگلۆفت لەکاتی شیر خواردنی دا.

**مَرَزَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بڕی دوولەتی کرد.

**مَـرَزَ الـشرابَ:** تـامی شـەرابەکەی کـرد ٥ چەشی کرد.

**إمْتَرَزَ من ماله مِـرزةً:** دەسـتی گەیـشتە ماڵەکەی توانی سودی لـێ ببینێ.

**إمْتَــرَزَ شَــريكَهُ:** مــاڵو ســامانەکەی لەشەریکەکەی جیاکردەوە.

**المَرْزُ:** بەنداو ٥ (ك: مروز).

**المَرْزَةُ:** پارچەی شت.

**المَرْزَتان:** ئەو دو تۆقلەی لەژور نەرمایی گوێــچکەوەیە ٥ دەگــوترێ: (أذن مليحة الشحمتين والمرزتين).

**المَرْزُبـان:** سـەرهەنگ ٥ سـەرۆك ٥ (ك: مرازبة)یە.

**مَرَسَ حَبْلُ البكرة:** حەبلی خولخلۆکەکە کەوتە لایەکیەوە.

**مَـرَسَ التَمْـرُ في المـاء:** خورماکـەی لـەناو ئاودا هەڵپشێوت بۆنـەوەی بتوێنـەوە ٥ دەگوترێ: (مَرَسَ الدواءَ والخُبْزَ في الماء): دەرمان یان نانەکەی کردە ناوئاو.

**مَرَسَ الصَبِيُّ إصْبُعَهُ:** منداڵەکە پەنجەی خۆی مژی.

**مَــرَسَ يــده بالمنــديل:** دەسـتی بەدەسـتە سڕەکە سڕیەوە.

**مَرِسَ فلان مَرَسـاً:** فلانکەس تونـدو تـۆڵ بوو لەچارەسەری کێشەکان.

**أمْــرَسَ حبــل البكــرة:** حــەبلی خولخلۆکەکـەی خـستەوە شـوێنی تایبەتی خۆی.

**مارَسَ الشَّيْءَ مِراساً وممارسةً:** چارەسەری شـتەکەی کـرد ٥ بەرامبـەری کـردو بەگژی دا چۆوە ٥ دەگوترێ: (مارس قِرْنَهُ) ٥ (ومارس الأمورَ والأعمال).

**إمْتَـرَسَ الخطبـاءُ:** وتارخوێنــەکان زۆر درێــژەیان بــەوتاردا ٥ دەشــگوترێ: (امترســت الألــسن في الخـصومات): لەکێـشەو نیـزاع دا دەمیـان تێـك ژەنیو کەوتنە قسە بەیەك گوتن.

**إمْتَــرَسَ بالــشَّيْءِ:** دەســتی وەردایــە شتەکە.

**تمــارَسَ القــومُ في الحــرب:** خەڵکەکـە لەشەڕدا لێکیان دا.

**تَمَرَّسَ بالشَّيْءِ:** خۆی لەشتەکە خشاند ٥ لێی ڕاهاتو فێری بوو.

**تَمَرَّسَ بالطيب:** بۆنی خۆشی لەخۆی دا.

**تَمَرَّسَ بدينـه:** گاڵتـەی بـەئایینی خـۆی کرد.

**تَمَرَّسَ بالخـصومات:** بەکێـشەو نیــزاع ڕاهاتو خوی پیانەوە گرت.

**تَمَرَّسَ البعيرُ بالشجرة:** حوشترەکە جار دواجــار لەگــەڵای درەختەکــەی خوارد.

**الأمْرَسُ:** (وجه أمرس): دەمو چاوی بـێ خێرو بێر.

مـــارِسُ: لەئەفـسانەی کـۆن دا نـاوی خوداوەنـدی حەربـە، واتـە: نـاوی (مـرّیخ)ە ○ هـەروا نـاوە بـۆ سـێیەم مانگی ساڵی رۆمی، پێشی دەگوترێ ئازار واتە مانگی نەورۆز.

المارسـتان: خەسـتەخانە، شـوێنی چاکبوونەوەی نەخۆش.

المِـراسُ: دەگـوترێ: (فـلان ذو مِـراس): فلانکـەس خـاوەن صـەبرو خـۆگرو بەهیمەتە.

المَرَاسَةُ: هێزو توانا.

المَـرَاسُ: خـاوەن هێـزو توانـاو ئـیش لەدەست هاتو.

المَرْسُ: رۆیشتنی بەردەوام.

المَـرِسُ: تێـکهەڵاتوو قـاڵبو لەشـەڕو جـەنگ دا ○ دەشگوترێ: (هـم علی مـرس واحـد): ئـەوان لەسـەریەك تەبیاتن.

المَرَسَةُ: حەبل ○ (ك: مَرَسٌ وأمْراسٌ).

المَـرِیسُ: تێـگوشاو ○ خورمـای لـەناودا تواوە.

المُمَارَسَـــةُ: مامەڵـــەکردنو کـــڕینو فرۆشتن بەبێ مەزاد.

مَرَشَ الماءُ مَرْشاً: ئاوەکە ڕەوان بوو جاری بوو.

مَرَشَ الشَّیْءَ أو الجِلدَ: شتەکەی لەدەست دەرهێنا.

الأمْرَشُ: مرۆڤێك میوەی زۆر هەبێ.

المُراشَةُ: دەگوترێ: (لـي عنـده مراشـة): مافێکی کەمم لایەتی.

المَرْشُ: زەوییەك باران ڕوەکەی روشاند بـێ ○ بـەلافاو ئـاو لەخۆنـەگرێ ○ بناری کێوو پێدەشت ○ چاڵێك ئاوی لەبەر بڕواو هێدی هێدی بەزەوی دا بڵاوبێتەوە.

المَرْشـاء: حـەیوانی زێـنـە خـرۆ ○ زەوی گیاوو گژاوی.

مَرَصَ الثَّدْيَ مَرْصاً: بەپەنجە گۆی مەمکی هەڵگلۆفت.

مَرِصَ فلان: فلانکەس پێشکەوت.

تَمَـرَّصَ القِـشْرُ عَـنْ الـشعیر: توێـکڵو سۆیەکە لەجۆیەکە جیابۆوە.

مَـــرِضَ مَرَضَـــاً: نـــەخۆش کـــەوت ○ تەندروستی تێکچو.

أمْرَضَ فـلان: فلانکـەس بـوو بـەخاوەن نەخۆشی.

أمْـــرَضَ القَـــومُ: خەڵکەکــە وڵاخو ئاژەڵەکانیان نەخۆش بوون.

أمْـرَضَ فـلان: فلانکـەس رای راسـتی دەربڕی.

أمْـرَضَ فلانـاً: فلانکەسـی بەنەخۆشـی بینـی یـان نەخۆشـی خـست ○ دەگوترێ: (امـرض الله فلانـاً): خـودا فلانکەسی نەخۆش خست.

مدية
مشط
موسى
مالج او بالج
مشط القدم
مكروسكوب
مهد
متر
مكوك
مخل
مطرة
معدة
مغنطيس
مرارة
مماس المنحني
مر
تمثال
اشكال مماسات
مشمش
مرجان
مندرين
مسك الروم
قصب المص
مور
مردقوش
امسوخ
مسكية
مرجان
مصطكي
مانجرو
مبس
موركس
مشط
مالك الحزين
مرزة
مالوش
تمساح
مموث
مرعة
ماعز

**مارَضْتُ رأي فيك**: دەربارەی تۆ فێڵم لەخۆم کرد.

**مَـرَّضَ في الأمـر**: لەکارەکـەدا کەمتـەر خەم بوو بەباشی ئەنجامی نەدا.

**مَرَّضَ في حاجتي**: بەتەمبەڵی‌و نابەدڵی بۆ ئیشەکەم هەڵسوڕا.

**مَـرَّضَ في كلامـه**: قـسەکەی دوبـارە کـردەوە قـسەکەی بـەبێ بناغـە لەقەڵەم دا.

**مَـرَّضَ المـريضَ**: بەباشـی نەخۆشـەکەی دەرمان کرد.

**مَرَّضَ البُرَّ**: گەنمەکـەی بـڵاو کـردەوە ٥ پرژاندی.

**تَمارَضَ**: خۆی بەنەخۆش لەقەڵەم دا.

**تمارض في أمره**: لەکارەکەی دا لاواز بـوو کەمتەرخەم بوو.

**التمـريض**: خزمـەتکردنی نـەخۆش‌و دابینکردنـــی ٥ پێویـــستیەکانی بـــەگوێرەی ڕێنومـــایی پزیـــشك ٥ پیشەی سستەریی.

**المُـــــراضُ**: نەخۆشـــییەکە توشـــی میوەدەبـــێ‌و خراپـــی دەکــــا ٥ دەیفەوتێنێ.

**المَرْضُ**: شك‌و گومان.

**المَرضُ**: نەخۆشی، هەردیاردەیـەك شـتی زینـدو لەسنووری ساغ‌و سـەلامەتی لابەرێ ٥ یان نەهێڵێ حەق‌و ڕاستی ببیسێ.

**المَريضُ**: کەسێـك نەخۆشی پێوەبێ یـان کەمئەنـدامی‌و لادان لەحـەقی پێـوە دیاربێ ٥ دەگوترێ: (قلـب مـريض): ئـایین سـست ٥ ئـایین لاواز ٥ (رأی مـــريض): ڕای لاواز ٥ ڕای هەڵـــەو ناڕاست ٥ (ريـح مريـضة): ڕەشـەبای گەرم ٥ یان کزەبـا ٥ بـای بـێ هێـز ٥ (ليلة مريـضة): شـەوی بـێ ڕونـاکی ٥ (أرض مريـــضة): وڵاتێـــك جێـــگای دانیشتوانەکەی تێدا نەبێـەوە ٥ یـان وڵاتێـك جێـگای دانیـشتوانەکەی تێـدا نەبێتـەوە ٥ یـان وڵاتێـکی بـێ یاســاو پـــڕ ئاشـــوبو تـــەنگو چەڵەمەبێ ٥ (شمـس مريـضة): خـۆر نەگـــەر بـــەڕونی دەرنەکـــەوێ، بەهەورو تەم‌و مژ داپۆشرابێ.

**المِراض**: نەخۆش.

**المُمَـرِّضُ**: کەسێـك کاروبـاری نـەخۆش بەڕێوەبەرێ‌و پێداویستیان بۆدابین بکا بەگوێرەی ڕێنومایی پزیشك.

**المَمْرُوضُ**: نـەخۆش.

**مَرَطَ الرجلُ مَرْطاً ومُرُطاً**: پیاوەکە پەلـەی کرد.

**مَرَطَـتْ بـه أمُّـهُ مَرْطـاً**: دایکـی ئـەوی بەوەلەد هێناوە.

**مَرَطَ الشَّعْرَ أو الريش أو الصوفَ عَنْ الجسد:**

مویان پەڕو پۆڵ یان کوڵك‌و خوری لەجەستەی هەڵکەند.

**مَرَطَ فلاناً:** ئەزیەتی فلانکەسی داوە.

**مَرَطَ الشَّيْءَ:** شتەکەی کۆکردەوە ◦ دەگوترێ: (فلان يَمْرُطُ مايجده): فلانکەس چی دەست بکەوێ کۆی دەکاتەوە.

**مَرِطَ فلان مَرَطاً:** فلانکەس موی جەستەی تەنك بوو.

**مَرِطَ الريشُ عَنْ السهم:** پەڕەکە لەتیرەکە بووەوە.

**أمْرَطَ الشَّعْرُ:** قژەکە کاتی ئەوەی هات هەڵوەرێ.

**أمْرَطَ النخلة:** دارخورماکە خورما نەگەیشتووەکانی هەڵوەراندن (فهي مُمْرِط) ◦ دەشگوترێ: (امْرَطَت النَاقَةُ): حوشترەکە بەنەکاملی بێچووەکەی فڕێ داو توکی لێنەهاتبو.

**مارَطَهُ مُمَارَطَةً:** توکی هەڵکەند، مووەکانی کنەکردن.

**مَرَّطَ الشَّعْرَ:** بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (مَرَطَ)دێ.

**مَرَّطَ الثَوْبَ:** قۆڵ‌و فەقیانەی کراسەکەی کورت کردن.

**إمْتَرَطَ الشَّيْءَ مِن يدِه:** شتەکەی لەدەست فڕاند ◦ لێی دزی.

**إنْمَرَطَ الشَّعْرُ وإمَّرَطَ:** قژی هەڵوەرین.

**تَمَرَّطَ الشَّعْرُ:** قژی هەڵوەرین ◦ دەگوترێ: (تمرطت لحيته): موی ریشی هەڵوەرین.

**تَمَرَّطَ الذِئْبُ:** گورگەکە توکی هەڵدا ◦ توکی هەڵوەری.

**المُراطَةُ:** ئەو موو کوڵکەیە کەلەجەستە هەڵدەوەرێ بەهۆی شانەکردن یان هەڵکەندن.

**المِرْطُ:** پۆشاکێکە لەئاوریشم یان خوری یان کەتان ئافرەت سەرو ملی خۆی پێ دادەپۆشێ.

**المَرْطاءُ:** درەختی مەرەطاء کە گەڵای پێوە نەبێ.

**المُرَيْطاءُ:** نێوان ناوك‌و موسڵدان.

**المُرَيْطاوَان:** دوو ڕەگن لەنەرمایی گەدەدان.

**المَرِيطي:** ئالو؛ دووپارچە گۆشتی خڕن دەکەونە ئەملاو ئەولای قورگەوە.

**مَرْطَلَ المطرُ فلاناً:** باران فلانکەسی تەڕکرد.

**مَرْطَلَ العملَ:** درێژەی بەئیشەکەدا.

**مَرْطَلَ فلاناً بالطين وغيه:** فلانکەسی قوڕاوی کرد ◦ قوڕی تێهەڵسو ◦ دەشگوترێ: (مَرْطَلَ ثوبَهُ ومرطل عِرْضَه): پۆشاکەکەی قوڕاوی کرد ◦ ناموسی لەکەدار کرد.

**مَـــرِعَ رأسَـــهُ بالـــدهن:** ســەری داهێنـــاو بەشانەی کرد.

**مَرِعَ المكانُ والوادي:** شوێنەکە یان شیوەکە گیاو گژی زۆر بوو، بەپیتو بەرەکەت بوو.

**مَرِعَ فلان:** فلانکەس کەوتە هەرزانییەوە ژیانی خۆش بوو.

**مَرِعَ مَراعةً:** نازو نیعمەتی بۆدەستە بەر بوو.

**أمْرَعَ المكانُ والوادي:** بەمانا (مَرِعَ)دێ.

**أمْـــرَعَ القـــومُ:** خەڵکەکـە توشـی زەوی بەپیتو بەرەکەتو ژیانی خۆشو هەرزانی بوو.

**أمْرَعَتِ الأرضُ:** زەوییەکە مەرو ماڵاتی ناوی تێریان خوارد چونکە لەوەڕی باشو زۆری تێدایە.

**أمْرَعَ رأسَهُ بدهن:** زۆری رۆن لەسەری دا.

**تَمَـــــرَعَ:** پەلـــەی کـــرد ○ هـــەوڵی پەیداکردنی لەوەڕی دا.

**الأمْرُوعَـةُ:** (أرض امروعـة): زەوییـەکی بەپیتو بەرەکەتە.

**المِراعُ:** بەزو پیو.

**المَرْعُ:** لەوەڕ ○ (ك: أمْرُوعٌ وأمراع).

**المَرِعُ:** (رجل مَرِعٌ): پیاوێـکە لەلـەوەڕی باش دەگەڕێ بۆ ئاژەڵەکانی.

**المَريـــعُ:** زەوی پـــڕ گیـــاو گـــژ ○ بـــارانی هـەرزانی ئاوەڕ ○ دەگوترێ: (غيـث مريـــع): بارانێـــکە بـــاش گیـــاو گـــژ دەڕوێنێ ○ زەوییەکە والێدەکا گیاو گژی باش بڕوێنێ.

**المِمْرَاعُ:** بەمانا (المَريعُ)دێ.

**مرغت الـسائمة العُـشْبَ مرغـاً:** ئاژەڵە بــــەر هەڵـــــدراوەکان هـــــەموو گیاوگژەکەیان خوارد ○ دەشگوترێ: (مرغ الحيوان في العُشبِ): ئاژەڵەکان لـەناو لەوڕەکـە دا مانـەوەو تێیـدا لەوەڕان.

**مَرِغَ عرضَهُ مَرِغاً:** پیس بوو، شتی پیسی پێوەنووسا تێکەڵی بوو ○ (فهو أمْـرَغُ وهي مَرْغاء).

**مَـــرِغَ شـعره:** قـژی رۆنەکـە یـان بـاش پێکەوت ○ (فهو مَرِغٌ).

**أمْــــرَغَ:** نوســـتو ئـــاو لەهـــەر دوو لاشەویلەی هاتەدەر ○ (کەفی چاند) ○ زۆرقسەی بێ جێو رێی کردن.

**أمْـــرَغَ العجـــينَ:** زۆری ئـــاو کـــردە هەویرەکـەوە بەجۆرێـــك نـەیتوانی وشکی بکاتەوە (توندی بکاتەوە).

**أمْـرَغَ عرضَـهُ:** حـەیاو ناموسـی خـۆی برد.

**مارَغَــه بـــالتراب:** لـەقوڕی هەڵـشێلا، لەقوڕی هەڵسوو.

**مَرَّغَهُ في الـتراب:** لـەقوڕی وەردا، لـەناو

قوڕدا ئەمدیو ئەو دیوی کرد.
مَـرَّغَ العِـرضَ: ناموسی بـرد، ناموسی لەکەدار کرد.
مَـرَّغَ فلانـاً: فلانکـەس جـوان قـژی چەورکردن، بەتەواوی رۆنی لێدان.
تَمَرَّغـت الـسائمة: ئاژەڵەکـە زۆر لـەناو لەوەڕگادا مایەوە.
تَمَـرَّغَ الحیـوان: ئاژەڵەکـە ئـاو لـەدەمی هاتە خوار.
تَمَرَّغَ فلان: فلانکەس خۆی پاك ڕاگرت، نەیهێشت کەسابەتی تووشی عەیبو خـەوش ببـێ ٥ خـۆی شـشتو دەمو چـاوی ئـارایش دا ٥ لـەتاو ئـازارو ئەشکەنجە تلاوتلی کرد.
تَمَرَّغَ في التراب: لەقوڕو لیتەدا گەوزی، ئەمـــدیوو ئـــەو دیـــوی کـــرد ٥ دەشگوترێ: (تَمَرَّغ في الرزائل، تَمَرَّغ في النعیم).
تَمَرَّغَ في الأمر: لەکارەکەدا ڕاڕاو دوو دڵ بوو.
تَمَـرَّغَ علـی فـلان: لەسـەر فلانکـەس مایـەوە ٥ لەسـەر فـلان وەسـتاو مۆڵەتی دا.
المَرَاغُ: شوێنی گەوزینی وڵاخو ئـاژەڵ ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (مَـراغ دوابهـا المِسْك).
المَرَاغة: بەمانا (المَراغ)دێ ٥ هەروا نـاوە بۆ دێڵەکەر.
المَرْغ: تفـو لیكو چڵم ٥ (المرغة): باغی پـڕدارو درەخـت ٥ قـژ چـەورکردنی تەواو.
المَرْغَةُ: ریخۆڵە کوێرە.
مَـرِقَ الـسَّهْمُ مـن الرمیـة مروقـاً: تیرەکـە بەتەوژم لەکەوان دەرچوو.
مَرَقَ من الدین: لەئایین دەرچوو.
مَرَقَ في الأرض: بەناوی دا ڕۆیشت گەشتو گوزاری کرد.
مَـــرَقَ القـــدر مَرْقـــاً: شـــۆرباوی ناوەمەنجەڵەکەی زۆر کرد.
مَـرَقَ الـصوف والـشَّعْرَ مـن الجلـد: خوری مـــووی لەپێـــستەکە خۆشـــکراوەکە هەڵکەند.
مَرَقَ الصبغ من العـصفر: ڕەنـگو بۆیـەی لەگوڵە زەردە دەرهێنا.
مَرَقَ فلانـاً: بـەخێرایی زەبـری کاریگـەری لەفلان دا.
مَرِقَت البیضة مرقاً: هێلکەکە پیس بوو بووە وەبەخوێنو ئاو.
مَرَقَـت النخلـة: بـەری دارخورماکـە هەڵوەری دوای ئەوەی پێگەییشت.
أمْرَقَ: شەرمگای خۆی دەرخست.
أمْرَقَت النخلـة: دارخورماکـە بەرەکەی پێگەیی‌و هەڵوەری.
أمْـرَقَ الجلـد: پێـستە خۆشـبوەکە کـاتی

ئەوەی هاتووە مووەکانی بڕندرێنەوە.

أَمْرَقَ القِدرَ: بەمانا (مَرَقَ القدر)دێ.

مَرَّقَ القِدرَ: بەمانا (أمْرَقَ)دێ.

مَرَقَ الثوبَ: قوماشەکە بەمادەی عوصفور ڕەنگ کرد.

إمْتَرَقَ الشَّيْئُ: شتەکە بەخێراییو بەتەوژم قەبارەکەی بڕی، مەسافەکەی بڕی ◦ دەگوترێ: (إمْترق من البيت): بەخێرایی لەماڵ هاتە دەر.

إمْتَرَقَ الولدُ من بطن أمه: زارۆکەکە بەئاسانی لەسکی دایکی هاتەدەر دەشگوترێ: (إمْتَرَقَت الحمامةُ من الكوة): کۆترەکە بەگورجی لەکونەکە هاتەدەر.

امترَقَ السَّيْفَ من غمده: شمشێرەکەی خێرا لەکالان دەرهێنا.

إمَّرَقَ وانْمَرَقَ الرجلُ: پیاوەکە شەرمگای دەرکەوت.

إنْمَرَقَ الشَّعْرُ: قژەکە بڵاو بوو هەڵوەری بەهۆی نەخۆشی یان بەهۆی شتی ترەوە.

تَمَرَّقَ الثوبُ: قوماشەکە قبوڵی ڕەنگو صوبغەکەی کرد.

المارق: لەئایین دەرچوو ◦ هەڵگەڕاوە لەئایین ◦ هەرشتێك شتێکی تر ئەمدیواودیو بکاو نەنوشتێتەوە.

المَراقُ: بڕوانە مادەی (رقق).

المُراقةُ: هەرشتێك لەشتێکی تر هەڵوەرێ ◦ ئەوەی هەڵدەکێشرێو هەڵدەکەندرێ لەخوریو موو یان لەوەڕ.

المَرِيقُ: گیا عصفور (گوڵە زەردە).

المَرْقُ: پێست کە بۆگەن بکا توکەکەی لێ بڕندرێتەوە ◦ خوری شیکراوەو بە شە کراو ◦ خوری مەڕە لەڕو نەخۆش ◦ پشکوتنی گوڵ ◦ دەشگوترێ: (أصابه ذلك في مَرْقِك): بەهۆی تۆوە ئەوەی توش بوو.

المِرْقُ: خوری بۆگەن.

المَرَقُ: شۆرباوی چەور (ناو گۆشتی تێبکرێو بکوڵێندرێ).

المَرْقةُ: خوری لەسەرەتای ڕنینەوەی لەپێستەکە ◦ ئەو زێدە گۆشتەی بەپێستەوە دەمێنێتەوە دوای گورونی جیاکردنەوەو داماڵینی لەگۆشتەکە ◦ پێستی دەباغکراو.

المُرُوقُ: پرژو چقڵو چاڵی گوڵ.

المِمْراقُ: کەسێك خۆ لەشت هەڵقورتێنێو لەهەموو دیزەیەك ئەسکوێ بێ.

المُمْرِقُ: گۆشت کە چەوری کەمی تێدابێ.

مَرْمَرَ فلان: فلانکەس ڕقی هەڵسا.

**مَرْمَرَ الماءَ:** ئاوەكەی والێكرد بەسەر زەوی دا بڕوا.

**تَمَرْمَرَ الجِسمُ:** جەستەی لەرزی حەجمینی لێ بڕا.

**تَمَرْمَرَ فلان على أصحابه:** فلانكەس بوو بە ئەمیرو گەورە بەسەر هاوەڵەكانی دا.

**المُرامِرُ:** كەسێك خاوەنی جیسمی نەرمو نیان بێ.

**المَرْمَرُ:** بەردی ڕوخام (مەڕمەڕ) ٥ بەردێكە بۆ بیناسازی بەكاردێ بۆ جوانیو ڕازاندنەوە.

**المَرْمَرَةُ:** پارچە مەڕمەڕ ٥ بارانی زۆر.

**المَرمَريسُ:** شتی لوسو ڕەقو پتەو ٥ (داهیة مرمریس) بەڵای گەورەو ترسناك ٥ ملدرێژ.

**مَرَنَ الشَّيْئُ مرانةً ومرونةً:** شتەكە لەحاڵەتی ڕەقیەوە گۆڕدرا بۆ حاڵەتی نەرمی ٥ دەشگوترێ: (مَرَنَ ثوبَهُ) پۆشاكەكەی نەرمو سفتو لووس بوو.

**مَرَنَتْ فلان على العمل:** دەستی فلانكەس لەسەر ئیشكردن ڕاهات دەستی ڕەقاص بوون ٥ دەشگوترێ: (مَرَنَ وجهه على الأمر): شەرمی نەكرد بۆ كردنی كارەكە، بێ چاوو ڕوبوو.

**مَرَنَ الجلدُ مرناً:** لەسەر قسەكردن ڕاهاتو شەرمی نەكرد.

**مَوَنَ من عدوه:** لەترسانو لەبەر لاوازی لەبەر دوژمنەكەی هەڵات.

**مَرَنَ به الأرضَ:** بەزەوی دادا، بەزەوی كێشا.

**مَرَنَ بعيرُهُ:** لای خواروی قاچی حوشترەكەی چەوركرد بۆئەوەی نەرم ببن.

**أمْرَنَ الرجلُ بالقول:** پیاوەكە قسەكانی نەرم كردنو بەهێواشی دوا.

**مارنت الناقةَ ممارنةً ومراناً:** حوشترەكە شیرەكەی وشك بوو.

**مَرَّنَ الشَّيْئَ:** شتەكەی نەرم كردەوە.

**مَرَّنَ فلاناً على الأمر:** فلانكەسی لەسەر كارەكە ڕاهێنا ٥ دەشگوترێ: (مَرَّنَ وجْهُهُ على الخِصام): ڕوكراوەو بێ چاوو ڕو بوو بۆ كێشە نانەوە دژایەتی یان سواڵكردن ٥ هەروا دەگوترێ: (انه لَمُمَرَّن الوجه): ئەو ڕوقایمو بێ چاوو ڕووە.

**مَرَّنَ به الأرضَ:** بەزەوی دادا، خستیە سەرزەوی.

**تَمَرَّنَ الشَّيْئُ:** شتەكە نەرمو نیان بوو.

**تَمَرَّنَ على الشَّيْئ:** ڕاهێنانی لەسەر شتەكە كردو فێری بوو.

**المتَمَرِّن:** ڕاهێنەر ٥ یان (المُتَمَرَّن): ڕاهێندراو كەسێك ماوەیەك

خەریکی فێربوونی کارێك بێ.

**المُرّانُ:** رمبی رەق‌و پتەو ٥ دەگوترێ: (تطاعنوا بالمُرّان): بەرمبی پتەو شەڕیان کرد.

**المَرْنُ:** چەرمی نەرمکراو ٥ فەروە ٥ لاتەنیشت‌و ئەملاو ئەولای شت.

**مَرْنا الأنف:** ئەملاو ئەولای لوت.

**المَرَن:** ڕەگێکە لەدیوی ناوەوەی قاچی پێشەوەی حوشتر ٥ (ك: أمران) ٥ (أمران الذراع): ڕەگەکانی باسك.

**المَرِنُ:** ڕەوشت‌و داب‌و نەریت ٥ حاڵ‌و وەزع.

**مَرِهَتْ عينُه مَرَهاً:** چاوی کلی تێدا نەبوو ٥ یان چاوی توشی نەخۆشی بوو.

**الأمْرَهُ:** (سراب أمْرَهُ): تراویلکەی سپی کە هیچ خاڵی رەشی تێدانەبن.

**المَرَهُ:** نەخۆشی چاو.

**المَرِهُ:** (رجل مَرِهُ الفؤاد): پیاوێکی دڵ نەخۆشە.

**المَرْهَاءُ من النعاجُ:** مەڕو بەرانی زۆر سپی ٥ زەوی کەم دارو روەك.

**المُرْهَة:** سپیایی کەشتی تری تێکەڵاو بێ ٥ چاڵێك ئاوی بارانی تێدا کۆبوبێتەوە.

**مَرْهَمَ الجُرْحَ:** مەرهەمی خستە سەر برینەکە.

**المَرْهَمُ:** گیراوەیەکی چەورە زۆر جۆری هەیەو بۆ زۆر برین‌و هاوسان‌و درزی جەستە بەکاردێ ٥ بەکوردی پێی دەڵێن مەڵحەم.

**المَرْوُ:** روەکێکی بۆنخۆشە، چەند ناوێکی تریشی هەیە وەکوو (الخربنا، حبق الشیوخ) ٥ جۆرە بەردە ئەستێیەکە ئاگری لێ دەبێتەوە.

**المَرْوَةُ:** کێوێکە لەمەککە بەرامبەر کێوی صەفا.

**مَرَى الفرسُ مَرْياً:** ئەسپەکە سمکۆڵی کرد یان قاچی بەسەر زەوی راکێشا بەهۆی شکان‌و شتی واوە ٥ دەگوترێ: (مری الفرسُ بیدیه).

**مَرَى الشَّيْءَ:** شتەکەی دەرهێنا.

**مَرَى الفَرَسَ:** ئەسپەکەی تاودا بۆئەوەی بزانێ تاچەند ئازاو بەتوانایە بۆغاردان‌و هێزی رۆیشتنی چەندە ٥ دەشگوترێ: (مریتە فمادرّ): هەوڵم دا قەناعەتی پێ بکەم بێ سود بوو.

**مَرَى الریح السحابَ:** بایەکە وایکرد هەورەکە باران ببارێنێ.

**مَرَى فلاناً حقه:** ئینکاری مافی فلانی کرد.

**مَرَى فلاناً الناقة ونحوها:** حوشترەکە شیری دا.

**أمْرَى الدَّمَ:** خوێنی دەرهێنا.

ماراه مِراءً ومُمَارةً: كێشەو دەمە دەمێی لەگەڵ کرد.
مـــاری فلانـــاً: پێـچەوانەی ویـــستی فلانکەسی کـرد فـرتو فێڵی لەگـەڵ دا ئەنجام دا.
إمْتَرَى في الشَّيْئ: شتەکەی دەرهێنا.
إمـترت الـريحُ الـسحابَ: رەشـەبایەکە هەورەکـەی والێـکرد بـارانی لـێ بباری.
إمْتَرَى الناقةَ: حوشترەکەی دۆشی.
تَماری القومُ: خەڵکەکە کێشەو نیزاعیان بەرپاکرد.
تَـماری في الـشَّيْئ: گومـانی لەشـتەکەدا هەبوو.
تَمَـــرَّى بالـــشَّيْئ: خـۆی بەشـــتەکە رازاندەوە.
المَارِيَـةُ: مانگـا کـە گۆلەکـەی هـەبێ ٥ هـەروا (ماریـــة) نـاوی ئافرەتێـــکە بـەناوی ماریـای کـچی ئەرقـەم ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (خذها ولو بقرطي ماريـة): ئەوشـتە هـەڵبگرەو بیکـە بـەماڵی خـۆت تەنانـــەت ئەگـــەر بـــەجوتگوارەی ماریەش بێ (واتـە بەهـەر نرخێـك بێ).
المـارِيُّ: مانگـای سـپی ٥ دەرپێیـەکی لـەخوری دروسـتکراوو خەتخـەت ئـــاوکێش‌و ئاودابەشـــکەر لـــەپێی دەکـرد ٥ هـەروا نـاوە بـۆ راوچـی قـەتێ، ئەوکەسـەی باڵنـدەی قـەتێ راودەکا.
المَارِيَّـــةُ: قـــەتێی قەڵـــەوو خوبـــاب ٥ ئافرەتی پێست سپی.
المِرْيَةُ: کێشەو دەمـە دەمـێ ٥ دەگـوترێ: (مافيه مُرِيَة) هیچ گومانی تێدانیە.
المَرِيُّ: حوشتری شیر زۆر ٥ ئـەو رەگـەی پڕدەبـــێ‌و شـــیری لێـــدێ ٥ (ك: مرايا)یە.
المُمْرِی: راستو رێـك ٥ دەگـوترێ: (أمـر مُمْرٍ): کاری راست.
مَـزَجَ الـشرابَ ونحـوه مَزْجـاً: شـەرابەکەی تێـکەڵ کرد بەشتی تر.
مَزَجَ فلاناً على صاحبه: فلانکەسی هـەڵنا بۆ دژایەتی کردنی هاوەڵەکەی.
مَازَجَـــهُ: تێـــکەڵاوی کـــرد ٥ شـــانازی بەسەردا کرد.
مَـزَجَ الـسنبلُ: گوڵە رووەکەکە لەحاڵـەتی سەوزییەوە چووە سەر حاڵەتی زەردی.
تَمـازَجَ الـشرابُ والمـاءُ: شـەرابو ئـاو تێـکەڵاو بـوون ٥ دەگـوترێ: (تَمـازَجَ الزوجان تمازج الماء والصهباء).
المِزاجُ: ئەوەی شەرابی تێکەڵ دەکـرێ ٥ هـــەر دووشـــت تێـــکەڵ بکـــرێن بەهەریەکێکیان دەگـوترێ: (مِـزاج)

٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ ٥ هەروا وشەی (مَزَاج) بریتییە لەئامادەباشییەکی تایبەتی جەستەیی عەقلّی، مرۆڤی رابردو سەردەمی کۆن پێیان وابوو کەحالّەتی (مِزَاج) لەوەوە پەیدادەبێ کە لەجەستەدا یەکێک لە چوار عەنصورەکان (خوێن، سفراو، مادەی ڕەش، بەلّغەم) رێژەکەی لەجەستە دا یاد بکا ٥ وەلێ زاناکانی سەردەمی پێشکەوتنی زانست ئێستاشی لەگەل دا بێ هەرچەندە پێیان وایە میزاجەکان لەئاکامی کارلێک و کاریگەرە جەستەییەکان پەیدا دەبن بەلاّم لەژمارەی میزاجەکان و ناوەکانیان رای جیاوازیان هەیە.

**المَزْجُ**: (شراب مَزْجٌ): شەرابی تێکەلّ کراو بەشتی تر.

**المِزْجُ**: هەنگوین ٥ ئەو ئاوەی تێکەلّی شەراب دەکرێ ٥ بادامی تالّ.

**المَزَّاجُ**: (رجُلٌ مَزَّاجٌ): پیاوێکی بەچەپ و گوپ و درۆزن و ڕاڕا، هیچ کاتێ لەسەر ڕەوشتێک بەردەوام نابێ.

**المَزِيجُ**: بادامی تالّ، شەراب کە تێکەلّ بێ لەچەند شتێک.

**مَزَحَ مَزْحاً ومزاحاً**: گالّتەو سوعبەتی کرد.

**أمْزَحَ الكرمَ**: کەپری بۆ دارمێوەکە کرد.

**مازَحَهُ مِزاحاً ومُمازحةً**: گالّتەو سوعبەتی لەگەل کرد.

**مَزَّحَ السُّنْبُلُ والعِنَبُ**: گولّە دانەوێلّەکە ڕەنگی گۆڕاو پێگەیی، ترێیەکە پێگەیی.

**المَزْحُ**: گولّی دانەوێلّە.

**المَزْدَةُ**: سەرما.

**مَزَرَ اللَّبَنَ ونحوَه مزراً**: شیرەکەی وردە وردە قومقوم خواردەوە.

**مَزَرَ المَرَقَ ونحوه**: شۆرباوەکەی خواردەوە هەلّیلوشی.

**مَزَرَ فلاناً**: ڕقی لەفلانکەس بوو.

**مَزَرَ القِرْبَةَ**: کوندە ئاوەکەی پڕکرد لەئاو.

**مَزُرَ الرجلُ مزارةً**: پیاوەکە دلّی پتەو بوو ٥ قسە خۆش و عەنتیکە بوو.

**مَـزَرَ التمـرُ**: خورماکە پێگەیی ٥ (فهـو مزير).

**الأمْزَرُ**: پیاوی دلّ قیام و ورەبەرز ٥ (ك: امازير).

**المِـزْرُ**: بیرەی دروستکراو لەزوڕات ٥ ئەحمەق و گێل.

**المَزْرَةُ**: هەلّمژین.

**المازريون**: بڕوانە مادەی (الماذريون).

**مَزَّ الشرابَ مَزّاً**: شەرابەکەی هەلّمژی.

**مَـزَّ الشَّيْئ او الرجـلُ مَـزَارةً**: شتەکە یان

پیاوەکە لەغەیری خۆی باشتر بوو.

**مَزَّ الشرابُ**: شەرابەکە زۆر مزر بوو ◦ (فهو مُزٌّ).

**مَزَّزَهُ**: بەباش‌و چاکی هاتە بەرچاو.

**مَزَّزَ فلاناً بذلك الأمر**: بەوشتە فلانکەسی بەرزکردەوە.

**تَمَزَّزَ**: شەرابی مزر یان شتی مزری خواردەوە.

**تَمَزَّزَ الشرابَ**: شەرابەکەی هەلمزی.

**المَازَّةُ**: (حِنطة مازَّةٌ): گەنمێکە هەویرەکەی شل دەبێتەوەو نانی لێ ناکرێ.

**المُزُّ**: هەرخواردن‌و خواردنەوەیەك تامی مزر بێ.

**المِزُّ**: فەضل‌و زێدە ◦ دەگوترێ: (هذا على ذلك مِزٌّ).

**المَزَزُ**: مۆلەت ◦ دەگوترێ: (افعله على مزز): من بەکالەو خۆ ئەو کارەدەکەم.

**المُزَّاءُ**: شەرابی تام خۆش.

**المَزَّةُ**: بەمانا (المَزَّاء)دێ ◦ کەمێك قومە ئاوێك یان قومە شیرێك ◦ دەگوترێ: (ماني الإناء الامُزَّةٌ): کەمێك لەقاپەکە داماوە ◦ دەگوترێ: (ماني الإناء الا مُزَّةٌ): کەمێك لەقاپەکە داماوە.

**المُزَّةُ**: شەرابی مزرو خراپ.

**المَزِيز**: شکۆمەندو گەورە، زانا کە کەس هاوشانی نەبێ.

**مَزَعَ الفرسُ ونحوه في عدوه مَزْعاً**: ئەسپەکە بەگورجی بازی دا.

**مَزَعَ القُطنَ**: بەدەست لۆکەکەی شی کردەوە.

**مَزَّعَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بلاو کردەوە ◦ دەشگوترێ: (مَزَّعَ اللحمَ والثوبَ): گۆشتەکەی هەلخست بۆئەوەی لەبەر هەتاو وشك بێتەوە.

**تَمَزَّعَ الشَّيْءُ**: شتەکە بلاو بۆوە ◦ دەشگوترێ: (فلان يَتَمَزَّعُ غيظاً): فلانکەس رقی لێ دەرژێ‌و کەف دەچێنێ.

**تَمَزَّعَ القومُ الشَّيْءَ بينهم**: خەلکەکە لەناو خۆیان دا شتەکەیان بەش کرد.

**المُزَاعَةُ**: هەلومریوی شت ئەو پرژو وردەو خلتەو شتەی لەشتی تر دەکەوێتە خوار.

**المزَاعُ**: ژیشك.

**المُزْعَةُ**: پاشماوەی چەوری ◦ قومە ئاو ◦ دەگوترێ: (ماني الإناء مُزْعَة من الماء) ◦ (ك: مَزَعٌ).

**المِزعَة**: پارچە لۆکە پارچە پەرو پۆلی بالندە پارچە گۆشت.

**المَزْعِيُّ**: فیتنە ◦ شەورەو.

**مَـزِقَ الطـائر بِسَلْحِهِ مَزْقـاً**: بالندەكـە جیقنەی بەردایەوە.

**مَزَّقَ الثوبَ**: قوماشەكەی دڕی.

**مَـزَّقَ عِـرضَ أخيـه**: تانـەی لەناموسـی براكـەی دا جـوێنی پێـدا ◦ قورئـان دەفەرموێ: ﴿وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَـزَّقٍ﴾ ◦ پـەرتو بلاومـان كـردنو هەریەكەیانمان فڕێ دایە شوێنێـك.

**مازَقَـهُ**: پێـشبڕكێی لەگـەڵ دا كـرد لەڕاكردنو بازدان دا.

**تَمَزَّقَ**: قەڵشت قەڵشت بوو.

**تَمَزَّقَ القومُ**: خەڵكەكە پەرتەوازە بـوون ◦ دەگوترێ: (تَمَزَّقَ جَمْعُهُم).

**المَـزَاقُ**: گـورجو گـوڵ خێـرا لـە ئـیشو كاردا.

**المَزِقُ**: (ثوب مَزِقٌ): قوماش یـان كراسـی دڕاو.

**المِزْقَـةُ**: بـەمانا (المِزْعَـة)دێ ◦ دەگـوترێ: (صار الثوب مِزقاً).

**المَزِيقُ**: بەمانا (المَزِقُ)دێ.

**مَزْمَـزَهُ**: هەوڵـەو گێـڕو ئەمـدیوی ئـەو دیوی كرد ◦ هێنایە پێشەوەو بردیە دواوە.

**تَمَزْمَـزَ**: لەقانـدی، جـولا، كەوتـە جـمو جوڵ.

**تَمَزْمَزَ للقيام**: هەوڵی دا هەڵسێ.

**مَـزَنَ مُزُونـاً**: بـەخێرایی ڕۆیـی بـۆ جێبەجێـكردنی ئیـشەكەی ◦ دەشگوترێ: (مَزَنَ من العـدو): لەترسی دوژمنەكەی هەڵات.

**مَـزَنَ فـلان**: فلانكـەس دەمو چـاوی گەشایەوە.

**مَـزَنَ فلانـاً**: فلانكەسـی شـكۆدار كـرد، بەسەر كەسانی دیكەدا پاساوی دایـەوە ◦ بەپاشملە مەدحی كرد لـەلای خـاوەن دەسەڵاتو كاربەدەست.

**مَزَنَ القِربةَ**: كوندە ئاوەكەی پڕكرد.

**مَزَّنَـهُ**: بـۆ زێـدەو موبالەغـە لـەمانای (مَزَنَهُ)دێ.

**تَمَزَّنَ**: بەڕێی خۆی دا بەپەلە ڕۆیی.

**تَمَـزَّنَ علـى أصـحابه**: شـانازی بەسـەر هـاوەڵانی دا كـرد، زیـاد لەبـەڕەی خۆی قاچی ڕاكێشا.

**المازِنُ**: گەرای مێروو.

**المُزْن**: هەور كەبارانی پێوەبێ ◦ (حَبُّ المُزن): تەرزە.

**المُزْنَةُ**: تاوە باران ◦ (ابن مُزْنَة): مانگ كە جارجـار لـەناو هـەور دەردەچـێو دەبینـدرێ، دەگـوترێ: (طلـع ابـن مزنة).

**مَزَا مزواً ومزياً**: لوتبەرزی نواند.

**أمْزاه عَلَيْهِ**: زێـدە ڕێـزی بەسـەر ئـەودا هەبوو.

**مَـزَّاه**: بەباشـی زانـیو تـەفـضیلی دا ◦

دەگوترێ: (مزيت مَتَاعَهُ حتى نَفَقْتُه متاعه).

تَمَازى القَومُ: خەلکەکە خۆیان بەگەورەو ڕێزدار دانا.

تَمَزّى عليهم: پێی وابوو زێدە فەزڵی هەیە بەسەر ئەوان دا.

المازِي: بەمانا (الجَبّارُ)دێ.

المازية: زێدە ٥ دەگوترێ: (لـه عَلَيْـهِ مازِية).

المُتَمازي: دەگوترێ: (قعد عني متمازياً): دژم وەستاو پێچەوانەی دابو نەریت لەگەڵم دانیشت.

المَزْوُ والمَزْيُ: تەواو ٥ لەهەموو شتێك دا تەواوو کامڵ.

المَزِيّ: بەمانا (المَزْوُ)دێ ٥ زەریفو قسە خۆش.

المَزِيّةُ: لەهەموو شتێك دا بەمانا (المَزْوُ)دی ٥ زێدە فەضلو ڕێزداری کەلەکەسانی دیکە جوداوازی هەبێ ٥ خواردنی تایبەت کە بۆپیاو دروست دەکرێ ٥ (ك: مزايا).

مَسَا فلان مَسْناً ومَسوءً: فلان شتی ناشیرینو نەشیاوی ئەنجام دا ٥ ڕاستو درۆی تێکەڵ کرد.

مَسَا على الشَّيْئ: فێڵی لەپیاوەکە کرد ٥ دەشگوترێ: (مَسَاهُ بالقول): بەقسە کابرای نەرم کردەوە.

مَسَا القِدْرَ: مەنجەڵەکە یان کوڵێنەکە هێواش بووە.

مَسَأَ حَقَّهُ: درەنگ مافەکەی بۆ گەڕاندەوە.

مَسَأَ الطريق: ناو قەدی ڕێگای گرتەبەر.

أَمْسَأَ بين القوم: فەسادو گەندەڵی خستە نێو خەلکەوە.

المَسْءُ: ناوەڕاستی ڕێگا.

مَسَحَ في الأرض مسوحاً: بەناو زەوی دا ڕۆیشت.

مَسَحَ الشَّيْئَ المتلطخ أو المُبْتَلّ مسحاً: دەستی بەسەر شتەکەدا هێنا بۆئەوەی چرچو لۆچو شوێنەواری تەڕپەکەی بەسەرەوە نەمێنێ.

مَسَحَ على الشَّيْئ بالماء او بالدهن: دەستی تەڕی بەسەر شتەکەدا هێنا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ﴾.

مَسَحَ يده على رأس اليتيم: بەزەیی بەهەتیوەکەدا هات.

مَسَحَ فلاناً بالقول: بەقسەی نەرم لەگەڵ فلانکەس دا دوا بۆئەوەی لەخشتەی بەرێ.

مَسَحَ القومَ: بەسەر خەلکەکەدا ڕۆیی و لایان نەمایەوە.

مَسَحَ الحجرَ الأسودَ: دەستی بەبەردە ڕەشەکەی کەعبەدا هێنا بۆ تەبەروك.

مَسَحَ شَعْرَهُ: موی قژی بەشانەکرد.

مَسَحَ فلاناً بالسيف: فلانکەسی بەشمشێر بڕی ٥ (فهو ماسِح).

مَسَحَ القومَ قَتْلاً: زەبری لەخەڵکەکە داو کەلاکی لێ خستن، سەری پەڕاند، ملی پەڕاند.

مَسَحَ الإبلَ: حوشترەکەی ماندو کرد کزو لاوازی کرد ٥ دەشگوترێ: (مسحت الإبلُ الأرضَ يومها دَأباً): حوشترەکە بەخێرایی بەناو زەوی دا ڕۆیشتو هەدادانی نەبوو.

مَسَحَ المسّاحُ الأرضَ مَسْحاً: ڕوپێوەکە بەمەترو زیراع زەوییەکەی ڕوپێو کرد.

مَسِحَ فلان مَسَحاً: فلانکەس ڕەفیسکی چوزایەوە بەهۆی زبری پۆشاکەکەی ٥ دیوی ناوەوەی ڕانەکانی لێك خشان‌و درزو شوێنکەیان تێدا پەیدا بوو.

مَسِحَت المرأةُ: ئافرەتەکە سمت پوچ بوو سمتی لاواز بون ٥ مەمکی بچوك بون ٥ بەرەقاچی تەخت بون‌و پاژنە پێی دیارنەبون ٥ (فهي مَسْحَاءُ، وهو أمسح).

مَاسَحَهُ: بەنەرمی لەگەڵی دوا بۆئەوەی لەخشتەی بەرێ‌و هەڵیخەڵەتێنێ ٥ دەگوترێ: (غَضِبَ فلان فما مَسَحَهُ حتى لان): فلانکەس ڕقی هەڵسا، ئەویش بەقسەی خۆش هێواشی کردەوە.

مَاسَحَهُ: لێی خۆش بوو، پەیمانی پێدا.

مَسَّحَ الشَّيْءَ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (مَسَحَ)دێ.

مَسَّحَ فلاناً: قسەی نەرمی لەگەڵ فلانکەس کرد بۆئەوەی فێڵی لێ بکا هەڵیخەڵەتێنێ.

مَسَّحَ الإبلَ: بەمانا (مَسَحَها)دێ.

إمْتَسَحَ السَّيْفَ من غمده: شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا.

إنْمَسَحَ وإمَّسَحَ الشَّيْءُ: شتەکە ئەوی لەسەری بوو ڕامالدرا، ڕادرا.

تَمَاسَحَ الرجلان: دووپیاوەکە دۆستایەتییان بەست ٥ یان مامەڵەی کڕین‌و فرۆشتنیان کرد ٥ یان دەستیان خستە ناو دەستی یەکترەوە ٥ دەگوترێ: (إلتقوا فتماسَحُوا): ئەو کۆمەڵەبەیەك گەیشتن‌و دەستیان خستە ناو دەستی یەکترەوە.

تَمَسَّحَ بالماء ومنه: بەئاو خۆی ششت.

تَمَسَّحَ للصلاة: بۆ نوێژ دەستنوێژی گرت.

تَمَسَّحَ بالأرض: تەیەمومی کرد ٥ لەحەدیثی پێغەمبەردا هاتووە: (تَمَسَّحوا بالأرض فإنها بكم برة): دەشگوترێ: (فلان يَتَمَسَّحُ به لفضله وعبادته): فلانکەس ئەوەندە پیاوی چاکە کەسانی دیکە خۆی لێ نزیك

دەکەنەوە بەخودا پەرستی حسێب دەکەن ٥ دەشگوترێ: (فلان يَتَمَسَّحُ): فلانکەس هیچی نییە.

**الأمسح:** کەسێك بەرپەرەوی خۆی دا بروا ٥ کوێر ٥ گورگ ٥ زەوی دەشت ٥ (ك: أماسِح وهي مسحاء).

**الأمسوح:** هەردارێکی درێز لەدروستکردنی کەشتی دا چەسپێندرابێ ٥ (ك: أماسيح).

**التِمْسَاحُ:** گیانلەبەرێکی وشکاوەکی خشۆکە، درندەو کەتەیە، درێژییەکەی پێنج مەترێك دەبێ لەرووباری نیلی میصرو هەندێ روباری وڵاتی تردا هەیە ٥ هەروا ناوە بۆ پیاوی زێنە خرۆو رەوشت ناشیرین ٥ (ك: تماسح وتماسيح) ٥ (دموع التماسيح): کینایەیە لەدوروویی‌و فرت‌و فێڵ چونکە تیمساح کەبیەوێ پەلاماری نێچیری بدا فرمێسکی دێن.

**التِّمْسَحُ:** بەمانا (التِمسَاح) دێ ٥ (ك: تماسح وتماسيح) ٥ هەروا وشەی (التِّمْسَحُ) ناوە بۆ مرۆڤی قسە نەرم‌و خۆش‌و فێڵاوی کەبیەوێ بەقسەی خۆش بەرامبەرەکەی لەخشتە بەرێ ٥ زەوی تەخت کە وردە بەردی تێدابن‌و بێ گیاو درەخت بێ.

**المِساحة:** زانیاری روپێوی زەوی.

**المِسْحُ:** پۆشاك کەلەمو دروستکرابێ ٥ پۆشاکی رەبەن‌و خەڵوە نشین ٥ شەقامە رێ.

**المَسْحاءُ:** زەوی دەشت‌و پان کە بەردەوردەی هەبن ٥ ئافرەت کەقاچی قاپەرەقەی دیارنەبن ٥ یان مەمکی بەرز نەبوبنەوە ٥ (ك: مِساح ومَسَاحی ومَسَاحٍ).

**المُسْحَةُ:** دەگوترێ: (عَلَيْهِ مُسْحَة من جمال أو بە مُسحة من هزال او عَلَيْهِ): کەمێك لەجوانی یان لە لاوازیی پێوەیە ٥ دەگوترێ: (مَنَّ الله عليك بالمُسْحة وأذاقَكَ حلاوة الصحة).

**المَسَّاحة:** خەتکوژێنەوە.

**المِسِّيحُ:** کەسێك زۆر گەشت‌و گوزار بکا.

**المَسِيحُ:** نازناوی حەزرەتی عیسای کوری مەریەمە ٥ هەروا بەمانا (الممسوح)دێ کەبریتییە لەوکەسەی بەرۆنی هەندێ روەك‌و شتی وا دەیهەنون بەنیازی ئەوەی ببێتە پێغەمبەر یان مەلیك ئەمە داب‌و نەرێتی هەندێ لەفەلەو نەصرانیەکانە ٥ (رجل مسيح الوجه): پیاوێکە لایەکی روخساری

چاوو برۆی نییە، هیچ دیاردەی چاوو برۆی پێوە دیارنییە ٥ (ك: مُسَحَاء ومَسْحَى)یە ٥ عارەق کەلەدەمو چاو دەسردرێ ٥ دەسەسڕی عارەق سڕین لەسەر دەمو چاو.

المَسِيحَةُ: لکی مێزەر ٥ یان مووی سەر کە لەشوێنی ناسایی خۆی بێتە خوارو بەدەرمانو داڕوو شتی وا چارنەکرێ ٥ هەروا ناوە بۆ لاجانگ نێوان نەرمایی گوێو برۆ بەرەو سەرو تادەگاتە خوار تەپڵە سەر ٥ پارچە زیو ٥ دیرهەمی زیو ٥ کەوانی چاك ٥ (ك: مَسَائح).

المَسِيحيّ: کەسێك یا شتێك پاڵ بدرێ بۆلای حەزرەتی مەسیح.

المِمْسَحُ: زەوی دەشتو پان کە بەردی وردی تێدابنو گیاو گزی لێ نەڕوێ.

المِمْسَحَةُ: پەڕۆیەکە تەختە ڕشەو مێزو کاشیو شتی وای پێ دەسڕدرێ.

المَمْسوحُ: مرۆڤێك چاوو برۆی نەبن، دیارنەبن ٥ دەشگوترێ: (رجل ممسوح الأليتين): پیاوێکە سمتی گەورە نەبنو بەنێسقانەوە نووسابن ٥ گۆشتیان پێوە نەبێ.

مَسَخَهُ مَسْخاً: شێوەی گۆڕی ٥ دەشگوترێ: (مَسَخَهُ اللهُ قرداً): خودا کردی بە مەیموون ٥ (فهو مِسْخٌ).

مَسَخَ كذا: خودا تامی شتەکەی نەهێشت.

مَسَخَ الطعامُ ونحوه مساخَةً: خواردنەکە شیرینایی نەما، یان هەرتامی نەبوو ٥ دەشگوترێ: (مَسُخت الفاكهة ومَسُخَ اللحمُ).

أمْسَخَ الوَرَمُ: هاوساوییەکە نەما پوکایەوە.

إمْتَسَخَ السَّيْفَ: شمشێرەکەی ڕاکێشا.

إمْسَخت العَضُدُ: قۆڵەکە گۆشتی پێوەنەما گۆشتی کەم بوو.

المَسِيخُ: لاوازو ئەحمەق ٥ روخسار شێواوو ئەکڵەوەتو ناشیرین ٥ دەگوترێ: (رجل مَسِيخٌ): پیاوی ناشیرینو جەستە ناقۆڵا ٥ هەروا وشەی (المَسيخ) بەخۆراکێك دەگوترێ: بێ تامو خوێ بێ.

المَمْسُوخُ: (فرس مَمْسُوخٌ): ئەسپی کەفەڵ لەڕو بێگۆشت.

مَسَدَ في السير مَسْداً: کۆششی کرد لەڕۆیشتن دا.

مَسَدَ الحَبْلَ: حەبلەکەی باش بادا، زۆر گشتی بادا.

مَسَدَ البَقْلُ الحيوان: روەکەکە ئاژەڵەکەی کزو لاواز کرد.

**مُسِدَ البَطنُ**: گەدە شل‌و ڕێك‌و بێ بەرزو نزمی بوو.

**المِسَارُ**: قاپی هەنگوین خواردنەوە ٥ هەنگوین خواردن.

**المَسَدُ**: گوش‌و حەبلی دروستکراو لەتوێکڵی درەخت ٥ حەبلی باش بادراوو چاك ڕێسراو ٥ میحوەری ئاسن کە بەکرەکەی لەسەر هەڵدەسوڕێ.

**المَسْدَاءُ**: (ساق مَسْداء): قاچی جوان‌و ڕێك‌و پێك.

**المَمْسُودُ**: دەگوترێ: (رجل مَمْسُود): پیاوی دەمار گشت‌و جەستە توندو تۆڵ ٥ (إمْرأة ممسودة): ئافرەتی قەدو باڵا جوان‌و بەرزو بڵند.

**مَسْرِي**: مانگی دوانزەی ساڵی قیبطی.

**مَسَّ الشَّيْئَ مَسّاً**: دەستی لێدا دەستی پێداهێنا ٥ دەشگوترێ: (مَسِسْتُ الشَّيْءِ): دەستم لەشتەکەدا دەشگوترێ: (مِسْتُهُ، مَسْتُهُ).

**مَسَّ الماءُ الجَسَدَ**: ئاو گەیشتە جەستەی ٥ دەشگوترێ: (مَسَّهُ بالسَّوْط ومَسَّهُ الكِبَرُ والمرض): دەشگوترێ: (مَسَّ المرأةَ): لاقەی ئافرەتەکەی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالَتْ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾ ٥ دەشگوترێ: (مَسَّهُ العذابُ وَمَسَّهُمَ البأساء والضراءُ).

**مَسَّهُ الشيطانُ**: شێت بوو.

**مَسَّتْ به رحِمُ فلان**: خزمایەتی فلانی هەبوو.

**مَسَّت الحَاجَة الى كذا**: پێویستی ناچاری کرد بۆ ئەو شتە.

**أمَسَّ الفَرَسُ**: ئەسپەکە دەست‌و قاچی پەڵەی سپییان تێدابوو.

**أمَسَّ فلاناً الشَّيْئَ**: فلانکەسی والێکرد دەست لەشتەکە بدا.

**أمَسَّ فلاناً شكوىً**: شکایەتی لای فلانکەس کرد.

**ماسَّهُ مُماسَّةً مِساساً**: دەستی لێ دا ٥ بەجەستەی کەوت.

**تَمَاسَّ الجرمان**: دوو قەبارەکە لێکیان دا.

**تماسَّ الزوجان**: ژن‌و مێردەکە جوتبون.

**مَسَاس**: دەستی لێ بدە ٥ (لا مِسَاسِ): توخنی مەکەوە.

**المَسُّ**: شێتی ٥ چارەسەرییەکە بەداخکردنی جەستە بەکاوییە ئەنجام دەدرێ ٥ دەگوترێ: (رأيتُ له مَسّاً في مالـه): دیاردەیەکی باشم لەماڵ‌و سامانەکەی دا دی.

**المَسُوسُ من الماء**: ئەو ئاوەی دەست بیگاتی ٥ ئەوەی ئارەزوو دابمرکێنێ ٥ ئاوێك نەسوێربێ نە شیرین ٥ دەشگوترێ: (کَلأٌ مَسُوس):

لەوورەیێکی بەسودە بۆ ئاژەڵ.
مَسِيسُ الحاجة: خاوەن پێداویستی.
مَسَطَ السقاءَ مَسْطاً: چی لە قاپو مەنجەڵەکەدا هەبوو لەماستو شتی وا بەپەنجەی دەری هێنا.
مَسَطَ الثوبُ: قوماشەکەی تەڕکرد دوایی رایتەکاند بۆ ئەوەی چی ئاوی تێدایە لێبێتە خوار.
مَسَطَ فلاناً: بەقەمچی لەفلانکەسی دا.
المَاسِطُ: ئاوی سوێر کە گەدە ڕەوان بکا ٥ ڕوەکێکی هاوینەیە کە حوشتر بیخوا سکی پێ دەچێو چی لەگەدەی دایە دێتەدەر.
المَسيط: قوڕ ٥ ئاوی لێڵ لەبنکی حەوزدا دەمێنێتەوە.
المَسيطَةُ: ئاوی لێڵ ٥ بیر کە ئاوی شیرین بێو ئاوی بیری سوێری بۆ بچێو لەکەڵکی بخا ٥ ئاوی نێوان حەوزو بیر کەجاری دەبێو بۆگەن دەکا ٥ شیوێک ئاوی کەمی پێدا بڕوا.
المُسْطَرين: بڕوانە مادەی (سَطَرَ).
المِسْعُ: بای شەماڵ.
المَسْعِيُّ من الرجال: پیاوێك زۆر ڕۆینده بێو ئازابێ بۆ ڕۆیشتن.
مَسَكَ بالشيئ: شتەکەی بەدەست گرت کۆنترۆڵی کرد ٥ خۆی پێدا هەڵواسی.
مسك بالنار: چاڵی بۆ ئاگرەکە هەڵکەندو ئەمجار بەخۆڵ دایپۆشی.
مَسَكَ الثوبَ: قوماشەکەی بەمیسك بۆنخۆش کرد.
مَسَكَ السقاءُ مساكةً: کوپەکە، کوندەکە ئاوی زۆر گرت.
أمْسَكَ بالشيئ: بەمانا (مَسَكَ)دێ.
امْسَكَ عَنْ الطعام: لەخواردن مانی گرت.
امْسَكَ عَنْ الإنفاق: ڕژدی کرد لەبەخشین دا.
أمْسَكَ الشَّيئ بيده: دەستی بە سەرشتەکە دا گرت.
أمْسَكَ الله الغيث: خودا بارانی گرتەوە نەیباراند.
مَسَّكَ بالشيئ: بەمانا (مَسَكَ)دێ.
مَسَّكَ فلاناً: عەرەبونی دا بەفلانکەس.
مَسَّكَ بالنار: بەئاگر داخی کرد.
إمْتَسَكَ بالشَّيئ: بەمانا (مَسَكَ)دێ.
إمْتَسَكَ فلان بالبلد: فلانکەس لەولاتەکەدا نیشتە جێ بوو.
تَمَاسَكَ بالشَّيئ: بەمانا (مَسَكَ)دێ ٥ دەشگوترێ: (ما تماسَكَ ان قال كذا): خۆی پێ داگیر نەکرا ئەوەی گوت ٥ یان دەگوترێ: (غشِيَني امر مُقلِقٌ فتماسكت): کارێکی ناخۆشم وەبەرهات خۆم ڕاگرتو توانیم

کۆنترۆڵی خۆم بکەم.

**تَمَسَّكَ بالشَّيْئ**: بەمانا (مَسَك)دێ.

**تَمَسَّكَ بالطيب**: بەبۆنی خۆش خۆی بۆنخۆش کرد.

**استمسك البولُ**: میزەکە نەهاتەدەرو حەوق بوو.

**استَمْسَكَ بالشَّيْئ**: بەتوندی دەستی بەشتەکە گرت.

**اسْتَمْسَكَ عَنْ الأمر**: لەکارەکە وەستاو ئەنجامی نەدا.

**اسْتَمْسَكَ الرجل على الراحلة**: پیاوەکە خۆی لەسەر وڵاخەکە گرتو نەگلا.

**الإمْساك**: رژدیو بەخیلی ٥ دەگوترێ: (بفلان امساك): فلانکەس رژدو چروکە.

**الإمساك في الصوم**: وازهێنان لەخواردنو خواردنەوەو شتی تر لەبەرەبەیانەوە تا خۆر ئاوابوون ٥ گیرانو قەبزبوونو وشکبوونەوەی خۆراکی خوراو لەریخۆڵەدا، پێچەوانەی سکچونو رەوانی.

**التَّماسُكُ**: پێکەوەنووسان یەکدی گرتنی مادەکان بەیەکەوە.

**التّماسك الإجتماعي**: پێکەوە لکانی تاکەکانی کۆمەڵ.

**المَاسِكَةُ**: توێکڵێکە بەسەر دەمو چاوی منداڵەوە.

**المَسَاكُ**: ئەو شوێنەی ئاو بگرێتەوە ئاوی تێدا بمێنێتەوە ٥ دەشگوترێ: (مافيه مِساك): خێرو بێری لێ چاوەڕوان ناکرێ.

**المَسَاكة**: رژدیو چروکی.

**المَسيكُ**: بەخیلو رژد ٥ (سقاء مسيك): کوندەو کوپەو گۆزەیەکە زۆر ئاو دەگری.

**المَسْك**: پێست ٥ پارچەیەك پێست دەشگوترێ: (هم في مسوك الثعالب): ئەوانە ترسنۆکن.

**المَسَك**: چینی زەوی ٥ بازنەو خرخاڵ ٥ کەلەشاخی ئاژەڵو عاج دروست کرابن.

**المُسْكُ**: عەقڵی زۆر ٥ عاقڵمەندی تەواو ٥ هەر خواردنو خواردنەوەیەك جەستە رابگرێ.

**المِسْك**: میسك کەلەجۆرە مامزێك دەردەهێندرێ.

**مِسْك البِرّ**: رووەکێکی بۆنخۆشە.

**المَسْكانُ**: عەرەبون ٥ (ك: مساكين).

**المُسْكَةُ**: هەرشتێك پشتی پێ ببەسترێ ٥ هەرشتێك ببێتە هۆکاری راوەستانی جەستەو گەشەکردنی ٥ عەقڵو ئاوەزو رای پەسەند ٥ دەگوترێ: (رجل ذو مُسْكَة): پیاوێکی خاوەن عەقڵو رای

پەسەندە ٥ هەروا وشەی (مُسكة):
بەبیرێك دەگوترێ: گلەكەی پتەو
بێ پێویست بەوەنەكا هەڵبچندرێ ٥
شوێنەوارو پاشماوە.

**المَسَكَةُ:** ئازاو چاونەترس ٥ دەگوترێ:
(فلان حَسَكة مَسَكة).

**المُسَكَةُ:** رژدو چروك ٥ كەسێك
كەدەستی بەسەر شتێك دا گرت لە
چنگی دەرنەیە ٥ پاڵەوان‌و
زۆرانبازی باش.

**المِسَيك:** رژدو چروك ٥ دەگوترێ: (سقاء
مِسِّيكٌ): قاپێكە كوندەیەكە
بەناخۆشی ئاوی لێدەردەهێندرێ.

**المَسيكة:** (أرض مسيكة): زەوییەكە ئاو
وشك نابێتەوە تێیدا بەهۆی
توندی‌و پتەوی خاكەكەی.

**مَسَلَ الماءَ مَسْلاً:** ئاوەكە جاری بوو.

**امْتَسَلَ السيفَ:** شمشێرەكەی لەكالان
دەركێشا.

**المَسَالَةُ:** دەم‌و چاوی درێژ كە جوان بێ.

**المَسيلُ:** رێڕەوی ئاو ٥ (ك: أمْسِلة
ومُسُلٌ): لقەدار خورمای تەڕ.

**مَسَنَ فلان مَسْناً:** فلانكەس شیعری
دڵداری بێ ئەدەبی گوت ٥ دڵداری‌و
فیشاڵی نواند.

**مَسَنَ فلاناً:** لەفلانكەسی دا تاكەوتە
سەرزەوی.

**مَسَنَ الشَيْئَ من الشَيْئ:** شتەكەی
لەشتەكە دەرهێنا.

**المَيْسون:** كوڕی گەنجی قۆزو قەدو باڵا
جوان.

**مَسا فلان مسواً:** فلانكەس وادەی كردنی
كارێكی داو دوایی كەمتەر خەمی
تێداكرد.

**مَسا النّاقة:** پێچووەكەی بەمردوویی لەسكی
حوشترەكە دەرهێنا.

**امسى القوم:** خەڵكەكە كەوتنە كاتی
ئێوارە.

**امْسَى فلاناً:** بەشتێك یارمەتی
فلانكەسی دا.

**ماساه مُمَاساةً:** گاڵتەی پێكرد.

**مَسَّ فلان:** فلانكەس وادەی كردنی
شتێكی داو دوایی كەمتەر خەمی لێ
كرد.

**مَسّى فلاناً:** بەفلانكەسی گوت چۆن
ئێوارەت تێپەڕاند یان ئێوارە باشی
لەفلانكەس كرد.

**إمْتَسَى ما عند فلان:** چی لای فلان
بوو هەمووی برد.

**الأمْسِيَةُ:** ئێوارە تا كاتی نیوە شەو ٥
دەگوترێ: (أتيتُهُ أمْسية امس).

**المَسَاءُ:** ئێوارە پێچەوانەی بەیانی ٥
بریتییە لەماوەی پاش نیوەڕۆ تا
نیوە شەو ٥ ناوەڕاستی رێگا ٥

دەگوترێ: (ركب فلان مَساء الطريق): فلانکەس بەناوەڕاستی ڕێگادا ڕۆیی.

**مَسى فلان مَسْياً**: فلانکەس ڕەوشتی ناشیرین بوو ۰ وای لێهاتووە گوێ لەئامۆژگاریی ناگرێو بەقسەی کەس ناکا.

**مَسى الشَّيْئَ**: بەدەستی شتەکەی مەسح کرد دەستی بەشتەکەدا هێنا ۰ دەگوترێ: (مَسَى الضرعَ): دەستی بەگوانەکەدا هێنا بۆئەوەی شیری لێبێتە دەر.

**مَسَى السَّيْرَ**: بەهێدی ڕۆیی.

**مَسَى الحَرُّ الماشية**: گەرما ئاژەڵەکانی کزو لاواز کرد.

**مَسَى السيفُ**: شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا.؟

**إمْتَسَى**: تینووی بوو.

**تماسى الشَّيْئ**: شتەکە پچڕا، کەرتو لەت بوو.

**تَمَسَّى**: بەمانا (تماسى)دێ.

**التَّماسِيَ**: بەڵاو کارەسات.

**الماسى**: کەسێك گوی لەئامۆژگاری کەس نەگرێ.

**مَشَجَ الشَّيْئُ مَشْجاً**: شتەکەی تێکەڵ کرد ۰ دەگوترێ: (مَشَجَ بينهما): شتەکانی تێکەڵاو کردن.

**المَشِجُ والمَشِيجُ**: هەردو شتێك تێکەڵاو بکرێن (دوو ڕەنگ تێکەڵاو ببن) ۰ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ﴾.

**الأمشاج**: ئەو چڵكو پیسییەی لەسەر ناوك کۆدەبێتەوە ۰ لەبواری ژیانداری دا وشەی (الأمشاج): ناوە بۆ خانەی تۆماوی پیاوو خانەی هێلکۆکەی مێینە پێش بەیەك گەیشتنیانو پێکەوە نوسانو تێکەڵاو بونیان.

**أمْشَحَت السماءُ**: ئاسمان ساو بوو، هەوری پێوەنەما.

**أمْشَحَتْ السَّنَةُ**: ساڵەکە وشکەساڵی بوو، گرانی بوو.

**مَشَرَ الشَّيْئ مَشْراً**: شتەکەی دەرخست.

**مَشَرَ فلاناً**: دای بەفلان، پێی بەخشی.

**مَشِرَ فلان**: فلانکەس خراپو بەدڕەوشت بوو.

**مَشِرَ الشَّجَرُ**: درەختەکە چرۆی کرد پۆخی کرد.

**أمْشَرَ فلان**: فلانکەس بازی پانی هاویشتن هەنگاوی پانی هەڵێنان ۰ فلانکەس فش بوو، هەڵاوسا.

**أمْشَرَ الشجرُ**: بەمانا (مَشِرَ)دێ.

**أمْشَرَت الأرضُ**: زەوییەکە ڕوەکی لێ ڕوا، ڕوەکی ڕواند.

١ - الانسان
١ الشعر
٢ الهامة
٣ الجبهة
٤ الصدغ
٥ العين
٦ الأنف
٧ الوجنة
٨ الخد
٩ الفم
١٠ الذقن
١١ اللحي
١٢ الرقبة
١٣ جوزة الحلق او الحرقدة
١٤ الكتف او العاتق
١٥ الصدر
١٦ المعدة
١٧ العضد
١٨ البطن
١٩ اليد
٢٠ الكاذة
٢١ السبابة
٢٢ الفخذ
٢٣ الوسطى
٢٤ الركبة
٢٥ الساق
٢٦ القدم
٢ - الانسان
١ قمة الرأس
٢ الأذن
٣ جمع الكف
٤ القفا
٥ القذال
٦ الإبط
٧ الظهر
٨ المرفق
٩ الحقو
١٠ الورك
١١ المعصم
١٢ الخنصر
١٣ البنصر
١٤ أخمص القدم
١٥ المأبض
١٦ أصابع الرجل
١٧ الحماة او الربلة
١٨ الرسغ
١٩ الكعب او الكاحل
٢٠ العقب
١ الوريد الأجوف الأعلى ◆ ٢ الشريان الرئوي ◆ ٣ الأذين الأيمن ◆ ٤ الشريان التاجي الأيسر ◆ ٥ البطين الأيسر ◆ ٦ الشريان التاجي الأيمن ◆ ٧ البطين الأيسر
٣ - القلب
١ الجفن الأعلى
٢ القرنية
٣ الحدقة او إنسان العين
٤ الجفن الأسفل
٤ - العين
٦ - جهاز الهضم
٥ - الرئة
١ قصبة الرئة ◆ ٢ الفلقة العليا ◆ ٣ الفلقة السفلى ◆ ٤ الرئة اليمنى ◆ ٥ الرئة اليسرى
١ المريء ◆ ٢ الكبد ◆ ٣ المرارة ◆ ٤ الاثني عشري ◆ ٥ الكبد ◆ ٦ المعدة ◆ ٧ بنكرياس او لوزة المعدة ◆ ٨ المعي الغليظ الصاعد ◆ ٩ المعي الغليظ المستعرض ◆ ١٠ المعي الدقيق ◆ ١١ المعي الأعوج ◆ ١٢ المعي الغليظ النازل ◆ ١٣ الزائدة الدودية ◆ ١٤ المستقيم

١ - الهيكل العظمي
١ العظم الجداري
٢ العظم الجبهي
٣ العظم الصدغي
٤ العظم الوجني
٥ العظم الأنفي
٦ الفك العلوي
٧ الاسنان العلوية
٨ الاسنان السفلية
٩ الفك السفلي
١٠ الفقرات العنقية
١١ الترقوة
١٢ عظم اللوح
١٣ القص
١٤ العضد
١٥ الأضلاع
١٦ الأضلاع السائبة الكاذبة
١٧ الفقرات القطنية
١٨ الحرقفة
١٩ الكعبرة
٢٠ العجز
٢١ الزند
٢٢ العصعص
٢٣ رسغ اليد
٢٤ مشط اليد
٢٥ السلاميات
٢٦ عظم الفخذ
٢٧ الرضفة او الداغصة
٢٨ قصبة الساق او الظنبوب
٢٩ الشظية
٣٠ رسغ القدم
٣١ مشط القدم
٣٢ سلاميات القدم
١ الشفة ◆ ٢ الطلاطلة ◆
٣ اللوزتان ◆ ٤ اللسان ◆
٥ الأسنان
٢ - الفم
١ العظم الجداري ◆ ٢ العظم الجبهي ◆ ٣ العظم الصدغي ◆
٤ العظم الوجني ◆ ٥ العظم الانفي ◆
٦ الفك العلوي ◆ ٧ الفك السفلي
٣ - قبائل الرأس
١ العضد
٢ الكعبرة
٣ الزند
٤ - مفصل المرفق
١ الجمجمة ◆
٢ العمود الفقري او الصلب ◆ ٣ الحرقفة
٥ - الصلب

**مَشَّرَ الشَجَرُ:** بەمانا (مَشِرَ)دێ.
**مَشَّرَ فلاناً:** بەخششی دابەفلان، شتی پێدا.
**مَشَّرَ الشَّئْ:** شتەکەی دابەشکرد، بڵاوی کردەوە.
**إمْتَشَرَ الراعي بِمِحَجَنِهِ من ورق الشجر:** شوانەکە بەگۆچانەکەی گەڵای بۆ ئاژەڵەکانی داهێنا، لێی نزیك کردنەوە.
**تَمَشَّرَ فلان:** فلانکەس بێ ئاتاج بوو ٥ یان دیاردەی دەوڵەمەندی لەسەر دیار کەوت.
**تَمَشَّرَ لأهله:** کاسبی بۆ خاوو خێزانی کرد ٥ پۆشاکی بۆ خێزانی کڕی.
**تَمَشَّرَ الشَجَرُ:** درەختەکە پۆخی کرد چرۆی کرد.
**تَمَشَّرَ الشَجَرُ:** درەختەکە سەوز بوو.
**تَمَشَّرَ القومُ:** خەڵکەکە دوای روتو ڕەجاڵی پۆشاکیان پۆشی.
**الأمْشَرُ:** گورجو گۆڵ ٥ چوستو چالاك.
**المَاشِرَةُ:** (أرض ماشرة): زەوییەکە بەباران تێراو بووە.
**المِشْرُ من الرجال:** پیاوی سورە فلەو زۆر سوور.
**المَشَرُ:** جنێوو قسەی ناخۆش ٥ دەگوترێ: (أذهبه مشراً): جوێنی پێدا.
**المَشْرَةُ:** سەرەتای دەرکەوتنی ڕوەك ٥ لەزاراوەی ڕوەکناسی دا هەرجەستەیەکی ڕوەکی کەمیحوەری مەرکەزی نەبێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئەوگەڵاو شتەی شوان بەگۆچانەکەی بۆ ئاژەڵەکانی دایدێنێ ٥ هەروا ناوە بۆ ڕوەکی کورتە بالا ٥ پۆشاکی ئافرەت ٥ دەشگوترێ: (إمرأة مشرة الأعضاء): ئافرەتی تەڕو تازە ٥ دەشگوترێ: (عَلَيْهِ مشرة الغِنى): دیاردەی دەوڵەمەندیو لافی نازونیعمەتی پێوە دیارە.
**المَشَرَةُ:** (مشرة الأرض): یەکەم ڕوەك کەلەزەوی سەردەردێنێ.
**مَشَّ العَظْمَ مشاً:** دوای هێنانو بردنی ئێسقانەکە لەدەمی دا ئەمجار هەڵی ملیست.
**مَشَّ فلاناً:** دزایەتی فلانکەسی کرد ٥ (مَشَّ یده): دەستی خۆی بەپەڕۆی زبر سڕی بۆئەوەی چەوری پێوە نەمێنێ.
**مَشَّ الناقَةَ:** حوشترەکەی دۆشی.
**مَشَّ مال فلان:** وردە وردە ماڵی فلانکەسی وەرگرت.
**مَشَّ الشَّئْ في الماء:** شتەکەی لەناو هەڵکێشا بۆئەوەی بتوێتەوە.
**مَشِشَتِ الدابَةُ مشَشاً:** وڵاخەکە

لەزەنگی دا خراپیەك پەیدا بوو بەئەندازەی ئێسقان ڕەق نییە.

**أَمَشَّ العَظمُ:** ئێسقانەکە شتی وای تێدا بوو هەڵملیسرێ.

**مَشْشَ العَظمَ:** مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا.

**إمْتَشَّ فلان:** فلانکەس خۆی پاك کردەوە.

**إمْتَشَّ العظمَ:** چەوری و مۆخی ناو ئێسقانەکەی هەڵمژی.

**إمْتَشَّ مافي الضرع:** چی لەگوانەکەدا هەبوو هەمووی دۆشی.

**إمْتَشَّ من مال فلان:** لەماڵی فلانکەس شتی دەستکەوت.

**إمْتَشَّ الثوب:** کراسەکەی داکەند.

**إمْتَشَّ المرأة حُلِيَّتها:** ئافرەتەکە ملەوانکەکەی لەملی خۆی داکەند.

**المَشَاشُ:** زەوی نەرمان ٥ بنەماو کانگە ٥ نەفس ٥ سروشت ٥ دەگوترێ: (فلان طیب المشاش): فلانکەس نەفسی بەرزە، ڕۆح سوکە، قسە خۆشە ٥ ئێسقانی بێ مۆخ ٥ خزمەتکار لەسەفەرو لەماڵەوە ٥ لەبواری ژیانداری دا بریتییە لە ئێسقانی ئیسفنجی.

**المُشَاشَةُ:** سەری ئێسقانی نەرم کەدەگونجێ بکرۆژرێ ٥ ئێسقانی شان کە بەرز بۆتەوە ٥ زەوی پتەوو ڕەق کە بیری لێ هەڵدەکەندرێ و ئاوی دەوران دەوری تێیدا کۆدەبێتەوە ٥ ڕێگایەك بەبەردی بچوك و گڵ ڕەصیف بکرێ واتە بەتێکەڵە ڕاستەو پاستە بکرێ.

**المَشَش:** سپیاییەکە لەچاوی حوشتردا دەردەکەوێ ٥ شتێکە لەزەندی ولاخ بەرز دەبێتەوە وەکوو ئێسقان ڕەق نابێ.

**المِشُّ:** پەنیری ناو جەرەو پێستە کەهەڵدەگیرێ و دەکرێتە پێخۆری زستان

**المشوشُ:** دەستە سرو شتی وا کەدەست و مەچەکی پێ وشك دەکرێتەوە.

**مَشَطَ الشعْرَ مَشْطاً:** قژەکەی بەشانە کرد ٥ دەگوترێ: (مَشِطَت الماشطَةُ المرأة): ئافرەتە جوانکارەکە قژی ئافرەتەکەی بەشانە کرد.

**مَشَطَ الشَّيْءَ:** شتەکەی تێکەڵاو کرد ٥ دەگوترێ: (مَشَطَ بين الماء واللبن): ماست و ئاو یان شیرو ئاوی تێکەڵ کرد.

**مَشَطَ الأرض:** زەوییەکەی بەئامێری ماڵماڵ تەخت کرد بۆئەوەی دانەوێڵە چاندراوەکە ژێر خۆڵ بکەوێ.

**مَشَطَ الدابَة:** ولاخەکەی بەئامێری وەکوو شانە داخ کرد.

مَـشِطَتْ يـد فـلان مَـشَطاً: دەسـتی فلانکـەس زبـر بـوو بـەهۆی ئـیش پێکردن یان چقڵو چاڵی تێڕاچوو.

مَـشِطَتْ الناقـة: حوشـترەکە بـەملاو بەولای دوگەکەی دا بەزی تیلمانج تیلمانج دروست بووە.

إمْتَـشَطَت المـرأةُ: ئافرەتەکـە قـژی شانەکرد.

الماشِـطَةُ: پیـشەی جوانکـاریی‌و ئارایشتکاریی.

المُشَاطَةُ: ئـەو تـوك‌و قژانـەی لـەکاتی شانە کردن دا هەڵدەوەرن.

المشّاطَةُ: ئافرەتی ئارایشتکارو جوانکارو رازێنەرەوە.

المِـشْطُ: شـانە ○ ئـامێری قـژداهێنان ○ (ك: أمشاط ومشاط).

المُـشْط: بـەمانا (المِـشْطُ)دێ ○ ئـامێری تەنین ئامێرێکە بۆ تەنین‌و چنین‌و تـەونکردن بـەکاردێ ○ دەگـوترێ: (ضَرَبَ النّاسِجُ بُمْشطه): تەونکەرەکە یـان جۆلاکـە بەشـانە لەبـەرەو قوماشـەکەی دا ○ هـەروا نـاوە بـۆ ئامێری داخکردنی حوشتر کەلەسەر شێوەی شانەیەو داندانە ○ بەشێـك لەقاچ کەدەکەوێتـە نێوان بـەرەپێ‌و قامکـەکانی ○ دەگـوترێ: (إنکَـسَرَ مُشطَ قدمـه): یـان دەگـوترێ: (قـاموا على أمشاط ارجلهم) هەروا وشەی (المُشْطُ) ناوە بۆ ئێسقانی شەپیلکی شان ○ یان ئەوگۆشتەی داپۆشیوەو بەشـەپیلکە کـەدا پـان بۆتـەوە ○ ئـامێری ماڵمـاڵ کـەدوای تۆچـاندن بـــەولاخ بەســـەر زەوییەکـــە ڕادەکێـشرێ بۆئـەوەی دانەوێڵەکـە ژێرخاك ببێ‌و گڵ داپۆشێ ○ هەروا ناوە بۆ جۆرە ماسییەك لەروبار دا دەژی.

المَـشْطَةُ: شـێوەی قـژی بەشـانەکراو ○ دەگـوترێ: (فـلان حـسن المَـشْطَة): فلانکەس سەری جوان داهێنـراوەو قژی ڕێـك‌و پێـکن.

المَـشيطُ: سـەری بەشـانەکراو، قـژی داهێنراوو ڕێـك خراو.

المْشَطُ: شانە ○ (ك: مَاشِط).

المَمْشوط: (رجل مَمشوط): پیاوی قـەدو بـالا جـوان‌و ڕێـك‌و پێـك ○ (بعـير ممشوط): حوشتری داخراو بەداخێك کەلەشێوەی شانەدایە.

مَـشِظَ الرجـلُ مَـشَظاً: پیاوەکـە دیـوی نـاوەوەی ڕانـەکانی لێـك دەخـشێن لەکاتی ڕۆیشتن دا.

مَـشِظَت الدابَـةُ: ولاخەکـە دەمارەکـانی لەناو گۆشتەکەی دا دەرکەوت.

المَـشَظُ: ئـەو چـقڵ‌و چـاڵەی لەدەسـت

رادەچێ ٥ پوازێکە کلکە پاچی پێ قایم دەکرێ.

**المِشْظَةُ**: چقڵ، درك.

**المَـشِظَةُ**: (قنـاة مَـشِظَةٌ): چەکێـکە ناسنەکەی ڕەق‌و زبرە.

**مَشَعَ فلان مَشْعاً ومـشوعاً**: کاسبی کردو ماڵ‌و سامانی پەیداکرد.

**مَشَعَ مَـشْعاً**: بەشێوە ڕۆیشتنێکی نەرم ڕۆیی ٥ دزی کرد.

**مَشَعَ القِثاءُ ونحوه**: خەیارەکەی کرۆشت‌و دەنگی خرمەی لێهات.

**مَـشَعَ القـصْعَةَ**: چی لەلەگەنەکەدا بوو هەمووی خوارد.

**مَشَعَ فلاناً بالحبل ونحوه**: بەحەبل‌و شتی وا لەفلانکەسی دا.

**مَشَعَ القُطنَ ونحوه**: لۆکەکەی بەدەست شی کردەوە.

**إمْتَشَعَ الرجلُ**: پیاوەکە پیسایی‌و چڵکی لەخۆی دوورخستەوە.

**إمْتَشَعَ ما في الضرع**: چی لە گوانەکەدا هەبوو هەمووی دۆشی.

**إمْتَشَعَ مـا في يـد فـلان**: چی لەدەستی فلان داهەبوو وەری گرت.

**إمْتَشَعَ ثوب صاحبه**: کراسی هاوەڵەکەی دزی.

**إمْتَـشَعَ الـسيف مـن غمـده**: بەپەلـە شمشێری لەکالان دەرکێشا.

**تَمَشَّعَ الرجلُ**: بەمانا (امْتَشَعَ)دێ.

**المِشْعَةُ**: پارچە لۆکەی شیکراوە.

**المَشُوعُ**: (رجل مشوع) پیاوێکی کاسب‌و ئیشکەرە ٥ (ذِئب مشوع): گورگی زێنە خرۆو دزەکەر.

**المَشيعَةُ**: بەمانا (المِشْعَةُ)دێ.

**مَشَغَ فلان مَشْغاً**: بەهێدی‌و لەسەرە خۆ شتی خوارد.

**مَشَغَ فلاناً سَوْطاً**: قامچی لەفلانکەس دا.

**مَـشَغَ عـرضَ فـلان**: ناموسی فلانکەسی لەکەدار کرد.

**المِشْغُ**: قوڕە سور کە سواغی دیواری پێ دەکرێ.

**مَـشَقَ في الكتابـة مَـشْقاً**: لەنووسـین دا پیتـەکانی بەدرێـژی نوسـین ٥ خێـرا نووسی ٥ دەشگوترێ: (مَشَقُوا رحيلهم): خێـرا کـار وانەکـەیان تـاودا بەپەلـە ڕۆیشتن.

**مَـشَقَت الإبـلُ في سـيرها**: حوشـترەکە لەڕۆیشتن دا خێرا بـوو (مَـشَقَتْ في الكلأ): لەوەڕە چاکەکەی خوارد، کام لەوەڕە خۆش بوو خواردی.

**مَـشَقَ فلانـاً**: زەبـری لەفلانکـەس دا ٥ بەقامچی لێی دا.

**مَشَقَ الأكْـلَ**: پەلـەی کـرد لەخواردنەکـەی دا.

**مَـشَقَ الـثوبُ الخَـشِنُ الـساقَ**: قوماشـە

زەبرەکــە شــوێنکەی لــەقاچ کــرد بریـنداری کـرد، وەکوو شێوە سوتاوی لێکرد.

**مَشَقَ الـشيئ:** شـتەکەی راکێـشا بۆئـەوە بکشێو درێژ بێ.

**مَــشَقَ الـوَتَرَ وغـيره:** ژێیەکـەی دادڕ دادڕ کرد.

**مَــشَقَ الكتـانَ:** کەتانەکـەی پـاك کـردەوە پــلو پــوشو گــڵو بــەردی لــێ جیاکردەوە.

**مَشِقَت الجاريـة مَـشقاً:** ئافرەتەکـە کزو لاواز بــوو گۆشــتی کــەم بــوو، ئەندامەکانی جەستەی باریکو بێ وەج بوون.

**مَشَقَ فـلان مَـشَقاً:** فلانکـەس فـەیزەن بـو ئەژنۆکانی یان ڕانەکانی لێـك خشان ٥ (فهو مَشِقٌ وأمْشِقٌ وهي مَشقاء أيضاً).

**امْشَقَهُ:** بەقامچی لێی دا.

**امْشَقَ الثوبَ:** قوماشەکەی بەقوڕە سور ڕەنگ کرد.

**مَاشَقَهُ مُاشَقَةً:** قـیڕەو هـەرای لەگـەڵ دا کرد ٥ رایتەکاند، کێشی کرد.

**اْمتَشَقَ الشيئ مـن يـد غـيره:** شـتەکەی لەدەســتی فلانکــەس دەرهێنــاو نەیهێشت بەخۆی بزانێ ٥ لەدەستی رفاند.

**اِمْتَشَقَ مافي الـضرع:** چی لەگوانەکـەدا هـەبوو هـەمووی دۆشـی ٥ (اِمْتَـشَقَ مـافي يـده): ئـەوەی لەدەستی دابـوو دەریهێنــا لێــی دزی ٥ (اِمْتَــشَقَ السيف): شمشێری لەکالان دەرکێشا.

**تَماشــقوا الـشيئ:** شــتەکەیان لێــك کێشایەوە، هەریەکەیان بۆلای خـۆی کێش کرد.

**تَمَشَّقَ عن فلان ثوبُهُ:** کراسەکەی لەبـەر فلان دا شڕو وڕکرد.

**تَمَشَّقَ الغُصْنُ:** لقەدرەختەکە ڕوت بـوو گەڵای پێوە نەما.

**تَمَشَّقَ الصُّبْحُ او الليـلُ:** بـەیانی بەسـەر چـــوو، شــەوڕابوو ٥ دەشــگوترێ: (تَمَشَّقَ ثوب الليل): پۆشـاکی لاچـوو بەیانی دەرکەوت دونیا ڕوناك بوو.

**الأمْشَقُ:** پێستی شەقار شەقار بوو.

**المُـشاقَةُ:** وردەو پـلو پـوشو شـتی وا کەلەئاکامی بەشانەکردنی قـزو مـو یان لەبێژنگدانی کەتان هەڵدەوەرێ.

**المَشّاقُ:** قەڵەمی خۆش نووس.

**المَشَقُ:** قوڕە سور ٥ دەشـگوترێ: (في قدّه مَشَقٌ): بـاڵای درێـژو جوانو ڕێـكو پێــکە ٥ نمونـەی خـەتی جوان کـە قوتــابی لەبــەری دەنووســێتەوە بۆئەوەی فێری نووسین بێو خـەتی خۆش ببێ.

**المَــشْقُ:** قــوڕە ســور ٥ پیــاوی لاوازو داڵگۆشت.

**المِشْقَةُ:** بەمانا (المَشَاقَةُ)دێ ◦ پارچە لۆکە ◦ قوماشی رزیو.

**المَشْقَةُ:** شوێنکەی حەبل‌و شتی وا بەقاچی ولاخەوە.

**المَشِيقُ:** پیاوی لاوازو دالگۆشت ◦ ئەسپی ورگ بچکۆلە (قەدباریك) ◦ قوماشی زۆر لەبەرکراوو رزیو.

**المَمْشُوقُ من الرجال او الخيل:** پیاوی لاواز ئەسپی ورگ بچوك ◦ هەروا وشەی (الممشوق): ناوە بۆ شیشە ئاسنی درێژو باریك ◦ دەشگوترێ: (قدّ ممشوق): قەدو بالای بەرزو باریك ◦ (جارية ممشوقة) ◦ کچۆڵەیەکی قەدو بالا جوان‌و رێك‌و پێکە.

**مَشَلَ لحمه مشولاً:** گۆشتی کەم بوو ◦ دەگوترێ: (فخذ ماشلة وممشولة): رانێکی کزو دالگۆشت.

**مَشَلَ السيفَ مَشْلاً:** شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا.

**مَشَلَتِ الناقة:** حوشترەکە شیری کەمی دا.

**مَشَلَ الحالبُ:** شیر دۆشەکە لەشیر دۆشین دا لەسەر خۆ بوو کەمێکی شیر لەگوانەکەدا هێشتەوە.

**إمْتَشَلَ السيفَ:** شمشێری لەکالان دەرکێشا.

**المَشَلُ:** شیری کەم.

**المِشْمِشُ:** کشمیش؛ درەختێکە میوەکەی بەترێ‌و بەوشك کراوەیی دەخورێ ◦ (قمر الدين)یشی لێ دروست دەکرێ.

**المشيمَةُ:** بڕوانە مادەی (شَيَمَ).

**مَشَنَهُ بالسوط مَشْناً:** بەقامچی لێی دا ◦ دەشگوترێ: (مَشَنَهُ بالسيف): بەشمشێر لێی دا پێستەکەی لێداماڵی‌و زۆری گۆشت نەبڕی.

**مَشَنَ الشيئ فلاناً:** شتەکە فلانکەسی ڕنی روشاندی.

**مَشَنَ يَدَهُ:** دەستی بەشتی زبر سڕینەوە.

**مَشَنَ ماني ضرع الناقة:** ئەو شیرەی لەگوانی حوشترەکە دا بوو هەمووی دۆشی ◦ دەشگوترێ: (إمْتَشِنْ مامَشَنَ لك): چیت دەسکەوت ببیە.

**مَشَنَت الناقة ونحوها:** حوشترەکە بەناخۆشی شیری دا.

**إمْتَشَنَ الشيئ:** شتەکەی دزی ◦ رفاندی، فراندی.

**إمتَشَنَ ثوبَهُ:** کراسەکەی داکەند.

**إمْتَشَنَ السيفَ:** شمشێرەکە دەرکێشا لەکالان.

**إمْتَشَنَ الناقة:** چی لەگوانی حوشترەکە دا بوو دۆشی.

**تماشَنا الشيئ:** شتەکە یان لێك کێشایەوە ◦ هەریەکە یان بۆلای خۆی رایکێشا.

المَشَانُ: ئـافرەتی دەمــە وەری جنێـو فرۆش ٥ گورگی زێنە خرۆ.
المَشْنَةُ: برینێـك فراوان بێ بـەلام قـوڵ نەبێ.
المَــشْنَ: کتابێــکە بــەزمانی عیــبری نووســـراوە دەبـــارەی شـــەریعەتی جولەکە.
أمْـشَی الـدواءُ فلانـاً: دەرمانەکە سکی فلانکەسی چواند، ڕەوانی کرد.
اسْتَمْـشی فــلان: فلانکــەس دەرمــانی ڕەوانـــــی خـــــواردەوە ٥ ســــکی بەخواردنی دەرمان ڕەوان بوو.
المَشَا: گێزەر، یان ڕوەکێك لەو بچێ.
المَشاءُ والمِشْوُ والمَشُوُّ: دەرمـانی ڕەوانـی دەرمانێك سك بچوێنێ.
مَــــشی مَــشْیاً: ڕۆیـی لەشوێنێــکەوە گواســـتیەوە بـــۆ شوێنێـــکی تـــر ٥ دەشگوترێ: (مَشَی بالنميمـة): فیتنـەیی نایەوە.
مَشی مَشاءً: ئاژەڵی زۆر بوون دەشگوترێ: (مَشَت إبِلُهُ): حوشتری زۆر بوون.
مَشَت المرأةُ: ئافرەتەکە منداڵی زۆر بوون.
أمــشی فــلان: فلانکــەس ئـاژەڵی زۆر بوون.
أمْشَی الرجلَ: پیاوەکەی والێـکرد بـڕوا، ڕۆیاندی.
مَــــشَّی: بـــۆ زێـــدەڕۆیی لـــەمانای (مَشی)دێ.
مَشَّي الرجلَ: پیاوەکەی ڕۆیاند.
مَاشاهُ مُماشاةً: لەگەڵی ڕۆیی.
إمْتَشَی القـومُ: خەڵکەکە ئاژەڵیان زۆر بوون.
تَماشـی القـوم: خەڵکەکـە هەندێـکیان چونە لای هەنێکیان.
تَمَشَّی: ڕۆیشت.
المَاشِيَةُ: ئـاژەڵ (حوشـترو مـەڕو بـزنو ڕەشە ولاخ) بـەزۆری بـۆ مـەڕو بـزن بەکاردەهێندرێ.
المُــشَاءُ: پیـادە پێـچەوانەی سـوار ٥ فیتنەگێڕ.
المُـشَاءُ مـن الجيش: ئـەو سـەربازانەی پیادەڕەون.
المَــشَّاءُ: زۆر ڕۆ (کەسێــك زۆر بــەپێ بڕوا) ٥ فیتنە.
مَـصَحَ الـشَيْئُ مَـصْحاً ومُـصُوحاً: شتەکە لاچـــوو، نـــەما، شـــوێنەواری نـــەما ٥ دەگــوترێ: (مَــصَحَتِ الــدارُ ومُــصِحَ الكتابُ).
مَصَحَ الثوبُ: قوماشەکە کۆن بوو ڕزی.
مَـــصَحَ النبـــات: ڕوەکەکــە گوڵــەکانی هەڵوەرین.
مَــصَحَ الظِــلُ: سـێبەرەکە هەڵکـشایەوە، کەمبۆوە، یان لایدا.
مَصَحَ الشَيْئُ في الأرض: بەزەوی دا ڕۆیـیو چووە ناوەوە.
مَصَحَ بالشَّيْئ: شتەکەی برد.

**أَمْصَحَ اللهُ مابكَ:** ئەوەی هەتبوو خودا بردیەوە، فەوتاندی.

**المَصَاحَةُ:** پێستی بێچوە ئاژەڵ بەکاوو شتی وا دەهاخندریّ لەشوێنی چۆڵ دادەنریّو دایکەکە وادەزانیّ بێچوی خۆیەتی.

**مَصَحَ الشَيْءَ مَصْحاً:** شتەکەی دارنی ٥ لەناو شتێکی تر دەری کێشا ٥ رایتەکاند.

**إمْتَصَحَ الشَيْءُ عن الشَيْءِ:** شتەکە لەشتەکە جیابۆوە.

**إمْتَصَحَ الشَيْءَ:** شتەکەی بۆلای خۆی کێش کرد رایتەکاند.

**إمْصَحَ الوَلَدُ:** بێچوەکە، زارۆکەکە لەسکی دایکی جیابۆوە.

**مَصَدَ الشَيْءَ:** شتەکەی هەڵمژی.

**مَصَدَ الحیوان:** ئاژەڵەکەی راهێنا، ژێرباری کرد.

**المَصَادُ:** بانوی بەرز ٥ (ك: أمصدة) ٥ دەشگوتریّ: (هو لقومه مَعْقَل ومَصَاد) ئەو بۆ خزمەکانی پەناگاو مەلجەئە.

**المَصْدُ:** بەمانا (المَصَادُ)دیّ ٥ تەرزە.

**المَصْدَةُ:** تاوەبارانێك ٥ دەگوتریّ: (ما أصابتنا مصدة).

**مَصَرَت الحلوبُ مصوراً:** ئاژەڵە شیردەرەکە شیری کەم بوو.

**مَصَرَ الناقةَ أو الشاةَ مَصْراً:** بەسەری پەنجەکانی گوانی حوشترەکەیان مەرەکەی دۆشی.

**مَصَرَ العَطاءَ:** بەخششەکەی کەم کردەوە.

**مَصَرَ الفَرَسَ:** ئەسپەکەی راهێناو بەتاقی کردەوە بۆ ئەوەی بزانیّ ئاخۆ غاردانی چۆنە.

**امْصَرَتِ الحلوبَ:** بەمانا (مَصَرَتْ)دیّ.

**مَصَّرَ علیه عطاءَهُ:** کەمکەم بەخششی پێدا.

**مَصَّرَ القومُ المكانَ:** خەڵکەکە شوێنەکەیان کرد بەگەورەشار ٥ دەشگوتریّ: (مَصَّرَ الأمصارَ): شاری بنیاتنان.

**مَصَّرَت الدولةُ الشركة ونحوها:** دەوڵەت کۆمپانیاکانی خستنە ژێر دەستی خۆیەوەو لەچنگی بێگانە دەری هێنان.

**مَصَّرَ الثوبَ:** بەرەنگی کەمێك کاڵ قوماشەکەی رەنگ کرد.

**تَمَصَّرَ المكانُ:** شوێنەکە بوو بەگەورە شار.

**تَمَصَّرَ الشَيْءُ:** شتەکە کەم بوو.

**تَمَصَّرَ القوم:** خەڵکەکە بەناو شارەکان دا بلاو بوونەوە.

**تَمَصَّرَ الشخصُ:** کەسەکە بوو بەهاوڵاتی میصریو رەگەزنامەی میصری وەرگرت.

**تَمَصَّرَ الشَيْئ**: شوێن شتەکە کەوت.

**امْتَصَرَ الناقَةَ أو الشاةَ**: حوشترەکەی یان مەڕەکەی بەسەری پەنجە دۆشی.

**الماصِرُ**: نێوانو لەمپەری نێوان دوشت ٥ (ناقە ماصرە): حوشترێکە بەناخۆشی شیر لەگوانەکانی دێتە دەر یان کەم شیرە.

**المُصَارَةُ**: شوێنێك ئەسپی تێدا کۆبکرێتەوە.

**المِصْرُ**: ناوانو پەردەی نێوان دوشت ٥ سنوری نێوان دوو زەوی ٥ (ك: مصور) ٥ دەگوترێ: (اشترى الدارَ بمصورها) خانوەکەی کڕیوە بەو زوییانەی بەدەوریەوەن ٥ هەروا وشەی (مصر) بەمانا زەرفو گوێنیو حاجەت دێ ٥ گەورەشار کە باڵەخانەو دوکانو بازاڕی تێدا بنیات بنرێنو پەرستگاو مزگەوتو خوێندنگاو زانکۆی خەستەخانەو شتی وای تێدا بنیات بنرێن ٥ مادەیەکی سورباوە شتی پێ ڕەنگ دەکرێ.

**المَصُورُ مِن الإبلِ أو الشاةِ**: بەمانا (الماصِرُ)دێ.

**المَصِيرُ**: ریخۆڵە ٥ (ك: مصران ومصارين).

**المُمَصَّرُ**: (ثوب مُمَصَّرٌ): قوماشێکە بەڕەنگی سوری تەنك بۆیەکراو.

**المُمَصَّرَةُ**: سەرەتەشی.

**مَصَّ القَصَبَ ونحوه مصّاً**: بەهێدیو کەم کەم بەقەفەزاژەکە شلەمەنییەکەی هەڵمژی ٥ (مَصٌّ من الدنيا): کەمێکی لەکاڵای دونیا بەرکەوت.

**أمَصَّهُ الشَيْئَ**: وای لێکرد شتەکە بمژێ ٥ شتەکەی پێ مژت.

**أمَصَّ فلاناً**: بەفلانکەسی گوت شوانە وێڵە، خوێڕی، گاوان.

**امْتَصَّ الشَيْئَ**: بەهێواشیو لەسەرەخۆ شتەکەی هەڵمژی.

**تَمَصَّصَ الشَيْئَ**: بەمانا (امْتَصَّهُ)دێ.

**المَاصَّةُ**: نەخۆشییەکە توشی منال دەبێ ٥ ئامێرێکە ئاوی پێ هەڵدەمژرێ.

**المُصَاصُ**: ئەوەی لەشت هەڵدەمژرێ ٥ پوختەی شت ٥ هەڵبژاردە ٥ دەگوترێ: (فلان مَصَاصُ قومه): فلانکەس هەڵبژاردەی نەتەوەکەیەتی ٥ (رجل مَصَاصٌ): پیاوێکە جەستەو سەرو شکڵی تەواوە بەڵام ئازانیە.

**المُصَاصَةُ**: ئەوەی دەمژرێ لەهەرشتێك بێ ٥ دەگوترێ: (طابت مَصَاصَةُ في فمي): هەڵمژینی لەدەممدا بەلەزەت بوو ٥ (مُصَاصَة الشَيْئ): پوختەی

شت ٥ دەگوترێ: (فلان مصاصة قومه): فلانكەس هەڵبژاردەی نەتەوەكەیەتی ٥ پاشماوەی شتی هەڵمژراو.

**المَصَانُ**: ئەو شوانە وێڵەی شیرو شتی وا بەدەم بێچوومنازەڵ دادەكا ٥ ئەگەر جوێن بەپیاوێك بدرێ شێوەیەك لەجنێو ئەوەیە پێی دەگوترێ: (یا مصان): شوانە وێڵە ٥ هەروا ناوە بۆ كەڵەشاخگر.

**المُصَّانُ**: قەصەبی شەكر كەلە گوشراوەكەی شەكر بەرهەم دەهێندرێ.

**مصيص الثرى**: گڵی شێدار، لمی تەڕ.

**المَمْصُوصُ**: (وظيف ممصوص): زەندە ولاغێكە باریكە.

**المَمْصُوصَةُ**: ئافرەتی كزو كۆڵەوار بەهۆی نەخۆشی.

**مَصْطَكَ الدواءَ**: مەستەكی كردە ناو دەرمانەكە.

**المُصطكا والمُصطكاءُ**: درەختێكە لەپێری دار قەزوانە درەختێكە دەروێندرێ لەكێو لەدەم كەنارە ئاوەكانی وڵاتی شامو هەندێ كێوی نزم بنێشتێكی تایبەتی لێ بەرهەم دەهێندرێ.

**مَصَعَ الشيءُ مَصْعاً**: شتەكە، رۆیی پشتی هەڵكرد ٥ (فهو ماصِعٌ): دەگوترێ: (مصع البردُ): سەرما رۆیی نەما ٥ (مَصَعَ ماء الحوض): ئاوی حەوزەكە وشك بوو یان كەم بوو (مَصَعَ فؤاده): لەترسا دڵی نەما.

**مَصَعَ في الأرض**: بەناوی زەوی دا رۆیی.

**مَصَعَ بالشيْءِ**: شتەكەی فڕێ دا.

**مَصَعَت الدابّةُ بذنبها**: وڵاخەكە (ئەسپەكە) كلكی راوەشاند بەبێ ئەوەی برواو باز بدا.

**مَعَصَ البرقُ**: بروسكەكە چەخماخەی دا.

**مَعَصَ فلاناً**: بەشمشێر لەفلانكەسی دا ٥ یان بەقامچی لێی دا.

**مَصَعَت الفتنةُ القومَ**: فیتنەو ئاشوب خەڵكەكەی قاڵ كرد.

**مَصَعَ الحوضَ بماء قليل**: بەئاوێكی كەم حەوزەكەی تەڕكرد.

**امْصَعَ العَوْسَجُ**: درەختی عەوسەج بەرەكەی دەركەوت.

**امْصَعَ القومُ**: خەڵكەكە شیری حوشترەكانیان خەسار بوو.

**امْصَعَ لفلان بحقه**: دانی بەمافی فلان دانا.

**امْصَعَت المرأةُ ولدها**: ئافرەتەكە كەمكەم شیری دا بەمنداڵەكەی.

**ماصَعَ قِرنَهُ**: شەڕە شمشێری لەگەڵ بەرامبەرەكەی دا كرد.

مَـصَّعَ العـودَ او الغُـصْنَ: توێـكڵەكەی بەلقەدارەكـەوە هێـشتەوە بۆئـەوەی لەسـەری وشـك بێتـەوە ٥ پێـوەی وشك بێتەوە.

انْمَصَعَ الحمارُ: گوێدرێژەكە گوێی قـوت كـردن بۆئـەوەی گـوێی لەدەنگەكـە بێ.

تَماصَـعوا في الحـرب: لەشەڕدا یـەكتریان كوشتو بڕكرد.

المَاصِعُ: ئاوی سوێر ٥ ئاوی كەمی لێڵ.

المَـصِعُ: منـداڵ كـە یـاری بـەنامێری میخـراق بكـا ٥ (رجـل مَـصِعٌ): پیاوێـكە ئـازاو بـەهێزو توانـا بـۆ شەڕ.

المُصْعَةُ: بەری درەختی عەوسەج.

المَـصُوعُ: پیـاوی ترسـنۆك كەلەترسان دڵی بلەرزێ.

مَصَلَ الشَّيْئُ مصلاً ومصولاً: شتەكە دڵۆپ دڵۆپ داچۆڕا.

مَـصَلَ الجُـرْحُ: برینەكـە كەمێـك كـیمو زوخاوی لێهاتە خوار.

مَصَلَ اللبنُ: ماستەكەی كردە قاپی كونكون یـان نـاو تورەكـەو شـتی وا بۆئـەوەی ئاوەكەی لێبچۆڕێتەوە.

مَصَلَ مَالَـهُ: مـاڵو سـامانەكەی فەوتانـد ٥ لەشتی پڕو پوچ دا خەرجی كرد.

أمْصَلَتْ المـرأةُ: ئافرەتەكـە منداڵەكـەی بەگۆشتپارەیی لەبارچو.

أمْصَلَ الراعـي الغَـنَمَ: شوانەكە شیری مەڕو بزنـەكانی دۆشی.

أمْصَلَ مالَهُ: ماڵو سـامانەكەی لەشـتی پڕو پوچ دا خەرج كرد.

الماصِـلُ: (لـبن ماصِـلٌ): شـیری كـەم ٥ دەگـوترێ: (اعطـى عطـاءً ماصِـلاً): بەخششی كەمی پێدا.

المُـصَالة: ئـەوەی لەكەشـكی كـولاوی گوشـراو دەچـۆڕێتەوە ٥ ئـەو دڵۆپـە ئاوانەی لەكوپەو گۆزە دەتكێ.

المَـصْلُ: (مَـصْلُ الـدم): زەرداوێـكە لـەخوێن جیادەبێتـەوە لـەكاتی خەستبوونەوەی دا.

المِمْصَلُ: كەسێـك مـاڵو سامانی خـۆی لەشتی بێهودە دا خەرج بكا.

مَصْمَصَ فـاه: ئـاوی لـەدەمی وەردا یـان بەسـەری زوبـانی نـاو دەمـی خـۆی پاك كردەوە.

مَصْمَصَ الإناءَ: ئاوی كردە ناو قاپەكەو رایوەشاند بۆئەوەی پاكی بكاتەوە.

المُـصَامِصُ: پاڵفتـەو هەڵبـژێراوی هەرشتێـك ٥ دەگوترێ: (انه لمصامِصٌ في قومه): ئـەو لـەناو نەتەوەكـەی دا هەڵبژێردەیە، وەجاخزادەیە ٥ (فرس مُـصَامِصٌ): ئەسپێـكی تێكـسمڕاو دەستو مەچەك ئەستورە ٥ ولاخـە

بەرزەیەکی ڕەختەو دامەزراوە.

**مَضَحَت الدوابُ مَضْحاً:** وڵاخەکان بڵاو بوونەوە.

**مَـضَحَت الـشمسُ:** خـۆر تیشکی بـڵاو بووە بەسەر زەوی دا.

**مَـضَحَت المـزادةُ:** کوندەکـە، مەشـکەکە ئاوی لـێ چوو.

**مَضَحَ عنه:** داکۆکی لێکرد ٥ (مَضَحَ عِـرض فلان): تانەی لەناموسی فلان دا.

**مَـضَرَ النبيـذ أو اللـبنُ مَـضْراً ومُـضُوراً:** سرکەکە یان ماستەکە تـرش بـوو مـزر بوو کەفی هەڵدا.

**مَـــضَرُ:** پـاڵ هـۆزی مـوضـــەری دا بەیەکێك لەو هـۆزەی لەقەڵەم دا ٥ دەشـکوترێ: (مَـضَرَ اللهُ لـك الثنـاءَ): خودا وەصفو ئەنای بـۆ تـۆ دەسـتە بەرکرد.

**تَمَـضَّرَ:** خـۆی کـرد بەیەکێـك لەهـۆزی مـــوضـــەر، یـــان دەمـــارگیریو تەعەصـوبی بۆیـان هـەبوو ٥ یـان خـۆی وەك ئەوان نیشان داو هەڵسو کەوتی ئەوانی ڕەچاوکرد.

**تَمَضَّرَت الماشيةُ:** ئاژەڵەکان قەڵەوبوون.

**المُـضَارَةُ مـن اللـبن:** ئـەو ئـاوە شـینەی لەشیر دەڕوا لەکاتی ترشبوونی دا.

**المَضِرُ:** ترش ٥ دەشکوترێ: (ذَهَـبَ دمـه خِـضراً مَـضِراً): بەگـەنجی خـوێنی بەفیڕۆ چوو.

**المَضِيرةُ:** جۆرە خواردنێکە گۆشت لەناو دۆ دا یان لـەناو شـیردا دەکوڵێنـدرێ تاشـــیرەکە خەســـت دەبێتـــەوەو گۆشتەکەش دەکوڵێ.

**مَـــضَّهُ مَــضّاً ومضيــضاً:** ئـازاری دا ٥ دەگوترێ: (مَضَّهُ الجرحُ).

**مَـضَّ الخـلُّ فَمَـهُ:** سـرکەکە ئازاری بـەناو دەمی گەیاند.

**مَـضَّ الـشَّيْئ فلانـاً:** شـتەکە ئـازاری دڵـی فلانکەسی دا ٥ دەشکوترێ: (مَـضَّهُ الهـمُّ والحزن والقول).

**مَـضَّ فـلان مَضَـضاً ومـضاضة ومضيـضاً:** بەهۆی ئازاری بەڵاو موصیبەتەکە زۆر ناڕەحەت بوو.

**مَضَّ له:** ئازاری پێگەیی.

**أمَـضَّهُ الـشَّيْئ:** بـەمانا (مَـضَّهُ) دێ ٥ دەگـوترێ: (أمَـضَّهُ جلـده فَدَلکَـهُ) پێستی خوراو خوراندی.

**ماضَّهُ مِضَاضاً:** پێکێشی لێـکرد، زۆری لەگەڵ گوت.

**مَضْمَضَ فلان:** فلانکـەس شـتی پوختـەو پاڵفتەکراوی خواردەوە.

**تَمَــاضَّ القــومُ:** خەڵکەکـە کێـشەیان تێکەوت.

**المُضَاضُ:** پاڵفتە، هەڵبـژاردەو ڕەسـەن ٥ دەگوترێ: (فلان من مُـضاض قومـه):

فلانكەس لەوەجاخزادەكانی نەتەوەكەیەتی ٥ ئاوێك زۆر سوێر بێ ٥ ئازارێكە توشی چاوی مرۆڤ دەبێو حەجمینی لێهەڵدەگرێ.

**المَضُّ**: ئازاری زۆر تیژ خەفەتو بەڵای زۆر بەئازار.

**مِضُّ (مِضٌّ)**: وشەیەكە مانای ئازاری نەبوون دەگەیەنێ بەڵام هیوا بڕاویشی ناكا.

**المَضَضُ**: دۆی ترش، شیری ترشاو ٥ ئازارو ئێش ٥ دەگوترێ: (فعلت هذا علی مضض): ئەوەم كرد بەپێناخۆشبونەوە.

**المَضَّةُ**: (ألبان مَضّة): شیری ترشاو دۆی ترشاو ٥ (إمرأة مَضَّةٌ): ئافرەتێكە خۆ بۆ ناخۆشی راناگرێ ٥ كەم چكڵدانەیە، زوو توڕەدەبێ.

**مَضَغَ الطعامَ وغيره مَضْغاً**: بەددانی خواردنو شتەكەی جوی ٥ دەگوترێ: (يَمْضَغُ الشيحَ والقيصومُ): گیاو گژ دەجوێ لەهیچ ناپرینگێتەوە ٥ دەشگوترێ: (هو يمضغ لحمَ أخيه): غەیبەتی براكەی دەكا.

**أمْضَغَ التَمْرُ**: خورماكە كاتی ئەوەی هاتووە بجورێ.

**أمْضَغَ اللحمُ**: گۆشتەكە كوڵاوە برژاوە بەكەڵكی ئەوە دێ بخورێ.

**أمْضَغَ فلاناً الشَّيْئ**: شتەكەی بۆ فلانكەس جو.

**أمْضَغَهُ في القتال**: باش لەگەڵی جەنگا، شەڕی باشی لەگەڵ كرد ٥ دەگوترێ: (ماضَغَهُ القتال والخصومة): درێژەی دا بەشەڕو كێشە لەگەڵی دا.

**مَضَّغَهُ الشَّيْئ**: بەمانا (أمْضَغَهُ)دێ.

**الماضِغُ**: لای خواروی شەویلە، شوێنی لێڕوانی كاكیلەو خرێ.

**الماضِغَةُ**: بەمانا (الماضِغُ)دێ ٥ (ك: مواضِغ).

**المَواضِغُ**: ددانی كاكیلەو خرێ.

**المَضاغُ**: هەرشتێك بجورێ ٥ دەگوترێ: (ماذقت مَضاغاً): هەرچی بجورێ نەم چەشتووە ٥ هەروا بەمانا خودی جوینیش دێ ٥ دەشگوترێ: (لقمة لينة المضاغ): پاروێكە بەخۆشی دەجورێ ددانی پێویست نییە.

**المُضاغَةُ**: ئەوەی بجورێ ٥ پاشماوەی پاروی جوراو لەناو دەم دا.

**المُضّاغة**: گێلو نەحمەق.

**المَضِغُ**: خورادنێك پێگەیشتبێ، كاتی جوینی هاتبێ ٥ دەگوترێ: (كَلأٌ مَضِغٌ): لەوەڕێكە ئاژەڵ دەیخوا.

**المُضْغَةُ**: پارچەیەك لەگۆشتو شتی وا لەدەم دا جێگای بێتەوەو بجورێ ٥

هەروا ناوە بۆ برینێك پارەو بارتەقای خوێنی بۆ دیاری نەكرابێ.

**المضيغة:** بنكی كاكیلەو خرێ پوك كەددانی خرێی لەسەر ڕوابێ ٥ هەرگۆشتێك لەسەر ئێسقان بێ ٥ لاشەویلە ٥ ماسولكە.

**مَضْمَضَ النعاسُ في عينه:** وەنەوز چووە ناو چاوی.

**مَضْمَضَ فلاناً:** فلاّنكەس بۆماوەیەكی درێژ نووست ٥ دەگوترێ: (ما مَضْمَضْتُ عيني بنوم): چاوم نەچووە خەو ٥ نەنوستم.

**مَضْمَضَ الماءُ في فمه:** ئاوی لەدەم وەردا.

**مَضْمَضَ الإناءَ:** قاپەكەی شت.

**تَمَضْمَضَ بالماء في فيه:** ئاوی لەدەم وەردا.

**تَمَضْمَضَ النعاسُ في عينه:** وەنەوز چووە چاوی خەونوچكەی كرد.

**تَمَضْمَضَ الكلبُ في أثره:** سەگەكە بەشوێنی دا وەڕی.

**المِضْمَاضُ:** پیاوی گورج و گۆڵو قوچاخ ٥ نووستن ٥ چوزانەوە، سوتانەوە.

**مَضَى الشَيْئُ مُضِيّاً:** ڕۆیشت.

**مَضَى على الأمر وفيه:** كارەكەی ئەنجام دا.

**مَضَى فلان سبيله وبسبيله:** فلاّنكەس مرد.

**مَضَى فلان السيفُ مَضاءً:** شمشێرەكە تیژ بووە، خێرا پڕبوو ٥ دەگوترێ: (هو أمضى من السيف): لە شمشێر بڕندە تر بوو.

**مَضَى على البيع:** كڕین و فرۆشتنەكەی ئەنجام دا.

**أمْضَى الحكم والأمْرَ:** حوكم بڕیارەكەی جێ بەجێ كرد.

**أمْضَى البيعُ:** فرۆشتنەكەی ڕۆیاندو ڕازی بوو.

**مَضَّى الأمْرَ:** ئیشەكەی ڕۆیاند.

**تَمَضَّى الرجلُ:** پیاوەكە چووە پێش.

**تَمَضَّى الأمْرُ:** كارەكە جێ بەجێ بوو.

**الماضي:** زەمانی ڕابردوو ٥ شمشێری بڕندە ٥ (ك: مواطن).

**المَضَوَاءُ:** پێشكەوتن ٥ بەرەو پێشەوە چون ٥ دەگوترێ: (مَضَى على مضوائه).

**مَطَحَهُ مَطْحاً:** بەدەست لێی دا.

**امْتَطَحَ الوادي:** ئاوی شیوەكە بەرز بۆوە، ئاوەكەی زۆر بوو.

**تَمَطَّحَ الوادي:** بەمانا (إمْتَطَحَ)دێ.

**مَطَخَ فلان مَطْخاً:** فلاّنكەس زۆری خوارد.

**مَطَخَ الشَيْئَ:** شتەكەی لستەوە ٥ دەگوترێ: (مَطَخَ العَسَلَ): هەنگوینەكەی لستەوە.

**مَطَخَ الرجلُ بيده:** بەدەستی لەپیاوەكەی دا.

مَطَخَ عَرضَهُ: حەیاو ناموسی لەکەدار کرد.

مَطَخَ بالـدَّلْوِ: دۆڵچەکەی هەڵکێشایەوە، رایتەکاند.

الماطِخُ: ئەسپێك نەرم بڕوا.

المطّاخُ: گێلو ئەحمەق ٥ خۆبەزلزان ٥ دەم پیسو چەقەچەناو.

مَطَرَت السماءُ مَطْراً ومَطَراً: ئاسمان بارانی باراند ٥ دەگوترێ: (مَطَرَت السماءُ القومَ): ئاسمان بارانی لەقەومەکە باراند ٥ دەشگوترێ: (لا أدري من مَطَرَبه): نازانم کێ بردی ٥ (مَطَرَنی بِخَیرٍ): خێرو بەرەکەتی بەسەردا ڕشتم.

مَطَرَ الفَرَسُ مَطْراً ومطوراً: ئەسپەکە خێرا رۆیی، خێرا بازی دا.

أَمْطَرت السماءُ: ئاسمان بارانی لێباری ٥ بارانی ئاسمان هاتە خوار ٥ (أمطر السحب أو السماءُ القومَ): هەور یان ئاسمان بارانی لەخەڵکەکە باراند.

أَمْطَر فلان: فلانکەس کەوتە بەرباران ٥ ناوچاوانی عارەقی لێتکا.

أَمْطَرَ المكانَ: شوێنەکەی وادی بارانی لێباری بوو.

تَماطَرَ السَّحَابُ: هەورەکە تاوێك بارانی باراندو تاوێك وەستایەوە.

تَماطَرَ فلان: فلانکەس ناوچاوانی عارەقی کرد.

تَمَطَّرَ الطيرُ: باڵندەکە بەگوڕجی خۆی دا هێشتە سەر زەوی.

تَمَطَّرَ به فَرَسُهُ: ئەسپەکەی چاك هەڵی گرت ٥ باش فڕاندی ٥ خستیە بەرباران، وای لێکرد تەرزەی لێبدا ٥ خۆی لەپاشە باران پاراست ٥ دوعای کرد باران ببارێ ٥ دەگوترێ: (خرجوا يتمطرون الله): چوونە دەری شار بۆ نوێژە بارانە.

تَمَطَّرَ الخيلُ: ئەسپەکە بەخێرایی هاتو چوو.

اسْتَمْطَرَ المكانُ او الزرعُ: شوێنەکە یان کشتوکاڵەکە پێویستی بەباران بوو.

اسْتَمْطَرَ فلان: فلانکەس لەخودا پاڕایەوە باران ببارێنێ ٥ دەگوترێ: (خرجوا يستمطرون الله).

اسْتَمْطَرَ للسياط: خۆی ڕاگرت بۆ قامچی لێدان.

اسْتَمْطَرَ الثوبَ: لەباران دا قوماشەکەی لەبەرکرد.

اسْتَمْطَرَ فلاناً: داوای بەخششی لەفلانکەس کرد.

الماطِرُ: (يوم ماطِر): ڕۆژێکی باراناوییە.

المُسْتَمْطَرُ: شوێنی بەدەرو دیارو ئاشکرا ٥ دەگوترێ: (نزل فلان بالمستمطر): فلانکەس چووە سەر تەپۆڵکەو بەرزایی.

المَطار من الآبار: بیری دەم پانو فراوان.

**المَطَارَةُ من الآبار:** بەمانا (المَطَار)دێ.

**المَطَرُ:** باران.

**المَطِرُ:** (يوم مَطِرٌ): ڕۆژێـکی باراناوییە.

**المُطْرُ:** دابو نەریت ٥ گوڵە زوڕات.

**المِطْـــران:** مـــەترانی مەسـیحییەکان ٥ پلەیەکـە لـەژوور ئوسـقوفو خـوار بەطریکەوەیە.

**المَطْـــرَةُ:** تاوەبـــاران ٥ دابو نـــەریت ٥ دەگوترێ: (ان تلك من فلان مَطْـرَةٍ): ئەوە دابو نەریتی فلانـەو وا خـوی پێوە گرتووە.

**المَطِـــرَةُ:** دابو نـــەریت ٥ دەشـــگوترێ: (إمرأة مَطِـرَة): ئافرەتێـکە هەمیشە سـیواك دەکـاو خۆپـاكو خـاوێن رادەگرێ.

**المَطَرَةُ:** کوندە ٥ ناوەڕاستی حەوز.

**المَطرِيَّـــةُ:** چـەتر هەرشتێـــك بـــاران بگێڕێتەوە.

**المَطِيرُ:** باراناوی ٥ دەگوترێ: (يوم مَطِيرٌ): هەروا دەگوترێ: (واد مَطِرٌ).

**المِمْطَارُ:** (سماء مِمْطـار): ئاسمانـی بـاران بارێن بەتاوو ڕێژنە.

**المِمْطَـرُ:** قوماشێـکە ئـاو دانـادا وەکـوو باڵتوو قەمصەڵە لەکاتی باران بارین دا لەبەردەکرێ.

**المِمْطَرَةُ:** بەمانا (المِمْطَرُ)دێ.

**المَمْطُـورُ:** (رجـل ممطـور): پیاوێـکە زۆر سیواك دەکا ٥ بۆنی دەمی خۆشە.

**مَـطَّ الـشَّيْءَ مَطّـاً:** شتەکەی درێـژکردەوە لێکی کێشایەوە.

**مَطَّ خَطَّهُ:** خەتەکەی درێژ کردەوە.

**مَطَّ خَطْوَهُ:** هەنگاوی درێژکردنەوە.

**مَـــــطَّ بهـــم في الـــسير:** درێـــزەی بەڕۆیـــشتنەکەیان دا ٥ دەشـــگوترێ: (تكلَّمَ فَمَطَّ حاجبيه): قسەی کردو برۆی کردنـــەوە بـــرۆی لێقرینجانـــدو خـــۆی بـەزل زانـی ٥ (مَـطَّ أصـابِعَهُ) ٥ لـەکاتی قسەکردن دا پەنجەی راداشت.

**تَمَطَّــطَ في الكـــلام:** قـــسەکەی درێـــژ کردەوە.

**المَطَّاطُ:** شیری ترشاوی حوشتر.

**المَطَّاط:** مادەیەکی لاستیکییە دەکشێو لەبناغــــەدا گوشـــراوی درەختـــی مەطاطەکە پێی دەگوترێ درەختـی (سمغونیە) یان (هافارییە) ٥ (شـجر المطّاط): درەختێکە لەهەرێمە خـۆر هەڵاتیـــــــەکانو دورگـــــــە خۆرهەڵاتییـــەکانی هیندوســـتان دەڕوێ.

**المُطَيْطَاءُ:** خۆبادانو لارو لەنجە کردن ٥ دەست ڕاوەشاندن لەڕۆیشتن دا.

**المَطيطـة:** ئـاوی لـێڵو تێـکەڵ بەلیتـەو لینجەوە بوو، شل.

**مَطَعَ في الأرض مَطْعـاً ومُطوعـاً:** ڕۆیـشتو

ڕێگای لێگوم بوو.

**مَطَعَ الشَّيْئَ:** شتەکەی بەددانی پێشەوەی خوارد.

**تَمَطَّقَ فلان:** فلانکەس لێوی سەریەك نان بەزوبانی دەنگێکی لەدەمی خۆی هێنا ئامازە بەتام خۆشی شتەکە.

**تَمَطَّقَ القوسُ:** قەوسەکە قەلشتی برد.

**تَمَطَّقَ الطعامَ:** تامی خۆراکەکەی کرد.

**المَطْقَةُ:** دەگوترێ: (تمر لە مَطْقَة): خورمایە کە شیرینییەکەی والەو کەسەدەکا کە دەیمژێ مڵچە مڵچی بێ.

**مَطَلَ الحَبْلَ ونحوه مَطلاً:** حەبلەکەی درێژ کردەوە.

**مَطَلَ الحديدَ:** ئاسنەکەی کوتا بۆئەوەی درێژ بێ.

**مَطَلَ فلاناً حَقَّهُ وبِحقه:** مۆڵەتی دا بەفلان کە قەرزەکەی دوابخا جار دواجار دواخستنی قەرزی بۆتازە کردەوە ○ (فهو مطول ومطالٌ).

**ماطَلَهُ بحقه مِطالاً ومماطلةً:** مۆڵەتی دا.

**إمْتَطَلَ النباتُ:** ڕوەکەکە تێکهاڵاو چووە ناوخۆوە.

**إمْتَطَلَ فلاناً حَقَّهُ:** مافی فلانکەسی دواخست.

**المِطالَةُ:** پیشەی شیرگەری، واتە کەسێك ئاسنێك بەرهەم بێنێ کەشیری لێدروست دەکرێ.

**المِطَلُ:** دزو جەردە.

**مَطْمَطَ:** بەهێواشی خەتی نووسین ○ یان بەهێواشی قسەی کردن ○ دەگوترێ: (مَطْمَطَ في کلامه): قسەکەی درێژ کردەوە.

**مَطَا مَطْواً:** لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد ○ دەگوترێ: (مطا بالقوم): ڕۆیشتنەکەی بەخەڵکەکە درێژ کردەوە ○ لەگەڵ دۆستەکەی دا سەفەری کرد ○ چاوی هەڵێنا.

**أمْطى الدابَّةَ:** وڵاخەکەی کردە وڵاخی سواریی سواری بوو.

**تَمَطَّى النهارُ وغيره:** ڕۆژگار درێژ بوونەوە ○ دەگوترێ: (تَمَطَّى بهم السَّفَرُ وتَمَطَّى بك العهدُ).

**تَمَطَّى في مشيته:** لەڕۆیشتن دا لارو لەنجەی کرد ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ذَهَبَ إِلَى أَهْلِهِ يَتَمَطَّى﴾.

**الأُمْطِيُّ:** قەدو باڵا ڕاستو ڕێك ○ باڵا بەرز ○ جەوی‌و صمغێکە درەخت دەری دەداو دەخورێ.

**المَطا:** پشت ○ (ك: امطاء) ○ (المَطْوُ): لقەدارخورماو شتی وایە دەکرێتە دوو تلیش‌و باقە گیاو شتی وای پێ دەبەسترێ.

**المِطْــوُ:** پــرژو لقــی دارخورمــا ٥ دەق بەمانا (المَطْوُ)دێ ٥ هاوشانو هاوەڵو بەرامبەر ٥ گوڵی دانەوێڵەی زوڕات ٥ (ك: أمْطاء).

**المُطواءُ:** درێژی، بەرزی.

**المَطْــوَةُ مــن الليــل:** ساتێــك لەشــەو ٥ دەگوترێ: (مَضَتْ مَطْوَةٌ من الليل).

**المَطِيَّــةُ مــن الــدواب:** وڵاخــی ســواریی ٥ (ك: مطايا ومَطِيّ).

**مَظَّهُ مَظّاً:** لۆمەی کرد.

**أمَظَّهُ:** جنێوی پێدا.

**مَاظَّهُ:** کێشەی لەگەڵ دا کردو جوێنی پێدا.

**مَــاظَّ الخَــصْمَ:** دەســتی لەدوژمنەکــەی گیربوو وازی لێنەهێنا.

**تَمَــاظُّوا:** جۆینیــان بەیــەکتر دا ٥ شــەڕە جوێنیان کرد.

**المَظَاظَةُ:** توندو تۆڵی دروستکراو.

**مَظَّعَ الوَتَرَ وغيره:** ژێیەکەی وشك کردەوە دەستی پێداهێنا بۆئەوەی لوسو پوس ببێ.

**مَظَعَ الوَتَرَ وغيره:** بەمانا (مَظَعَهُ)دێ.

**مَظَّعَ الخَشَبَةَ:** دارەکەی بەتەڕی بڕیو ئەمجار لەبەر هەتاو داینا تا بە توێکڵەوە وشك بوو بۆئەوەی درزو قەڵشت نەبا.

**مَظَّعَ الإهَابَ:** چەرمەکەی چەور کرد بۆئەوەی چەورییەکە هەڵمژێ.

**تَمَظَّــعَ في الرعــي:** لــە لــەوەڕ خــواردن دواکەوت.

**تَمَظَّــعَ مــا عنــدنا:** چــی لامــان هــەبوو هەمووی خوارد.

**تَمَظَّعَ الظِّــلُّ:** شــوێن ســێبەرەکە کــەوت لەم شوێن بۆ ئەو شوێن.

**المُظعَةُ:** پاشماوەی لەوەڕ.

**مَعَ:** وشەیەکە بەمانا (لەگەڵ) دێ.

**مَعَجَ مَعْجاً:** پەلەی کرد ٥ دەگوترێ: (مَعَجَ السيلُ): لافاوەکە بەخوڕڕەم هاتو تیژ تێپەڕی.

**مَعَــجَ الفَــرَسُ ونحــوه:** ئەســپەکە غــاری دا، بــەهۆی خێــرا ڕۆیــشتنو تیژڕەوییــەوە دەمێــك لەســەر لای ڕاســتو دەمێــك لەسەر لای چەپی دەخزێ ٥ دەگوترێ: (الريحُ تَمْعُجُ بالنبات): بایەکە گیاو گژو دەغڵو دانەکــەی ئەمــدیوو ئــەو دیــو دەکرد.

**مَعَــجَ بــالقَلَمِ في الــدواة:** نوچــەکەی لــەناو مەرەکەبەکــەدا هێنــاو بــرد بۆئــەوەی باش مەرەکەبی تێوە بچێ.

**مَعَــجَ الفــصيلُ ضــرع أمِّــهِ:** بێــچوەکە ئەمــدیواو دیــوی بــەگوانی دایکەکــەی کرد بۆئەوەی چاك بۆی بمژێ.

**تَمَعَّــجَ الــسيلُ في جريتــه:** لافاوەکــە لەڕۆیشتنی دا مارو دوویی، قۆرتو

پێچی کرد ◊ دەشگوترێ: (تَمَعَّجَت الحَيـــةُ في إنـــسيابها): مارەکـــە لەڕۆیشتنی دا قۆرتو پێچی کرد.

المَعْجَة: هەڕەتی گەنجی.

المِمْعَجُ: (فرس مِمْعَجٌ): ئەسپێکی خێراو خۆشڕۆیە.

مَعَدَ الشَّيْءَ مَعْداً: شتەکە فەوتا ◊ گەندەڵ بوو.

مَعَدَ في الأرض مَعْداً ومُعُـوداً: بـەناو زەوی دا ڕۆیی.

مَعَدَ فلاناً مَعْداً: گەدەی هەنگاوت، زەبـری لەمەعیدەی دا.

مَعَـــدَ الـــشَّيْءَ: شـتەکەی دزی، ڕفانـدی، فڕانـــدی ◊ بەتونـــدی ڕایتەکانـــد ◊ دەگـوترێ: (مَعَــدَ الـرمحَ): ڕمیەکـەی بـەگورجی لـەکالانی خـۆی دەرهێنـا ◊ (مَعَــدَ الـدَّلْوَ): دۆڵـچەکەی ڕاتەکانــدو لەناو بیرەکە دەری هێنا.

مُعِدَ فـلان: فلانکـەس مەعیـدەی تێـکچو، خواردنی هەزم نەکرد.

إمْتَعَدَ الشَّيْءَ: شتەکەی ڕاتەکاند، دەری هێنـا، فڕانـدی ◊ دەگـوترێ: (امْتَعَـدَ الرمْحَ وامتَعَدَ الدَّلْوَ وامْتَعَدَ سـيفَه مـن غِمده).

المتَعَمِّـدة مــن الرطــب: خورمـای تـەڕو تازە.

المَعْـدُ: میـوەی تـازە ◊ پۆڵکـەو پاقلـەو فاسۆلیا کەتەڕو تازەبن.

المَعِــدَةُ: مەعیــدە، گــەدە ◊ شــوێنی کۆبونەوەی خواردن دوای قوتدانیو چوونە خوارەوەی لەگەرو.

المِعْدَة: بەمانا (المَعِدَةُ)دێ.

المَعْدُ: سك، لاکەلەکەو تەنیشت ◊ ئـەو شــوێنەی پاژنـــە پێـــی ســواری لـێ دەدرێ کەســـــواری ولاخ دەبـــــێو هەلینگی دەدا.

مَعَدٌّ: خێڵێکی عەرەبە.

تَمَعْدَدَ المهزولُ: کزو لاوازەکە وردە وردە خەریکە قەڵەو ببێ.

تَمَعْـدَدَ الـصَّبِيُّ: منداڵەکـە گـەورە بـوو ناسکیو شلکی منداڵی لێڕۆیی.

تَمَعْـدَدَ فـلان: فلانکـەس خـۆی کـرد بەیەکێك لەهۆزی مەعەدد.

تَمَعْدَدَ القومُ: خەڵکەکە خۆیان شوبهاند بەهۆزی (مەعەدد) خۆیان والێـکرد وەکوو هۆزی (معدّ) فێری ژیانی زبر بن.

تَمَعْدَدَ المريضُ: نەخۆشەکە چاکبۆوە.

مَعِرَ الشَّعْرُ والريش: موو پەڕو پۆڵو شتی وا تـەنك بـوو، کـەم بـوو ◊ دەگـوترێ: (مَعِرَ الرأسُ) ◊ (فهو أمْعَرُ).

مَعِرَت الناصية: پیشەسەری موی پێوە نەمانو ڕوتایەوە.

مَعِـــرَ فـــلان: فلانکـەس تێـشوی نـەما ◊

دەگوترێ: (مَعِرَ من مالـه): مـالی نـەماو هەژار کەوت.

امْعَـرَ الـشَّعْرُ أو الـريش: مـوو پـەڕی ئـاژەڵو پەلـەوەرەکان کـەم بـوو ◊ دەگوترێ: (أمْعَرَ الحيـوانُ): ئاژەڵەکە موی پێومنەما ◊ کوڵکی لێڕوتایەوە.

أمْعَـرَت الأرضُ: زەوی ڕوتایـەوە بـوو بەسوتەمەڕۆ.

أمْعَرَ القـومُ: خەڵکەکە کەوتنـە قـاتو قڕیو گرانییەوە.

أمْعَرَ فـلان: فلانکـەس هـەژار کـەوت ◊ تێشوی کەم بـوو ◊ دەگـوترێ: (أمْعَرَ فلاناً): فلانکەسی ڕوت کـردو مـاڵو سامانی لێستاندو هەژاری کرد.

أمْعَـرَتْ المواشـي الأرضَ: ئاژەڵـەکان زەوییەکـەیان ڕوت کـرد هەرچـی گـژوگیای تێـدا بـوو هـەموویان خوارد.

مَعَّرَ فلان: بەمانا (أمْعَرَ) دێ.

مَعَّـرَ وجْهَـهُ: دەمو چـاوی گـرژو مـۆن کردنو ڕقی هەڵسا.

تَمَعَّـرَ شَـعْرُهُ: قـژی هـەڵوەرین ◊ دەشـگوترێ: (تَمَعَّـرَ رأسَـهُ): سـەری ڕوتایەوە.

تَمَعَّـرَ وجْهَـهُ أو لونـه: دەمو چـاوی یـان ڕەنگی گۆڕاو زەرد هەڵگەڕا.

المَعِرُ: پیاوی ڕژدو چروکی بێ خێر.

مَعَـزَ الراعـي المَعْـزَ مَعْـزاً: فلانکـەس بزنەکانی زۆر بوون.

مَعِزَ المكـانُ: شوێنەکە پتـەو بـوو ◊ (فهـو أمْعَزُ وهي مَعْزاء).

أمْعَـزَ القـومُ: خەڵکەکـە بزنیـان زۆر بوون.

اسْتَمْعَزَ في أمره أو رأيـه: لەسـەر ئیشی خـۆی سـور بـوو ◊ ڕای خـۆی پێپەسەند بوو.

الأمْعَزُ: زەوی ڕەقەڵانی بەرداوی.

الأُمْعُوزُ: بزن ◊ ڕەوە ئاسك نێوان سی تاچل.

الماعِزُ: بزن ◊ چ نێر چ مێ ◊ (ك: مواعز ومِعاز) ◊ پیـاوی ئـازاو لێزان لـەکارو باری خۆی دا.

المَعْـزُ: بزنـە مـو، بزنـە مـەرەز ◊ پێچەوانەی مەڕ.

المِعِـزيّ والمِعْـزيّ: چـروكو ڕژد کەهەرسـامان کۆدەکاتـەوەو لێـی نابەخشێ.

المعّاز: خاوەن بزن (شوانی بزنە گەل).

مَعَسَ الـشَّيْئَ مَعْساً: شتەکەی شێلا، هـەنوی دەسـتی پێـداهێنا ◊ دەشگوترێ: (مَعَسَ الأديمَ في الدباغ): لەدەباغکردن دا دەستی بەپێستەکە داهێنا بۆنەوەی چرچو لۆچی تێدا نەمێنن.

مَعَسَ في الحرب: لەشەڕدا هەڵمەتی برد.

مَعَسَ فلاناً: بەڕمب لێی دا.

مَعِصَ فلان مَعَصاً: خواریو نارێکو پێکی لەجومزگەی یان شادەماری قاچی دا پەیدا بوو ٥ خرخاڵی لەقاچی کرد ٥ لەئاکامی زۆر رۆیشتنەوە قاچی ئازاری بوو دەگوترێ: (مَعِصَتْ قدمُهُ فهو أمْعَصَ وهي مَعْصاء).

المَعْصُ: ئازارێکە لەشادەماری قاچ دا پەیدا دەبێ بەهۆی زۆر رۆیشتنەوە.

مَعِضَ من الأمر مَعْضاً: لەکارەکە تورە بوو رقی هەڵسا ٥ ئازاری پێگەیی.

أمْعَضَهُ الأمْرُ: کارەکە رقی هەڵساند، تورەی کرد.

أمْعَضَ فلان الشَّيْءَ: فلانکس شتەکەی سوتاند.

إمْتَعَضَ من الأمر: بەمانا (مَعِضَ)دێ.

مَعَطَ في القوس مَعْطاً: دەستی لەکەوانە کێشا.

مَعَطَت المرأة بولدها: ئافرەتەکە منداڵەکەی فرێ دا.

مَعَطَ الشَّيْءَ: شتەکەی درێژ کردەوە.

مَعَطَ فلاناً بحقه: حەقی فلانکەسی دواخست.

مَعَطَ السيف: شمشێرەکەی دەرکێشا، روتی کرد.

مَعَطَ الشَّعْرَ والصوفَ: موو خوریەکەی رنیەوە هەڵی کەند ٥ تالێکیشی کرد.

مَعِطَ مَعَطاً: جەستەی توکی پێوە نەبوو (کۆسە بوو).

مَعِطَ اللصّ: دزەکە هیچی پێ نەبوو ٥ (فهو أمْعَطَ وهي مَعْطاء).

امْتَعَطَ الشَّعْرُ: قژی هەڵوەرین بەهۆی نەخۆشیو شتی واوە.

امْتَعَطَ النهارُ: خۆر بەرزبووە.

امَّعَطَ الشَّعْرُ: بەمانا (إمْتَعَطَ)دێ.

إمَّعَطَ الحَبْلُ وغيره: حەبلەکە گشتو درێژ بوو.

تَمَعَّطَ الشَّعْرُ: بەمانا (امْتَعَطَ)دێ.

تَمَعَّطَ الفَرَسُ في عَدْوِهِ: ئەسپەکە لەبازدان دا دەستی هاویشتنو پاشوی گرتنەوە.

تَمَعَّطَ فلان: فلانکەس ناڕازیی بوو، رقی هەڵسا.

الأمْعَطُ: لەبەلان کەهیچی لێنەڕوێ ٥ (المُمَعِّطُ): زۆر درێژ.

مَعَّ الشَّحْمُ: بەزەکە توایەوە.

مَعَقَ فلان مَعْقاً: فلانکەس ڕەوشتی ناشیرین بوو.

مَعَقَ الشراب: خێرا شەرابەکەی خواردەوە.

مَعَقَ السيلُ الأرضَ: لافاوەکە زەویەکەی رادا.

مَعُقَ النَّهْرُ: چۆمەکە قووڵە.

مُعِق: گەدەی ترشا، مەعیدەی شێوا ◦ (فهو مَعوق).
أمْعَقَ البِئرُ: بیرەکەی قوڵ کرد.
تَعَمَّقَتِ البِئرُ: بیرەکە قوڵ بوو ◦ (تَعَمَّقَ علینا): رەوشتی ناشیرین بوو.
المَعْــقُ: زەوی بــێ گیــاو گــژ ◦ زەوی سوتەمەڕۆ.
مَعَكَ الأديمَ ونحوه في التراب: بەزەختو هێز پێستەکەی لەگڵو خۆڵ وەردا.
مَعَـكَ فلانــاً بــالحرب والقتــال: فلانکەسی بەشەڕو کێشە هێنایە ژێر بار.
مَعَكَ فلاناً دينه وبدينه: قەرزی فلانکەسی دواخست ◦ وەغراندیو لەکاتی خۆی دا نەیدایەوە.
مَعَكَ معاكةً: ئەحمەق بوو.
ماعَكَـهُ بدينــه: قەرزەکەی وەغرانــد، دوای خست.
مَعَـــكَ الدابَّــةَ: وڵاخەکــەی لــەخۆڵ دا گەوزاند.
تَمَعَّـــكَ: خـــۆی گەوزانـــد لـــەناو خۆڵەپەتەدا.
المِعِكُ: توندو تیژو رق ئەستور.
المَعْكَوْكــــاءُ: دەگــوترێ: (وقعـــوا في معكوكاءَ): کەوتنە ناو تەپو تۆزی بگرەو بەردەی شەڕو هەرادا.
المِمْعَــكُ: قــەرز دواخــەر ◦ کەسێـــك قەرزدانەوە بووە غرێنی.

مَعَلَ الرجلُ مَعْلاً: پیاوەکە پەلەی کرد لەڕۆیشتن دا.
مَعَلَ فلاناً عَنْ حاجته: فلانکەسی ناڕەحەت کردو وەڕزی کرد.
مَعَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی رفاند ◦ یان دزی.
مَعَلَ الخَشَبَةَ: دارەکەی شەق کرد.
مَعَلَ الحمارَ: گونی گوێدرێژەکەی دەرهێنا.
أمْعَلَهُ عَنْ حاجته: پەلەی لەکابرا کردو ئیزعاجی کرد.
إمْتَعَلَ فلان: فلانکەس بەدزی زەبری وەشاندو چوستو چالاك بوو.
المَعْـلُ: دەگـوترێ: (مالــك منــه مَعْـلٌ): چارت ناچارەو دەبێ ئەوە ڕەچاو بکەی.
المِعِلُّ: بەپەلە ◦ (غلام مَعِلٌّ): منداڵێکی چوستو چالاکە.
مَعْمَــعَ فــلان: فلانکــەس ڕاڕا بـــوو، هەردەمە ڕایەکی دەربڕی.
مَعْمَعَ القومُ: خەڵکەکە شەڕی باشیان کــرد ◦ دەگـــوترێ: (ســـاروا في المَعْمَعَـــان): لەجەنگــەی گــەرمادا رۆییشتن.
مَعْمَعَــتِ الســماءُ المطــرَ علــى الأرض: ئاسمــان بەرێژنــە بــارانی بارانــدو زەوی خاوێن کردەوە.
المَعَــامِعُ: شــەڕو فیتنــەو ئاشــوبو کــێ بڕکێــی حیزبایــەتیو دەمــارگیری.

**المَعْمَعُ**: (إمْرَأةٌ مَعْمَعٌ): ئافرەتێکە رژدو چروکەو هیچ نابەخشێ ٥ ئافرەتی زیرەك و وریا ٥ دەشگوترێ: (هو ذو مَعْمَـــع): ئـەو خـاوەن صـەبرو بارقوڵییــە لەســەر بـەڕێوەبردنی کارەکانی.

**المَعْمَعَانُ**: جەنگەی گەرما ٥ دەگوترێ: (یـوم معمعـان): رۆژێـکی گـەرمو بەتینــە ٥ دەشـگوترێ: (جـــاء في معمعـــان الـــصيف): لەجەنگـەی گەرمای هاوین دا هات.

**المَعْمَعَةُ**: قرچەو دەنگی ئاگر کەپوش و قەفـەزاز دەسـوتێنێ ٥ دەگـوترێ: (سمعـت مَعْمَعَـة الحريـق): گـوێم لـەدەنگی سـوتانی پـوش و پـەلاش و وشـکەڵ بـوو ٥ دەنـگـو هــەرای جـەنگاوەران لـەگۆڕەپانی شـەڕدا ٥ جەنگەی گەرما.

**المَعْمَعِيُّ**: ئەوکەسەیە خاوەن مەبدەء نییـەو هەمیـشە لەگـەڵ کەسـی سەرکەوتودایە ٥ کەسێـك هـیچ ڕای نـەبێ و بەهـەموو کـەس دەڵـێ مـن لەگەڵ تۆم.

**مَعَنَ بالحق مَعْناً**: دانی بەحەق دانا.

**مَعَـــنَ الفَـــرَسُ**: ئەسـپەکە بـازی دوری هاویشتن.

**مَعَنَ الماءُ**: ئاوەکە ڕەوان بوو.

**مَعَـنَ الـوادي**: شـیوەکە ئـاوی زۆر بـوو بەئاسانی دەست دەیکەوت.

**مَعَـنَ المطـرُ الأرْضَ**: بارانەکـە زەوییەکـەی ئاودا ٥ (فهي ممعونة).

**مَعِـنَ الموضِـعُ أو النبـتُ مَعَنـاً**: شوێنەکە تێراو بوو.

**أمْعَنَ فلان**: فلانکـەس دوورکەوتـەوە ٥ ماڵ و سامانی زۆر بوو.

**أمْعَنَتِ الأرضُ**: زەوییەکە تێراو بوو.

**أمْعَنَ في بلـد العـدو**: چووە نـاو وڵاتـی دوژمنــەوە ٥ زۆر چــووە نــاوەوە ٥ (أمعن في الأمـر): زۆر لەکارەکـە ورد بۆوە.

**أمْعَنَ الماءَ**: ئاوەکـەی بـەردا وای لێـکرد بەسەرزەوی دا بڕوا.

**تَمَعَّنَ**: خۆی بەبچوك خستە بەرچاو.

**المَــاعُونُ**: قــاپ و قاچــاغی ناومــاڵ ٥ ئامێری پێویست بۆناومـاڵ ٥ وەکوو مەنجــەڵ و گــۆزەو ســـەماوەرو ســـەلاجەو تـــەباخ و شـــتی وا ٥ ملکەچـی و ژێربـاربوون ٥ ئـاو ٥ چاکەو پیاوەتی ٥ زەکات.

**المَعْـنُ**: هەرشتێـك سودی لێـوەربگیرێ کـەم بـێ یـا زۆر ٥ (رجُـلٌ مُعَنّـی): پیاوێـــکە ســـود لـــەپیاوەتی و بەخـشندەیی وەردەگـیرێ ٥ ئـاوی دەریـــاو ڕەوان بەســـەر زەوی دا،

شیرین‌و گوارا ٥ چاکەو پیاوەتی ٥ پێست ٥ پێستی سورو بەنرخ کەدەخرێتە سەر صندوق‌و شتی وا.

**المَعْنَةُ**: شتی ئاسان‌و کەم ٥ دەگوترێ: (فلان ماله سمنة ولا معنة): فلانکەس نە کەم نە زۆر هیچی نییە.

**مَعَا السنور مُعَاءً**: پشیلەکە میاواندی.

**أمْعَتِ النَخْلَةُ**: خورماکە بەرەکەی شیرین بوو، بوو بەروتاب.

**أمْعَى البُسْرُ**: خورما بەرسیلەکە شیرین بوو.

**تَمَعَّى السِّقَاءُ**: کوندەکە لێك کشایەوەو فراوان بوو.

**تَمَعَّى الشَّرُّ فيما بينهم**: شەڕو هەرا لەناویان دا بڵاو بۆوە.

**المَعْوُ**: خورمای شیرین ٥ خورمایەك تازە پێگەیشتبێ‌و بەتەواوی شیرین بووبێ ٥ درزی لیچی خوارەوەی حوشتر.

**الماعي**: خۆراکی شل.

**المِعَى**: ریخۆڵە ٥ زەوی نەرمەڵان‌و چاڵایی ٥ پلوسکی ئاو ٥ ڕێڕەوی ئاو، شوێنی هەڵڕژانی ئاو لەناو شاخ‌و بەرددا.

**المِعَاءُ**: ریخۆڵە ٥ (ك: أمعية).

**مَغَثَ الرجلَ**: بەهێواشی‌و لەسەرە خۆ لەفلانکەسی دا.

**مَغَثَت الحمى فلاناً**: لەرزوتا توشی فلانکەس بوو.

**مَغَثَ فلاناً في الماء**: فلانکەسی لەناو ئاودا نقوم کرد.

**مَغَثَ عِرْضَ فلان**: حەیاو ناموسی فلانکەسی لەکەدار کرد.

**مَغَثَ المطرُ الكلأ**: باران لەلەوەڕەکەی داو تامی گۆڕی، ڕەنگی گۆڕی ٥ رزاندی کەڕوی پێ هێنا.

**مَاغَثَهُ مِغاثاً ومماغثةً**: کێشەی لەگەڵ نایەوە ٥ دەگوترێ: (بينهما مِغاث) لەنێوانیان دا کێشەو نیزاع هەیە.

**المُغاثُ**: بڕوانە مادەی (غَوَثَ).

**المَغْثُ**: زۆرانبازی بەهێزو توانا ٥ شەڕو نەگبەتی.

**المِغَثُ**: (رجل مِغَثٌ): پیاوێکی زۆرانبازی خاوەن هێزو توانایە ٥ یان پیاوێکی شەڕانی‌و شەڕ خوازە.

**المَغِيثُ**: بەمانا (المِغيثُ)دێ.

**مَغَدَ الرجلُ في ناعم العيش**: پیاوەکە نازپەروەر بوو ٥ لەژیانی خۆش دا کاتی بەسەر برد.

**مَغَدَ فلان**: فلانکەس گەیشتە هەڕەتی گەنجی ٥ دەگوترێ: (مَغَدَ الجسمُ): جەستەی تێك سمڕاو خۆی پڕکردەوە.

**مَغَدَ النباتُ**: ڕوەکەکە درێژ بوو.

**مَغَدَ الرجلَ ناعم العيش**: بژێوی خۆش‌و بەلەزەتی دا بەپیاوەکە.

مَغَدَ الرجلُ شَعْرَهُ: پیاوەکە موی جەستەی خۆی هەڵکێشا.

مَغَدَ الشَّيْئَ: شتەکەی هەڵمژی.

مَغَدَ الفصيلُ أمَّهُ: بێچووەکە گوانی دایکەکەی مژی.

أمْغَدَ فلان: فلانکەس زۆری خواردەوە.

أمْغَدَت المرأةُ الصَّبِيَّ: ئافرەتەکە شیری دا بەمنداڵەکەی ٥ دەگوترێ: (أمغدت الناقةَ الفصيلَ).

المَغْدُ: نەرمو نۆڵ ٥ دەگوترێ: (عيش مَغْدٌ): ژیانی نەرمو نۆڵ ٥ دۆڵچەی گەورە ٥ صمغێکە لەدرەختی سیدر درەختی (الطَّلْح): دەردەهێندرێ ٥ باینجان.

مَغَرَ في البلاد مَغْراً: بەناو وڵات دا رۆیی‌و پەلەی کرد ٥ دەگوترێ: (مَغَرَ به فرسه): ئەسپەکەی بەخێرایی بردی.

أمْغرت الشاة او الناقة: مەڕەکە یان حوشترەکە شیرەکەی بەهۆی نەخۆشیەکەوە تێکەڵ بەخوێن بووە.

أمْغَرَ فلاناً بالسهم: بەتیر برینێکی ئەمدیواو دیوی لەفلان کرد.

مَغَّرَ الثوبَ: قوماشەکەی بەرەنگی سوری کاڵ بۆیەکرد.

الأمْغَرُ: مرۆڤی قژو پێست سوری مەیلەو کاڵ.

المَغْرُ: رەنگێکە زۆر سور نییە ٥ یان سورە فلەی مەیلەو لێڵ.

المَغَرَةُ: قوڕێکی سورە شتی پێ سواخ دەدرێ ٥ نەرمە باران (مغرة الصيف): جەنگەی گەرمای هاوین.

المَغَرَةُ: قورە سور کە شتی پێ رەنگ بکرێ.

المُغْرَةُ: بەمانا (المَغَرُ)دێ ٥ رەنگی ئاسن، هاڕدراوی ئۆکسیدی ئاسن کە بۆ بۆیە کردنی شت بەکاردێ.

المَغِيرُ: (لبن مغير): شیرێک خوێنی تێکەڵ بووبێ‌و سور بوبێ.

المِغْمَارُ: (نخلة مغمار): دارخورمایەکە خورماکانی سورن ٥ هەروا ناوە بۆ حوشترێك کەشیرەکەی سور بووبێ.

المَمْغَرَةُ: زەوییەك قوڕی سوری هەبێ.

مَغَسَهُ بالرَمْح مَغْساً: بەرمب لێی دا.

مَغَسَ الطبيبُ فلاناً: پزیشکە کە دەستی لەفلان داو زەختی گرت.

مَغَسَ فلاناً بطنُهُ: سکی ئازاری بوو.

امْغَسَ رأسُهُ بنصفين من بياض وسواد: قژی سەری ماش‌و برنج بوو.

المَغْسُ: لۆغەتێکە لە (المَغْصُ).

مَغَصَ مَغْصاً: سکی توشی ئازارو نارێك‌و پێکی بوو.

مَغِصَ بَطْنُهُ: سکی توشی ئازار بوو ٥ ریخۆڵەی تێك هالان.

تَمَغَّصَ بَطْنُهُ: سكی توشی شێوانو ناسروشتی بوو.

تَمَغَّصَ الشيئُ فلاناً ومنه: شتەکە ئازاری فلانی دا.

المَغْصُ والمغَصُ: ئازارێکە لەڕیخۆڵەداو تێکهالانی ریخۆڵەیە.

مَغَطَ الشيْئَ مَغْطاً: شتەکەی لێك کێشایەوەو درێژی کردەوە ○ دەشگوترێ: (مَغَطَ الرجل القوسَ): پیاوەکە قەوسەکەی بە ژێیەکە ڕاکێشا.

إمتَغَطَ الشيْئُ: شتەکە لێك کشایەوەو درێژ بوو ○ دەگوترێ: (إمتَغَطَ النهارُ): رۆژ درێژ بۆوە.

إمتَغَطَ الشيْئُ: بەمانا (إمتَغَطَ)دێ.

تَمَغَّطَ فلان: فلانکەس رقی هەڵسا.

تَمَغَّطَ الفرسُ: ئەسپەکە بەئەوپەڕی توانای خۆی غاری دا ○ یان لەغاردان دا قاچەکانی درێژ هاویشتن.

المُمَغَّطُ: زۆر درێژ ○ (درێژ داوەڵ).

مَغْطَسَ الحَجَرَ: هێزی موگناتیسی دا بەبەردەکە ○ بڕوانە مادەی (المغناطیس).

مَغَلَ بالرجُلِ مَغْلاً ومغالاةً: دژی پیاوەکە دوا، بوختانی بۆکرد.

مَغَلَ فلان مغالاةً: فلانکەس خیانەتی کرد، غەشی کرد.

مَغَلت الدابَّةُ مَغْلاً: ولاخەکە لەگەڵ گیاو گژدا گڵو خۆڵیشی خوارد، ژانەسکی گرت ○ سکی ئازاری لێ پەیدا بوو.

مَغِلَت الحامِلُ بولدها مَغْلاً: ئافرەتەکە شیری پیسی دا بەمنداڵەکەی منداڵی تازەی لەسکی کەوتبوو شیری دەدا بەمنداڵەکەی پێشووی.

مَغِلَتْ عَيْنُهُ: چاوی تێکچووو نابینا بوو.

مَغِلَت الدَابَّةُ: بەمانا (مَغَلَتْ)دێ.

امْغَلَت المرأةُ: ئافرەتەکە هەموو ساڵێ منداڵێکی بوو، پێش ئەوەی منداڵەکەی لەشیر ببڕێتەوە سکی بۆوە.

امْغَلَت النَّعْجَةُ: مەڕەکە ساڵی دوجار بێچوی بوو.

امْغَلَت الحامِلُ: ژنە سکپڕەکە شیری دا بەمنداڵەکەی، شیری پیسی پێدا.

امْغَلَ القومُ: خەڵکەکە حوشترو مەڕەکانیان ساڵی دوجار بێچوویان بوو.

امْغَلَ به عند السلطان: لەلای پاشا دژی دواو بوختانی پێ کرد.

المَغْلُ: ئەو شیرەیە ئافرەتی سکپڕ دەیدا بەمنداڵەکەی.

المَغَلُ: بەمانا (المَغْلُ)دێ.

المَغْلَةُ: شێوانو تێکچونی گەدە ○ ترشانی گەدە ○ مەڕو بزن کەساڵی

دوجار بێچوویان ببێ ٥ (ك: مِغَالٌ).
**المُغِلُ**: زەوییەك زۆر گژو گیای لێ ڕوابێ.
**مَغْمَغَ الأمْرُ**: كارەكە شێوا، تێكچوو.
**مَغْمَغَ الكلْبُ في الإناء**: سەگەكە دەمی خستە ناو قاپەكەوە.
**مَغْمَغَ اللحمَ**: گۆشتەكەی باش نەجوی.
**مَغْمَغَ العَمَلَ**: كارەكەی باش ئەنجام نەدا.
**مَغْمَغَ الكلامَ**: قسەكەی باش رون نەكردەوە.
**مَغْمَغَ الثريدَ**: تێكوشاوەكەی چەور كرد ٥ چەوری زۆری كردە ناو تێكوشاوەكە.
**مَغْمَغَ الحيوانُ**: حەیوانەكە شتێكی لەلەوەڕ دەست كەوت ٥ حەیوانەكە قەڵەوو خوباب بوو.
**المُغناطيس والمُغْنَطيسُ**: جۆرە بەردێكە كێشی دەرزیو ئاسنی بچوك بۆلای خۆ دەكا.
**المُغناطيسية**: هێزێكی كێشندەیە لەموگناتیس دایە.
**مَغَا السِنَّوْرُ مَغْواً ومغاءً**: پشیلەكە میواندی.
**مَغَى فيه مَغْياً**: ئەوەی دەربارەی ئەو گوتی، ئەو ڕەوشتانەی پاڵی دان واقیعی نەبوونو لەڕاستیەوە دوور بوون.

**مَغَى الوَلَدُ**: منداڵەكە زمانی پژا، قسەی وای كردن مانایان رون بێ.
**مَغَى الأديمَ**: چەرمەكەی نەرم كرد.
**تَمَغى الأديمُ**: بەمانا (مَغَى)دی.
**مَقَتَ فلاناً مَقْتاً**: فلانكەسی دزا، زۆری رق لێبوو ٥ دەگوترێ: (ما أمْقَتَهُ عندي): ئای كە ڕقم لێیەتیو لام ناخۆشەویستە ٥ (ما أمْقَتَني): ئای كە ناخۆشم دەوێو رقم لێیەتی.
**مَقُتَ الى الناس مقاتةً**: لای خەڵك ناخۆشەویست بوو.
**ماقَتَ فلاناً**: لەڕق لێبوون دا كێ بركێی لەگەڵ فلانكەس كرد.
**مَقَّتَهُ**: بۆ زێدە رۆیی لەمانای (مَقَتَهُ)دێ ٥ دەشگوترێ: (مَقَّتَهُ إلَيَّ): كردەوەكانی بەلامەوە ناشیرین كرد.
**تَماقَتُوا**: هەندێكیان هەندێكیان ناخۆشویست، خەڵكەكە رقیان لێك بوو.
**تَمَقَّتَ إلَيَّ**: لای ناخۆشو ناشیرین كردم، كردەوەیەكی ئەنجام دا كەرقم هەڵسێنێ.
**المَقْتُ**: (زواج المقت): ئەوەیە پیاو زڕدایكی خۆی مارە بكاتەوە، ئەمە عادەتێك بوو لەناو عەرەبەكان دا پێش ئیسلام باو بوو ئایینی ئیسلام ئەم دابو نەریتەی قەڵاچۆكرد.
**المَقْتِيُّ**: ئەو كەسەیە زڕدایكی خۆی

ماره كردبێتەوە ◊ یان لەو ئافرەتە زڕدایكە منالّی ببێ.

**المقـدونیسُ:** ڕوەكێكە لەپێڕی (الخیمیة)یە، بۆنی خۆشە بۆ سود وەرگرتن لەبۆن‌و گەڵاكەی دەروێندرێ.

**مَقَرَ عُنُقَهُ مَقْراً:** بەگۆچان لەگێزەرەی ملی دا ئێسقانی ملی شكاندو پێستەكەی ساغە.

**مَقَـرَ السمكةَ المالِحـةَ:** ماسییە خوێ كراوەكەی لەسركەكەدا نقوم كرد.

**مَقِرَ الشَّيْئُ مَقَراً:** شتەكە تاڵ بوو ◊ یان ترش بوو.

**أمْقَـرَ الـشَّيْئُ:** شتەكە تاڵ بوو ◊ دەگوترێ: (أمْقَرَ اللبَنُ): شیرەكە تامی نەما ◊ شیرەكە ترش بوو.

**أمْقَرَ لفلان شراباً:** شەرابەكەی بۆ فلان تاڵ‌و تفت كرد.

**أمْقَـرَ السمكة المالحـة:** ماسییە خوێ كراوەكەی لەسركە هەڵكێشا.

**المَقِرُ:** ڕەگەزی ئەوڕوەكە زەنبەقیانەیە كە لەوڵاتی گەرمە سێردا دەروێن ◊ هەروا پێشی دەگوترێ: (الـصَّبِر أو صَبّار).

**اليَمْقُورُ:** تاڵ‌و تفت.

**مَقَـسَ في الأرض مَقْـساً:** بەناو زەوی دا ڕۆیی.

**مَقَسَ الماءُ:** ئاوەكە ڕەوان بوو.

**مَقَـسَ الـشَّيْئَ في المـاءِ:** شتەكەی لەئاودا نقوم كرد.

**مَقَسَ الشَّيْئ:** شتەكەی شكاند، یان كونی كرد.

**مَقَسَ القِرْبَةَ:** كوندەكەی پڕكرد.

**مَقِسَتْ نَفْسُهُ مَقَساً:** نەفسی لێی بێزراو لێی هەڵەنكوت.

**ماقَـسَهُ:** لەئاودا نقومی كرد ◊ دەگوترێ: (هو يُماقِس حوتاً): ئەو ماسی گەورە نقومی ئاو دەكا ◊ ئەم پەندە بۆكەسێك دەگوترێ كەبەگژ لەخۆی بەهێز تردا بچێ.

**مَقَّسَ الماءَ:** زۆری ئاو بەسەر خۆی دا كرد.

**تماقَسَ الرجلان في البحـر:** دوپیاوەكە پێشبڕكێیان كرد لەخۆ نقوم كردن لەدەریا دا.

**تَمَقَّسَتْ نَفْسُهُ:** نەفسی لەشتەكە بێزراو لێی هەڵسڵەمیەوە.

**مَقَـطَ الـبعيرُ مقوطـاً:** حوشترەكە زۆر كزبوو.

**مَقَطَ الكرةَ مَقْطاً:** تۆپەكەی بەزەوی داداو پاشان گرتیەوە.

**مَقَطَ الحَبْلَ:** حەبلەكەی گشت بادا.

**مَقَـطَ القِـرْنَ:** هاوشانەكەی خۆی خست، بەزەوی دادا.

**مَقَطَ عُنُقَهُ**: ملی شکاند.

**مَقَطَ فلاناً**: رقی لەفلانکەس بوو.

**مَقَطَ الفَرَسَ**: ئەسپەکەی بەحەبل شەتەك دا.

**مَقَطَ فلاناً بالإيمان**: فلانکەسی سوێند دا.

**مَقَطَ فلاناً الشَّيئ**: شتەکەی بەگەرو دا کرد.

**مَقَّطَ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (مَقَطَ)دی.

**امْتَقَطَ الشَّيئ**: شتەکەی دەرهێنا.

**تَمَقَّطَ فلان**: فلانکەس رقی هەڵسا.

**الماقِط**: بەکرێگیراو لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ ◦ رەمڵ هاوێژو فالگرەوە.

**المَقاطُ**: حەبل ◦ رێشمەی ئەسپ ◦ حەبلی دۆڵچە.

**المَقّاطُ**: شتێك لەم ماڵ بۆ ئەوماڵ بەکرێ بدرێ.

**المُقْطُ**: داوێکە دەزوبەکە باڵندەی پێ دەگیرێ.

**المَقْطُ**: زەبرو زەنگو توندو تیژی.

**المَقِطُ**: ئەو منداڵەی بەشەش مانگی یا بەحەوت مانگی لەدایك دەبێ.

**مَقَعَ مَقْعاً**: زۆر بەخێرایی‌و هەڵەشەیی خواردیەوە.

**مَقَعَ الفَصيلُ أمَّهُ**: بێچووەکە زۆر بەخێرایی گوانی دایکەکەی راتەکاندو شیرەکەی خوارد.

**مَقَعَ فلاناً بِشر**: شەڕو شۆڕی پاڵ فلان دا، شەڕی هاویشتێ.

**إمْتَقَعَ الفصيلُ ماني ضرع أمه**: چی بێچووەکە چی لەگوانی دایکەکەی دا بوو خواردی‌و بەخێرایی لوشی دا.

**أمْتَقِعَ لونُهُ**: ڕەنگی گۆڕا، زەرد هەڵگەڕا، رەش هەڵگەڕا، بەهۆی ئەخۆشی یان خەم‌و خەفەت.

**المَيْقَعُ**: ئەخۆشی کەوەکوو سورێژەو مێکوتە وایە توشی بێچوە ئاژەڵ دەبێ‌و دەیخاتە سەر زەوی‌و دەیکوژێ.

**مَقَّ الشَّيئ مَقّاً**: شتەکەی کردەوە، شەقی کرد، دەری هێنا.

**مَقَّ الرجلُ أو الفرسُ مَقَقاً**: پیاوەکە یان ئەسپەکە درێژو کزو لاواز بوو ◦ (فهو أمَقُّ وهي مَقّاءُ).

**مَقَّ مابين الشيئين**: نێوان دوشتەکە زۆر بوو ◦ دەگوترێ: (بلد أمَقُّ): وڵاتێکی بەرفراوان‌و پان‌و پۆرە.

**مَقَّقَ على عياله**: ڕژدو چروکی لەگەڵ ماڵ‌و خێزانی کرد ◦ بەباشی بەخێوی نەکردن.

**مَقَّقَ الطائرُ فَرْخَهُ**: باڵندەکە خواردنی دا بەبێچووەکانی.

**إمْتَقَّ الفصيلُ ما في الضرع**: بێچووەکە چی لەگوانەکەدا بوو خواردی.

**تَمَقَّقَ الشَّيئ**: شتەکە درێژ بوو ◦ دورکەوتەوە.

**تَمَقَّقَ مافي العظم**: چی لەئێسقانەکەدا هەبوو دەری هێنا.

**تَمَقَّقَ الشرابَ**: شەرابەکەی کەمکەم خواردەوە ٥ دەشگوترێ: (أصاب فلان جرح فما تَمَقَّقَهُ): فلانکەس برینی لێپەیدا بوو وەلێ هیچ پێی تێك نەچوو.

**الأمَقّ**: (وجه أمقّ): دەمو چاوی درێژ ٥ (حِصْن أمَقّ): قەڵای بەرفراوان.

**المَقَّاءُ**: ئیسمی فاعیلە لەمادەی (مَقّ) وەرگیراوە ٥ دەشگوترێ: (فخذ مَقّاءُ) رانی کزو کۆڵەوارو بێ گۆشت.

**المَقَقَةُ**: ئادەمیزادی نەزانو کەودەن ٥ شەرابی سرکە چۆڕ چۆڕ.

**مَقَلَه مَقْلاً**: بۆی ڕوانی.

**مَقَلَ الشَّيْءَ في الماء وغيره**: شتەکەی لەناو ئاودا نقوم کرد.

**مَقَلَ في الماء**: چووە ناو ئاوەکە.

**مَقَلَ المَقلةَ**: بەردەکەی خستە ناو قاپەکەو ئاوی بەسەردا کرد بۆئەوەی هەرکەسە بەئەندازەی یەك ئاو بخۆنەوە.

**مَقَلَ فلان الفصيلَ**: فلانکەس بە لوێچ کەم کەم شیری دا بەبێچووەکە ٥ یان زمانی گرتو ئاوی کردە ناو گەرویەوە.

**مَاقَلَهُ**: نقومی ناو ئاوی کرد.

**إمْتَقَلَ**: چەند جارێك چووە ناو ئاوو خۆی نقوم کرد.

**تماقَلا**: دوو مرۆڤەکە خۆیان لەناودا نقوم کرد.

**المَقْلُ**: بنکی بیر ٥ دەگوترێ: (إنغمس في الماء حتى جاء بالمَقْلِ): لەناوەکە دا خۆی نقوم کرد تا چووە بنکی بیرەکەو بەردەوردەی دەرهێنان ٥ جۆرێکە لەشیر دان بەزارۆك و بێچو.

**المُقْلُ**: بەری درەختی دۆم؛ کەدرەختێکە دەشوبهێتە درەختی خورما ٥ صمغی درەختێکە پێی دەگوترێ: (الكور)، ئەم صمغە خۆی جۆرە دەرمانێکە.

**المُقْلَةُ**: چاو ٥ (ك: مُقَل).

**مَقْمَقَ الشَّيْءُ**: شتەکە نەرم بوو لووسو ئاسان بوو.

**مَقْمَقَ الحُوارُ خلفَ أمّهِ**: بێچووەکە بەهێز گوانی دایکی مژی.

**مَقْمَقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ڕاهێناو گونجاندیو ژێر باری کرد.

**المُقَامِقُ**: کەسێك بەلای خواروی قورگی قسە بکا.

**مَقِهَ مَقَهاً**: پێڵوو قولینچکی چاوی سور بونو برژانگی کەم بوون ٥ چاوی شین بونو سپیایی چاوی تۆخ بوو ٥ (فهو أمقه وهي مقهاء).

**الأمْقَهُ من الناس**: کەسێك سەری خۆی

هەڵدەگرێو نازانێ بۆکوێ دەچێ ٥ شوێنی سوتەمەڕۆ کەدرەختی لێ نەڕوێ.

**مَقَا المرأةَ:** ئاوێنەکەی سڕی مشتو ماڵی کرد.

**مَقَا أسنانَهُ:** ددانی خۆی شتنو خاوێنی کردنەوە.

**مَقَا الفصيلُ أمَّهُ:** بێچوەکە بەتەوژم گوانی دایکەکەی مژی، تێی هەڵکەوت.

**مَكَثَ بالمكان مُكثاً ومَكَثاً ومكوثاً:** لەشوێنەکە راوەستا، تێفکری، چاوەڕونی کرد.

**أمْكَثَهُ:** هەڵنینا بۆ تێفکرینو هەڵوەستە لەسەرکردن.

**مَكَّثَهُ:** بەمانا (أمْكَثَهُ)دێ.

**تَمَكَّثَ:** چاوەڕوانی کرد، هەڵوەستەی لەسەر کرد پەلەی نەکرد.

**تَمَكَّثَ بالمكان وتَمَكَّثَ في الأمر:** لەسەرە خۆ بوو پەلەی نەکرد.

**المَكيثُ:** عاقڵو ئاغرو لەسەرەخۆو بارقوڵ ٥ (ك: مُكَثَاء).

**المِكِّثى والمِكِّيثاءُ:** لەسەرە خۆیی.

**مَكَدَ الماءُ ونحوه مُكُوداً:** ئاوەکە بەردەوام هاتو نەبڕا ٥ (فهو ماكِد) ٥ (حُبٌّ ماكد): خۆشەویستییەکی بەردەوام.

**مَكَدَ فلان بالمكان:** فلانکەس لەوشوێنە مایەوە.

**مَكَدَت الناقةُ والشاةُ:** حوشترەکە یان مەڕەکە شیری زۆر بوو، شیرەکەی وشکی نەکرد ٥ دەگوترێ: (شاة ماكِدَةٌ ومَكود): مەڕێکی شیر زۆرە (بئر ماكدة ومَكُودٌ): بیرێکە هەمیشە ئاوی هەیە قەت وشك ناکا.

**مَكَرَهُ وبه مَكْراً:** فێڵی لێ کرد ٥ (فهو ماكر ومكّار ومَكُور).

**مَكَرَ اللهُ العاصِيَ:** خودا سزای یاخی بووەکەی دا، یان مۆڵەتی دا لەدونیادا سەرپێچی بکا تا لەقیامەت دا سزای بدا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ اللَّهُ﴾.

**مَكَرَ الثَّوبَ:** کراسەکەی بەقوڕە سور بۆیەکرد.

**مَكَرَ الأرضَ:** زەوییەکەی ئاودا ٥ دەگوترێ: (مررت بزرع ممكور).

**مَكِرَ مَكَراً:** سور بوو.

**مَاكَرَهُ:** فێڵی لێکرد.

**مَكْرَ:** دانەوێڵەی لەماڵ دا شاردەوە بۆئەوەی بەگرانبەها دوایی بیفرۆشێ.

**إمْتَكَرَ الشَّيْئ:** شتەکە بەگڵە سور ڕەنگ گرت.

**تَمَاكَرُوا:** هەندێکیان فێڵیان لەهەندێکیان کرد.

**المَكْرُ**: فێڵو تەڵەکە ٥ گڵی سور کەشتی پێ ڕەنگ دەکرێ ٥ دەنگی هانکەو هەناسەدانی شێر.

**المَكْرَةُ**: پلانو فێڵ لەشەڕ کردن دا ٥ قاچی ئەستورو پۆزی خڕو جوان ٥ خورمای تازەپێگەیشتوی خراپ بوو.

**المَمْكورة**: ئافرەتی قاچ ئەستورو پوز خڕو ناسكو جوان.

**مَكَسَ الشَّيْئُ مَكْساً**: شتەکە کەم بوو.

**مَكَسَ في البيع**: نرخی کاڵاکەی لەمامەڵە کردن دا کەم کردەوە.

**مَكَسَ الضريبة**: باجەکەی خەملاندو وەری گرت.

**ماكَسَه في البيع مماكسة**: داوای لێکرد لەمامەڵەکەدا نرخەکە کەم بکاتەوە ٥ بەربەرەکانی نرخبازی لەگەڵ دا کرد.

**المَاكِسُ**: باج وەرگر لەبازرگانو خاوەن موڵك ٥ (ك: مُكَاس).

**تماكَسَ البَيْعان**: کڕیارو فرۆشیارەکان چەندو چونو بێنەو بەرەیان کرد.

**المَكْسُ**: باجو دەرامەت کە باجگر وەری دەگرێ لەبازرگانو ئەوانەی داخڵی وڵاتێك دەبن ٥ (ك: مكوس).

**مَكَّ العَظْمَ مَكّاً**: هەرچی لەناو ئێسقان دا بوو هەڵی مژی.

**مَكَّ غريمَهُ**: تەنگی بەقەرز دارەکەی هەڵچنی بۆئەوەی قەرزەکەی بداتەوە.

**مَكَّكَ على غريمه**: بەمانا (مَكَّهُ)دێ.

**إمْتَكَّ العظم**: بەمانا (مَكَّهُ)دێ.

**إمْتَكَّ الفصيلُ مافي ضرع امه**: بێچووەکە چی لەگوانی دایکەکەی دا بوو هەڵی مژی.

**تَمَكَّكَ**: بەمانا (إمْتَكَّ)دێ.

**تَمَكَّكَ غريمَهُ**: بەمانا (مَكَّهُ)دێ ٥ دەگوترێ: (تَمَكَّكَ على غريمه).

**المُكَاكُ**: مۆخی هەڵمژراو ٥ شیری هەڵمژراو.

**المُكَاكَةُ**: بەمانا (المُكَاك)دێ.

**المَكُّوكُ**: جامێکە شلەمەنی پێ دەخورێتەوە، یان جۆرە پەرداخو گلاسێکە لای سەروی تەسکەو لای خواروی پان ٥ هەروا ناوە بۆ ئامێرێکی پێوانە بەگوێرەی ناوچەو کاتو زەمان چەندییەتو ئەندازەی گۆڕانکاری تێداکراوە ٥ بەکرەیەکی مەعدەنییە حەبلو شتی وای لەسەر هەڵدەکرێو بۆ چنینو تێوەدان سودی لێ وەردەگیرێ ٥ جۆلاشتێکی وای هەیە بەکاری دەهێنێ پێی دەگوترێ مەکۆك ٥ (ك: مكاكيك).

**مَكْمَكَ الرجلُ**: پیاوەکە لەڕۆیشتن دا

خۆی باداو بەخوارو خێچی ڕۆیی.
مَكْمَكَ العَظْمَ: مۆخی ناو ئێسقانەکەی هەڵمژی.
تَمَكْمَكَ العظمَ: بەمانا (مَكْمَكَهُ)دێ.
مَكِنَت الجرادة ونحوها مَكْناً: کوللە گەرای دانا، یان گەرای لەناو جەستەی خۆی دا کۆکردەوە ٥ (فهي مَكُون).
مَكُنَ فلان عند الناس مكانةً: فلانکەس ڕێزو شکۆمەندی لای خەڵك بۆ پەیدا بوو (فهو مكين) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾.
امْكَنَهُ من الشّيْئ: وای لەفلان کرد دەسەڵاتی بەسەر شتەکەدا بشکێ.
أمْكَنَ الأمْرُ فلاناً: کارەکە لەسەر فلانکەس ئاسان بوو ٥ دەشگوترێ: (فلان لايُمكِنُهُ النهوضُ): فلانکەس توانای بەسەردا ناشکێ.
مَكَّنَ لە في الشّيْئ: دەسەڵاتی ئەوی بەسەر شتەکە دا سەپاند ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ﴾.
مَكَّنَ الثوبَ: قوماشەکەی بەماکینە دوری.
مَكَّنَ فلاناً من الشّيْئ: فلانکەسی بەسەر شتەکەدا باڵادەست کرد.
تَمَكَّنَ عند الناس: لای خەڵك ڕێزو نرخی زیادی کرد.
تَمَكَّنَ المكانَ: لەشوێنەکە جێگیر بوو.
تَمَكَّنَ من الشّيْئ: دەسەڵاتی بەسەر شتەکەدا پەیدا کرد.
إسْتَمْكَنَ من الشّيْئ: بەمانا (تمكن)دێ.
المُتَمَكِّنُ: سەرو بۆرو ژێر قبوڵ بکا واتە مەبنی نەبێ.
المكانُ: شوێن.
المكانة: پلەو پایە ٥ ڕێزو شکۆمەندی.
المَكَّانُ: کەسێك مەکینە بخاتە گەڕ ٥ مەکینە بفرۆشێ.
المَكْنُ: هێلکەو گەرای بزن مژەو کوللەو شتی وا.
المَكِنُ: بەمانا (المَكْنُ)دێ ٥ لەحەدیث دا هاتووە دەفەرموێ: (إقِرّوا الطَّيْرَ على مكناتها): باڵندەکان لەسەر هێلانەو گەرای خۆیان هەڵمەفڕێنن‌و تەرمیان مەکەن.
المَكِنيُّ: کەسێکە مەکینەو شتی وا چاك دەکاتەوە ٥ فیتەری مەکینەی دورین‌و شتی وا ٥ کەسێك مەکینە ئاساو خێراو بێ تێفکرین کارەکانی ئەنجام بدا ٥ کەسێك کارەکانی بەڕێك‌و پێکی ئەنجام بدا.
المَكْنَةُ: تواناو دەسەڵات ٥ هێزو بڕشت.
المَكِنَةُ: دەست لێگیربون‌و دەسەڵات بەسەردا شکان ٥ دەگوترێ: (إنَّ ابن

فلان لذو مَكِنَةٍ من الناس): فلانكەس لای خەڵك خاوەن ڕێزو حورمەتە ٥ هەروا دەگوترێ: (ولفلان مَكِنَةٌ): فلانكەس خاوەن هێزو توانایە ٥ ئالەتو ئامێرێكە لەمادەی ڕەقو ئاسنو مەعدەنو شتی وا بەدەست یان بەفاج بەهۆی وزەی كارەبا یان بوخار هەڵدەسوڕێو كاری پێئەنجام دەدرێ ٥ دەگوترێ: (مەكینەی خەیاتی، مەكینەی برژاندن، هاڕین چاپكردن ...هتد).

**مَكَا مُكَاءً وَمَكواً:** فیكەی لێدا، بەدەم فیكەی كێشا ٥ یان پەنجەی خستە ناو دەمیەوەو فیكەی كێشا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ صَلاتُهُمْ عِندَ الْبَيْتِ إِلاَّ مُكَاء وَتَصْدِيَةً﴾.

**مَكِيَتْ يده مَكاً:** دەستی بەهۆی ئیشكردنەوە قەڵشتنو زبر بوون.

**تَمَكَّى الغُلامُ:** كوڕە كە بۆ نوێژ دەستنوێژی هەڵگرتو خۆی پاكو خاوێن ڕاگرت.

**تَمَكَّى الفَرَسُ:** ئەسپەكە عارەقی كرد بەناڕەق جەستەی تەڕ بوو ٥ چاوی بەئەژنۆی خوراند.

**المَكا:** كونەڕێوی، كونە كەروێشك ٥ لانەكەیان.

**المُكَّاءُ:** باڵندەیەكی بچوكەو حەزی لەكێوو دەشتە، قاچەكانی دەخاتە پەنایەكەوەو فیكە فیكیان پێ دەكا ٥ (ك: مَكاكيّ).

**مَلأَ في القوس مَلْئاً:** ژێی كەوانەكەی ڕاكێشاو بەهێز ڕایتەكاند.

**مَلأَ الشَّيْءَ:** شتەكەی پڕكرد لەئاوو شتی وا ٥ دەگوترێ: (مَلأهُ على الأمر): لەسەر كارەكەی یارمەتی دا.

**مَلأتُ منه عيني:** شێوەو ڕوخساری سەرسامی كردم.

**مَلأَ فروجَ فرسه:** ئەسپەكەی هەلینگ دا بۆغاردانو بازدان.

**مَلِئَ مَلْئاً:** پڕبوو.

**مَلُؤَ فلان مَلاءً ومَلاءةً:** بوو بەخاوەن ماڵو سامان.

**مَلُؤَ بكذا:** بەوكارە هەڵسا.

**مُلِئَ فلان:** فلانكەس هەڵامەتی توشبوو.

**أمْلأ:** هەڵامەتی پێوەنا، بوو بە هۆی توشبوونی بەهەڵامەت.

**مالأهُ على الأمر مُمَالاةً:** یارمەتی دا لەسەر كارەكەی.

**مَلأَ الإناءَ:** شتەكەی زۆر پڕكرد، زیادی تێكرد.

**إمْتَلأَ الشَّيْءُ:** شتەكە پڕبوو هاخندرا ٥ دەگوترێ: (امْتَلأَ فلان غَيْظاً): فلانكەس پڕبوو لەڕقو قین.

**تَمَالأَ القومُ على كذا:** خەڵكەكە لەسەر

شـــتەكە كۆبونـــەوەو یارمـــەتی یەکتریان دا.

**تملأ الشَّيْئ:** شتەكە پڕ بوو ◦ دەگوترێ: (تَمَلأ من الطعام والشّراب وتَمَلأ شَبَعاً، وتَمَلأ غَيْظاً).

**تَمَلأت المرأة:** ئافرەتەکە چەرچەفی لەخۆوە پێچا ◦ لێفەی بەخۆدا دا.

**اسْتَمْلأ في دينه:** كردیه بڕوا پێكراوو ئەمینو جێگای متمانە.

**الأمْلأ:** دەگوترێ: (فلان أمْلأ لعيني من فلان): فلانكەس لەدیدی من دا زۆر لەفلانكەس ڕێزدار ترو پیاو ترە.

**المالئ:** كەسێك شكۆمەندو پیاو بێتە بەرچاو ◦ دەگوترێ: (شاب مالِئ العين): گەنجێكە پڕ بەچاوو ڕێزدارە.

**المَلأ:** تاقمو پیرو كۆمەڵ ◦ پیاو ماقوڵو ریش سپی نەتەوە ◦ دەگوترێ: (ماكان هذا الأمر عَنْ مَلأ منا): ئەو كارە بەپرسو رای ئێمە ئەنجام نەدراوە ◦ ڕەوشتو ئەخلاق ◦ دەگوترێ: (ما أحسن مَلأ فلان): ئای كەڕەوشتو ئەخلاقی فلانكەس جوانە.

**المَلْءُ:** ئەندازەی ئەوەی كەقاپو حاجەت لەناو خۆی دەیگرێ ◦ لەشلەمەنی یان شتی تر ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿مِلْءُ الأرض ذَهَبًا﴾: دەگوترێ: (هذا الحجر ملئ الكف): ئەم بەردە پڕ چنگە.

**المَلَءُ:** جۆرە هەلامەتێكە لەئاكامی گەدە پڕ بوونەو پەیدا دەبێ.

**المَلاءَة:** لێفە، چەرچەف كەلەسەر سیسەمو تەختەی لەسەر نوستن رادەخرێ.

**المَلْآن:** پڕ بوو ◦ توشبو بەنەخۆشی هەلامەت ◦ بۆ مێینە دەگوترێ (مَلْآنة).

**المَلاءَة:** بەمانا (المَلاءُ)دێ ◦ سەر گرانبونو توشبوون بەنەخۆشی هەلامەت لەئاكامی پڕبوونی گەدە.

**المِلْأة:** گەدە پڕ بون لەخۆراك ◦ یان پڕبوونی شتی تر ◦ دەگوترێ: (هذا الإناء أشَدّ مِلْأةً من ذلك).

**المُمْلِئ:** مەڕێكە یان ئاژەڵێكی تر كە ورگی پڕبێ لەلەوەڕو ئاو وابزانرێ كەئاوسە.

**مَلَثَ الفرسُ مَلْثاً:** ئەسپەكە نەیتوانی بڕوا، سست بوو.

**مَلَثَ الشَّيْئ:** شتەكەی تێكەلاو كرد.

**مَلَثَ فلاناً:** وادەیەكی بەفلانكەس دا كە بەنیازنییە جێ بەجێی بكا ◦ دەگوترێ: (مَلَثَهُ بكلام): بەقسەی لوسو بێ بنەما رازی كردو بەهیوا

نیە بەکردەوە هیچی بۆ بکا.

**مَلَثَ فلاناً**: بەهێواشی لەفلانی دا.

**مَالَثَهُ مِلاثاً ومُمَالَثَةً**: هەڵی خەڵەتاند، قەشمەری پێکرد ئاشتەوایی بەفێڵی لەگەڵ دا کرد.

**المَلْثُ**: سەرەتای تاریکی شەو کەدادێ لەکاتی نوێژی شێوان دا یان کەمێ دواتر.

**المُلْثَةُ**: بەمانا (المَلْثُ)دێ.

**مَلَجَ الصَّبِيُّ مَلْجاً**: منداڵەکە بەلێوی گۆی مەمکی دایکی مژی.

**مَلِجَ الصَّبِيّ مَلْجاً**: منداڵەکە دەنکی خورمای لەدەمی دا هێناو برد.

**مَلِجَتْ الناقَةُ**: حوشترەکە شیری تێدانەما کەمێکی تێدا ماوە کەسێك بیچێژی تامی سوێری دەدا.

**أَمْلَجَت الأم ولدها**: دایکەکە شیری دا بەمنداڵەکەی.

**إمْتَلَجَ الفصيلُ مافي الضرع**: بێچووەکە چی لەگوانەکەدا بوو مژی.

**إمْلاَجَّ الصَّبِيُّ**: منداڵەکە لەسکی دایکی هاتەدەر.

**الأمْلَجُ**: ئەسمەرو گەنم رەنگ ◦ جۆرە دەرمانێکە ◦ سەبەتەو قەفەز کەهیچیان تێدا نەبێ ◦ زەمبیلەی خاڵی.

**الأملوج**: دەنکی خورمای درەختی موقل.

**المَالِجُ**: ماڵەی گەچکاریو شتی وا ◦ پێشی دەگوترێ (المسطرين).

**المُلْجُ**: بەمانا (الأمْلُوجُ)دێ ◦ (ك: أمْلاَج).

**المَلِيجُ**: پیاوی رێزدار ◦ منداڵی شیرە خۆر.

**مَلَحَ الطائِرُ مَلْحاً**: باڵندەکە لەکاتی فرینی دا خێرا خێرا باڵەکانی لێك دان.

**مَلَحَتْ فلانة لفلان**: فلاّن ئافرەت شیری دا بەمنداڵی فلان.

**مَلَحَ القِدْرَ**: بەئەندازە خوێی لەمەنجەڵەکە کرد ◦ دەگوترێ: (مَلَحَ الطعامَ واللحمَ والجِلدَ).

**مَلَحَ الماشِيةَ**: ئاژەڵەکەی خوێ دا.

**مَلَحَ الشاةَ**: بەئاوی زۆر گەرم خورییەکەی لەپێستی مەڕەکە هەڵکەند.

**مَلِحَ الشَّيْئُ مَلَحاً**: شتەکە زۆر شین بوو تاوای لێهات بەمەیلەو سپی خۆی نواند.

**مَلِحَ الحيوانُ**: حەیوانەکە عەیبو خراپی لەقاچی دا بوو.

**مَلِحَ الكَبْشُ**: بەرانەکە رەشو سپی بوو هەندێك لەخورییەکەی رەشو هەندێکی سپی بوو ◦ (فهو أمْلَح وهي مَلْحاء).

**مَلُحَ الماءُ ملوحة ومَلاَحةً**: ئاوەکە سوێر بوو ◦ (وهو مليح أيضاً).

مَلُحَ الشَّيْئُ ملاحَةً: شتەکە جوانو رازاوەو زەریف بوو روخساری لەدڵ دا شیرینو نایاب بوو ٥ (ك: مِلاَح) ٥ (وهو ملاح ومُلاّح).

أَمْلَحَ الماء: ئاوەکە سوێر بوو.

أَمْلَحَ فلان: فلاَنکەس چووە سەرئاوی سوێر ٥ دەگوترێ: (أملحت الإبلُ وأملح الراعي الإبلَ): شوانەکە ئاوی سوێری دابە حوشترەکان.

أَمْلَحَ المتكلمُ: وتار بێژەکە قسەکەرەکە قسەی جوانو زەریفی گوتن.

أَمْلَحَ البعيرُ: حوشترەکە بەزی گرتو قەڵەو بوو.

أَمْلَحَ الشَّيْئُ: شتەکە زۆر شین بوو ٥ تاوای لێهات مەیلەو سپی خۆی نواند.

أَمْلَحَ القِدْرَ: بەئەندازە خوێی کردە ناو مەنجەڵەکە یان زۆری خوێ تێکردو خواردنەکەی سوێر کرد ٥ بەزو پیوی کردە ناو مەنجەڵەکە.

مَالَحَهُ ملاحاً ومُمَالَحَةً: شیری لەگەڵ خوارد ٥ دەگوترێ: (بینهما حُرمَة المِلح والمماحلة).

مَلَّحَت الإبلُ: حوشترەکە قەڵەو بوو.

مَلَّحَ الشاعِرُ: شاعیرەکە وشەو ڕستەی جوانی هێنانە ناو شیعرەکانیەوە.

مَلَّحَ القِدْرَ: زۆری خوێ کردە ناو مەنجەڵەکە.

مَلَّحَ الطعامَ: زۆری خوێ کردە قورگی وڵاخەکەوە.

امْتَلَحَ: راستو درۆی تێکەڵاو کرد.

تَمَلَّحَ فلان: خوێی کردە تێشوو بەزمەندەی کرد ٥ یان بازرگانی بەخوێ کرد ٥ یان بەتۆپزی خۆی کردە مەلەوانو لێخوڕی کەشتی ٥ دەگوترێ (فلان یتظرف ویَتَمَلَّح).

إمْلَحَّ الشَّيْئُ: بەمانا (مَلِحَ)ەی.

إمْلَحَّ الكَبْشُ: بەرانەکە خوریەکەی ڕەشو سپی بوو.

إمْلاَحَّ النَخلُ: خورماکە ئاڵو بۆڵی تێکەوت.

استَمْلَحَ الشَّيْئَ: شتەکەی بەزەریفو جوان لەقەڵەم دا.

الأمْلَحُ: شەونم.

المِلاَحُ: هەڵبونی بای وەشت دوای بای شەماڵ ٥ ئەو بایەی کەشتی لێ دەخورێو پاڵ بەکەشتیەوە دەنێ ٥ سەرە ڕەب یان خودی ڕەب ٥ گزەبای سارد کەدوای بارینی باران هەڵدەکا.

المَلاَحَةُ: پیشەی دەریاوانی، کەشتیەوانی.

المُلاَحِيُّ: جۆرە ترێیەکی سپیو دەنك درێژە ٥ هەنجیری وردی زۆر شیرین

٥ درەختی ئەراك کەسپیو سووربێ.

**المِلْحُ:** خوێ ٥ سوێری ٥ دەگوترێ: (ماء مِلحٌ): ئاوێکی سوێر ٥ دەشگوترێ: (فلان مِلحُهُ على ركبتيه): فلانکەس بێ وادەو بەڵێنە ٥ یان ڕەوشت ناشیرینە ٥ بەشتێکی زۆر کەم تووڕەدەبێ.

**المُلْحُ:** هەواڵی خۆش‌و سەیرو سەمەرە.

**المَلْحاءُ:** سێبەندە، نێوان شان‌و سمت ٥ لەجەستەی حوشتر دا بریتییە لەخوار دوگەکەی ٥ درەختێکە گەڵاکەی هەڵوەرێ‌و ببێتە ڕەشەدار ٥ (ك: مَلْحَاوات).

**المَلْحَةُ:** شەپۆلی دەریا.

**المُلْحَةُ:** ڕەنگی زۆر شین ٥ بەرەکەت‌و فەڕ ٥ قسەی خۆش ٥ یان دەگوترێ: (اصبنا مُلْحَة من الربيع): کەمێك خێرو فەڕی بەهارمان ڕێ کەوت.

**المَلَحَةُ:** قسەی عەنتیکەو خۆش.

**المَلّاحُ:** خوێ فرۆش ٥ یان خاوەن خوێ ٥ کەشتییەوان ٥ کارگوزاری کەشتی.

**المَلّاحَةُ:** شوێنێك خوێی لێبێ ٥ خوێڵین، شوێنی خوێ فرۆشتن.

**المُلّاحِيُّ:** جۆرە ترێیەکی سپی‌و بۆڵ درێژە.

**المَمْلَحَةُ:** خوێدان ٥ ئەو قاپ‌و شوشەیەی خوێی تێدەکرێ.

**مَلَخَ فلان مَلْخاً:** فلانکەس بەخێرایی ڕۆیشت.

**مُلِخَ في الأرض:** بەناو زەوی دا ڕۆیی.

**مُلِخَ في الباطل:** لەبەتاڵ‌و خراپەکاری دا ڕۆچوو.

**مَلَخَ الفرسُ:** ئەسپەکە یاری کرد.

**مَلَخَ الطعامُ:** خۆراکەکە گۆڕاو کەڵکی نەما فاسید بوو.

**مَلَخَ فلان:** فلانکەس دوولا هاتەوە تێك شکا.

**مَلَخَ الشَّيْءَ:** شتەکەی ڕاتەکاند، گەستی.

**مَلُخَ الشَّيْءُ ملاخَةً:** شتەکە بێ تام بوو.

**مَالَخَهُ مَلاخاً ومُمَالَخَةً:** یاری لەگەڵ دا کرد.

**إمْتَلَخَ الشَّيْءَ:** شتەکەی دەرکرد، دەری هێنا ٥ کێشی کرد ٥ گەستی ٥ دەگوترێ: (إمْتَلَخَ اللجامَ من رأس الدابة): ڕێشمەی لەسەری وڵاخەکە دا ماڵی ٥ (امْتَلَخَ اللحمةَ عَنْ عظمها): گۆشتەکەی لەئێسقانەکە جیاکردەوە.

**امْتَلَخَ عَيْنَهُ:** چاوی هەڵکۆڵی.

**امْتَلَخَ القَلّاعُ ضِرْسَهُ:** دانکێشەکە ددانی هەڵکەند.

**امْتَلَخَ عقلَ فلان:** فلانکەس عەقڵ‌و هۆشی ڕۆیی.

**تَمَلَّخَ الشَّيْءُ:** شتەکە فاسید بوو، پووکا

٥ دەگوترێ: (رَجُلٌ مُمْتَلِخُ الـصُّلْب): پیاوێکه پشت لاوازو بێ وەج.

تَمَلَّـخَ العُقَـابُ عَيْنَـهُ: هەڵۆکـه چـاوی هەڵکۆڵی.

المَـــلاَّخُ: ماســتاو چـــیو زمــانلوس ٥ کەسێــك ترســنۆك بـــێو لەشـــەڕو بەرامبـــەری دا خۆگرنـــەبێو زۆر هەڵبێ.

المُلُوخِيَّـــةُ: ڕوەکێـــکی ســـالانەیەو دەڕوێندرێو گەڵاکەی دەکوڵێندرێو دەخورێ.

المَلِخُ: پیاوی لاوازو ورە نـزم ٥ خـۆراکی فاسیدو بێ کەڵك ٥ خواردنێك تامی نەبێ.

مَلَدَ الشَّيْئَ مَلداً: شتەکەی درێژ کردەوە.

مَلِـدَ الغُـصْنُ مَلَـداً: لقەدرەختەکـه ڕاژاو نەرمو شلك بوو ٥ (فهو أمْلَدُ).

مَلَّدَ الأديمَ: چەرمەکەی نەرم کردەوە.

الأملَدُ: مرۆڤـی نـەرمو نیـان یـان لـقو پۆپو نەمامی شلكو نـەرم ٥ (رجـلٌ أمْلَدُ) پیاوێکه ڕیشی نیه.

الأملـودُ: بـەمانا (الأمْلَـدُ) دێ ٥ (إمـرأة املود وأملودة).

المُلْـــدُ: ئـــادەمیزادی نـــەرمونۆڵ یـــان لقەدرەختی شلك ٥ دێوی بیابان.

المَلْدَاءُ: بۆ مێینـەی (الأمْلَدُ) بـەکاردێ ٥ دەگوترێ: (إمرأة مَلْداءُ) ئافرەتێـکی نەرمو نیانو قەدوبالا ڕێکە.

المَلَـدَان: ڕاژانـی لـقو پـۆپی درەخـتو نەرمو نیانی ٥ گەنجی.

مَلَذَ الفرسُ: ئەسپەکە دەستی هاویشتنو غاری دا.

مَلَـذَ فـلان: فلانکـەس درۆی کـرد ٥ (مَلَـذَ فلاناً بالرمح) بەڕمب لێی دا.

مَلَذَ فلاناً مَلْـذاً ومـلاذةً: بەقـسەی لـوسو پـــوس فلانـــی ڕازی کـــردو هـــەڵی خەڵەتاند، بـەلام بـەکردەوە هیچی بـۆ نەکرد.

مَلِذَ فلان مَلَـذاً: فلان بەڕواڵەتو بـەدرۆ خۆشەویـستی خـۆی بـۆ دەربـڕی بـەلام لـەناخی دا ڕقـی لێ بـوو ٥ (فهـو أمْلَـذ وملاذ ومِلْوَذ).

إمْتَلَـذْت منـه: بەخـشش و عـەتام لێـی دەستگیر بوو.

مَلَزَ عنه مَلْزاً: لێی ڕۆیی جێی هێشت.

أمْلَزَهُ: شتەکەی برد.

مَلَزَ بالشيئ: شتەکەی برد.

مَلَّزَ الشَّيْئَ: شتەکەی پوختە کرد.

إمْتَلَـزَ الـشَّيْئَ: بـەمانا (أمْلَـزَهُ) دێ ٥ دەری هێنا فڕاندی.

مَلَـسَ فـلان مَلْـساً: فلانکـەس بـەخێرایی ڕۆیـــی ٥ بەشـــێوەی ڕێـــكو پێـــك لەسەرەخۆ ڕۆیی.

مَلَـسَ بالابـل: بـەخێرایی حوشـترەکانی

لێخــوڕین ◦ بــەدزیو دوور لەچــاوی خەڵك لێی خۆڕین.

**مَلَسَ فلاناً بلسانه**: بەزمانی لوسو قسەی خۆش فلانکەسی ڕازی کرد.

**مَلِسَ مَلَساً**: نـەرمونیانو شـلك بـوو ◦ لوسو بێ گرێو گۆڵ بوو ◦ (فهو أمْلَسُ وهي مَلْساء).

**مَلُسَ ملاسَةً ومُلوسَةً**: بەمانا (مَلِسَ) دێ ◦ (فهو مَليسٌ).

**أمْلَسَت الشاةُ**: مەڕەکە خورییەکەی لێ بــووەوە، زەوییەکــەی بــەماڵماڵو وەروەرە تەخت کرد.

**مَلَّسَ الشَّيْءَ**: شـتەکەی ڕزگـار کـرد ◦ پوختەی کرد.

**إنْمَلَـسَ وامَّلَـسَ الـشَّيْءُ**: شــتەکە وێکهاتەوە.

**إنْمَلَسَ مـن الـشَّيْءِ**: لەشـتەکە ڕزگـاری بوو ◦ دەگوترێ: (إنْمَلَسَ فـلان مـن يديّ) فلان لەچنگم ڕزگاری بوو.

**إنْمَلَسَ الشَّيْءُ**: شتەکە وێکهاتەوە.

**تَمَلَّسَ الشَّيْءُ**: بەمانا (مَلِسَ) دێ.

**تَمَلَّسَ من الشراب**: لەشەرابەکە ڕزگاری بوو سەرخۆشی نەما.

**تَمَلَّسَ من الأمر**: لەکارەکە ڕزگـاری بـوو ◦ دەگوترێ: (تَمَلَّسَ من بـين القـوم و تَمَلَّسَ من بين يدي).

**إمْلاسَّ الشَّيْءُ**: بەمانا (مَلِسَ) دێ.

**إمْلاسَّ الشَّيْءُ**: بەمانا (مَلِسَ) دێ.

**إمْلاسَّ من الأمر**: بەمانا (تَمَلَّسَ) دێ.

**الأمْلَسُ**: دەگوترێ: (جلد فـلان أمْلَـسُ) فلانکـەس بـێ عـەیبو نـەنگی یـە، عەیبی لێ ناگیرێ.

**الإمْلِيسُ**: دەشـتی کـاکی بـەکاکی بـێ درەخـتو ڕوەك ◦ (الرمان الإمليسي، والرمان الامليس) هەناری مێخۆش.

**الأمليسَةُ**: بـەمانا (الإمليسُ) دێ ◦ (ك: أماليس).

**المَلَسُ**: شوێنی دەشـتایی کـە سوتەمەڕۆ بـێ درەخـتو ڕوەکـی تێـدا نـەبێ ◦ (ك: ملـوس وأمْـلاس) دەگـوترێ: (أتيتُهُ مَلَسَ الظـلام) کـاتی داهـاتنی شەو و دەمـەو ئێـوارە هاتم بـۆلای ◦ واتــە: دەوروبــەری نوێــژی شــێوان ◦ کراسێــکی فــشو فۆڵــە لەئاوریــشم دروســت دەکــرێو ڕەشــە ئــافرەتی لادێیی وڵاتی میصر لەبەری دەکەن.

**المَلَسَي**: (رجـل مَلَـسَي) پیاوێـکە وادەو بــەڵێنی نیــەو هــەرگیز پابەنــدی قــسەی خــۆی نابــێ ◦ دەشــگوترێ: (أبيعُــك الملـــسي) شــتەکەت پــێ دەفرۆشـمو بـەرعۆدەی عەیبـەکانی نـابم ◦ (ناقة مَلَسي) حوشترێـکە زۆر خێــــرا دەڕوا ◦ (أرض مَلَـــــسى) زەوییــەکی ســوتەمەڕۆیە و هــیچ

ڕوەك‌و درەختی تێدا نەڕواوە.

**المَلْساءُ**: مێینەی (الأمْلَس)ە ٥ (ك: مُلْسٌ) ٥ (خَمرة مَلْساءُ) شەرابێکی گوارایەو بەخۆشی قوتدەچێ ٥ (سنة ملساء) ساڵێکی قات‌و قڕی‌و بێبارانییە ٥ (قوس ملساء) کەوانێکە درزی تێدانیە، شیوەڵی ڕێڕەوی تیرەکەی لێ نەکراوە ٥ (ك: أمالِس وأماليس).

**المَلاّسَةُ**: ماڵەماڵ‌و وەروەرەی زەوی تەخت کردن ٥ پێشی دەگوترێ: (الزّحافة).

**المِلْسَة**: بەمانا (المَلاّسَةُ) ٥ (ك: مَمالِس).

**المُلَيْساءُ**: نێوان کاتی نوێژی شێوان‌و خەوتنان ٥ ناوێکی مانگی سەفەریشە.

**مَلَشَ الشَّيْءَ مَلْشاً**: بەدەستی تەفتیشی کردو پشکنی ٥ وەکوو ئەوە داوای شتێك بکا.

**مَلَصَ بسهمه**: تیری خۆی هاویشت.

**مَلِصَ الشَّيْءُ مِن يَدِي**: شتەکە لەدەستم کەوتە خوار لەبەر لوسی ٥ دەگوترێ: (مَلِصَتْ السمكةُ ونحوها).

**مَلِصَ الرجلُ**: پیاوەکە هەڵات ٥ (فهو مَلِصٌ وهي ملصة).

**أمْلَصَتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە منداڵەکەی لەبارچوو بەنەکاملی منداڵەکەی لێ بووە ٥ (فهي مُمْلِصٌ).

**أمْلَصَ الرجلُ**: پیاوەکە هەژار کەوت.

**أمْلَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی واڵێ کرد بترازێ.

**إنْمَلَصَ الشَّيْءُ من يدِي**: بەمانا (مَلِصَ) دێ ٥ دەگوترێ: (إنْمَلَصَت السمكة من يدِي) ماسییەکە بەهۆی لووسی‌و پوسی لەدەستم کەوتە خوار.

**تَمَلَّصَ من كذا**: بەمانا (إنْمَلَصَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَمَلَّصَ الرشاءُ من يدي) دۆڵچەکە لەدەستم کەوتەخوار.

**تَمَلَّصْتُ من فلان**: لەدەست فلانکەس ڕزگارم بوو.

**الأمْلَصُ**: (رجل أمْلَصُ الرأس) پیاوێکە سەری ئەصلەعە تووکی بەسەرەوە نیە ٥ تەڕو نەرم‌و شلك.

**الإمْلِيصُ**: (سير إمليص) ڕۆیشتنی خێرا.

**المُلْصُ**: ڕوت‌و بێ پۆشاك.

**المَلِيصُ**: زاروکێك دایکەکەی بەنەکاملی لەباری بچێ.

**المِمْلاصُ**: ئافرەتێك عادەتی وابێ منداڵی بۆ ڕانەوەستێ.

**مَلَطَ الغلامُ مُلُوطاً**: منداڵەکە دز دەرچوو فێری دەست پیسی بوو.

**مَلَطَ البَنّاءُ الحائطَ**: وەستاکە بەگڵە سپی دیوارەکەی سواخ دا.

**مَلَطَ شَعْرَهُ**: قژی تاشین.
**مَلَطَت الأُمُ ولَدَها**: دایکەکە بەنەکاملی منداڵی بوو.
**مَلِطَ فلان مَلَطاً ومُلْطَةً**: فلانکەس موو بەجەستەیەوە نەبوو، بێ توك بوو ◦ (سَهْمٌ أملط) تیرێکە پەڕی پێوە نیە.
**أمْلَطَت المرأةُ**: ئافرەتەکە بەنەکاملی منداڵی بوو.
**أملط الشاعر**: شاعیرەکە نیوە دێڕی شیعرەکەی گوت دوای ئەوەی بەرامبەرەکەی نیوەی یەکەمی ڕێك خستبوو.
**أمْلَطَت الناقة جنينها**: حوشترەکە بێچوی بێ توکی بوو ◦ (فهي مُمْلِط و مُمْلِطة) ◦ (ك: مَمَاليط).
**مَلَّطَ الشاعرُ**: بەمانا (أمْلَطَ) دێ.
**مَلَّطَ الحائط**: دیوارەکەی سواخ دا.
**تَمَلَّطَ الشَّيْءُ**: شتەکە نەرمو نیانو شلك بوو.
**تَمَلَّطَ السَّهْمُ**: تیرەکە پەڕەکانی لێ بوونەوە.
**إمْتَلَطَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دزی، فڕاندی.
**المِلاطُ: مَلْطه**: قوڕێکی لینجە دیواری پێ سواخ دەدرێ ◦ یان بەردەکانی لەدیواردا پێ بەیەکەو دەلکێندرێ ◦ ئانیشك ◦ تەنیشت ◦ قەراخی دوگی حوشتر ◦ (إبن مِلاط) مانگی یەکشەوە (إبنا مِلاط) دودەستی حوشتر ◦ یان دوو شانی حوشتر.
**المِلْطُ**: پیاوی ڕەوشت ناشیرینو دز کەهەرچی شتێك دەستی بیگاتێ دەیدزێو بەهی خۆی دەزانێ ◦ زۆڵو ناکەسبەچە ◦ دەگوترێ: (غلام خلط ملطٌ) کوڕێکە باوکی نازاندرێ کێیە.
**المَلَطى**: جۆرە ڕاکردنو غاردانێکە ◦ دەشگوترێ: (بعته المَلَطى) بەبێ زەمانو بەرعۆدەبوون پێم فرۆشتووە (بەگۆشتی سەر چەپەر پێم فرۆشتووە) ◦ کە دوعا لەیەکێك دەکرێ دەگوترێ: (جعله الله مَلَطى) خودا بەخێری نەهێنێتەوە.
**المَلِيطُ**: کەسێك تووکی بەجەستەوە نەبێ ◦ زاروك لەناو سکی دایکی دا پێش ئەوەی هەستی پێ بکرێ ◦ (سهمٌ مليط) تیرێکە پەڕی پێوە نیە ◦ بێچوی بزن لەسەرتای هاتنەدەرەوەی ◦ هەروا ناوە بۆ بەرخۆلەی تازە لەدایك بوو.
**المِمْلاطُ**: دایکێك زاروکی لەمنداڵدان دا بۆ ڕانەوەستێ.
**مَلَعَت الدابَّةُ ونحوها مَلْعاً وملعاناً**: ولاخەکە زۆر بەخێرایی ڕۆیی.

**مَلَعَ الشاةَ**: مەڕەکەی لەلای ملیەوە کەوڵ کرد.

**مَلَعَ الفصيلُ أمَّهُ**: بێچووەکە شیری دایکی خوارد.

**أمْلَعَت الناقة**: حوشترەکە خێرا ڕۆیی.

**إمْتَلَعَت الناقة ونحوها**: بەمانا (أمْلَعَتْ) دێ.

**إمْتَلَعَ الشاةَ**: مەڕەکەی لەلای ملیەوە کەوڵ کرد.

**إمْتَلَعَ الشَّيْئَ**: شتەکەی دزی، فراندی.

**إنْمَلَعَتْ الناقة**: بەمانا (مَلَعَتْ) دێ.

**المِلاعُ**: سارای بێ درەختو ڕوەك ٥ (عُقاب مَلاعٌ) هەڵۆیەکی لەسەرەخۆیەو بەهێواشی پەلاماری دا.

**المَلْعُ**: دەگوترێ: (هم علی فلان مَلْعٌ واحد) ئەوانە هەموویان دژی فلانکەس کۆبوونەوە.

**المَلیعُ**: وڵاخی خۆشڕۆ ٥ زەوی پانو فراوان ٥ دەشتی دورو فراوان.

**المَلوعُ**: خێراو گورجو گۆڵ.

**المَیْلَعُ**: درێژی باریك ٥ ئەسپی خۆشڕۆ ٥ زەوی سوتەمەڕۆ.

**مُلِغَ في کلامه**: لەقسەکردنی دا گێلی نواند.

**مالَغَهُ بالکلام**: قسەی ناشیرینی لەگەڵ دا کرد.

**تَمالَغَ به**: پێی پێکەنی.

**تَمَلَّغَ في کلامه**: لەقسەکردنی دا گێلی نواند.

**الأمْلَغُ**: (کلام أمْلَغُ) ٥ قسەی پڕوپوچو بێ کەڵك.

**المالِغُ**: (رجل مالِغٌ) پیاوی فاسقو خوێڕیو پیس.

**المِلْغُ**: ماستاوچیو دووڕو ٥ گێلی قسەنەزانو قسە تڕن ٥ کەسێك گوێ نەدا چی دەڵێو چی پێ دەگوترێ ٥ (کلام مِلْغٌ) قسەی بێ خێرو بێر.

**مَلَقَت الدوابُ وغيرها مَلْقاً**: وڵاخەکە بەخێرایی ڕۆیی.

**مَلَقَ الرجلُ**: پیاوەکە بەگورجو گۆڵی ڕۆیی.

**مَلَقَ الشَّيْئَ**: شتەکەی شت ٥ سڕیەوە ٥ لەدەستی خۆی بەڕەڵلای کردو بەندی کرد.

**مَلَقَ الحِمارُ الأرض**: گوێدرێژەکە پێکۆڵی کردو بەقاچەکانی لەزەوی دا.

**مَلَقَ عَيْنَهُ**: لەچاوی خۆی دا.

**مَلَقَ الصغيرُ أمَّهُ**: منداڵەکە شیری دایکی خوارد.

**مَلِقَ الفرسُ مَلَقاً**: ئەسپەکە بازەکانی چوستو چالاك بوون.

**مَلِقَ الخاتمُ من الأصبع**:ئەنگوستیلەکەی لەپەنجەدا لەقی.

**مَلِقَ فلاناً وله**: بەقسەی خۆش‌و زیاد لەپێویست ماستاو بۆکردن فلانکەسی هەڵخەڵەتاند.
**أملَقَتْ المرأةُ**: ئافرەتەکە منداڵی لەبارچوو بەنەکاملی منداڵی فڕێ دا.
**أملَقَ فلان**: فلانکەس هەژار کەوت ٥ قورئان دەفەرموێ: (ولاتقتلوا أولادکم من إملاق) ٥ دەشگوترێ: (أملَقَ مامعه) هەرچی هەیبوو دەری هێناو خستیە ڕو ٥ دەشگوترێ: (أملَقَته الخطوبُ) بەڵاو کارەسات هەژاریان خست ٥ (أملَقَ الدهرُ مالَهُ) ڕۆژگار ماڵ‌و سامانی فەوتاند ٥ هەژاری خست.
**أملَقَ الأديمُ**: پێستەکەی نەرم کردەوە ٥ دەستی پیا هێنا تا نەرم بێ.
**مَلَّقَ الشَّيئَ**: شتەکەی پوختە کرد.
**مَلَّقَ الأرضَ**: زەوییەکەی بەماڵماڵ‌و وەرووەرە تەخت کرد.
**مَلَّقَ الجدارَ**: دیوارەکەی بەماڵە ڕێک خست.
**إمتَلَقَ الشَّيئَ**: شتەکەی دەرهێناو خستیە ڕوو.
**إنملَقَ الشَّيئُ وإمَّلَقَ**: شتەکە لووس‌و پوس بوو ٥ نەرم بوو.
**إنمَلَقَ منه**: ڕزگاری بوو.

**تَمَلَّقَ الرجلَ**: ماستاوچییەتی بۆ پیاوەکە کردو خۆی لێ نزیك کردەوە.
**المالَقُ**: دارێکی گەورەو تەختە، دووڕەشە ولاخ یان دوو بارگیرو شتی وا ڕایدەکێشن‌و زەوی کێڵدراوی پێ تەخت دەکرێ ٥ لەهەندێ شوێنیش ناوە بۆ ماڵەی سواخکردن.
**المَلَقُ**: دووعاو پاڕانەوە ٥ زەوی دەشت‌و ڕێکخراو ٥ دەگوترێ: (سرنا في الملق والملقات) واتە بەناو شوێنی ڕوتەن‌و دەشتایی دا ڕۆیشتین ٥ هەرشتێك نەرم بێ لەگیانلەبەرو بەردو دارو قسەو گفت‌و گۆ.
**المَلِقُ**: لاواز ٥ (فَرَس مَلِق) ئەسپێکە هەنگاو هەڵدێنێ‌و قاچ بەزەوی دا دەکێشێ‌و خێرا ناڕوا ٥ کەسێك وادە بداو نەیباتە سەر، لافی شتێك لێ بدا کەنەیبێ.
**المَلَقَةُ**: شتی سفت‌و لووس.
**المَلَّاقُ**: کەسێك زۆر ماستاوچیەتی بکاو خۆرە پێشخەرو خۆ لەبەرکەربێ‌و خۆشەویستی ڕاستاڵانەی نەبێ.
**المَلِيقُ**: بێ توك ٥ کەسێك تووکی بەجەستەوە نەبێ.
**المِمْلَقُ**: بەمانا (المالِقُ) دێ.
**المِمْلَقَةُ**: بەمانا (المِمْلَقُ) دێ.
**المَمْلَقُ**: خێراو خۆشڕۆ.

مَلَكَ الشَّيْءَ مِلْكاً: شتەکەی کردە ملکی خۆیو بەویستی خۆی تەصەروفی تێدا کرد ٥ (ك: مُلّك ومَلاك).

مَلَكَ الخِشْفُ أمَّهُ: بێچوو ئاسکەکە توانی شوێن دایکی بکەوێ.

مَلَكَ العجين: هەویرەکەی شل شێلاو چاکی هێنایە بەرهەم.

مَلَكَ الوليُّ المرأةَ: وەلی ئەمری ئافرەتەکە نەیهێشت ئافرەتەکە شوبکا.

مَلَكَ فلان إمرَأةً: فلانکەس ئافرەتێکی مارە کردو کردی بە هاسەری خۆی.

أمْلَكَهُ الشَّيْءَ: شتەکەی کردە ملکی ئەو.

أمْلَكَ فلاناً أمْرَهُ: کاروباری خۆی دایە دەست فلانکەس.

أُمْلِكَتْ فلانةُ أمرها: فلان ئافرەت تەلاق درا، یان تەلاقی درایە دەس خۆیو خۆی خاوەنی تەلاقی خۆیەتی.

أمْلَكَ فلاناً المرأةَ: ئافرەتەکەی لەفلانکەس مارە کرد.

مَلَكَ القومُ فلاناً عليهم: خەلکەکە فلانکەسیان کردە پاشاو مەلیکی خۆیان.

مَلَّكَ فلاناً الشَّيْءَ: شتەکەی کردە ملکی فلان.

إمْتَلَكَ الشَّيْءَ: بوو بەخاوەنی فلان شت شتەکەی کردە ملکی خۆی.

تمالَكَ عَنْ الشَّيْءِ: جلەوی نەفسی خۆی گرتو دەستی بۆ شتەکە نەبرد ٥ دەگوترێ: (ما تَمَالَكَ أن فعل كذا) خۆی لە کارەکە نەگرتەوە ٥ دەشگوترێ: (هذا حائط لايتمالك) ئەمە دیوارێکە خۆڕاناگرێو خەریکە بڕوخێ.

تَمَلَّكَ الشَّيْءَ: بووە خاوەنی شتەکە، شتەی کردە ملکی خۆی ٥ (أبو مالك) نازناوی برسیەتییە ٥ (مالك الحزين) ناوی باڵندەیەکی ئاوییە، بۆیە ئەم ناوەی لێ نراوە چونکە لە نزیك جۆگاو کانیاوەکان دەژی هەرکە دەبینێ ئاوێك وشك دەبێ غەمبار دەبێ.

المَلاَكُ: فریشتە.

مَلاك الأمر: پوختەی کار، عونصوری سەرەکی کارو شت ٥ دەگوترێ: (القلب مَلاك الجَسَد).

المِلاكُ: (مِلاك الأمرِ) ڕاگرو پایەی سەرەکی کارو شت ٥ دەشگوترێ: (ركب مِلاك الطريق) بەناوەڕاستی ڕێگادا ڕۆیی.

المَلْكُ: مەلیكو پاشا ٥ نەوشتەی کە دەگرێتە ماڵو سامان دێتە ژێر دەستەوە ٥ ویستو ئیرادەی

سەربەست، قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالُوا مَا أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا﴾.

**المُلْكُ**: موڵك‌و سامان ٥ (ك: أملاك).

**المَلَكُ**: تاكی (الملائكة)یە.

**المَلِكُ**: پەروەردگار كەهەر ئەو بەڕاستی مەلیك‌و خاوەن دەسەڵاتە.

**المَلَكَةُ**: صیفەتێكە لەنەفس دا پەیدا دەبێ، یان ئامادەباشییەكی عەقڵی تایبەتییە بۆ ئەنجامدانی كارێكی تایبەتی بەلێهاتوویی‌و دەست ڕەنگینی ٥ وەكوو مەلەكەی ژمارە ژماردن، مەلەكەی زمانەوانی‌و شتی وا.

**المَلَكوتُ**: جیهانی غەیب‌و نادیار لەنێمەو تایبەت بەگیانەكان‌و نەفسەكان‌و شتە عەجیبەكان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللّـهُ مِن شَيْءٍ﴾ ٥ شكۆمەندی‌و دەسەڵات‌و گەورەیی.

**مَلَكوت الله**: دەسەڵات‌و عیززەتی پەروەردگارو شكۆمەندی ٥ ملكی تایبەتی پەروەردگار ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾.

**المَلَكية**: شتی پاڵدراو بۆ پاشایەتی ٥ دەگوترێ: (الحكومة المَلَكية) ئەو دەسەڵات‌و ڕژێمەی مەلیك سەروكاریی دەكا بەیاسای بنەماڵەیی یەك لەدوای یەك ئەو پۆستە لەلایەن یەكێك لەبنەماڵەی مەلیكەوە وەردەگیرێ.

**المِلكيَّةُ**: ملك‌و بەماڵكردن‌و مافی تەصەڕوف كردن تێیدا ٥ دەگوترێ: (بيدي عقد ملكية هذه الأرض) خاوەندارێتی ئەم زەوییە بەدەست منە ٥ (قانون تحديد الملكية الزارعية) یاسای دیاریكردنی ئەوەی بۆ هەرتاكێكی كۆمەڵ چەند ڕەوایە زەوی كشت‌و كاڵی بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە ٥ (الملكية الخاصة) ملكی تایبەت بەتاكێكی كۆمەڵ ٥ (الملكية العامة) ملكی گشتی‌و كۆیایەتی، ئەوەی كە دەوڵەت خاوەنداریەتی.

**المليك**: خاوەن موڵك‌و دارای سامان.

**مليك الخلق**: خاوەن‌و بەڕێوەبەرو بەخێوكاری دروستكراوان.

**المُلَيْكَةُ**: صەحیفە.

**المَمْلَكَةُ**: دەسەلاتی مەلیك لەناو ڕەعیەت‌و دانیشتوانی وڵاتی دا ٥ دەگوترێ: (طالت مملكته وساءت مَمْلَكته) ٥ هەروا ناوە بۆ دەسەڵات‌و فەرمانڕەواییەك كە مەلیك بەڕێوەی بەرێ.

**مَلكة الطريق**: ناوەڕاستی ڕێگا ٥ زۆربەی ڕێگا.

**المَملوكُ**: کۆیلە.

**مَلَّ فلان مَلاً**: فلانکەس خەمۆکی توش بوو ٥ لەناو غەم‌و نەخۆشی دا تلایەوە.

**مَلّ نعلی فلان السفرُ**: سەفەری فلان درێژەی کێشا.

**مَلَّ في المشْي**: لەڕۆیشتن پەلەی کرد.

**مَلَّ الشَّيْئَ**: شتەکەی ئەمدیواو دیو کرد، هەڵی گێڕایەوە.

**مَلَّ الشَّيْئَ في الجَمْرِ**: شتەکەی خستە ناو کورەخانەکەوە.

**مَلَّ الخبزَ أو اللحْمَ في النار**: نانەکە یان گۆشتەکەی خستە سەرئاگر ٥ (فهو مَملول ومَليل).

**مَلَّ القوس أو السَّهْمَ في النار**: کەوانەکە یان تیرەکەی بە ئاگر چارەسەر کرد.

**مَلَّ الثوبَ**: یەکەمجار قوماشەکەی دوری.

**مَلَّ فلان الشَّيْئَ**: فلانکەس لەشتەکە وەڕز بوو ٥ دڵی لێی هەڵەنکوت.

**أمَلَّهُ وأمَلَّ عَلَيْهِ**: زۆری داوا لێ کرد تا وەڕزی کرد.

**أمَلَّ الشَّيْئُ فلاناً**: شتەکە فلانکەسی وەڕز کرد.

**أمَلَّ عَلَيْهِ السَّفَرُ**: سەفەرەکەی درێژ بۆوە.

**أمَلَّ عَلَيْهِ المَلَوانُ**: شەو و ڕۆژ جیاوازییان زۆر بوو ئەمیان زۆر درێژو ئەویان زۆر کورت.

**أمَلَّ الشَّيْئَ**: شتەکەی شی کردەوە و نووسرایەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلْيكتب ولْيُمْلِل الذي عَلَيْهِ الحق﴾.

**مَلَّلَ فلان الشَّيْئَ**: فلانکەس شتەکەی ئەمدیواو و دیو کرد.

**إمْتَلَّ مِلَّةَ الإسلام**: چووە سەر ئایینی ئیسلام.

**تَمَلَّلَ**: وەزع‌و حاڵی گۆڕا لەم نەخۆشی بۆ ئەو نەخۆشی‌و هەردەمە توشی بەلاو چورتمێك بوو.

**تَمَلَّلَ في المشي**: لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد.

**تَمَلَّلَ اللحْمُ على النار**: گۆشتەکە لەسەر ئاگرەکە هەڵبەزو دابەزی کرد.

**تَمَلَّلَ مِلَّةَ الإسلام**: چووە سەر ئایینی ئیسلام.

**إسْتَمَلَّهُ**: جاڕزی کرد، وەڕزی کرد ٥ دەگوترێ: (إستمل به).

**الأُمْلُولَةُ**: بەمانا مەلەل‌و خەمۆکی دێ.

**المالُولَةُ**: کەسێك جاڕز بێ.

**المَلالُ**: خەم‌و وەڕزبونێکە توشی ئادەمیزاد دەبێ لەئاکامی بەردەوام بوون لەسەر کارێکو ماندویەتی‌و وەڕزبوونی بۆ پەیدا دەبێ.

**المُلالُ**: گۆڕانو نەمدیواو ئەو دیو کردن لەناو نەخۆشیو ئێشو ئازاردا ٥ دەگوترێ: (أخذ فلاناً المُلالُ) خەمۆکیو بەلاو کارەساتی جۆراوجۆر بەسەر فلان دا هاتن ٥ پشت ئێشە ٥ ئارەقی تاو نەخۆشی ٥ ئەو گەرمایەی لەناو ئێسقانی جەستەدا پەیدا دەبێ لەئاکامی تاو نەخۆشی دا.

**المَلَلُ**: نیشانەیەکە بەئێسقانی پاش گوێچکەوەیە.

**المُلِّي**: نانی برژاوی ناو تەندور.

**المَلالَةُ**: جاڕزبوون وەڕزبوون.

**المَلَّةُ**: گڵی گەرم، خۆڵەمێشی گەرم یان پشکۆئاگر کە کێشتی لەسەر گەرم بکرێ، یان نانو کولێرەی تێدا ببرژێندرێ ٥ عارەقی تاو نەخۆشی ٥ دەگوترێ: (لفلان مَلَّة حَمَّيٍّ باطنه) فلانکەس ئارەقی تایەکەی لێ دەتکێ ٥ کەسێك زۆر لەهاوەڵەکانی وەڕزبێ ٥ دەشگوترێ: (رجل ذو مَلَّةٍ) پیاوێکە خەمۆكو وەڕزە.

**خُبْزُ المَلَّةِ**: نانی تەندورو ئاگردان ٥ ئەو شتەی نانی تێدا دەبرژێندرێ.

**المِلَّةُ**: شەریعەتو یاسا ٥ ئایین ٥ ئایینی ئاسمانی کە خودا بەهۆی پێغەمبەرەکانیەوە گەیاندویەتیە بەندەکانیو فەرمانی پێکردوون کە بەو ڕێبازەدا بڕۆنو ئەو شەریعەتە پەیڕەو بکەن بۆئەوەی لەدونیاو قیامەت دا بەختەوەر بن ٥ هەروا ناوە بۆ خوێنبایی کوژراو یان بریندارکراو.

**المُلَّةُ**: دورونی جاری یەکەم ٥ ئەو تەختەو مەعدەنەی لەسەر سیسەم لەژێر دۆشەکەوە دادەنرێ.

**المَلُولُ**: کەسێك زوو وەڕزبێ.

**المَلُولَةُ**: بەمانا (الملول) دێ.

**المَلِيلُ**: نان یان گۆشت کە دەخرێتە تەندورو ئاگردانەوە بۆئەوەی ببرژێ ٥ دەگوترێ: (أطعمنا خبزاً مليلاً) نانی برژاوی دەرخوارد داین.

**رجلٌ مليلٌ**: پیاوێکە خۆر سوتاندویەتی ٥ (طريق مليلٌ) ڕێگای تەخت کراو و ئاشکرا.

**المَلِيلَةُ**: گەرمی تاو شتی وا کەلەناخی ئێسقان دا پەیدا دەبێ ٥ تەشەنە سەندنی گەرمی تا لەناو مۆخ دا ٥ دەگوترێ: (بفلان مليلة) فلانکەس گەرمی تای لەناو ئێسقانی جەستەدا هەیە.

**المُمَلُّ**: (حيوان مُمَلٌّ) گیانلەبەرێکە ماندوکراوە، زۆر سواری بوون ٥ (طريق مُمَلٌّ) ڕێگای تەختکراو و

النَّخِبُ: دەگوترێ: (رجل نَخِبٌ) پیاوێکی ترسنۆکە ٥ شەربە ئاوی گەورە ٥ قومە شەرابێك مرۆڤ دەیخواتەوە بۆ تەندروستیو میانەی برادەرایەتی.

النُّخْبَةُ: کۆمەڵێك هەڵبژاردەبن لەهەر جۆرو ڕەگەزێك بن ٥ دەگوترێ: (جاء في نخبة أصحابه).

النَّخِبَةُ: ترسنۆك.

النَّخِيبُ: دەگوترێ: (قلب نَخِيبٌ) دڵی داوەشاو، دارزاو (رجل نخيب) پیاوی عەقڵ تۆراو، عەقڵ نەماو، بێ عەقڵ.

نَخَجَ السِّقاء: کوندەکە یان شەربە ئاوی لێ چوو.

نَخَجَ السيلُ الواديَ نَخْجاً: لافاوەکە لەم لاو ئەولای شیوەکەی داو دەنگی لێ هات.

نَخَجَ القِرْبَةَ: کوندەکەی هەژاند ٥ ڕایوەشاند ٥ هێنایو بردی.

نَخَجَ الدَّلْوَ في البئر: دۆڵچەکەی لەناو بیرەکەدا جوڵاند بۆئەوەی پڕ بێ لەناو.

إسْتَنْخَجَ: دوای ڕەقبون نەرم بوو.

النُّخاجَةُ: تەڕایی، تەڕەشوح.

نَخَّ نَخّاً: بەگورجیو بەتەوژم ڕۆیی.

نَخَّ الإبلَ نَخّاً: حوشترەکەی تاوداو تێیەوە ژەنی بۆ ئەوەی خێرا بڕوا ٥ دەنگی دا بۆئەوەی بیخ بخواو پاڵکەوێ.

النُّخُّ: ناخی دڵ، قوڵایی دڵ ٥ دەگوترێ: (هذا من نُخِّ قلبي) ٥ هەروا ناوە بۆ فەرشو ڕاخەری درێژ ٥ لاکێشی.

النُّخَّةُ: تاودان لێخوڕینی بەکجار ٥ هەواڵێك ڕاستیو درۆی لێك جیانەکرێتەوە ٥ وردە باران نمە باران.

النَّخَّةُ: حوشتری بارەبەر یان حوشتری ئاو هەڵکێشان بەناعور و شتی وا.

النّاخُذاةُ: کەشتییەوان، خاوەن کەشتی.

نَخَرَ نَخْراً ونخيراً: بەلوتی قسەی کرد.

نَخَرَ الحالِبُ النّاقةَ نَخْراً: شیردۆشەکە لمبۆزی حوشترەکەی خوراند بۆئەوەی شیر بداو بەخۆشی بدۆشرێ.

المَنْخِرُ: کونە لوت ٥ (ك: مناخر).

المَنْخُور: بەمانا (المَنْخِرُ) دێ ٥ (ك: مناخير).

النّاخِرُ: ئەو کەسەی بەکونەلوتی دەفیشکێنێ ٥ دەشگوترێ: (ما بالدار ناخر) کەس لەخانوەکەدا نیە ٥ هەروا ناوە بۆ بەرازی زێنەخرۆ ٥ گوێدرێژ.

الناخِرة من العظام: ئێسقانێك مۆخی تێدابێ، واتە ئێسقانی کلۆر ٥ هەروا وشەی (الناخرة) ناوە بۆ ئەسپ، بۆ گوێدرێژ.

النُّخَرَةُ: پێشەوەی لوت ٥ پەکێك لەکونە لوت.
النُّخـوارُ: وەجـاخزادەی بـەفیزو خۆبەزلزان ٥ ترسنۆك ٥ لاواز.
النُّخُـورُ: حوشـترێکە تـا لمبـۆزی نەخورێنی شیرنادا.
الـنُّخيُ: فیـشکە ٥ فینگـە ٥ دەنـگ دەربڕین بەلوت.
نَخَرَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی کون کرد.
النّخروب: کونی بچوك ٥ (ك: نخاريب).
نخاريب النحل: خانەی شانە هەنگوین؛ ئەو کونە بچوکانەی هەنگ لە مێو دروسـتیان دەکـا بۆئـەوەی هەنگوینیان تێدا کۆبێتەوە.
نَخَـزَهُ بحديـدة نَخْـزاً: بەنـەقیزە تێوەی ژەنی.
نَخَزَهُ بكلمة: بەقسە دڵی ئازاردا.
نَخَسَ الدّابّةَ نَخْساً: لەسمتی وڵاخەکەیەوە ژەنـی بۆئـەوەی خێـرا بـڕوا یـان لەکەلەکەیـەوە ژەنـی بۆئـەوەی بـاش بڕوا.
نَخَسَ الرجلَ وبه: پیاوەکەی دەنەدەنـە دا، ئیزعاجی کرد، دەری کرد.
نَخَسَ البكرةَ: کونی بەکرەکەی بـەپوازو شتی وا تـەنگ کـردەوە ٥ دوای ئـەوەی فراوان بوو ٥ (فهي منخوسة ونخيس).
نُخِسَ البعيرُ ونحوه نَخْساً: حوشترەکە توشی نەخۆشـی ورگ شـۆڕیو زۆربـوونی گۆشـتی بندەسـتی بـوو ٥ یـان توشـی گرۆێی بن کلکی بوو ٥ (فهو منخوس).
تناخست الغَنَمُ: مەڕو بزنەکان لەسەرما خڕبوونەوەو پاڵیان لەیەك دا.
تنـاخَسَ الغـدرانُ: زلکاوەکـان ئـاوی هەنـدێکیان چـووە نـاو هەندێکیانەوە.
المِنْخَسُ والمِنْخاسُ: نەقیزە یان هەر دارو ئاسنێك وڵاخی پێ لێ بخوڕدرێ.
النّـاخِسُ: دەردێکـە توشـی بندەسـتی حوشتر دەبێ ٥ هەروا گرۆێی توشی بنکلکـی ئـاژەڵ دەبـێ ٥ کەڵـەکێوی گەنج.
النُّخـاسُ: ئـەوەی کـونی بـەکرەو شـتی وای پـێ تەسـك دەکرێتـەوە ٥ کۆڵکەیەکـە لەمبـەرو ئەوبـەری دیوەخانی ماڵ دەچەقێندرێ.
النُّخاسـة: ئـەو پـوازو شـتانەی کـونی بـەکرەی پـێ تەسـك دەکرێتـەوە ٥ پیـشەی تەسـك کردنـەوەی کـونی بەکرە.
النَّخـاس: فرۆشـیاری ئـاژەڵو کۆیلـە ٥ جەڵەبچی.
النّخوسُ: کەڵەکێوی گەنج.
النّخيسُ: شوێنی لێ بەسـتنی قەیاسـەو حـەبل لەکـەژاوەی بـچوك بەسـەر پشتی حوشترەوە.

**النَّخِيسَةُ**: ماستی مەڕو بزن بەتێکەڵاوی ٥ تامی مزر کە لەشیرینیو مزری تێکەڵ بووبێ ٥ ڕۆنەکەرە.

**نَخَشَ الرجلُ نَخْشاً**: پیاوەکە لاواز بوو.

**نَخَشَ فلاناً**: ئازاری فلانکەسی دا ٥ هەڵیناو خستیە جمو جوڵ ٥ دەگوترێ: (نَخَش الدابة) وڵاخەکەی دنەدەنە دا.

**نَخَشَ الشَّيْءَ**: توێکڵی لەشتەکە کردەوە ٥ کاکڵەی شتەکەی گرت.

**نَخِشَ الشَّيْءُ نَخَشاً**: شتەکە لای خواروی ڕزی کەلکی نەما.

**نُخِشَ الرجلُ نَخْشاً**: پیاوەکە کزو لاواز بوو.

**تَنَخَّشَ إلى كذا**: چوو بۆلای فلان شت.

**نَخَصَ نَخْصةً**: کزو لاواز بوو پێستی چرچی تێکەوت.

**نَخَصَ الكِبَرُ أو المرض الحيوانَ**: پیری یان نەخۆشی حەیوانەکەی لاواز کرد.

**نَخَصَ لَحْمُهُ نَخْصاً**: گۆشتی نەما، کزو لاواز بوو.

**أنْخَصَهُ الكِبَرُ أو المرض**: پیری یان نەخۆشی لاوازی کرد.

**إنْتَخَصَ لَحمُهُ**: بەمانا (نَخِصَ) دێ.

**النَّاخِصُ**: ئەو کەسەی پیری کزو کۆڵەواریی کردبێ ٥ دەگوترێ: (عجوز ناخص) پیرێکە پیری کزو لاوازی کردوە و پێستی چرچو لوێچ کرد.

**نَخَطَ الى القوم نَخْطاً**: لەنکاوێك هاتەدەر بۆناو خەڵکەکە.

**نخط عليه**: تەکەببوری کرد بەسەریا.

**نَخَطَ بە**: قسەی ناشیرینی ناڕاستە کرد، جوێنی پێدا.

**النَّخْطُ**: مۆخ ٥ ئەو ئاوەی لە وێڵداش دایە.

**نَخَعَ بالحق نُخوعاً**: ددانی بەحەقو ڕاستی دا نا.

**نَخَعَ الذبيحة نَخْعاً**: زێدەڕەوی کرد لەسەربڕینی کوشتییەکەدا نوخاعی شەوکیشی هەڵبڕی.

**نَخِعَ العودُ نَخَعاً**: چڵەدارەکە ئاوی تێ تزا، ئاوی تێکەڕا.

**إنْتَخَعَ عَنْ أرضه**: لەزەویو زێدی خۆی دوورکەوتەوە.

**تَنَخَّعَ السحابُ**: بەمانا (إنْتَخَعَ) دێ.

**تَنَخَّعَ فلان**: فلانکەس بەڵغەمی فڕێ دا.

**المَنْخَعُ**: شوێنی بڕینەوەی نوخاع لەنێوان ملو سەردا.

**النُّخاع**: دەزوە دەمارێکە لەناو عەمودی فەقەرەی پشت دایەو پەیوەستە بە مێشکەوە.

**النُّخاعة**: بەڵغەم کە لەقورگەوە دێتە دەر.

**نَخَفَ نَخْفاً ونَخيفاً:** فيشكاندى، دەنگى خۆى بەلوت دەربڕى ◦ پرماندى لوتى خۆى پاك كردەوە ◦ پژمى.

**أنْخَفَ:** زۆرى مشەمش‌و گنەگنە كرد.

**النَّخافُ:** گۆرەوى، خوف، كالّە.

**النَّخْفَةُ:** چالّايى لەسەر كێو.

**نَخَلَ الشَّيْئَ نَخْلاً:** شتەكەى بێژايەوە.

**نَخَلَ الدقيق:** ئاردەكەى بێژا ◦ (نَخَلَ الكلامَ).

**نَخَلَ السحابُ المَطَرَ:** هەور بارانى باراند.

**نَخَّلَ الشَّيْئَ:** بۆزێدەڕۆيى لەماناى (نَخَلَهُ) دێ ◦ دەگوترێ: (نَخَّلَ السحابُ المَطَرَ) هەورەكە زۆرى باران باراند.

**إنْتَخَلَ الشَّيْئَ:** لەشتەكە باشەكەى هەڵبژارد.

**إنْتَخَلَ السحابُ المطر:** هەور بارانى باراند.

**تَنَخَّلَ الشَّيْئَ:** بەمانا (إنْتَخَلَ) دێ.

**المُنْخُلُ:** بێژنگ ◦ (ك: مناخل).

**النُّخالة:** سەركوێزر، سۆ ◦ ئەوەى دەمێنێتەوە لە بێژنگەكەدا دواى لەبێژنگ دان.

**النَّخْلَةِ:** دارخورما.

**النَّخيلة:** شتى لەبێژنگ دراو و پاڵفتە كراو ◦ دەشگوترێ: (بذل لە نخيلة قلبه) پاڵفتەى دلّى پێدا.

**نَخَمَ نَخْماً:** گۆرانى باشى گوت.

**نَخِمَ نَخَماً:** زمانى گيراو قسەى پێ نەكرا.

**نَخِمَ نَخَماً:** بەڵغەمى فڕێ دا.

**النُّخامَةُ:** بەڵغەم.

**نَخْنَخَ:** بەپەلە ڕۆيى.

**نَخْنَخَ الإبِلَ:** حوشترەكەى ييخ دا ◦ دەشگوترێ: (نَخنخ بالإبل).

**نَخْنَخَ فلاناً:** فلّانكەسى ترۆ كرد، دەرى كرد.

**تَنَخْنَخَتِ الإبِلُ:** حوشترەكە ييخى خوارد؛ پالّكەوت ◦ دەگوترێ: (نَخْنَخَها فَتَنَخْنَخَت).

**نخا نخوةً:** شانازى كردو خۆى بەزل زانى.

**نخا فلاناً نخواً:** مەدحى فلّانكەسى كرد.

**نُخِيَ نخوةً:** شانازى كردو خۆى بەگەورە زانى.

**أنْخى:** پياوەتى و ڕەوشتى بەرزى زيادييان كرد.

**إنْتَخى:** شانازى كردو فيزى كردو لوتبەرزى نواند.

**إنْتَخى علينا:** شانازى بەسەردا كردين.

**إنْتَخى من كذا:** خۆى لەو شتە پاراست‌و بێزى لێ كردەوە.

**إسْتَنْخى منه:** خۆى لێ پاراست‌و بيزى لێ كردەوە.

**النَّخْوَةُ:** پياوەتى‌و مەردايەتى ◦ فيزو خۆبەزلزانى.

**نَـدَأَ اللَّحْـمَ نَـدْءاً:** گۆشـتەکەی برژانـد پـیـشاندی ٥ بـەوە: کـە خـستیە نـاو ئاگرەوەو ژێر پشکۆو ژیلی خست.

**نَـدَأَ المَلَّـةَ:** فولکە نـاگردانی دروست کـرد تەندوری داناو ئاگری تێدا کـردەوە بـۆ نان برژاندنو شتی وا.

**النَـدْأَةُ:** سـورایی دەوری خـۆر لـەکاتی هەڵاتنو ئاوابوونی دا.

**النَـدْأَةُ:** توێـژێکی گۆشـت کـە ڕەنگـی لەوی تری نەچێ ٥ پارچە ڕومکێك کە بەجیاو دوور لەوی تر ڕوابێ.

**النَّدِيّ:** سورایی خـۆر لـەکاتی هـەڵاتنو ئاوا بوونی دا.

**النَّدِيءُ:** هـەر خواردنێك بـە پـیـشاندن لـەژێر ئـاگردا یـان بەبرژانـدن بەکـەڵکی خـواردن بـێ ٥ دەگـوترێ: (لحم ندیءٌ).

**نَدَبَ فلاناً الی الأمر ندباً:** فلانکەسی بانگ کرد بۆ ئەنجامدانی کارەکە.

**نَدَبَ المیـتَ:** مردووەکـەی لاوانـدەوە وایـە شێرەی بۆ کرد.

**نَدِبَ الجُرْحُ نَدَباً:** برینەکە شوێنەکەی ڕەق هەڵات ٥ قەتماغەی کرد.

**نَدِبَ جِسْمُهُ:** جەستەی شوێنی برینی پێوە دیارن.

**نَدُبَ ندابَةً:** چوستو چالاك بوو ٥ گورجو گۆڵ ڕاپەڕی.

**أنْـدَبَ جِـسْمَهُ:** شـوێنکەی بەجەسـتەوە جێ هێشت ٥ دەگـوترێ: (نزلـت بـە ضائقة فأندبتـە) چورتمو کێشەیەکی توش بوو ئاسـەواری بەجەسـتەیەوە جێ هێشت.

**نَدَّبَ به للأمر:** ناردی بۆ ئەنجامدانی کارەکە ٥ کارەکەی خستە ئەستۆی خۆی.

**إنْتَـدَبَ الـشَّيْءُ:** شـتەکە ئاسـانو بەپەدەسـت بـوو ٥ ئاشـکرا بـوو ٥ دەگـوترێ: (خـذ مـا انتـدب) ئـەوەی حـازرو ئاسـان بەدەسـت دێ ئـەوە بەرە بۆ خۆت.

**إنْتَدَبَ للأمر:** خۆی بۆ کارەکە تـەرخان کردو هەوڵی ئەنجامدانی داو پەلەی کرد بۆ جێبەجێ کردنی.

**إنْتَدَبَ فلانـاً للأمـر:** بانگی فلانکەسی کـرد بـۆ گرتنـە ئەسـتۆی کـارو ئەنجامدانی.

**المنـدوب:** بـەزمانی دانیـشتوانی مەککە واتـە: پێغەمبـەرو ڕەوانـەکراو ٥ کەسێك لەجیاتی یەکێکی تر کارەکە ئەنجام بدا جێگرو وەکیل ٥ کـرداری سـوننەتو پەسـەند لای خـواو لای شەرع.

**النادِبَـةُ:** ئافرەتێـك شـین بگێـڕێو وایەشـێرە بکـا ٥ بـەپیاوی مـردو دا هـەڵبڵێو ڕەوشـتە جوانـەکانی بـیر شـینگێڕو دانیـشتوانی ماتەمینەکـە بینێتەوە.

النَّدْبُ: چوستو چالاكو خێرا گورجو گوڵ ٥ ئادەمیزادی نەجیبو ڕەوشت بەرز ٥ ئەسپی ڕەسەن.
النَّـــدَبُ: شـوێنكەی بـرین ٥ شـوێنی پاشمـاوەی بـرین ٥ شـتێك گـرەوی لەسەر بكرێ ٥ كەوانێك تیرەكە تیژ بهاوێژێ.
النُدبَةُ: لەزاراوەی نـەحوییان دا بـەمانا بـــانگكردنو هـــاوار لێكـــراو دێ، دەگوترێ: (وا محمداه) (وا معتصماه).
نَدَحَ الشَّيْءَ نَدْحاً: شتەكەی فراوان كرد.
إنتَـدَحَت الغَـنَمُ في مرابـضها: مـەڕو بزنــەكان لــە حەوشـــەو كـــۆزو ئاغەڵــەكانیان دا بــڵاو بوونـــەوەو پەرتەوازە بوون.
تَنَـدَّحت الغـنم في مرابـضها: بـەمانا (إنتدحت) دێ.
المندوحـة: دەگـوترێ: (أرض مندوحـة) زەوییەكی فراوانـە ٥ دوورە ٥ هـەروا دەگـوترێ: (ولـك عَـنْ هـذا الأمـر مندوحـة) لەكارەكەدا ئـەتۆ مـەودای فراوانـت هەیـەو دەستت كراومیـە ٥ (ك: مناديح).
النَدْحُ: بەرفراوان ٥ زۆر.
النُّـــدْحُ: قـورس ٥ تارمـــایی، شـــتێك لەدورەوە ببیینی.
النُّدْحَةُ: زەوی بـەرفراوان ٥ دەشـتایی ٥ دەگـوترێ: (إنك لفي ندحة من الأمر) ئـەتۆ لـەم كـارەدا مـەودای فراوانـت لەبەردەم دایە ٥ مەجالت كراومیە.
ندَخَهُ نَدْخاً: بەرەو ڕوی بـوو، خـۆی پـێ كێشا.
أندَخَهُ: بەمانا (نَدَخَهُ) دێ.
تَنَدَّخَ: زۆر خـۆی هەڵكێشا، زۆری كـاری سەرومری پاڵ خـۆی دانو هیچیانی نەكردبوون.
المِنْدَخُ: كەسێك خوێڕیو هیچو پوچ بێ گوێ نەدا بەوەی چ بەخـەڵكی دەڵێ یان خەڵك چی پـێ دەڵێن لەقسەی ناشیرین.
نَـدَّ الـبعيرُ ونحـوه نَـدّاً ونـدوداً: حوشـترەكە بەلەسـه بـوو ٥ دەشـكوترێ: (نَـدَّت الفكـــرة عـــني) فكـرم تـەرەبوو بـیرم ڕۆیشت.
نَـــدَّت الكلمـــة: وشـــەكە نایەتـــە ژێـــر كـۆنترۆڵی یاسـاو ڕێـسای زمانـەوە، قاعیدە نایگرێتەوە.
نـدَّدَ بفـلان: عـەیبو عـاری فلانكەسـی ئاشكراكردن.
نَـــدَّد القطيـــعَ: جەڵەبـــە ئاژەڵەكـــەی پەرتەوازە كردن.
نـــدَّد صَـــوْته: دەنگـی نـاڕەزایی بــەرز كردەوە.
تنادَّ القوم: خەڵكەكە پەرتـەوازە بـوون

یەکیەتیان لێك ترازا.

**النَّادُّ**: رزق‌و ڕۆزی ٥ دەگوترێ: (لیس لهم نادّ) ئەوانە ڕزقیان نیە.

**النَّدُّ**: جۆرە ڕوەکێکە لاسکەکەی دەکرێ بەبخور.

**النِّدُّ**: هاوشان‌و ڕکابەر ٥ دەگوترێ: (هو نِدُّهُ) ٥ (ك: أنداد) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً﴾.

**النَّدِیدُ**: بەمانا (النِّدُّ) دێ ٥ (ك: نُدداء وأنداد).

**نَدَرَ الشَّیْئُ نُدوراً**: شتەکە بەربۆوە هەڵوەری.

**هَزَّ الغُصْنُ فندرت منه الثمار**: لقەکەی ڕاوەشاند میوەی لێ هەڵوەری ٥ دەشگوترێ: (ندر العظم عَنْ موضعه) ئێسقانەکە لەشوێنی خۆی دەرچوو.

**نَدَرَ فلان في العلم والفضل**: فلانکەس لە عیلم‌و زانیاری دا پێش کەوت‌و هاو وێنەی کەمە.

**نَدَرَ الكلام ندارة**: قسەکە ڕەوان‌و کاریگەر بوو.

**أندر**: شتی ناوازەی هێنا ٥ قسەی عەنتیکەی کردن کاری کەس نەکردووی ئەنجام دا.

**أَنْدَرَ الشَّیْئَ**: شتەکەی داشکاند ٥ دەگوترێ: (أندر التاجِرُ من حسابي کذا) بازرگانەکە لەحیسابی من ئەوەندەی داشکاند ٥ دەشگوترێ: (أَنْدَرْتُ يد فلان عَنْ هذا العمل) دەستی فلانکەسم لەو ئیشە کێشایەوە، لەسەر کارەکە لام برد.

**أندر العظم من وضعه**: ئێسقانەکەی لە شوێنی خۆی جوولاند.

**تنادر**: قسەی عەنتیکەو خۆشی گێڕانەوە.

**تنادر على فلان**: گاڵتەی بەفلانکەس کرد.

**تنادر علینا**: جار جار دەهاتە لامان.

**إِسْتَنْدَرَ**: شتەکەی بەناوازەو نادر زانی.

**إِسْتَنْدَرَ القوم أثر فلان**: خەڵکەکە شوێن ڕێبازی فلان کەوتون‌و کاریگەریی ئەویان بەسەرەوە دیارە.

**إِسْتَنْدَرَ الحیوانُ الرَّطْبَ**: حەیوانەکە لە لەوەڕی تازە گەڕا.

**النادِرَة**: قسەی گاڵتەو گەپ ٥ دەشگوترێ: (هو نادرة زمانه) ئەو مرۆڤە تاقانەی ڕۆژگاریی خۆیەتی.

**النَّدَری**: دەگوترێ: (لَقَیْتُهُ النَّدَرَی) کەم کەم توش بووم.

**النَّدْرَةُ**: پارچەی زێڕو زیو کە لەکان دا دەردەهێندرێ.

**النُّدْرَةُ**: دەگوترێ: (لایکون ذلك إلا نُدْرَة) ئەو شتە کەمجار وادەبێ، واڕی دەکەوێ.

نَدَسَ فلاناً بالشيئِ نَدْساً: زەبرێکی سوکی لەفلان دا ٥ دەگوترێ: (نَدَسَهُ بالرمح) بەرمب بەهێواشی لێی دا.

نـدسَ الأرض برجلـه: بەقاچی پێپرکەی لەزەوی کرد.

نَدَسَه بكلمة: بەهێواشی جنێوی پێ دا.

نَدَسَ بفلان الأرض: فلانکەسی بەزەوی دا دا خستی.

نَدَسَ الشَّيْئَ عَنْ الطريق: شتەکەی لەرێگا دوورخستەوە.

نَدِسَ نَدَساً: زیرەك بوو، زۆر بەوردی لە ئیشەکان ورد بۆوە ٥ دەنگی بەئەسپایی و نزمی زوو بیست.

نادَسَهُ: زەبری لێ دا ٥ ناو و ناتۆرەی ناشیرینی لێنا.

تَنَدَّسَ ماءُ البئر: ئاوی بیرەکە لەهەر چوار لایەوە سەر ڕێژی کرد.

تَنَدَّسَ الرجلُ: پیاوەکە بەزەوی دا دراو کەوت، کوژرا ٥ دەگوترێ: (نَدَسَ بە الأرض فَتَنَدَّس).

تَنَدَّسَ الخَبَرَ وعنه: لەهەواڵەکەی کۆڵیەوەو هەوڵی دا پێش هەموو کەس ئەو بیزانێ.

النادس من الرماح: ڕمبی وەشاو و بەکارهاتوو لە لێدان دا.

النِدْسُ: دەنگی نزم.

النَّدَسُ: عەقڵو لێزانی.

النُّدُسُ: ئەو کەسەی تێکەڵاوی خەڵك دەبێو ئەرکی خۆی ناخاتە سەریان.

نَدَشَ عَنْ الشَّيْئِ نَدْشاً: باسی شتەکەی کرد، لەشتەکەی کۆڵیەوە.

نَدَشَ القُطْنَ: لۆکەکەی شی کردەوە هەلاجی کرد.

نَدَصَ الشَّيْئُ من الشَّيْئِ: شتەکە لەشتەکە دەرچوو هاتە دەر ٥ دەگوترێ: (نَدَصَت النواةُ من التمرة) ناوکە خورماکە لە خورماکە هاتەدەر.

ندصت العينُ: چاوەکە زەقو دەرپەڕیو بوو.

نَدَصَ البَثْرَةَ: دومەڵەکەی گوشی کێمو زوخاوی لێ دەرهات.

نَدَصَ القومَ: شەڕی توشی خەڵکەکە کرد، شەڕی پێ فرۆشتن.

المِنْدَاصُ: دەگوترێ: (رجل منداص) پیاوێکی شەڕانیو بەد ڕەوشتە هەر هەوڵی ئەوەیەتی کاری وابکا خەڵك ئەززیەت دا ٥ (إمْرأة مِنداص) ئافرەتێکی عەقڵ سوکو چەقەچەناوە.

نَدَغَ فلاناً نَدْغاً: لە فلانکەسیەوە ژەنی، نقورچکی لێ گرت.

نَدَغَ المرأةَ: دڵداری لەگەڵ ئافرەتەکە کرد.

نَدَغَ العَقْرَبُ فلاناً: دووپشك بەفلانکەسیەوە دا.

**نَدَغَ فلان فلاناً**: فلانكەس جنێوی بە فلان دا.

**أَنْدَغَ بفلان**: خراپەی لەگەڵ فلانكەس كرد.

**نَدَّغَ العجين**: ئاردی بە هەویرمكە كرد.

**نادَغَ المرأة**: دڵداری لەگەڵ ئافرەتەكە كرد.

**إِنْتَدَغَ**: پێكەنینەكەی هێواش كرد.

**المِنْدَغ**: ڕمب ومشێن ٥ جنێو دەر، زمان پیس.

**النُّدْغَةُ**: سپیایی بنكی نینۆك.

**ندفت الدَّابَّةُ نَدْفاً ونَدَفاناً**: ولاخەكە لە ڕۆیشتن دا پەلەی كرد، خۆشڕۆ بوو.

**ندفت السماء بالمطر وبالثلج ندفاً**: ئاسمان بارانی باراند، بەفری باراند ٥ بەفری تێ كرد.

**نَدَفَ القطن**: بە ئامێری هەلاجی لۆكەكەی شی كردەوە.

**أَنْدَفَ**: حەزی لەدەنگی عودو كەمان بوو.

**أَنْدَفَ الدابة**: بەخێرایی و بەزەحت ولاخەكەی لێ خوڕی.

**نَدَّفَ القُطْنَ**: لۆكەكەی زۆر شتی كردەوە.

**المِنْدَفُ والمِنْدَفَةُ**: ئەو دارو ژێو حەبلەی هەلاج لۆكەی پێ شی دەكاتەوە.

**النِّدافَةُ**: پیشەی هەلاجی.

**النُّدافة**: ئەو وردە خشتو خاشاكەی لە لۆكە دەكەوێتە خوار لەكاتی هەلاجی كردنی دا.

**النَّدَّاف**: هەلاج؛ ئەو كەسەی لۆكەكە شی دەكاتەوە یان ئەو ئامێرەی لۆكەكەی پێ شی دەكرێتەوە.

**النُّدْفَة**: شتی كەم، چۆرێك ٥ دەگوترێ: (سقاني ندفة لَبَن).

**نَدَلَ الشَّيْءَ نَدْلاً**: شتەكەی بەخێرایی گواستەوە ٥ شتەكەی دزی ٥ بەدەستی خۆی شتەكەی لە شوێنی خۆی دەرهێنا.

**ندلَ ندَلاً**: چڵكن بوو ٥ دەگوترێ: (ندلت يده) دەستی چڵكن بوو.

**إِنْتَدَلَ الشَّيْءَ**: شتەكەی هەڵگرت توانی هەڵی بگرێ.

**تَنَدَّلَ بالمنديل**: بەپەڕۆ سەری شتەكەی سڕی.

**نَوْدَلَ**: لە بەرپیری شەپلە لێی دا، توشی لەرزین بووە ٥ شلو بێ هێز بووە ٥ دەگوترێ: (مشى مُنَوْدِلاً) بەشلو شێواوی ڕۆیی.

**المَنْدَلُ**: لقەدرەختی بۆنخۆش ٥ جۆرێكە لە فالگرتنەوەو كوڵەومنانی كاهینو دەست بڕ بەكاری دێنن بۆ دۆزینەوەی شتی ونبوو.

**المِنْديل**: پارچە قوماشێکی بچوکی چوارگۆشەیە بەکوردی پێی دەگوترێ دەسەسڕ دەمو چاو و دەستی پێ وشك دەکرێتەوە.

**النّادِلُ**: کەسێك خواردنو خواردنەوە پێشکەش بە خەڵك بکا.

**نَدِمَ على الأمر نَدَماً**: لەکارەکە پەشیمان بۆوە، خەفەتی پێ خوارد ٥ پەشیمان بوو لە ئەنجامدانی، خوازیار بوو ئەو کارەی نەکردایە.

**أنْدمهُ**: پەشیمانی کردەوە.

**نادَمَهُ منادمةً ونِداماً**: هاوکاری کردو هاونشینی بوو لەخواردنەوەدا.

**نَدَّمَ عليه**: بەمانا (أنْدَمَهُ) دێ.

**تنادم القومُ**: خەڵکەکە دانیشتن بۆ خواردنەوە.

**تَنَدَّمَ على الأمر**: خەفەتی خوارد لەسەر ئەوەی ئەو کارەی کردووە.

**إنْتَدَمَ الأمْرُ**: کارەکە ئاسان بوو ٥ دەگوترێ: (خذ ما انتدم).

**المَنْدَمُ**: پەشیمانی.

**المَنْدَمَةُ**: هەرشتێك مرۆڤ هەڵنێ بۆ پەشیمان بوونەوە.

**النَّديم** : هاو ڕێی سەرمێزو شەرابخواردنەوە.

**نَدَهَ الرجلُ نَدْهاً**: پیاوەکە هاواری کرد.

**نَدَهَ الإبلَ**: حوشترەکانی بەکۆمەڵ لێخوڕین.

**إسْتَنْدَهَ الأمْرُ**: کارەکە جێگیر بوو.

**المِنْدَهُ**: دەگوترێ: (رجل مِنْدَهٌ) پیاوێکە زۆر هاوار دەکاو دەقیڕێنێ.

**النُّدْهَةُ**: دەنگ.

**النَّوادِهُ**: داکۆکیکارو مەنع کەرو لەمپەرو پەرژین.

**نَدا القومُ نَدْواً**: خەڵکەکە لە یانە کۆبوونەوە.

**نَدا القَوْمَ**: خەڵکەکەی لەیانە کۆکردەوە ٥ دەشگوترێ: (ما ینْدوهم النادي) یانە بەشیان ناکا ئەوەندە زۆرن جێگایان نابێتەوە.

**نَدِيَ الشَّيْءُ نَدىً ونداوة**: شتەکە تەڕبوو شەی هەڵێنایەوە.

**نديت الأرض**: زەوییەکە شەونم لێی دا.

**نَدِيَ فلان**: فلانکەس بەخشندە بوو سەخاوەتی زۆر کەسی گرتەوە ٥ دەشگوترێ: (ما نديت بشيء من فلان) هیچم لەفلانکەس دەست نەکەوت ٥ دەنگی خۆش کە درێژ بکرێتەوەو بەبەرزی بگوترێ.

**أنْدى فلان**: فلانکەس بەخششو پیاوەتی زۆر بوو ٥ دەنگو صەدای خۆش بوو.

**أندى الشَّيْءَ**: شتەکەی واڵ کرد تەڕو شێدار بێ.

نـادي الـشَّيْءُ منـاداةً ونِـداءً: شـتەكە دەركەوت.
نـادي النَّبـتُ: ڕوەكەكـە پێگـەیی‌و تێکهالا.
نـادي فلانـاً: بـانگی فلانکەسـی کـرد بـەدەنگی بـەرز ٥ لەیانـە دا لەگـەڵی دانیشت: ڕاوێژی پـێ کـرد ٥ شـانازی بەسەردا کرد.
نادي بِسِرِّه: نهێنیەکەی ئاشکرا کرد.
نَدَّ الشَّيْءَ: شتەکەی تەڕو شێدار کرد.
نـدي الفَـرَسَ: ئەسـپەکەی هـەلینگ دا تـا عارەقی پـێ کـرد ٥ دەشـگوترێ: (هـو لا تُنَدّي إحـدی يديـه الأخـری) دەسـتێکی بەدەسـتەکەی تـری نابەخـشێ! واتـە: بەخیلە.
إنْتَدَى فلان: فلانکەس عەتاو بەخششی زۆر بـوو ٥ دەشـگوترێ: (مـا انتـديت منـه شـيئاً) هـیچ خێـرو بێـرێکم لێ نەدیوە.
تنـادي القـومُ: خەڵکەکـە هەنـدێکیان بانگی هەندێکیان کـرد ٥ لـە یانـە دا کۆبوونـەوە.
المُنْتَدى: یانەی گەڵ‌و هۆزو دیوەخانەی عەشـرەت‌و شـوێنی ڕاوێـژو قـسە گۆڕینەوەی ناو خۆیان.
تَنَدَّى المكانُ: شوێنەکە تـەڕبوو تـەڕایی شێی لێ پەیدا بوو.

المُنْدِيـةُ: وشـەیەك یـان کردەوەیـەك ئەوەنـدە ناشـیرین بـێ عـەرەق بـەمرۆڤ بکـا ٥ کـرداروگوفتـاری شەرم ئاوەر.
النّادي: یانـەو ئەنجومـەن ٥ دیوەخـان‌و شـوێنی کۆبوونـەوەی گـەڵ‌و هـۆز ٥ یـان شـوێنی کۆبونـەوەی چـینێکی تایبـەتی خـەڵك وەکـوو یانـەی مامۆستایان، یانەی ئەفسەران.
النادِيـةُ: لایـەن‌و دەفـەر ٥ (نادیـات الشَّيْءِ) سەرەتای شت ٥ نۆنەخشەی شت.
النَّـدى: شـەونم ٥ هـەڵمی ئـاوە بـەرز دەبێتـەوە بـۆ حـەوا لەچـینە ساردەکانی هـەوادا خەسـت دەبێتەوەو لەشەودا لەشێوەی دڵۆپە بـارانی زۆر ورد دا دەبارێتـە سـەر زەوی ٥ هـەروا ئـاوە بـۆ بـاران ٥ بـۆ سـەخاوەت‌و بەخـشندەیی‌و خێـرو بێر ٥ (ك: أنداء وأندية).
النَّدْوةُ: یەکجار واتە: (إسم مرة) یـە ٥ یانەو ئەنجومەن ٥ کۆمەڵە مرۆڤێك لەیانەیـەك دا کۆببنـەوە بـۆ ڕاوێـزکردن‌و بـاس‌و لێکۆڵینـەوە دەربارەی کارێك ٥ (دار الندوة) هـەر خانو و باڵەخانەیەك خەڵك تێیدا کۆببنـەوە بـۆ بـاس‌و ڕاوێـژو

لێکۆڵینـــــەوە ە قورەیـــــشییە عەرەبەکان لە پێش هاتنی ئیسلام ئـەم جـۆرە یانـەو ئەنجومەنـەیان هـەبوو تێیـدا کۆدەبوونـەوە (قـصي کوڕی کیلاب) کە یەکێکە لە باپیرە گـەورەکانی پێغەمبـەر لـە ڕۆژگـاری خۆی دا بنیاتی نـابوو دوایـی پـشتاو پـشت بـۆ ئـەو بەرەبابـە مایـەوە ە موعاوییـە لـە ڕۆژگـاری خـۆی دا کرێو کردی بە (دار الإمارة).

**النّدي**: تەڕ.

**النَّـدِيّ**: بـەمانا (النّـدِي) دێ ە یانـەی گـەلو هـۆزو شـوێنی کۆبوونـەوەیان بـۆ بـاسو ڕاوێـژ دەربـارەی کـاری گـرنگ ە دەشـگوترێ: (هـم نـدی الکـفّ) ئەوانـە سـەخی سروشـتن دەست کراوەو بەخشندەن.

**نَدِيَ** الـصوت: دەنـگ خـۆش ە یـان دەنگـی بـاش دەڕواو پـشوو درێـژە بـۆ دەنـگ هەڵدان.

**النَدْیانُ**: تەڕبوو، شێدار.

**نَــذَرَ الــشَّيْءَ نَــذْراً ونُــذوراً**: شـتەکەی لەسەرخۆی پێویست کـرد ە دەگـوترێ: (نَذَرَ مالَهُ لله) و (نَذَرَ علی نفسه أن یفعل کذا).

**نَذِرَ بالشیءِ نَذْراً ونذارة**: بەشتەکەی زانیو لێـی بـەئاگا بـوو ە دەگـوترێ: (نَـذِروا بالعَـــدُوِّ) بەدوژمنەکـــەیان زانـــیو چاودێری هەڵسو کەوتو جمو جوڵی ئەویان کرد.

**أنْـذَرَهُ الـشَّيْءَ**: شـتەکەی پـێ زانانـدو هۆشداری دایە کە وریای بێ.

**تنـاذر القـومُ**: خەڵکەکـە هەنـدێکیان هەنـدێکیانیان لەشـەڕو خراپـەکاری ترساند.

**النِّذارَة**: ترساندن، هۆشدار کردن.

**النَّذْرُ**: فۆتۆ، ئەوەی بەنـدە لەسەر خۆی پێویـست دەکـا بـۆ پـەروەردگاری لـە بەخـشینی مـاڵ یـان لەئەنجامـدانی تاعەت.

**النَّذيرُ**: ترساندن، ترسێنەر ە (ك: نُذُرٌ)

**النَّذيرةُ**: ئەوەی مرۆڤ بەشێوەی نـەزرو فۆتۆ دەیبەخشێ.

**نَذيرة الجيش**: پێشەتای سوپا، ئەو بەشە سوپایەی دەبنە ڕەصـەدو چاودێری بەسـەر دوژمنـەوە سـات بەسـات هەواڵی جمو جوڵی سوپای دوژمـن بەسوپای لەمەڕ خۆیان دەگەیەنن.

**نَذَعَ الماءُ أو العرقُ**: ئاو یـان عـارەق دڵۆپ دڵۆپ هاتەدەر.

**النَّذَعَةُ**: قەترە ئاو و شتی لەو جۆرە.

**نَذُلَ نذالة ونُذولة**: خوێڕی بوو هیچو پوچ کەوتە دەشتێ ە (ك: أنذال ونذول).

**النـرجِسُ**: نێـرگس ە چـەند جـۆرێکی

هەيــە بــۆ جــوانیو ڕازاندنــەوەی باخـچەو بـۆنی خـۆش دەروێنـدرێ، هەروا خۆرسکیش دەڕوێ.

**النرجسية:** جـۆرە شـزوزێکی جنـسییە مرۆڤەکە حەزی لەخۆیەتی.

**النارجيل:** ڕەگەزی درەختـی خورمـایی، فرەجـۆرە دەروێنـدرێ بـۆ جـوانی، هەنـدێکی بـەردارە، نـاوێکی تـری هەيـە پـێـی دەگـوترێ: (الشعـصور والــرانج) ئـەم جـۆرە بـۆ سـود وەرگـرتن لەبەرەکـەی دەروێنـدرێ بەرەکەيــشی گــوێزی هيندیيــە، ڕۆنێکــی لێ بەرهــەم دەهێنــدرێ باشترين ڕۆنە پێی دەگوترێ: (سمونا نباتية).

**النارجيلـة:** نێرگەلـە، ئـامێرێکی تـوتن کێشانە لـەجياتی سـەبيلەو قەڵـنەو جگــەرە دەخـــورێ، لەســـەرەتادا قاعيدەی ئەم ئامێرە لەداری گوێزی هيندی دروستکراوە دوايی لەشوشە دروست کراوە.

**النَّرْدُ:** ياری تاوڵە ٥ (صندوقێكو چەند داشێكن).

**النّـرْدِنُ:** ڕوەکێکـی بـچوکی بۆنخۆشـە پەلکــە گــەڵاکانی درێــژن ڕەنگــی زەردی مەيلەو شلّەيە.

**الناردين:** بەمانا (النَرْدِن) دێ.

**النّـارنج:** نـارنـج؛ درەختێکـی بـەردارە هەميـشە سـەوزە چـەند مـەترێك بەرز دەبێتـەوە بۆنی خۆشـە، گوڵی سـپی دەردەدا، گوڵەکەشـی بـۆنێکی زۆر خۆشی هەيە، لەوەرزی بـەهاردا گــوڵ دەکــا، بەرەکــەی لەشــێوەی پرتــەقاڵ دايــە تــامی زۆر تــرشو مەيلـەو تاڵـە ٥ لـە گوڵەکـەی گـوڵاو دروست دەکرێ عەترو شتی وا شی لێ دروســت دەکــرێ ٥ توێکڵەکەشــی بڕی دەرمانی لێ بەرهەم دەهێندرێ.

**نَزَأَ بين القوم نَزْءاً ونزوءاً:** دژايـەتی خـستە نێـوان خەڵکەکـەوە ٥ دەگـوترێ: (نـزأ الشيطان بينهم).

**نَزَأَ عليه نزءاً:** سواری بوو، چووە کۆڵی.

**نَزَأَ فلاناً وعليه:** سـواری فـلان بـوو چـووە کۆڵی.

**نَزَأَ فلاناً عَنْ الشَّيْ:** فلانکەسی لـەو شـتە گێڕايەوە.

**نُـزِئَ بـە:** خۆشـی ويـست، عاشـقی بـوو ٥ حەزی لێ کرد.

**النّـزاءُ:** دەگـوترێ: (رجـل نـزّاءٌ بكـذا) پياوێکە شێتو شەيدای ئەو شتەيە، حەزی لێيەتی.

**النَّزِيُّ:** دەگوترێ: (فلان نَزِيٌّ) فلانـکەس فيتنەو ئاشوبگێڕە دژايەتی دەخاتـە نێـوان خەڵکـەوە ٥ کونـدەی بـچوك، دێمكەی بچوك.

**نَــزَحَ نَزْحــاً ونزوحــاً**: دووركەوتــەوە ٥ دەگوتریٚ: (نزحــت الــدار) خانوەكەی دوورە ٥ (نَزَحَــت البئــرُ) بیرەكـە ئـاوی داكـــەوت، كـــەم بـــوو، ئاوەكـــەی دووركەوتەوە.

**نَزَحَ البِئرَ ونحوها نَزْحاً**: بیرەكـەی دەردا تـا ئاوەكـەی كـەم بـوو یـان هـەرئاوی تیّـدا نەما.

**نُـــزِحَ بفـــلان**: فلاّنكـەس لـەولاّتی خـۆی دووركەوتـــەوە و دیـــار نـــەماو دیـــار نەبوونەكەی دریّژەی كیّشا.

**أنْزَحَ الشَّيْءَ**: شتەكەی دوور خستەوە.

**أنْزَحَ البِئرَ**: بیرەكەی دەردا.

**إنْتَزَحَ**: دووركەوتەوە.

**المِنْزاحُ**: كەسیّك زۆر سـەفەر بـۆ ولاّتـی دوور بكا.

**المِنْزَحَة**: ئامیّری ئاو هەلّیّنجان ٥ وەكـوو دۆلّچەو شتی وا.

**النـازِح**: دەگـوتریٚ: (بلـد نـازح) ولاّتـی دوور (بئر نازح) بیری كەم ئاو.

**النَّزَحُ**: ئاوی لیلّ ٥ (والبئر النَّزَحُ) بیریّك ئاوی تیّدا نەبیٚ.

**النَّزوح**: بیری كەم ئاو ٥ بیریّك ئاوەكەی زۆر لیّلّ بیٚ.

**النَّزيحُ**: دوور.

**نَزَرَ الشَّيْءَ نَزْراً**: شتەكەی كەم كردەوە.

**نَزَرَ فلاناً**: فلاّنكەسی بەهیچو پوچ زانیو سوكایەتی پـیٚ كـرد ٥ پەلـەی لیٚ كـرد، هەلّینا ٥ وردە وردە چی لابوو هەمووی لیٚ وەرگرت.

**نَزَرَ الشرابُ فلانـاً**: شـەرابەكە فلاّنكەسـی سەرخۆش كرد.

**نَزُرَ الشَّيْءُ نزارة ونزورةً**: شتەكە كەم بوو.

**نَزُرَ فلان**: فلاّنكـەس خیّـرو بیّـری كـەم بوو.

**نَزُرَت الأنثى**: میّینـە شـیردەرەكە شیری كەم بوو.

**أنْــزَرَ العَطــاءَ**: بەخشـشەكەی كـەم كردەوە.

**نَزَّرَ العَطاءَ**: بەخششەكەی كەم كردەوە.

**تَنَــزَّرَ مِــن الــشَّيْء**: لەشـتەكەی كـەم كردەوە.

**تَنَزَّرَ**: خـۆی پـالّ هـۆزی نـزارە دا ٥ یـان خۆی شوبهاند بەیەكیٚ لەو هۆزە.

**المنزور**: دەگـوتریٚ: (شـيء منـزور) شـتی كەمو بیٚ نرخ ٥ (أعطاه عطاء منزوراً) بەپیّكیّـشیو ئیلحـاحی سـوالّكەرەكە بەخششی دا ٥ (عطـاء غـير منـزور) بەخششی بیٚ ئیلحاح و پیّكیّشی.

**النَّزْرُ**: دەگـوتریٚ: (شيء نزرٌ) شتی كـەمو بیٚ نرخ.

**رجـل نَـزْرٌ**: پیـاوی بـیٚ خیّـرو بیّـر ٥ دەشـگوتریٚ: (مـا جئـت إلا نـزراً) بەتەمبەلّی هاتم.

**النَّزْرَةُ من الإناث:** مێینەی کەم بێچوو کەم شیر.

**النَّــزورُ:** هــەر شــتێك کــەم ببــێ ٥ دەگوتریّ: (رجل نزور) پیاوێکی کەم قسەیە.

**النَّزیــرُ:** کــەمو بــێ نــرخ ٥ دەگــوتریّ: (عطاء نزیر) بەخششێکی کەم.

**نَــزَّ المكــانُ نَــزّاً ونزیــزاً:** شــوێنەکە بــوو بــە قوڕەلیتــە ٥ بــوو بــەزۆنگاو ٥ شــوێنەکە زۆنگاوی زۆر بوو.

**نَزَّ الفـؤادُ نَـزّاً:** دڵەکـە زۆر وریـاو زیـرەك بوو.

**نَزَّ الظَّبْيُ:** ئاسکەکە بازی داو باڕاندی.

**نَزَّ وتر السهم:** ژێی کەوانەکە لەکاتی تیر هاویشتن دا تێکچوو.

**نَــــزَّ فـــلان عــــني:** فلانکـــەس لـــێم دوورکەوتەوەو گۆشەگیر بوو لێم.

**أَنَــــزَّ المكــــانُ:** شــوێنەکە زۆنگــاو و شێدارییەکەی درێژەی کێشا.

**أَنَـزَّ الرجـل:** پیاوەکـە زێـدەڕۆیی کـردو توندو تیژ بوو.

**نــازَّ فلانــاً منــازَّةً ونِــزازاً:** ڕکابــەری فلانکەسی کـردو لەگـەڵی دا کەوتـە کێشەوە.

**نَزَّزَهُ عَنْ كذا:** بەدووری گرت لـەو شتـە، بــەپاكو خــاوێنی دایــە قەڵــەمو لەشتی خراپ بەپاکی ڕاگرت.

**نَــزَّزَت الظبیـــة ولـــدها:** ئاســکەکە بێچووەکەی پەروەردە کرد.

**المِنَزُّ:** دەگـوتریّ: (رجـل مِنَـزٌّ) پیـاوێکی جـەو جـوڵ کـەرەو لـەهیچ شـوێنێ ناحەجمێ ٥ لانکەی منداڵ.

**النَّزازُ:** دەگـوتریّ: (هـو نِـزازُ شـرّ) ئـەو شەڕانییە واز لەشەڕ کردن ناهێنێ.

**النَّزُّ:** ئەوەی لـەزەوی دا بـەهۆی ئـاوەوە دەبێتــە زۆنگــاو و شــێدارو قــوڕو لیتــەی زۆر دەبــێ ٥ (رجـــل نَـــزٌّ) پیـاوێکی دڵ وریایـە ٥ یـان سـەخی سروشــتە ٥ یــان زۆر جــەو جــوڵ دەکاو لەجێگایەك ناسرەوێ ٥ (مکان نَزٌّ) شوێنێکی زۆنگاو و شێدارە.

**النَّــــزَّةُ:** ئــــارەزوو شــــەهوەتی زۆر ٥ چلێسی.

**النَّزیزُ:** دەگوتریّ: (رجل نزیز) پیـاوێکی زەریفو ڕۆح سوکە ٥ یان زۆر جەو جوڵکــەرەو هــارو هاجــە ٥ یــان چـلێسو شـەهوانییە ٥ (نزیـز شـرّ) شەڕانییەو واز لەشەڕکردن ناهێنێ.

**نَــزَعَ المـریضُ نزعــاً:** نەخۆشـەکە کەوتـە حاڵەتی گیانەڵاوە.

**نَزَعَـت الـشمسُ:** خـۆر ئـاوابوون نزیـك بۆوە.

**نَزَعَ إلى أهله:** ئارەزووی لای ماڵو منداڵی خۆی کردو کەوتە ناڵەو فیغان بۆلایان.

**نَزَعَ عَنْ الأمر:** وازی لەشتەکە هێنا.

**نَزَعَ أباه:** شێوەی چووە سەر باوکی.

**نَزَعَ الشَّيْءَ من مكانه نزعاً:** شتەکەی لەشوێنی خۆی دەرهێناو هەڵی کەند ٥ دەشگوترێ: (نَزَعَ الأمير عامِلَهُ) پاشا پیاوە کاربەدەستەکەی خۆی لەسەر کارەکەی لابرد.

**نَزَعَ يده من جيبه:** دەستی لەباخەڵی دەرهێنا.

**نَزَعَ يده من الطاعة:** لەڕێو ڕەسمی فەرمانبەرداری چووە دەرو کەوتە سەرپێچی کردنو یاخی بوون.

**نَزَعَ معنى جيداً من الآية:** مانایەکی جوانی لەئایەتەکە دەرهێنا.

**نَزِعَ نَزْعاً:** قژی ئەملاو ئەولای پێشەسەری هەڵوەرین ٥ (فهو أنزع وهي نزعاء).

**نازَعَ المريض نِزاعاً ومنازعةً:** نەخۆشەکە لەکاتی گیانەلاودا زۆری هاتو هاوار کردو ئازاری زۆر بوو.

**نازَعَ نفسه إلى أهله:** دڵی کورکاندی بۆلای ماڵو منداڵی.

**نازَعَ فلاناً:** بەربەرەکانی فلانکەسی کرد، کێشەی لەگەڵ نایەوە.

**نازع الشَّيْءُ غَيْرَهُ:** شتەکە بەوی ترەوە لکا ٥ دەگوترێ: (أرضي تنازع أرضه) زەوییەکەم لکاوە بە زەوی ئەوەوە.

**نازَعَ فلاناً الشَّيْءَ:** شتەکەی بۆ ئەو کێش کرد.

**نازع الرجلُ غَيْرَهُ الكأسَ:** پیاوەکە پیاڵە شەرابەکەی دا بە یەکێکی تر.

**نَزَّعَهُ من مكانه:** لەشوێنی خۆی هەڵی کەند.

**إنْتَزَعَ الشَّيْءُ:** شتەکە هەڵکەندرا.

**إنْتَزَعَ عَنْ الشَّيْءِ:** لەشتەکەی داڕنی، لێی هەڵکێشا.

**إنْتَزَعَ الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵکەند ٥ ڕفاندی.

**إنْتَزَعَ للصيد سهماً:** تیرێکی بە نێچیرەکەوە نا.

**تَنَزَّعَ الى الشَّيْءِ:** پەلەی کرد بۆ شتەکە.

**تَنَزَّعَ الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵکەند.

**تنازع القومُ:** خەڵکەکە کێشەیان تێکەوت ٥ دەشگوترێ: (تنازعوا في الشَّيْءِ).

**تنازع القوم الشَّيْءَ:** خەڵکەکە شتەکەیان بۆلای خۆیان کێش کرد.

**إسْتَنْزَعَ فلاناً عَنْ الشَّيْءِ:** داوای کرد لەفلان کە شتەکەی لێ دابڕنێ، لێی وەربگرێ.

**المَنْزَع:** شوێنی جل داکەندن، شوێنی لێ داڕنین.

**المِنْزَع:** تیرێك دوور بهاوێژرێ ٥ دەشگوترێ: (رجل مِنْزَع) پیاوێکە بەناخۆشی گیانی دەدا.

**المَنْزَعَـة**: کێشەو دژایەتی ٥ شوێنی داکەندنی شت ٥ ورەبەرزیو دڵقایمی ٥ دەگوترێ: (هو بعيد المَنْزَعَة) ئەو پیاوە ورە بەرزە ٥ (شراب طيب المنزعة) شەرابێکی تام خۆشو لەزیزە.

**المِنْزَعة**: کێشەو نیزاع.

**النازع**: غەریبو بیانی.

**النَّزَاعة**: کێشەو نیزاع.

**النَّـزْع**: گیانەڵاو ٥ حاڵەتی گیان دەرچوون.

**النَّزْعة**: شوێنی ڕوتانەوەی مو لەملاو لەو لای ناوچەوان ڕوتایی پەنا لاجانگ ٥ ڕێگای ناو کێو.

**النَّزْعاء من الجباه**: ڕوخسارێك قژی پێشەسەری هاتبنە پێشەوە ٥ موی لاجانگی بەرز بووبنەوە.

**النَّزوع**: ئەو کەسەی دەکورکێنێ بۆ وڵاتو بیری زێدو نیشتمانی دەکاتەوە ٥ دەشگوترێ: (بئر نَزوع) بیرێکە پڕە لەناو بەدەست دەتوانرێ ئاوی لێ دەربێنرێ ٥ (فلاة نَزوع) دەشتێکی دورو درێژە.

**النَّزوع في التربية**: حاڵەتێکی هەستییە مرۆڤ وای لێ دەکا ڕێبازێکی تایبەتی بگرێتە بەر بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك لە بواری پەروەردەدا.

**النَّزيع**: هەڵکەندراو ٥ لێکراوە، چندراو ٥ دەگوترێ: (ثَمَر نزيع) میوەیەکی چندراوە ٥ پیاوی دوور کەوتە لەوڵاتو نیشتمانی خۆی کەیادی وڵات بکاتەوەو بۆی بکورکێنێ ٥ (مكان نزيع) شوێنێکی دوور (فرس نزيع) ئەسپی ڕەسەن.

**النَّزيعة من النساء**: ئافرەتێك شوبکا بە بێگانە، بەپیاوێك لەعەشیرەتی خۆی نەبێ ٥ ڕەشەبای وێرانکار ٥ ئەوەی لەبێگانە ستێندرابێ.

**نَزَغ بين القوم نَزْغاً**: نێوانی خەڵکەکەی تێك دا، ئاژاوەی خستە نێوانیانەوە ٥ هەندێکیان هەڵنان بۆئەوەی ستەم لەوانی تر بکەن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿مِن بَعْدِ أَن نَّزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي﴾.

**نَزَغ فلاناً**: زەبری لەفلانکەس دا بەدەست یان بەڕمب ٥ لە پاشملە بەخراپی باسی فلانی کرد.

**النَّزاغ**: پیاوی فیتنەو ئاشوبگێڕ.

**النَّـزْغُ**: قسەیەك کە بە مەبەستی فیتنەییو دووزمانی بگوترێ ٥ (نزغ الشيطان) وەسوەسەو ختوکەی شەیتان کە مرۆڤ هەڵدەنێ بۆ تاوانکردن.

**النُّزْغَةُ**: زەبر ٥ نقورچك.

**النَّزيغة**: قسەی ناشیرین ◦ دەگوترێ: (نزغه بنزيغة) قسەیەکی ناشیرینی ئاڕاستەکرد.

**نَزَفَ الشَّيْءُ نَزفاً**: شتەکە بڕایەوە فەوتا، لەناوچوو، تێ شکا.

**نَزَفَ فلان في الخصومة**: فلانکەس لەکێشەو نیزاعەکەدا بۆڕی خواردو تێ شکا، بەلگەی نەما.

**نَزَفَ الدَمْعَ أو المالَ أو نحوهما**: فرمێسکی نەمان، ماڵو سامانی لەناو برد.

**نَزَفَه الفَزَعُ**: ترسی لەلا نەهێشت.

**نَزَفَ الدمُ**: خوێنی کەم بوو بەهۆی زۆر لێ هاتنە دەرەوەی.

**نُزِفَ فلان نزفاً**: فلانکەس خوێنی لەبەر ڕۆیی و بێهێز بوو.

**نُزِفَ عقله**: بەهۆی سەرخۆشی یان شتی ترەوە عەقڵی نەما ◦ (فهو منزوف ونزيف).

**أنْزَفَ فلان**: فلانکەس هیچی نەما ◦ دەشگوترێ: (جادلته حتى أنزف) لەگەڵی پێداهاتم و چووم تاهیچی بەدەستەوە نەما بۆڕدرا ◦ دەشگوترێ: (شرب خمراً فأنزف) شەرابی خواردەوەو سەرخۆش بوو.

**أنْزَفَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕاندەوە تەواوی کرد.

**المِنْزاف**: دەگوترێ: (معز مِنزاف) بزنێکە زوو شیری هەبوو ئێستا شیرەکەی وشکی کردووە.

**المِنْزَفَةُ**: ئەو شتەی ئاوی پێ هەڵدەهێنجی.

**النازِف**: دەگوترێ: (عرق نازف) دەمارێکە خوێنی پێدا نایە.

**نَزافِ**: (إسم فعله) بەمانا (إنْزَف) دێ.

**النُّزْف**: ئاوی هەڵێنجندراو ◦ زەعیفی و لاوازییەك بەهۆی زۆر خوێن لێ هاتنەوە پەیدا بووبێ ◦ برینێك خوێنی نەوەستێ.

**النُّزْفَةُ**: ئاوی کەم ◦ چۆڕە ئاو.

**النَّزُوف**: دەگوترێ: (بئر نزوف) بیرێکە ئاوی کەم تێدایە.

**النَّزيف**: تادار ◦ دەشگوترێ: (سکران نزيف) سەرخۆشێکە عەقڵی لەلانەماوە ◦ (بئر نزيف) بیرێکە کەم ئاوە ◦ (رجل نزيف) پیاوێکە تینوێتی هەموو ڕەگی جەستەی وشك بوونەوە، زمانی وشك بووە ◦ کەسێك زۆری خوێن لەبەر ڕۆیشتبێ و لاواز بووبێ ◦ هەروا وشەی (النَّزيف) ناوە بۆ بەربوونی خوێنی لوت، یان هاتنەدەرەوەی خوێن لەدەم و پوك و شوێنی وا ◦ بەهۆی نەخۆشییەکەوە ◦ یان بریندار بوونەوە.

**نَزَقَ الفرسُ ونحوه نَزْقاً ونزوقاً**: ئەسپەکە بازی داو بەگورجی پێشکەوت.

**نَزَقَ الإناءُ والغديرُ**: زەرفەکە یان زلکاوەکە پڕبوو لەناو.

**نَزِقَ الإناءُ ونحوه نَزَقاً**: قاپەکە لێوان لێو پڕبوو.

**نَزَقَ الرّجلُ نزقاً ونزوقاً**: پیاوەکە هەڵچوو و تووڕە بوو ٥ چوستو چالاك بوو ٥ (فهو نَزِق وهي نَزِقَة).

**أنزَقَ فلان**: فلانکەس دوای ئەوەی لەسەرەخۆو پشو درێژ بوو حەوسەڵەی نەماو تووڕەبوو.

**أنزَقَ في الضّحك**: زۆر پێکەنی.

**أنزقَ الفرسَ**: ئاوزەنگی لە ئەسپەکەدا بۆئەوەی غاربکا.

**أنزَقَ النعيمُ فلاناً**: نازونیعمەت فلانکەسی چوستو تەڕدەماغ کرد.

**مازَقَهُ مُنازَقَةً ونِزاقا**: جوێنی پێدا.

**نَزَّقَهُ**: بەمانا (أنزَقَه) دێ.

**تنازق الرجلان**: دووپیاوەکە جنێویان بەیەکتر دا.

**المُنازِق**: زۆربلێ چەقەچەناو.

**النِّزاق من الحيوان**: حەیوانی سەر ڕەق و چەموش ٥ خۆشڕۆ.

**النَّزَقُ**: چوستو چالاك لەهەموو کارێك دا ٥ دەگوترێ: (في كلامه نَزَق) لەقسەکردن دا پەلە دەکا ٥ پەلەکردن لەئیش دا بەشێوەی بێ عەقڵیو گێلانە ٥ شوێنی نزیك.

**النَزِقَةُ من الحيوان**: ئاژەڵو وڵاخی چەموشو سەر ڕەق.

**نزك فلاناً**: بەنەیزەك لەفلانی دا ٥ ڕەخنەی لێ گرتو بەناڕەوا تانەو تەشەری لێ دا.

**النَّزّاك**: ڕەخنەگرو تانەو تەشەر دەر لە خەڵك.

**النَّزك**: بەمانا (النَّزاك) دێ.

**النَّزيك**: عەیبدار.

**النَّيْزَك**: ڕمبی کورت ٥ قەبارەیەکی ئاسمانییە ٥ لەبۆشایی دا هاتوچۆ دەکا، کەنزیك بەزەوی بووە گڕدەگرێو دەسوتێ، وادەزانی ئەستێرەیەو دەکەوێتە خوار.

**نزل نزولاً**: لەبەرزاییەوە دابەزی بۆ نزمایی ٥ دەگوترێ: (نزل فلان عَنْ الأمر والحق) فلانکەس وازی لەعەدالەتو حەق هێنا.

**نزل بالمكان وفيه**: لەشوێنەکە دابەزیو تێیدا مایەوە.

**نَزَلَ على القوم**: بوو بەمیوانی خەڵکەکە.

**نَزَلَ به مكروه**: ناخۆشی توش بوو.

**نَزَلَ الحاجُ**: حاجیەکان لەعەرەفاتەوە هاتنە مینا.

**نَزَلَ على إرادة زميله**: چووە سەر ڕای

هاوەڵەکەی‌و بەگوێی کرد.

**نَزِلَ فلان نِزالَةً:** فلانکەس سەفەری کرد.

**نَزِلَ نَزْلَةً:** کۆکەو هەلامەتی توش بوو.

**نَـزِلَ الـزَرْعُ نـزلاً:** کشت‌وکاڵەکە گەشـەو نیمای کرد.

**نَـزِلَ المکـانُ:** شـوێنەکە بـەهۆی پتـەوی گڵەکەیـەوە بـە بـارانێکی کـەم نـاوی لەسەر ڕۆیی.

**أنْزَلَ الشَّيْءَ:** شتەکەی دابەزاند، ناردیـە خـوارەوە ٥ دەگـوترێ: (أنـزل الله کلامـه علـى أنبيائـه) خـودا سروشـی خـۆی دابەزانـدوە بۆسـەر پێغەمبەرەکانی.

**أنزل حاجته علـى کـريم:** هیـوای خستە سەر پیاوی مەردو سەخی سروشت بـۆ دابـین کردنـی پێویـستییەکانی خۆی.

**أنزل الـضَّيْفَ:** میوانەکەی دامەزرانـدو پێداویستی بۆ جێبەجێ کردن.

**نازله في الحرب:** لەشەڕدا ڕوبەڕوی بۆوە بۆئەوەی لەگەڵی دا بجەنگێ.

**نـازَلَ فـلان النـاس في سـفره ونحـوه:** فلانکەس لەگەڵ خەڵکەکە دابـەزی، بوویە میوان.

**نَـزَّلَ الـشَّيْءَ:** شـتەکەی دابەزانـد ٥ دەق بەمانا (أنزل) دێ.

**نَـزَّلَ القـوم:** خەڵکەکـەی لەمـەنزڵ‌و خانوودا نیشتەجێ کرد.

**نَـزَّلَ الـشَّيْءَ:** شـتەکەی خـستە شـوێنی تایبـەتی خـۆی ٥ دەشـگوترێ: (نَـزَّل هذا مکان هذا) ئەوەی لەشوێنی ئەم دانا.

**تنـازَلَ القـوم:** خەڵکەکـە هەرتاقمـەیان چـووە بەرامبـەر تـاقمێکی دوژمـن‌و شەڕیان لەگەڵ دا کردن.

**تنــازل القــوم في الــسفر:** خەڵکەکـە لەسەفەردا هـەر ژەمـەو لای یـەکێك نانیان خوارد.

**تنازل عَنْ الحق:** وازی لە حـەق‌و ڕاسـتی هێنا.

**تَنَــزَّلَ:** بەهێواشـی دابـەزی ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالـرُّوحُ فِيهَا﴾.

**إسْتَنْزَلَه:** بەمانا (أنزله) دێ.

**إسْــتَنْزَلَ فلانــاً:** داوای دابــەزینی لەفلانکەس کرد.

**إسْتَنْزَلَ فلانـاً عَـنْ حقـه أو رأيـه:** داوای کرد فلانکەس واز لـە حـەقی خـۆی بێنێ ٥ دەشگوترێ: (أسـتُنْزِلَ فـلان) فلانکـەس لەپلـەو پایـەی خـۆی هێنرایە خوار.

**المُنْزَلُ:** دابەزین، دابەزاندن.

**المَنْـزِلُ:** شـوێنی لێ هـەڵێنجان ٥ خـانوو مـەنزڵ ٥ (ك: منـازل) ٥ (منـازل

القمر) مەدارو شوێن ڕێگەی مانگ، ڕێڕەوی مانگ کە پێیان دا دەڕواو بەدەوری زەوی دا دەخولێتەوە، هەرشەوە لە ڕێڕەوییەکیان دایەو هەڵە ناکاو بەمو لە ڕێڕەوی خۆی لانادا ◦ مانگ بیست مەنزڵی هەیە هەر مەنزڵەو ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە وەکوو: (السّرطان، البطين، الثريا، الدّبران....) ◦ ساڵ چواروەرزەو هەر وەرزەی هەشت مەنزڵی هەیە.

**اُلمُنزَلُ**: نازلکردن ◦ ئەو شوێنەی شتەکەی تێدا دادەبەزێ ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا﴾.

**اَلمَنزِلَةُ**: خانو و مەنزڵ ◦ پلەو پایە ◦ (ك: منازل) دەگوترێ: (له منزلة عند الأمير) (وهو رفيع المنازل).

**النّازِلة**: بەڵاو کارەساتی گەورە ◦ (ك: نازلات و نوازل).

**النَّزالة**: ڕەوانبوونی ئاو بەسەر زەوی دا بەهۆی کەمترین بارینی بارانەوە لەبەر ئەوەی زەوییەکەی توندو پتەوە.

**النَّزالة**: میوانداریی ◦ دەشگوترێ: (هو من نزالة سوء) ئەو لەنژادو ڕەچەڵەکێکی نارەسەنە.

**النَّزّالُ**: کەسێك زۆر دابەزێ زوزوو دابەزێ ◦ زۆر ببێتە میوانی خەڵك ◦ یان زۆر شەڕو بەربەرەکانی بکا.

**النَّزَلُ**: شوێنێك خەڵك لێی دابەزێ ◦ دەگوترێ: (موضِعٌ نَزَلٌ) ◦ هەروا دەگوترێ: (رجل ذو نزل) پیاوێکی خاوەن ڕێزو بەخشش ◦ هەروا دەگوترێ: (فلان ليس بذي طعم وليس بذي نَزَل) فلانکەس نەعەقڵی هەس نەزانستو ئەدەب ◦ هەروەها دەگوترێ: (سحاب ذو نزل) هەورێکی باراناوییە ◦ (طعام كثير النزل) خواردنێکە بەرەکەت ئامێزە.

**النَّزِلُ**: شوێنێك خەڵك زۆر لێی دابەزێ ◦ دەشگوترێ: (سَحاب نَزِلٌ) هەورێکە بارانی زۆر پێیە.

**النُّزُلُ**: مەنزڵو دیوەخان؛ شوێنێك ئامادەکرابێ بۆ میوان نانی لێ بخواو تێیدا بنوێ ◦ قورئان دەربارەی موسوڵمانان دەفەرموێ: ﴿كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾ ◦ هەروا وشەی (النُّزُلُ) ناوە بۆ میوانخانە، ئوتێل ◦ عەتاو بەخشش ◦ خێرو بەرەکەت.

**النَّزْلَةُ**: ئیلتیهابو هەوکردنی لوتو بۆری هەناسە ◦ دەشگوترێ: (أرض نزلة) زەوییەکە کشتوکاڵی باشی

تێدا دەڕوێ ٥ (ك: نـزلات) دەگوترێ: (ترکت القوم علی نـزلاتهم) خەڵکەکەم جێ هێشت وەزعو حاڵیان زۆر باشبوو.

**النُّزْلَةُ:** خواردن کە دروست بکرێ بۆ دۆستو ناسیاو ٥ دەگوترێ: (کان الیوم علی فلان نزلتنا) ئەمڕۆ خواردنمان لەسەر فلاّنکەسە.

**النزیل:** میوان ٥ یان نیشتمەنی لەماڵ دا یان لەنیشتمان دا ٥ دەگوترێ: (فلان نزیلي) فلاّنکەس لەگەڵم دا لەخانوەکەدایە بەیەکەوە لەخانوێکداین ٥ دەشگوترێ: (طعام نزیل) خواردنێکی بەرەکەت ئامێزە ٥ (ثوب نزیل) کراسێکی تەواوە هیچ کەمو کورتی تێدا نیە.

**نَزْنَزَ:** سەری خۆی بادا.

**نَزْنَزَ المكان:** شوێنەکە بەردەوام زۆنگاو بوو.

**نَزْنَزَ الأم صَبِّیها:** دایکەکە منداڵەکەی هەڵپەڕاند.

**نَـزِهَ الـدُّوابَ:** وڵاخەکەی لەئاوەکە دوور خستەوە.

**نَزِهَ المكانُ:** شوێنەکە ئاو و هەوای خاوێن بوو.

**نَـزِهَ فـلان:** فلاّنکەس لەهەموو خراپیو بەد ڕەوشتییەك دوورە (دەمو دەستو داوێن پاکە).

**نَزِهت الأرضُ:** زەوی بەگیاو گژو گوڵو گوڵزار خۆی ئارایش دا.

**نَزُهَـهُ عَـنْ الـشَّیْئِ:** ئەوی لەشتەکە دوورخستەوە ٥ دەگوترێ: (نَزَّهَ نفسه عَنْ الأقذار) خۆی لەشتی خراپو چەوت دوور گرت.

**تَنَـزَّهَ عَـنْ الـشَّیْئِ:** لەشتەکە دوور کەوتەوە، خۆی بەدوور گرت لە شتەکە ٥ دەگوترێ: (هو یتنزه عَنْ الأقذار) ئەو پیاوە خۆ لە شتی ناشیرینو کارو گوفتاری ناپەسەند دەپارێزێ.

**تَنَزَّهَ فلان:** فلاّنکەس ڕۆیشتە دەرەوە بۆ سارا بەمەبەستی پیاسەو کەیفو صەفا.

**إسْتَنْزَهَ عَـنْ الـشَّیْئِ:** لەشتە خراپو ناپەسەندەکە خۆی بەدوور گرت ٥ یان هەوڵی دا بڕوا بۆ پیاسەو سەیران.

**المُتَنَزَّهُ:** شوێنی پیاسەو سەیران.

**المُنْتَزَهُ:** بەمانا (المُتَنَزَّه) دێ.

**المَنْزَهُ:** شوێنی دوور.

**النَّـازِهُ:** دەگوترێ: (فلان نازه النفس) فلاّنکەس دڵو دەروون پاکە.

**النَّزاهَـةُ:** دوورکەوتنەوە لەگوفتاری خراپ ڕەوشتی ناپەسەندو شتی گوماناوی.

ناجذان
منجل
منجر
منجم الميزان
منبر
نبلة
ناي
نجب الشجر
منشة
منسر
أنجر
النحر
منخل
نيزك
نرد
نسافة
مندف
مسحذة
نشابة
نبراس
نباتة
نبريج ونارجيلة
أنبج
منثور
نخلة
نارجيل
ناردين
نسرين
نجيل
نرجس
نسر
نخاريب النحل
نحامة
نحلة
نجم البحر
نساف

**النُّزْه**: دەگوترێ: (هو نزه الخُلُقِ) ئەو ڕەوشت بەرزو دەروون خاوێنە.

**النُّزْهة**: پیاسە ٥ شوێنی دوور ٥ دەگوترێ: (هو بِنُزْهة عَنْ كذا أو منه) ئەو لەو شتە دوورە.

**النُّزَهي**: دەگوترێ: (رجل نزهي) پیاوێکە زۆر دەچێ بۆ دەرەوە بۆسەیرانو پیاسە.

**نزا الفَحْلُ نَزْواً ونُزُواً ونَزَواناً**: کەڵەکە خۆی هاویشتە سەر مێینەکە ٥ دەشگوترێ: (مَزَجَ الخمر فنزت مقاقيها) شەرابەکەی تێکەڵدا کەفو خڵتەو پڵتەی سەرکەوت ٥ هەروا دەگوترێ: (نزا به قلبه الى الشَّئ) دڵی بۆ لای شتەکە چوو حەزی لێ کرد ٥ (نزا به الشرّ) شەڕ رایپەڕاندو خستیە جمو جوڵ.

**أنْزاهُ**: وای لێکرد هەڵبپەڕێ.

**نَزّاه**: بەمانا (أنْزاه) دێ.

**تَنَزّى إليه**: بازی بۆداو هەڵمەتی بردێ.

**إنْتَزى على الشَّئِ**: سواری شتەکە بوو ٥ دەگوترێ: (إنْتَزَى على أرضي فأخذها).

**النازية**: توندو تیژیو چوستو چالاکی.

**أكمة نازية**: تەپۆڵکەیەکە لەتەپۆڵکەکانی تر بەرزترە ٥ (ك: نوازي) ٥ (نوازي الخمر) ئەو بلقو کەفو شتەیە کەدەکەوێتە سەر پیاڵە شەراب دوای ئەوەی ئاوی تێکەڵ دەکرێ.

**النّازية**: ڕژێمێك بوو وەکوو فاشیزم لەئەڵمانیا سەری هەڵداو ساڵی (١٩٣٣ز) هیتلەری گەیاندە تروپکی دەسەڵاتو توندڕەویو فاشیەتی هیتلەر جەنگی جیهانی دووەمی لێ کەوتەوە.

**النَّزّاء**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نزا) دێ. دەگوترێ: (إنّه لَنَزّاءٌ الى الشرّ) ئەو کابرایە شەڕەنگێزەو هەمیشە منەی شەڕیەتی.

**النَّزَوان**: هەڵچوونو توندو تیژی.

**النَّزِيُّ**: بەمانا (النَّزّاء) دێ.

**النَّزِية**: بارانی لەناکاو ٥ یان هەرکارو ڕوداوێکی چاوەڕوان نەکراو.

**نَسَأت الماشية نَسْئاً ومَنْسَأةً**: ئاژەڵەکە قەڵەو بوو یان قەڵەوی لێ دیاریی دا.

**نَسَأ الشَّئَ أو الأمرَ**: شتەکەی دواخست.

**نَسَأ الدينَ**: قەرزەکەی دواخست (نَسَأ البيع) مامەڵەی کڕینو فرۆشتنەکەی دواخست.

**نَسَأ الإبلَ عَنْ الحوض**: حوشترەکانی لەبردن بۆسەر ئاو دواخست.

**نَسَأ الدّابّةَ بالمنسأة**: بەدار عەصا لەوڵاخەکەی دا.

**نَسَأَ اللَّبَنَ**: شیرەکە یان ماستەکەی تێکەڵاوی ئاو کرد بۆئەوەی زۆر ببێ، یان کەمێك تامی ترشی لێ کەم بێتەوە.
**نَسَأَ فلاناً**: شەرابی کەسکونی دا بە فلانکەس ○ (فهو ناسيٌّ).
**نُسِئَت المرأةُ**: ئافرەتەکە عادەی مانگانەی لەکاتی خۆی دواکەوت گومانی ئەوەی لێ دەکرێ سکی هەبێ ○ (فهي نَسِئٌ).
**انْسَأَ عنه**: دواکەوت دوورکەوتەوە.
**انْسَأَ الشَّيْءَ**: بەمانا (نَسَأَهُ) دێ.
**إنْتَسَأَ**: دواکەوت دوورکەوتەوە ○ دەگوترێ: (إنْتَسَأَ عَنْ فلان).
**إسْتَنْسَأَ**: داوای مۆڵەتو دواخستنی کرد.
**إسْتَنْسَأَ الدين**: داوای دواخستنی قەرزەکەی کرد.
**المِنْسَأَة**: دارعەصای قایمو پتەو ○ گۆچانی شوان.
**النَّسَاءُ**: دواخستن.
**النَّسْئُ**: شەرابی کەسکون کە زۆر سەرخۆشکەر بێ ○ ماستاوی ڕون یان شیر کەزۆری ئاو تێکەڵ کرابێ ○ قەڵەوی.
**النِّسْئُ**: دەگوترێ: (هو نِسْئُ نساء) ئەو پیاوە زانیینە هەمیشە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ژن دایە تێکەڵاوی ئافرەتە.
**النُّسْأَةُ**: دواخستن ○ دەگوترێ: (باعَهُ بِنُسْأَة) شتەکەی بەقەرز فرۆشت.
**النَّسُوءُ**: شیر کە بمێنێتەوەو بترشێ ئەمجار ئاوی تێ بکرێ بۆئەوەی ترشییەکەی کەم بێتەوە.
**النَّسِيئُ**: دواخستن ○ لەسەردەمی پێش ئیسلام دا عەرەبەکان ڕێزو شکۆی مانگی موحەرەمیان دواخست بۆ مانگی سەفەر بەم جۆرە دواخستنەیان دەگوت (نَسِيئ) قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ﴾ ○ هەروا وشەی (النَّسِيئ) ناوە بۆ شیر کە زۆری ئاو تێکرابێ.
**النسيئة**: قەرزی دواخراو ○ دەگوترێ: (باعه بنسيئة) بەقەرز فرۆشتی ○ (ربا النسيئة) زیادەو سودێك بەهۆی دواخستنی قیمەتی کاڵاکەوە دەست خاوەن کاڵا بکەوێ.
**نَسَبَ الشاعر بفلانة نسيباً**: شاعیرەکە گیرۆدەی دڵداریی فلان ئافرەت بوو.
**نَسَبَ الشَّيْءَ**: شتەکەی وەصف کردو ڕەگو ڕیشەی شی کردەوە.
**نَسَبَ فلاناً**: داوای لە فلان کرد نژادی خۆی ڕونبکاتەوە.

نَسَبَ الشَّيْءَ الى فلان: شتەكەی پاڵ فلان دا.
أَنْسَبَت الريحُ: رەشەباكە بەهێز بوو گڵو زیخی ڕادا.
ناسَبَ فلاناً: لە نژاد دا هاوبەشی فلان بوو ◦ لەگەڵ فلان دا گونجا، پێكەوە هەڵیان كرد.
إِنْتَسَبَ: نژادی باس كرد ڕەچەڵەكی شی كردەوە.
إِنْتَسَبَ الى فلان: خۆی نیسبەت دا بۆلای فلان.
تَنَاسَبَ الشيئان: دوو شتەكە هاوشێوە بوون.
تَنَاسَبَ القوم الى أحسابهم: خەڵكەكە خۆیان بردەوە سەر نەسەبو حەسەبی خۆیان.
تَنَسَّبَ الى كذا: خۆی پاڵدا بۆلای ئەو شتە.
إِسْتَنْسَبَ فلاناً: داوای لەفلان كرد نژادو ڕەچەڵەكی خۆی ڕون بكاتەوە.
التَّناسُب: لێكچوون.
المَنْسوبُ: پاڵدراو، ئیسمی مەفعولە لەمادەی (نَسَبَ) وەكوو (كوردستانی، ئێرانی، توركی) ◦ دەشگوترێ: (شعر منسوب) شیعرێكە سۆزی دڵداری تێدایە ◦ (خط منسوب) خەتێكە قاعیدەی هەس.
منسوب الماء في النهر: ئەو شوێنەی لەڕوباردا ئاو دەیگاتێ ◦ ئەو ئاستەی كە ئاوەكە لەكاتی بەرزبوونەوەی دا دەیگاتێ ◦ (ك: مناسیب).
النَّساب: شارەزا لە نژادو ڕەچەڵەكی هۆزو گەلو نەتەوەدا.
النَّسَّابَةُ: بەمانا زۆر شارەزا لەبواری نژادو ڕەچەڵەك.
النَّسَبُ: خزمایەتی ◦ دەگوترێ: (نسبه في بني فلان) خزمایەتی لەگەڵ هۆزی فلان دا هەیە، یەكێكە لەو هۆزە.
النِّسْبَةُ: خزمایەتیو پەیوەندی.
النِّسْبِيَّة: ڕێژەیی.
النَّسيبُ: موناسیب ◦ شیعری دڵداری ◦ دەشگوترێ: (رجل نسیب) پیاوێكی شەریفو وەجاخزادەیە.
نَسَجَت الناقة نَسجاً: حوشترەكە خێرا خێرا هەنگاوی نا.
نَسَجَ الثوبَ: قوماشەكەی چنی ◦ دەشگوترێ: (نَسَجَت الريح الترابَ أو الورق أو الهشيمَ أو الماءَ) ڕەشەبا گڵو خۆڵ یان گەڵای درەخت یان پوشو پەڵاش یان ئاوی بەسەریەك دا دا تێكیەوە هاویشتن.
نَسَجَ الغيث النباتَ: باران گژوگیاكەی

ڕواندو گەشەی پێ کرد تا تێکهالاو چڕو پڕ بوو.

**نَسَجَ الشاعر الشِّعْرَ:** شاعیرەکە شیعرەکەی هۆنیەوە.

**نَسَجَ الزور:** درۆو دەلەسەی هەڵبەست.

**نَسَجَ الكلامَ:** قسەکەی پوخت کرد، داپڕشتەوە.

**إنْتَسَجَ الثوبُ:** قوماشەکە چندرا ٥ دەگوترێ: (نَسَجَهُ فإنْتَسَجَ).

**المَنْسَجُ:** شوێنی چنین (ك: مناسج).

**المِنْسَجُ:** مەکوك.

**النِّساجَةُ:** پیشەی جۆلایی.

**النَّسَّاجُ:** جۆلا ٥ ئەوەی قوماش دەچنێ.

**النَّسيجُ:** چندراو ٥ دەشگوترێ: (هو نسيج وحْدِهِ) ئەو پیاوە وێنەی نیە لە عیلمو زانیاری دا، یان لەشتی تردا.

**نَسَحَ الترابُ نَسْحاً:** گڵو خۆڵەکەی بەربادا، یان بەرزی کردەوە.

**نَسِحَ فلان نَسْحاً:** فلانکەس تەماعی بوو.

**المِنْساحُ:** شتێکە گڵی پێ دەردەدرێ ٥ گڵی پێ هەڵدەدرێتەوە.

**النُّساحُ:** ئەوەی لەخورما هەڵدەوەرێ لە توێکڵو وشکەڵ.

**النُّسْحُ:** بەمانا (النُّساحُ) دێ.

**نَسَخَ الشَّيْئَ نَسْخاً:** شتەکەی سڕیەوە لایبرد ٥ دەگوترێ: (نَسَخَت الريح آثار الديار) ڕەشەبا شوێنەواری کاولە ڕوخاوەکانی پڕکردەوە، کوێری کردنەوە ٥ (نَسَخَت الشمسُ الظِلَّ) خۆر سێبەرەکەی لابرد ٥ (نَسَخَ الشيبُ الشبابَ) پیری دیمەنی گەنجیەتی لابرد.

**نَسَخَ اللهُ الآيةَ:** خودا حوکمی ئایەتەکەی هەڵگرت، سڕیەوە.

**نَسَخَ الحاكِمُ القانون أو الحُكْمَ:** دادوەر یان فەرمانڕەوا قانونەکەی هەڵوەشاندەوە، حوکمەکەی هەڵوەشاندەوە.

**نَسَخَ الكاتِبُ الكتابَ:** نووسەرەکە کتێبەکەی نووسیەوە ٥ نوسخەیەکی تری لە کتێبەکە گرتەوە.

**ناسَخَهُ:** لەنووسینەوەدا کێبڕکێی فلانی کرد ٥ بەسەر فلان دا زاڵ بوو.

**إنْتَسَخَ الشَّيْئَ:** شتەکەی نەسخ کردەوە، پوچەڵی کردەوە.

**إنْتَسَخَ الكتابَ:** کتێبەکەی نووسیەوە.

**تَناسَخَ الشَّيْئانِ:** یەکێك لەو دوو شتە ئەوی تری سڕیەوە نەسخی کردەوە ٥ دەگوترێ: (أبلاه تناسخ الملوين) (وتناسخت الأشياءُ) شتەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتو هەندێکیان چوونە شوێنی هەندێکیان.

**تَناسَخَت الأرواح:** گیانەکان لەچەند جیسمو قەبارەیەکەوە گواستیانەوە بۆ جیسمی تر.

**إسْتَنْسَخَ الشَّيْئَ:** داوای لابردنی شتەکەی کرد ٥ یان داوای نووسینەوەی شتەکەی کرد.

**التناسخ:** (تناسخ الروح) بیرو باوەڕێکە لەناو هیندیو هەندێ نەتەوەی تردا بڵاوبۆتەوە ناوەڕۆکی ئەم بیروباوەڕە ئەوەیە گوایە ئادەمیزاد کەدەمرێ گیانەکەی دەگوازرێتەوە بۆلاشەی زیندەوەرێکی تر لەخۆی پلەو پایە بەرزتر یان نزمتر بۆئەوەی گیانەکە خۆشی بنۆشێ یان سزا بکێشێ لەپاداشو سزای کردەوەی مردوە خاوەن گیانەکە ٥ هەلگرانی ئەم بیروباوەڕە بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیە.

**النَّاسِخُ:** ئەو کەسەی پیشەی نووسینەوەی کتێب بێ.

**النسخة:** وێنە لە کتێبە نووسراوەکە یان لەنامە نووسراوەکە.

**التناسخیة:** تاقمو پێڕێکن بڕوایان بەتەناسوخ هەیەو پێیان وایە زیندوبوونەوە نیە.

**نَسَرَ الطائر اللحمَ نَسْراً:** باڵندە گۆشتخۆرەکە گۆشتەکەی لێك هەڵبچڕیو پارچە پارچەی کرد.

**نَسَرَ فلان الشَّیْئَ:** فلانکەس شتەکەی پارچە پارچە کرد ٥ گروی، سپی کرد ٥ هەڵیوەشاند ٥ دەگوترێ: (نَسَرَ الحَبْلَ) حەبلەکەی هەڵوەشاندەوە ٥ (نَسَرَ الجرحَ) برینەکەی هەڵوەشاندەوە ٥ هەڵی تەقاندەوە.

**نَسَرَ فلاناً:** فلانکەسی شی کردەوە زۆری ڕەخنە لێ گرتو عەیبو عاری لێ دۆزینەوە.

**نَسَّرَ الشَّيْئَ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَسَرَه) دێ.

**إنْتَسَرَ الشَّيْئُ:** شتەکە هەڵوەشایەوە.

**تَنَسَّرَ الشَّيْئُ:** بەمانا (إنْتَسَرَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَنَسَّرَ الجرحُ) برینەکە بەهۆی هەڵتەقینەوەو هەڵپچڕانەوە دەمەکەی فراوان بوو.

**تَنَسَّرَ الثوبُ أو القرطاسُ:** قوماشەکە یان کاغەزەکە وردە وردە لێی ڕۆیی‌و کەم بۆوە ٥ دەشگوترێ: (تَنَسَّرت النعمة عَنْ فلان) نازو نیعمەت لەفلان وردە وردە لاچوو.

**إسْتَنْسَرَ الطائِرُ:** باڵندەکە وەکوو هەڵۆی لێ هات لەهێزو تواناد‌ا.

**المِنْسَرُ:** ئەوەی باڵندە گۆشتو شتی وای پێ لێك دەپچڕێ ٥ یان ناوە بۆ چنگو نینۆکی دەعبای گۆشت خۆر: کە بەنینۆکی گۆشت لێك دەپچڕێ ٥ ڕەوە ئەسپ ٥ کۆمەڵێك سوپا وەکوو پێشەنگ لەپێش سوپاوە دەڕۆن.

**المُنَسَّرُ:** کۆمەڵە دز.

الناسور: مایەسیری.

النَّسْرُ: هەڵۆ، یان باز دەعبایەکی گۆشت خۆرە لەهەموو باڵندە گۆشتخۆرەکان گەورەترە ٥ دەندوکێکی خواری هەیە قەراخی دەندوکی برگە برگەی تیژی هەیە چنگی کورت باڵەکانی درێژن، بەزۆری حەزی لەلاکە تۆپیوە، زۆری برسی نەبێ پەلاماری حەیوانی زیندو نادا ٥ لەناوچەی گەرمەسێرو ئاو و هەوا مامناوەندی دا دەژی.

النَّسْر الطائر: کۆمەڵە ئەستێرەیەکن دەشوبهێتە باز.

النَّسِيَّةُ: پارچە گۆشتی بچوك کە کولابێ.

النَّسْرِينُ: جۆرە گوڵێکی سپی بۆنخۆشی کەسکونە.

نَسَّ الشَّيْءُ نُسُوساً ونسيساً: شتەکە وشك بوو ٥ دەگوترێ: (نَسَّ الخبز في التنور) نانەکە بەتەندورەکەوە وشك بۆوە.

نَسَّ فلان: فلانکەس زۆری تینو بوو.

نَسَّ فلان نَسّاً وتَنساساً: فلانکەس تاوداتە هەر ئیشێك تا تەواوی نەکا وازی لێ ناهێنێ (ئیش لەبەر ڕۆیشتوو).

نَسَّ الحطبُ نسوساً: دارەکە بە ئاگرەوە نراو لەسەرەوەی کەفی دەردا ٥ دەشگوترێ: (نَسَّ لفلان) بۆ فلانکەسی هەڵبزێرە.

نَسَّ بين القوم: نێوانی خەڵکەکەی تێك دا فیتنەجۆیی لەناویان دا بەرپا کرد.

نَسَّ الدابة نَسّاً: وڵاخەکەی لێ خوڕی و تێی ڕاخوڕی.

أنَسَّ الشَّيْءُ: شتەکە ئەوپەڕی هێزی کەوتەسەر.

أنَسَّ الدابةُ: وڵاخەکەی تینو کرد.

نَسَّسَ الصَّبِيَّ: بەمنداڵەکەی گوت (اس اس) بۆئەوەی میز بکا یان پیسایی.

تَنَسَّسَ منه خبراً: تکای لێ کرد هەواڵی بداتێ.

المِنَسَّةُ: عەصاو گۆچانی ئەستوور.

المنسوس: دەرکراو، ڕەتێندراو.

النَّسَّاسُ: فیتنە.

النَّسيسُ: بەمانا (المنسوس) دێ ٥ ئەوپەڕی توانا ٥ کەفی داری تەڕ کە بەئاگرەوە دەنرێ لەسەریەوە کەف دێتە دەر ٥ پاشماوەی گیان ٥ دەگوترێ: (بَلَغَ الرجلُ نسيسَهُ) پیاوەکە کەوتە گیانەڵاوەوە هەندێکی گیان تیاماوە.

النَّسيسَةُ: فیتنەیی ٥ ئاژاوە نانەوە ٥ کەفی دار کە سەرێکی لەناو ئاگردایەو سەرەکەی تری کەفی لێ دێتەدەر.

**نَسَعَ الشَّيْءُ نَسْعاً ونسوعاً:** شتەكە درێژ بوو.

**نَسَعَت الأسنانُ:** ددانەكە پوك جوان لەخۆی نەگرتو لەقی.

**نَسَعَ فلانٌ في الأرض:** فلانكەس بەزەوی دا ڕۆیشت.

**أنسَعَ فلان:** فلانكەس زیانی بۆ هاوسێكانی هەبوو.

**نَسَّعَت الأسنان:** بۆ مانای زێدە دێ لەمادەی (نَسَعَ).

**إنْتَسَعَت الإبلُ ونحوها:** حوشترەكانی لە لەوەڕگاكەیان دا بلاو بوونەوە.

**المِنْسَعَة:** زەوییەك ڕوەكی زۆر درێژ ببێ.

**النَّاسِعُ:** دەگوترێ: (عنق ناسِع) ملی درێژ گەردنی بەرز.

**الناسِعَة:** دەگوترێ: (إمرأة ناسِعة) ئافرەتێكە پشتی درێژە یان ددانی درێژن.

**النِّسْعُ:** جومگەی دەست (نێوان بەری دەستو مەچەك) ० حەبلێكی درێژە تیلمە چەرمێكی درێژە بوخچەو جانتاو بارو بارگەنەی پێ شەتەك دەدرێ.

**النِّسْعَةُ:** پارچەیەك لە تیلمە چەرم یان حەبل.

**نَسَغَتْ أسْنانُه نَسْغاً:** بنكی ددانەكانی شل بوون پوكی نەرم بوو.

**نَسَغَ فلان في الأرض:** فلانكەس بەولاتان دا گەڕا.

**نَسَغَ فلاناً بِشيئ:** بەشتەكە لەفلانكەسیەوە ژەنی.

**نَسَغَتِ الواشمة الذراع بالأبرة:** خالكوتەكە بەدەرزی باسكی كوتا دەرزی هاژنی كرد.

**نَسَغَ فلاناً بكلمة:** بەقسەی ناشیرین تانەی لەفلانكەس دا.

**نَسَغَ اللبنُ بالماء:** شیرەكەی تێكەلّ ئاو كرد ० ئاوی تێكەلاوی شیرەكە كرد.

**أنْسَغَتِ النَّخْلَةُ ونحوها:** دار خورماكە بەرەكەی خراپ بوو ० یان دار خورماكە دوای بڕینی هەلّی دایەوە.

**أنْسَغَ فلاناً:** تانەو تەشەری ئاڕاستەی فلان كرد.

**إنْتَسَغَ البعير ونحوه:** حوشترەكە شوێنی گەستنی زەردەوالّەكەی بەقاچی خوراندی یان كوتای.

**إنْتَسَغَ فلان:** فلانكەس كەوتە پشكنین‌و لێكۆلّینەوە.

**إنْتَسَغَت الإبلُ:** حوشترەكان لە لەوەڕگاكەدا بلاو بوونەوە.

**المِنْسَغَةُ:** گورزەیەك دەرزی‌و شتی وا خالكوت بەكاری دەهێنێ بۆ خالكوتان‌و شتی وا ० گورزەیەك لەپەڕی بالّندەو شیشی باریكی ئاسن كەنانكەر كولێرەو نانی پێ كونج كونج دەكا.

**النّاسِغُ:** لێزانو دەست ڕاست لەئاراستە کردنی تیرو گوللەو ڕمب دا.

**النّسغُ:** ئەو ئاوەی لەدرەخت دێتە دەر کە دەیبڕنو وەرزەکە وەرزی ژیانەوەیەتی کە بریندار دەبێ ئاوی لێدێتەدەر.

**النّسیغُ:** عەرەق.

**نَسَفَ الإناءُ نَسْفاً:** قاپەکە پڕ بوو لەسەریەوە ڕژا.

**نَسَفَ الماشي:** ڕێکەرەکە (بەڕێدا ڕۆییەوەکە) پەلەی کرد.

**نَسَفَ الشَّيْءَ:** شتەکەی ڕیشەکێش کرد ٥ لەڕەگەوە هەڵی کەند ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا﴾.

**نَسَفَت الدوابُ الكلأ:** وڵاخەکە لەوەڕەکەی هەموو خوارد.

**نَسَفَ الشَّيْءَ:** شتەکەی تەفرو تونا کرد.

**نَسَفَت الريحُ التُّراب:** ڕەشەبایەکە گڵو خۆڵەکەی بڵاو کردەوە.

**نَسَفَ الحافِرُ الأرض:** سمی وڵاخەکە زەوییەکەی هەڵکۆڵی.

**نَسَفَ الشَّيْءَ:** شتەکەی لە بێژنگ دا.

**نَسَفَ الحبَّ بالمِنْسَفِ:** بەگڵ گیرەکە دانەوێڵەکەی پاك کرد.

**نَسَفَ الطائرُ اللحمَ بمخلبه:** باڵندەکە بەچنگو نینۆکی گۆشتەکەی لێك هەڵپچڕی.

**نَسَفَ الحِملُ أو الركض جَنْبَ الدابة:** بار یان زینو ئاوزەنگی تۆکی لاقەبرغەی وڵاخەکەی ڕوتاندەوە.

**نَسَفَ الحِمارُ الأتانَ:** نێرەکەرەکە دێڵەکەرەکەی گەست.

**انْسَفَت الريحُ:** ڕەشەبایەکە بەتوندی هەڵبوو زیخو گڵو خۆڵی ڕادا.

**تناسَفَ الرجلان الكلامَ:** دووپیاوەکە بەسرتەو ئەسپایی قسەیان لەگەڵ یەکتردا کرد.

**إنْتَسَفَ الكلامَ:** قسەی بەهێواشیو لەسەر خۆ کردن.

**المِنْسَفُ:** شەنە ٥ بێژەینگو گڵ گیر ٥ (مِنسَف الحمار) دەمی گوێدرێژ ٥ (ك: مناسف).

**المِنْسَفَةُ:** ئامێرێکە بیناو شتی وای پێ لەبێخ دەردەهێندرێ ٥ بێژنگو گڵ گیر.

**النُّسافة:** ئەو خشتو خاشاکەی لەکاتی ڕوخاندنو دەرهێنانی دیواردا دەکەوێتە خوار ٥ تەپو تۆزی بەرزەوەبووی ڕێگا ٥ چڵكو ژەنگ کەدەکەوێتە سەر قاپو قاچاخو شتی وا.

**النُّسافة:** کەشتییەکی جەنگییە قەڵاو شورا دەڕوخێنێ.

**النَّسْفانُ:** قاپێك پڕبێ لە ناو و لەسەریەوە بڕژێ.

**النُّسفَةُ**: بەردێکی ڕەشی زبرو کونکوناوییە لە حەمام دا بەکاردەهێندرێ بۆ لابردنی چڵکی بەرەپێ.

**النَّسَفَةُ**: بەمانا (النِّسفة) دێ.

**النَّسوف**: دەگوترێ: (بعیر نسوف) حوشترێکە بەپێشەوەی دەمی لەوەڕ دەخوا ◦ (فرس نسوف) ئەسپێکی هەنگاو پانو فراوانە.

**النَّسیفُ**: دانەوێڵەی لەبێژنگ دراو ◦ دەشگوترێ: (كلام نسیف) قسەی بەئەسپایی ◦ (ترك فیه نسیفاً) شوێنەواری لەسەر جێ هێشت، شوێنی گەستن یان کەوتنی توكو شتی وای پێوە دیارە.

**النَّسیفة**: بەردە ڕەشەی گەرماو.

**نَسَقَ الشَّیْءَ نَسْقاً**: شتەکەی ڕێك خست.

**نَسَقَ الدُّرَّ**: گەوهەرەکەی هۆنیەوە.

**نَسَقَ الكُتُبَ**: کتێبەکانی ڕیزکردن.

**نَسَقَ الكلامَ**: قسەکانی ڕێك کردنو پەیوەندی لەنێوان ڕستەکانی دا دروست کرد.

**أنْسَقَ فلان**: فلانکەس بەشێوەی سەجع ئاخاوت.

**ناسَقَ بین الأمرین**: دوو کارەکەی پێکەوە گونجاند.

**نَسَّقَهُ**: شتەکەی ڕێك خست.

**إتَّسَقَتِ الأشیاءُ**: شتەکانی کەوتنە پاڵ یەکترو پێکەوە گونجان.

**تناسَقَتِ الأشیاء**: بەمانا (إتَّسَقَت) دێ ◦ دەگوترێ: (تَنَاسَقَ كلامُهُ) ڕستەی قسەکانی پێکەوە گونجاو بوون.

**تَنَسَّقَتِ الأشیاء**: بەمانا (إتَّسَقَتْ) دێ.

**النَّسْقُ**: (حروف النَّسْق) حوروفی عەتف ◦ ئەو پیتانەی کەلام دەخەنەوە سەریەكو ڕستەکان پێکەوە دەبەستنەوە.

**النَّسَقُ**: هەرشتێك لەسەر یەك یاساو تەومرە دامەزرابێو بڕوا بەڕێوە ◦ دەگوترێ: (جاء القوم نَسقاً) (زُرعت الأشجار نَسَقاً) درەختەکان بەڕێز چەقێندران ◦ (درّ نَسَقٌ) گەوهەری هۆنراوە ◦ (كلام نَسَق) قسەی ڕێكو پێك ◦ (حروف النَّسَق) حروفی عەتف.

**النَّسیقُ**: ڕێکخراو، گونجاو ◦ ڕێك کراو.

**نَسَكَ فلان نَسْكاً ونَسْكَةً ومَنْسَكاً**: فلانکەس دونیا نەویست بوو، ڕوی لەخودا پەرستی کرد ◦ کوشتی سەربری بۆ ڕەزامەندیی پەروەردگار.

**نَسَكَ الثَّوْبَ نَسْكاً**: قوماشەکەی بەئاو شتو پاکی کردەوە.

**نَسَكَ الأرضَ**: زەوییەکەی پاك کردەوە بژاری کرد ◦ زبڵی کیمیاوی پێوە کرد.

**نَسَكَ البَيْتَ**: هاتە ناو خانوەکە.
**نَسَكَ الى طريقة جميلة**: ڕوی کردە ڕێبازێکی ڕاستو جوانو خودا پەرستی پاك.
**إنْتَسَكَ**: دونیا نەویستی ڕەچاو کردو سەرگەرمی خوا پەرستی بوو.
**تَنَسَّكَ**: بەمانا (إنْتَسَكَ) دێ.
**المَنْسِك**: ڕێبازی دونیا نەویستیو خودا پەرستی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾: بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك مەنسەكو ڕێو شوێنی خودا پەرستی بەندایەتیمان بۆ دیاریی کردووە ٥ هەروا وشەی (المَنسِك) ناوە بۆ شوێنی قوربانی سەربڕین.
**مناسك الحج**: عیباداتو ڕێو ڕەسمەکانی ئەنجامدانی حەج ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ﴾.
**المنسوكة**: دەگوترێ: (فرس منسوكة) ئەسپێکی ڕوتو بێ توکە.
**النّاسِك**: خودا پەرستو دونیا نەویست ٥ (ك:نُسّاكٌ) ٥ دەشگوترێ: (عشب ناسك) ڕوەکێکی زۆر سەوزە.
**النّاسِكَةُ**: ئافرەتی خودا پەرستو دونیا نەویست ٥ دەشگوترێ: (أرض ناسكة) زەوییەکی سەوزو تازە باران لێ باریوە.
**النُّسْكُ**: هەر مافێکی خودا بەسەر بەندەکانیەوە ٥ قوربانی کوشتن.
**النُّسُكُ**: بەمانا (النُّسْكُ) دێ.
**النَّسِيكَةُ**: قالْبە زیوی خالیص ٥ قوربانی کوشتن.
**نَسَلَ الشَّيْءُ نسولاً**: شتەکە جیابۆوە، لێ بۆوە ٥ کەوتە خوار ٥ دەگوترێ: (نَسَلَ ریش الطائر) پەڕی باڵندەکە کەوتە خوار.
**نَسَلَ الثوبُ عَنْ الإنسان**: پۆشاکەکە لەمرۆڤەکە بۆوە.
**نَسَلَ فلان نَسْلاً**: فلان وەچەو نەوەی زۆر بوو.
**نَسَلَ الماشي**: ڕێکەرەکە خێرا ڕۆیی.
**نَسَلَ الوَلَدَ**: منداڵی بوو ٥ دەشگوترێ: (نَسَلَ بوالد).
**نَسَلَ الحيوانُ نَسْلاً**: ئاژەڵەکانی وەبەرهێنان، ڕایگرتنو بەخێوی کردن بۆ زاو و زێو بەروبووم.
**نَسَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی لێ کردەوە، جیای کردەوە ٥ دەگوترێ: (نَسَلَ ریش الطائر) پەڕی باڵندەکەی دەرکێشا ٥ (نَسَلَ الصوفَ) خورییەکەی بڕییەوە لەمەڕەکە.
**أنْسَلَ الشَّيْءُ**: بەمانا (نَسَلَ) دێ.
**أنْسَلَ الحيوانُ**: حەیوانەکە بێچوی بوو.

أنسَلَ فلان: فلانكەس ئاژەڵەکانی کاتی زاو و زێیان هات نزیکە بێچوویان ببن.
أنسَلَت الدابة: وڵاخەکە، حوشترەکە کاتی ئەوەی هاتووە توك بەربدا، کولکەکەی لێ ببێتەوە.
أنسَلَ في عدوه: لەبازدان‌و ڕاکردنی دا پەلەی کرد.
أنسَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی لێ کردەوە جیای کردەوە.
إنتَسَلَ الشَّيْءُ: بەمانا (نَسَلَ) دێ.
تناسَلَ القوم: خەڵکەکە زاو و زێیان کردو زۆربوون.
تناسَلَ بنو فلان: فلان هۆزو بنەماڵە وەچەو نەومیان زۆر بوون.
الناسِلُ: خێراو بەپەلە.
النّسالُ: ئەوەی هەڵدەوەرێ لەخوری‌و موو کوڵك لەکاتی بڕینەوەو لێکردنەوەی دا.
النَّسَلان: خێرا ڕیشتنی گورگ.
النَّسْلُ: منداڵ‌و نەوە ٥ (ك: أنسال).
النَّسَلُ: شیر کەلەهەنجیری کاڵ دێتەدەر لەکاتی لێکردنەوەی دا.
النَّسُولُ: خێرا و گورج لەڕاکردن‌و بازدان دا.
النَّسُولَةُ من الماشية: ئەو ئاژەڵەی ڕابگیرێ بۆ زاو و زێ بۆ بەرهەمهێنان.
النَّسِيلُ: بەمانا (النُّسالُ) دێ ٥ ڕاوی هەنگوین کە لەکەڕەشانەکەی جیابکرێتەوە.
النَّسِيلَة: تاکی وشەی (النَّسِيل)ە واتە: ئەوەی لەکاتی بڕینەوەی خوری‌و مودا هەڵدەوەرێ ٥ منداڵ ٥ پڵێتە ٥ ڕاوە هەنگوین کە کەڕەشانەکەی لێ جیا کرابێتەوە.
نَسَمَت الريح نَسماً ونَسيماً: بایەکە هەڵبوو، شنە بایەکە هەڵبوو.
نَسِمَ الشَّيْءَ: شتەکە تامی گۆڕا ٥ دەگوترێ: (نَسَم اللبنُ) (نَسَمَ الدَّسِمُ) ٥ شیرەکە تامی گۆڕا ٥ چەورەییەکە تامی گۆڕا.
نَسَمَ البعيرُ الأرض بِمَنسَمِه: حوشترەکە بەسمی لە زەوی دا و پێکوڵی کرد، شوێنکەی لەزەوییەکە کرد.
نَسَمَ لي خَبَرٌ أو أثر: هەواڵێکم لێ دەست کەوت یان شوێن پێیەکم هەڵگرتووە ٥ سۆراخێکم کردووە.
نَسِمَ البعيرُ نَسَماً: حوشترەکە سمی کون بوو.
ناسَمَهُ مناسَمَةً ونِساماً: لێی نزیك بۆوەو بۆنی کرد ٥ قسەی لەگەڵ دا کرد ٥ سرتەی لەگەڵ دا کرد.
نَسَّمَ في الأمر: دەستی بەکارەکە کرد بەڵام زۆر نەچۆتە ناوی.

تَسَمَّ النَّسَمَةَ: ئادەمیزادی بوژاندنەوە لەمردن ڕزگاری کردن.

تَنَسَّمت الریحُ: بایەکە بەهێواشی هەڵی کرد.

تَنَسَّمَ المکانُ بالطیب: شوێنەکە بۆنی خۆش بوو.

تَنَسَّمَ فلان: فلانکەس هەوای خاوێنی هەڵمژی.

تَنَسَّمَ الجنینُ: کۆرپەلەکە لەسکی دایکیا ئەندامەکانی جەستەی ڕێك بوون شکڵی ئادەمی وەرگرت ٥ دەگوترێ: (أملصت الأنثى وَلَدَها قبل أن يَتَنَسَّمَ).

تَنَسَّمَ الریحَ: بۆنەکەی هەڵمژیو هەستی بەخۆشی کرد.

تَنَسَّمَ فلان العِلْمَ أو الخبرَ: فلانکەس وردە وردەو لەسەرەخۆ زانیاری فێربوو زانستی بەدەست هێنا ٥ یان وردە وردە هەواڵەکەی بەدەست هێنا.

تَنَسَّمْتُ اَثَرَهُ حتی تَبَیَّنْتُه: سۆراخم کردو بەشوێنیا ڕۆیشتمو شوێن پێیم هەلگرت تا ئاشکرام کرد.

المَنسِمُ: لایەکی سمی حوشتر ٥ ڕێگا ٥ دەگوترێ: (قد إستبان المَنسِم) لایەکی سمی حوشترەکە دەرکەوت.

النّاسِم: نەخۆشێك بگاتە حاڵەتی گیانەڵاو.

النَّسَمُ: خەڵكو ئادەمیزاد ٥ هەناسەی گیان ٥ کزەبا ٥ سەرەتای هەڵبوونی با بەهێواشی ٥ ڕێگای کوێرەبوو ٥ بۆنی شیر یان بۆنی چەوری ٥ باڵندەی تیژ ڕۆی وەکوو واشە ٥ کەرمنگیان سەوز بنوێنێ.

النَّسْمَةُ: عەرەقکردنی ناو گەرماو یان عەرەق بەگشتی.

النَّسَمَةُ: زیندەوەر گیانەوەر هەرشتێك گیانی تێدا بێ ٥ تەنگەنەفەسی (هەناسە برکە).

النَّسِیمُ: شنەبا (کزەبا) کە درەخت نەهەژێنێو گڵو خۆڵ ڕانەدا ٥ گیان ٥ عەرەق ٥ هێزو تواناو خۆگری.

نَسْنَسَ الرجلُ: پیاوەکە زەعیفو لاواز بوو.

نَسْنَسَ الطائرُ: باڵندەکە تیژ فڕی.

نَسْنَسَتِ الریحُ: بایەکە هەڵبوو بەشێوەی سارد کزەبای سارد هەڵبوو.

نَسْنَسَ الدابَّةَ: وڵاخەکەی تاوداو خێرا لێی خوڕی.

النَّسْناسُ: جۆرە مەیمونێکی جەستە بچوکەو کلکی درێژە ٥ برسیایەتی زۆر ٥ دەگوترێ: (جوع نسناس) برسیایەتی برست بڕو بەشیدەت.

**نَسَا الشَّيْءَ نَسْواً:** وازى لەشتەکە هێنا ◊ دەگوترێ: (نَسا العَمَلَ) وازى لەکارەکەى هێنا.
**نَسَا فلاناً نَسْياً:** زەبرى لەڕەگى وەريکى دا.
**نَسِيَ فلان نَسىً:** فلانکەس لەڕەگى وەريکى دا ◊ ئازار پەيدا بوو ◊ (فهو نَسٍ وهي نسية وهو أنسى وهي نسياء).
**نَسِيَ الشَّيْءَ نَسْواً ونَساوةً ونِسياناً:** شتەکەى واز لێ هێنا، لەبيرى چوو.
**أنساه الشَّيْءَ:** شتەکەى لەبير بردەوە.
**ناساه العداوة:** دوژمنايەتى لەبير بردەوە.
**نَسَّاه الشَّيْءَ:** بەمانا (أنساه) دێ.
**تناسى الشَّيْءَ:** هەوڵى دا شتەکەى لەبير بچێتەوە ◊ واى خۆ نيشان دا کەشتەکەى لەبير چۆتەوە.
**الأنسى:** ڕەگێکە لەبەلەکى مرۆڤ دايە.
**النَّسا:** ڕەگى وەرکييە، ڕەگێکە لەسمتەوە درێژ بۆتەوە بۆ پاژنەپێ ◊ لەتەسنيەکەى دا دەگوترێ: (نَسَوان) يان (نَسَيان) ◊ (ك: أساةً).
**النِّسَاء:** کۆمەڵێك ئافرەت.
**النَّسْوَةُ:** قومە شەرابێك ◊ دەگوترێ: (نَسْوَةٌ من لَبَن).
**النِّسْوَةُ:** کۆمەڵێك ئافرەت.
**النِّسوان:** ئافرەت.
**النَّسْيانُ:** کەسێك زۆرى شت لەبير بچێ.
**النِّسْيانُ:** نەخۆشى لەبيرچوونەوە کەزوو شتيان لەبير دەچێ.
**النِّسْيُ:** شتى لەبيرەوە چوو ◊ شتى بێ نرخ، کەمبايەخ.
**النَّسِيُّ:** شتى لەبيرەوەچوو ◊ دەگوترێ: (هو نَسِيُّ قومِه).
**نَشَأ الشَّيْءُ نَشْئاً ونشوءاً و نَشْأةً:** شتەکە پەيدا بوو ◊ دروست بوو، هاتە کايەوە.
**نَشَأ الصَّبِيُّ:** منداڵەکە گەشەى کردو پێگەيى ◊ دەگوترێ: (نَشَأتُ في بني فلان)و (نَشَأ فلان نَشْأة حسنة).
**نَشَأ الشَّيْءُ عَنْ غيره:** شتەکە لەشتى ترەوە پەيدا بوو.
**تَنَشَّأ لحاجته:** بۆ ئەنجامدانى کارى خۆى ڕاساو هەوڵى دا.
**إسْتَنْشَأ الشَّيْءَ:** داواى دروستکردنى شتەکەى کرد ◊ دەگوترێ: (إسْتَنْشَأتُهُ قصيدة في الزهد) داوام لێ کرد پارچە شيعرێکم بۆ دابنێ لەبارەى دونيا نەويستييەوە.
**إسْتَنْشَأ الأخْبار:** بەدوا هەواڵەکەدا چوو توێژينەوەى تێدا کرد.
**الإنشاء:** (لەزاراوەى زانستى بەلاغەدا) بريتيە لەقسەو ڕستەيەك لەخاريج دا ماناى نەهاتبێتە کايەوە ◊ واتە: لەواقيعو دەرەوەدا مانايەکى هەبوو

بەرامبەری نەبێ، لەزاراوەی ئەدیبو هەستیاران دا (الإنشاء) فەنو بەهرەیەکی خودا دادە، بەهۆیەوە دەتواندرێ مانای جۆراو جۆر کۆبکرێنەوە لێك بدرێن رێك بخرێن و مانای جوانو سەرەنج راکێش دەربېردرێ.

**المَنشأ**: شوێنی دروستکردن ٥ شوێنی دروستبوون ٥ دەگوترێ: (هذا مَنشَؤُهُ يابان) و (هذا منشؤه أربيل) رەگو ریشەو بنەما ٥ دەگوترێ: (ما منشأ هذا الإضطراب )؟

**المُنشِئُ**: ئەو نووسەرەی باش دەزانێ پەخشان دابرێژێو قسەکانی شیرینو رەوان بن.

**المُنشأةُ**: شوێنی کارکردنو پیشەسازیو کۆکردنەوەی پارچەی ئامێرو لێکدانو لێك بەستنیان.

**الناشِئُ**: کورێك لەتەمەنی بچوکی تێپەری کردبێو گەیشتبێتە تەمەنی گەنجی.

**النَّاشِئة**: کچۆڵە لەتەمەنی منداڵی تێپەری کردبێو چوبێتە حاڵەتی گەنجی ٥ شەو بەخەبەر هاتنو نوێژو تاعەتکردن.

**النَّشْئُ**: سەرەتای پەیدابوونی هەور ٥ منداڵ لە سەرەتای ساڵانی خوێندنی دا ٥ ئاژەڵو حەیوانات لەکاتی رامکردنو ژێربارکردنی دا ٥ (ك: نَشأ) ٥ زرووێت وەچە ٥ دەگوترێ: (هو نَشئُ سوء) ئەو کابرایە وەچەو دەرئەنجامی خراپەکارییە.

**النَشأةُ**: وەدی هێنانو پەروەردەکردن.

**النَّشيئة**: دەگوترێ: (حوض نَشِيئة) حەوزێکە ئاوی تێدا نەماوەو بنکی دەرکەوتووە.

**نَشِبَ في الشَّيْئ نَشَباً ونشوباً**: لەشتەکە هەڵچەقیو پێوەی نووسا ٥ پێیدا رۆیشتە خوار ٥ دەگوترێ: (نشبت مخالب السبع في الصيد) چنگی درندەکە چووە جەستەی نێچیرەکەوە ٥ (نَشِبَ العظم في الحلق) ئێسقان لەقورگ گیرا.

**نَشِبَ فلان فيما يكرهه**: فلانکەس توشی ئەوە بوو کەپێی ناخۆشە.

**نَشَبَ الشرُّ أو الحرب بين البلدين**: شەرو ئاژاوە لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا بەرپا بوو.

**نشب الأمر فلاناً**: کارەکە یەخەی فلانی گرت.

**أنشب الصائدُ**: داوی نێچیرەوانەکە لەنێچیرەکەوە هاڵا.

**أنشبت الريحُ**: رەشەبایەکە بەتوندی هەڵی کردو زیخو گڵو خۆڵی رادا.

**انشَبَ الشَّيْئَ في غيره**: شتەکەی

لەشتێکی تر گیر کرد ٥ دەگوترێ: (أنْشَبَ فيه مَخالِبه) چنگی لێ گیرکرد، چنگی تێنا.

ناشَبَهُ الحربَ: شەڕی لەگەڵ هەلگیرساند.

نَشَّبَ الشَّيْءَ في غيره: بەمانا (أنشبَهُ) دێ.

نَشَّبَ الثوبَ: قوماشەکەی بەوێنەکردن تێیدا ڕازاندەوە.

إنْتَشَبَ القوم: خەڵکەکە یەکیان گرتو هەندێکیان بە هەندێکیانەوە گیرۆدە بوون وەگری یەکتری بوون.

تَنَشَّبَ في الشَّيْءِ: بەمانا (نَشِبَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَنَشَّبَ في قلبي حُبُّها) خۆشەویستی ئەو چووە دڵمەوە.

المَنْشَبَةُ: ماڵو سامان، مەنقولەو غەیرە مەنقولە.

النَّاشِبُ: تیرهاوێژ.

النَّشَبُ: ماڵو سامان ٥ زەوی و زار ٥ خانو و بەرە.

النُّشَبَةُ: دەگوترێ: (رجل نُشَبَةٌ) پیاوێکە کەدەستی دایە کارێك وازی لێ ناهێنێ تا تەواوی نەکا.

النَّشابُ: تیر، سەرە تیر ٥ (ك: نشاشيب) دەگوترێ: (ترامَوا بالنشاشيب) یەکتریان تیرباران کرد.

النُّشَّابُ: شتێك کە زۆر بەناو شتی تردا ڕۆبچێ ٥ تیر دروستکەر ئەو کەسەی تیر دروست بکا ٥ (ك: نَشَابَةٌ).

نَشَجَ الباكي نَشْجاً ونشيجاً: مرۆڤە گریاوەکە گریانی لەسنگی دا دەکوڵیو گریانەکەی دەرنەبڕی.

نَشَجَ الحِمارُ: گوێدرێژەکە زەڕینەکەی لەقوڕگی خۆی دا خواردەوە.

نَشَجَ الضفدع: بۆقەکە قراندی ٥ (نَشَجَ القِدْرُ) مەنجەڵەکە کەوتە گیزە گیز.

نَشَجَ نَشْجاً ونشوجاً: ئاو و شتی وای خواردەوە بەڵام تێراو نەبوو.

نَشَجَ السقاء والجِلْدُ ونحوهما نَشْجاً: پێستەکە یان کوندەکە ئاوی دەڵاند، ئاوی لێ چوو.

نَشَجَ الدَّابّة: ئەوەندەی ئاودا بە وڵاخەکە کە گڕی تینوایەتی دابمرکێنێو بەس بەتەواوی تێر ئاوی نەکرد.

إنْتَشَجَ: بەمانا (نَشَجَ) دێ.

النَّشَّاجُ: صیغەی موبالەغەیە و لەمادەی (نَشَجَ) دەرهێنراوە ٥ دەگوترێ: (سَقاء نَشّاجٌ) کوندەیەکە زۆر ئاو دەدەڵێنێ.

النَّشوج: ئاوی کەم.

نَشَدَ فلان نَشْداً ونِشداناً: فلانکەس یادی کەوتەوە، هاتەوە بیری.

نَشَدَ الضالَّةَ: هەوڵی دۆزینەوەی گومبووەکەی دا.

نَشَدَ فلاناً: هەوڵی دیتنی فلانی داو چو بۆلای.
نَـشَدَ فلانـاً بكـذا: فیـساره شتی بـیری فلانكـەس هێنایـەوە ٥ دەگـوترێ: (نشدتك الرحم) داوات لێ دەكەم بـیری خزمایەتی نێوانمان بكەیەوەو ڕێزی لێ بگـری ٥ (نَـشَدْتك الله) خوداوەنـدت بیردێنمەوە، خودا دەكەم بەگژتا.
انْـشَدَ فلانـاً: وەڵامـی فلانـی دایـەوە ٥ دەگـوترێ: (نَـشَدْته فأنْـشَدَني (یـان) فَأنْشَدَ لي).
أنْشَدَ الشِّعْرَ: بەدەنگی بەرز شیعرەكەی خوێندەوە.
ناشَدَ فلاناً الأمْـرَ وفیـه مناشـدة: داوای كارەكەی لە فلانكەس كرد.
ناشَـدَ فلانـاً الله: خـودای كـرد بەگـژیاو وتی بۆخـاتری خـودا ئـەوەم بـدەرێ یان سوێندی دا بەخودا كەئەوەی بۆ بكا.
تناشـدوا الأشـعار: خەڵكەكـە شـیعریان بۆیـــەكتری بـــەدەنگی بـــەرز خوێندەوە.
تَنَـشَّدَ الأخبـار: هـەوڵی بەدەستهێنانی هەواڵــەكانی دا بۆئــەوەی پــێش كەسانی دیكە پێیان بزانێ.
إسْتَنْشَدَ فلاناً شعراً: داوای لەفلانكـەس كرد شیعرێكی بۆ بڵێ.
إسْتَنْـشَدَ فلانــاً الـضَّالَّة: داوای لــە فلانكەس كـرد بـانگی بـۆ هەڵدا بـۆ دۆزینەوەی گومبوەكەی.
الأنـشودة: نەشـید شـیعرێك بكرێتـە نەشـــیدی نیـــشتمانی وەكـــوو شیعرەكەی دڵدار: (ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی كورد زووبان......).
المُنْشِدُ: كەسێك بـەدەنگی بـەرز شیعر بخوێنێتەوە.
النَّشّادُ: كەسێك پیشەی بـانگ هەڵدان بێ بۆ شتی گومبوو.
النَّـشیدُ: دەنـــگو صـــەدا ٥ دەنـــگ بەرزكردنـــــەوە بەلەحنـــــەوە ٥ شیعرێك بكرێتە نەشیدی نیشتمانی ٥ پارچــە شــیعرێك یــان پارچــە زەحەلێك بەحەماسەتەوە كۆمەڵێك بـەدەنگی بـەرز بیخوێننـەوە ٥ (ك: أناشید).
النشیدة: بەمانا (النشیدُ) دێ.
نَشَرَت الأرض نشوزاً: زەوییەكە بەهاری لێ هاتو گیاو گژی ڕواند.
نَشَرَ الشجرُ: درەختەكە گەڵای كرد.
نَشَرَ الشَّيْءَ نَشْراً: شتەكەی بڵاو كردەوە.
نَـشَرَ الراعـي غَنَمَـهُ في المرعـى: شوانەكە مـەڕەكانی بـەناو لەوەڕگاكـەدا بـڵاو كردنەوە.
نَشَرَ الكتابَ أو الثوبَ أو نحوهما: كتێبەكە یـــان قوماشـــەكەی بـــڵاو كـــردەوە.

**نَشَرَ الخَبَرَ أو المقال:** هەواڵەکە یان مەقالەکەی پەخش کرد.

**نَشَرَ الكتابَ أو الصحيفة:** کتێبەکە یان ڕۆژنامەکەی بەچاپ گەیاندو پەخشی کرد.

**نَشَرَ الخَشَبَةَ:** دارەکەی ڕاهێنا، بڕیەوە تاشی.

**نَشَرَ الله الموتى نَشْراً ونشوراً:** خودا مردووەکانی زیندوو کردنەوە.

**نَشَرَ الشَّيْءُ نَشْراً:** شتەکە بڵاو بۆوە.

**نَشَّرَ الثوبَ أو الكتابَ:** قوماشەکە یان کتێبەکەی کردەوە، لێکی کردەوە.

**أَنْشَرَ الله الموتى:** خودا مردووەکانی زیندو کردنەوە.

**أَنْشَرَ الأرض:** زەوییەکەی بەئاو زیندو کردەوە.

**أَنْشَرَ الرياحَ:** بایەکەی هەڵکرد.

**إِنْتَشَرَ الشَّيْءُ:** شتەکە کرایەوە، بڵاو بۆوە.

**إِنْتَشَرَ الخبرُ:** هەواڵەکە بڵاو بۆوە.

**إِنْتَشَرَ الشَّيْءُ:** شتەکە پەرتەوازە بوو، بڵاو بۆوە ٥ دەگوترێ: (إِنْتَشَرَ الناس في الأسواقِ).

**إِنْتَشَرَ العَصَبُ:** ڕەگەکە هاوسا ٥ ئەستور بوو.

**تناشروا الشَّيْءَ:** هاریکاری یەکتریان کرد بۆ بڵاو بوونەوەی شتەکە.

**تَنَشَّرَ الشَّيْءُ:** شتەکە کرایەوە، پان بۆوە ٥ پەرتەوازە بوو.

**إِسْتَنْشَرَ الشَّيْءُ:** داوای کرد شتەکە بڵاو بکرێتەوە.

**التناشيرُ:** نووسینی منداڵ کە سەرەتا فێری نووسین دەبێ ٥ دەگوترێ: (ما أشبه خطه بتناشير الصبيان).

**المِنْشارُ:** مشار.

**المَنْشَرُ:** شوێنی نەشرو بڵاو بوونەوە ٥ بڵاو کردنەوە.

**المنشورُ:** کارێکی بڵاو کراوە ٥ بەیانێکی بڵاو کراوە بەناو فەرمانگەو خەڵك دا بۆئەوەی زۆر کەس بیزانن.

**النَّاشِرُ:** ئەو کەسەی پیشەی لەچاپدانو پەخش کردنی کتێب بێ ٥ پیشەی کتێب فرۆشی بکا ٥ جۆرە مارێکە ژەهراوی سەری پان دەکاتەوە وەکوو ئەسکوێ.

**النَّاشِرَةُ:** دەمارێکی خوێنبەرە لەژێر پێستی دیوی ناوەوەی باسكو قۆڵە ٥ (ك: نواشر).

**النُّشارة:** پیشەی شەقکردنی دار.

**النُّشارَةُ:** ئەو وردە دارەی لەکاتی شەقکردنو ڕاهێنانی داردا دەکەوێتە خوار.

**النَّشْرُ:** بۆنی خۆش ٥ نەتەوەیەکی پەرتەوازە کە سەرۆکێکیان نەبێ

کۆیان بکاتەوە ٥ دەگوترێ: (جاء القوم نشراً) خەڵکەکە بەپەرتەوازەیی هاتن ٥ چاپکردنی کتێب و ڕۆژنامەو گۆڤارو فرۆشتنیان.

**النَشْرَةُ:** بای نەسیم ٥ بەیاننێك دەنووسرێ و پەخش دەکرێ بۆئەوەی بزاندرێ هەڵوێستی لایەنێك یان دەسەڵات لەبارەی ڕوداوێکی تایبەتییەوە چۆنە.

**النُشْرَةُ:** هەندێ دوعاو نوشتەو شتی وان بەکاردەهێندرێن بۆ چارەسەری نەخۆش.

**النَشّارُ:** کەسێك پیشەی دار بڕینەوە بێ.

**النُشورُ:** بۆ زیندەڕۆیی لەمانای (النَاشِرُ) دێ.

**النُشُورُ:** زیندوو کردنەوەی مردوو، ڕۆژی قیامەت.

**النَشِيُّ:** بڵاوکراوە.

**نَشَزَ الشَيْئُ نَشْزاً ونشوزاً:** بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (نَشَزَ المكانُ) (وَ نَشَزَ العِرْقُ) ٥ شوێنەکە بەرز بوو، دەمارەکە هەڵسا ٥ هەروا دەگوترێ: (نَشَزَت إليّ نَفْسي) دڵم ترساو نارەحەت بوو.

**نَشَزَ فلان:** فلانکەس چووە سەر بەرزاییەکی زەوی.

**نَشَزَ من مكانه وفيه:** لەشوێنی خۆی هەڵساو ڕاساو جوڵا ٥ بەرز بۆوە ٥ دەشگوترێ: (نَشَزَت النغمة عَنْ مثيلاتها) لەحن و گۆرانیەکە لەیاسای خۆی دەرچوو.

**نَشَزت المرأةُ:** نافرەتەکە لەمێردەکەی یاخی بوو، داب و نەریتی ژن و مێردایەتی پەیڕەو نەکرد.

**نَشَزَ الرجلُ:** پیاوەکە پابەندی داب و نەریتی هاوسەرایەتی نەبوو ٥ (فهو ناشِز وهي ناشِزَة) ٥ (ك: نواشِز).

**نَشَزَ بقرنه نَشْزاً:** بەقۆچ هەڵی گرت و بەزەوی دا دا.

**أنْشَزَ الشَيْئَ:** شتەکەی لەشوێنی خۆی بەرز کردەوە.

**أنْشَزَ الله عظام الميت:** خودا ئێسك و پروسکی مردووەکەی لەشوێنی خۆی بەرز کردەوەو پێکیەوە نانەوەو ڕێکی خستنەوە بۆئەوەی سەرلەنوێ بەگۆشت دایان پۆشێ و گیانیان بەبەردا بکاتەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَانظُرْ إِلَى العِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا﴾.

**تنَشَزَ لكذا:** خۆی بۆ هەڵدا.

**النَاشِزُ:** دەگوترێ: (فلان ناشز الجبهة) فلانکەس ناوچەوان دەرپەڕیوە ٥ (قلب ناشِزُ) دڵێکە لەترسان کەوتوەتە پەلەپەل.

**النَّاشِزَةُ**: دەگوترێ: (لحمة ناشِزة) پارچە گۆشتێکە لەجەستە بەرزبۆتەوە هەڵتۆقیوەتەوە.

**النَّشاز**: بەمانا (النَّشزُ) دێ واتە: شتی نارێك و پێك نەگونجاو شتێك لەئاستی شتەکانی پەنا خۆی نەبێ لەیاسای هاو وێنەی خۆی دەرچووبێ.

**هذه النّغمة نشاز**: ئەم هەوای گۆرانییە لەوانی تر ناچێ.

**النَّشْزُ**: ئەوەی لەزەوی بەرزبێتەوە وەکوو تەپۆلکەو گردۆلکە.

**النَّشَزُ**: بەمانا (النَّشزُ) دێ.

**نَشَّ الشَّيْءُ نَشّاً ونشيشاً**: شتەکە وشك بۆوە ئاوەکەی نەما ٥ دەگوترێ: (نَشَّ الرطب) خورماکە وشك بۆوە ئاوی تێدا نەما ٥ (وأشتدّ الحرُّ فَنَشَّ الحوضُ) گەرما تاوی سەندو حەوزەکە وشك بوو.

**نَشَّ اللّحمُ**: گۆشتەکە لەسەر ئاگرەکە جزەی هات.

**نَشّت الجرة الجديدة**: جەرە تازەکە کەئاوی تێکرا کزەکزی لێ هات.

**نَشَّ الشَّيْءَ نَشّاً**: شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**نَشَّ الدابةَ**: وڵاخەکەی بەهێواشی لێخوڕی.

**نَشَّ الذّبابَ ونحوه**: مێشەکەی دەرکرد.

**المَنَشُّ**: ئەو گۆماو و زۆنگاوانەی لە قەراخ ڕووبارو دەریا ئاویان تێدا دەمێنێتەوە ٥ دەگوترێ: (کانوا في مَنَشّ الساحِل).

**المِنَشَّة**: مێش کوژ ٥ مێش دەرکەر گورزێکی سەر پرژاوییە مێشی پێ دەرەتێندرێ.

**المنشوش**: دەگوترێ: (دهن منشوش) ڕۆنێکە بۆنی خۆشی تێکەڵ کراوە.

**النَّشاشُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَشَّ) دێ ٥ دەشگوترێ: (سبخة نشَّاشَة) زەوییەکە گڵەکەی وشك نابێتەوە و لەوەڕیشی لێ ناڕوێ.

**النَّشُّ**: نیوەشت ٥ هەرشتێك بێ ٥ دەگوترێ: (نَشُّ أوقية) نیوەی حوقەیەك ٥ سەنگێکی کێشانەیە کێشەکەی کێشی بیست دیرهەمە.

**النَّشيشُ**: دەنگی ئاو و شتی تر کە گەییشتە ئاستی کوڵین.

**النَّشيشَةُ**: زەوییەك وشك نەبێتەوە و گیای لێ نەڕوێ.

**نَشَصَ نشوصاً**: بەرز بۆوە ٥ هەڵتۆقی.

**نَشَصَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دەرهێنا ٥ لێی کردەوە ٥ دەگوترێ: (أقام القوم ما يَنشِصون وتداً) خێڵەکە لەو شوێنە دایانکوتاو نیازی مانەوەیان هەیە سنگی داکوتراوی ڕەشماڵیان هەڵناکەنن.

**نَشَصَ فلاناً بالرمح:** بەرمب زەبری لەفلان دا.

**أنْشَصَهُ:** دەری هێنا ٥ دەگوترێ: (أنْشَصَ فلاناً مـن بيتـه) فلانکەسی لەماڵی خۆی هێنایە دەر ٥ (أنشَصَ الجَدْبُ الناس عَنْ مواضعهم) گرانیو قاتو قڕی خەڵکەکەی ناچار کرد زێدی خۆیان جێ بێڵن.

**إنْتَشَصَ الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵکەند.

**إنْتَشَصَ الشجرةَ:** درەختەکەی هەڵکەند.

**المِنْشاصُ:** ئافرەتێك لەمێردەکەی زیز بووبێو لەگەڵی نەخەوێ.

**النَّشاصُ:** هەوری پڕو چین لەسەر چین.

**النَّشُوصُ مـن الرماح:** ڕمبی بەرز کراوەو ئامادە بۆ شەڕ.

**نَشِطَ من المكان نَشْطاً:** لەشوێنەکە چووە دەر.

**نَشِطَ المسيلُ:** لافاوەکە لە ڕێڕەوی خۆی لای داو کەوتە قۆرتو پێچ کردن.

**نَشَطَت بـه الهموم:** خەمو خەفەت سەریان لێ تێك داوە.

**نَشَطَ الحَبْلَ:** حەبلەکەی واگرێ داوە بەئاسانی بکرێتەوە.

**نَشَطَ الشَّيْءَ:** شتەکەی دەرهێناو ڕایتەکاند.

**نَشِطَ الدَّلْوَ:** دۆڵچەکەی دەرهێناو تەکاندی.

**نَشَطَ فلاناً:** زەبری لەفلانکەس دا.

**نَشَطَتْهُ الحيَّة:** مار گەستی، پێوەی دا.

**نَشِطَ إليه وله نشاطاً:** بەچوستو چالاکی دەستی دایە.

**نَشِطَ في العمل ونحوه:** ئیشەکەی پێ خۆش بوو بەدڵسۆزی تاوی دایە.

**أنْشَطَ فلاناً:** فلانکەسی چوستو چالاك کرد.

**أنْشَطَ العُقدةَ:** گرێیەکەی کردەوە، شلی کردەوە.

**إنْتَشَطَ الشَّيْءَ:** شتەکەی ڕاتەکاندو دەری هێنا.

**إنْتَشَطَ النَشيطةَ:** دەسکەوتی پێش جەنگی گرتو ڕایماڵی.

**تَنَشَّطَ:** نیشاتی پەیدا کرد.

**تَنَشَّطَ للعمل:** خۆی بۆ کارەکە حازر کردو دەستی پێ کرد.

**تَنَشَّطَ الطريقَ:** بەچوستو چالاکی ڕێگاکەی بڕی.

**إسْتَنْشَطَ الجِلدُ:** پێستەکە وێکهاتەوەو کۆبۆوە.

**المَنْشَطُ:** شتێك بەتامەزرۆوە بۆی بچێو کردنەکەی کاریگەر بێ.

**المِنْشَطُ:** کەسێك نیشاتی زۆر بێ.

**النَّشاطُ:** کارکردنی دڵسۆزانە لەبوارێك لەبوارەکانی ئیش دا ٥ دەگوترێ: (لفلان نِشاط زراعي أو تجاري).

الأنشوطة: گرێیەکە بەئاسانی بکرێتەوە.

النَّاشِط: ئەو کەسەی حەبل شی دەکاتەوە بۆئەوەی سەر لەنوێ بیکاتەوە بەحەبل.

النَّشْطُ: گەستنی خێرا، داخکردنی خێرا بەم جۆرە ئاسنە گەرمەکە بەخێرایی بگەیەنیە گۆشتەکەو لایبەی نەهێڵێ زۆری داخ بکا.

النَّشْطَةُ: دەگوترێ: (بئر نشوط) بیرێکە بەناخۆشی دۆڵچەکەی لێ دێتە دەر.

النَّشِيطة: ئەو غەنیمەو دەستکەوتەیە کە جەنگاوەرەکان پێش ئەوەی بگەنە گۆڕەپانی جەنگ دەستیان دەکەوێ.

نَشَغَ نَشْغاً: پرخەیەکی توندی کرد.

نَشَغَتِ الأرضُ: زەوییەکە ئاوێکی تام ناخۆشی دەردا.

نَشَغَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەزەحمەتو ڕاتەکاندن دەرهێنا.

نَشَغَ المريضَ الدواءَ نَشْغاً: دەرمانەکەی دەرخواردی نەخۆشەکە دا.

نَشَغَ فلاناً الكلامَ: قسەی فێری فلان کرد پێی گوت ئاواو ئاوا بڵێ.

نَشَغَ فلاناً بشربة: فریا فلانکەس کەوت بەوەقومی ئاوی دایەو ڕزگاری کرد لەخنکان.

إنْتَشَغَ: بۆنی کرد.

المِشْنَغُ: پاکەتو کیفی ئەو بۆنو بەرامەی هەڵدەمژرێ.

النُّشاغة: ئەو شتەی بەدەست هەڵدەکەندرێو فڕێ دەدرێ.

النَّشَغُ: ئەو ئاوەی تامی ناخۆش‌و تفتە.

النُّشوغُ: ئەو دەرمان‌و شتە بۆندارەی دەکرێتە ناو کونی لوتەوە ٥ دەرمانێك دەکرێتە دەمی نەخۆشەوە.

نَشَغَ الماءُ نَشْغاً: ئاوەکە ڕەوان بوو.

نَشَغَ فلان: فلانکەس لرخەو پرخەی کرد، خەریك بوو لەسەر خۆ بچێ ٥ هەناسەی قوڵ و تەنگی هەڵکێشا.

نَشَغَ بالشيء: قورگی بەشتەکە گیرا.

نَشَغَ الطريقَ بالقوم: ڕێگاکە بەقەرەباڵغی خەڵکەکە تەنگ بوو.

نَشَغَ الماءَ: ئاوی خواردەوە.

أُنْشِغَ فلان: فلانکەس دورکەوتەوە، کەنارگیر کەوت.

أَنْشَغَ الصَّبِيَّ الدواءَ: دەرمانەکەی دەرخواردی منداڵەکە دا ٥ دەشگوترێ: (أنْشَغَهُ الكلامَ) قسەی فێر کرد، دەرزی دا دا چۆن قسەکانی بکا.

إنْتَشَغَ الدواءَ: قوم قوم دەرمانەکەی خواردەوە.

إِنْتَشَغَ الكلامَ: قسەی فێر كرد، پێی گوت ئاوا بڵێ‌و ئاوا وەڵام بدەرەوە.
تَشَنَّغَ فلان: فلانكەس لرخەو پرخەی بەهێزی كرد ٥ خەریك بوو گیانی دەرچێ.
المِنْشَفَةُ: گوڵاو پرژێن شتێك بۆنی خۆشی پێ بڵاو بكرێتەوە.
النّاشِفَةُ: ڕێڕەوی ئاو بۆناو شیو و دۆڵ.
النَّشْغَةُ: هەناسە سواربی ٥ هەناسە بڕكێ ٥ تێكچوون‌و لنگەفرتێ‌و شڵە ژانێكە لەكاتی گیانەڵاو دا توشی ئادەمیزاد دەبێ.
نَشَفَ الشَّيْءُ نَشْفاً: شتەكە وشك بوو ٥ دەگوترێ: (نَشَفَ الثوبُ و نَشَفَتِ الأرض و نَشَفَ الماءُ).
نَشَفَ الشَّيْءَ: شتەكەی وشك كردەوە ٥ دەگوترێ: (نَشَفَ الثوبُ العرقَ) قوماشەكە ئارەقەكەی وشك كردەوە.
نَشِفَ الشَّيْءُ نَشْفاً ونَشَفاً: شتەكە وشك بۆوە.
نَشِفَتِ الأرض: زەوییەكە وشك بۆوە.
نَشِفَت الأرضُ الماءَ: زەوییەكە ئاوەكەی هەڵمژی.
أَنْشَفَتِ الدابةُ: ئاژەڵەكە (وڵاخەكە) لەدوای بێچوی مێینە بێچوی نێرینەی بوو.
أَنْشَفَ الشَّيْءَ: شتەكەی وشك كردەوە.
أَنْشَفَ فلاناً: سەر توێژی شیری دەرخوادی فلانكەس دا.
نَشَفَتِ الحلوب: حەیوانە شیردەرەكە جارێك گوانی پڕبوون لەشیرو جارێكی تر هیچیان تێدا نەبوو.
نَشَّفَ اللبنُ: شیرەكە سەرتوێژی پەیدا كرد.
نَشَّفَ الشَّيْءَ: شتەكەی وشك كردەوە.
نَشَّفَ الماءَ: بەپەڕۆو ئیسفنج‌و شتی وا ئاوەكەی وشك كردەوە.
إِنْتَشَفَ فلان: فلانكەس سەر توێژی شیری خواردەوە.
إِنْتَشَفَ فلان الماءَ ونحوه: فلانكەس ئاوەكەی وشك كردەوە بەپەڕۆو ئیسفنج‌و شتی وا.
إِنْتَشَفَ النشافة: سەرتوێژی شیرەكەی گرت.
أُنْتُشِفَ لونُهُ: ڕەنگی گۆڕا.
تَنَشَّفَ الرجلُ: پیاوەكە بە خاولی‌و شتی وا ئاوی لەجەستەی سڕی، خۆی وشك كردەوە.
تَنَشَّفَ الشَّيْءَ: شتەكەی وشك كردەوە.
المِنْشاف: حەیوانی شیردەر كەجارێك گوانی پڕبن لەشیرو جاری وایش هەبێ هیچیان تێدا نەبێ.
المِنْشَفَةُ: خاولی‌و قوماش‌و شتی وا كەئاوی پێ وشك بكرێتەوە ٥

دەسەسرو شتی وا کەناوی سەر دەم‌و چاو و دەست‌و مەچەکی پێ بسڕدرێتەوە ○ (ك: مناشف).

**النُّشَافَةُ**: ئەو توێژو کەفو شتەی دەکەوێتە سەر مەنجەڵە شیر ○ ئەو ئاو و عارەق‌و چەورییەی بە پەڕۆو شتی وا دەسڕدرێتەوە.

**النَّشَاف**: کاغەزی شاش کە نەپەستێورابێ‌و صەقل نەکرابێ‌و مەرەکەب زۆر هەڵمژێ‌و وشکی بکاتەوە.

**النَّشَّافَةُ**: خاولی‌و دەستە سڕ.

**النَّشَفُ**: بەردی گەرماو (بەردێکی ڕەشی کونکون‌و گرن گرنە بەرەپێی پێ دەشۆرێ‌و پێی پاك دەکرێتەوە).

**النُّشْفَةُ**: پارچە پەڕۆیەکە شتی تەڕبوی پێ دەسڕێ‌و پێی وشك دەکرێتەوەو هەموو جارێ پەڕۆ تەڕەکە لەناو قاپێك دا دەگوشی‌و ئاوەکەی لێ دەچۆڕێنیەوە.

**النَّشِفَةُ** (أرض نَشِفَة): زەوییەکە ئاو زۆر هەڵدەمژێ.

**النُّشْفَةُ**: شتی کەم کەلەبنکی قاپ‌و شتی وادا دەمێنێتەوە ○ ئەو تۆزە خواردنەی بەکەوچك‌و کەوگیر بەگەرمی لەمەنجەڵ دەردێنرێ‌و بۆ تاقیکردنەوەو تام کردن دەخورێ ○ توێژی سەر شیرو ماست.

**نَشِقَ في الحِبالة نَشَقاً**: کەوتە ناو داوەکە.

**نَشِقَ فلان في حبالة فلان**: فلانکەس کەوتە داوی فلانکەسەوە.

**نَشِقَ الرائحة**: عەترەکەی بۆنکرد.

**نَشِقَ النَّشوقَ**: دەرمانەکەی هەڵمژی بۆ کونەلوتی.

**أنشَقَ الصائِدُ**: نێچیروانەکە داوەکەی بە نێچیرەکەیەوە نووسا.

**أنشَقَ الصَّيْدَ**: داوەکەی بە نێچیرەکەوە کرد پێوەی هەڵواسی.

**أنشَقَ فلاناً النُّشُوقَ**: دەرمانەکەی بە فلانکەس هەڵمژی.

**إنْتَشَقَ الماءَ وغيره**: ئاوەکەی بەلوتی هەڵمژی ○ یان ئاوی لە لوتی ڕادا.

**تَنَشَّقَ الماء وغيره**: ئاوەکەی بەلوتی هەڵمژی.

**تَنَشَّقَ الرائحة**: عەترەکەی بۆن کرد، بۆنەکەی هەڵمژی.

**إسْتَنْشَقَ**: بەمانا (تَنَشَّقَ) دێ.

**المَنْشَقُ**: لوت ○ ئەندامی بۆنکردن‌و شت هەڵمژین.

**المَنْشَقَة**: ئەو شتەی دەرمانی لوتی تێدەکرێ.

**النَّشِقُ**: دەگوترێ: (رجل نَشِقٌ) پیاوێکە گیرۆدە بووە، چووەتە ناو کارێکەوە لێی ڕزگار نابێ.

**النُّشْقَةُ**: قلێتەو مل بێن کەدەکرێتە ملی ئاژەڵ‌و شتی واوە.

**النُّشُوقُ:** دەرمانی لوت، هەرشتێك بەلوت هەڵمزرێ ٥ بۆن بكرێ.
**النَّشاقى من الصيد:** نێچیرێكە قولاپی ڕاوكەرەكەی چوبێتە قورگیەوە.
**نَشَلَ الحيوانُ نشولاً:** حەیوانەكە لەڕبوو دالگۆشت بوو (فهو ناشل وهي ناشلة) ٥ دەگوترێ: (فخِذ ناشلة) ڕانێكی لەڕو كەم گۆشتە.
**نَشَلَ الشَّيْءَ: نَشْلاً:** بەپەلەو خێرا شتەكەی دارنی، لێی كردەوە، لێی دەرهێنا ٥ دەگوترێ: (و نَشَلَ الفريق من الماء).
**نَشَلَت الحيّة فلاناً:** مارەكە فلانكەسی گەست، پێوەی دا.
**أنْشَلَ الشَّيْءَ:** بەمانا (نَشَلَه) دێ.
**نَشَّلَ الأضياف:** بەركولێكی بۆ میوانەكانی دانا.
**المِنْشالُ:** پارچە مەعدەنێكە لای سەرەوەی قولاپێكی پێوەیە پارچە گۆشتی پێ لەمەنجەڵ و شتی وا دەردەهێندرێ ٥ (ك: مناشيل).
**النَّشّالُ:** كەسێك زۆر شت دەرێنێ، خێرا خێرا بە كەوگیرو شتی وا گۆشت لەمەنجەڵو شتی وا دەربێنێ ٥ دزی گیرفان بڕو دەست سوك ٥ دزی چوستو چالاك كەبەخێرایی شت بدزێو هەڵبێ.
**النَّشيلُ:** شتی دەرهێندراو ٥ شتی فڕێندراو و دزراو.
**نَشِمَ الشَّيْءُ نَشَماً:** شتەكە بۆنی گۆڕا (فهو نَشِمٌ) ٥ دەگوترێ: (يده نَشِمة) دەستی بۆنێكی ناخۆشی گرتووە، بۆنێكی ناخۆشی لەدەست دێ.
**نَشِمَ الثورُ:** گایەكە ڕەنگی بەڵەك بوو، پەڵە پەڵەی سپیو پەڵە پەڵەی ڕەش بوو ٥ (فهو نَشِمٌ وهي نَشِمة).
**نَشَّمَ الطعامُ:** خواردنەكە گۆڕاوەو بۆنێكی ناخۆشی لێ دێ.
**نَشَّمَت الأرضُ:** زەوییەكە فش بوو، بەرز بۆوە.
**نَشَّمَ في الأمر:** دەستی بەكارەكە كرد ٥ دەگوترێ: (نَشَّمَ في الشرِّ).
**تَنَشَّمَ في الأمر:** بەمانا (نَشَّمَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَنَشَّمَ منه علماً) زانیاری لێ وەرگرت ٥ لەو فێری زانست بوو ٥ (فلان يَتَنَشَّمَ العِلمَ) فلانكەس بەشێوەیەكی لەسەرە خۆیی خەریكی خوێندنو بەدەستهێنانی زانستە.
**المَنْشَمُ:** مادەیەكی بۆنخۆشە بەزەحمەت ورد دەكرێ ٥ لەپەندی پێشینان دا دەڵێ:(دقّوا بينهم عِطر مَنْشَمٍ) واتە: شەڕو هەرا لەنێوانیان دا گەرم بوو.
**النَّشَمُ:** درەختێكە لە پێڕی (ألزيزفونية)

بـه كـاتى خـۆى تيريـان لىٚ دەتاشـى، بـەرێكى خـڕى وەكـوو پرتـەقاڵى هەيە.

نَشنَـشَتِ القِـدر: مەنجەڵەكـە دەنگـى كوڵينى لىٚ هات.

نَـشْنَشَ فـلان: فلاْنكـەس خێـرا دەستى بەكارەكـــەى كـــردو خـــەريكى ئەنجامدانيەتى.

نَشْنَشَ الطائر: باڵندەكه پـەرى لـەخۆى دەركێشاو فڕێى دا.

نَـشْنَشَ الـشَّيْءَ: شـتەكەى پـاڵ پێوەنـاو ڕاپتەكاند.

نَشْنَشَ الدابة: ولاْخەكەى بـەخێرايى لىٚ خوڕى‌و دەنگى دا.

نَـشْنَشَ الوِعـاءَ: زەرفەكـەى هەڵڕشـتو ئەوەى تێيدا بـوو تەكانـدى‌و بـلاْوى كردەوە.

نَـشْنَشَ الجِلْـدَ: پێـستەكەى گـرو ٥ كوشتييەكەى كەوڵ كرد.

تَنَشْنَشَ: بۆ موتاوەعەى (نَشْنَش) دىٚ.

تَنَشْنَشَ الشَجَرَ: توێكڵى درەختەكەى لىٚ كردەوە.

النَّشْناشُ: دەگـوترىٚ: (رجـل نـشناش) پيـــاوێكى چوســـتو چـــالاكه لەسەفەردا.

النَّشْناشَةُ: دەگـوترىٚ: (أرض نـشناشة) زەوييـــەكى شـــۆرەخاكەو هـــيچ ناڕوێنىٚ، هيچى لىٚ ناڕوىٚ.

النَّشْنَشُ: دەگـوترىٚ: (غـلام نـشنش) كوڕێكـــــه گـــــورجو گۆڵـــــه لەخزمـەتكردنو ئـيش دا (نَشْنَـشيُّ الــذراع) دەســت گــەرمو دەســت ڕەنگينه.

النَّشْنَـشَةُ: دەنگـى لێـك خـشانى زرىٚ‌و كاغەزو قوماشى تازەو شتى وا.

نَـشِيَ نَـشْواً: زوو سـەرخۆش بـوو هـەر كەنارەقەكـــەى خـــواردەوە خێـــرا سەرخۆش بوو ٥ دەگـوترىٚ: (نَـشِيَ مـن الشراب).

نَـشِيَ بالـشيئ: ئاشـقى شـتەكه بـوو بەلايـەوە خـۆش بـوو ٥ جـار دواجـار دووبارەى كردەوە.

نَشِيَ الريحَ نَشاً ونشوةً: بـۆنى هەوايەكـەى كـرد، بـە لـوت هەواكـەى هەڵمـزى ٥ دەگـوترىٚ: (نَـشَيْتُ منـه رائحـة طَيّبـة) بۆنێكى خۆشم لىٚ هەڵمزى.

نَـشِيَ الخَبَـرَ: چـووە بـنجو بنـاوانى هەواڵەكەو ڕوداوەكەى ڕون كردەوە.

أنْشَى الشَّيْءَ: خۆشى‌و لەزەتى شتەكەى هەست پىٚ كرد.

إنْتَشَى فـلان: فلاْنكـەس سەرخۆشـى لىٚ ديارى دا.

إنْتَـشى الـريحَ: بـەلوت هەواكـەى هەڵمزى.

تَنَشَّي: بەمانا (إِنْتَشى) دێ.

إِسْتَنْشى: بەمانا (إِنْتَشى) دێ ٥ دەشگوترێ: (إِسْتَنْشى الخَبَرَ) لەهەواڵەکەی کۆڵیەوە.

النَّشا: هیدرات کاربۆنە؛ هاڕدراوێکی سپییە ٥ شنەبای بۆنخۆش ٥ یان بۆن‌و بەرام بەگشتی.

النَّشاءُ: بەمانا (النَّشا) دێ.

النَّشاةُ: درەختی وشك ٥ بۆن‌و بەرام.

النَّشْوانُ: سەرخۆشی ٥ سەرەتای سەرخۆشی بوونی ٥ بۆ ئافرەت دەگوترێ: (نَشْوى) ٥ هەروا بەکەسێك دەگوترێ کەدەست پێشخەری هەیە بۆ وەرگرتنی هەواڵ.

النَّشْوَةُ: هەواڵ لەسەرەتای پەیدابوونی دا.

النَّشَوِيُّ: هەرشتێك نیسبەت بدرێ بۆلای (النَّشا).

نَصَبَ الحادي: گۆرانی بێژو حودیە خوێنەکە بەستەیەکی سوکی چڕاند، بەدەنگێکی نزم‌و لەسەرەخۆ گۆرانی گوت ٥ فرت‌و فێڵی کرد.

نَصَبَ علیه: فرت‌و فێڵی لێ کرد.

نَصَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەرز کردەوە ٥ دەگوترێ: (نَصَبَ العَلَمَ، نَصَبَ البابَ) ٥ دەشگوترێ: (نَصَبَ لـه العداء) دوژمنایەتی بۆ نایەوە ٥ (نَصَبَ لـه حرباً) شەڕی هاویشتی شەڕی پێ فرۆشت ٥ (نصب الأميرُ فلاناً) پاشا پلەو پایەی دا بەفلانکەس ٥ (نَصَبَ الکلمة) بزوێنی فەتحەی دا بە وشەکە ٥ (نَصَبَ الشَّيْءُ أو الأمر فلاناً) نیشەکە فلانکەسی ماندو کرد ٥ دەگوترێ: (نَصَبَه المرضُ ونَصَبَه الهَمُّ).

نَصِبَ نَصَباً: ماندوبوو ٥ هەوڵی دا، کۆششی کرد.

نَصَبَ ذو القرن: شاخدارەکە شاخەکانی ڕاست هەڵچون ٥ (فهو أنصب وهي نصباء) ٥ دەشگوترێ: (ناقة نصباء) حوشترێکە سنگی بەرزە ٥ هەروا دەگوترێ: (أنصب الحديث) فەرموودەکەی بەرزکردەوە بۆسەر خاوەنەکەی.

ناصَبَهُ العداوَةَ أو الحربَ: دوژمنایەتی بۆ ئاشکرا کرد، بانگی شەڕی لەگەڵ دا.

نَصَّبَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەرز کردەوە هەڵیساندەوە.

نَصَّبَ الأميرُ فلاناً: پاشا پلەو پایەی ئیداری دا بەفلان.

إِنْتَصَبَ: بۆ موتاوەعەی (نَصَبَ) دێ ٥ دەگوترێ: (نَصَبَهُ فانتصب).

إِنْتَصَبَ للحکم: بۆ فەرمانڕەوایی خۆی ئامادە کرد.

تناصبوا الشّيْئَ: شتەکەیان بەش کرد.

تَنَصَّبَ: بۆ موتاوەعەی (نَصَبَ) دێ ٥ دەگوترێ: (نَصَبَهُ فَتَنَصَّبَ) ٥ هەروا دەگوترێ: (تَنَصَبَ الطائِرُ) باڵندەکە بەرز بۆوە.

تَنَصَّبَ الثَّغْرُ: ددانەکان ڕێکو پێک بوون (پوکەکە ددانەکانی ڕێک بوون).

تَنَصَّبَ لفلان: دوژمنایەتی فلاٌنکەسی کرد.

الأنصوبة: نیشانەیەکە لەسەر ڕێگا دادەنرێ بۆ شارەزایی کردنی خەڵك ٥ (ك: أناصیب).

المَنصِبُ: پلەو پایەی کارگێڕی یان زانستی یان ئایینی یان ڕامیاری ٥ یان کۆمەڵایەتی ٥ ئەصڵو بنەما ٥ شکۆمەندی ڕێزداری ٥ دەگوترێ: (لفلان منصب) ٥ فلاٌنکەس پلەو پایەی ڕێزداریی هەس.

المِنصَبُ: سەرئاگرە، یان هەرشتێك بخرێتە نێوان ئاگرو بنکی مەنجەڵو تاوە ٥ (ك: مناصِب).

المَنصَبَةُ: هەوڵو تەقەلاو ماندوبوون ٥ دەگوترێ: (عیش ذو منصبة).

المُنَصَّبُ: دەگوترێ: (ثغرٌ مُنَصَّبٌ) پوکێکە ددانەکانی تێیدا جوان ڕواون.

المنصوبُ: لەبواری زانیاری نەحودا بەئیسمێك دەگوترێ بەکاریگەری وشەیەکی تر بزوێنی نەصبەی بۆ پەیدا ببێ.

المنصوبة: فێڵو تەڵەکەو داو نانەوە.

النّاصِبُ: دەگوترێ: (هم ناصِبٌ) خەمو خەفەتێکی ماندو و شەکەتکەرە ٥ (عیش ناصِب) ژیانی کولەمەرگی ٥ ژیانی زبر.

النِّصَابُ: بنەماو ئەصڵی شت ٥ دەگوترێ: (رجع الأمر الی نصابه) ئیشەکە وەکوو خۆی لێ هاتەوە ٥ کارەکە چووە سەر ئەصڵی خۆی ٥ دەسکی کێردو چەقۆ ٥ ماڵو سامانێك بگاتە ئەندازەی ئەوەی زەکاتی لێ بکەوێ ٥ لەبواری ئەنجومەنو لیژنەو شتی وادا ئەو ژمارەیەیە دانیشتنەکە بکاتە کۆبوونەوەو دانیشتنی یاسایی.

النَّصّاب: بۆ موبالەغە و زێدەڕۆیی لەمانای (نَصَبَ) دێ ٥ کەسێك خۆی بەسەر شتێك دا بسەپێنێو بەبێ ئەوەی داوای لێ بکرێ کاری سەربەخۆ ئەنجام بدا ٥ ئۆین بازو فێڵکەرو تەڵەکەچی.

النُّصْبُ: نیشانەی دانراو لەسەر ڕێگا بۆ شارەزایی کردنی ڕێبواران ٥ ئاڵای بەرزەوەکراو (بتو صەنەم کە

دانـرابن بـۆ ئـەوەی لـەجیاتی خـودا پەرستـــشیان بـــۆ بکـــرێ) ◊ (ك: أنصاب) ◊ فێڵو تەڵەکەبازی، ئـۆین بـازی ◊ بزوێنـی نەصبە بـۆ ئیسمو فیعل بـەهۆی کاریگـەریی وشـەیەکی تـرەوە ◊ دەشـگوترێ: (هـذا نـَصْبُ عیني) ئەوە لەبەردەمم دایە.

النُّصُبُ: بـەرزکراوە ◊ کێـلو پەیکـەرو میـلو شـتی وا کـە بـۆ یـادەوەری شـتێك دروسـت دەکـرێو ڕوداوێـك یـــادی دانیـــشتوان دەخاتـــەوە ◊ دەشگوترێ: (هذا نُصُبُ عـيني) ئـەوە لەبەر چاوم دایەو دەیبینـم ◊ شـەڕو نەگبەتی ◊ بتو صەنەم کەلەجیاتی خودا بەندایەتییان بۆدەکرێ.

النُّصُبُ: شتی بەرزکراوە ◊ چەقێندراو.

النُّصْبَةُ: یەکجار بەرزکردنـەوە ◊ (إسـم المرّة) ◊ جۆرە بزوێنێکە دەخرێتـە سەر هەندێ وشە.

النَّصِيبُ: بەشو بار لەهەرشتێك دابـێ ◊ حـــەوز ◊ شـــتی بـــەرزکراوەو چەقێندراو ◊ برێ بەرد کەبەدەوری حەوزدا ڕیز دەکرێن وەکوو لێوار ◊ هەرشتێك دابکوترێ، بەرزبکرێتەوە وەکوو نیشانەو عەلامەت بۆ شتێکی تر ◊ (ك: نصائب).

نَصَتَ لە نَصْتاً: بێدەنگ بوو گوێی ڕاگرت.

أَنْصَتَ: گوێی گرت ◊ بەجوانی گوێی بۆ گێڕانەوەی حەدیسەکە ڕاگرت.

أَنْصَتَ فلاناً: فلانکەسی بێدەنگ کرد.

أَنْـــصَتَ المحـــدِّثُ القـــومَ: حـــەدیس گێڕەوەکـە، قـسەکەرەکە خەڵکەکـەی واڵ کـرد بێـدەنگ بـنو گـوێی بـۆ ڕابگرن.

أَنْـصَتَ لِلَّهـو: حـەزی لەگاڵتـەو گـەپو ڕابواردنە.

إِنْتَصَتَ لە: بەمانا (نَصَتَ) دێ.

تَنَصَّتَ: گـوێی گـرت، گـوێی خـۆی کلـۆر کـرد بۆئـەوەی شـتەکە ببیـستێ ◊ زۆری هەوڵ دا گوێی لەقسەکە بێ.

إِسْتَنْصَتَ: ڕاوەسـتاو گـوێی خـۆی کلـۆر کرد بۆ بیستن.

إِسْتَنْصَتَ فلاناً: داوای لەفلانکەس کـرد قسەی بۆ بدزێ.

النُّـصْتَةُ: هـەوالگریی ◊ قـسە دزیـنو چـــونە نـــاو ڕوداوی حەســـاسو کاریگەرەوە.

نَـصَحَ الـشَّيْءُ نـصحاً ونـصوحاً: شـتەکە پاڵفتەو خاوێن بوو ◊ دەگـوترێ: (نَصَحَ المعـدِنُ) مەعدەنەکـە پاڵفتـەو خـاوێن بـوو ◊ (نَصَحَتْ تَوبَتُـهُ) تۆبەکردنەکـەی خـاڵصو ڕاسـتاڵانەبوو ◊ (نَـصَحَ قلبُـهُ) دڵـی بـێ غـەش بـوو هـیچ دیـاردەی دو ڕوییو ڕارایی تێدا نیە.

**نَصَحَ الشَّيْءَ:** شتەكەی پاڵفتە كرد ٥ دەگوترێ: (نَصَحَ لفلان المودَّةَ، و نَصَحَ لـه المشورة) بەڕاستی فلانكەسی خۆشويستو خۆشەويستييەكەی لەناخەوە بوو ٥ بەدڵسۆزييەوە بەپیر ڕاوێژكردنەكەيەوە چوو ئامۆژگاری باشی كرد.

**نَصَحَ فلاناً:** فلانكەسی ڕێنمونی كرد بۆ كاری سودبەخشو ڕێگای باشی نیشان دا (فهو ناصح وهي ناصحة).

**نَصَحَ الثوبَ ونحوه نَصْحاً ونِصاحةً:** قوماشەكەی باش دوری، دورينەكەی تەواو كرد.

**نَصَحَ الشَّرابَ نَصْحاً:** لەشەرابەكەی خواردەوە تا تێراو بوو.

**أنْصَحَهُ:** تێراوی كرد.

**ناصَحَ فلاناً:** ئامۆژگاری فلانی كردو ئەويش ئامۆژگاری ئەوی كرد.

**ناصح فلان نَفْسَهُ في التوبة:** فلانكەس لەتۆبەكردنو گەڕانەوەكەی بۆلای خودا دڵسۆزی نواندو ڕاستاڵانە ڕەفتاری كرد.

**إنْتَصَحَ:** ئامۆژگاريكردنەكەی قبوڵ كردو گوێ بيست بوو.

**إنْتَصَحَ فلاناً:** فلانكەسی كرد بە ئامۆژگاريكەری خۆی ٥ دەگوترێ: (إنْتَصِحْني فاني لك ناصح) بمكە بەئامۆژگاريكەريی خۆت من بۆتۆ ئامۆژگاريكەرمو ڕێگای باشت نیشان دەدەم.

**تَنَصَّحَ:** خۆی شوبهاند بە ئامۆژگاريكەرانو لاسايی ئەوانی كردوە ٥ زۆری ئامۆژگاری كرد.

**تَنَصَّحَ الثوبَ:** دورينی قوماشەكەی تەواو كرد.

**إسْتَنْصَحَهُ:** بەئامۆژگاريكەری لەقەڵەم دا.

**المِنْصَحُ:** دەرزی، هەرشتێك قوماشی پێ بدورێ.

**المِنْصَحَةُ:** بەمانا (المِنْصَحُ) دێ.

**الناصِحُ:** پاڵفتە لەهەرشتێك بێ ٥ دەگوترێ: (سقاني ناصِحَ الشراب) شەرابی پاڵفتەو بێ غەشی دامێ ٥ (ناصَحَ الجيب) دڵ و دەرونی خاوێنە بێ غەشە ٥ هەروا وشەی (الناصِح) بەمانا بەرگدرو دێ.

**النِّصاحُ:** كندرو دەزو و شتی وا (پەتی شت دروون) ٥ دەگوترێ: (صَلُبَ نصاحُك) دەزوەكەت قايمو پتەوە.

**النَّصّاحُ:** كەسێك زۆر ئامۆژگاری خەڵك بكا ٥ بەرگدرو.

**النَّصوحُ:** كەسێك زۆر ئامۆژگاری خەڵك بكا ٥ دەشگوترێ: (توبة نصوح) تۆبەی خاڵصو ڕاستاڵ.

**النَّصِيحُ**: بەمانا (الناصِح) دێ ٥ (ك: نُصَحَاء).

**النَّصيحة**: ئامۆژگاری.

**نَصَرَهُ على عدوه**: یارمەتی دا بۆئەوەی بەسەر دوژمنەکەی دا سەربکەوێ ٥ ڕزگاری کرد لەناخۆشیو چورتم ٥ (فهو ناصِر وهي ناصرة) ٥ (ك: نصار ونصور).

**ناصَرَهُ**: یارمەتی ئەوی دا، ئەویش یارمەتی ئەمی دا.

**نَصَّرَهُ**: کردی بەفەلە (بەمەسیحی).

**إنْتَصَرَ**: ملی بۆ ستەمکارەکە نەدا، سەرپێچی زاڵمەکەی کرد.

**إنْتَصَرَ على خصمه**: بەسەر ڕکابەرەکەی دا بالادەست بوو.

**إنْتَصَرَ من خصمه**: تۆڵەی لەڕکابەرەکەی کردەوە.

**تناصَرَ القومُ**: خەڵکەکە یارمەتی یەکتریان دا.

**تَنَاصَرَت الأخبار**: هەواڵەکان یەکتریان پشت ڕاست کردەوە.

**تَنَصَّرَ**: بوو بەمەسیحی.

**إسْتَنْصَرَ بفلان**: هاواری بۆ فلانکەس برد.

**إسْتَنْصَرَ فلاناً**: داوای یارمەتی لەفلانکەس کرد.

**إسْتَنْصَرَ فلاناً على فلان**: داوای لەفلانکەس کرد یارمەتی بدا بۆئەوەی بەسەر فلانکەس دا سەربکەوێ.

**الأنصار**: دانیشتوانی شاری مەدینە کە موسوڵمان بوونو یارمەتی پێغەمبەریان دا، پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ بەخۆی هاوەڵانیەوە لەمەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، مەدینەییەکان پێشوازییان لێ کردنو بەماڵو بەگیان یارمەتییان دان.

**الأنْصَرُ**: خەتەنە نەکراو.

**النَّاصِرُ**: ڕێڕەوی ئاو بۆ ناو شیو ٥ (ك: نواصِرُ) ٥ دەگوترێ: (مدت الوادي النواصِرُ) جۆگەلەی بچوك بچوك ئاوی شیوەکەیان زۆر کردو بووبەلافاو.

**النَّاصِرَة**: شارێکە لەوڵاتی فەڵەستین گوایە حەزرەتی عیسا لەوێ لەدایك بۆوە.

**النَّاصور**: بەمانا (النَّاسور) دێ ٥ (ك: نواصِير).

**النَّصْرُ**: یارمەتیو کۆمەکی ٥ دەشگوترێ: (رجل نصر) پیاوێکی یارمەتیدەرە.

**النصراني**: فەلەو گاور، مەسیحی ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (نصرانية).

**النَّصرانية**: مەسیحی، شوێنکەوتوانی حەزرەتی عیسا ٥ درودی خودای لەسەربێ.

**النُّصْرَةُ**: يارمەتیو كۆمەك.

**النُّصورُ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (النّاصِرُ) دێ.

**النّصيرُ**: بەمانا (النّصور) دێ واتە: زۆر كۆمەكیكارو یارمەتیدەر ٥ (ك: أنصار ونصراء).

**النَّصيرَةُ**: مێینەی (النّصير) ٥ بەخششو دیاریی.

**نَصَّ على الشَّيْئِ نَصّاً**: شتەكەی دیاری كردو ڕونی كردەوەو سنووری بۆ دانا ٥ دەگوترێ: (نَصّوا فلاناً سیّداً) فلانكەسیان دیاری كرد بەسەرۆكو ڕیش سپی خۆیان.

**نَصَّ الشَّيْئَ**: شتەكەی بەرز كردەوە، دەری خست ٥ دەگوترێ: (نَصَّت الظّبيَةُ جيدها) ئاسكەكە گەردنی خۆی بەرزكردەوە، دەری خست ٥ دەشگوترێ: (نَصَّ الحديث) فەرموودەكەی بەرزكردەوەو پاڵی دایە حەدیس گێڕەوەكەی كەلێیەوە ڕیوایەت كردووە.

**نَصَّ المَتاعَ**: كاڵاكانی خستنە سەر یەك.

**نَصَّ فلاناً**: فلانكەسی لەسەر كورسی دانیشاند.

**نَصَّ الشَّيْئَ**: شتەكەی جوڵاند، هێنایو بردی ٥ دەگوترێ: (هو يَنُصُّ أنفه غَضَباً) ئەو لەڕقا لوتی خۆی بادەدا.

**نَصَّ الدابةَ**: وڵاخەكەی دەنە دەنەدا بۆئەوەی خێرا بڕوا ٥ هەروا دەگوترێ: (نَصَّ فلاناً) لە فلانەسی كۆڵیەوەو چووە بن كلێشەیەوە هەتا چی لابوو لێی دەرهێنا.

**نَاصَّ غريمه**: لێكۆڵینەوە و چەندو چونی لەگەڵ قەرزدارەكەی كرد.

**نَصَّصَ المَتاعَ**: كاڵاكانی خستنە سەریەك.

**إنْتَصَّ الشَّيْئُ**: شتەكە بەرزبۆوەو ڕێك وەستا.

**إنْتَصَت العروس**: بوكەكە لەسەر كورسی دانیشت.

**تناصَّ القومُ**: خەڵكەكە پاڵەپەستۆیان كرد.

**المِنَصَّةُ**: كورسییەكی بەرزە یان تەختەیەكی بەرزە ئامادە دەكرێ بۆ وتارخوێن بچێتە سەری وتاربدا یان بوك بچێتە سەری خۆی نیشانی ئامادەبوان بدا ٥ وایش دەبێ ئەو كورسیو تەختە بەقوماشی جوانو ئاوریشمو شتی وا دەڕازێندرێتەوە ٥ دەشگوترێ: (وضع فلان على المنصة) فلانكەس ڕانوێندراو حەیایان بردو فەزح بوو.

**المَنصوصُ عليه**: شتی ڕونو ئاشكرا.

**النَّصُّ**: دەق ٥ خودی قسەی دانەر چۆنی لێ بیستراوە بەبێ دەستكاری

کردن ٥ ڕشتەو وشەیەك تەنها یەك
مانای هەبێ ٥ یان تەئویل کردن
هەڵنەگرێ ٥ بەلای زانایانی ئوصولی
فیقهەوە ناوە بۆ دەقەکانی قورئان و
فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) ٥
هەروا وشەی (النَّصّ) بەمانا
کۆتایی و ئەو پەڕی شت دێ ٥
دەگوترێ: (بلغ الشَّيْئُ نَصَّهُ) شتەکە
گەیشتە کۆتایی ٥ یان گەیشتە
ئەستوراییو جەنگەو کوشندەی
شتەکە.

النَّصَّةُ: کاکۆڵ؛ قژی پێشەسەر کە
بۆلای ناوچەوان شۆڕ دەبنەوە.

النَّصِيصُ: دەگوترێ: (أمر نصيص)
کارێکی گرنگ و جدییە.

نَصَعَ الشَّيْئُ نصوعاً ونصاعَةً: شتەکە
دەرکەوت ڕون بۆوە صاف بوو ٥
دەگوترێ: (نَصَعَ لونُهُ) و (نَصَعَ الأمْرُ)
(نَصَعَ الحَقُّ) حەق و راستی دەرکەوت
(نَصَعَ فلان) فلانکەس چی لابوو
دەرکەوت ٥ (نصع بالحق) دانی بەحەق
دا نا.

أنْصَعَ بالحق: ددانی بەحەق و ڕاستی دا
نا.

أنْصَعَ للشر: بەرەنگاریی شەڕو ئاژاوە
بۆوە.

أنْصَعَ الرجلُ: پیاوەکە ئەوەی
لەدەروونی دا بوو دەری خست ٥
پێستی گرژ بوو تێکچوو.

ناصَعَهُ الخَبَرَ: هەواڵەکەی بەڕاستی بۆ
گێڕایەوە ٥ هیچ فرت و فێڵ و درۆو
شتی وای تێدا نەکردن.

النَّاصِعُ: پاڵفتەو ساغ ٥ دەگوترێ:
(أبيض ناصِع) سپی تەواو سپی ٥
(أحمر ناصِع) سوری تەواو سور ٥
(حق ناصِع) حەقی ڕون و ئاشکرا ٥
(حسب ناصع) نژادو بنەچەی پاك و
خاوێن و پاڵفتە لەهەموو عەیب و
لەککەیەك.

النُّصّاعُ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای
(الناصِع) دا دێ ٥ دەگوترێ: (أحمر
نصّاع) ٥ (حمرة نَصّاعة).

النَّصْعُ: هەر پێست و قوماشێك سپی
بێ زۆر سپی بێ.

النَّصَعُ: ڕاخەرێك لەپێست دروست
کرابێ.

النَّصِيعُ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانا (الناصِعُ)
دێ ٥ پاڵفتە لەرەنگی خۆی داو
تەواو کامڵ لەو ڕەنگەدا (سپی
تەواو سوری تۆخ) ٥ صاف و ڕون و
بێ گەرد ٥ دەگوترێ: (شربنا ماءً
نصيعاً) ئاوێکی پاکی ڕونی
پاڵفتەکراومان خواردەوە.

**نَصَفَ الشَّيْءُ نصفاً ونصوفاً:** شتەکە بوو بەنیوە ٥ دەگوترێ: (نَصَفَ النهار ونَصَفَ الليلُ) ڕۆژ بوو بەنیوەڕۆ ٥ شەو بوو بەنیوە شەو ٥ دەشگوترێ: (نَصَفَ البُسْرُ والثمرُ) هێشوە خورماکە، میوەکە نیوەگەیی بوو، ئاڵو بۆڵەکەی بووبە نیوە.

**نَصَفَ الشَّيْءَ نَصْفاً ونصافةً:** گەییشتە نیوەی شتەکە.

**نَصَفَ الإزارُ ساقَهُ:** دەرپێیەکە گەیشتە نیوە گۆزینگی.

**نَصَفَ الشيبُ رأسَهُ:** نیوەی سەری سپی بوو.

**نَصَفَ الكتابَ:** کتێبەکەی کرد بە دووبەش.

**نَصَفَ القومَ:** نیوەی ماڵی لەخەڵکەکە ستاند.

**نَصَفَ فلاناً نَصْفاً ونصافاً:** خزمەتی فلانکەسی کرد.

**أنْصَفَ الشَّيْءُ:** شتەکە بووبەنیوە.

**أنْصَفَ فلان:** فلانکەس عادڵ بوو.

**أنْصَفَ الشَّيْءَ:** شتەکەی کرد بەنیوە ٥ دەگوترێ: (أنْصَفَ الماءُ الإناءَ) ئاوەکە گەیشتە نیوەی قاپەکە.

**أنْصَفَ فلاناً:** بەشێوەی عادلانە مامەڵەی لەگەڵ فلان دا کرد.

**أنْصَفَ فلاناً من فلان:** مافی فلانکەسی لەفلانکەس وەرگرت.

**ناصَفَهُ الشَّيْءَ:** شتەکەی لەگەڵ کرد بەنیوە.

**نَصَّفَ الشَّيْءُ:** شتەکە بوو بەدووبەش.

**نَصَّفَ البُسْرُ:** بەرسیلە خورماکە نیوەی شیرین بوو.

**نَصَّفَ رأسُهُ:** سەری نیوەی سپی بوو (سەری بوو بەماش‌و برنج).

**نَصَّفَ فلانٌ:** فلانکەس پیر بوو.

**نَصَّفَ الشَّيْءَ:** شتەکەی کرد بە دوو بەش ٥ شتەکەی پەردە پۆش کرد، دایپۆشی.

**إنْتَصَفَ الشَّيْءُ:** شتەکە گەیشتە نیوەی.

**إنْتَصَفَ النهار:** ڕۆژەکە گەیشتە کاتی نیوەڕۆ.

**إنْتَصَفَ فلان:** فلانکەس داوای بەکارهێنانی ویژدانی کرد.

**إنْتَصَفَت الجاريةُ:** کچەکە بەپارچە قوماش سەری خۆی داپۆشی.

**إنْتَصَفَ منْ فلان:** مافی خۆی بەتەواوی لەفلانکەس وەرگرت ٥ تۆڵەی لێ ساندەوە.

**إنْتَصَفَ الشَّيْءَ:** نیوەی شتەکەی هەڵگرت.

**تناصَفَ القومُ:** خەڵکەکە ویژدانیان لەگەڵ یەکتر بەکارهێنا ٥ مافی خۆیان لەیەکتر وەرگرت ٥ دەشگوترێ: (تناصف وَجهُها حسناً)

دەمو چاوی ڕێكو پێكو جوان بوو.

**تَنَصَّفَت الجاریة**: كچۆڵەكە پارچە قوماشی كرد بەسەر پۆشو ڕوبەندی خۆی ٥ دەشگوترێ: (تَنَصَّفَه الشیبُ) موی سەرو ڕیشی بەنیوەیی سپی بوون (ماشو برنج بوون) ٥ (تَنَصَّف من فلان) مافی خۆی لەفلان ستاند ٥ (تَنَصَّفَ الشَّیءَ) نیوەی شتەكەی برد.

**تَنَصَّفَ السلطان**: داوای لەفەرمانڕەوا كرد ویژدانی لەگەڵ دا بەكاربێنێ.

**تَنَصَّفَ فلاناً**: خزمەتی فلانكەسی كرد ٥ (تَنَصَّفه) داوای پیاوەتیو یارمەتی فلانكەسی كرد.

**إستَنصَفَ**: داوای بەكارهێنانی ویژدانی لەگەڵ دا كرد.

**إستَنصَفَ منه**: بەمانا (أنصف منه) دێ.

**إستَنصَفَ السلطان**: داوای لەپاشا كرد ویژدانی لەگەڵ دا بەكاربێنێ.

**الأنصَفُ**: (إسم تفضیل) واتە بە ویژدانتر.

**المتناصِفُ من الأمكنة**: شوێنی تەختو ڕێكو جوان.

**المنتصَفُ من كل شیئ**: ناوەڕاستی شت ٥ دەگوترێ: (أتیته منتصف النهار او الشهر أو الساعة).

**المَنصِفُ**: بەمانا (المنتصف) دێ ٥ دەگوترێ: (بلغ مَنصِفَ الطریق) گەیشتە نیوەی ڕێگا.

**المُنَصَّفُ**: شەرابێكە ئەوەندە كوڵابێ نیوەی ڕۆیی بێ.

**المُنَصَّفُ**: پیاوێكە بەمێزەر سەری داپۆشیبێ.

**النّاصِف**: خزمەتكار.

**النّاصِفَةُ**: ڕێڕەوی ئاو لەناو شیو و دۆڵ دا.

**النَّصَفُ**: ویژدان ٥ دەگوترێ: (ما جعلوا بیني وبینهم نِصفاً) لەدادگاییكردنی منو ئەوان دا دادوەرەكان ویژدانیان بەكارنەهێنا ٥ هەروا بەمانای نیوەی شت دێ.

**النَّصَفُ**: پیر ٥ دەگوترێ: (رجل نَصَفٌ) پیاوێكی پیرە كەوتۆتە ساڵەوە.

**النَّصفان**: تا نیوە پڕ بوو ٥ (إناء نَصفان) قاپێكە تا نیوەی پڕبووە ....(وهي نَصفی).

**النَّصِفَةُ**: ویژدان ٥ دەگوترێ: (ماجعلوا بیني وبینهم نصفة).

**النَّصیفُ**: نیوەی شت ٥ هەرشتێك سەرداپۆشێ لەمێزەرو چارۆكەو كۆترەو شتی وا ٥ (ك: ألنصِفَة) ٥ هەروا بەمانا خزمەتكار دێ ٥ (ك: نُصفاء).

**نَصَلَ اللونُ نَصْلاً ونصولاً**: ڕەنگەكەی نەما ٥ دەگوترێ: (نَصَلَ الخضابُ) خەنەكە ڕەنگی چۆوە نەما.

**نَصَلَ الشَعْرُ أو الثَوبُ:** قژەکە یان قوماشەکە ڕەنگی نەما ٥ ڕەنگەکەی چۆوە کاڵ بۆوە.
**نَصَلَ السيفُ من قرابه:** شمشێرەکە لەکالانی دەرچوو.
**نَصَلَ الخيلُ من الغبار:** ڕەوە ئەسپەکە لەتەپو تۆز دەرچوون.
**نَصَلَ الدرُّ من السِلْك:** دەنکە مرواریيەکە لەڕیز دەرچوو.
**نَصَلَ بِحَقي صاغراً:** بەناچاری حەقی خۆمی دا مافی خۆمی دەرکرد.
**نَصَلَ السَّهْمَ والرُّمْحَ:** نوکی تیژی خستە سەر تیرو ڕمبەکە.
**أنصَلَ الشَّيْئَ من الشَّيْئِ:** شتەکەی لەشتەکە دەرهێناو لای برد.
**أنصَلَ السَّهْمَ والرُّمْحَ:** سەرە تیرو سەرە ڕمبەکەی لابرد.
**نَصَّلَهُ:** سەرەتیرەکەی لەتیرەکە شەتەك دا.
**إنْتَصَلَ السَّهْمُ ونحوه:** سەرەتیرەکە دەرهات (تیرەکە سەرەتیزەکەی لێ بۆوە).
**تناصَلَ الشَّيْئُ:** شتەکە دەرکەوت، هاتەدەر ٥ دەگوترێ: (تناصَلَتْ أسنانه) ددانی دەرهاتن.
**تَنَصَّلَ اللونُ:** بەمانا (نَصَلَ) دێ ٥ واتە: ڕەنگی چۆوە.
**تَنَصَّلَ كَدَّ فلان:** نارەحەتی فلانکەس نەما.
**تَنَصَّلَ من الشَّيْئِ:** لەشتەکە قوتار بوو.
**تَنَصَّلَ من ذنبه:** لەتاوان رزگاری بوو.
**تَنَصَّلَ الشَّيْئَ:** شتەکەی دەرهێنا ٥ هەڵی بژارد.
**تَنَصَّلَ فلاناً:** هەرچی بەفلان بوو لێی ساند.
**إسْتَنْصَلَ الشَّيْئَ:** هەوڵی دا شتەکە دەربێنێ، دەری هێنا ٥ دەگوترێ: (إسْتَنْصَلَت الريحُ اليَبْسَ) ڕەشەباکە هەموو رووەکە وشکبووەکانی لەبێخ هەڵکەند.
**المِنْصالُ:** دەسکە سندۆڵ (بەردێکە درێژو چاککراو ساوەرو شتی وای پێ دەکوترێ).
**المُنصُلُ:** شمشێر ٥ (ك: مناصيل).
**النَّاصِلُ:** دەگوترێ: (لحية ناصل) ڕیشێکە خەنەکەی چۆتەوە ڕەنگی نەماوە ٥ (سهم ناصل) تیرێکە سەرەکەی لێ بۆتەوە.
**النَّصْلُ:** سەرەتیر، سەرە ڕمب، نوکی چەقۆو کێرد ٥ (ك: نصال وأنصل ونصول) ٥ هەروا ناوە بۆ گلۆڵە ڕیسی ڕێسراو کەلە تەشیەکە داماڵدرابێ.
**النَّصيلُ:** پاچ، قولینگ ٥ جومزگەی نێوان ملو سەر ٥ دەگوترێ: (ضرب نصيلَهُ) لەگێزەرەی ملی دا ٥ گەدەی

پاککراو لەهەموو خشتو خۆڵ گوێزرو مرۆرو شتی وا.

**نصيل الحجر:** روی بەرد ٥ (نصيل الرأس) تۆقەسەر.

**نَصْنَصَ البعيرُ:** حوشترەکە ئەژنۆی لەزەوی گیر کرد بۆئەوەی هەڵسێ.

**نَصْنَصَ في مَشْيَهِ:** لەرۆیشتن دا خۆی بادا.

**نَصْنَصَ الشَّيْءَ:** شتەکەی جولاند لەقاندی.

**النَّصْناصُ:** دەگوترێ: (حية نصناص) مارێکی جمو جوڵ کەرەو زۆر دێ و دەچێ هەدادانی نیە.

**نَصاه نَصْواً:** ناوچاوانی گرت قژی پێشەسەری گرت.

**أنصى المكانُ:** شوێنەکە گیا (سەبتی) زۆر بوو لەوەڕی باشی زۆر بوو.

**ناصى فلاناً مناصاةً ونِصاءً:** هەریەك لەو دووانە کاکۆڵی یەکتریان گرتو دەستیان لەقژی یەکتر وەرهێناو قژی یەکتریان ڕاتەکاند ٥ دەشگوترێ: (فلان يناصي فلاناً) فلانکەس کێشەو نیزاعی لەگەڵ فلان دا هەیە.

**ناصى الشَّيْءُ الشَّيْءَ:** شتەکە بەشتەکەوە نووسا ٥ دەگوترێ: (هذه الفلاة تناصي أرض كذا) ئەم ساراچۆڵە لکاوە بەزەوی فلانەوە.

**إنتَصى الشَّيْءُ:** شتەکە درێژ بۆوە، دەگوترێ: (إنتصى شعره) قژی درێژ بوو.

**إنتصى الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵبژارد.

**تناصى القومُ:** خەڵکەکە چنگیان لەقژی یەکتروەرهێناو یەکتریان هێناو بردو شەڕیان بوو.

**تناصت الأشياءُ:** شتەکان وێك کەوتن ٥ دەگوترێ: (هَبّت الريحُ فتناصت الأغصان) با هەڵی کردو لقە درەختەکان پێکەوە نووسان ٥ لێکدران.

**المُتَنَصَّى:** شوێنی نزیکبوونەوەی دووشتو پێك گەیشتنیان.

**النَّاصِيَةُ:** پێشەسەر، قژی پێشەسەر کەدرێژ بێو ببێتە کاکۆڵ ٥ (ك: نواص وناصيات) ٥ دەگوترێ: (أذلّ فلان ناصية فلان) فلانکەس سوکایەتی بەفلانکەس کردو ڕێزی شکاند ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان ناصية قومه) فلانکەس پیاو ماقوڵی گەلەکەیەتی ٥ کۆتایی شەقام کەلەشەقامێکی تر بدا.

**النَّصِيُّ:** روەکی (سەبط) کە باشترین لەوەڕە بۆ ئاژەڵ.

**النَّصِيَّةُ:** تاکی (النصي)یە ٥ پاشماوە ٥ (ك: أنصاء).

**نَضَبَ الماءُ نُضُوباً:** ئاوەکە ڕۆچوو ٥ دەگوترێ: (نَضَبَ خيرُهُ) خێرو بێری کەم بوو ٥ (نَضَبَ ماء وجهه) بێ حەیا بوو، شەرمی نەما ٥ (نَضَبَ عمرُهُ) تەمەنی بەسەرچوو، کۆتایی بەژیانی هات.

**نَضَبَ عنه:** لێی گیرا، تێیدا ئاخێ بوو.

**نَضَبَ المكانُ:** شوێنەکە دوور بوو.

**نَضَبَ الماءُ نضوباً:** ئاوەکە ڕۆچوو بەناخی زەوی دا.

**نَضبَتِ الحلوب:** شیردەرەکە شیری کەم بوو بەناخۆشی شیری لێ دۆشرا.

**التَّنْضُبُ:** ڕوەکێکی دەشتەکی تەمەن درێژە لەپەنددا هاتووە دەڵێ: (كأنه حِرْباء تنضبة) واتە بەلاو نەگبەتی.

**نَضِجَ نَضْجاً و نُضْجاً و نضاجاً:** پێگەیی و کاتی خواردنی هات ٥ دەگوترێ: (نَضِجَ اللحم و نَضِجَت الفاكهة و نَضِجَ الطعام) ٥ هەروا دەگوترێ: (نَضِجَ الرأيُ و نَضِجَ الأمر).

**نَضِجَت الحامل بولدها:** ژنە سکپڕەکە کاتی منداڵبوونی هات و زۆری بەسەردا تێپەڕی منداڵەکەی نەبوو.

**أنْضَجَهُ:** پێی گەیاند ٥ دەگوترێ: (أنْضَجَ الرأيَ والأمرَ) ڕاو بۆچوون و کارەکەی پوختەو ڕاستەو پاستە کرد ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان لا يُنضِجُ كراعاً) فلانکەس لاوازو بێ دەسەڵاتە هیچی پێ جێبەجێ ناکرێ.

**نَضَّجَهُ:** وای لێ کرد پێ بگاو بەکەڵکی سود لێ وەرگرتن بێ.

**إسْتَنْضَجَ الطعامَ:** خواردنەکەی پێگەیاند.

**المِنْضاجُ:** شیشی گۆشت برژاندن.

**النَّضِيجُ:** (تمر نضيج) خورمای پێگەیشتوو گەییو ٥ دەگوترێ: (فلان نضيج الرأي) فلانکەس ڕاو بۆچونی ڕێک و پێک و مەحکەمی هەیە.

**نَضَحَ نَضْحاً:** ئاوی لێ چوو، دەڵاندی، تەڕایی دا.

**نَضَحَ الإناءُ بما فيه:** گۆزەکە چی تێدا بوو ئەوەی لێ هاتەدەر.

**نَضَحَ الجِلْدُ بالعرق:** ئارەق لەپێستی هاتەدەر، پێستی ئارەقی دەردا.

**نَضَحَ العينُ:** چاو فرمێسکی ڕژاندن.

**نَضَحَ الشَّجَرُ:** درەختەکە پۆخی کرد بۆئەوەی بپشکوێ.

**نَضَحَ الثوبَ ونَحْوَهُ:** بەئاو یان بەبۆنی خۆش قوماشەکەی ڕشاند ٥ دەگوترێ: (نضحه بالغبار) خۆڵبارانی کرد ٥ دەگوترێ: (نَضَحَتنا السماء) ئاسمان بارانی بۆ باراندین.

نَضَحَ القوم بالنبل: خەڵکەکەی تیرباران کردو پەرتەوازەی کردن ٥ (فلان ينضح عَنْ نفسه) فلانکەس بەرگری لەخۆی دەکا ٥ نەفسی خۆی دامرکاند، ڕامی کرد.

نَضَحَ الزرعَ: کشتو کاڵەکەی ئاودا.

نَضَحَت الدابة الماءَ: وڵاغەکە ئاوەکەی هەڵێنجا بۆئەوەی ئاودێری پێ بکرێ.

أنْضَحَ الزرعُ: بەمانا (نَضَحَ) دێ.

أنْضَحَ عِرضَ فلان: ناموسی فلانکەسی شکاندو لەککەداری کرد.

ناضَحَهُ مناضَحَة ونِضاحاً: هەریەك لەو دوانە حەیای یەکتریان برد، ئابڕوی یەکتریان تکاند ٥ دەگوترێ: (ناضَحَ عنه) داکۆکی لێ کرد.

إنْتَضَحَت العينُ: بەمانا (نَضَحَ) دێ.

إنْتَضَحَ الماءُ: ئاوەکە پرژا بەسەر شتەکەداو تەڕی کرد.

إنْضَحَّ عليه الماءُ: بڕوانە مادەی (ضَخَخَ).

المِنْضَحَةُ: ئامێری ئاو پرژاندن ٥ یان بەخاخی بۆن پرژاندن.

تَنَضَّحَت العينُ: چاوەکە فرمیسکی ڕژاند ٥ ڕیپۆقی لێ کەوتە خوار ڕیپۆقی لێ دەرهات ٥ پێوەی نەماو لێی پاك بۆوە.

النّاضِحُ: وڵاخی ئاو گواستنەوەو ئاوکێشان ٥ باران.

النَّضْحُ: ئاوی پرژێندراو ٥ کشتو کاڵ ٥ عەترو بۆنی شل کەوەکوو ئاو وابێ.

النَّضَحُ: ئەو پرژو دڵۆپانەی دەپرژێندرێن ٥ حەوزی ئاو ٥ (ك: نضوح وأنضاح).

النَّضْحَةُ: بارانی کەمۆ پچڕ پچڕ ٥ (ك: نَضَحات).

النَّضّاحة: دەگوترێ: (قوسٌ نَضّاحة) کەوانێکە زۆر بەهێزە تیر دوور دەهاوێ.

النَّضُوحُ: دەگوترێ: (مزادة نضوح) کوندەیەکە ئاو دزە دەکا ٥ (قوس نضوح) کەوانێکە تیر بەتەوژم دەهاوێ ٥ هەروا وشەی (نضوح) ئاوە بۆ جۆرە عەترێك بۆنەکەی زوو بڵاو دەبێتەوە.

النَّضيحُ: حەوز ٥ عەرەق ٥ (ك: نُضُحٌ).

نَضَخَ الماءُ نَضْخاً ونضوخاً: ئاوەکە بەتەوژم لەسەرچاوەکەی هەڵقوڵاو فوارەی کرد.

نَضَخَ الشَّيْءَ نَضْخاً: شتەکەی تەڕکردو بەئاو ڕشاندی یان عەتری پێ کرد ٥ دەشگوترێ: (نَضَخَ القوم بالنبل) خەڵکەکەی تیرباران کرد.

أنْضَخَ الزَّرْعُ: دانەوێڵەکە دەنکەکەی پێگەیی و هەر تەڕە، وشك نەبوو.

ناضَخَهُ مناضَخةً ونِضاخاً: هەریەکەیان ئەوی تری ئاو ڕشێن کرد.

إنْتَضَخَ الماءُ ونحوه: ئاوەکە پرژا.

إنْـضَخَ عليـه المـاء: بڕوانـە مـادەی (ضَخَخَ).

المِنْضَخَةُ: ئامێری ئـاو پرژانـدنو گوڵاو وشتی وا پرژاندن.

النَّضْخُ: شوێنەواری بۆنو شتی وا کە بـە قوماشـەوە بمێنـێ ٥ دەگـوترێ: (أرسل السماءُ نَضْخاً): ئاسمان بارانی باراند.

النَّضْخَةُ: یـەك جـار بـاران بـارین، یـان یەك جار پرژاندنی عـەترو گوڵاو ٥ (نَـضْخَة مـن مطـر) تۆزێـك بـاران ٥ بارانی کەم.

النَّضَّاخُ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَـضخ) دێ.

غيـث نَـضّاخٌ: بـارانێکی بەتـەوژمو لێزمەو ڕێژنەو زۆر.

النَّضّاخَةُ: مێینـە (النَـضّاخُ) دەگوترێ: (عين نَضّاخة) سەرچاوەیەکی فیچقە کەرە ئاو بەتەوژمو فیچقە هەڵدەدا.

نَـضَدَ الـشَّيْئَ نَـضْداً: شـتەکەی ڕیزکـرد بەریزو ڕێكو پێکی خستنیە پەنایـەك ٥ دەگـوترێ: (نَضَدَهُ بالنَّبـل) تیرەبـارانی کرد بەتیر دایـدرو ٥ (فهو ناضد والشيئُ منضود).

نَضَّدَهُ: بەمانا (نَضَدَهُ) دێ.

تَنَـضَّدَت الأشيـاءُ: شـتەکان بەتـەختیو ڕێكو پێکی کەوتنە پەنایەكو ڕیز بەنـد بـوون ٥ دەگـوترێ: (تَنَـضدت أسنانه) ددانی جوان ڕیزبوون.

المِنْـضَدَةُ: ئـەو تەختـەدارو سـەکۆیەی ڕاخـەرو شـتو مـەکی ناومـاڵی دەخرێتـە سـەر ٥ مێـزو تەپڵـەك: کەسێ قاچ یان زیاتری هەبنو شتی بخرێتە سەر ٥ (ك: مناضد).

المُنَضَّدُ: شتی ڕێكو پێك کراو.

النَّضْدُ: ڕێك خستنو ڕێك کردن ٥ شتی ڕێکخـراو ڕیزکـراو هەڵـچنراو ٥ دەگوترێ: (جـسم نَـضَد) جەستەی ڕێكو پێك ٥ (وفي السماء نـضد مـن السحاب) لەئاسمان هەور چین چین کەوتۆتە سەریەك ٥ هـەروا نـاوە بۆ تەختەو سەکۆیەك کە شتو مەکی مـاڵی لەسـەر ڕێـز دەکـرێ، هەڵدەچـنرێ ٥ هـەروا دەگـوترێ: (لفلان نَـضَدٌ) ئەوانـە پشتو پەنای فلانکەسن ٥ (ك: أنضاد).

النَّـضيدُ: بـەمانا ڕیزکـراو دێ ٥ دەشگوترێ: (شجر نضيد) درەختێکە لەخوارەوە بۆسەرەوە بەگەڵاو میوە ڕیز بووە داپۆشراوە.

النَّضِيدَةُ: مێینـەی (النَّـضيد) ٥ هـەروا

ناوه بۆ سەرین‌و پشتی ◦ هەرشتێك کاڵای تێهاخندرابێ.

**نَضَرَ نضوراً ونَضْرَةً**: شتەکە تەڕو تازەو ڕەونەق دار بوو ◦ دەگوترێ: (نَضرَ النباتُ، ونضر الشجرُ، ونضر وجهه).

**نَضَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی جوان‌و ڕەونەق دار کرد.

**نَضَرَ نَضَراً**: بەمانا (نَضِرَ) دێ ◦ (وهي نَضِرَةٌ ونضراءُ).

**نَضُرَ نضارةً**: بەمانا (نَضَرَ) دێ ◦ (فهو نَضيرٌ).

**أنضَرَ الشَّيْئُ**: بەمانا (نَضُرَ) دێ ◦ دەگوترێ: (أنضَرَ العودُ، وأنضَرَ وَجْهُهُ).

**أنضَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی ڕەونەق دار کرد، گەشەی پێ کرد ◦ جوانی کرد، ڕازاندییەوە.

**إسْتَنْضَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بەجوان‌و ڕازاوە هاتە بەرچاو بەجوان‌و ڕازاوەی لەقەڵەم دا.

**الأنْضَرُ**: ئاڵتون.

**الناضِرُ**: دەم‌و چاوی گەشاوەو تەڕو تازە ◦ دەگوترێ: (وجه ناضر ولون ناضرٌ) دەم‌و چاوی گەش‌و جوان ڕەنگی گەش‌و جوان ◦ هەروا وشەی (الناضر) ناوە بۆ قەوز.

**النُّضار**: پاڵفتە لەهەر شتێك بێ ◦ دەگوترێ: (ذهب نضار) زێڕی خاڵیص ◦ هەروا ناوە بۆ خودی (زێڕ) ◦ دەگوترێ: (سِوار من نضار) بازنی زێڕ.

**النَّضْرُ**: ئاڵتون ◦ دەگوترێ: (لها سِوار من نَضْر) ◦ (ك: نضار وأنضر).

**النِّضْرُ**: ژن، هاوسەر، خێزان ◦ دەگوترێ: (هذه نِضْرُ فلان) ئەو ئافرەتە خێزانی فلانە.

**النَّضْرَةُ**: پارچە زێڕ ◦ نیعمەت، ورشەو گەشەو جوانی ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ﴾.

**النَّضِيرُ**: (نبات نضير) ڕوەکێکی تەڕو تازەو جوان ◦ دەگوترێ: (غُصْنٌ نضير) لقەدرەختێکی تەڕو تازەو جوانە (جارية نضيرة) کچۆڵەیەکی ناسك‌و جوانە ◦ (هو نضير) ئەو پیاوە قۆزو جوانە ◦ هەروا ناوە بۆ ئاڵتون.

**نَضَّ الماءُ نَضّاً ونضيضاً**: ئاوەکە چۆڕ چۆڕ ڕەوان بوو.

**نَضَّ له بشيئ**: شتێکی کەمی پێدا.

**نَضَّ إليَّ من معروفه شيئ**: شتێکی لەعەتاو بەخششی خۆی پێدام.

**نَضَّ الشَّيْئُ**: شتەکە پەیدا بوو دەستکەوت ◦ دەگوترێ: (خُذْ ما نَضَّ لك من دينك) ئەوەی لەقەرزەکەت بۆت دیاری کراوە وەری گرە.

**نَـضَّ الطـائِرُ**: بالندەکـە بـالی لێـك دان بۆئەوەی بفرِێ.

**نَضَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی جولاندو لەقاندی.

**أنَـضَّ الرضـيعَ**: کـەم کـەم شـیری دا بـە شیرەخۆرەکە.

**تَنَضَّضَ فلاناً**: فلانکەسی هەڵنا بۆ فلان شت.

**تَنَـضَّضَ الحاجَـةَ**: ئیـشەکەی جێبـەجێ کرد.

**إسْتَنَضَّ الشَّيْءَ**: بـەدو شـتەکەدا چـوو ٥ شـوێنی کـەوتو لێـی کۆڵیـەوە ٥ دەگوترێ: (هو يَسْتَنِضَّ معروف فلان) لـەپیاوەتیو بەخشایـشی فـلان شـتی دەست دەکەوێ ٥ وردە وردە شـتی لێ پەیدا دەکا.

**يَـسْتَنِضُّ حقـه منـه**: وردە وردە مـافی خۆی لێ وەردەگرێ.

**النُّـضَاضَةُ**: شـتی کـەمو بـچوك ٥ دەگوترێ: (مـا عنـدي مـن المـاء إلا نُضاضَةً) کەمێك ئـاوم لایـە جۆرێکم ئـاو لایـە ٥ (وإسـتوفيت حقـي منـه وبقيت عليه نُـضاضة) مـافی خـۆم لێ سـتاند کـەمێکی لامـاوە ٥ بـاقی ماندەیـــەکی لامـــاوە ٥ هـــەروا دەگوترێ: (هو نُضاضَةُ ولده) ئەو دوا منداڵیەتی (ك: نُضاض و نضائض).

**النَّـضوض**: دەگـوترێ: (بئـر نَـضوض) بیرێکە ئاوەکەی بەشێوەی ئـاوەدز لێ دێتەدەر.

**النَّـــضيضُ**: شــتی کــەمو بــچوك ٥ دەگوترێ: (ماء نضيض) ئـاوی کـەمو چۆرِ چۆرِ (هو نـضيض اللحـم) ئـەو کزو داڵگۆشتە.

**النَّضيـضةُ**: دەگـوترێ: (مطـر نضيـضة) بـارانی کـەم و پـچرِ پـچرِ (سـحابة نضيضة) تەنکە هـەور هـەوری کـەم توێسکە هەور ٥ دەشگوترێ: (ترکت الـدواب ذات نضيـضة) وڵاخـەکانم بەتینوایەتی جێ هێشت.

**نَضَفَت الدابة نضفاناً**: وڵاخەکە دامرکا، زێربار بوو.

**نَـضَفَ فلانـاً نَـضْفاً**: خزمـەتی فلانکەسـی کرد.

**نَضَفَ الشَّيْءَ**: هەموو شتەکەی برد، کرِی، خواردی ٥ دەگوترێ: (نَضَفَ مافي الإناء، و نَضَفَ الرضيعُ مافي الضرع).

**نَـضَفَ الـشَّيْءُ نَـضْفاً**: پـیس بـوو ٥ (فهـو نَضِف ونَضيف).

**أنْـضَفَ فـلان**: بـەردەوام بـوو لەسـەر خـــواردنی روەکـــی (النَّـــضيف) کەروەکێکی بۆنخۆشە.

**أنضَفَت الناقةُ**: حوشترەکە زێربار بوو.

**أنضَفَ الدابة**: خاوەنی وڵاخەکە هەوڵی دا وڵاخەکە زێربار بکاو وای لێ بکا بەویستی ئەو بروا.

**إنتَضَفَ الشَّيْءَ:** هەموو شتەکەی تەواو کرد، خواردی بردی، دایپۆشی ٥ دەگوترێ: (إنتَضَفَ مافي الإناء وإنتَضَفَ مافي الضرع).

**النَّضَفُ:** ڕوەکێکی بۆنخۆش و عەتر ئامێزە لە پێری (الشفويات).

**النُّضَفُ:** ڕوەکێکی بۆنخۆشە لەبواری داو و دەرمان دا بەکاردێ.

**نَضَلَهُ نَضْلاً:** پێشی کەوت لەبواری تیر هاوێژی و تفەنگ هاوێژی دا ٥ دەگوترێ: (ناضَلَهُ فنضَلَهُ).

**نَضَلَ نَضَلاً:** کزو لاواز بوو، ماندو بوو.

**أنْضَلَ الدابة:** وڵاخەکەی ماندوو کزو لاواز کرد.

**ناضَلَ عنه مناضلة ونضالاً وتناضلاً:** پارێزگاری لێ کرد ٥ داکۆکی لێ کرد پاساوی بۆ هێنایەوە.

**ناضَلَ فلاناً:** لەبواری تیرهاوێژی دا پێشبڕکێی لەگەڵ کرد.

**إنتَضَلَ القومُ:** خەڵکەکە لەتیرهاوێژی دا پێشبڕکێیان کرد ٥ دەگوترێ: (قصدوا يتنضلون) دانیشتن دەستیان کرد بەخۆ هەڵنانەوە و خۆهەڵکێشان.

**إنتَضَلَ الشَّيْءَ:** شتەکەی دەرهێنا.

**إنتَضَلَ السيف:** شمشێری لە کالان دەرکێشا.

**إنتَضَلتُ من القوم رجلاً:** پیاوێکم لەنەتەوەکە هەڵبژارد.

**تناضَلَ القوم:** خەڵکەکە پێشبڕکێیان کرد لەتیر هاوێژی دا.

**تَنَضَّلَ الشَّيْءُ:** شتەکەی دەرهێنا ٥ هەوڵی دەرهێنانی دا.

**تَنَضَّلَ سهماً من كنانته:** تیرێکی لەتیردانەکەی دەرهێنا.

**النَّضِيلُ:** هاوشان لەتفەنگ هاوێژی و تیر هاوێژی دا ٥ دەگوترێ: (فلان نضيلي) فلانکەس هاوشانمە لە تیر ئەندازی داو پێشبڕکێم لەگەڵ دەکا.

**نَضْنَضَ فلان:** فلانکەس ماڵ و سامانی زۆر بوو.

**نَضْنَضَ الشَّيْءَ:** شتەکەی لەقاندو دەری هێنا.

**نَضْنَضَ لِسانَهُ:** زمانی دەرکێشا ٥ دەشگوترێ: (ما زال يُلِّحُ به حتى نَضنَضَ منه شيئاً) بەردەوام یەخەی گرت و وازی لێ نەهێنا تا شتێکی لێ هەڵکڕاند.

**النَّضْناضُ من الحَيَّات:** ئەو مارەیە لەشوێنێك ئۆقرە ناگرێ و هەر دێو دەچێ و شەڕانی و زێنە خرۆیە ٥ یان ئاوە بۆ ئەو مارەی زمان دەردێنێ و دەیجوڵێنێ.

**النَّضْناضَةُ:** مێینەی (النضناض).

**نَضا اللَّونُ نَضْواً**: ڕەنگەکە کاڵ بۆوە، چۆوە.
**نضا الماءُ**: ئاوەکە ڕۆچوو.
**نضا الجُرحُ**: برینەکە هاوساوییەکەی نیشتەوە.
**نضا الشَّيْءَ**: شتەکەی دەرهێناو فڕێی دا.
**نضا الثَّوْبَ عنهُ**: قوماشەکەی لەبەر دارنی کراسەکەی لێ داکەند.
**نضا منه الشَّيْءَ**: لێی دەرهێنا ٥ دەگوترێ: (نضاه من ثوبه: ونضا سيفه من جفنه).
**نضا المكانَ**: لەشوێنەکە تێپەڕی شوێنەکەی خستە دوا خۆیەوە.
**نضا الجوادُ الخَيْلَ**: ئەسپە ڕەسەنەکە لەغاردن دا پێش ماینەکە کەوت.
**نَضي الشَّيْءَ من الشَّيْءِ نضياً**: شتەکەی لەشتەکە دەرهێنا ٥ فڕێی دا.
**نَضي الثَّوْبَ**: کراسەکەی کۆنو ڕزیو کرد.
**أنضى فلان**: فلانکەس ولاخەکانی کزو لاواز بوون.
**أنضى الدابةَ**: ولاخەکەی لاواز کرد، ماندوی کرد.
**أنضى الثوبَ**: کراسەکەی ڕزاند.
**أنضى فلاناً**: ئاژەڵێکی لاوازی دا بە فلانکەس.
**نَضّى الشَّيْءَ عَنْ الشَّيْءِ**: شتەکەی لەشتەکە دەرهێناو فڕێی دا.
**إنْتَضى السَّيْفَ**: شمشێری لەکالان دەرکێشا.
**إنْتَضى الثوبَ**: قوماشەکەی ڕزاند.
**تَنَضّى الدابة**: ولاخەکەی ماندو و کزو لاواز کرد.
**النُّضاوة**: (نضاوة الشَّيْءِ) ئەوەی لەشتەکە دەبێتەوە لەکاتی دەرهێنان دا بەتەوژم.
**النِّضْوُ**: کزو لاواز ئاژەڵی دالگۆشتو کز ٥ دەگوترێ: (فلان نضو سَفَرٍ) فلانکەس کزو لاوازی سەفەرکردنە ٥ (ثوب نِضْوٌ) قوماشی ڕزیو ٥ (سَهم نضوٌ) تیری خراپو بێ کەڵك ئەوەندە هاوێژراوە خراپ بووە لەکەڵك کەوتووە ٥ ئاسنی لغاو بەبێ سیرمەکەی.
**النِّضِيُّ من الحيوان**: ئاژەڵی لاوازو بێ گۆشت.
**نَضِيُّ السَّهم**: نێوان پەڕو خەدەنگی.
**نَطَبَ فلاناً نَطْباً**: پەلەپیتکەی لەگوێچکەی فلانکەس دا.
**نَقَّبَ الديك الشَّيْءَ**: کەڵەشێرەکە بەدەندوك لەشتەکەی دا، شتەکەی دەندوك هاژن کرد.
**المِنْطَبُ**: مەصفی (شت پاڵێو).
**المِنْطَبَةُ**: بەمانا (المِنطَبُ) دێ ٥ (النواطِب) کونی شت پاڵێو، کونی مەصفی.

نَطَحَهُ الثورُ ونحوه نَطْحاً: ڕەشە ولاخەکە قۆچی تێهەڵدا.

نَطَحَ فلاناً عَنْ كذا: فلانکەسی لەو کارە لادا ٥ هەروا دەگوترێ: (هذا أمر لا ينتطح فيه عنزان) ئەمە شتێکە دوو بزن شەڕەقۆچی لەسەر ناکەن (واتە: کەس نیە بڕوای پێ نەبێ و ڕەتی بکاتەوە).

ناطحه مُناطحة ونِطاحاً: هەریەکە لەو دوانە قۆچی لەوی تردا، شەڕە قۆچیان کرد ٥ لەشەڕەقۆچ دا بەسەری دا زاڵ بوو.

تَناطَحَ فلان فلاناً: فلانکەس بەربەرەکانی فلانکەسی کرد.

تناطَحَ الكبشان: دوو بەرانەکە شەڕە قۆچیان کرد.

تناطحت الأمواج والسيول: شەپۆلەکان یان لافاوەکان تێکیانەوە هاویشت.

النّاطحة (ناطحة السحاب): باڵەخانەی بەرز ٥ (ك: نواطح).

النّطيح: قۆچ تێهەڵدراو ٥ کەسێك بەقۆچ لێدان مردبێ ٥ (ك: نطحى ونطائح).

النطيحة: (الشاة النطيحة) مەڕێك بەشەڕەقۆچ مندار بوبێتەوە.

نَطَرَ الكرمَ ونحوه: مێوەکەی پاراست بەخێوی کرد.

الناطِرُ: ڕەزەوان، ڕەز بەخێوکەر.

الناطور: بەمانا (الناطِرُ) دێ.

النَّطَّارُ: داوەڵ ٥ پۆشاکێکە (پاڵتۆیەکە) لەناو کشتو کاڵ دا بەدارێك دا هەڵدەواسرێ بۆئەوەی دڕندەو ئاژەڵی کێوی سڵی لێ بکەنەوەو وابزانن ئەوە مرۆڤە.

نَطِسَ نَطْساً: بەسەرنجدانەوە لەکارەکان ڕاماو لێیان وردبۆوە ٥ (فهو نَطِسٌ ونطيسٌ).

تَنَطَّسَ في الشَّيْئِ: لەشتەکە ورد بۆوە تێی ڕاما ٥ دەگوترێ: (فلان يَتَنَطَّسُ في ملبسه ومأكله) فلانکەس زۆر لە پۆشاكو خواردەمەنی خۆی ورد دەبێتەوە زۆریان بیر لێ دەکاتەوە تا هەڵیان دەبژێرێ ٥ (فهو يَتَنَطَّسُ في كلامه) زۆر لەقسەکردنی خۆی ورد دەبێتەوە، بیردەکاتەوە ئەمجار قسەکە دەکا.

تَنَطَّسَ فلان من كذا: فلانکەس قێزی لەو شتە کردەوە ٥ دەگوترێ: (تَنَطَّسَ من مؤاكلة فلان) بێزی کرد لەخواردن لەگەڵ فلان دا، بێزی نەهات لەگەڵ فلان نان بخوا.

تَنَطَّسَ عَنْ الأخبار: لەهەواڵەکانی کۆڵیەوە.

الناطِسُ: جاسوس.

**النَّطاسيّ**: زاناو شارەزا لەزانستو ئەدەب دا، پزیشکی کاراما.

**النَّطْسُ**: بەمانا (النّطاسيُ) دێ ٥ بێزکەرەوە لەشت.

**النُّطْسُ**: پزیشکانی کارامەو دەست ڕِنگین ٥ کەسانێك کەبێز لەشت دەکەنەوە.

**النَّطيسُ**: وردبین لەکارو باردا، شارەزاو پسپۆڕ لەبواری پزیشکی دا ٥ (وهي نطيسة).

**النُّطَسَةُ**: کەسێك زۆر بیر لەشت بکاتەوە.

**نَطَّ نَطّاً ونطيطاً**: بازی دا.

**نَطَّ في الأرض**: بەناو زەوی دا ڕۆیی.

**نَطَّ في منطقه**: لەقسەکردن دا زمانی پیس بوو، قسەی نەشیاوی کرد، چەلتەچەلتی کرد ٥ (فهو نطّاط).

**نَطَّ الشَّيْءَ نَطّاً**: شتەکەی درێژکردەوە توندو گشتی کرد.

**الأنَطُّ**: (سَفَرٌ أنطّ) سەفەری دورو درێژ ٥ (وهي نطّاء).

**عَقَبَة نطاء**: تەنگانەو ڕێگای ناخۆش کەماوەیان زۆربێ.

**النَّطّاطُ**: زۆربلێو چەقەچەناو و قسەترِن ٥ جۆرێکە لە کولەبێتان کە کشتوکاڵ دەخوا.

**النَّطيطُ**: دەگوترێ: (مكان نطيط)

شوێنی دوور.

**نَطَعَ اللُّقمة نَطعاً**: هەندێکی لەپاروەکە خواردو باقی مەندەکەی خستەوە سەر سفرەکە ٥ (فهو ناطع).

**نُطِعَ لونه نَطْعاً**: ڕەنگی گۆڕا.

**تَنَطَّعَ فلان**: فلانکەس شتێکی لە پارەکە خواردو ئەوی تری خستەوە سەر سینیەکەی.

**تَنَطَّعَ في الشَّيْء**: زۆر بیری لەشتەکە کردەوە و لێی ورد بۆوە ٥ دەگوترێ: (تَنَطَّعَ في كلامه) لەقسەکردن دا زۆر درێژەی پێداو وردەکاریی تێدا کردو لێی کۆڵییەوە.

**تَنَطَّعَ في شهواته**: ڕۆچوو لەشەهوەتو ئارەزۆبازی دا.

**تَنَطَّعَ في عمله**: لەنێو کارەکەی دا زیرەك و شارەزا بوو.

**النُّطاعَةُ**: پارو نیوەی بخورێو نیوەکەی تری بخرێتەوە سەر سفرەکە.

**النِّطعُ والنَّطَعُ**: چەرمێکە لەڕۆژگاری ڕابردودا تاوانباری لەسەر کوژراوە بەشمشێر یان بەشتی تر ئیعدام کراوە بۆیە گوتراوە: (عَليّ بالسَّيف والنّطع) شمشێرو چەرمەکە لەعۆدەی من بێ من دابینی دەکەم بۆ کوشتنی تاوانبار ٥ هەڵاشی نەشکەوت ٥ مەڵاشوو ٥ دەگوترێ:

(هذا من الحروف النطعيّة) ئەم پیتە لەوانەیە کەلەمەلاشـۆوە دەردەچـن کـەبریتین لـە (گ ٥ د ٥ ت) ٥ (ك: نطو ع).

**النُّطُـعُ:** ئەوانـەی لەقـسەکردن دا زۆر درێژ دادڕنو زمانیان بادەدەن.

**نَطَفَ نَطْفاً ونطوفاً ونطافاً ونطفاناً:** دلۆپـەی کـرد ٥ دەگـوترێ: (نَطَفَـت القِرْبَـة) کوندەکـە لێـی چـوو، دلۆپـەی کـرد ٥ ئـاوی لێ تکـا ٥ (نَطَـفَ الـسَّحابُ) هەورەکـە دلۆپ دلۆپ بـارانی لێ هاتـە خـوار ٥ (جـاء سـیفه ینطـف دماً) هـات شمـشێرەکەی خـوێنی لێ دەتکـا ٥ دەگـوترێ: (فـلان ینطـف بـسوء) فلانکەس خراپەی لێ دەتکێ.

**نَطَفَ الماءَ:** ئاوەکەی ڕژاند.

**نَطِـفَ الجُـرْحُ والخـراجَ نَطْفـاً:** برینەکـەی قەلاشـتەوە کوانەکـەی دەرکـرد ٥ دەگـوترێ: (نَطَفَـه بعیـب) عـەیبو خەوشی پاڵ دا، عەیبداری کرد.

**نَطِفَ الشَّيْءُ نَطْفاً:** شتەکە خراپ بوو ڕزی تێکچوو کەڵکی نەما.

**نَطِفَ الهیرانُ:** ئاژەڵەکە لویـەکی لەگـەدەدا پەیدابوو خوێن دەدەڵێنێ.

**نَطِفَ الرجلُ:** پیاوەکە برینـی سەری قـوڵ بوو گەیشتە مۆخی ٥ لەڕێی گومانـەوە تۆمەتبار کرا.

**أنْطَفَـهُ:** ڕەخنـەی لێ گـرت ٥ لـەڕێی گومانەوە تۆمەتباری کرد.

**نَطَّفَ فلاناً:** ڕەخنەی لەفلان گرت.

**نَطَّـفَ المـرأةَ:** گـوارەی کـردە گـوێی ئافرەتەکە.

**تَنَطَّفَ:** قوڕاوی بوو، خوێناوی بوو.

**تَنَطَّفَتِ المرأةُ:** ئافرەتەکە گوارەی لەگوێ کرد.

**تَنَطَّفَ من كذا:** بێزی لەوە هەڵسا.

**النّـاطِفُ:** شـتی شـل وەکـوو ئـاو و شـلەمەنی لـەو جـۆرە ٥ جـۆرە حەڵوایەکـە لـەبادامو گـوێزو فـستق دروسـت دەکـرێ پێـشی دەگـوترێ: (القبیط).

**النُّطافة:** ئاوی کەم ٥ جۆرە ئاو.

**النَّطَـفُ:** عـەیبو خـەوش ٥ دەگـوترێ: (مابه نَطَفٌ) ٥ (وقع في النطفِ) کەوتە ناو شەڕو ناخۆشیەوە.

**النُّطْفَةُ:** ئاوی صافو ڕون ٥ (ك: نِطاف) دەگـوترێ: (سـقاني نُطْفـةً عذبـة، ونِطافـاً عِـذاباً) ٥ دلۆپـەناو قـەترە عارەق ٥ دەگوترێ: (جاء وعلى جبینه نِطاف) هـات بەناوچاوانیەوە دلۆپە ئـارەق هـەبوون ٥ دلۆپـە مـەنی (ك: نُطَفٌ).

**النُّطْفَـةُ:** مـرواری بـچوكو وردو ڕون ٥ گوارە ٥ (ك: نُطَفٌ).

**النَّطوف**: دڵۆپەکەر؛ هەرشتێك دڵۆپەی لێ بتکێ ٥ دەگوترێ: (ليلة نطوف) شەوێکی باراناوی بوو تابەیانی باران باری.

**نَطَقَ نُطْقاً ومَنْطِقاً**: قسەی کرد ٥ (نَطَقَ الطائِرَ) باڵندەکە دەنگی لێوە هات.

**نَطُقَ الرجلُ**: پیاوەکە بوو بە قسەزان‌و قسەڕەوان.

**أنْطَقَهُ**: بەقسەی هێنا، وای لێ کرد قسە بکا.

**ناطَقَهُ**: قسەی لەگەڵ کرد.

**نَطَّقَهُ**: بەمانا (أنْطَقَهُ) دێ ٥ ناوقەدی بەپشتێن بەست ٥ دەگوترێ: (نطّقَ الماءُ الشجرَ والأكمةَ) ئاو گەیشتە ناوقەدی درەختەکە، یان ئاو گەیشتە ناوڕاستی گردەکە.

**إنْتَطَقَ**: ناوقەدی خۆی بەپشتێن یان بەقایش بەست ٥ دەگوترێ: (إنْتَطَقَت الأرض بالجبال) زەوی بەکێوەکان دەوران دەور دراوە ٥ کێوەکانی کردوە بەپشتێنی خۆی ٥ هەروا دەگوترێ: (هو ينتطق بقومه وإخوانه) ئەو پشت بەهۆزو خزم‌و کەس‌وکاری دەبەستێ.

**إنْتَطَقَ فرساً**: لەتەنیشت ئەسپەکەوە ڕۆیی‌و سواری نەبوو.

**تناطَقَ الرجلان**: دوو پیاوەکە کەوتنە گفت‌و گۆ لەگەڵ یەکتر.

**تَنَطَّقَ**: ناوقەدی خۆی بەپشتێن بەست.

**تَنَطَّقَتِ الأرضُ بالجبالِ**: زەوی پشتێنی بەکێوەکان بۆخۆی دروست کرد، خۆی بەکێوەکان قایم‌و پتەو کرد.

**تَمَنْطَقَ**: ناوقەدی بەپشتێن بەست ٥ خەریکی فێربوونی زانستی مەنتیق بوو.

**إسْتَنْطَقَهُ**: داوای لێ کرد قسە بکا ٥ قسەی لەگەڵ کرد.

**المُسْتَنْطِق**: کەسێکە لەبواری پۆلیسی‌و دادوەری دا لێکۆڵینەوە لەگەڵ تۆمەتبار دەکا.

**المَنْطِقُ**: ئاخاوتن‌و قسە، قورئان دەفەرموێ: ﴿عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ﴾ ٥ هەروا وشەی (المنطق) ناوە بۆ زانستێك یاساو ڕێسایەکی تایبەتی خۆی هەیە کە پەیڕەوییان بکەی زەین لەهەڵە دەپارێزرێ ٥ دەگوترێ: (فلان منطقي) فلانکەس مەنتیق زانە زانستی دەربارەی مەنتیق باشە ٥ بیرو زەینی بەهەڵە ناچێ.

**المِنْطَقُ**: پشتێن، هەرشتێك ناوقەدی مرۆڤی پێ پتەو بکرێ ٥ (ك: مناطِق).

**المِنْطَقَةُ**: بەمانا (المِنطَقُ) دێ ٥ بەشێکی دیاریکراو و سنوردار لەزەوی: کە تایبەتمەندییەکی هەبێ وەکوو

(المِنطَقَـة الإسـتوائية و مِنطَقـة البحـر الأبيض).

**المُنْطَقَة**: بەمانا (المِنطَقة) دیٚ.

**المُنَطَّقَـةُ**: پـشتێن بەسـتو ◦ یـان ئـاژەڵی ناوقەد بەڵەك.

**المَنطــوق**: بــەلای زانایــانی ئوصــولی فیقهەوە ئەومیە لەفز ڕاستەوخۆ بێ بەرچـاوگرتنی هـیچ شـتێکی تـر دەلالەت بکا لەسەر مانا.

**المِنطيــقُ**: زمــان ڕەوان ◦ ئافرەتێــك بەئیسفەنجو پەڕۆو شتی وا سمتو کمفەڵی خۆی گەورە بکا.

**النّـاطِقُ**: (کتـاب نـاطِق) کتێبـی ڕونو ئاشکرا (شيء نـاطِق) شتی ئاشکرا ◦ (حیـوان نـاطِق) ئـادەمیزاد، خـاوەن بیرو هۆش.

**النّاطِقة**: مێینەی (الناطق) ◦ هەروا ناوە بۆ کەلەکەو خالیگە.

**النِّطَاقُ**: قایش پشتێن ◦ (ذات النّطاقين) نـاوە بـۆ خـاتو (ئـەسماء)ی کـچی ئەبوبەکر ◦ بەرهەڵبێن: کە ئـافرەت بۆ ئیش‌و کار بەبەرخۆی هەڵدەدا ◦ دەشـگوترێ: (عَقَــدَ فـلان حُبُــكَ النِّطاق) فلانکەس خۆی بـۆ کارەکە ئامادە کرد ◦ (وهـو واسـع الـنّطاق) ئـەو مرۆڤـە ئاسـۆی بیرکردنـەوەی بەرفراوانە.

**نِطـاق الجَـوْزاء**: سـێ ئەسـتێرەن لـەنێو کۆمەڵـە ئەسـتێرەی جـەوزادا ◦ (ك: نُطُق).

**النُّطْقُ**: قسەکردن ◦ تێگەیشتن‌و هەست کردن بەچەمکە گشتییەکان.

**نَطَلَ الخمرَ نَطْلاً ونطولاً**: شەرابەکەی گوشی ◦ ترێـی گوشـی کەلـەئاکام دا دەبێتـە شەراب.

**نَطَلَ الماءَ**: ئاوەکەی وردە وردە ڕژاند.

**نَطَلَ المريضَ**: وردە وردە ئـاو و شـتی وای بەسەر نەخۆشەکەدا کـرد بەمەبەستی چارەسەری نەخۆشییەکەی.

**نَطَّلَ المريضَ**: بەمانا (نَطَلَهُ) دیٚ.

**إنْتَطَلَ من الإناء**: لەگۆزەکەوە چۆڕ چۆڕ ئاوی ڕژاند.

**المَنطَلَةُ**: شوێنی میوە گوشین ◦ چەرەس ◦ (ك: مناطل).

**النّاطِلُ**: پیاڵەیـەکی بـچکۆلەیە نمونـەی شـەرابی تـێ دەکـرێ بـۆ بانگەشـەو ڕاکێـشانی کڕیـار بـۆ شـەرابەکە ◦ ئامێرێکی پێوانەیە بۆ پێوانەکردنی هەنـدێ شلەمەنی‌و خـۆراك ◦ بـاقی مەندەیــەك لەشــتی پێوانــەکراو کەلــەبنکی ئــامێری پێوانەکــەدا دەمێنێتــەوە ◦ قومــە ئــاو و قومــە بـیرەو شـتی وا ◦ دەگـوترێ: (مـا ظفرت منه بناطل) قومە ئاوێکم لێـی دەست نەکەوتووە.

**النَّطْـلُ**: تلّپـەو شـتی ڕەق هـەڵاتوی شلەمەنی.

**النُّطْلَةُ**: قومە ئاو، چۆرە ئاو ٥ شتی کەم ٥ دەگوترێ: (أخذ مـن الإنـاء نطلـة) شتێکی کەمی لەزەرفەکە دەرهێنا.

**النَّطيـلُ**: دۆڵـچە ٥ ئـامێرێکی بـچوکە شـلەمەنی پـێ پێوانـە دەکـرێ ٥ دەشـگوترێ: (فلان نطيـل) فلانکـەس زیرەکـە، لێهـاتووە ٥ (رمـاه الله بالنطيـل) خـودا بـەلاو کارەسـاتی بەسەر هێنا.

**نَطْنَطَ الشَّيْءُ**: شتەکە دوورکەوتەوە.

**نَطْنَطَـت الأرضُ**: زەوییەکـە دوور بـوو ٥ (نَطْنَطَ فلان) فلانکەس سـەفەرەکەی دوورخـستەوە ٥ (نَطْـنَطَ الـشَّيْءَ) شتەکەی درێژکردەوە.

**تنَطْنَطَ**: دوورکەوتەوە.

**النَّطناطُ**: درێـژو تـولانی ٥ دەشگوترێ: (رجـل نطنـاط) پیـاوێکی زۆر بڵـێو چەقەچەناو.

**النُّطْنُطُ**: بەمانا (النّطناط) دێ.

**نطا المنزلُ نَطْواً**: مەنزڵەکەی دوور بوو.

**نطا الحَبْلَ**: حەبلەکەی درێژ کردەوە.

**نطا الغَزْلَ**: ڕیسەکەی ڕست.

**أنْطى**: پێی بەخشی (واتـە: دەق بـەمانا (أعطى))دێ ٥ بۆیە قیرائەتێك هەیە (إنا أنطيناك الكوثر) خوێندراوەتەوە.

**نطاهُ**: کێشەی لەگەڵ نایـەوە ٥ یارمـەتی دا بـۆ ڕسـتنی ڕیـسی بۆنـەوەی زوو ڕانكوچۆغەکەی پێ بگەن.

**تنـاطى القـومُ**: خەڵکەکـە پێـشبڕکێیان کرد.

**المَنْطُوُّ**: (سفر مَنطُوٌّ) سـەفەرێکی درێـژ ٥ (ثـوب مَنطـوٌ) قوماشـێکی کـۆنو فرێدراوە.

**النَّطِيُّ**: بەمانا (المَنْطوُّ) دێ.

**نَظَـرَ الى الـشَّيْءِ**: بـۆ شـتەکەی ڕوانـی ٥ چاوی تێ بڕی.

**نَظَـرَ فيـه**: تێـی فکری، سەرنجی دایـە ٥ دەگـوترێ: (نَظَـرَ في الكتـاب) لەکتێبەکـەی ڕوانـی، تێـی فکـری ٥ دەشـگوترێ: (فـلان ينظـر ويعتـاف) فلانکەس سەیری کتێب دەکاو ڕەمڵ لێ دەدا.

**نَظَرَ لفلان**: فلانکەسی لاواندەوەو یارمەتی دا.

**أنْظُر لي فلاناً**: فلانکەسم بۆ بانگ بکە.

**نَظَـرَ بـين النـاس**: دادگـایی نێـوان ئادەمیزادەکانی کرد.

**نَظَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بینی ٥ دەشگوترێ: (داري تنظر داره) خانوەکەم بەرامبـەر خانوەکەیـەتی ٥ هـەروا وشـەی (نظـر) بـەمانا پاراسـتنو چـاودێری کـردن هاتووە ٥ بـەمانا مۆڵەتـدانو دواخـستن هاتووە ٥ دەگوترێ: (نظـر الـدينَ ونظـر البيعَ).

نطاق
نقطة الدائرة
نفير
نفق
نظارة
أنشوطة
نصاحة
نطفة
ناعورة
منضحة
نعل الدابة
منشار
ناووس
نقارة
نعل
نصل الرمح
نهد
منصب
منفخ
نعي
نمام
منشار
نصل
نفلة
شقائق النعمان
نقار
أنقد
نعامة
منقار
نمر
نصارية
نملة
نمس

**نَظَرَ المبيعَ:** کاڵاکەی بەقەرز فرۆشت.

**نَظَرَ فلاناً:** شتی لەفلانکەس کڕی بەقەرز.

**نَظَرَ الشَّيْئَ:** چاوەڕوانی شتەکەی کرد ٥ دەگوترێ: (نَظَرتُ فلاناً الى الظهر) چاوەڕوانی فلانکەسم کرد تانیوەڕۆ.

**أنْظَرَ الشَّيْئَ:** شتەکەی دواخستو وەغراندی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ ٥ دەشگوترێ: (أنظرت الدينَ وأنظرته الدين).

**أنظَرَ فلاناً:** شتی بەقەرز بەفلانکەس فرۆشت ٥ ڕێگای تێڕوانینی پێدا.

**أنْظَرَ فلاناً بفلان:** فلانکەسی کردە هاوشانی فلان.

**ناظَرَ فلاناً:** بووبەهاوشانی فلانکەس ٥ گفتو گۆی لەگەڵ فلانکەس کرد، لەدەمەدەمێو موناقەشەدا بۆڕی دا.

**ناظَرَ الشَّيْئَ بالشيئ:** شتەکەی کردە هاوتای ئەو ٥ دەگوترێ: (داري تناظر داره) خانوەکەم بەرامبەر خانوەکەیەتی ٥ هەروا دەگوترێ: (جمعهم يناظر الألف) کۆمەڵەکەیان نزیکی هەزار کەسە.

**نَظَّرَ الشَّيْئَ بالشيئ:** شتەکەی بەرامبەر شتەکەی تر کرد بەئەوی گرت.

**إنْتَظَرَهُ:** چاوەڕوانی کرد، وابەهیوابوو، مۆڵەتی دا.

**تناظر القومُ:** خەڵکەکە سەیری یەکتریان کرد.

**تناظر في الأمر:** دەمەدەمێو کێشەو جەدەلیان کرد ٥ دەشگوترێ: (دورهم تناظر) خانوەکانیان بەرامبەر یەکترن.

**تَنَظَّرَهُ:** چاوی تێ بڕی ٥ چاوەڕوانی بوو ٥ هێدی بوو لەگەڵی دا ٥ دوای خست ٥ ئیشەکەی وەغراند.

**إسْتَنْظَرَهُ:** چاودێری کرد ٥ داوای مۆڵەتی لێ کرد.

**إسْتَنْظَرَهُ على كذا:** کردی بە موراقیبو چاودێر بەسەر ئەو شتەوە.

**المُناظِرُ:** کێشەکارو بەڵگە هێنەرەوەو ڕکابەر ٥ هاوشان.

**المِنْظارُ:** ئاوێنە ٥ دووربین، میکرۆسکۆپ ٥ تیلیسکۆپ.

**المَنْظَرُ:** تێڕوانین ٥ دیمەنو وێنە کەسەیری بکەی سەرنجت ڕابکێشێ ٥ شوێنی چاودێری ٥ (ك: مناظر).

**المَنْظَرَةُ:** بەمانا (المَنظَرُ) دێ ٥ ژوورێکە لەناو خانودا پێشوازیی میوانی تێدا دەکرێ ٥ کۆمەڵێك مرۆڤ بڕواننە شتێك.

**المنظور:** دەگوترێ: (سيد منظور) پیاوێکی گەورەو بەخشندەیە پیاوەتی لێ چاوەڕوان دەکرێ ٥ (شيئ

منظــور) شـتێك چـاو بـەملۆق بومستێنیو سەرنج ڕاكێش بێ ◦ (طفـل منظــور) منالێكـە توشـی چاوئێشە بووە.

**الناظر**: تەماشاكەر ◦ (ك: نظارة) ◦ چاو ◦ ڕەشێنەی چاو ◦ (ك: نـواظر) ◦ كـارگێڕو كاربەدەسـتی وڵاتو دەفەرێك، دەگوترێ: (ناظر المدرسة) ◦ (ناظر الضيعة) ◦ (نـاظر المعـارف) ◦ (ك: نُظّار).

**النّاظِرَة**: مێینەی (النّاظِر) ◦ چاو ◦ (ك: نواظر).

**الناطور**: بـەمانا (النـاطور) دێ ◦ ڕیش سپیو پیاو ماقوڵی نەتەوە.

**نَظَارِ**: ئیسم فیعلە بەمانا فیعلی ئەمرە، واتە چاوەڕوان بە.

**النَّظـارَةُ**: سەرناسـیو زیرەكـیو خوێندنـەوەی دەموچاوی بەرامبـەر ◦ پیشەی چاودێری.

**النَّظَـرُ**: چاو، ئەنـدامی بیـنین ◦ هێـزی تێفكرینو بیركردنەوە ◦ شوێنی تێ ڕامانو بیر لێ كردنەوە.

**النَّظْرُ**: هاوشان.

**النَّظْـرَةُ**: تێڕوانینێـك، چـاو پیاخـشاندنێك ◦ چـاوەزار، بەچـاو هەنگاوتن ◦ ڕەحمەتو بەزەیی.

**النَّظِـرَةُ**: چـاوەڕوانی، شـت فرۆشـتن بەشـێوەی قـەرز ◦ دەگـوترێ: (إشـتريته بِنظِـرَة) بەقـەرز لێم كڕی پـاش ماوەیـەك پارەكـەی تەسـلیم دەكـەم ◦ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾.

**النَّظَرِيُّ**: دەگوترێ: (أمر نَظَرِيٌّ) كارێكە پێویستی بەلێ وردبوونـەوەو فیكرو خـەیاڵ هەیـە، زۆر پێویـستی بەتەجرەبـەی زانـستیو ئـەزمونی زانستی نیە.

**النظريّـة**: بیروبۆچـونێكە بـەبورهان دەچەسـپێندرێ ◦ لـەبواری فەلـسەفەدا كۆمـەڵێك ڕاو بۆچـونن هەنـدێ ڕوداوی (زانـستی یـان فەننی) یان پێ ڕون دەكرێتەوە.

**نظرية المعرفة**: لێكۆڵینەوە لەو جورتەمو تەنگژانـەی لـەناكامی پەیوەنـدی نێوان شەخصو مەوزوع، یان نێوان ناسێنەرو ناسراو پەیدا دەبن.

**النَّظّارُ**: چاوتیژ، زۆر سەیركەر.

**النَّظّـارَةُ**: خـەڵك كەبڕوانـنـە شـتێك ◦ عەینەك، چاویلكە.

**النَّظورُ**: بـەمانا (النَّظّار) دێ ◦ چـاوتێبڕ، دەگـوترێ: (رجـل نظــور) پیاوێكـە چاوی لەشتەكە ناتروكێنێ ◦ (نظورة الجيش) پێشەتای سوپا؟.

**الـنَّظِير**: كفـتو كۆكـار، هاوشـانو هـاو

وێنه ◦ دەگوترێ: (فلان منقطع النظیر) فلانکەس وێنەی نیه لەو بوارەدا شارەزاو لێهاتووه ◦ دەشگوترێ: (هو نظیرة قومه) ئەو پیاوه گەورەپیاوی نەتەوەکەیەتی ◦ هەروا دەگوترێ: (جاءت نظیرة الجیش) پێشەتای سوپاکه هات ◦ دەشگوترێ: (عددت الأشیاء نظائِرَ) شتەکانم دوو دوو ژماردن.

**النظائر المُشِعَة:** گەردیلەی تیشك ئاوەر.

**نَظُفَ نظافةً:** لەچڵك پاکبۆوه ◦ (فهو نظیف) ◦ (ك: نظفاء).

**نَظَّفَهُ:** پاکی کردەوه ◦ دەگوترێ: (نَظَّفَ قلبَه) دڵو دەروونی خۆی پاراست له ڕەوشتی ناشیرینو شوبهەو حەرام.

**تَنَظَّفَ:** پاکبۆوه ◦ دەگوترێ: (نَظَّفَهُ فَتَنَظَّفَ) پاکی کردەوه پاکبۆوه ◦ دەشگوترێ: (فلان يَتَنَظَّفُ) فلان خۆدەپارێزێ لەهەرشتێك عەیبو عاربێ.

**إستَنظَفَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بەپاکی وەرگرت.

**المِنظَفَةُ:** پاککەرەوه.

**النَّظیفُ:** دەگوترێ: (هو نظیف السراویل) ئەوپیاوه داوێن پاکه، پاکداوێنه ◦ (فهو نظیف الأخلاق) ئەو ڕەوشت بەرزه ◦ هەر شتێك پاککەرەوەبێ وەکوو صابونو تایتو ئەسپۆن.

**نَظَمَ الأشیاءَ نَظْماً:** شتەکانی ڕێك کردنو خستنیه پەنایەك.

**نَظَمَ اللؤلؤ ونحوه:** مرواریو شتی لەو جۆرەی هۆنینەوه.

**نَظَمَ شِعراً:** ڕستەو وشەی سەروا دارو کێشداری ڕیزکردن، شیعری دانان ◦ دەشگوترێ: (نَظَمَ أمْرَهُ) کاروباری خۆی ڕێك خستن.

**نَظَّمَ الأشیاءَ:** بەمانا (نَظَمَ) دێ.

**إنْتَظَمَ الشَّيْءُ:** شتەکه ڕێكو پێك بوو ◦ ڕێك هاته بەرچاو ◦ دەگوترێ: (نَظَّمَهُ فإنْتَظَمَ) شتەکەی ڕێك کردو ڕێك بوو ◦ دەگوترێ: (إنتَظَمَ أمْرُهُ) کاری دامەزراو ئیشەکەی ڕێك کەوت، کێشەی نەما.

**إنْتَظَمَ الأشیاء:** شتەکانی کۆ کردەوەو خستنیه پەنایەکەوه.

**تَناظَمَت الأشیاءُ:** شتەکان چوونه پەنایەکەوەو ڕیز بوون.

**نَظَمَ الشَّيْءُ:** بەمانا (إنْتَظَمَ) دێ.

**الإنظام:** بەنی تەزبیح هۆنینەوە، هەربەنو دەزوویەك میرو و شتی وای پێ بهۆندرێتەوه.

**الأنظومة:** بەمانا (الإنظام) دێ.

**النِّظام:** دەزو و بەن کە مرواریو شتی

وای پێ بهۆنرێتەوە ٥ ڕێك‌و پێكی کاروبار ٥ دەگوترێ: (نظام الأمر) کۆڵەکەو ڕاگری ئیش‌و کار.

**النَّظْمُ:** میرو و مرواری هۆنراوە، ملەوانکە ٥ دەشگوترێ: (أتانا نظم من جراد) چینە کولەیەکی زۆرمان بۆ هات ٥ کەلامی سەرەوادارو کێشەدار (پێچەوانەی پەخشان).

**نَظْم القرآن:** ئەو چۆنیەتی‌و شکڵ‌و شێوەیەی قورئان لە ڕوی دەق‌و شێوەی خوێندنەوەو تەرتیبەوە ٥ هەروا ناوە بۆ کۆمەڵە ئەستێرەی سیوەیل (سورەییا) و کۆو تەرازو.

**النظیم:** هۆنراوە ٥ هەرشتێك ڕێك‌و پێك بێ‌و بەشەکانی پێکەوە گونجاوبن ٥ دەگوترێ: (نظیم من لؤلؤ) ملوانکەی مرواری.

**النَّظیمة:** تاڵە حەبل.

**النَّظّیمُ:** کەسێك زۆر شت بهۆنێتەوە ٥ شیعری زۆری نووسیبێ.

**نَعَبَ الغرابُ نَعْباً ونعیباً ونُعاباً وتنعاباً:** قەلە ڕەشەکە قیراندی، دەنگی لێوەهات.

**نَعَبَ البعیرُ نَعْباً:** حوشترەکە خێرا ڕۆیی (فهو ناعب وهي ناعبة).

**أنْعَبَ:** بەمانا (نَعَبَ) دێ ٥ دەشگوترێ: (أنْعَبَ فلان في الفِتَن) فلانکەس ئاژاوەی هەڵگیرساند.

**المِنْعَبُ:** (رجل مِنْعَبٌ) پیاوێکی چەقەچەناو و بەهات‌و هاوارە.

**النَّعْبُ:** (سیر نعب) ڕۆیشتنی خێرا (ریح نَعْبٌ) ڕەشەبای خێرا ڕەو.

**النَّعّابُ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَعَبَ)دا دێ ٥ دەگوترێ: (ناقة نعوب) حوشترێکی خۆشڕۆیە.

**نَعَتَهُ نَعْتاً:** مەدحی کرد ٥ دەگوترێ: (نعته بالکرم) ڕەوشتی نانبدەیی‌و سەخاوەتی پاڵ دا.

**نَعُتَ نعاتَةً:** شیاوی ئەوەیە وەصفی بکرێ‌و باسی پیاوەتی‌و نانبدەیی بکرێ.

**نَعَتَ الفَرَسُ:** ئەسپەکە زینی لەسەر پشت لابرا ٥ ڕەسەن‌و پەسەند بوو.

**أنْعَتَ:** جوان بوو بۆئەوە دەشێ وەصفی بکرێ ٥ دەگوترێ: (أنْعَتَ وجهه و أنْعَتَ خصاله).

**إنْتَعَتَ الفرس:** ئەسپەکە ڕەسەن بوو.

**إنْتَعَتَ فلان بکذا:** فلانکەس بەو ڕەوشتە جوانە ڕازایەوە ٥ دەشگوترێ: (إنتعت بالجمال) جوان‌و قەشەنگ بوو.

**إنْتَعَتَ فلاناً:** وەصفی فلانکەسی کرد بەچاکە.

**تناعته الناسُ:** خەڵك وەصفیان کرد.

**تَنَعَّتَهُ:** وەصفی کرد.

إسْتَنْعَتَهُ: هەوڵی دا ڕەوشتە جوانەکانی باس بکا.

المَنْعَـتُ: وەصـفو هەڵنانـەوە ◦ (ك: مناعـت) ◦ دەگـوترێ: (لـە مناعـت جميلة) ڕەوشتی جوانی هەن.

النَّعْتُ: صیفەتو ڕەوشت ◦ (ك: نعوت) ◦ دەشـگوترێ: (شـيئ نَعْـتٌ) شـتێکی بـاشو پەسـەندە ◦ (فـرس نعـت) ئەسـپێکە لەڕەسـەنی دا گەیـشتۆتە ئەوپـەڕی ◦ لەپێـشبڕکێ دا هەمیـشە براوەیـە ◦ (فـلان نعـت) فلانکـەس گەیـشتۆتە ئەوپـەڕی پلەبـەرزیو سەرکەوتن ◦ (إمْرأة نعتة) ئافرەتێکە گەیـشتۆتە ئەوپـەڕی جـوانی ◦ دەشـگوترێ: (رجـل نعتـة) پیاوێکـە پلەو پایەی لەوپەڕی بەرزی دایە.

النّعیـت: دەگـوترێ: (فـرس نعیـت) ئەسـپێکی ڕەسـەنە، (رجـل نعیـت) پیـاوێکی سـەخی سروشـتە پیـاوێکی مەردە.

نَعَثَ الشَّيْئَ نَعْثاً: شتەکەی هەڵگرت.

أنْعَثَ في مالـه: زێـدەڕۆیی کـرد لـەماڵ بەفیڕۆدان دا.

أنْعَثَ فلان: فلانکەس خۆی ئامـادەکرد بۆسەفەر.

نَعْثَـلَ: سـەرکەوت بەپلیکانـەدا ◦ یـان بەشێوەیەك ڕۆیی وەکوو بەپەیـژەدا سەربکەوێ ◦ یـان وارۆیـشتو قاچـی وا هەڵێنانەوە دەتگوت بەقاچەکانی شت هەڵدەهێنجێ.

نَعْثَـلَ الفَـرَسُ في جريـه: ئەسـپەکە لەغاردان دا قاچەکانی واهەڵێنانەوە دەتگوت لەقوڕ دەریـان دێنـێ، واتـە: بەقورسـی قاچـی بـۆ هـەڵ دەهێنرانەوە.

نَعْثَـلَ الـشیخُ: پیرەمێردەکـە گێـلو ئەحمەق بوو.

النَّعْثَـلُ: نێرەکـەمتیار ◦ پـیرە مێـردی گێل.

النَّعْثَلَةُ: گێلی ◦ دەگـوترێ: (فیـه نَعْثلـةٌ) ڕەوشـتێکی گێلـی تێدایـە ◦ هـەروا ناوە بۆ شێوە ڕۆیشتنی مرۆڤی پیر.

نَعَـجَ نَعْجـاً ونعوجـاً: سـپی بـوو، هـەموو جەستەی سپی بوو ◦ (فهو ناعج).

نَعِجَ نَعَجاً: قەڵەو بوو.

أنْعَـجَ القـوم: خەڵکەکـە مـەڕەکانیان قەڵەو بوون.

النَّعْجَـةُ: مەڕەسپی ◦ مانگا کێـوی (ك: نِعاج ونعجـات) ◦ دەگـوترێ: (نِـساء کنعـاج الرَّمْـلِ) چـەند ئـافرەتێکی جوانو قەشەنگن چاوگەورەو چاو ڕەشن.

نَعَـرَ نَعْـراً ونعـیاً ونعـاراً: هـاواری کـرد، قیژاندی.

**نَعَرَت الريحُ:** ڕەشەبا هەڵیکردو هاژەی هات.

**نَعَرَ العِرْقُ:** دەمارەکە خوێنەکەی فیچقەی کردو کفەی هات.

**نَعَرَ فلان نَعْراً:** فلانکەس سەرپێچی کردو ملی نەدا.

**نَعَرَ في البلاد:** بە وڵات دا هاتو چوو ◊ دەشگوترێ: (ماكانت فِتنة إلا و نَعَرَ فيها فلان) فیتنەو ئاشوبێك بەرپانەبووە ئیللا فلانکەس دەورێکی سەرەکی هەبووە تێیدا.

**نَعِرَ الحِمارُ ونحوه نَعَراً:** گوێدرێژەکە لوشکاندی.

**الناعور:** دەگوترێ: (عِرق ناعور وجرح ناعور) ڕەگێکە خوێنی ناوەستێ یان برینێکە خوێنی ناوەستێو وشك نابێ ◊ باڵو پەری ئاش ◊ دۆڵچەی ئاو هەڵێنجان ◊ ئامێری ئاو هەڵێنجان لەبیرو چاڵی گەورە.

**النّاعورة:** ئامێرێکە چەند دۆڵچەو دۆلابێکی لێ شەتەك دراون بەهۆی ولاخو شتی وا هەڵدەخولێو ئاو لەبیرو چاڵی گەورە دەردەهێنێ.

**النَعْرَةُ:** یەکجار هاوارکردن ◊ فیشکەو لوشکەی کونەلوت.

**نَعْرَةُ النجم:** هەڵبونی باو تاوساندنی گەرما لەکاتی هەڵهاتنی ئەستێرەی (النجم)دا.

**النُّعَرَةُ:** لای ژوروی کونەلوت ◊ مێشەسەگ کە بە ولاخەوە دەنیشێو ئەزیەتی دەدا ◊ هەروا دەچێتە ناو لوتی ئەسپو گوێدرێژەوە حەجمینی لێ هەڵدەگرێ ◊ دەشگوترێ: (في فلان نُعَرَة) فلانکەس فیزو خۆبەزلزانی تێدایە ◊ دەمارگیری پێوەدیارە.

**النَّعّارُ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَعَرَ)دا دێ ◊ دەگوترێ: (جُرْح نعّار) برینێکە خوێنی ناوەستێ خوێنی زۆری لێ دێ ◊ (رجل نَعّار) پیاوێکە فیتنە جۆو ئاشوبگێڕە، هەمیشە خەریکی ئاژاوە نانەوەیە ◊ قۆشمەچیو فێڵباز ◊ هەروا ناوە بۆ باڵندەیەك دەشوبهێتە باڵندەی (کەناری سەوز).

**النَّعورُ:** دەگوترێ: (عرق نعور) دەمارێکە لەکاتی خوێن لێ هاتنی دا کفەی لێ دێ ◊ دەنگی لێ دێ ◊ (ریح نعور) بایەکە لەکاتی سەرمادا گەرمی دێنێ یان لەکاتی گەرمادا هەوا فێنك دەکاتەوە ◊ (سفر نعور) سەفەرێکی دورودرێژە ◊ (همة نعور) ورەو هیمەتێکی بەرز.

**نَعَسَ نَعْساً ونَعَساً ونُعاساً:** هەنۆزی هاتێ

وەنەوز گرتی ○ خەوی هات ○ (فهو ناعس وهي ناعسة).

**نَعَسَ جسمه:** جەستەی لاواز بوو (نَعَسَ رأيه) رایەکەی لاواز بوو.

**نَعَسَت السوق:** بازار شکا، بازارِ کڕینو فرۆشتنی تێدا کەم بوو ○ (نَعَسَ جَدّهُ) شانسی کەوت ○ بێ بەخت بوو.

**أنعَسَ فلان:** فلانکەس منداڵی تەمبەڵو تەوەزەلی بوون.

**أنعَسَ فلاناً:** فلانکەسی واڵێ کرد خەوی بێ هەنۆز بیگرێ.

**تناعَسَ:** خۆی وانیشان دا خەوی دێو هەنۆز گرتویەتی.

**تناعَسَ البَرقُ:** هەورەبروسکە چەخماخەی دا.

**النُّعاسُ:** وەنەوز، هەنۆز ○ لەش داهێزانو شل بوونی ڕەگەو دەمار ○ سەرەتای خەو.

**النَّعْسَةُ:** ساتە خەو، خەوێکی کەم، تۆزە خەو.

**النّعوسُ:** کەسێك زۆر وەنەوز (هەنۆز) بیگرێ.

**نَعَشَ الشَّيْءَ نَعْشاً:** شتەکەی ڕاست کردەوە ○ ڕایپەڕاند ○ دەگوترێ: (نَعَشَ طرفَهُ) چاوی هەڵبڕی ○ (نَعَشَ الشجرة المائلة) درەختە خوارەوە بووەکەی ڕاست کردەوە.

**نَعَشَ فلاناً:** دوای هەژاریی فلانکەسی کەمێ دڵدەداو هێنایەوە تایم ○ یان لەو وەرتەو تەنگانە تێی کەوتووە ڕزگاری کرد فریای کەوت.

**نَعَشَت الجماعةُ الميتَ:** خەڵکەکە مردووەکەیان لەناوەدارەمەیت دا هەڵگرت.

**أنْعَشَهُ:** بەمانا (نَعَشَه) دێ ○ دەگوترێ: (أنْعَشَهُ من كبوته) لەتێکشانەکەی ڕاستی کردەوەو کەمێ وەرەی بەرزکردەوە.

**نَعَّشَهُ:** بەرزی کردەوە، یان پێی گوت: خودا پایەبەرزو تەندروستت بکا.

**إنْتَعَشَ من عثرته:** لەنسکۆیەکەی هەڵسایەوە هەروا دەگوترێ: (إعْتَدَلَ الجوُّ فإنْتَعَشَ الناس) هەوا خۆش بوو خەڵك هێزو توانای پەیدا کردووە.

**المنعوشُ:** دەگوترێ: (ميت منعوش) مردوێکە لەدارە مەیت دا خراوەتە سەرشانی خەڵكو هەڵگیراوە.

**النَّعْشُ:** تەختەیەکە نەخۆشی دەخرێتەسەر یان مردو ○ نابیغە لە دێڕە شیعرێکی دا دەڵێ:

(ألم أقسم عليك لتخبرني
أمحمول علي النعش الهمام)

**بنات النعش:** حەوت ئەستێرەن لەلای قوتبی شیمالییەوە دەبینەدرێنو دەشوبهێندرێن بەکۆمەڵێك کەدارە

مەیتیان هەلگرتبێ.

**النُعَیْش**: ئەستێرەی سوهایە کەیەکێکە لە ئەستێرەکانی (بنات النعش)و لەهەموان خەفەترە.

**نَعْظَلَ**: لەرۆیشتن دا بەملاو لادا خۆی بادا.

**نَعَّ نَعّاً**: لاواز بوو (فهو نعّ).

**النَعاعُ**: رووەکی تەڕو تازەو ناسك کەتازە پێ دەگاو کامڵ نەبوو بێ ٥ تاکەکەی (نعاعة).

**النَعْفُ**: شوێنێکە کەمێك بەرز بێ‌و هەندێ بەرزو نزمی تێدابێ ٥ (ك: نِعاف).

**النَعَفَةُ**: تیلمەچەرمی نەعلە: کە دەکەوێتە پشتە پێ.

**النُعَفَةُ**: لکەمێزەر، پۆپنەی کەڵەشێرو شتی وا ٥ دەگوترێ: (ما أحسن نعَفَة الديك) ٥ هەروا وشەی (النُعَفَة) ناوە بۆ ئەو تیلمە چەرمانەی بەملاو بەولای کورتان‌و زینی ولاخ دا شۆڕدەبنەوەو هەندێ شتی سوارەکەی پێدا هەڵدەواسرێ ٥ گرێ گۆشت‌و کوتەگۆشتی خراپ بوو.

**نَعَقَ الراعي بغنمه**: شوانەکە دەنگی ئاژەڵەکانی داو رایپەڕاندن.

**نَعَقَ في الفتنة**: لەفیتنە نانەوەدا جم‌و جوڵی هەبوو ٥ (فهو ناعق وهي ناعقة) ٥ دەگوترێ: (فلان ناعقة بني فلان).

**النُعّاق**: کەسێك زۆر بقیڕێنێ، زۆر فیتنە جۆبێ.

**نَعَلَ فلاناً**: نەعلی لەپێی فلان کرد.

**نَعَلَ الدابة**: ولاخەکەی ناڵ کرد ٥ شتێکی خستە قاچەکانی بیانپارێزێ.

**نَعِلَ نَعَلاً**: نەعلی لەپێ کرد.

**أنْعَلَت الدابة**: ولاخەکە سپیایی بەپشت سمەکانیەوە دەرکەوت.

**أنْعَلَ الدابة**: ولاخەکەی ناڵ کرد ٥ پێتاو و شتی وای لەسمی ولاخەکە کرد.

**نَعَّلَ الدابة**: ولاخەکەی ناڵ کرد ٥ پێتاو و شتی وای لەسمی ولاخەکە کرد.

**نَعَّلَ الحِذاء أو الخُفَّ**: چەرمی لەبنکی پێلاوەکە یان خوفەکە دا.

**إنْتَعَلَ**: نەعلی لەپێ کرد ٥ دەگوترێ: (إنتعل الأرض) بە پێ کەوتەڕێ‌و ولاخی سواری نەبوو.

**إنْتَعَلَ الشَيْئَ**: پێی لەشتەکە نا ٥ دەگوترێ: (إنتعلت المَطِيُ ظلالها) ولاخەکە بەسەر سێبەری خۆی دا رۆیشت واتە ئەوکاتە خۆر لەناوەراستی ئاسمان بوو.

**تَنَعَّلَ**: نەعلی لەپێ کرد.

**تَنَعَّلَ الشَيْئَ**: شتەکەی کرد بەنەعل.

**المَنْعَلُ والمَنْعلة**: زەوی پتەو ٥ دەگوترێ:

(نَزَلْنا أرْضاً منعلاً) لەزەوییەکی پتەودا دابەزین و نیشتەجێ بووین.

**النّاعِلُ**: پیاوی خاوەن نەعل ٥ مرۆڤی پێڵاو لەپێ ٥ (حافِرٌ ناعِل) سمی ڕەق و قایم ٥ (وهي ناعلة) ئەو ئافرەتە پێستی بەری قاچی ئەستورو پتەوە ٥ هەروا ناوە بۆ کەرکێوی لەم ڕووەوە کە سمەکانی زۆر پتەون.

**النَّعّالَةُ**: نەعل دروستکەر، پینەچی.

**النَّعّالُ**: نەعل دروستکەر.

**النَّعْلُ**: پێڵاو، نەعل ٥ ئاسنێکی کەوانەییە، یا بڵێ جۆرە ناڵێکە بە بزمار لەسمی وڵاخ دەدرێ بۆ پارێزگاری سمی وڵاخەکە ٥ یان پێستێکی بتەوە دەکرێتە قاچی وڵاخەوە بۆئەوەی سمەکانی بپارێزێ ٥ (ك: نِعالٌ).

**نَعْلُ السیف**: ئاسنێکە لەلای خواروی کالانی شمشێرەکەیە ٥ زەوی پتەو و ڕەقەن: کەڕووەکی لێ نەڕوێ ٥ (ك: نِعال) ٥ دەشگوترێ: (إخْضَرَّت نِعال القوم) خەڵکەکە زاو و زێیان زۆربوو ٥ (رَقَّتْ نِعال القوم) خەڵکەکە ژیانیان خۆش بوو.

**النَّعْلَةُ**: نەعل کەبەری قاچ دەپارێزێ لەچڵ و ئازار.

**نَعِمَ الشَّيْئُ نَعماً ونَعْمَةً ونعيماً**: شتەکە نەرم و نیان بوو ٥ تەڕو تازە بوو ٥ سێبەری خۆش بوو ٥ دەگوترێ: (نَعِمَ عَيْشُهُ) ژیانی خۆش بوو ٥ (نَعِمَ بالُه) دڵی داسەکناو ئارامی گرت.

**نَعِمَ به**: پێی کەیف خۆش بوو ٥ دەگوترێ: (نَعِمْتُ بلقائه) دڵخۆش بووم بەچاوپێکەوتنی و لەنزیکەوە دیتنی ٥ (نعمت به عيناً) چاوی پێی فێنك بۆوە.

**نَعُمَ نعومةً**: نەرم و نۆڵ بوو ٥ نەرم بۆوە ٥ (فهو ناعم).

**نِعْمَ**: فیعلێکە لە فیعلەکانی مەدح و زەم ٥ دەگوترێ: (نِعْمَ الغني ونِعْمَ الفتى).

**أنْعَمَ فلان**: فلانکەس ئازونیعمەتی دایەو زۆری کرد ٥ کەوتە ناو نازو نیعمەتەوە.

**أنْعَمَ الريحُ**: بایەکە بەهێواشی هەڵبوو.

**أنْعَمَ عليه بكذا**: ئەوەی پێ بەخشی ٥ دەگوترێ: (أنْعَمَ الله عليه بمال كثيرة وصحة وافرة) خودا ماڵی زۆرو تەندروستی زۆری پێ بەخشیوە.

**أنْعَمَ له**: پێی گوت بەڵێ.

**أنْعَمَ فلاناً**: فلانکەسی خۆشگوزەران کرد ٥ دەگوترێ: (أنْعَمَ الله بك عيناً) خودا چاوت بەدیتنی خۆشەویستانت فێنك بکاتەوە.

**أنْعَمَ الشَّيْئَ**: شتەکەی نەرم کردەوە.

**أنْعَمَ العجينَ أو الدواءَ:** زێدەڕەوی کرد لەشێلانی هەویرەکە یان دەرمانەکە.

**أنْعَمَ النظرَ في الأمر:** زۆر لەکارەکە ورد بۆوەو سەرنجی لێ دا.

**ناعَمَ فلان:** فلانکەسی ژیان خۆش کرد.

**ناعَمَ الشَّيْءَ:** شتەکەی پتەو کرد.

**نَعَّمَ فلان:** فلانکەس وتی بەڵێ.

**نَعَّمَ فلاناً:** فلانکەسی گوزەران خۆش کرد.

**نَعَّمَ الشَّيْءَ:** شتەکەی نەرمو نیان کرد.

**تناعَمَ:** خۆشی گوزەراند.

**تَنَعَّمَ في مشيه:** بەپێخواسی ڕۆیشت ٥ دەگوترێ: (أتاهم مَتَنَعِّماً) هات بۆلایان بەپیادەو ولاخی سواری پێ نەبوو.

**تَنَعَّمَ فلاناً:** لەفلانکەس گەڕاو هەوڵی دا بیدۆزێتەوە.

**تَنَعَّمَ الدابة:** لە ولاخەکەیەوە ژەنیو تاوی دا بۆئەوەی خێرا بڕوا ٥ دەشگوترێ: (أتيت أرضهم فَتَنَعَّمَتْني) هاتمە خاکەکەیان و ئاو و هەواکەی پێم کەوتو ژیانێکی خۆشم تێدا بەسەربرد.

**الإنعام:** عەتاو بەخشش.

**الإنعامة:** بەمانا (الإنعام) دێ.

**المُتناعِمُ:** دەگوترێ: (نبات متناعم) ڕوەکێکی ڕاست هەڵچووە ٥ (رجل متناعم) پیاوێکی دەوڵەمەندو گوزەران خۆشە.

**المُنَعَّمُ:** دەگوترێ: (رجل مُنَعَّمٌ) پیاوێکی دەوڵەمەندو گوزەران خۆشە (کلام مُنَعَّمٌ) قسەی نەرمو نیان ٥ (شيئ مُنَعَّمٌ) شتەکە زۆر وردکراوە زۆر کوتراو و هاڕاوە.

**الناعِمُ:** دەگوترێ: (ثوب ناعِمٌ) قوماشێکی نەرمە ٥ (نبات ناعِمٌ) ڕوەکێکی ڕاستو هەڵچووە.

**النّاعِمة:** مێینەی (الناعِم)ە ٥ دەگوترێ: (طير ناعِمة) باڵندەی سیمانو نەرمو نیان ٥ (ثيابٌ ناعِمة) قوماشی نەرم ٥ باغچە.

**النَّعائِم:** مەنزڵێکە لەمەنزڵەکانی مانگ لەشێوەی نوعامەدایە ٥ هەشت ئەستێرەن قۆناغێك لەقۆناغەکانی مانگیان لێ پێك دێ.

**النَّعامَة:** باڵندەیەکی جەستە گەورەیە مل درێژو قاچ درێژە کلکی کورتە، بازی درێژ دەهاوێو بۆ ڕۆیشتن ئازایە پێی دەگوترێ شوترمورغ ٥ شێوەی لەنێوان شێوەی حوشترو قەلەمون دایە ٥ (ك: نِعام ونعائم) ٥ دەشگوترێ: (فلان ظِل نعامة) فلانکەس درێژە ٥ (خَفّت نعامة

القــوم) خەڵکەکــە ڕەویــان کــردو ڕۆیــشتن ٥ (جـــاء کالنعامـــة) بەنائومێـدی گەڕایـەوە ٥ (شـالت نعامته) مـرد ٥ (هـو خفیـف النعامـة) ئەو عـەقڵ سوکە ٥ (رکـب جنـاحي نعامة) بەدڵسۆزی کارەکەی ئـەنجام ا هەروا وشـەی (النعامة) نـاوە بـۆ ئـەو نیـشانەو کەڵەکـە بـەردو سـنگ چەقاندنو شتی وا کە بـۆ شارەزایی بەڕێگای چۆڵ دا بەکاردەهێنـدرێن ٥ چەتری سەربیرو شتی وا.

النُعـامی: دەگـوترێ: (نُعامـاك أن تفعـل کـذا) دەخیلـت بم تـابوێت دەکـرێ ئەوە مەکە.

نُعــامی عــین: ئـەوەم لەبـەر خـاتری دووچاوی جـەنابت ئـەنجام دا ٥ بـای باشـور، بۆیـە بـەم جـۆرە بایـە دەگـوترێ: (نعـامی) چـونکە لـەنیوە دورگـەی عـەرەبی دا تـەڕترین بایـە نماوی ترین بایە.

النُعْمُ: گوزەرانی خۆشو ساماندارى ٥ دەگـوترێ: (نُعْـمَ عــین) ئـەو شـتە لەبەرخاتری چاوی تۆ دەکەم.

الــنَّعَمُ: ئاژەڵێـك بۆخـۆی بلـەوەڕێو پێویستی بەئالف نـەبێ بـەزۆری بـۆ حوشـــتر بـــەکاردێ ٥ (ك: أنعـــام وأناعیم).

نَعَم: حەرفی جەوابە بەمانا (بەڵێ) دێ.

النَّعْماءُ: دابـەزین لـە ڕەوشتی بـەرز ٥ ماڵو سامان.

النُّعْمی: بەمانا (النّعماء) دێ.

النَّعْمَةُ: نازونیعمەتو گوزەرانی خۆش ٥ دەگـوترێ: (هو في نَعْمة عیش) ئـەو لەخۆشـــگوزەرانی دایـــە ٥ هـــەروا دەگوترێ: (أفعله نَعْمةَ عین) ئەو کارە لەبـەر خـاتری چـاوی تـۆ ئـەنجام دەدەم.

النِّعْمَـــةُ: ئــەو نــازو نیعمــەتو ڕزقو ڕۆزیو مـاڵو سامانەی خـودا دەیـدا بەبەنـدەکانی ٥ وەزعو حـاڵی خـۆش ٥ پیـاوەتیو بـەهانا هـاتنی کەسـانی تــرەوە ٥ (ك: نِعَـــم وأنعُـــم) ٥ دەشگوترێ: (أفعله نِعْمَـة عـین) ئـەوە لەبـەرخاتری چـاوی تـۆ ئـەنجام دەدەم.

النُّعُومة: نەرمو نۆڵی.

النَّعیم: ئـەوەی لـەزەتی لێ دەبینـدرێ ٥ ژیانی خۆش ٥ وەزعو حاڵـەتی بـاش ٥ دڵخۆشـی ٥ دەگـوترێ: (هـو نعـیم المال).

نَعْنَعَ: لەزوبانی دا جۆرە گنیەك هەبوو نەیدەتوانی بەباشی پیتـی (ن)و (ع) دەرببڕێ.

تَنَعْنَــعَ: دوورکەوتــەوە، دەگــوترێ: (تَنَعْنَعَـــت الـــدار) خانوەکـــە دوورکەوتــەوە ٥ (وتَنَعْنَــعَ عنـــه)

لەخانوەکە دوورکەوتەوە.

**النَّعْناعُ**: پنگ، جۆرە ڕوەکێکی گیایی بۆنخۆشە چەند جۆری هەیە، هەندێکی خۆڕسکە، هەندێکی دەروێندرێ لەشوێنی تەڕو دەم جۆگاو نزیك ئاو دەڕوێ.

**أقراص النّعناع**: کورسی نەعنا، حەڵوایەکە ئاوی پنگی تێدەکرێ بۆنی خۆش دەبێ ٥ (ماء النّعناع) ئاوی نەعنا ئەوەیە کە بەشێوەی تایبەتی ئاوی پنگەکە دڵۆپ دڵۆپ دەگیرێ.

**النَّعْنَع**: نەعنا ٥ دەشگوترێ: (رجل نعناع) پیاوێکی درێژی ناقۆڵاو شڵو شێواوە ٥ (ك: نَعانِعُ).

**النُّعْنُعَةُ**: چڵێدانە.

**نعا السِّنور نُعاءً**: پشیلەکە میواندی.

**النُّعْوُ**: کەوانەی ژێر لوت ٥ درزی لێوی حوشتر ٥ یان درزی سمی حوشتر.

**نَعى فلاناً نَعْياً ونَعِياً**: هەواڵی مردنی فلانکەسی بڵاوکردەوە ٥ دەگوترێ: (نعاه لنا ونعاه إلينا) هەواڵی مردنی ئەوی پێ ڕاگەیاندین ٥ هەروا دەگوترێ: (هو يَنْعى على فلان كذا) ئەو ڕەخنەی ئەوەو ئەوە لەفلانکەس دەگرێ ٥ (فلان ينعى على نفسه بالفواحش) فلانکەس بەئاشکراو لەبەرچاوی خەڵك کاری خراپو ناپەسەند دەکا خۆی بەخراپەکار ناوزەد دەکا.

**أنعى عليه قَبيحاً**: کارێکی ناشیرینی لێ بڵاو کردەوەو لێی لەهەرادا بۆئەوەی بەخۆی دا بچێتەوەو لەو کارە خراپە دوور کەوێتەوە.

**تناعى القومُ**: خەڵکەکە هەواڵی کوژراوەکانی خۆیان ڕاگەیاند بۆئەوەی خەڵکەکە هەڵنێن بۆ تۆڵە سەندنەوەو بەرگری کردنو پەلاماردانی دوژمن.

**إستنعى القومُ**: خەڵکەکە هەواڵی کوژراوەکانیان ڕاگەیاند ٥ هەروا دەگوترێ: (نزلت فاجعة فاستنعى القومُ) بەڵایەك پەیدابوو خەڵکەکە هەواڵی مردنی یەکتریان ڕاگەیاندو پەرتەوازە بوون.

**إسْتَنعى الراعي غَنَمَهُ**: شوانەکە پێش مەڕەکە کەوتو بانگی کردن بۆئەوەی دوای بکەون ٥ هەروا دەگوترێ: (إستنعى بفلان حُبُّ كذا) خۆشەویسی فلان شت لەدڵی فلان کەسەی کردوو ڕەگی داکوتا.

**المَنعى والمَنعاةُ**: هەواڵی مردن.

**النّاعي**: ئەو کەسەی هەواڵی مردن ڕادەگەیەنێ ٥ ئەو کەسەی ڕێوڕەسمی مردوناشتن ئەنجام دەدا.

النَّعْيُ: بلاوبوونەوەی هەواڵی مردنی کەسێك.
النّعيُّ: دەگوترێ: (بلغنا نَعيُّ فلان) هەواڵی مردنی فلانمان پێ گەیی.
المَنْعِيُّ: پیاوی مردوو ٥ (ك: نعايا).
نَغَبَ الطائر نَغْباً: باڵندەکە دەندوکی لەئاوەکەداو لێی خواردەوە.
نَغَبَ الماءَ: ئاوەکەی قوت دا، خواردیەوە.
نَغَبَ الريقَ: تفەکەی قوت دا.
النُّغْبَةُ: قومەئاوو شتی شلەمەنی ٥ دەگوترێ: (سَقَاهُ نُغْبَةً من لبن) قومە شیرێکی دەرخوارد دا.
نَغَتَ الشَّعْرَ نَغْتاً: قژی ڕاکێشا.
نَغَرَت القِدْرُ نَغراً ونغراناً: مەنجەڵەکە کوڵیو قڵپەی دا.
نَغَرَ فلان: فلانکەس بەهۆی ڕق هەڵسانەوە دەرونی دەکوڵا.
نَغَرَ الدَّمُ: خوێنەکە فیچقەی کرد.
نَغِرَت القِدْرُ نَغَراً: بەمانا (نَغَرَتْ) دێ.
نَغِرَ فلان: بەمانا (نَغَرَ) دێ.
أنْغَرتِ البيضَةُ: هێلکەکە پیس بوو، کەڵکی خواردنی نەما.
أنْغَرَت الشاةُ: مەڕەکە لەگەڵ شیر لێ دۆشینی خوێنی لێ هاتە دەر.
نَغَّرَ منه وبه: هاواری کرد، هاواری لێ هەڵسا.
نَغَّرَ الصبي: دیقەدیقەی منداڵەکەی دا، هەڵی پەڕاند.
تناغَرَ القومُ: خەڵك لێك دڕ دۆم بوون.
تَنَغَّرَ جوفه: دەروونی لەرقا کوڵا.
تَنَغَّر عليه: لێی دڕدۆم بوو ڕقی لێ هەڵسا.
المِنْغار: (شاة منغار) مەڕێکە هەمیشە شیرەکەی تێکەڵ بەخوێن دەبێ، کەشیری لێ دەدۆشن خوێنی لەگەڵە.
النَّغْرُ: سەرچاوەی ئاوی سوێر.
النُّغَرُ: بێچوە چۆلەکە ٥ بولبول.
النُّغارُ: بۆ زێدەڕۆیی لەماناى (نَغَرَ) دێ ٥ دەگوترێ: (جرح نَغّار) برینێکە خوێنی لێ دێ.
نَغَزَ بين القوم نَغْزاً: خەڵکەکەی لەیەکتر هان داو دوژمنایەتی خستە نێوانیانەوە.
نَغَزَ فلاناً: غەیبەتی فلانکەسی کرد.
نَغَزَ الصبي: دیقەدیقەی منداڵەکەی دا.
النَّغّازُ: دەگوترێ: (فلان نَغّاز) فلانکەس زۆر غەیبەتکەرە.
نَغَشَ نَغْشاً ونَغَشاناً: لەشوێنی خۆی جولا ٥ دەگوترێ: (سُقِيَ فلان فَنَغَشَ) کابرا لەهۆش خۆی چوبوو ئاوی درایە جەمو جوڵی تێکەوتەوە.
نَغَشَ الى فلان: مەیلی بۆلای فلانکەس کرد.
إنْتَغَشَ: دەگوترێ: (الدار تَنتَغِشُ صبياناً)

خانوەکە جمەی دێ لەمناڵ.
تَنَغَّشَ فلان: فلانکەس دوای ئەوەی بێهۆش بوو جمو جوڵی تێکەوتەوە ٥ بەئەسپایی و لەسەرخۆ کەوتەوە جمو جوڵ.
النُّغاش من الرجال: پیاوی کورتە بالاو زۆر زەعیف و سست ٥ کەم ئەندام ٥ دەگوترێ: (رجل نُغاشيٌّ).
النُّغاشَةُ: جۆرە چۆلەکەیەکە دەندوك سوورە.
نَغَصَ علیه نَغْصاً: لێی لیڵ کرد.
نَغَصَ فلاناً: بەشە ئاوەکەی لەفلانکەس مەنع کرد.
نَغِصَ الأمرُ نَغَصاً: کارەکەی تەواو نەکرد.
نَغِصَ الشارِبُ: شلەمەنی خۆرەوەکە خواردنەوەکەی تەواو نەکرد.
نَغِصَ الرجلُ: پیاوەکە مەبەستەکەی تەواو نەبوو.
أنْغَصَ فلاناً رِعْیَهُ: بەشەکەی لەفلانکەس مەنع کرد ٥ نەیهێشت ولاخەکانی بلەوەڕێنێ.
أنْغَصَ علیه عیْشَهُ: ژیانی لێ لیڵ کرد.
نَغَّصَ فلاناً: ژیانی فلانکەسی لیڵ و تاڵ کرد.
نَغَّصَ علیه عیشه: ژیانی لێ تاڵ کرد.
نَغَّصَ علینا فلان: فلانکەس ئەوەی پێمان خۆش بوو زۆرمان لێی هەبێ لێی مەنع کردین.
تناغَصَت الدوابُ علی الحوض: ئاژەڵەکان لەسەر حەوزەکە پاڵەپەستۆیان کرد.
تَنَغَّصَتْ معیشته: ژیانی تاڵ و لیڵ بوو ٥ دەشگوترێ: (تَنَغَّصَتْ علیه معیشته).
نَغَضَ الشيْئُ نَغْضاً ونَغَضاناً: شتەکە کەوتە جمو جوڵی زۆر و هەڵبەز و دابەز ٥ دەشگوترێ: (نَغَضَ سرج الحصان) زینی ئەسپەکە کەوتە هەڵتەك هەڵتەك (نَغَضَت ثنیة الغلام) ددانی منداڵەکە کەوتە لەقین.
نَغَضَ السَّحابُ ونحوه: هەورەکە زۆربوو پاشان پڕ بوو.
نَغَضوا الی العدو: ڕووبەڕووی دوژمن ڕاپەڕین.
نَغَضَ برأسه: لەسەر سوڕمانی خۆی لەشتەکە سەری بادا.
أنْغَضَ رأسَهُ: لەسەر سوڕمانی خۆی سەری بادا.
تَنَغَّضَ الشيْئُ: شتەکە کەوتە هەڵبەز و دابەز.
النّاغِضُ من الإنسان: بنکی مل ئەو شوێنەی کەلەگەڵ سەردا دەجوڵێ ٥ دەشگوترێ: (غَیْمٌ ناغِض) هەوری پڕو جمو جوڵ کەر کەبەشوێن

یەکدا دێن و دەڕۆن.

**السَّنَّغْضُ**: کەسێك سەری بلەرزێ و لەرۆیشتن دا بلەرزێ ◦ بێچوە نوعامە (شوتور مورغ).

**النُّغْضُ**: لای ژوروی دەفەی شان.

**النُّغَاضُ**: بۆ زێدەرۆیی لەمانای (نغض)دا دێ ◦ دەشگوترێ: (سَحابٌ نغّاض) هەورێکی نەوەستاوە یەك لەدوایەك دێن و دەرۆن.

**نَغِفَ نَغَفاً**: کرمی زۆر بوو.

**النَّغَفُ**: کرمێکە لەلوتی حوشترو ڕەشە ولاخ و مەڕو بزن دا پەیدا دەبێ ◦ هەروا ناوە بۆ جۆرە کرمێکی درێژ سورو بۆرو سەوزە لەژێر گڵەوە ڕەگی ڕوەك دەقرتێنێ ◦ هەروا ناوە بۆ چڵمە ڕەقەڵە: کەناەدەمیزاد لەلوتی دەری دێنێ.

**نَغَقَ الغُرابُ نُغاقاً ونَغيقاً**: قەلەڕەشەکە قیڕاندی ◦ (فهو ناغِق ونغّاق).

**نَغَقَت الناقة**: حوشترەکە بۆ بێچوەکەی کورکاندی و بە دەنگێکی زۆر نەرم بۆی باراند ◦ (فهي نغيق نغوق).

**نَغِلَ وجْهُ الأرض نَغَلاً ونَغْلَةً**: ڕوی زەوی بەهۆی وشکە ساڵی و کەمئاوییەوە لێك هەڵتەکی.

**نَغِلَ الأديمُ**: چەرمەکە بۆگەنی کردو دەباغەکەی تێکچوو.

**نَغِلَ الجرحُ**: برینەکە داوەشا ◦ دەشگوترێ: (نَغِلَت نيته) نیازی خراپ بوو ◦ (نَغِلَ قلبه على فلان) دڵی فلانکەس کرمێ بوو.

**نَغِلَ بين القوم**: فیتنەیی لەناو خەڵکەکە دا کرد (فهو نَغِلٌ وهي نَغِلَةٌ).

**نَغُلَ المولود نغولة**: زارۆکە لەدایکبووەکە منداڵی زینایەو دایکی و باوکی نیکاحی شەرعییان لەنێوان دا نەبووە.

**أنْغَلَ الأديمَ**: پێستەکەی واڵێ کرد بۆگەن بکا.

**أنْغَلَ فلاناً حديثاً سمِعَه**: قسەیەکی فیتنە ئامێزی بۆفلانکەس گێڕایەوە.

**النَّغِلُ**: منداڵی لەزینا پەیدا بوو (زۆڵ) ◦ دەشگوترێ: (جوزة نَغِلَة) گوێزێکی پوچەڵە.

**النَّغيلُ**: زۆڵ، منداڵی پەیدابوو لەبەیەکگەیشتنی ناشەرعی پیاو و ئافرەت.

**نَغَمَ نَغْماً**: بەهێواشی قسەی کرد ◦ دەگوترێ: (سكت فما نَغَمَ بحرف) بێدەنگ بوو ورتەی لەدەم دەرنەهات.

**نَغَمَ في الغناء**: لەگۆرانی وتن دا گەرم بوو.

**نَغَمَ في الشراب**: کەمێکی لەشەرابەکە خواردەوە.

**ناغَمَهُ**: بەئەسپایی قسەی لەگەڵ کرد.

**تَنَغَّمَ**: بەمانا (نَغَمَ) دێ.

**النَّغَّامُ**: زۆر گۆرانی بێژ.

**النَّغْمَةُ**: جەرەسی وشە ە دەنگ خۆشی لەقورئان خوێندن‌و شتی تردا ە دەنگی کاریگەر ە (ك: أنغام وأناغيم).

**النُّغْمَةُ**: قومێك ە (ك: نُغَمٌ).

**النَّغومُ**: دەگوترێ: (رجل نغوم) پیاوێکی دەنگ خۆشە.

**نَغْنَغَ**: نەخۆشی توشی ئاڵوی بوو، بینەخرەی توش بوو.

**النُّغْنُغُ**: زمانە بچکۆلە، ئەوپارچە گۆشتەی لای لەوزەتێنە ە ئەوەی لەژێر دەندوکی کەڵەشێرەوە وەکوو ریش وایە ە هەوکردنی جەستە بەشێوەیەك شل بێ ە گێلی لاواز ە (ك: نغانغ).

**النُّغْنُغَةُ**: بەمانا (النُّغْنُغ) دێ ە ئافرەتی گێل‌و نەحمەق.

**النَّغْنَغَةُ**: پارچە گۆشتێکە لای سەروی قورگ لەلای لەوزەتێن.

**نَغَى نَغْياً**: بەشێوەیەك ئاخاوتنی کرد کەس لێی حاڵی نەبوو ە دەگوترێ: (نغى الى فلان بكلمة) وشەیەکی بەگوێچکەی فلانکەسدا دا.

**ناغى الصَّبِيَّ**: یاری لەگەڵ منداڵەکە کرد، بەهێواشی‌و نەرم‌و نیانی لەگەڵی دا جوڵایەوە.

**نَغَى فلاناً**: بەقسەیەك لەگەڵ فلان دوا کەکەس لێی حاڵی نەبوو ە دەشگوترێ: (هذا الجبل يُناغي ذاك) ئەو کێوە سەری ناوە بەو کێوەوە دەڵێی چپەی لەگەڵ دەکا ە هەروا دەگوترێ: (كاد الموجُ يناغي السحاب) شەپۆلەکە ئەوەندە بەرزبۆوە خەریکە نزیك هەور ببێتەوە.

**النَّاغِيةُ**: وشەو قسە.

**النُّغْيَةُ**: بەمانا (الناغية) دێ ە هەردەنگ‌و قسەیەك سەرنج ڕاکێش بێ ە یەکەمجار کە هەواڵ دەبیسرێ‌و هێشتا دڵنیانی لەڕاستی‌و دروستی‌و نەچەسپاوە ە دەگوترێ: (سمعت نَغية من كذا وكذا) واتە: شتێکم لە هەواڵەکە بەرگوێ کەوتووە بۆم ساغ نەبۆتەوە ئاخۆ وایە یان نا.

**النُّفَاُ**: پارچەو کۆمەڵە ڕوەکی جیاجیاو پەرتەوازە ە تاکەکەی (نُفاةٌ).

**نَفَتَ المِرْجَلُ ونحوه نَفْتاً ونفتاناً**: مەنجەڵەکە یان دیزەکە بەهۆی زۆر کوڵانەوە پریشکی وا دەهاوێ دەڵێی تیرە.

**نَفَت الدقيقُ نحوه نَفْتاً**: ئاردەکە کەئاوی بەسەردا کرا هەڵاوساو قشەڵ بوو (فهو نافت ونفوت).

**تنافَتَ**: ئاوەکوڵاوەکە پریشکی یەك لەدوایەکی هاویشتن.

**نَفَثَ نَفْثاً ونَفَثاناً:** فوی پێدا کرد فوی بەسەردا کرد ٥ دەگوترێ: (نَفَثَ الراقي في العُقْدَة) فالْ خوێنەکە فوی بە گرێیەکەدا کرد ٥ (فلان يَنفُثُ غَضَباً) فلانکەس لەرق هەڵساوی خۆی فیشکەی دێ، هەر فو بەبا دەدا.

**نَفَثَ في أذنه:** قسەی بە چرپەی بەگوێی دا دا ٥ بەهێواشی سەری بردە بن گوییەوەو قسەی لەگەڵ کرد.

**نَفَثَ الشَّيْئَ من فيه:** قسەی هاویشت ٥ دەشگوترێ: (الجرحُ يَنفِثُ الدمَ) برینەکە خوێن فڕێ دەدا ٥ (الحية تنفث السُّمَ) مارەکە ژەهر دەڕێژێ ٥ (نُفِثَ في روعي كذا) فلان شت بەدڵمداهات خرایە دڵمەوە.

**نَفَثَ فلاناً:** سیحرو جادوی لەفلان کرد ٥ (فهو نافِث ونفاث) ٥ (وهي نافثة ونفّاثة) ٥ وشەی (النافثة) کۆیەکەی (النفّاثات)ە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ﴾.

**النُّفَاثَةُ:** ئەوەی دڵتەنگ دەری دەبڕێو لەدەمی دێتەدەر ٥ ئەو خواردنەی بەکەلێنو کونی دەمو ددانەوە دەمێنێتەوە فڕێی دەدا ٥ دەشگوترێ: (هذا من نفاثات فلان) ئەمە لەشیعری فلانە.

**النَّفْثَةُ:** دەگوترێ: (هذه نَفثَة مصدور) ئەمە کورکاندنو ناڵەو فیغانی دڵتەنگە، دەیەوێ بەم کورکاندنە تۆزی غەم بەباداو ئارامی بەدڵی بدا ٥ (ك: نَفَثات) دەگوترێ: (هذا من نفثات فلان) ئەمە لەشیعری فلانە.

**النَّفّاثَةُ:** فڕۆکەیەکی تیژڕەوە، لەفڕین دا پشت بە چڕی هەوا دەبەستێ، واتە: (تەیارەی نەفاسە).

**نَفَجَ الشَّيْئُ نَفْجاً ونفوجاً:** شتەکە بەرز بۆوە.

**نَفَجَ فلان:** فلانکەس شانازی بەشتێك کرد کەنیەتی.

**نَفَجَ الإرنب ونحوه:** کەروێشکەکە ڕاپەڕیو کەوتە بازدان.

**نَفَجَت الريحُ:** بایەکە بەشێوەی گێژەڵوکەو زریان هەڵبو.

**نَفَجَ الفروجة من بيضتها:** جوچکەکە لەهێلکەکە هاتەدەرەوە.

**نَفَجَ الشَّيْئَ نفجاً:** شتەکەی بەرز کردەوە.

**نَفَجَ فلاناً:** فلانکەسی بەگەورە زانی.

**نَفَجَ السِّقاءَ:** کوندە ئاوەکەی پڕکرد.

**نَفَّجَ الإرنب:** کەروێشکەکەی لەلانەکەی خۆی دەرپەڕاند.

**أنْفَجَ الحالِبُ:** شیر دۆشەکە قاپەکەی دوور لەگوانی ئاژەڵەکە ڕاگرت بۆئەوەی کە شیرەکەی دۆشییە ناوی کەف بکا.

**إنْتَفَجَ وتَنَفَّجَ:** بەمانا (نَفَجَ) دێ.

إسْتَنْفَجَ الإرنب ونحوه: کەروێشکەکەی لەلانەکەی دەرپەڕاند، دەشگوترێ: (ماالذي إستَنفَجَ غَضَبَه) چی وا ڕقی هەڵسان‌و جامی غەزەبی پڕکرد.؟

المِنْفَجُ والمِنْفَجَةُ: ئەو شتەیە هەندێ ئافرەت دەیخەنە سەر سمتی خۆیان بۆنەوەی سمتیان گەورە بنوێنن.

النافِجُ: دەگوترێ: (هو نافِج حِضنيه) ئەو خۆی بەزل زانی‌و لوتبەرزی نواند ٥ (صوت نافج) دەنگی زل‌و گڕو ناخۆش.

النّافِجة: ڕەشەبای بەهێز ٥ دەگوترێ: (سحابة نافجة) هەورێکی پڕباران ٥ ئەو کوندیلەو زەرفەی مادەی میسکی تێدایە لەجستەی ئاسك دا ٥ (ك: نوافِج).

النُفُجُ: ئادەمیزادی قونگران‌و تەمبەڵ ٥ دەگوترێ: (هو نفج الحقيبة) ئەو سمت پان‌و زلە.

النَّفّاج: خۆبەزلزان‌و لوتبەرز ٥ ئەو کەسەی لافی شتێك لێ دەدا کەنیەتی.

النَّفّاجَة: پەراوێزو شوێنی دادڕاوی کراس کە قۆپچەکانی پێوە دەنرێن.

النَّفيجُ: بێگانەیەك بکەوێتە ناو قەومێکەوە بێوەی بێ نەچاکەی هەبێ نەخراپە ٥ (ك: نُفَجٌ).

النَّفيجَةُ: کەوانێك لەدرەختی (النَّبع) دروست کرابێ (جۆرە درەختێکە لەبەرزایی کێو و شوێنی وادا دەڕوێ دارەکەی سەرەتیرو شتی وای لێ دروست دەکرێ) ٥ (ك: نفائج).

نَفَحَت الريح نَفْحاً ونفوحاً: بایەکە هەڵی کرد، جوڵایەوە.

نَفح العِرْق نَفْحاً: دەمارەکە خوێنی لێ هات ٥ دەشگوترێ: (نَفَحَ الطيبُ) بۆنەخۆشەکە بڵاو بۆوە.

نَفَحَ الشَّيْئَ: شتەکەی لێ دوور خستەوە.

نَفَحَت الدابة الشَّيْئَ: وڵاخەکە بەتیزایی سمی لەشتەکەی دا.

نَفَحَ فلاناً بالمال: ماڵی دا بەفڵانکەس (نَفَحَ فلاناً بالسيف) بەشمشێر لەفڵانکەسی دا بەڵام بەهێواشی.

نَفَحَ اللَّبَنَ: ماستەکەی هەژاند.

نَفَحَ الجُمَّةَ: پێشەسەری داهێناو بەشانەی کرد.

نافَحَ عنه: داکۆکی لێ کرد.

نافَحَ فلاناً: بەرهەڵستی فڵانکەسی کرد، دژی وەستا.

إنْتَفَحَ بە: ڕەخنەی لێ گرت، کۆسپی خستە بەردەمی.

الأنفحة: ڕوەکێکە وەکوو باینجان ٥ بەشێکە لەمەعیدەی گۆلکەڵەو کارو بەرخ ٥ مادەیەکی تایبەتییە لەدیوی

ناوەوەی گەدەی گوڵكەڵەو كاریلەو بەرخۆلە دەردەهێندرێ پێی دەگوترێ: (شیلوا وك) شیری پێ دەكرێتە پەنیر.

**الإنفَحَة:** (إنفحة العجول) شیلواوك.

**المِنفَحُ:** كەسێك خۆبخاتە كارێكەوە كە پەیوەندی بەئەوەوە نیە خۆ لەشتێك هەڵقورتێنێ كەهیچ پەیوەندی بەوەوە نەبێ.

**النُّفْحُ:** سەرما ٥ پێچەوانەكەی (اللّفح) واتە: گەرما.

**النَّفْحَة:** بۆنێك كەدڵ پێی خۆش بێ ٥ دەشگوترێ: (أصابتنا نفحة من عذاب ربك) هەروا وشەی (النّفحة) بەمانا بەخشش دێ ٥ دەگوترێ: (لایزال لفلان نفحات) تا ئێستا فلانكەس بەخششی هەیە.

**النَّفُوحُ:** زۆرسارد ٥ دەشگوترێ: (ضرع نَفوحٌ) گوانێكە شیر ناگرێتەوە، شیری تێناوەستێ ٥ (بقرة نفوح) مانگایەكە بەبێ دۆشین شیری لێ دەرژێ ٥ (قوس نفوح) كەوانێكە تیر دوور دەهاوێ ٥ (ریح نفوح) ڕەشەبایەكی بەهێزەو شت هەڵدەدا.

**النَّفیحُ والنِّفّیحُ:** بەمانا (المِنفَحُ) دێ.

**نَفَخَ بفمه نَفْخاً:** فوی تێ كرد بەدەمی بای تێكرد.

**نَفَخَ في البوق أو الیراع:** بەهەموو هێزی فوی بە زوڕناكەدا كرد بۆئەوەی دەنگی لێ بێ.

**نَفَخَ الشیطانُ في أنفه:** شەیتان بای تێكردو هەڵینا بۆ ئەوەی خۆی بەزل بزانێ ٥ لافی شتێك لێ بدا كەنیەتی.

**نَفَخَ الشَّيْءَ:** فوی لەشتەكە كرد، بەفو هەڵی دا.

**نَفَخَ النار:** فوی لەئاگرەكە كردو هەڵی ساند ٥ یان بەمۆشە دەمەو پانكەو شتی وا فوی لەئاگرەكە كردو پشكۆكانی گەشاندنەوە.

**نَفَخَ الطعامُ ونحوه فلاناً:** خۆراكەكە ورگی فلانكەسی پڕكرد ٥ دەشگوترێ: (نَفَخَ شِدقیة أو حِضنَیه) لوتبەرزیی نواندو خۆی بەزلزانی.

**نَفِخَ نَفَخاً:** توشی نەخۆشی باكردن بوو، ورگی بای كرد.

**نَفَّخَ بفمه:** بۆزێدەرۆیی لەمانای (نَفَخَ)دێ.

**إنتَفَخَ الشَّيْءُ:** شتەكە بەرزبۆوە ٥ دەگوترێ: (إنتَفَخَ النهارُ) ڕۆژهەڵكشاو بەرز بۆوە.

**إنتَفَخَ فلان:** فلانكەس خۆی بەزل زانیو لوتبەرزی نواند.

**إنتَفَخَ علیه:** ڕقی لێ هەڵسا.

**المِنفاخُ:** موشەدەمە ٥ هەرشتێك هەوا

کۆبکاتـەوەو ئاراستەی بکا ٥ وەکوو ئـەو ئـامێرەی ئاسـنگەرو مزگـەر خـەڵوزی پـێ دەگەشـێننەوە ٥ (ك: منافِخ).

المِـنْفَخُ: بـەمانا (المِنْفـاخ) دێ ٥ (ك: منافِخ).

المنفوخ: (رجل منفوخ) پیاوێکی قەڵەو و خۆگەیە ٥ یان ترسنۆکە.

النّافِخُ: دەگوترێ: (مابالدار نافخ) کەس لەخانوەکەدا نیە.

النَّفْخُ: شانازیو خۆبەزلزانی.

النَّفَخُ: هەوکردنو هاوسانێکە لەزەنگی (زنـد)ی وڵاخ دا پەیـدا دەبـێ ٥ نەخۆشییەکە توشی گون دەبێ پێی دەگوترێ: (قۆرِیی).

الـنُّفُخُ: هـەرەتی گـەنجی ٥ دەگـوترێ: (فَتیً نُفُخٌ وفتاةٌ نُفُخٌ).

النُّفْخـاءُ: لای زۆروی ئێـسقانی قـاچ ٥ زەوییەکی بەرزو بەپیت، نە لمبەڵان بـێ نـە بـەردی تێـدا بـن کـەمێك درەختی تێدا ڕوابن ٥ (ك: نفاخی).

النُّفْخَـــةُ: ورگ هاوســانو مەعیـــدە پڕبوون بەخواردن یان بەشتی تـر ٥ (نَفْخَـةُ الـشباب) هـەرەتی گـەنجیو لاویـەتی ٥ (نفخـــةالربیع) ڕۆژانـــی پێگەیشتنی گژوگیا لە بەهاردا.

النُّفْخة: دەردێکە توشی ئەسپ دەبێو لەئەنجامی ئەوەدا گونی دەهاوسێن.

النُّفاخُ: هاوسانی بەشێك لە جەستەی بەهۆی نەخۆشییەوە.

النُّفاخـة: هاوساوێکە لەناوسکی ماسـی دایــە ٥ ئــەو بڵــقو تلۆقانـــەن کەدەکەونە سەر ئاو و شلەمەنی تـر ٥ میزەڵـدانو شـتی لـەو جـۆرە کـە منـداڵ یارییـان پـێ دەکـەنو فویـان تێدەکەنو بەرزیان دەکەنەوە.

النَّفیخُ: ئـەو شاگرد ئاسنگەرو شـاگرد مـسگەرەی کـە بەموشـەدەمە یـان بەشـــتی تـــر ئـــەرکی خـــەڵوز گەشـاندنەوەوەو فـوکرن لـەکورە ئاگرەکەی لەئەستۆیە ٥ (ك: نُفَخاء).

نَفَـدَ الـشَّیْئُ نَفَـداً ونفـاداً: شـتەکە فـەوتا، نەما، بڕایەوە.

أنْفَدَ فلان: فڵان تێشوی بڕایەوەو ماڵو سامانی نەما.

انفد الشَّیْئ: شتەکەی فەوتاند.

نافَـدَهُ: موحاکەمـەی لەگـەڵ دا کـردو کێـشەو نیزاعـی نایـەوە بۆئـەوەی بەبەڵگە بۆری بدا.

إنْتَفَدَ الشَّیْئَ: شتەکەی فەوتاند.

إنْتَفَـدَ الحـقَّ: مافەکـەی وەرگرتــەوە ٥ دەشـــگوترێ: (إنْتَفَـــدَ منــــه) لێــی وەرگرتەوە.

إنْتَفَدَ اللَّبَن: شیرەکەی هـەموو دۆشـیو هیچی بۆ نەهێشتەوە.

**تنافَدَ القومُ:** خەڵکەکە کەوتنە کێشەو دەمەدەمێوە هەرکەسە بەڵگەی خۆی خستەڕو.

**إسْتَنْفَدَ الشَّيْئَ:** شتەکەی بڕاندەوە ٥ دەگووترێ: (إسْتَنفَدَ وسْعَهُ) تاقەتی نەما، توانای خۆی تێدا خەرج کرد وهیچی پێ نەما.

**إسْتَنْفَدَ الأمْرُ أغراضه:** کارەکە مەبەستە سەرەکییەکانی هاتنە دیو نیتر چی دی پێویست ناکا درێژەی پێ بدرێ.

**المُنافِدُ:** دەگوترێ: (خَصْمٌ منافِدٌ) ڕکەبەرێکە چی لە تواناداپە بەکاری دەهێنێ بۆ ئەوەی سەربکەوێ.

**المُنْتَفَدُ:** دەگوترێ: (فلانٌ مُنتَفَدُ فلان) فلانکەس کەبزێوی نەما فلان پەکی ناخاو دەیداتێ.

**النَّفادُ:** فەوتان، نەمان، بڕانەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَـذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِن نَّفَادٍ﴾.

**نَفَذَ الأمْرُ نفوذاً ونفاذاً:** کارەکە تەواو بوو ئەنجام درا ٥ دەشگوترێ: (نفذ فلان لوجهه) فلانکەس ڕێبازی خۆی گرتەبەرو ڕۆیی ٥ (نفذ الكتابُ الى فلان) نامەکە گەیشتە فلان ٥ (هذا الطريق ينفذ الى مكان كذا) ئەم ڕێگایە دەچێ بۆ فلان شوێن ٥ (نفذ الطريقُ) ڕێگاکە ناسانو خۆشە هەموو کەس دەتوانێ پێیدا بڕوا ٥ (نفذ منه) لەم شوێنەوە چووە شوێنێکی تر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾ ٥ دەگوترێ: (نفذ فلان في الأمور) فلانکەس لەئیش‌و کاردا شارەزاو وریایە ٥ (نفذ عنه) لێی تێپەڕی ڕزگاری بوو لێی.

**نَفَذَ القومَ نَفْذاً:** لەخەڵکەکە تێپەڕی‌و کەوتە ئەو پەڕیان.

**أنْفَذَ القومَ:** خەڵکەکەی دڕ داو بەناویان دا ڕۆیی ٥ دەشگوترێ: (رَمَيْتُهُ فأنفَذته) تیرێکم پێوەناو هەنگاوتم تیرەکە ئەمدیواو دیو کونی کرد.

**أنْفَذَ الكتابَ الى فلان:** نامەکەی نارد بۆ فلانکەس.

**أنْفَذَ الأمْرَ:** کارەکەی ئەنجام دا.

**إنْفَذَ عهده:** وادەو بەڵێنی خۆی بەجێ هێنا.

**نَفَّذَ الحكمَ:** بڕیارەکەی جێبەجێ کرد.

**تنافذ القومُ الى القاضي:** خەڵکەکە کێشەکەی خۆیان بردە لای دادوەر بۆ ئەوەی بۆیان یەکالا بکاتەوەو بڕیاری پێ دەرکا.

**التنفيذ في الحكم:** بەکردەوە جێبەجێ کردنی بڕیارە.

**الهَيئــة التنفيذيــة:** ئــەو دەســەڵاتەی یاساکانی دەوڵەت جێبەجێ دەکاو بەعەمەلی پەیڕەویان دەبێ.

**المُنتَفَذُ:** بەرفراوانی و پەك نەکەوتن ٥ دەگوتری: (في مالــه مُنتَفَــذ) مــاڵو سامانەکەی زۆرە بەشی ئەو شتانە دەکا.

**المَنفَـذ:** شوێنی تێدا هەڵسوڕانی شت، شوێنی پێداڕۆیشتن‌و لێ دەرچوون ٥ (ك: منافذ).

**النّافِذ:** دەگوتری: (رجل نافذ في أمـوره) پیاوێکــە لــەکاروباری خــۆی دا ســەرکەوتووە ٥ (طريــق نافــذ) ڕێگایەکە ڕۆیشتنی پێدا دەکرێ‌و هەمووکەس دەتوانێ پێیدا بڕوا ٥ (أمر نافذ) فەرمانێکە دەبێ پابەندی بێ ٥ وشەی (النافــذ) لەجەستەی ئادەمیزاد ناوە بۆ کونە لوت‌و کونە گوێی‌و ئەو شتانە.

**النافــذة:** دەگـوتری: (طعنــة نافــذة) برینێکە ئەمبەرەو بەری وەکوو یەك وەهان ٥ پەنجەرەی خانو کەڕوناکی‌و هەوایان لێ بچێتە ژورەوە بۆناو ژورەکان ٥ (ك: نوافذ).

**النَّفـاذ:** (الحكـم مـع النَّفـاذ) حاڵەتێکە وادەخوازی لەگەڵ بڕیاری دادگا دەرچوو تەنفیز کردنیشی پێویست دەبێ، جاداواکە مەدەنی بێ یان جنائی.

**النَّفَذُ:** بڕاندنەوەی شت‌و ئەنجامدانی ٥ دەگوتری: (أَمَرَ بِنَفَذِهِ) فەرمانی کرد بە ئەنجامدانی ٥ (قام بَنَفَذ الكتـاب) چی لەنامەکەدا بوو تەنفیزی کرد ٥ چارەســەرو ڕێگــای ڕزگــاربوون لەچورتم ٥ دەگوتری: (أتى بِنَفَذِ هذا المَعْضَل) چارەسەری ئەو تەنگژەیەی هێنایە کایەوە ٥ هەروا دەگوتری: (طَعْنَة لها نَفَـذٌ) برینێکە ئەمدیواو دیوە.

**النُّفْــذَةُ:** دەنکــەمیرو ٥ (ك: نُفَــذٌ) ٥ دەگوتری: (قارب الخـرازُ بين النُّفَـذِ) میروچییەکە میروەکانی لێك نزیك کردنەوە.

**النَّفّــاذُ:** ئـیش لەدەســت هــاتوو کــار ڕاپەڕێن.

**النُّفُوذ:** بەمانا (النَّفاذ) دێ.

**النُّفُــوذُ:** دەســەڵات‌و هێــزو توانــا ٥ دەگـوتری: (فـلان ذو نفـوذ عظـيم) فلانکــەس دەســەڵاتێکی گــەورەو بەرفراوانی هەیە ٥ (منـاطق النفـوذ) ئەو وڵاتە زەعیفەو بێ دەسەڵاتانەن کە دەوڵەتە زلهێزەکان دەسەڵاتی خۆیانی بەسەردا دەسەپێنن.

**النَّفيذ:** بەمانا (النّافِـذ) دێ، دەگوتری:

(أمر نفيذ) فەرمانێکە ملی بۆ کەچ دەکرێ‌و تەنفیز دەبێ.

**نَفَرَ نَفْراً ونفوراً:** ولاتی خۆی جێ هێشت‌و کەوتە گەڕان بەولاتان دا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ﴾.

**نَفَرَ الجلدُ نفوراً:** پێستەکە هاوساو لەگۆشتەکە جیابۆوە.

**نَفَرَ مِن الشَّيْئِ نفوراً:** لەشتەکە هەڵسڵەمیەوە هێزی لێ کردەوە پێی ڕازی نەبوو.

**نَفَرَ مِن المكان:** لەو شوێنە ڕۆیی بۆ شوێنێکی تر.

**نَفَرَ الحاج مِن منى:** حاجییەکان دەشتی مینایان جێ هێشت بەرەو مەککە ڕۆیشتن.

**نَفَرَ الناسُ الى العدوّ:** خەڵك بەپەلەو هەڵەداوان بەرەو ڕوی دوژمن ڕۆیشتن بۆئەوەی شەڕی لەگەڵ بکەن.

**نَفَرَ فلاناً نَفْراً:** بەسەر فلانکەس دا زاڵ بوو لەبەربەرەکانی دا.

**أنْفَرَ القومُ:** خەڵکەکە ولاغەکانیان بلاوبوونەوە.

**أنْفَرَ الدابة:** ولاخەکەی چەموش کرد.

**أنْفَرَ الرجلَ:** یارمەتی پیاوەکەی دا ٥ دەگوترێ: (إستَنْفَرَهم فأنفروه) داوای یارمەتی لێ کردن یارمەتییان دا.

**أنْفَرَ فلاناً على فلان:** بڕیاری بۆ فلانکەس دا بەسەرکەوتن بەسەر فلان دا.

**نافَرَهُ:** کێشەی لەگەڵ نایەوە ٥ شانازی بەسەردا کرد.

**نَفَّرَ فلاناً مِن الشَّيْئِ:** فلانکەسی لەشتەکە ترساند، لێی دوورخستەوە ٥ دەگوترێ: (نفر الدابة عَنْ الرعي) ولاخەکەی لە لەوەڕگاکە دوورخستەوە.

**نَفَّرَ عَنْ ولده أو غيره:** نازناوی ناشیرینی بۆ منداڵەکەی یان بۆ کەسانی تر دانا بەمەبەستی ئەوە جندۆکەو چاوی پیس کاری تێ نەکەن.

**نَفَّرَ فلاناً على فلان:** بڕیاری سەرکەوتنی بۆ فلانکەس دا بەسەر فلانکەس دا.

**نَفَّرَ فلاناً على الشَّيْئِ:** فلانکەسی زاڵ کرد بەسەر شتەکەدا.

**تنافر القوم:** خەڵکەکە کێشەیان تێکەوت ٥ شانازییان بەسەر یەکتردا کرد.

**إسْتَنْفَرَت الدابة:** ولاخەکە هەڵسڵەمییەوە ٥ دوورکەوتەوە ٥ (فهي مُسْتَنْفِرَةٌ).

**إسْتَنْفر الدابة:** وای لە ولاخەکە کرد هەڵسڵەمێتەوە.

**إسْتَنْفَر الحاكم الرعية**: فەرمانڕەوا داوای لەخەڵکەکە کرد بەپەلە بڕۆن بۆ بەرەنگاریکردنی دوژمن‌و شەڕ لەگەڵ کردنی.

**إسْتَنْفَرَ بني فلان**: داوای لەهۆزی فلان کرد بەهاواریەوە بێن‌و ڕزگاری بکەن.

**النّافِرُ**: دەگوترێ: (دابة نافِر) ولاخێکە هەڵسڵەمینەوەی زۆرە ٥ لەپێشبڕکێ‌و کێبڕکێ دا سەرکەوتوە ٥ (شاة نافِر) مەڕێکە کرم لە لوتیەوە دێتە دەر، کرم فڕێ دەدا ٥ شتێك لە لوتیەوە دەردەدا وەکوو کرم وایە.

**نافرة فلان**: خزم‌و کەس‌وکارە نزیکەکانی فلانکەس.

**النافورة**: شتێکە لە باخچەو چتی وادا دادەنرێ ئاو بەرز دەکاتەوە بەتەوژم بۆ جوانکردن‌و ڕازاندنەوەو فێنك کردنەوەی شوێنەکە.

**النِّفارُ**: هەڵسڵەمینەوە.

**النُّفَارَة**: ئەو شتەی ناو بژیوان یان سەرکەوتوو لەژێرکەوتوی وەردەگرێ.

**النَّفْرُ**: خەڵکانێك بەپەلەو هەڵەداوان بۆ شتێك دەچن یان بۆشەڕ ٥ (یوم النفر الأول) دووەم ڕۆژی جەژنی قوربانە کە حاجی لەدەشتی مینایەوە دەڕۆن بۆ مەککە ٥ (یوم النفر الآخر) سێیەم ڕۆژی جەژنی قوربان.

**النَّفَرُ**: لەسێ کەسەوە بۆ دەکەس ٥ دەگوترێ: (هم نَفَرُ فلان) ئەوانە تاقمی فلانکەسن ٥ بۆتاقە پیاوێکیش دەگوترێ ٥ (ك: أنفار).

**النُّفْرَةُ**: ئەوەی بەمندالّ دا دەکرێ بۆ چاوەزار.

**النَّفيرُ**: هاوشان لەشانازیی کردن دا ٥ خەڵکانێك بڕۆن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ دوژمن.

**النّفير العامُ**: ڕاجمینی تێکڕای خەڵك بۆ شەڕکردن لەبەرامبەر دوژمن ٥ کەسێك کە بێ کەڵك بێ پێی دەگوترێ: (فلان لافي العير ولا في النفير) واتە: فلانکەس نەلەگەڵ کاروانی قوڕەیش بوو کەلەشامەوە دەگەڕایەوە بۆ مەککە بەسەرۆکایەتی ئەبوسوفیان، نەلەگەڵ سوپای قوڕەیش دا بوو کەبەسەرۆکایەتی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بە ہیر کاروانەکەوە چوو بۆ ڕزگارکردنی، جاکەسێك لەگەڵ ئەم دوو تاقمەدا نەبووبێ بەپیاو حسێب نەکراوە.

نَفَزَ الظَّبيُ نَفْزاً ونفوزاً: ئاسكەكە بازی داو قاچەكانی لێك هەڵبڕینو بەیەكەوە دایاننەوە.
نَفَّزَ فلان: فلانكەس مرد.
نَفَّزَت المرأةُ وَلَدَها: ئافرەتەكە منداڵەكەی هەڵپەڕاند.
تنافَزوا: عەمبازی یەكتر بوون، پەلاماری یەكتریان دا ٥ دەگوترێ: (الصِّبيان يتنافزون في لعبهم) منداڵەكان لەیاری كردنەكەیان دا بەسەر یەكتردا بازیان دا.
النُّفازى: یارییەكە یاریكەرەكان بازی تێدا دەدەن.
النَّفيزُ: ڕۆنەكەرەی بزركاو كەلەناو مەشكەكەدا یەكترنەگرێو توپەڵ نەبێ.
نَفَسَهُ نَفْساً: بەچاو هەنگاوتی، چاوەزار لێ یدا.
نَفِسَتْ المرأةُ نَفْساً ونفاسةً: ئافرەتەكە منداڵی بوو.
نُفِسَتْ وَلَداً: منداڵی بوو ٥ (دَمُ نِفاسٍ) خوێنی پاش منداڵبوون.
نَفِسَ بالشيئ: شتەكەی لاخۆشەویست بوو لەدەستی نەبۆوە ڕژدو چرۆك بوو دڵی نەهات شتەكە ببەخشێ.
نَفِسَ الشَّيْئَ وبه على فلان: حەسودی بەفلان برد بەوەی كە ئەوشتە هی ئەوەو ئەوی بەشیاوی ئەوە نەزانی ئەو شتەی هەبێ.
نَفُسَ الشَّيْئُ نفاسةً ونِفاساً ونفوساً: شتەكە بەنرخ بوو (فهو نفيس ونافِس).
أنفَسَ الشَّيْئُ: شتەكە بەنرخ بوو، جێگای سەرنج بوو.
نافَسَ في الشَّيْئِ: زێدەڕەوی لەشتەكەدا كرد لەدڵی خەڵك دا شیرینی كرد.
نافس فلاناً في كذا: كێبڕكێی لەگەڵ فلان دا كرد بۆئەوەی پێشی بكەوێ بەبێ ئەوەی زیانی پێ بگەیەنێ.
نَفَّسَ عَنْهُ: قورسایی لەسەر كەم كردەوە.
نَفَّسَ عنه كربته: ناخۆشییەكەی لەسەر لابرد.
تنافَسَ القومُ: خەڵكەكە پێشبڕكێو مونافەسەی یەكتریان كرد بەبێ ئەوەی زیانیان بۆ یەكتر ببێ.
تَنَفَّسَ: هەناسەی دا هەناسەی هەڵكێشا.
تَنَفَّسَ الريح: بایەكە بەهێواشی هەڵیكرد.
تَنَفَّسَ في الكلام: قسەی درێژ كردەوە.
تَنَفَّسَ النَّهر: ڕوبارەكە ئاوی زیادی كرد.
تَنَفَّسَ الموجُ: شەپۆلەكە ئاوی دەردایە دەر.
تَنَفَّسَ العُمْرُ: تەمەن درێژ بوو.

تَنَفَّسَ القوسُ: کەوانەکە درزی برد.
تَـنَفَّسَ الـصُبْحُ: بـەیانی دەرکـەوت، روناکی بەیانی ئاشکرا بوو.
تَـنَفَّسَ الـصُعداءَ: هەناسـەیەکی قـوڵی هەڵکێشاو ماندویەتی حەسایەوە.
الأنْفَـسُ: بـەنرختر ە درێـژتر، باشـتر ە فراوانتر.
التَّنـافُس: هـەڵئانێکی دەروونـی سروشتییە داخوازی ئەومیە هەوڵ بدەی لاسایی گەورە پیاوانی مێژوو بکەیەوەو بچیتە ڕیزی ئەوان.
المُتَـنَفِّسُ: دەگـوترێ: (ألـفٌ متـنفِّس) لوتێکی پانەوەبووە کون گەورەیە.
المُنافَسَة: بەمانا (التنافس) دێ.
المُنفِسُ: دەگوترێ: (مـال مُـنفِسٌ) مـاڵو سامانی زۆر.
المنفوس: زاروك ە شتێك چاوەزار لێی دابێ ە خۆزگەی بۆ بخوازرێ.
النّافِسُ: چاوپیس، حەسودو چاوچنۆك ە (شـيء نـافِسٌ) شـتێکە داخـوازی لەسەرە.
النِّفَـاسُ: جـۆرە خـوێنێکی ئافرەتـە ماوەیـە دوای منـداڵبوون دێ لـەو ماوەدا منداڵدانو کۆئەنـدامی زاوزێ دەچـنەوە سـەر حاڵـەتی سروشـتی خۆیـان کەنزیکـەی شـەش هەفتەیەکی گەرەکە.

النَّفْسُ: گیان ە دەگوترێ: (خرجت نفسه أو جاد بنفسه) مردو گیانی لەدەست دا ە خوێن ە دەگوترێ: (دَفَقَ نَفْسَهُ) خـوێنی بەفیـچقە لێ دەرهێنـا ە خودی شتەکە ە دەگوترێ: (جاء هو نَفْسُهُ أو بنفسه) ئـەو خـودی خـۆی هـات ە (ك: أنفـس ونفـوس) دەشـگوترێ: (أصـابته نفـس) چاوی پیس هەنگاوتی، چاوەزار لێی داوە ە (فـلان ذو نفـس) فلانکـەس خـاوەن ڕەوشـتی بـەرزو مەردایەتییـە ە (في نفـسي أن أفعـل کـذا) لـەنیازو مەبەستم دایـە ئـەوە بکـەم ە (فـلان یـؤامر نفـسیه) فلانکـەس دوو ڕاو بۆچونی هەیە نازانێ بەپێی کامیان بکا.
الـنَّفَسُ: هەناسـە ە هـەوای نـەرم؛ بـای شەماڵ ە کزەبای شـەماڵ ە قومـەئاو و شتی وا ە بارودۆخی ئاساییو بێ چورتمی ە دەگـوترێ: (هـو في نفـس من أمره) ئەو کاروباری ئاساییو بێ کێـشەیە دەتوانـێ بـەئارەزوی خـۆی پـەل ڕاهـاوێ ە (بـيني وبينـه نَفَـسٌ) نێوانی منو ئەو دوورە ە (شراب ذو نفـس) شـەرابێکە تینوایـەتی دەشکێنێ ە (شـاعر أو کاتـب طویـل الـنفس) شـاعیر یـان نووسـەرێکی

هەناسە درێژەو دەتوانێ بەچەند جۆر بەهرەکەی خۆی دەربخا ٥ (يعجبني نَفَسُ هذا المؤلف أو هذا الطاهي) من سەرسامم بە شێوازی ئەم دانەرە یان ئەم چێشت لێنەرە.

النّفوسُ: حەسودو رژدو چاو چنۆك.

النّفيسُ: ماڵو سامانی زۆر ٥ (شيئ نفيس) شتی بەنرخو خۆزگە بۆ خوراو ٥ (رجل نفيس) پیاوێکی چاو چنۆك.

نَفَشَ القُطْنُ ونحوه نَفْشاً ونفوشاً: لۆکەکە کرایەوە، فش کرایەوە ٥ دەگوترێ: (نَفشَه فَنَفَشَ).

نَفَشَ القومُ: خەڵکەکە کەوتنە حاڵەتی هەرزانییەوە.

نَفَشَت الماشية في الزرع: ئاژەڵەکان بەلەوەڕگاو ناوکشتو کاڵەکەدا بڵاو بوونەوە شەو لەوەڕیان کرد ٥ (ك: نَفَشَةٌ ونُفّاش) ٥ (وهي نافِشة) ٥ (ك: نوافِش).

نَفَشَ على الطعام: چووە سەر سفرەو خوانەکە بۆ نان خواردن.

نَفَشَ القُطْنَ أو الصوفَ: لۆکەکەی شی کردەوە هەلاجی کرد ٥ خورییەکەی بەشەکرد بەئامێری شە تاڵەکانی لێك کردنەوە ٥ یان بەدەست خورییەکەی خاوکردەوە ٥ (أَنْفَشَ الراعي الماشية): ولاخەکانی بەشەو ڕەوانەی لەوەڕگا کردنو بۆخۆی نوست.

نَفَّشَ القُطْنَ: لۆکەکەی کردەوە ٥ هەلاجی کرد.

إنْتَفَشَ القُطْنُ ونحوه: لۆکەکە شی کرایەوە.

إنْتَفَشَت الهِرّةُ: پشیلەکە موی جەستەی ڕاستبوونەوە تاوای لێ هات بنکی تاڵەمووەکانی جەستەی بیندران.

إنْتَفشَ الطائر: باڵندەکە پەڕو باڵی لێ فش بوون دەتکوت دەترسێ یان سەرمایەتی.

تَنَفَّشَ: بەمانا (نَفَشَ) دێ.

المُتَنَفِّشُ: دەگوترێ: (أمةٌ متنفّشة الشَعْر) کچۆڵەیەکە قژی ژاکاو و بژن ٥ (أنف مُتَنَفِّش) لوتێکە نەرمایی کەمەو کون پانو فراوانە ٥ هەر هاوساویەك ناوەوەی بۆش بێ.

النَّفَشُ: خوری (بە شە) کراو و پشکنراو ٥ شتو مەکی پەرتەوازە بوو ٥ دەگوترێ: (باتت غَنَمَه نَفَشاً) مەڕو بزنەکانی بڵاو بوونەوە ٥ قسەی زۆرو داواکاری زۆر.

النَّفّاشُ: لوتبەرزو خۆبەزلزان ٥ کەسێك لافی شتێك لێ بدا کەنەیبێ، شانازیی بەشتێکەوە بکا کەنیەتی ٥ جۆرە نارنجێکە دەگرێتە مرەبا.

**نَفَصَ ببوله نَفْصاً:** بەتەکان میزی هەڵدا، دەگوترێ: (نَفَصَ بالكلمة) قسەی بەخێرایی کردن.
**أنْفَصَ بالضحك:** زۆر پێکەنی.
**أنْفَصَ بشفتيه:** بەلێوی ئاماژەی بۆ کرد ٥ لێوی لێ داقرینجاند.
**أنْفَصَ بالكلمة:** قسەکەی بەخێرایی گوتن.
**المِنْفاصُ:** کەسێك زۆر پێبکەنێ ٥ دەگوترێ: (رجل مِنفاصٌ وإمرأة منفاص) ٥ هەروا ناوە بۆ کەسێك لەکاتی نوستن دا میز لەجێگە نووستنی دا بەخۆدا بکا.
**النُّفاصُ:** دەردێکە توشی مەڕوبزن دەبێ و میزەچرکەیان پێ دەکا تا مندار دەبنەوە.
**النُّفْصَةُ:** فیچقە کردنی خوێن ٥ (ك: نُفصٌ).
**نَفَضَ الثوبُ أو الصبغُ نفوضاً:** قوماشەکە هەندێ لەڕەنگەکانی چونەوە، نەمان.
**نَفَضَ الزرع:** کشتوکاڵەکە پێگەیی و هەموو گوڵە دانەوێڵەکانی دەرکەوتن.
**نَفَضَ الكَرْمَ:** دارمێوەکە پۆخەکانی پشکوتن.
**نَفَضَت الدابةُ:** ئاژەڵەکە زاو و زێی کرد.
**نَفَضَ فلان من مرضه:** فلانکەس لەنەخۆشییەکەی ڕزگاری بوو.
**نَفَضَ القوم:** خەڵکەکە تێشوویان بڕایەوە.
**نَفَضَ الشَّيْءَ نَفْضاً:** شتەکەی تەکاند بۆئەوەی ئەوەی پێوەی نووساوە هەڵوەرێ ٥ دەشگوترێ: (نَفَضَتْهُ الحُمىٌّ) لەرزوتا وەشەقەتۆڵەی هێناو هەڵی پەڕاند.
**نَفَضَ المكانَ ونحوه:** سەیری شوێنەکەی کردو چی تێدا بوو بینی و لێی ورد بۆوە بۆئەوەی بزانێ چیە.
**نَفَضَ الشَّيْءَ:** شتەکەی لێ کردەوە تەکاندی دایچۆڕاند ٥ دەگوترێ: (نَفَضوا حَلائبَهم) گوانی ئاژەڵەکانیان یەکەیەکە دادۆشی و هیچیان تێدا نەهێشتەوە.
**نَفَضَت المرأة كَرِشَها:** ئافرەتەکە منداڵی یەك لەدوایەکی بوون، منداڵی زۆری خستنەوە.
**أنْفَضَ الوِعاءُ:** زەرفەکە هیچی تێدا نەما.
**أنْفَضَ القومُ زادهم:** خەڵکەکە تێشوو بژێوی خۆیان تەواو کرد لەناویان برد.
**نَفَّضَ الشَّيْءَ:** شتەکەی لێ کردەوە تەکاندی دایچۆڕاند.
**إنْتَفَضَ الشَّيْءُ:** شتەکە کەوتە جم و جوڵ و هەڵبەزو دابەز ٥ دەگوترێ: (فلا يَنْتَفِضُ من الرعدة) فلانکەس بەهۆی لەرزوتاوە هەڵدەلەرزێ.

**إنْـتَفَضَ الكـرمُ:** دارمێوەکـە پۆخـەکانی کرانەوەو گەڵای کرد.

**إنْـتَفَضَ الـشَّيْئ:** شـتەکەی داچـۆڕاندو دایتەکاند.

**إنْـتَفَضَ الفـصيلُ مـافي الـضرع:** بێچوە ئاژەڵەکـە ئـەوەی لـەگوانی دایکـی دا بوو دایچۆڕاند.

**إسْــتَنْفَضَ القــومُ:** خەڵکەکــە چــەند کەسێکیان نـارد بـۆ تاقیکردنـەوەی شوێنەکە تـا بـزانن ئـاخۆ دوژمنـی لێیە، ئەو شوێنە ترسی تێدایە.

**إسْــتَنْفَضَ المكــانَ ونحــوه:** ســەیری شوێنەکەی کرد بۆئەوەی بزانێ چی تێدایەو چی تێدا نیەو بیناسێ.

**إسْتَنْفَضَ القومَ:** لەخەڵکەکە وردبۆوە و زۆری سەیرکرد.

**إسْتَنْفَضَ ماعنده:** ئەوەی لای بوو دەری هێنا.

**الأنْفُوضَــةُ:** ئــەو میــوەو شــتەیە کــە لـەدرەختی بـەردار دەکەوێتـە خـوار بۆ ژێر درەختەکە ٥ (ك: أنـافیض) ٥ دەگـوترێ: (أصــابنا اليــومَ أنــافیض) ئــــەمڕۆ میــــوەی لــــەدرەخت بەربۆوەمان خوارد، کۆمان کردەوە.

**المِنْفاضُ:** قوماشێکە چارەکەیەکە لەژێر درەخـت ڕادەخـرێ بۆئـەوەی ئـەو میـوەی لەدرەختەکـە دەتەکێنـدرێ بکەوێتە سەری.

**المِنْفَضُ:** بەمانا (المِنفاضُ) دێ ٥ بێژنگی گەورە.

**المِنْفَضَةُ:** قاپێکە گڵ یان لمی تێدەکرێ شـتی سـوتاوی تـێ فـڕێ دەدرێ ٥ (تەپڵەکی جگەرە).

**المِنْفَــضَةُ:** داردەســتێکە لــە درەختــی خـەیزەران بـەڕمو قـاڵی‌و شـتی وای پێ دەتەکێنـدرێ‌و تـەپو تـۆزی پـێ لێ دەکرێتەوە.

**المَنْفوضُ:** ئەو کەسەی لەرزوتا دەیخاتـە چۆقە چۆق.

**النّــافِضُ:** (ثــوب نــافِض) قوماشــەکە ڕەنگەکەی چۆوە ٥ هەروا دەگوترێ: (أخذتْه حمی نافِض) لەرزوتای بـەهێز هێناویەتە چۆقە چۆق ٥ چاوساغو نیـشاندەر لـەپێش قافڵەوە ڕێگاکـە بەتاقی بکاتەوە بزانـێ ئەمینـە یان نا.

**النُّفَــاضُ:** چـۆقە چـۆق‌و هەڵلـەرزین بەهۆی لەرزو تاوە.

**النُّفاضُ:** گرانـی‌و قـات‌و قـڕی ٥ ئـەوەی هەڵـدەوەرێ لەشـتی تەکێنـدراو ٥ ئــەوەی لــەناو دەم دا دەمێنێتــەوە لــەپرژە ســیواك‌و شــتی وا و تــف دەدرێتەوە.

**النِّفــاضُ:** پۆشـاك: دەگـوترێ: (ماعلیـە نِفـاضٌ) هیـچی لەبـەردا نیـە هـیچ پۆشاکێکی لەبەردا نیە.

**الـنَّفَضُ**: ئـەو میـوەو بەروبوومـەی لەدرەخت دەکەوێتە خوار بۆ بنکی درەختەکـە ٥ بۆڵـەتریَ کـە لـە هێـشووەکەدا تێـك دەتـرنجێن‌و پاڵەپەستۆی یەکتر دەکەن.

**النُّفُضُ**: کەرِشان‌و هەنگە مـردوو کە دەکەونە ناو کۆڵەسەوە.

**النُّفَضاءُ**: هەڵەرزینی لەرزوتادار.

**النُّفْـضَةُ**: رِێژنـە بـاران کەلـە پارچـە زەویەك دەداو لەپارچە زەویەکی تر نادا.

**النَّفْضَةُ**: کۆمەڵـە خـەڵکێك دەنێـردرێن بـۆ شـوێنێك بـۆ جاسوسی‌و بـەتاقی کردنەوەی ئاخۆ دوژمن لەویَ هەیـە یان نا؟

**النَّفَضي**: هەڵەرزین.

**النَّفـوضُ**: دەگـوتریَ: (إمـرأة نفـوض) ئافرەتێکـە منـداڵ زۆرە ٥ (رجـل نفوض للمكان) پیاوێکە لەشوێنەکە ورد دەبێتەوە.

**النَّفيضة**: بەمانا (النَّفَضَةُ) دیَ.

**نَفَطَتِ القِدرُ نَفْطاً ونفيطـاً**: مەنجەڵەکە کوڵی پرژی وادەهاویَ دەڵێی تیرە.

**نَفَطَ فلان**: فلانکەس رِقی هەڵساو لـەرِقان گەرم داهاتووەو هەر خۆی دەخواتەوە.

**نَفَطَ العَنزُ**: بزنەکە پژمی.

**نَفَطَ الظبيُ**: ئاسکەکە بارِاندی ٥ دەگوتریَ: (نَفَـطَ فـلان) فلانکـەس بەشـێوەیەك قسەی کرد کەس لێی حاڵی نەبیَ.

**نَفِطَ الصَّبِيُ نَفَطاً**: منداڵەکە خرِوێلکەی لیَ هاتن.

**نَفِطَـت يـدُهُ مـن العمـل نَفْطـاً ونفيطـاً**: دەستی بالوکەو بلّقی لیَ پەیدا بوون ئاویان تێدایە.

**أنفَـطَ العمـل يديـه**: کـارکردن بلّقـی لەدەست دا پەیدا کردن پرِن لەئاو.

**تنَفَّطَـت القِـدرُ**: بـەمانا (نَفِطَـت) دیَ ٥ دەشگوتریَ: (تَنفَّطَ فـلان) فلانکـەس لــەرِق هەڵــساوی خــۆی گــەرم داهاتووە.

**تَنفَّطَت يدُهُ من العمل**: بـەمانا (نَفِطَـتْ) دیَ.

**النَّافِطَـةُ**: بلـۆق‌و بلّـق کەبـەهۆکاری کارکردنــەوە لەدەســت دا پەیــدا دەبن‌و پرِن لـەئاو ٥ ئاوڵەو مێکوتـە ٥ دەگـوتریَ: (يـد نافطـة) دەسـتێکە بلـۆقی کـردووە، دەشـگوتریَ: (مالـه عافطـة ولانافطـة) هیچی نیـە ٥ (ك: نوافِط).

**النَّفاطَةُ**: نەوتچیەتی، نەوت دەرهێن.

**النَّفـاط**: نـەوت دەرهـێن لـەبیرو کـان ٥ نەوت فرۆش.

**النَّفَّاطـةُ**: بلّقـی سـەر دەسـت‌و شـوێنی تری جەستە کە پرِبیَ لـەئاو ٥ ئـەو

شـتەی نـەوتی پـێ دەهـاوێو دەیپرژێنـێ ٥ شـوێن دەرهێنـانی نەوت.

**الـنَّفْطُ**: نـەوت ٥ کـە بـەکاردێ بـۆ سوتەمەنیو شتی وا.

**الـنِّفْطُ**: بلـۆقو بلـق لەجەسـتەدا ٥ مێکوتەو ئاوڵە.

**النِّفَطَان**: جۆرە کۆکەو هەناسە دانێکە لەکاتی ڕق هەڵسان دا.

**النُّفَطَةُ**: کەسێك دەستی بلۆقی کردبێ.

**نَفَعَهُ نَفْعاً**: سودی پێگەیاند (فهو نـافع ونَفّاع).

**أنْفَـعَ**: بازرگـانی لەشتی خێـر ئـامێزدا کرد.

**نَفَّعَهُ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (نَفَعَ) دێ.

**إنْتَفَعَ بە**: قازانجی لێدەستکەوت.

**إسْتَنْفَعَ فلانـاً**: داوای سـودو قـازانجی لێ کرد.

**المَنْفَعَـةُ**: هەرشـتێك سـودو قـازانجی لێ ببینـدرێ ٥ (ك: منـافِع) ٥ (مـذهب المَنفعـة) مەزهـەبێکی ئەخلاقییـە ٥ بـەناوبانگترین ڕێـڕەوی ئـەم مەزهەبە (بنتـام و سـتیوَرْت میـل) ٥ (منـافِع الـدار) ئـەو شـتانەی کەپەیوەنـدیان بـەخانووە وە هەیـە وەکـوو حەوشـەو سیاجو بـەربێڵاو زێرابو بارکۆن .....هتد.

(المنافِع العامة) ئەو سودو قازانجانـەی بـۆ هـەموو کەسـەو هـەموو خـەڵك بەگشتی لێی سودمەند دەبن.

**النَّافِعُ**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا.

**النافعة**: سودو قازانج ٥ دەگوترێ: (مـا نفعـني فـلان بنافعـة) فلانکـەس قازانجێکی پێ نەگەیاندووم.

**النَّفْـعُ**: خێـرو بێـرو سـودو قـازانجو بەرەکـەت ٥ هەرشـتێك مـرۆڤ بەمەبەست بگەیەنێ.

**النُّفْعَةُ**: عەصاو گۆچان ٥ (ك: نفعات).

**نَفَّ الأرضَ نَفّاً**: زەوییەکەی تۆو کرد.

**نَـفَّ الـسَّوِيقَ**: بەوشـکی قاوتەکـەی بەکارهێنا نەیکردە حەڵوا.

**نَفَّ نَفّاً**: چڵمی دەردا لەلوتی.

**النَّفِيُّ**: شتێکە وەکوو چارەکەو سفرە وەهایە قاوتی لەسەر دەبێژرێتەوە.

**النَّفِيفُ**: قاوتو شتی وا.

**نَفَـقَ الـشَّيْئُ نَفَقـاً**: شـتەکە تـەواو بـوو، بڕایەوە نەما ٥ دەگوترێ: (نَفَقَ الـزاد و نَفَقَ الدراهم).

**نَفَقَ اليربوع**: یەربوعەکە لەکونەکەی خۆی هاتە دەر.

**نَفَقَتْ الدابة نفوقاً**: وڵاخەکە تۆپی.

**نَفَقَ الجرحُ**: برینەکە توێکڵی هەڵدا.

**نَفَقَت الـبضاعة نفاقـاً**: کاڵاکە ڕەواجـی بـوو ٥ داخـوازی لەسـەر زۆر بـوو ٥

دەگوترێ: (نَفَقَت المرأةُ): ئافرەتەکە خوازبێنی کەری زۆر بوون.

أنْفَقَ فلان: فلانکەس هەژار بوو ٥ ماڵو سامانی فەوتا.

أنفَــقَ التّــاجِرُ: بازرگانەکــە کاڵاکــانی ڕەواجیان پەیدا کرد.

أنْفَقَ الإبلُ: حوشترەکە توکی بڵاو بۆوە لەبەر قەڵەوی توکی هەڵدا.

أنْفَقَ المالَ: ماڵو سامانەکەی لەناو برد.

نافق اليربوع نِفاقاً: یەربوعەکە چووە کونەکەی خۆی.

نــافق فــلان: فلانکــەس دووڕو بــوو، ئەوەی دەری بڕی پێچەوانەی ئــەوە بوو کەلەدڵی دا بوو.

نَفَّقَ السِّلعةَ: ڕەواجی بەکاڵاکەدا بازاڕ گەرمی بۆ کرد.

إسْــتنْفَقَ الــشّيْئَ: شــتەکەی کــردە ئەفەقــەو بــژێو بــۆ مــاڵو منــداڵی ٥ دەگوترێ: (إسْتَنفَقَ المال على عيالـه) مــاڵو ســامانەکەی کــردە بــژێوو مەسرەف بەسەر ماڵو منداڵی دا.

الإنفــاق: بەخــشینی مــاڵ لــەبوارێك لەبوارەکان دا ٥ هــەژاریو نــەبوونی، قورئــان دەفــەرموێ: ﴿إذًا لَّأَمْــسَكْتُمْ خَشْيَةَ الإنفَاقِ﴾.

المُنــــافِق: دووڕو، کەســــێك کــــوفر بشارێتەوەو ئیمان دەربخا ٥ کەسێك دوژمنکاری بشارێتەوەو دۆستایەتی دەربخــا ٥ کەســێك شــتێك دەربخــاو پێچەوانەی بشارێتەوە.

المِنْفــاق: کەســێك ئەفەقــەی زۆربــێ مەسرەفو خەرجی زۆر بێ.

المُنَفَّقُ من الـسراويل: شوێنی دۆخـێن ٥ پزوی دەرپێ.

المَنْفَقَــةُ: هۆکــاری ڕەواج دان بــەکاڵا ٥ دەگــوترێ: (حُــسْنُ الإعــلان مَنفَقَــةٌ للــسِّلعة) بانگەشــەکردنی لــەبارو پڕوپاگەنــدە کردنــی جــوان دەبێتــە هۆکاری ڕەواجی کاڵا.

النافِقــاء: یەکێکــە لــەکونو لانــەی یــەربوع ئــەو کونــەی بەدەرەوەیــە لــەویان دا خــۆ حەشــاردەدا، خــۆ لەکونێك دا حەشاردەدا کە دیارنیە ٥ ئەمەیــە بنــەمای نیفــاق نیفــاق لەئەمە وەرگیراوە ٥ (ك: نوافق).

النَّفَق: تونێـل ٥ کونێکە لەژێر زەویو ژێر کێـو و ئەمـسەرەو سـەر کونـە ٥ لەکوردستـانی عێـراق تـا ئێـستا دوو تونێــل هەیــە یــەکێکیان تــونێلی دەربەندیخانە لەشەستەکانی سەدەی بیــستەم تــەواو بــووە دووەمیــان تونێلی ئەزمەڕە ساڵی ٢٠٠٩ کرایەوە.

النُّفِقُ: شتێك زوو ببڕێتەوە ٥ دەگوترێ: (طعــــام نُفِــقٌ) خواردنێکــە زوو دەبڕێتــەوە ٥ (فــرس نفِـق الجــري)

ئەسپەکە زوو لەغاردان دەوەستێتەوە.

**النُّفُقُ من النساء:** ئافرەتێك لای مێردی نەفەقەی باشی بدرێتیو شانسو بەختی چاکی لای مێردی هەبێ.

**النَّفَقَة:** ناوێکە لە وشەی (الإنفاق) واتە: یەك مانایان هەیە ٥ ئەو پارەی خەرج دەکرێ بۆ ژن: کەمێردەکەی بۆی دابین بکا بۆ خواردنو پۆشاكو شوێنی نیشتەجێ بوونو پێویستیاتی تر ٥ (ك: نفقات ونفاق).

**النَّيْفَقُ من السراويل:** پزوی دەرپێو رانکەو شەرواڵ ٥ ناقۆکی دەرپێ.

**نَفَلَ الرجلُ نَفْلاً:** پیاوەکە سوێندی خوارد.

**نَفَلَ فلاناً:** زیادەی بەخشی بەفلاّنکەس ٥ دەگوترێ: (نَفَلَ القائدُ الجُندَ) سەرلەشکرەکە زێدە بەخششی دا بەسەربازەکان ٥ لەدەستکەوتی شەڕ بەشی دان.

**أنْفَلَ فلان:** فلاّنکەس تەشوێی تاودایەو ڕوەکی قەتادی بڕی بۆ حوشترەکە بۆئەوەی بیخوا.

**أنْفَلَ له:** سوێندی بۆ خوارد.

**أنْفَلَ فلاناً:** لەدەستکەوتی شەڕ بەشی فلاّنکەسی دا.

**نَفَّلَ عَنْ صاحبه:** لەجیاتی هاوەڵەکەی پارەی دا.

**نَفَّلَ فلاناً:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَفَلَهُ دێ ٥ زیاد لە بەشی خۆی پێدا ٥ سوێندی دا.

**إنْتَفَلَ من الأمر:** دورەپەرێزی خۆی لەکارەکە ڕاگەیاند ٥ دەگوترێ: (إنْتَفَلَ مما قيل) بەرائەتی خۆی لەو قسە گوتراوانە ڕاگەیاند.

**إنْتَفَلَ من القوم:** لەیارمەتیدانی خەڵکەکە دوورکەوتەوە.

**إنْتَفَلَ الشَّيْئَ منه:** داوای شتەکەی لەو کرد.

**تَنَفَّلَ المصلي:** نوێژکەرەکە نوێژی سوننەتی کردن.

**تَنَفَّلَ على اصحابه:** لەدەستکەوتی شەڕدا ٥ زیاتر بەشی هاوەڵەکەی وەرگرت.

**النَّافلة:** زیاد لەحەقو پێویست زیاد لەبەشی خۆی ٥ زیاد لەفەرزو واجب ٥ دەگوترێ: (هو يصلي النافلة) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَّكَ﴾ ٥ هەروا وشەی (نافِلة) ناوە بۆ دەستکەوتی شەڕ، بۆشتی بەخشراو، بۆ کوڕەزا، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً﴾ مەبەست بە (نافلة) کوڕەزایە.

**النَّفْلُ:** هەر تاعەتو خودا پەرستییەك زیاد لەفەرزو واجب بێ ٥ هەروا ناوە بۆ سەرما.

**النَّفَلُ**: دەستکەوتی شەڕ ٥ بەخشش ٥ (ك: أنفال) ٥ هەروا ناوەبۆ ڕەگەزی ڕووەکێك سالآنەو تەمەندرێژە چەند جۆرێکی هەیە هەندێکی دێمەکارەو خۆڕسکە، هەندێکی دەروێندرێ دەکرێ بەئالف وەکوو ئەو جۆرە کەپێی دەوترێ: (النَّفَل الأسكندري) و پێشی دەگوترێ: بیرسیم.

**النُّفَلُ**: سێ شەوی دوای سێی مانگ واتە شەوی چوارەمو پێنجەمو شەشەم.

**النَّوْفَلُ**: دەریا ٥ دەگوترێ: (رجل نَوْفَلُ) پیاوێکی بەخشندەیە ٥ گەنجی قۆزو جوانچاك.

**النَّفْنافُ**: بۆشایی نێوان دوو کێو ٥ شتی دوور.

**النَّفْنَفُ**: هەوا ٥ سارای دوورو فراوان ٥ دەگوترێ: (قطعتُ نَفْنَفاً من الأرض) ٥ بەرزایی یەك لەنێوان ڕوی زەوی ئەودا بۆشاییەك هەبێ ٥ دەگوترێ: (بئر بعيدة النفنف) بیرێکە نێوان بنکیو زارکی زۆرە ٥ (ك: نفانِف) ٥ (نفانف الدار) دەوروبەری خانوو.

**نَفُهَ نُفوهاً**: ترسنۆك بوو ٥ دڵی زەعیفو لاواز بوو ٥ ئاژەڵی چەموش کەژێر بار بکرێو بچەمێندرێ.

**نَفِهَتْ نفس فلان نَفَهاً**: نەفسی فلآنکەس ماندو بوو لەوزەی دا نەما (فهو نافِهٌ).

**أنْفَهَ لفلان من مالە**:بەخششی بۆ فلآنکەس کەمکردەوە.

**أنْفَهَ الدَّابة**: وڵاخەکەی ماندو کرد.

**نَفَّهَ الدابة**: وڵاخەکەی ماندو کرد.

**إسْتَنْفَهَ فلان**: فلآنکەس ئیسراحەتی کرد ٥ پشوی دا.

**نَفَاهُ نفواً**: دوری خستەوە.

**النُّفايةُ من الشَّيْئِ**: گوێزرو بنزیلو قرپۆکی شتو بەرماوەی شت.

**نَفَى الشَّيْئَ نَفْياً**: شتەکەی دوورخستەوە.

**نَفَى الحاكم فلاناً**: فەرمانڕەوا فلآنکەسی لەوڵاتی خۆی دوورخستەوە دەری کرد.

**نَفَتَ السحابة ماءَها**: هەورەکە بارانی خۆی باراند ٥ هەروا وشەی (نفی) بەمانا ئینکارکردن دێ ٥ دەڵێ ئەوشتە هەرنەبووە ڕوی نەداوە.

**نَفَت الريحُ التراب**: ڕەشەباکە گڵو خۆڵەکەی ڕادا.

**نافاه**: دژی وەستا پێچەوانە بوو ٥ دەگوترێ: (هذه القضية تنافي تلك).

**إنْتَفَى**: دوورکەوتەوە، دەگوترێ: (إنْتَفى الرجل عَنْ بلده) پیاوەکە لەزێدو نیشتمانی خۆی دوورخرایەوە دەرکرا.

**إنْتَفَى شَعْرُهُ**: قژی هەڵوەرین (إنْتفى الشجر عَنْ الوادي) درەختی شیو و

دۆڵەکە فەوتان.

**إنْتَفَى من الشَّيْئ:** خۆی لەشتەکە بێ بەری کردو خۆی لێ ڕزگار کرد.

**تنافت الأحكام أو الآراء:** بڕیارەکان یان بۆچوونەکان دژ بەیەكو پێچەوانەی یەکتر بوون.

**المَنْفَى:** شوێنی کەسانی دوورخراوە لەزێدو نیشتمانیان.

**النُفايَةُ:** شتی فرێدراو لەبەر بێ کەڵکیو خراپی ٥ باقی مەندەی شت ٥ (نُفاية المطر) پرژو پریشکی باران ٥ دەشگوترێ: (هو نُفاية القوم) ئەو خوێڕی نەتەوەکەیەتی، یەکێکە لەهەتیومچەکانی نەتەوە.

**النَّفْيُ:** پێچەوانەی ئیجابو ئیسپاتە ٥ (عقوبة النفي) سزایەکە بریتییە لەوە تاوانبار لەزێدو نیشتمانی خۆی دوور بخرێتەوە بۆ شوێنێکی تر بۆ ماوەیەکی دیاریکراو یان دیاری نەکراو.

**النَّفَيان:** ئەوەی هەور دەیڕێژێ لەناوی خۆی ٥ لافاو.

**النَّفِيَّةُ:** سفرەو خوانێکە لەپوشو پرژە خورما دروست دەکرێ پێشی دەگوترێ سەلە، گۆشتو پەنیرو شتی وای لەسەر دادەنرێو دەخرێتە بەر خۆرەتاو تا وشك بێتەوە.

**النُفْيَةُ:** پاشماوەو بەرماوەی شت ٥ شتی فرێدراو لەبەر خراپیو بێ کەڵکی.

**النَفِيُّ:** بەمانا (النُفاية) دێ دوورخراوە لەزێدو نیشتمانی خۆی ٥ دەگوترێ: (هذا نَفِيُّ الريح) ئەوە هاوردەو فرێدراوی ڕەشەبایە ٥ ئەو گڵو خۆڵو شتەیە کەڕەشەبایەکە لەبن قەدە درەختەکانی دا هێشتویەتیەوە ٥ (نَفي الرحى) ئەو ئاردەیە بەرداشەکە لەسوڕی خولانەوەیدا فرێی دەداتە دەر ٥ (نَفِيُ القِدر) ئەو دڵۆپە ئاوانەن کەمەنجەڵ لەکاتی کوڵان دا فرێی دەداتە دەر ٥ (نَفِيُ الجيش) ئەو سەربازانەی دەکەونە قەراخو بیجاخی سوپا ٥ (فلان نفي) فلان باوکی دیاریی نیەو بۆخۆی ترۆ کراوە.

**نَقَبَ فلان في الأرض نَقْباً:** فلانکەس بەناوزەوی دا گەڕا ٥ ڕۆیشت.

**نَقَبَ عَنْ الشَّيْئ:** لەشتەکەی کۆڵیەوە.

**نَقَبَ الجلدَ أو الجدارَ:** پیستەکە یان دیوارەکەی کون کرد ٥ دەشگوترێ: (نَقَبت النَكْبَةُ فلاناً) کارەساتو تێشکانەکە فلانکەسی کەلەپاچە کرد.

**نَقَبَ الثوبَ:** قوماشەکەی کردە دەرپێی کورت.

**نَقِبَ الشَّيْئُ نَقَباً:** شتەکە کون بوو.

**نَقِبَ البعيرُ**: حوشترەکە سمی تەنك بوون (سمی سوان).

**نَقُبَ على القوم نقابةً**: بوو بەگەورەو ریش سپی خەڵکەکە ٥ (ناقَبَ فلاناً): توشی فلان بوو بەبێ وادەو نەخشەی پێش وەخت ٥ لەناکاو توشی بوو.

**لَقيته نِقاباً**: لەناکاو تووشی بووم.

**ناقب الرجلَ فَنَقَبهُ**: شانازی بەسەر پیاوەکەدا کرد بەکرداری جوان‌و ڕەوشتی بەرز، بەسەری دا زاڵ بوو.

**نَقَّبَ**: بۆ زێدەڕەوی لەمانای (نَقَبَ) دا دێ.

**نَقَّبَ عَنْ الشَّيْءِ**: زۆری لەشتەکە کۆڵیەوەو وردبینی تێدا کرد.

**تَنَقَّبَت المرأةُ**: ئافرەتەکە چارشێوی بەسەر ڕوخساری خۆی دا دادایەوە.

**المَنْقَبُ**: ڕێگەی تەنگەبەر لەنێوان دوو کێو دا ٥ دەربەندو تەنگڵ ٥ ئەو شوێنەی لێکۆڵەرەوە هەوڵی خۆی تێدا ئەنجام دەدا.

**المِنْقَبُ**: شت کونکەر ٥ کەسێك زۆر لەشت بکۆڵێتەوە.

**المَنْقَبَةُ**: ڕێگای تەنگ لەنیوان دوو خانودا کەنەتواندرێ ڕەوی پێدا بکرێ ٥ کرداری چاك ڕەوشتی بەرز ٥ (ك: مناقِب).

**المِنْقَبَةُ**: بەمانا (المِنْقَبُ) دێ.

**النَّاقِبَةُ**: برینێکە لەلای تەنیشتی مرۆڤ پەیدا دەبێ‌و دەتەنێتەوە بۆ ناوەوەی جەستە.

**النِّقَابُ**: زاناو بلیمەت‌و زیرەك ٥ سەرپۆشێك ئافرەت دەم‌و لوتی خۆی پێ دادەپۆشێ ٥ سك، دەگوترێ: (هما فرخان في نِقاب واحد) ئەوانە دوولانەن‌و بەیەك سك بوون‌و لەیەك دەچن.

**النِّقابة**: سەندیکا؛ کۆمەڵێك هەڵبژێرێن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری تایەفەو پێڕێك لەخەڵك وەکوو سەندیکای کرێکاران، سەندیکای ئەندازیاران، سەندیکای ڕۆژنامەنووسان ...هتد ٥ هەڵبژێراوەکان لەناو خۆیان دا یەکێك دەکەن بەنەقیب‌و یەکێکی تر بەجێگرو بەو جۆرە ٥ سەیید نژادەکانی کوردستان‌و عێراقیش کاتی خۆی لە (مەجلیسی مەبعوسان)دا نوێنەرێکیان هەبوە پێیان گوتووە نەقیب‌و نوێنەرایەتی سەییدەکانی کردووە.

**النَّقَّابُ**: کەسێك زۆر پشکنین بکاو لەشت بکۆڵێتەوە.

**النَّقْبُ**: کون لەپێست‌و دیوارو شتی وادا ٥ (ك: أنقاب، نِقاب).

**النُّقْبَةُ**: دەرپێی کورت، یان دەرپێی بێ دەرەلینگ ٥ گرۆیییو لەش خوران یان سەرەتای گرۆییی ٥ شوێنی ژەنگ ٥ کاریگەریی ژەنگ لەسەر شتێك ٥ دەگوترێ: (جلوت سيفي من نُقْبَتِهِ) شمشێرەکەم لەژەنگ مشتو ماڵ کرد ٥ (إن عليه نقبة من سواد) لەسەر ئەو شتە پەڵە ژەنگی ڕەش هەیە ٥ دەشگوترێ: (فلان حسن النقبة) فلاّنکەس ڕوخسار جوانە.

**النِّقْبَةُ**: شێوەی ڕوخسار داپۆشین ٥ (ك: نِقب).

**النَّقِيبُ**: زورنا ٥ زوبانەی تەرازو ٥ سەرۆکی سەندیکا ٥ پلەیەکە لەپلەی عەسکەریو پۆلیس لەژور پلەی مولازیمو خوار پلەی ڕائیدە ٥ ڕیش سپیو سەرۆکی بنەماڵەو لێ پرسراوی کاروباریان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَبَعَثْنَا مِنهُمُ اثنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا﴾ ٥ (ك: نقباء).

**النَّقِيبَةُ**: (نقيبة الرجل) ئەخلاقو سروشتو ڕەوشتی پیاو ٥ مەشورەت و ڕاپرسی ٥ دەگوترێ: (هو ميمون النقيبة) ڕا دروستو مەشۆرەت پێکراوێکی پیرۆز ٥ هەروا دەگوترێ: (ماله نقيبة) ڕای پەسەندی نیە.

**نَقَثَ فلان في السير أو الأمر نَقْثاً**: فلاّنکەس لەڕۆیشتن دا یان لەکارەکەدا پەلەی کرد.

**نَقَثَ عَنْ الشَّيْئ**: شوێنی شتەکەی هەڵکۆڵی بۆئەوەی دەری بێنێ.

**نَقَثَ الأرضَ**: زەوییەکەی شی کردەوە بەپاچو بێڵ.

**نَقَثَ العَظْمَ**: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا.

**نَقَّثَ فلان في السير أو الأمر**: فلاّنکەس لەڕۆیشتن دا یان لەکارەکەدا پەلەی کرد.

**نَقَّثَ الشَّيْئَ**: شتەکەی گواستەوە.

**إنْتَقَثَ**: دەق بەمانا (نَقَثَ) دێ.

**تَنَقَّثَ فلان**: بەمانا (نَقَثَ) دێ.

**تَنَقَّثَ فلاناً**: هەوڵی دا فلاّنکەس وەگری خۆی بکاو مەیلی لای ئەوی هەبێ.

**تَنَقَّثَ ضَيْعَتَهُ**: کاروباری ئەوی گرتە دەست خۆی.

**نَقَاثِ**: ناوە بۆ کەمتیار.

**النُّقْثُ**: فیتنەیی.

**نَقَحَ الشَّيْئَ نَقْحاً**: چاکی شتەکەی لەخراپەکەی جیاکردەوە.

**نَقَحَ العَظْمَ**: مۆخی ئێسقانەکەی دەرهێنا.

**نَقَحَ العودَ**: چڵەدارەکەی سپی کرد، توێکڵەکەی لێ کردەوە.

**نَقَحَ الجِذْعَ**: پرژو پاڵی لە لقەدارەکە کردەوەو گرییەکانی لوس کردن ٥ دەشگوترێ: (نَقَحَ الكلامَ أو الكتابَ)

قـــسەکەی ڕێـــك‌و پێـــك کـــردەوە، کتێبەکـەی ڕاسـت کـردەوە هەڵـەکانی لابردن.

**ناقَحَهُ:** قەلاچۆی کرد.

**نَقَّحَ:** بۆ زێدەڕۆیی لـەمانای (نَقَـحَ) دا دێ.

**نَقَّحَ الكـلامَ أو الكتـابَ:** کەلامەکـەی پاڵفتـە کـرد، هەڵـەو نارێکیـەکانی لابردن.

**نَقَّحَتْـهُ الـسنون:** ڕۆژگـار بڕسـتی لێ بڕیوەو کاری خۆی لێ کردووە.

**إنـتَقَحَ العَظْـمَ:** مـۆخی ئێـسقانەکەی دەرهێنا.

**تَــنَقَّحَ شـحْمُ الناقــةِ:** بـەزو پیـوی حوشترەکە کەم بوو.

**المُنَقَّح:** دەگوترێ: (رجل مُنَقَّحٌ) پیاوێکی خاوەن ئـەزمون‌و فـاڵبوی ڕۆژگارە ◊ هەروا دەگوترێ: (طبعة من الكتـاب مُنَقَّحَـةٌ) چـاپی ئـەمجارەی کتێبەکـە پاڵفتەکراوە.

**النَّقْحُ:** هەوری سپی هاوینە.

**النَّقِحُ:** زانای شارەزاو فـاڵبوو لـەزانیاری دا ◊ دەگوترێ: (إنَّه لَنِقْحٌ).

**النَّقِحُ:** لبی شۆراوەو پاڵفتە.

**نَقَخَ رأسَـهُ بالعـصا:** بەگۆچـان و دارعەسا لەسەری دا.

**نَقَخَ المُخَّ من العظم:** مۆخی لـە ئێـسقانەکە دەرهێنا.

**نَقَـخَ المـاءُ العَطَـشَ:** ئاوەکـە تینوایـەتی شکاند.

**إنـتَقَخَ المُـخَّ مـن العظـم:** مـۆخی لـە ئێسقانەکە دەرهێنا.

**الأنْقَـخُ:** دەمـاغ بـچوك ◊ کـەم دەمـاغ ◊ دەگـوترێ: (ظلـيم أنْقَـخُ) بێـچوە نوعامەیەکی بێ دەماغە.

**النُّقـاخ:** پاڵفتـەو خـالیص لەهـەموو شـتێك ◊ دەگـوترێ: (هــذا نُقــاخ العربيــة) ئەمـــە پاڵفتـــەی زمـــانی عەرەبییە ◊ هەروا وشەی (النُّقـاخ) بەمانا ئاوی ساردو صاف‌و گوارا دێ ◊ ئاوی زۆر کە بیرهەڵکەن لەشوێنی بـێ ئـاو و بێـرون دا زەوی بـۆ هـەڵکۆڵێ‌و دەری بێنـێ ◊ نووسـتنی ئەمین‌و ئامان‌و بێ وەی.

**النُّقْخَـةُ:** ئافرەتێـك لەبـەر قەڵـەوی نەتوانێ بـڕوا ◊ لەڕۆیـشتن دا لەبـەر گۆشتنی بەهێواشی هەنگاو هەڵێنێ.

**النُّقّاخُ:** لای پێشەوەی پشتە مـل (واتـە: دەوروبـەری گوێـچکەو ئێـسقانی پشتگوێ).

**نَقَدَ الـشَّيْءَ نَقـداً:** شتەکەی سوژن هـاژن کـــرد بۆنـــەوەی بـــەتاقی بکاتـــەوە، شـتەکەی لەبۆتـەدا بۆنـەوەی چـاك‌و خـراپ لێـك جیابکاتـەوە ◊ دەگـوترێ:

(نَقَدَ الدراهم والدنانير وغيرهما) دیناره زێڕو دیرهەمە زیوەکانی لەبۆتەداو ئەسڵو تەزویری لێك هەڵاوارد ٥ هەروا دەگوترێ: (نَقَدَ الشِّعْرَ و نَقَدَ النثرَ) عەیبو لەکەی لەشیعرو پەخشانەکەدا هەن هەمووی دەرخستن یان لایەنە جوانەکانی شیعرو پەخشانەکەی خستنە ڕو ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان ینقد الناسَ) فلانکەس ڕەخنە لەخەڵك دەگرێو عەیبو عاری ئەوانی دەرخستنو پاشملە غەیبەتیان دەکا.

نَقَدَت الحیّةُ فلاناً: مار بەفلانکەسیەوە دا، مارگەستی.

نَقَدَ الشَّیْئَ وإلیه ببصره نقوداً: بەتیلەی چاوی بۆشتەکەی ڕوانی بۆنەوەی هەستی پێ نەکرێ کە بۆ ئەو دەڕوانێ.

نَقَدَ فلاناً الدارهِمَ نقداً وتنقاداً: پارەکەی بۆ فلانکەس ژماردو دایە دەستی.

نَقَدَ فلاناً الثمَنَ، وله الثمنَ: پارەکەی بەحازری و دەستەو پەخشە دا بەفلانکەسو هیچ دوای نەخست.

نَقِدَ الشَّیْئُ نَقَداً: شتەکە گەندەڵی تێدا دروست بوو ٥ دەگوترێ: (نَقِدَ الضِرْسُ أو القَرْنُ) ددانەکە یان شاخەکە کرمۆڵ بوو، داخوران، شکان.

نَقِدَ الحافِرُ: سمەکە توێکڵی هەڵدا.

أَنْقَدَ الشَّجَرُ: درەختەکە گەڵای کرد.

ناقَدهُ: موناقەشەی لەگەڵ دا کرد دەربارەی کارەکە.

إنتقَدَ الوَلَدُ: منداڵەکەی گەورە بوو.

إنتقَدَ الدراهم: دیرهەمەکانی وەرگرتن ٥ پارەپوچو تەزویرەکانی جیاکردەوە، دەشگوترێ: (إنتَقَدَ الشعر علی قائله) عەیبو خەوشی شیعری شاعیرەکەی دەرخستن.

إنتَقَدَت الأرضُ الجِذعَ: گڵەکە لقەدارەکەی گەندەڵ کرد و ڕزاندی.

تناقد وتَنَقَّدَ الدَّراهِمَ وغیرها: دیرهەمەکانی لەبۆتە دان ساغو تەزویری لێك هەڵاوارد.

الأنْقَدُ: کیسەڵ، یان کەسێك ددانی ژان بکا ٥ ژیشك ٥ هەر لەم ڕوەویە کەلەپەندی پێشینان دا هاتووە (أسری من أنقد) لەژیشك شەوڕەوترە، چونکە ژیشك قەت بەشەو ناخەوێ ٥ هەروەها لەپەندێکی تردا گوتراوە (بات بلیل أنقد) بەشەو بەخەبەر مایەوە نەنوست.

الإنْقِدان: کیسەڵ.

المِنْقادُ: دەندوك.

المِنْقَدَةُ: ئامێری جیاکردنەوەی گوێزی کوێرەكو ئازا لەیەکتری ٥ پارچە

ڕاخەرێکـــە گـــوێزی لەســـەر جیادەکرێتەوە.

**النّاقد الفني**: ڕەخنەگری هونەریی؛ نووسەرێك کاری سەرەکی ئەوەبێ کاری هونەری و ناهونەری لێك جیابکاتەوە ٥ کاری باش‌و خراپ لێك جیادەکاتەوە ٥ (ك: نقاد ونقدة) ٥ (النَّقْدُ) لەبواری کڕین‌و فرۆشتن دا فرۆشتن‌و کڕین بەپارەی حازر، (واتە: پێچەوانەی قەرز) ٥ هەروا دەگوترێ: (درهم نقدٌ) دیرهەمی زیوی ئەصڵ واتە: تەزویر نیە ٥ هەروا ناوە بۆ پارەی سکە لێدراو چ زێڕبێ چ زیو بێ ٥ یان هەر پارەیەکی تر کەلەبازاڕادا مامەڵەی پێ بکرێ ٥ هەروا ناوە بۆ فەنێك قسەی باش‌و خراپی پێ لێك جیادەکرێتەوە.

**النِّقْدُ**: مرۆڤی کەم نمودو گەشە نەکردوو.

**النَّقَدُ**: جۆرە درەختێکە گوڵێکی زەردی هەیە لەسارا دەڕوێ ٥ جۆرە مەڕێکە قەبارە بچوك ٥ یان ڕەگەزێکە لەئاژەڵی مەڕ قاچ بچوك دەم‌و لمبۆز ناشیرین لە وڵاتی بەحرەین هەیە بەخێودەکرێ، تاکەکەی پێی دەگوترێ: (نَقَدَةٌ) ٥ (ك: نقاد ونقادة) ٥ هەروا ناوە بۆ مرۆڤی خوێڕی‌و هەتیومچە.

**النُّقْدَةُ**: بڕوانە مادەی (الكَرَوْيا).

**النُّقَادُ**: ئەو کەسەی پارەی تەزویرو ئەصڵ لێك جیادەکاتەوە ٥ شوانی ئەو جۆرە مەڕەی کەپێی دەگوترێ: (النَّقَدُ) لەوڵاتی بەحرەین بەخێودەکرێ ٥ یان خاوەنی ئەو جۆرە مەڕەیە.

**نَقِذَ نَقَذاً**: ڕزگاری بوو خەلست ٥ دەگوترێ: (أنقذته فنقِذ).

**أنْقَذَهُ**: ڕزگاری کرد، قوتاری کرد، دەگوترێ: (أنقذته من الشر) و (أنقذت الشَّيْءَ منه).

**نَقَذَهُ**: بەمانا (أنقذه) دێ.

**تَنَقَّذَهُ**: بەمانا (أنْقَذَهُ) دێ.

**تَنَقَّذ منه الحديث**: قسەکەم لێ دەرهێنا ٥ قسەم لێ وەرگرت.

**إسْتَنْقَذَهُ**: بەمانا (أنْقَذَهُ) دێ.

**الأنْقَذُ**: قالۆچە.

**النُّقُذُ**: سەلامەتی‌و ڕزگاربوون ٥ دەگوترێ: (نقذاً لك) سەلامەتی‌و بێ وەیی بۆتۆبێ هەمیشە لەخۆشی دا بی.

**النَّقَذُ**: ڕزگارکراو، ئەوەی لەدەستی یەکێکی تر ڕزگاری دەکەی ٥ دەگوترێ: (ماله شَقَذٌ ولانقذ) واتە هیچی نیە.

**النَّقيذُ:** ئەوەی لەدەستی دوژمن ڕزگار دەکرێ ٥ (ك: نقائذ).

**النَّقيذةُ:** بەمانا (النَّقيذ) دێ ٥ دەگوترێ: (هو نقيذة بؤس) ئەو ڕزگار بووی بەڵاو کارەساتە ٥ هەروا ناوە بۆ زرێ لەم ڕووەوە کە زرێ جەستەی مرۆڤ دەپارێزێ لەزەبری شمشێرو شتی وا ٥ (ك: نقائذ).

**نَقَرَ عَنْ الأمر نَقْراً:** لەشتەکەی کۆڵیەوە.

**نَقَرَ في الحجر:** لەسەر بەردەکەی نووسی.

**نَقَرَ في صلاته:** پەلەی کرد لەئەنجامدانی نوێژەکەی داو خێرا خێراو سەرسەرەکی نوێژی کرد ٥ لەحەدیس دا هاتووە: کە پێغەمبەر (د.خ) (نهی عَنْ نقرة الغراب) نەی کردووە لە ئەنجامدانی نوێژ بەشێوەی پەلەپەلو چوونەڕوکوعو سجود وەك دەندوك لەزەوی دانی قەلەڕەشە.

**نَقَرَ بلسانه:** بەزوبان فیکەی لێ دا.

**نَقَرَ بالدابة:** دەنگی لە وڵاخەکە کرد بۆئەوەی خێرا بڕوا ٥ دەشگوترێ: (نَقَرَ بفلان) لەناو خەڵکەکەدا تەنیا بانگی فلانکەسی کرد.

**نَقَرَ في الصور:** فوی بەکەڕەنا دا کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ﴾.

**نَقَرَ الشَّيْءَ بالشيء:** شتەکەی بەشتەکە کێشا ٥ دەگوترێ: (نَقَرَ رأسَهُ بأصبعه) بەپەنجەی لەسەری خۆی دا ٥ (نَقَرَ الدفّ) دەفەکەی ژەنی ٥ (نَقَرَ العودَ) عودەکەی لێ دا.

**نَقَرَ السَّهْمُ الهدفَ:** تیرەکە لەنیشانی دا.

**نَقَرَ الطائرُ الحَبَّ:** باڵندەکە دەنکە دانەوێڵەکانی چنینەوە.

**نَقَرَ شيئاً من الطعام:** بەپەنجە هەندێ لە خواردنەکەی هەڵگرت.

**نَقَرَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بەئامێری هەڵکۆڵین هەڵکۆڵی.

**نَقَرَ النَّقّارُ الخشبة:** نەقارەکە تەختەدارەکەی کونجکونج کرد.

**نَقَرَ الخَيْلُ الأرضَ:** ئەسپەکە بەسمەکانی زەوییەکەی قوڵکە قوڵکە کرد.

**نَقَرَ فلاناً:** ڕەخنەی لەفلان گرت.

**نَقِرَ فلاناً نَقَراً:** فلانکەس هەژار کەوت.

**نَقِرَت الشاةُ:** مەڕەکە تووشی نەخۆشی تەبەقەو سم داوەشان بوو.

**نَقِرَ عليه:** ڕقی لێ هەڵسا ٥ (فهو نَقِرٌ ونَقِرَةٌ).

**أنْقَرَ عنه:** وازی لێ هێنا ٥ دەگوترێ: (ضَرَبَهُ فما أنقر عنه حتى قتله) لێی داو وازی لێ نەهێنا هەتا کوشتی.

**ناقَرَهُ مناقَرَةً ونقاراً:** کێشەی لەگەڵ دا نایەوەو بەربەرچی قسەکەی دایەوە.

**نَقَّرَ الطائر في الموضع:** باڵندەکە زەوییەکەی تەختو خۆش کرد بۆئەوەی هێلکەی تێدا بکا.
**نَقَّرَ بأسم فلان:** لەناو کۆمەڵ دا ناوی فلانی دیاری کرد.
**نَقَّرَ الشَّيْءَ وعنه:** لێی کۆڵیەوەو پشکنینی بۆ کرد.
**إنْتَقَرَ الشَّيْءَ:** شتەکەی بەبێ نرخو پوچ لەقەڵەم دا ○ دەشگوترێ: (جرت السيولُ فإنتقَرَتْ نُقَراً إحتبس فيها الماءُ) لافاو هەڵساو زەوی قوڵکە قوڵکە کردو ئاوتێیان داوەستا.
**إنْتَقَرَ الشَّيْءَ وعنه:** بەمانا (نَقَرَ) دێ.
**إنْتَقَرَ الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵبژارد.
**إنْتَقَرَ في الدعوة الى الوليمة:** بۆ داوەتەکە هەندێ خەڵکی بانگ کردو هەندێکی بانگ نەکردن.
**إنْتَقَرَ الرجلَ وبالرجل:** پیاوەکەی تایبەت کرد بە بانگ کردن هەربەتەنها بانگی ئەوی کرد لەناو کۆمەڵە پیاوەکەدا.
**تَنَقَّرَ الشَّيْءَ:** لەشتەکەی کۆڵیەوە.
**تَنَقَّرَ على الأهل والمال:** دوعای لەخزمو خێزانو ماڵو سامانی کرد.
**الأنقورَةُ:** چالاّیی‌و شیوەڵی سەرەدەنکە دانەوێڵە.
**المِنْقارُ:** دەندوکی باڵندە ○ (ك: مناقير) هەروا ناوە بۆ ئاسنێك وەكوو پاچ وایە کەوانەییە بەردی پێ دەبڕدرێنەوە ○ ئامێرێکە داری پێ کونکون دەکرێ.
**المِنْقَرُ:** چەکوش ○ (ك: مناقِر).
**المُنْقُرُ:** دارێکە کون دەکرێو شەرابی تێدا دەکرێ بەسرکە ○ بیری ئاوی بچوك ○ یان بیری سەرتەسك کەلەزەوی توندو پتەودا لێ بدرێ ○ (ك: مناقير).
**النَّاقِرُ:** تیر: کەنیشانە بهەنگێوێ.
**النَّاقِرَةُ:** بەڵگەی کاریگەر ○ (ك: نواقِر) دەگوترێ: (أتتني عنه نواقِر) لەو کابرایەوە قسەیەکی ناشرینم پێ گەیی ○ (أخطأت نواقِر فلان) بەڵگەو دەلیلی فلان جێی خۆیان نەگرت هەڵەیان کرد.
**النَّاقور:** کەرەناو شاخێکە فوی پێدا دەکرێ وەکوو نیشانەو پێشەکی دونیا وێرانبون دەناسرێ ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ﴾ ○ (ك: نواقير).
**النُّقَارَةُ:** ماوەی ئەوەندەی باڵندە دەندوکی بەمارو کرمو شتی وادا دەدا ○ ئەو وردە و پارچۆکانەی لەکاتی بەرد چاککردن دا لەبەردەکە دەبنەوە، یان ئەو پارچە

دارانەی لەدار برینەوەدا هەڵدەوەرن ٥ دەگوترێ: (ماترك عندي نقارة إلا إنتقرها) هەرشتێکی بەکەڵك هاتو لام بوو بردی‌و هیچی نەهێشتەوە.

**النِّقارة**: پیشەی بەرد چاککردن‌و بەرد بیراز کردن.

**النَّقْرُ**: کوتانەوەو بیرازکردنی شت تادەگاتە ئەندازەی کونکردن ٥ چەقەنە لێدان: کەلەناکامی پێکێشانی قامکە گەورە بە قامکی ناوەڕاست پەیدا دەبێ.

**النُّقْرُ**: بەمانا (الأنقور) دێ.

**النَّقِرُ**: سیفەتی موشەبەهەیە ٥ ئاو یان بیر.

**النَّقَرُ**: دەگوترێ: (أعوذ بالله من العَقَر والنَّقَرِ) پەنا دەگرم بەخودا لە ئیفلیجی‌و ماڵ فەوتان‌و هەژاریی.

**النَّقَرى**: عەیب‌و تانە ٥ داوای تایبەتی ٥ دەگوترێ: (إن المولِمَ منا لايدعوا النقرى) داوەتکەر لەئێمە داوەتی تایبەتی ناکا بەڵکوو بانگی هەموو کەس دەکا.

**النُّقْرَةُ**: شەڕە دەنووك، دەگوترێ: (بينهما نِقَرَةٌ).

**النُّقْرَةُ**: چاڵی بچوك‌و کەوانەیی لەزەوی‌و بەردو شاخ‌و شتی تر کەئاوی باران‌و لافاوی تێدا دەمێنێتەوە.

**نُقْرَة القفا**: قوڵکەیەکە لەکۆتایی دەماغ دا ٥ قوڵکەی چاو ٥ قوڵکەو لانەی هێلکە کردن ٥ پارچەی زێڕو زیو کە بتوێنرێتەوە.

**النُّقْرَةُ**: دەردێکە تووشی قاچی ئاژەڵ دەبێ.

**النَّقّارُ**: کەسێك زۆر لێکۆڵینەوەو پشکنین ئەنجام بدا ٥ دەگوترێ: (رجل نَقّارٌ) پیاوێکی لێکۆڵەرەوەو پشکێنەرە لە کاروبارو هەواڵگری دا ٥ کەسێك پیشەی ئەوە بێ نەقاری بەردبکا یان دار کونج کونج بکا.

**النَّقِيُّ**: ئەو بەردو دارەی کونج کونج دەکرێ ٥ قەدە دار کە گرن گرن دەکرێ‌و وەکوو پلیکانە پێیدا سەردەکەون بۆ بەرزایی‌و سەربان ٥ قەدە دارێکە کاسەی لێ دروست دەکرێ‌و سرکەی خورمای تێدا دروست دەکرێ ٥ چاڵایی‌و شیوەڵی سەر دانەوێڵە ٥ شتی پڕو پوچ‌و کەم نرخ، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا﴾ ٥ هەژارو ئاتاج ٥ توێکڵی دانەوێڵە.

**النقيرة**: کەشتی بچوك.

**نَقْرَدَ في المكان**: زۆر لەشوێنەکە مایەوە.

**المُنَقْرِدُ**: دەگوترێ: (مالك مُنقرِداً) ئەتۆ مانەوەت نیە، هۆکاری مانەوەت نیە.

النَّقْـــرِسُ: نەخۆشـــییەکی بـــەئازارە بـەزۆری لەجومزگـەی قاچو قـامکی قـــاچ دا پەیـــدا دەبـــێ ٥ پێـــشی دەگوتریّ: (داء الملوك) دەردە پاشا ٥ فەوتانو تێداچوون ٥ بەڵای گەورە ٥ (ك: نقارِس).

النِّقْـــرِيسُ: چاوسـاغو ڕێ نیـشاندەری شارەزاو زیـرەك ٥ پزیـشکی شارەزاو زیرەك ٥ شتێکە وەکوو گوڵ ئافرەت لەسەری خۆی شەتەکی دەدا ٥ (ك: نقاريس).

نَقْـــرَشَ الـــشَّيْئَ: شـــتەکەی ڕنـــی ٥ ڕازانـدیـــــەوە ٥ لەقانـــدی ٥ لێـــی کۆڵیەوە.

النَّقْرَشَـــــــةُ: هەســــــتی کــــــەم ٥ زەخرەفەکردنو جوانکردن.

نَقَـزَ الظبيُ وغيره في عَـدْوِه نقـزاً ونقزاناً: ئاسکەکە خۆی بەرز کردەوەو بازی دا.

أنْقَـزَ فـلان: فلانکـەس شتی خراپـی هـەلگرتو کـردی بـەماڵی خـۆی ٥ بەردەوام بـوو لەسـەر خواردنـەوەی ئـــاوی صـــاف ٥ ئاژەڵــــەکانی نەخۆشــــــییان تێکـــــــەوتو منداربوونەوە.

أنْقَزَ عَنْ الشَّيْئ: وازی لە شتەکە هێنـا، تەرکی کرد.

أنْقَـزَ عَـدُوَّهُ: دوژمنەکـەی بـەخێرایی کوشت.

نَقَّـزَهُ: بـازی پـێ داو هـەڵی پەڕانـد، ڕەقصاندی ٥ دەگـوترێ: (نَقَّزَت المرأةُ صـــبيّها) ئافرەتەکـــە منداڵەکـــەی هەڵپەڕاند.

إنْتَقَزَت الماشيةُ: ئاژەڵەکان نەخۆشییان تێکەوت.

إنْتَقَـزَ لفـلان مالَـه: مـاڵی خـراپو بـێ کەڵکی بۆ هەڵبژاردو پێی دا.

المَنْقوزُ: توشبوو بـە نـەخۆشی (نوقـاز) جۆرە دەردێکە توشی ئاژەڵ دەبێ.

النّـــاقِزُ: دەگـــوترێ: (عطـــاء نـــاقِز) بەخشیشی خـراپو بـێ نـرخ ٥ (ذو ناقز) خاوەنی ماڵی خراپ.

النـاقِزَةُ: یـەکێك لەقاچـەکانی ئـاژەڵ ٥ (ك: نواقز).

النُّقـاز: دەردێکـە توشـی ئـاژەڵ دەبـێو منداری دەکاتەوە.

النَّقَزُ: شتی خـراپو بـێ کـەڵك، پیـاوی خـوێڕیو هەتیومـچە ٥ دەگـوترێ: (أعطاه من نقـز المـال) مـاڵی خراپـی پێدا ٥ نازناو و لەقەب.

النَّقْزُ: ئاوی صافو بێگەرد.

النُّقْزُ: ئاوی صافو بێگەرد ٥ بیر.

النُّقْزُ: بیر.

النُّقازُ: چۆلەکە ٥ یان چۆلەکەی بچوك ٥ (ك: نقاقيز).

**نَقَسَ الناقوسُ نَقْساً:** زنگەکە لێی دا، دەنگی هات.

**نَقَسَ فلان:** فلانکەس زەنگی لێ دا ٥ دەگوترێ: (نَقَسَ بالناقوس).

**نَقَسَ الشرابُ:** شەرابەکە مزر بوو.

**نَقَسَ بين القوم:** فیتنەو ئاشوبی لەنێو خەڵکەکەدا نایەوە.

**نَقَسَ فلاناً:** ڕەخنەی لەفلانکەس گرتو تانەو تەشەری لێ دا.

**تناقَسَهُ:** ڕەخنەیان لەیەکتر گرت ٥ دەگوترێ: (بینهما منافسة ومناقسة).

**نَقَّسَ فلاناً:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَقَسَ) دێ.

**نَقَّسَ القومَ بناقوسه:** بەزەنگو شاورەکەی بانگی خەڵکی کرد.

**نَقَّسَ الدَّواةَ:** ئوچەکەی خستە ناو شوشە مەرەکەبەکە بۆئەوەی پێی بنوسێ.

**الناقوس:** زەنگێکە بۆئەوە کاتی نوێژکردنیان هاتووە ٥ (ك: نواقیس).

**النِّقاسَةُ:** عەیبو گاڵتە پێکردن.

**النُّقْسُ:** جۆرێکە لەزەنگو زەنگوڵە.

**النِّقْسُ:** مەرەکەب کە شتی پێ دەنووسرێ ٥ (ك: أنقُسُ، أنقاس).

**النَّقِيسُ:** دەگوترێ: (رجل نقيسٌ) پیاوێکە ڕەخنە لەخەڵك دەگرێ.

**نَقَشَ الشَّيْءَ نَقْشاً:** لەشتەکەی کۆڵیەوەو بەدوایدا چوو دەری هێنا ٥ دەگوترێ: (نَقَشَ الشوكة بالمنقاش) چقڵەکەی بەموکێش دەرهێنا.

**نَقَشَ الحق من فلان:** مافەکەی لەفلاَن وەرگرتەوە.

**نَقَشَ الشَّعْرَ:** مووەکانی هەڵکەندن.

**نَقَشَ مَرْبِضَ الغنَمَ:** کۆزو گەوەو ئاغەڵی مەڕو بزنەکانی ماڵی، خاوێن کردەوە ٥ لەحەدیس دا هاتووە: (إستوصوا بالمعزى خيراً فانه مال رقيق وأنقشوا له عطنه).

**نَقَشَ الشَّيْءَ:** شتەکەی ڕەنگاوڕەنگ کردو ڕازاندیەوە.

**نَقَشَ الرَّحى:** بەرداشی ئاشەکەی بیراز کرد بۆئەوەی زبر بێو باش دانەوێڵەکە بهاڕێو وردی بکا.

**نَقَشَ العِذْقَ:** هێشوە خورماکەی چقڵ هاژن کرد بۆئەوەی زوو شیرین ببێو بگا.

**نُقِشَ العِذْقُ:** هێشوە خورماکە خاڵ خاڵ بوو نیشانەی گەیشتویی لێ دیاریی دا ٥ (فهو منقوش).

**أنقش:** بەردەوام بوو لەسەر خواردنی خورمای وشکەڵی تەڕکراو ٥ بەدواداچونی بۆ قەرز دارەکەی ئەنجام دا.

**ناقشه مناقشة ونقاشاً:** لە حیسابەکەی

کۆڵیەوە ٥ دەگوترێ: (ناقشه في الحساب) لە حیسابەکەدا لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرد.

**ناقش المسألة:** مەسەلەکەی لەگەڵ دا باس کرد.

**نَقَّشَهُ:** بەچەن ڕەنگێك ڕەنگی کردو ڕازاندیەوە.

**إنتَقَشَ فلان في فَصِّه:** داوای لە نەخشکەرەکە کرد کەلەسەر نقێمی ئەنگوستیلەکەی نەخشی بۆ دروست بکا.

**إنتَقَشَ الشَّيْءَ:** شتەکەی دەرهێنا ٥ شتەکەی هەڵبژارد.

**إنتَقَشَ منه جميع حقه:** هەموو مافی خۆی لێ ستاند.

**المِنقاشُ:** ئامێری نەخشەکردن (ك: مناقیش) ٥ دەگوترێ: (إستَخرجت منه حقي بالمناقيش) زۆر بە گرەگرو ناخۆشی مافی خۆم لێ ستاند.

**المنقوشة:** برین کە ئێسقانە وردەی لێ دەربێندرێ.

**النَّقَّاشَةُ:** پیشەی نەخشەکاری.

**النُّقْشُ:** شوێنکەو شوێندەست ٥ دەگوترێ: (ذهب الرّمادُ حتى ما نرى له نَقْشاً) گڵو خۆڵەکە ڕۆیی‌و نەما شوێنەواری نابینین ٥ خورمای وشکەوەبووی تەڕکراو.

**النَّقَّاشُ:** کەسێك پیشەی نەخشکاری بێ.

**النَّقِيشُ:** هاوشانو هاو وێنە ٥ دەگوترێ: (هذا نقيش هذا) ئەوە هاوشانی ئەوە ٥ دەشگوترێ: (ماله ضد ولا نقيش).

**نَقَصَ الشَّيْءُ نقصاً ونقصاناً:** شتەکە کەم بوو، بێ هێز بوو، لاوازو زەبون بوو ٥ دەگوترێ: (نَقَصَ عقله أو دينه) عەقڵی لاواز بوو، ئایینی کز بوو.

**نَقَصَ فلاناً حَقَّهُ:** مافی فلانی ژێر لێودا ٥ حەقی کەم کردەوە.

**نَقَصَ فلاناً نقيصة:** تانەو تەشەری لەفلان دا.

**نَقَصَ الشَّيْءُ فلاناً:** شتەکە پێویستی بەفلان بوو.

**أنقَصَ الشَّيْءَ:** شتەکەی کەم کردەوە.

**نَقَّصَ الشَّيْءَ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (نَقَصَه) دێ.

**إنتَقَصَ الشَّيْءُ:** بەمانا (نَقَصَ) دێ.

**إنتَقَصَ الحَقَّ:** حەقی شاردەوە، مافی پێشێل کرد.

**إنتَقَصَ الثَمَنَ:** نرخەکەی دابەزاند.

**تناقص الشَّيْءَ:** شتەکە وردە وردە کەم بۆوە.

**تَنَقَّصَ الشَّيْءَ:** کەم کەم شتەکەی لێ وەرگرت.

بەشێوەی ڕێك و پێك ڕیوایەتی کرد.

**نَمى الحديثُ نماءً ونُمِيّاً:** قسەکە بڵاو بۆوە.

**نَمى الحيوانُ:** ئاژەڵەکە قەڵەو بوو.

**نَمى الدوابُ:** ئاژەڵ و وڵاخەکان دوورکەوتنەوە بۆ مڵ و موش و لەوەڕخواردن.

**نَمى الصَّيْدُ:** نێچیرەکە بەبریندارى لە ڕاوکەرەکە گوم بوو تیرەکە بەجەستەیەوە بوو.

**نَمى الشَّيْءَ:** شتەکەی بەرز کردەوە لەرێزو بەهای زیاد کرد ٥ دەگوترێ: (فلان يَنميهِ حَسَبُهُ).

**نَمى الحديثَ:** فەرموودەکەی گەیاندەوە گوتەرەکەی.

**نَمى فلاناً الى فلان:** فلانکەسی پاڵ فلانکەس دا.

**نَمَى المالَ ونحوه:** ماڵەکەی زیاد کردو گەشەی پێدا.

**أنمى الكرمُ إنماءً:** دارمێوەکە پۆخی دەرکەوتن، خەریکە گەلاکەی دەربکەوێ.

**أنمى الشَّيْءَ:** گەشەی بەشتەکە دا.

**أنمى الراعي دوابَّهُ:** وڵاخ و ئاژەڵەکانی لەلەوەڕگاکەدا لێك بڵاوکردن بۆئەوەی هەریەکەیان لەپانتاییەك دا بلەوەڕێ.

**أنمى الصيدَ:** تیری بەنێچیرەکەوە ناو هەنگاوتی و بۆی نەگیرا لەشوێنێکی دوور منداربۆوە.

**نَمَّى الشَّيْءَ أو الحديثَ تَنْمِيَةً:** گەشەی بەشتەکە دا ٥ قسەکەی بەشێوەی فیتنەیی هێناوبرد.

**نَمَّى النار:** سوتەمەنی بۆ ئاگرەکە زیاد کرد.

**إنتمى الطائرُ:** باڵندەکە لەشوێنێ هەڵفڕی بۆ شوێنێکی تر چوو.

**إنتمى الى الجَبَلَ:** چووە سەر کێوەکە.

**إنْتَمَى الى كذا:** نیسبەت درا بۆلای ئەوە.

**تَنَمّى:** بەمانا (إنتمى) دێ.

**الأُنمِيُّ:** شریفێکە کای تێدەکرێ.

**النّامي:** هەرشتێك گەش و نمای تێدا بێ وەکوو گیاندارو ڕوەك و درەخت.

**النّامية:** خەڵك (مخلوقات) ٥ تولە مێو کەهێشوەترێی پێوەبێ.

**النَّماءُ:** مێروی بچوك.

**النَّمْوَةُ:** زیبادە.

**الأنموذج:** نموونە.

**النُّنُّ:** قژی تەنك.

**نَهَا نَهاً:** پڕبوو، دەگوترێ: (نَهَا الإناءُ) زەرفەکە پڕبوو ٥ (شرِبَ فلان حتى نَهَاً) ئاوی خواردەوە تا تێراو بوو.

**نَهَا اللَّحْمَ نُهوءاً:** گۆشتەکەی نەکوڵاند.

**نَهِئَ اللحْمُ نَهْئاً ونَهَاءةً ونُهُوءةً:** گۆشتەکە نەکوڵی.

**أَنْهَأَ اللَّحْمَ:** گۆشتەکەی نەکوڵاند بەکاڵی هێشتییەوە.

**النَّاهِئُ:** تێرو تەسەلە.

**نَهَبَ الشَّيْءَ نَهْباً:** بەزۆر شتەکەی وەرگرت ٥ دەگوترێ: (إنَّه ينهب الأرض) ئەو بەپەلەو خێرا دەڕوا ٥ هەروەها دەگوترێ: (إنه لَيَنْهَبُ الغايةَ) ئەو پێشکەوتووە بۆلای ئامانج.

**نَهَبَ الكلبُ فلاناً:** سەگەکە دەماری پاژنەپێی فلانکەسی گرت.

**نَهَبَ فلاناً:** جنێوی بەفلانکەس داو لێی تورە بوو ٥ (فهو ناهب) ٥ (وهو منهوب).

**أنْهَبَ الشَّيْءَ:** شتەکەی واڵێ کرد هەڵمەتی بۆ ببرێ‌و بەتاڵان ببرێ.

**أنْهَبَ الشَّيْءَ فلاناً:** شتەکەی بۆ فلانکەس ڕانواند.

**ناهَبَ المُتَسابِقُ مُسابقةً:** پێشبڕکێی لەڕاکردن دا لەگەڵدا کرد.

**إنْتَهَبَ الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵگرت.

**إنْتَهَبَ الفَرَسُ الشَّوْطَ:** ئەسپەکە لەپێشبڕکێیەکەدا بردیەوە.

**تناهب المتسابقان:** هەریەك لەو دوو پێشبڕکێکارانە ویستی سەرکەوتن بەدەست بێنێ.

**تناهَبَ الدَّوابُ الأرض:** وڵاخەکە یان ئاژەڵەکە بەقاچەکانی زەوی هەڵکۆڵی.

**المِنْهَبُ:** سەرکەوتوو لەپێشبڕکێ دا ٥ دەگوترێ: (فرس مِنْهَبٌ).

**المَنْهوبُ:** ئەوەی چەپاو دەکرێ (تالان دەکرێ) ٥ شتێك بەپەلە داوابکرێ.

**النَّهْبُ:** تالانکردن ٥ چەپاو کردن ٥ شتێك بکرێتە مەبەست‌و نیشانە بۆ هەنگاوتن ٥ دەگوترێ: (أصبح فلان نَهْباً للسَّبِّ) فلانکەس بوو بەنیشانە بۆ تانەو تەشەر لێدان‌و جنێوپێدان ٥ یان فلانکەس بوو بە ئامانج بۆنەخۆشی ٥ هەروا وشەی (النهب) ناوە بۆ ماڵی تالانی‌و دەسکەوتی جەنگ ٥ تالانکراو و ماڵبڕاو ٥ (ك: نهابٌ ونهوبٌ) ٥ هەروا وشەی (النَّهْبُ) بەمانای جۆرێك لەڕاکردن دێ.

**النُّهْبَةُ:** بەمانا (إنتهاب) دێ واتە: هەڵگرتن یان سەرکەوتن.

**النُّهْبَى:** هەڵمەت‌و تالانکردن ٥ تالانکراو، ماڵبڕاو.

**النَّهّابُ:** کەسێك زۆر تالانچی بێ، چەپاوکەربێ.

**النَّهْبَرَةُ مِن النساء:** ئافرەتی درێژداوەڵ‌و دالگۆشت ٥ کزو لاواز ٥ ئافرەتێك بگاتە حاڵەتی تێداچوون‌و گیانەلاو ٥ (ك: نهابِرَة).

**النُّهْبَرَةُ**: تەپۆڵکەو گردۆڵکە ٥ چاڵو چۆڵی نێوان بیشەو لانەی شێر ٥ (ك: نهابر ونهابير).

**النُّهْبُورُ**: بەمانا (النُّهْبَرَةُ) دێ ٥ (ك: نهابير).

**نَهْبَلَ**: فلانکەس خۆی شەلاند وای پیشان دا شەلە، لەڕۆیشتن دا خۆی شەل کرد.

**نَهْبَلَ فلان**: فلانکەس تەمەن درێژبوو.

**النَّهْبَلُ**: پیرەمێرد ٥ دەگوترێ: (شیخ نَهْبَلٌ).

**النَّهْبَلَةُ**: ڕۆیشتنێکی تەمبەلانەیە ٥ پیرەژنی کۆنەساڵ ٥ دەگوترێ: (عجوز نَهْبَلَةٌ) ٥ هەروا ناوە بۆ حوشتری کەتەو زەبەللاح.

**نَهَتَ القِرْدُ** وغوه نهيتاً ونهاتاً: مەیمونەکە قیراندی زیراندی ٥ دەگوترێ: (نَهَتَ الأسدُ) شێرەکە دەنگی لێوەهاتو دەنگەکەی نەبوە نەڕاندن.

**نَهَتَ فلان**: فلانکەس نالاندی، نرکاندی.

**المِنْهَتُ والمُنْهِتُ**: شێر.

**الناهِتُ**: قورگ.

**النُّهَاتُ**: دەنگێك کەلەسنگ بێ، نرکەو ناڵە، زیخەزیخ کەلەکاتی ناڕەحەتی دا لەئادەمیزاد دەبیسرێ.

**نَهْتَرَ علی فلان**: درۆی بەدەم فلانکەسەوە کرد.

**نَهْتَرَ فلان في كلامه**: فلانکەس قسەکانی بەشێوەی بەرەو ئاواژو گێڕانەوە.

**نَهَجَ الطريقُ نَهْجاً ونهوجاً**: ڕێگاکە ئاشکرابوو دەرکەوت ٥ دەگوترێ: (نَهَجَ أمْرُهُ) ئیشەکەی ئاشکرابوو.

**نَهَجَ الدابةُ أو الإنسان نَهْجاً ونهيجاً**: وڵاخەکە یان مرۆڤەکە خێرا خێرا هەناسەی داو هانکە هانکی پێ کەوت بەهۆی ماندوبوون.

**نَهَجَ الثوبُ نَهْجاً**: قوماشەکە کون بوو ڕزی.

**نَهَجَ الطريقَ**: ڕێگاکەی ئاشکرا کرد، رونی کردەوە ٥ ڕێگاکەی پەیڕەو کرد.

**نَهِجَ نَهَجاً وَنَهْجَةً**: خێرا خێرا هەناسەی هەڵێنانو هانکە هانکی پێکەوت بەهۆی ماندویی و شەکەتی، یان ڕاکردنو جمو جوڵی زۆر.

**نَهِجَ الثوبُ وغيره**: قوماشەکە کۆن بوو، ڕزی (فهو نَهِجٌ).

**أنْهَجَ الطريقُ**: ڕێگاکە ئاشکراو ڕون بوو، دەرکەوت.

**أنْهَجَ الدابةَ**: بەسواری وڵاخەکە ڕۆیی تا ماندوی کرد.

**أنْهَجَ العَمَلُ فلاناً**: ئیشکردنەکە فلانکەسی ماندوکرد تاوای لێ کرد هەناسە بڕکەی پێ بکەوێ.

**أنْهَجَ الثوبَ**: قوماشەکەی کۆن کرد. ڕزاندی.

**إنْتَهَجَ الطريقَ**: ڕێگاکەی ئاشکرا کردو پێیدا ڕۆیی.

**إسْتَنْتَجَ الطريقُ**: ڕێگاکە ئاشکرابوو دەرکەوت چۆنە.

**إسْتَنْتَجَ سبيلَ فلان**: ڕێبازی فلانکەسی گرتەبەرو پێیدا ڕۆیی.

**المِنْهاجُ**: ڕێگای ئاشکراو نمایان ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ پلانو خەریتەی کارکردن ٥ پرۆسەو پرۆگرام ٥ دەگوترێ: (منهاج الدراسة ٥ منهاج التعليم ٥ منهاج العمل ......الخ).

**المَنْهَجُ**: بەمانا (المِنهاجُ) دێ ٥ (ك: مناهج).

**النّاهِجُ**: دەگوترێ: (طريق ناهج) ڕێگایەکی ئاشکراو ڕون ٥ هەروا دەگوترێ: (طريقة ناهجة).

**النَّهْجُ**: ئاشکراو نمایان ٥ دەگوترێ: (طريق نَهْجٌ) ٥ (أمر نَهْجٌ) ٥ ڕێگای ڕاستو ئاشکرا ٥ دەگوترێ: (هذا نهجي لاأحيد عنه) ٥ (ك: نهجات ونُهُجٌ ونهوج).

**النَّهَجُ**: نەخۆشی ڕەبۆ، هەناسە سواریی‌و تەپەتەپی دڵ.

**النَّهيجُ**: بەمانا (النَّهَجُ) دێ.

**نَهَدَ الثديُ نهوداً**: مەمك خڕبوو، سەری هەڵداو بەرز بۆوە ٥ دەگوترێ: (نهدت ثدي المرأة) مەمکی ئافرەتەکە خڕبوون (فهي ناهد وناهدة) ئەو ئافرەتە (مەمك خڕو تونده) هێشتا مەمکی شل نەبوون ٥ (ك: نواهد).

**نَهَدَ الإناءُ**: قاپەکە نزیکە پڕ ببێ.

**نَهَدَ فلان**: فلانکەس هەڵساو ڕۆیی.

**نَهَدَ لعدوه (أو) الى عَدُوِّهِ**: خۆی لەبەردەم دوژمن دا ڕاگرتو بەردەوام بوو لەشەڕ لەگەڵ کردنی دا.

**نَهُدَ نُهوداً**: بەرزبوو، خڕبوو ٥ سەری هەڵدا.

**أنْهَدَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕکرد هەتا لەسەریەوە ڕژا ٥ یان نزیك بوو لێوان لێوبێ.

**أنْهَدَ الهديةَ**: دیارییەکەی گەورەکرد؛ دیاری گەورەی برد.

**أنْهَدَ فلاناً**: فلانکەسی دەست نیشان کرد.

**ناهَدَ فلاناً**: کێشەی لەگەڵ فلانکەس دانایەوە.

**ناهَدَ عَدُوَّهُ**: بەربەرەکانی دوژمنی کرد لەشەڕداو لەقاقوزەی پێچا.

**تناهَدَ القومُ**: خەڵکەکە لەسەفەردا هەریەکە بەشە تێشوی خۆی هێنایە دەرو تێکەڵاویان کرد (پیتاکیان کرد).

تناهَدَ في الحرب: لەشەڕدا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە، بۆیەکتر ڕاپسکوتن‌و پەلاماری یەکتریان دا.

تناهد القومُ الشَّیْءَ: خەلکەکە لەناو خۆیان دا شتەکەیان دەستاودەست پێ کرد.

تَنَهَّدَ: هەناسەی حەسانەوەو خۆشی هەلکێشا.

النَّاهِدُ: ئافرەتێك مەمکی خڕبووبن مەمکی ڤیت کردبن ٥ (ك: نواهد) ٥ دەشگوترێ: (غلام ناهِد) کوڕە گەنجێکی تازە پێگەیشتووە.

النُّهادُ: ئەندازە، ڕێژە ٥ نزیکەی ٥ دەگوترێ: (هؤلاء نُهادُ مائة) ئەوانە نزیکەی سەد دەبن، ئەندازەی سەد کەسن.

النَّهْداءُ: لیبەلانی گوێ چەم کەڕووەکی باشی لێ بڕوێ.

النَّهدانُ: دەگوترێ: (حَوْض نهدان) حەوزی پڕ ئاو کەلەسەریەوە ئەڕژێ ٥ (قدح نهدان) پیالەی پڕ ٥ یان دوو لەسەر سێی پڕبێ.

النَّهْدُ: شتی بەرز ٥ مەمکی خڕبوو ٥ (ك: نهود) ژەمە ڕۆنە کەرەی گەورە ٥ گیانلەبەری گەورەو بەهێز ٥ دەگوترێ: (شابٌ نَهْدٌ وفرس نَهْد) ٥ هەروا ئاوە بۆ پیاوی پیاوانەو بەکەلك‌و ڕەوشت بەرز کەهەمیشە هەولی پیاوەتی بدا.

النِّهْدُ: ئەوەی هاوەلی سەفەرو کاروانچی لەکیسە باخەل‌و توێشودانی خۆیان دەری دێنن‌و تێکڕا دەیخەنە سەر سفرەی هاوبەش ٥ یان پیتاك‌و کۆمەکی هاو ولاتیان لەکاتی هێرش هێنانی دوژمن دا ٥ دەگوترێ: (طَرَحَ نِهْدَهُ مع القوم) پارمەتی خەلکەکەی دا.

النَّهِیدُ: ڕۆنەکەرەی تەنکە (بچوك).

النَّهِیدَةُ: ژەمە ڕۆنەکەرەی گەورە ٥ تۆوی کالەکە مارانە ئاردی تێکەلاو دەکرێ‌و دەخورێ.

نَهَرَ نَهْراً: بەتەوژم ئاوەکە ڕۆیی.

نَهَرَ الماءُ: ئاوەکە بەزەوی دا ڕۆیی‌و ڕێگای خۆی کردەوە.

نَهَرَ الحَفَّارُ: بیرهەلکەنەکە گەیشتە ئاو لەناوبیرەکەدا ٥ دەگوترێ: (حَفَرَ بِئراً حتى نَهَرَ) بیرەکەی هەلکەند تا گەیشتە ئاو.

نَهَرَ الأرض: زەوییەکەی هەلدڕی.

نَهَرَ فلاناً: لەفلانکەس توڕەبوو بەڕەقی‌و ڕوی ناخۆش قسەی لەگەل دا کرد ٥ ڕقی هەلسا.

نَهَرَ النَّهْرَ: جۆمەکەی هەلکۆلی‌و ئاوەکەی پێدا برد.

نَهِرَ الشَّيْئُ نَهَراً: شتەكە زۆر بوو ٥ (فهو نهِر).
أنْهَرَ: كەوتە ڕۆژەوە ٥ يان بەڕۆژ كاری كرد.
أنْهَرَ السائِلُ: شلەمەنییەكە بەتەوژم ڕۆیی‌و ڕەوان بوو ٥ دەگوترێ: (أنْهَرَ البَطْنُ) سكەكە چوو، گوفیرەی گرت.
أنْهَرَ العِرْقُ: دەمارەكە خوێنی نەوەستا.
أنْهَرَت المرأةُ: ئافرەتەكە قەڵەو بوو.
أنْهَرَ فِي العَدْوِ: لەبازدان دا تەمبەڵ بوو بەهێواشی بازی دا.
أنْهَرَ الدَّمَ: خوێنەكەی ڕەوان كرد ڕۆیاندی.
أنْهَرَ الفَتْقَ: دڕاوییەكەی فراوان كرد ٥ كەلەبەرو چاڵەكەی فراوان كرد ٥ دەگوترێ: (أنْهَرَ الدَّمَ) خوێنەكەی ڕشت، ڕەوانی كرد.
إنْتَهَرَ النَّهْرُ: چۆمەكە شوێنی خۆی كردەوە ڕێڕەوی خۆی گرتەبەر.
إنْتَهَرَ بَطْنُهُ: سكی چوو، گوفیرەی گرت.
إنْتَهَرَ العِرْقُ: دەمارەكە خوێنی نەوەستا.
إنْتَهَرَ فلاناً: فلانكەسی زۆر تووڕەكردو بەشێوەی زبرو دەنگی بەرزو ڕوی ترشە وەقسەی لەگەڵ كرد.
إسْتَنْهَرَ السائِلُ: شلەمەنییەكە بەزۆری‌و تەوژم ڕۆیی.
إسْتَنْهَرَ النَّهْرُ: چۆمەكە ڕێڕەوی خۆی كردەوەو جاری بوو.
إسْتَنْهَرَ الأمْرُ: كارەكە قورس بوو لەسنور دەرچوو.
المَنْهَرُ: شوێنی هەڵكەندنی جۆگاو لادڕ كە ئاو دایدڕێ ٥ جۆگایەكە لەناو قەڵاو شورادایە ئاوی پێدا دەڕوا ٥ (ك: منهار ومناهير).
المَنْهَرَةُ: بۆشاییەكە لەنێوان خانوەكان ٥ زبڵ‌و زاڵی تێ فڕی دەدرێ ٥ زبڵدان ٥ سەرانگوێلك.
النّاهِرُ: ترێی سپی.
النّاهور: هەور.
النَّهارُ: ڕۆژ، ڕوناكایی نێوان بەرەبەیان‌و شێوان؛ نێوان ڕوناكایی ئاسۆ لەبەرەبەیانەوە تا ئاوابوونی خۆر لەئێوارەدا ٥ (ك: أنْهُر ونُهُر).
النّهارِيُّ: نان خواردنی قاوەڵتی.
النَّهْرُ: ئاوی زۆرو شیرین‌و ڕەوان (ڕوبار) ٥ ڕێڕەوی ئاوی شیرین‌و گوارا ٥ (ك: أنهار وأنْهُرُ ونُهُر).
النَّهَرُ: بەرفراوان ٥ ڕوناكی ٥ بەمانا (النَّهْر) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ﴾.
النُّهُرُ: ترێی سپی ٥ دەشگوترێ: (نَهْرٌ ونَهِرٌ) ٥ ڕوبارێكی پان‌و پۆڕە ٥ (نهار نَهِرٌ) ڕۆژێكی ڕۆشن‌و ڕوناكە ٥

(رجل نَهِرٌ) پیاوێکه بەڕۆژ کاردەکا ٥ دەگوترێ: (لست بليلي ولكني نَهِرٌ) بەشەو کارناکەم بەڕۆژ کاردەکەم.

**النَّهِرَةُ:** ئاژەڵی شیر زۆر ٥ دەگوترێ: (ناقة نَهِرَة، وشاة نَهِرَةٌ).

**نَهَزَ فلان نَهْزاً:** فلانکەس ڕاپەڕی بۆئەوەی شتێك بەدەست بێنێ ٥ دەشگوترێ: (نَهَزَت الدَّابَّةُ بصدرها) ئاژەڵەکە یا ولاخەکە سینگی پێوەنا؛ واتە: دەستی کرد بەڕۆیشتن ٥ ملی درێژ کردو سینگی پێوەنا بۆئەوەی بڕشێتەوە.

**نَهَزَت الدابةُ برأسها:** ولاخەکە بەراوەشاندنی سەری مێش و مەگەزی لەخۆی دوورخستەوە.

**نَهَزَ بالدلو في البئر:** دۆڵچەکەی لەناوبیرەکە هێناو برد بۆئەوەی پڕبێ لەئاو.

**نَهَزَ الدَّلْوَ من البئر:** دۆڵچەکەی لەبیرەکە دەرهێنا.

**نَهَزَ الشَّيْئَ:** پاڵی بەشتەکەوە نا ٥ دەگوترێ: (نَهَزَ راحِلَتَهُ) لە ولاخەکەیەوە ژەنی و دەنەدەنەی دا بۆخێرا ڕۆیشتن ٥ دەشگوترێ: (نَهَزَني اليك حاجة) پێداویستی و ئاتاجی منی هێنا بۆلای تۆ.

**نَهَزَ فلاناً في صدره:** مستەکۆڵەی لەسنگی فلانکەس دا.

**نَهَزَ رأسَهُ:** سەری بادا.

**أنْهَزَهُ:** ڕاپەڕاند.

**نَاهَزَ الأمْرَ:** لەکارەکە نزیك بۆوە ٥ دەگوترێ: (نَاهَزَ الصَّبِيَ البلوغ) منداڵەکە خەریکە باڵغ دەبێ، نزیکە پێ بگا.

**نَاهَزَ الرضيعَ الفِطامَ:** شیرەخۆرەکە نزیکە لەشیرخواردن ببڕدرێتەوە.

**ناهَزَ فلاناً:** پێش فلانکەس کەوت.

**نَاهَزَ الصيدَ:** پەلەی کرد نێچیرەکە بگرێ.

**نَاهَزَ الفُرْصَةَ:** هەلەکەی قۆستەوە نەیهێشت لەکیسی بچێ.

**ناهَزَت الفرصةُ فلاناً:** فورسەت و هەل بۆ فلانکەس ڕێ کەوت.

**إنْتَهَزَ في الضحك:** زێدەڕۆیی کرد لە پێکەنین دا ٥ زۆر پێکەنی.

**ناهَزَ الشَّيْئَ:** شتەکەی بەدڵ بوو پەلەی کرد بەدەستی بێنێ ٥ دەگوترێ: (إنْتَهَزَ الفرصة) هەلی قۆستەوە نەیهێشت هەلی لەکیس بچێ.

**تناهَزَ القومُ الشَّيْئَ:** خەڵکەکە پەلەیان کرد بۆ بەدەستهێنانی شتەکە ٥ دەشگوترێ: (تناهَزوا الفُرَصَ) کەوتنە خۆ بۆ قۆستنەوەی هەل و ویستیان کەڵکی لێ وەرگرن.

**المناهَزَة:** پێشبڕکێ.

النَاهِزُ: ریش سپیو پیاوماقوڵی گەلو هۆزو هەڵسوڕێنەری کاروباریان.
النُهازُ: ئەندازەو مەزندە ٥ دەگوترێ: (عمره نُهاز عشرين سنة) تەمەنی بیست ساڵ دەبێ، نزیکەی بیست ساڵ دەبێ.
النُهْـزُ: دەست دانە شت؛ هەرشتێك بەدەست بکرێو دەستی بۆ ببرێ.
النُهْـزَةُ: هـەلو فرسـەت ٥ (ك: نُهَـزٌ) دەگوترێ: (هو نُهْـزَة المختلس) ئەو نێچیری هەموو کەسێکە هەموو کەس دەتوانێ فرسەتی لێ بێنێ.
النُهازُ: کەسێك خێرا خێراو زۆر شت بەدەست بداتە یەکێکی تر وەکوو بەردەستی وەستای دیوار دانانو شتی وا ٥ گوێدرێژ: کە سنگی رەپێش دەکا بۆ رۆیشتن.
النُهوزُ: شتێك کە پاڵنەری هەبێ بۆ رۆیشتن ٥ حوشترێك بێچووەکەی مندار بوبێتەوەو شیرنەدا تاباشباش گوانەکانی رانەتەکێنێو دایان نەچۆرێنێ.
نَهَسَ اللَحْمَ نهساً: گۆشتەکەی بەددانی پێشەوەی پچری بۆئەوەی بیخوا.
نَهَسَ فلاناً الكلْبُ: فلانکەس سەگ گەستی.
نَهَسَتْهُ الحية: مارگەستی، پێوەی دا.
إنْتَهَسَ: زۆری گۆشت بەکەڵبەکانی بچری ٥ زێدەرۆیی کرد لەگۆشت بچرین دا.
المَنْهَسُ: ئەو شوێنەی گۆشتی لێ دەپچرێندرێ ٥ (ك: مناهِس) ٥ دەشگوترێ: (أرض كثيرة المناهِس والمعالق) زەوییەکە لەوەڕو خواردنی زۆر بەددان گۆشت بپچرێ ٥ دەگوترێ: (أسَدٌ أو نَسْرٌ مِنهَسٌ) شێرێکە زۆر گۆشت دەپچرێ ٥ یان داڵاشێکە زۆر گۆشت بەدەندوکی دەپچرێ.
المَنْهوسُ: کزو داڵگۆشت ٥ دەگوترێ: (رجل منهوس) پیاوێکی کزو لاوازە ٥ (رجل منهوس القدمين) پیاوێکی قاچ رەقو تەقە.
النُهَسُ: باڵندەیەکە لەپێری (الصردية)یەو رەنگی کەستەنائییە لەچۆلەکە گەورەترە، سەر گەورەو دەندوك گەورەیە، رەوشت شەڕانیو توندو تیژە، چۆلەکەو حەشەراتی بچوك نێچیر دەکا ٥ هەمیشە کلکی هەڵدەتەکێنێ، لە وڵاتانی ئەوروپا دەژیاو پایزانو بەهاران رەودەکا بۆ وڵاتی میصر.
النَهاسُ: بەمانا (المِنهَسُ) دێ.
النَهوسُ: گازندە گەزندە، هەر درەندەیەك شت بگەزێ.

النَّهِيسُ: گەزراو هەرشتێك سەگو مارو شتی وا گەستبێتی.
نَهَسَ اللَّحمَ: گۆشتەكەی پارچە پارچە كرد ٥ بەدەم پچڕی، ڕاپتەكاند.
نَهَسَ الطعامَ: بەهەلپە خواردنەكەی خوارد.
النَّهِسَ: گورگ: پیاوی چوستو چالاك ٥ چلێسو هەلپەكەر بۆ خواردنی گۆشت ٥ (ك: نهاسِر).
نَهَشَ الشَّيْءَ نَهْشاً: قەپالی بەشتەكەدا كرد بۆنەوەی بیخوا ٥ بیگەزێ پێوەی بدا برینداری بكا.
نَهَشَتِ الحَيّةُ فلاناً: مارەكە بە فلانكەسیەوە دا ٥ گەستی.
نَهَشَتِ المرأةُ وَجْهَها: ئافرەتەكە دەمو چاوی خۆی ڕنین لەكاتی بەلاو كارەسات دا خۆی نەگرتو بەنینۆك دەمو چاوی ڕنینەوە.
نَهَشَ الكلبُ فلاناً: سەگەكە فلانكەسی گەست، دەشگوترێ: (نَهَشَهُ الدهر) ڕۆژگار جەڕاندیو خستیە حالەتی ئاتاجی.
نَهَشَ فلاناً أو عِرْضَهُ: غەیبەتی فلانكەسی كردو تانەی لێ دا.
نُهِشَتْ عَضُدُهُ: باسكی باریك بوو گۆشتی پێوە نەما.
إنْتَهَشَتْ عَضُدُهُ: باسكو قوڵی باریكو بێ گۆشت بوون.
إنْتَهَشَ الشَّيْءَ: زۆری شتەكە گەستو لێكی هەلپچڕی.
المُنْتَهِشَةُ: ئافرەتێك لەكاتی بەلاو كارەسات دا ڕوخساری بڕنێ.
المَنْهوشُ: دالگۆشتو كزو لاواز ٥ ماندو و لەڕو لاوازە.
هـو منهـوش القـدمین: ئەو قاچ ڕەقو تەقە.
النُّهاوِشُ: ستەمو ماف پێشێلكردن.
النَّهْشُ: كەمی گۆشتی ڕان، قونپوچەڵی ٥ دەگوترێ: (فلان نَهْشُ اليدين) فلانكەس دەستو مەچەك باریكو بێ گۆشتو دەست گەرمو گورجو گۆڵە ٥ هەروا دەگوترێ (رجل نَهْشٌ) پیاوێكی دالگۆشتو جەستە سوكە.
نَهْشَلَ فلان نَهْشَلَةً: فلانكەس پیرو كەنەفت بوو لەرزۆك بوو ٥ (فهو نَهْشَلٌ) ٥ سواری ولاخی خوازڕاو بوو.
نَهْشَلَ الشَّيْءَ: شتەكەی بەتامەزرۆوە خوارد، وەكوو برسی لرفی دا.
نَهْشَلَ فلاناً: فلانكەسی گەستو كەلەپارچەی كرد.
النَّهْشَلُ: گورگ، بازو هەلۆ.
النَّهْشَلَةُ: پیریو كەنەفتی.
نَهَضَ نهوضاً ونَهْضاً: ڕاپەڕی، بەئاگاو

وریاییەوە هەڵسایە سەرپاو ڕاپسکوت ٥ دەگوترێ: (نَهَضَ من مکانه الی کذا).

**نَهَضَ لـه**: بۆی ڕاپسکوتو پەلاماری دا ٥ (نَهَضَ الی العَدُوّ) ڕاپەڕی بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن.

**نَهَضَ النَبْتُ**: ڕوەکەکە ڕاست بۆوەو پێگەیی.

**نَهَضَ الطائِرُ**: باڵندەکە باڵی کردنەوە بۆئەوەی بفڕێ.

**نَهَضَ فلاناً نَهْضاً**: ستەمی لەفلانکەس کرد.

**أنْهَضَ الحیوانَ**: ئاژەڵەکەی ئامادەکردو خستیە سەر ئەوە بکەوێتە جوڵەو ڕابکا غاربدا.

**أنْهَضَ فلاناً للأمر**: فلانکەسی ئامادەکرد بۆکارەکەو خستیە ئەستۆی.

**أنْهَضَ فلاناً بالشیئ**: فلانکەسی بەهێزکردو ورەی پێدا بۆئەنجامدانی کارەکە.

**أنْهَضَ الریحُ السحابَ**: ڕەشەبایەکە هەورەکەی ڕاداو بردنی بۆ شوێنێکی تر.

**أنهَضَ القِرْبَةَ**: کوندەکەی پڕکرد یان نزیکی ئەوەی کرد پڕبێ.

**ناهَضَ فلاناً**: بەربەرەکانی فلانکەسی کرد، دژی وەستا.

**تناهَضَ القومُ**: هەر تاقمەو پێڕێك پەلەی کرد بۆئەوەی بەرەنگاری تاقمەکەی بەرامبەری بکا ٥ دەشگوترێ: (تناهض القومُ في الحرب).

**إسْتَنْهَضَ فلاناً للأمر**: داوای لەفلانکەس کرد بەپەلە کارەکە ئەنجام بدا.

**النَاهِضُ**: بێچوی باڵندە: کەبتوانێ بفڕێ ٥ گۆشتی لای ژوروی قۆڵو باسك ٥ دەگوترێ: (عامل ناهِضٌ) کرێکارێکە بەردەوامە لەسەر ئیشەکەی‌و بەبڕوای تەواو و سوربوونەوە کارەکەی ئەنجام دەدا ٥ (شباب ناهِض) گەنجێکی زیرەك‌و وریایە، گرنگی دەدا بەئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی.

**النّاهِضَةُ**: (ناهِضَة الرجل) خزم‌و کەس‌وکاری پیاو ٥ لەبراو باوك‌و برازاو ئامۆزا.... هەروا ناوە بۆ دەست‌و پێوەندو کەس‌و کاری پیاو.

**النُّهاضُ**: خێراو بەپەلە.

**النُّهْضُ**: زەوی پتەو و شاخ‌و داخ: کەڕێگای تێدا دروست بکرێ ٥ (ك: نِهاضٌ) ٥ دەگوترێ: (سلکوا نِهاضَ الطرق) ڕێگای سەخت‌و ناخۆشیان بڕی.

**النَّهْضَةُ**: هێزو توانا ٥ ڕاپەڕین‌و

هەوڵدان بۆ پێشکەوتن لەبواری کۆمەڵایەتی‌و بوارەکانی تری ژیان دا ٥ دەگوترێ: (کان من فلان نهضة الی کذا) جم‌و جوڵ‌و هەوڵدانی باش هەبوو لەلایەن فلانەوە بۆ ئەو کارە ٥ دەشگوترێ: (هو کثیر النهضات).

**النَّهَّاضُ**: کەسێك بەردەوام لەسەر رێبازی پێشکەوتن‌و بەدەستهێنانی سەروەری بێ ٥ دەشگوترێ: (مکان نَهَّاض) شوێنێکی بەرزە.

**نَهَطَهُ بالرمح نَهْطاً**: بەرمب لێی دا.

**نَهَفَ نَهْفاً**: سەرسام بوو.

**نَهَقَ الحِمارُ نَهْقاً ونَهِيقاً**: گوێدرێژەکەی زەری، زەراندی.

**تناهَقَت الحُمُرُ**: گوێدرێژەکان تێکرا زەریــن ٥ یان بەشوێن یەکتردا زەراندیان.

**النَّاهِقُ**: یەکێك لەو ئێسقانە دەرپەڕیوانەی ئاژەڵی سمدارە کە دەکەونە شوێنی ڕێڕەوی فرمێسکی ٥ ئەو شوێنەی لەقورگی گوێدرێژدا زەرەی لێ دێتەدەر ٥ (ك: نواهِق).

**النَّهَقُ**: گیایەکە لەپێری (الصلیبیة) درێژ دەبێتەوە گەڵای پانی هەیە، گوڵەکەی وەکوو گوڵی ڕوەکی کەرنەب وایە بەرەکەی خەردەلەو تۆوێکی وردی هەیە وەکوو تۆوی کەرنەب وایەو لەو وردترەو تامی تیژەو دەبرێ، ناوێکی تری هەیە پێی دەگوترێ: (جیرجیر) یان (أیهُقان).

**نَهَكَ الأمرُ فلاناً نَهْكاً ونهاكَةً**: کارەکە فلانی ماندو کردو بەسەریا زاڵ بوو ٥ دەگوترێ: (نَهَکَهُ العَمَلُ) ئیش کردن لەپەلو پۆی خست ٥ (نهکه الشرابُ) شەراب لەگڵ‌و گۆی خست ٥ (نَهَکَتْهُ الحمی) لەرزوتا لەپەل‌وپۆی خست.

**نَهَكَ الشَّيْئَ**: زێدەڕەوی کرد لەشتەکەدا، دەگوترێ: (نَهَكَ الطعامَ) زۆری لەخواردنەکە خوارد ٥ هەروا دەگوترێ: (نَهَكَ في الطعام) ٥ (ونَهَكَ من الطعام).

**نَهَكَ الضَّرْعَ**: گوانەکەی زۆر داچۆڕاند، زۆری جەرەبابەدا.

**نَهَكَ عِرضَ فلان**: زۆری جنێو و قسەی ناشرین بەفلان گوتن.

**نَهَكَ الثوبَ**: قوماشەکەی لەبەر کرد تا ڕزاندی هەر لەبەری کرد.

**نَهُكَ نهاكَةً**: زێدەڕەوی کرد لەکۆکردنەوەی شت دا.

**نُهِكَ فلان**: فلانکەس کزو لاواز بوو، نەخۆشی لاوازی کرد.

**نُهِكَ بيتُ الشعر من بحر الرجز**: سێیەکی

شیعرەکە لابرا، چەرت کرا.
**أنْهَکَهُ السلطان عقوبة:** فەرمانڕەوا زێدەڕۆیی کرد لەسزادانی دا.
**إنْتَهَكَ:** بەمانا (نَهَكَ) دێ ◦ دەگوترێ: (إنْتَهَكَتْه الحمى).
**إنْتَهَكَ عرض فلان:** زێدەڕەوی کرد لە جنێودان بەفلانکەس و قسەی ئابڕو بەری ئاڕاستەکرد.
**إنْتَهَكَ الشَّيْءَ:** سوکایەتی بەشتەکە کرد.
**إنْتَهَكَ الحرماتِ أو المحرمات:** کاری ناشایستەو نەشیاوی ئەنجام داو سنووره شەرعیەکانی بەزاندن.
**إنْتَهَكَ حَرمةَ الله:** وادەو پەیمانی شکاند، سنورشکێنی کرد.
**المَنْهَكَةُ:** ئەو شتەی کە مرۆڤ هەڵدەنێ بۆ سنور بەزێنی ◦ دەگوترێ: (هذا منهکة للأعراض) ئەمە مرۆڤ هەڵدەنێ بۆ ناموس شکێنی.
**النّاهِكُ:** زێدەڕۆ لەهەموو شتێك دا.
**النَّهْكُ:** زێدەڕۆیی کردن لە هەرشتێك دابێ ◦ جنێو و سوکایەتی پێکردن ◦ چەرتکردن و حەزفکردنی سێیەکی شیعره لەبەحری ڕەجەز.
**النَّهْکَةُ:** شوێن دەست و ئاسەوارو پاشماوە ◦ دەگوترێ: (بدت فيه نَهْکَةَ المرض) دیاردەو ئاسەواری نەخۆشییەکەی لەسەر دەرکەوت کزو لاوازیی پێوەدیارە.
**النَّهوكُ:** ئازاو چاونەترس.
**النَّهيكُ:** توندڕەو زێدەڕۆ لە کۆکردنەوەی هەرشتێك دابێ ◦ ئازاو چاونەترس لەئادەمیزادو گیانلەبەری تر ◦ شمشێری بڕندە ◦ دەگوترێ: (سیف نهیك) ◦ هەروا ناوە بۆ مرۆڤی ڕەوشت بەرز.
**نَهِلَ نَهَلاً ومَنْهَلاً:** یەکەم پێك، یەکەم قومە ئاو و شلەمەنی ◦ شەراب خۆرەوە (بخۆرەوەی شلەمەنی).
**نَهِلَ الشارِبُ:** تینوەکە خواردیەوە تا تێراو بوو ◦ شەرابخۆرەوەکە تامڕ بوو خواردیەوە ◦ (فهو ناهل) ◦ (ك: نهال ونواهل).
**أنْهَلَ دابّتَهُ:** یەکەم وەجبە ئاوی دا بە وڵاخەکەی.
**أنْهَلَ زَرعَهُ:** یەکەم ئاودێریی کشتو کاڵەکەی کرد.
**أنْهَلَ العطشان:** تینوەکەی ئاودا تا تێراو بوو.
**أنْهَلَ فلاناً:** ڕقی فلانکەسی هەڵساند ◦ دەشگوترێ: (أنهلوا القنا من عدوهم) شمشێریان لەدوژمنەکانیان ئاودان، دوژمنیان لەخوێن دا گەوزاند.
**المِنْهالُ:** کەسێك زۆر وڵاخ ئاوبدا ◦ پیاوی سەخی و دەست و دڵ فراوان ◦ گۆڕ ◦ (ك: مناهیل).

**المَنْهَلُ**: شوێنی ئاوخواردنـەوەی ئـاژەڵو وڵاخ ٥ دوێـڵاو ٥ خـانو کاروانـسەرا کەلەچـۆڵەوانی دا بـێو کاروانــچی بیکەنە قۆناغی خۆیان بۆ پـشودانو شەو تێدا مانەوە، لەم ڕووەوە کەئاوی خواردنەوەی تێدا دەست دەکەوێ.

**الناهِلـة**: حوشـترێك بـێو بچێ بۆسـەر دوێـڵاو و شـوێنی ئـاو خواردنـەوە ٥ دەشـگوترێ: (إبـل نواهِـل) حوشـتری برسی.

**النَّهْلان**: ئاو خۆرەوە ٥ (ك: نِهال).

**النَّهْلَةُ**: دەگـوترێ: (مـا سُـقِيَ إلا نِهلـة) یەك جار ئاوی خواردەوە.

**نَهَمَ الأسَدُ والفيلُ نَهيماً**: شێرەکە نەڕانـدی فیلەکە نەڕاندی.

**نَهَمَـت القِـدْرُ**: مەنجەڵەکـە قلّپـە قلّپـی پێکەوتو کەوتە کوڵین.

**نَهَمَ فلان**: فلانکەس ترۆی کرد، دەنگی دا.

**نَهَمَ الدابة نَهْماً ونهيماً**: وڵاخەکـەی دەنـگ دا بۆئەوەی خێرا بڕوا.

**نَهِمَ في الشَّيْئِ نَهْماً ونهامَةً**: زۆری حەز لـە شتەکە بوو تامەزرۆی بوو.

دەگـوترێ: (نَهِمَ في الطعام ونَهِمَ في العلم فهو نَهِم ونهيم).

**نُهِـمَ بالـشيئ**: خـوی بەشـتەکەوە گـرت ئالودەی بوو ٥ (فهو منهوم).

**المِنهـامُ**: وڵاغێـك بەدەنگـدان ڕاپـەڕێو بڕوا یان بگەڕێتەوە ٥ (ك: مناهيم).

**المَنْهَمَـةُ**: دێـرو کەنیـشتە، یـان شـوێنی کۆبونەوەی ڕەبەنەکان.

**المَنهوم**: کەسێك ئـالوودەی شـتێك بـێ ٥ خـو بەشـتێکەوە بگـرێ ٥ کەسـێك مرپـێ لــەخواردنو هەناسـەی بـۆ هەڵنەیەتەوە.

**النُّهامُ**: ئاسنگەر، دارتاش ٥ قەلـەڕەش ٥ (ك: نُهُمْ).

**النُّهامِيُ**: خاوەنی کەنیشتە.

**النَّهْمَــــةُ**: پێداویــستی ٥ حـــەزکردن لەشـتێك ٥ دەگـوترێ: (لـه في الأمـر نُهْمَةٌ، وقضي منه نُهْمَتَهُ).

**النَّهّامُ**: ڕێگای ئاسان.

**نَهْنَهَ فلاناً عَنْ الـشَّيْئِ**: فلانکەسی لـەو شتە مەنع کردو دەری کرد.

**نَهْنَــهَ الدابــة**: دەنگــی وڵاخەکــەی دا بۆئــەوەی بگەڕێتــەوە، ئــەوەی بـۆی چوبوو وازی لێ بێنێو نەیکا.

**نَهْنَهَ الثوبَ**: قوماشەکەی تەنك چنی.

**النُّهْنَــــهَ**: قوماشــی تــەنك چــنراو ٥ دەگوترێ: (حُلَّةٌ نَهْنَةٌ).

**نَهُــوَ الرجـلُ نهــاوَةً**: پیاوەکــە گەیــشتە ئەوپەری ئاقڵمەنـدی ٥ (فهـو نَهِـيٌّ) ٥ (ك: أنهياء).

**نَهِيَ الشَّيْئُ اليه نَهْياً**: شتەکەی گەیشتێ.

**نَهِـيَ اليـه المثـلُ**: نمونـەو میـسالەکەی پێگەیی.

**نَهِيَ عَنْ الشَّيْئِ:** نەی لێ کرد لەشتەکە وتی، ئەو شتە مەکە.
**نَهِيَ الله عَنْ كذا:** خودا نەی لەو شتە کردووەو حەرامی کردووە.
**نَهِيَ مِن الشَّيْئِ نَهيً:** بەو شتەی لێی وەرگرت کیفایەتی کرد ○ دەگوترێ: (نَهِيَ فلان من اللَّحم) فلانکەس لە گۆشتەکە تێرو تەسەل بوو.
**أنهى فلان:** فلانکەس چووە شوێنێك ئاو لێیەوە نەڕوا ○ چووە ناو زلکاوەوە.
**أنهى مِن الشَّيْئِ:** ئەوەی لەشتەکە دەستی کەوت بەسی بوو ○ دەگوترێ: (أنهى فلان من اللحم) فلان لەخواردنی گۆشت مڕبوو.
**أنهىَ عَنْ الشَّيْئِ:** وازی لەشتەکە هێنا.
**أنهى الشَّيْئَ:** شتەکەی گەیاندە شوێنی خۆی.
**أنهيتُ اليه الخَبَرَ:** هەواڵەکەم پێگەیاند.
**نَهَّى فلاناً عَنْ الشَّيْئِ:** فلانکەسی لە شتەکە مەنع کرد.
**إنْتهى الشَّيْئُ:** شتەکە گەیشتە کۆتایی ○ دەشگوترێ: (إنتهى اليه الخبرُ وإنتهى اليه المثل وإنتهى بنا المسير الى موضع كذا).
**إنتهى عَنْ الشَّيْئِ:** وازی لەشتەکە هێنا ○ دەگوترێ: (إنتهى العاصي) یاخی بووەکە وازی لە تاوان هێنا ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ إِن يَنتَهُواْ يُغَفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ﴾.
**تناهى الشَّيْئُ:** شتەکە گەیشتە کۆتایی ○ دەگوترێ: (تناهى الخَطْبُ) کارەسات و بەڵاکە گەیشتە ئەوپەڕی ناخۆشی.
**تناهى الماءُ:** ئاوەکە لەزلکاوەکەدا وەستا.
**تناهى عَنْ الشَّيْئِ:** وازی لە شتەکە هێنا.
**تناهى القوم عَنْ المنكر:** خەڵکەکە هەندێکیان نەهیان لە هەندێکیان کرد کە کاری خراپە ئەنجام نەدەن ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ﴾.
**إستنهى فلاناً:** بەفلانکەسی گوت وازبێنە.
**إستنهى فلاناً مِن فلان:** فلانکەسی راسپارد بەفلان بڵێ: وازبێنێ.
**النِّهاءُ:** ئەو شوێنەی لەمبەرەوبەری شیو ئاوەکەی بگاتێ.
**النُّهاءُ:** ئەو شتەی بەری لافاوی پێ دەگیرێ لەگڵ و بەردو شتی وا.
**التَّنْهِيَةُ:** بەمانا (التنهاءُ) دێ.
**المَنْهى:** ئەو کارو کردەوانەی نەهیان لێ دەکرێ ○ (ك: مناهٍ) دەگوترێ: (هذا

من مناهي الشرع وهو يركب المناهي).
**المَنهاةُ**: ئامانجو ئاكام ٥ دەگوترێ: (الموت منهاة الناس) مردن سەرەنجامی هەموو كەسێكە ٥ (المنتهى) ئامانجو ئاكام ٥ دەگوترێ: (هو بعيد المنتهى).
**الناهي**: تێرو تەسەلو تێرئاو ٥ (ك: نهاه) ٥ دەگوترێ: (رجل ناهيك من رجل) پیاوێكە كیفایەتی تۆدەكاو پێویستت بەكەسی تر نییە.
**الناهية**: دەگوترێ: (إمرأة ناهيتك من إمرأة) ئافرەتێكە گەیشتۆتە ئەوپەڕی ڕەنگزنیو پێویستت بەژنی تر نیە.
**النُّهاءُ**: ئاكامی شت ٥ كۆتاییو ئەوپەڕی شت ٥ دەگوترێ: (بَلَغَ الخَطْبُ نهاءَهُ) ناخۆشیو بەلایەكە گەیشتۆتە ئەوپەڕی.
**النَّهَاءُ من النهار والماء**: بەرزبوونەوەی خۆر ڕۆیشتنی بەرەو ئاوابوون ٥ بەرزبوونەوەی ئاو ٥ ئەندازە ٥ دەگوترێ: (هم نِهاءَ مائة) ئەوانە ئەندازەی سەد دەبن ٥ بچوكترین بەنداوی ئاو.
**النُّهاءُ**: بەردێكی سپییە لەڕوخام نەرمترە، وەكوو تەباشیرو شتی وا وایە.
**النُّهاةُ**: میرو ٥ (ك: نُهيٌ) ٥ دەشگوترێ: (نفس نُهاة عَنْ الشَّيْ) نەفسێكی نەهی كەرە لەو شتە.
**النِّهايةُ**: كۆتایی شت ٥ سنوری خانو ٥ عەقڵو ئاوەز ٥ تەختەدار كەباروشتی وای دەخرێتە سەر بۆگواستنەوە بەناو ئاودا.
**النُّهُوُّ**: پێچەوانەی شت ٥ دەگوترێ: (هو نُهُوٌّ عَنْ المنكر) ئەو نەی دەكا لە خراپەكاریو فەرمان دەكا بەچاكە.
**النُّهَى**: كۆی (النُّهْيَة) بەمانا عەقڵو ئاوەز دێ.
**النَّهْيُ**: داوای وازهێنان لەشت ٥ بەلای نەحوییەكانەوە بریتییە لە فەرمانكردن بەوازهێنان لەكارێك بەهۆی بەكارهێنانی پیتی (لا)و فیعلی موضاریعی مەجزوم.
**النِّهْيُ**: شوێنێك كەبەربەستی ئاوی هەبێو نەهێڵێ ئاوەكەی سەرڕێژ بكا ٥ زلكاو و گەڕاو ٥ (ك: أنهاء ونهاء).
**النَّهِيُّ**: كەسێك بگاتە ئەوپەڕی ڕادروستیو بیرو بۆچونی ڕاستاڵ ٥ (ك: نُهُون).
**النُّهْيَةُ**: كۆتایی شتو نیهایەتی ٥ ئەڵقەو گرێو پانایەك لەسەر سنگ بێ نەهێڵێ حەبلەكەی داماڵدرێ ٥ عەقڵو ئاوەز ٥ (ك: نُهيٌ).

النَّهِـيُّ: کەسـێك لەقەڵـەوی دا بگاتـە ئەوپەڕی قەڵەوی ٥ دەگوترێ: (رجل نَهِـيٌّ و أمـرأةٌ نَهِيّـةٌ) ٥ دەشـگوترێ: (فلان نَهِيُّ فلان) فلانكەس نەی دەكا لەفلان‌و ناهێڵێ فلان كاربكا.

ناء النَّجْمُ نَوْءاً وتنواءً: ئەستێرە لەخۆرئاوا ئاوا بوو لەهەمان كات دا لەخۆرهەلات ئەستێرەیەكی تر هەلات.

ناء بِحِمْلِه: بەزەحمەت لـەژێر بارەكـەی دا ڕاست بۆوە ٥ یان بارەكـەی قـورس بـوو نەیتوانی بەبارەكەیەوە بڕوا و كەوت.

ناء به الحِمْلُ: كۆڵ‌و بارەكە گران بـوو چـــەماندی ٥ بەزەحمـــەت بـــۆی هـــەلگیرا ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُـوءُ بِالْعُـصْبَةِ أُولِـي الْقُـوَّةِ﴾ ٥ دەشـگوترێ: (نـاء الحِمْـلُ حامِلَـهُ) بارەكـــە هەڵگرەكـــەی چـــەماندو ماندوی كرد.

أناءت السَّماءُ: ئاسمان هەور دایپۆشی.

أناء فلاناً: فلانكەسی ڕاپەڕاند.

أنـــاء الحِمـــلُ حامِلَـــهُ: بـــارو كۆڵەكـــە هەڵگرەكەی ماندو كرد.

أنْواتِ السَّماءُ: ئاسمان هەور دایپۆشی.

ناوأَهُ: شانازی بەسەردا كرد.

إستناءَ النَجْمُ: ئەستێرەكە ئاوابوو.

إستناءَ فلاناً: داوای بەخشش‌و یارمەتی فلانكەسی كرد.

الأنْوَاْ: شارەزاو لێزان لەكەش‌و هەوادا.

النَّوْءُ: دەگـوترێ: (فلان نَـوْءةُ متخـاذل) فلانكـــەس ڕاپـــسانەكەی ســـست‌و تەمبەلانەیـە ٥ ئەسـتێرەكە بـەرەو ئاوابوون دەڕوا ٥ بارانی بـەخوڕەم‌و لێزمـە ٥ بەخـشش‌و عـەطـا ٥ (ك: أنواء ونوآن).

ناب الشَّيْئُ نَوْباً: شتەكە نزیك بۆوە.

نـاب الى الـشَّيْئِ: گەڕایـەوە بـۆ شـتەكە، خـوی بـە شـتەكەوە گـرت ٥ دەگـوترێ: (نــاب النحـــلُ الى الخلايـــا) هـــەروا دەگـوترێ: (نـــاب الى الله) گەڕایـــەوە بۆلای خوداو تۆبەی كرد.

نـاب عنـه نيابـة: چـۆوە جێگـای ئـەو و لەجیاتی ئـەو كاری كـرد ئـیش‌و كـاری هەڵسوڕاند ٥ بۆوە نوێنەری ئـەو ٥ (ك: نواب).

أناب فلان الى الشَّيْئِ: فلانكەس چەند جارێك بۆ شتەكە گەڕایەوە.

أناب الى الله: گەڕایـەوە بـۆلای خـودا ٥ قورئـان دەفـەرموێ: (فاسـتغفر ربـه وخـرّ راكعـاً وأنـاب) ٥ دەشـگوترێ: (أتاني فلان فما أنَبْتُ اليه) فلانكـەس هات بۆلام پێشوازی خۆشەویستانەو گەرمم لێ نەكرد.

أناب فلاناً عنه في كذا: فلانكەسی كرد

بەنوێنەرو جێگری خۆی لەوشتەدا.

**ناوَبَـهُ في الـشَّيْئِ والأمـر:** هاوكـاریو نۆبەی لەگەڵدا كرد لەئیشەكەدا.

**نَوَّبَهُ:** نۆبەی خۆی بۆ دیاری كرد.

**إنتابَهُ أمْـرٌ:** كـارێكی گـەورەی لێ ڕودرا، بەڵایەكی بۆهات.

**نَـوَّبَ صـدیقه:** جار دواجـار چـو بـۆلای برادەرەكـــەیو ســەردانی كـــرد ٥ دەگـوترێ: (فـلان ینتابنـا) فلانكـەس ســەرمان لێ دەدا ٥ (الــسباعُ تنتــاب المَنْهَلَ) درِندە دەچنە سەر دوێڵاو و شوێنی ئاوخواردنەوەی ئاژەڵەكان.

**تنـاوَبَ الأمْـرَ:** چـەند جارێـك بەشوێن یەكدا ئەوكارەی لە ئەستۆ گرت.

**تناوب القومُ الشَّيْئَ:** خەڵكەكە بەنۆبـە شتەكەیان لەناو خۆیان بـەش كـرد، هـــەموویان بـــەنۆرەو هەركەســـە بەئەنـدازەی خـۆی هاوكـاری دەكـا ٥ دەگـوترێ: (تنــاوبوا المــاءَ، وتنــاوبوا العَمَلَ).

**تناوَبَ الهمومُ فلاناً:** بەڵاو ناخۆشی یەك لەدوای یەك یەخەیان گرت.

**إسْتَنَابَهُ:** كردیە نوێنەری خۆی.

**المُنْتَـابُ:** دیـدەنی كـەر، شـتێكی موبـاح بەنۆرە ئەنجامی بدەی.

**المُنیبُ:** بارانی زۆر.

**النائــبُ:** جێگـر، كەسـێك لەشـوێنی یــەكێكی تــر كــار ئــەنجام بــدا ٥ دەگـوترێ: (نائـب الـرئیس، نائـب القاضـي، نائـب الـشعب، النائـب العمومي) ٥ (ك: نواب).

**النَّائِبَةُ:** بەڵاو كارەسات ٥ (ك: نوائب) ٥ دەگـوترێ: (حُمىً نائبة) لەرزوتایەكە هـــەموو ڕۆژێ دەگەڕێتـــەوە بـــۆ نەخۆشەكە.

**النَّوْبَةُ:** نۆبە ٥ دەگـوترێ: (جاءت نَوبَتُهُ) نـۆرەی هـات ٥ بـەڵاو كارەســات ٥ حاڵەتی ناخۆش نەشاز ٥ دەگوترێ: (جاءت نَوبَتُهُ) نـۆرەی هات، سەرەی هـات ٥ بـەڵاو كارەسات ٥ دەگـوترێ: (إعْتَرَتْهُ نوبة عصبية، أو نوبة الجنـون) ماوەیەكی توڕەبوونی بەسەردا هات، ماوەیەكی شێت بوو ٥ هەروا وشـەی (النَّوبة) بەمانا (هەلو فرسـەت) دێ ٥ دەگــوترێ: (اصـــبح لانوبـــة لـــه) فرسـەتو هـەلی لـەكیس چـوون ٥ كۆمەڵێك ئادەمیزادن ٥ (ك: نُوَبٌ).

**النُّوبَةُ:** بـەڵاو كارەسـات ٥ (ك: نُـوَبٌ) ٥ كۆمـەڵێك ئـادەمیزادن بەتاكەكـەیان دەگـوترێ: (نـوبيّ) (بــلاد النُّوبَــةُ) زێدونیـــــشتمانی ئـــــەو تاقمـــــە ئادەمیزادەیـە كـە دەكەوێتـە بەشـی باشوری میصر.

**النِّیابَـــةُ:** دەســـتەیەكی دادوەرییـــە

لەجیاتی ستەم لێکراو داوا لەسەر ستەمکارو تاوانبارو تۆمەتبار دەخاتە ڕو خۆبەخشانە دەبێتە خاوەن داوا.

**ناتَ نَوْتاً**: لارە لاری بوو لەبەربێ هێزی یان بەهۆی وەنەوزەوە.

**النَّوْتَةُ**: دەفتەری تێبینییەکان؛ دەفتەرۆکێکە مرۆڤ هەندێ تێبینیو وردە حیسابی تێدا تۆمار دەکا.

**النُّوتي**: کەشتیەوان کە لەناو دەریادا کاروباری کەشتییەکە بەڕێوە دەبا ٥ (ك: نواتي)یە.

**ناج نَوْجاً**: کردەوەکەی خۆی نیشانی خەلك دا.

**النَّوْجة**: گێژەلۆکە.

**ناحت الحَمَامَةُ نَوْحاً**: کۆترەکە خوێندی.

**ناحت المرأةُ على الميت**: ئافرەتەکە شینو شەپۆری لەسەر مردووەکە گێڕاو وایە شێرەو واوەیلای بۆ کردو بەسۆزەوە بۆی گریا.

**نَاوَحَهُ**: بەرامبەری وەستا ٥ دەگوترێ: (دارُهُ تناوِح داري) خانوەکەی بەرامبەر خانوەکەی منە.

**تناوح الشَّيئان**: دووشتەکە بەرامبەر یەکتر بوون ٥ دەگوترێ: (هما جبلان يتناوحان وشجرتان تتناوحان).

**تناوَحَ الرياحُ**: ڕەشەبایەکە بەهێز بوو ٥ بایەکە دەمێك سەبابوو، چەلێك بای دەبور بوو، کاتێکیش بای شەماڵ بوو، وەختێکیش بای جەنوب بوو.

**تَنَوَّحَ الشَّيْئُ**: شتەکە جولایەوەو شۆڕبۆوە.

**إسْتناحَ فلان**: فلانکەس هێندە بەسۆز گریا کەسانی تری هێنایە گریان.

**إستناح الذِئبُ**: گورگەکە لوڕاندی.

**إستناحَ فلاناً**: فلانکەسی گریاند.

**المناحة**: شینو شەپۆر ٥ شوێنی واوەیلاو شینو شەپۆر ٥ دەگوترێ: (كنا في مناحة فلان) ٥ هەروا ناوە بۆ دیمەنێك ئافرەت کۆببنەوەو بەسۆز شینو شەپۆر بگێڕن ٥ (ك: مناحات ومناوح).

**النَّوَّاحُ**: کەسێك زۆر شینو شەپۆر بگێڕێ ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (نَوَّاحة).

**أناخ بالمكان**: لەشوێنەکە مایەوە.

**أناخ به البلاء والذُّلّ**: بەلاو ژێردەستەیی یەخەی گرتووەو لەکۆڵی نابێتەوە.

**أناخَ الجَمَلَ**: حوشترەکەی یخ دا ٥ دەشگوترێ: (أناخ بفلان حاجته) هانای بۆ فلانکەس برد پێداویستییەکانی بۆ جێبەجێ بکا.

**نَــوَّخَ الــبعيَ:** حوشــترەکەی یــیخ دا ٥ دەشگوتریّ: (نَوَّخَ اللهُ الأرضَ طروقـةً للمـــاء) خـــودا زەوی والیّ کـــردووە توانای ئەو هەموو ئاوەی هەبیّ.

**تَنَـوَّخَ الجَمَـلُ:** حوشـترەکە ییخی خوارد (پالکەوت).

**تَنَـوَّخَ الجمـلُ الناقـةَ:** حوشـترە نێرەکـە مێینەکەی کەلّ دا.

**إسْـتناخَ:** ییخـی خـوارد ٥ دەگـوتریّ: (أناخَهُ فاستناخَ).

**الَمناخُ:** شوێنی ییخدانی حوشتر (ئاغەلّە حوشـــتر) ٥ شـــوێنی مانـــەوە ٥ دەگوتریّ: (هـذا منـاخ سـوء) ئەمـە شوێنێکی خراپـە بۆ تێدا مانـەوە ٥ بەکەلّکی نیشتەجیّ بوون نایە.

**مناخ البلاد:** باری کەش‌و هـەوای ولاّت ٥ دەگوتریّ: (مناخ هذه البلاد رطـب حـــار) کـەش‌و هـەوای ئـەم ولاّتانـە شێدارو گەرمە.

**النائخة:** زەوی دوور.

**النَّوْخَةُ:** مانەوەو نیشتەجیّ بوون.

**نادَ نَوْداً ونَواداً ونُـواداً:** لەبـەر خـەوهاتن‌و هەنۆز بردن لارەلاریەتی.

**نـادَ فـلان:** فلاّنکـەس سـەری باداو شـانی هەلّتەکاند.

**تَنَوَّدَ الغُصْنُ:** لقەدرەختەکە شـەکایەوە، هەژا، راژا.

**نَوْدَأ:** بڕوانە مادەی (نَدَأ).

**نَوْدَلَ:** بڕوانە مادەی (نَدَلَ).

**نارَ نَوْراً:** ڕوناکی کردەوە، لەئاسۆدەرکەوت، جوان بوو.

**نارت الفِتْنَة:** فیتنـەو ئاشوب بـەرپابوو بلاّو بۆوە.

**نـار فـلان:** فلاّنکـەس تـیّ شـکا، هـەلاّت ٥ دەگـوتریّ: (نـار الظَّبْـيُ مـن صـائده) ئاسکەکە لەترسی ڕاوکەرەکە هەلاّت.

**نارت المرأة من الشيب:** ئافرەت لەترسی پیریـــی هـــەلّهات خـــۆ لـــەپیری دەشارێتەوە.

**نار فلان:** فلاّنکەس قاچاندی، هەلاّت.

**نــار الــشَّيْءَ:** نیـشانەی تایبـەتی لەسـەر شتەکە دانـا ٥ دەگـوتریّ: (نـار الـسلعة) ئـارمی تایبـەتی خـستە سـەر کالاّکـە ٥ (نار النار من بعيد) ئاگرەکـە لـەدوورەوە بینـدرا ٥ (نار فلانـاً وغـيره) فلاّنکەسـی ترساند.

**أنارَ:** ڕوناکی کردەوە ٥ دەگوتریّ: (أنـار الشجرُ) درەختـەکە پـشکوت‌و گولّـی کـــرد ٥ گولّـــەکانی دەرکـــەوتن ٥ دەشگوتریّ: (أنـار النبـاتُ) ڕوەکەکـە ڕواو گەشەی کردو خۆی ئارایش دا.

**أنـــارَ فـــلان:** فلاّنکـــەس ڕوخـــساری گەشایەوەو ڕەنگی جوان بوو.

**أنار المكانَ:** شوێنەکەی ڕوناك کـردەوە.

أنـــارَ الأمـــرَ: كارەكـــەی ڕونكـــردەوەو ئاشكرای كرد.

أنار الظبيَ: ئاسكەكەی تەراند.

ناور فلاناً: جنێوی بەفلاّن دا.

نَـــوَّرَ: ڕونـــاكی دا، ڕونـــاكی كـــردەوە ٥ دەگـوترێ: (نَـوَّرَ المكـانُ) شـوێنەكە ڕوناك بوو.

نَوَّرَ الصُبْحُ: بـەیانی گزنگی داو ڕونـاك بـــوو ڕوناكـــایی بـــەیانی لەئاســـۆ دەركەوت.

نَوَّرَ الشَجَرُ: درەختەكە گوڵی كرد.

نَـــوَّرَ النبـــاتُ: ڕوەكەكـــە پێگـــەیی‌و دەركەوت.

نَوَّرَ الثَمَرُ: میوەكە دەنكی تێدا خولقا.

نَوَّرَ علی فلان: فلاّنكەسی شارەزا كـردو كارێكی بـۆ ڕون كـردەوە ٥ سـەری لێ شـێواندو چەواشـەكاریی لەگـەڵ دا ئەنجام دا.

نَوَّرَ المصباحُ: چراكەی هەڵكرد.

نَوَّرَ الأمْرَ: كارەكەی ئاشكرا كـرد، ڕونـی كردەوە.

نَوَّرَ الله قلبـه: خـودا فلاّنكەسـی شارەزا كرد بۆحەق‌و هیدایەتی دا.

نَوَّرَ الجِلدَ: پێستەكەی بەدارِو سـواغ دا ٥ دارِوی لە پێستەكە هەڵسو.

تَنَوَّرَ النَّارَ: لەئاگرەكە ورد بۆوە، شوێنی پێ دەرخستن‌و كون‌و كەلەبەری پـێ دۆزینەوە ٥ چوو بۆلای ئاگرەكە.

تَنَوَّرَ الرجلَ: سەیری پیاوەكەی كرد: كە ڕونـــاكی ئـــاگر لێـــی دابـــوو بـــەلاّم پیاوەكە ئەمی نەبینی.

إسْتنارَ: ڕونـاكی دا، دەگـوترێ: (إسـتنارَ الـــــشعب): گـــــەل‌و نەتـــــەوە ڕۆشـــــنبیربوون، هەســـــت‌و بـــــیرو بۆچوونی زیندویان هەبوو.

إستنارَ بە: ڕوناكایی لێ وەرگرت.

إســـتنارَ عَلَیـــە: بەســـەری دا زاڵ بـــوو زەفەری پێ برد.

الأنـــور: (إســـم تفـــضیل) بـــەمانا لـــەو ڕونـــاكترە، ئاشـــكراترە ٥ دەگـــوترێ: (هذا أنورُ من ذاك) ٥ هـەروا نـاوە بـۆ ڕوخساری جوان‌و گەشاوە.

التَنـــویرُ: كـــاتی كـــازیوەی بەرەبـــەیان دەگـوترێ: (صلي الـصبحَ في التـنویر) لەكاتی ڕونـاكبوونی كـازیوەی بـەیان دا نوێژی بەیانی كرد.

المنـــار: شـوێنی ڕونـاكی ٥ نیـشانەیەكە دادەنـرێ لـەنێوان دوو زەوی‌و شـتی وادا بۆ جیاكردنـەوەی سنورەكانیان ٥ نیشانەو عەلامەتی ڕێگا.

المناورة: بڕوانە مادەی (مناورة) لـەپیتی (میم)دا.

المنـــارة: مـــۆمی داگیرســـاو ٥ منـــارەی مزگەوت‌و شتی وا ٥ ئەو نیـشانانەی

لەبەنـــدەرەکان دا دادەنــــرێ بـــۆ شارەزاییکردنی کەشتی و ڕێبوارانی ناو دەریا ٥ (ك: مناور) یان (منائر).

**المَنْـوَرُ:** پەنجـەرەو دەلاقـەی بـچوك كـە ڕوناكییان لێ بێتە ناو خانو و شتی واوە ٥ بەتاڵاییەكـە لەقـەراخ خـانوو یـــان لەهــــەلاَش‌و ســـەقفی دا دەهێڵدرێتـەوە بۆئـەوەی ڕوناكـایی بـــدا بــەژورەكان‌و هــەوایان لێــوە هاتوچۆ بكا.

**المـــنیر:** تیـشك هاوێـــژ، ڕوناكیـــدەر ٥ ئاشكراو ڕون.

**النائر:** بەمانا (المنیر) دێ.

**النــــائِرَةُ:** بـــەمانا (المـــنیرة) دێ ٥ دوژمنایەتی‌و كینەو ڕقی ناوسینە ٥ دەشـكوترێ: (أطفـأ نـــائرة الحــرب) شەڕو ئاگری شەڕی كوژاندەوە.

**النَـارُ:** ئـاگر؛ عونـصورێكی كاریگـەرە، ڕوناكایی و گـەرمی‌و بلێسەی هەیە ٥ (ك: نیران) ٥ دەشـكوترێ: (إستضاء بناره) ڕاو بۆچونی ئـەوی وەرگـرت‌و پـەیڕەوی كـرد ٥ هـەروا دەگـوترێ: (أوقـــد نــــار الحـــــرب) شــەڕی هەلگیرســــاندو ئـــاگری شـــــەڕی خۆشكرد.

**النَّـــوارُ:** ئافرەتێــك خــۆ لــە شــوێنی گوماناوی‌و كاری گوماناوی بپارێزێ ٥ دەشـــكوترێ: (بقـــرة نـــوار): مانگایەكـە لەبـەر كـەڵ هەڵـدێ‌و نایەوێ كەڵ سواری بێ.

**النورانیة:** بەمانا (النور) دێ.

**النَّـوْرُ:** گـوڵی سـپی ٥ تاكەكـەی پێـی دەگوترێ: (نَوْرَة) ٥ (ك: أنوار).

**النُّورُ:** ڕوناكایی‌و ڕۆشنایی پرشنگ ٥ ئەوەی شت بـەدیار دەخـاو وایـان لێ دەكا چاو بیان بینـێ ٥ قـەدو بـاڵای جوانی ڕوەك‌و درێژی ٥ (ك: نِوَرَةٌ).

**النَّـوَرُ:** خـەڕات‌و دۆم بڕوانــە مـادەی (غَجَرَ).

**النُّورَةُ:** نیشانە ٥ بەردی كلسی ٥ بـەردە تـــسنە ٥ تێكەڵەیـــەك لـــەخوێی كالیـسیۆم‌و بـاریۆن كـە دەكرێنــە دەرمانی موو لابردن‌و شتی وا.

**النُّوَّارُ:** گوڵ ٥ تاكەكـەی (نـوّارة) ٥ (ك: نواویر).

**النَّـوْور مــن النـسـاء:** ئـافرەتی سـرك‌و خۆپارێز لەشوێنی گومانـاوی، كـاری گوماناوی ٥ هەروا ناوە بۆ ئەو بـەزو پیوو دەرمانەی خـاڵی كوتراوی پـێ سەوز دەكرێ ٥ دوكەڵی پیو.

**النَّیِّرُ:** ڕوناككەرەوە ٥ ڕوخساری جوان‌و گەشەدار.

**نَـوْرَجَ:** پـاش‌و پێـشی كـرد، دەمێـك بـۆ دواوەو دەمێك بۆ پێشەوە ٥ (نَـوْرَجَ

في الكــلام) لــه قــسەكردنەكەی دا مینگە مینگی كـردو شتەكەی ڕون نەكردەوە.

**النَّــوْرَجُ**: جەنجــەڕ (ئــامێری كرشــە گێرەكردن بـۆ كردنـی بـەكاو دوایـی جیاكردنەوەی دانەوێڵەكە لەكایەكـە بەهۆی شنەو شتی وا).

**نَــوْرَزَ**: كەوتــە مــانگی نــەورۆزەوە ٥ ئاهـەنگی جـەژنی نـەورۆزی گێـڕا ٥ شاعیرێك دەڵێ:

(نورز الناس و نورَزْ تُ ولكن بدموعي)

**نَوْرَزَ فلاناً**: دیاریی جەژنی نەورۆزی بۆ فلانكەس نارد.

**النَّــوْروزُ** (یــان) الــنیروز: ڕۆژی نــوێ، یەكـەم ڕۆژی سـاڵی خـۆری ئێرانـیو كوردییە: كەڕێكەوتی بیستو یـەكی مانگی ئـازار دەكـاو سـەرەتای وەرزی بەهارە ٥ پیرەمێرد دەڵێ:

نـەورۆزی سـاڵی تازەیـە نـەورۆزە هاتـەوە
جـەژنێكـی كـۆنی كـوردە بەخۆشـیو بەهاتەوە.

**ناسَ الشَّيْءُ نوساً ونوساناً**: شـتەكە كەوتـە لەرینـەوەو جـمو جـۆڵو هـاتو چـۆ ٥ دەگــوترێ: (ناســت الذؤابــة) لكــی مێزەرەكـە لەریـەوە ٥ (نــاس الغــصنُ الــدقيق) لقــە باریكەكــەی درختەكــە لەریەوە ٥ (القُرْطُ ينوس في الأذن) گوارە لەگوی دا دەلەرێتەوە.

**ناس الإبلَ**: حوشترەكەی لێخوڕی.

**أناسَــــهُ**: خــستیە جــمو جــۆڵ ٥ لەراندیەوە.

**نَوَّسَ التَّمْرُ**: خورماكە لایەكی ڕەش بوو (فهو مُنوس).

**نَوَّسَ بالمكان**: لەشوێنەكە مایەوە.

**تَنَــوَّسَ الــشَّيْءُ**: بــەمانا (نــاسَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَنَوَّسَ الغصْنُ الدقيق) لقە باریكەكانی درەختەكە لەرینەوە.

**النَّاسُ**: ئادەمیزاد، گرۆهـی ئـادەمیزاد ٥ وادەبــێ مەبەســت لــەو وشــەیە ئادەمیزادی عاقڵو ڕێزدارە ٥ وەكوو قورئان دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُواْ كَمَا آمَنَ النَّاسُ﴾.

**النَّـاووسُ**: صـندوقێكە لـەدارو تەختـە دروســت دەكــرێ مەســیحیەكان مردوی تێدەخەن ٥ هەروەها نـاوە بـۆ گۆڕســـتانی مەســـیحیەكان ٥ (ك: نواویس).

**النُّــــواسُ**: ئــــەوەی هەڵدەواســــرێو شۆڕدەبێتەوە لەشێوەی داوە دەزو و شتی وا لەهەڵاشەوە بەهۆی دوكەڵی ناومالـەوە ٥ دەگـوترێ: (أزِلْ نــواس الــدخان) ڕیــشۆڵە شــۆڕبۆوەكانی هەڵاشەكە لابەرە.

**نواس العنكبوت**: تەونی جاڵجاڵۆكە.

**النَّواسِــيُّ**: لـەرزۆكو شـلو شـێواو ٥ دەگوترێ: (رجل نواس).

**نـاش فـلان نَوْشـاً**: فلانكـەس ڕۆيـشت ٥ پەلـەی کـرد لـە ڕاپـەڕين دا خێـرا ڕاپسکوت.

**ناش بالشيئ**: پەيوەست بوو بەشتەکەوە.

**ناش الشَّيْئَ**: داوای شتەکەی کـرد ٥ هـەڵی گـرتو بـردی، دەگـوترێ: (ناشـە بيـدە) بەدەستی هەڵی گرت، دەستی دايە.

**نـاش فلانـاً**: بەسـەرو ڕيـشی ئامـاژەی بـۆ کـرد، سـەری بـۆ بـادا ڕيـشی بـۆ هەڵتەکاند.

**ناش فلانـاً بالـشيئ**: شـتەکەی دا بـەفلان يـان فلانکەسـی بەشـتەکە هـەنگاوت ٥ شـتەکەی لەفلانکـەس دا ٥ دەگـوترێ: (ناشە بـالرمح) ٥ (وناشـە بخير) ٥ (نـاش فلاناً خيراً): خێرو خۆشی بەفلانکـەس گەياند.

**ناوَشَ الشَّيْئَ**: شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**ناوش فلاناً**: پێش ئەوەی شەڕی لەگەڵ بکا هێزی فلانکەسی بەتاقی کردەوە ٥ دەگـوترێ: (ناوشت االعـدوَّ مقدمـةُ الجـيش) پێـشەتای سـوپاکە لەگـەڵ دوژمن دا کەوتە شەڕەوە.

**إنتـاشَ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی بـەگورجی هەڵگرت ٥ دەری هێنا ڕزگاری کرد ٥ دەگوترێ: (إنتاشني فلان مـن الهلکـة) فلانکەس لەتێداچون ڕزگاری کردم.

**تنـاوش القـومُ في القتـال**: خەڵکەکـە دوراودوور هەنـدێك تەقـەيان لەيـەکتر کـردو لەيـەك نزيـك نەبوونـەوە ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَأَنَّى لَهُمُ التَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾.

**تَنَوَّشَ يده بالمنديل**: بەدەستەسڕ دەستی سـڕيەوە بۆئـەوەی چـەوری‌و شـتی وای پێوە نەمێنێ.

**النُّوُوشُ**: بەهێز.

**نـاصَ نَوْصـاً ونَوَصـاناً**: هەڵـساو ڕايکـرد، جوڵايەوەو هەڵات.

**ناص الفرسُ**: ئەسپەکە چەموشانە سەری هەڵبڕی ٥ دەگوترێ: (فلان ما يقدر على أن ينوصَ) فلانکەس ناتوانێ پەلاماری شتێك بدا.

**ناص عَنْ الأمر أو عَنْ زميلـه**: لەکارەکـەی يان لەبرادەرەکەی دواکەوت.

**نـاصَ للحرکـة**: خـۆی ئامـادە کـرد بـۆ ڕۆيشتن.

**ناصَ إليه**: بۆی ڕاپەڕی ٥ پەنای بۆ برد.

**ناصَ الشَّيْئَ**: شتەکەی ڕاتەکاند هەوڵی بۆ شتەکە دا.

**ناصَ فلاناً**: پێش فلانکەس کەوت.

**أناصَ الشَّيْئَ**: شتەکەی ويـستو هـەوڵی بۆ دا ٥ بەرپێوەی برد.

**أناصَ الوَتَدَ**: سينگەکەی لەقاندو بای دا بۆئەوەی دەری بێنێ.

**ناوَصَـهُ**: ڕاکێـشی کـرد، بـۆلای خـۆی هێنای.

**إنْتَاصَت الشَّمْسُ**: خۆر ئاوابوو.

**إنْتَاصَ الفَرَسُ**: ئەسپەکە کەوتە جمو جۆڵ.

**إنْتَاصَ فلان**: فلانکەس سەری بۆلەقاند.

**إنْتَاصَ عنه**: لێی دواکەوت.

**إنْتَاصَ الشَّيْئَ**: شتەکەی جولاند.

**إنْتَاصَ فلاناً**: فلانکەسی خستە گەڕ چووە ژێر باڵیەوە بۆئەوەی کاری پێویستی خۆی ئەنجام بدا.

**المَنَاصُ**: پەناو پەناگە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ﴾.

**النَّوْصُ**: کەرەکێوی ٥ لەم ڕووەوە هەمیشە ئەم حەیوانە سەری هەڵبڕیوە.

**النَّوِيصُ**: هێزو توانا لەسەر جمو جوڵو ڕاپسکان ٥ دەگوترێ: (ما به نويص) جوڵەی تێدا نیە ٥ ناتوانێ بجوڵێ.

**نَاصَ الشَّيْئُ نَوْصاً**: شتەکە جولایەوە، لەرییەوە.

**نَاصَ فلان**: فلانکەس بەناو وڵات دا گەڕا ٥ دواکەوتو بەمراز نەگەیشت ٥ بۆ دواوە گەڕایەوە.

**نَاصَ الشَّيْئَ**: هەوڵی دا شتەکە دەربێنێ.

**أنَاصَ النخلُ إناصةً**: دارخورماکە بەرەکەی پێگەیی.

**أنَاصَ فلان**: فلانکەس چاوی لێ سور هەڵگەڕابوون و نەزانیو ڕقو کینەی لێ دەباری.

**نَوَّضَ الثوبَ بالصبغ**: قوماشەکەی بۆیەکرد ٥ ڕەنگی کرد.

**النَّوْضُ**: شوێنی بەرزایی، تەپۆڵکە، پلوسلی ئاو، شوێنی لێ هەڵڕژانی ئاو ٥ شیو و دۆڵ ٥ (ك: أنواض).

**نَاطَ الشَّيْئَ بغيره وعليه نوطاً**: شتەکەی بەشتێکی ترەوە هەڵواسی ٥ دەگوترێ: (ناط القِربة بنياطها) کوندەکەی بە سینگو پەتەکانی خۆی هەڵواسی ٥ (ناط الأمرَ بفلان) کارەکەی خستە ئەستۆی فلانکەس.

**نِيطَ الحيوان**: ئاژەڵەکە توشی نەخۆشی ملەخڕەو سنگە ئەستورە بوو.

**أناطَ الحيوانُ**: ئاژەڵەکە توشی نەخۆشی ملەخڕەو شتی وا بوو.

**أناطَ الشَّيْئَ به وعليه**: شتەکەی هەڵواسی ٥ پیاکرد.

**نُوِّطَ**: دەگوترێ: (نُوِّطَ الروحَ) تەمبەڵی کرد خەریك بوو لەخەفەتانی گیان دەرچێ.

**إنتاطت المسافةُ**: مەسافەکە دوورکەوتەوە.

**إنتاطت به**: خۆی پێوە هەڵواسی.

**إنتاط الأمْرَ**: کارەکەی بەرای خۆی بڕیەوە نەك بەڕاوێژ.

**التَّنْواط**: ئەو گۆزو گولێنکەی بەکەژاوەدا دەکرێن بۆ ڕازاندنەوەی.

**المَنَاطُ**: شوێنی شت هەڵواسین ◦ دەگوترێ: (هو مني مناط الثريا) نێوان منو ئەو بەئەندازەی نێوان منو شوێنی هەڵواسینی ئەستێرەی سیومیلە ◦ (فلان مناط الثريا) فلاّنکەس لەشوێنی ئەستێرەی سیومیلەو کەس دەستی نایگاتێ، بەرزو بەرێزو خانەدانە.

**مناط الحكم**: بەلای زانایانی ئوصولی فیقهەوە عیلەتو بایسی حوکمەکەیە ◦ دەگوترێ: (مناط الحكم بتحريم الخمر هو الأسكار) عیلەتی بڕیاردان بەحەرامی مەیو بادە ئەوەیە سەرخۆش دەکا.

**المنوط**: کەسێك توشی نەخۆشی ملە خڕە ببێ ◦ دەشگوترێ: (هو منوط بالقوم) ئەو کابرایە خۆی هەڵواسیوە بەو هۆزەوەو لەوان نیە ◦ غەوارەو بێگانەیە لەناویان دا.

**النّائِط**: ڕەگی ناوەوەی پشت.

**النائطة**: چلێدانە ◦ (ك: نوائط).

**النَّوْطُ**: سەربار؛ ئەوەی دەخرێتە سەر دوو تابارەکان ◦ هەرشتێك پەیوەندی بەشتێکەوە بێ ◦ ویسامو ڕێزلێنانی ئازایەتی، ئاشتیخوازی، زانستی .....هتد ◦ دەگوترێ: (مُنِحَ فلان نَوْط الجدارة) فلاّنکەس شارەی لێهاتویی پێدرا ◦ زەمیلەیەکی بچوکە خورمای تێدەکرێ ◦ ڕەگە دەمارێکی ئەستوورە لەسیو جەگەرەوە درێژدەبێتەوەو پەیوەستە بەدڵەوە ◦ ئێسقانێکی بچوکە لەخوار سێبەندەوەیە پێی دەگوترێ: (کلێجە) ◦ (ك: أنواط ونياط).

**النَّوْطَةُ**: چلێدانە، هاوساوییەکە لەسینگ دا یان لەگەردن دا یان غودەیەکە لەگەدەداو کوشندەیە ◦ ئەو شوێنەی ئاو نایگاتێ زەوییەك: درەختی تەڵحو تەرفای تێدابێ ◦ ڕقو کینە.

**النِّياط**: ئەوەی شتی پێدا هەڵدەواسرێ ◦ ڕەگێکە سیو دڵ پێکەوە دەبەستێ ◦ (ك: أنوِطَة ونوط) ◦ دەشگوترێ: (مفازة بعيدة النياط) سارایەکی پانو پۆڕو درێژە برانەوەی نیە.

**النَّيطُ**: بیرێکە ئاو لەقەرخەکانیەوە دێتە ناویەوە لەبنکییەوە هەڵناقوڵێ.

**نـاعَ نَوْعـاً ونَوَعَانـاً**: لەرییەوە ئەملاو ئەولای کرد ◦ ڕاژا ◦ دەگوترێ: (ناعَ الغُصنُ) لقەدرەختەکە ڕاژا.

**ناعـت العُقـابُ**: هەڵۆکە خۆی خوارکردەوە بۆئەوەی پەلاماری

نێچیرەکەی بدا.

**نـاعَ الـشَّيْئَ**: شتەکەی جولاندو خستیە گەڕ.

**نَوَّعَـت الـريحُ الغُـصْنَ**: بایەکـە لقەدرەختەکەی ڕاژاند.

**نَـوَّعَ فـلان الـشَّيْئَ**: فلانکەس شتەکەی داهێـشتەخوارو وازی لێ هێنـا بۆنەوەی بۆخۆی بلەرێتەوە.

**نَوَّعَ الأشياء**: شتەکانی ڕیزبەند کردو لێکـی جیاکردنـەوەو کردنیـە جۆرجۆر.

**تَنَوَّعَ الشَّيْئُ**: شتەکە جولایەوەو هەژا ە ڕاژا.

**تَنَوَّع الغُصْنُ**: لقەدرختەکە ڕاژا.

**تَنَـوَّعَ النـاعِسُ علـى الرَّحْـلِ**: ومنـەوز لێهاتووەکە بەسەر بارو بارگنەکەوە لۆژە لۆژی بوو.

**تَنَـوَّع الـصَّبِيُّ في الأرجوحـة**: منداڵەکـە لەناو جۆلانەکەیدا ڕاژا.

**تَنَوَّعـت الأشـياءُ**: شـتەکان لێـک جیاکرانەوەو ڕیزبەندکران.

**إسـتناعَ**: دەسـتی کـرد بـە جەوجـۆڵو ڕاژان.

**إستناعَ الغُصْنُ**: لقەدرەختەکە ڕاژا.

**إستناعَ الشَّيْئَ**: شتەکە درێژ بۆوە.

**إسـتناعَ في الـسير**: لەڕۆیـشتن دا پێشکەوت.

**المنواع**: شێوازو ئوسلوب.

**النَّائِعُ**: تینو ە کەسێك لەبرسان لۆژەی بـێ، لاکـەی بـێ ە وایـش دەبـێ دەکرێتە ئاوەڵنـاوی وشـەی (الجـائع) دەگوتـرێ: (جائع نائع).

**النَوعُ**: جۆر لەهەرشتێك بێ ە لـەزاراوە زانـا مەنتیقیـەکان دا وشـەیەکی ڕەهایـەو بـۆ تاقەکەسێك یـان بـۆ چـەند کەسـێك دەگـوترێ کەلەبناغـەو سروشـت دا یـەك بـن‌و لـەوەلامی پرسـیاری (مـاهو)دا دەگـوترێ: (زید مـاهو؟) وەلامەکـەی (إنسانٌ) (زیـد وعمـر وبکـر مـاهم؟) وەلامەکەی (إنسانٌ).

**النُّـوعُ**: دەگـوترێ: (رمـاه الله بـالجوع والنُّـوع) واتـە: دەکرێتـە ئاوەڵنـاوی (الجوع).

**النُّوعَةُ**: میوەی تەڕو تازە.

**نافَ الشَّيْئُ نوفاً**: شتەکە بەرز بۆوە.

**نافَ الضَّبُعَ**: کەمتیارەکە هەڵمەتی برد.

**نافَ عَلَيْهِ**: بەسەریا ڕوانی.

**نـافَ الرضـيعُ الثـديَ**: منداڵەکـە مەمەکەی مژی.

**أنـاف الـشَّيْئُ**: شـتەکە بـەرز بـۆوە ە دەگوترێ: (أناف البناءُ).

**أناف العدُوُ**: ژمارەکە لەدەیان‌و سەدان تێپەڕی.

**أناف عَلَيْهِ:** بەسەریدا ڕوانی.

**نَيَّفَ عَلَيْهِ:** لێی زیاد کرد ٥ دەگوترێ: (نَيَّفَ العدد على ماتقول) ژمارەکە لەوەی تۆ دەیڵێی زیادی کرد، تێپەڕی.

**نَيَّفَ فلان على السنين:** فلانکەس لەشەست تیپەڕی.

**المنافُ:** بەرزو بڵندو سەخت ٥ دەگوترێ: (جبل عالي المناف) کێوێکی زۆر بڵندو سەختە.

**المنيفُ:** ئەوەی لەبەرزاییەوە بەسەر شتی تردا بڕوانێ.

**عِزٌّ منيف:** زۆر بەرزو بڵند.

**قصر منيف:** باڵەخانەی زۆر بەرز.

**المنيفة:** دەگوترێ: (إمرأة منيفة) ئافرەتێکی باڵا بەرزو شۆخو شەنگە.

**النّاف:** لەزاراوەی میصرییەکان دا ناوە بۆ (نیری) جوت.

**النَّوفُ:** دەنگ ٥ بنی کلك ٥ دوگی بەرزی حوشتر ٥ (ك: أنواف).

**النَّيافُ:** شتی زۆر بەرز ٥ دەگوترێ: (قصر نَيّافٌ) و (فلاة نياف) و (إمرأة نياف) ٥ باڵەخانەی بەرز، سارای درێژو دوور، ئافەرتی باڵابەرزو جوان.

**النَّيِّفُ:** زیاد لەشت، زیادە بەسەر یەکێکی تردا، دەگوترێ: (هذا الجبل نَيِّف على ذاك) ئەم کێوە لەو کێوە بەرزترە ٥ زیادە لەگرێی ژمارەکان واتە: زیادە لە دەیان و سەدان ٥ دەگوترێ: (عشرة ونيّف ومائة ونيّف) ٥ وشەی (نيّف) دەبێ لەدوای وشەی (عشرة) (عشرون)و ئەو شتانەوە بگوترێ.

**النّيفة:** نێوان خانەی ژمارەکان (نێوان گرێ ژمارەکان) دەگوترێ: (إمرأة نيفة) ئافرەتێکی بالابەرزو شۆخو شەنگە.

**ناق نَوْقاً:** (نَقّى الشحم من اللحم) بەزەکەی لەگۆشتەکە جیاکردەوە.

**نَوِقَ نَوَقاً:** ڕەنگی سپی بوو کەمێك سوراییی تێدا بوو.

**نَوَّ الحيوانُ:** گیانلەبەرەکەی ڕام کرد، زێرباری کرد ٥ دەگوترێ: (نَوَّقَ البعيرَ) حوشترەکەی زێربار کرد.

**نَوَّقَ الناقَةَ:** حوشترەکەی فێری ڕۆیشتن کرد.

**نَوَّقَ النخلة:** دارخورماکەی موتوربە (تەلقیح) کرد.

**نَوَّقَ الشَّيْئَ:** شتەکەی ڕێز کرد، ڕێکی کرد ٥ کوتایەوەو تەختی کرد.

**إنتاق في أموره:** زۆر بەباشی کنارەکانی ئەنجام دا، هەوڵی دا باش جێبەجێیان بکا.

**إنتاق الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵبژارد.

**تَنَوَّقَ فيه:** زێدەڕەوی کرد لەباش بەجێهێنانی شتەکە ٥ دەگوترێ: (تنوق في منطقه وتَنَوَّق في مَلْبسه) هەوڵی دا بەجوانی قسەکانی بکا، زێدەڕەوی کرد لەپۆشاك لەبەرکردن دا.

**إستنوق الجَمَلُ:** حووشترە نێرە چەموشەکە وەکوو حوشتری مێینە رام بوو ٥ کەسێك دوای دەست ڕۆیشتویی زەلیل بێ پێی دەگوترێ: (إستنوق الجملُ).

**النّائِقُ:** ئەو کەسەی بەزو گۆشت لێك جیادەکاتەوە بۆ جولەکە ٥ (ك: نُوَقة).

**النّاقة:** حوشترە مێینە (ك: ناق، ونوق، وأينق و أنواق) هەروا وشەی (ناقة) ناوە بۆ ئەستێرەی ڕیزبەستو.

**النُّوْقَة:** زیرەکیو لێهاتویی لەهەموو شتێك دا.

**النَّوّاقُ:** کەسێك کاروبار لەئەستۆ بگرێو ڕێکیان بخا.

**النِّيقَةُ:** زێدەڕۆیی لەهەوڵدان بۆ کردنی ئیشی باشو ئەنجامدانی بەڕێكو پێکی ٥ لەپەنددا هاتووە (خرقاء ذات نيقة) بە کەسێك دەگوترێ نەزان بێو لافی زانایی لێ بدا، گەندەڵ بێو لافی چاکسازی و نەزاهەت لێ بدا.

**نَوِكَ نَوَكاً ونَواكاً:** ئەحمەق بوو.

**أنْوَكَهُ:** بەئەحمەقی لەقەڵەم دا ٥ دەشگوترێ: (ما أنوَكَهُ) ئای چەند گێلو ئەحمەق بوو.

**إسْتَنْوَكَ:** ئەحمەق بوو.

**إستنوك فلاناً:** فلانکەسی بەگێلو ئەحمەق دانا.

**الأنْوَكُ:** ئەحمەقو گێل ٥ بێ دەسەڵاتو نەزان ٥ کەسێك زمانی بگیرێو نەتوانێ قسە بەئاسانی بکا.

**نالَ على فلان بالشيئ نولاً ونوالاً:** شتەکەی بەفلانکەس بەخشی ٥ دەشگوترێ: (نال فلاناً العطية وبالعطية) بەخششەکەی دا بەفلانکەس.

**نالَ فلان بالحديث:** فلانکەس ویستی قسەبکا.

**نال لَه أن يفعل كذا:** کاتی ئەوە هاتووە ئەو ئیشە بکا.

**نالَ الشَّيْءَ:** شتەکەی دەست کەوت.

**نالَ فلان نيلاً ونَوْلاً:** فلانکەس بوو بەخاوەن بەخششو عەتای زۆر.

**أنالَ المَعْدِنُ:** لەکانەکەدا شتێکی دۆزییەوە.

**أنالَ فلان الشَّيْءَ:** شتەکەی دا بەفلانکەس.

**ناوَلَهُ الشَّيْئَ:** شتەکەی دایە.

**نَوَّلَ:** بەخششی پێدا ○ دەگوترێ: (نَوَّلَ فلاناً ونَوَّلَ علیه).

**نَوَّلَ فلاناً الشَّيْئَ:** شتەکەی دابەفلان.

**تناوَلَ الشَّيْئَ:** شتەکەی هەلگرت، وەرگرت.

**تناوَلَ الرِكابُ بنا مكان كذا:** سوارەکان کاروانچییەکان لەگەڵ ئێمە گەیشتنە فلان شوێن.

**تَنَوَّلَ فلان بالخير:** فلانکەس کەوتە خێرکردنو چاکەخوازی.

**تَنَوَّلَ عَلَيْهِ بِشيئٍ:** شتەکەی پێ بەخشی.

**تَنَوَّلَ الشَّيْئَ:** شتەکەی هەلگرت ○ دەشگوترێ: (نَوَّاني كذا فتنولتُهُ) فلان شتی پێدام منیش وەرم گرت.

**المُتَنَاوَلُ:** دەگوترێ: (هو قريب المتناول) ئەوە بەیدەستە بەئاسانی دێتە دەست.

**المِنْوالُ:** شەپیتەی جوڵا ○ خەرەکی جوڵا ○ یان خودی جوڵاکە خۆی ○ (ك: مناويل) ○ شێوەو شێوازو ڕێبازو مەزهەب ○ دەگوترێ: (هم علی منوال واحد) ئەوان لەسەریەك شێوازو تەبیاتو ڕەوشتن.

**النّالُ:** سەخیو نانبدە ○ بەشو بار ○ (ك: أنوُلّ).

**النّوالُ:** بەشو بار بەخشش ○ دەگوترێ: (نوالُكَ أن تفعل كذا) ئیشی تۆ ئەوەیە ئەو کارە ئەنجام بدەی.

**النّوالَة:** پارو.

**النَّوْلُ:** پارەو ڕەسمی کەشتی؛ بلیتی کەشتی ○ ئەو پارەیەی دەدرێ بەفەرمانگەی گواستنەوەی نامەو شتو مەك بۆ کرێی گواستنەوەکە ○ شیوێك لافاوی لێ بێ ○ خەرەکی جوڵا، ئەوەی کە ڕیسەکەی لەسەر هەڵدەکرێ ○ (ك: أنوال) ○ هەروا دەگوترێ: (مانُوْلُكَ ولانُولك أن تفعل كذا) لەتۆ ناوەشێتەوە ئەو کارە بکەی ○ لەحەدیس دا هاتووە (ما نَوْلُ إمرئٍ مسلم أن يقول غير الصواب) بۆ مرۆڤی موسوڵمان ناشێ جگە لەڕاستی شتی تر بڵێ.

**النَّوْلَةُ:** ئەوەی دەست مرۆڤ دەکەوێ لەخێرو بێر ○ دەگوترێ: (ما اصبتُ منه نولة) من خێرو بێرێکم لێ دەست نەکەوتووە ○ ماچ؛ ماچێکم نەکردووە.

**نامَ فلان نَوْماً ونياماً:** فلانکەس نوست، ڕاکشا، هەنۆزی هاتێ.

**نامَ الشَّيْئُ:** شتەکە بێدەنگ بوو ئارامی گرت.

**نامَ الخلخال:** خرخاڵەکان بێدەنگ بوون

لـەم ڕووەوە پڕبەقاچـن‌و لەگۆشـت دا ونبـوون ٥ (نـام العِـرْقُ) دەمارەکە لێـی نەدا ٥ (نامت الريح) ڕەشەباکە بێدەنگ بـوو وزەی نایـە ٥ (نـام البحـر) دەریـا هێواش بۆوە ٥ (نامت قالنـارُ) ئاگرەکە کـپ بـوو کوژایـەوە ٥ (نامـت الـسوق) بازاڕ کەوت.

**نـام الثـوبُ أو الفَـرْوُ**: کراسـەکە یـان فەروەکە کۆن بوو، ڕزی.

**نام فلان لله**: فلانکەس ملکەچی فـەرمانی خودابوو.

**نـام اليـه**: ئـارامی گـرت‌و دڵـی لـەلای داسەکنا.

**نـام عَـنْ حاجتـه**: ئیشەکەی خـۆی لـەبیر چۆوەو گرنگی پـێ نـەدا ٥ دەشـگوترێ: (نـام هَمُّـهُ) غـەمی نـەبوو ٥ (مـا نامـت الـسماءُ الليلـة مطـراً أو برقـاً) ئەمـشەو ئاسمـان هـەدادانی نـەبوو یـان بـارانی هەبوو یان هەورەبروسکە.

**نام فلاناً نَوْماً**: بەسەر فلانکەس زاڵ بـوو لەزۆر نوستن دا.

**أنامَـهُ**: نوانـدی ٥ دەشـگوترێ: (طعنـه فأنامَهُ) زەبری لێ داو کوشتی ٥ (أنـامَ القَحْـطُ القـومَ) گرانـی‌و قـات‌و قـڕی خەڵکەکەی لاواز کرد.

**ناوَمَهُ**: پێشبڕکێیان کرد لەزۆر نووسـتن دا.

**نَوَّمَ فلان**: فلانکەس زۆر نوست.

**نَوَّمَ فلاناً**: فلانکەسی نواند.

**تنـاوَمَ**: وای خـۆ نیـشان دا نوسـتووە ٥ خـۆی بەنوسـتو خـست ٥ هـەوڵی دا بنوێ.

**تنـاومَ اليـه**: لـەلای داسـەکناو ئـارامی گرت.

**تَنَـوَّمَ**: هـەوڵی دا بنـوێ، پاڵکـەوت بۆنـەوەی خـەوی لێ بکـەوێ ٥ دەگـوترێ: (تَنَـوَّمَ شـهوة للنـوم) پاڵکەوت چونکە زۆری حـەز لەخـەو بـوو ٥ (شـەیتان پێـی پێکـەنی)، ئیحتیلامی بوو.

**تَنَـوَّمَ فلانـاً**: فرسـەتی لـەفلان هێنـا لەکاتی نووستنی دا.

**إسـتنام**: نووسـت ٥ خـۆی بەنوسـتوو خـست ٥ جـێگیر بـوو ٥ (التنـويم المغناطيسي) حاڵـەتێکی کـارتێکردەی جەسـتەیە دیـاردەی نووسـتوویی لەسـەر مرۆڤـە نوێنراوەکـە دەردەکـەوێ بـەهۆی ئـەو ئیحائـات‌و ڕەهنومـایی کـرد ئانـەی نوێنەرەکـە ئاراستەی خەو لێخراوەکەی دەکا بۆ دەسـتەبەربوونی فیکرەیـەك کەکابرای نوێنراو لێی بێ ئاگایە.

**المَنـامُ**: نووسـتن ٥ دەگـوترێ: (رأي في منامه كذا) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿یَا

بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى﴾ ٥ هەروا وشەی (المنام) بەمانا شوێنی نووستن دێ ٥ دوکانو شوێنی وا ٥ پۆشاکی پێوە نووستن ٥ گۆڕ.

الْمَنْوَمَة: هەرشتێك خەو لەمرۆڤ بخا ٥ دەگوترێ: (طعام مَنْوَمَة) خواردنێکە خەو لەمرۆڤ دەخا.

الْمُنَوِّمُ: ئەو کەسەی ئیشی خەو لێ خستن (تنویم موگناتیسی) دەکا ٥ هەر دەرمانێك خەو لەمرۆڤ بخا.

النَّائِم: دەگوترێ (لیل نائم) شەوێکە خەوی تێدا دەکرێ.

النَّؤُوم: زۆر نوستوو کەسێك زۆر بخەوێ ٥ دەگوترێ: (رجل نؤوم وإمرأة نؤوم).

النُّوَام: نەخۆشییەکە توشی مرۆڤ دەبێ لەناکامی گەستنی مێشی تسی تسی، کابرا خەوی لێ دەکەوێو لەوانەیە وەهۆش خۆی نەیەتەوە زۆر جار کوشندەیە.

النَّوْمُ: نووستوەکان ٥ ماوەیەکە جەستەو عەقڵ تێیدا پشو دەدەنو لەو ماوەدا هەست کەم تازۆر نامێنێو بڕی ئەرکی ئەندامەکانی جەستە نامێننو هەستەکان لەکار دەکەون.

النُّوَمُ: زۆر نوستوو، کەسێك زۆری حەز لەخەو بێ.

نومان: زۆر نوستوو، کەسێك زۆری حەز لەخەو بێ ٥ ئەم وشەیە تایبەتە بەبانگ کردنەوە ٥ دەگوترێ: (یانومانُ).

النُّوَمَةُ: کەسێك زۆر بنوێ ٥ کەسێك ناو و ناوبانگی لەناو خەڵك دا نەبێ کەس نەیناسێ ٥ کەسێك لاشەڕبێو نەزانێ شەڕ چیەو بیر لەشەڕو شەڕخوازی نەکاتەوە.

النَّوِيمُ: بێ ئاگاو گێل، لاشەڕو ئاشتیخواز، کەسێك دژی شەڕو ئاژاوەبێ.

النِّيمُ: هەرشتێك نەرمو نۆڵ بێ ژیانی نەرمو نۆڵ، قوماشی نەرم ٥ پۆشاکی نوستن ٥ پەستەكو فەروەی کورت کەلەپێستی کەروێشكو شتی وا دروست دەکرێ ٥ درەخت ٥ پلیکانە کەبەهۆی ڕەشەباوە لە لمەلان دا دروست دەبن ٥ مرۆڤی قسە خۆشو گونجاو بۆ هاوەڵی کردنی ٥ دەشگوترێ: (فلان نیمیّ) فلانکەس پیاوێکی قسەخۆشو ئەربابە بۆ هاوەڵی کردنی ٥ پیاوی ژنانی.

النِّيمَةُ: ئارامیو حەسانەوە بەهۆی نووستن ٥ دەگوترێ: (إنه لحَسَنُ النِيمَةِ) ئەو مرۆڤە لەخەوێکی ئارامدایە ٥ دەشگوترێ: (ماله نیمة

ليلـة واحـدة) ئـەو مرۆڤـە بـژێوی شەوێكی نیە.

نَوَّنَ الكلمة: جوت بزوێنی خستە سەر كۆتایی ئیسمەكە.

نَوَّنَ النونَ: پیتی نونی نووسی.

التنوين: بەلای نەحوییەكانەوە نونێكی زێـدەی بـێ بزوێنـە بـەكۆتایی ئیـسمەوە دەنووسـێ و تەنكیـد ناگەیەنێ.

النون: پیتێكە لە پیتـەكانی هیجا (ك: نونـات وأنـوان) ٥ تیـژایی شمـشێر ٥ ماسی ٥ ئوچ و دەواتی نووسین.

النّونة: چالایی چەناگەی منداڵی ساوا ٥ ماسی.

ناهَ نَوْهاً: بەرزبۆوە، درێژبزوو بـالای كـرد ٥ دەگوترێ: (ناهَ النباتُ) ڕوەكەكە بەرز بۆوە بالای كرد.

نـاه البـوم: كوندەبووەكـە سـەرەی بـەرزكردەوە گمانـدی ٥ قەلەڕەشـەكە سەری بەرزكردەوەو قڕاندی.

ناه بالشيئ: شتەكەی بەرز كردەوە.

نـاه عَـنْ الـشَّيْئ: وازی لەشـتەكە هێنـا ٥ دەگـوترێ: (ناهـت نفـسي عَـنْ اللحـم) نەفسم لەگۆشتەكە بێزرا.

نـاهَ البقـلُ الـدوابَ: گژوگیاكـە كـەمێك ولاخەكەی تێر كرد ٥ دەشگوترێ: (إنّها لتأكُلُ ما ينوهها) ئـەو ئەوەنـدە دەخـوا برسی نەبێ بەتەواوی خۆی لەخواردن مڕناكـا ٥ هـەروا دەگـوترێ: (أغطـني ماينوهني) ئەوەندەم بدەیە برسیایەتیم نەمێنێ.

نَوَّهَ بفـلان أو بأسمـه: نـاوی فلانـی هێنـا، بـەرێزەوە بەاسـی فلانكەسـی كـردو بەگەورەی لەقەڵەم دا.

نَوَّهَ بالحديث: قسەكەی ئاشكرا كرد.

النَّوْهُ: وازهێنان لەشت.

النَّوْهَـةُ: ژەمـە خواردنێـك لەشـەو و ڕۆژدا.

النُّهَةُ: هێزی جەستە.

نَوَى نَيَّ ونية: لەشوێنێكەوە گواستیەوە بۆ شوێنێكی تر.

نَوَى نويً: دووركەوتەوە.

نَـوى التمـرُ: خورماكـە دەنكـی هـەبوو (ناوكی هەبوو).

نوى التَّمْرَ: خورماكەی خواردو دەنكەكەی فڕێ دا.

نـوى الأمـرَ نِيـةً: نیـەتی كارەكـەی هێنـاو بڕیـاری لەسـەردا ٥ دەگـوترێ: (نويـتُ منزلَ كذا، ونويتُ أمْراً).

نواه الله بخير: خودا ئەوی گەیاندە خێرو خۆشی.

نَـوى الـشَّيْئَ: هـەوڵی بەدەسـتهێنانی شتەكەی داو كۆششی بۆ كرد.

نوى فلانـاً: پێداویـستی فلانكەسـی دابـین كرد.

أنــوى: ســەفەرەکانی زۆر کــردن ٥ دوورکەوتەوە.

أنــوى التَمْــرَ: خورماکــەی خــواردو ناوکەکەی فڕێ دا.

أنوى المرعى الدّابة: پاوانەکە ولاخەکەی قەڵەو کرد.

أنوى الحاجة: ئیشەکەی جێبەجێ کرد.

أنــوى البُسْرُ: دەنکــە خورماکــە نــاوکی پەیدا کرد.

نَوّى فلان: فلانکەس ناوکـە خورماکانی فڕێ دا.

نَوّى فلانـاً: فلانکەسی حەوالەی نیـازو مەبەسـتی خـۆی کـردو لەڕوانگـەی نیەتو نیازی خۆیەوە موحاسـەبەی کرد.

نَوّى حاجَتَهُ: کاری خۆی جێبەجێ کرد.

إنتــوى: لەشـوێنێکەوە گواسـتیەوە بـۆ شوێنێکی تر.

إنتوى من الأمر: لەکارەکە وازی هێنـاو چووە سەرکارێکی تر.

إنتوى الشَّيْئَ أو فلاناً: چوو بـۆ شـتەکە یـان چـوو بـۆلای فـلان ٥ دەگـوترێ: (إنتـوى منـزلاً بموضـع كـذا) هـەوڵی پەیـداکردنی مـەنزڵێکی دا لـەفلان شوێن ٥ (إنتوى فلانـاً لمعروفـه) چوو بــــۆلای فلانکــــەس بۆئــــەوەی لەپیاوەتیو سەخاوەتی بەهرەمەنـد ببێ.

إنتـوى الأمْـرَ: نیـازی ئیشەکەی کـردو • ســووربوو لەســەر ئەنجامــدانی ٥ دەشــگوترێ: (إنتــــوى بنوائـــــه) پێداویستییەکەی بۆ جێبەجێ کرد.

تَنَوّاهُ: قەصـدی کـرد، چوبۆلای، نیازی لای ئەوی بوو.

إسْـتنوى: دەنکـە خورماکـەی خـواردو ناوکەکەی فڕێ دا.

المُنْتَوى: دەگـوترێ: (فلان مُنْتوى القـوم) فلانکـەس خـاوەنی بڕیـاری گـەلو نەتەوەکەیەتی.

المَنْويُّ: دەگوترێ: (رجل منوي) پیاوێکە هـــەوڵ دەدا بۆنامـــانجی پـــیرۆزو دەیپێکێ.

النّاوي: دەگوترێ: (فـلان نـاوى القـوم) فلانکـەس خـاوەنی بڕیار بەدەستی نەتەوەکەیەتی ٥ (ك: نِواءً).

النّــوى: دووریـــی ٥ دەفـــەرو ولاتێـــك ســـەفەری بـــۆ بکـــەی ٥ دەگـــوترێ: (شــــطّت بهــــم النّـــوى) زۆر دوورکەوتنــەوە هــەروا دەگــوترێ: (إستَقَرّت بـه النّـوى) جێگیر بـوو ٥ (فلان نـواك) فـلان نیـازو مەبەسـتی تۆیە.

النّــواةُ: نیــازو مەبەســت ٥ خورمـــا عەجەمـە ٥ مێـوژ ٥ ناوکـە خورمـاو شتی لەو جۆرە ٥ ئـەو چڵە ئەمامـە خورمایەی لەسـەر دەنکە خورماکە

(سەوز) یان بڵێ: شین دەبێ ٥ هەرشتێك كێشەكەی پێنج دیرهەم بێ ٥ بەشێك لەكرۆكی زەرە ئەوەی ئەلەكترۆنەكانی بەدەوردا دەخولێنەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّـهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ پێداویستی.

**النَّوَّاءُ**: فرۆشیاری دەنكە خورما.

**النَّوَوِيُّ**: ئاژەڵێك دەنكە خورما بخوا ٥ دەگوترێ: (بعير نوويّ) (وهي نووية) هەرشتێك نیسبەت بدرێ بۆلای (النّواة) ٥ هەرشتێك نیسبەت بدرێ بۆلای گوندی (نوی) وەكوو چۆن یەحیای كوڕی شەرەف محی الدين خاوەنی (منهاج الطالبين والمجموع) چەندەها كتێبی تر نیسبەت دەدرێ بۆلای ئەو گوندەو دەگوترێ: (النووي).

**النووية**: سیلاحی نەوەوی كە بەوزەی زەرەو شتی وا كاردەكاو چەكێكی خاپوركەرە.

**النَّوِيُّ**: هاوەڵێك لەگەڵ تۆدا هاونیازو هاومەبەست بێ ٥ هاوەڵی سەفەر ٥ دەگوترێ: (هو نويّك) ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان نَوِي القوم) فلانكەس خاوەن بڕیاری گەلەكەیەتی بڕیار بەدەستی هۆزەكەیەتی.

**النَّيُّ**: بەزو پیو ٥ ئیسمێكە بەمانا (ڕۆن) دێ.

**النِّيَّةُ**: ڕازونیازو مەبەست ٥ شوێنێك ڕێبوار مەبەستیەتی بیگاتێ دوربێ یان نزیك ٥ دەگوترێ: (شطت بهم نية قذف) سەفەری دورو درێژیان كرد دووركەوتنەوە ٥ (نووا نيةً قذفا) نیازی شوێنی دووریان هەبوو.

**ناء الشَّيْءُ نَيْئاً ونيوءاً**: شتەكە نەكوڵی، نەگەیی (فهو نِيءٌ ونِيٌّ) ٥ شتەكە دووربوو، دووركەوتەوە.

**أنـــاءَهُ**: هەڵی نەپێچا، پێنەگەیی، نەیكوڵاند.

**أنيأهُ**: بەمانا (أناءَهُ) دێ.

**نَيَّأَ الأمْرَ**: كارەكەی قایم نەكرد.

**النِّيءُ**: هەرشتێك پێویست بەكوڵاندن یان برژاندن بێ نەكوڵابێ یان نەبرژابێ (كاڵ) بێ كرج بێ ٥ دەگوترێ: (لبن نيّ) شیری خاو و نەكوڵاو.

**نابَهُ نَيباً**: كەڵبەی هەنگاوت.

**نَيَّبَت الناقةُ**: حوشترەكە پیربوو.

**نَيَّبَ النَّبْتُ**: ڕوەكەكە لاسكی كرد.

**نَيَّبَ الشَّيْبُ**: پیری دەركەوت.

**نَيَّبَ في الشَّيْءِ**: كەڵبەی بەشتەكەدا بردە خوار ٥ دەگوترێ: (ظفر فلان

في كـذا ونَيَّبَ) فلانكـەس زەفـەری بەشتەكە بردو ددانی لێ گیر كردن.

نَيَّبَ الشَّيْءَ: بەددان شتەكەی گەست ٥ شـوێنكەی لەشـتەكە كـرد ٥ بـەددان شـتەكەی بـەتاقی كـردەوە بزانــێ رەقە یان نەرمە.

تَنَيَّبَ النَّبْتُ: روەكەكـە لاسـكی كـرد، لاسكی دەركەوت.

تَنَيَّبَ الشَّيْبُ: پیری دەركەوت.

الأنيَبُ: كەڵبەزل ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (نَيباءُ) ٥ (ك: نيب).

النّـابُ: كەڵبـەی پـەنا ددانەچوارینەی پێـشەوە، خـرێ ٥ هـەموو مرۆڤێـك دوو لەو كەڵبانەی هەن ٥ (ك: أنياب ونيـوب وأنيـب) دەگـوترێ: (عَـضَّهُ الدهر بنابه وأنيابه) رۆژگار بەكەڵبەی خۆی گەستی، هـاڕی ٥ شـەڕو قینـی خۆی بەسەردا ڕشت ٥ هەروا وشـەی (النّاب) ناوە بۆ حوشتری بەساڵاچوو ٥ دەشـگوترێ: (هو ناب قومـه) ئـەوە ڕیـــــش ســــــپیو گـــــــەورەی نەتەوەكەیەتی.

النُّيُـــوبُ مـــن النـــوق: حوشـــتری بەساڵاچوو.

نات نَيْتاً: لۆژەلۆژی بـوو لـەلاوازی دا یـان بەهۆی وەنەوزەوە.

ناحَ الغُصْنُ نيحاً ونيحانـاً: لقەدرەختەكە ڕاژا، جوڵایەوە.

ناحَ العَظْمُ نَيْحاً: ئێـسقانەكە پتـەو و ڕەق بوو ٥ تەڕایی تێدا نەبوو.

نَيَّحَ اللهُ عَظْمَهُ: ئێسقانەكەی پتەو كردو تونـدی كـرد ٥ وردو هـاڕی كـرد ٥ دەگوترێ: (نَيَّحَهُ بخير) شتێكی پێدا.

النَّيْحَةُ: هێزو توانا.

النَّيْحُ: بەهێزو پتەو ٥ دەگوترێ: (عظم نَيِّحٌ) ئێسقانی پتەو.

النَّيْدِلُ: كاری گەورەو گـران ٥ كابوسو مۆتەكە.

النَّيْـدِلانُ و النَّيْـدَلانُ: بـەمانا (النَّيـدِلُ) دێ.

نارَ الثوبَ نَيْراً ونيارةً: وێنەو خەتو هێڵی لەقوماشـەكەدا دروسـت كـرد ٥ تـانو پۆی بۆ قوماشەكە ئامادەكرد.

أنار به: هاواری پێ كرد.

أنار الثوبَ: هێڵو وێنەی بۆ قوماشەكە دروست كرد ٥ دەگوترێ: (هو يسدي الأمور وينيرها) ئـەو ئـیشو كارەكـان باش ڕێك دەخاو ئەنجامیان دەدا.

نَيَّرَ الثوبَ: هێڵو وێنەی بۆ قوماشەكە دروسـت كـرد ٥ لەسـەر دوو هـێڵ قوماشەكەی چنی.

تنايرا: خۆیان ڕازاندەوە.

المنـايَرَة: شـەڕو ئەگبـەتی ٥ دەگـوترێ: (بين القوم منـايرة) ناخۆشـیو شـەڕو

نەگبەتی لەنێو قەومەکەدا هەیە.

المُنَيَّرُ: (ثـوب مُنَيَّـرٌ) قوماشێکە لەسەر دوو ڕایەڵ چندراوە ٥ (جِلد مُنَيَّرٌ) پێستێکی ئەستورو پتەوە.

الـنِّير: نـیری جـوت؛ دارێکی تایبەتیە دەخرێتە سەر ملی دوو گاجوت یان دوو وڵاخ بـۆ زەوی کـێڵان ٥ بـەم جۆرە نیرێکـە دەخرێتـە سـەر ملـی دوو گاجوتەکەو هەرلایەکی نێرەکە بەهۆی کەڵەمەو بەن کەڵەمە لەملی گاجوتەکـە شـەتەك دەدری، ئـەمجار سـەری مزانەکـە کەهـەوجاڕو گاسـنەکەی لێ بەسـتراوە بەبنەوەنـدێك یـان حـەبلێکی پتـەو لـە ناوەڕاسـتی نیرەکـە دەبەسـتری جوتیارەکـە ڕادەکـشێن‌و زەوییەکـە هەڵـدەدڕن ٥ هـەروا وشـەی (الـنِّير) نـاوە بـۆ پـرژو پـاڵی قومـاش، ئـارەو ژمـارەو نیـشانەی قومـاش ٥ قـەراخ ڕێگا.

الـنِّيرةُ: شـەپیتەی جـولا؛ ئـەو شـەپکە پانـەی تێوەدانەکـەی پـێ چەسـپ دەکرێ ٥ دەشگوترێ: (ما هو بـسداة ولا لحمـة ولانـيرة) ئـەو نەرایەڵـە نەتێوەدانـە نـە شـپیتەو ئـامێری چنینە ٥ واتە: هیچ نیە.

نَيـرَبَ: کۆشـشی کـردو هـەوڵی بەرپاکردنی فیتنەو ئاشوبی دا.

نَيْرَبَ الريحُ التُرابَ فوق الشَّيْئ أو عَلَيْهِ: ڕەشـەبایەکە گـڵ‌و خۆڵەکـەی بەشتەکەوە نووساندەوە.

نَيْرَبَ فلان القَولَ: فلانکەس قسەکانی تێکەڵ‌و پێکەڵ کردن.

النَّيْرَبُ: شـەڕو نەگبـەتی ٥ فیتنـەیی ٥ پیـاوی ئـازا ٥ پیـاوی شـەڕەنگێزو فیتنـەجۆ ٥ بـۆ ئـافرەت دەگـوترێ: (نَيْرَبَة).

الَنْيـرَج: هاتوچـۆی بەپەلـە ٥ تێکـەوە هاویـشتن ٥ دەگـوترێ: (جـاءت الـدوابُ تعـدو نيرجـاً) ٥ وڵاخـەکان هـاتن تێکیانـەوە دەهاویـشت‌و ڕیزبەسـتو نـەبوون ٥ دەشـگوترێ: (ناقة نيرجٌ) حوشترێکی ڕەسەنە (ريح نـيرج) ڕەشـەبایەکی تونـدو شـت ڕادەرە ٥ فیتنەو ئاشوبگێڕ ٥ هەروا دەگوترێ: (إمرأة نَيـرَج) ئافرەتێکی بەلاو ئاشبرن‌و نەکڵەوتە.

النَّيْـرَنْجُ: کەسـێکە دەڵێـی سـیحر لێ کراوە.

النَّيرُوزُ: بڕوانە مادەی (النوروز).

النَّيْزَكُ: بڕوانە مادەی (نزك).

نَيْسَبَ بينهمـا: فیتنـەیی لـەنێوانیان دا ئەنجام داو هـەوڵی دا نێوانیـان تێـك بدا.

النَيْسَبُ: ڕێگای ڕاست‌و ئاشکرا ٥ ڕێگای باریـك، ڕێـچکە ٥ وەکـوو ڕێگـای

میروو مارو شتی وا ٥ ڕێبازی کەرەکێوی‌و شتی وا بۆسەر ناو و دوێلاو.

نیسان: مانگی حەوتەمە لەمانگەکانی سالّی سریانی کەبەرامبەر مانگی چواری سالّی زاینییە واتە مانگی نیسان.

**ناصَ نَیْصاً**: بەهێواشی جولاّیەوە.

**النَّیْصُ**: جم‌وجولّی هێواش‌و لەسەرخۆ ٥ ژیشکی کەتەوزل.

**نـاض العِرقُ نَیْضاً**: دەمارەکە پەلەپەلی پێکەوت هەلّبەزو دابەزی کرد.

**ناط نَیْطاً**: دوورکەوتەوە.

**إنتاط**: بەمانا (ناط) دێ.

**النَّـیْطُ**: مردن ٥ دەگوترێ: (رماه الله بالنیط) خودا مردنی بەسەرداهێنا ٥ ئەجەل‌و مەرگ ٥ دەگوترێ: (أتاه نیطه) ئەجەلی هات.

**ناعَ نَیْعاً**: لاربۆوە، ڕاژا ٥ دەوترێ: (ناعَ الغُصْنُ) لقەدرەختەکە ڕاژا ٥ لەڕۆیشتن دا پێشکەوت‌و گورج‌و گۆلّ بوو.

**إستناعَ**: لەڕۆیشتن دا خێرابوو.

**تَنَیَّقَ في ملبسه ومطعمه**: گرنگی زۆری دا بەپۆشاک‌و خواردن.

**النِّیقُ**: کێوی بلّند ٥ بەرزترین لوتکەی کێو و دوندی سەرکەش ٥ دەگوترێ: (هو کالأنوق في النیق) ئەو وەکووو لوتکەی کێوی سەرکەش وایەو کەس دەستی نایگاتێ ٥ (ك: أنیاق ونیوق ونیاق).

**النیکوتین**: قەلوانییەکی شلەو ئامادەباشی توانەوەی تێدایە.

**نالَ الرحیلُ نَیلاً**: کاتی سەفەری نزیك بۆتەوە ٥ دەگوترێ: (ما نال لهم أن یفقهوا) کاتی ئەوەیان نەهاتووە تێبگەن.

**نالَ الشَّیْئَ**: بەشتەکە گەیشت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾.

**نالَ فلان من فلان**: فلاّنکەس جنێوی بەفلاّن دا ناموس‌و کەسایەتی برینندار کرد.

**نال الشَّیْئُ فلاناً**: شتەکە گەیشتە فلاّنکەس.

**نال فلاناً الشَّیْئَ**: داوای لە فلاّن کرد شتەکەی دەست بکەوێ، بیدرێتێ.

**النَّائِلُ**: عەتاو بەخشش دەگوترێ: (أصبتُ منه نائلاً) بەخششیکم لەو دەست کەوت.

**النَّالَةُ**: بەربێلاّو بەردەگاو دەوروبەری خانوو.

**النَّیْلُ**: ئەو عەتاو بەخششەی دەست دەکەوێ ٥ فرسەت‌و زەفەر بردن ٥ دەگوترێ: (أصاب عدوه نیلاً)

فرسەتی لەدوژمنی هێنا.

**النّیلُ:** ڕوباری نیل: ڕوبارێکە ولاتی میصر و ولاتی سودان شەق دەکا ٥ چەند ڕوەکێکی ساڵانەو تەمەندرێژن لە پێڕی (القرنیة)ن دەروێندرێن بۆئەوەی مادەیەکی ڕەنگ شینیان لێ دەربهێندرێ بۆ ڕەنگ کردن کەڵکی لێ وەربگیرێ ٥ پێی دەگوترێ: (ألنیلُ)و (النّیلَجُ).

**النَّیْلَــةُ:** بەمانا (النَوْلــة) دێ ٥ واتــە: بەخشش.

**الــنِّلِینُ:** ئــەو مــادە ڕەنــگ کــراوەی بەڕوەکی (النیل) بۆیە دەکرێ.

**النِّیْلَجُ:** پیو کە شوێنی خاڵ کوتانی پێ دەچوزێندرێتەوە بۆ ئەوەی ڕەنگی خاڵەکە سەوز بنوێنێ ٥ ڕەنگێکی شینە لەگەڵای ڕوەکی (النیل) دەردەهێندرێ ٥ لەولاتی میصر پێی دەگوترێ: (النّیلة).

**النیلوفر و النینوفر:** ڕەگەزی ڕوەکێکی ئاوییە لەپێڕی (النیلوفریة)یە زۆر جۆری هەن لەدەم جۆگەو جۆبارو زلکاوو شوێنی ئاوادا دەڕوێ، هەندێ جۆری لەدێبەرو دێراودا دەروێندرێ بۆ کەڵك وەرگرتن لەگەڵاو گوڵی ٥ لەجۆرەکانی ئەم ڕوەکە جۆرێك هەیە پێی دەگوترێ: (اللوطس) واتە: بوکی نیل پێشی دەگوترێ: (البشنین).

**النیوترون:** قەبارەیەکە دەچێتە ناو پێکهاتەی زەڕەوەو جودایە لە ئیدرۆجین.

**النیم:** بڕوانە مادەی (نَوَم) ٥ هەروا ناوە بۆ تری ڕێویلە ٥ هەروا ناوە بۆ جۆرە تەرێیەکی تر کەلە ولاتی میصر پێی دەگوترێ ترێی (الدیب).

**النیمَبِشت:** هێلکەی نیوە کوڵاو.

**نیون:** عونصورێکی غازییە، ئەگەر پریشکە کارەباییەکی بەناودا ببرێ بلێسەیەکی سوری پرتەقاڵی پەیدا دەکا لەغازەکانی تری جیادەکاتەوە، بەزۆری بۆ ئیعلانو ئیشاراتی ڕوناکی بەکاردێ.

**ناەَ نَیْهــاً:** بەرزبۆوە ٥ بووە جێگای سەر سوڕمان.

**النّائه:** بەرز.

**النّاهة:** ئەو شتەی نەی لەشت دەکا ٥ دەگوترێ: (نفس ناهة) نەفسێکی نەیکارە ٥ نەی دەکا لەشت.

**الهــاء:** هــێ؛ پیتـی بیـستو شەشـەمە لـەڕیزی پیتـەکانی هیجا ٥ لـەبنکی قورگ دەردێ.

**هَأهَأَ:** لەقاقای پێکەنینی داو درێژەی بەپێکەنینەکەی دا.

**هَأهَأ الراعي بالماشية:** شوانەکە بـانگی ئاژەڵـەکانی کـرد بـۆ لـەوەڕخواردن بەشێوەی ...

**هِئْ هِئْ:** بانگی کردن ٥ لێیان تورەبوو وتی (هَأْ هَأْ).

**هَاتُورُ:** مانگی سێیەم ساڵی قیبتییە.

**هــاروت:** نـاوی فریـشتەیەکە هـاوەڵی ماروتەو لەقورئان دا ناویان هاتووە.

**هَبَّتْ الريحُ هَبّاً وهبوبـاً:** بایەکە هـەڵی کرد.

**هَبَّ الفحلُ:** نێرەکەرەکـەیان کەڵەنێرەکە بـۆ کەڵـدانی مێیەکـە کەوتـە مرەمـرو زەرەزەرو مرقە مرق.

**هَــبَّ فـلان مـن نومـه:** فلاّنکـەس لەخـەو هەڵسا.

**هَـــبَّ الـــنجمُ:** ئەسـتێرەکە دەرکـەوت، هەڵهات.

**هبَّ السائِرُ:** ڕێبوارەکە کەوتە پەلە پەلو خێرا رۆیشتن.

**هَبَّ فلان الى الشَّيِّ:** فلاّنکـەس پـەلاماری شتەکەی دا بۆی راپەڕی.

**هَبَّ فلان حينا ثم قدم:** فلاّنکەس ماوەیەك دیارنـەماو دوایـی هاتـەوە ٥ دەگـوترێ: (من أين هَبَّ فلان): فلاّنکەس لـەکوێوە هات.

**هَـبَّ اللهُ يفعـل كـذا:** فلاّنکـەس دەسـتی بەکارەکە کرد.

**أهَبَّ اللهُ الريحَ:** خودا بای هەڵکرد.

**أهَبَّ السَّيف:** شمشێرەکەی هەڵسوڕاند، رایوەشاند.

**أهَبَّ فلاناً من نومه:** فلاّنکەسی لەخەو راپەڕاند.

**إهْتَبَ الفحـلُ:** نێرەکـەخۆی ئامادەکرد بـۆ سـواربونو کەڵـدانی ئاژەڵـە مێیەکە ٥ بۆ کەڵدانی ماینەکە.

**اهتبَّ الشَّيْئَ:** شتەکەی بڕیەوە.

**تَهَبَّـبَ الثـوبُ:** قوماشـەکە، کراسـەکە ڕزی‌و دادڕا.

**أهْبَـابٌ:** دەگـوترێ: (ثـوب أهْبَـابٌ): کراسێکی دادڕاوە.

**المِهْبَـــابُ مـــن الفحـــول:** ئـەو کەڵـە وانێـکەیە بـۆ کەڵدانو سـواربوونی حەیوانـە مێیەکـە حـەجمینی لـێ بڕابـێ‌و سمکـۆڵ بکـاو بپرمێنـێ بزەڕێنێ ٥ بگمێنێ ... هتد.

**المَهَبُّ**: شوێنی باڵی هەڵبون، یان شوێنی بەرەو باو باگر ٥ (ك: مَهاب).

**والهَبابُ**: تەپو تۆز.

**هَبايِبٌ**: دەگوترێ: (ثوب هبايب): كراسێكی دادڕ دادڕە ٥ تاكەكەی (هبيبة).

**الهِبَّةُ**: دەگوترێ: (إنه لَحَسَنُ الهِبَّةِ) ئەو ومزعو حاڵی باشە ٥ گوزەرانی خۆشە ٥ بەخششی چاكە ٥ بریسكەی شمشێر لەكاتی لێدان ٥ پارچە قوماش ٥ ماوەیەك لەرۆژگار ٥ ساتێك پێش هەتاو كەوتن.

**الهَبُوبُ**: رەشەبایەك تەپو تۆز هەڵسێنێ.

**هَبَتَ هَبْتاً**: نەرم بوو، شلو شەوێڵ بوو، سۆر بۆوە.

**هَبَتَ فلاناً**: فلانكەسی ملكەچو ژێربار كرد.

**هَبَتَ الشَّيْءَ**: لەشتەكەی كەم كردەوە ٥ دەگوترێ: (إنَّ ما فعله فلان قد هَبَتَهُ عندي): ئەوەی فلانكەس كردی رێزی لەلای من كەم بۆوە، لەرێزی دابەزی.

**هَبَتَ الأمرُ فلاناً**: كارەكە فلانكەسی سەرسامو حەیران كرد.

**هَبَتَ فلاناً بالسيف**: بەشمشێر لەفلانی دا.

**المهبوتُ**: ترسنۆك ٥ بێ عەقڵو هۆش ٥ باڵندەی تەمبێ دادراو بەبێ رێ نیشاندانو ئاراستەكردن بنێردرێ.

**الهَبْتُ**: ئەحمەق.

**الهَبْتَةُ**: زەبونی، زەلیلی.

**الهَبِتُ**: ترسنۆكی عەقڵ رۆیشتوو.

**هَبَجَهُ بالعصا**: بەگۆچان لێیدا بەعاصا داركاری كردو هێواش هێواش كوتای.

**هَبِجَ وَجْهُهُ هَبَجاً**: دەمو چاوی هاوسانو گرژ بوو.

**هَبِجَ الحلوب**: ئاژەڵە شیردەرەكە گوانی هاوسان.

**هَبَجَةُ**: هاوساندی.

**هَوَّبَجَ**: لەنزیك سەرچاوەی ئاوەكەوە چاڵێكی هەڵكەند بۆ ئەوەی ئاوی تێبێ بۆ خواردنەوە بەكاری بهێنێ.

**التَّهَبُّجُ**: شێوە هاوسانێكە لەجەستەدا.

**المُهَبَّجُ**: دەگوترێ: (خرج مُهَبَّجَ الوجه): بەدەمو چاو هاوساویی رۆیەدەرەوە ٥ (فلان مَهَبَّجٌ): فلانكەس نەفس گرانە.

**الهَبِيجُ من الظباء**: ئاسكێكە دووخەتی هەن لەنێوان توكی وەرگیو توكی پشتی.

**الهَوْبَجَةُ**: زەوی بەرزو تەپۆڵكە كە چەوو بەردی تێدابێ ٥ شوێنی چاڵو نەرم لەناو زەوی ٥ چاڵێكی

بچوكه هەڵدەكەندرێ لەنزیك سەرچاوەی ئاوەوە بۆئەوەی ئاوی بێتە ئاوو بۆخواردنەوە بەكاری بێنن ٥ كۆتایی‌و سەرانسەری شیوو دۆڵ.

**هَبَدَ الهَبيدَ هَبْداً:** كاڵەكە مارانەكەی ڕنی ٥ شكاندی ٥ كوڵاندی.

**هَبَدَ فلاناً:** كاڵەكە مارانەكەی دەرخواردی فلان دا.

**اِهْتَبَدَ فلان:** فلانكەس كاڵەكە مارانی ڕنی.

**الهَبيدُ:** كاڵەكە مارانە یان تۆوەكەی ٥ تاكەكەی (هبيدة).

**هَبَذَ هَبْذاً:** لەڕۆیشتن دا یان لەفڕین دا پەلەی كرد ٥ دەگوترێ: (هَبَذَ الفرسُ وَهَبَذَ الطائر): ئەسپەكە خێرا ڕۆیی بالندەكە تیژ فڕی ٥ (مرّ فلان يَهْبِذُ): فلانكەس تیژ ڕۆیی.

**هَبَرَ اللَّحْمَ هَبْراً:** گۆشتەكەی كوتكوت كرد بەكوتی گەورە گەورە ٥ دەشگوترێ: (هَبَرَ له من اللَّحْمَ هَبْرةً): پارچەیەكی گەورەی گۆشت بۆلێ كردەوە ٥ (هَبَرَه بالسيف): بەشمشێر گۆشتەكەی بڕی.

**هَبِرَ هَبَرا:** گۆشتی زۆر بوو، قەڵەو بوو ٥ دەگوترێ: (بعيرٌ هبرٌ وبرٌ): حوشترێكی قەڵەوو كوڵك زۆرە.

**أهْبَرَ:** بەڕێك‌و پێكی قەڵەو بوو.

**اِهْتَبَرَ:** گۆشتی پوكایەوە ٥ (اِهْتَبَرَ فلان غيره بالسيف): فلانكەس بەشمشێر جەستەی یەكێكی بڕی.

**هَوْبرت الناقةُ:** حوشترەكە گۆشتی زۆر بوو.

**هَـوْبَرَتْ الأذن:** گوێچكەكە توكی لێ هات لەمووودا گوم بوو.

**الهابِرُ:** بڕندە دەگوترێ: (ضَرْبُ هابر): لێدانێكی بڕندە بوو.

**الهُبَارِيـة:** ئەو پەڕو پۆڵەی لەباڵندە بڵاو دەبنەوە ٥ ئەوچڵك‌و كرێژەی بەبنكی قژەوە دەنووسێ.

**الهُبَارِيَـة:** ڕەشەبایەك تەپو تۆز هەڵبكا.

**الهَبَّـارُ:** بڕندە ٥ دەگوترێ: (سيف هَبَّارٌ): شمشێرێكی تیژو بڕندەیە ٥ مەیمونی توكن‌و موو درێژ.

**الهَبُورُ:** مێروی بچوك ٥ گەندە گیا.

**الهَبْرُ:** نزمایی لەزەوی‌و لمبەڵان ٥ (ك: هبور).

**الهَبْرَة:** پارچە گۆشت كە بێ ئێسقان بێ، ئێسقی تێدا نەبێ.

**الهِبِّرُ:** دابڕاو.

**الهِبْرِيَةُ:** ئەو تەپو تۆزو وردەو خڵتەی لە لۆكە هەڵدەوەرێ ٥ یان لەپەڕو باڵی باڵندە دەكەوێ‌و بڵاو دەبێتەوە ٥ ئەوەی لەقەفەزاژی

شەكرو بەرەداو ئەو جۆرە شتانە هەڵدەومرێو بەقــزو كوڵــكو خورپيەوە كەمێڵ دەبێ.

الهُبَيْرَة: كەمتيارى بچوك ٥ (أبو هبيرة): نێرە بۆق ٥ بۆقى نێر ٥ (أم هبيرة): بۆقى مێ.

الهَوْبَرُ: كوڵك زۆر؛ حوشترى پڕ توكو توكن ٥ يان هەر حەيوانێك توكى زۆر بێ ٥ مەيمونى توكن ٥ بەور ٥ سەوسەن ٥ شوێنێك باڵندەى قەتێى زۆر بێ.

هَبْرَجَ: تێكەڵاوى ئەمبەرو ئەوبەرى كرد لە رۆيشتن دا بەلارو لەنجەو قۆرتو پێچ رۆيى.

هَبْرَجَ الثوبَ: كراسەكەى پەراوێز چنو نەقش چن كرد.

الهَبْــرَجُ: رۆيــشتنى خێــراو هــەنگاو كورتو قۆرت قۆرتو پێچ پێچاوى ٥ لارو لەنجە كەر ٥ كەتەو قەڵەو ٥ ئاسكى پير ٥ كراسى پەراوێز چندراو.

الهِبْرِزِيُّ: ئازاو ئيش لەدەست هاتوو ٥ چاونەترسو ورە بەرز لە هەموو كارێك دا ٥ بازنگى عەجەمى ٥ زێدى خاڵص ٥ دينارى تازە لێ دراو ٥ هەرشتێك جوانو سەرنج راكێش بێ ٥ دەگوترێ: (رجل هِبْرِزِيٌّ): پياوێكى پياوانەو شۆخو شەنگە ٥ (أم الهِبْرِزِي): لەرزو تا.

تَهَبْرَسَ: خۆى بادا، لارو لەنجەى كرد ٥ دەگوترێ: (مَرَّ يَتَهَبْرَسُ): رۆيشت بەشێوەى خۆبادانو لارو لەنجە.

الهِبْرِقِيُّ: هەركەسێ ئيش بەئاگرو شتى وا بكا وەكوو ئاڵتونچىو ئاسنگەر ٥ كەڵەگا كێوى ٥ گەڵەگاى كەتەو پير.

هَبْرَمَ: زۆرى قسە كرد ٥ زۆرى خوارد.

هَبَزَ هَبْزاً وهبوزاً: لەناكاوێك مرد تێدا چوو.

الهَبَسُ: رەگەز روەكێكە لەپێرى (الصليبية) گزوگياى وەرزىو تەمەندارن دەشتەكى يان دێبەرين، لەئەوروپاو ولاتانى حەوزى دەرياى سپى ناوەڕاست دەروێن درێژييەكە سى تا پەنجا سانتيمەترە گەڵاكانى پانكۆڵەو وردن، گوڵەكانى رەنگاو رەنگە، بۆنێكى خۆشى سوكى هەيە.

هَبَشَ الضَرْعَ هَبْشاً: بەدەست گوانەكەى گرتو دۆشى.

هَبَشَ المالَ ونحوه: ماڵى كۆكردەوە ٥ دەگوترێ: (هو يَهْبَشُ لعياله): ماڵو سامان بۆ منداڵو خێزانى كۆدەكاتەوە لەهەموو لايەكو بەهەموو جۆرێك هەڵپەيەتى.

**هَبَشَ فلاناً**: تێر تێر فلانکەسی کوتا.

**هَبِشَ هَبَشاً**: کاسبی کردو ماڵو سامانی کۆکردەوە.

**هَبَّشَ الشَيْئَ**: بەمانا (هَبَشَهُ) دێ ٥ دەگوترێ: (هو يَهْبَشُ لعياله): بەهەر دوو دەست ماڵو سامان کۆدەکاتەوە بۆ خێزانو منداڵی ٥ (فلان يُهَبِّشُ كلاماً): فلانکەس قسە تێکەڵو پێکەڵ دەکا.

**إهْتَبَشَ**: کۆبۆوە.

**اهْتَبَشَ الشَيْئَ**: شتەکەی کۆکردەوە بەنارەحەتی ٥ دەگوترێ: (هو يَهْتَبِشُ لعياله).

**تَهَبَّشَ**: کۆبۆوە، گەلەکۆمەکێیان کرد ٥ دەگوترێ: (تَهَبَّشَ القومُ على فلان): خەڵکەکە گەلەکۆمەکییان کردە سەر فلان.

**تَهَبَّشَ الشَيْئَ**: جۆرەها هەوڵو تەقەلای بەکارهێنا بۆ وەدەستهێنانی شتەکە.

**الهَابِشُ**: بێگانەو دورەی خێڵو هۆز، کەسێك لاوەکی بێو چوبێتە ناو خێڵێکەوە ٥ دەگوترێ: (هل هبش اليكم هابش؟): پیاوی لاوەکیو بێگانە خۆی خزاندۆتە ناوتانەوە؟.

**الهَابِشَةَ**: کۆمەڵو تاقمو پێری تازە ٥ دەگوترێ: (جاءت هابِشَةَ من ناس).

**الهُبَاشَةُ**: تاقمێك مرۆڤ لەیەك تایەفەو هۆزنەبن.

**هَبَصَ هَبْصاً**: چوستو چالاك بوو ٥ (فهو هابص وهي هابصة).

**هَبِصَ هَبَصاً**: بەپەلە رۆیی.

**هَبِصَ الكلبُ**: سەگەکە زۆر سور بوو لەسەر نێچیرەکەو هەوڵی خواردنی دا ٥ دەگوترێ: (هَبِصَ فلان على الشَيْئ يأكله): فلانکەس پەری دایە شتەکەو دەستی کرد بەخواردنیو سەیری ئەم لاو ئەو لای کرد.

**هَبِصَ بالضحك**: زێدە رۆیی کرد لە پێکەنین دا ٥ (فهو هَبِصٌ وهي هَبِصَةٌ).

**اِهْتَبَصَ**: پەلەی کرد ٥ بەقاقا پێکەنیو زۆر پێکەنی.

**إنْهَبَصَ للضحك**: زێدە رۆیی کرد لە پێکەنین دا.

**الهَبَصى**: رۆیشتنی بەپەلە ٥ دەگوترێ: (هو يعدو الهبصى).

**هَبَطَ هبوطاً**: هاتە خوار ٥ نزم بۆوە ٥ دەشگوترێ: (هَبَطَ في الشرّ): کەوتە ناو گێژاوی شەڕو هەراوە.

**هَبَطَ الشَيْئُ**: شتەکە دابەزی نرخی کەم بۆوە ٥ لەئاستی پێشوی دا کەوت ٥ دەگوترێ: (هَبَطَ مالُهُ وهَبَطَ ثمن السلعة وهَبَطَ درجة الحرارة).

**هَبَطَ فلان**: فلانکەس زەلیلو کەم ڕێز

بـوو، فـلان لـەحاڵی دەوڵەمەندییـەوە هاتە سەر حاڵی هـەژاری ٥ ڕێـزی کـەم بۆوە، کەسایەتی دابەزی.

**هَبَطَ الـشَيْءَ:** شتـەکەی دابەزانـد ٥ کـەمی کـردەوە ٥ دەگـوترێ: (هَبَطَـتُ الـثمنَ): نرخەکـەم دابەزانـد ٥ (هَـبَطَ الـدواء درجـة الحـرارة): دەرمانەکـە پلـەی گەرمی نەخۆشەکەی دابەزاند ٥ (هَـبَطَ المـرضُ لحمـه): نەخۆشـیەکە کـێش‌و قەڵـەوی فلانـی دابەزانـد ٥ قورئـان دەفەرموێ: {اهْبِطُواْ مِصْراً}: دابەزنـە ناوشار ٥ بڕۆنە ناوشار.

**هَبَطَ السوقَ:** چووە ناو بازاڕ، دابەزییە ناو بازاڕ.

**هَبَطَ فلاناً المكانَ:** فلانکەسی خستە نـاو ئەو شوێنە.

**هَبَّطَهُ:** بەمانا (هَبَطَهُ)دێ.

**هَـبَّطَ العـدْلَ علـى الـبعير:** لابارەکـەی بەسـەر پـشتی حوشـترەکەدا لابـە لابەلا راکێشا.

**إنْهَـبَطَ الـشَيْءُ:** شـتەکە کـەمی کـرد ٥ دابەزی ٥ نـزم بۆوە.

**تَهَبَّطَ:** وردە وردە دابەزی.

**المِهْبَطَـةُ:** ئامێرێـکە وەکـوو چـەترو مەزەللی لەحەواوە لەتـەیارەوە پێـی دادەزییە سەر زەوی ٥ (ك: مَهَابِط).

**الهَبْطَةُ:** چاڵایی.

**الهَبِيطُ:** کزو لاواز.

**المَهْبِطُ:** شوێنی دابـەزین، جێـگای نـزم بوونـەوە ٥ دەگوترێ: (مَهْبِط الـوحي ومَهْبِط الطائرة ومَهْبِط النهر).

**هَبَـعَ الحِمـارُ هَبْعـاً وهبوعـاً:** گوێدرێژەکـە ڕۆیشت بەڕۆیـشتنێکی خـوارو خـێچ‌و تەمبەلانە.

**هَبَعَ الـبعيرُ ونحوه في مـشيته:** حوشـترەکە لەڕۆیشتن دا ملی درێـژ کـرد بۆنـەوەی یارمەتیــدەری بــێ بــۆ ڕۆیــشتن‌و خۆشـڕەوی ٥ (فهـو هـابع) ٥ (ك: هُبَّـعٌ وهوابع).

**أهْبَـعَ الحيـوانُ:** حەیوانەکـە هـاوین بێچوی بوو.

**إسْـتَهْبَعَهُ:** وای لــێ کـرد بەنارێــك‌و پێـکی بڕوا.

**الهُبَـعُ:** بێـچوە ئاژەڵێـك کـە لـەوەرزی هاوین دا لەدایك بێ.

**الهُبُــوعُ:** ئــەوەی ملــی خــۆی دەکــا بەیارمەتیــــدەر بــــۆ ڕۆیــــشتن ٥ دەگوترێ: (بعير هبوع وناقة هبوع).

**هَبَغَ هَبْغاً وهبوغاً:** بەڕۆژ راکشا نوست.

**الهِبْيَـغُ:** نوسـتوو خـەوخۆش، کەسێـك بەڕۆژ بخەوێ.

**الهَبَيَّغُ:** شتی گـەورە ٥ دەگـوترێ: (نهـر هَبَيَّـغٌ وواد هَبَيَّـغٌ) ٥ ئـافرەتی بـێ ڕەوشـت کەدەسـت بـەڕوی کەسـەوە نەنێ.

**الهَبَيَّغَةُ من النساء:** ئافرەتی داوێن پیس کەلەشفرۆشی بکاو دەست بەرووی کەسەوە نەنێ.

**إنْهَبَكَتْ به الأرض:** زەوی قوتی دا.

**الهُبَكَةُ:** زەوییەك قاچی تێدا رۆچن ٥ نەحمەق‌و گێل.

**هَبِلَ فلان هَبَلاً:** عەقڵی لەدەست داو جیاوازی نێوان چاکەو خراپە ناکا ٥ لەحەدیثی (أم حارثة)دا هاتووە: (ويحكِ أهَبِلْتِ).

**هَبِلَت الأمُ ولَدَها هَبْلاً:** دایکە کە بۆ منداڵەکەی گریا ٥ (فهي هابِلٌ وهَبَلَةٌ).

**اهْبَلَت المرأةُ:** ئافرەتەکە بەردەوام بوو لەشین‌و شەپۆڕ دا.

**اهَبْلَ اللهُ فلانَةَ:** خودا ئافرەتی جەرگ سوتاو کردو منداڵەکەی لێ سەندەوە.

**هَبَّلَ فلان لعياله:** فلانکەس بۆ ماڵ‌و منداڵی کاسبی کرد.

**هَبَّلَ فلاناً:** بەفلانکەسی گوت دایکی شینی بۆ بگێڕێ.

**هَبَّلَ اللحمُ فلاناً:** فلانکەس گۆشتی زۆر بوو گۆشت لەجەستەی دا کەوتە سەریەك قەڵەو بوو.

**اِهْتَبَلَ:** خەفەتبار بوو ٥ خەمی بۆ منداڵەکەی خواردو گریا.

**اِهْتَبَلَ في سيره:** لەرۆیشتن دا پەلەی کرد ٥ درۆی کرد ٥ فێڵی کرد.

**اهْتَبَلَ الصيدَ:** فێڵی لەنێچیرەکە کردو داوی بۆنایەوە.

**اهْتَبَلَ الفرصةَ:** هەلی قۆزتەوە، هەلەکەی لەکیس خۆی دا، دەگوترێ: (سَمِعَ كلمةً فاهتبلها): وشەیەکی بیست‌و قۆزتییەوە.

**تَهَبَّلَ لأهله:** کاسبی بۆ ماڵ‌و خێزانی خۆی کرد.

**الأهْبَلُ:** کەسێك هێزی جیاکردنەوەی چاك‌و خراپی نەمابێ.

**المُهَبَّلُ:** کەسێك پێ گوترابێ، دایکت شینت بۆ بگێڕێ ٥ مرۆڤی گۆشتنی دەم‌و چاو هاوساو.

**المَهْبِلُ:** کونی بەرەو خوار بۆناو زەوی ٥ هەوای هەڵبوو لەسەرانسەری کێوەوە بۆناو شیوو دۆڵ ٥ بۆری هینی مێینە لەوانێکەوە بۆ منداڵدان.

**الهَبَالَةُ:** داواکاریی.

**الهُبَالَةُ:** دەستکەوت‌و تالانی.

**الهَبَّالُ:** راوچییەك فێڵ لەنێچیر بکاو تەڵەو داوی بۆ بنێتەوە ٥ دەگوترێ: (ذِئب هَبَّالٌ): گورگێکی فێلاوییە ٥ کاسبکاری فەندو فێڵ زان‌و پیلان دارێژ.

**هُبَلُ:** بتێك بووه له كهعبهدا.

**الهِبَلُ:** ئادەمیزادی کەتەو زەبەلاح ٥ ئاژەڵی کەتەو زل.

**الهَبِلَّى:** ڕۆیشتنی بەفیزو لارو لەنجە.

**الهَبُولُ:** ئەو ئافرەتەی منداڵی بۆ نەمێنن، منداڵی بۆ ڕانەگیرێ.

**الهِبْلاع:** قورگ گەورەو پارو زلو زۆر خۆر.

**الهِبْلَعُ:** ڕەوشت بەدو خراپ ڕەفتارو دڵ پیس ٥ دەگوترێ: (عبد هِبْلَعٌ): بەندەیەك نازاندرێ باوكو دایكی كێن یان یەكێكیان نادیارە ٥ سەگی سلوقی.

**الهَبَنْكُ:** ئەحمەقو گێلو بێ دەسەڵات ٥ فیتنە گێڕو سەرسەری.

**الهَبَكَّةُ:** تەمبەڵ ٥ ئافرەتی ئەحمەقو گێلو بێ دەسەڵات.

**هَبْهَبَ:** خێرا ڕۆیی ٥ لەخەو هەڵسا.

**هَبْهَبَ السَّرابُ:** تراویلکەکە درەوشایەوە.

**هَبْهَبَ التيسُ:** نێرییە قەرەکە بۆ بەتەگەدانی بزنەکان کەوتە جومبوشو مرقاندن.

**الْهَبْهَبُ:** گورجو گۆڵو چوستو چالاك ٥ دەگوترێ: (جَمَلٌ هَبْهَبٌ وذئب هَبْهَبٌ).

**الهَبْهَبِيُّ:** چوستو چالاك ٥ دەنگ خۆشو لێزان بۆ حودیە خوێندن ٥ لێزانو دەست ڕەنگین لەپیشەیەك لەپیشەکان دا ٥ وەکوو وێنەگری ٥ قەصابی، ئاشپەزی ٥ شوانی مەڕو بزن ٥ نێریەقەرە، بەران.

**هَبَا الغبارُ هَبْواً وهُبُوّاً:** تەپو تۆز هەڵسا بەرز بۆوە.

**هبا فلان:** فلانکەس مرد ٥ هەڵات ٥ بەهێواشی ڕۆیشت ٥ (فهو هاب وهي هابية).

**أهْبَى التُرابَ أو الغبار:** تەپو تۆزی بەرپا کرد.

**هَبَّى الثريدَ:** تێکوشاوەکەی ڕێکخست، دروستی کرد.

**تَهَبَّى فلان:** فلانکەس چاوی کز بوون ٥ بەخۆبادانو لارو لەنجە ڕۆیی ٥ دەشگوترێ: (جاء يتهبَّى): بەدەستی بەتاڵ هات.

**الهابي من التراب:** خۆڵە پەتە گڵە وردە ٥ دەشگوترێ: ((موضع هابي التراب): شوێنێکە تابڵێی گڵەکەی وردە ٥ گڵو خۆڵی سەر گۆڕ ٥ ئەستێرە کە تەپو تۆز نەهێڵێ ببیندرێ.

**الهَبَاءُ:** تەپو تۆزێك كە باهەڵیدەسێنێو بەشتەوە دەنوسێ ٥ یان بەحەواوە بەهۆی تیشکی

خۆرەوە نەبێ نەبینرێ ٥ قورئان دەفەرموێ: (وبست الجبال بساً فكانت هباءً مُنبساً) ٥ ئادەمیزادی بێ عەقڵ یان کەم عەقڵ ٥ تەپو تۆزێك لەکاتی گێژەڵوکە دا بەرز دەبێتەوە.

**الهَبَاءَة**: گەردیلەیەك لەتەپو تۆز.

**الهباية من الشجر**: توێکڵی درەخت.

**الهُبُو**: ئاگری خامۆش بوو.

**الهَبْوَة**: تەپو تۆز.

**الهَبَيُّ**: منداڵی بچوك ٥ بۆ مێینە (هَبِيَّة).

**هَتَأَهُ هَتْئاً**: لێیدا ٥ (هَتَأَهُ بالعصى): بەگۆچان لێی دا.

**هَتِئَ هَتْئاً**: لەبەر پیری یان نەخۆشی پشتی چەمایەوە ٥ (فهو أهْتَأ وهي هَتْآءُ) ٥ (ك: هُتِئَ).

**تَهَتَّأَ الثوبُ**: کراسەکە دڕاو رزی.

**الهَتَأُ**: تاوێك، ماوەیەك، دەمێك، ساتێك ٥ دەگوترێ: (جاءَ بعد هَتَأةٍ من الليل ومضى من الليل هَتَأة).

**هَتَّ الماءُ ونحوه وهَتِيتاً**: ئاوەکە لەکاتی هەڵڕژانو رۆکردنی دا خوڕەی هات.

**هَتَّ في كلامِهِ**: لەقسەکردنی دا پەلەی کرد.

**هَتَّ الهمزةَ**: بەرێكو پێکی هەمزەی دەربڕی.

**هَتَّ الشَيْءَ**: شتەکەی شکاندو وردو هاڕی کرد.

**هَتَّ الثوبَ ونحوه**: قوماشەکەی دڕیو ونجڕ ونجڕی کرد.

**هَتَّ عِرضَهُ**: ناموسی شکاند.

**هَتَّ فلاناً**: لەروتبەو رێزو شانی کەمکردەوە.

**هَتَّ الشَيْءَ**: شوێن شتەکە کەوتو بەشوێنی دا گەڕاو خەریکیەتی ٥ دەگوترێ: (العامِلُ يَهُتُّ عمله ليل نهار): کرێکارەکە خەریکی ئیشی خۆیەتی شەوو رۆژ دەستی تێ یدایە ٥ (باتت السحابة تهت المطر): هەورەکە دەستی کرد بەباراندنی باران.

**هَتَّ الماءَ ونحوه**: ئاوەکەی بەهێواشی رشتو درێژەی بەرژاندنەکەی دا ٥ (فهو هاتٍ وهَتّاتٌ).

**المِهَتُّ**: چەقە چەناوی زۆر بلێ ٥ هێواش لەکارکردن دا.

**الهَتُّ**: دەگوترێ: (تركهم هَتّاً بتّاً): بەتێکشکاویو تارومار کراوی جێی هێشتن ٥ دەنگو خشپەو خرمە ٥ دەگوترێ: (سمعت هَتَّ قدميه): گوێم لەخشپەی قاچەکانی بوو.

**الهَتَّاتُ**: چەقەچەناوو زۆر بلێ.

**هَتَرَ هَتْراً**: ئەحمەقو گێلو نەفام بوو.

**هَتَرَ فلاناً الكِبَرُ**: خۆ بەزلزانیو

لوتبەرزیی عەقڵی نەهێشتووە.

هَتَرَ عِرْضَهُ: ناموسی شکاند.

أهْتَرَ فلان: فلانکەس بێ عەقڵ بوو.

اهْتَـرَ فلانـاً الكِبَـرُ: خۆبـەزلزانی فلانکەسی ئەحمەق و نەزان کرد.

أُهتِـرَ فـلان بکـذا: فلانکـەس شـەیدای فلان شت بووە باکی نییـە چی پێ دەگوترێ لەوبارەوە.

هاتَرَهُ: بەناڕەوا جوێنی پێدا.

هَتَّـرَ العِـرْضَ: زۆر ناموسـی شـکاندو شرت و شۆی لێ بڕی.

تهـاترا: هەریـەك لـەو دوانـە قسەو بوختانی بۆ ئـەوی تـر هەڵبەست ٥ دەشکوترێ: (تهاترا الشاهدان): ئـەو دوو شـایەتە یـەکتریان بـە درۆخستەوەو شایەتییەکەیان بەتاڵ دەرچوو.

تَهَتَّرَ: ئەحمەق و نەزان بوو.

أسْتُهْتِرَ فلان: فلانکەس بەهۆی پیری و شتی واوە عـەقڵ و هۆشی لەدەست دا ٥ کاروباری هەمووی پوچ بوو.

أسْـتُهتِرَ بالـشَّيْءِ: خـوی بەوشـتەوە گرتـوو تێیـدا نـوغرۆ بـووە وازی بۆلـێ ناهێنـدرێ و گـوێ ناداتـە ڕەخنـەو لۆمـەی خـەڵکی هـیچ دەسـتی پـێ لـێ هـەڵناگرێ ٥ دەگوترێ: (أستُهتِرَ بشراب، واستُهتِرَ بفلانة).

التَّهـاتُرُ: شـایەتەکان کەهەریەکـەیان ئەوی تر بەدرۆوە خاتەوە.

التَّهْتَارُ: ئەحمەقی و نەزانی.

المُهَـاتَرَة: قـسەو ئاخـاوتن کەهەندێـکی هەندێکی هەڵوەشێنێتەوە.

المُهْتَرُ: ئەوکەسە هەڵە بکا لەقسەکردن دا.

الهُتْرُ: نەمانی عەقڵ بەهۆی پیری یـان نەخۆشـی یـان بـاغری و خۆبەزلزانییەوە.

الهِتْرُ: بەتاڵ و پـوچ ٥ قسەی بـێ مانـاو بـێ بناغـە ٥ درۆو دەلەسـە ٥ کـاری سەر سوڕهێنەر ٥ بـەلاو کارەسـات ٥ چورتم و ناخۆشی ٥ نیوەی یەکـەمی شەو ٥ یان کەمتر لەنیوەی شەو.

هَتَشَ الكَلْبُ أو السبُعَ هَتْـشاً: سـەگەکەی هـەڵناو دەنگـی دا بۆئـەوەی پـەلاماری نێچیرەکە بدا.

هَتَفَ هَتْفاً وهتافاً: کەوتـە هەلهەلەکێـشان قـیڕەو هـەرا، کەوتـە گـۆرانی گـوتن و دەنـگ هەڵـدان ٥ دەگـوترێ: (هتفـت الحمامـة): کۆترەکـە خوێنـدی و دەنگـی لـێ هەڵبڕی ٥ دەشکوترێ: (جَعَلَ يهتـف بربه): دەنگی هەڵبڕی و کەوتە پاڕانـەوە لەخودا.

هَتَفَ فلاناً: مەتحی فلانی کردو وەسپی دا

٥ باسی ڕەوشتی جوانو مەردانەی فلآنی کرد.
**هَتَّفَ**: بۆ زێدەمانای (هَتَفَ) دێ.
**الهَاتِفُ**: دەنگێك ببیسریٚو خاوەن دەنگەکە نەبیندریٚ ٥ تەلەفۆنو مۆبایل ٥ هەر ئامێرێك قسەی پیٚ بکریٚ.
**الهُتَافُ**: دەنگی بەرز کەمەبەستی پشتگیریی کردنی شتێك، یان نارەزایی دەربڕین دەربارەی، یان بۆ پێداهەڵدانو تەمجید کردنی شتێك ئەنجام بدریٚ.
**الهَتَّاف**: ئەوەی زۆر هوتاف بکێشیٚ یان زۆر دەنگ هەڵبڕیٚو شیعار هەڵداو کەسانی دیکە بۆی دوبارە بکەنەوە ٥ پێشەنگی خۆ پیشاندەرانو هوتاف کێشیان ٥ دەشگوتریٚ: ((قوس هَتَّافَةٌ): کەوانێکی خاوەن رەنینو دەنگو صەدایە.
**الهَتْفَى من القِسِيِّ**: تێری وێژە وێژ لیٚ هاتو.
**الهَتُوفُ**: بەمانا (الهَتَّاف) دیٚ ٥ دەگوتریٚ: (رجل هتوف وحمامة هتوف): هەروا دەگوتریٚ (ریح هتوف).
**هتك السِتْرَ هَتْكاً**: پەردەکەی ڕاتەکاندو لای بردو لەشوێنی خۆی لایدا ٥ یان هەندێکی دڕاو دوای پەردەکە دەرکەوت.
**هَتَّكَ الثوبَ**: قوماشەکەی لەباری درێژیی دادڕی ٥ (فهو هاتك وهَتَّاك).
**هَتِكَ**: دەگوتریٚ: (هُتِكَ عَرْشُهُ): کورسیو پلەو پایەی نەما ٥ شانسو بەختی سەرەو خوار بوو.
**هَاتَكَ الليلَ**: بەناو تاریکی شەودا رۆیی.
**هَتَّكَ الأستارَ**: پەردەکانی داتەکاندنو لای دان لەشوێنی خۆیان نەیهێشتن ٥ بۆ زێدە رۆیی لەمانای (هَتَكَ)دیٚ.
**تَهَتَّكَ فلان**: فلآن کەس باکی نەبوو ئاخۆ حەیای دەچیٚو سەرزەنشت دەکریٚ ٥ پرکێشیٚ هەڵەو تاوانی کرد ٥ فلآن حەیای چوو کەسایەتی دابەزی ٥ دەگوتریٚ: (تَهَتَّكَ في البطالة): لەگومراییو خراپەکاری دا رۆچوو نوغرۆ بوو.
**الهُتْكُ**: دڕاو ونجڕ ونجڕ بوو ٥ دەگوتریٚ: (ثوب هَتَكٌ).
**الهُتْكَةُ**: حەیا چونو دەرکەوتنی کاری خراپی پەنامەکی.
**هَتَمَ فاه**: ددانی پێشەوەی دەرهێنان.
**هَتِمَ الشَيْئُ هَتماً**: شتەکە شکا ٥ دەگوتریٚ: (هَتِمَهُ فَهَتَم).
**هَتِمَ الإنسانُ وغيره**: ددانی پێشەوەی

مرۆڤەکـە شـکان ٥ (فهـو أهـتم وهـي هتماء) ٥ (ك: هُتْم).

أهْـتَمَ الـشَيْئَ: شـتەکەی شـکاند ٥ دەگـوترێ: (أهْـتَمَ ثَنِيَّتَـهُ): ددانـی شکاند.

أهْـتَمَ الإنـسانَ: ددانـی مرۆڤەکـەی شکاند.

هَتَّمَـهُ: بـۆ زێـدەڕۆیی لـەمانای (هَتَمَـهُ) دێ.

تهاتمـا: قـسەی ناشـیرینیان بەیـەکتر گوت.

تَهَتَّمَ: دەگوترێ: (تَهَتَّمَتْ أسنانُهُ): ددانی شکان.

الهُتَامَةُ: ئەوەی لەشت دەشکێ.

الهَيْـتَمُ: ڕووەکێـکی دەشـتەکی پـڕژو پالاوییە.

هَتْمَرَ: زۆری قسەکرد.

هَتْمَـلَ فـلان: فلانکـەس بەهێواشـی قسەی کرد ٥ فیتنەیی کرد.

هَتْمَلَ الرجلان: دوو پیاوەکە بەیەکـەوە سـرتەیان کـردو نەیانویـست کەسـی تر گوێی لەدەنگیان بێ.

الهَتْمَلَةُ: قسەی سرتە ٥ (ك: هتامِل).

هَتَنَـت الـسماءُ هتنـاً وهتونـاً: ئاسمـان بارانی بەخوڕەمی باراندو بەردەوام بوو لە بـارین دا ٥ دەگـوترێ: (هَـتَنَ الدَمْعُ): فرمێـسکەکە ڕژایـە خـوار ٥ (فهـو هـاتن) ٥ (ك: هُـتَّن) ٥ (وهـي هاتنة) ٥ (ك: هواتِن).

التَهْتَـانُ: بارانێـکە تـاو تـاوە، دەمێـك دەبارێو دەمێك خۆش دەکاتەوە.

الهَتُـونُ: بـارانی پـڕ دڵۆپ ٥ بارانێـك بـەخوڕەمو ڕێژنـە بـێ ٥ دەگـوترێ: (سحاب هتون وعين هتون الدمع).

هَتْهَتَ فلان في الكلام: فلانکەس پەلەی کرد لەقسەکردن دا زمانی تەتەڵەی کرد.

هَتْهَتَ الشَيْئَ: بەزەخت پێی لەشتەکە ناو شکاندی.

الهَتْهَـاتُ: کەسێـکە خێـرا خێـرا قسەبکاو زمانی تەتەڵە بکا.

هَتا الشَيْئَ هَتواً: شتەکەی شکاند ٥ یان بە توندی قاچی بە شتەکەدا ناو شکاندی.

هـاتی فـلان: فلانکـەس وەری گـرت ٥ گرتی.

هاتى فلان الشَيْئَ: فلانکەس شتەکەی نزیك کردەوە.

هـاتى فلانـاً الـشَيْئَ: شـتەکەی دایـە فلانکـەس ٥ دەگـوترێ: (الهِتْـيُ مـن الليل): بەشێك لەشەو ٥ (ك: أهتاء) ٥ دەگوترێ: (مضى هِتْيٌ من الليـل) ٥ بەشێك لەشەو ڕۆیی.

الهِتِيُّ من الليل: بەمانا (الهِتْيُ) دێ.

هَـتَّ فـلان هَتّـاً: فلانکـەس درۆی کـرد.

**هَثَّ الأشيَاءَ:** شتەكانی تێكەڵ بەیەك كردن ٥ (فهو هاثّ وهثاث).

**هَثَمَ لفلان من الشَيْئِ هَثْماً:** لەوشتە بەشێكی زۆری دا بەفلاَنكەس.

**هَثَمَ الشَيْئَ:** شتەكەی وردكردو چاك كوتایی بەكوتان.

**الهَيْثَمُ:** كۆمەڵە لمو كۆمەڵە گلی نرم ٥ بازو هەڵۆ ٥ بێچوی دالاش ٥ هەروا بەمانا (الهَيْثَم)دێ.

**هَثْهَثَ في السير:** لەرۆیشتن دا پەلەی كرد.

**هَثْهَثَ السحاب بمطره وثلجه:** هەورەكە خێر خێرا باران‌و بەفری باراند.

**هَثْهَثَ الأشياءَ:** شتەكانی تێكەڵاو بەیەك كردن.

**هَثْهَثَ الشَيْئَ:** پێی لەشتەكە ناو شكاندی.

**هَثْهَثَ فلاناً:** ستەمی لەفلاَن كرد ٥ (فهو هَثهاث).

**الهَثْهَاثُ:** خێرا، دەگوترێ: (سير هثهاث): رۆیشتنی خێرا ٥ وڵاتێك تەپو تۆزی زۆر بێ ٥ درۆزن.

**الهَثْهَثَةُ:** هەراو هۆریاو قاوو قیژو تێكەڵاو بوونی دەنگەكان لەكاتی شەڕو هەرادا.

**هَثَى هَثْياً:** دەمو چاوی سور هەڵگەڕا.

**هَثَى الترابُ:** گڵ‌و خۆڵی پرژاند ٥ دەگوترێ: (هثى له من ماله): لەماڵ‌و سامانی خۆی بەشی دا.

**هاثاه:** گاڵتەی لەگەڵ كرد.

**هَجَأ الشَيْئُ هَجأً وهُجوءاً:** شتەكە دابڕا.

**هَجَأ جوعُهُ:** برسیایەتی نەما، برسیایەتییەكەی ئارام بۆوە.

**هَجَأ الطعامَ هَجْئاً:** هەموو خواردنەكەی خوارد.

**هَجِئَ هَجَأً:** برسیایەتیەكەی پەرەی ساندو تینی بۆ هێنا.

**أهْجَأ الشَيْئَ:** شتەكەی بڕیەوەو لای برد ٥ دەگوترێ: (أهْجَأ الطعامُ جوعَه): خواردنەكە برسیایەتییەكەی نەهێشت.

**أهْجَأ الإبلَ:** حوشترەكەی بەستەوە بۆنەوەی بلەوەڕێ.

**أهْجَأ فلاناً الشَيْئَ:** شتەكەی دەرخواردی فلاَنكەس دا.

**أهْجَأ فلاناً حَقّهُ:** مافی فلاَنكەسی دایەوە.

**الهَجأ:** هەرشتێك ئادەمیزاد تێیدابێ‌و وازی لێ بیبنێ.

**الهَجأةُ:** نەحمەق‌و گێل.

**هَجّتْ عينه هَجّاً:** چاوی بەقوڵدا چوو.

**هَجّت النار هَجّاً وهجيجاً:** ئاگرەكە بڵێسەی سەندو داگیرسا ٥ هەڵگیرسانەكەی دەنگی لێ هات

لرفه لرفى هات.

**هَجَّ البيتَ:** خانوەكەى روخاند.

**هَجَّجَ:** لەبرسا يان لەتينوا يان لەبەر ماندويى چاوى بە قوڵدا چوو ٥ دەشگوترێ: (هَجّجَتِ العينُ): چاوى قوڵ بوو.

**هَجَّجَ النارَ:** ئاگرەكەى خۆش كرد بڵێسەى دايە.

**إهْتَجَّ:** سور بوو لەسەر راى خۆىو ئامۆژگارى كەسى وەرنەگرت.

**اسْتَهَجَّ:** بەراى خۆى كردو راى كەسى قبوڵ نەبوو، گومڕاو سەر لێ شێواو بوو ٥ خۆى خستە ناو باسەكەوە بەحەقو ناحەق خۆى تێ هەڵقورتاند.

**اسْتَهَجَّ السائرةُ:** پەلە پەلى لەكاروانەكە كردو دەنەى دان.

**هَجَاجٌ:** سوارى راى خۆى بوو ٥ هەر بەقسەى خۆى كرد ٥ دەگوترێ: (ركب فلان هَجَاجُ) ٥ دەشگوترێ: (هَجَاجَيْكَ): وازبێنە، بەسە.

**الهَجَاجَةُ:** ئەو رەشەبايەى هەموو شتێك بەگڵ دادەپۆشێ ٥ گێلو نەحمەق.

**الهَجُّ:** نيرى سەرملى گاى جوت.

**الهَجِيجُ:** شيوى قوڵ ٥ زەلكاو ٥ زەوى لاكێشەيى ٥ ئەو هێڵو خەتانەى كاهين لەسەر گڵ دەيكێشێ بۆ جادو بازى ٥ (ك: هُجُجٌ وهُجّانٌ).

**هَجَدَ هجوداً:** نوست ٥ شەو نوێژى كرد.

**أهْجَدَ البعيرُ:** حوشترەكە قورسايى خۆى خستە سەر زەوى.

**أهْجَدَ فلاناً:** فلانكەسى خەو لێ خست ٥ بەنوستويى بينى.

**هَجَّدَ فلاناً:** فلانكەسى نواند.

**تَهَجَّدَ:** بەمانا (هَجَدَ) دێ ٥ هەستا بۆ نوێژ يان بۆ ئيشى تر ٥ قورئان دەفەرموێ: (ومن الليل فتهجد به نافلة لك) ٥ يەكتا پەرستى ئەنجام دا.

**التَّهَجُّدُ:** شەو نوێژ.

**هَجَرَ هَجْراً:** دوور كەوتەوە ٥ دەگوترێ: (هَجَرَ الفحلُ): نيرەكە وازى لەسواربونو كەڵدان هێنا.

**هَجَرَ المريضُ:** نەخۆشە بزركاندى ٥ دەشگوترێ: (هَجَرَ في مرضه وفي نومه).

**هَجَرَ في الشَيْئِ:** زۆرى پێ خۆش بوو ناوى بێنێو باسى بكا.

**هَجَرَ الشَيْئَ:** وازى لەشتەكە هێنا ٥ روى لێ وەرگێرا.

**هَجَرَ الدابَّةَ:** وڵاخەكەى بەپەتى كەمەندكێش بەستەوە سەرێكى لەدەستىو سەرێكى لەپاشوى خستو

ئەمجار حەبلەکەی لەوکەمەندە گرێ دا.

**أهْجَرَ:** بەگەرمای نیوەڕۆ سەفەری کرد ◦ کەوتـەکاتی نیـوەڕۆ ◦ قـسەی ناشـیرینی وتـن ◦ کەوتـە چـەقە چـەق‌و قـسەی ناشایـستە ◦ دەشگوترێ: (أهْجِرَ في منطقه): قسە ناشیرینی بەدەم دا هات.

**أهْجَرَ الشَيْئُ:** شتەکە تەواو بوو گەیشتە ئەندازەی خۆی.

**أهْجَرَتِ الفتاةُ:** کچەکە پێگەیی‌و گەیشتە تەمەنی گەنجی بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك.

**أهْجَرَ الحامِلُ:** ئافرەتە دوگیانەکە سکی گەورە بوو.

**أهْجَرَ بفلان:** گاڵتەی بەفلان کرد.

**هَاجَرَ:** زێدی خۆی جێ هێشت.

**هاجَرَ من مكان كذا أو عنه:** ئەو شوێنەی تەرك کردو چو بۆ شوێنێکی تر.

**هاجَرَ القومَ:** وازی لەو گەل‌و هۆزە هێناو جێی هێشتن چوو بۆلای خێڵێکی تر.

**هَجَّرَ:** لەکاتی نیوەڕۆدا کەوتە ڕۆیشتن.

**هَجَّرَ النهار:** ڕۆژ بوو بەنیوەڕۆ گەرماکەی پەرەی سەند.

**هَجَّرَ اليه:** زوو چو بۆلای‌و خۆی گەیاندێ.

**هَجَّرَ الدابةَ:** وڵاخەکەی بەکەمەند بەستەوە، بەم جۆرە حەبلێکی هێنا سەرێکی لەدەستی بەست‌و سەرێکی لەقاچی دواوەی ئەمجار حەبلێکی لەو حەبلە بەست‌و بەسنگێکەوە گرێی دا.

**تهاجَرَ القومُ:** خەڵکەکە دەنگیان لێك دابڕی‌و لێك ترازان‌و یەکتریان جێ هێشت.

**تهاجَرَ القومُ الماءَ:** خەڵکەکە بەنۆرە چونە سەر ئاوەکە.

**تَهَجَّرَ:** لەکاتی نیوەڕۆدا سەفەری کرد ◦ خۆی بەکۆچەرو موهاجیر لەقەڵەم دا ◦ لاسایی موهاجیری کردەوە.

**الأهْجَرُ:** دەگوترێ: (هذا أهْجَرُ من ذاك): ئەمە لەوە درێژترە ◦ گەورەترە، بەنرخ ترە، ڕێزدار ترە.

**الأهْجُورَةُ:** داب‌و نەریت.

**المهاجِرُ:** ئەوکەسەی لەمەککەوە لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) چوو بۆ مەدینە.

**المهاجَرُ:** شوێنی هیجرەت کردن.

**المهاجَرَةُ:** کۆچکردن.

**المَهْجَرُ:** ئەو شوێنەی لێوەی هیجرەت دەکەی یان کۆچی بۆدەکەی.

**المُهْجِرُ:** باش‌و تەواو بێ عەیب‌و بەنرخ لەهەموو شتێك ◦ دەگوترێ: (بعير مهجر، نخلة مهجرة).

**المُهْجِـرَةُ:** دەگـوترێ: (فتـاة مُهْجـرة): کچێکە لەناو هاوەڵەکانی دا نموونەی جوانیو عاقڵیو ڕەوشت بەرزییە ٥ (ناقة مُهْجِـرَة): حوشترێـکی قەڵەوو خۆشڕۆو ڕەسەنە.

**المَهْجُـورُ:** دەگـوترێ: (کـلام مهجـور): قسەو ڕستەیەکە لەبیرکراوەو ئێستا بەکارناهێندرێ.

**الهـاجِرُ:** دەگـوترێ: (شـيئ هـاجر): شتێـکی باشو جوانو بێ عەیبە ٥ زێدە باشی بەسەر شتی تردا هەیە.

**الهَـاجِرَةُ:** نیوەڕۆ ٥ جەنگەی گـەرما ٥ دەگوترێ: (طبخته الهاجرة): گـەرمای نیـوەڕۆ کوڵاندویـەتی ٥ وشـەیەك مانـای ناشـیرین لـەخۆ بگـرێ ٥ (ك: هاجرات وهواجر).

**الهـاجِرِيّ:** هەجـەری؛ نیـسبەت دراو بۆلای گوندی هەجەر ٥ کەسێـك واز لەسارانـشینیو کۆچـەریی بێنـێو ببێتە شارەستانی ٥ وەستای دیوار ٥ شتی بەنرخو چاك.

**الهِجارُ:** حەبلێـکە سەرێـکی دەبەسـترێ بەدەستی وڵاخەوەو سەرەکەی تـری دەبەســترێ بەقاچــی باشــویەوە ٥ بەکوردی پێی دەگوترێ: کەمەنـد ٥ وەتـەرو ژێـی کـەوان ٥ دەگـوترێ: (قـوس شـدید الهجـار) ٥ هەرشتێـك کەوانەیی بێو لەدەستو قاچو مـل بکرێ (تۆق) ٥ تاجو کڵاوی شاهانە.

**الهِجِّيرَی:** زۆر بڵێیی ٥ قسەی ناشـیرین ٥ دابو نەریت ٥ دەگـوترێ: (مـازال هـذا هِجِّـيراه): تائێـستا ئـەوە خـوو دابو نەریتیـــــە ٥ هەرشتێـــــك بـەیادکردنی مـچوڕکە بەجەسـتەدا بـێ ٥ (بـــەزۆری لەگـــەڵ زەم دا دەگوترێ بۆ دابو نەریتی ناشـیرین بەکاردێ.

**الهَجْرُ:** لغاو؛ لوتەوانەی وڵاخو ئـاژەڵ ٥ بـەمانا (الهـاجِرة) دێ ٥ دەگـوترێ: (شَـيْئ هَجْـرٌ): شتێـکی بـێ وێنـە ٥ (ذهبت النخلة هَجْـراً): دارخورماکـە بەرز بۆوە، گەورە بـوو ٥ (لقيته عـين هَجْــر) دوای لێــك دابڕانێـکی زۆر بەیـــەك گەیـــشتینەوە تووشـــی بوومەوە.

**الهُجْــرُ:** بزڕکانــدنو قــسەی حەلــەقو مەلەق ٥ قسەی ناشیرین.

**الهَجِرُ:** لاوازو هـەنگاو کورت، کەسێـك وردە وردە قاچ هەڵێنێ وەکوو ئـەوە پێوەندکرابێ.

**الهَجْراءُ:** دەوڵەمەنـدیو بـێ ئاتـاجی ٥ دەگـوترێ: (ماعنـــده غَنَـــاءُ ذاك ولا هَجْراؤه).

**الهَجْرَةُ:** قەڵەوی تەواو گۆشتن.

**الهِجْـرَةُ:** رەوكـردن لەولاتێـكەوە بـۆ ولاتێـكی تـر ◦ گواستنەوەی هـۆزو خـێڵ لەزەوییەكـەوە بـۆ زەوییـەكی تـــر بەمەبەســـتی دابینكردنـــی بژێوی‌و رزق‌و رۆژی.

**الهَجُورِيُّ:** خواردنی نیوەڕۆ.

**الهَجِـيرُ:** واز لـێ هێنـدراو ◦ پاشـگوێ خـراو ◦ نەویـستراو ◦ ئـەو گـژوگیاو لقـەدارەی ئـاژەڵ دەیـشكێنێ‌و وشـك دەبێ ◦ (لَبن هجيرٌ): ماستێـكی بـاش مـــەییوو تـــام خـــۆش‌و بۆنخۆشـــە هێشتا نەترشاوە ◦ مەنجەڵ‌و قـاپی گەورە، كەرەكێوی كەتـەو زەبـەللاح ◦ نێـره ولاخـی قەڵـەو كەمــەیلی كەڵـدان‌و سـواربوونی مـاین‌و شـتی وای نەبێ ◦ كاتی نیوەڕۆ بەتایبەتی لەوەرزی هاوین دا ◦ (ك: هُجُرٌ).

**الهَجِيرَةُ:** بەمانا (الهاجرة) دێ.

**الهُوَيْجِرَةُ:** كاتێـكی كەمی دوانیوەڕۆ.

**الهِجْرِسُ:** مـەیمون ◦ رێـوی یـان بێـچوە رێـوی ◦ ورچ ◦ دەگـوترێ: (فـــلان هِجْـــرِس): فلانكــەس دڵ پــیس‌و خوێڕی‌و بەدخووە.

**الهَجْرَعُ:** ئەحمەق‌و گێل ◦ شێت ◦ پشت درێژ ◦ سەگی سلۆقی.

**الهِجْزَعُ:** ترسنۆك.

**هَجَسَ الأمرُ في صدره هَجْساً:** خەیاڵی ئەو ئیشەی بەدڵ دا هات.

**هَجَسَ فلاناً عـن الأمـر:** فلانكەسی لـەو كارە گێڕایەوە.

**هاجَسَهُ:** بەگوێیدا سركاند.

**تهاجـسا:** بەسـرتە قـسەیان بۆیـەكتر كرد.

**المُتَهَجِّسُ:** دەگوترێ: (خبـز مُـتَهَجِّسٌ): نانێـــكە هەویرەكـــەی بـــاش نەشێلدراوەو هەڵنەهاتووە.

**المَهْجوسُ:** دەگوترێ: (وقعوا في مهجوس مـن الأمـر): كەوتنـە سـەر سـامی‌و حەیرانبوونـەوە دەربارەی كارەكـەو نازانن روداوەكە چۆنە.

**الهاجِسُ:** خەیاڵ ◦ (ك: هواجِس).

**الهَجْسُ:** دەنگـی نـزم دەبیـسترێ‌و لێـی حـــاڵی نابـــێ ◦ هـــەر خـــەیاڵ‌و خەتەرەیەك بەدڵ دا بێ ◦ لەقسەو بیرو بۆچون.

**الهَجِيسَةُ:** گۆشتی تەڕو تازە.

**هَجَشَ اليه هَجْشاً:** ئارەزووی كرد حـەزی لـێ كرد.

**هَجَّشَ بينهم:** نێوانی وروژاندن.

**هَجَّشَ الأمْرَ:** كارەكەی وروژاند.

**هَجَّــشَ الدابَّــةَ:** ولاخەكـەی لـێ خـوڕی بەلێخوڕینێـكی هێواش.

**الهَاجِشَةُ:** بەمانا (الهابشة) دێ، بێگانەو دورەی خـێڵ‌و هـۆز ◦ كۆمەڵێـك

خەڵکی بێگانە بکەونە ناو گەڵو هۆزو تایەفەیەك ٥ (ك: هواجش).
**الهَجْشَةُ:** راپەڕینو پەلاماردان ٥ دژومستانو روبەڕوبوونەوە.
**هَجَعَ هَجْعاً وهجوعاً:** شەونوست ٥ قورئان دەفەرموێ: (كانوا قليلا من الليل ما يهجعون).
**هَجَعَ الجوعُ:** برسیایەتی دامرکایەوە نەما.
**أهْجَعَهُ:** نواندی خەوی لێ خست.
**أهْجَعَ الطعامُ الجوعَ:** خواردنەکە ئازاری برسیایەتییەکەی دامرکاند.
**هَجَّعَ:** بۆ موبالەغەو زێدەڕەوی لەمانای (هَجَعَ)دێ.
**التَّهْجَاعُ:** خەوی کەم، سوکە خەو، سەرە خەو ٥ خەوی شەو.
**المِهْجَعُ:** غافڵو تێنەگەیشتوو لەمەبەست ٥ گێلو خەواڵوو.
**الهَجْعُ من الليل:** بەشێك لەشەو ٥ دەگوترێ: (زارني بعد هجع من الليل): دوای تێپەڕبوونی بەشێك لەشەو هاتە دیدەنیم.
**الهَجِعُ:** بەمانا (المِهْجَعُ) دێ.
**الهَجْعَةُ:** نوستنی کەم سەرەخەو شکاندن لەسەرەتای شەودا ٥ دەگوترێ: (استيقظتُ بعد هجعة): دوای سەرەخەو شکاندنێك بەخەبەر هاتم.
**الهِجْعَةُ:** جۆرێکە لەنوستنی کەم.
**الهُجْعَةُ:** بەمانا (الهَجَعُ)دێ ٥ دەگوترێ: (مضى هَجْعٌ من الليل): بەشێك لەشەو تێپەڕی.
**هَجَفَ هَجْفاً:** لەمانـدویی‌و شەکەتی دا لاکەلەکەی وێك هاتنەوە، پەراسوی بەورگییەوە نووسان.
**هَجِفَ هَجَفاً:** ئەوەندە کزو لاواز بوو ئێسقانی دەرکەوتن ٥ (فهو أهْجَفُ وهي هَجْفاءُ).
**هَجِفَتِ الأرض:** چی لەزەوییەکە دا بوو بوو بەتەپو تۆزو بەحەوادا چوو.
**إنْهَجَفَ:** کزو کۆڵەوار بوو.
**الهُجْفَانُ:** تینوو، پڕش هەڵاتوو.
**الهِجَفُ:** (الظليم المُسِنّ): نێرە شوتورمورغی پیر ٥ ئادەمی وشك تەبیاتو تەمبەڵ ٥ ئاژەڵی تەمبەڵ ٥ ورگ زل ٥ کەتەو زلی بێ خێرو سود.
**هَجَلَ الشيْءَ هَجْلاً:** فڕێی دا، شتەکەی فڕێ دا نەیویست ٥ دەگوترێ: (أخذ الكرّة فَهَجَلَ بها): تۆپەکەی گرتو فڕێی دا.
**هَجَلَت المرأة بعينها:** ئافرەتەکە بەچاو ئیشارەی کرد بۆ پیاوەکە.
**أهْجَلَ:** بەزەوی نەرمەڵان دا ڕۆیشت.
**أهْجَلَ الشيْءَ:** شتەکەی فراوان کرد.

**أهْجَلَ المالَ:** ماڵو سامانەکەی بەفیڕۆ دا ٥ دەشگوترێ: (أهْجَلَ الإبلَ وغيرها): حوشترەکانی پاشگوێ خستن هیچ سەروکاری نەکردن.

**هاجَلَ:** بەزەوی نەرمەلان دا ڕۆیشت.

**هاجل فلاناً:** لەگەڵ فلانکەس دا یەکتریان هێناو برد.

**هَجَّلَ فلاناً:** جوێنی بەفلانکەس دا ٥ دەگوترێ: (هَجَّلَ عِرضه): جوێنی بەناموسی دا.

**اهتجَلَ الشَيْئَ:** شتەکەی داهێنا.

**المَهْجِلُ:** کونی بەرەو خوار بۆ ناو زەوی.

**الهاجِلُ:** نوستو ٥ کەسێك زۆر سەفەر بکا ٥ (ك: هجول) ٥ دەگوترێ: (دَمْع هاجل): فرمێسکی ڕەوان.

**الهَجْلُ:** زەوی نزمو نەرمایی ٥ دەشتی کاکی بەکاکی ٥ (ك: أهجال وهجال وهجول).

**الهُجُلُ:** ئافرەتی بەدخوو داوێنپیس.

**الهجيلُ:** حەوزە ئاوێك تەواو نەبووبێو ئیش کردنی تێدا مابێ ٥ یان بەناڕێكو پێکی دروست کرابێ ٥ (ك: أهجال وهجال).

**هَجَمَ عليه هجوماً:** لەناکاو پەلاماری دا ٥ دەشگوترێ: (هجم البرد): سەرما هێرشی هێناو لەناکاو پەیدا بوو.

**هَجَمَ البيتُ:** خانوەکە ڕوخا.

**هَجَمَت العَيْنُ:** چاوەکە بەقوڵ دا چوو.

**هَجَمَ فلان:** فلانکەس سەری داخستو بێ دەنگ بوو.

**هَجَمَ المرضُ:** نەخۆشییەکە بنبڕکرا.

**هَجَمَ المكانَ ونحوه هَجْماً:** بەزۆرە ملێ چووە ناو شوێنەکەوە.

**هَجَمَ الدابّةَ ونحوها:** بەتوندی وڵاخەکانی لێ خوڕین ڕاپێچی کردن ٥ دەگوترێ: (هَجَمْنا الخَيْلَ على القوم): ئەسپەکانمان هەڵینگ دا بۆسەر قەومەکەو هێرشمان کردە سەریان.

**هَجَمَ الريحُ تَهْجُمُ الترابَ على الدار:** ڕەشەبا هێرشی هێناو خشتو خۆڵی بەسەر خانوەکەدا دا.

**هَجَمَ العَدُوُّ:** دوژمنی دەرکرد.

**هَجَمَ الناقَةَ:** حوشترەکەی دۆشی.

**هَجَمَ ما في الضرع ونحوه:** ئەوی لەگوانەکە دا بوو دایدۆشیو هیچی تێدا نەهێشتەوە.

**هَجَمَ الحَرُّ الدابّةَ:** گەرما ئارەقی لەوڵاخەکە دەردا.

**هَجَمَ البَيْتَ:** خانوەکەی ڕوخاند.

**أهْجَمَ عليه الشَيْئَ:** شتەکەی هەڵنا بۆ ئەوەی پەلاماری بدا.

**أهْجَمَ الناقَةَ:** حوشترەکەی دۆشی.

**أهْجَمَ ما في الضرع:** چی لەگوانەکە دا

بوو دایدۆشی.
أَهْجَمَ الدابَّةَ: وڵاخەكەی حەساندەوە.
أَهْجَمَ المرضَ عن فلان: نەخۆشییەكەی لەفلانكەس لابرد.
هاجَمَهُ: شتەكەی هەڵنا بۆئەوەی پەلاماری بدا، تێی بەردا.
إهْتَجَمَ الشَيْئَ: بەمانا (هَجَمَ عليه) دێ.
إهْتَجَمَ ما في الضرع: چی لەگوانەكەدا بوو دایدۆشی.
اهْتَجَمَ المرضُ فلاناً: نەخۆشی فلانكەسی لاواز كرد.
انْهَجَمَ البيتُ: خانوەكە ڕوخا.
انهَجَمَتْ عينه: چاوی بەقوڵدا چوو ٥ فرمێسكی لێ هاتن، ئاوی كرد.
انهَجَمَ العَرَقُ: ئارەقی كرد.
تهاجَمَا: ئەو دووكەسە پەلاماری یەكتریان داو هێرشیان بۆیەك برد.
تَهَجَّمَ على غيره: بەشێوەی توندو تیژی هێرشی بۆكرد ٥ بەزۆرە ملێ هێرشی كرد بەویستی خۆی نەبوو.
الإهتجام: كۆتایی شەو.
الهَجّامُ: ئازاو نەبەردو هەمیشە هێرشبەر ٥ شێر.
الهَجْمُ: قاپی گەورە كە شیری تێدا بدۆشرێ ٥ عەرەق.
الهجمة من الليل: سەرەتای تاریكایی شەو.
الهَجْمَةُ من الشتاء: جەنگەی سەرماو سۆڵی زستان.
الهجمة من الصيف: جەنگەی گەرمای هاوین ٥ هەروا وشەی (الَهجْمَةُ): ناوە بۆ گارانە حوشتری زۆر لەخوار ژمارە سەدەوە ٥ هەروا ناوە بۆ مەڕی پیر.
الهَجُومُ: هەرشتێك خێرا پەلاماری بداو لەهێرش بردندا گورج و گۆڵ بێ ٥ بای بەهێزو تەوژم، كەبەلای هەرشتێكدا بڕوا دەری بێنێ هەرشتێك ئارەق لەجەستەدا ڕەوان بكا ٥ دەگوترێ: (تَحَمَّمْ فان الحمامَ هَجُومٌ): حەمام بكە حەمامكردن ئارەق لەجەستەدا پەیدا دەكا.
الهَجيمَةُ: فرێدراو دەركراو ٥ شیرێك نەمەیی بێو خەریك بێ بمەیێ.
الهَيْجَمَانَةُ: دوڕو گەوهەر ٥ جاڵجاڵۆكەی نێر.
هَجَنَتِ الصَبِيَّةُ هَجْناً وهجوناً: كچەكە پێش ئەوەی باڵغ ببێ شوی كرد.
هَجَنت الناقَةُ: حوشترەكە ئاوس بوو پێش ئەوەی كاتی ئاوس بوونی بێ.
هَجَنت النخلةُ: دارخورماكە بەری گرت لەكاتێكا ساوابوو كاتی بەرگرتنی نەبوو.
هَجَنَ الزندُ: شقارتەكە بەیەك جار

لێخشاندن ئاگری نەکردەوە.
**هَجُنَ هُجْنَةً وهجونةً:** قسەکە بێ کەڵك و ناشیرین بوو قسەی پڕو پوچ و خوێڕیانە بوو.
**أهْجَنَ:** حوشتری باشی زۆر هەبوون.
**أهْجَنَ الفتاةَ:** کچەکەی مارەکرد لەتەمەنی منداڵی دا، هێشتا کاتی شوی نەهاتبوو بەشوی دا.
**أهجَنَ الفحلُ الناقةَ:** کەڵەحوشترەکە سواری حوشترە مێیەکە بوو کەڵی دا هێشتا حوشترە مێیەکە دوساڵە بوو کەڵی گرتو بێچوی بوو، سێ ساڵی تەواو کرد بوو پێی لەساڵی چوارەم نابوو.
**هَجَّنَ الشيئَ:** شتەکەی لەحاڵی خۆی لاداو بەتەواویی نەیخستە سەر حاڵەتی دووەمی ٥ دەگوترێ: شیری مەیاند بەڵام نەبوو بەماستی تەواو یان شتەکەی عەیبدار کرد.
**هَجَّنَ الأمْرَ:** ناشیرینی کردو عەیبداری کرد.
**إهْتَجَنَت الصَبِيَّةُ:** کچەکە شوی کرد پێش ئەوەی باڵغ بێ.
**إهْتَجَنَت النخلة:** نەمامەدار خورماکە بەساوایی بەری گرت.
**أهْتُجِنَت الشاةَ:** مەڕەکە ئاوسبوونی لێ دەرکەوت.
**تَهَجَّنَت النخلة:** بەمانا (إهْتَجَنت)دێ.
**إسْتَهْجَنَهُ:** ناشیرینی کرد ٥ بەلایەوە ناشیرن بوو ٥ دەگوترێ: (هذا مما يُستَهْجَنُ قولَه): ئەمە شتێکە گوتنی ناشیرینە.
**الأُهَيْجِنَةُ:** ئەو کوڕە گەنجانەی کەسوکار یان پێش باڵغ بوونیان نافرەتی منداڵکاریان لێ مارەکردن.
**المُهَجَّنَةُ من النوق:** حوشتری ڕەسەن کەبەمەرج گیرابێ جگە لەکەڵە حوشتری خۆو وڵاتی لەحوشتری تر کەڵ نەدرێ ٥ هەروا ناوە بۆ درەختی خورما لەسەرەتای موتوربە کردن و تەلقیح کردنی دا ٥ یان حوشتری تازە کەڵ گرتوو.
**المَهْجَنَةُ:** هۆزو خێڵێك بێ خێرو بێربن.
**الهِجَانُ من الأشياء:** شتی چاك و ڕەسەن ٥ حوشتری سپی بەنرخ ٥ دەگوترێ: (رجل هجان): پیاوێکی نەجیب زادەو خانەدان ٥ (إمرأة هجان): ژەوییەکی بەپیت و بەرەکەتە ٥ (ك: هجان وهُجُنٌ وهَجائن).
**الهِجانة:** وەجاخزادەیی و ڕێزداری ٥ خاوەن خانەوادەی ڕەسەن.
**الهِجَانُ:** هێستر سوار.

قریشکەو تیژی دەنگی هەور.

**الهَـزِقُ:** بـەمانا (المِهـزاق)دێ ٥ دەنگـی هەور کە زۆر گەورەو توند بێ.

**هَزَلَ هَزْلاً:** لاواز بوو ٥ کزو کۆڵەوار بوو.

**هَزَلَ القومُ:** خەڵکەکە حەیوانەکانیان کزو لاواز بوون.

**هَــزَلَ فـلان في کلامـه هـزلاً:** فلانکـەس گاڵتـەو سـوحبەتی کـرد لەکارەکـەدا جیـدی نـەبوو، شـتەکەی بەهەوانتـە گرت.

**هَزَلَ الرجُـلَ:** پیاوەکـە ئاژەڵەکانی منـدار بونەوەو هەژار کەوت.

**هَـزَلَ الدابـةَ:** ولاخەکـەی کزکـرد بـەهۆی ئەوەوە بەباشی بەخێوی نەکرد.

**هَــزِلَ فــلان هَــزْلاً:** فلانکـەس گاڵتـەو سوعبەتی کرد.

**هُزِلَ هُزالاً:** زەعیفـو لاواز بوو، دەگوترێ: (هُزِلت حال فلان): وەزعو حـاڵی فـلان لاواز بوو، دایە نوشوستی.

**أهْــزَلَ الرجــلُ:** پیاوەکــە ئــاژەڵو ولاخــەکانی کــزو لاواز بــوون ٥ دەگوترێ: (أهْزَلَ القـومُ): خەڵکەکە گرانــیو قــاتو قــڕی لــەئاژەڵو ولاخەکانیانی داو بەفڕچون ٥ ماڵو دارایـی خۆیـان شـاردەوە لەترسـی قاتو قڕی.

**أهْزَلَ الشيْءَ:** شتەکەی لاواز کرد.

**أهْــزَلَ فلانــاً:** فلانکەســی بەپیاوێــکی گاڵتــەبازو قەشمــەری کــەر هاتــە بەرچاو.

**أهْزَلَ الدابَةَ:** ولاخەکەی لاواز کرد.

**هــازَلَ فـلان فلانـاً:** فلانکـەس گاڵتـەی لەگەڵ فلان دا کرد.

**المهزلة:** کزو کۆڵەواریی ٥ قـاتو قـڕیو گرانـی ٥ وڕێنـە ٥ کارێـك زۆرینـەی گاڵتــەو ســوعبەت بــێ، شــتە جیدییەکانی کەم بن ٥ شانۆگەرییو تەمــسیلییەك پێــکەنینو شــتی سەیرو عەنتیکەی زۆر تێدابێ.

**المهزول من الشعر:** ئەو شیعرەی بونیەو هەیکـەلی نارێـكو پێـك بـێ ٥ (ك: مهازیل).

**الهُزَالُ:** زەعیفـو لاوازیی.

**الهُزَالَة:** گاڵتـەو گـەپو شـتی پێـکەنین هاوردە.

**الهِزِّیلُ:** شتی زۆر گاڵتە ئامێز.

**الهَزْلُ:** وڕێنەو قسەی پڕو پوچ ٥ قسەی خاوو بێ تامو خوێ.

**الهَزْلی:** مارو مۆر، پێڕی مار بە هەموو جۆرەکانیەوە.

**الهزیل:** زەعیفـو لاواز ٥ (ك: هَزْلی).

**الهُزَیلی:** هەڵسو کەوتی جادوبازو چاو بەسـتکەر کەبەفەنـدو فـێڵو چـاو بەستەکیو دەست سوکی بڕێ کاری

سەر سورهێنەر ئەنجام دەدا.

هَزْلَجَ: پەلەی کرد.

هَزْلَجَتْ الألفاظ: وشەو رستەکان تێکەڵو پێکەڵ بوون.

الهِزلاجُ: گورجو خێرا.

هَزِمَ الشَيْئُ هَزماً وهزيماً: شتەکە ڕەنگی هات ٥ دەگوترێ: (هَزَمَ الرعدُ): هەورەکە گۆلاندی، شریخاندی.

هَزَمَتِ الريحُ: رەشەباکە هاشاندی، هاژاندی.

هَزَمَ فلان على فلان: فلانکەس بەزەیی بەفلانکەس دا هاتەوە.

هَزَمَ الشَيْئ: شتەکەی لۆلو خستە سەریەك، هەندێکی بەسەر هەندێکی دادایەوە.

هَزَمَ العَدُوَّ هزيمة: دوژمنی شکاندو بەسەری دا زاڵ بوو.

هَزَمَ الشَيْئَ: دەستی خستە ناو شتەکەوەو هەڵیکۆڵی ٥ چاڵی تێکرد.

هَزَمَ الأرضَ: گڵی لادا لەسەر یەکێ لەکاریزاوەکانو ئاوی زۆرو رونی لێ دەرهێنا.

هَزَمَ له حقه: مافی پێشێل کرد.

هَزَّمَ الشَيْئَ: شتەکەی شکاندو وردو هاڕی کرد.

هَزَّمَ العَدُوَّ: دوژمنی شکاندو بەسەری دا زاڵ بوو.

إهْتَزَمَ الفَرَسُ: ئەسپەکە خرمە خرمی رۆیشتنی هات.

إهْتَزَمَتِ السَحَابَةُ: هەورەکە لەگەڵ گۆلەو گرمە گرم دا بارانیشی باراند.

إهْتَزَمَ الأمرَ: بڕیاری کارەکەی داو پەلەی کرد بۆ ئەنجامدانی.

إهْتَزَمَ الشاةَ: مەڕەکەی سەربڕی ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە (اهتَزِموا ذبيحتكم مادام بها طِرق): کوشتییەکە سەربڕن پێش ئەوەی کزو کۆڵەوار بێ.

تَهَزَّمَ الشَيْئُ: بەمانا (إهْتَزَمَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَهَزَّمَ الفرسُ): ئەسپەکە خرمە خرمی رۆیشتنی هات ٥ (تَهَزَّمت السحابة بالماء): هەورەکە گۆلاندیو بارانیشی باراند.

تَهَزَّمت العصا: عەصاکە شکاو قرچەی هات.

تَهَزَّمَ الرعدُ: هەورەکە گۆلاندی.

تَهَزَّم البناءُ: باڵەخانەکە تێك روخا.

استهزَمَ العَدُوَّ: دوژمنی شکاندو بەسەری دا زاڵ بوو.

المِهْزامُ: گۆچانو عەصای کورت ٥ کۆڵەوەژو داری ئاگر خۆشکردن ٥ دارێکە سەرەکەی ئاگری تێ بەردەدرێو منداڵ یاری شەڕە

ئاگری پێ دەکەن ٥ هەروا ناوە بۆ یارییەك منداڵ دەیکەن دەهێنن سەری یەکێکیان بەپارچە پەڕۆیەك دادەپۆشن، ئەمجار یەکە یەکە ئەوانی تر بەدەست لێی دەدەن هەمووجارێ دەڵێن کێ بوو پێی کێشای؟ کەهەڵی هێنا کێ پێی کێشاوە ئیتر پەڕۆکە دەخەنە سەر سەروچاوی ئەوی ترو لێی دەدەن هەتا دەزانێ کێ لێی داوەو ناوەکەی دەڵێ هەروا تا کۆتایی ٥ (ك: مهازیم).

**الهَازِمَةُ:** بەڵاو کارەسات ٥ (ك: هوازم).

**الهَزْمُ:** زەوی نزمو شێوە چاڵو تەخت ٥ گەدەو ریخۆڵە ٥ هەوری تەنك کەئاوی تێدانەبێ ٥ کونو درزی کوندەی ئاو.

**الهَــزَمُ:** دەنگ ٥ دەنگی کەوانی تیر ٥ فرە فرِی تیر.

**الهَزِمُ:** ئەسپی جڵەو خۆش ٥ بارانی بەردەوامو درێژخایەن ٥ دەشگوترێ: (فرس هزِم الصوت): ئەسپێکە دەنگی وەکوو دەنگی هەور وایە، حیلەی دەڵێی هەورە دەگۆڵێنێ.

**الهَزْمَــةُ:** زەوی نزمو مەیلەو چاڵ ٥ دەنگو گرمە.

**هزمة السِّنَور:** دەنگی قورگی پشیلە ٥ قوڵکەو چاڵی هەڵکەنراو لەبەرد ٥ (ك: هزم وهزوم).

**الهَزِمَةُ:** بزنی دووساڵ.

**الهَزِمَةُ من القدور:** مەنجەڵێك دەنگی قڵپە قڵپو کوڵانی ببیسرێ.

**الهِزْمَــةُ مــن الــدواب:** وڵاخی کزو کۆڵەوارو لاواز.

**الهَــزُومُ:** شتێك بەئاشکرا دەنگی جەرەسی لێ بێ.

**الهَــزِيمُ:** گۆڵە گۆڵی هەور ٥ دەنگی خرمە خرمی رۆیشتنی ئەسپ ٥ ئەسپی حیلکە گەورە ٥ بارانی درێژخایەنو بەردەوام ٥ دوژمنی شکاوو رەتێندراو.

**الهَزِيمَةُ:** تێك شکاو لەشەڕدا ٥ بیرێك ئاوی زۆر بێ ٥ وڵاخو ئاژەڵی کزو لاواز ٥ ئەسپی عەرەق کردو بەهۆی زۆر رۆیشتنو ماندو بوونەوە ٥ (ك: هزائم).

**الهَزِّيمى:** تێکشکانی تەواوو جەرگبڕ.

**الهَيْزَمُ:** شێر ٥ پتەوی رەقو رەختە.

**الهَزْمَجَــةُ:** قسەکردنی خێرا خێراو لێکدان لێکدان ٥ گاڵو بوغڵو تێکەڵاو بوونی دەنگەکان.

**هَزْهَزَ الشَّيْئَ:** شتەکەی لەرە لەر پێ کرد، خستیە شەقەتۆڵە ٥ زەلیلو ملکەچی کرد.

تَهَزْهَزَ اليه القلب: دڵی بۆی لێ دا ◦ دڵی پێی کرایەوە.

الهُزاهِزُ من الماء: ئاوی زۆری ڕەوان کەلەبەر زۆری کڵەو بکا ◦ ئەگەر بۆ شمشێر بەکارهات مەبەست شمشێری بریسکەدارو سپیو بێ پەڵەو لەکەیەکە لەکانو مەعدەنی ڕەسەن دروست کرابێ.

الهُزْهاز: دەق بەمانا (هُزاهِز)دێ.

الهُزْهاز من الآبار: بیری قوڵ، زۆر قوڵ.

الهَزْهَزَةُ: بەلاو کارەسات کەخەڵك بتاسێنێو مەدهۆشیان بکا.

هَزَا هَزْواً: ڕۆیی.

هَسْ: وشەیەکە بۆ دەرکردنی مەڕو بزن ◦ فەرمانکردنە بە بێدەنگ بوون واتە وسبە.

هَسَّ فلان هَساً: فلانکەس لەبەر خۆیەوە قسەی بۆ خۆی کرد.

هَسَّ الشَيْئَ: شتەکەی باریك کردەوەو شکاندی.

هَسَّ الكلامَ هَسِيساً: قسەکانی لەسەر خۆ کردن.

هَسَّ الطفلَ: لەمنداڵەکە تورەبوو بۆئەوەی بێدەنگ بێ.

الهَسِيسُ: وردکراوو هاڕاو لەهەرشتێك بێ.

الهَمَسُ: قسەی سرتە کەلێی حاڵی نەبی.

هَسْهَسَ الرجلُ: پیاوەکە شەو ڕۆیی.

هَسْهَسَ ليلته كلها: شەوەکە هەمووی بەڕێوە بوو هەر ڕۆیی ◦ نوزەی لێوە هات ◦ دەشگوترێ: (هَسْهَسَ الخلخالُ وهَسْهَسَت الدرعُ).

هَسْهَسَ الماءُ: ئاوەکە بەڕونیو جوانی هاتە خوار.

هَسْهَسَ الحديث: قسەکەی شاردەوە.

تَهَسْهَسَ: بەمانا (هَسْهَس)دێ.

الهَسَاهِسُ: ڕۆیشتن بەشەو ◦ دەنگی سمی حوشتر ◦ قسەی بەنەسپایی.

الهُسَاهِسُ: قسەی ناو دڵ وتو وێژی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی ◦ وەسوەسەو دەنەدەنەی ناو دەروون.

الهَسْهَاسُ: قسەی بەنەسپایی کەلێی حاڵی نەبێ ◦ ئەوکەسەی شەو ناخەوێو خەریکی ئیشکردنە ◦ قەساب ◦ ڕۆیشتنی خێرا.

الأهْسَاءُ: خەڵکانێك کەدەکەونە حاڵەتی سەر سوڕمانو تاسانەوە.

هَشَرَ الناقةَ هَشْراً: هەرچی لەگوانی حوشترەکەدا هەبوو هەمووی دۆشی.

هُشْرَ البعيرُ: حوشترەکە سییەکانی سوتان.

الهَشْرُ: سوکیو تەنکی شت.

الهَشْرَةُ: کەیفو خۆشیو تەڕدەماخی.

**الهَشِرَةُ**: درەختێك زوو گەڵای هەڵوەرێ.

**الهَشورُ**: بەمانا (الهَشِرَةُ)دێ.

**الهَيْشَرُ**: پیاوی درێژی شل‌و شێواو ○ هەروا ناوە بۆ روەکێك بەتەمەن‌و چقڵاوییە لەپێری روەکی مورەکەبەیە لەوڵاتی میصرو ولاتانی سەر دەریای ناوەڕاست دەروێ بالای بەئەندازەی ٣٠سم تامەترێك بەرز دەبێتەوە ○ قەدو لاسکەکەی نەرم‌و شێوەڵ شیوەڵە ○ گەڵاکانی بەسەر خۆی دا شۆڕ دەبنەوە، لای خواروی چقڵاوی‌و کەلکەلە روبەری سەروی لوس‌و گوڵەکانی زۆرو رەنگ شینن میوەکەی وەکوو دەنکە قەزوان وایە.

**هَشَّ الرجل هَشاً**: بەگۆچان‌و عەصا هەڵمەتی بۆبرد.

**هَشَّ الشجرةَ**: بەگۆچان درەختەکەی تەکاند، درەختەکەی کوتا بۆ ئەوەی گەڵاکانی هەڵوەرێ ○ قورئان دەفەرموێ: {وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي}.

**هَشَّ اليه ولـه**: دڵی پێی کرایەوە ○ پێی دڵخۆش بوو.

**هَشَّ الخبز ونحوه هشاً وهشوشةً**: نانەکە تەنکو وشك‌و ڕەق بوو خێرا ورد بوو.

**هَشَّ العودُ**: عودەکە شکا ○ نەمامەکە شکا.

**هَشَّ الشيئُ هشوشةً**: شتەکە کلۆرو بێ هێز بوو.

**هَشَّشَ فلاناً**: فلانکەسی کەیف خۆش کرد تەردەماخی کرد ○ هەوڵی لاوازکردنی‌و زەعیف بوونی دا.

**إهْتَشَ فلان للأمر وبه**: فلانکەس حەزی لەکارەکە بوو، دڵی بۆی لێ دا.

**استهش الشيئَ**: شتەکەی بەسوك‌و بێ نرخ زانی، سوکی کرد.

**الهَشُّ**: شتێك بەئاسانی بشکێ ○ دەگوترێ: (خبز هَشٌ): نانێکی رەق‌و تەنکە هەر لە خۆیەوە ورد دەبێ ○ هەرشتێك نەرم‌و تەنك‌و خۆنەگربێ ○ پیاوی روخۆش‌و دەم بەپێکەنین ○ ئەسپێك زۆر ئارەق بکا ○ دەشگوترێ: (فرس هشَ العنان): ئەسپێکە جڵەو نەرمە، جڵەو خۆشە.

**الهَشّاشُ**: دەگوترێ: (خبز هَشاش): نانێکە رەق‌و تەنکە هەر لەخۆیەوە ورد دەبێ.

**الهَشاشَة**: (هشاشة العظام): نەخۆشییەکە زکماکە توشی کۆئەندامی ئێسکی مرۆڤ دەبێ.

**الهَشّاشَةُ**: کوندە ئاو کەلەبەر تەنکی‌و

پندر نەبوونی ئاوی لێ بتکێ.

**الهَشوش:** مەڕێك زۆری شیر هەبێ ٥ بەشیر بێ.

**الهشوشَةُ:** لەبواری کیمیادا بریتییە لەتایبەتمەندییەکی مادە وای لێ دەکا ئامادە باشی زوو شکاندنی تێدابێ ٥ بەئاسانی بشکێ.

**الهَشیشُ من الرجال:** کەسێك ئەگەر داوای یارمەتیو بەخششی لێ بکرێ پێی خۆش بێ ٥ هەرشتێك بەئاسانی تێك بشکێو خۆگرنەبێ ٥ وردو پەرت بوو جەستە لاوازو بێ وەج ٥ بۆمێینە (هَشیشَة) دەگوترێ.

**هَشَلَت الناقةُ ونحوها:** حوشترەکە کەمێك شیری دا.

**اهتشلَ الدابَّةَ:** بەبێ ئیزنی خاوەنی، ولاخەکەی بەکارهێنا.

**الهشيلَةُ:** ئەو ولاخو ئاژەڵو ئامێرەیە بەبێ ئیزنی خاوەنی بەکار بهێندرێ یان داگیر بکرێ.

**الهَيْشَلَة:** حوشتری بەسالاچوی قەڵەو.

**هَشَمَ الشيْئَ الأجوفَ او اليابسَ هَشاً:** شتە کلۆرەکە یان وشکبوەکەی ئامادەکرد بۆ تێکوشین.

**هَشَمَ الناقةَ:** حوشترەکەی دۆشی ٥ دەشکوترێ: (هَشَمَ ضرعها).

**هَشَّمَ الشيْئَ الأجوف أو اليابس:** بۆ زێدەڕەوی لەمانای (هَشَمَ)دێ ٥ واتە شتە کلۆرەکە یان وشکەوە بووەکەی زۆر ورد کرد.

**إنْهَشَمَ الشيْئُ:** بۆ موطاوەعەی (هَشَمَهُ)دێ.

**إنْهَشَمَ الإبل:** حوشترەکە لاواز بوو لەڕو کزو کۆڵەوار بوو.

**إهتَشَمَ نفسَهُ له:** خۆی بۆ شکاند، خۆی لەئاستیا بچوك دانا.

**تَهَشَّمَ الشيْئُ:** بۆ موطاوەعەی (هَشَّمَهُ)دێ.

**تَهَشَّمَت الأرض:** زۆر لەمێژە زەوییەکە بارانی لێ نەباریوە.

**تَهَشَّمَ الشجرُ:** درەختەکە لەبەر زۆر وشك بوونی شکا تێك شکاو هاڕەی کرد ٥ دەشکوترێ: (تَهَشَّمَتِ الريحُ الشجر): ڕەشەبایەکە درەختەکەی تێك شکاند.

**تَهَشَّمَ على فلان:** بەزەیی بەفلان دا هاتەوە.

**تَهَشَّمَ فلاناً:** هەوڵی دا فلان لەخۆی رازی بکا ٥ دەگوترێ: (تَهَشَّمْتُ فلاناً للمعروف): داوای بەخششو پیاوەتیم لەفلان کرد ٥ ڕێزی فلانکەسم گرت.

**المِهْشامُ من النوق ونحوها:** حوشترێك زوو کزبێ.

**الهَاشِمُ:** كێوی نەرمو ڕوخەك ٥ شیر دۆشی لێزان ٥ (ك: هُشَّمٌ).

**الهاشِمة:** برینێك ئێسقان ورد بكا.

**الهِشامُ:** بەخشندەیی.

**الهَشْمُ:** زەوی سوتەمەڕۆو بێ بەرو بوم ٥ زەوی نـــزمو دەشـــتایی ٥ (ك: هشوم).

**الهَشِمُ:** سەخیو دەست كراوە.

**الهَشَمَةُ:** بزنەكێوی.

**الهَشومُ من الأرض:** زەوییەك بیرێكی قوڵی تەسكی تێدا هەڵكەندرابێ.

**الهَشيمُ:** وردكراو پەرت بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: {فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ} ٥ درەختی گەندەڵو رزیو كـەدار كـەر بـەئارەزوی خـۆی بەئاسـانی وردی دەكـا ٥ پـوشو پەڵاشـی سـاڵی ڕابـردوو ٥ شـتی وشـكەوەبوو لەهەر جۆرێك بێ ٥ جەستە لاوازو زەبوون.

**الهَـشيمَةُ:** كێـوو كـەژو زەوییـەك درەختــەكانی وشــك بـوبنو بەپێوەمابن ٥ درەختی وشكی ڕزیو.

**الهَيشوم من الكلأ وغيره:** لەوەڕی وشكەوە بووی ناسك.

**الهَشْنَقُ:** مەكۆكی جۆلا، ئەوشتەی جۆلا تێوەدانەكەی لەسەر هەڵدەكا.

**هَشْهَشَ الشَّيْءَ:** شتەكەی جولاند.

**تَهَشْهَشَتِ المرأةُ:** ئافرەتەكە خۆی لای مێردەكەی خۆشەویست كرد.

**هاشاه:** سوعبەتو یاری لەگەڵ كرد.

**هَصَرَ فلان الشَّيْءَ:** فلانكەس شتەكەی شكاند.

**هَصَرَ الغُصْنَ ونحوه وبه:** لقەدارەكەی چەماندەوە شكاندییەوە بەبێ ئەوەی بەتەواویی لێی بكاتەوە ٥ لقەدارەكەی داهێناو ڕایتەكاندو شوڕی كردەوە.

**هَصَرَ قِرْنَه:** بەتوڕەیی چاوی لەبەرامبەرەكەی داگرت.

**هَصَرَ الحيوانُ رأس الفريسة:** دڕندەكە سەری نێچیرەكەی تێك شكاند.

**هَصِرَ الشَّيْءُ هَصْراً:** شتەكە خواربوو.

**اهتصر الغُصْنُ:** لقەدرەختەكە كەوتە سەرزەوی.

**اهتصر الشَّيْءَ:** بەمانا (هَصَرَهُ)دێ.

**إهتصر النخلةَ:** لقو پۆپی دارخورماكەی ڕێك خستن.

**تَهَصَّرَتْ أغصان الشجرة:** لقو پۆپی درەختەكە شۆڕبۆوە.

**المُهْتَصِرُ:** شێر.

**الهَصِرُ:** شێر ٥ پیاوی بەهێزو بەتوانا.

**الهُصَرُ:** بەمانا (الهَصِرُ) دێ ٥ شێر.

**الهَصْرَةُ:** میرویەكە ئافرەت پێیان وابووە دەتوانن بەهۆی ئەو میرووەوە سیحرو جادو لەپیاو بكەن.

الهَصُورُ: شێر.

هَصَّتْ النار ونحوها هَصيصاً: ئاگرەکە بڵێسەی داو روناکی خستە دەورو بەری خۆیەوە.

هَصَّ فلان هَصّاً: فلانکەس پێی لێ ناو پلیشاندییەوە ٥ بەپەنجەکانی گرتی‌و گوشی ٥ (فهو مهصوص وهصيص).

هَصِصَ الرجلُ: پیاوەکە چاوی بریسکەیان کرد.

الهاصَّة: چاوی فیل.

الهَصّ: هەرشتێك رەق‌و پتەو بێ.

هَصَمَ الشَيْئَ هَصْماً: شتەکەی شکاند.

هَصَمَ قِرْنَه: بەرامبەرەکەی شکاند، بۆری دا.

المِهْصَمُ: شێر.

الهَیْصَمُ: ئەستورو بەهێزو پتەو ٥ جۆرە بەردێکی سفت‌و لووسە ٥ دەشگوترێ: (نابٌ هَیْصَمٌ): کەڵبەیەکە هەموو شتێك دەهارێ.

الهُصَامِصُ: مرۆڤی بەهێز ٥ شێری ئازاو بەهێز.

الهَصْهَاصُ: کەسێك چاوی بریسکەیان بێ، تیشك بدەنەوە.

هَصَاهَصْواً: پیربوو کەوتە ساڵەوە.

هَضَبَ الرجلُ هَضْباً: پیاوەکە وەکوو رۆیشتنی ولاخی گێل بەرێکادا رۆیی.

هَضَبَت السماءُ: ئاسمان بارانی بەردەوام بوو ٥ درێژخایەن بوو بروکەی نەدایە ٥ دەگوترێ: (هَضَبَ الشاعر بالشعر): شاعیرەکە درێژەی دا بەشیعر خوێندنەوە.

هَضَبَتْ السماءُ القومَ: ئاسمان خەڵکەکەی بەتەواوی تەرِکردو شرت‌و شۆی لێ بڕین.

أهْضَبَ في الحديث: چەند جارێك چووە ناو قسەو باسەکەوەو دەنگی هەڵبڕی ٥ لەسەر تەپۆڵکەو شتی وا دابەزی.

إهْتَضَبَ في الحديث: بەمانا (أهْضَبَ)دێ.

الأهضوبَة: تەپۆڵکە ٥ بان ٥ دەشتایی پان‌و بەرز ٥ بارانی قەترەگەورەو درێژخایەن ٥ (ك: أهاضيب).

الهَضَبَة: بان؛ دەشتایی پان‌و پۆڕ کەئەملاو ئەولای نزم بن وەکوو بانی مقان، بانی ئێران ٥ کێوی پانەوە بووی گەورە بەسەر رویەرێکی زۆری زەوی دا بروانێ ٥ (ك: هَضْبٌ وهِضَبٌ وهِضابٌ) ٥ دەگوترێ: (رجل هَضْبَة): پیاوێکی سوێر قسەیە، زۆر بڵێ یە.

الهِضَبُ: شتی پتەوی رەق ٥ ئەسپێك زۆر ئارەق بکا.

الهَضيبُ: (غنم هضيب): مەرێکی کەم شیرە.

هَضَجَ الرجلُ مواشِيَه: پیاوەکە جوانو رێــكو پێــك ئاژەڵــەکانی بــەخێو نەکردن.

الهَضيجُ: دەگوترێ: (صـبیان هـضیج): منداڵـەکان بچوکنو ئیشو کاریـان بەرێــكو پێــکی بۆئـەنجام نـادرێو هیچیان لەدەست نایە.

هَضّتِ الإبـلُ هَـضّاً: حوشـترەکە پەلـەی کـرد، خێـرا رۆیـشت ٥ دەگـوترێ: (هَضّت السَّیرَ): رۆیـشتنەکەی خێـرا کرد.

هَضَّ فلان المَشْيَ: فلانکەس رۆیشتنێکی جوان رۆیی‌و تەکانی بەخۆی دا.

هَضَّ الشَيْءَ: شتەکەی شکاندو وردی کـرد ٥ (فهو مهضوض وهضیض).

هَضْهَضَ الرجل: پیاوەکە بەتوندی قاچی بــــەزەوی دا داو زەوییەکــــەی پەستاوت.

اهْتَضَّ الـشَیْءَ: بـۆ زێـدەڕۆیی لـەمانای (هَضَّهُ)دێ.

اهْتَضَّ نَفْسَهُ لفلان: خۆی کەمتەرخـەم نیـشان دا بەرامبـەر فـلانو نەفـسی خۆی هەڵنا بۆ زێـدە خزمـەتکردنی ئەو بابایە.

الهَــضّاءُ: کۆمــەڵو تــاقم ٥ دەســتە سەربازو پۆلە پێشمەرگە.

الهَضّاضُ: نێرە حوشتر کەپیاو دەکوژێ یان حوشتر دەکوژێو یـان دەیانخـاو دوایــی قورسـایی خــۆی لەســەریان لادەبا.

الهَضَضُ: شکان، ورد بوون.

هَـضَلَ الرجـلُ بـالكلام هـضلاً: پیاوەکـە کەوتــە نــاو قــسەو گوفــتو گــۆوەو درێژەی پێدا.

أهْضلت السماءُ: ئاسمان بارانی باراند.

أهضلت الدَّلْوُ: دۆڵچەکە ئـاوی لـێ ڕژا چونکە لەقەراخی بیرەکەی دا.

الهَــضّالُ: کەسێــك شــیعر بــەگۆرانی دەڵــێو دەیکاتــە حودیــە بــۆ حوشترەکانی بۆئەوەی خێرا بڕۆن.

الهَضْلُ: زۆر.

الهَضلاءُ من النساء: ئافرەتێك مەمکی درێژبنو شۆڕبوبنەوە ٥ ئافرەتێــك عادەی مانگانەی نەمابێ.

الهَیْــــضَلُ: ســــوپای زۆر ٥ تــــاقمی پرچــەكو یــەکگرتوو لەشــەڕدا ٥ پیــاوی درێــــژو کەتــــەو زەلام ٥ بۆئافرەت دەگوترێ: (الهَیْضَلَةُ).

الهَیْضَلَةُ: ئافرەتی تەمەن مام ناوەندی ٥ نەگەنج نەپیر ٥ حوشترێك شیری زۆر بــێ ٥ گــاڵو بــوغڵی خــەڵك کەدنگیان تێکەڵاو دەبێ.

هَضَمَ علیه هَـضْماً: هێرشی کـردە سـەر ٥ کەوتـە خـوار، دابـەزی. دەگـوترێ: (مـا

هَضَمَ عليه): هێرشی نەکردۆتە سەر، لێی نزیك نەبۆتەوە.

**هَضَمَ لە من حقە:** وازی لەهەندێ مافی خۆی هێنا بۆ هاوەڵەکەی بەگەردن ئازایی.

**هَضَمَ الشيْئُ:** شتەکەی شکاند.

**هَضَمَ فلاناً:** ستەمی لەفلانکەس کردو مافی خۆی نەدایە.

**هَضَمَ نفسَه:** لەرێزی خۆی کەم کردەوە، خۆی شکاند ◦ نەفسی خۆی دابەزاند.

**هَضَمَ الطعامَ:** خواردنەکەی ئەزم کرد ◦ دەشگوترێ: (هضمت المعدةُ الطعامَ وهضم الدواءُ الطعامَ).

**هَضَمَ الهواضيم الطعامَ:** کۆئەندامی هەزم خواردنەکەیان گۆڕی بۆ مادەی کیلۆسی کەبگونجێ بۆ جەستەو سودی لێ وەربگیرێ.

**هَضِمَ هَضَماً:** گەدەی وێك هاتەوەو بچوك بۆوە ◦ قەدی باریك بوو کەلەکەی باریك بوونەوە.

**هَضِمَ الفرسُ:** ئەسپەکە پەراسووەکانی رێك بوون ◦ (فهو أهضم وهي هضماء).

**إهْتَضَمَ فلاناً:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (هَضَمَهُ)دێ.

**إنهَضَمَتْ الثمرةُ:** میوەکە پێگەیی دەمی کردەوە.

**تَهَضّمَتِ الثمرةُ:** بەمانا (إنهضمت)دێ.

**تَهَضَّمَ فلان لفلان:** فلانکەس ملکەچی فلان بوو.

**تَهَضَّمَ نفسهُ له:** نەفسی خۆی لێ رازی کرد وای کرد لێی رازی بێ.

**تَهَضَّمَ فلاناً:** فلانکەسی بەکەم زانی.

**الأهضم:** دەگوترێ: (رجل أهضم الكشحين): پیاوێکە کەلەکە پێچراوەیە ◦ کەڵبە گەورە.

**المُهَضَّبَةُ:** دەگوترێ: (قصبة مُهَضَّبَةٌ): قەفەزاژێکی کونکونە دەکرێتە بلوێرو چوزەلە.

**المهضومَة:** دەگوترێ: (قصبة مهضومة): قەفەزاژێکی کونکونە دەکرێتە بلوێرو چوزەلە ◦ بۆنێکە تێکەڵاوی میسكو بان دەکرێ.

**الهاضِمُ:** هەرشتێك نەرمیو شلی تێدابێ.

**الهاضوم:** هەردەرمانێك کاریگەربێ بۆ هەزمکردنی خۆراك. هەرمادەیەك خواردن هەزم بکا وەکوو تفو سەفراو هەموو ئەو مادانەی غودەی تایبەتمەندییەکان دەری دەدەنو تێکەڵ بەخواردن دەبنو دەبنە هەزم کەر ◦ (ك: هواضيم) ◦ ئەوکەسەی ماڵی خۆی دەبەخشێ.

**الهَضّام:** بەمانا (الهاضوم)دێ.

**الهَضْمُ:** عەمەلییەو کارلێکێکە مادە هەزمکەرەکان ئەنجامی دەدەن ٥ خواردنە جۆراو جۆرەکان دەگۆڕن بۆ مادەیەکی بزێوی گونجاو بۆ جەستە.

**الجهاز الهضمي:** کۆئەندامی هەزم، کۆمەڵە ئەندامێکن هاوکاری یەکتر دەکەن بۆ هەزمکردنی خۆراك، وەکوو ددانو غودەی هەزم کردنو گەدەو ریخۆڵە.

**القناة الهَضْمية:** قەناتو ڕێڕەوێکە لەکلۆرایی جەستەدا هەموو کۆئەندامی هەزم پێوەی بەستراون، لەدەمەوە دەست پێ دەکا تا قوڵۆن.

**الهِضْمُ:** زەوی تەختو نەرمو مەیلەو چاڵ ٥ ناوەوەی شیوو دۆڵ ٥ بوخور ٥ (ك: أهضام وهضوم).

**الهضوم:** بەمانا (الهاضوم)دێ ٥ دەگوترێ: (یدهضوم): دەستێکی بەخشندەیە، چی لا هەبێ دەیبەخشێ.

**الهضيمُ:** بەمانا (المهضوم)دێ ٥ ئافرەتی نەرمو شلی قەد باریك ٥ شتی کاملو گەییو ٥ هێشووە میوەی بزمار کوتو تێکچڕژاو ٥ قورئان دەفەرموێ: (ونخل طلعها هضيم) ٥ دەشگوترێ: (قصبة هضيم): قەفەزاژێکی کونکونەو دەکرێتە بلوێرو جوزەلە.

**الهَضيمة:** ستەمو داگیر کردن ٥ خواردنێك دەکرێتە خێر بۆ مردو ٥ (ك: هَضَائِم).

هاضاه: بەنەحمەقو گێلی لەقەڵەم داو بەبێ ڕێزی سەیری کرد.

**هَطَرَ الفتى للغنيِّ هطرةً:** هەژارەکە بۆ دەوڵەمەند ملکەچی نیشان داو لەبەری پاڕایەوەو سواڵی لێ کرد.

**هطَرَ فلان الكلبَ ونحوه:** فلانکەس بەدار لەسەگەکەی دا.

**تهطَرَتْ البئرُ:** بیرەکە دیوارەکەی تێك روخا.

**تهطرس الرجلُ:** پیاوەکە لەڕۆیشتن دا خۆی باداو لارو لەنجەی کرد.

**الهُطُطُ:** ئادەمیزادی مردو، کەلاکی مرۆڤی مردو.

**هَطَعَ هَطْعاً وهُطُوعاً:** بەپەلەو بەترسو لەرزەوە هات ٥ ملی درێژکردو سەری راست کردەوە ٥ چاوی لەشتەکە بڕیو چاوی لێ نەبروکاند (نەتروکاند).

**أهطع فلان:** فلان بەزەلیلیو چاو بەرەو ژێری سەیری کرد.

**أهطع في سيره:** لەڕۆیشتنەکەی دا پەلەی کرد.

**إستهطَعَ:** ملی درێژکردو سەری

بەرزکردەوە.

استهطعَ في سيره: لەرۆیشتنی دا پەلەی کرد.

المُهطِعُ: ئەوکەسەی بەزەلیلیو ملکەچی دەڕوانێ ٥ کەسێك لەبەر زەلیلیو داماوی خۆی بێ دەنگەو هیچی پێ ناگوترێ، هەرکە بانگی لێ دەکرێ خێرا دەچێ بۆلای ئەوکەسەی بانگی دەکا ٥ قورئان دەفەرموێ: (مهطعين الى الداع).

الهَيْطَع: ڕێگای پانو پۆڕو فراوان.

هطف الراعي هَطْفاً: شوانەکە شیری دۆشی.

هطفت السماءُ: ئاسمان بارانی باراند.

هَطَفَ اللبنُ: شیرەکە خوشەی هات لەکاتی دۆشین دا.

الهَطْفُ: خوشەی شیر.

الهَطِفُ: بارانی زۆر.

هَطَلَ المطر هَطْلاً وهَطَلاناً: بارانەکە دڵۆپەی گەورە بوو تاوتاو باریو بەردەوامیش بوو ٥ دەگوترێ: (هطل الدَّمْعُ) فرمێسکەکە هەڵوەری ٥ دەشگوترێ: (هطلت العين بالدمع): چاوەکە فرمێسکی هەڵڕشت.

هَطَلَ الرجلُ هطلاناً: پیاوەکە بەگورجی سەرەو ژێر ملی ڕێگای گرتو داپەڕیە خوار.

هَطَلَ الجَرْيُ الفرسَ هطلاً: ڕۆیشتن چین چین ئارەقی بەئەسپەکە کرد.

تهاطل القومُ ونحوهم: خەڵکەکە شوێن یەك کەوتنو ڕۆیشتن.

تَهَطَّلَ المطر أو السحابُ: بارانەکە بەدڵۆپی گەورە گەورەو تاوتاو باری، یان هەورەکە بارانی دڵۆپ گەورەو تاوتاوی باراند.

الهَاطِلُ: کشتوکاڵی تێکچڕژاو.

الهَطّالُ: هەورێك باران زۆر ببارێنێ.

الهَطْلُ: بارانی درێژخایەن ٥ ماندوبوون.

الهِطْلُ: ماندوکەر ٥ ئەحمەقو گێل ٥ دز ٥ گورگ.

الهُطْلُ ديمة هُطْلٌ: هەوری باراناوی.

الهَطْلى: حوشتری بەرەڵڵاو بێ شوانو قەتارچی.

الهَطْلاءُ: (ديمة هطلاء): هەوری باراناوی.

الهَيَاطِلة: ڕەگەزێکی تورك نەژادو سیندین.

الهَيْطَلُ: تاقمو پێری کەم ٥ ڕێوی.

الهَيْطَلَةُ: مەنجەڵی مس، تاوەی مس کێشتی تێدا لێ دەنرێ.

الهَيْطَلِيَّة: جۆرە حەڵوایەکە لەمادەی نیشاستەو شیرو شەکر دروست دەکرێ.

**هَطْلَسَ**: گورگە لوقەی کرد ٥ ئەوەی داوای کرد وەری گرت.

**تَهَطْلَسَ الرجلُ**: پیاوەکە گورگە لوقەی کرد پلانی دانا بۆ دەستگیر کردنی....

**تهطلسَ اللُّصُّ**: دزەکە فرتو فێڵی کردن بۆ دزیکردن.

**تَهَطْلَسَ المريضُ من مرضه**: نەخۆشەکە چاك بۆوە.

**الهَطْلَسُ**: دزێك کەهەرچی دەستی بکەوێ بیدزێ ٥ گورگ ٥ سوپای زۆر.

**الهَطَلَّعُ**: زۆر ٥ تاقمو پێری ئادەمیزاد ٥ جەستەی زۆر درێژ کە بەهۆی درێژی لەرەلەر بکا.

**هَطْهَطَ في المشي**: لەرۆیشتن دا پەلەی کرد.

**الهُطاهِطُ**: ئەسپ.

**هَطَا الشَّيْءَ هَطْواً**: شتەکەی فرێ دا.

**الهُطى**: لێدانی توندو بەئازار ٥ کێشەو بەربەرەکانێ.

**هَيْعَرَ**: چوستو وێڵ بوو.

**هَيْعَرت المرأةُ**: ئافرەتەکە بەدرەوشت بوو ٥ دانەسەکناو گەرێدە بوو، ماڵانگەڕ بوو.

**تَهَيْعَرَتِ المرأة**: بەمانا (هَيْعَرَتْ)دێ.

**الهَيْعَرَة**: ئافرەتی بەدرەوشتو زۆر

بڵێو فیژەکەر ٥ دێوو درنجو خێو ٥ شتەکە وردو بچوك بوو.

**هَفَت الرجلُ**: پیاوەکەی بەبێ راوەستان قسەی کردو چەنەی داو هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو.

**هُفِتَ الرجلُ**: پیاوەکە سەرسام بوو.

**إنهفت الشَّيْءُ**: شتەکە دابەزیو نرخی کەم بۆوە.

**تهافت الجدارُ أو الثوب ونحوهما**: دیوارەکە پارچە پارچە کەوتە خوار ٥ یان قوماشەکە پارچە پارچە هەڵوەری ٥ دەشگوترێ: (تهافت الفراش على النور أو في النار): پۆل پۆل پەپولەکان هەڵوەرینە ناو ئاگرەکەوە.

**تهافت الناسُ**: خەڵکەکە وەجبە وەجبەو چین چین مردن.

**تهافتت الآراء**: بیرو رایەکان هەندێکیان هەندێکیانیان هەڵوەشاندەوە ٥ رایەکان پوچەڵبوونەوەو خۆیان نەگرت.

**تهافت الناس على الماء**: خەڵکەکە چین چین چوونە سەرئاوەکە.

**الهَفَاتُ**: نەحمەقو گێل.

**الهَفْتُ**: زەوی نەرمەڵانو مەیلەو چاڵ ٥ بارانی بەلێزمەو خورەم ٥ گێلیو نەفامی زۆر.

الهَفتق: هەفتە.

هَفَّ الشَّيْءُ هَفيفاً: شتەکە کێشی کەم بوو ٥ چوست بوو.

هَـفَّ الـسائِرُ: ڕێبوارەکـە لەڕۆیـشتن دا پەلەی کرد.

هَفّت الريحُ هَفّاً وهَفِيفاً: بایەکە هەڵبو هاشە هاشی هات.

هَـفَّ الـزرعُ: کـشتوکاڵەکە دانەوێڵەکـەی بـەزەوی دا بـڵاو بـۆوە چونکە درەنـگ دورایەوە.

إهتـف الـصوتُ: دەنگەکـە بیـسترا، لەگوێـــــچکەی بیـــــسەران دا زرینگایەوە.

إهتـــف الـــسرابُ: تراوێلکەکـــە درەوشایەوە.

المُهَفَّفُ من الرجال: پیـاوی قـەد باریـك، ورگ بچکۆلە.

الهِفُّ: ئادەمیزادی سوکەڵەو چوست ٥ کشتوکاڵێك درەنگ دروێنـە بکرێو دانەوێڵەکـەی بڵاوبێتـەوە ٥ شـانە هـەنگوینی تـەنکی سـوکی کـەم هەنگوین ٥ تەنکە هەوری بێ باران ٥ هەر شتێك سوكو بۆش بێ.

الهَفاف: سوکەڵەو گورجو گوڵ ٥ بـاڵی تیـژو تـەنك بـۆ فـڕین ٥ پۆشـاکی تـەنكو شـەفاف ٥ سێبەری سارد ٥ تراویلکەی درەوشاوە.

الهِفّـان: شـوێن پـێ ٥ دەگـوترێ: (جـاء علـى هفانـه): بەشـوێن پێـی ئـەودا هـات ڕێـچکەی ئـەوی هـەلگرتو بەشوێنی دا هات.

اليهفوف من الرجال: پیاوی بێ ڕەحمو دڵ رەق ٥ گێـــــڵو ئەحمـــــەق ٥ ترسنۆك ٥ زەوی چۆڵ.

هَفَكَ الشَّيْءَ: شتەکەی فڕێ دا.

تهفك: لەڕۆیشتن دا نارێكو پێك بـوو خـــوارو خـــێچ ڕۆیـــی ٥ زۆر هەڵخلیسکاو قاچی تێك باهەڵدران.

المُهَفَّـكُ مـن الرجـال: کەسێـك زۆر هەڵەبکاو شتی لـێ تێك بچێ.

الهَيْفَك من النساء: ئافرەتی گێل.

هَفهَـفَ: جەسـتەی ڕێـكو شـوش بـوو تالێی بڕوانی جوانی لـێ بتکێ.

هفهف الشَّيْءَ: شتەکەی جوڵانـدو پـاڵی پێومنا.

المُهَفْهَـفُ: قـەدباریك ٥ ورگ بـچکۆلە ٥ (وهي مُهَفْهَفَةٌ).

الهَفْهَاف: بـەمانا (المُهَفْهَفُ) دێ ٥ تینـو ٥ باڵی تیژو تەنكو سوك بـۆ فـڕین ٥ پۆشاکی تەنکی شەفاف.

هفاني المشي هَفْواً وهفواناً: پەلـەی کـرد خێـرا خێـرا هـەنگاوی هـەڵێنان ٥ دەگـوترێ: (هفـا الظبـيُ): ئاسـکەکە سـوك بـوو رایکـردو بـازی دا.

**هفا الطائر:** باڵندەکە باڵی لێك دانو فڕی.

**هفا فلان:** فلانکەس کەوتە خوار ٥ هەڵەی کرد ٥ برسی بوو.

**هفت الريحُ:** بایەکە هەڵی کرد.

**هَفَت الريحَ بالشَّيْئِ:** بایەکە شتەکەی جوڵاندو بردی، رایدا.

**هَفَتْ الريحُ بالمطر:** رەشەبایەکە بارانەکەی دوورخستەوە.

**هَفَتْ النفس الى الشَّيْئِ:** نەفسو ئارەزۆکە حەزی لەشتەکە بوو بۆی کورکاند ٥ بۆی هەڵپەڕیو کەوتە رەقص و سەما.

**هفا القلبُ:** دڵ کەوتە کوتەکوت، دڵەکە لێی دا.

**هفا الشَّيْئُ في الهواء هَفْواً وهُفُواً:** شتەکە بەحەواوە رۆیی ٥ کەوتە حەواو رۆیی.

**هافاه:** هێنایە سەرهەواو هەوەسی خۆی.

**الهافية من الإبل:** حوشتری گوم بوو.

**الهفا:** باران تاوێك دەباریو خۆش دەکاتەوە.

**الهَفَاءُ:** هەڵەو تێکەوتن.

**الهَفَاة من الرجال:** پیاوی گێلو نەحمەق.

**الهفوة:** بەمانا (الهَفَاءُ)دێ ٥ هەڵەکردنو تێکەوتن.

**الهَقْبُ:** پانو پۆڕ.

**الهِقَبُّ:** گەورو فراوان کەبتوانێ هەمووشتێك قوت بدا جەستە گەورە ٥ قەبارە گەورەو درێژ ٥ دەگوترێ: (نعام هِقَبٌ).

**هَقَعَ الفَرَسَ بين أذنيه هقعاً:** نێوان دوو گوێی ئەسپەکەی داخ کرد.

**إهتقع الحمى فلاناً:** لەرزو تا کە رۆژێك لەکۆڵ فلان بۆوەو رۆژی دوایی بۆی هاتەوە بەخەستی گرتیەوە.

**إهتقع فلاناً عرق سوء:** رەگەزو رەچەڵەکی خراپ بوونە هۆی ئەوەی فلان پلەی رێزو شکۆمەندی بەدەست نەهێنێ.

**اهتقع لون فلان:** رەنگی فلانکەس لەترسان گۆڕا ٥ رەنگی زەرد هەڵگەڕا.

**إنهقع فلان:** فلانکەس برسی بوو سکی تێك قبوت.

**تَهَقّع الرجل:** فلانکەس کاری ناشیرینی ئەنجام دا.

**تهقع علينا:** خۆی بەزل زانیو فیزی بەسەرمان دا کرد ٥ هەڵسو کەوتی ناشیرینی بەرامبەرمان ئەنجام دا.

**تهقَّعَ القومُ ورداً:** خەڵکەکە هەموویان تێکڕا چوونە سەر ئاوەکە نۆرەو سەرەیان تێك دا.

**الهُقاعُ:** بێ ئاگایی‌و غافڵبونێکە توشی مرۆڤ دەبێ لەئاکامی خەفەت‌و نەخۆشییەوە.

**الهَقِعُ:** حەریص‌و سوور بوو لەسەر کارێك ٥ ئەسپی داخ کراو.

**الهَقْعَةُ:** کەوانەیەکە بەنەندازەی پاژنەپێی سوار ٥ خاڵێکی سپییە لەتەنیشتی چەپی ئەسپ ٥ سێ ئەستێرەن لێك نزیکن لەسەروی ئەستێرەی (الجَبّار)وەن کە مەنزڵێکە لەمەنزڵەکانی مانگ.

**الهُقَعَةُ:** کەسێك خوی بەوەگرتبێ لەناو خەڵك دا شان دابداو رابکشێ؟.

**الهَیْقَعَةُ:** لاسایی کردنەوەی دەنگی شمشێر لەشەڕدا ٥ لەسەرشتێکی وشك بەشتێکی وشك بکێشی، وەکوو ئەوە شتێك بەئاسن بکێشێ بۆنەوەی زرینگەی لێ بێ ٥ لاسایی کردنەوەی دەنگی پێکێشان‌و لێدانی شتە بەگشتی.

**هَقِفَ هَقَفاً:** ئارەزوی خواردنی نەما.

**الهَقَفُ:** کەمبوونەوەی ئارەزوی خواردنی خۆراك.

**هَقَّ هَقّاً:** هەلات بەترساوی‌و زەندەق چوویی ٥ دەگوترێ: (هَقّت الکلابُ منا).

**تَهَقَّلَ:** بەهێواشی‌و لەسەرەخۆیی رۆیی.

**الهاقِلُ:** مشکە نێرە.

**الهَقِلُ:** برسی.

**الهِقْلُ:** درێژ، درێژ داوەڵ ٥ بێچوە نوعامە.

**الهِقِلْسُ:** بەدخو، ئادەمیزادی بەدخو ٥ ڕێوی ٥ (ك: هقالِس).

**هَقِمَ هَقَماً:** زۆری برسی بوو، زۆری خوارد (فهو هَقِمٌ).

**تَهَقَّمَ العَدُوَّ:** دوژمنەکەی شکاند.

**تَهَقَّمَ الطعامَ:** پاروی گەورەی یەك لەدوای یەکی قوت دان.

**الهَیْقَمُ:** زۆر خۆر ٥ دەریای فراوان‌و قوڵ.

**الهَیْقَمُ:** دەریای فراوانی قوڵ ٥ لاسایی کردنەوەی دەنگی شەپۆل‌و تێکەوە هاویشتنی دەریا ٥ دەنگی قوتدانی پارو.

**الهَیْقَمانی:** شتی درێژ، هەرشتێك بێ.

**هَقْهَقَ الرجلُ:** پیاوەکە خێرا ڕۆیی‌و وڵاخەکەی ماندو کرد.

**الهَقْهَاقُ:** ئەوکەسەی لەنیشەکانی دا سەرکەوتوو نەبێ‌و تێ بشکێ.

**هَقّى فلان هَقیاً:** فلانکەس وڕێنەی کرد، زۆری گوت.

**هقى فؤادُه:** دەرونی کورکاندی.

**هقى فلاناً:** بەجۆرێك باسی فلانی کرد

پێی ناخۆش بێ ٥ قسەی ناشیرینی ناڕاستەکرد، بۆی هەڵبەست.

أهتى: دایوەشاند، رزاندی، خراپی کرد.

هَكَبَ فلاناً: گاڵتەی بەفلان کرد.

هَكَدَ: تینی بۆقەرزدارەکەی هێنا ٥ دەشکوترێ: (هَكَّدَ علی غریمه).

هَكِرَ هَكَراً وهَكَراً: زۆر سەرسام بوو ٥ هەنوزی هاتو خەو سواری شانی بوو لەپەل‌و پۆی خست، لەشی خاو بۆوە.

هَكَرَ الرجلُ: زۆری خەو هاتو لەتاو خەو هۆشی نەما.

تَهَكَّرَ: سەرسام‌و مەدهۆش بوو.

هَكَعَ هكوعاً: ئارامی گرت‌و دامەزراو جێ نشین بوو.

هَكَعَ البقر ونحوه تحت الشجر: رەشەوڵاخەکە لەبەر گەرمای زۆر چووە ژێر سێبەری درەختەکە.

هَكَعَ فلان الى القوم: فلانکەس شەوی بەسەر دا هات‌و خۆی کرد بەمیوانی قەومەکە.

هَكَعَ الى الأرض: خۆی بەزەوی دا دا.

هَكَعَ العظمُ: ئێسقانەکە دوای یەکگرتنەوەی هەمدیسان شکایەوە.

هَكَعَ الليلُ: شەو بەتاریکی خۆی دونیای داپۆشی.

هَكِعَ فلان هَكعاً: فلانکەس بەدانیشتنەوە خەوی لێ کەوت.

هَكِعَ الرجلُ هَكَعاً: پیاوەکە دادوفیغانی کردو خۆفی لێ نیشت ٥ لەخەم‌و خەفەت یان لەڕق هەستاوی خۆی دا سەری داخست.

إهْتَكَعَ الرجلُ: پیاوەکە دادوفیغانی کرد، ترسا خۆفی لێ نیشت.

اهتَكَعَ الحُمَّى أو غيرها فلاناً: لەرزوتا یان خەم‌و خەفەت بۆ فلان گەڕایەوە.

الهُكاعُ: کۆکە ٥ نووستنی دوا ماندوبوون.

الهَكَعَةُ: گێل‌و نەحمەق.

الهُكَعَةُ: بەمانا (الهَكَعَةُ)دێ.

هَكَّت البئر هَكاً: بیرەکە تێك روخا.

هَكَّ فلاناً: فلانکەسی ماندو کرد.

هَكَّ فلاناً بالسيف: بەشمشێر فلانکەسی زامارکرد ٥ زێدەڕۆیی کرد لە بریندار کردنی دا.

هَكَّ اللَّبَنُ: شیرەکەی دۆشی‌و زێدەڕۆیی کرد لەدۆشینی دا.

هَكَّ الشَّيْءَ: شتەکەی بەردایەوە، هەڵیوەراند ٥ وردو هاڕی کرد.

هَكَّ النبيذُ فلاناً: سرکەکە فلانی سەرخۆش کرد.

هَكَّ النجارُ الخرق: دارتاشەکە کونەکەی گەورە کرد.

**إنهَكَت المرأةُ:** ئافرەتەکە بەناخۆشی منداڵی بوو.

**إنهَكَ صلا المرأة:** پزدانی ئافرەتەکە لەکاتی منداڵبوون دا دڕا ٥ هاتە دەر.

**إنهَكَ البعيرُ:** حوشترەکە لەکاتی پیخ دانی دا بەزەوییەوە نووساو خۆی پان کردەوە.

**تَهَكَّكَ:** چەواشە بوو، چڕژا.

**تَهَكَّكت الأنثى:** مێینە ئاوسەکە ورگی داکەوت ٥ مەمکی یان گوانی گەورەبوون ٥ نزیك بوو سکەکەی دابنێ، بزێ.

**المَهْكوك:** قسەتڕن ٥ کەسێك قسەی ناشیرین بکا.

**الهَكّ:** عەقڵ تێکچووو، خەرەفاو ٥ بارانی بەلێزمەو خوڕەم.

**الهَكّاك:** کەسێك قسەی خۆی بەلاوە ڕاست بێو وابزانێ هەرخۆی لەسەر حەقە، لەواقعیش دا وانەبێ.

**الهَكوكُ:** دەم پیس و زمان شڕو قسە تڕن ٥ لاوازو کاڵفام ٥ ولاخێك زەحمەتی لێ کرابێ و لەڕۆیشتن دا ماندووبووبێ.

**الهَكَوَكُ:** قەڵەو ٥ شوێنی ڕەق و پتەو.

**الهَكيكُ:** نێرەموك ٥ ژنانی.

**هَكَلت المرأة:** ئافرەتەکە بەلەنجەو لار ڕۆیشت.

**تهاكَل القومُ:** خەڵکەکە لەکارەکەدا کەوتنە کێشەوە.

**هيكَل الزرعُ:** کشتوکاڵەکە گەشەی کردو بەرز بۆوە.

**الهَيْكَلُ:** قەبارەی گەورە ٥ دەگوترێ: (فرس هيكل): ئەسپێکی قەبارە گەورەیە ٥ هەر درەخت و ڕووەکێك گەشە بکاو بەرز بێتەوە ٥ خانوو باڵەخانەی بەرز ٥ بتخانە ٥ عیبادەتخانەی جولەکە خانوی گەورەو پیرۆز یان شوێنێکە لەپێشی کەنیسە قوربانی تێدا سەردەبڕن ٥ خانوی گەورەو ڕازێندراوە لەناوەوە کەتایبەت دەکرێ بۆ پەرستنی خوداکان وەکوو لەلای میصرییە کۆنەکان و ئیغریقییەکان و بابلی و ئاشوورییەکان و ڕۆمانییەکان باو بووە ٥ جولەکەکانیش ئەم داب و نەریتەیان هەبوو.

**الهيكل العظمي:** کۆی ئەو ئێسقانانەی جەستە یان لێ پێك دێ.

**الهَيْكَلَةُ:** ئافرەتی جەستە گەورەو کەتە.

**هَكَّمَ فلاناً:** گۆرانی بۆ فلانکەس گوت ٥ نارۆکەی بۆ گوتن.

**تَهَكَّمَ فـلان:** فلانكەس گۆرانی گوتن‌و ورینگە ورینگی هات ٥ دەگوترێ: (تَهَكَّمَ لفلان): گۆرانی بۆ فلان گوت ٥ قسەی بۆ خۆی کرد ٥ خۆی بەزلزانی‌و تەکەببوری کرد ٥ لەکردارەکەی خۆی ژێوان بۆوە.

**تهكمت السماءُ:** ئاسمان بارانی زۆری باراند.

**تَهَكَّمَت البئرُ:** بیرەکە تێك روخا.

**تَهَكَّمَ فلاناً:** گاڵتەی بەفلان کرد بەچاوی سوك سەیری کرد.

**تَهَكَّمَ فلاناً:** بەشمشێر لێی دا بریندار کرد.

**اسْتَهكَمَ:** خۆی بەزلزانی‌و لوتبەرزی نواند.

**الأهكومة:** گاڵتە پێکردن.

**الهَكِمُ:** شەڕەنگێزو خۆتێهەڵقورتێن لەهەموو شتێك بەبێ ئەوەی پەیوەندی بەوشتانەوە هەبێ.

**تَهَكَّنَ:** ژێوان بۆوە ٥ دەگوترێ: (تهكن على الأمر الفائت): پەشیمان بۆوەو پەنجەی خۆی گەزی لەسەر کاری رابردو.

**هَاكَاهُ:** بەکەم عەقڵی لەقەڵەم دا وای دانا عەقڵی بچوك بێ.

**هَلَبَ الفرسَ هَلباً:** تاڵە مووە ئەستورەکانی ئەسپەکەی هەڵکێشا.

**هَلَبَ فلاناً بلسانه:** تانەو تەشەری لەفلانکەس دا زۆری شتی ناشیرین پاڵ دا.

**هَلِبَ هَلَباً:** تووکی زۆر بوو.

**هَلِبَ العامُ:** ساڵەکە بارانی زۆر بوو (فهو أهلب وهي هَلْباء).

**أهْلَبَتْ السماءُ القومَ:** ئاسمان بەشەونم یان بەباران خەڵکەکەی تەڕکرد.

**هَلِبَ الفرسُ في عدوه:** ئەسپەکە لەبازدان دا شوێنی کەوت.

**هَلَّبَ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (هَلَبَ)دێ.

**إهْتَلَبَ السيفَ من غمده:** شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا.

**الهَالِبُ:** ڕۆژی بارانـاوی ٥ دەشگوترێ: (ليلة هالِبة) ٥ (ك: هوالب).

**الهُلابَةُ:** (غُسالة السِّلى): شەڕەخۆر، خوێری.

**الهُلْبُ:** تاڵەموی ڕەق‌و ئەستور ٥ موی کلك ٥ موی برژانگ.

**الهُلْبَةُ:** ئەو تاڵە مووانەی لە کلك‌و یالی وڵاخەبەرزە هەڵبکەنـدرێ ٥ لەخوار ناوکەوە تانزیك شەرمگا ٥ تاڵەموی بەراز کەشتی پێ کون دەکرێ.

**هُلْبَةُ الشهر:** کۆتایی مانگ ٥ (هُلْبَة الشتاء): جەنگەی سەرمای زستان.

**الهَلاَّبُ:** ڕۆژی بارانـاوی ساڵی تەڕو

تـوشو زۆر بـاران ◦ ڕۆژی ڕەشـەبا ◦ ساڵی وا ڕەشـەبای زۆر بـێ ◦ هـەوای ساردو بارانی زۆر.

**الهَلاَّبَةُ:** ئافرەتێك خۆی لای مێردەكەی خۆشەویـست بكـا هەرمێردەكـەی خۆش بوێ ◦ ڕەوشتی جوان.

**الهُلاَبِـجُ:** گێـلو ئەحمـەق ◦ زۆر گێـلو نەفام ◦ شتی بێ كـەڵك ◦ زۆر خـۆر، ئـاو خـۆرەوەی زۆر ◦ مرۆڤـی ڕەزا گران .مرۆڤی قـونگرانو قـەبارە زل ◦ كانی شەڕو شەڕەنگێزی.

**هَلَـتَ الـشَيْئَ هَلْتـاً:** شـتەكەی سپی كـرد توێكڵی لـێ كردەوە ◦ دەگوترێ: (هَلَتَ الجلدَ): پێستەكەی سپی كرد.

**الهَلْتاتُ:** كۆمەڵە مرۆڤێك لەشوێنێـك نیشتەجێ بن.

**الهُـلاثُ:** لـەش داهێـزان ◦ شـلبونەوەی ماسـولكەو مانـدو بونێـكە توشـی ئادەمیزاد دەبێ.

**الهَلاثَث:** خوێڕیو هەتیو مچە.

**الهَلْثـی:** كۆمەڵێـك خـەڵك دەنگیـان بەرز بكەنەوە.

**هَلَـجَ هَلْجـاً:** هەواڵێـكی بـڵاو كـردەوە بۆخـۆی بـڕوای پـێ نـەبوو ◦ زۆری خەونی پڕو پوچو زڕە خەون بینین.

**أهْلَجَ الشَيْئَ:** شتەكەی شاردەوە.

**أهْلَجَ الخَبَـرَ ونحوه:** هەواڵەكـەی بەتـەمو مزاوی بڵاو كردەوە.

**الهـالِجُ:** كەسێـك زۆر خـەون ببینـێو لێكیان جیانەكاتەوە.

**الهَلْجُ:** خەوی سوك ◦ هەواڵی نامەعلوم ◦ خەونی پڕوپوچ.

**هَلَـدَ المرضُ النـاسَ هَلْـداً:** نەخۆشـییەكە هەموو خەڵكەكەی گرتەوە.

**هَلَـسَهُ الـداءُ او الحـزن هَلْـساً وهلاسـاً:** دەردەكـــە كـــزو لاوازی كـــرد ◦ نەخۆشـــییەكە عـــەقڵو هۆشـــی تێكداو وڕێنە دەكا.

**هُلِـسَ هُلاسـاً:** ڕوت بـوو ◦ كیفەكـەی لـــێداماڵدرا ◦ خـــواردنی خـــواردو كاریگەری نەبوو بەسەر جەستەیەوە ◦ عەقڵی نەما ◦ (فهو مهلوس).

**أهْلَسَ:** پێـكەنی، ناو ناوە پێـكەنی.

**أهْلَسَ الشَيْئَ:** شتەكەی شاردەوە، شوێن بـزری كـرد ◦ دەگـوترێ: (أهْلَـسَ الحديث، وأهلس فيـه وأهلـس اليـه): بەسركە قـسەی بۆكرد، بەنەسپایی قسەی لەگەڵ دا كرد.

**أهْلَسَ الظـلامُ:** تاریكییەكـە ڕەوییـەوەو كەمی كرد.

**هَالَسَه:** قسەی نهێنی لەگەڵ دا كرد.

**هَلَّسَ:** بۆ موبالەغە لەمانای (هَلَس)دی.

**إهْـتَلَسَ المـرضُ فلانـاً:** نەخۆشـییەكە فلانكەسی لاواز كرد.

**امْتُلِسَ عقل فلان**: عەقڵی فلان نەما، عەقڵی لانەما.

**الهالِسُ**: جەستە بچوك‌و چوست ٥ (ك: هوالس).

**الهُلاسُ**: شێوە نەخۆشییەکە وەکوو سیل وایە کوشندەیە، نەخۆشی سیل بەهۆی کزی‌و لاوازییەوە.

**الهَلْسُ**: بەمانا (الهُلاسُ) دێ ٥ کزو لاوازیی جەستە ٥ وڕێنەو قسە بزرکاندن بەهۆی دەردی کوشندە یان خەم‌و خەفەتی زۆرەوە.

**الهابِطُ**: ورگ شۆڕبۆوە.

**هَلِعَ هَلَعاً شديداً**: داغ‌و خەفەتی زۆری دەربڕی ٥ (فهو هَلِعٌ وهي هَلِعَةٌ وهو وهي هلوع) ٥ قورئان دەفەرموێ: (ان الإنسان خلق هَلُوعاً) ٥ هەروا وشەی (هَلِعَ) بەمانا بەخیل بوو، برسی بوو دێ.

**الهَالِعُ**: نوعامەی سرك‌و خۆشڕۆ لەڕۆیشتن دا ٥ دەگوترێ: (نعامة هالِعٌ).

**الهُلاَعُ**: ترس‌و لەرزی کاتی روبەڕوبوونەوەی دوژمن.

**الهُلَعُ**: زۆر بەتەماع‌و چاو چنۆك ٥ دادو فیغانکەرو هاتوهاوار کەر.

**الهُلَعَةُ**: بەمانا (الهُلَعُ)دێ.

**الهِلْواعُ**: دەگوترێ: (ناقة هِلْواعٌ) حوشترێکی خۆشڕۆیە ٥ گورج‌و گۆڵە، چوستە، جڵەو نەرمە ٥ یان کەمێك چەموشە.

**الهَوْلَعُ**: هاتوهاوار کەر ٥ خۆشڕۆ.

**الهَوَلَّعُ**: زۆر تیژڕەو.

**الهِلَّوْفُ**: قونگران‌و تەمبەڵ ٥ تەبیات وشك ٥ ریشی پان‌و پڕو درێژو ژاکاو ٥ زۆر درۆزن ٥ تەمبەڵ‌و تەوەزەل‌و بێ کارە ٥ پیری خەرەفاو ٥ رۆژی هەورو هەلا ٥ پیرە حوشتری کوڵك زۆر.

**الهِلَّوْفَةُ**: پیرەژن ٥ ریشی پان‌و درێژو پڕ.

**هلقم الشَيْءَ**: شتەکەی قوت دا.

**الهِلْقامُ**: شەویلە پان ٥ زۆر خۆر ٥ کەتەو زەبەللاح ٥ درێژ ٥ ریش سپی‌و پیاو ماقوڵی هۆز کە قورسایی باری کۆمەڵایەتی قەومەکەی هەڵدەگرێ ٥ صوڵح‌و خوێنبەستیان بۆدەکا.

**هلك فلاناً هلاكاً وتهلكةً**: فلانکەس مرد.

**أهْلَكه**: وای لێکرد بەهیلاك بچێ.

**أهْلَكَ مالَهُ**: ماڵ‌و سامانی خۆی خەرج کرد ٥ فرۆشتی ٥ لەناوی برد.

**هَلَّكه**: بەمانا (أهلكه)دێ.

**هَلَّكَ فلان فلاناً**: فلانکەس فلانکەسی لەناو برد.

**إهتلك الطائرُ:** باڵندەکە باڵی لێك دانو هەوڵی دا تیژ بفڕێ.

**إهْتَلَكَ المنتجعُ:** ڕێبوارەکە ڕێگای لێ تێکچوو.

**تهالك على الشيْئ:** بەحەماسو جۆشەوە ڕوی کردە ئیشەکە.

**تهالك فلان على الفِراش:** فلانکەس بەحەزێکی زۆرەوە خۆی خستە سەر جێگای نوستنەکەو خەپ بوو.

**تهلكت المرأة في مشيها:** ئافرەتەکە لەڕۆیشتنی دا خۆی باداو لارو لەنجەی کرد لەئەنجامدانی.

**تَهَلّكت في مشيها:** ئافرەتەکە بەجۆشو خرۆشەوە کەوتە ڕێو لارو لەنجەی کرد، خۆی بادا.

**تَهَلَّكَ في المكان:** بەسەر لێ شێواوی سوڕایەوە.

**تهلّك في الأمر:** لەکارەکە سەرسام بوو.

**استهلك في كذا:** خۆی لەوشتەدا ماندو کرد زۆر سەعیو کۆششی کرد.

**استهلك المالَ ونحوه:** ماڵو داراییەکەی بەخشی.

**المَهْلَكة:** دەشتو چۆڵەوانی ٥ سارا ٥ (ك: مهالك).

**الهالِكة:** نەفسی چڵێسو برسیو چاوچنۆك ٥ هەور باران ببارێنێو دوایی لێی نەبارێ.

**الهَالِكيّ:** ئاسنگەر ٥ شمشێر.

**الهالوك:** ڕوەکی گیاکەڵە؛ ڕوەکێکی گوڵدارە لەڕوەکی تەڕەوە دەهاڵێ، وەك مشەخۆر دەژی لەسەر ڕەگی ڕوەکی تەماتەو باینجانو فولو توتن، تۆوی ئەم ڕوەکانە لەپاڵ ڕومکی تەڕەوە نەبێ ناڕوێ.

**الهُلاّك:** (هلاّك الناس): هەژارو سواڵکەر ٥ ڕێبواری ڕێ لێ گوم بوو.

**الهَلَكُ:** باقی ماندەی شتی لەناوچوو پۆلکاوو ڕزیو ٥ نێوان بناری کێوو سەرانسەری کێو ٥ بۆشایی نێوان دووشت ٥ هەرشتێك لەسەرەوە رابکەوێتە خوار.

**الهَلْكَةُ:** ساڵی قاتو قڕی ٥ (ك: هَلَكٌ وهَلَكات).

**الهِلْكَةُ:** ئادەمیزادی خوێڕیو هەتیومچە.

**الهَلَكون:** زەوی سوتەمەڕۆو بێ بەرو بووم هەرچەندە ئاویشی تێدابێ ٥ دەگوترێ: (أرض هلكون، وأرضون هلكون).

**الهَلُوك من النساء:** ئافرەتی خوێڕیو هیچو پوچ.

**الهيلكون:** داسو ماراغانی گیا درونەوە.

**الهِلّكسُ:** ڕەوشت نزم.

**هَـلَّ الهِـلالُ هـلاً:** مـانگ، مـانگی یـەك شەوە دەرکەوت.

**هَلَّ فلان:** فلانکەس کەیف خۆش بوو.

**هَلَّ الشهرُ:** مانگی یەکشەوە دەرکەوت.

**هَلَّ المَطَرُ:** بارانەکەی بەخوڕەم باری.

**هَـلَّ الـسحابُ:** هەورەکـە قـەترە بـارانی گـەورەی بارانـد دەنگـی بارینەکـەی دەبیسرا.

**اَهَـلَّ الرجـلُ:** پیاوەکـە سـەیری مـانگی یەکـشەوەی کـرد ٥ بۆمـانگی یەکـشەوەی ڕوانـی ٥ دەشـگوترێ: (أهْلَلْنا عن لیلة کذا): مانگمان بینـی مانگی یەکشەوەمان دی.

**أهلّ الشهرُ:** مانگەکە مانگی یەکشەوەی دەرکەوت.

**اَهَـلَّ فـلان:** فلانکـەس دەنگـی بەرزکردەوە.

**اَهَـلَّ الـصبِيُّ:** منداڵەکـە گریـا، کەلەدایکبوو گریا.

**اَهَلَّ الملبّی:** ئیحرام بەستووەکە (لبیـك اللهم لبیك)ی گوت.

**اَهَلَّ الرجلُ بذکر الله:** پیاوەکە بـەیادی خودا دەنگی بەرزکردەوە.

**اَهَلَّ الـسیفُ بفـلان:** شمـشێرەکە چووە ناو گۆشتی فلانەوە.

**اَهَـلَّ الکلـبُ بالـصَّیْدِ اذا امـسکه:** سـەگەکە کەنێـچیرەکەی گـرت فروسکاندی بۆئـەوەی خاوەنەکـەی بزانێ کەنێچیری گرتووە.

**اَهَلَّ الذابِحُ:** کوشتی سەربڕەکە لـەکاتی قوربانی سەربرینەکەدا (الله أکبر)ی کـردو دەنگـی بـەرزکردەوەو نـاوی قوربانی بۆکراوەکەی هێنا.

**اَهَـلَّ فـلان الهِـلالَ:** فلانکـەس لـەکاتی دیتنی مـانگی یەکشەوەدا بـەدەنگی بـەرز یـادی خـودای کـردو زیکـری تایبەتی خوێند.

**اَهَـلَّ الـشهرَ:** مـانگی یەکـشەوەی مانگەکەی بینی.

**اَهَـلَّ اللهُ الـسحابَ:** خـودا هەورەکـەی والـێ کـرد بـاران ببارێنـێ ٥ دەشگوترێ: (أهَـلَّ الله المطـرَ): خـودا بارانی باراند.

**هالَّ الأجیرَ هلالاً:** کرێکارەکەی بەمانگ بـەکرێ گـرت لەیـەکی مانگـەوە بۆیـەکی مـانگ بەکرێیـەکی دیاریکراوی مانگانە.

**هَلَّلَ الرجـلُ:** پیاوەکە (لا إلـه إلاَ الله)ی گـوت ٥ هێرشـی بـۆ بەرامبەرەکـەی بـرد پاشـان لێـی ترسـاو هـەڵات ٥ دەشـگوترێ: (هَلَّلَ عنه): لێـی ترسـاو هەڵات.

**هَلَّلَ عن الأمر:** لەکارەکە دواکەوت.

**هَلَّـلَ الفـرسُ ونحـوه:** ئەسپەکە پـشتی

کەوانە بۆوە ◦ پشتی وەکوو مانگی یەکشەوەی لێ هات لەبەر لاوازی.

**اهْتَلَّ السحابُ والوجه:** هەورەکە بریسکەی دا، دەمو چاوەکە درەوشایەوە.

**اهْتَلَّ المطرُ ونحوه:** بارانەکە بەخوڕەم باری.

**اهْتَلَّ الرجلُ:** پیاوەکە ددانی خۆی لەجیڕەوە بردن ◦ لەڕقان ددانی لێك خشاندن لەجیڕەوەی بردن.

**إنهلَّ المطرُ:** بارانەکە بەخوڕەم باری ◦ دەگوترێ: (إنهلَّ الدمع): فرمێسکی ڕژان ◦ (وانهلّت السماءُ وانهلت العينُ): چاوەکە فرمێسکی ڕژان.

**تَهَلَّلَ السحابُ والوجه:** بەمانا (إهتلّ)دێ، دەگوترێ: (تهلّلَ الوجهُ فرحاً وتهلّلَ السحابُ بالبرق): دەمو چاوەکە درەوشایەوە ◦ هەورەکە بریسکەی دا.

**تهللتِ العينُ:** چاو فرمێسکی ڕژان ◦ دەشگوترێ: (تهلّلَ الدمعُ).

**استَهَلَّ الصَّبِيُّ:** منداڵەکە لەکاتی لەدایکبوون دا گریاو دەنگی بەرز کردەوە.

**استَهَلَّ الشهرُ:** مانگەکە مانگی یەکشەوەی دەرکەوت ◦ دەشگوترێ: (استهللنا الشهرَ): چوینە سەرەتای مانگەوە ◦ دەستمان بەمانگی تازە کرد ◦ یان مانگی یەکشەوەی مانگمان بینی.

**استهلَّ المطرُ:** بارانەکە بەخوڕەمو لێزمە باری.

**استهلت العينُ:** چاوەکە فرمێسکی ڕژاند.

**استهلّ الوجهُ:** دەمو چاوەکە گەشایەوە.

**استهلّ فلان الهلالَ:** فلانکەس لەکاتی بینینی مانگی یەکشەوە دەنگی بەزیکری تایبەتی بەرزکردەوە.

**استهلَّ السيفَ:** شمشێرەکەی لەکالان دەرکێشا.

**اسْتَهَلَّ الهِلالُ:** مانگی یەکشەوە دەرکەوت.

**الإسْتِهْلال:** (براعة الإستهلال): ئەوەیە نووسەر یان شاعیر لە سەرەتای نووسینو شیعرەکەیانەوە ڕستەو وشەگەلێك دابنێن ئاماژەیەکی زیرەکانەو وردەکاریانەی تێدابێ بۆ ناوەڕۆکی کتێبەکە یان هی چامە شیعرییەکە.

**الأهاليل:** باران.

**المُهَلَّلُ:** دەگوترێ: (حاجبٌ مهلّل): بڕۆی کەوانەیی ◦ (ناقة مهلّلة): حوشتری لاوازو قەدباریك.

**الهَلَلُ:** سەرەتای باران.

**الهِلالُ**: مـانگی یەکـشەوە ☾. رونـاکی مـانگ تـارۆژی حەوتـەم ٥ مـانگ لەکۆتایی دا لەشەوی بیستو شـەش بـەولاوە تاکۆتـایی ٥ ئـاوی کـەم لەبنکی بیردا ٥ تاوە باران ٥ تـەپو تـۆز ٥ حوشـتری لـەرو لاواز ٥ مـار ٥ نێرە مار ٥ توێژی مار ٥ هەرشتێـك وەکوو مانگ روخساری جوان بێ ٥ وەکوو کورو کچی تـازە پێگەیشتوو یان لەشێوە دا وەك مانگی یەکشەوە وابێ ٥ وەکوو سپیایی بنکی نینۆك ٥ لایەکی بەرداشی شکاو ئەو پارچە ئاسنە یان پارچە دارەی کەهـەردوو لای کەژاوەکـەی پـێ لێـك دەدرێ ٥ نووکـە رمـب کـەدوو فـاق بـێ بـۆ گرتنـی نێـچیر ٥ نیـشانەکردن بـە داخێـك کـە نیوەکەوانـەیی بـێ ٥ کەرتـەنان ٥ قاشـە کالّـەك کـەنیوە کەوانـەیی بـێ ٥ ئـارمو شـیعاری هەنـــدێ لەدەوڵەتــــە بــــەناو ئیـسلامییەکان، هـەر لەسـەردەمی عوسمانییەکانـەوە تـا ئێـستا، ئـەم شێوە شیعارە شیعارێکی ئیسلامییە بەرامبـــەر شـــیعاری صـــەلیب کەهەندێ وڵاتی ئـەوروپاو خۆرئـاوا هەڵی دەکەن.

**الهَلُّ**: قوماشی تەنك ٥ موی باریك.

**الهِلّ**: دەگوترێ: (أتیته في هِـلّ الـشهر): لـــەکاتی دەرکـــەوتنی مـــانگی یەکشەوەی مـانگ دا هـاتم بـۆلای ٥ (إمرأة هِلّ): ئافرەتێکە یەك کراسـی پانو درێژی پۆشیوەو نازدەکا.

**الهَلَـلُ**: سـەرەتای بارانبـارین ٥ بـاران بەگشتی ٥ تـانو پـۆی جاڵجاڵۆکـە ٥ ترسو لەرز.

**هَـلاّ**: وشـەیەکە بـۆ هـەڵنانو دەنـەدان دەگـوترێ تایبەتــە بەرســـتەیەك بەفیعل دەست پێ بکا.

**الهُلّـــی**: فـــەرەحی دوای ناخۆشــیو چورتم.

**الهَلَّةُ**: بـەمانا (المِسْرجة)دێ: واتـە چـرا، شوێنی فتیلە.

**هَلَّة الشهر**: سەرەتای مانـگ ٥ دەگوترێ: (اتیته في هَلَّة الشهر): سەرەتای مانگ هاتم بۆلای.

**الهَلیلَة**: زەوییەك بـارانی لـێ باریبـێو دەورو بەری لێی نەباریبێ.

**هَلِمَ بغَیرِه هَلَماً**: بەشـتی تـرەوە نووسـا ٥ پێوە لکا.

إهتلَمَ به: بردی، رۆیاندی.

**الهُـلاّم**: شـۆربای سـیکباج کەچـەوری پێـوە نـەبێ ٥ مادەیەکـە پرۆتینـی شـەفافە لەئەنـسیجە جیاجیاکـانی حەیوان وەردەگیرێ.

**هَلُمَّ**: وشەیەکە بـەمانا (وەرە، حازربـە) دێ.

هَلُمَّ جرّاً: تەعبیرو دەربڕینێکە بۆ بەردەوام بوونو درێژە دان بەشت دەگوترێ.

الهِلْمانُ: زۆرینە لەهەرشتێك بێ.

الهَلِيمان: بەمانا (الهِلْمان)دێ، دەگوترێ: (رجع فلان بالهيل والهليمان): فلانكەس گەڕایەوە بەماڵو سامانێکی زۆرەوە.

هَلْهَلَ بفرسه: بەوشەی (هەل)و تێڕاخورین ئەسپەکەی لێ خوڕی.

هَلْهَلَ عن الشَيْئ: لەشتەکە گەڕایەوە.

هَلْهَلَ في الأمر: لەکارەکە دا چاوەڕوانی کردو تێفکرینی ئەنجام دا.

هَلْهَلَ النَسَّاجُ الثوبَ: جۆلاکە قوماشەکەی شاشو تەنك چنی.

هَلْهَلَ الطحينَ: ئاردەکەی بەشتێکی تەنك چنراو بێژت.

هَلْهَلَ الشَعْرَ: قژەکەی تەنك کرد ◦ یان قژەکەی جوان چاك نەکرد وازی لێ هێناو بەری دایەوە هیچ خزمەتی نەکرد.

هَلْهَلَ الصوتَ: دەنگەکەی دایەوە.

هَلْهَلَ الثوبَ: قوماشەکەی زۆر بەکارهێنا نزیك بوو بڕزێ ◦ دەشگوترێ: (هَلْهَلَ يدركه): نزیك بوو بیگاتێ.

تَهَلْهَلَ الثوبُ: قوماشەکە تەنك بوو خەریك بوو بڕزێ.

تَهَلْهَلَ القومُ: خەڵکەکە شوێن یەکتر کەوتنو بەدویەکدا هاتن.

الهُلاهِلُ: ئاوی زۆری صافو بێگەرد.

الهَلْهالُ: تەنكو زەعیف ◦ دەگوترێ: (ثوب هَلْهَالٌ وشَعْر هلهال).

الهَلْهَلُ: بەمانا (الهَلْهال)دێ ◦ ژەهری کوشندە ◦ قوماشی شاشو پاشو تەنك چنراو ◦ تەونی جاڵجاڵۆکە.

الهُلْهُلُ: بەفر.

المُهَلْهَلُ: بەمانا (الهَلْهالُ)دێ.

المُهَلْهَلَةُ: قوماشی زۆر خراپ چنراو ◦ شاشو پاش.

الهِليوم: جۆرە غازێکی زۆر ناوازەیە ◦ لەهەوادا هەیە.

الهِلْيَوْن: جۆرە ڕوەکێکە لەپێری (الزنبقية)یە، چەند جۆرێکی هەیە.

هَمَأَ الثوبَ هَمْئاً: قوماشەکەی ڕاتەکاندو دڕا.

أهْمَأَ الثَوْبَ: قوماشەکەی ڕزاند.

تَهَمَّأَ الثوبُ: قوماشەکە دارزاو ونجڕ ونجڕ بوو.

إنهَمَأَ: بەمانا (تَهَمَأَ)دێ.

الهِمْءُ: قوماشی ڕزیو.

هَمَتَ الثريدُ هَمْتاً: تێکوشاوەکە (تریتەکە) بەچەوری داپۆشراوە.

أهْمَتَ الكلامَ والضحك: قسەو

پێکەنینی شاردەوە.
هَمَجَتْ الإبل من الماء همجاً: حوشترەکە بینی بەئاوەکەوە دەمی لێ نەکردەوە تا تێراو بوو.
هَمِجَ فلانٌ هَمَجاً: فلانکەس برسی بوو.
أهْمَجَ الفرسُ: ئەسپەکە لەغارکردنو بازدان دا زۆری خۆماندوکرد.
أهْمَجَ الشَيْئَ: شتەکەی شاردەوە.
إهْتَمَجَ: بەهۆی گەرما یان شتی ترەوە لاواز بوو ٥ دەشگوترێ: (إهْتَمَجَ وجهه): دەمو چاوی سیس بوون.
الهَامِجُ: شتێك بەنارێکی وازی لێ بهێندرێ.
الهَمَجُ: مێشێك وەکوو مێشوله بچوکە بەدەمو چاوی مەڕو بزنو گوێدرێژەوە دەنیشێ ٥ مەڕو بزنی لاواز ٥ کۆمەڵە ئادەمیزادی هەرچیو پەرچی کەهیچ یاساو رێسایەك پەیڕەو نەکەن ٥ (ك: أهماجٌ) ٥ برسیەتی ٥ بەرێوەبردنی کاروباری ژیان بەنارێكو پێکی.
الهَمِيجُ: ورگ بچوك ٥ قەدباریك ٥ ئاسك کە توشی نەخۆشی بوبێو دەمو چاوی چرچ بوبنەوە.
هَمَدَ الشَيْئُ هَمْداً وهُمُوداً: شتەکە کپ بوو لاواز بوو ٥ دامرد ٥ دەگوترێ: (هَمَدَتْ النارُ): ئاگرەکە کوژایەوە ٥ یان گەرمایی نەما ٥ (هَمَدَ الرجلُ): پیاوەکە مرد ٥ خپ بوو بێدەنگ بوو.
هَمَدَتِ الأرض: زەوییەکە وشك بوو هیچی نەڕواند، هیچی لێ نەڕوا.
هَمَدَ الزرعُ: کشتوکاڵەکە فەوتاو نەما.
هَمَدَ الثوبُ: قوماشەکە بەهۆی زۆر پیچانەوەی رزی بوو کەدەستت لێ دا هەڵوەری.
هَمِدَ الثوبُ: بەمانا (هَمَدَ)دێ.
أهْمَدَ: بێدەنگ بوو، دامرکا ٥ دەگوترێ: ((أهْمَدَ فلان) فلانکەس لەو شتەی پێی ناخۆش بوو بێدەنگ بوو.
أهمدتِ الريحُ: بایەکە کەوت، نەما.
أهْمَدَ في المكان: لەشوێنەکە جێگیر بوو.
أهْمَدَ في السير: لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد.
أهْمَدَ قِرْنَهُ: رکەبەری خستو خپی کردو کوشتی.
أهْمَدَ النارَ: ئاگرەکەی کوژاندەوە.
الهَامِدُ من الاجسام: لەبواری کیمیاگەری دا گەری دا ئەوەیە جەستە کە نیشانی کیمیایی تێدا نەمێنێ ٥ دەگوترێ: (نبات هامد): روەکێکی وشکەوەبووە.
الهَامِدةُ: دەگوترێ: (ثَمَرَةٌ هامِدَةٌ):

میوەیەکی رەش بووی بۆگەنە ٥ (أرض هامدة): زەوی مردوو سوتەمەڕۆ ٥ قورئان دەفەرموێ: {وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ}.

**الهَمِيدُ**: بەمانا (الهامِدُ)دێ ٥ ماڵو کالایەك واگومان دەبرێ پیاومکە خاوەنیەتی، لەواقیعیش دا کەلکی پیوەنەماوەو فەوتاوە.

**هَمَدَ هَمَذاناً**: بەرۆیشتنێکی جوان رۆیی.

**الهَمَاذِيُّ**: رۆیشتنی خێرا ٥ حوشتری خۆشڕۆو گورج و گۆڵ ٥ جەنگەی گەرما ٥ جەنگەی باران بارین.

**الهَمَذانُ**: جوان رۆیشتن ٥ رەوتی جوان.

**الهَمَذانِيّ**: کەسێك نیسبەت بدرێ بۆلای هەمەزان، واتە هەمەزانی بێ ٥ دەشگوترێ: (رجل هَمَذاني): پیاوێکی زۆر بلێیە بەین بەین بێدەنگ دەبێ و دەست پێ دەکاتەوە ٥ (مشي هَمَذاني): رۆیشتنی تێکەڵ بەجۆرە رۆیشتنی تر.

**هَمَرَ الماءُ**: ئاوەکە هەڵڕژا ٥ (هَمَرَ الدمعُ): فرمێسکەکە ڕژان، دابارین ٥ دەشگوترێ: (هَمَرَ فلان): فلان رقی هەڵساو تورە بوو.

**هَمَرَ له من ماله**: لەماڵی خۆی بەشی دا.

**هَمَرَ الماءَ ونحوه همراً**: ئاوەکەی ڕشت.

**هَمَرَ ما في الضرع**: هەرچی شیری لەگوانەکەدا هەبوو هەمووی دۆشی.

**هَمَرَ الكلامَ وفي الكلام**: زۆری قسەکرد.

**هَمَرَ البناءَ**: باڵەخانەکەی روخاند.

**هَمَرَ الفرسُ الأرضَ**: ئەسپەکە پێکۆڵی کرد ٥ بەتوندی قاچی بەزەوی کێشا.

**هامَرَ الشيْءَ**: شتەکەی رادا.

**إنهَمَرَ الماءُ**: ئاوەکە بەزەخت هەڵڕژا ٥ (فهو مُنهمر).

**انهمَرَ بالكلام**: کەوتە قسەو زۆری گوت.

**انهَمَرَ البناءُ**: باڵەخانەکە روخا.

**إنهمَرَتْ الشجرةُ**: درەختەکە لەکاتی کوتانی دا گەڵاکەی هەڵوەری.

**إهْتَمَرَ الفرسُ**: ئەسپەکە رۆیی.

**إهْتَمَرَ الفرسُ الأرضَ**: ئەسپەکە بەتوندی قاچی بەزەوی کێشا، پێکۆڵی کرد.

**المِهْمَارُ**: زۆر بلێ، سوێر قسە ٥ دەگوترێ: (هو مهمار في كلامه): ئەو زۆر بلێ یە لەناخاوتنی دا هەردەڵێ و نایبڕێتەوە ٥ (مهمار لأضْيَافِهِ): روخۆش و دەست کراوەیە بۆ میوانەکانی.

**المِهْمَرُ**: بەمانا (المِهمارُ) دێ.

**الهامِرُ**: هەوری باراناوی.

**الهَمِرُ من الرجال**: پیاوی قەڵەوی کەتە

٥ هەروا وشەی (الهَمِرُ) بەمانا لەبو زیخی زۆر دێ.

الهَمِرَی: ئافرەتی زۆر بلێو فیزەکەرو دەمدرێژ.

الهَمْرَةُ: میرووی سیحر ٥ تاومباران.

الهَمَّارُ: هەوری باراناوی لافاو هەلّسێن ٥ پیاوی زۆر بلێ ٥ دەگوترێ: (رجل همار).

الهَمَـيْرُ: پیرێـزنی پۆلکـاو ٥ ئاسـکی جوانو جەستە تێرو پڕ.

هَمْرَجَ هَمْرَجَةً: قسەی هەڵەی کرد.

هَمْـرَجَ علیـه الخبرَ: هەواڵەکـەی لـێ تێکەڵو پێکەڵ کرد.

الهَمْرَجُ: قسەی تێکەڵو پێکەڵ.

الهُمْرُجانُ: هەڵەو شێواو.

الهَمَـرَّجُ: وازنەهێنـەر لـەکار، سووربوو لەسەر گەیشتن بە مەبەست.

هَمْرَشَ: جولا، کەوتە ڕێ.

الهَمْرَشَةُ: جمو جولّ.

تَهَمْرَشَ القوم: خەڵکەکە کەوتنـە جـمو جولّ.

الهَمَـرَّشُ: پیرێـزنی شـەپلە لێـدراو ٥ حوشتری بەشیر.

هَمَزَه هَمْزاً: چاوی لـێ دا گرت ٥ بەچاو نیـشارەی بـۆکرد ٥ دەشـگوترێ: (هَمَـزَه) پاشملـە غەیبـەتی کـرد ٥ لەڕێزی کەم کردەوە.

هَمَـزَ الفـرسَ بالمهمـاز: ئەسـپەکەی بەئاوزەنگی لـێ خوڕی.

هَمَزَ الشیطانُ الإنسانَ: شـەیتان ختوکـەی ئادەمیزادی داو شتی خستە دڵیەوە.

هَمَزَ: لێی دا.

هَمَـزَ الحرفَ: پیتەکـەی بـەدەنگی هـەمزە دەربڕی.

هَمَزَ الشَیْءَ: شتەکەی شکاند.

هَمَزَ به الأرض: بەزەوی دادا، خستی.

المِهْمَازُ: ئەوەی ولاخی پێ لـێ دەخوڕێ، ئاوەزەنگی.

المِهْمَزُ: بەمانا (المهماز)دێ.

المِهْمَـزَةُ: گـوتکی دەهـۆڵ، داری تـەپڵ ٥ (نـــەقیزە) دارێـــکە سەرێـــکی ئاسنێـکی دوفـاق سـێ فـاقی پێوەیـە لەگوێدرێژیـەوە دەژەنـی بۆئـەوەی خێرا بڕوا.

الهـــامِزُ: ڕەخنـــەگر، عـــەیبگر ٥ چـاوهەڵتەکێن ٥ پاشملـە باسـکردن بەخراپە ٥ (ك: هُمَّاز).

الهَمْزُ: (همز الشیطان): دەس لێومشـانی شەیتان، شێتی.

الهَمَزِی: (ریح هَمَزِی): ڕەشەبا کەدەنگی گەورەی هەبێ.

قـوس هَمَـزَی: کەوانێـکە پاڵپێوەنـانی بەهێزە ٥ تیر زۆر دڕۆیەنێ.

الهَمْـــزَةُ: شوێنێـــکە لـــەزەوی، چـاڵو

چـوێڵی نـاو ڕێـگا ٥ نـاو زەوی ٥ یەكەم پیتی هیجاو ئەبجەد.

همزات الشیاطین: ختوكەو وەسوەسـەی شەیاتینی.

الهُمَزَةُ: بەمانا (الهامِزُ)دێ ٥ بۆ نێرو مێ بەیەك شێوە دێ ٥ دەگوترێ: (رجل همزة وامرأة همزة).

الهَمّازُ: بەمانا (الهُمَزَةُ)دێ.

الهَمیزُ: (رجل همیز الفـؤاد): پیاوێـكی زیرەكو وریایە.

هَمَـسَ هَمْـسا وهموسـا: شـەوڕەوی كـرد بەبێ وەستان ٥ بەدزیەوە ڕۆیی.

هَمَـسَ فـلان الی فـلان هَمْـساً: فلانكـەس بەسـرتەو بەئەسـپایی قـسەی لەگـەڵ فـلان كـرد بەجۆرێـك لـەوەبوو لێـی حاڵی نەبێ.

هَمَسَ الشیطان: شەیتان ختوكەی دەرونی فلانی دا.

هَمَـسَ الكـلامَ: قـسەكەی زۆر بەسـرتەو ئەسپایی كرد.

هَمَسَ الشَیْئَ: شتەكەی شكاند.

هَمَـسَ الطعـامَ: خواردنەكـەی جو بـەبێ ئەوەی لێوەكانی لێك بكاتەوە ٥ دەمـی قوچاندبوو پاروشی دەجوو.

هَمَسَ العِنَبَ: ترێیەكەی گوشی.

هامَسَ فلان فلانـاً: بەسـرتە فلانكـەس قسەی لەگەڵ فلان كرد.

تَهَـامَسَ القـومُ: خەڵكەكـە بەسـرتە قسەیان پێكەوە كرد.

الإهمـاسُ: ئەوەیـە پیتـی مـەهجورە بـەدەنگی پیتـی مەهموسە دەربـڕی وەكـوو پیتـی (دال) بـەدەنگی پیتـی (ت) بخوێنیەوە لەجیاتی (بو دەقە) بڵێی (بوتەقە).

المهمـوس: قـسەی بەسـرتە ٥ پیتێـك كەلـەپێڕی پیتـەكانی مـەهجورە نەبێ.

الهَامِسُ: گورگی برسی.

الهَمْـسُ: هـەر ئاخاوتنێـك بەسـرتەو ئەسپایی بگوترێ ٥ كەمترین دەنگی قاچ كەلەزەوی دەدا.

الهَمَّاسُ: شێری تێك شكێنەری بەهێز كـەخێرا نێـچیرەكەی تێـك دەشكێنێ.

الهَمُوسُ: شێر كەلەشـەودا بەهێواشـی دەڕواو نایـەوێ دەنگـی قاچـی ببیسرێ ٥ ڕێبواری شەو.

الهَمِیسُ: دەنگی سمی حوشتر.

هَمَـشَ الرجـلُ هَمْـشاً: پیاوەكـە زۆری قسەكردن بەناحەق زۆری قـسەی پـڕو پوچ گوتن.

هَمَـشَ القـومُ: خەڵكەكـە كەوتنـە جـمو جوڵ.

هَمَـشَ الجـرادُ: كوللەكـە راسـا بۆئـەوەی هێرش بەرێ.

**هَمَشَ الشَيْءَ هَمْشاً**: شتەكەی كۆكردەوە.
**هَمَشَ الكتابُ**: پەراوێزی بۆكتێبەكە نووسی.
**هامَشَه في كذا**: لەوشتەدا چارەسەری كرد.
**إهتمشَ القوم**: خەڵكەكە لەشوێنێك كۆبونەوەو تێكیانەوە هاویشتو هاتنو چوون.
**اهتَمَشَتْ الدابةُ**: وڵاخەكە وردە وردە رۆیی.
**تهامَشَ القومُ**: خەڵكەكە تێكەڵ بەیەك بوونو خرۆشان.
**تَهَمَّشَ الشَيْءُ**: شتەكە داخورا، لێی هەڵوەری.
**الهامِش**: پەراوێزی كتێب ٥ دەشگوترێ: (فلان یعیش علی الهامش): فلانكەس لەپەراوێزدا ژیان بەسەر دەبا تێكەڵ بەخەڵك نابێ.
**الهَمِشُ**: كەسێك زۆر جمو جوڵ بەپەنجەكانی بكا.
**الهَمْشَةَ**: ئاخاوتنو جمو جوڵ ٥ تێكەڵاو بوون ٥ دەنگی كوللەو سیسرە كەتێكەڵ بەیەك دەبنو دەبێتە ژاوەژاو.
**الهَمَشَةَ**: ئافرەتێك زۆر جمو جوڵو هاتو چۆ بكا.
**الهَمیشةُ**: كوللەی كوڵاو.
**هَمَطَ هَمْطاً**: تەمبەڵی كرد لەدەس بەكاربون دا ٥ خێرا دەستی بەئیشی خۆی نەكرد ٥ قسەی تێكەڵو پێكەڵ كرد ٥ گوێی نەدایە، چی خوارد چی گوت؟.
**هَمَطَ الناسَ**: ستەمی لەخەڵك كرد.
**هَمَطَ المالَ**: بەزۆرو ستەم ماڵی داگیر كرد.
**هَمَطَ الشَيْءَ**: شتەكەی بەگۆترە هەڵگرت.
**إهتمط المالَ أو الناسَ**: بۆ زێدە رۆیی لەمانای (هَمَطَ)دێ.
**إهتَمَطَ عرضه**: ناموسی شكاند، لەكەداری كرد.
**إهتَمَطَ الذئبُ الشاةَ**: گورگەكە لەناكاو پڕی دایە مەڕەكە.
**هَمَعَتِ العینُ هَمْعاً وهموعاً**: چاو فرمێسكی ڕشت.
**هَمَعَ الطَلُّ علی الشجرة**: شەونم كەوتە سەر درەختەكە.
**هَمَعَ رأسَه**: سەری شكاند.
**أهْمَعَ الدَمْعُ أو الماءُ**: فرمێسك یان ئاو ڕەوان بوو، رۆیی.
**أهْمَعَ الطَلُّ**: شەونم كەوتە سەر درەختەكەو دڵۆپ دڵۆپ كەوتە خوار.
**أهْتُمِعَ اللونُ**: ڕەنگەكە شێوا ڕەنگی تێك چوو سیسو ژاكاو بوو.

**الـوَاوُ:** پيتـی بيـستو حەوتـەمی پيتـەكانی هيجايـە ٥ لەپيتـە مەهجورەكانـە، مـەخرەجو شـوێنی لێوەدەرهـاتنی سـەری زمـانو ناوەڕاستی مەلاشووە.

**وَأَبَ فـلان يئِـبُ وابـاً:** فلانكـەس رقـی هەڵسا ٥ (أوأبَ فلان فلانـاً): فلانكـەس كارێـكی ئەوەنـدە ناشيرينی بەرامبـەر فلان كرد مـرۆڤ ڕوی نايە باسی بكا ٥ رقی هەڵساندو تورەی كرد ٥ بەشێوەی ناشـيرين وەلامـی دايـەوەو داخوازييەكەی بۆ جـێ بـەجێ نـەكردو ريسوای كرد.

**إتّـأبَ فـلان:** فلانكـەس ريـسوابوو ٥ حەيای چوو.

**إتّـابَ فلانـاً:** بەشـێوەی ناشـيرينو حەيابەرە داخوازييەكەی فلانكەسی ڕەتكردەوە.

**الإبَّـةُ:** ريـسوایو حـەيا چـوونو تێكشانەوەو وێكهاتنەوە.

**التُّؤَبَـةُ:** ريـسوابونو حـەيا چـون ٥ بنەمای وشەكە (وُؤبَةٌ) بووە.

**التُّؤَبَةُ:** بەمانا (التُّوَبَةُ)دێ.

**المَوْئبة:** بەمانا (التُّؤَبَةُ)دێ.

**الـوَابُ:** ئـاژەڵی سـم دوفـاق كـەدرزی نێـوان سمەكـەی فـراوان نـەبێ ٥ پـەرداخو گلاسـی نەسـتورو قـورسو پان.

**الوَأْبَـةُ مـن النـساء:** ئـافرەتی كورتـە بالای پان ٥ بيری پانو قوڵ ٥ قوڵكـە لەبـەر دوو شـاخ دا كـەئاوی تێـدا بمێنێتەوە كەپێی دەگوترێ بـەرداو ٥ دەشـگوترێ: (قِـدر وأبَـةٌ): مەنجەڵێكی پانو گەورەيە.

**الوَئيبة:** (قِدر وئيبة) مەنجەڵی قوڵ.

**الوَاجُ:** برسيايەتی.

**وَأَدَ الرَّجُـلُ إبنتهـا:** پياوەكـە كـچەكەی خۆی زينده بەچاڵ كـرد ٥ (فهـو وائـد وهي وئيدة ومؤودة): كچ زينده بەچـاڵ كـردن عادەتێـكی سـەردەمی پـێش هاتنی ئيسلام بووە.

**إتّأدَ فلان:** فلانكەس لەسەرە خۆ بـوو هێـواش بـوو ٥ دەگـوترێ: (إتّـأد في مشيه): بەهێواشی رۆيشت ٥ (إتّأد في أمره): لەكارەكەی دا دامەزراو بوو.

**تَوَأدُ فلان:** بەمانا (إتّأدَ)دێ.

**تَوَأدت عليه الأرضُ:** زەوی بەسـەر دا كەوت گڵ ژێرخۆی دا شاردیەوە.

**التُّـوَأدُ:** لەسـەرەخۆيیو ڕەفتـاركردنی عاقلانە.

**الـوَأْدُ**: دابو نەریتێـکی عەرەبـەکان بـوو لەسـەردەمی پـێش هـاتنی ئیـسلام، هەنـدێ کەسـیان کـچی خۆیان بەزینـدویی ژێرخـاك دەکـرد ◊ دەنگی بەرزو گەورە ◊ دەنگی قـاچ بـەزەوی دادان رمبـەی قـاچ ترپـە ترپی قاچ کەلەدوورەوە دەبیسترێ ◊ بارەی حوشـترو دەنـگ خواردنـەوەی خۆی.

**الوئید**: بەمانا (الوَأدُ)دێ.

**وَأَرَ النارَ**: قولکە ئاگردانی دروست کرد.

**وَأَرَ فلاناً**: فلانکەسی ترساند ◊ فلانکەسی خستە ناو شەڕو ئەنگێزەوە.

**أوْأرَهُ**: فێـری کـرد ◊ سـەر بـەرەوژێر ناردنیە خوار.

**وَأَرَهُ**: خستیە ناو شەڕو هەراوە.

**الإرَةُ**: ئـاگر ◊ قولکـە ئـاگردانی ژێـر گەرما ◊ تونی حـەمام ◊ تـونی کـورە قسڵو گەچ ◊ کولاندنی گۆشت لەناو سرکەدا ◊ بەزی دوگ.

**الوِئـارُ**: گڵێنجـان ◊ کـە گڵـی تایبـەتی هەیە بۆ سواغکردن.

**الوَئِرَةُ**: زەوی گەرمەڵان ◊ گەرمەسێر.

**الوُءْرَةُ**: قولکە ئاگردان.

**وَأَلَ فلان يَئِلُ وَأْلاً**: فلانکەس پەنای برد، ڕزگاری بوو.

**وَآلَ الى المكـان**: پەلـەی کـرد بۆئـەو شوێنە ◊ دەشگوترێ: (أوْألَتِ الماشيةُ في الكلأ): ئاژەڵەکان قشپڵو میزیان لـە لـەوەڕگادا کـردو شـوێن میزیـان دیاربوو.

**أوْألَ المكـانُ**: شـوێنەکە ریخـاویو زبلاوی بوو.

**أوْألَـت الماشِيةُ المكـانَ**: ئاژەڵـەکان شوێنەکەیان ریخاویو زبلاوی کرد.

**وَاءَلَ فـلان مواءلـة**: فلانکـەس پـەنای بردو ڕزگاری بوو.

**واءَلَ الى المكـــان**: پەلـــەی کـــرد بۆشوێنەکە.

**وَاءَلَ مـن الـشَيْئِ مواءلـة**: هـەوڵی دا خۆ لەشتەکە ڕزگار بکا.

**وَاءَلَ الطائر**: باڵندەکە خۆی پەناشت دا لەترسی هەڵۆ.

**الإلَةُ إلـة فـلان**: خـزمو کـەسو کـاری فلان.

**الأوَّلُ**: یەکـەم پێـچەوانەی (الآخِـر) ◊ (ك: الأوائل، الأولون).

**الأُولى**: مێینەی (الأوَّل) ◊ (ك: الأُوَل).

**المَوْئِـلُ**: شـوێنی راوەسـتانی لافـاو ◊ پەناگە.

**الموئِلـة**: سەرچـاوەو کـان مـەرجیع پەناو شوێنی خۆپاراستن لەشت.

**الوَألُ**: بەمانا (الموئل)دێ.

**الوَأْلَـةُ**: قـشپڵو ریـخ، پیـسایی مـەڕو

بزنو حوشتر كه تـەباره دەبەستێو دەبێته گەمرەو تەپاڵه ٥ دەگـوترێ: (إن بني فـلان وقـودهم وألـة): فـلان خێــزانو بنەماڵــه ســوتەمەنییان تەپاڵەیە.

**وَأمَهَ يَوْأمُهُ:** رازی بوو، موافیق بوو.

**اتأمت الأنثى:** مێینەکه بەسکێك دوو بێچوی بوون.

**واءَمَــهُ مواءمــةً ووئامــاً:** رازی بــوو، موافیـق بـوو لەپەنـدی پێـشینان دا هـاتووه (لـولا الوِئـام هلـك الأنـام): ئەگـەر پێــك رازیبـوونو پێــكەوه گونجان نەبوایه خەڵك تێدا دەچون.

**واءمـــت المـــرأة صـــواحِباتها:** ئافرەتەكــــه وەكــــوو دەســــته خوشكەكانی خۆی رازاندەوه.

**وَأَمَ اللهُ فلانــاً:** خــــودا فلانكەســـی ناشیرین دروست كردووه.

**وَأمَ رَاسَهُ:** سەری گەوره كرد.

**تــواءَمَ الـشيئان:** دووشــتەكه لێــك چوون وەكوو یەك وابون.

**تَوْأمت الفتيات:** كـچەكان لـەناوخۆیان دا رێك كەوتن.

**تــواءم الغِنــاءُ:** رســتەو پەنــدی گۆرانیەكه پێكەوه گونجاو بوون.

**الـتَّـوْءَمُ:** دولانــه، دوو منــداڵ ٥ دوو بێچوو بەیەك سك ببن ٥ دووبن یا زیاتر، نێربن یا مێینه بن.

**الوَامُ:** خانووی گەرم.

**الوَامَــةُ:** دەگــوترێ: (رجــل وَأمَــة): پیاوێكه لاسایی خەڵك دەكاتەوه.

**الـوَأْن:** جەسته لـەرو لاواز ٥ كەسێـك رای ناپەسەندو پڕو پووچی هەبن.

**الوَأْنُ:** پیاوی جەسته پانو خەپان.

**الوَأْنَةُ:** بـەمانا (الـوأْن)دێ ٥ دەگـوترێ: (إمــرأةٌ وأنــة): ئافرەتێــكه كەتــەو گێلو نەفامه.

**وَأوَأَ الكَلْبُ:** سەگەكه لوراندی.

**الوَأْوَاءُ:** واقەواقی چەقەڵ.

**وَأيَ فلاناً وَأْياً:** وادەی بـەفلان دا ٥ (وأی لَـهُ) بـەرعودەی بـوو، بـوو بەكـەفیلی ٥ دەگوترێ: (وَأي لفلان كـذا): بـۆ فـلان بەرعودەی فلان شت بـوو ٥ لەحـەدیث دا هاتووه: خـودا دەفـەرموێ: (إنـي قـد وأيتُ على نفسي أن أذكر من ذكرني).

**إتَّأى الرجلُ:** پیاوەكه وادەی دا.

**تَوَاءَى القومُ:** خەڵكەكـه كۆبونـەوەیان ئەنجام دا.

**إستَوْأى الفلان:** فلانكەس داوای وادەو بەڵێنی كرد ٥ وادەی دا.

**الـوَأْيُ:** وادەو بـەڵێنو بـەرعودەبوون ٥ لەحـەدیثـی عومـەردا هـاتووه (مـن وَأى لأمرئٍ بَوأيٍ فليف به): كەسێـك وادەو بەڵێنێــــكی دا بەپیاوێــــك

بابـەجێی بێنـێ ‌ە هـەروا وشـەی (ألـوَأيُ) نـاوە بـۆ ژمارەیـەك ئادەمیزاد ‌ە بۆ شكو گومان.

**الوَأيُ من الدواب:** وڵاخی تێكسمڕاوو پتەو.

**الوايَةُ:** مەنجەڵی گەورەو پانو پۆڕ.

**الوَئِيَةُ:** بـەمانا (الوَأيَـة) دێ ‌ە ئـافرەتی دەستڕەنگینو كـەیبانوی بەخەمـەوە بووی مـاڵو حـاڵی خـۆی ‌ە جـەواڵو هۆڕو تێڕەو خەراری گەورە.

**وَبَا الشَيْئ وَبْئاً:** ئاماژەی بەشتەكە كرد.

**وَبَـــأ المتـــاعَ:** كاڵاكـانی كۆكردنــەوەو بەستنی بۆباركردن.

**وبِئَـتِ الأرضُ:** زەوییەكـە (وڵاتەكـە) تاعونو وەبای تێدا پەیدابوو.

**اوبـات الأرض:** زەوییەكـە، ناوچـەكە تاعونی تێدا پەیدابوو.

**اوبَـأ فـلان الی الـشَيْئ:** فلانكـەس ئاماژەی بۆ شتەكە كرد ‌ە دەگوترێ: (ركِيَّةٌ لاتـوبِئُ): بیرێـكە هـەت ئـاوی لـێ نابڕێ.

**وَبَّـأ الی الـشَيْئ:** ئامـاژەی بۆشـتەكە كرد.

**وَبَـــأ الـــشَيْئَ:** شـــتەكەی داگـــرت (تەعبیئەی)كرد بۆ ناردنە دەرەوە.

**تَوَبَّأ فـلان البلـدَ او المـاءَ:** فلانكـەس وڵاتەكـە یـان ئاوەكـەی بـەتاعوناوی زانی.

**اسـتوبَأ فـلان الأرضَ:** فلانكــەس زەوی‌و وڵاتەكـــەی بـــەتاعوناوی لەقەڵەم دا.

**المُوبِئُ:** ئاوی كەم ‌ە ئاوی وشك بوو.

**الوَبَـــأ:** تـــاعونو پـــەتا ‌ە هـــەر نەخۆشییەك گشتی‌و بڵاوە بووبێ.

**الوَبَاءُ:** بـەمانا (الوَبَـأ)دێ ‌ە (ك: أوبئـة وأوبية).

**وَبَّخَهُ:** سـەر زەنـشتی كـرد، گلـەیی لـێ كرد ‌ە هەڕەشەی لـێ كرد.

**وَبِدَ فلان يَوْبَدُ وَبَداً:** حاڵو وەزعی خراپ بـوو ژیـانی نـاخۆش‌و گـوزەرانی تـەنگ بـوو، خێزانــی زۆرو داهــاتی كــەم ‌ە دەشگوترێ: (وَبِدَت حالُه).

**وَبَدَ عليه:** ڕقی لـێ هەڵسا.

**وَبِدَ الثوبُ:** قوماشەكە ڕزی.

**وَبِـدَ اليـومُ:** ڕۆژەكـە گـەرم بـوو، كزەبـاو هەواشی نەبوو.

**اوْبَدَ الشَيْئَ:** شتەكەی تاك كردەوە.

**تَوَبَّـدَ امـوال النـاس:** بەچـاوی مـاڵی خـەڵكی هـەنگاوتو توشـی ئافـەتی كردن.

**استَوْبَدَ فلان:** فلانكەس حاڵو وەزعـی خـراپ بـوو بـەهۆی خێـزان زۆری‌و كەم دەرامەتییەوە.

**الوَبْدُ:** كۆنە شاخو درزێك لەناو كێو دا

ئاوی تێدا کۆبێتەوە ٥ ئاتاجی بۆ خەڵك.

**الوَبَدُ**: چاوگە دەکرێتە ئاوەڵناو ٥ دەگوترێ: (رجل وَبَدٌ): پیاوێکە حاڵو وەزعی خراپو گوزەران تەنگە ٥ کونەشاخو چاڵایی لەناو کێودا ئاوی تێدا کۆبێتەوە.

**وَبِرَ البعيرُ ونحوه (يَوْبَرُ) وَبَراً**: حوشترەکە کوڵکی زۆربوو.

**وَبَّرَ فلان**: فلانکەس تەرە بوو وەکێوان کەوت، ژیانی لەگەڵ حەیواناتی وەحشی بردەسەر ٥ فلانکەس لەماڵ دا مایەوەو نەچوە دەر.

**وَبَّرَ ولد النعام**: بێچوە نوعامەکە پەرو پۆڵی لێ روان.

**وَبَّرَ الإرنب او الثعلب او الأيلُ**: کەروێشکەکە یان رێوییەکە یان حەیوانە کێوییەکە لەسەر توکی قاچی رۆیی قاچی نوشتاندەوە لەکاتی رۆیشتن دا بۆئەوەی شوێن پێی خۆی گوم بکاو کەس بەمەکۆی نەزانێ.

**وَبَّرَ فلان آثاره**: فلانکەس شوێن پێ‌و شوێن دەستی خۆی سڕیەوە بۆئەوەی پێی نەزانن.

**وَبَّرَ على فلان الأمرَ**: کارەکەی لەفلانکەس چەواشەکرد.

**وَبَّرَ النخلةَ**: دارخورماکەی تەلقیح کرد تۆوە نێرەکەی پێوە کرد.

**الاوبر (بناتُ أوبَر)**: جۆرە قاچکێکە رەنگی خاکییەو سوچ سوچەو گڕن گڕنە ٥ تاکەکەی پێی دەگوترێ: (ابن أوْبَر) ٥ دەشگوترێ: (لقيت منه بنات أوبَر): لەسۆنگەی ئەوەوە توشی بەلاو کارەسات بووم.

**الوَابِرُ**: دەگوترێ: (ما بالدار من وابر): لەخانوەکەی دا کەس نیە، کەس لەخانووەکەدا نییە.

**الوَبْرُ**: گیانلەبەرێکە سمدارە لەقەبارەی کەروێشك دا یە، رەنگی لەنێوان خاکی‌و رەشی دایە، کلك کورتە، شەویلەی خوارو دەجوڵێنێ دەڵێی کاوێژدەکا، لەوڵاتی لوبنان زۆرە ٥ هەروا وشەی (الوَبَر) ناوە بۆ رۆژێك لەحەوت رۆژی کۆتایی زستان.

**الوَبَرُ**: توکی حوشترو کەروێشك‌و ئەوجۆرە حەیوانە ٥ (أهل الوبر): رەشماڵ نشین‌و ئاژەڵدار.

**وَبِشَ الظُفْرُ وجلدُ البعير يَوْبَشُ وَبَشاً**: پەڵەی سپی لەبنکی نینۆکەکەدا پەیدا بوو یان لەپێستی حوشتردا پەڵەی سپی پەیدابوو.

**اوبَشَ السائر**: رێبوارە شەوڕەوەکە پەلەی کرد.

**اوبَشَ الرجلُ**: پیاوەکە دالان‌و

دیوەخانی خوێ ئامادەکرد بۆنان خواردنو خواردنەوە تێیدا.

اوبَشَتْ الأرض: زەوی گژوگیای جۆراو جۆری رواند.

وَبَّشَ فلان للحرب: فلانکەس کۆمەڵێکی زۆری لەهۆزو خێڵەجیاجیاکان کۆکردەوە بۆ شەڕ.

وَبَّشَ القوم في أمر: خەڵکەکە لەهەموو لایەکەوە لەکارەکە وروکان ٥ پێیەوە خەریك بوون.

وَبَّشَتِ الأظفار: پەڵەی سپی لەسەر بنکی نینۆکەکان دەرکەوت.

وَبَّشَ الجُمر: پشکۆ ئاگرەکە بەهۆی باوە گەشایەوەو سورایی ئاگرەکەی دەرکەوت.

الوَبَشُ: تاکی (الأوبش)ە، مەبەست هەتیومچەو ئادەمیزادی خوێڕی ناکەس بەچەیە ٥ پەڵە پەڵەی سپی کەدەکەونە سەر نینۆك ٥ پەڵە پەڵە کە لەسەر پێستی حوشتر دەردەکەون.

وَبَشُ الكلام: قسەی پڕوپوچ.

وَبَصَ البَرْقُ: بروسکەکە روناکی دا ٥ دەشگوترێ: (وَبَصَ القمر): مانگ روناکایی بڵاو کردەوە.

وَبَصَ الجِروُ: توتکە سەگەکە (بێچوە گورگەکە) چاوێکی هەڵێنا.

وَبَصَتَ الأرضُ: زەوییەکە روەکی زۆری لێ روا ٥ یان گیاوو گژەکەی سەری دەرهێناو سەوز بوو.

وَبَصَت النارُ: ئاگرەکە روناکی دا.

وَبَصَ الفرسُ يَوْبِصُ وَبَصاً: ئەسپەکە نیشاتی پەیداکرد تەڕدەماخ بوو ٥ (فهو وَبِصٌ وهي وبصة).

اوبَصَت الأرض: بەمانا (وَبَصَتْ).

اوبَصَت النارُ: بڵێسەی ئاگرەکە دەرکەوت.

اوبَصَ فلان نارە: فلانکەس ئاگرەکەی هەڵگیرساند.

وَبَّصَ فلان لفلان بشيئ: فلانکەس شتەکەی دا بەفلان.

وَبَّصَ الجِروُ: بێچوە گورگەکە چاوێکی کردەوە.

الوابصة: ئاگر ٥ پشکۆ ئاگر ٥ هەورە بروسکە ٥ دەگوترێ: (فلان وابصة سمع): فلانکەس هەرقسەیەك ببیسێ بڕوای پێ دەکا.

الوَبَّاصُ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (الوابصة)دێ ٥ مانگ ٥ ڕەنگی زۆر زەقو دیار.

الوَبْصَة: پشکۆ ئاگر.

الوبيصة: ئاگر.

وَبَطَ في جسمه وفي رأيه: لەجەستەی دا لاواز بوو راو بۆچوونەکەی لاوازو ناپەسەند بوو.

**وَبِطَ**: خوێڕی بوو ٥ ترسنۆك بوو ٥ لاواز بوو.

**وَبُطَ فلان**: بەمانا (وَبَطَ)دێ ٥ قورس‌و گران بوو.

**الوَبَاطُ**: زەعیفی.

**الوباعَة من الصَّبي**: مەلاشوی منداڵ ٥ كلۆت.

**وَبَخَهُ يَبِخُهُ**: ڕەحنەی لێ گرت ٥ تانەی لێ دا.

**الوَبَخُ**: شوێنی بەیككەیشتنی دوشت ٥ جومژگە ٥ دەردێكە توشی حوشتر دەبێ كاریگەری خراپی دەبێ بۆ كولكەكەی.

**الوَبَخَةُ**: (وَبَخَة القوم): شوێنی كۆبونەوەی خەڵك ٥ پیاوی باشی كۆمەڵ.

**وَبَقَ يَبِقُ وَبْقاً**: فەوتا بەهیلاك چوو.

**وَبَقَت الإبلُ**: حوشترەكە بەقوڕدا چووە خوار.

**أوبَقَهُ**: فەوتاندی بەهیلاكی برد ٥ بەندی كرد ٥ ڕامی كرد ٥ ژێرباری كرد.

**استوبَقَ**: فەوتا بەهیلاك چوو.

**المَوبِقُ**: شوێنی بەندكردن، بەندیخانە ٥ شوێنی وادەو بەڵێن ٥ ناوەندو بەربەست لەنێوان دوشت دا.

**المَوبِقات**: تاوانە گەورەكان.

**وَبَلَت السماءُ تَبِلُ وبلاً ووبولاً**: ئاسمان بارانی زۆری باراند.

**وَبَلَتْ السماءُ الأرضَ**: ئاسمان زەوی ئاودا.

**وَبَلَ الإنسانَ وغيرَهُ بالسوط**: بەقامچی لێكدان لەمرۆڤەكەی دا.

**وَبَلَ الصَّائِدُ الصَّيْدَ**: ڕاوچییەكە نێچیرەكەی تەراند.

**وَبُلَ المَرْتَعُ**: لەوەڕگاكە لەوەڕەكەی ژاكاو ناخۆش بوو.

**وَبُلَ الشَّيْئُ**: شتەكە توند بوو، ناخۆش بوو، تێك چوو.

**وَبُلت الأرض عليهم وبولاً**: زەوییەكە دەرداوی‌و لەوەڕ ناخۆش‌و ناساز كار بوو بۆ دانیشتوان‌و بۆ ئاژەڵەكانیشیان.

**وابَلَ الأمْرَ**: بەردەوام بوو لەسەر كارەكە.

**استوبَلَتْ الغَنَمُ**: مەڕو ماڵاتەكە نەخۆش كەوتن ٥ بەهۆی لەوەڕگای خراپ‌و ئاوو هەوای ناساز نەخۆشی لەناو ئاژەڵەكان دا بلاو بۆوە ٥ یان مەڕو بزنەكان حەزیان لەنێری‌و بەران بوو (بەتەگە هاتبون).

**استوبَلَ فلان الأرضَ**: فلانكەس ئاووهەوای زەوییەكەی پێ نەكەوت‌و نەخۆش كەوت، وێڕای

ئەوەی بەدڵ ئەو وڵاتەی خۆش دەوێ وەلێ ئاوو هەواکەی پێ ناکەوێ.

**اسـتوبَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەبەڵاو نەخۆشی لەقەڵەم دا.

**المَوْبِلُ**: گورزە دار، کوڵە دار ٥ گۆچانو عەصای ئەستورو پتەو.

**المَوْبِلة**: باوەشەدار، گورزە دار.

**المِيبَلُ**: گۆچانو عەصای ئەستورو پتەو ٥ جۆرە قامچیەکی سەر پرژاوییە دارێکە سەرەکەی هەندێ تیلمە چەرمی ئەستوری بۆ دەگرێتە پرژو وەکوو قامچی حوشتری پێ لێ دەخورێ.

**المِيبلَةُ**: قامچی وڵاخ لێ خورین ٥ گۆچانو عەصا.

**الوَابِلُ**: بارانی بەخورەمو قەترە گەورە ٥ پیاوی سەخی.

**الوَابِلة**: وەچەی حوشترو مەرو بزن ٥ لایەکی کۆتایی قۆڵ یان هی ڕان.

**الوَبَالُ**: گەندەڵیو فەساد ٥ چورتەمو ناخۆشی ٥ کاری قورسو گران لەسەر دڵو جەستە ٥ ئاکامو سەرەنجامی خراپو ناخۆش ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا﴾.

**الوَبْلُ**: بارانی دڵۆپەگەورەو بەخورەم.

**الـوَبَلَى مـن النـوق او الـشاه**: حوشترێک یان مەڕێک دوای دادۆشینی بەهێزو تەکان شیربدا.

**الوَبَلَةُ**: زیانو تاوان، لەشگرانیو نەخۆشی ٥ گەدەترشانو تەبیات تێکچون ٥ (وَبْلَةُ الطعام): تێکچونی گەدە ٥ (وَبْلَةُ الشاة): بەتەگە هاتنی مەرو بزن، بەکەڵ هاتنیان.

**الوَبِلَةُ (ارضٌ وَبِلَةٌ)**: زەوییەکی دەرداویو هەواناسازە هەمیشە پەتاو نەخۆشی تێدایە.

**الوَبِيلُ**: توندو تیژو پتەو، قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذْنَاهُ أَخْذًا وَبِيلًا﴾: گرتمان بەشێوە گرتنێکی بەهێزو پتەو ٥ دار، کوڵەدار ٥ گۆچانو عەصای ئەستورو پتەو ٥ شورکو داری نەرمو شلك ٥ دارێکە زەنگوڵو ناقوسی پێ لێ دەدرێ ٥ شەپکە دارێکە جل شۆر جلی پێ دەکوتێو پاکی دەکاتەوە.

**الوبيلة**: گورزەدار ٥ گۆچانو عەصای ئەستورو پتەو.

**الوُتُّ**: گمەگمو دەنگی خوێندنی جۆرە کۆترێکە.

**الوُتَّةُ**: بەمانا (الوُتُّ)دێ.

**الوَتاوِتُ**: وەسوەسەو خنوکەی دڵ.

**وَتَّحَ عطاءَهُ**: بەخششەکەی کەم کردەوە.

**وَتَحَ العطاءُ**: بەخششەکەی زۆر کەمو بێ بایەخ بوو.

**أوْتَحَ فلان**: فلانکەس ماڵو سامانی کەم بوو.

**أوتَحَ فلاناً**: فلانکەسی ماندو کردو دەستی تێی چوو ◊ زیانی پێ گەیاند ◊ بەخششەکەی کەم کردەوە.

**أوْتَحَ عطاءَهُ**: بەخششەکەی کەم کردەوە.

**وَتَّحَ عطاءَهُ**: بەخششی ئەوی کەم کردەوە.

**تَوَتَّحَ الشرابَ**: شەرابەکەی کەم کەم خواردەوە.

**الوَتِحُ**: شتی کەمو بێ نرخ ◊ (رجل وَتِحٌ) پیاوێکی خوێرییە ◊ (طعام وَتِحٌ): خواردەمەنییەکی بێ سودە.

**الوَتِحُ**: بەمانا (الوَتِحُ)دێ.

**وَتَدَ الوتِدُ**: چەسپا، سینگەکە چەقی.

**وَتَدَ فلان الوَتَدَ**: فلانکەس سنگەکەی چەقاند.

**أوتَدَ الوَتَدَ**: سنگەکەی چەقاند.

**وَتَدَ فلان في بيته**: فلانکەس لەماڵەوە جێگیر بوو نەهاتە دەر.

**وَتَدَ الزَرْعُ**: کشتوکاڵەکە سەری دەرهێنا، ڕوا، سەوز بوو.

**وَتَدَ رجلَهُ في والأرض**: قاچی لەزەوی چەقاند.

**الميتَدُ**: ئەو چەکوچو ئامێرەی سنگی پێ دادەکوترێ.

**الميتَدَةُ**: بەمانا (المِيتَدُ)دێ.

**الوَتَدُ**: ئەوەی لەزەوی دەچەقێندرێ ◊ یان بەدیواردا دادەکوترێ ◊ ئەو بەرزاییەی پێشەوەی گوێچکە ◊ بەشێکە لەتەفعیلەی عوروز ◊ (ك: أوتاد) ◊ (أوتاد الأرض): کێوەکانی زەوی ◊ (أوتاد البلاد): سەرۆكو ڕابەری وڵات ◊ (أوتاد الفم): ددانی دەم ◊ (أوتاد الصوفية): چوار شێخی گەورەی صوفیەکانن.

**الوَتَدَةُ**: ئەو بەرزاییەی پێشەوەی گوێچکە.

**وَتَرَ فلاناً وتراً وتِرةً**: دۆستو برادەری خۆی کوشت ◊ خراپەی لەگەڵ دا کرد ◊ ترساندی.

**وَتَرَ القومَ**: جوتی خەڵکەکەی کرد بەتاك ◊ دوو بون بوون بەسێ ...هتد.

**وَتَرَ العَدَدَ**: ژمارەکەی کرد بەتاك.

**وَتَرَ الصَلاةَ**: نوێژەی کرد بەویتر ◊ نوێژی یەك ڕکاتی خستە دوا نوێژە سوونەتەکانی.

**وَتَرَ القوسَ**: ژێی قەوسەکەی توند کرد ◊ ژێیەکەی بەقەوسەکەوە شەتەك دا.

**واتَرَ بين أخباره وكتبه مواترةً ووِتاراً**: ناو بەناو بەدواداچونی بۆ

هەواڵــــەکانی کــــردوە، بــــەناو کتێبـەکانی دا گـەڕا بـۆ دۆزینـەوەی زانیاری.

**واتــرت الناقــة:** حوشــترەکە لــەکاتی بیخدانی دا ئەژنۆیـەکی دادا ئـەمجار ئەژنۆکــەی تــری دا دا، بەمــەش ئەزیـەتی ئـەو کەسـەی دا کەلەسـەر پشتی بوو.

**واتَرَ الشَیْئَ:** ناوبـەناو بەدواداچوونی بۆشتەکە کرد.

**واتَرَ الصومَ:** رۆژە نا ڕۆژێـك بـەڕۆژو بوو ٥ یان ڕۆژێـك بـەڕۆژو بـوو دوو ڕۆژ بەڕۆژوو نەبوو.

**وَتَّـرَ فـلان الـصَلاةَ:** فلانکـەس نوێـژی سوننەتی شـەوانەی بەنوێـژی یـەك ڕکاتی کۆتایی پێ هێنا.

**وَتَّـرَ القـوسَ:** ژێـی قەوسـەکەی تونـد کرد.

**تــواترت الأشــیاء:** شــتەکان یــەك بەدوایــەك دا هــاتن، نــاو بــەناو کــەلێنیان تێــکەوت ٥ یــان تاکتــاك یەك بەدوو یەك دا شتەکان هاتن.

**تَــوَتَّرَ العَــصَبُ والعــرق:** ڕەگـو دەمارەکە گـرژ بـوون ٥ دەشگوترێ: (تَــوَتَّرَت العلاقــة بــین الــدولتین): پەیوەنـدی نێوان ئـەو دوو دەوڵەتـە گرژ بوو.

**تَتْری:** دەگوترێ: (جاءوا تـترى): یـەك لەدوایەك هاتن.

**تَتْـراً:** دەگـوترێ: (جــاءوا تــتراً): یــەك لەدوایەك هاتن.

**التَوَتُّرُ:** لـەبواری میکانیـك دا بریتییـە لەهەڵــــچونو خۆڕاپــــسکاوتنی قەبارەیەك کەهەردوو سەری بەسترا بن.

**المتــواتِرُ:** لــەبواری زانیــاری عــوروزدا بریتییــە لەســەرەوایەك پیتێــکی بـزوێن کەوتبێتـە نێـوان دوو پیتـی ساکنەوە، وەکوو (مفاعِیْلُنْ، فـاعِلاتُنْ، مفعُــــولُنْ) ٥ لــەبواری فــەرمودەی پێغەمبــەر (الحــدیث المتــواتر): بریتییە لەڕیوایەتکردنی کۆمەڵێـك کــە نــەگونجێ درۆبکــەن، واتــە: کۆمەڵێــك لەکۆمەڵێــکی تــرەوە ریوایەتیان کردبێ چین لەدواچین تادەیگەیەننــەوە ســەر پێغەمبــەر (د.خ).

**الوِتْرُ:** ناوێـکە لەناوە جوانەکانی خودا، تاكو تـەنها ٥ بێ هـاوەڵ ٥ لـەبواری ژمارەدا (الوتر) ئەوەیە جوت نەبێ ٥ هــەروا ناوێــکە لــەناوەکانی ڕۆژی عەرەفە.

**الـوَتَرَان:** دوو دەمـارن لـەنێوان پاژنـە پێـیو ڕەفیـچك یـان لـەنێوان لـەپی دەستو ئانیشك.

**الــوَتَرَةُ مــن کــل شــیئ:** ئەوەیــە

قەراخـــەكانی كەوانـــەیی بـــن ٥ ڕێـــــڕەوی تـــیر لەكــــەوان دا ٥ كرِكرِاگەیەكی بچوكە لەلای سەروی گوێچكە ٥ بۆشـایی نێـوان هـەر دوو پەنجەیـــەك ٥ پێـــستۆكەی نێـــوان قامكە گەورەو قـامكی شایەتومان ٥ دەمارێــكە لـەژێر زمـان دا ٥ نێـوان نـەرمایی لـوت و سەبەلە ٥ پـەردەی نێوان هەردوو كونە لـوت ٥ ڕەگێـكە لەنێوان خواروی ڕان و ڕەفیچك.

**الوَتَرَتان**: بەمانا (الوَتَران)دێ ٥ دوشتی بــەرزەوە بـوون دەڵێـی دو ئەڵقـەی لەگوێچكەی ئەسپدان.

**الوَتَرِيَّةُ من النساء**: ئافرەتی دڵـڕەق و بێ بەزەیی.

**الوَتِيرَة**: ڕێبازێـكە بەتەنیشت كێودابێ، پارچـەیەك لـەزەوی ٥ زەوی سـپی ٥ كرِكرِاگەیەكە لەلای سەروی گوێچكە ٥ پێـــستۆكەیەكە لــەنێوان قامكــە شادەو قامكـە گەورەدایـە ٥ پـەردەی نێـوان دوو كونــەلوت ٥ ئەڵقەیەكــە ڕاهێنانی شیربازی لەسـەر دەكـرێ ٥ خاڵێـــكی ســـپی كەوانەییـــە بەجەستەی ئەسپەوەیە ٥ خونچەی گـوڵ ٥ خانــەی دەیــان ٥ قاعیــدەو ڕێبـازی قیاسـی ٥ قاعیـدەو یاسـای تایبــەت بەشتێــك ٥ بــەردەوامبون لەسەر شتێـك ٥ دابـڕان و بروكانـدن ٥ دەگـوترێ: (مـاني عملـه وتـيرة): لەكارەكـەی دا ڕاوەسـتان بروكانـدن نیە.

**وَتِغَ فلان**: فلانكـەس فـەوتا ٥ تێداچوو ٥ تاوانبار بـوو ٥ داوەشـاو گەنـدەڵ بـوو ٥ ڕەوشتی خـراپ بوو بـەدبوو ٥ دەنـگو دۆرەی ناشیرین بوو ٥ زۆر نەزان و گێل بوو ٥ لەبەڵگە هێنانەوەدا هەڵەی كـرد هیچی بۆنەچەسپا ٥ ئازاری پەیدا كرد.

**اَوْتَغَ اللهُ فلاناً**: خودا فلانكەسی لـەناو برد.

**اوتـغ فـلان فلانـاً**: فلانكـەس وای كـرد فلان تاوانبار بكا ٥ فلانكەسی هـەڵنا بۆ تاوان كردن ٥ خـستیە نـاو بـەلاو چورتمەوە.

**اوتَــغَ فـــلان القـــولَ**: فلانكــــەس لەقسەكردنەكەدا كاڵفام بوو.

**اوتَغَ فلاناً عند السلطان**: ئامۆژگاری فلانكەسی كـرد لەخزمـەت پاشا داو فێـری ئـەوەی كـرد چـۆن هـەڵس و كەوت بكا.

**المَوْتَغَةُ**: شوێنی تێداچون و فەوتان.

**الوَتِغَـــةُ**: هەڵــــەكردن لەبەڵگـــە هێنانەوەدا.

**الأوْتَلُ**: پیاوێـك ورگی خۆی پڕبكا لـە شەراب.

**وَتِمَ بالمكان وتوماً**: لەشوێنەكە مایەوەو جێگیر بوو.

**الموتمة:** ئوسطوانه.

**الوَتْمَةُ:** رۆیشتنی خێرا.

**وَتَنَ بالمكان وتناً وتوناً:** لەشوێنەکە مایەوەو جێگیر بوو.

**وَتَنَ الماءُ:** ئاوەکە جاری بوو بەردەوام هاتو نەبڕا.

**وَتَنَ فلان فلاناً:** فلان زەبری لەڕەگی لاملی فلان دا.

**وُتِنَ فلان:** فلانکەس ڕەگی لاملی ئازاری بوو.

**اوتنت المرأة:** ئافرەتەکە منداڵی بوو بەجۆرێك قاچی پێش سەری هاتنەدەر.

**اوتن القوم دارهم:** خەڵکەکە زۆر لەماڵی خۆیان دا مانەوە.

**استوتن المالُ:** ماڵو سامانەکە زۆر بوو، هەڵگرا.

**المُوْتُونَة:** ئافرەتی بەئەدەبو ڕۆشنبیر، هەرچەند جوانیش نەبێ.

**الواتِن:** شتی جێگیرو چەسپاو لەشوێنی خۆی ٥ ئاوی کارێزاو بەردەوامو نەبڕاوە.

**الوَتْنُ:** ئەوەیە منداڵ کەلەدایك دەبێ لەپێش دا قاچەکانی بێن ئەمجار باقی جەستەی بێتەدەر.

**الوَتْنَةُ:** تەنگ هەڵچنین بەقەرزدار بۆئەوەی قەرزەکە وەربگرێتەوە ٥ ڕاجیایی‌و دژایەتیکردنی یەکتری ٥ دەگوترێ: (بینهما وتنة).

**الوَتِينُ:** شاڕەگی جەستە، دەماری سەرەکی کەهەرچی خوێنێك لەدڵ دێتەدەر ئەو دابەشی دەکا بەناوجەستەدا.

**واتاه على الأمر موتاةً وَوِتاءً:** فەرمانبەرداریی کرد.

**الوُتى:** زۆنگاو.

**وَثَأ اللَحمَ:** گۆشتەکە هاوسا گرێی لێ پەیدابوو.

**وَثَأَ الوتَدَ:** سینگەکە سەرەکەی پرژ پرژ بوو.

**وَثِئَتْ يد الرجل:** دەستی پیاوەکە ئازاری لێ پەیدابوو.

**اوثأ يَدَ فلان:** دەستی فلانکەس ئازاردرا ٥ زەبری لێ دا.

**الميثأة:** ئەو چەکوچو ئامێرەیە سینگی پێ دادەکوترێ.

**الوَثْءُ:** پەڵەیەکە، گرێیەکە لەگۆشت دا پەیدا دەبێو ناگاتە سەرئێسقان ٥ ئازارێکە توشی ئێسقان دەبێ بەبێ ئەوەی شکا بێ.

**الوَثَاءةُ:** بەمانا (الوَثْءُ)دێ.

**وَثَبَ يثِبُ وثباً:** بازی دا، خۆی هەڵدا ٥ دەگوترێ: (وَثَبَ الى المكان العالي): گەیشتە پلەو پایەی بەرز.

**وَثَبَ على فلان:** بەسەر فلانكەس دا زالّ بوو، بۆری دا ٥ هەروا وشەی (وَثَبَ) بەمانا راست بۆوەو راپەری، هەلمەتی برد، دانیشتو كەوت پالكەوت دێ ٥ دەگوترێ: (وَثَبَ على الفراش): لەسەرجێ كەوت، راكشا.

**اوثَبَ الحيوانَ:** وای كرد حەیوانەكە بازبدا.

**اوثَبَ فلاناً الموضعَ:** وایكرد فلانكەس بازبەسەر شوێنەكەدا بدا.

**واثَبَهُ مواثَبَةً ووثاباً:** هەریەك لەودووكەسە عەمبازی یەكتربوونو هەلمەتیان بۆیەكتر برد، پەلاماری یەكیان دا.

**وَثَّبَهُ:** خپی كرد، لەجێگای خست، ولی لێكرد لەجێگادا بكەوێ.

**وَثَّبَ فلاناً وثاباً:** جێگای بۆفلانكە راخست بۆئەوەی لەسەری بخەوێ یان دابنیشێ.

**تواثَبَ القومُ ونحوهم:** خەلكەكە هەندێكیان عەمبازی هەندێكیان بونو پەلاماری یەكتریان دا.

**تَوَثَّبَ:** بەمانا (وَثَبَ)دێ.

**تَوَثَّبَ على اخيه في ارضه:** بەستەمكاریو ناڕەوا دەستی بەسەر زەوی براكەی دا گرت ٥ داگیری كرد.

**تَوَثَّبَ في ملك فلان:** ملكو مالی فلانكەسی بەستەم داگیركرد.

**الموثبان:** ئەو پاشاو فەرمانرەوایە هەولی غەزاكردنو داگیركردنی ولاتی ترنەدا، بەسەلامەتی بۆخۆی دابنیشێ.

**الميثَبُ:** بازهاوێز ٥ دانیشتو لەسەرزەوی نەرمەلان ٥ تەبارو تەپۆلكە ٥ جۆگا.

**الوثابُ:** قەرموێلەو جێگای نوستن.

**الوَثَبَى:** بازهاوێژی گورج، هەرشتێك زوو باز بهاوێ دەگوترێ: (فرس وَثَبَى).

**وَثُجَ الحيوان:** حەیوانەكە قەلەو بوو گۆشتی گرت ٥ دەشگوترێ: (فَرَسٌ وَثِيجٌ): ئەسپێكی بەهێزە ٥ (ثوب وثيج): قوماشێكە باش چنراوەو رەختەیە.

**وَثُجَ الشَيْئَ:** شتەكە پرو قەرەبالغ بوو.

**وَثُجَ النبت:** روەكەكە درێژو پرو چر بوو.

**وَثُجَ المكانُ:** شوێنەكە لەوەری زۆر بوو، درەختی زۆر بوو.

**اوثَجَ الشَيْئَ:** شتەكە پرو چربوو.

**اوثَجَت الأرض:** زەوییەكە لەوەری زۆر بوو.

**إستوثَجَ الرجل من المال:** پیاوەكە مالو سامانی خۆی زۆر كرد.

**استوثَجَت المراةُ:** ئافرەتەكە خۆی

دارِشتو قەڵەو بوو.

**استَوثَجَ الشَيئُ:** شتەکە چڕو پڕبوو.

**إستوثَجَ المالُ:** ماڵەکە زۆر بوو.

**استوثَجَ النبت:** گژوگیایەکە تێك چڕژاو تێك هاڵا.

**المُوتثِجَةُ:** زەوییەك لەوەڕی زۆربێ.

**المَوثَّخُ:** (رجل موثّخُ الخلق): پیاوێکە جەستە لەڕو لاوازە.

**الموثُوخ:** بەمانا (الموثخ)دێ.

**الوَثخَةَ:** تەڕایی ئاو.

**الوثیخة:** ئەوەی لەئێسقان نەرم دەبێو تێکەڵ بەچەورایی دەبێ ٥ شیری مەییو، ئەو پڵو پوشەی ساڵی رابردو کەتێکەڵ بەگیاوگژی تازە رسکاوو ناسك دەبێ ٥ لەوەرزی بەهاردا ٥ زەوییەك قوڕو قاڵ بێ.

**وَثَرَ الشَيئَ يَثِرُهُ وَثْراً:** پێی لەشتەکە نا.

**وُثِرَ الشَيئُ:** شتەکە پێی لێ نرا.

**استوثِرَ من الشَيئِ:** زۆری لەوشتە ئەنجام دا، زۆری لێ کرد.

**استوثَرَ المراةَ:** هەوڵی دا ئافرەتی قەڵەوی دەست بکەوێ.

**استوثَرَ الفِراش:** چووەسەر جێگاکە ٥ پێی نایەسەر جێگاکە.

**الأوثَر:** نەرم تر ٥ دەگوترێ: (فراشي أوثر من فراشه): جێگا نووستنی من لەهی ئەو نەرمترە.

**المِثَرَةُ:** ئەو پۆشاکەیە لەسەر هەموو پۆشاکەکانەوە لەبەردەکرێ ٥ پێستی دڕندە، کەوڵی دڕندە ٥ قەپوچکی زین ٥ جۆرە زینو کورتانە ولاخێك بووە عەجەم لەئاوریشمو دێباج دروستیان کردوە.

**میثرة الفرس:** توكو باڵی ئەسپ.

**میثَرَةَ الأرجوان:** جۆرە قوماشێکی نەرمی ئاوهاخندراوە وەکوو لێفە لەسەر زین دەکەوێتە ژێر سوارەکە بۆئەوەی جێگای نەرم بێ ٥ (ك: مواثر ومیاثر).

**الوَاثِر:** چەسپاو لەسەرشت.

**الوِثار:** سەرزین کەلەقوماشی نەرم دروست بکرێ.

**الوَثْرُ:** پێستێکە دەکرێتە سیرمە ٥ پانایی سیرمە کە چوار پەنجە یان بستێك بێ ئافرەتی منداڵ لەبەری دەکا ٥ یان ئافرەتێك لەپێی دەکا بکەوێتە عادەی مانگانەی خۆیەوە ٥ بەکورتی وەکوو دەرپێی کورت وەهایە.

**الوِثْرُ:** جێگانوستنی نەرمو نۆڵ ٥ پۆشاکێك لەسەر پۆشاکی تەرەوە لەبەربکرێ وەکوو جبەو شتی وا.

**الوَثِیرُ:** بەمانا (الوِثْرُ)دێ ٥ (ك: وثار).

**الوَثيرَة من النساء:** ئافرەتی قەڵەوو گۆشتن ٥ (ك: وثائِر ووِثار).

**وَثِغَ رأسَهُ:** سەری شكاند.

**وَثِغَ الرجُل ناقته:** پیاوەكە لەوەڕو ئالفی جۆراو جۆرو كۆنو نوێی دا بەحوشترەكەی.

**وَثَغَ فلان الثريدة:** فلانكەس تێگوشاوەكەی تێك هەڵدا بەسەریەكی دا دا.

**الوَثيغة:** ئەو لەوەڕو گیاو گژەیە كە لەوەرزی بەهاردا تێك دەهاڵێ‌و جۆراوجۆرن ٥ پەرۆیەكە شەرمگای حوشتری پێ دادەپۆشرێ.

**وَثَقَ القِدرَ:** سێ كوچكەی بۆمەنجەڵەكە دانا.

**أوثَقَ القِدرَ:** بەمانا (وَثَقَ)دێ.

**وَثَّقَ القِدرَ:** بەمانا (وَثَقَها)دێ.

**وَثِقَ بفلان:** بتمانەی بەفلانكەس كرد.

**وَثُقَ الشَيْئُ يَوثُقُ وثاقةً:** شتەكە جێگیر بوو، چەسپا، دامەزرا.

**وَثُقَ فلان:** بەدیكۆمێنت‌و وەسیقە پابەند بوو.

**أوثَقَ فلاناً ايثاقاً:** فلانكەسی كردە جێی بتمانە.

**أوثَقَ الأسيرَ:** دەست‌و پێوەندی ئەسیرەكەی باش توند كرد.

**أوثَقَ العَهدَ:** وادەو بەڵێنەكەی جەخت كردەوە.

**واثَقَ فلاناً:** پەیمانی لەگەڵ فلانكەس بەست ٥ وادەو بەڵێنی پێدا ٥ دەگوترێ: (واثقت باللّه لأفعلنّ كذا).

**وَثَّقَ فلاناً:** وتی فلانكەس جێگای بتمانە پێكردنە.

**واثَقَ الأمْرَ:** كارەكەی پتەوو مەحكەم كرد.

**وَثَّقَ العقدَ:** گرێبەستەكەی لەدەفتەری رەسمی دا تۆماركردو كردی بەدیكۆمێنت‌و بەڵگەنامە.

**تَواثَقَ القومَ زعلى الأمر:** خەڵكەكە وادەو بەڵێنیان بەیەكتر داو سوێندیان بۆیەكتر خوارد.

**تَوَثَّقَ في الأمر ومن الأمر:** بەبەڵگەو دیكۆمێنت كاری كرد.

**تَوَثَّقَتِ العُقْدَةُ:** گرێیەكە توند بوو.

**استوثَقَ من فلان:** بەڵگەنامەو وادەو بەڵێنی لەفلانكەس وەرگرت.

**استوثَقَ من الأمر:** بەبەڵگەو دیكۆمێنتەوە چووە ناو كارەكە.

**الثِّقَةُ:** بتمانە.

**المَوثِقُ:** وادەو بەڵێن.

**المُوثِقُ من الشجر:** ئەو درەختەیە كە خەڵك پشتی پێ دەبەستن بۆ لەوەڕی ئاژەڵەكانیان لەكاتی بڕانەوەی گژوگیا ٥ دەگوترێ: (كلأً

مُوثِقٌ): درەختێکە پشتی پێ دەبەسترێ ٥ بۆئەوەی بەشی خۆراکی ئاژەڵەکانیان بکا ٥ (ماء مؤثِق): ئاوێکی زۆرەو بەشی ئاژەڵو پێداویستی خۆیان دەکا.

**المُوَثِّقُ**: ئەوکەسەی گرێبەستو نوسراوی نێوان خەڵك دەکاتە رەسمیو لەدەفتەری تایبەتی دادگادا تۆماری دەکا.

**المیثاق**: عەهدو پەیمان ٥ (ك: مواثیق ومیاثیق).

**الوَثاقُ**: ئیسمێکە لەوشەی (إیثاق)وەرگیراوە ٥ ئەو حەبلو پێوەندو کەلەبچەیەیە شتی پێ دەبەسترێ.

**الوِثاقُ**: هەر حەبلو گوریسو پەتێك شتی پێ ببەسترێ.

**الوَثِیقةُ**: بەڵگەنامە، دیکۆمینت ٥ هەرشتێك شتی پێ ببەسترێو شەتەك بدرێ.

**الوَثیقةُ في الأمرِ**: قایمکردنو دیکۆمینتکردنی کار ٥ باش ئەنجامدانو رێکوپێك کردنی کار ٥ دەگوترێ: (أرض وثیقة): زەوییەکە گزوگیای زۆرو چرو پرە ٥ کومپیالەدانو چەکدانە بۆ بتمانەی قەرز ٥ یان دانەوەی قەرز.

**وَثَلَهُ**: لکاندی ٥ پێوەی نووساند.

**وَثَلَ الشَيْئَ**: شتەکەی جێگیر کرد ٥ کردی بەبنەماو بناغە.

**وَثَلَ المالَ**: ماڵو سامانی کۆکردەوە.

**الوَثْلُ**: توێکڵو پرزی توێکڵ ٥ چلكو زیادە گۆشت کەبەچەقۆی تیژ لەپێستی دادەماڵنو تیفتیفەی دەدەن ٥ یان بەهۆی دەباغەوە لێی دەکرێتەوە.

**الوَثِیلُ**: لاواز ٥ توێکڵی دار ٥ حەبلو گوش کەلەتوێکڵو پرژو شتی وا دروست بکرێ ٥ هەر زیوو خشتو خاڵێك لەدرەختو گوشو شتی وا بکەوێتە خوار.

**وَثَمَ الحیوان یَثِمُ وَثْماً**: حەیوانەکە بازی دا.

**وَثَمَ الشَيْئَ**: شتەکەی شکاند ٥ باریکی کرد ٥ کوتای.

**وَثَمَ فلان الرَّجُلَ**: فلانکەس لەپیاوەکەی دا.

**وَثَمَ المطرُ الأرضَ**: باران لەزەوی دا.

**وَثَمَ فلان الحشیشَ**: فلانکەس گیاو گژو پلو پوشەکەی گرد کردەوە.

**وَثَمَ الفرسُ الأرضَ بحافره**: ئەسپەکە بەسمی زەوی کوتا، سمکۆڵی کرد.

**وَثَمَت الحِجارةُ رِجلَهُ**: بەردەکە قاچی بریندار کرد.

**وَثِمَــت الأرضُ وَثامــةً**: زەوییەکــە گژوگیای کەم بوو لەوەڕی کەم بوو.

**وَثُـمَ وثامَـةً**: خـۆی دارِشـتو گۆشـتن بـوو قەڵەو بوو.

**واثَـمَ فِي العَـدْوِ**: هــەموو قاچــەکانی خرِکردنــەوەو خـۆی ئامـادەکرد بـۆ بازدان وەکوو ئەوە خۆی بهاوێ.

**الميــثَمُ**: زەوی کــوت، شتێــك زەوی بپەستێوی.

**الوَثيمةُ**: بەرد ٥ بەردی چەرخ ٥ بەردە ئەســـتێ ٥ کۆمەڵــە گـــژوگیا ٥ کۆمەڵێك خواردەمەنی جیاجیا.

**وَثَنَ الشَيْئُ بالمكان**: شتەکە جێگیر بوو لەشوێنەکەو چەسپا.

**وَثِنَـتِ الأرض**: زەوییەکـە بـارانی لـێ درا باراناوی بوو.

**اوثَن من المال**: ماڵو سامانەکەی زۆر کرد.

**اوثَــنَ فلانــاً**: بەخشـشی فلاَنکەســـی زۆرکرد، زۆری پێدا.

**استوثَن من المال**: لەماڵو سامانەکەی زۆرکرد ٥ قەڵەو بوو.

**إســتوثَنَ النحـلُ**: هەنگــەکان بــوون بەدوو بەش، گەورەو بچوك.

**إســتوثَن الـشَيْئ**: شــتەکە مایــەوە ٥ بەهێز بوو.

**المَوْثونَةُ**: ئافرەتی زەلیلو گوێ ڕایەڵ، فەمارنبــەردار ٥ (إمــرأة موثونــة): ئــافرەتی بەئــەدەبو گوێڕایــەڵ هەرچەندە جوانیش بێ.

**الوَثَنُ**: پەیکەرێك پەرستشی بۆبکرێ جالەبــەردو دار دروست کرابێ یـان لەمس و زیوو شتی تر ٥ دەشگوترێ: (هــي وثــن فــلان): ئــەوە ژنــی فلاَنکەسە.

**الوَثَنِيّ**: بتپەرست ٥ دەگوترێ: (رجـل وثني وامرأة وثنية).

**الوَثَنيّـــــةُ**: رێبـــازو مەزهـــەبی بتپەرستەکان.

**وَجَأ فلاناً**: بەهەموو هێزی دەستی پاڵی بـە فلاَنکەســەوە نـا ٥ پـاڵی بەکوڵـەی سینگییەوە نا ٥ قۆرتەمەی ملی گـرتو گێڕایەوە.

**وَجَأَ التمرَ**: خورماکەی کوتا تاتێـك هـاڵاو بەسەریەك دا بوو بەگرموڵەو لینجاوی دایەوە.

**وَجَــأَ الفَحْـلَ**: دەمـاری گـونی ئەسـپەکەی خــستە نێــوان دوو بــەردو گوشــینی تامراندی (جۆرە خەساندنێکە).

**اوجَــأ فــلان**: فلاَنکــەس هــات بــۆ پێویــستیاتی خـۆی یـان بـۆ نێـچیر گرتنو هیچی دەست نەکەوت.

**اوجَأت الرَكيّةُ**: بیرەکە ئاوی کـەم بـوو یان ئاوەکەی بڕا، وشکی کرد.

**أوْجَأ عنه**: پاڵی بەشتەکەوەناو لێی دورخستەوە ٥ دەگوترێ: (أوجَأَ الشَيئَ عنه).

**إتَّجَأَ التَمرُ**: خورماکە دەنکەکانی گەورەبونو گۆشتن بونو پێگەیین، شیرین بوون لینجاویان لێ پەیدا بوو بەهۆی کوتانو تێک هەڵشێلانەوە.

**تَوَجَّأهُ باليد والسِّكِين**: بەمانا (وَجَأهُ)دێ.

**الوَجْءُ**: (ماء وَجْءٌ): ئاوی بێ کەڵك.

**الوَجَأُ**: (ماء وَجَأٌ): ئاوی بێ کەڵك.

**الوَجِيئة**: مانگا ٥ خورما کەئەوەندە بکوترێ ناوکەکەیان بێتەدەر ٥ پاشان بەشیر یان بەرۆن بشێلدرێن تا یەك دەگرنو دەبنە تۆپەڵ ئەمجار بخورێ.

**وَجَبَ الشَيئُ يَجِبُ وجوباً ووجباً**: چەسپا، پێویست بوو ٥ کەوتە سەر زەوی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا مِنهَا وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ﴾.

**وَجَبَ القلب وجباناً**: دڵ کەوتە پەلەپەلو لێدانی خێراو لەرزین.

**وَجَبَ فلان وَجْبَةً**: فلانکەس رۆژی یەك ژەمە نانی خوارد.

**وَجَبَ فلان وجوباً وموجباً**: فلانکەس مرد.

**وَجَبَت الشمس وجباً**: خۆرئاوابوو.

**وَجُبَ الرجل وجوبةً**: پیاوەکە ترسا، ترسنۆك بوو.

**أوجب فلان**: فلانکەس لەشەوو رۆژێك دا یەك ژەم نانی خوارد ٥ یان فلانکەس کارێکی چاکی کرد بەهەشتی بۆخۆی کڕی ٥ یان کارێکی خراپی کردو دۆزەخی بۆخۆی مەیسەر کرد.

**وَجَبَ على فلان**: لەپێشبڕکێ دا بەسەر فلان دا زاڵ بوو.

**وَجَبَ الشَيئَ**: شتەکەی بەپێویست دانا، واجبی کرد ٥ دایمەزراند، دایبەست ٥ دەگوترێ: (أوجَبَ له البيعَ) یان (أوجَبَه البيعَ).

**أوجَبَ اللهُ قَلْبَهُ**: خودا دڵی دامەزراو کرد.

**واجَبَ فلاناً مواجَبَةً**: فلانکەسی پابەندکرد ٥ دەگوترێ: (واجَبَهُ البيعَ): مامەڵەکەی لەسەر پێویست کرد.

**وَجَّبَت الإبلُ**: حوشترەکە ماندو بوو.

**وَجَّبَ اللَبأُ**: ژەکەکە لەگوانی حەیوانەکە دا مایەوە، ڕەق بوو.

**وَجَّبَ فلان فلاناً**: فلانکەس فلانکەسی پابەند کرد.

**وَجَّبَ به الأرضَ:** بەعەرزی دادا.

**وَجَّبَ فلان:** فلانکەس لەرۆژێك دا یەك ژەم نانی خوارد.

**وَجَّبَ فلان عیالَه وفرسَهُ:** فلانکەس ماڵو منداڵو ئەسپەکەی وافێرکردن شەوو رۆژی یەك ژەم نان بخۆن، ئەسپەکەی یەکجار ئالێك بدریٚ.

**وَجَّبَ الناقةَ:** رۆژی یەکجار حوشترەکەی دۆشی.

**تواجَبَ القومُ:** خەڵکەکە گرەویان لەگەڵ یەك کرد گرێنتییان دا بەیەکتر.

**تَوَجَّبَ فلان:** فلانکەس لەشەوو رۆژێك دا یەك ژەم نانی خوارد.

**استوجَبَ الشَّيْءَ:** شتەکەی کردە مافی خۆی.

**المُوجِبُ:** (موجِب) ناوی ئیحرام بەستو بوو لەپێش هاتنی ئیسلام دا.

**الموجِبَةُ:** تاوانی گەورە کەببێتە هۆی چوونە ناو دۆزەخ ٥ یان ئیشی باشو خێری گەورە کە ببێتە مایەی چوونە ناو بەهەشت.

**الواجب:** لەزاراوەی شەرع زانان دا ئەوەیە واجب بوونەکەی بە خەبەری ئاحادو شتی وا بووبیٚ بکەری پاداشی هەیەو نەکەری سزادەدریٚ.

**واجب الوجود:** پەروەردگار؛ ئەوەیە هەر بوبیٚو بوونەکەی پێویستی بەشتی تر نەبیٚ.

**الوَجْبُ:** ترسنۆك ٥ گێلو ئەحمەق ٥ حوشترێك ژەك لەگوانی دا رەق بووبیٚ ٥ کوندەی ئاوی گەورە کەلەپێستی نێرییە قەرەو شتی وا بیٚ ٥ شوێنی چۆڕاوگەی ئاو ٥ (ك: وجاب).

**الوَجَبُ:** خەتەرو گرەو.

**الوَجْبَةُ:** دەنگو قیژەی بەربۆوە ٥ ژەمەنان خواردن ٥ ژەمە لەوەڕو ئالف بۆ ئاژەڵ ٥ یەکجار دۆشینی شیردەر لەرۆژێك دا ٥ ئەندازەی خواردنی حەبو دەرمان لەرۆژێك دا.

**الوُجُوبُ:** پێویست بوون، کەوتنە شانو زیمە مەشغوڵ بوون ٥ یان ئەوەیە خودی شتەکە بونی پێویست بیٚ.

**الوَجِيبة:** ئەرکو وەزیفە ٥ ئەندازەی موچەو کریٚ، یان ئەندازەی خۆراك رۆژانە حەفتانە مانگانە ٥ هەروا ئاوە بۆ حاڵەتێك شتێك بکریٚو مامەڵەکە تەواو بکەی ئەمجار وەجبە وەجبە شتەکە بگوێزیەوە جا کەتەواو بوو دەگوتریٚ (قد استوفیت وجیبتك).

**وَجَّ وَجّاً:** پەلەی کرد.

**الـوَجُّ**: نوعامــه ٥ قــهتێ ٥ گیایهکــه لــهپێرِی (القلقاســـیات) بۆنێــکی خۆشی ههیه ٥ دارێـکه کهرهستهی جـوتی لــێ دروسـت دهکـرێ وهکـو ههوجارِو دهسته دوو مزانو ههپهو نیرو شتی وا.

**الوُجُجُ**: نوعامهی خۆشرِۆو بازهاوێـزی گورجو گۆڵ.

**وَجَـجَ الـشَّیْئُ یَجِجُ وجوجاً**: دهرکهوت، ئاشکرا بوو.

**وَجَحَ یَوْجَحُ وجحاً**: پهنای برد.

**اوجَـحَ الـشَّیْئُ**: شـتهکه دهرکــهوتو ئاشکرا بوو.

**اوْجَحَ الحافِرُ**: بیر ههڵکهنهکه گهیشته شــاخی لـــوس ٥ زۆربـــهزهوی دا رۆیشته خوار تاگهیشته شاخ.

**اوجَحَـت غـرَةُ الفَـرس**: سـپیایهتی ناوچهوانی ئهسپهکه ئاشکرابوو.

**اوجَحَتْ النـارُ**: ئاگرهکه روناکایی داو دهرکهوت.

**اوجَـحَ فـلان الـشَّیْئَ**: فلانکــهس شتهکهی داپۆشی.

**اوجَحَ فلاناً الیه**: وای کرد فلان پهنای بۆ بهرێ.

**اوجِحَ البولُ فلاناً**: میز تینی بۆ فلان هێنا ٥ تهنگهتاوی کرد.

**وَجَّـحَ الـشَّیْئَ**: شـتهکه دهرکــهوتو ئاشکرابوو.

**المُـوَجَّحُ**: (طریـق مـوجَّحُ): رێـگایهکی ئاشکراو رونه.

**المُـوجَحُ**: پێـــستی لــوسو ســفت ٥ قوماشـی ئهسـتورو رِهخنـه کهلێـك بدرێ دهنگی لێوه بێ.

**المَوْجُـوحُ**: (بــاب مَوْجُــوح): دهرگـای پێوهدراو ٥ یـان دهرگایـهك پـهردهی بهسهر درابێتهوه.

**الوُجَـاحُ**: پــهرده ٥ وادهبــێ واوهکــه دهکرێ بهههمزه دهگوترێ (أجاح – أجاح – إجاح).

**الـوَجَحُ**: ئهشــکهوتۆکه، پهناپاســار ٥ مهلجهئو پهنا.

**الـوَجِیحُ**: پــهنا ٥ قوماشــی ســفتو رِهخنـــهو ئهســـتور یـــان پۆشـــاك کهلهوجۆره قوماشه دروستکرابێو پانو پۆرِبێ.

**وَجَدَ فلان یَجِدُ وَجْداً**: فلانکهس غـهمبار بوو.

**وَجَدَ علیه موجدةً**: رقی لێ ههڵسا.

**وَجَــدَ فـلان وُجْـداً وجِـدَةً**: فلانکـهس دهوڵهمهند بوو.

**وَجَدَ مطلوبه**: ئهوهی لێی دهگهرِا دهستی کــهوت ٥ گومبوهکــهی دۆزیـــهوه ٥ دهگوترێ: (وجَدَ ضَالَّتَهُ).

**وَجَدَ الشَّیْئَ کذا**: شتهکهی وازانی، واهاته

بەرچاوی ٥ دەڵێی (وجدت الحِلمَ نافعاً): بۆم دەرکەوت کەصەبرو بار قوڵی بەسودە.

وُجِدَ الشَّيْئُ: شتەکە پەیدا بوو ٥ دەگوترێ: (وُجِدَ الشَّيئ من عدم وجوداً).

اوجَدَ اللهُ الشَّيْئَ: خودا لەنەبوونەوە شتەکەی هێنایە کایەوە.

اوجَدَ فلاناً: فلانکەسی دەوڵەمەند کرد ٥ دەگوترێ: (الحمد لله الذي أوجدني بعد فقر): سوپاس بۆخودایەك پاش هەژاریی دەوڵەمەندی کردم.

اوجَدَ فلاناً بعد ضعف: داوای لەڕو لاوازیی فلانکەسی بەهێز کرد.

اوجَدَ على الأمر: ناچاری کرد بۆ ئەوکارە.

اوجَدَ الشَّيْئَ: وایکرد شتەکەی دەست بکەوێ‌و زەفەری پێ بەرێ.

اوجَدَ مطلوبه: وای کرد زەفەر بەمەبەستی خۆی بێنێ ئەوی عەوداڵی بوو دەستی کەوێ.

تواجَدَ فلان: فلانکەس لەناخی خۆی دا هەستی بەسۆزو عیشق کرد.

تَوَجَّدَ لفلان: بۆ فلانکەس غەمبار بوو ٥ خەفەتی بۆخوارد.

تَوَجَّدَ بفلانة: عاشقی فلان ئافرەت بوو ٥ خۆشی ویست.

تَوَجَّدَ الأمرَ: نارەحەتی لەکارەکە دەربڕی.

توجَّدَ السَّهَرَ: لەشەو بەخەبەریی جاڕز بوو.

المَوْجُود: لەبواری فەلسەفەدا بریتییە لەشتێك لەزیهن‌و لەخاریج دا بوونی چەسپاوبێ.

الوَاجِدُ: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا واتە دەوڵەمەندێکی بێ سنور کەهەرگیز هەژار نەبێ، هەرچی بیەوێ هەبێ‌و بێ ئاتاج لەهەموو کەس ٥ لەحەدیثی پێغەمبەر دا هاتووە: (لَيُّ الواجد يَحِلُّ عقوبَتَه وعِرْضه): ماتڵ کردنی دانەوەی قەرز لەلایەن کەسێکەوە هەبووبێ شیاوی سزادانەو ڕەوایە ناموسیشی بشکێندرێ.

الوجادَة: لەزاراوەی فەرمودەزانەکان دا بریتییە لەوە کابرا لەپەڕاوێك زانیاری فێرببێ بەبێ مامۆستاو ئیجازەو موناوەلە.

الوَجْدُ: زلکاو ٥ شوێنی ئاو تێداکۆبوونەوە ٥ (ك: وِجاد).

الوُجْدُ: هەبوویی دەوڵەمەندیی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُم مِّن وُجْدِكُمْ﴾.

**الوِجْدان**: لەبواری فەلسەفەدا بریتییە لەهەموو هەستکردنێکی سەرەتایی لەزەت بێ یان ئازار، ئەمجار پەیدابوونی جۆرێك لەحالاتی نەفسی لەم ڕووەوە کەلەزەتەکەیان ئازارە کەکاری تێ بکاو ببێتە هەستکردنو پێ زانین.

**الوُجُودُ**: بوون، پێچەوانەی نەبوون ٥ وجود واتە بوونی زیهنیو خاریجی.

**الوُجودِيَّة**: جۆرە فەلسەفەیەکە پێی وایە بوون لەپێش ماهییەتەوەیە ٥ سارتەر پێی وایە وجود لەسەر بنەمای ئازادیی دادەمەزرێ ٥ ئازادییەکی ڕەهای وا کەرێگابدا تاك خۆی دروست بکاو هەڵوێست وەربگرێ بەو شێوەی خۆی دەیەوێ بۆئەوەی بوونی خۆی بەتەواوی بچەسپێنێ.

**الوَجِيدُ**: زەوی تەختو دەشت.

**أوجَدَهُ على الأمر**: بەزۆرە ملێ کارەکەی پێ کرد.

**واجَدَهُ اليه**: ناچاری کرد بۆی.

**واجّدَه عليه**: بەزۆرە ملێ کارەکەی پێ ئەنجام دا.

**الوَجْذُ**: بەرداو، قوڵکە ئاو لەکێو دا، حەوزی ئاو لەشاخ دا ٥ (ك: وجذان ووجاذ).

**الوَجِذُ**: دەگوترێ: (مكان وَجِذ): شوێنەکە، شاخەکە، حەوزی ئاوی زۆر تێدان.

**وَجَرَ العَليلَ يَجِرُهُ وَجْراً**: دەرمانی کردە قورگی نەخۆشەکەوە ٥ دەگوترێ: (وَجَرَ العليلَ الدّواءَ): دەرمانی کردە قورگی نەخۆشەکە ٥ دەرمانی کردە ناودەمی نەخۆشەکە.

**وَجَرَ فلاناً**: قسەیەکی ناخۆشی بەفلانکەس گوت، قسەیەکی ناخۆشی بەگوێچکەی فلانکەس دادا.

**وَجَرَ فلاناً الرمْحَ وبه**: ڕمبی لەفلانکەس دا.

**وَجِرَ من الأمر يَوْجَرُ وَجَراً**: لەکارەکە ترسا سامی لێ کرد ٥ (فهو وَجِرٌ وأوْجَرُ وهي وَجِرَة ووَجْراء).

**اوجَرَ العليلَ**: دەرمانی کردە قورگی نەخۆشەکەوە.

**اوجَرَ العليلَ الدواءَ**: دەرمانەکەی کردە دەمی نەخۆشەکەوە.

**اوجَرَ فلاناً الرُمْحَ او بالرُمْحِ**: ڕمبی لەفلانکەس وەشاند ٥ یان بەڕمب لێی دا ٥ دەشگوترێ: (أوجره الغيظ): رقو کینەی خۆی پێ ڕشت.

**إتَّجَرَ العليلُ**: نەخۆشەکە بەدەرمان چارەسەری خۆی کرد.

**تَوَجَّرَ العليلُ بالدواء**: نەخۆشەکە

دەرمانەکەی کەم کەم قوت دا.

**تَـوَجَّرَ فُـلانٌ المـاءَ**: فلاّنکەس بەنابەدڵی ئاوەکەی خواردەوە.

**المِیجارُ**: شتێـکە وەکوو صەولەجان پێی لەتۆپ دەدرێ.

**المِیجَـرُ**: ئامێرێـکە دەرمـانی پـێ دەکرێتە قورگی نەخۆشەوە.

**المَیجَرَةُ**: بەمانا (المیجر)دێ.

**الوِجَارُ**: کونە کەمتیار، کونە گورگ، لانەی شێر ٥ کونە رێوی ٥ بەزۆری بـۆ کونـە سـەگ بەکاردەهێنـدرێ ٥ دادراوێـکی زەوی کـەلافاوی گـەورە دایدرِیبێ ٥ (ك: أوجرة ووجُرٌ).

**الوَجْرُ**: شێوەیەکە لەئەشکەوت لەکێوو کەژ دا.

**الـوَجْرَةُ**: چاڵێـکە هەڵدەکەنـدرێ بـۆ گرتنی شێرو درِندە.

**الوَجُورُ**: دەردێـکە لـەقورِگ دا پەیـدا دەبێ.

**وَجَــزَ فِي منطقـة يَجِـزُ وَجْـزاً ووجـوزاً**: لەقسەکانی دا پەلەی کـردو وتارەکـەی کورت کردەوە.

**وَجَــزَ الکـلامَ**: قـسەکەی کـورت کـردەوە، کەمی کردەوە.

**وَجُزَ فِي منطقه يَوْجُزُ وَجْزاً**: لەقسەکانی دا پەلــەی کــردو وتارەکــەی کــورت کردەوە.

**وَجُــزَ الکـلامُ**: قـسەکە لەرِوانبێـژی دا کورتی هێنا.

**اوجَزَ الکلامُ**: قسەکە بەلاغـەتی کـەم بوو.

**اوجَـزَ فِي الأمـر**: پەلـەی لەکارەکـەدا کردو درێژەی پێ نەدا.

**اوجَزَ کلامە**: قسەکەی کورت کـردەوە، کەمێـکی لەقسەکەی درکاند.

**اوجَـزَ العَطِيّـة**: بەخشـشەکەی کـەم کردەوە ٥ خێرا بەخششەکەی پێ دا.

**تَـوَجَّزَ الشَّيْئَ**: شـتەکەی جـێ بـەجێ کرد ٥ داوای شتەکەی کرد.

**اِسْتَوْجَزَ الکـلامَ**: کەلامەکـەی کـورت کردەوە.

**المِیجـاز**: ئەوکەسـەی پرسـیارو وەڵام کورت دەکاتەوە.

**الـوَجْزُ مـن الرجـال**: پیاوێـك گـورج و گۆڵ بێ، کارەکـانی زوو ئـەنجام بـدا ٥ زوو ببەخـــشێ، گـــیر نـــەبێ ٥ حوشـتری تیـژرِۆ، خۆشـرِۆ ٥ خێـراو بەپەلە ٥ قسەی کەمو سوك ٥ کاری ئاسان.

**وَجَــسَ فـلان**: فلاّنکـەس ترسـا لـەو خەیاڵەی بەدڵیا هات یان لەوهەواڵەی بەرگوێی کەوت.

**وَجَــسَ فــلان وَجْــساً**: فلاّنکــەس ترسـانەکەی شـاردەوە، هـەوڵی دا پێـی نەزانـــــدرێ کەدەترســـــێ.

**وَجَسَ الشَّيْئُ**: شتەکە گوم بوو، نادیار بوو.

**اوجَسَ فلان**: فلانکەس ترس‌و بیم کەوتە دڵیەوە.

**اوجَسَت الأذُنُ**: گوێچکە دەنگێکی بیست.

**اوجَسَ فلان الأمرَ**: فلانکەس کارەکەی شاردەوە.

**اوجَسَ القلب شيئاً**: دڵ هەستی بەشتێك کرد ٥ یان دڵ لەشتێك ترسا.

**اوجَسَت الاذن صَوتاً**: گوێچکە دەنگی بیست.

**تَوَجَّسَ فلان**: فلانکەس گوێی بۆ دەنگی نزم کلۆر کرد.

**تَوَجَّسَ بالشَّيْئِ**: هەستی بەشتەکە کردو گوێی خۆی بۆ هەڵخست.

**تَوَجَّس فلان الأمرَ**: فلانکەس کارەکەی شاردەوە پەردەپۆشی کرد.

**توجَّس الصَّوْتَ**: گوێی بۆ دەنگەکە هەڵخست ٥ یان گوێی لێ بوو لێی ترسا.

**تَوجَّسَ الطعامَ او الشرابَ**: کەم کەم تامی خواردنەکە یان شلەمەنییەکەی کرد.

**الأوجَسُ**: خۆراك‌و ئاوو شلەمەنی کەم ٥ لەسیاقی نەفی دا بەکاردێ ٥ دەگوترێ: (ماذقت عنده أوجس) ٥ یان دەگوترێ: (لا أفعل ذلك سجيس الأوجس): تادونیا دونیا بێ من ئەوشتە ناکەم.

**الأوْجُسُ**: بەمانا رۆژگار دێ ٥ دەگوترێ: (لا أفعل ذلك سجيس الأوجُس).

**الواجِسُ**: هەست کردن بەدڵا هاتن ٥ خەتەرەی دڵ.

**الوَجْسُ**: دەنگی نزم.

**وَجِعَ فلان يَوْجَعُ وَجَعاً**: فلانکەس نەخۆش کەوت ئازاری لێ پەیدا بوو.

**وَجَعَ فلانٌ راسَه او بَطْنَهُ**: فلانکەس سەری هێشا یان سکی هێشا ٥ (فهو وجِعٌ وهي وجِعَة).

**اوجَعَ فلان في العَدُوِّ**: فلانکەس فرسەتی لەدوژمن هێنا زەبری کاریگەری لێدا.

**اوجَعَ المرضُ او الضربُ**: نەخۆشییەکە یان لێدانەکە ئازاری زۆری بەفلانکەس گەیاند.

**تَوَجَّعَ فلان**: فلانکەس هاتوهاوارو دادو فیغانی کرد.

**تَوَجَّعَ لفلان**: ئاخ‌و ئۆفی بۆ ئەوکارەساتە خوارد کەبەسەر فلان دا هات، پەرۆشی بوو، خەفەتی بۆخوارد ٥ لاوانەوەی بۆ کرد.

**الوَجَعُ**: ناوێـکی گشتییه بـۆ هـەموو ئـێش‌و ئازارێـک کەلەجەسـتەدا پەیدابێ ٥ (ك: أوجاع) ٥ (**الوَجْعاءُ**): قنگ ٥ (ك: وَجْعاوات).

**الوَجِيعُ**: بەئێش ٥ بەئازار ٥ دەگوترێ: (ضرب مُوجِعٌ).

**وَجَـفَ الـشَّيْئُ يَجِـفُ وَجْفـاً**: پەشـۆکا، لەگرێژنە چوو.

**وَجَفَ البعيرُ او الفرسُ**: حوشـترەکە یـان ئەسپەکە خێرا ڕۆیی.

**وَجَفَ القلبُ**: دڵەکە کەوتە لێدانی خێـرا ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿قُلُـوبٌ يَوْمَئِـذٍ وَاجِفَةٌ﴾.

**وَجَـفَ فـلان**: فلانکەس لەترسا کـەوت ٥ (فهو واجف وهي واجفة).

**اوجَـفَ الـسائرُ**: ڕێبوارەکـە بەپەلـە ڕۆیی، پەلەی کرد لەڕۆیین دا.

**اوجَـفَ فـلان فلانـاً**: فلانکـەس فلانـی هەڵنا بۆ کارێـک.

**اوجَـفَ فـلان دابَّتـه**: فلانکـەس وڵاخەکـەی دەنـە دەنـە دا بـۆ ڕۆیشتن.

**اوجَفَ الشَّيْئَ**: شتەکەی جوڵاند.

**اوجَفَ الباب**: دەرگاکەی داخست.

**اسـتوجَفَهُ**: بـردی ٥ دەگـوترێ: (إستوجَفَ الحُـبُّ فـؤاده): دڵداری‌و عیشق دڵی بردوه.

**الميجافُ**: دەگوترێ: (دابـة ميجـاف): وڵاخێکە خۆشڕۆو خێرا ڕۆیە.

**وَجَلَهُ يَوْجُلُهُ وَجْلاً**: لـەترس‌و بـیم دا بەسەری دا زاڵ بوو.

**وَجِلَ يَوْجَلُ وجلاً**: ترسا، زەنـدەقی چوو ٥ (فهو أوجل ووَجل وهي وَجِلَةٌ).

**وَجُلَ يَوْجُلُ وَجَلاً ووجالَـةً**: گەورە بوو ٥ هەڵچوو.

**اوجَلَهُ**: ترسانـدی.

**واجَلَ فلانـاً**: لەترسـان‌و بـێ ورەیـی دا پێشبڕکێی لەگەڵ فلان کرد.

**المَوْجَلُ**: چاوگی (وَجَلَ)یە ٥ بەردێـکی لوسـەو مەیلـەو نەرمـە واتـە بـەردە قسڵ.

**المَوْجِلُ**: شوێنی ترس ٥ چاڵێکە ئاوی تێدا رادەوەستێ.

**الوُجولُ**: پیران، پیرەکان.

**الوَجِيلُ**: چاڵێـکە زەلکاوێـکە ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە.

**وَجَـمَ يَجِـمُ وَجْمـاً ووجومـاً**: بـەرق هەڵـساوی بێـدەنگ بـوو ٥ ڕوی خـۆی گرژ کردو سەری دانەنەواندو بێـدەنگ بـوو جـۆش دامـاو بەخـەم بـاری خـۆی خواردەوە.

**وَجَـمَ الـشَّيْئَ**: شـتەکەی ناخۆشویـست ٥ (فهو واجِمٌ).

**وَجَمَ عنـه**: لەترسا بێـدەنگ بـوو ٥ (فهـو واجم).

**وَجَمَ فلاناً**: مستەکۆڵەی لەفلان دا.

**الـوَجْمُ**: چـەند کەڵـەك و بینـاو شـتی وەهان دەکرێنـە نیشانە بۆ رێـگای چۆڵەوانی و سارا ٥ بـەردی گـەورە ٥ دەشگوترێ: (رجل وَجْـمٌ): پیاوێـکی هیچ و پوچە ٥ (بیت وجم): خـانوی گەورە ٥ (ك: أوجام ووجوم).

**الــوَجْمُ**: بـــەخیل و رژد ٥ جەســـتە بـچکۆلەو ناکـەس بەچـە ٥ کەڵەکـە بـەرد ٥ بـەردی کـۆکراوەو سـەریەك نـراو لەسەر کۆختەو سەنگەرو شتی وادا ٥ بـــەردی ســـەریەك نـــراو بۆشارەزایی کردن و نیشانەی رێـگای دەشـــت و چـۆڵەوانی ٥ (ك: آوجـــام ووجوم) ٥ دەشـگوترێ: (رجُلٌ وَجَمٌ): پیاوی خوێری و خراپ.

**الوَجَمَةُ**: جنێو.

**الوَجيم من الأيام**: رۆژگاری زۆرگەرم.

**الوَجيمَةُ**: بزێو.

**وَجَنَ بالشيئ يَجِنُ وَجْناً**: هاویشتی.

**وَجَــنَ بـه الأرضَ**: بـەزەوی دادا کێـشای بەزەوی دا.

**وَجَنَ الوَتَدَ**: سینگەکەی داکوتا.

**وَجَــنَ القِـصَارِ الثَّـوْبَ**: جـل شـۆرەکە جلەکانی کوتان.

**تَوَجَّنَ فلان**: فلانکەس زەلیـل و ملکەچ بوو.

**الأوجن**: کوڵم گەورە، رومەت پان.

**المُوجَّنُ**: کوڵم گەورە، گۆشتن و قەڵەو.

**الموجونــة مــن النــساء**: ئــافرەتی شەرمن.

**المِيجنة**: ئەو کوتکە دارەیە کە جلشۆر جلـی پـێ دەکوتـێ بـۆ ئـەوەی بـاش پاك بێتەوە ٥ (ك: مواجن ومياجن).

**الوَاجِنُ**: زەوی رەقەڵان و پتەو.

**الوَجْنُ**: بەمانا (الوَاجنُ)دێ.

**الوَجَنُ**: بەمانا (الواجن)دێ.

**الوَجناء**: کوڵم گەورە ٥ کوڵم گۆشتن.

**الوَجْنَةُ**: کوڵم، خڕایی رومەت.

**الوَجَنَةُ**: بەمانا (الوجْنَةُ)دێ.

**الوَجـينُ**: زەوی رەقــی پتــەوو تونــد ٥ بەرد ٥ کەناری روبار.

**وَجَهَ فلان فلاناً عنـد النـاس**: فلانکەس لەناو خەڵك دا لەفلانکەس زیاتر جێی باوەڕو متمانە بوو.

**وَجَهَ فلاناً**: لـەڕوی فلانکەسـی دا، بـەڕوی فلان دا چۆوە، بەرەو روی فلان بۆوە.

**وَجُهَ فلان يَوْجُهُ وَجَاهَـةً**: فلانکـەس بـوو بەخاوەن رێزو قەدر لای خەڵك ٥ (فهو وجيه) ٥ (ك: وُجَهاء) ٥ (وهي وجيهـة) ٥ (ك: وجاه).

**اوْجَهَت المـرأةُ**: ئافرەتەکـە لەسـك و زا وەستایەوە.

**اوجَهَ فلان فلاناً**: فلانکەس فلانکەسی

کردە پیاو ماقوڵ ٥ یان لای خەڵك باسی پیاوەتی ئەوی کردو ڕێزی بۆ پەیدا کرد ٥ گێڕایەوە ٥ بەپیاو ماقوڵی لەقەڵەم دا.

**واجهه موجهة ووجاهاً:** چاوپێکەوتنی لەگەڵ دا کرد ٥ ڕوبەڕوی بۆوە ٥ بەڕوی خۆش‌و قسەی شیرین پێشوازی لیٚ کرد.

**وَجَّهَ:** ملکەچ‌و ژێربار بوو ٥ دەگوترێ: (قاد فلان فلاناً فوجَّهَ): فلان ڕابەرایەتی فلانی کرد ئەویش گوێ بیسی بوو شوێنی کەوت.

**وَجَّهَ المولود:** مندالەکە لەکاتی لەدایکبوونی دا سەرەتا دو دەستی لەمندالدانی دایکیەوە هاتنەدەر.

**وَجَّهَ الى الشَّيْئِ:** ڕوی لەشتەکە کرد.

**وَجَّهَ فلاناً في حاجة:** بۆ ئەنجامدانی کارێك فلانکەسی نارد ڕوی پیٚ لەشتەکە کرد.

**وَجَّهَ الشَّيْئَ:** شتەکەی خستە لایەك لەبەرێکەوە داینا.

**وَجَّهَ النَّخْلَة:** ئەمامەخورماکەی بەرەو شەماڵ توزیٚ خواری چەقاند بایەکە ڕاستی کردەوە.

**وَجَّهَ الناسُ الطريقَ:** خەلکەکە بەرێگا کەدا ڕۆیشتن تا بەتەواوی شوێن پێیان دەرکەوت‌و رێگاکە رون بۆوە.

**وَجَّهَ المطرُ الأرضَ:** زەوییەکە ڕوی زەوی قەلاشتەوە کاری تەواوی لیٚ کردو پێیدا ڕۆیشتە خوار.

**وَجَّهَت الريحُ الحَصَى:** ڕەشەبایەکە بەردە وردەو زیخەکەی ڕادا.

**وَجَّهَ فلاناً:** فلانکەسی خستە سەر ڕێبازێکی تایبەتی.

**إتَّجَهَ اليه:** ڕوی تیٚکرد.

**تواجها:** ڕوبەڕوی یەك بون.

**تَوَجَّهَ:** بۆ موطاوعەی (وَجَّهَهُ)دیٚ.

**تَوَجَّهَ الجيش:** سوپاکە شکا.

**تَوَجَّهَ الشيخ:** پیرەمێردەکە کەنەفت بوو.

**تَوَجَّهَ اليه:** بۆلای چوو ٥ بەرەو ڕوی هات.

**تَوَجَّهَ جِهَةَ كذا:** چو بۆلای ئەو شوێنە.

**التِّجَاهُ:** ئەو شوێنەی بەرەو ڕوی دەچی ٥ دەشگوترێ: (قعدت تجاهَكَ): بەرامبەرت دانیشتم.

**التوجيه:** لەبواری شیعردا بزوێنی پیتی پێش ڕەوییە ٥ لەبواری بەلاغەدا هێنانی کەلام‌و ڕستەیە بەشێوەیەك دومانای دژ بەیەك هەلبگریٚ.

**الجِهَةُ:** لایەن‌و دەڤەرو ناحیە ٥ ئەوشوێنەی بۆی دەچی‌و کردوتە

بەئامانجی خۆت ٥ (ك: جهـات) ٥ دەشگوترێ: (ماله جهة في هذا الأمر): لەم کارەدا ئەو هیچ بەرنامەیەکی ئاشکرای نیە نازانێ چۆن کارەکەی جێ بەجێ دەبێ.

**الموجَّهُ:** خاوەن ڕێزو شکۆمەند.

**الوِجَاهُ:** بەمانا (التِجاه)دێ ٥ دەگوترێ: (داری وِجَــاه دارك): خانوەکــەم بەرامبەر خانوەکەتە ٥ دەشگوترێ: (هـم وجـاه الـف): ئـەوان نزیکـەی هەزار کەس دەبن.

**الوَجَاهَةُ:** پاوانو حورمەت.

**الوَجْـهُ:** دەمو چـاو ٥ گـەورەی هـۆزو خــێڵ، پیــاو مــاقوڵی خێــزان ٥ هەرشتێــك بەرامبــەرت بــێ، ڕوی لێت بێ ٥ خودی شتو زاتی شت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّـــا وَجْهَــــهُ﴾ ٥ دڵو دەرون ٥ لەحــەدیــث دا هــاتووە: (لَتُــسَوُّن صفوفكم أو ليخالفَنَّ بين وَجُوهَكم) ٥ وشــەی (وجـــــوهكم): بـــەمانا (قلـــوبکم)دێ ٥ هــەروا نــاوە بــۆ سەرەتای ڕۆژگار، بۆسەرەتای ڕۆژ ٥ بۆ نوێـژی بـەیانی ٥ بـۆ ئەوبەشـەی دەبینـــدرێ لـــەڕوی ئەســـتێرە، لەپۆشــاك، ڕوی دەرەوەی، لــەخانو ئــەو ڕوەی کــە دەرگــای ســەرەکی تێدایە ٥ جۆرێك ناو ٥ شکۆمەندیی ٥ مەبەسـت ٥ ڕاسـتیو دروسـتی ٥ دەگـوترێ: (لـيس لكلامــه وجــه): قسەکەی لایـەنی ڕاسـتی تێدانییـە ٥ لەبواری قسەکردنو نوسین دا ئـەو ڕێبازەیـە دەیگرێـە بـەرو پـەیڕەوی دەکەی ٥ هەروا بەمانا جۆرو بەشو شێوە دێ ٥ دەشگوترێ: (رجـل حُـرُّ الوَجْـهِ وعبـد الوجـه وسَـهْل الوَجْـهِ) واتـە: دەمو چـاوی تـەختن کـوڵمی خـڕنین، کـوڵمی بـەرز نەبۆتـەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (رجل ذو وجهين): پیاوێــــــکی دوڕوووە لای ئــــــەم قــسەیەكو لای ئـــەو پێــچەوانەی قــسەی پێــشووی دەدوێ ٥ (ووجــوه القرآن): واتە: ماناکانی قورئان.

**الوُجَهَـةُ:** لایـــەنو دەفـــەرو ناحیـــە ٥ ئەوشـــوێنەی ڕوی تـــێ دەکـــەیو دەیکەیتــە ئامــانج ٥ هەرشوێنێــك ڕوی تێکەی ٥ ڕۆگەی نوێژو قیبلە.

**الوَجيه:** شکۆمەند ٥ ڕیش سپی خێڵو هــۆز ٥ (ك: وجهـــاء): منداڵێـــك کەلـــەکاتی لـــەدایکبوونی دا دوو دەســتی بێنــە دەر ئــەمجار بــاقی جەســتەی بێتــە دەر ٥ جوانــوە ماینێك لەکاتی هاتنە دەرەوەی دوو دەستی بەیەکەوە بێنەدەر ئەمجار باقی جەستەی.

**وجاه يجيه وجياً**: بەبێ خێرو هیچو پوچی زانی.

**وَجِــيَ يَــوْجى وجــىً**: بــەهۆی زۆر رۆیشتنەوە سمی سوانو تـەنك بـوون ٥ (فهو وَجٍ ووَجِيّ وهي وجياء).

**اوجى عَنْ كذا**: مانی لەوشتەگرت.

**اوجى الصائدُ**: ڕاوکەرەکە نەیتوانی نێچیر بگرێ هیچی دەست نەکەوت.

**اوجى حافر البئر**: بیرهەڵکەنەکە گەیشتە رەقایی‌و نەیتوانی چیدی بیرەکە قوڵ بکا.

**اوجى على فلان**: چروکی‌و ڕژدی لەگەڵ فلانکەس کرد.

**اوجى فلاناً**: فلانکەسی بەهیچو پوچ هاتە بەرچاوو بەبێ خێرو بێر بوو ٥ نەیهێشت بەئامانجی خۆی بگا.

**اَوْجَى فلان عَنْ فلان الظلمَ ونحوه**: فلانکەس زوڵمو زۆری لەفلان دوورخستەوەو نەیهێشت بیچەوسێننەوە.

**تَوَجّى**: بەمانا (وَجِيَ)دێ.

**وَحَدَ يَحِدُ حِدَةً ووَحْداً ووحوداً**: تاك بۆوە.

**وَحَدَ الشَّيْئَ**: شتەکەی تاك کردەوە.

**وَحَدَ يَوْحَدُ وَحْداً**: بەتەنیا مایەوە.

**اوحَدَت المراةُ**: ئافرەتەکە یەك منداڵی بوو ٥ دەشگوترێ: (أوحدت الشاةُ): مەڕەکە یەك بێچوی بوو.

**اوحَدَتْ المراةُ بإبنها**: ئافرەتەکە منداڵێکی بوو تاقانەو بێ وێنە.

**اوْحَدَ اللهُ فلاناً**: خودا فلانکەسی کردە تاقانەی رۆژگاری خۆی بەتەنیا هێشتیەوە.

**اوْحَدَ الشَيْئَ**: شتەکەی تاك کردەوە ٥ دەشگوترێ: (أوحَدَ الناسُ فلاناً): خەڵکەکە فلانکەسیان بەتەنیا هێشتەوە ٥ بەتەنیا جێیان هێلا.

**وَحَّدَ اللهَ سبحانَهُ**: بڕوای بەوەهێنا کەخودا تاكو تەنیایە.

**وَحَّدَ الشَّيْئَ**: شتەکەی تاك کرد بەتاکی زانی.

**إتَّحَدَ**: تاك بۆوە.

**إتَّحَدَ الشيئان او الأشياء**: شتەکان بوون بەیەك شت.

**تَوَحَّدَ اللهُ بِرُبوبيته وجلاله وعظمته**: خودا تاكو تەنهایە لەخودایەتی‌و لەشکۆمەندی‌و گەورەیی دا.

**تَوَحَّدَ فلان**: فلانکەس بەتەنیا مایەوە.

**تَوَحَّدَ برايه**: تاکڕەوی کرد.

**تَوَحَّدَ اللهُ تعالى فلاناً بعصمته**: خودا فلانکەسی پاراستو چاودێری کرد.

**اِسْتَوْحَدَ**: بوو بەیەك.

**الأحد**: یەك، تاكو تەنها ٥ بۆ نێرو

مێ ٥ لەدوو شوێن دا لەگەڵ وشەی (الواحد)دا یەك دەگرن ٥ یەکەمیان کەدەکرێ بەناوەڵناو بۆ پەروەردگار دەگوترێ: (هو الواحد وهو الأحد) وەلێ ناکرێ بەناوەڵناوی غەیری خودا، واتە ناگوترێ: (رجل أحد) ٥ دوهەمیان لەناوەکانی ژمارەدا، دەگوترێ: (أحد وعشرون وواحد وعشرون) ٥ جگە لەم دووشوێنە جودا وازی لەنێوان وشەی (أحد وواحد)دا هەیە، وشەی (أحد) لەسیاقی نەفیو نینکاری دا بەکاردەهێندرێ دەڵێی (ماقام أحد، ماقام أحد الثلاثة)، وەلێ وشەی (واحد) لەسیاقی ئیپبات دا بەکاردێ، دەڵێی: (جاءني واحد من القوم).

**الأحدِيّة**: تاكو تەنهایی، سیفەتێکە لەسیفەتەکانی خودا، واتە زاتی پاکی پەروەردگار لەهەموو رویەکەوە تاكو تەنهاو بێ وێنەیە تەعەددو تەرکیبی تێدانییە.

**الأوحد**: (الله الأوحد): خودای تاكو تەنها لەهەموو رویەکەوە بەهەموو مانایەك بێ وێنەو بێ هاوتا ٥ دەشگوترێ: (فلان أوحد زمانه): فلانکەس تاکە پیاوی رۆژگاری خۆیەتی.

**التوحید**: یەکتاپەرستی ٥ خودا بەیەکناسین ٥ دوورخستنەوەی زاتی خودا لەهەر شێوەو وێنەیەك بەزیهنو خەیاڵ دا دێ ٥ هەرچی تۆ تەصەوری بکەی لەشێوەو وێنەی خودا لەوە دوورەو مونەزەهە ٥ (مذهب التوحید): لەبواری فەلسەفەدا داننانە بە هەبوونی یەك خودا بۆ بونەوەر.

**توحید النمط**: لەبواری ئابوریی سیاسی دا ئەومیە کارگەکانی نمونەیەك یان چەند نمونەیەکی کەم بەرهەم بێنن لەکالآ ٥ (علم التوحید): زانیاریو لێکۆڵینەوە لەبواری عیلمی کەلام دا.

**الحِدَةُ**: دەگوترێ: (هذا الشَيْءِ على حدته): ئەمە لەسەر باری خۆیەتی، وەکوو خۆی وایە.

**المُوَحَّدُ**: ئەو پیتانەن یەك خاڵیان هەیە وەکوو (ف، ب، ن) ٥ (موحّد الخواص): لەبواری سروشت دا بەقەبارەیەك دەگوترێ یان بەناوەندێك دەگوترێ لەهەموو لایەك تایبەتمەندییەکانی وەکوو یەکبن.

**مَوْحَدَ**: دەگوترێ: (دخلوا مَوْحَدَ

مَوْحَدَ): یەك یەك هاتنە ژوورەوە.

**الميحاد:** چەند تەپۆڵکەو کۆمەڵە گلی لێك جیابۆوە.

**الواحــــد:** ناوەڵنـــاوی خـــودای پەروەردگارەو بەمانا تاك‌و تەنهاو بێ هاوەڵەودووەمی نییە ٥ یەکەم ژمـــارەی حیـــسابو نـــەژمار ٥ پێـــشکەوتوو زیـــرەك لـــەبواری زانـــستێك دا یـــان لەبوارێـــك لەبوارەکانی ژیان دا ٥ واتە تاقانەی نەوشتە، تاکەکەس لەو بوارەدا ٥ یان بەشێـك لەشت ٥ (ك: وُحـدان أُحْدان) ٥ دەشگوترێ: (فلان واحـد الأحدين، واحد الآحـاد، واحـد أمـه، واحد الدهر).

**الواحِديّــة:** لـــەبواری فەلـــسەفەدا ڕێبازێـــکە بونـــەوەر دەباتـــەوە ســـەریەك بنـــەما وەکـــوو گیـــانی مەحض یان سرووشتی مەحض.

**وُحَادَ:** دەگوترێ: (دخلوا وُحاد وُحادَ): یەك یەك هاتنە ژورەوە.

**الوَحْــدُ:** چـاوگە، تـەنێیـەو جـەمع ناکرێتەوە ٥ دەگوترێ: (رأيته وَحْدَهُ، ورأيتها وحدها).

**الوَحَــدُ:** کەسێــك بنەچــەو نــەژادی نەزاندرێ.

**الوَحْداني:** نیسبەتدانی یەکێکە بۆلای تـــەنیایی تـــەرەبوو لەکۆمـــەڵ‌و تاکڕەوو خود پەسەند ٥ لەحـەدیث دا هـاتووە: (شـرُّ أمـتي الوحـداني المعجب بدينه المرئي بعمله).

**الوَحْدانِيَــةُ:** چـاوگی دروســتکراوە ٥ (مـــصدر صـــناعي)یـــە دەکرێتـــە صیفەتێـــك لەصـــیفەتەکانی پـــەروەردگار واتـــە هـــیچ شتێـــك هاوبەشـــی خودانیـــە لەماهیـــەت‌و صیفات‌و شکۆمەندی دا، خۆی تاکە خودایـــە کـــە بونـــەوەری بـــەدی هێناوەو هەڵیدەسوڕێنێ‌و بەڕێوەی دەبا.

**الوَحْــدَةُ المربعــة:** قەبارەیـــەکی چوارگۆشە کە هەموو لایەکی یەك مەتر بێ ٥ واتە هەموو بوعدەکانی بەئەنـدازەی یـەکتربن ٥ لـەبواری سیاســی دا بریتییـــە لەیەکیـــەتی دووگەل‌و نەتەوە یان زیاتر لەچوار شـــتی ســـەرەکی دا (ســـەرۆکایەتی، ڕامیاریی، سوپا، ئابوری).

**وحدة النقد:** لەبواری ئابوری سیاسی دا بریتییـــە لەکێـــشێکی نـــەگۆڕو دامەزراو لەمەعدەنێکی تایبـەتی دا بـــەقانون قـــەبارەو وەزن‌و شـــێوەی دیاریی دەکرێ.

**الوَحيد:** تاق‌و تەنیا ٥ تاقەوە بوو.

**وَحِرَ يَوْحَرُ وحَراً:** بەرماوەی سەرمازەڵەی خـــوارد یـــان خـــواردەوە نەوشـــتەی

سەرمازەڵە لێی خوارد بوو یان لێی خواردبووەوە ئەم خواردی بۆیە ژەهرەکەی کاری تێکرد.

**وَحِرَ الطعامُ:** خۆراکەکە سەرمازەڵەی تێکەوت.

**وَحِرَ صَدْرُ فلان علی فلان:** دڵی فلاّنکەس لەفلاّن کرمێ بوو ٥ بوغزو کینەی لێ هەڵگرت.

**اوْحَرَت الوَحَرَةُ الطعامَ:** سەرمازەڵە بەسەر خواردنەکەدا رۆیی‌و ژەهراوی کرد هەرکەسێ لێی بخوا توشی رشانەوەو سکچون دەبێ، یان دەمرێ.

**اوْحَرَ فلاناً:** قسەیەکی ناخۆشی بەگوێی فلان دا چپاند ٥ قسەیەکی ناخۆشی پێ گوت.

**الوَحْرُ:** حیقدو کینە ٥ رق‌و کینە ٥ غەش‌و فێڵ ٥ رق هەڵسانی زۆر ٥ دوژمنایەتی ٥ ختوکەو وەسوەسەی دڵ.

**الوَحَرُ:** بەمانا (الوَحْرُ)دێ.

**الوَحَرَةُ:** سەرمازەڵەو قۆرێ کەلەبیاباندا دژی ٥ پێرۆیەکە لەسەرشێوەی بوکە خاتونکەیەکی بەڵەک، کلکێکی باریکی هەیە، بەسەر هەرشتێك دا بڕوا ژەهراوی دەکا لەهەرشتێك بخوا بەرماوەکەی ژەهراوی دەبێ هەرکەسێك لەوشتە بخوا سکی دەچێ یان دەڕشێتەوە یان دەمرێ ٥ رەنگی سپییە خاڵی سوری تێدان عەرەب بێزیان لێیەتی‌و نایخۆن ٥ هەروا وشەی (وَحِرَة) ناوە بۆ حوشتری کورت ٥ دەشگوترێ: (إمرأة وَحِرَة): ئافرەتێکی رەش پێست‌و ناشیرینە ٥ یان سوری کورتە بالاّیە.

**وَحَشَ فلان بثوبه وسِلاحه ونحوهما:** فلانکەس پۆشاکەکەی یان چەکەکەی فڕێ دا، دایناو.

**وَحِشَ فلان الشَیْئ یَوْحَشُ وحشةً:** فلاّنکەس هەستی بەدڵتەنگی‌و ناخۆشی کرد.

**وُحِشَ المكانُ:** شوێنەکە وەحش‌و جڕو جانەوەری زۆر بوون ٥ دەشگوترێ: (أرض مُوَحِشة): زەوییەکی وەحش‌و جڕو جانەوەراوییە.

**اوْحَشَ فلانٌ:** فلانکەس تێشوەکەی بڕایەوەو برسی بوو.

**اوحَشَ المكانُ:** شوێنەکە چۆڵ بوو کەسی تێدانەما ٥ وەحش‌و جڕو جانەوەری زۆر تێداپەیدا بوو.

**اوحَشَ فلاناً:** فلاّنکەسی والێ کرد دڵتەنگ‌و خەفەتبار بێ.

**اوحِشَ المكانَ:** شوێنەکەی چۆڵی‌و کەس تێدا نەماویی بینی.

**وَحَّشَ فلان بثوبه وسلاحه:** فلانكەس پۆشاكو سیلاحی خۆی فڕێ دا، داینان.

**تَوَحَّشَ فلان:** فلانكەس پۆشاكی خۆی داكەند، فڕێی دا ٥ برسی بوو.

**تَوَحَّشَ جَوفَهُ:** ناوسكی هیچ خۆراكی تێدانەما خاڵی بوو.

**تَوَحَّشَ للدواء:** گەدەی خۆی خاڵی كرد بۆئەوەی خڵتەو پڵتەی ناو ڕەگی لەشی بەئاسانی بێتەدەر.

**تَوَحَّشَ المكان من أهله:** وڵاتەكە لەدانیشتوانەكەی خاڵی بوو.

**أوْحَشَتِ الأرض:** زەوییە خاڵی بوو لەئادەمیزاد.

**استَوحَشَ فلان:** بۆ موطاوعەی (أوحشه)دێ ٥ هەستی بەدڵتەنگیو ناخۆشی كرد.

**استَوْحَشَ منه:** وەگری نەبوو، لێی تەرەبوو، چووە پاڵ حەیواناتی كێوییەوە ٥ وەكێوی كەوت.

**الحِشَةُ:** زەوی وێرانو كەس تێدانەماوو چۆڵ.

**الوَحْشُ:** كوی (وحشي)یە ٥ ئەو حەیوانە كێوییە یە وەگری ئادەمیزاد نەبێو لەگەڵی ڕانەیە ٥ (ك: وحوش، ورحشان) ٥ دەشگوترێ: (حِمار وحش وحِمار وحشي) ٥ دەشگوترێ: (بات وحشاً): شەو بەبرسیەتی سەری نایەوە، هیچی نەخواردو گەدەی بەخاڵی مایەوە ٥ (مشى في الأرض وحشاً): بەتەنیا بەناو وڵات دا گەڕا كەسی لەگەڵ نەبوو ٥ (مكان وَحْش): وڵاتێكی چۆڵو حاڵی لە مرۆڤ.

**الوَحْشَةُ:** زەوی چۆڵەوانی ٥ خاڵی لەمرۆڤو ئاوەدانی.

**الوَحْشَةُ من الناس:** دابڕان لەكۆمەڵی ئادەمیزادو تەرە بوون ٥ گۆشەگیری ٥ ترسان ٥ غەمناكی.

**الوَحْشِيّ:** تاكی (الوَحْش)ە ٥ لای ڕاستی هەرشتێك بێ ٥ ئەوبەشەی دەستو قاچ كەڕوناكەنە خاوەنەكەی ٥ هەنجیرە كێویلە لەهەر ڕەنگێ بێ ڕەشو سورو سپی.

**الوَحِشُ:** هەر ئاژەڵو گیانلەبەرێكی كێوی كەماڵی نەبێ.

**وَحَصَهُ يَحِصَهُ وَحْصاً:** ڕایكێشا.

**الوَحْصُ:** زیپكە كەلەڕوخساری ئافرەتی جوان دا دەربكەوێ.

**الوَحْصَةُ:** سەرما.

**وَحَفَ يَحِفُ وحفاً:** خۆی بەزەوی دا دا.

**وَحَفَ البعيرُ:** حوشترەكە پەلەی كرد.

**وَحَفَ منه:** لێی نزیك بۆوە.

**وَحَفَ اليه:** چو بۆلای، كردی بەئامانجی خۆی ٥ لای دانیشت.

**وَحِفَ النباتُ والشَّعْرُ:** گژوگیایەکە یان قژەکە چڕو پڕ بوون، بنکی داکوتا، ڕەش بوون.
**وَحُـــفَ النبـــاتُ والـــشَّعْرُ:** بـــەمانا (وَحِفَ)دێ.
**اوْحَفَ:** پەلەی کرد.
**اوحَفَ اليه:** چو بۆلای، لای دانیشت ٥ بوو بەمیوانی.
**وَحَّفَ:** خۆی بەزەوی دادا ٥ دەگوترێ: (وَحَّفَ البعيرُ): حوشترەکە لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد.
**وَحَّـفَ الـشَيْئَ:** بەگۆچـانو عەصـا شتەکەی کوتا.
**المُوَحَّفُ:** حوشتری لەڕو لاواز.
**المَوْحِفُ:** ئەوشـوێنەی حوشـتر تێیـدا پیخ دەدرێ.
**الوَاحِفُ من النبـات والـشَّعْرِ:** ڕوەكو مـوو ئەگـەر زۆر چـڕو پـڕبن ڕش بنـوێنن ٥ بـاڵی باڵنـدە کەپـەڕی زۆربن ٥ دۆلچە کەسیرمەی بچڕابنو دووی مابن.
**الوَحْفُ مـن النبـات والـشَّعْرِ:** بـەمانا (الوَاحِف)دێ ٥ هـەروا نـاوە بـۆ بـاڵی باڵندە کە پەڕو پۆلی زۆر بن.
**الوَحْفُ:** قژی پڕو ڕەش ٥ باڵی باڵنـدە کــە زۆری پــەڕو پــۆڵ پێــوەبن ٥ گیاوگژ چڕو پڕو تێـك هاڵاو بێ ٥ بنكو ڕەگی بەهێزو پتەو بن.
**الوَحْفـاءُ:** زەوییــەك بــەردی ڕەشــی تێدابنو بەردەڵانو حەڕەنەبێ.
**الوَحْفَةُ:** تەپۆڵکەی خڕو بەرزو ڕەش ٥ گاشـە بـەرد لـەناو شـیوو دۆڵ دا ٥ دەنگ بەگشتی.
**وَحَلَ فلان فلاناً يَحِلُهُ وَحْلاً:** فلانکەس لەفلان باشتر ڕۆچو.
**وَحِلَ يَوْحَلُ وَحَلاً:** کەوتـە نـاو قوڕەوەو کەوتە پەلە پەلی خۆڕزگار کردن.
**اوْحَلَهُ:** خستیە ناو قوڕەوە.
**اوحَلَ فلانـاً شَـرّاً:** فلانکەسـی توشـی شەڕکردو تێیەوە پێچا.
**واحَلَــهُ:** پێــشبڕکێی لەگــەڵ دا کــرد لەچــوونە نــاو قــوڕو لیتــەوە ٥ دەگوترێ: (واحلـه فوحَلَـهُ) لەچونە ناو قوڕو ڕاکردن تێیـدا پێشبڕکێیان کرد یەکیان بەسـەر ئـەوی تـردا زاڵ بوو.
**تَوَحَّلَ:** بەمانا (وَحَلَ)دێ.
**تَوَحَّلَ المكانُ:** شوێنەکە بوو بە قوڕو لیتە.
**استوحَلَ المكانُ:** بەمانا (تَوَحَّلَ)دێ.
**المَوْحِلُ:** شوێنی قوڕاوی.
**الوَحَلُ:** قوڕ (قوڕە لیتە قوڕی شل کە قاچی پێدا ڕۆبچێ) ٥ (ك: اوحـال ووحول).

**وَحَمَت الحُبْلى**: ئافرەتە سك پڕەكە بێزوی كردن، حەزی لەجۆرە خواردنێك بوو.

**وَحِمَ الرجُل**: پیاوەكە زۆری حەز لەشتێك بوو، حەز لێ بونەكەی لەسنور دەرچوو ٥ (فهو وَحِم وهي وحمى).

**وَحُمَ الحُبْلى**: ئەو خواردنەی بێزوكەر حەزی لێ بوو دەرخواردی دا.

**الوَحَمُ**: ناوە بۆ ئەو خواردنەی ئافرەتی بێزوكەر حەزی لێیە ٥ دەشگوترێ: (ليلة ذات وحمٍ): شەوێكە هەوای گەرمە.

**الوَحِمُ، يوم وحِمٌ**: ڕۆژێكی زۆر گەرمە.

**وَحَنَ عليه يَحِنُ وَحَناً حِنَةً**: زەلیل بوو ٥ بەهیلاك چوو ٥ ورگی زل بوو ٥ دەشگوترێ: (تَوَحَّنَ بطنه): ورگی زل بوو.

**الوَحْنة**: قوڕی لینجو خلیسك.

**وَحْوَحَ الرجلُ**: پیاوەكە دەنگی لێوەهاتو پەحا پەحای كرد ٥ یان سەرمای بوو دەستی چونو فوی دەكردە ناو دەستییەوە بۆئەوەی دەستی گەرم ببنەوە.

**وَحْوَحَ من البرد**: لەسەرما هەناسەی خۆی لەقوڕگی دا دەهێناو دەبرد بۆئەوەی دەنگی ببیسرێ.

**تَوَحْوَحَ الظليمُ فوق البيض**: نوعامەكە لەسەر هێلكەكانی كڕكەوت.

**الوَحْوَاحُ**: بەهێزو تواناو نیشاتكەلەكاتی نیش كردنو هەوڵدان دا نركەی لێوەدێ لەبەر تەڕدەماخیو بەهێزی خۆی دەخواتەوە ٥ لەسەرە خۆو خۆگرو نەفەس درێژ ٥ پیاوی گورجو گۆڵو لەش سوك ٥ (ك: وَحَاويح).

**الوَحْوَحُ**: بەمانا (الوَحْواحُ)دێ ٥ ناوەڕاستی شیوو دۆڵ.

**وَحَى اليه وله**: ئاماژەی بۆكرد ٥ قسەی لەگەڵ كرد بەئاخاوتنێك كەسانی تر گوێیان لێ نەبوو یان تێی نەگەن ٥ نامەی بۆ نوسی ٥ فەرمانی پێ كرد.

**وَحَى الله اليه**: خودا ڕەوانەی كرد، نیگای بۆنارد ٥ ژێرباری كرد.

**وَحَى القوم وَحياً**: خەڵكەكە كەوتنە هاتو هاوار.

**وَحَى فلان الكلامَ الى فلان وَحْياً**: فلانكەس ئاخاوتنەكەی بەفلان گەیاندو خستیە بەرگوێچكەی.

**وَحَى الذبيحَةَ**: بەخێرایی كوشتیەكەی سەربڕی.

**اوحى اليه وله**: ئاماژەی بۆكرد بۆی

نارد ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾: نیگای بۆکردن فەرمانی پێکردن کەبەیانیو ئێوارەو هەموو کاتێك تەسبیحاتی خودا بکەن ◦ بەجۆرێك قسەی لەگەڵ دا کرد کەسانی تر لێی حاڵی نەبوون ◦ نامەی بۆنوسی ◦ فەرمانی پێ کرد.

**اوحی الله الیه**: خودا کردی بەپەیامبەر ◦ ویستی خۆی خستە دڵیەوە ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا﴾ ◦ زێربارو ملکەچی کرد.

**اوحی نَفْسُهُ**: ترسو بیم کەوتە ناو دڵیەوە.

**اوحی القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە هاتو هاوار.

**اوحی بالشَّیْئِ**: پەلەی کرد بەشتەکە.

**اوحی فلان الکلامَ الی فلان**: فلانکەس قسەکەی بەفلان گەیاند، قسەکەی بەگوێدا دا.

**اوحی المیتَ**: بۆ مردووەکە گریا، وایە شێرەی بۆکرد ◦ دەگوترێ: (أوحت النائحةُ المیّتَ): ئافرەتە شینگێڕەکە شینو شەپۆری گێڕا بۆ مردووەکە.

**اوحی العملَ**: خێرا کارەکەی کرد.

**وَحَّی العَمَلَ**: خێرا کارەکەی کرد پەلەی لەکردنی دا کرد.

**وَحَّی الذبیحَةَ**: خێرا کوشتییەکەی سەربڕی.

**تَوَحَّی**: پەلەی کرد ◦ لەحەدیشدا هاتووە: (إذا أردت أمراً فتدبَرْ عاقبته فإن کانت شراً فانته وإن کانت خیراً فَتَوَحَّهُ).

**استوحی الإنسانَ والحیوانَ**: بانگی ئادەمیزادەکەی کرد بۆئەوەی ڕەوانەی بکا ◦ بینێرێ ◦ پەلەی لێ کرد.

**استوحی الشَّیْئَ**: شتەکەی جوڵاند، خستیە جمو جوڵ.

**استوحی فلاناً**: هاواری کردە فلانکەس فریای بکەوێ ◦ پرسیاری لێ کرد.

**الوَحْیُ**: هەرشتێك بیخەیە بەر گوێچکەی یەکێکی تر بۆ ئەوەی فێری بکەی، هەروا ناوە بۆ نیگای خودا کە بۆ فرستادەکانی خۆی دەنێرێ ◦ دەنگ بەگشتی دەنگی ئادەمیزاد بێ یان هی شتی تر ◦ هەروا ناوە بۆ کتێبو نوسراو بۆ نووسینو خەت.

**الوَحی الوَحَی**: خێرا خێرا،

دەشـگوترێ: (الوَحَـاكَ الوَحَـاكَ) ٥ كافەكـە كـافی خیطـابـە ٥ هـەروا وشـەی (الـوَحی): بـەمانا دەنـگ دێ بەگـشتی، دەنگـی ئـادەمیزاد یـان دەنگی شـتی تربێ ٥ ئـاگر ٥ پاشا ٥ فریشتە ٥ ریش سپیو پیاو ماقوڵی هۆزو وڵات.

**الوَحَـاءُ الوَحَـاءُ:** خێـرا خێـرا ٥ دەی دەی ٥ زو زو.

**الوَحَـاةُ:** دەنـگ بەگـشتی، دەنگـی ئادەمیزاد بێ یان دەنگی شتی تر.

**الـوَحِيُّ:** (شَـيْئٌ وَحِـيٌّ) شـتی خێـراو بەپەلە.

**وَخَـدَ الـبعيرُ يَخِـدُ وَخـداً ووخيـداً ووَخـداناً:** حوشـترەکە پەلـەی کـردو هەنگاوەکانی فراوان کردن ٥ قاچەکانی هاویشتن وەکوو نوعامە ٥ (فهـو واخـد ووخاد ووخود).

**وَخَـزَ فـلان يَخِـزُ وَخْـزاً:** فلآنکـەس تێکوشاوی هەنگوینی دروستکرد.

**وَخَزَ الشَّيْئَ بالرمح وغيره:** بـەرمب یـان بەشـتی تـر زەبـری لەشـتەکە وەشـاند وەلێ ئەمدیواو دیو کونی نەکرد.

**وَخَـزَ الحـافِرَ:** بەیتارەکـە دەرزییـەکی سـوکی لـەژوور سمتـی وڵاخەکـەدا بەمەبەسـتی چارەسـەرکردن، سـەری دەرزییەکەی نەگەیاندە دەمار.

**وَخَـزَ الشيبُ فلانـاً:** پـیریو مـوی سپی تێـکەڵ بـەموی رەشـی کـابرا بـونو مودوا موی سپی بوون.

**الـوَخْزُ:** ئیشو ئازار ٥ برین لـێ کـردن بەسەری رمب یان بـەنوکی دەرزی ٥ هەرشتێـك کەم بـێ ٥ دەگـوترێ: (في العِذق وخـز قليـل مـن الخـضرة): لـە لقەدارەکەدا کەمێك سەوزایی هەیە ٥ (في الرأس وخز قليل مـن الـشيب): لەقژی سەری دا کەمێك مـوی سپی هـەن ٥ دەشـگوترێ: (جـاءوا وخْـزاً وخزاً): چوار چوار هاتن.

**الوَخِيزُ:** تێکوشاوی هەنگوین.

**وَخُشَ الشَّيْئُ يَوْخَشُ وخاشَةً:** رەزیـلو چروك بوو خـراپ بـوو، وشـكو سیس بوو.

**اوْخَشَ لفلان بعطيةٍ:** بەخششی کەمی دا بـەفلآن ٥ بەخشـشەکەی کـەم کردەوە.

**اوْخَـشَ في عـرض فـلان:** ناموسـی فلآنکەسـی لەکـەدار کـرد ٥ تانـەو تەشەری لەبنەماڵەو نەژادی دا.

**اوخَـشَ القَـومُ:** خەڵکەکـە سـەرە تیرەکانیـان گێڕاندنـەوە بـۆ نـاو تیردانەکانیان.

**اوخَـشَ الـشَّيْئَ:** شـتەکەی تێـکەڵاو کرد.

**وَخُشَ**: دەستی بەردانەوەو ملکەچی خۆی ڕاگەیاند.

**وَخُشَ لفلان بالعطية**: بەخششی فلاّنکەسی کەم کردەوە.

**الوَخْشُ**: شتی خراپ لە هەرشتێك بێ ٥ پیاوی خوێڕیو هەتیو مچەی ٥ بۆ نێرومێ بەیەك شێوەیە، وایش دەبێ جوداوازی نێوان نێرو مێ بە (ت) دەکرێ.

**وَخَطَ يَخِطُ وخطاً**: پەلەی کرد ٥ دەگوترێ: (وَخَطَ الظليمُ): نوعامەکە پەلەی کرد.

**وَخَطَ فيه**: چووە ناویەوە.

**وَخَطَ في البيع**: لەمامەڵەکەدا جارێك قازانجو جارێك زەرەری کرد.

**وَخَطَت النِعالُ**: نەعلەکان دەنگیان لێوە هات.

**وَخَطَ فلان فلاناً**: فلاّنکەس زەبرێکی سوکی لەفلاّن دا ٥ لەدوورەوە شمشێری ئاڕاستەکرد.

**وَخَطَ الشَيْبُ فلاناً**: موی سپی بەناو قژو مووەکانی دا بلاّو بۆوە ٥ قژی سەریو موی ریشی ماشو برنج بوون ٥ (فهو واخِط ووخاط).

**وُخِطَ فلان**: فلاّنکەس سەری سپی بوو ٥ (فهو موخوط).

**الوَخْطُ من الشَيْءِ**: کەمێك لە شت.

**وَخَفَ السويقُ**: قاوتەکە بەهۆی کوتانەوە لینجاوی دایەوە.

**وَخَفَ فلانٌ السويقَ**: فلاّنکەس قاوتەکەی کوتا تا لینجاوی دایەوە ٥ یان ئاوی تێکردو کوتای تا بەتەواوی نەرم بوو ٥ تێکەلاّو بوو.

**وَخَفَ فلاناً**: غەیبەتی فلاّنکەسی کرد، گوفتارو کرداری ناشیرینی پاڵ فلاّنکەس دا ٥ ناموسو کەسایەتی لەکەدار کرد.

**اوخَفَ**: پەلەی کرد.

**اوخَفَ فلان السويقَ**: بەمانا (وَخَفَهُ)دێ.

**إتَّخَفَتْ رِجْلُهُ**: قاچی هەڵخلیسکا.

**استوخَفَ الدهر مَالَهُ**: ڕۆژگار ماڵو سامانی فەوتاندو هیچی بۆنەهێشتەوە.

**المِيخَفُ**: ئەو مەنجەڵو سندۆڵەی قاوت یان ئەسپۆنی تێدا دەکوترێ.

**الوَخْفَةُ**: هەمبانە ٥ کیسەو تورەکە لەچەرم.

**الوَخِيفُ**: ئەسپونی کوتراو ٥ دەگوترێ: (أما عندك وخيف أغسل به رأسي): ئەسپونت لانیە سەرمی پێ بشۆم.

**الوَخِيفَة**: بەمانا (الوَخِيفُ) دێ ٥ قاوتی تەڕکراو ٥ خۆراکێکە

لەکەشکی هاڕاو کەدەکرێتە ناو ئاوەوە، ئەمجار ڕۆنی بەسەردا دەکرێ‌و دەخورێ ٥ خورما تێکەڵ بەڕۆن دەکرێ‌و دەخورێ (خورماو ڕۆن) ٥ ئاوێك زۆر قوڕاو بێ ٥ دەگوترێ: (صار الماءُ وخيفةً).

**تَخَمَ فلان تَخماً**: فلانکەس توشی نەخۆشی ئینتەلاو گەدە ترشان بووە.

**تَخِمَ فلان تَخماً**: بەمانا (تَخَمَ)دێ.

**وَخَمَ فلانٌ فلاناً يَخِمَهُ وَخماً**: فلان لەفلان پتر گەدەترشاوو تەبیات تێکچوو بوو.

**وَخَمَ فلان**: فلانکەس ئینتەلای کرد گەدەی ترشا.

**وَخُمَ فلان يَوخَمُ وخامة ووخوماً**: فلانکەس گەدەترشاو بوو.

**وَخُمَ الطعامُ**: خواردنەکە قورس بوو هەزم نەکرا.

**وَخُمَ المكان**: شوێنەکە ناووهەوای پیس بوو بەکەڵکی ژینگە نایە.

**وَخُمَ الأمرُ**: کارەکە قورس بوو خراپ بوو.

**أتْخَمَ الطعام فلاناً**: خواردنەکە فلانکەسی خستە ناو نەخۆشی گەدەترشان‌و تەبیات تێکچوونەوە.

**أوْخَمَهُ الطعامُ**: خواردنەکە توشی گەدەترشانی کرد.

**واخَمَ فلان فلاناً**: فلانکەس پێشبڕکێی لەگەڵ فلان کرد لەبارەی زۆر خۆری‌و گەدەترشانەوە.

**إتَّخَمَ فلان من الطعام وعنه**: فلانکەس خواردنەکەی پێ نەکەوت‌و گەدەی پێی ترشا.

**تَوَخَّمَ فلان الطعامَ**: فلانکەس بەخواردنەکە ئاسودە نەبوو سودی لێ نەبینی.

**استوخَمَ الطعامَ**: لەخواردنەکە سود مەند نەبوو کەڵکی لێ نەبینی.

**التُّخَمَةُ**: دەردێکە توشی ئادەمیزاد دەبێ لەئاکامی خواردنی خۆراکی قورسەوە یان لەئاکامی زۆر خۆرییەوە.

**المَتْخَمَةُ**: (طعام متخمة): خۆراکێك هەزم نەکرێ‌و ئادەمیزاد توشی گەدەترشان بکا.

**المَوْخَمَةُ**: (أرض موخمة): زەوییەکە ئاوو هەوای پیس‌و خراپە بەکەڵکی تێدانیشتەجێ بوون نایە.

**المُوخِمَةُ**: (أرض مُوخِمَةٌ): زەوییەك ئاوو هەوای پیس‌و ناسازی بێ‌و بەکەڵکی تێدا ژیان نەیە.

**الوَخَامُ**: وڵاتی ئاوو هەوا پیس‌و ناساز.

**الوَخْمُ**: پیاوی قورس‌و قونگران‌و

تەمبەڵ ٥ (ك: وِخام، ووخوم، وأوخام).

**الوَخَمُ**: پیس بوونی ئاوو هەوا کەسەر دەکێشێ بۆ پەیدا بوونو بڵاو بوونەوەی تاعونو پەتا ٥ زەرەرو زیان.

**الوَخِمُ من الرجال**: پیاوی قورسو قونگرانو تەمبەڵ.

**الوَخْمَةُ** (ارض وخمة): زەوییەك ئاووهەوای ناساز بێ.

**الوَخِمَةُ** (ارض وخِمَة): زەوی ئاووهەوا پیسو ناساز.

**الوَخومُ**: بەمانا (الوَخِمُ)دێ ٥ دەشگوترێ: (أرض وَخُوم): زەوی ئاووهەوا پیسو ناساز.

**الوَخِمُ من الرجال**: بەمانا (الوَخْمُ)دێ ٥ (طعام وَخِيم): خواردنێکە بەبخۆرەکەی ناکەوێ ٥ دەشگوترێ: (هذا الأمر وخيم العاقبة): ئەم کارە سەرەنجامی باش نییە.

**الوَخيمةُ**: (أرض وَخيمة): زەوییەکی ئاوهەووا ناسازە.

**الوَخوَاخ من الرجال**: پیاوی ورگ شۆڕو گەدەزلو قەڵەو ٥ گەدەو گیپاڵ ناشیرین ٥ تەمبەڵو قونگران ٥ ترسنۆكو زەعیف ٥ پیاوێك دەعباکەی هەڵنەستێ ٥ شلەپەتەبێ ٥ خورمای نەرمی بێ تامو تفت ٥ هەرشتێك شلە پەتەبێ.

**الوَخْوَخَةُ**: لاسایی کردنەوەی دەنگی برێ باڵندەیە.

**وَخَى يخي وَخْياً**: بەشێوەی مامناوەندی رۆیی.

**وَخَى الأمْرَ**: قەصدی کارەکەی کرد ٥ ویستی بیکا ٥ دەگوترێ: (وَخْيَ وَخْيَهُ): هەمان نیازو مەبەستی ئەوی پەیڕەو کرد ٥ هەوڵی دا ویستی ئەو جێ بەجێ بکا ٥ دەگوترێ: (وَخَى رضاه).

**وَخَى محبَّتَهُ**: هەوڵی دا خۆی لاخۆشەویست بکا چی پێخۆشە ئەوە بکا، بەدڵی ئەو بجوڵێتەوە.

**وَخَّاه الأمر وللأمر**: رِوی پێ لەکارەکەکردو هەڵینا بۆ ئەنجامدانی.

**تَوَخَّى الأمْرَ**: قەصدی کارەکەی کردو هەوڵی دا ئەنجامی بدا ٥ بەمانا بەدواداچونو لێکۆڵینەوەش دێ ٥ دەگوترێ: (تَوَخَّى مَحبَّته وتوخى رضائه).

**استوخاه**: داوای هەواڵو زانیاری لێ کرد ٥ دەگوترێ: (استوخاه عَنْ موضع كذا) ٥ داوای لێ کرد زانیاری بداتێ دەربارەی فلان شوێن ٥ (استوخِ لنا بني فلان ماخبرهم):

پێمان بڵێ خێڵی فلان لەکوێن و چییان بەسەر هات؟.

**الخِيَّةُ**: قەصدو نیازو لایەن ◦ دەگوترێ: (سألت القومَ عَنْ خِيَّتِهِمْ): پرسیارم لەخەڵکەکە کرد بۆئەوەی بزانم نیازو مەبەستیان چیەو چۆنە.

**الوَخِيُ**: رێگای بڕوا پێکراو، رێگای مەبەست.

**الوُخي**: بەمانا (الخِيَّة)دێ.

**وَدَأَ بالقوم يَدَأ وَدْءاً**: خەڵکەکەی بەجنێوو قسەی ناشیرین داپۆشین، چی خراپە ئەوەی پێکردن.

**وَدَأَ يَوْدَا وَدَأً**: فەوتا تێدا چوو.

**وَدِأَ عنه وعليه الأخبار**: هەواڵی بڕا، نازاندرێ چی بەسەرهات.

**وَدَّأ على الميت الأرضَ**: زەوییەکە لەسەر مردوەکە تەخت کرد.

**وَدَاتْ الأرضُ**: زەوی فلانکەسی داپۆشی.

**تَوَدَّأَ عليه**: لەناوی برد، فەوتاندی.

**تَوَدَّ على مالـه**: ماڵەکەی خۆی هەڵگرت و لەشوێنی شیاوی خۆی دانا.

**تَوَدَّات عليه الأرضُ**: زەوی داپۆشی ◦ زەوی لەسەری تەخت بوو ◦ چووە ناو شیوو دۆڵی زەوییەوەو کەس نازانێ چی بەسەر هات ◦ تێدا چوو، مرد.

**تَوَدَّات عنه الأخبار**: هەواڵی نەما ◦ کەس نازانێ چی لێ هات.

**المُوَدَّاةُ**: گۆڕیچەی ناوگۆڕ ◦ سارای ترسناک و چۆڵ و فەوتێنەر ◦ شوێنی تێدا فەوتان.

**وَدَجَ الذبيحَة يَدِجها وَدْجاً**: سروچکی کوشتییەکەی بڕی.

**وَدَجَ بين القوم وَدْجاً**: ئاشتەوایی خستە نێوان خەڵکەکەوەو ڕەگی شەڕو شۆڕی لەبن دەرهێنا.

**وادَجَهُ**: نەرمی لەگەڵدا نواندو لایەنی ئاشتی ڕەچاو کرد.

**وَدَّجَ الذبيحَةَ**: سروچکی کوشتییەکەی بڕی.

**الوداجُ**: سروچك، شادەماری لامل ◦ ئەو دەمارەی کەئاژەڵ کوژمرەکە دەیبڕێ و مەرجە دەبێ لەسەر بڕینی حەیوان دا ئەو دەمارەی ببڕدرێ ◦ هۆکارو سەبەبی شت ◦ دەگوترێ: (فلان وَدَجي الى فلان).

**أوْدَحَ**: ملکەچ بوو.

**الوَدَحَةُ**: دەگوترێ: (ما أغنى عني وَدَحة): هیچ سودێکم لێ نەدی ◦ لەهیچ شتێکی بۆ ئاتاج نەکردم.

**وَدَهُ يَوْدَهُ وَدْأً**: خۆشی ویست ◦

ئاواتەخوازی ئەوە بوو ٥ دەگوترێ: (وَدِدْت لو تفعل كذا): ئاواتەخوازم ئەوە بکەی.

وَادّه: خۆشی ویست.

وادّا: یەکتریان خۆشویست.

تَوَدَّدَ الیه: خۆی لا خۆشەویست کرد.

تَوَدّدَ فلاناً: خۆشەویستی فلانکەسی بۆخۆی دەستەبەر کرد.

المَوَدُّ: کەسێك سۆزی زۆر بێ، خۆشەویستی بۆ شتێك زۆربێ.

المَوَدَّةُ: خۆشەویستی ٥ کتێبو نوسراو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿تُلقُونَ إِلَيهِم بِالْمَوَدَّةِ﴾.

وُدٌّ: بتێك بوو عەرەبەکان لەپێش هاتنی ئیسلام دا دەیانپەرست.

الوُدُّ: دەگوترێ: (هەو وُدّی) ئەو خۆشەویستمە.

الوِدُّ: خۆشەویست ٥ زۆر خۆشەویست.

الوَدود: زۆر خۆشەویست ٥ ناوێکیشە لەناوە جوانەکانی خودا، مانای ئەوە دەگەیەنێ کەبەندە راستاڵەکانی خۆی زۆر خۆش دەوێ ٥ یان لەدڵی بەندە راستاڵەکانی دا خۆشەویستە.

الوَدیدُ: خۆشەویست.

وَدَرَ فلان یَدِرُ وَدْراً: سەرخۆش بوو تاوای لێ هات خەریك بوو بێ هۆش بێ.

وَدَّرهُ: خستیە ناو هیلاکیو تێداچوونەوە ٥ هەڵینا بۆئەوەی کارێك بکا تێدابچێ.

وَدَّرَ الشَّيْئَ: دوری خستەوە ٥ دەگوترێ: (وَدِّرْ وَجْهَكَ عني): روی خۆتم لێ دووربخەرەوە نەتبینم.

وَدَّرَ مالَهُ: ماڵو سامانی خۆی لەشتی بێهودە دا سەرف کرد.

تَوَدَّرَ مالُهُ: بۆ موطاوەعەی (وَدَّرَهُ)دێ.

وَدَسَتِ الأرض تَدسُ ودساً: زەوییەکە گیاو گژی لێ روا تاوای لێ هات بەگیاو گژ داپۆشرا.

وَدَسَ علیه الشَّيْئُ: شتەکە گوم بوو.

وَدَسَ الشَّيْئُ: شتەکە لەکیس چوو رۆیی.

وَدَسَ فلان بالشَّيْئِ: فلانکەس شتەکەی شاردەوە.

وَدَسَ بکلام الی فلان: قسەیەکی بۆ فلان هێنایە پێشەوەو تەواوی نەکرد.

اودَسَتِ الأرضُ: زەوی گیاوگژی رواند گیاو گژەکە سەر زەوییەکەی داپۆشی.

وَدَّسَتِ الأرضُ: بەمانا (وَدَسَتْ)دێ.

وَدَّسَ الشَّيْئُ: شتەکە گوم بوو.

وَدَّسَ فلان بکلمة الی فلان: فلانکەس قسەیەکی بۆ فلان دەست پێکردو تەواوی نەکرد.

وَدَّسَتِ الماشِيَةُ: ئاژەڵەکە گژوگیای

تازه رواوی سەرزەوی خوارد.

**تَوَدَّسَت الأرضَ:** بەمانا (أودست)دێ.

**تَوَدَّسَتِ الماشية:** بەمانا (وَدَسَت)دێ.

**الـوَادِسُ:** گـزوگیای کەلـەزەوی دێتـە دەر.

**الودِسُ:** بەمانا (الوادِسُ)دێ.

**الـوَدَسُ:** بەمانا (الوادس)دێ ٥ عەیبو لەکە.

**الوَديسُ:** بەمانا (الوِداسُ)دێ ٥ روەکی وشك بوو ٥ راوی هەنگوین.

**وَدَعَ يَـدَعُ وَدْعـاً:** ئـارامی گـرت، کەوتـە حاڵەتی خۆش ڕابواردنەوە.

**وَدَعَ المـسافِرُ النـاسَ:** ڕێبوارەکـە خـوا حافیزی کردو خەڵکەکەی جێ هێشت.

**وَدَعَ النـاسُ المـسافِرَ:** خەڵکەکـە خـوا حافیزییـان لەڕێبوارەکە کـردو جێیـان هێـشتو هیـوای سـەفەری سـەلامەتو خۆشییان بۆکرد.

**وَدَعَ فلانٌ الشَّيْئ:** فلآنکەس شتەکەی واز لێهێنا.

**وَدَعَ الثـوبَ بـالثوب:** بەکراسـەکە کراسەکەی تری پاراست.

**وَدُعَ يَـوْدُعُ دعـةً:** ئـارامی گـرت جێـگیر بـوو، کەوتـە ژیـانی خۆشـەوە ٥ (فهـو وديع).

**أوْدَعَ الشَّيْئ:** شتەکەی پاراست.

**أوْدَعَ الفَـرَسَ ونحـوه:** ماینەکـەی حەساندەوە.

**اودَعَ فلانـاً الـشَّيْئ:** لای فلآنکـەس شتەکەی بەئەمانەت دانا.

**وادَعَ فـلان فلانـاً:** فلآنکـەس لەگـەڵ فلآن دا ئاشـتەوایی گرتەبـەر ٥ وازی لەفلآن هێناو دەنگی لـێ دابڕی.

**وَدَّعَ المسافر الناسَ:** ڕێبوارەکە خـوا حـافیزی لەخەڵکەکـە کـردو جێـی هێشتنو کەوتە ڕێ.

**وَدَّعَ النـاسُ المـسافر:** خەڵکەکـە ڕێبوارەکەیان بەڕێ کرد.

**وَدَّعَ الـشَّيْئ:** شـتەکەی وەلانـا، وازی لێهێنـا ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿مَـا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾.

**وَدَّعَ الثـوبَ:** کراسـەکەی خـستە نـاو بوخچەوە بۆئەوەی بیپارێزێ.

**وَدَّعَ الـصَّبِيَّ:** مـیرووی سـپی لـەملی منداڵ'کە کرد.

**وَدَّعَ فرسَه:** ماینەکەی حەساندەوە.

**إتَّـدَعَ:** جێـگیر بـوو ئـارامی گـرت ٥ حەسـایەوەو کەوتـە ژیـانی نـەرمو نۆڵەوە.

**تَوَدَّعَ القومُ:** خەڵکەکە خوا حافیزییان لەیەکتر کرد، یەکتریان بەڕێ کـرد ٥ ئاشتەواییان بەرپاکرد ٥ هەندێکیان وادەو بەڵێنیان دا بەیەکتر.

**تَـوَدَّعَ:** ئـارامی گـرتو داسـەکنا ٥ بـوو

بەخاوەن ئارامیو پشوو درێژی.
**تَـوَدَّعَ القـومُ:** خەڵکەکـە خـودا حافیزییان لەیەکتر کرد.
**تَـوَدَّعَ فـلان الـشَّیْئ:** شـتەکەی لەبوخچەی جانتادا پاراست.
**تُـوُدِّعَ مـن فـلان:** لەلایـەن فلانـەوە سـەلامی لـێ کـرا بـۆ خواحـافیزی ٥ نائومێد بوو لەچاکبوونەوەی.
**استودع فلاناً ودیعة:** ئەمانەتیـەکی لای فلانکـەس دانـا بۆئـەوەی بـۆی بپارێزێ.
**الإسـتیداع:** دانیـشاندنو تـەقاعود کردنـی ئەفـسەرو موچـەخۆرە لەکارەکـەی پـێش ئـەوەی کـاتی تـەقاعودکردنی بـێ ٥ دەگـوترێ: (أحیل الضابط علی الإستیداع).
**الإیداع:** لەبواری ئابوری دا هـەڵگرتنی کاڵایـە لەمـەخزەنی فەرمانگـەی گومرگ دا یان لە مەخزەنێکی ترو لەژێر چاودێری فەرمانگەی گومرگ دا.
**التداعَة:** بەمانا (التداعَة)دێ.
**المستودع:** شوێنی شت تێدا هەڵگرتن بۆماوەیـەکی کـەمو دیـاریکراو ٥ شوێنی ئادەمو حەوا لەبەهەشت دا.
**المُوَدَّعَـة:** حوشترێـك مەرەخـەس بێ نەبدۆشـرێو نـەبۆ سـوار بـونو بارگواستنەوە بەکاربهێنرێ.
**المودَعُ:** خاوەنی گوزەرانی خۆش.
**المَـوْدُوعُ:** ئـارامیو لەسـەرەخۆیی ٥ ئـەدەبو ویقـار، دەگـوترێ: (علیـك بـالمودع): لەگـەڵ مرۆڤـی خـاوەن ئـەدەبو ویقـاردا هـەڵسو کـەوت بکە.
**المیداعَـةُ:** مرۆڤێـك حـەزی لـەژیانی نەرمو نۆڵ بێ.
**المیـدَعُ:** بوخـچەو بـاوەڵی شـت تێـدا هـەڵگرتن ٥ پۆشـاکی کـۆنو ڕزیـو ٥ (ك: موادیـع) ٥ دەگـوترێ: (مالـە میـدع): شتێـکی نییـە بەشـی بکـا ٥ کەس شتێکی بۆبکا.
**المیدَعَة:** بوخـچەو بـاوەڵی جـل تێـدا هـەڵگرتن ٥ کراسێـکی درێـژو بـێ قۆڵە لەسەر پۆشاکەوە لەبەردەکرێ بۆئـەوەی جلـەکانی پـیس نـەبن لەچـڵكو پۆخـەڵی کـارکردن بیپارێزێ ٥ (ك: موادع).
**الـوَداعُ:** بـەڕێ کردنـی موسـافیرە، خواحـافیزی لـی کردنیـەتی ٥ (ثنیة الـوَداع): شوێنێـکە لەمەدینـە ٥ چـونکە هەرکەسێـك سـەفەری مەککەی بکردایە لەو شوێنە بەڕێ دەکرا.
**الـوَدْعُ:** گـۆڕ یـان دەوروبـەری گـۆڕ.

**الوَدَعُ**: میرویەکی ناو سپییە قەبارەی جیاجیای هەیە ٥ (ذو الـوَدَعُ): منداڵ.

**ذات الوَدَع**: بت و صەنەم ٥ یان کەعبە لەم ڕووەوە کە میرووی سپی بەپەردەکانیەوە دەکران ٥ کەشتی نوح.

**الوديعُ**: ژیان خۆش، گوزەران خۆش ٥ ئەسپی حەساوەی ٥ گۆڕستان ٥ وادەو پەیمان ٥ (ك: ودائع).

**الوديعة**: ئەمانەت ٥ (ك: ودائع).

**وَدَفَ الشَّحْمُ**: پیوەکە توایەوە، ڕەوان بوو.

**وَدَفَ لفلان العَطَاءَ**: بەخششی فلانکەسی کەم کردەوە.

**تَوَدَّفَتْ الأوعال ونحوها فوق الجبل**: گا کێویەکان چوونە سەر تۆپەڵاکی کێوەکە.

**تَوَدَّفَ الخَبَرَ**: لەهەواڵەکەی کۆڵیەوە.

**استودفت النبتُ**: ڕوەکەکە درێژ بوو.

**استودف فلان الشحمةَ ونحوها**: فلانکەس بەزەکەی تواندەوە.

**استودف اللبنَ**: شیرەکەی کردە ناو قاپەکەوە.

**استودف الخَبَرَ**: لەهەواڵەکەی کۆڵیەوە.

**استودَفَ معروفَ فلان**: داوای بەخششی فلانکەسی کرد.

**الوَدْفَةُ**: پارچە بەز ٥ باخچەی سەوزو ڕازاوە.

**الوَدَفَةُ**: باخچەی سەوزو ڕازاوەو گەش و تەڕدەماخ ٥ دەگوترێ: (أصبحت الأرض كلها وَدَفَةً واحدةً خِصْباً): زەوی هەمووی یەکپارچە بووەتە باخچەیەکی سەوزو گەشەدار هەمووی زەنوێرو تێراوە.

**الوَديفة**: باخچەی سەوز.

**وَدَقَ المطرُ يَدِقُ وَدْقاً**: باران دڵۆپ دڵۆپ باری.

**وَدَقَ الى الشَّيْءِ وله وَدْقاً**: لەشتەکە نزیك بۆوە ٥ بەیدەستی بوو ٥ (وَدَقَ له الصيدُ): یاری بەنێچیرەکە کرد.

**وَدَقَ بطنه**: گەدەی کشاو لەگەورەیی و داچۆڕان نزیك بۆوە.

**وَدَقَتْ سُرَّتُهُ**: ناوکی دەرپەڕی، شۆڕبۆوە.

**وَدَقَتِ السماءُ**: ئاسمان بارانی باراند.

**وَدَقَ السَّيْفُ**: شمشێرەکە تیژ بوو.

**وَدَقَتْ العينُ وَدْقاً**: خاڵی سور لەچاوەکەدا پەیدا بوون.

**اودَقَتْ السماءُ**: ئاسمان بارانی باراند.

**المَوْدِقُ**: شوێن کە مرۆڤو گیانلەبەری تر لێیەوە دێن ٥ گۆڕەپانی شەڕو ئاژاوە ٥ پەردەو ناوانی دوشت ٥

(مَوْدِق الظبي): وێنەو دیمەنی ئاسك لەكاتی مل درێژكردنی بۆ خواردنی گەڵای درەخت.

**الوَادِقُ**: شمشێری بڕندە ٥ دەشگوترێ: (فلان وادق السِنّة): فلانكەس خەواڵووە زۆر دەنوێ لەهەر شوێنێك بۆی بلوێ دەخەوێ ٥ هەمیشە هەنۆز دەبا.

**الوَدْقُ**: باران بەهەرشێوەیەك بێ ئەمە بێ یان ڕێژنە ٥ پەڵەو خاڵی سور كەلەچاودا دیاری دەدەن ٥ یان پارچە گۆشت كەلەچاودا پەیدا بێ ٥ یان نەخۆشییەكە تووشی چاو دەبێ ناو گوێچكەی پێ دەهاوسێو چاوەكە سور هەڵدەگەڕێ ٥ (سحابة ذات ودقين): هەورێك بوو دو جۆر بارانی باراند بارانی ئەمەو بارانی ڕێژنە ٥ ئەگەر بەڵاو كارەسات زۆر گەورەو ترسناك بوون پێیان دەگوترێ (ذات ودقين): وەكوو ئەوە بڵێی بەڵاكە لەدولاوە هاتووە دەرەتانی لێ ناكرێ.

**الوَدَقُ**: چەند خاڵێكی سورن لەچاودا پەیدا دەبن یان پارچە گۆشتێكە لەچاودا گەورە دەبێ ٥ یان نەخۆشییەكە جودایە لەچاو ئێشەی ئاسایی ٥ گوێچكەی پێوە دەهاوسێو سورایی زیاد دەكا.

**الوَدِيعَةُ**: گەرمای نیوەڕۆ ٥ یان جەنگەی گەرماو نزیك بوونەوەی خۆر لەزەوی ٥ شوێنێك پاقلەو گیای لێ بێ.

**وَدِكَ يَوْدَكُ وَدَكاً**: قەڵەو بوو ٥ (فهو ودك).

**ودِكَتْ يدُهُ**: دەستی چەور بوو ٥ دەگوترێ: (لحم وَدِكٌ): گۆشتێكی چەورە ٥ بەزی زۆرە.

**وَدُكَ يَوْدُكُ وداكةً**: قەڵەو بوو ٥ (فهو وَدِيك وهي وَدِيك ووَدِيكة) ٥ دەگوترێ: (ديك وديك ودجاجة وديكة).

**وَدَّكَ فلان الشَّيْئ**: فلانكەس شتەكەی چەور كرد، ڕۆنی تێكرد.

**الأوْدَكُ**: (بنات أودك): بەڵاو كارەسات ٥ سەرسوڕهێنەر ٥ دەڵێی (ما أدري أي أودك هو): نازانم ئەو كابرایە لە چ پێڕو كەسانێكە.

**الدَكة**: ناوێكە لە (الوَدَك).

**المُتَوَدِّك**: دەگوترێ: (ما رأيت عنده متودكاً): هیچ سودو دەستكەوتێكم لەلای ئەو نەبوو ٥ هیچ خێرێكم لێ نەدی.

**الـوادِك**: قەڵەوو خاوەن بەز ٥ دەگوترێ: (رجل وادك).

**الـوَدَكُ**: چەوریو بەز ٥ یان چەوری

گۆشــتو ئــەو پیــوەی لەگۆشــت دەردەهێنــدرێو جیادەكرێتــەوە ٥ بەزی دوگو لاتەڕادی مەڕو گۆلك.

**وَدَكُ المیتة:** ئـەو چـەورایيە كەلەبـەر لاشــــەی مردارەوەبــــوو دەڕوا ٥ دەشكوترێ: (ما فیه ودك): هیچ سودی تێدا نییە.

**الوَدّاكُ:** بەز فرۆش ٥ پیو فرۆش.

**وَدَلَ السِّقاءَ يَدِلُهُ وَدْلاً:** مەشــكەكەی هەژاند.

**وَدَنَ الشَّيْءَ يَدِنه وَدْناً:** شــتەكەی تەڕكرد، لەئاوی هەلكێشا.

**وَدَنَ العروسَ والفرسَ:** بەباشــی ئاگــاداریو سەرپەرشــتی بوكەكــەو ئەســپەكەی كــرد لــەكاتی بــوك گواستنەوەكەدا.

**وَدَنَ الجِلْدَ وَدْناً:** پێستەكەی خستە ژێر گلەوە بۆئەوەی نەرم بێ.

**وَدَنَ الشَّيْءَ بالعصا:** بەگۆچانو عەصا شتەكەی كوتا ٥ یان بەهۆی كوتانەوە پێستەكەی خاراندو نەرمی كرد.

**وَدَنَ الشَّيْءَ:** بەكوتكی جل شتن شتەكەی كوتا ٥ شتەكەی كەم كردەوە، بچوكی كردەوە.

**وَدِنَت المرأةُ:** ئافرەتەكە منداڵێكی دەستو مل كورتو شان تەسكی بوو ٥ منداڵێكی كزو كۆلەواری بوو.

**اودنت المرأةُ:** بەمانا (وَدِنت)دێ.

**اودن فلانٌ الشَّيْءَ:** فلانكەس شتەكەی بەكوتكی جل شۆرین كوتا ٥ كەمی كردەوە، بچوكی كردەوە.

**وَدَّنَ الشَّيْءَ:** شتەكەی تەڕكرد لەئاوی هەلكێشا ٥ بەكوتكی جل شۆرین كوتای.

**إتَّدَنَ الشَّيْءَ:** شتەكە تەڕبوو ٥ لەئاو هەلكێشرا.

**تَوَدَّنَ فلان:** فلانكەس گەزو بەزو نازو نیعمەتی زۆر بوو.

**تَوَدَّنَ الجلدُ:** پێستەكە لەكاتی دەباغ كردن دا نەرم بوو.

**الأودَنُ:** نەرم.

**المُودَنُ:** منداڵی لاواز، دەستو مل كورت، كەمئەندام ٥ ناوشان تەسك ٥ دەگوترێ: (فلان مودن الید): فلانكەس كەمئەندامو دەست كورتە.

**المُودَنَةُ:** (دخَلَهُ)یەكی مل كورت، جەستە بچوكە.

**المودونُ:** بەمانا (المُودَنَة)دێ.

**المَوْدُونَةُ:** (إمرأة مردونة): ئافرەتێكی كورتە باڵای جەستە بچوك.

**الودان:** شوێنێك شەونمی هەبێو بەكەڵكی شت تێدا رواندن بێ.

**الوَدْنَةُ:** شەرە قسەو تێك گیران ٥

لەیەکتردانو لەیەك هەڵدان.
**وَدَى الرجلُ:** پیاوەکە (وەدیی) لێ هاتەدەر.
**وَدَى الشَّيْءُ:** شتەکە جاری بوو، ڕەوان بوو.
**وَدَى القاتلُ القتيلَ ودياً:** کەسو کاری بکوژ خوێنی دا بەکەسو کاری کوژراو.
**اودى:** بەهیلا چوو ٥ فەوتا.
**اودى بالشيءِ:** شتەکەی برد.
**اودى الموت به:** مردن تێکیەوە پێچاو فەوتاندی.
**اودى العمر به:** تەمەنی درێژ بوو ٥ ژیانی درێژ بۆوە.
**اودى الرجلُ:** پیاوەکە (وەدی) لێ هاتەدەر.
**وادى فلان فلاناً:** فلانکەس خوێنی وەرگرت خوێنی کوژراوەکەی لە بکوژ یان لەکەسوکاری بکوژ وەرگرت.
**اتَّدى ولي القتيل:** کەسی کوژراوەکە خوێنی لەبکوژیان لەکەسو کارەکەی ستاندو بکوژی نەکوشتەوە.
**استودى فلان بحق فلان:** فلانکەس دانی نا بەحەقی فلان دا.
**التودية:** دارێکی بچکۆلەیە بەکاردەهێندرێ بۆ مەنع کردنی بێچوە حوشتر لەوەی شیری دایکی بخوا.
**الدِيَةُ:** ئەو ماڵو سامانەیە کەلەجیاتی خوێنی کوژراو دەدرێ بەکەسو کارەکەی.
**الوادي:** شیوو دۆڵ کەلێنو دادڕی ناو زەوی ٥ ڕێڕەوی لافاو ٥ (ك: أوداء، أودية، وأوداية، ووديان) ٥ دەگوترێ: (حَلَّ بوادية): توشی بەڵاو کارەسات بووە.
**الوَدْيُ:** ئاوێکی سپییە لەدوای میز کردن دێتە دەرەوە بەهۆی ئیفرازاتی پرۆستات.
**الوَدِيُّ:** بەمانا (الوَدْي)دێ ٥ نەمامی بچوك.
**وَذَاتِ العينُ عَنْ الشَّيْءِ تَذْا وَذءاً:** چاوەکە شتەکەی لەخۆنەگرت دەری دایەوە.
**وَذَأَ فلان فلاناً:** فلانکەس عەیبی لەفلان گرت ٥ بەچاوی سوك سەیری کرد ٥ لێی تورە بوو، دەری کرد.
**الوَذْءُ:** قسەی ناخۆشو ڕەق جنێو بێ یان ڕەخنە.
**الوَذْءَةُ:** نەخۆشی ٥ دەگوترێ: (ما به وَذْءَة) ٥ هیچ نەخۆشی پێوە دیار نییە.
**وَذِحَ يَوْذَحُ وذحاً:** ناوڕانی چوزانەوە ٥

سوتايەوەو گۆشتەكەی شەقار شەقار بوو.

**وَذِحت الشاةُ:** مەڕەكە خورییەكەی كەمێلی پێوە نووسا ◦ پیسایی ناو ناغەلی پێوە لكاو گەمرەی بەست.

**الأوْذح:** دەگوترێ: (عبد أوذح): بەندەو كۆیلەیەكی خوێڕییە.

**الوَذَحُ:** ئەو كەمێلو ریخو قشپەلەیە كە بە خوری مەڕو بزنەوە دەنووسیو دەبێتە گەمرە.

**وَذَرَ اللحمَ يَذِرُه وَذراً:** گۆشتەكەی پارچە پارچە كرد ◦ بریندار كرد.

**وَذَرَ الوَزرةَ:** گۆشتەكەی توێ توێ كرد كوتكوتی كرد؟،

**وَذِرَهُ:** دەگوترێ: (يَذرُهُ): وازی لێ هێنا ◦ ئەم فیعلە هەر صیغەی موضاریعی هاتووە ◦ ماضیو مەصدەری مرێنلراون.

**وَذَّرَ اللحمَ:** گۆشتەكەی بڕی.

**وَذَّرَ الجُرْحَ:** برینەكەی قاشقاش كرد.

**الوُذارَةُ:** پارچە قوماشی بچوكو پرژو پاڵی قوماشە كەبەرگدرو دەیبڕێو دەكەونە ئەملاو ئەولای قوماشەكە.

**الوَذْرَةُ:** پارچەی بچوك لەگۆشتی بێ ئێسقان ◦ پارچە گۆشتی خڕ، كوتە گۆشت.

**الوَذِرَةُ:** شتێ گۆشتی زۆر بێ ◦ دەگوترێ: (عضد وذِرَة): قۆڵە گۆشتن ◦ ئافرەتی بۆگەن ◦ لچ ئەستور.

**وَذَفَ فلان يَذِفُ وذفاً ووَذفاناً:** رۆیشت بەشێوەیەك لارو لەنجەی تێدا بوو، خۆی بادا.

**وَذَفَ الشحمُ وغيره:** بەزەكە توایەوەو داچۆڕاو دلۆپ دلۆپ هاتە خوار.

**وَذَّفَ فلان:** هەنگاوی‌كورتی نانو شانی هەڵتەكاندنو فیزی نواند ◦ ئافرەتەكە لەرۆیشتن دا خۆی بادا.

**تَوَذَّفَ فلان:** فلانكەس فیزی نواند پۆزی لێ دا.

**الوَذَفانُ:** بەخێرایی ئەو ◦ دەگوترێ: (فعل ذلك وَذَفانُهُ).

**الوَذْفُ:** مەنی (تۆماو).

**الوَذَفَةُ:** پیو.

**تَوَذَّلَ القوم من الجزار:** خەڵكەكە گۆشتیان لەقەصابەكە كڕی بەبێ ئەوەی گۆشتەكە بەشبەش بكا یان بەكیلۆو حوقەو كێشەكەی دیاری بكا.

**الوَذّالة:** ئەوەیە قەسابەكە گۆشتەكە ببڕێ بەبێ ئەوەی بەتەواوی كوتەكان لەیەك جیابكاتەوە.

**الوَذْلُ من الرجال:** پیاوی چوستو چالاكو بەدەستو برد لەكاری خۆی دا.

**الوَذَلَةُ:** مێینـەی (الـوَذَل) ٥ ئـافرەتی گـورج‌و گـۆڵ‌و قـەد باریـك ٥ ئـادەمیزادی چوسـت‌و چـالاك ٥ حوشتری خۆشڕۆ.

**الوَذِيلَة:** ئافرەتی بەنیشات‌و چوست‌و چالاك ٥ ئاوێنەی پاك‌و رون ٥ قاڵبە زیـوی پرشـنگدار ؟. پارچـە دوگـی حوشتر ٥ (ك: وذيل ووذائل).

**وَذِمَـتِ الـدَّلْوُ تَـوْذَم وَذَمـاً:** ئەڵقـەی دۆڵچەکە پچڕا.

**اوذَمَ السقاءَ:** بەبـەنی قـایم‌و سـیرمە دەمی کوندەکەی بەست.

**اوذم الدَّلْوَ:** ئەڵقـەی دۆڵچەکەی پتـەو کرد.

**اوذم الهـديَ:** بەنێـکی ڕنگکـراوی لـەئاژەڵی دیـاری حـەرەم بەسـت بۆئـەوەی بزانـدرێ ئـەو ئاژەڵـە قوربانییـەو کـەس خراپـەی لەگـەڵ نەکا.

**اوذم علـى نفـسه:** شـتەکەی لەسـەر خـۆی پێویـست کـرد ٥ دەگـوترێ: (أوذم الحج على نفسه، أوذم الـسفر، أوذمَ اليمين).

**وَذَّمَ فـلان علـى الخمـسين:** فلانکـەس تەمەنی لەپەنجا تێپەڕی.

**وَذَّمَ الـدلْوَ:** قولفـەی بـۆ دۆڵـچەکە دروست کرد.

**وَذَّمَ الكلـبَ:** قلێتـەی لـەملی سـەگەکە کـرد بۆئـەوەی بزانـدرێ سـەگی رامکراوو تەربیەت دادراوە.

**وَذَّمَ الشَّيْئ:** شتەکەی بەپێویست دانـا ٥ پارچە پارچەی کرد.

**وَذَّمَ الناقةَ والشاةَ:** زیادەگۆشتی زێـی حوشترەکە یان هی مەڕەکەی بـڕی‌و دەرمانی کرد.

**الـوَذَمُ:** بالوکـە ٥ پارچـە گۆشـتە لـەناو شەرمگای حوشتردا دەبێتـە هۆکاری ئـەوە کـەئاوس نـەبێ ٥ پارچـەیەکە لەجـەرگی کوشـتی یـان لـەورگ‌و ریخۆڵەی دەبڕدرێ‌و فڕێ دەدرێ.

**الوَذمَـاءُ:** نـەزۆك ٥ دەگـوترێ: (إمْـرَأة وَذمَـاءُ و فـرس وذمـاء): ماینێـکی نەزۆك.

**الوَذَمَـةُ:** ریخۆڵـەو ورگ‌و گـەدە ٥ کیـسەی ورگ ٥ زیدەیـەك لەشـەرمگای حوشـترو مـەڕدا پەیـدا دەبـێ ناهێڵـێ ئـاوس ببـێ ٥ سـیرمەیەکە ئەڵقـەو گوێـچکەی دۆڵـچەکەی پـێ دەبەسـترێ ٥ سـیرمەیەکە بەدرێـژی دەبـڕدرێ‌و دەکرێتـە قلێتـەی ملـی سـەگ بۆئـەوەی لـەکاتی پێویـست دا سەگەکەی پێ ببەسترێتەوە.

**الوَذِيمـة:** ئـەو پارچـەو بەشـەیە کـە

کـابرا لـەماڵی خـۆی دەیبرێتـەوەو تەرخانی دەکا بۆ شتێـك ٥ قلێتـەی ملـی سـەگ ٥ دیـاری بـۆ کەعبـەی پـیرۆز، ئـاژەڵ کـە دەکرێتـە هـەدیو دیاری بۆماڵی خودا.

**تَـوَذَّن فلانـاً**: فلانکەسـی جـواب کـرد پاڵی پێوەنا ٥ لێی دا.

**وذی وجهه یذیه وذیاً**: دەمو چاوی رنی.

**الـوَذاة**: هەرشتێـك پێـی توشـی زیـان ببێ.

**الوَذِیة**: هیچو پـوچ ٥ دەگـوترێ: (دنیـاً وذیة).

**وَرَأ من الطعام یَرَأ وَرْءاً**: گەدەی پڕ بـوو لەخۆراك.

**وَرَأ الرجلَ**: پیاوەکـەی جـواب کـرد پـاڵی پێوەنا.

**أُوریَ بالشَیئ**: هەستی بەشتەکە کرد.

**اوْرَأهُ**: فێری کرد پێی زاناند.

**اُوریَ بالشیئ**: هەستی بەشتەکە کرد.

**وُرِّئَ بالـشَّي~ئِ**: هەسـتی بەشـتەکە کرد.

**الوَرَاءُ**: منـداڵی منـداڵ (کـوڕەزاو کچـە زا) ٥ لەوحـەی گـەورەو ئەسـتور ٥ دەگوترێ: (هو وراءك لما أستر عنـك) ٥ بـــۆ پێـــشەوەو بـــۆ دواوە بەکاردەهێنـــدرێ ٥ قورئـــان دەفەرموێ: ﴿مِن وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ﴾.

**وَرِبَ جَوْفُهُ یَوْرَبُ وَرَباً**: داوەشـا ٥ خـراپ بوو.

**وَرِبَ فلان**: فلانکەس گەندەڵ بوو.

**وَرِبَ الـسحابُ**: هەورەکـە نـزم بـۆوە لەزەوی نزیك بۆوە ورگی دادا.

**وارَبَـه**: فێڵـی لـێ کـرد ٥ هـەڵی خەڵەتاند.

**وَرَبَ البـابَ**: کەمێـك دەرگاکـەی کلاکرد.

**الـوَرْبُ**: گەنـدەڵی ٥ بۆشـایی نێـوان قامکە شادەو قامکە گەورە ٥ لانـەو کونی دڕندە کونە گورگ کونە ڕێوی ٥ زارکی کونـە مـشك ٥ دەمـی کونی دوپشك ٥ (ك: أوراب).

**الوَرْبَـةُ**: کەلەکـە، خالیگـە ٥ چـاڵایی خوار کەلەکە.

**وَرِثَ فلاناً**: میراتی لەفلانکەس گرت.

**اورَثَ فلاناً**: فلانکەسـی کـردە یەکێـك لەمیراتگرانی ماڵەکەی ٥ میراتەکەی تایبەت کرد بە ئەوەوەو کەسی تری نەخستە گەڵ.

**اوْرَثَ فلاناً شیئاً**: شتەکەی بـۆ فـلان واز لـێ هێنـا ٥ دەگـوترێ: (أورثـه المرض ضَعْفاً): نەخۆشییەکە لاوازیو زەبوونی بۆ جێهێشت.

**وَرَّثَ فلاناً**: فلانکەسی کردە میراتگری خـۆی ٥ خـستیە نـاو لیـستی میراتگرەکانیەوە.

**وَرَّثَ فلاناً من فلان**: میراتی فلانکەسی بۆ فلان دانا.
**الإراثُ**: ئەوەی دەبێتە میرات.
**الإرْث**: میرات.
**التراث**: میرات.
**الميراث**: میرات ◦ (ك: مواريث) ◦ (علم المواريث): زانیاری دەربارەی چۆنیەتی دابەشکردنی میرات.
**الوارِثُ**: صیفەتێکە لەصیفەتەکانی خودا ◦ واتە باقی‌و بەردەوام‌و میراتگری زەوی‌و ئەوەی لەسەریەتی‌و خاوەنی حەقیقی هەموو بونەوەر هەرخۆی دەمێنێ‌و هەربوەو هەردەبێ.
**الوِراثُ**: میرات.
**الوِراثةُ**: (علم الوِراثة): زانیارییەکە باس لەوەدەکات چۆن دیاردە سروشتییەکانی زیندو لە چینێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ چینێکی تر دیاردە ڕەچەڵەکی‌و نەژادییەکان چۆن لەباوك‌و باپیرانەوە دەگوازرێنەوە بۆ نەوەو وەچەکان.
**الوَرْثُ**: بەمانا (الإراث)دێ ◦ شتی تەڕو تازە.
**الوِرْثُ**: بەمانا (الإراث)دێ.
**الوَرِيث**: یەکێك لەمیراتگرەکان.

**وَرِخَ العَجِينُ يَوْرَخُ وَرَخاً**: هەویرەکە شل بوو بەهۆی زۆر ئاوی.
**وَرِخَ المكانُ**: شوێنەکە گژوگیای زۆر بوو گیاو گژەکەی تێك چڕژا.
**اَوْرَخَ العجينَ**: ئاوی هەویرەکەی زۆر کرد بۆئەوەی شل ببێتەوەو داهێزێ.
**وَرَّخَ الكتابَ**: مێژووی بۆ کتێبەکە دانا.
**تَوَرَّخَ العَجِينُ**: بەمانا (وَرِخَ)دێ.
**تورَّخَتِ الأرضُ**: زەوییەکە تەڕ بوو.
**استورَخت الأرض**: زەوییەکە تەڕ بوو.
**الوَرْخُ**: درەختێکە دەشوبهێتە داری مەرخ وەلێ گەڵایەکی تەپو تۆزاوی هەیە پەلکە گەڵاکانی باریك‌و درێژۆکەیە وەکوو گەڵای ڕوەکی تەرخون یان کەمێك لەو گەورەترە.
**الوَرِيخة**: هەویری شل‌و داهێزاو بەهۆی ئاوی زۆرەوە ◦ زەوی تەڕبوو.
**وَرَدَ يرد وروداً**: ئامادەبوو.
**وَرَدَ انفه**: لوتی درێژبوو.
**وَرَدَت الشجرة**: درەختەکە گوڵی کرد ◦ گوڵی دەرکرد.
**وَرَدَ المكانَ او على المكانَ**: چووە سەر

شوێنەکە بەسەر شوێنەکەی دا ڕوانی ٥ چووە ناو شوێنەکە.

**وَرَدَت الحميّ فلاناً:** لەرزوتا ناو بەناو توشی فلانکەس بوو ٥ ڕۆژە نا ڕۆژێك یان بەسێ ڕۆژ جارێك لەرزو تای توش دەبێ.

**وَرُدَ الفرسُ وغيره يَوْرُدُ وَرْدَةً:** ئەسپەکە سورێکی مەیلەو زەردبوو ٥ سوری زەردباو بوو.

**اوردَ فلانٌ الشَّيْئَ:** فلانکەس شتەکەی ئامادەکرد.

**اوردَ الخَبَرَ:** هەواڵەکەی باس کرد ٥ هەواڵەکەی گێڕایەوە.

**اوردَ الشَّيْئَ:** وای کرد بچێتە سەر شتەکە ٥ دەگوترێ: (أوردَ الماءَ): وای لێ کرد بچێتە سەر ئاوەکە.

**وارَدَهُ:** لەگەڵی دا چوو.

**وارَدَ الشاعرُ الشاعِرَ:** شاعیرەکە شیعری بەشێوەی شاعیرێکی تری هاوزەمان دانا و شیعرەکانیان زۆر لێك چوو بوون بەبێ ئەوەی ئەم دوو شاعیرە یەکتریان بینیبێ یان بەرهەمی یەکتریان خوێندبێتەوە ٥ لەفەنی شیعری دا پێی دەگوترێ: (توارد الأفكار).

**وَرَّدت المرأة:** ئافرەتەکە کوڵمی سور بوون ٥ دەشگوترێ: (وَرَّدت خدها): کوڵمی سور بوون.

**وَرَّدت الشجرة:** درەختەکە گوڵی کرد.

**وَرَّدَ فلان الثوبَ:** فلانکەس پۆشاکەکەی ڕەنگ کرد ٥ وەکوو ڕەنگی گوڵ.

**توارد القومُ الماءَ:** خەڵکەکە بەیەکەوە چون بۆسەر ئاوەکە.

**توارد الشاعران:** دوشاعیرەکە لەفظو مەعنای چامە شیعرییەکەیان وەکوو یەك وابوو بەبێ ئەوەی یەکتر ببینن و بەرهەمی یەکتریان دیبێ.

**تَوَرَّدَ:** داوای چونەسەر ئاوو ئاوخواردنەوەی کرد ٥ داوای گوڵی کرد ٥ پێشی کەوت.

**تَوَرَّدت الخدُ:** کوڵمی وەکوو گوڵی سوری لێ هات.

**تَوَرَّدَ الماءَ:** چووە سەرئاو بۆ ئاوخواردنەوە.

**تَوَرَّدَ الشَّيْئَ:** شتەکەی ئامادەکرد.

**تَوَرَّدَت الخيلُ البلدَ:** ڕەوە ماین و ئەسپەکان کۆمەڵ کۆمەڵ چونە ناو شارەکەوە.

**استوردَ:** داوای چونەسەرئاوو ئاوخواردنەوەی کرد.

**استوردَ الماءَ:** چووە سەرئاوەکە.

**استوردَ الشَّيْئَ:** شتەکەی ئامادەکرد.

**استوردَ السلعَةَ:** كالاكەی لەدەرەوەی ولات هێنایە ناو ولاتەوە هاوردەی کرد.

**استوردَ فلان الضلالَةَ:** فلانکەس گومڕایی هێنایە ناو ولاتەوە.

**المَوْرِدُ:** شوێنی ئاو وەرگرتن ۰ ڕێگا ۰ سەرچاوەی بژێو.

**الموردَةُ:** ڕێگای چوون بۆسەرئاو بۆ ئاو خواردنەوەو ئاودانی ئاژەڵ ۰ ڕێگای پانو پۆڕ ۰ شەقامەڕێ.

**الوارِدُ:** ڕێگا ۰ پیاوی ئازاو چاونەترس ۰ پێشەتاو چاو ساغی ڕێگا ۰ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلُواْ وَارِدَهُمْ﴾ ۰ دەشگوترێ: (فلان وارد الأرنبة): فلانکەس لوتدرێژە.

**الواردات:** ئەوکالاو کەرەستانەن حکومەت لەولاتانی دەرەوە دەیکڕێو دەیانهێنێ بۆناو ولات.

**الوارِدَةُ:** خەڵك کەدەچن بۆسەر کارێزو بیر بۆ ئاو هەڵێنجانو ئاودانی ئاژەڵ ۰ شەقامەڕێ ۰ (شفة واردة): لچی شۆڕ ۰ (شجرة وارِدة الأغصان): درەختێ: لقو پۆپەکانی شۆڕبوبنەوە.

**الوَرْدُ:** گوڵ؛ گوڵی ڕووەك یان گوڵی درەخت.

**الوِرْدُ:** ڕوانین بەسەر ئاوو شتی وا دا ۰ چوون بۆسەر کارێزاوو بیر بەمەبەستی ئاوگرتنو ئاو پەیداکردن ئەو حوشترانەی دەبرێن بۆ سەر ئاو بۆئاو خواردنەوە ۰ بەشەئاوو نۆرە ئاو ۰ پۆلە باڵندە ۰ سوپا ۰ بەشێك لە شەو کە پێویستبێ مرۆڤ نوێژی تێدا بکا ۰ بەشێك لەقورئانو یادکردنی خودا کەمرۆڤ کردبیەتی بەعادەت بیانخوێنێ ۰ دەڵێی (قرأت وردي): ویردەکەم خوێند ۰ ناوێکە لەناوەکانی لەرزو تا ۰ بەڵگەنامەیەکە ژمێریارو کارمەندی تایبەت زانیاری پێویستی تێدا تۆماردەکا ۰ چەند قەرزدارەو چەندی داوەو چەندی لەسەر ماوە ۰ (ك: أوراد).

**وَردانُ:** (بنت وردان): دەعبایەکی بچوکە وەکوو قالونچە وایە ڕەنگی سورە، بەزۆری لەحەمامو تەوالێت دا دەبیندرێن ۰ (ك: بنات وردان).

**الوَردةُ:** ناوە بۆ یەکجار ۰ تاکی (الوَرْد) ۰ مێینەی (الورد) ۰ (عشية وردة): زەردەپەڕی ئێوارە کاتێك خۆرئاوا دەبێو کەناری ئاسمان سوردەبێ ۰ یان زەرداییو سورایی ئاسۆ لەکاتی خۆرکەوتن دا ۰ بەزۆری ئەو دیمەنە نیشانەی گرانیو قاتو قڕییە.

**الوُردة**: ڕەنگی گوڵ.

**الوَرِيدُ**: هەر ڕەگو دەمارێك خوێن لەجەستەوە بەرێ بۆدڵ ٥ (مُفْرَد الوريدين): دوو ڕەگن لەژێر سورچكەوەن ٥ (حبل الوريد): ڕەگێكە عەرەب وایان زانیوە ڕەگی لامله.

**الوُرَيْدَة الطفلِيَّة**: نەخۆشییەكە دیاردەكەی لەرزوتایە توشی منداڵ دەبێ.

**الوَرُّ**: كلۆت ٥ هەرزانیو گوزەران خۆشی.

**وَرَسَ النبتُ يَرِسُ وروساً**: ڕوەكەكە سەوز بوو.

**وَرَسَت الصخرة**: بەردەكە لەناو ئاودا قەوزاوی بوو، وای لێهات سەوزی نواندو خلیسك بوو.

**أورَسَ الشجرُ**: درەختەكە گەڵای كرد.

**أورَسَ الرِّمْثُ**: ڕوەكی ڕەمث گەڵاكەی زەرد بوو.

**أوْرَسَ المكانُ**: شوێنەكە گیای وەرسی لێ ڕوا.

**وَرَّسَ الثوبَ**: قوماشەكەی ڕەنگ كرد، بەگەڵای وەرس.

**الوارِسُ**: زەرد ٥ دەگوترێ: (أصْفَرُ وارس): زەردی كەسكون، شتێك زۆر زەردبێ.

**الوَرْسُ**: ڕوەكێكە لەخێزانی (القرنية)یە لەوڵاتی عەرەبو حەبەشەو هیندوستان دەڕوێ، بەرەكەی لەكاتی كامڵ بونو پێگەیشتن دا بەچەند غودەیەكی سورباو دادەپۆشرێ، هەندێ پرژوپاڵی پێوەیە بۆ ڕەنگكردنی پۆشاكی ئاوریشم بەكاردەهێندرێ چونكە مادەیەكی سوری تێدایە.

**الوَرْسِيُّ**: شتێك پاڵ بدرێ بۆلای وەرس ٥ جۆرێكە لەباشترین داری گوێزو شتی وا كە كاسەو كەوچكی لێ دروست دەكرێ.

**الوَرِيسُ**: هەرشتێك بەڕوەكی وەرس ڕەنگ بكرێ ٥ دەگوترێ: (ثوب وريس ومَلحفة وريسة).

**وَرَشَ يَرِشُ وَرْشاً**: خەفەتی بەكردەوەی ناشیرینو پڕوپوچ خوارد ٥ چاوچنۆك بوو تەماعی كرد ٥ زۆری خواردو شتی ماشیەوە.

**وَرَشَ عليهم**: لەكاتی نان خواردن دا چووە لایانو خولكیان نەكرد نانیان لەگەڵ بخوا.

**وَرَشَ من الطعام شيئاً**: كەمێكی لە خواردنەكە خوارد.

**وَرِشَ يَوْرَشُ وَرَشاً**: چوستو چالاك بوو.

**الوَرْشُ**: خواردنێكە لەشیر دروست

دەكــرێ ، (قــــراءة ورش): جــۆرە قورئانخوێندنێــكە نیـسبەت دەدرێ بــۆلای عوسمــانی كــوڕی ســەعید (القارئ).

**الوَرَشَــان**: باڵندەیەكــە لــە پێــڕی (الحمامیــە)یــە كەمێــك لــەكۆتر گــەورەترە ، زێــدی ســەرەكی وڵاتــی ئەوروپایــە بەكۆمــەڵو پۆلپــۆل ڕەودەكەن بۆ وڵاتی شامو عێراق ، (ك: وِرشان ووراشین).

**وَرَصَــت الدجاجــة تَــرِصُ ورصــاً**: مریــشكەكە بەیــەكجار هێلكەكــەی كرد.

**اورَصَــــتْ الدجاجــــة**: بــــەمانا (وَرَصَت)دێ.

**وَرَطَ الشَّيْئ ورطاً**: شتەكەی شاردەوە.

**وَرَطَ فلاناً**: فێڵی لەفلانكەس كرد.

**اورَطَ فلانــاً**: فلانكەســی خــستە چورتمەوە.

**اورَطَ إبلَهُ**: حوشترەكەی شاردەوە.

**اورَطَ إبله في إبل اخرى**: حوشـترەكەی خـۆی خستە نـاو حوشـتری تـرەوەو گومی كرد شاردیەوە.

**اورَطَ الشَّيْئ**: شتەكەی شاردەوە.

**وارَطَـه مُوارَطَـة ووراطـاً**: فێڵـی لـێ كرد.

**وَرَّطه**: خستیە ناو چورتمەوە، خستیە ناو گۆبەندەوە.

**وَرَّطَ إبله في إبل اخرى**: حوشترەكەی خۆی خستە ناو حوشـوتری تـرەوەو شاردیەوە.

**تَوَرَّطَ**: بۆ موطاوعەی (وَرَّطَه)دێ.

**تَوَرَّطَ في الأمر**: كەوتە ناو ئیشەكەوەو توشـی چـورتم بـوو ، سـەری لـێ شـێواو نـەیزانی چـۆن خـۆی ڕزگـار بكا ، لەناو ڕوداوو كارەكەدا فـەوتا ، بەهیلاك چوو.

**تَوَرَّطت الماشِية**: ئاژەڵەكان كەوتنە قـوڕەوە ، یـان كەوتنـە شوێنێـكی سامناكەوەو ڕزگاربونیان نییە.

**استورَطَ في الأمر**: لەكارەكەدا سەری لـێ شـێواو نـەیزانی چـۆن خـۆی ڕزگار بكا ، لەگۆبەنـدو گێژاوەكەدا فەوتا ، سەری تێداچوو ، دەگوترێ: (إسـتورط في حبـالتي): كەوتـە داوی منەوە ڕزگاری نەبوو.

**الـوِرَاطُ في الـصدقة**: ئـاژەڵو مـاڵی جیاجیـا كە نەگەنـە حـەدی زەكـات كۆبكرێنــــەوە بۆنــــەوەی بگەنــــە ئەندازەی زەكـات لـێدەركردن ، یـان بەپێـچەوانەوە ئـاژەڵو ماڵێـك هـی یەك كەس بێو زەكاتیان لـێ بكەوێ دابەشــیان بكــەی بەســەر چــەند كەسێــك دا بۆئــەوەی زەكاتیــان لــێ نــەدا ، یــان ئاژەڵــەكانی تێــكەڵ

بـــەئاژەڵی تربکـــاو لـــەناو ئـــاژەڵی کەســـانی تـــردا گومیـــان بکـــا ٥ یـــان ئاژەڵـەکانی لەشوێنێـك بـشارێتەوە بۆئــــــەوەی فەرمانبــــــەرەکانی کۆکەرەوەی نەیان بینێ.

**الوَرْطَةُ**: زەلکاوو چاڵ کەرێـگەی لـێ هاتنـەدەرەوەی نـەبێ ٥ ئەشکەوتو غاری زۆر قوڵو پێچاو پێچ ٥ چاڵو کەنـــدری قـــوڵو بـــێ ســـەروبن ٥ قورولیتـــــەی زۆر ٥ هـــــەرکارو کێـــشەیەك خۆلـــێ ڕزگـــارکردنی زەحمـــــەت بـــێ ٥ فـــــەوتان ٥ (ك: ورطات، وراط، وأوراط).

**وَرِعَ يَرِعَ وَرَعاً**: خۆی لەحەرام پاراست ٥ تەنانـــــەت دوایـــــی ئـــــەم مانایـــــە گواســـــتراوەتەوە بـــــۆ خۆگرتنـــــەوە لەهەندێ شتی حەڵاڵو موباحیش.

**وَرَعَ وُرْعاً**: ترسنۆك بوو ٥ بچوك بوو ٥ زەعیف بوو.

**وَرِعَ يَـرِعُ يَـوْرِعِ وَرَعـاً**: خـۆی پاراسـت لەحەرامو شتی شوبهە.

**وَرُعَ يَـوْرَعُ وروعـاً**: خـۆی لەحـــەرام پاراست.

**أورَعَ بينهمـــا**: لەمپـــەری خـــستە نێوانیانەوە.

**أورَعَ بـيْنَ القـوم**: ئاشـتەوایی خـستە نێوان خەڵکەکە.

**أورَعَ فلانـاً عَـنْ الـشَّيْءِ**: فلانکەســی لەشتەکە مەنع کرد.

**وارَعَ فلاناً**: قسەی لەگەڵ فلان داکرد، ڕاوێژی پێ کرد.

**وَرَّعَ بينهمـــا**: لەمپـــەری خـــستە نێوانیانەوە.

**وَرَّعَ فلانـاً عَـنْ الـشَّيْءِ**: فلانکەســی لەشـتەکە مـەنع کـرد ٥ لەحـەدیثی عومـــەردا هـــاتووە: (وَرِّعْ عَنِّـــي في الـــدرهم والـــدرهمين): مەهێڵـــە کێشەکاری درهەمو دوو درهەم بێنە لام بۆخـــۆت بڕیـــار بـــدە بۆیـــانو سوڵحیان بکە.

**وَرَّعَ الإبلَ عَنْ المـاء**: حوشـترەکەی لەئاوەکە گێڕایەوە.

**وَرَّعَ الفـــارسُ الفـــرسَ**: ســـوارەکە ئەســـپەکەی بـــەلغاو (بەهەوســـارو ڕێشمە) بەستەوە ٥ دەشگوترێ: (مـا وَرَّعَ أن فعـل كـذا): درۆی نـەکرد کەنەوەی کرد.

**تَـوَرَّعَ في الأمـر**: لەکارەکـەدا توشـی ئیحراجی بوو.

**الرِّعَةُ**: خۆگرتنـەوە لەشـتی حـەرامو نارەوا ٥ ئەدەبو ویقار ٥ دەگوترێ: (هــو حـــسن الرِّعــة): ئـەو پیـاوە هـەڵسو کـەوتو شـێوەی جـوانو پەسەندە.

**وَرَفَ النبتَ والشجر يَرِف وَرْفاً ووريفاً:** ڕووەك و درەختەكە رازایەوەو جوان و گەشەدار بوو.

**وَرَفَ الـشَّيْئ:** شتەكە گەشـایەوەو بریسكەدار بوو.

**وَرَفَ الظِـلُّ:** سـێبەرەكە فـراوان و درێژخایەن بوو.

**اورَفَ الظِلُّ:** بەمانا (وَرَفَ)دێ؟.

**وَرَّفَ الظِلُّ:** بەمانا (وَرَفَ)دێ.

**وَرَّفَ الشَّيئ:** شتەكەی مژی.

**وَرَّفَ الأرضَ:** زەوییەكـەی بەشـبەش كرد.

**الرِّفَّةُ:** سەوزو ناسك و تەڕو تاز.

**الرُّفَّةُ:** كا؛ گژوگیای وشكی گێرەكراو.

**وَرَقَ الشجرُ يرِق وَرْقاً:** درەختەكە گەڵای كـرد گەڵاكـەی هاتـە دەرو پـان بـۆوە ◦ گەڵاكەی هەڵوەراند.

**وَرَقَ فـلان الـشجرةَ:** فلانكـەس گـەڵای درەختەكەی رنی، لێی كردەوە.

**اورَقَ الشجر:** درەختەكەی گەڵای كرد، گەڵاكەی بە تەواوی دەركەوت.

**اورَقَ فلان:** فلانكەس دەوڵەمەند بوو، ماڵ و سامانی زۆر بوو.

**اورَقَ طالـبُ الحاجـة:** داواكەرەكـە، خـاوەن پێویـستیاتەكە تـێ شـكاو هیچی بۆ جێ بەجێ نەبوو.

**اورَقَ الصائدُ:** نێچیرەوانەكە نەیتوانی نێچیرەكە بگرێ فاشیل بوو.

**اورَقَ الغـــازي:** غەزاكەرەكـــە دەســتكەوتی جـەنگی دەســت نەكەوت.

**وارَقَهُ:** لێـی نزیـك بـۆوە ◦ دەگـوترێ: (مازلتُ مِنك ولك موارقاً): هەمیـشە من لێتەوە نزیكم.

**وَرَّقَ الـشجرُ:** درەختەكــە گــەڵای دەركرد.

**وَرَّقَ فــلان:** فلانكــەس كاغــەزی ئامادەكردو تێیدا نوسی ◦ فلانكەس نوسەری یەكێكی تر بوو.

**تَـوَرَّقَ الحیـوانُ:** حەیوانەكـە گـەڵای خوارد.

**استورقَ:** داوای زیوی كرد.

**الأورَقُ:** لەهـەموو شتێـك دا ئەوەیـە ڕەنگـی خـاكی بـێ ◦ هەروا نـاوە بـۆ مرۆڤـی سـەوزەو گـەنم ڕەنـگ ◦ بـۆ حوشترێـك سپی مەیلەو ڕەش بـێ ◦ گـورگ ◦ تـەپو تـۆز ◦ ماست و شـیر بەشێـك لەسێ بەشی شیربێ دوبەش لەسێ بەشی ئاوبێ ◦ ساڵی بێ باران (وشــكە ســاڵ) ◦ (زمـــان أورق): ڕۆژگاری قات و قڕی.

**الرِّقَة:** زەوی لەكاتی گەرمادا بارانی لـی بـداو گیاوگـژی لـێ بـڕوێ و سـەوز هەڵگـەڕێ ◦ مـاڵ و سامان ◦ زیـو ◦ دیرهەمی سكە لـێ دراو ◦ (ك: رِقات ورِقون).

**الوَارِقَـةُ:** درەختــی ســەوزو گــەڵادارو پۆشناخ.

**الوَرّاقُ:** دیمەنی سەوزی زەوی بەهۆی گیاو گژەوە ٥ دەگوترێ: (ما أحسن وَرّاقُهُ): چەند شێوەو دیمەنو جلو پۆشاکی جوانو رێكو پێکە.

**الـوِراقُ:** کاتــێ پـشکوتنی درەخــتو گەڵاکردنی.

**الوِراقة:** پیشەی کتێب نوسینەوە بۆ خەڵك.

**الـوَرّاقُ:** (مُـوَرِّق الکتـب): نەوکەسـەی کاغەز ئامادە دەکاو کتێب بۆ خـەڵك دەنوسـێتەوە ٥ کەسێـك دیرهـەمی زۆربــێ ٥ (رجــــل وراق): پیــاوی خاوەن زیو.

**الوَرّاقـة:** مێینـەی (الـوَرّاق) ٥ هـەروا ناوە بۆ پەڕەکاغەزێـکی ڕەقو پتـەو چـــوار گۆشـــەیەکی دەوران دەوری بـۆکراوە لەســـەر مێـــز دادەنـــرێ نووســـەر نەوپـــەڕەی کەدەیـــەوێ لەسـەری بنوسێ دەیخاتـە سەر ئـەو پەڕە پتەوە بۆئـەوەی نووسینەکەی خواروخێچ نەبێ ٥ سندوقێکی دارە جۆری زۆرە، کاغەزی نوسینی تێـدا هەڵدەگیرێ.

**الـوَرَق من الـشجر:** پەلکـە گـەڵا کـە دەمارەکـــانی دیـــاربن ٥ دونیـــا ٥ جوانیو رازاوەیـی جیهان ٥ جـوانی گەڵو نەتەوە.

**وَرَقُ القوم:** منـداڵو تـازە پێگەیـشتوانی گــەل ٥ یــان گــەنجو لاوە لاوازەکــانی نەتەوە.

**وَرَقُ الـشباب:** تــەڕو تــازەیی گــەنجیو نیـشاتو تـەڕدەماخی ٥ پێـستی تـەنك کەلەســـەری بنوســـرێ ٥ هەرشتێـــك لەسـەری بنوسـرێ یـان لەسـەری چاپ بکرێ ٥ماڵو سامان کەزیوو حوشـترو شـتی وابـێ ٥ دەگـوترێ: (اختـبط منـه ورقاً): خێـرو بێـری لێـی دەستکەوت ٥ چـــۆڕاوگەی خـــوێن کەبـــە شـــێوەی کەوانـــەیی بکەوێتـــە ســـەر زەوی ٥ خـوێنی کلۆ کلۆ کەلـەبرین بکەوێتـە خوار.

**الأوراق المـصرفية:** چەکێـکە بانـك دەری دەکـا ئـەوە دەگەیـەنێ کـە پێویـــستە بـــڕی پـــارەی دیـــاریکراو بدرێ بەهەڵگری نەوچەکە.

**الوَرِق:** زیو ٥ سکەلێدراو بـێ یـان نـا ٥ (ك: أوراق ووِراق).

**الوَرْقـــاءُ:** کـــۆتر ٥ دێڵـــە گـــورگ ٥ درەختۆکێـــکە بالاپیاوێـــك بـــەرز دەبێتەوە، گەڵایەکی خڕی کەوانەیی هەیـــە هـــەموو ئاژەڵێـــك دەیخـــوا، لاسکەکەی تـەپو تـۆزاوی گەڵاکـەی زۆر ســـــەوزە لەشــــیوو دۆڵو دەم روباردا دەڕوێ.

**الوَرْقَـةُ في القـوس:** عـەيبو لەككـەی کەوان.

**الوُرْقَـةُ:** گـەنم ڕەنگـی ٥ بـۆر ٥ ڕەش‌و سـپی ٥ بـەزۆری ڕەنگـی حوشـتردا باقی ئاژەڵەکان دا بەرچاو دەکەوێ.

**الوَرَقَةُ:** تاکی (الوَرَق) ٥ پیاوی پیاوانە، پیاوی خوێڕی ٥ دەگوترێ: (هو ورقة وهي وَرَقَة): ئەو پیاوە ئـەو ئافرەتـە هیچ‌و پوچ‌و خوێڕییە.

**الوَرِقَـةُ:** (شـجرة وَرِقَـةٌ): درەختێـکی پرگەڵاو چڕە ٥ گەڵا سەوزو جوانە.

**الوَرِيقَـةَ:** درەختـی پرگـەڵاو سـەوزو تەڕدەماخ.

**وَرَكَ يَـرِكُ وَرْكـاً:** زەختـی خـستە سـەر کلۆتی.

**وَرَكَ وروكاً:** لەسەر تەنیشت ڕاکشا.

**وَرَكَ على الدابة:** قاچی لەسەر ولاخەکە نوشـتاندەوە بۆئـەوەی پـشوو بـدا یـان دابەزێ.

**وَرَكَ بالمكـان:** لەشـوێنەکە دا نیشتەجێ بوو مایەوە.

**وَرَكَ علـى الأمـر:** دەسـەڵاتی بەسـەر کارەکەدا شکا.

**وَرَكَ الشيءَ وَرْكاً:** شتەکەی خستە ئاست کلۆتی (سمتی).

**وَرِكَ يَـوْرَك وَرَكـاً:** سمتـی گـەورە بـوون، (فهو أورك وهي وركاء).

**وَارَكَ بالمكان:** لەشوێنەکە تێپەڕی.

**وَرَّكَ علـى الدابـة:** لەسـەر پـشتی ولاخەکە قاچی نوشتاندەوە کلۆتی خستە سەر زینەکە.

**وَرَّكَ علـى الأمـر:** دەسـەڵاتی بەسـەر شتەکەدا شکا.

**وَرَّكَ في الوادي:** بەناو شیوو دۆڵەکەدا ڕۆیی.

**وَرَّكَ في اليمين:** لەسوێند خواردنەکـە دا نیازی ئەوە نەبوو کەسوێندەرەکە مەبەستی بوو.

**وَرَّكَ الشيءَ:** شـتەکەی خـستە ئاسـتی سمتی خۆی.

**وَرَّكَ المكـانَ:** شـوێنەکەی جـێ هێـشت خستیە دوا خۆیەوە.

**تـوارَكَ:** زەختـی خـۆی خـستە سـەر کلۆتی.

**تَـوَرَّكَ:** زەختـی خـۆی خـستە سـەر کلۆتی.

**تَـوَرَّكَ في الـصلاة:** لـە دانیـشتنی تـەحیاتی نوێـژدا سمتـی ڕاسـتی لەسـەر قاچـی ڕاسـتی دانـاو سەرەپەنجەکانی ڕویان لەڕۆگە بـوو، سمتی لای چەپی لەسـەر زەوی دانـا سـەرەپەنجەی قاچـی چـەپی لـەلای ڕاستییەوە هێنایە دەر.

**تـورَّك علـى الدبـة:** لەسـەر پـشتی ولاخەکـە قاچـی نوشـتاندەوە

بەمەبەستی ئەوەی دابەزێ یان قاچی بحەسێتەوە.

**تَوَرَّكَ بالمكان:** لەشوێنەکە نیشتەجێ بوو، مایەوە.

**تَوَرَّكَ عَنْ الحاجة:** لەناست پێداویستییەکەدا کەمتەرخەم بوو تەمبەڵی کرد.

**تَوَرَّكَ لفلان وفلاناً:** پێ پیلکەی هێنایە قاچی فلاًنکەس و بەزەوی دادا.

**تَوَرَّكَ على الأمر:** دەسەلآتی بەسەر کارەکەدا شکا.

**تَوَرَّكَ الصبي:** منداڵەکەی خستە کلۆتی وای لێ کرد زەخت بکاتە سەری.

**المَوْرِك:** ئەو شوێنەی سوار قاچی دەخاتە سەر ◊ حەبل و قەیاسە کە بارگەنەی پێ لەسەر پشتی ولآخەکە دەبەستێ.

**المَوْرِكة:** ئەو شوێنەی سوار قاچی دەخاتە سەر لەسەر پشتی ولآخ ◊ (ناو زەنگی) ◊ ئەو شوێنەی زین و بارگەنە کە سوار قاچی لەسەر دەنوشتێنێتەو بەمەبەستی حەسانەوە یان دابەزین.

**المیرکة:** ئەوەی لەپێشەوەی بارگەنەدایەو سوار کە ماندو بوو قاچی دەخاتە سەر.

**الوارِك:** ئەوشوێنەی بارگەنە کەسوار قاچی دەخاتەی سەر لەکاتی ماندوبون دا بۆئەوەی بحەسێتەوە ◊ ئەو پەشتەماڵەی بەپێشەوەی بارگەنەدا دەدرێ و لەژێری دەنوشتێتەوە.

**الوَرْكُ:** زوور ڕانی ئادەمیزاد ◊ کلۆت (سمت) ◊ کەوانی دروستکراو لەقەدەدار (بنەدار) ◊ (ك: أوراك).

**الوِرْكُ:** زوور ڕان ◊ سمت و کلۆت.

**وَرِكَ الشَّجَرة:** قەدی دار (بنکی دار) ◊ )أوراك).

**الوِرْكُ:** زوور ڕان ◊ کەوانی دروستکراو لەقەدی دار ◊ لەبنکی دار ◊ تەنیشتی کەوان ◊ ڕێڕەوی تیرەکە لەناو کەوان دا ◊ (ك: أوراك).

**الوَرْكي:** بنەماو سەرچاوەی شت ◊ دەگوترێ: (إِنَّ عنده لَوَرْكي خبر): سەرچاوەی هەواڵە کە لای ئەوە.

**الوَرْكاءُ:** مێینەی (الأورك) ◊ ئافرەتی سمت و کەفەڵ گەورە ◊ پاشپان.

**الوَرْكانة:** ئافرەتی سمت و کەفەڵ پان و زل.

**الوَرَلُ:** گیانلەبەرێکی لوت درێژو کلك درێژە ◊ لەهەندێ شوێن پێی دەڵێن (قۆڕی) ◊ قەدباریك و کلك لوس و سفتە لەسوسەمار درێژترەو لەتیمساح کورتترە لەناو وشکانی و

دەریادا دەژی، دوپشك‌و مارو کرم‌و قالۆنچە دەخوا، عەرەب بەلایانەوە پیسەو قێزی لێ دەکەنەوەو نایخۆن ٥ (ك: أورال وِرلان وأرؤل).

**وَرِمَ يَرِمُ ورماً**: هاوسا.

**وَرِمَ انفَهُ**: رقی هەڵسا.

**وَرِمَ النبتُ**: روەکەکە راساو درێژ بوو ٥ (فهو وارم).

**اورَمَت الناقة**: حوشترەکە گوانی هاوسان، گوانی رِەپ بوون.

**اورَمَ فلاناً**: قسەیەکی بەگوێی فلانکەس دادا رقی پێ هەڵسێ.

**وَرَّمَ فلان بانفه**: فلانکەس خۆی بەزل زانی‌و فیزی نواند.

**وَرَّمَ الجلدَ**: پێستەکەی والێ کرد بهاوسێ.

**وَرَّمَ انفَهُ**: رقی هەڵسان تورەی کرد.

**تَوَرَّمَ**: فش بوو، رقی هەڵسا.

**الأوْرَم**: خەڵك، یان زوربەی خەڵك ٥ زوربەی سوپا.

**التوَرّم**: جۆرە نەخۆشییەکە لەپێست دا یان لەپەردەی موخاطی دا کێم‌و زوخاو پەیدا دەکا.

**المَوْرِمُ**: شوێنی روانی ددانی خرێ ٥ ددانی هارِەر.

**الوَرَمُ**: شێرپەنجە.

**تَوَرَّنَ**: زۆری خۆئارایش داو زێدە رەوی کرد لەبەکارهێنانی بۆنی خۆش‌و میکیاج کردن دا.

**الوَارنية**: کڵۆت، سمت.

**وَرْنَة**: ناوی مانگی ذیلقەعیدە بووە لەپێش هاتنی ئیسلام دا.

**الوَرْنيش**: مەحلولی مادەی راتینجییە یان زەیتی جەففوف بۆ خۆچەورکردن بەکاردێ.

**وَرِهَ يَوْرَهُ وَرَهاً**: گێل‌و ئەحمەق بوو.

**وَرِهَ الكثيبُ**: کۆمەڵە گڵەکە خۆی نەگرت داڕوخا.

**وَرِهَت الريحُ**: بایەکە بەنارێك‌و پێکی هەڵی کرد.

**وَرِهت السحابة**: هەورەکە بارانی زۆر بوو ٥ (فهو أوره وهي ورهاء).

**وَرِهت المرأةُ**: ئافرەتەکە بەزی زۆر بوو ٥ (فهي وَرِهَة).

**تَوَرَّهَ في عمله**: لەئیشەکەی دا کاراما نەبوو.

**الوارِهَة**: پان‌و فراوان ٥ دەگوترێ: (دار وارِهة).

**الورهاءُ**: دەگوترێ: (إمرأة ورهاء اليدين): ئافرەتێکە دەست بڵاو دەست قڵشاو.

**الوُرَّهُ**: لەبەلانی روخەك‌و خۆنەگر.

**وَرْوَرَ في الكلام**: لەقسەکردن پەلەی کرد.

**وَرْوَرَ نظرَهُ:** چاوی تیَ بڕی.

**المُوَرْوِرُ:** هەڵخەڵەتێنەر.

**الوَرْوَرِيُّ:** چاوکز، کوێرە مشە.

**وَرَى الزَّنْـدُ يـرى وَرْيـاً:** چـەرخەکە شقارتەکە بەردە ئەستێـکە ئـاگری لـێ دەرچوو ٥ (فهو وارٍ).

**وَرَتِ النارُ ورياً رِيَّةً:** ئاگرەکە هەڵگیرسا.

**وَرَى الإبلُ وَرْياً:** حوشـترەکە قەڵەو بـوو، بەزی زۆربوو.

**وَرَى الله فلانـاً:** خـودا فلانکەسـی توشـی نەخۆشی ناوسك کرد.

**وَرَى فـلان فلانـاً وغـيره:** فلانکــەس لەجەرگو سیَ فلاَنی دا.

**وَرَى القَيْحُ جَوْفَهُ:** کێمو زوخـاو ناوسـکی خوارد ٥ لەحەدیثدا هـاتووە (لأن يمتلئ جوف أحدكم قَيْحاً حتى يريه خير له من أن يمتلئ شِعراً).

**وَرِيَ الزَّنْدُ يَوْرَى ورياً:** بەمانا (وَرَى)دیَ.

**وَرِيت النار:** بەمانا (وَرَتْ)دیَ.

**وَرِيَ المـُخُّ يـرى وريـاً:** مۆخەکـە پتـەوو پڕبوو.

**وَرِيَ الـشحمُ ورِيًّ:** بەزەکـە رونـاوی زۆر بوو.

**وُرِيَ الكلبُ وَرِياً:** سەگەکە رقـی هەڵساو کەوتە وەڕین.

**أورى الزنـدُ:** چـەرخەکە، شـقارتەکە ئاگرەکەی هاتە دەر.

**أورى الزَّنْـــدَ:** ئـــاگری چـــەرخو شقارتەکەی هێنایەدەر.

**أورى النارَ:** ئاگرەکەی هەڵگیرساند.

**أورَى صَـدْرَه عليـه:** حیقـدو کینـەی دەربـارەی ئـەو خـستە نـاو سـنگی خۆیەوە، رقی لێی بوو.

**أورى لـه رأيـاً:** رایـەکی بـۆ دەربـڕی، بیرو بۆچونێـکی تازەی بۆخستە ڕو.

**أورى الـسِّمَنُ الإبـلَ:** قەڵـەوی بـەزو چەوری حوشترەکەی زۆرکرد.

**واراه:** شاردیەوە.

**وَرَّى عَنْ فلان:** داکۆکی لەفلاَن کرد.

**وَرَّى عَنْ الـشَّيْئِ:** شـتەکەی مەبەسـت بـــوو شتێـــکی تـــری درکانـــد ٥ لەحەدیث دا هـاتووە کـە پێغەمبـەر (د.خ): (كـــان إذا أراد ســـفراً وَرّى بغـيره): ئەگـەر بیویـستایە بـچیَ بـۆ غەزایـــەك بەمەبەســـتی چەواشـــە کردنی دوژمنان ناوی ئـەو شـوێنەی مەبەسـتی بـوو ئاشـکرای نـەدەکردو شوێنێـکی تری ئاشکرا دەکرد.

**وَرَّى فـلان الزنـدَ:** فلاَنکـەس ئـاگری لەچەرخو شقارتەکە دەرکرد.

**وَرَّى الـشَّيْئِ:** شـــتەکەی شـــاردەوە ٥ خستیە دوا خۆیەوەو حەشاری دا.

**تَوارى:** خۆی پەنهان کرد.

**اســتورى الزنـدَ:** ئـــاگری چـــەرخو شقارتەکەی دەرهێنا.

**استوری فلاناً رایاً**: داوای لەفلان کرد رایەکی پێ بڵێ‌و شارەزای بکا بۆئەوەی پەیڕەوی بکا.

**الثَّرِيَّةُ**: ئەوەی ئافرەتی حەیزدار دەیبینێ لەکاتی خۆشتن دا ٥ کەبریتییە لەزەرداو لێڵییەکی زۆرکەم.

**الرِّيَةُ**: هەرشتێک ئاگری پێ داگیرسێنی، پەڵ‌و پوشی بێ یان کاغەزو پەڕو چیلکە داربێ.

**الواري**: بەزی قەڵەو ٥ هەرشتێک قەڵەو بێ.

**الوَارِيَة**: نەخۆشییەکە توشی سی‌و جگەر دەبێ کۆکە کۆک پەیدا دەکا لەنەخۆشەکەدا و دەیکوژێ.

**الوَرْيُ**: کێم‌و زوخاوێکە لەناو سک دا پەیدا دەبێ یان برینێکە خوێن‌و کیم‌و زوخاوی لێ دێ.

**الوَرى**: خەڵک ٥ بونەوەر.

**الوَرْيَةُ**: هەرشتێک ئاگری پێ هەڵگیرسێ.

**الوَرِيُّ**: بەزی قەڵەو ٥ گۆشتی قەڵەو ٥ میوان ٥ جیران.

**وَزَأَ مِنَ الطعام يَزَأُ وزءاً**: پڕ بوو لەخواردن.

**وَزَأَ اللَّحْمَ**: گۆشتەکەی برژاندو وشکی کرد چەورایی تێدا نەهێشت.

**وَزَأَ القومُ القومَ**: خەڵکەکە نەتەوەکە هەندێکیان لەشەڕدا یان لەشتی تردا داکۆکییان لەهەندێکیان کرد.

**وَزَأَتِ الناقةُ او الفرس ونحوهما براكبهما تَوْزِئَةً**: حوشترەکە یان ئەسپەکە سوارەکەیان گلاند لەسەرپشتی خۆیان خستیانە خوار مرد.

**وَزَّأَ فلاناً**: فلانکەسی بەهەموو جۆرە سوێندێک سوێندی دا.

**وَزَّأَ الإناءَ**: قاپەکەی پڕکرد.

**تَوَزَّأَ**: پڕبوو لەکێم‌و زوخاو.

**تَوَزَّأَ الإناءَ**: قاپەکە پڕبوو.

**الوَزَأُ**: کورتە بالای قەڵەوو خەپە تۆڵەو جەستە پتەو.

**وَزَبَ الماءُ والشيئ**: ئاوەکە شلەمەنییەکە ڕەوان بوو.

**اوزَبَ في الأرض**: بەناو زەوی دا ڕۆیی.

**المِيزابُ المِئْزابُ**: بڕوانە مادەی (أزَبَ).

**الوَزّابُ**: دزی کارامە.

**وَزَرَ يَزِرُ وَزْراً وزِرَةً**: شتێکی بەکۆڵ هەڵگرت پشتی ماندو بوو ٥ تاوانبار بوو.

**وَزَرَ لە وَزارةً**: بوو بەشالیارو وەزیری ئەو.

**وَزَرَ الشيئ وَزْراً**: شتەکەی هەڵگرت لەکۆڵی دا.

**وَزَرَ الرجلَ وَزْراً**: بەسەر پیاوەکە دا زاڵ بوو.

**وَزَرَ الثلمة**: کونەکەی هاخنی، کەلێنەکەی گرت.

**وُزِرَ یَـوْزَرُ وِزْراً**: تـاوانی کـرد، تـاوانی پاڵدرا.

**اوْزَرَهُ**: پـەناو مەلجەئێـکی بـۆ دابـین کـرد بۆئـەوەی تێیـدا بحەوێتـەوە ٥ شاردیەوە.

**اوْزَرَ الـشَّیْئَ**: شـتەکەی هـەلگرت بۆخۆی دانا خستیە شوێنی شیاوی خۆی ٥ شتەکەی بردە بنچو بناوانی خۆیو کردیە دیکومێنت ٥ بردی.

**وازَرَهُ علـی الأمـر**: لەسـەر کارەکـە یارمـەتی دا پـشتگیری کـرد ٥ بـوو بەوەزیری ئەو.

**استَوْزَرَهُ**: کـردی بـەوەزیری ئـەو ٥ بردی.

**الوِزارَة الوَزارَةُ**: حاڵو وەزعی وەزیرو پلەو پایەی لەو فەرمانڕەواییەدا.

**إتَّزَرَ**: تاوانی کرد ٥ ئیزاری لەبەر کرد، بەشانی دادا دەرپێـی کـورتی لـەپێ کرد.

**الوِزْرُ**: کۆڵی گـران ٥ چـەكو سیلاح ٥ تـاوان ٥ (ك: أوزار) ٥ دەگـوترێ: (أعَـدّوا اوزار الحـرب): ئـامێری جـەنگیان ئامـادەکردوە ٥ (وُضِـعت الحـربُ أوزارهـا): شـەڕەکە دامرکایـەوە، تـەواو بـوو، کوژایـەوە، شەڕ وەستا.

**الوَزَرُ**: پـەناو مەلجـەو، کێـوی عاصیو قایم.

**الـوِزْرَة**: پۆشاکێـکی بـچوکە بـۆ داپۆشینی شەرمگا ٥ (ك: وِزَرَات).

**الوَزِیر**: پاڵپشتو یارمەتیدەر ٥ وەزیر.

**المَوْزَةُ**: زەوییەك باڵـندەی (ئیـوەزەی) تێدابێ.

**الـوَزُّ**:باڵـندەی (ئیـوەز) ٥ باڵندەیەکـە لەقاز دەچێ.

**وَزَعَ الإنـسان وغـیره**: ئادەمیزادەکـەی مـەنع کـرد حەبـسی کـرد ٥ لێـی تـورە بوو.

**وَزَعَ الجَـیْشَ**: سـوپاکەی رێـك خـستو دایمەزراند بۆ شەڕو بەرگری.

**اوزع بیـنهم**: جـودا وازیـی خـستە نێوانیان ٥ رێکی خستن.

**اوزع الشَّیْئَ**: شـتەکەی تەقسیم کـرد، لێکی جیاکردنەوە.

**اوزع فلانـاً بالـشیئ**: کـابرای هـەڵناو دەنەی دا بۆئەو شتە.

**اوزع فلان بالشیئ وزوعاً**: فلانکەس بەوشتە هەڵەو گیر بـوو خـۆی پێوە گرتو زێدەڕەوی کرد تێیدا.

**واعـضهُ**: نەیهێـشت، کۆسـپی خـستە بەردەمی.

**وَزَّعَـــهُ:** دابەشـــی کـــرد، لێـــکی جیاکردنەوە.

**وَزَّعَ الـصحیفة او المجلـة:** رۆژنامــە یان گۆڤارەکـەی بەسـەر خوێنـەرانی دا دابەش کرد.

**وَزَّعَ البریـدَ:** بەریدەکـەی دابەشـکرد نامـــەو نوســـراوە فەرمیـــەکانی گەیاندنە شوێنی مەبەست.

**وَزَّعَ الموســـیقار اللحـــن:** موســـیقا ژەنەکـــە لەحنـــەکانی بەســـەر ئامێرەکان دا دابەشکرد.

**إتَّزَعَ:** بۆ موطاوەعەی (وَزَعَ)دێ.

**تَوَزَّعَ القومُ الـشَّيْئ بینهم:** خەڵکەکە شتەکەیان لەناو خۆیان دا دابەشکرد ٥ دەشگوترێ: (تَوَزَّعته الأفکار): بیرو بۆچـونی جیـاواز دابەشـیان کـردوە نازانـــێ کامـــەیان پـــەیڕەو بکـــا دەشـــگوترێ: (توزّعـــوا ضـــیوفهم): میوانـــــەکانیان بەســـــەرخۆیان دا دابەشکردو بردیاننەوە ماڵەوە هـەر خانــە خوێیــەو کۆمەڵێــکی میــوان بەرکەوت.

**اسـتوزَعَه الأمـرَ:** کارەکـەی خـستە دڵیـــەوە، وای لـــێ کـــرد بیزانـــێو پەیڕەوی بکا ٥ دەگوترێ: (اسـتوزع اللهُ شـکرَه): خـودا یارمـەتی داو وای لـێ کرد سوپاس کردنی خودای لەلا شیرن بێو بتوانێ ئەنجامی بدا.

**الأوزاع:** چـــەند تـــاقمو گرۆهێـــك، کۆمەڵی جیاجیا ٥ چەند خانویـەکی دوورکەوتــە لەکۆمــەڵگای ئـادەمیزاد دروستکراو لەقەراخو بیجاخی شار.

**التوزیـع:** دابەشـکردن لـەبواری ڕەسـم گـــرتن دا بریتییـــە لەبـــەتاڵکردنی ڕەنـــگ لـــەڕوی تـــۆخیو کـــەمو زۆرییـــەوەو دابەشـــکردنی بەســـەر بەشـەکانی دا، هـەروا دابەشـکردنی سـێبەرو ڕونـاکی بەسـەر وێنەکـەدا بەشـێوەیەکی ڕێـكو پێـك بـەزۆری لەوێنەگرتنی ئادەمیزادو ئیعلاناتو شتی وا پەیڕەو دەکرێ.

**المتَّزِعُ:** نەفس بەرز.

**المُـوَزِّعُ:** ئەوکەسـەی نامـەو نوسـراوی پۆستە جیادەکاتەوەو دابەشیان دەکا یان رۆژنامەو گۆڤاری دەزگای چاپو بڵاوکردنەوە دابەش دەکا.

**الـــوازِع في الحـــرب:** ئەوکەســـــەی سەرپەرشـتی ریزەکـانی سـوپادەکا لەجـەنگ دا ڕیزێـك پـێش دەخـاو ریزێـــك دێنێتـــەوە دواوەو ڕێـــکیان دەخاتــەوە بۆســـەر لـەنوێ چـوونە پێشەوە ٥ (ابن وازع): ناوی سەگە ٥ (ك: وزعة ووُزّاع).

**الـوَزوُعُ:** هـەڵناو تـەماع بەرنانـە بـۆ شتێك بۆ کارێك.

**وَزَعَ به يَزَعُ وَزْعاً:** پارچه پارچه فڕێی دا ٥ پـچڕ پـچڕ دەری دا ٥ دەگـوترێ: (وَزَعَـت الإبـل ببولها، وَزَعَـت الطعنـة بالدم).

**أوْزَعَ به:** بەمانا (وَزَعَ)دێ.

**وُزِّعَ الجنين:** کۆرپەلەکە لەسکی دایکی دا ئەندامـەکانی ڕێـك خـران‌و شـێوەی ئـادەمی تێـدا دەرکـەوت‌و گیانی بەبەردا کراو جولاّیەوە.

**الـوَزَعُ:** پیـاوی زەعیـفـو هـیـچ لەبارانـەبوو ٥ بوکـە خاتونکـە ٥ دەعبایەکـە وەکـوو مارمیلکـە وایـە پەڵـەی زەردو سـوری بەجەسـتەوە هەن.

**الـوَزَغُ:** هەڵلـەرزین وشـەقەتۆڵە کەوتن.

**الوَزَغَةُ:** بوکە خاتونکە.

**وَزَفَ يـزِف وَزْفـاً:** پەلـەی کـرد ٥ هەنگاوەکانی کورت کردنەوە.

**وَزَفَ اليه:** نزیك بۆوە.

**وَزَفَ فلاناً وَزْفاً:** پەلەی لەفلاّنکەس کرد.

**أوْزَفَ:** پەلەی کرد.

**وازَفَ القـومُ:** خەڵکەکـە هەریەکـەیان بەئەنـدازەی هاوەڵەکـەی بـژێوو خەرجی خۆی دەست نیشان کرد.

**وَزَّفَ:** پەلەی کرد.

**توازَفَ القومُ:** خەڵکەکە هەریەکەیان بەئەنـدازەی هاوەڵەکـەی خـەرجی‌و بـژێوی دانـا ٥ دەگـوترێ: (توازفـوا بينهم): لەناو خۆیان دا مەسـرەفیان دانـا بۆئـەوەی بەیەکـەوە مەسـرەف بکەن ٥ لەیەکتر نزیك بوونەوە.

**أوزَكَت المرأة:** ئافرەتەکە پەلەی کرد.

**أوزَكَتْ في مشيتها:** بەشێوەی ناشیرین رۆیـی ٥ رۆیـشتنەکەی نەشـیاوو ناشیرین بوو.

**وَزَمَ يَـزِمُ وزمـاً:** رۆژی یـەك ژەم نـانی خـوارد ٥ شـتی کـەم‌و چـکە چـکەی کۆکردەوە.

**وَزَمَ الشَّيْئَ:** شـتەکەی کـەل کـرد، کـەڵکی تێ کرد.

**وَزَمَ فلاناً بفيه:** فلاّنکەسی بەدەم گەست ٥ گازی سوکی لـێ گرت.

**وَزَمَ الدينَ:** قەرزەکەی دایەوە.

**وَزَمَ في ماله:** کەمێـك لەماڵەکـەی فـەوتا، رۆیی تێداچوو.

**وَزَّمَ نفسه:** بڕیـاری دا رۆژی یـەك ژەم نان بخوا.

**تَوَزَّمَ:** قاچ پییا بەزەوی دا بەهێز بوو.

**الوِزامُ:** پەلەو خێرا.

**الـوَزّامُ:** گۆشـت‌و جەسـتە پـڕو دامەزراوو ماسولکاوی.

**الوَزْمُ:** ئەندازە ٥ گورزە پاقلەو شتی وا ٥ ئەوگۆشتەی هەڵۆ کۆی دەکاتەوە ٥

کارێك لەکاتی خۆی دا ئەنجام بدرێ.

**الوَزْمَـةُ:** ئەنـدازە ٥ یـەك ژەم نـان خواردن لەرۆژێك دا.

**الـوَزِيمُ:** گـورزە پاقلـە ٥ ماسـولکە ٥ دەگوترێ: (رجـل وزيـم): پیاوێکی گۆشـتن‌و تێکـسمڕاوە ٥ بـرژاو ٥ گۆشـتی وشـکەوەبوو ٥ گۆشـتی کوتکـوتکراو ٥ شـۆربای پاشمـاوەو بنکرِ لەبنکی مەنجەڵ دا ٥ پاشماوەی هەرشتێك بێ.

**الوَزِيمَـةُ:** باقـە پاقلـە، گـورزە پاقلـە ٥ طـەلعـی دارخورمـا فەلـّشتی تـێ بکـرێ‌و تـەلقیح بکـرێ ئـەمجار بەتوێکڵی دار یان بەشورکە دارێـك ببەسـترێ، ئـەو توێـکڵە دارە یـان شۆرکە دارەی برینـی تەلقیحەکـەی پـێ دەبەسـترێ ٥ پارچـە گۆشـت ٥ گۆشـتی ڕان ٥ ئەوگۆشـتەی هـەڵۆ کۆی دەکاتەوە لەهێلانەکەی دا.

**وَزَنَ الشَّيْئ يَزِنُ وَزْناً وزنة:** شتەکە بـاڵا بوو، بەرزبۆوە ٥ پاساوی هەبوو.

**وَزَنَ الـشَّيْئ:** شـتەکەی کێـشا بـەهۆی تـەرازو ئەنـدازەی قورسـی شـتەکەی دیـاری کـرد ٥ شـتەکەی بەدەسـت بـەرزکردەوە بۆئـەوەی مەزنـدەی بکـا بزانـێ قورسـی‌و سـوکی چـەندە ٥ شـتەکەی مەزنـدە کـرد ٥ دەگـوترێ: (وَزَنَ الكلامَ).

**وَزَنَ الـشَّيْئ:** شـتەکەی خەرسـاند، مەزنـدەی کـرد ٥ دەگـوترێ: (وَزَنَ ثَمَـرَ النخـلِ): بـەری درەختەکـە یـان خورماکانی خەرساند.

**وَزَنَ الـدراهِمَ لَـه:** دیرهەمـەکانی سـکەدارکردن دوای کێشان سکەی بـۆ لێدان.

**وَزَنَ الـشَّيْئ درهمـاً:** شـتەکەی کێـشانە کرد بەکێشی دیرهەم.

**وَزَنَ نفسَه على الأمر:** نەفسی خـۆی رام کرد لەسەر ئەوکارە.

**وازَنَ بـين الـشيئين موازنـةً ووزانـاً:** هاوتـایی‌و یەکـسانی کـرد لـەنێوان دووشتەکەدا.

**وازَنَ الشَّيْئ الشَّيْئ:** کێشی شتەکەی بەئەنـدازەی کێـشی ئـەو لێـکرد ٥ کێـشی دوشـتەکەی وەکـوو یـەك لێکرد.

**وازَنَ فلاناً:** پاداشی کردەوەکەی فلانی دایەوە.

**اتَّزَنَ العدلُ:** لاتایەکان بەرامبەر بـوون لەقورسـی‌و سـوکی دا وەکـوو یـەك بوون.

**إتَّـزَنَ الـشَيئان:** دووشـتەکە لەکێـشا وەکوو یەك بوون.

**اتَّـزَنَ فـلان الـدراهمَ:** فلانکـەس دوای

کێشان دیرهەمەکانی هەڵگرتن.

**تـــوازن الـــشیئان**: دووشـــــتەکە هاوتابوون، یەکسان بوون.

**الأوْزَنُ**: دەگوترێ: (هذا القول أوزن من هذا): ئەم شتە لەم شتە بەهێزترە، چەسپاو ترە.

**الإتّـــــزان**: لــــــەبواری وەرزش دا هاوکێـــشەیی‌و تـــەوازن‌و ڕاگرتنـــی جەستەیە.

**التـــوازن الإقتـــصادي**: ڕاگـــرتن‌و بەرامبـــەری کـــردن‌و دیـــاری کردنـــی نرخـــی کاڵاکانـــە وێـــڕای بەرچـــاو گرتنـــی چـــەند دیـــاردەو هۆکارێـــکی ئابوریی.

**الزِّنة**: کێش‌و ئەنـدازە ٥ لەحـەدیـثدا هـاتووە (سـبحان الله وبحمـده عـدد خلقه وزِنَةَ عرشه).

**الموازنة**: بودجە (میزانیـة) ٥ لـەبواری ئـــابوریی دا تێـــکەو لێـــکەیەکە هەنـــدێ بـــانق ئـــەنجامی دەدەن، بریتییـە لـەکڕینی هەنـدێ بانقـە نـــەوتی بێـــگانە کـــە نرخییـــان دابـــەزیوە لەشوێنێـــك بـــۆ ئـــەوەی بیانفرۆشـێتەوە بەلایەنێـــکی تـــرو شوێنێکی تر کەنرخیان تێدا بـەرز بۆتەوە.

**الموازین**: کۆی (المیزان) واتە تەرازوو.

**المــوزون**: (شـــیئ مـــوزون): شـــتی کێشراوو ئەندازە زانراو.

**الموزونـة**: (إمـراە موزونـە): ئـافرەتی کورتە باڵاو ژیرە.

**المیزان**: تـەرازو، ئامێرێـکە شـتی پـێ دەکێـشرێ ٥ ئەنـدازەی کەسـایەتی‌و بـــەهای مرۆڤایـــەتی ٥ دەگـــوترێ: (إعرِفْ لکل إمرئ میزانه).

**المیزان الحسابي**: لەبواری ئـابوری دا دیاریکردنی پارەی حکومـەتە ئـەوەی هەیەتی‌و ئەوەی قـەرزداری وڵاتـانی ترە ٥ ئەوەی هـی ئـەومو قـەرزە لای وڵاتان.

**المیـــزان التجـــاري**: روزنکردنـــەوەو دیـــاریکردنی نرخـــی ئـــەو کاڵایـــەی ڕەوانـــەی دەرەوەی وڵاتـــی کـــردوە ئەوەی هاوردەی کردوە.

**المیزانیـة**: بودجـە، سجیلێـکە تێیـدا واریــــداتی دەوڵــــەت یــــان هــــی کۆمپانیایـــەك بـــەراورد دەکـــرێ بەمەسـروفاتی جـا مانگانـە بـێ یـان ساڵانە بێ.

**الـوازِنُ**: (درهـــم وازن): دیرهەمێـــکە کێشی تەواوە خاوەن کێشە.

**الوزانُ**: دەگوترێ: (هـو یزانـه): ئـەوە بەرامبەر هاوکێشەی ئەوە.

**الوزانة**: دەگـوترێ: (هو یزانتـه): ئـەو

بەرامبەر ئەوە ٥ پیشەی شت کێشان، قەپانچییەتی.

**الوَزّانُ**: کەسێك پیشەی قەپانچییەتی بێ.

**الوَزنُ**: کێش ٥ زوبانی تەرازو ٥ کۆمەڵە خورمایەکە پیاوێك نەتوانێ بەرزی بکاتەوە، پوشە خورمایەکە لەولاتی هەجەر وەکوو ئامێری پێوانو کێشان بەکاردێ ٥ لەبواری شیعردا جۆرە کێشێکە عەرەب لەسەر برگەی ئەو کێشە شیعریان وتوە.

**وَزن الجبل**: بەرامبەری کێو ٥ دەشگوترێ: (فلان راجح الوزن): فلانکەس عاقڵمەندو رادروستە ٥ (ما لفلان وزن): فلانکەس هیچ رێزو نرخێکی نییە.

**الوَزنُ النوعي**: رێژەی کێشی جەستەو قەبارەیەکە بەرامبەر بەکێشی قەبارەیەك کەیەکسان بێ بەقەبارەی ئەو بەپێوەری ئاو.

**الوَزنَةُ**: ئافرەتی کورتە بالاو رەزان ٥ دیرهەمێك مامەڵەی پێ بکرێ ٥ وەجبەی شت ٥ یەك کێش.

**الوَزين**: دەگوترێ: (هو وزين الرأي): ئەو پیاوێکی رادروستو قسە پەسەندە.

**وَزوَزَ**: خێرا بازی دا ٥ هەنگاوەکانی نزیك کردنەوەو خۆی هەڵتەکاند.

**الوَزوَزُ**: مردن ٥ ماڵماڵ، پارچەدارێکی پانە لەشوێنی بەرزەوە گڵی پێ رادەدرێ بۆ شوێنی چاڵو نزمایی واتە زەوی کشتوکاڵیو باخچەی پێ تەخت دەکرێ.

**وَزَی الشَّيْئ يزي وَزياً**: کۆبۆوەو وێکهاتەوە.

**وَزَی الأمرُ فلاناً**: کارەکە فلانکەسی تورە کرد.

**اوزی لداره**: دەوران دەوری خانوەکەی بەقورِ سیاج کرد.

**اوزی اليه**: پەنای بۆبرد.

**اوزی اليه الشَّيْئ**: شتەکەی ناچارکرد پەنای بۆبەرێ.

**اوزی ظهره**: پشتی بەدیوارەکەوە دا ٥ دیوارەکەی کردە پاڵپشتی خۆی ٥ شتەکەی راست کردەوەو چەقاندی.

**وازاه**: بەرامبەری کرد روبەروی بۆوە.

**توازی الشيئان**: دووشتەکە بەرامبەر بەیەك بوون.

**استَوزی**: سوربوو لەسەر رای خۆیو تاکرەوی کرد ٥ تەرەبوو خۆی جیاکردەوە ٥ دەگوترێ: (استوزی العيدُ).

**استوزی الشَّيئُ**: شتەکە راوەستاو بەرز بۆوە ٥ هەڵسا ٥ قیت بووە.

استوزى في الجبل: بەكێوەكەدا سەركەوت.

الوَزى: پیاوی كورتە باڵاو تێكسمڕاو.

وَسَبَت الأرضُ تَسبُ وَسْباً: زەوییەكە گژوگیای زۆر بوو.

وَسِبَ الثوب: كراسەكە قوماشەكە چڵكن بوو.

اوسبت الأرض: زەوییەكە گژوگیای زۆر بوو.

اوْسَبَ الغنمُ: مەڕەكە خوری زۆر بوو.

الميسَابُ: خورمایەكە نیوە گەییو بێ تانیوەی گەیشتبێ.

الوَسْبُ: دارێكە دەخرێتە بنكی بیر بۆئەوەی گڵەكەی تێ نەڕوخێ ٥ (ك: وسوب).

الوِسْبُ: ڕوەك ٥ گژوگیا ٥ پوشو پەڵاش.

الوَسَبُ: چڵك.

وَسَخَ الشَّيْئ يوسَخ وَسَخاً: چڵكو ژەنگ شتەكەی داپۆشی.

وَسَّخَ الشَّيْئ: شتەكەی پیس كرد.

اتَّسَخَ الشَّيْئ: شتەكە پیس بوو.

تَوَسَّخَ الشَّيْئ: شتەكە پیس بوو.

استَوسَخَ الشَّيْئ: شتەكە پیس بوو.

الوَسَخُ: چڵك ٥ ئەو چڵكو ژەنگەی دەكەوێتە سەر شت.

اوسَدَ في السير: لەڕۆیشتن دا پەلەی كرد.

وَسَّدَ فلاناً الشَّيْئ: شتەكەی خستە ژێر سەری فلانكەسەوە.

وَسَّدَ الأمْرَ اليه: كارەكەی بەئەو سپارد.

تَوَسَّدَ: شانی دادا ئەنیشكی دادا.

تَوَسَّدَ الشَّيْئ: بۆ موطاوەعەی (وَسَّدَه اياه) دێ.

تَوَسَّدَ وسادةً: سەری خستە سەر سەرین.

تَوَسَّدَ ذراعه: قۆڵی خۆی كردە سەرینو سەری خۆی خستە سەرو نوست.

الوِسادُ: سەرینو پشتی ٥ دەشكوترێ: (هو عريض الوِساد): گێلو كاڵفامە ٥ هەرشتێك ئانیشكی بخەیەسەر ٥ هەرشتێك بخرێتە ژێرسەر دار بێ بەردبێ گڵ بێ یان شتی تر.

الوِسادة: بەمانا (الوِسادُ)دێ ٥ (ك: وسادات ووسائد).

وَسَطَ الشَّيْئ يَسِطُهُ وَسْطاً: شتەكەی خستە ناوەڕاست ٥ دەگوترێ: (وَسَطَ القومَ ووسَطَ المكانَ): چووە ناو خەڵكەكە چووە ناو شوێنەكە (وَسَطَ في القوم): كەوتە ناو خەڵكەكە بۆ پەیڕەوكردنی حەقو دادپەروەریو چەسپاندنی ئاشتەوایی.

**وَسُطَ الرجل يَوْسُطُ وساطة:** پیاوەکە بوو بەپیاوماقوڵو ڕێزدار.

**اوسَطَ القومَ:** کەوتە ناوەڕاستی خەڵکەکە.

**وَسْطَهُ:** خستیە ناوەڕاستەوە ٥ کردی بەدو پارچە ٥ کردی بەناو بژیکەرو ناوەندو واسیتە.

**تَوَسَّطَ فلان:** فلانکەس مام ناوەندی هەڵبژارد، لەنێوان چاکو خراپ دا مام ناوەندی پەسەند کرد.

**تَوَسَّطَ بینهم:** ناوبژی نێوانی کردن بەحەقو عەدالەت.

**تَوَسَّطَ الشَّیْئ:** چووە ناوەڕاستی شتەکەوە ٥ دەگوترێ: (توسَّطَ القومُ): کەوتە ناوەڕاستی خەڵکەکەوە.

**الأوْسَطُ:** شتی مام ناوەندو میانکار لەهەرشتێك بێ ٥ (ك: أوَاسط).

**اوسَطَ الشَّیْئ:** ناوەڕاستی شت نێوان دوولای شتەکە ٥ دەگوترێ: (هو من أوسط قومه): ئەو پیاوە لەهەڵبژاردەی گەلەکەیەتی.

**المُتوسَطُ:** (موسَط البیت): ئەوەی لەناوەڕاستی خانوەکە دایە.

**الوَاسِط:** دەرگا ٥ (واسط الکور): سەرەتای هەرێم.

**الوَاسِطة:** (واسِطة الکور): سەرەتای ولاتو هەرێم ٥ (واسطة القلادة): ئەو کەوهەرەی دەکەوێتە ناوەڕاستی ملوانکەو بەرمورەوە کەلەهەموو دەنکە میروەکانی تر بەنرختربێ ٥ یان واسیتەو شەفاعەتخواز بۆ گەیشتن بەمەبەست.

**الوَسَاطة:** ناوبژی کردن ٥ لەبواری قانونی نێودەڵەتی دا هەوڵدانی دەوڵەتێك یان زیاتر بۆ کوژاندنەوەو خەلکردنی کێشەی نێوان دوو دەوڵەت لەڕێگەی دانوسانەوە.

**الوَسْطُ:** زەرفە بەمانا (بَیْنَ)دێ ٥ دەگوترێ: (جَلَسَ وَسْطَ القوم): لەناوەڕاستی خەڵکەکەدا ڕۆنیشت.

**الوَسَطُ:** (وَسَطُ الشَّیئ): نێوان دوو لای شت ٥ مام ناوەندی لەهەرشتێك بێ ٥ دەگوترێ: (شیئ وسَط): شتێکی مامناوەندییە ٥ نەچاکە نەخراپە ٥ دادپەروەری ٥ خێرو چاکی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾: هەر بەو شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردوە بەگەلێکی دادپەروەرو چاك ٥ دەشگوترێ: (هو من وَسَطَ قومه): ئەو پیاوە لەهەڵبژاردەو پیاوە باشەکانی گەلەکەیەتی.

**الوُسْطى**: لەناو پەنجەکان دا ◦ پەنجە درێژەیە کەدەکەوێتە پەنا قامکە شادەوە ◦ پەنجەبالابەرز ◦ (الصلاة الوُسْطى): نوێژی عەصر.

**الوَسُوط**: ناوەند، ناوەڕاست ◦ هەروا ناوە بۆ جۆرە خێوەتو ڕەشماڵێك لەچەتر گەورەترو لەڕشماڵو چادر بچوکتر.

**الوُسُوطُ**: (وُسُوط الشمس): گەیشتنی خۆر بۆ ناوەڕاتی ئاسمان.

**الوَسيط**: ناوبژیکەری نێوان دوو کێشەکارو بەشەڕ هاتوو ◦ ناوبژیکەری نێوان فرۆشیارو کڕیار، دوو معامەلە چی ◦ مامناوەندی نێوان دووشت ◦ (ك: وُسَطاء) ◦ دەشگوترێ: (هو وسيط فيهم): ئەو لەناویان لەهەموویان وەجاخزادەترو ڕێزدارترە.

**وَسَعَ الله عليه رزقه وفي رزقه**: خودا ڕزقو رۆزیی بەرفراوان کرد، ساماندارى کرد.

**وَسِعَ الشَيْئ يَسَعُ سِعَةً**: شتەکە پانو پۆڕ بوو.

**وَسَعَ الله عليه**: خودا ژیانو گوزەرانی خۆش کرد ◦ دەوڵەمەندی کرد ◦ دەشگوترێ: (وسعت رحمة الله كلُّ شيئ ولكل شيئ وعلى كل شيئ): ڕەحمەتو بەزەیی خودا بەشی هەموو شتێك دەکاو لەهیچ شتێکو بۆهیچ شتێك تەسك نابێو کورت ناهێنێ.

**وَسِعَ المالُ الدينَ**: ماڵەکە زۆر بەشی قەرزەکەی کردو زیادەشی هەبوو ◦ دەشگوترێ: (لا يَسَعَكَ أن تفعلَ كذا): بۆت ڕەوا نییە ئەوە بکەی نابێ ئەوەبکەی ◦ (لا يَسَعُنِي ذلك الأمر): ئەوکارە لەتواناى من دا نیەو ناتوانم بیکەم ◦ (هذا الإناء يسع عشرين رطلا): ئەم قاپە بیست ریطل ئاو دەگرێو زیاتریش.

**سَعْ**: فیعلی ئەمرە بۆ حوشتر ئاراستە دەکرێ واتە بڕۆ خێرا بڕۆ ◦ خێرا خێرا هەنگاو هەڵێنە ◦ لەدوعاو پاڕانەوەدا دەگوترێ: (اللهمَّ سَعْ علينا، وَسِّعْ علينا).

**وَسُعَ الشَيْئ**: شتەکە فراوان بوو.

**وسُعَت الدابةُ وسَاعة وسَعَةً**: وڵاخەکە کەوتە ڕەوتو خۆش رۆیشتن.

**اوسَعَ فلان**: فلانکەس ماڵو سامانی زۆر بوو، دەوڵەمەند بوو.

**اوسَعَ اللهُ عليه رزقه**: خودا ڕزقو رۆزی بەسەردا رشتو گوزەرانی خۆش کرد ◦ دەوڵەمەندی کرد.

**اوسَعَ الشَيْئ**: شتەکەی فراوان کرد ◦

بەپانو پۆڕ هاتە بەرچاوی.

**أوسَعَ فلاناً الشَّيْئ**: شتەکەی والێ کرد بەکەڵکی فلان بێ بۆی بگونجێ ٥ بەبەری بکا ٥ لەدوعاو پاڕانەوەدا دەگوترێ: (اللهمّ أوسِعْنا رَحْمَتَك): خودایە بمانخەرە بەر ڕەحمەتی خۆت ڕەحمەتی خۆت والێ بکەی دامان پۆشیو بەشمان بکا.

**وَسَّعَ الشَّيْئ توسيعاً وتوسِعةً**: شتەکەی پانو پۆڕ کرد ٥ دەگوترێ: (وَسَّعَ الله عليه): خودا ژیانی خۆش کردو رزقو رۆژی زۆرو بەرەحمەتی بەسەردا ڕژاند.

**إتَّسَعَ الشَّيْئ**: بۆ موطاوەعەی (وَسَّعَهُ)دێ ٥ درێژ بۆوە، بەرز بۆوە.

**تَوَسَّعَ الشَّيْئ**: شتەکە فراوان بوو، بەبەری تەنگ نەبوو.

**تَوَسَّعَ القوم في المجلس**: خەڵکەکە لەمەجلیسەکەدا کشانە داواوەو بازنەی مەجلیسەکەیان فراوان کردو ڕێگایان دا کەسانی دی بێنە ریزی دانیشتنەکەیان.

**إستوسَعَ الشَّيْئ**: بۆ موگاوەعەی (وَسَّعَهُ)دێ.

**إستوسَعَ الرَّجُلُ**: پیاوەکە ژیانی خۆش بوو گوزەرانی باش بوو.

**إستوسعَ الشَّيْئ**: شتەکەی بەبەرفراوانی هاتە بەرچاو.

**السَّعَةُ**: هێزو توانا ٥ گوزەران خۆشیو دەوڵەمەندیی ٥ دەگوترێ: (هو في سَعَة من العيش).

**المُتَّسَعُ**: دەگوترێ: (مالي عَنْ ذلك مُتَّسَعٌ): من لەو شتەدا ناچارمو دەراوی رونی ترم نیە ٥ من هیچ ڕێگای ترم لەبەردەم دا نیە.

**الموسوعة**: کتێبێکە زانیاری هەمە چەشنی تێدایەو زانیارییەکان بەگوێرەی (اـبـتـث) ریزکراون کەلەخوا پێداوەکان جۆرەها مەوسوعەیان نوسیون بەڵام گەلی کورد لەوبوارەدا تا بڵێی هەژارە.

**الميساع من النوق**: حوشتری هەنگاو فراوان.

**الواسِع**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار ٥ بەخشندەو خاوەن عەتای زۆرو زەبەندە کەبەشی هەموو کەس دەکاو زۆرەو لەبن نەهاتووە ٥ ئاگادار بە سەر هەموو شتێک دا ٥ یان ئەوکەسەی رزقو رۆژی بەشی هەموو مەخلووقات دەکاو ڕەحمەتو بەزەیی هەموو شتێک دەگرێتەوە.

**الوَسَّاع**: کەم نەرکو خێرا لەکاردا ٥ خۆشڕۆو هەنگاو فراوان.

**الوُسْعُ**: تاقەت و هێزو توانا.
**الوسيع من السير**: ڕۆیشتنێك هەنگاوی فراوانی تێدا بهاوێژرێ.
**وَسَفَ الشَّيْءَ**: توێکڵی لەشتەکە دامالّی سپی کرد.
**تَوَسَّفَ الشَّيْءُ**: شتەکە توێکڵی لێ داماڵدرا.
**تَوَسَّفَ البعيرُ**: حوشترەکە پێستی لاڕانی و کلۆتی قەڵشت قەڵشت بوو ٥ بەروبوومی بوو، قەڵەو بوو ٥ تووکی هەڵداو تووکی تازەی لێ هاتەوە.
**تَوَسَّفَ أوبارُ الإبل**: حوشترەکە توکی هەڵداو با توکەکەی برد.
**الوَسْفُ**: قەڵشتن و شەقار بوونی پێستی ڕانی حوشترە لەکاتی قەڵەوبوونی دا.
**وَسَقَت الدابّةُ تسِق وَسْقاً**: ئاژەڵە مێیەکە ولاخەکە ئاوس بوو.
**وسقت النخلة**: دارخورماکە بەری گرت.
**وَسَقَ الشَّيْءَ**: شتەکەی کۆکردەوەو خستنیە پەنایەك.
**وَسَقَ الليلُ الأشياءَ**: شەو شتەکانی داپۆشین.
**وسقت العينُ الماءَ**: چاوەکە ئاوی هێنا.
**أوسقت النخلةُ**: دارخورماکە بەری زۆر بوو.
**أوسق البعيرَ**: بارەکەی لەحوشترەکە بارکرد.
**واسقه مواسقة ووِساقاً**: دژایەتی کرد ٥ بەئەندازەی ئەو بوو لەوکەمتر نەبوو ٥ لەشەڕا بەرامبەری کرد ٥ دەشگوترێ: (هو لايواسِق فلاناً): ئەو هاوتای فلان نییە، دەرەقەتی نایە.
**وسَّقَ الحبَّ**: دانەوێڵکەی وەزنە وەزنەکرد کردی بەچەند ویسقێك.
**إتسق الشَّيْءُ**: شتەکە کۆبۆوە چووە پەنایەك ٥ شتەکە ریز بەند بوو.
**إتَّسَقَ القمرُ**: مانگ خشت بوو ٥ گەیشتە شەوی چواردەو پانزە.
**استوسق الشَّيْءُ**: شتەکە کۆبۆوەو چووە ناویەکەوە ٥ دەگوترێ: (استوسقت الإبل): حوشترەکان کۆبونەوەو چونە پەنایەك ٥ (إستوسق له الأمر): کارەکەی بۆڕایی بوو.
**الميساقُ**: باڵندەکە لەکاتی فڕین دا باڵی لێك دەدا ٥ کۆتر کەپەڕو باڵی زۆربن.
**الوَسْقُ**: ئامێرێکی پێوانەی دانەوێڵەیە شەصت ڕبە دەگرێ ٥ هەر ربەیەك پێنج ریطل و سێیەکی

ربەیەکە ، یان وەسق باری حوشترێکە.

**الوِسْقُ**: بەمانا (الوَسْقُ)دێ.

**الوسيق**: باران.

**الوَسِيقة**: کۆمەڵە حوشترێک کەدوژمن بڕی بدا بۆئەوەی بەتاڵان بیانبا ، یان حوشتری ئاوس.

**وَسَلَ فلان الى الله تعالى**: بەمانا (وَسَّلَ)دێ.

**تَوَسَّلَ الى فلان بكذا**: بەهۆی خزمایەتیو کەسایەتییەوە خۆی لەفلان نزیک کردەوە.

**التَّوسُّلُ**: دزی کردن ، دەگوترێ: (أخذ فلان إبلي تَوَسُّلاً): فلانکەس حوشترەکانی دزین ، بەدزی بردنی.

**الوَاسِلُ**: پێویستو واجب ، دەگوترێ: (شيءٌ واسِلٌ): شتێکی پێویستە.

**الواسِلة**: مێینەی (الواسل)ە ، پلەو پایەو قسە رۆیشتویی لای پاشا ، خزمایەتی.

**الوسيلة**: بەمانا (الواسلة)دێ ، پەیوەندیو عەلاقە ، خزمایەتی ، پلەو مەقامێکە رۆژی قیامەت لەبەهەشت دا دەدرێ بەپێغەمبەری ئیسلام.

**وَسَمَ الشَّيْءَ يَسِمُها وَسْماً وسِمَة**: شتەکەی داخ کردو نیشانەی لێ کرد ، دەگوترێ: (وسمه بالهجاء): بە شیعری جنێو ئامێز لەکەداری کرد.

**وَسَمَ فلاناً**: لەجوانیو شۆخی دا بەسەر فلان دا بالادەست بوو.

**وَسَمَ الوَسْميُّ الأرضَ**: یەکەم بارانی بەهار لەزەوییەکەی دا.

**وَسَمَ فلاناً بوسام**: بە ویسام وڕێزلێنان فلانکەسی جیاکردەوە.

**وَسُمَ يَوْسُمُ وسامةً**: جوان بوو جوانیەکی درێژخایەن ، دەگوترێ: (وسُمَ وَجْهُهُ): روخساری جوان بوو.

**واسَمَهُ في الحسن**: لەجوانی دا بەسەر یا زاڵ بوو ئەو لەو جوانتر بوو.

**وَسَّمَ**: حازری مەوسیم بوو، دەگوترێ: (وَسَّمَ الحاج): حاجییەکە ئامادەی وەرزو مەوسیمی کاتی حەج بوو.

**إتَّسَمَ**: بۆ موطاوەعەی (وَسَمَهُ)دێ ، واتە داخی کرد ، شێوە داخێکی بۆخۆی هەڵبژارد بۆئەوەی ئاژەڵەکانی پێنیشانە بکا ، یان بۆنەفسی خۆی شێوە هەڵسو کەوتێکی هەڵبژاردو هەمووکاتێ پێی دەناسرێتەوە ، دەگوترێ: (هو متَّسِمٌ بالخير أو الشرّ).

**تَوَسَّمَ**: داوای بارانی سەرەتای بەهاری کرد ، بەخەنەو وسمە خۆی ڕەنگ کرد.

**تَوَسَّمَ الشَّيْءَ فيه**: خەیاڵی واچوو

ئەوشتە لەودا هەبێ ٥ دەگوترێ: (تَوَسَّمَ فيه الخَير): پێی وابوو خێری تێدایە بەفیراسەتو تیژ بینی خۆی خێرو بیرو پیاوەتی تێدا ڕەچاو کرد.

السِّمَةُ: داخو نیشانە؛ پارچە ئاسنێکە شێوەی جیاجیای هەیە سوردەکرێتەوە گوێچکە یان شوێنی تری ئاژەڵەکەی پێ داخ دەکرێ شوێنی داخەکە موی لێ نایەتەوەو دەبێتە نیشانە بۆ ئاژەڵەکە.

المَوْسِمُ: کۆمەڵگایەکی قەرەباڵغی ئادەمیزاد.

مَوْسِمُ الشَّيْئِ: کاتی پەیدابوونی شت، وەرزی پەیدابوونی شت ٥ یان کۆبونەوەی ئادەمیزاد لەشوێنێك بۆ مەبەستێك وەکوو وەرزی حەجکردن وەرزی گەشتوگوزار.

المَوْسُومُ: کەسێك ویسامی شەرەف یا ویسامی ئەدەبو شتی وای پێ بەخشرابێ.

المَوْسُومَةُ: دەگوترێ: (دِرع موسومة): زرێیەکە لای خواروی رازێنراوەتەوە.

المِيسَمُ: نیشانە ٥ داخی ئاژەڵ داخکردن ٥ دیاردەو ئەثەری جوانیو شۆخو شەنگی.

الوِسَام: نیشانە ٥ ویسامی ڕێزلێنان ٥ پارچەیەکە لەمادەیەکی بەنرخ دروست دەکرێو دەکرێتە نیشانەی ڕێزلێنان دەبەخشرێ بەهەندێ کەسی جیاوازو خاوەن هەڵوێستو پێشکەوتوو لەبوارێك لەبوارەکانی ژیان دا بەیەخەی خۆیانی دا دەکەنو هەندێ (إمتيازات)ی هەیە.

الوَسَامَةُ: کاریگەری جوانیو شۆخی لەسەر مرۆڤ.

الوَسْمُ: نیشانە.

الوَسْمَةُ: ڕوەکێکە دەروێندرێ بۆ سوودوەرگرتن لەو ڕەنگەی لێی بەرهەم دێ.

الوَسْمِيُّ: بارانی یەکەمی بەهار.

وَسِنَ يَوْسَنُ وَسَناً وسِنَةً: هەنۆزی هاتێ، خەو سواری شانی بوو ٥ بەهۆی بۆگەنی بیرەکەوە بێ هۆش بوو.

اوسَنَتْهُ البِئْرُ: بیرەکە بەبۆگەنی کابرای بێ هۆش کرد.

تَوَسَّنَ المرأة: چووەلای ژنەکە خەوی لێ کەوتبوو.

استوسَنَ: بەمانا (وَسِنَ)دێ.

السِّنَةُ: هەنۆز (وەنەوز) سەرەتای خەو ٥ دەگوترێ: (أخذته السِّنَةُ): هەنۆز گرتی ٥ بێ ئاگاییو غافڵی.

**المَوْسُونة:** ئافرەتی تەمبەڵ.

**الميسان:** (إمرأة ميسان): ئافرەتێکی عاقڵو ڕەزانە ٥ دەشگوترێ: (هي ميسان الضحى): ئەو ئافرەتە نوستوی چێشتەنگاوانە.

**الوَسَنُ:** پێداویستیو ئاتاجی ٥ دەگوترێ: (ماهو من همّي ولا من وَسَني): ئەوە مەبەستو پێویستی من نییە ٥ دەشگوترێ: (قضت الإبل أوسانها من الماء): حوشترەکە پێداویستی خۆی لەئاوەکە هەڵگرت، خواردیەوە.

**الوَسْنى:** (إمرأة وسنى): ئافرەتی چاومەست.

**الوَسْنانة:** (إمرأة وسنانة): ئافرەتی چاومەست.

**الوَسْنِيُّ:** (رجل وَسْني): پیاوێکە وەنەوزی زۆر دەکا ٥ هەمیشە خەواڵووە.

**وسوس الشيطان اليه:** شەیتان ختوکەی داو هەڵینا بۆ کردنی کاری بێ سود ٥ دەشگوترێ: (وَسْوَسَتِ النفسُ): نەفسی دەنە دەنەی دا بۆ خراپەکاری ٥ بەنەسپایی قسەی کردو قسەکانی بەعاستەم دەبیسران‌و کەس لێی حاڵی نەبوو ٥ جۆرە هاوەسوەسەو خەیاڵ پڵاو دەوریان داوە ٥ بەسرتە قسەی کرد ٥ بەگوێی دا چرپاند.

**وَسْوَسَ الصَّائِدُ:** نێچیرەوانەکە بەنەسپاییو سرتە سرت دوا.

**وَسْوَسَتْ كلابُهُ:** سەگەکەی کلکە سونەی کرد فروسکایەوە ٥ بەعاستەم دەنگی هات ٥ دەگوترێ: (وَسْوَستِ الريحُ): بایەکە سروەی هات.

**وَسْوَسَ الحَلي والقصب:** خشڵەکە خرینگەی هات ٥ قەفەزاژەکە خشەی هات.

**وَسْوَسَ فلان فلاناً:** فلانکەس بەنەسپاییو سرتە قسەی لەگەڵ فلان کرد.

**وُسْوِسَ:** قسەکان تێکەڵو پێکەڵ بوون ٥ هەر غەڵبەغەڵب بوو.

**الوَسْواسُ:** شەیتان ٥ جۆرە نەخۆشییەکە توشی دەرون دەبێ سەنتەری زەین تێك دەدا.

**وسى راسه يَسيه وَسْياً:** سەری تاشی.

**اوسى راسَه:** سەری تاشی.

**الموسى:** بڕوانە مادەی (موسى).

**الوشْبُ:** تاکی (الأوشاب)ە کەبەمانا (الأوباش)دێ ٥ (أوباش الناس): کۆمەڵە خەڵکێك کەهەریەکەیان لەهۆزو خێڵێك بن.

**الوَشْبَة**: دەگـوترێ: (تمـرة وَشْـبَة): خورمای توێـكڵ ئەستور.

**وَشَجَ الشَّيْءُ يَشِجُ وَشْجاً**: شتەكە تێـك چرژاو تێك هاڵاو تێـكەڵ بەیـەك بـوو ٥ دەگـوترێ: (وشـجت العـروق والأغـصان): ڕەگـو لـق‌و پـۆپ تێـكەڵ بەیەك بوون ٥ (وشجت في قلبـه همـوم وأحـزان): جۆرەهـا خـەم‌و خەفـەت لەدڵ‌و دەروونی دا كۆبۆتـەوەو تێـكەڵ بەیەكتر بوون.

**وَشِجَ حَمْلُهُ**: كورتانەكە یان ڕەحلەكە یان بارەكەی بەحەبل‌و قەیاسە شەتەك دا بۆئەوەی هیچی لـێ نەكەوێ.

**وَشَّجَ بين القوم**: خەڵكەكەی پێـكەوە ئاشـت كردنـەوەو تێـكەڵ بەیـەك بوونەوەو خزمایەتییان تازەكردەوە.

**تَوَشَّجَ**: بەمانا (وَشَجَ)دێ.

**الأوشـاج**: دەگـوترێ: (علیـه أوشـاج غـزول): ڕەنگـی تێـكەڵ‌و جـۆراو جـۆری لەسـەرە، ڕەنگـەكان هەندێـكیان چـوونە نـاو هەندێكیانەوە.

**الواشجة**: خزمایەتی كەبەچەند شێوە ببنە خزم.

**الوَشـیجُ**: قەفەزارو شـتی وا كـە چـڕو پڕ بن.

**الوَشـیجة**: ڕەگـی درەخـت ٥ ڕەگـی گوێـچكە ٥ خزمایـەتی دوو سـەرەو سـێ سـەرە ٥ تاینـچە، شریفێـكی گەورەیـە بەشـێوەی چوارگۆشـەی (١٠×١٠ یـان ١٢×١٢)سـم) دەچـنرێ‌و گیـاو گرشـەی پـێ دەگوێزرێتـەوە ٥ یـان شرێفێـكە ئـەملاو ئـەولای دوو تەختـە دارن‌و نێوانیـان بـەگوش‌و شـتی وا دەتەنـدرێ‌و گیـاو كرشـەی پێ دەگوێزرێتەوە.

**وَشَّـحَ المـرأةَ**: ویـشاحی لەبـەر ئافرەتەكـە كـرد ٥ گەردنبەنـدی لەملی ئافرەتەكە كرد.

**وَشَّحَ فلاناً الثوبَ**: كراسی لەبەر فلان كرد.

**إتَّـشَحَت المـرأة**: ئافرەتەكـە گەردنبەندی لەمل كرد.

**إتَّـشَحَ فـلان**: فلانكـەس قوماشـی لەخۆوە پێچاو لكێكی بەژێر دەستی ڕاستی دا خستە سەرشانی چەپی‌و ئـەمجار لەسـەر سـنگی هـەردو سەرەكەی بەیەكەوە گرێ دان.

**إتَشَحَ بسیفه**: شمـشێرەكەی لەشـان كرد.

**تَوَشَّـحَتِ المـرأةُ**: ئافرەتەكـە گەردنبەندی لەمل كرد.

**توشَحَ فلان بسیفه وبثوبه**: بـەمانا (إتَّشَحَ)دێ.

**توشَحَ فلاناً**: دەستی لەملی فلانكـەس كرد.

تَوَشَّحَ الجَبَلَ: بەکێوەکەدا ڕۆیشت.
التوشیح: نـاوە بـۆ جـۆرە شیعرێـك ئەندەلوسییەکان دایانهێنـا بـەزۆری لەحەوت شیعر پێك دێ.
المُوَشَّحُ: بەمانا (التوشیح)دێ ٥ هـەروا نـاوە بـۆ کەڵەشێرێـك دوو پۆپنـەی هەبێ ٥ (ثـوب موشـح): قوماشێـکە پەراوێزی چندراوە.
الموشَّحَة من الظباء والشاء والطير: ئاسکێك یان مەڕێك یان باڵندەیەك دوو گوارەی بـەملاو بـەولادا هاتبنـە خوار ٥ هەروا وشـەی (موشّح): نـاوە بــۆ شیعرێـــك لەســـەر شـــێوازی تەوشـــــــیحی ئەندەلوســـــــی هۆنرابێـتەوە.
الوِشَـــاحُ: دووهـــەودا لـــەمرواریو گەوهـــەر دوخـــەت دوو ڕســـتە مرواریو گەوهەری هۆنراوە کـەناو بـەناو لێـك بـدرێنو نـاو نـاوەش بەسەر یەك دا بێنەوە ٥ هەروا نـاوە بـۆ پارچـە چندراوێـك بەگەوهـەر بنەخـشێندرێ ئـافرەت لاوو نیـو لەشـانی بکـا واتــە لەســەر شـانی راسـتییەوە بیبـا بـۆ سـەرکەلەکەی چەپی یان چندراوێکی ڕەنگاوڕەنگ دادوەر یان قازی لـەدادگادا لاوو نیـو لـە شـانی بکـا ٥ واتـە لەسەرشـانی راسـتییەوە بیبـا بۆسـەر کەلەکـەی چـەپی ٥ (ك: وُشُـــحٌ وأوشـــحە ووشائح) ٥ دەشگوترێ: (إمراة غرثـی الوشاح): ئافرەتێکی قەد باریکە.
الوَشْحاءُ: بزنـی ڕەش کەخـەتی سـپی تێدابن (بزنە مس).
وَشَـرَ الخشبَةَ یَشِرها وَشْراً: دارەکـەی ڕنی بڕیەوە.
وَشَـرَتِ المـراة اسـنانها: ئافرەتەکـە ددانەکانی تیزکردنو لێی کرانـدن ٥ (فهو واشر وهي واشرة).
إتَّشَرَت المراةُ: ئافرەتەکە داوای کـرد ددانەکانی بۆ بکـرێننو بـۆی بـچوك بکەنەوە.
استوشَـــرَت المـــراةُ: بـــــەمانا (إتشرت)دێ.
المیـشارُ: ئـامێری ددان ڕنـینو ددان بچوك کردنەوە.
توشَّزَ للشّر: خۆی بۆشەڕ ئامادەکرد.
الوَشْزُ: پەلەکردن ٥ گوزەرانی تەنگ ٥ ئەوشـتەی پـشتی پـێ دەبەسـتیو پەنای بۆدەبەی ٥ دەگوترێ: (لجئت الی وَشَزَ): خۆم خـستە پەنایەکـەوەو پـشتم پـێ بەسـت ٥ دەشـگوترێ: (لقیته علـی أوشـاز): بەپەلـە توشـی هاتم.
الوَشِـیزَةُ: سەرینێـكو زۆری نـاواخن هەبێ ٥ (ك: وشائز).

**وَشَظَ القوم الينا يشظون وَشظاً:** خەڵکەکە کەم بوون هاتنە گەڵ ئێمە.

**وَشَظَ فلان الفأسَ ونحوها:** فلانکس کونی پاچەکەی بەدارێکی پوازو تەنگ کردەوە.

**وَشَظَ العظم:** ئێسقانەکەی شکاند پارچەیەکی لەئێسقانەکە شکاند.

**الوَشيظُ:** شوینکەوتە ٥ هەتیومچەو خوێڕی ٥ بێگانەو دوورە کە تێکەڵ بەهۆزو خێڵێك بووبن ٥ خزمەتکار.

**الوشيظة:** دورِوو بێگانە کە تێکەڵ گەل و هۆزبن ٥ دەگوترێ: (هم وشيظة في قومهم): ئەوانە لەبنەماڵە رەسەنەکانی قەومەکەیان نین لەلاوە هاتوون و تێکەڵیان بوون ٥ پوازو چیلکەدار کونی پاچەکەی پێ دەگرێ با تەسکی دەکەیەوە ٥ پارچەدارێك قەدەحی پێ چاك بکەی.

**وَشَقَت البقلة:** روەکەکە گوڵی کرد ٥ خونچە گوڵەکەی کرایەوە.

**وَشَغَ الشَّيْءُ الشَّيْءَ:** شتەکە کەوتە سەر شتەکە ٥ دەگوترێ: (وَشَقَةُ الشَّيْبُ): پیری لەسەر جەستەی دەرکەوت.

**وَشَعَ الجبَلَ:** بەکێوەکەدا سەرکەوت ٥ چووە سەر کێوەکە.

**وَشَعَ فلان الشَّيْءَ:** فلانکەس شتەکەی تێکەڵاو کرد.

**وَشَعَ القطنَ وغيره:** لۆکەکەی رست و هەڵی کرد.

**اوشَعَ الشَجَرُ والبقلُ:** روەکەکە یان درەختەکە گوڵی کرد ٥ پشکوت خونچەکەی کرایەوە.

**وَشَّعَ القوم على كرمهم وبستانهم:** خەڵکەکە پەرژینیان بۆ رەزو باخەکانیان دروست کرد ٥ دەشگوترێ: (وَشَّعَ كَرْمَهُ): رەزەکەی پەرژین کرد.

**وَشَّعَ الشَّيْءَ في الشَّيْءِ:** شتەکەی خستە ناو شتەکەی ترەوە.

**وَشَّعَ الشَّيْءَ:** چووە سەر شتەکە ٥ دەشگوترێ: (وَشَّعَهُ الشَّيْبُ): پیری (مویی سپی) دەورەیان داوە.

**وَشَّعَ فلان الشَّيْءَ:** فلانکەس شتەکەی تێکەڵ کرد.

**وَشَّعَ القطنَ:** دوای شیکردنەوە لۆکەکەی هەڵکردەوە کردی بە گلۆڵە.

**وَشَّعَ الغَزْلَ:** ریسەکەی لەدو داو تەشیەکەی بادا تەشییەکەی رست ٥ بۆئەوەی بیکاتە شاڵ، ئامادەی کرد بۆ چنین.

**وَشَّعَ الثوبَ:** قوماشەکەی بەشێوەی

ئالاو وێنەی جۆراو جۆر ڕەنگ کرد.
**تَوَشَّعَ الشَّيْئ**: شتەکە بڵاو بۆوە.
**تَوَشَّعَ في الجبل**: بەکێوەکەدا سەرکەوت.
**توشعت الغنم في الجبل**: ئاژەڵەکە بەکێوەکەدا سەرکەوتو لێی لەوەڕا.
**توشَّعَ بالشيئ**: بەشتەکە زۆر بوو، جوان بوو ○ دەگوترێ: (توشَّعَ الجبلَ): چووە سەر کێوەکە.
**تَوَشَّعَ الشيبُ راسَهُ**: پیری لەسەری دا دەرکەوت موەکانی سپی بوون.
**تَوَشَّعَ القوم ضيوفَهم**: خەڵکەکە میوانەکانیان دابەش کردن.
**المُوَشَّعُ**: (بـرد مُوَشَّعٌ): عەبایەکی پەراوێز چندراوو نەخشێنراوە خەتو گوڵی جۆراو جۆری تێدا دروستکراون.
**الوَشْعُ**: شتی کەم لەڕوەکی کێو ○ گیاو گژی کەم ○ درەختی بان ○ گوڵی روەکی پاقلەو شتی وا ○ شتی کەم لەطەلعی دارخورما ○ (ك: وُشُوع).
**الوُشُوعُ**: خانوی جاڵجاڵۆکە.
**الوَشُوعُ**: گیاوگژی بڵاوی ناوکێو ○ تەنکە گیا ○ دەرمان کەبەکەوچك دەکرێتە قورگی منداڵی نەخۆشەوە.
**الوَشيعُ**: دارێکی ئەستورو پتەوە لەسەر لێواری بیردادەنرێ ○ ئاو هەڵکێش لەکاتی هەڵکێشانی ئاودا لەسەری دەوەستێ ○ شەپیتەی جۆلا ○ لقو پرژی دارخورما کەلەسەر دارە ڕای هەڵاشەوە رادەخرێن بۆئەوەی گڵو شتی وا بگرێ ○ هەڵاشی خانو ○ شتێکە وەکوو حەصیر لەڕوەکی (الثمام) دروست دەکرێ ○ سیاجو پەرژینێکە لەتەلی چندراوی خانەخانەو ناو بەناو کۆڵەکەی ئاسن یان چیمەنتۆ یان شتێکی لەو جۆرە بۆ دەچەقێندرێو پێوەی قایم دەکرێو بەدەوری باخو شوێنی تایبەتی دا رایەڵ دەکرێ ○ کەپرو ساباتێکە بۆ سەروکی سوپا لەسەر بەرزاییەك دروست دەکرێ بۆئەوەی لەوێوە چاودێری سوپاکە بکا ○ پرژو پاڵی دارخورما ○ وشکەڵی دارو درەخت ○ ئارەو گوڵی قوماش.
**الوَشيعَةُ**: مەکۆکی جۆلا ○ دارێکە چەند جۆرێکی لەهەودای تێوەدان لەسەر هەڵدەکرێ جۆلا بەپێی پێویست هەرجارەو یەکێ لەهەودارەنگ کراوەکان بەناو رایەڵەکەدا دەبا ○ گلۆڵە لۆکەی ڕێسراو.

**وَشَغَ بِبَولَه يَشغُ وشغاً**: بەیەکجار میزەکەی هەڵدا.

**اوشَغَ ببوله**: بەمانا (وَشَغ)دێ.

**اوشَغَ العَطِيَة**: بەخشندەکەی کەم کردەوە.

**أوشَغَ الصَّبِيَ الدواءَ**: دەرمانەکەی کردە دەمی منداڵەکەوە.

**وَشَّغَ الثوبَ**: قوماشەکەی خوێناویی کرد هەتا هەمووی بەخوێنەکە خەتخەتو ڕێ ڕێ بوو.

**تَوَشَّغَ بالسوء**: پەڵەی ڕەوشت ناشیرینی پێ هەڵپەڕین.

**الوَشْغُ**: کەم ٥ (ك: وُشُوغ).

**الوَشُوغ**: ئەوبڕە دەرمانەی دەکرێتە دەمی منداڵەوە.

**الوَشِيغ**: بەمانا (الوَشْغُ)دێ.

**وَشَقَ اللحمَ**: گۆشتەکەی توێ توێ کردو وشکی کردەوە.

**وَشَقَ فلاناً**: زەبری لەفلانکەس دا ٥ برینداری کردو ڕوشاندی گەستی.

**وَشِقَ المفتاح في القفل يَوْشَقُ**: کلیلەکە چووە ناو قفڵەکەوە.

**اوشَقَ الشَّيئ**: شتەکە چووە ناو شتێکی ترەوە پێوەی نووسا.

**وَشَّقَ الشَّيئ**: شتەکەی بڕیەوە ٥ جیای کردەوە.

**وَشَّقَ اللحمَ**: بەمانا (وَشَقَ)دێ.

**إتَّشَقَ اللحمَ**: بەمانا (وَشَقَه)دێ.

**إتَّشَقَ القوم فلاناً باسيافهم**: خەڵکەکە فلانکەسیان بەشمشێرەکانیان کوتکوت کرد.

**تواشَقَ القومُ فلاناً**: خەڵکەکە فلانکەسیان پارچە پارچە کرد.

**المواشيق**: ددانی کلیل.

**الواشِق**: کەمێك لەشیرو ماست.

**الوُشَّقُ الأُشَّقُ**: صمغێکی پزیشکی لە جۆرەها ڕوەك دەردەهێندرێ، لەولاتی میصر پێی دەگوترێ: (علك الكَلَح) ئەو ڕوەکەی ئەم جۆرە صمغەی لێ دەردێ لەئێرانو تورکستانو باشوری سیبریا دەڕوێ ٥ ئەم ڕوەکە بەتەمەنەو دوو مەترو سێ مەتر بەرز دەبێتەوە ناوەکەی کلۆرە ڕەگەکانی ئەستورنو بەزەوی دا دەڕۆنە خوار.

**الوَشْقُ**: لەومڕی پەڵەپەڵە.

**الوَشَقُ**: گیانلەبەرێکە لەپێڕی پشیلە، گوانی هەن لە پشیلە گەورەترو لەپڵنگ بچوکترە، سەری گەورەیە ٥ لەهەرپەنا گوێچکەیەکی کۆمەڵە مویەك هەیە، کلکی کورتە لەناو دارەستان دا دەژی هەروا لەدەشتو ساراش دا دەژی.

**الوَشيقُ**: دەگوترێ: (سیر وشيق): ڕۆیشتنی سوكو خێرا.

**الوَشِيقَة:** گۆشتی کوتکوتکراوی وشکەوەبوو ٥ یان گۆشتێك لەناوو خوێ دا بکوڵێندرێو دوایی وردبکرێو بکرێتە قاورمەو هەڵبگیرێ بۆسەفەرو شتی وا.

**وَشُكَ يَوْشُك وشكاً:** پەلە بوو، نزیك بوو ٥ جاری وایش دەبێ وەکوو (فیعلی موقارەبة) بەکاردەهێندرێ.

**واشَكَ مواشكةً:** خێرا ڕۆیی.

**وَشَّكَ:** بەپەلە بوو.

**الوِشَاكُ:** خێرایی.

**الوُشكانُ:** پەلەو خێرا.

**الوَشِيك:** بەخێرایی، بەپەلە ٥ دەگوترێ: (خرج وشيكاً): خێرا ڕۆیشتە دەرەوە.

**وَشَلَ الماءُ يشِلُ وشلاً:** ئاوەکە ڕەوان بوو (جاری بوو) ئاوەکە کەم بوو بوو بەدڵۆپ دڵۆپ.

**وَشَلَ فلان وُشُولاً:** لاواز بوو دەوڵەمەندی نەما ٥ هەژار کەوتو ئاتاج بوو.

**وَشَلَ اليه:** هانای بۆ بردو لێی پاڕایەوە ٥ (فهو واشِلٌ).

**أَوْشَلَ حَظَّهُ:** بەش‌و باری فلانکەسی کەم کردەوە.

**أوشَلَ الفَصيل:** گوێ گوانی حوشترەکەی خستە دەمی بێچوەکەوە بۆئەوەی فێری شیر خواردن بێ واتە مێژاندی.

**أوشَلَ الماءَ:** ئاوەکەی بینی ڕەوان بوو، جاری بوو.

**أوشَلَ البِئرَ:** بیرەکەی بینی ئاوی لەبەر دەڕۆیی.

**الأوشال:** ئاو کە بەشەملاو ئەولای کێودا بێتەخوارو لەخوارەوە بەنداوی بۆبکرێ ئەمجار بەگوێرەی پێویست زەوی‌و زاری پێ ئاو بدرێ ٥ دەشگوترێ: (جاءوا اوشالاً): بەرێز یەك لەدوایەك هاتن ٥ هەروا دەشگوترێ: (هو من أوشال القوم): ئەو پیاوە لەتێکەڵەی خەڵکە، لەوکەسانەیە کە هۆزو خێڵێکی تایبەتییان نیە.

**الواشِل:** دەگوترێ: (جبل واشل): کێوێکە هەمیشە ئاوی لێ دێتە خوار (فلان واشل الحظ): فلانکەس بێ بەختە ٥ (واشل الرأي): بیرو بۆچونی لاوازە.

**الوَشَلُ:** ئاوی کەم کەلدڕکە شاخو بەردە دڵۆپ دڵۆپ دەکەوێتە خوار ٥ بەزۆری ئەم وشەیە ئاوە بۆئەو دڵۆپ دڵۆپ ئاوەی کەلە بەرزایی شاخاکانەوە تکە دەکا ٥ دەشگوترێ: (ما أصاب إلا وشلاً من الدنيا): شتێکی کەمی لەبەش‌و باری دونیا پێ بڕا ٥ ژیانێکی کولە مەرگی

بەڕێ کرد ○ هەروا وشەی (الوَشَل): ناوە بۆ فرمێسکی کەم.

الوَشِلَة مـن العیـون: چـاوی کـەم فرمێسك.

الوَشُولُ من النوق: حوشترێـك شیری زۆربێ بەجۆرێك شیر لەگوانـەکانی تکە بکا.

وَشَمَ الجلد یَشِمُه وَشْماً: پێستەکەی بـەدەرزی کوتـا دەرزی هـاژنی کـردو دوایـی مـادەی (نێلـەجی) پێـدا بـڵاو کردەوە.

اَوْشَمَ فلانٌ یفعل کذا: فلاّنکس دەستی بەوکارە کرد.

اوشَمَ في الأمر: لەکارەکە ورد بۆوە.

اوشَـمَ في عـرض فـلان: ڕەخنـەی لەناموسی فلاّن گرتو جوێنی پێدا.

اوشَـمَتِ الفتـاةُ: کـچەکە بناغـەی مەمکی دانا، مەمکی کردن ○ مەمکی خڕ بوون.

اوشَمَ الإبلُ: حوشترەکە توشی لەوەڕی تازە ڕسکاو بوو.

اوشمت السماءُ: ئاسمان بروسکەی دا ○ چەخماخەی دا.

اوشَـمَ الـبرقُ: هەورەبروسـکەکە بەئاستەم چەخماخەی دا.

اوشَـمَتِ الأرضُ: زەوی گیـاو گـژی دەرکـەوت، گیـاو گژەکـەی سـەری دەرهێنا.

اوشَمَ الکرم: ترێیەکە ئاڵو بـۆڵ بـوو، خەریکە بەتـەواوی پێ بگا ○ نـەرم بوو، تامی پەیدا کرد شیرین بوو.

اوشَـمَ الـشَّیْبُ في الـراس: مـوی سـپی بەناو سەری دا بڵاو بوونەوە، سەری ماشو برنج بوو.

وَشَّـمَ الغُـصنُ: لقەدرەختەکـە گـەڵای کرد، گەڵای دەرکەوت.

وَشَّمَ فلان جلدهُ: فلاّنکـەس پێستی خۆی کوتا سوژن هاژنی کرد.

إتَّشَمَ فلان: فلاّنکەس کوتـانو دەرزی هاژنی لەپێستی خۆی دا ئەنجام دا.

استَوْشَـمَ: داوای کـرد پێـستی سـوژن هـاژن بکـەن جەسـتەی بـەدەرزی بکوتن نیشانەو وێنەی تێدا دروست بکەن.

الوَشْمُ: بریتییە لـەدەرزی هـاژنکردنی بەشێك لەپێست بـەزۆری لەباسكو قۆڵدا ئـەو جۆرە کوتانـە دەکـرێ ○ ئەمجار پاش دەرزی هاژنەکە مـادەی نیلەنجی بەسـەردا دەکـرێ بۆئـەوەی ئاسـەوارەکە بمێنـێ یـان سـەوز بنوێنـێ ○ هـەروا نـاوە بـۆ پـوانو گـۆڕانی ڕەنگـی پێـست وێـکەوتنی زەبر یان بەربوونەوە ○ نیشانەو داخ ○ بۆ گا کێویو ئاسکە کێوی وشـەی (وشم) بۆ ئەوان بریتییە لەوخەتو بەڵەکیەی بەبەرسینگو قاچیانەوە

دەبیندرێ ٥ ئەو دیمەنە لەڕووەك دا دەبیندرێ لەسەرەتای روانو دەرکەوتنی دا ٥ (ك: وشوم ووشام).

**الوَشمَة**: دلۆپە باران ٥ دەگوترێ: (ما أصابتنا وشمە): دلۆپە بارانێکمان بۆنەباریوە ٥ (ما عصیته وشمةً): بچوکترین تاوانو سەرپێچی ئەوم نەکردوە.

**الوَشمَةُ**: شەڕو دوژمنایەتی.

**تَوَشّنَ الماءُ**: ئاوەکە کەم بوو.

**الأوشَنُ**: کەسێکە کاتی نان خواردن خۆدابمەزرێنێ بەبێ بانگ کردن ٥ بچێتە سەر سفرەی کەسێکی ترو خواردنەکە بخوا.

**الوَشنان**: ئەسپۆن ٥ بڕوانە وشەی (الأشنان).

**وَشوَشَ الرجلِ والنعام والبعير وشوشةً**: خێرا ڕۆیی.

**وَشوَشَ الرجلُ**: پیاوەکە بەئەسپایی قسەی کرد ٥ یان بزرکاندیو قسەی تێکەڵو پێکەڵی کردن.

**وَشوَشَ فلاناً**: بەئەسپایی قسەی لەگەڵ فلان کرد.

**وَشوَشَ فلاناً الشيءَ**: یەکەمی شتەکەی دا بەفلان.

**تَوَشوَشَ القومُ**: خەڵکەکە بەئەسپاییو سرتە سرت لەگەڵ یەك دا قسەیان کرد ٥ بەگوێی یەکتریان دا چپاند.

**الوَشواشة**: لێکچون ٥ دەگوترێ: (في فلان وأبيه وشواشة).

**الوَشوشُ**: بەمانا (الوَشواشُ)دێ.

**الوَشوشي**: دەگوترێ: (رجل وشوشي الذراع): پیاوێکی بەدەستو بردو دەست سوکە.

**وشى به الى السلطان يشي وشياً**: لای پاشا دژی دواو قسەی وای پاڵ دا سوڵتان رقی لێ هەڵگرێ.

**وشى بنو فلان**: بەرە بابی فلان زۆربوون.

**وشت الماشية**: ئاژەڵەکان زۆربونو بلاو بوونەوە.

**وشى فلان الثوبَ وشيا وشية**: فلانکەس قوماشەکەی نەخشاندو ڕازاندییەوە.

**وشى الكلامَ وفيه**: درۆی لەقسەکەدا کرد.

**وشى الكذبَ**: قسەکەی هەڵبەستو ڕازاندیەوە.

**اوشى الرجل**: پیاوەکە ماڵو سامانی زۆر بوو ٥ مانای جوانی لەدەقە پەخشانەکە یان چامە شیعرەکە دایەوە.

**اوشى في الدراهم والجوالق**: لەکیسە

پارەکان یان لەفەردەکان شتی دزیو لێی کەم کردنەوە.

**أوشى المعدنَ:** لەکانەکەدا شتێکی کەمی ئاڵتون دۆزییەوە.

**أوشى فلان الشَّيْئ:** فلانکەس شتەکەی زانی ٥ بەهێواشی شتەکەی هێنایە دەر.

**أوشى فَرَسَهُ:** دوا ئەندازەی هێزی رۆیشتنی ئەسپەکەی دەرخست، زانی تا چ ئەندازەیەك دەتوانێ بڕوا ٥ بەگۆچانو قەمچی یان بە ئاوزەنگی لەئەسپەکەی دا بۆئەوەی بزانێ تا چ ئەندازەیەك توانای رۆیشتنی هەیە.

**أوشى الدَواءُ المريضَ:** دەرمانەکەی شیفای بەنەخۆشەکە بەخشی.

**تَوَشّى فيه الشيبُ:** پیری تێدا دەرکەوت ٥ موی سەرو ریشی ماشو برنج بوون.

**استوشى المعدِنَ:** بەمانا (أوْشى)دێ.

**استوشى فلان فرسه:** بەمانا (أوشى فرسه)دێ.

**استوشى الشَّيْئ:** شتەکەی داواکردو خستیە جەمو جوڵ بۆئەوەی بینێرێ.

**استوشى الحديثَ:** فەرمودەکەی بەلێکۆڵینەوەو پرسیار دەرهێنا.

**الشِّيَةُ:** نیشانەو ئارم ٥ پەڵەی رەش بەشتی سپییەوە ٥ یان پەڵەی سپی بەشتی رەشەوە ٥ هەر رەنگێك لەجەستەدا لەرەنگەکەی تری جودا بێ لەهەموو گیانلەبەرێك دا.

**شِية الفرس:** رەنگی ئەسپ ٥ (ك: شيات).

**المُوَشّى:** (ثور مُوَشّى القوائم): کەڵەگای قاچ بەڵەك.

**الواشى:** منداڵ زۆر ٥ جوڵا ٥ سکە لێدەری ئاڵتون ٥ (ك: وُشاة).

**الوَشاءُ:** ماڵو سامانی زۆر.

**الوَشّاءُ:** صیفە موبالەغەیە ٥ فیتنەو درۆزن ٥ ئەو کەسەی قوماشی ئاوریشم دەفرۆشێ.

**الوَشْيُ:** نەخشو نیگاری قوماش لەهەر رەنگێك بێ ٥ جۆرێکە لەقوماشی پەراوێز نەخشاوی ٥ جەوهەری شمشێر ٥ دەگوترێ: (حجرٌ به وشي): بەردی کانێکە زێری تێدایە.

**وَصَبَ الشَّيْئ يَصِبُ وصوباً:** بەردەوام بوو جێگیر بوو ٥ دەگوترێ: (وَصَبَ شحم الناقة ولبنها): شیری حوشترەکە بەردەوام بوو نەبڕایەوە.

**وَصَبَ على الأمر:** لەسەر کارەکە بەردەوام بوو.

**وَصَبَ على مالِه**: باش چاودێری ماڵو سامانی خۆی کرد.

**وَصِبَ يَوْصَبُ وَصَباً**: نەخۆش کەوت، هەستی بەئازار کرد ٥ (فهو وَصِبٌ) ٥ (ك: وصابى ووِصاب).

**اوصَبَ الشَّيْئ**: شتەکە بەردەوامو جێگیر بوو ٥ دەگوترێ: (أوصَبَت الناقة): حوشترەکە شیری نەبڕاو گۆشتو بەزیشی کەمی نەکرد.

**اوْصَبَ فلان**: فلانکەس نەخۆش کەوت ٥ منداڵی نەخۆشو دەردەداری بوون.

**اوصَبَ القومُ**: نەخۆشی منداڵی خەڵکەکەی ماندوو شەکەت کردن.

**اوصَبَ على الشَّيْئ**: لەسەر شتەکە بەردەوام بوو.

**اوصَبَ فلاناً**: فلانکەسی نەخۆش خست.

**واصَبَ الشَّيْئ**: شتەکە بەردەوامو جێگیر بوو ٥ دەگوترێ: (واصبت الناقة): حوشترەکە شیری وشکی نەکردو گۆشتو بەزیشی کەم نەبوو.

**واصَبَ فلان على الأمر**: فلانکەس لەسەرکارەکەی بەردەوام بوو.

**وَصَّبَ**: بەمانا (وَصِبَ)دێ.

**وَصَّبَ فلاناً**: فلانکەسی نەخۆش خست.

**تَوَصَّبَ**: بەمانا (وَصِبَ)دێ.

**المُوَصَّبُ**: کەسێك ئازاری جەستەی زۆربێ.

**الواصِبَة**: سارای دورودرێژ ٥ دەگوترێ: (فلاة واصِبة).

**الوَصْبُ**: لەپەدەست.

**الوَصَبُ**: ئازارو نەخۆشی ٥ ماندویی شەکەتبوون ٥ (ك: أوصاب).

**وَصَدَ الشَّيْئ يَصِدِ وَصْداً**: جێگیر بوو ٥ دەگوترێ: (وَصَدَ النسَّاجُ بعضَ الخيط في بعض): جوڵا لە تێوەدانەکەی خستە ناو رایەڵەکەوە.

**اوْصَدَ**: پەچەو کوزی بۆ ئاژەڵەکان دروست کرد.

**اوْصَدَ عليه**: تەنگی پێ هەڵچنیو ماندوی کرد.

**اوْصَدَ القِدْرَ**: سەرقاپی خستە سەرمەنجەڵەکە.

**اوْصَدَ البابَ**: دەرگاکەی داخست ٥ دەرگاکەی گرت.

**وَصَّدَهُ**: ترساندی هەڕەشەی لێ کرد.

**وَصَّدَ النساج بعض الخيط في بعض**: جوڵاکە تێوەدانەکەی خستە ناو رایەڵەکەوە.

**اسَوْصَدَ**: پەچەو کوزو ئاغەڵی بۆ ئاژەڵەکان دروست کرد.

١ ترس ◆ ٢ خنجر ◆ ٣ خنجر ◆ ٤ ترس ◆ ٥ فأس ◆ ٦ صفيحة ◆ ٧ دبوس ◆ ٨ قوس ونبل ◆ ٩ قوس فولاذي ◆
١٠ دبوس طيار ◆ ١١ سيف ◆ ١٢ بارودة ◆ ١٣ بندقية ◆ ١٤ خنجر ◆ ١٥ سنجة ◆ ١٦ فأس ◆ ١٧ فرد أوتوماتيكي ◆
١٨ فرد ◆ ١٩ حربة ◆ ٢٠ مسدس ◆ ٢١ قنبلة يدوية ◆ ٢٢ قنبلة الطائرات ◆ ٢٣ بندقية رشاشة ◆ ٢٤ مدفع ◆
٢٥ مدفع ضد الطائرات ◆ ٢٦ مدفع رشاش ◆ ٢٧ مدفع ◆ ٢٨ مدفع ◆ ٢٩ دبابة مصفحة ◆ ٣٠ دبابة قاطرة

أدوات التوقيت
ساعة دقّاقة
ساعة مائيّة
ساعة شمسيّة
ساعة فلكيّة
ساعة رمليّة
ساعة منبهة
ساعة يد
ساعة طاولة
مُقيت
مقياس الرطوبة او مِرْطاب
ميزان الجوّ او مِضْغَط
مقياس الريح
مقياس الحرارة
مقياس المطر
دوّارة الهواء
مِرسمة الضّغط
موقّتة الموسيقى

**المُوَصَّدُ**: كەژاوە.

**الوَصَّادُ**: جولاّی ئازاو دەست ڕەنگین زۆرچن.

**الوَصيد**: ڕوەكێك كەڕەگەكانیان لێك نزیك بن ٥ گەوەو بەچەو ئاغەڵ بۆ ئـاژەڵ ٥ بـەردەرگا، زاردەرگـا ٥ بـەربێلاّی خـانوو ٥ (ك: وُصُـدٌ ووَصَائد).

**الوَصيدَةُ**: ئاغەڵو گەوڕ بەبەردوشتی وا لەكێو بۆ ئاژەڵ دروست دەكرێ.

**الأوصَرُ**: تەپۆلكە، بەرزایی ناو زەوی.

**الوِصـرُ**: بـەمانا (الإصْـر): دی واتـە عەهدو پەیمان ٥ چەكو كومپیالە ٥ هـەر نوسراوێـكی دیكـۆمێنتی دوبارەی قەرز.

**الوَصَرَةُ**: بەمانا (الأوصَرُ)دێ.

**الوصيرة**: كومپیالەو چەكی پارە یان نوسراوێكی دیكۆمێنتی.

**وَصَّ العمـلَ يَوُصُـهُ وصّـاً**: كارەكـەی بەباشی ئەنجام دا.

**وَصْصَت المرأةُ**: ئافرەتەكە ڕوبەندی خـۆی والـێ كـرد تـەنها چـاوی بەدەرەوە بوون.

**وَصَعَ الحصا يَصَعه وَصْعاً**: چەوو وردە بـەردەكانی بـەزەوی دا بردنـە خـوارو لەگڵ دا گومی كردن.

**الوَصْـعُ**: جـۆرە باڵندەیەكـە لـەپێری چۆلەكە، دەنـدوكی كورتـە باڵـەكانی كەوانـەیین، كلكـی كـورتو خـڕە شـوێنی نیـشتەجێ بـوونی ولاّتـی ئەوروپایە بەزستان ڕەودەكا بـەرەو ولاّتـی ئـەردەنو میـصر ٥ (ك: وِصْعان).

**الوَصَـعُ**: بـەمانا (الوَصْـعُ)دێ ٥ (ك: وِصْعان).

**الوَصـيعُ**: دەنگـی چـۆلەكە ٥ بێـچوە چۆلەكە.

**وَصَـفَ المهـرُ والناقـة ونحوهمـا يـصف وَصـفاً**: جوانـوە ئەسـپەكە یـان حوشـترەكە جـوان ڕۆیـشت، ڕەوتـی جوانە.

**وَصَـفَ الـصَغيرُ المَشْيَ**: منداڵەكـە پێـی گرتن كەوتە سەر ڕۆیشتن.

**وَصَفَ الشَيْئ وَصْفاً**: وەسفی شتەكەی كـرد پەسـنیو لایەنـە باشـەكانی باسكردن.

**وَصَـفَ الطبيـب الـدواءَ**: پزیـشكەكە دەرمانەكەی بەناوو نیشانو چۆنیەتی بەكارهێنان بۆ نەخۆشەكە دیاری كرد.

**وَصَفَ الخَبَرَ**: هەواڵەكەی گێڕایەوە.

**وَصَفَ الثوبُ الجسمَ**: پۆشاكە چۆنیەتی جەسـتەی خاوەنەكـەی دەرخـست بـەهۆی تـەنكی یـان تـەنگیو تەسـكی چاك چۆنیەتی جەستەی پۆشەرەكەی

دەرخست ٥ لەحەدیثی عومەردا هاتووە: (إلاّیَشِفُّ فإنه یَصف).

**وَصُفَ الغلامَ والفتاة وصافة:** کوڕەکە یان کچەکە کاتی خزمەت پێکردنیان هاتو قەدو بالآیان تەواو بوو خۆیان دارِشت.

**واصفته الشَّیْئ:** شتەکەم لەسەر وەصف پێ فرۆشت، واتە شتەکەم لەبەردەستانەبوو بەوەصفو نیشانە پێم فرۆشت.

**إتَّصَفَ الشَّیْئ:** بۆ موطاوەعەی (وَصَفَه)دێ ٥ وەصف کرا ٥ بەباشی ناویان هێناو پەسەندیان کرد.

**تواصَفُوا الشَّیْئ:** هەندێکیان شتەکەیان بۆ هەندێکیان وەصف کرد.

**تَوَصَّفَ فلان وصیفاً:** فلاّنکەس یەکێکی ڕاگرت بۆ خزمەتکردن.

**استوصَفَ فلانٌ الطبیبَ لدائه:** فلاّنکەس داوای لەپزیشکەکە کرد دەرمانی دەردەکەی پێ بلێ.

**استوصَفَ فلاناً الشَّیْئ:** داوای لەفلاّن کرد شتەکەی بۆ وەصف بکا.

**الصِفَة:** ئەو حالّەتەی بەشتەکەوەیە، شتەکەی پێ جیادەکرێتەوە لەشتی تر وەکوو رەشیو سووریو سپییەتیو کورتیو درێژی ٥ زانیاریو نەزانی ٥ لەلای زانایانی نەحو صفە شوێنێکە وتەی ئیسمی پێشوویەتیو حوکمو ئیعرابی ئەوی دەدرێتێ.

**المُستَوْصَفُ:** خەستەخانەی بچوك کەهەندێ خزمەتی پزیشکی تێدا پێشکەش دەکرێ.

**المواصفة:** صیفەتو چۆنیەتی ئەوشتەی دەتەوێ بیکڕی ٥ یان دروستی بکەی.

**بیع المواصفة:** بریتییە لەوەی شتێك بفرۆشی شتەکە لەبەر دەستا نەبێ، جۆرو شێوەی بۆ کڕیار باس بکەی، دوایی بەو وەصفە دەستی بخەیو بیدەیتێ.

**الوَصّاف:** صیغە موبالەغەیە ٥ زاناو لێزان لەوەصف کردن دا.

**الوَصیف:** خزمەتکارو کارەکەر ٥ کوڕێك نەگەیشتبێتە تەمەنی بالّغ بوون.

**الوَصیفة:** کارەکەر ٥ کچێك نەگەیشتبێتە تەمەنی بالّغ بوون.

**وَصَلَ فلان یَصِلُ وَصْلاً:** بانگەشەی سەردەمی نەزانی هەلّداو دەمارگیریو تایەفەگەری پەیڕەو کرد.

**وَصَلَ الشَّیْئ بالشیئ وَصْلاً وصِلَةً:** شتەکەی بەشتەکەی ترەوە لکاند، دەگوترێ: (وصلت المرأة شعرها بشعر غیرها): ئافرەتەکە قژی لکاندن بەقژی

ترەوە قژی خۆی درێژکردن بەهۆی پێوەلکاندنی قژی تربە قژەکانی خۆی.

**وَصَلَ فلاناً وَصلاً:** پەیوەندی بەردەوام بوو لەگەڵ فلان دا ٥ صیلەی رەحمی نەپچڕاند ٥ دەشگوترێ: (وصَلَ حَبْلَهُ بفلان): دڵی بەفلان دا چووەو خۆشی دەوێ ٥ چاکەی لەگەڵ کرد ٥ ماڵی پێ بەخشی.

**وَصَلَ رحمَهُ:** چاکەی لەگەڵ خزمو کەس‌و کارەکەی دا کرد ٥ هاموشۆی کردن، یارمەتی دان، چاودێری کردن پێیانەوە خەریك بوو.

**وَصَلَ المكان وصولاً:** گەیشتە شوێنەکە.

**وَصَلَ الى بني فلان:** خۆی پاڵدایە لای فلان بەرەباب‌و تایەفە خۆی بەیەکێ لەوان حسێب کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىَ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ﴾.

**اوْصَلَهُ الشَّيْئ واليه:** شتەکەی گەیاندە ئەوی، یان شتەکەی پێ گەیاند ٥ دەشگوترێ: (ضَرَبَه ضربةً لاتوصل): زەبرێکی وای لێ داوە چارە سەرناکرێ دەرمان ناکرێ.

**واصله مواصلةً ووصالاً:** بەردەوام بوو لە دیدەنی کردنی‌و نەپچڕانی پەیوەندی ٥ پێچەوانەی مانای (هَجَرَهُ)دێ ٥ بەزۆری بۆمانای دڵداری‌و خۆشەویستی ئەو بوارە بەکاردێ.

**واصَلَ الصيامَ:** چەند رۆژێك لەسەریەك بەرۆژو بوو ٥ دەشگوترێ: (واصل حَبْلَهُ).

**وَصَّلَ الشَّيْئ بالشَّيْئ:** شتەکەی بەشتەکەوە لکاند ٥ یان زۆری دیدەنی کردو پەیوەندییەکەی لەگەڵ دا چڕو پڕ کردەوە ٥ لەخۆی گرت، خستیە گەڵی ٥ شتەکانی لێك دان، پێکیەوە بەستن.

**وَصَّلَ الشَّيْئ اليه:** شتەکەی گەیانە ئەو.

**إتَّصَلَ فلان:** فلانکەس بانگەشەی سەردەمی نەزانی کرد دەمارگیری‌و تایەفەگەری‌و داب‌و نەریتی خێڵەکی پەیڕەو کرد.

**اتَّصَلَ الى بني فلان:** خۆی پاڵ فلان بەرەباب‌و تایەفەدا.

**إتَّصَلَ الشَّيْئ بالشَّيْئ:** شتەکە بەشتەکەی ترەوە لکا ٥ پێوەی نوسا.

**تواصَلاَ:** پێکەوەبوون لێك دانەبڕان ٥ پەیوەندییان بەیەکەوە بەردەوام بوو پێچەوانەی (تصارما)یە کەبەمانا لێك دابڕانە.

**تَوَصَّلَ اليه:** گەیشتە لای، پێی گەیشت

ه ورده ورده لهگـەڵی دا ڕۆیـی تـا گەیـشته مەبەسـت ه هـەوڵی داو واسیتەی کردو خۆی نزیـك کـردەوە تاپێی گەیی ه دەگوترێ: (تَوَصَّلَ الیه بُوصـلة أو سـبب): بـەهۆی واسیتەو هۆکـاری جـۆراو جـۆرەوە پێـی گەیشت.

استوصـلت المـرأةُ: ئافرەتەکە داوای کرد قژی تر بخرێنـە سەر قژەکانی بۆئـەوەی قـژەکانی درێـژبن، جـوان بنوێنن.

الصِلَةُ: عـەطاو بەخشش ه خـەڵات ه ئـەو پیتـەی دوای (الـروی) دێ لـە سەرەوای شیعردا ه پێشی دەگوترێ: (الوَصَلَ).

الصُلَة: تێشوو.

الإیـصال: نوسراوێـکە وەرگرتنـی ماڵێـك یان قەرزێکی تێدا ئاماژەپـێ دەکرێ.

المستَوْصِلة: ئـەو ئافرەتـەی دەبێتـە دەلاڵو ڕێ نیشاندەر بۆ قژپێـکەوە لکاندنو بارۆکە کـردنو ئـەو جۆرە شتانە.

المَوَصَّلُ: دەگوترێ: (خَـیط مرصَّـلٌ): حەبلو هەودایەکە لەزۆر شوێنەوە سەریەك خراوەتەوە.

المُوَصِّـلُ المعـزول: پلاکـی کارەبـاو شتی وا.

الموَصِّـلات: ئـەو قـەبارەو شـتانەی کارەبایان پێدا نەقڵ دەکرێ.

الموصِـلُ: شـوێنی گەیـشتن ه شـوێنی بەیـەك گەیـشتنی دوشـتو پێـکەوە لەحیم کردنیان ه جومگە ه نێـوان کلۆتو ڕانی حوشتر ه شوێنی گرێـی حەبل، ئـەو شـوێنەی دوو حەبلەکە دەخرێنـــەوە ســـەریەك ه (ك: مواصِل).

المَوْصُـــولُ: حەیوانێـــکە وڵاخو ئاژەڵێـکە دایکەکـەی لەیـەك نێـرێ کـەڵی گرتبـێو فـەحلی تـر سـواری دایکی نەبووبن.

الواصِلَة: ئافرەتی داوێن پیس.

الوَصْلُ: عەطاو بەخشش ه دەگـوترێ: (أعطـاه وَصْـلاً مـن ذهـب): بڕێـکی ئـاڵتون پـێ بەخـشی ه هاوشـانو هـاوکوف ه دەگـوترێ: (هـذا وصـل هـذا): ئەمـە هاوشـانی ئەمەیـە ه جومزگەو شوێنی بەیەکەوە لکانی دوونێسكو زیـاتر ه (حرف الوَصْل): ئـەو پیتەیـە لـەدوای (الـرّوی)دێ لەسەرەوای شیعردا.

لیلة الوصل: شەوی کۆتایی مانگە.

الوُصْلُ: جومزگە، یان شوێنی بەیـەك گەیـشتنی دوو ئێـسقان یـان زیـاتر.

**الوَصْلَةُ:** (لەبواری زانیاری کیمیادا) ڕەمزی ئەو هێزمیە کە دوگەردیلە بەیەك دەگەیەنێ.

**الوُصْلَةُ:** گەیاندن‌و پەیوەندی ٥ دەگوترێ: (بینهما وُصْلَةٌ): لەنێوانیان دا پەیوەندی هەیە ٥ هەرشتێك بەشتێکی ترەوە بلکێ ٥ هاوڕێ‌و هاوەڵ، تێشو ٥ زەوی دوور.

**الوَصِیلُ:** کەسێك هەمیشە لەگەڵ یەکێکی تربێ‌و لێی جیانەبێتەوە.

**الوَصِیلَةُ:** شتێك بەشتێکی ترەوە بلکێندرێ ٥ هاورێ ٥ زەوی پان‌و پۆر ٥ لەسەردەمی نەزانی دا وشەی الوصیله ناو بووە بۆ حوشترێك دە سك بکا بێ بسانەوە ٥ یان مەرێك حەوت سك بکا حەوتەم جاری نێرو مێیەکی ببێ، لەبەر رێزی کاوڕە مێیەکە نێرەکەش سەرنابڕن ٥ شیری دایکەکەش هەردەبوایە پیاو بیانخواردایەوە لەئافرەت یاساغ بوو ٥ ئەم جۆرە حوشترو مەڕە رێزێکی تایبەتی هەبوو بەئارەزۆی خۆی لەکوێ دەلەوەڕا کەس بۆی نەبوو رێگری بکا، دەق وەکووو ئاژەڵی (سائیبە) هەڵس‌و کەوتی لەگەڵ دەکرێ ٥ (ك: وصیل ووصائل).

**وَصَمَهُ یَصِمُهُ صِمَةً ووَصْماً:** بەگورجی رایکێشا ٥ ڕەخنەی لێ گرت.

**وَصَمَ العود:** دارەکەی شکاندەوەو بەبێ ئەوەی لێکی جیابکاتەوە.

**وَصَّمَهُ:** تەمبەڵ‌و فونگرانی کرد، هەڵی نەنا بۆ کردنی کارەکە ٥ ئەزیەتی دا، دەگوترێ: (وَصَّمَتْه الحُمی): لەرزو تا ئازاری دا.

**تَوَصَّمَ:** بۆ موطاوەعەی (وَصَمَهُ)دێ.

**الوَصْمُ:** عەیبو لەکە ٥ گرێی دار ٥ درز ٥ دەگوترێ: (قناة فیها وَصْمٌ).

**الوَصْمَةُ:** کەلەبەرو پیتکەو روشاوی لەجەستەدا ٥ عەیبو لەکە ٥ سوێندی بەدرۆو تاوان.

**وَصْوَصَ:** لەکون‌و درزەکەوە ڕوانی.

**وَصْوَصَتِ المرأةُ:** ئافرەتەکە روبەندی خۆی وێکهێنایەوە هەرکونی چاوی بەدەرەوەن.

**وَصْوَصَ الجروُ:** بێچوە سەگەکە، بێچوەگورگەکە چاوی تروکاندن.

**وَصْوَصَ فلان:** فلانکەس چاوی خۆی بچوك کردنەوە بۆئەوەی چاك شتەکە ببینێ‌و بەباشی روانینەکەی ئاڕاستە بکا.

**الوَصْوَصُ:** کونێکە لەپەردەو دەرگاو شتی وا بەئەندازەی چاولێیەوە دەڕوانرێ ٥ (ك: وصاوص).

**وصی فلان یصی وصیاً:** دوای بەرزی‌و

شکۆمەندی ڕەزیل بوو ٥ دوای کێش سوکی کێشی قورس بوو.

**وَصَی الشَّیئ**: شتەکە گەیشت دەرکەوت ٥ دەگوترێ: (وَصَی النبتُ): گژوگیاکە پێگەیی‌و زۆر بوو.

**وَصَت الأرضُ وَصْیاً ووُصِیاً**: زەوی گیاوو گژەکەی تێك ڕژاو زۆر بوو.

**وَصَی الشَّیئُ بالشَّیئ**: شتەکە بەشتەکەوە لکا پێوەی نووسا.

**اوصی**: چووە ناو گیاوگژی زۆرەوە.

**اوصَی فلاناً والیه**: فلانکەسی کردە سەر وەصیەت ماڵ‌و منداڵی دوای مردنی داوای لێ کرد سەرپەرشتیاریان بێ ٥ پەیمانی دایەو بەڵێنی پێدا.

**اوصی له بشیئ**: شتەکەی کردە ماڵی ئەوو وتی بۆئەو بێ.

**اوصی فلاناً بالشیئ**: فەرمانی بەفلانکەس کرد بەئەنجامدانی شتەکەو لەسەری پێویست کرد.

**وَصَّی الیه وله بشیئ**: شتەکەی کردە هی ئەوو بڕیاری بۆدا.

**وَصَّی فلاناً**: دوای مردنی فلانکەسی کردە وەصی‌و سەر پەرشتیاری ماڵ‌و منداڵی.

**وَصَّی بالشیئ فلاناً**: فەرمانی بەفلانکەس کرد بەئەنجامدانی شتەکەو خستیە ئەستۆی ئەو ٥ دەگوترێ: (وصَّی اللهُ الناسَ بکذا).

**تواصَی القومُ**: خەڵکەکە هەندێکیان وەسێتیان بۆ هەندێکیان کرد.

**تواصَی النبتُ**: گیاو گژەو کە پاڵی لێك دا.

**استوصی به**: وەصییەتەکەی بەوشتە قبوڵ کرد ٥ دەگوترێ: (استوصی به خیراً): خێرو بێری بۆئەو وێستو بۆی ئەنجام دا ٥ لەفەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە: (إستوصوا بالنساء خیراً).

**الواصیة**: دەگوترێ: (فلاة واصیة): دەشت‌و سارایەکە بەدەشت‌و سارای ترتێکەڵاو دەبێ.

**الوَصَاةُ**: بەمانا (الوَصیة)دێ ٥ (ك: وَصَایا)یە سەرپەرستیاری کردنی منداڵ.

**الوَصِي**: ئەوکەسەی وەسییەتی بۆ دەکرێ‌و دەکرێ بەسەرپەرشتیار ئەوکەسەی سەرو کاری منداڵ‌و ماڵ‌و سامانەکەی دەکا.

**وَضَأه یَضوؤه وضئاً ووضاءةً**: لەڕوخسار جوانی‌و پاك‌و خاوێنی دا بەسەریا باڵادەست بوو ٥ دەگوترێ: (وَاضَأهُ فَوَضَأهُ).

**وَضُؤ یَوْضُؤُ وُضاءةً**: جوان بوو ڕێك‌و

پێك‌و پاك‌و خاوێن بوو ◊ (فهو وَضِيءٌ) ◊ (ك: أوضياء ووِضاء).

**وَضَــأَهُ:** شــانازی بەســەردا كــرد ◊ دەگوترێ: (واضَأَهُ فَوَضَأَهُ).

**وَضَّأَهُ:** وای لێ كرد دەستنوێژ بگرێ.

**تَوَضَّــأ للعبــادة:** هەنــدێ ئەنــدامی جەســتەی شــت‌و هەندێــكی مەســح كــرد ◊ یــان بــەنیازو مەبەســتی نوێــژكردن ئــاوی گەیانــدە هەنــدێ ئەندامی جەستەی.

**تَوَضَأَ الغلام والجارية:** كوڕو كچەكە گەیشتنە تەمەنی باڵغی.

**المتَوَضَّأُ:** شوێنی دەستنوێژشتن.

**الميضَأَةُ:** قاپێك یان مەسینەو گڵێنە ئاوی دەســتنوێژی تێــدابێ ◊ شــوێنی دەستنوێژ هەڵگرتن.

**الوَضُوءُ:** دەستنوێژ ◊ ئاوی دەســتنوێژ پێ هەڵگرتن.

**الوُضاءُ:** دەم‌و چاو نورانی.

**الوُضُوءُ:** دەستنوێژ هەڵگرتن ◊ شتن‌و مەســح كردنــی هەنــدێ ئەنــدامی جەستە ◊ گەیاندنی ئــاو بــۆ هەنــدێ ئەندامی جەستە لەگەڵ نیەت دا.

**وَضَــحَ الأمـرُ يـضح ضِـحَةً ووضـوحاً:** كارەكــە ئاشــكرا بــوو ڕون بــۆوە ◊ دەگــوترێ: (وضــح الــصُبْحُ): بــەیانی ئاشــكرابوو ئاسـۆ ڕون بـۆوە ◊ (وَضَــحَ الراكـــب): ســـوارەكە دەركـــەوت ◊ دەشگوترێ: (من أين وَضَـحَ الراكـب؟): لەكوێوەوە سوارەكە دەركەوت.

**وَضَحَ الوَجْهُ:** ڕوخساری جوان بوو ◊ (فهو واضِح).

**اوضَــحَ الرجــل والمــرأةُ:** پیــاوو ئافرەتەكــە منــداڵی ســپی پێــستیان بوون.

**اوضَـحَ الأمْـرُ:** كارەكـە ئاشـكرا بـوو، دەركەوت.

**تَوَضَّحَ الطريق:** ڕێگاكە ڕون بۆوە.

**تَوَضَّحَ عنه:** لێی كۆڵیەوە.

**استوضَــحَ الــشَيْئ وعنــه:** دەســتی خســتە پــشت چــاوی لەبــەر تیــشكی خۆر بۆئـەوەی بزانـێ ئـاخۆ شـتەكە دەبینێ یان نا.

**استوضـــح فلانـــا الأمـــر:** داوای لەفلانكـەس كـرد شـتەكەی بـۆ ڕون بكاتەوە.

**الأواضـــح:** ڕۆژانێـــك شـــەوەكانیان ڕونــاكن شــەوی ســیانزەو چــواردەو پانزەی مانگی قەمەری.

**الأوضـاح مـن النـاس:** كۆمەڵگایـەك پێـك هاتبـێ لەچـەند هـۆزو خێڵـی جیاجیا.

**المُتَوَضِّحُ:** كەسێـك سواری ڕێـگایەكی ڕاستو ئاشكرا ببێ ◊ بەناوەڕاستی

ڕێگادا بڕواو نەکەوێتە پەنا پەسێوو کەندولەند ٥ حوشتری سپی زۆر سپی نەبێ.

**المُوضِحَةُ**: برینێك ئێسقانی دەربکەوێ ٥ واتە گۆشتی سەر ئێسقانەکەی دڕیبێ.

**الواضِح**: پێچەوانەی (الخَامِلُ) دێ ٥ واتە: ئاشکراو ڕون ٥ دەگوترێ: (رجل واضح الحسب): پیاوێکە بنەچەو نەژادی ئاشکراو ڕونە ٥ حوشتری سپی بەلام زۆر سپی نەبێ.

**الواضِحة**: برینێك گۆشتی هەموو بڕابێ‌و ئێسقانی دەکەوتبێ ٥ دیمەنی ددان لەکاتی پێکەنین دا ٥ شەوێك لەشەوەکانی (ليالي البيض): کەشەوی سیانزەو چواردەو پانزەی مانگی قەمەرین.

**الوَضَحُ**: روناکی، تیشك ٥ سپیایی ئاسۆ لەخۆرهەلات کاتی بەیانی ٥ مانگ ٥ سپیایی هەمووشتێك ٥ ڕێگای ئاشکراو ناوەڕاستی ڕێگا ٥ دیرهەمی زیوی ساخ ٥ خشلی زیوی ساخ ٥ پاوانەو خرخال ٥ بازنەو دەستەوانە کەلەقاچ بکرێ ٥ خالی سپی بەناو چەوانی ولاخەوە ٥ شیر ٥ مووی سپی سەرو ڕیش کە نیشانەی پیرییە ٥ بەلەکی.

**الوَضّاحُ**: صیغە موبالەغەیە لەمانای (وَضَحَ)دا ٥ سپی زۆر جوان ٥ روخساری جوان‌و دەم بەپێکەنین ٥ رۆژ ٥ دەگوترێ: (رجل وضّاح الحسب): پیاوێکە بنەچەو نەژادی زۆر رون‌و ئاشکرایە ٥ (عظم وضّاح): یارییەکی مندالە عەرەبە، لەشەوی تاریك دا ئێسقانێکی سپی فڕێ دەدەن ئەمجار دەست دەکەن بە گەڕان‌و پشکنین بۆ دۆزینەوەی هەرکەسێ بیدۆزێتەوە ئەوە براوەیە.

**الوَضِيحة**: ئاژمایەکی سپی دێتە پێش چاوی مرۆڤ ٥ ئاژەل (مەڕو بزن‌و گاو حوشتر) ٥ (ك: وضائح).

**وَضَخَ في السقاء يَضَخُ وضخاً**: شتێکی کەمی لەکوندە ئاوەکەدا هێشتەوە.

**وَضَخَ الدَلْوَ**: دۆلچەکەی نیوەکرد ٥ (فهو واضخ).

**أوْضَخَت البئر**: بیرەکە ئاوەکەی کەم بۆوە.

**اوضَخَ فلان في السقاء**: فلانکەس شتێکی کەمی لە کوندەکەدا هێشتەوە.

**اوضَخَ بالدَلْو**: بەخێرایی وتەکانی دۆلچەکەی لەناو بیرەکە هەلکێشایەوەو پڕی نەکرد کەمی ئاو تێ چوو بوو.

**اوضَخَ للرجل:** کەمی ئاو لەبیرەکە بۆ پیاوەکە دەرهێنا.

**اوضَخَ الدلوَ:** بەمانا (وَضَخَ)دێ.

**واضَخَهُ مواضخة:** پێشبڕکێی لەگەڵ دا کرد لەناو هەڵێنجان دا ٥ پێشبڕکێی لەگەڵ دا کرد لەبازدان دا ٥ وەکوو ڕۆیشتنی ئەو ڕۆیشت ٥ دەشگوترێ: (واضخه السَّيْرَ وفي السير).

**تواضَخَا:** پێشبڕکێیان کرد ٥ دەگوترێ: (توضخا في الإستسقاء وفي العدو وفي السير).

**تواضَخَ فلان فلاناً:** فلانکەس وەکوو ڕۆیشتنی فلان ڕۆیشت.

**وَضِرَ يَوْضَرُ وَضَراً:** چڵکن بوو.

**وَضِرَ الإناءُ:** قاپەکە، مەنجەڵەکە چەور بوو ٥ (فهو وَضِر وهي وضِرَةٌ ووَضْرى).

**وَضَّرَهُ:** چەوری کرد، چڵکنی کرد، دەگوترێ: (كان نقي العِرْضِ فَوَضَّرَه بالدناءة).

**الوَضَرُ:** چڵك ٥ چەوری ٥ پیس‌و پۆخەڵی بەهۆی چەورییەوە خشت‌و خۆڵی بنکی کوندەو گۆزەی ئاو ٥ بۆگەنی خۆراکی ئێکسپایەرو گەنیوو ترشاوو بەسەر چوو ٥ شوێن ئاسەواری خۆراك بەسەر ڕوی سینی‌و قاپ‌و شتی واوە ٥ ئەو ڕەنگەی بەسەر زەعفەران‌و شتی واوە دەبینرێ ٥ پاشماوەو ئاسەواری مۆرانەو ژەنگ‌و پیسایی ٥ پاشماوەو ئەثەری قەتران ٥ (ك: أوضار) ٥ دەگوترێ: (فلان ذو أوضار): فلانکەس چڵکن‌و پیس‌و پۆخەڵە.

**وَضَعَ يَضَعُ وضعاً وموضوعاً:** پەلەی کرد لەڕۆیشتن دا ٥ دەشگوترێ: (وضَعَ السراب على الآكام): تراویلکە لەسەر گردۆڵکەو شتی وا درەوشایەوە.

**وَضَعَت المراة وَضْعاً وتُضْعاً:** ئافرەتەکە لەکۆتایی ماوەی پاکی دا، سکی پڕبوو نەکەوتە عادەی مانگانەیەوە.

**وَضَعَتِ الإبلُ وضيعة:** حوشترەکە گیا ترشۆکەی گوێ چەم‌و ئاوی خواردو ئەو لەوەڕی ڕێگایەی جێ نەهێشت.

**واضَعَ فلان من فلان وعنه وضعاً وموضعاً:** فلانکەس لەڕێزی فلانی کەم کردەوەو پلەی کۆمەڵایەتی هێنایە خوار ٥ دەشگوترێ: (وضعه الشُّحُ ودناءة النسب).

**وَضَعَ عَنْ غريمه:** لەقەرزەکەی بۆ قەرزدارەکەی داشکاند.

**وَضَعَ فلاناً:** فلانکەس ژێردەستەو زەلیل کرد ٥ دەگترێ: (وضَعَ الله المتکبرين ووضع فلان نفسَه):

فلانکەس نەفسی خۆی زەلیل کرد.

**وَضَعَ الشَّيْئ**: شتەکەی دانا لەدەستی خۆی کردەوە ◦ دەگوترێ: (رفع السلاحَ ثم وضعَه).

**وَضَعَت المراةُ خمارها**: ئافرەتەکە سەرپۆش و ڕوبەندی لەسەرخۆی داماڵی و فڕێی دا.

**وَضَعَ الشَّيْئ الى الأرض**: شتەکەی دابەزاندە سەرزەوی.

**وَضَعَ الشَّيْئ في المكان**: شتەکەی لەشوێنەکە دامەزراند ◦ دەشگوترێ: (وَضَعَ يده في الطعام): دەستی کرد بەنانخواردن.

**وَضَعَ فلان فلاناً في ماله وضيعة**: فلانکەس لەماڵی خۆی بۆ فلانکەس ئەندازەیەکی بۆ دابەزاند.

**وَضَعَ فلاناً**: فلانکەسی کرە پیاوێکی نزم و بێ نرخ.

**وَضَعَ عُنُقَه**: لەملی فلانی دا.

**وَضَعَ عنه الأمرَ**: کارەکەی لەمل و ئەو داماڵی لەکۆڵی کردەوە ◦ دەگوترێ: (وَضَعَ عنه الدين والجزية): قەرزەکەی لەمل داماڵی ◦ (وَضَعَ عنه الجناية): تاوانەکەی لەئەستۆی ئەو لابرد.

**وَضَعَ الشَّيْئ وضعاً**: وازی لەشتەکە هێنا.

**وَضَعَ الرجلُ الحديثَ**: پیاوەکە قسەکەی هەڵبەست ◦ درۆی ڕێك خست.

**وَضَعَت الحاملُ ولدها وضعاً**: ژنە سکپڕەکە منداڵەکەی بوو سکەکەی دانا ◦ (فهي واضع).

**وَضَعَ العلم**: شارەزای یاساو بنەمای زانیارییەکە بوو.

**وَضِعَ الرجلُ في تجارته وضَعاً**: پیاوەکە لەبازرگانیکردنەکەدا زەرەری کرد.

**وَضُعَ الرجلُ يَوْضُعُ ضَعَةً ووضاعةً**: پیاوەکە بێ ڕێز بوو هەتیو مچەو خوێڕی دەرچوو.

**وُضِعَ الرجلُ في تجارته**: پیاوەکە لەبازرگانی کردنەکەی دا زەرەری کرد ◦ زۆربەی کات ئەم چمکە بەم شێوەی ئیسمی مفعول ئەدا دەگرێ ◦ دەگوترێ: (لايزال فلان موضوعاً في تجارته).

**اوضَعَ في الشَّرِ**: پەلەی کرد لەشەڕکردنەکەدا.

**اوضَعَ الراكبُ الدابَّةَ**: سوارەکە ولاخەکەی هەلینگ دا بۆ خێرا ڕۆیشتن.

**اوضَعَ فلان فلاناً في الأمر**: فلانکەس موافەقەی بۆ فلان کرد لەکارەکەدا.

**اوضِعَ الرجلُ في تجارته**: پیاوەکە لەبازرگانی کردنەکەی دا تێشکا.

**واضَعَ الرجل مواضَعَةً ووضاعاً**: پیاوەکە لەهەڵگرتنی دەستەبارەکەدا

تەرازو ئاسا هەڵی نەگرت، بەسەر لای هاوەڵەکەی دا شکاندیەوە.

**واضَعَ فلاناً**: گرەوی لەگەڵ فلان کرد ◦ لەکارەکەدا هاوڕای فلان بوو ◦ موافیقی بوو ◦ موناظەرەو چەلەحانێی لەگەڵ فلان دا کرد.

**واضَعَ فلاناً الرأيَ**: لەگەڵ فلان دا هەریەکەیان ئەوی تری بەسەر راو بۆچونی خۆی دا ئاگادار کرد.

**وَضَّعَ فلاناً**: فلانکەسی خوێڕی کرد ◦ بێ رێزی کرد.

**وَضَّعَ الباني الحجَرَ**: وەستاکە بەردەکەی خستە چینی دیوارەکەوەو داینا ◦ بەردەکانی چین چین خستنە سەریەك‌و ریزبەندی کردن.

**وَضَّعَ الجُبَّةَ**: دوای ئەوەی لۆکەی خستە ناو جبەکەوە ئەمجار دوری.

**وَضَّعَت النعامةُ بَيْضَها**: نوعامەکە هێلکەکانی خستنە سەریەك.

**اتَّضَعَ فلان**: فلانکەس بوو بە خوێڕی‌و هەتیو مچە.

**اتَّضَعَ البعيرُ**: حوشترەکە سەری خۆی نەوی کرد بۆئەوەی خاوەنەکەی پێ بخاتە سەر ملی‌و سواری بێ.

**تواضَعَ فلان**: فلانکەس خۆی بەزەلیل‌و ترساو لەخودا نیشان دا.

**تواضَعَ القومُ على الأمر**: خەڵکەکە لەسەر کارەکە رێك کەوتن.

**تواضَعت الأرض**: زەوییەکە لەو زەوییەی ئەولای نزم تر بوو.

**تواضَعَ ما بيننا**: نێوانمان دوور بوو.

**استوضَعَ منه**: لەرێزی هێنایە خوار.

**استوضَعَ فلاناً الشَّيْءَ**: داوای لەفلانکەس کرد شتەکەی لەسەر لابا ◦ دەگوترێ: (استوضع فلاناً في دينه): داوای لەفلان کرد قەرزەکەی لەسەر لابەرێ.

**التوضيع**: دەگوترێ: (في فلان توضيع): فلانکەس ژنانییە.

**الضَّعَة**: نزم بوونەوەی رێزو نرخ ◦ شکانی کەسایەتی‌و دابەزینی سومعە ◦ خوێڕیەتی‌و هیچ‌و پوچی.

**المُوَضَّعُ**: شکاوو کەرت‌و پەرت بوو، کەسێك نەپیاوی تەواو بێ نەئافرەتی تەواو بێ (واتە نێرە موك) ◦ دەگوترێ: (فلان مُوَضَّعٌ): فلانکەس نێرەموکە ◦ شێوە ژنانییە ◦ بێ رەوشتە.

**الموْضِع**: شوێن‌و مەکان ◦ دەگوترێ: (في قلبي موضع فلان): خۆشەویستی فلانکەس لەدڵم دایە.

**المَوْضَعَة**: ناوی شوێن (اسم المكان).

**الموضوع**: سەرەباس ◦ ئەو مادە

زانیـــاریو رۆژنامەوانییەیـــە کەنووســـەر دەیکاتـــە عینـــوانی نووسینەکەی.

**الموضوع من الأحادیث:** حـەدیثی هەڵبەســـتراوو پاڵـــدراو بـــۆ لای پێغەمبەر (د.خ) لەبواری فەلسەفەدا بریتییـــە لەشتێـــك هەســـتی پـــێ بکریو مودرەك بێ، بەرامبەرەکەی بریتییـە لـە (الـذات) ٥ لـەزاراوەی مـەنطیـق بریتییـە لـە شتێـك (مەقولو عـەنهو)بێ قسە لـێ کراو بـێ لەپێـشەوە بگـوتریو بکرێتـە مەوضوعو بەشی یەکەمی قـەضیەو شتی تـری بخرێتە سەرو مـەحمولی بۆ بهێنـدری.

**المَوضوعة من الأحادیث:** حـەدیثی هەڵبەسراووبێ بنەما.

**الموضـوعیة:** لـەبواری فەلـسەفەدا دیـدو بۆچونێـکی فەلـسەفییە پێـی وایـە مەعریفـە دەگەڕێتـەوە بـۆ حەقیقەتێـــك جودایـــە لـــەزاتی مودرەكو هەست پێکراو.

**الواضـعة:** بـاخو باخـچە ٥ حوشترێـك لەشـتی فڕێـدراوو پـلو پـوشو بەرماوەدا بلەوەڕێ ٥ ئافرەتی داوێن پیسو بەدڕەوشت.

**الوَضْعُ:** دانـان ٥ دانـراو (موضـوع) ٥ هێـدی تـرینو لەســـەرەخۆترین شـێوەی ڕۆیشتنی حوشـترو وڵاخـی تره ٥ شێوەی شتو هەیئەتی.

**الوَضـاع:** زۆر قـــسە هەڵبەســـتو درۆزنو بوختانـــچی ٥ دەگــوترێ: (رجل وَضّـاعٌ): پیـاوی زۆر درۆزنو قسە هەڵبەست.

**الوَضعیة:** مەزهەبو ڕێبازی (ئوجست کۆنـت)ە کـە بـڕوای بەنـەو دیـو مادەنیەو ئینکاری میتا فیزیقیەکان دەکـا، پێـی وایـە زانیـاریی دەبـێ لەســـەر روداو ئـــەزمون بـــنج بەستوبێ.

**الوَضـیعُ:** پـڕو پـوچو هـەتیو مـچەو خـوێڕی ٥ پێـچەوانەی (الـشریف)ە ئەمانـەتو ئەسـپاردە ٥ دەگـوترێ: (وضـــعت عَـــنْ فـــلان وضـــیعاً): ئەسپاردەیەکم لای فلانکەس داناوە.

**الوَضـیعَة:** ئەمانـــەتو ئەســـپاردە ٥ کتێبێـکە قسەی عاقڵمەنـدانی تێدا دەنووسـرێ ٥ کۆمەڵێـك سـەرباز دەخرێنـە هەرێمێـکەوەو غـەزوی ئەو دەڤەرناکەنو تێیدا دەمێننەوە ٥ وردەو پـــردەی شــت ٥ زەرمر ٥ کۆڵو بـارو بارگەنـەی خـەڵك ٥ ئـەو ئەندازەیـەی پاشـاو خەلیفـە وەری دەگرن لەباجو خەراج ٥ ناردو ڕۆنـی بەسـەردا دەکـرێو دەخـورێ ٥ (ك: وضائع).

**وَضَمَ القومُ يَضِمون وضوماً**: خەڵكەكە كۆبونەوەو لێك نزیك بوونەوە.
**وَضَمَ القوم على بني فلان**: خەڵكەكە بوونە میوانی فلان خێزانو بەرەباب.
**وَضَمَ الجزار اللحم**: حەیوان كوژەرەوەكە (قەصابەكە) گۆشتەكەی خستە سەر (وەضەم) هەرشتێك گۆشتەكە لەگڵو خۆڵ دووربخاتەوە.
**اوضَمَ الجزارُ اللحمَ**: بەمانا (وَضَمَهُ)دێ.
**استَوضَمَهُ**: ستەمی لێ كرد.
**الوَضَمُ**: هەرشتێك گۆشتی لەسەر دابندرێ لەدارو حەسیرو بەردو شتی وا بەمەبەستی ئەوە لەگڵو خۆڵ دووربێ ٥ سفرەی نانخواردن.
**الوَضْمَةُ**: كۆمەڵێك ئادەمیزاد دووسەد یان سێ سەد كەس ٥ كۆمەڵێك مرۆڤی لێك نزیك دەگوترێ: (القوم وَضْمة واحدة).
**الوَضيمُ من الأصابع**: نێوان قامكی ناوەڕاستو قامكە بچكۆلە.
**الوَضيمة**: كۆمەڵێك مرۆڤ دووسەد تا سێ سەد كەس ٥ خەڵكێكە كەم دەبنە میوانی هۆزو خێڵێكو ڕێزیان لێ دەگیرێ ٥ خواردنی ئامادەكراو بەبۆنەی ماتەمینییەوە.
**وَضَنَ الشَّيءَ يَضِنه وَضْناً**: شتەكەی خستە سەریەك ٥ دەگوترێ: (وَضَنَ الحجرَ والآخرَ): شتەكەی دوو لۆو دوو تونێ كردەوە ٥ تەنی ٥ دەگوترێ: (وَضَنَ السرير وأشباهه الجوهر) ٥ (فهو واضن وهي واضنة).
**أوضن الرَّجل**: بۆ ڕەحلو كەژاوەكە قەیاسەی چندراو بەسەریەك دای بۆ دروستكرد، پێی شەتەك دا.
**إتَّضَنَ**: پەیوەندی پێوەكرد پێیەوە لكا.
**تضوَضَّنَ**: زۆر دەستە بوو ٥ زەلیل بوو.
**الموضونة**: زرێیەك كونەكانی لێك نزیك بن ٥ حەلقەكانی تێك خرابنو چوبنە ناو یەكەوە ٥ یان ئەڵقەكانی دو دو چندرابن.
**المِيضنة**: هۆڕو جەواڵو تێرەیەكە لەپوشی دارخورما چندرابێ ٥ (ك: مواضین).
**الوُضنةُ**: كورسی چندراو لەلقی دارخورماو شتی وا.
**الوَضين**: ریزكراو چین چین كراو ٥ پشتێنێكی پانی چندراوە هەندێكی چووەتە سەر هەندێكیو هەوداو سیرمە كانی پێكەوە لاو نیو چندراون ٥ بەكوردی خۆمان پێی دەگوترێ: (قەیاسە) ٥ یان هەر

لەپێست دروست دەکرێ شتی پێ لەپشتی حوشتر شەتەك دەدرێ ٥ بۆ رەحــــڵو کــــەژاوە بــــەکاردێ ٥ دەشگوترێ: (إنه لعلقِ الوضين): ئەو گورجو گۆڵو خێرایە ٥ چوستو چالاکە.

**وطِئَ الشَّيْئَ يَطؤه وَطْئاً:** شێلای پانی کردەوە ٥ دەگوترێ: (وطِئنا العَدُوَّ): دوژمنمان پانو پلێش کردەوە، غەزومان کردن ٥ (بنو فلان يطؤهم الطريقُ): بەرەبابی فلان هۆزی فلان لەنزیك رێگاکەوە نیشتەجێ بوون.

**وَطِئَ المرأةَ:** چووە لای ئافرەتەکە، سەرجێیی کرد.

**وَطُؤَ الموضعُ وغيره:** شوێنەکە نەرمەڵان بوو.

**اوْطَأَ شِعْرَهُ وفيه:** لەشیعرەکەدا سەرەوای دوبارە کردەوە بەلەفظو ماناوە هەمان سەرەوای پێشوی هێنایەوە.

**اوطَأ فلاناً العَشْوةَ وعَشوَةً:** فلانکەسی والێ کرد بەسەر کوێری بڕواو نەزانێ رو لەکوێ دەکا.

**اوطَأ الأرضَ وبها:** پێی لەزەوییەکە ناو بەناوی دا رۆیی.

**اوطَأ فلاناً الأمرَ:** لەکارەکەدا هاوڕای فلان بوو.

**وَطَّأَ الموضعَ وغيره توطئةً:** شوێنەکەی تەخت کردو کردییە رێبازو رارەو.

**وَطَّأ الشَّيْئ:** شتەکەی ئامادەکرد.

**وَطَّأ الفِراشَ:** شوێن نوستنو دۆشەك سیسەمەکەی رێك خستو خۆشی کرد بۆ لەسەر نووستن.

**تَوَاطَأَ القومُ على الأمر:** خەڵکەکە لەسەر کارەکە رێك کەوتن.

**تواطَأ فلان فلاناً على الأمر:** فلانکەس لەسەر ئیشەکە ڕەزامەندیی خۆی بۆ فلان دەربڕی.

**تَوَطَّأ الرجلان:** شتەکەی ژێر قاچی دا ٥ بەقاچ گێرەی کرد، وردی کرد پلیشاندیەوە.

**استوطَأ الشَّيْئ:** شتەکەی نرم کرد ٥ نەرمی کرد ٥ ئاسانی کرد ٥ بەوشێوانە هاتە بەردەستی.

**الإيطاء:** بەلای شاعیرانەوە عەیبێکی سەرەوای شیعرە، بریتییە لەوە سەرەواکە بەلەفظو ماناوە دوبارە بێتەوە.

**الطَّأة والطَّئَةُ:** نەرمو نیان.

**المَوْطَأُ:** شوێن قاچ ٥ جێ پێ.

**المَوْطِئُ:** بەمانا (المَوطَأ)دێ.

**المُوَطَّأُ:** سەهلو ئاسان، نەرمو نیان ٥

دەگوترێ: (رجل موطأ الأكناف): پیاوێکی بارخۆش‌و مامەڵە خۆشە، ڕۆخۆش‌و سەخی سورشت‌و میوان نەوازە ◦ هەرکەسێ بچێ بۆ لای پەشیمان نیەو ماندو نابێ.

**المِيطَاءُ:** چاڵایی زەوی ◦ پارچە زەوییەکی نزم.

**الواطِئَة:** ڕێبوار کە شوێنێکی زەوی دەکەنە ڕێڕەو ◦ خورمای بیژۆك‌و هەڵوەریو.

**الوِطَاءُ:** نزمایی، زەلکاوو چاڵایی لەزەوی دا.

**الوِطَاءُ:** بێشکەی نەرم‌و خۆش بۆ منداڵ.

**الوَطَاءَةُ:** نەرم‌و نیان‌و ئاسان‌و بەیدەست.

**الوَطْأَةُ:** پێلەقەو گرتنی بەهێزو توند.

**الوَطَأَةُ:** ڕێبوار.

**الوَطِئ:** چاڵایی زەوی ◦ نەرم‌و دەشت ◦ تەخت کراوو بێ کۆسپ ◦ دەگوترێ: (هذا الفراش وَطِئٌ): ئەم شوێن نوستن‌و دۆشەکە نەرمە ئەوکەسەی لەسەری دەخەوێ ئازاری جەستەی نابێ.

**الوَطِئَةُ:** خورمایەکە دەنکەکەی دەردەهێندرێ‌و بەشیرەوە دەشێلرێ ◦ کەشك‌و شەکر.

**الوَطْبُ:** مەشکەی دۆ ◦ مەمك‌و گوانی گەورە ◦ پیاوی وشکە تەبیات‌و قسە ڕەق ◦ (ك: أوطب وأوطاب ووطاب وأواطب) ◦ دەگشوترێ: (صَغِرَت وِطَابُهُ): مرد یان کوژار.

**الوَطْبَاءُ:** مەمك گەورە.

**الوَطْبَةُ:** قاوت؛ کەلەخورماو کەشك‌و ڕۆن دروست دەکرێ.

**وَطَحَهُ يَطحُهُ وَطْحاً:** بەزەخت‌و هێز پاڵی پێوەنا.

**تواطَحَت الإبل على الحوض:** حوشترەکان پاڵەپەستۆیان کرد لەسەر حەوزی ئاوخواردنەوە.

**تواطح القومُ:** خەڵکەکە لەگەڵ یەك شەڕیان کردو دژی یەکتر دوان‌و هەڵوێستیان وەرگرت.

**الوَطْحُ:** ئەو چڵك‌و پیسییەی بەسم‌و چنگ نینۆکی وڵاخ‌و ئاژەڵ‌و باڵندەو پەلەوەرەوە دەنوسێ.

**وَطَدَ يطِدُ وَطْداً:** جێگیر بوو، چەسپا.

**وَطَدَ الشَّيْئ وَطْداً وَطِدَةً:** چەسپاندی بەهێزی کرد ◦ (فهو وطيد وموطود): دەگوترێ: (وَطَدَ له منزلة): جێگای بۆ خۆش کرد.

**وَطَدَ الإنسان الى الأرض:** پیاوەکەی بەزەوییەوە نوساندو نەیهێشت جوڵەبکا.

**وَطَـــدَ الأرضَ**: زەوییەکـەی بـەکوتك کوتایـەوە بـۆ ئـەوەی بپەسـتێوریٚو بچێتە پاڵ یەكو بۆشایی تێدا نەمێنیٚ کەبیناى لەسەر بکریٚ نەنیشیٚ.

**وَطَدَ الصَّخْرَ علي الغار**: بەبەرد دەرکی ئەشـــکەوتەکەی گـــرت ٥ دەرکـــی ئەشـــکەوتەکەی بەکەڵەکــە بـــەرد هەڵچنی.

**وَطَّدَهُ**: بەمانا (وَطَدَهُ)دێ.

**وَطَّـدَ الأرضَ**: زەوییەکـــەی تـــەخت کردو کوتایەوە بۆئەوەی گڵو بەردو چەوەکە بچێتە پاڵ یـەكو تونـدبیٚ ٥ دەشگوتریٚ: (وَطَّدَ له عنده منزلـةً): بۆ فلاّن لای فلاّن جێگای بۆ خـۆش کردو دایمەزراند.

**تَوَطَّدَ الشَّيْئ**: شتەکە چەسپاو جێگیر بوو.

**اتَّطَدَ**: بەمانا (تُوَطَّدَ)دیٚ.

**المُتَوَطِّـدُ**: شـتی بـەردەوامو نـەبڕاوە کەیەك بەدو یەك دا بیٚ ٥ چەسپاوو پتەوو جێگیر بوو.

**المِيطَـدَةُ**: کوتکێـکی قـورسو گرانـە لــەدارو شــتی وا دروسـت دەکـریٚ بناغــەی دیــوارو شــتی وای پـــیٚ دەکوترێتەوە بۆئـەوەی پتـەو ببیٚو نەنیـشیٚ ٥ دارێـکە درێـلو ئاسـنی سورەوەکراوی کـونکردنی شـتی پـیٚ دەگیریٚ.

**الوَطِيـدَةُ**: بناغــەو کانگــەی دیــواری خـــانوو ٥ ســیٚ کوچــکەی ئــاگردان (سەرئاگرە) ٥ دەشگوتریٚ: (لە عندي وطيـــدة): فلانکــەس لای مــن پلــەو پایـــەی بـــەرزی هەیـــە ٥ هـــەروا دەگوتریٚ: (أنـت مـن وطائـد الحق): ئــەتۆ پایەیــەکی پتــەوی حـــەقو راستی.

**الوَطَرُ**: پێداویستی ٥ مەبەستو ئارەزۆ ٥ دەگوتریٚ: (قضی منه وَطَرَه): ئیشی خۆی لـیٚ جـیٚ بـەجیٚ کـرد ئـارەزوی خۆی لـی بەدی هێنا.

**وَطَـسَ الأرض يَطِـسُها وَطْـساً**: چـاڵی لەزەوییەکە کرد.

**وَطَـسَ الـشَّيْئ**: شـتەکەی شـکاندو وردو هاڕی کرد ٥ بەتوندو بەهێز لێی دا.

**تَوَطَّسَ المَوْجُ**: شەپۆلەکان توندو زۆر بوون.

**الوَطَّـاسُ**: بـۆ زێــدەڕۆیی لــەمانای (وَطَس)دیٚ ٥ شوان.

**الوَطِيسُ**: تەنـدوری نـانکردن کـەنانی تێـــدا دەبـــرژیٚ ٥ شـــەڕو هـــەرا ٥ دەگـــوتریٚ: (حَمَـــی الـــوطيسُ): شەڕگەرم بوو پەرەی ساند.

**وَطَشَ فلاناً يطشه وطشاً**: لێـی دا، پێـی کێشا.

**وَطَشَ فلاناً عَنْ فلان:** فلانكەسی لەكۆڵ فلانكەس كردەوە.
**وَطَشَ الكلامَ:** كەلامەكەی بەیان كرد، جوان ڕونی كردەوە.
**وَطَشَ الخَبَرَ:** لایەنێكی هەواڵەكەی ئاشكرا كرد ٥ دەگوترێ: (ما وَطَشَ لنا): هیچی نەداینێ ٥ (سألته عَنْ شیئ فما وطَشَ): پرسیاری شتێكم لێ كرد هیچی بۆنەدركاندم.
**وَطَّشَ عنه:** لێی دوورخستەوە.
**وَطَّشَ القوم عنهم:** خەڵكەكەی لێ دوورخستەوە.
**وَطَّشَ لفلان:** دەروازەی قسەو بۆچوونو كرداری بۆ فلانكەس دیاری كرد.
**وَطَّشَ فیه:** كاریگەر بوو تێیدا ٥ دەگوترێ: (سألوه فما وَطَّشَ لهم بشیئ): پرسیاریان لێ كردو هیچی پێ نەدان ٥ (ضربوه فما وَطَّش الیهم): لێیان داو دەستی پێ نەكرایەوەو نەیتوانی دیفاع لەخۆی بكا ٥ (سألته عَنْ شیئ فما وَطَّش): پرسیاری شتێكم لێ كرد هیچی بۆ رون نەكردمەوە.
**وَطَفَ الرَّجُلُ یَطِفُ وَطْفاً:** پیاوەكە دوا ڕەتێندراوەكە كەوت دووری خستەوە.
**وَطِفَ یَوْطَف وَطَفاً:** موی بڕۆو برژانگی زۆر بوون نەرمو شۆڕیش بونەوە.
**وَطِفَ المطرُ:** بارانەكە بەلێزمە باری.
**وَطِفَتِ السحابة:** هەورەكە شوڕابەی كردە سەرزەوی ٥ (فهو اوطف وهي وَطْفاء).
**اوْطَفَ:** بەسەر یا ڕوانی، بەرز بۆوە ٥ دەركەوت ٥ دەگوترێ: (خذ ما أوطف لك): چیت دی هەڵی بگرە.
**الأوْطف:** دەگوترێ: (بعیر أوطف الوبر): حوشترێكی كوڵك زۆرو باشە ٥ (عام أوطف): ساڵێكی پڕ خێرو بەرەكەتە ٥ (عیش اوْطَف): گوزەرانی خۆش ٥ (ظلام أوطف): تاریكییەكی داگرندەو نزیكو داپۆشەرە.
**وَطَمَهُ یَطمُهُ وَطْماً:** پێی لێنا.
**وَطَمَ السِتْرَ:** پەردەكەی دادایەوە.
**وَطِمَ یَوْطَمُ وَطماً:** گوی گیرا ٥ پیسایی بۆنەكرا.
**وُطِمَ:** بەمانا (وَطِمَ)دێ.
**وَطَنَ بالمكان:** لەشوێنەكە مایەوە.
**اوطَنَ البلدَ:** شارەكەی كردە زێدو نیشتمانی خۆی.
**اوطَنَ نفسه علی كذا:** نەفسی خۆی ئارام كرد لەسەر ئەوشتەو پێی ڕازی بوو.
**واطَنه علی الأمر:** كاری خۆی لەگەڵ

ئەوشاردەوە ٥ خۆی دەرنەخست ٥ بەکارەکە رازی بوو.

**واطن القوم:** لەگەڵ خەڵکەکە لەنیشتمانێك دا ژیا.

**وَطَنَ بالبلد:** شارەکەی کردە زێدو نیشتمانی خۆی.

**وَطّنَ نفسه على الأمر:** نەفسی خۆی لەسەر کارەکە ڕاهێنا.

**إتَّطَنَ البلدَ:** وڵاتەکەی کردە زێدو نیشتمانی خۆی.

**تَوَطَّنَ:** بۆ موطاوەعەی (وَطَّنَ)دێ ٥ دەگوترێ: (تَوَطَّنَتْ نفسه على الأمر): نەفسی خۆی لەسەر ئەوکارە ڕاهێنا.

**تَوَطَّنَ الأرضَ وبها:** زەوییەکەی کرد بەزێدو نیشتمانی خۆی.

**استوطن البلَدَ:** شارو وڵاتەکەی کردە زێدی خۆیو تێیدا نیشتەجێ بوو.

**المَوْطِن:** وەتەن ٥ هەرشوێنێك ئادەمیزاد بەهۆیەکەوە تێیدا نیشتەجێ ببێ ٥ ئەنجومەنو مەجلیس ٥ دیمەنێك لەدیمەنەکانی شەڕ ٥ (ك: مَواطن).

**الميطان:** شوێنی لێ ریزکردنو ڕاگرتنی ئەسپەکان پێش ئەوەی دەست بە پێشبڕکێکە بکەن ٥ (ك: مياطين).

**الوَطَنُ:** نیشتمان ٥ زێدو شوێنی لەدایکبونو نیشتەجێ بوون ٥ تەویلەو ئاغەڵو گەوڕی ڕەشەوڵاغو بزنو مەڕ ٥ (ك: أوطان).

**وَطْوَطَ فلان:** فلانکەس لاواز بوو، قسەی خێرا خێرا کردن.

**تَوَطْوَطَ الصبي:** منداڵەکە بەگریانەوە هاواری کرد.

**الوَطْوَاطُ:** شەمشەمە کوێرە ٥ پیاوی کاڵفامو لاوازو جەستە بچکۆلە ٥ کەسێك قسە خێرا خێرا بکا ٥ پیاوی زەعیفو ترسنۆك ٥ دەم بەهاوارو جاڕدەر ٥ (ك: وطاويط).

**الوَطْوَاطَةُ:** کەسێکە خێرا خێرا قسە بکە ٥ لەقسەکردن دا پەلە پەل بکا ٥ ئافرەتێك زۆر قیزە قیز بکا.

**الوَطْواطي:** نیسبەتدانی شتە بۆلای (وطواط) ٥ لاوازو ترسنۆك ٥ چەقە چەناو زۆر بڵێ.

**وَظَبَ عليه يَظَبُ وظوباً:** بەردەوام بوو لەسەری.

**وَظَبَ الأمْرَ:** بەکارەکەوە نووساو وازی لێ نەهێنا ٥ بەرعۆدەی کارەکە بوو.

**واظَبَ على الأمر:** بەردەوام بوو لەسەر کارەکەو پشودرێژبوو.

**واظَبَ فلاناً على خدمة فلان:** فلانکەسی هەڵنا بۆ ئەوەی خزمەتی فلان بکا.

**تواظَبَت عليه الرياح**: بايەكان بە نۆبە لێیان داو هەردەمە جۆرە بايەك لێی دەدا.

**الموظوب**: دەگوترێ: (رجل موظوب): پياوێكە بەڵاو كارەسات نۆرەی لێ دەكەن‌و هەر ڕۆژەو توشی چورتمێك دەبێ‌و ماڵ‌و سامانی بەڵايەك لەناوی دەبا.

**المَوْظوبَةُ**: دەگوترێ: (أرض موظوبة): زەوييەكە ئەوەندەی مەڕو ماڵات تێكراو كرۆسراوەتەوە هيچ لەوەڕی تێدا نەماوە.

**الميظَبُ**: دەسكە سندوڵ بەردێكە لەدرێژەوەيە گەنمی پێ دەگوترێ.

**الوَظْبَةُ**: شەرمگای ئاژەڵ‌و وڵاخ.

**وَظَفَ البعيرَ يَظِفُهُ وَظْفاً**: زەبری لەباريكايی قاچی حوشترەكەدا ٥ زنجيری حوشترەكەی كورت كردەوە.

**وَظَفَ القومَ**: شوێن خەڵكەكە كەوت.

**وَظَفَ الشَّيْءَ على نفسه**: شتەكەی لەسەر خۆی پێويست كرد.

**واظَفَهُ**: هاوڕای بوو، لەگەڵی كەوت.

**وَظَّفَهُ**: هەر ڕۆژەو ئەرك‌و وەزيفەيەكی دياريكراوی بۆدانا.

**وَظَّفَ عليه العملَ والخراجَ ونحو ذلك**: كارو باجی بۆ مەزندە كردو بۆی دياری كرد ٥ دەگوترێ: (وَظَّفَ له الرزقَ ولدابته العلَفَ): يان دەگوترێ: (وَظَّفَ على الصبي كل يوم حفظ آيات من القرآن الكريم): هەر ڕۆژە چەند ئايەتێكی دەست نيشان كردن بۆ منداڵەكە بۆئەوەی لەبەريان بكا.

**الوَظيفُ**: باريكايی قاچی حوشترو وڵاخە بەرزەو حەيوانی تر ٥ قاچی بەهێزو توانا بۆ ڕۆيشتن بەناو نەرمەڵان‌و دۆڵ‌و شيودا ٥ (ك: أوظُفَةٌ وَوُظُفٌ).

**الوظيفة**: ئەوەی دياری دەكرێ لەئيش‌و خواردن‌و بژێوو شتی تر لەماوەيەكی دياريكراودا ٥ وادەو پەيمان‌و بەڵێن ٥ پلەو پايەی موچە خۆر ٥ دەشگوترێ: (للدنيا وظائف وَوُظُفٌ): جيهان بەڵاو كارەساتی جۆراو جۆری هەن.

**وَعَبَهُ يضعبه وَعْباً**: شتەكەی هەموو هەڵگرت‌و هيچی لێ نەهێشتەوە.

**اوعَبَ القوم**: خەڵكەكە هەموويان چون بۆ غەزا بۆ بەرگری لەوڵات‌و زێدو نيشتمان.

**اوعَبَ القومُ جلاءً**: خەڵكەكە هەموويان دەركران هيچيان لەوڵاتی خۆيان دا نەمانەوە.

**اوْعَبَ فلان في ماله**: فلانكەس ماڵ‌و

سامانی خۆی تەخشان‌و پەخشان کرد بەهەموو شێوەیەك لێی بەخشی.

**اوعَبَ الشَّيْءَ:** هەموو شتەکەی هەڵگرت هیچی لێ نەهێشتەوە ٥ شتەکەی لەبێخ دەرهێنا.

**اوعَبَ الشَّيْءَ في الشَّيْءِ:** هەموو شتەکەی کردە ناو شتەکەوە.

**استوعَبَه:** هەمووی هەڵگرت، جێگای هەمووی کردەوە ٥ لەبێخ‌و ریشە دەری هێنا.

**استوعَبَ الحديثَ:** قسەکەی وەرگرت‌و لێی حاڵی بوو.

**استوَعَبَ المكانُ او الوعاءُ:** شوێنەکە یان زەرفەکە هەموو شتەکەی تێدای جێ بۆوە.

**الوَعْبُ:** فراوان، دەگوترێ: (طريق وَعْبٌ): رێگایەکی پان‌و بەر فراوانە.

**الوَعيب:** بەرفراوان بەجۆرێك ئەوەی تێی دەکەی جێگای ببێتەوە تێیدا ٥ دەگوترێ: (بيت وعيب ووِعاء وعيب).

**وَعِثَ الطريقُ يَوْعَثُ وَعْثاً وَوَعثاً:** رێگاکە ناخۆشەو رەوی پێدا ناکرێ.

**وَعِثَ الأمرُ:** کارەکە خراپ بوو تێکچوو تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو.

**وَعِثَتْ يده:** دەستی شکا.

**اوعَثَ:** کەوتە زەوی نەرمەڵان‌و لمبەڵان‌و قوڕو لیتەوە ٥ بەناو گڵە نەرمەو لمبەڵان‌و قوڕە شل دا رۆیی ٥ نەیتوانی قسەبکا ٥ بزرکاندی.

**اوعَثَ في ماله:** لەماڵ‌و سامان خەرج کردن دا زێدە رۆیی کرد.

**اوعَثَ الأمرَ:** کارەکەی تێك دا، داپوەشاند.

**وَعَّثَهُ:** لای دا ٥ سەرفی کرد ٥ بەندی کرد.

**الأوْعَثُ:** (طريق أوعَثُ): رێگایەکە رەوی پێدا ناکرێ ٥ کوێرە زێیە، قۆرت‌و پێچ‌و پڕ کەندو لەندە.

**المُوَعَّثُ:** رێگای بەردەڵان‌و ناخۆش.

**المَوْعُوثُ:** (رجل موعوث): پیاوێکی هەتیومچەو ناوە جاخزادەیە.

**الوَعْثُ:** هەرشتێك نەرم‌و ئاسان بێ ٥ شوێنێك لمبەڵان یان نەرمەخاك یان قوڕ بێ کەفاج تێیدا رۆچێ ٥ رێگای بەردەڵان‌و ناخۆش ٥ هەرکارێك ناخۆش‌و برست بڕبێ ٥ ئێسقانی شکاو ٥ جەستەی کزو لاواز ٥ دەشگوترێ: (رجل وعث اللسان): پیاوێکی لاڵە پەتەپەو ناتوانێ قسە بکا.

**الوَعِثُ:** رێبازی ناخۆش.

**الوَعْثاء**: مانـدو بـون‌و نارەحـەتی‌و جورتم ٥ دەگوترێ: (أعوذ بالله من وعثاء السفر): پەنا بەخوا لەنارەحەتی‌و شەکەتی سەفەر چەند ناخۆش‌و بڕست بڕە.

**الوَعْثةُ من النساء**: نافرەتی قەڵەو ٥ دەگوترێ: (إمرأة وَعْثة الأرداف): نافرەتێکە سمت‌و کەفەڵ نەرمە ٥ دەستی شکاو.

**الوُعُوثُ**: تەنگ‌و چەڵەمەو ناخۆشی‌و شەڕو هەرا.

**وَعَدَهُ الأمرَ وبه وَعْداً وعِدةً**: وادەی کارەکەی پێدا، هیوا خوازی کرد بۆئەوشتە.

**وَعَدَ فلاناً**: لەفلانکەس زیاتر پابەندی وادەو بەڵێن بوو ٥ دەگوترێ: (واعَدَهُ فوعَدَهُ): وادەی دایێ‌و لەوزیاتر پابەندی وادەو بەڵێن بوو.

**أوعَدَ الفَحْلُ**: کەڵەنێرەکە حیلکاندی مراندی زەڕاندی بۆڕاندی کاتێک ویستی مێیەکە کەڵ بدا.

**أوعَدَ فلاناً**: وادەی بەفلانکەس دا، هەڕەشەی لەفلانکەس کرد.

**واعَدَهُ**: هەریەك لەو دوانە وادەیان بەیەکتر دا ٥ پێشبڕکێیان کرد لەوادەو بەڵێندان بەیەکتری.

**واعَدَ فلاناً وقت كذا**: بەڵێنی بەفلانکەس دا لەکاتی فلان شت دا ئەرکی سەرشانی خۆی بۆ جێ بەجێ بکا.

**إتَّعَدَ**: وادەکەی قبوڵ کردو بتمانەی پێ دا ٥ دەگوترێ: (وَعَدَهُ فاتَّعَدَ).

**إتَّعَدَ القومُ**: خەڵکەکە بەڵێنیان بەیەکتردا.

**اتَّعَدَ فلان فلاناً**: فلانکەس هەڕەشەی لەفلانکەس کرد ٥ (تَوَاعَدوا): خەڵکەکە هەندێکیان وادەیان بەهەندێکیان دا.

**تَوَعَّدَهُ**: هەڕەشەی لی کرد.

**المَوْعِدُ**: وادەو بەڵێن ٥ شوێنی وادە ٥ کاتی وادە ٥ عەهدو پەیمان.

**الموعود**: (اليوم الموعود): رۆژی قیامەت.

**الميعاد**: کاتی وادە، شوێنی وادە ٥ (ك: مواعيد).

**الواعِدُ**: دەگوترێ: (فَرَسٌ واعِد): ئەسپێکە بەڵێن دەدا لەڕۆیشتن‌و غاردان نەوەستێ ٥ (أرض واعِدة): زەوییەکە هیوای ئەوەی لێ دەکرێ خێرو بێری زۆربێ‌و بەرو بوومی باش بێ.

**الوعيد**: (يوم الوعيد): رۆژی قیامەت.

**وَعَرَ المكان وغيره يَعِرُ وَعْراً**: شوێنەکە بەردەلان‌و چەقەن‌و ڕەقەن بوو ٥ پتەو ڕەق بوو.

**وَعَرَ فلاناً**: فلانكەسی بەند كرد.

**وَعُرَ الشَّيْءِ**: شتەكە كەم بوو ٥ (فهو وعِر).

**وَعِرَ المكانُ وغيره يَوْعَرُ وَعْراً**: شوێنەكە ڕەق‌و پتەو بوو.

**اوعَرَ**: كەوتە ناو زەوی بەردەڵان‌و چەقەن‌و ڕەقەنەوە.

**اوْعَرَ فلان**: فلانكەس هەژار بوو.

**اوْعَرَ الطريقَ بفلان**: ڕێگاكە فلانكەسی گەیاند بەشوێنێكی ڕەقەن‌و چەقەن.

**اوْعَرَ الشَّيْءِ**: شتەكەی كەم كردەوە.

**اوعَرَ الطريقُ**: ڕێگاكەی بەپڕ كۆسپ‌و تەگەرە هاتە بەرچاو.

**وَعَّرَ المكانَ**: شوێنەكەی بەردەڵان‌و چەقەن‌و ڕەقەن كرد.

**وَعَّرَ فلاناً**: فلانكەسی گێڕایەوەو نەیهێشت بەمراز بگا ٥ قسەكەی بڕی.

**تَوَعَّرَ فلان**: فلانكەس توند ڕەوی كرد.

**تَوَعَّرَ المكانُ**: شوێنەكە ڕەقەلان بوو.

**تَوَعَّرَ الأمْرُ على فلان**: كارەكە لەسەر فلانكەس گران بوو دەرەقەتی نایە.

**تَوَعَّرَ في الكلام**: لەقسەكردن دا سەرسام بوو.

**تَوَعَّرَ فلان فلاناً في الكلام**: فلانكەس فلانكەسی لەقسەكردن دا سەرسام كرد.

**اسَوْعَرَ الطريق والمكانَ**: ڕێگاكەی بەپڕ كۆسپ‌و تەگەرە زانی.

**الأوْعَرُ**: بەردەڵان‌و پڕكۆسپ‌و تەگەرە ٥ دەگوترێ: (طريق اوْعَرُ).

**الواعِرُ**: شوێنی چاڵ‌و پڕكەندو لەند ٥ پێچەوانەی مانای (السهل) دێ ٥ دەگوترێ: (جبل واعِرٌ): كێوێكی سەخت‌و ئەستەمە.

**الوَعْرُ**: شوێنی سەخت‌و پتەو ٥ شوێنی ترسناك ٥ دەشگوترێ: (رجل وَعْرُ المعروف): پیاوێكە عەطاو بەخششی كەمە.

**الـوَعِرُ**: بەمانا (الـوَعْرُ)دێ ٥ (ك: أوعار).

**الوَعِيرُ**: بەمانا (الوَعْرُ)دێ.

**وَعَزَ اليه في الأمر يعز وَعْزاً**: چو بۆلای‌و فەرمانی پێ كرد ئەو ئیشە بكا یان پێی گوت وازی لێ بێنە.

**اوعَزَ اليه**: فەرمانی پێ كرد بەكردنی كارێك، یان نەكردنی.

**وَعَّزَ اليه**: بەمانا (وَعَزَ)دێ.

**وَعَسَه يعسه وَعْساً**: بەتوند پێی پیانا.

**وَعَسَ الدهرُ فلاناً**: ڕۆژگار فلانكەسی لەبۆتە داو قاڵی كرد.

**اوعَسَ**: شوێن پێی هەڵگرت لەناو

لبەڵانەکەدا ٥ بەیانی زوو ڕۆیی.

**اوعَسَتْ الإبلُ:** حوشترەکە ملی خۆی درێژ کرد هەنگاوەکانی فراوان کردنو خێرا ڕۆیشت ٥ دەشگوترێ: (أوعَسَت الإبلُ بأعناقها): حوشترەکە ملی خۆی درێژکردو خێرا ڕۆیی.

**واعَسَت الإبلُ:** بەمانا (أوعَسَت)دێ ٥ بەتوندی قاچی بەزەوی دادا، پێکۆڵی کرد.

**واعَسَ فلان فلاناً:** فلانکەس پێشبڕکێی لەگەڵ فلان دا کرد.

**الأوْعَسُ:** دەشتی لباویو نەرمەلان کەقاچی تێیدا ڕۆچێ.

**الميعاس:** دەشتێکی لبەلان کەلبەکەی تەباری نەبەستبێ لبەلانێك کە قاچ تێیدا ڕۆبچێ ٥ قاچی تێدا گوم ببێ ٥ زەوییەك کەلەوەپێش پێخوست نەکرابێ ٥ ڕێگا.

**الوَعْسُ:** شوێن پێو نیشانەی پێدا ڕۆیشتن ٥ بەمانا (الأوعس)دێ ٥ (ك: أوعُسٌ وأوعاس).

**الوَعساء:** مێینەی (الأوعس) ٥ زەوییەك نەرم بێو کەمێك لبەلانی تێدابێ، وەکێ بەباشی لی بڕوێ ٥ دەشتێك لبەلانی نەرم بێ قاچی تێچەقێ.

**الوَعْسَةُ:** بەمانا (الأوعس)دێ.

**وَعَظَهُ يعظه وَعْظاً وَعِظةً:** ئامۆژگاریی کردو لەسەرەنجامی خراپەکاریی ترساندی ٥ فەرمانی پێ کرد بەچاکە کردنو تەماعی خێرو خۆشی دوا ڕۆژی بەرنا.

**إتَّعَظَ:** قبوڵی ئامۆژگاری کردو فەرمانبەرداری ئامۆژگاری بوو، نەفسی خۆی گرتەوە لەخراپە ٥ دەگوترێ: (وَعَظَهُ فَتَعَظَ): ئامۆژگاری کردو ئەویش ئامۆژگارییەکانی وەرگرتن.

**المَوْعِظَةُ:** ئەوەی ئامۆژگاری پێ ئەنجام دەدرێ کردەوە بێ یان گوفتار بێ ٥ (ك: مَوَاعظ).

**الوَاعِظُ:** کەسێك ئامۆژگاری دەکاو شت وەبیر گوێگرانی دێنێتەوەو فەرمان دەکا بەچاکەو نەهی دەکا لەخراپە ٥ (ك: وُعَاظ).

**وَعَفَ بَصَرُهُ يَعِفُ وعوفاً:** چاوی زەعیف بوو، کز بوو.

**اوعَفَ الرَّجُلُ:** پیاوەکە چاوی کزبوو.

**الوَعْفُ مِنَ الأرض:** هەرشوێنێکی زەوی کەڕەق بێو ئاوی تێدا ڕاوەستێو ببێتە زۆنگاو.

**وَعَقَ الفَرَسُ يَعِقُ وَعْقاً ووعيقاً:** ئەسپەکە لەکاتی ڕۆیشتنی دا دەنگ لەورگی هات، قۆڕەی سکی هات.

**وَعِقَ عليه يَعِقُ وَعْقاً:** پەلەی کرد.

**وَعُقَ**: چەموش بوو.

**وَعُقَ فلاناً**: فلانکەسی نیسبەت دا بۆ چەموشیو سەر ڕەقی ٥ تێکی دا خۆی خراپ کرد ٥ پێچەوانەی ئەو جولایەوە.

**تَوَعُّقَ**: سەر ڕەقو ڕەوشت خراپو سەرپێچی کەر بوو.

**اسْتَوْعَقَ**: بەمانا (تَوَعَّقَ)دێ.

**الوُعاق**: دەنگێکە لەورگی ولاخ دەبیسرێ لەکاتی رۆیشتنی دا.

**الوَعِقُ**: مرۆڤی بەدڕەوشت ٥ دەگوترێ: (رجل وَعْقٌ).

**الوَعِقُ**: دەگوترێ: (رجل وَعِق): پیاوێکی ڕەوشت ناشیرینە ٥ مرۆڤی چەقە چەق کەر.

**الوَعْقَةُ**: بەدڕەوشتی ٥ چەموشی ٥ سەرڕەقو قسە نەبیس.

**الوَعِقَةُ من الرجال**: بەمانا (الوَعْقَةُ)دێ.

**الوعیق**: دەنگێکە لەورگی ولاخ دەبیسرێ لەکاتی رۆیشتنی دا.

**وَعَكَ الحرُّ یَعِكُ وَعْكاً وَوَعْكَةً**: گەرما بەتین بوو.

**وَعَكَت الریحُ**: بایەکە هێواش بوو.

**وَعَكَ فلان**: فلانکەس لەناکامی ماندو بون دا توشی ئازار بوو.

**وَعَكَت الکلابُ الصَّیْدَ**: سەگەکان نێچیرەکەیان لەگڵو خۆڵ وەردا.

**وَعَكَ المرضُ فلاناً**: نەخۆشی فلانکەسی ئازاردا ٥ دەگوترێ: (وعکتە الحُمَّی): لەرزوتا ئێشی پێ گەیاند.

**وَعَكَ الشَّیْئ في التراب**: شتەکەی لەگڵو خۆڵ وەردا.

**وَعَكَ الشَّیْئ**: شتەکەی کوتا ٥ بەیەکی کێشان.

**اوعَكَت الإبلُ عند الحوض**: حوشترەکان لەسەر حەوزەکە پاڵە پەستۆیان کردو چوونە سەریەك.

**اوعَكَ فلان الشَّیْئ**: فلانکەس شتەکەی لەگڵ وەردا.

**اوعَكَ الکلابَ الصید**: سەگەکان نێچیرەکەیان لەگڵو خۆڵ وەردا.

**الموعوك**: لەرزو تادار ٥ لەش بەئازار.

**الوَعْكَةُ**: هەوای کەمو گەرمای توند ٥ لەرزو تا لێ هاتنو وەشەقەتۆڵە خستنی نەخۆشەکە ٥ شەڕی پاڵەوانان کەیەکتر دێننو دەبەنو بەکتر بەزەوی دادەدەن ٥ قاچ بەزەوی کێشانی بەهێز لەکاتی غاردان دا.

**وَعَلَ یَعِلُ وَعْلاً**: بەسەریا ڕوانی.

**تَوَعَّلَ الجبَلَ**: چووە سەر کێوەکە ٥ دەشگوترێ: (توعَّلَ مصاعد الشرف): چووە سەر پەیژەو شوێنی بڵندی شەرەفو شکۆمەندی.

**استوعَلَ الیه**: پەنای بۆبرد.

**استَوعَلَ الأوعالَ:** حەیوانە کێوی‌و نێریە کێوییەکان چوونە سەر لوتکەی کێوەکان.

**المُستَوعَلُ:** کونە شاخی حەیوانە کێوی، شوێنی تێدا حەوانەوەی حەیوانە کێوی لەئەشکەوتە ساخی عاصیّ‌و بەرزایی دا.

**الوَعْلُ:** نێریە کێوی (نێری بزنە کێوی) ٥ شەریف‌و نەجیب زادە ٥ پەناو مەلجەئو شوێنی ئەمین ٥ دەشگوترێ: (هم علینا وَعْلٌ واحد): ئەوان لەدژی ئێمە کۆك‌و یەك هەڵوێستن هەروا دەگوترێ: (مالك عنە وَعْلٌ): تۆلەو شتەدا هیچ مەجالێکت نییە ٥ هەردەبێ ئەوەبێ.

**الوَعِلُ:** نێریە قەرەی کێوی.

**الوَعْلَةُ:** لوتکە شاخی سەراسەری کێو ٥ ئەشکەوت‌و شوێنی سەخت‌و عاصیّ لەناو کێودا ٥ پەخەی کراس ٥ هەنگڵی گۆزەو دیزەو مەسینەو شتی وا.

**وَعَمَ بالخبر يَعِمُ وَعْماً:** بەگشتی هەواڵەکەی داو ڕونی نەکردەوە.

**وَعَمَ الديارَ:** دوعای ئاوەدانی بۆ وڵاتەکە کرد ٥ (أنعِمي أيها الديار).

**الوَعْمُ في الجبل:** دەمارە شاخ‌و توێسکە گڵێکە لەکێودا ڕەنگی لەوەی تر جیایە ٥ (ك: وعام).

**وَعُنَتِ الدوابُ:** وڵاخ‌و ئاژەڵەکان قەڵەو بوون.

**تَوَعَّنَتِ الدوابُ:** وڵاخ‌و ئاژەڵەکان گەیشتنە ئەوپەڕی قەڵەوی.

**تَوَعَّنَ فلان الشَّئ:** فلانکەس شتەکەی وەرگرت‌و خستیە شوێنی شیاوی خۆی.

**الوعَانُ:** کۆی (الوَعَنُ والوعنة): بریتییە لەدەمارە شاخ‌و توێسکە گڵ‌و چینە خاك لەکێودا کەلەوەی تر جیابێ‌و شوێنکەی خۆی هەبێ.

**الوَعْنُ:** پەناگاو مەلجەئو شوێنی حەوانەوە ٥ زەوی ڕەق‌و پتەو.

**الوَعْنَة:** زەوی ڕەق‌و پتەو ٥ سپی خاکێك کەهیچی لی نەڕوێ.

**وَعْوَعَ الكلبُ:** سەگەکە وەڕی، لوراندی.

**وَعْوَعَ القومُ:** خەڵکەکە کەوتنە غاڵ‌و بوغڵ‌و چەقەو هەرا.

**وَعْوَعَ فلان القومَ:** فلانکەس خەڵکەکەی هێنایە عامێلکەو تەنگی پێ هەڵچنین.

**الوَعْواعُ:** قیڕەو هەرای خەڵکە ٥ هەر دەنگ‌و قیڕەو هەرایەك تێکەڵ بێ ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد کە بکەونە غەڵبە غەڵب‌و هەراو هوریا ٥ چەقە

چەناو زۆر بڵێ ٥ دیدەبان ٥ ئازاو
چاونەترس ٥ یەکەم پێشمەرگەو
جەنگاوەر کەفرپای هاوەڵانی
تێشکاو لەشەڕدا دەکەوێ.

**الوَغْوَغُ**: چەقەڵ ٥ ڕێوی ٥ خەتیبی
زمانڕەوان ٥ پیاوی زەعیفو لاواز ٥
سارای کاکی بەکاکی.

**الوَغْوَغَةُ**: وەڕەو مڕەو لورانەوەی
سەگو گورگو ڕێوی.

**الوَغْوَغِيُّ**: پیاوی مەردو ئازاو
شکۆمەندو چاونەترس.

**وَعَى العَظْمُ يعى وَعْياً**: ئێسقانەکە
بەخواری گرتیەوە.

**وَعَى الجُرْحُ**: برینەکە کێمی لێ ڕۆیی ٥
برینەکە لەسەر پیسیو کێم دەمەکەی
وێکهات بۆوە.

**وَعَت المِدَةُ في الجرح**: کێمو زوخاو
لەبرینەکەدا کۆبۆوە.

**وَعَى الشَّيْءَ**: شتەکەی لەکیسەو
حاجەتێك دا کۆکردەوە.

**وَعَى الحديثَ**: فەرمودەکەی لەبەرکرد
بەباشی خستیە مێشکی خۆیەو لێی
حاڵی بوو.

**وَعَى الأمْرَ**: کارەکەی لەسەر حەقیقەتی
خۆی زانی.

**أوعى الشَّيْءَ**: شتەکەی خستە شوێنی
خۆیو پارێزگاری کرد.

**أوعَى الحديثَ**: فەرمودەکەی
لەبەرکرد.

**أوعَى فلان وعليه**: ڕزقو ڕۆژی فلانی
کەم کردەوە.

**أوعَى جَدْعَه**: لوتی بڕی.

**استوعى الشَّيْءَ**: هەموو شتەکەی
هەڵگرت ٥ دەگوترێ: (استوعى من
فلان حَقَّهُ): هەموو مافی خۆی
لەفلان وەرگرتەوە.

**استوعى جَدْعَهُ**: هەموو خۆراکەکەی
داپێی.

**المَوْعِيُّ**: دەگوترێ: (هو موعِي الرسغ):
قوڵو قاچ ئەستورو پتەو.

**الواعِيةُ**: دەگوترێ: (أذنٌ واعيةٌ):
گوێچکەیەکی بیسەرە ٥ دەنگو
شینو ڕۆڕۆ لەسەر مردو.

**الوِعَاءُ**: زەرفو حاجەت کەشتی
تێدەکرێ ٥ (ك: أوعية).

**الوَعْيُ**: زانینو لەبەرکردنو
مەزندەکردن ٥ تێگەیشتن دەرك
کردنی شت بەرێكو پێکی.

**الوَعى**: غەڵبە غەڵبو بگرەو بەردە.

**الوَعِيُّ**: شەرعزانو تێگەیشتوو
لەنابینو عاقڵمەند.

**الوَعِيَّةُ**: مێینەی (الوَعِيُّ)ە ٥ هەمبانەو
تێشوودان ٥ بڕێو کە هەڵبگیرێ
لەکیسو جەڕەو گۆزەدا.

**وَغُبَ الجَمَلُ يَوْغُبُ وُغُوبةً:** حوشترەکە گەورەو کەتە بوو.
**الوَغْبُ:** چروکی بەدڕەوشت، جەستە لاواز ◦ گێل‌و ئەحمەق ◦ حوشتری کەتەو زەبەلاح ◦ کاڵای پڕوپوچ‌و بێ نرخ.
**الوَغْبَةُ:** گێل‌و ئەحمەق.
**وَغَدَ القومَ يَغِدهم وَغْداً:** خزمەتی خەڵکەکەی کرد.
**وَغُدَ يَوْغُدُ وغادةً:** خوێڕی‌و هەتیومچەو ناپیاوو کاڵفام بوو ◦ جەستەی لاواز بوو ◦ بەنانە سکی خزمەتی خەڵکی کرد ◦ بەری باینجان ◦ (ك: أوغاد ووِغدان).
**وَغَرَت الهاجِرَةُ تغِرُ وَغْراً:** نیوەڕۆیەکەی زۆر گەرم بوو.
**وَغِرَ فلان:** فلانکەس پڕ بوو لەحیقدو کینەو ڕق‌و غەزەب.
**وَغِرَ صَدْرُهُ عليه:** ڕقی لێ هەڵساو چاوی لێ سورکردنەوە.
**وَغَرَت الشمسُ فلاناً:** تیشکی خۆ تینی بۆ فلانکەس هێنا.
**وَغِرَ فلان فلاناً غِرَّةً:** فلانکەس وادەی دا بەفلان.
**اَوْغَرَ القومُ:** خەڵکەکە کەوتنە کاتی گەرماو توند بوونی تینی تیشکی خۆر.
**اوغَرَ فلانٌ فلاناً:** فلانکەس ڕقی لەفلان بوو.
**اوغَرَ صَدْرَ فلان:** دڵ‌و دەروونی فلانکەسی پڕکرد لەڕق‌و کینەو ئاگری پێ گرت.
**اوغَرَ الماءَ:** ئاوەکەی گەرم کردو هێنایە کوڵین.
**اوغَرَ اللَبَنَ:** شیرەکەی گەرم کردو خواردیەوە.
**اوغَرَ الخنزير:** ئاوی بۆ بەرازەکە کوڵاندو بەرازەکەی بەزیندویی تێ هەڵکێشا ئەمجار سەری بڕی.
**اوغَرَ فلاناً الأرض:** زەوییەکی دا بەفلان بەبێ ئەوەی خەراجی لێ بسێنێ.
**اوغَرَ فلاناً بكذا:** فلانکەسی ناچارکرد بۆئەوەی پەنا بەفلان ببا.
**وَغَّرَهُ:** پڕی کرد لەحیقدو کینە.
**وَغَّرَ اللبنَ:** بەمانا (أوغَرَه)دی.
**تَوَغَّرَ:** بەڕق‌و قین پڕبوو.
**الميغَرُ:** شوێن‌و کاتی شت.
**الوَغْرُ:** حیقدو کینەو ڕق ◦ دوژمنایەتی‌و دژایەتی ◦ غەڵبە غەڵب‌و هەراو هوریای سوپا.
**الوَغْرَةُ:** جەنگەو چرقەی گەرما.
**الوَغِيرُ:** گۆشت بەبەردی گەرم‌و لبی گەرم ببرژێندرێ ◦ شیر بکوڵێندرێ‌و

بخورێتەوە ٥ شیر بەردی گەرمی تێ بخرێو پاشان بخورێتەوە.

**الـوَغِيرَة**: شـیر بەبـەردی گـەرم گـەرم بکرێو بخورێتەوە.

**وَغَفَ یغف وَغْفاً**: پەلەی کردو بازی دا.

**وَغَـفَ البـصرُ وَغْفـاً**: بینینـی کـزو لاواز بوو.

**وَغِفَ البـصرُ یوغِـفُ وَغْفاً**: بینینـی کـز بوو.

**اوْغَفَ**: بینینی کز بوو ٥ پەلەی کـردو بـازی دا، بەشـێوە رۆیـشتنێك رۆیـی ماندوبوو تێدابوو.

**اوغَفَ الطائرُ**: باڵندەکە باڵی لێك دان بۆئەوەی تیژ تێپەڕێ.

**اوعَفَ الکلبُ**: سـەگەکە حەپـە حـەپی کرد.

**اوعَـفَ فـلان**: فلانکـەس بەئەنـدازەی پێویست لەخواردنەکەی خوارد.

**الوَغْـفُ**: پارچــە چەرمێـــکە یـــان قوماشێـکەی لەبـەر ورگـی نێـری دەبەسترێ بۆئەوەی نەپەڕێ.

**وَغَلَ في الشَّيْءِ یغِلُ وغولاً**: لەشـتەکە دا قوڵبـۆوە چـووە ناوییـەوە ٥ دەگـوترێ: (أوغــل في الــسیر): کەوتــە رۆیـشتنو گـەرم بـوو لەڕۆیـشتن دا، دەشـگوترێ: (اوغَلَ في الشجر): چووەناو لقو پـۆپی درەختەکەوەو خۆی حەشاردا.

**اوغَـلَ علـی القـوم في شـرابهم وغـلاً**: لـــەکاتی خواردنـــەوە دا چـــووە ســـەرمێزی خەڵکەکـــەو لەگـــەڵی خواردنــەوە بــەبێ ئــەوەی بــانگ کرابێ ٥ هەروا وشەی (أوْغَلَ) بەمانا رۆیشتنو دوورکەوتنەوەدێ.

**اوغَـلَ في الـبلاد**: چـووە نـاو قـولایی وڵاتەکـــەوە ٥ زۆر چـــووە نـــاوەوە لەســـــنوور دوورکەوتـــــەوە ٥ دەشـــگوترێ: (اوغَـــلَ في العلـــم أو الدین): زۆر رۆچووە لـەعیلم دا یـان لــەئایین دا زێــدە ڕۆیــی کــردوە ٥ لەحەدیـثدا هاتووە: (إن هـذا الـدین متین فأوغَلَ فیه برفق).

**اوْغَلَ في الـسیر**: لەڕۆیـشتن دا پەلـەی کـــردو کەوتـــە ڕەوتو درێـــژەی بەڕۆیشتنەکەی دا.

**اوغَلَـت الحاجـةُ فلانـاً في کـذا**: پێویستیو ئاتاجی فلانکەسی خستە ناو ئەو ئیشەوە.

**تَوَغَّـلَ في الـبلاد**: چـووە نـاو قـولایی وڵاتــەوە ٥ دەشــگوترێ: (تَوَغَّـــلَ في العلم او الدین): چووە نـاو زانیاریو تێیـدا قوڵبـۆوە یـان لـەئایین دا زۆر رۆچو.

**الوَاغِلُ**: کەسێکە بەبێ بـانگ لێـکردن بچێتە سەر سفرەو خوانی خـەڵکیو بخواو بخواتەوە.

**الوَغْلُ**: کەسێکە بچێتە سەر سفرەو خوانی خەڵکی‌و بانگ نەکرابێ یان ناوە بۆ ئەو شلەمەنی‌و شەرابەی کابرای خۆتێهەڵقورتێن دەیخواتەوە ٥ پیاوی لاوازو خوێڕی‌و هیچ لەدەست نەهاتوو فاشیل لەهەموو شتێک دا ٥ مرۆڤی بەدخۆراك ٥ درەختی چڕو پڕ ٥ دانەوێڵەی تێکەڵبوو بەگڵ‌و خۆڵ کە کۆترو باڵندەی تر چینەی تێدا دەکەن‌و دەیخۆن.

**الوغِلُ**: بەدخۆراك ٥ نارەسەن‌و بێ بناغە بۆخۆی نەژادو بنەچەی بۆخۆی هەڵبەستووە.

**وَغَمَ بفلان يَغِمُ وَغماً**: هەواڵێکی بێ ڕاگەیاند کەلێکۆڵینەوەی پێویستی تێدا نەکردبوو.

**وَغَمَ بالخبر**: هەواڵێکی دا بەهاوەڵەکەی کەلێی مەعلوم نەبوو ئاخۆ ڕاستە یان درۆ.

**وَغَمَ الى الشَيْئ**: گومانی بۆشتەکە چوو.

**وَغَمَ فلاناً**: قاری لەفلان گرت‌و لێی نارازی بوو.

**وَغَمَ عليه يَوْغَمُ وَغَماً**: رق‌و کینی لی هەڵگرت.

**اوغَمَهُ**: رقی هەڵسان، خەفەتی پێدا.

**تواغَمَ القوم**: خەڵکەکە شەڕیان کرد، کەوتنە بەرامبەری‌و لێک راسان‌و هەڕەشە لەیەك کردن.

**تَوَغَّمَ عليه**: رقی لێ هەڵگرت.

**تَوَغَّمَ القومُ**: خەڵکەکە شەڕیان کردو کەوتنە بەرامبەری‌و لێك ڕاسان.

**الوَغْمُ**: ئەحمەق‌و گێل ٥ رق‌و کینە ٥ شەڕو جەنگ ئەوەی لەکاتی نان خواردن دا دەکەوێتە ئەملاو ئەولای سفرەی نان خواردن لەوردە نان‌و پارچە پارچەی خواردنەکەو دەنك‌و وردەو پەردەی جۆراو جۆر ٥ (ك: أوغام ووغوم).

**الوَغْيُ**: قیڕەو هەراو هوریا ٥ شەڕ، لەم ڕووەوە کە هەراو هوریای تێدایە.

**الوَغْى**: بەمانا (الوَغْيُ) دێ ٥ ویزەی هەنگ‌و مێشولەو شتی وا لەکاتی کۆبونەوەیان دا.

**وَفَدَ على القوم والیهم (يفِدُ وَفْداً)**: چووە لای قەومەکە بەنوێنەرایەتی ٥ بەشێوەی نێردراو چوو بۆلایان.

**اوفَدَ**: پەلەی کرد.

**اوفَدَ الشَيْئُ**: شتەکە بەرز بوو ڕێزی پەیدا کرد.

**اوفَدَ الرِّئْمُ**: ئاسکەکە سەری بەرز کردەوەو گوێچکەی قوت کردن.

**اوفَدَ الشَيْئَ**: شتەکەی بەرز کرد، هەڵی ستاندەوە.

**اوفَدَ فلاناً على الأمير واليه:** بەنوێنەر فلانکەسی نارد بۆ لای ئەمیر.

**وافَدَهُ على الامير:** لەگەڵی دا چوو بۆلای ئەمیر.

**وَفَّدَهُ على الأمير واليه:** بەنوێنەرایەتی ناردی بۆلای پاشا.

**توافد القوم عليه:** خەڵکە بەشێوەی شاندو نوێنەر هاتنە لای فلان.

**تَوَفَّدَ عليه:** بەسەریا ڕوانی، چاودێریی کرد.

**استوفَدَ في قِعْدَتِهِ:** لەشوێنی خۆی بەرز بۆوە، ڕاست بۆوە.

**استوفد فلاناً:** داوای کرد فلان کەس بێتەلای یان شاندێکی بەنوێنەرایەتی خۆی نارد بۆلای یەکێك.

**الأوفاد:** دەگوترێ: (نحن على أوفاد قد أشخصنا): ئێمە لەسەر سەفەرێکین کە توشی دڵەڕاوکێ بووین.

**الوافِد:** بەرزایی‌و هەڵتۆقیو لە ڕومەت لەکاتی خواردن‌و جوینی شت دا کەبەهۆی خواردنی ناو دەمی ڕومەتی هەردولا بەرز دەبنەوە.

**الوَفّاد:** کەسێك زۆر وەفد بنێرێ.

**الوَفْدُ:** کۆی (الوافِد)ە واتە: کۆمەڵی هەڵبژێرراو بۆ پێشوازیی لەپیاو ماقوڵ‌و کەسانی خاوەن پایە.

**وَفَرَ الشَيْئُ:** شتەکە زۆر بوو، بەرفراوان بوو، دەگوترێ: (وَفَرَ عِرْضُهُ): زۆر بە ناموس‌و خاوەن هەڵوێست بوو.

**وَفَرَ لفلان المالَ والمتاعَ وَفْراً:** ماڵ‌و کاڵای بۆ فلانکەس زۆر کرد.

**وَفَرَ عِرضَ فلان:** ناموسی فلانکەسی پاراست.

**وَفَرَ فلاناً عَطاءَهُ:** بەخشش‌و عەطای بۆ فلان سەر لەنوێ دەست پێکردەوە، بۆی گێڕایەوە.

**وَفَرَ الثوبَ:** کراسەکەی بەپان‌و پۆڕی بۆ بڕی.

**وَفُرَ الشَيْئُ يَوْفُرُ وَفَارَةً:** بەمانا (وَفَر)دێ، دەگوترێ: (وَفُرَ عِرضُهُ): زۆر بەناموس‌و حیرص بوو.

**اوفَرَ الشَيْئَ:** شتەکەی زۆر کرد ٥ تەواوی کرد.

**وَفَّرَ الشَيْئَ:** شتەکەی زۆر کرد.

**وَفَّرَ الثَوْبَ:** بەپان‌و پۆڕی کراسەکەی بڕی.

**وَفَّرَ لفلان طعامَهُ:** خۆراکی بۆ فلان بەتەواوی دابین کردو هیچی لێ کەم نەکردەوە.

**وَفَّرَ لـه عِرْضَهُ:** ناموس‌و حەیای فلانکەسی پاراست جنێوی پێنەداو نەیشکاند.

**وَفَرَ عليه حَقَّهُ:** مافی خۆی لێ وەرگرتەوە.

**وَفَّرَ الله حظَّهُ من كذا:** خودا لەوشتە رزقی بەسەردا رشتووە.

**وَفَّرَ شَعْرَهُ:** قژو ریشی بەردایەوەو هیچی لێ نەقرتاند.

**اتَّفَرَ الشَيْئُ:** بەمانا (وَفُرَ)دێ.

**تَوافَرَ الشَيْئُ:** بەمانا (وَفُرَ)دێ.

**تَوَفَّرَ على صاحبه:** چاودێری ناموس‌و بەها پیرۆزەکانی هاوەڵەکەی کردو چاکەی لەگەڵ کرد.

**تَوَفَّرَ على الشَيْئ:** هەرچی هێزو توانای خۆی هەبوو لەوشتەدا چڕی کردەوە.

**استوفَرَ حَقَّهُ:** مافی خۆی لێ وەرگرت.

**استوفَرَ الشَيْئَ:** شتەکەی تەواو کرد.

**الموفور:** شتێك لەهەموو رویەکەوە تەواو کامڵ بێ، دەگوترێ: (جزاء موفور): پاداش‌و کرێیەك هیچی لێ کەم نەبووبێ.

**الوافِر:** بەحرێکە لەبەحرەکانی عەروز کێشەکەی دوجار (مفاعلتن مفاعلتن فعولن).

**الوافِرَة:** هەر بەزو پیوێك لەدرێژەوەبێ.

**الوَفْرُ:** دەگوترێ: (مال وَفْرٌ ومتاع وَفْرٌ): ماڵی زۆرو کاڵای زۆر ٥ دەوڵەمەندی ٥ تەواو لەهەرشتێك دا بێ.

**الوَفْراء:** پڕو لێوان لێو، دەگوترێ: (قِرْبَة وفْراء): گۆزەیەك یا کوپەیەکی پڕ ٥ (مَزادة وفراء): مەشکەیەکی تەواوەو هیچی لە پێستەکەی کەم نەبۆتەوە.

**الوَفْرَة:** یەکجار ٥ زۆرو زەبەندە ٥ قژی پڕو چڕی سەر یان قژێك هاتبێتە خوار نەرمایی گوێچکە ٥ (ك: وِفار).

**الوَفير:** بەمانا (الوافِرُ) دێ.

**وَفَزَ يَفِزُ وَفْزاً:** پەلەی کرد.

**وَافَزَهُ:** پەلەیان لەیەکتر کرد.

**تَوَفَّزَ لكذا:** خۆی بۆ ئەوە ئامادەکرد، دەشگوترێ: (بات يتوَفَّزُ على فراشه): شەو تا بەیانی لەسەرجێگای نووستنەکەی جینگڵی دا.

**إستوفَزَ:** بەشێوەیەك دانیشت کە وابزانی خەریکی هەڵسانە.

**إستَوْفَزَ في قعدته:** لەشوێنی خۆی راست بۆوە بەشێوەیەك شکی لەخۆی بێ.

**الوَفْزُ:** پەلەکردن ٥ (مکان وَفْز): شوێنی بەرز ٥ (ك: وِفاز).

**الوَفَزُ:** پەلەکردن ٥ (ك: أوفاز)، دەگوترێ: (لقيته على أوفاز):

بەشێوەیەکی عەجەلەو پەلە پڕوزە توشی بوم.

**وَفَضَ يفِضُ وَفْضاً**: بازی داو پەلەی کرد.

**وَفَضَت الإبلُ**: حوشترەکان بڵاو بوونەوە.

**اوفَضَ**: بەمانا (وَفَضَ)دێ.

**اوفَضَ لفلان**: بەڕەیەك یا حەسیرێك یا شتێکی وای بۆ فلان ڕاخست بۆئەوەی لەخشتو خۆڵی زەوییەکە بیپارێزێ.

**اوفَضَ الرجُلَ**: پیاوەکەی دەرکرد.

**اوفَضَ الإبلَ**: حوشترەکانی بڵاو کردنەوە.

**إستَوْفَضَ**: بەمانا (وَفَضَ)دێ.

**إستَوفَضَتْ الإبلُ**: حوشترەکان لە لەوەڕگاکەدا بڵاوبوونەوە.

**إستوفَضَ فلان**: فلانکەس لەترسان هەڵسڵەمییەوە.

**إستوفضَ فلاناً**: پەلەی لەفلان کرد ○ دەری کرد.

**الاوفاض**: زەعیفو لاوازو هەژارو بێ دیفاع.

**الميفاضُ**: چوستو چالاكو گورجو گۆڵ، دەگوترێ: (ثمامة ميفاض).

**الوفاضُ**: شوێنێك ناو بگرێتەوە ○ پێستێکە یا لبادێکە دەخرێتە ژێر بەرداشی ئاشەوە ○ (ك: وُفُضٌ).

**الوَفْضُ**: عەجەلەو پەلەکردن ○ (ك: أوفاضٌ).

**الوَفْضُ**: بەمانا (الوَفْضُ)دێ ○ چەپەرو بەرد کە قەصاب گۆشتی دەخاتە سەر بۆئەوەی لەگڵ نەکەوێ.

**الوَفْضَةُ**: یەکجار، جارێك ○ ئەو نوقرەو شوێنەی دەکەوێتە نێوان هەردولای سمێڵەوە لەخوار لوتەوە ○ هەمبانەیەکە شوان تێشوو پێداویستی خۆی تێ دەهاوێ ○ تیردانێك لەچەرم دروستکرابێ ○ (ك: وفاض).

**الوفاعُ**: دەسکی گۆزەو سوراحی ○ باڵەخانەی بەرز ○ هەرشتێك لەزەوی بەرز بێتەوە ○ هەورێك ئومێدی بارانی لێ بکرێ ○ (ك: أوفاع).

**الوَفَعُ**: دەگوترێ: (غلام وَفَعٌ): کوڕی تازە پێگەیشتوو.

**الوَفْعَةُ**: بەمانا (الوِفاعُ): دێ ○ حاجەتێکە لە پڕژی لقە دارخورماو شتی وا دروست دەکرێ وەکوو سەلەو سەبەتەو شتی وا ○ جۆرە پەڕۆو پیتاڵێکە ئاگری تێدا دەگوازرێتەوە لەم ماڵ بۆئەو ماڵ.

**الوَفَعَةُ**: دەگوترێ: (غلام وَفَعَة): کوڕێکی تازە پێگەیشتووە.

ميزان : ١ اللسان ٢ المحجم ٣ الكفة
ودعة
وتد
ميزاب
الوسطى
وتر
وسادة
متوسط المثلث
وتر المثلث القائم الزاوية
وزرة
وردية
وذمة الكلب
متوازي المستطيلات
كثير الوجوه
وتر الخط المنحني
ورد ذقراء
ورقة
وردة
ودقة
وزال
ورقاء
ورس
ورم
وناقية
وروار
ورشان
وزعبة
بنت وردان
وبر
ورل
ورنك
وزغة

**الوفيعة**: بەمانا (الوِفـاع) دێ ٥ جۆرە سـەلەو سـەبەتەیەکە لـەپرژی دارخورمـا دروسـت دەکـرێ ٥ پەرۆیەکـە نـووکی قەڵـەمی مەرەکەباوی پێ پاك دەکرێتەوە ٥ پەرۆیەکە ئافرەتی بێنوێژ بەخۆی هەڵدەگرێ ٥ پارچـە خورییەکـە ئاژەڵی گرویێی پێ چەور دەکرێ.

**وفِقَ الأمْرُ (یَفِقُ) وفقاً**: کارەکە دروست بـوو رێـك‌و پێـك بـوو بـەگوێرەی ویست‌و مەبەست بوو.

**وَفِقَ الأمْرَ**: کارەکەی واهاتە بەرچاو کە موافیقی ویست‌و مەبەستی ئەو بێ ٥ لەکارەکە حاڵی بوو.

**أوفـق القـوم لفـلان**: خەڵکەکـە لەفلانکەس نزیك بوونەوەو قسەیان دەربارەی ئەو یەکخست.

**أوفـق الإبـلُ**: حوشـترەکان ریزبـوون‌و بەیەکەوە وەستان.

**أوفَـقَ لفـلان لقاؤنـا**: بیـنین‌و کۆبونەوەمان لەگەڵ فلان رێکەوت‌و سودفە بوو.

**وافـق فـلان بـین الـشَّیْئَین موافَقَـةً ووفاقـاً**: فلانکـەس یـەکتر قبـوڵکردن‌و پێـکەوە نووسـانی لەنێوان دوو شتەکە دا ئەنجام دا.

**وافق فلاناً**: سودفەی فلانکەسی کرد.

**وافـق فـلان فلانـاً في الـشَّيْئِ وعليـه**: فـلان‌و فـلان لەسـەر شـتەکە کـۆك بوون.

**وفَّـقَ بـین القـوم**: ئاشـتەوایی خـستە نێوان خەڵکەکەوە.

**وفَّـقَ بـین الأشـیاء المختلفـة**: شـتە جوداوازیەکانی یەکخستن.

**وفَّـقَ اللهُ فلانـاً**: خـودا تـۆفیقی فلانکەسـی دا روی پـێ لـە کـاری خێرو سود ئامێز کرد.

**وفَّـقَ الله امـر فـلان**: خـودا کـاری فلانکەسی بەدڵی خۆی بۆ رەخساند چۆنی ویست خودا ئاوای بۆهێنا.

**اتَّفَـقَ مـع فـلان**: لەگـەڵ فـلان دا رێککەوت.

**إتَّفَـقَ الإثنـان**: ئـەو دووکەسـە لێـك نزیکبوونەوەو یەکیان گرت.

**توافَقَت الجماعَة**: کۆمەڵ رێککەوتن‌و رای خۆیان کرد بە یەك را.

**توافـق القـوم في الأمـر**: خەڵکەکـە دەربـارەی کارەکـە لێـك نزیکبوونەوە.

**تَوَفَّقَ فلان**: خودا تۆفیقی فلانکەسی داو شارەزای کرد بۆ رێبازی باش.

**اِسـتوفقَ اللهَ**: داوای تۆفیـق‌و سـەرکەوتنی لـەخودا کـرد ٥ دەشـگوترێ: (اسـتوفق لـە باحجـة):

لەبەلگە هێنانەوە دا سەرکەوتوو بوو مەبەستی پێکا.

**الإتّفاق**: لەبواری یاسای نێو دەوڵەتی دا بریتییە لە رێککەوتنێک لەنێوان دوو دەوڵەت دا لەناکامی نیزاعو کێشەیەکی نێوانیان، بڕیاردەدەن رێگاچارەی کێشەکەیان بەیاساو دانوسان یەکالآ بکەنەوە.

**الإتّفاقیة الدولیة**: بەڵگە نامەو عەهدو پەیمانێکە لەنێوان دوو دەوڵەت یان زیاتردا کە پەیوەندی هەبێ بە هەندێ کارو بارەوە، وەکوو باجو گومرگو پارەو گواستنەوەو کارکردنەوە.

**التّوافق**: لەبواری فەلسەفەدا ئەوەیە مرۆڤ رێگای کۆمەڵ بگرێتەبەرو خۆ لەرەوشتو کرداری شاز بپارێزێ.

**التّوفاقُ**: کاتی شت ە دەگوترێ: (أتَیْتُكَ لتوفاق الأمر): لەکاتی پەیدابوونی شتەکەدا هاتم بۆ لات.

**التَّوَفُّقُ**: دەگوترێ: (أتیتُكَ لتوفّق الهلال): لەکاتی دەرکەوتنی مانگی یەکشەوەدا هاتم بۆلات.

**التوفیق من الله للعبد**: تەوفیق دانی خودا بۆ بەندەی ئەوەیە رێگای شەری لێ بگرێو رێگای خێری بۆناسان بکا ە هەروا دەگوترێ: (أتیتُكَ لتوفیق الهلال): لەکاتی دەرکەوتنی مانگی یەکشەوەدا هاتم بۆلات ە لەبواری یاسای نێو دەوڵەتی دا بریتییە لەوە دەوڵەتێك هەوڵ بدا نیزاعی نێوان دوو دەوڵەت چارەسەر بکا.

**التّیْفَاقُ**: دەگوترێ: (أتیتُكَ لتیفاق الأمر): لەکاتی روودانی ئیشەکەدا هاتم بۆلات ە هەروا دەگوترێ: (البَیْت المعمور تیفاق الکعبة): بەیتولمەعمور لەبەهەشت دا بەرامبەری کەعبەیە.

**التّیْفَاق**: دەگوترێ: (أتیتك لتیفاق الهلال): کاتی دەرکەوتنی مانگی یەکشەوە هاتم بۆلات.

**المتَّفِقُ**: بەلای زانایانی عوروزەوە هێنانی وشەیەکی دەخیلو نارەسەنە بۆناو شیعر لەبەر ناعیلاجی.

**الوفاق**: لەبواری قانوونی نێودەوڵتی دا بریتییە لەزاراوەیەك کە بۆ زۆر رێکەوتننامەی نێودەوڵەتیو لەبواری جیاجیادا بەکار دەهێنرێ تەنانەت ئەگەر بەگۆڕینەوەی پیرۆزبایی لەیەك کردنو سەرەخۆشی کردن لەیەکتریش بێ.

**الوِفَاقُ المُعلَمْ:** ڕێککەوتننامەیەك کە ڕاسپێراوی دوولایەن واژۆی بکەن، تەنها پیتی یەکەمی ناوی واژۆکەرەکانی دەنووسرێ‌و ڕێککەوتنی سەرەتاییەو قۆناغی یەکەمی ڕێککەوتنی کۆتاییە.

**وفاق الأشراف:** ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتییە ئەو ڕێ‌و شوێنەی لەڕێککەوتنی تردا بەرچاو دەگیرێ لەم دا بەرچاو ناگیرێ، تەنها پشت بەشەرەف‌و ڕاستگۆیی دوو لایەنە واژۆکەرەکە دەبەسترێ.

**الوَفْقُ:** (وَفْقُ الشَيْئ): گونجاو بۆ شت ٥ دەگوترێ: (حلوبته وفق عياله): ئاژەڵە شیردەرەکانی بەئەندازەی خێزانەکەیەتی، شیرەکەیان بەشیان دەکا سەرومر ٥ هاوڕاو پێکەوە گونجاو، دەگوترێ: (جاء القومُ وَفْقاً): خەڵکەکە بەتەبایی‌و گونجاوی هاتن‌و هیچ کێشەیان نەبوو ٥ یان دەگوترێ: (كنت عنده وَفْق طلعت الشمس): ئەو کاتەی خۆرهەڵات من لای ئەو بووم.

**وَفَلَ الشَيْئَ (يفله) وفلاً:** توێکڵی شتەکەی داماڵی ٥ (فهو وافِل وهي وافِلة).

**وَفَّلَهُ:** سپی کرد ٥ توێکڵی لێ داماڵی.

**الوافِلُ:** پێگەیشتوو؛ دەگوترێ: (قصب وافِلٌ): قەفەزاژێکی کامڵ‌و پێگەیشتووە لەقۆناغی ناسکی تێپەڕیوە.

**الوَفْلُ:** شتی کەم.

**وَفَهَ يَوْفَهُ وَفهاً:** بوو بەچاودێری کەنیشتە.

**الوافِهُ:** چاودێرو لێ پرسراوی کەنیشتە ٥ حەکەم‌و ناوبژیکەر.

**الوِفَاهَةُ:** پیشەی چاودێری کەنیشتە.

**الوَفهِيَّةُ:** پلەی چاودێریی کەنیشتە ٥ لەحەدیث دا هاتووە: (لايُحرك راهب عن رهبانيته ولا وافِهٌ عن وَفهِيَتِهِ).

**وفِيَ الشَيْئُ (يفي) وفاءً:** شتەکە تەواو بوو ٥ دەگوترێ: (وفي ريش الجناح): پەڕو پۆڵی باڵەکە تەواو بوو.

**وفي الشَيْئُ وفياً:** شتەکە زۆر بوو.

**وفي فلان نَذْرَهُ:** فلانکەس نەزرو فۆتۆکەی خۆی جێ بەجێ کرد.

**وَفِيَ بعهده:** پابەندی وادەو بەڵێنی خۆی بوو ٥ دەشگوترێ: (وَفَتْ أذُنُهُ): ڕاستی ئەو هەواڵەی بیستبوی دەرکەوت.

**وَفَى الدِرهمَ والمثقالَ:** شتەکە بەرامبەری دیرهەمەکە یان مسقاڵە زێڕەکە بوو ٥ (فهو وافٍ وهي وافية).

**اوفى بالعهد والوعد:** بەمانا (وَفَى)دێ.

**أوفى على المكان وفيه:** بەسەر شوێنەکەی دا روانی.

**أوفى على المأة:** لەسەد زیاتر بوو، لەسەد تێپەڕی.

**أوفى القومَ:** هاتەلای قەومەکەو توشیان بوو لەگەڵیان کۆبۆوە.

**أوفى نَذْرَهُ وبه:** نەزرەکەی جێبەجێ کرد.

**أوفى الكيلَ:** پێوانەکەی بەتەواوی دایە.

**أوفى فلاناً حَقَّهُ:** مافی تەواوی دا بەفلان.

**وافى فلاناً:** لەناکاو توشی فلان بوو.

**وافى القومَ:** هاتە لای قەومەکە.

**وافى العامَ:** حەجی کرد ٥ مافی ساڵەکەی دا بەوە حەجی تێدا کرد.

**وَفّى فلاناً حَقَّهُ:** مافی فلانکەسی دا.

**تَوَفّى اللهُ فلاناً:** خودا فلانکەسی مراند.

**تَوَفّى فلانٌ حَقَّه:** فلانکەس مافی خۆی وەرگرت ٥ دەگوترێ: (توفيت منه مالي): ماڵی خۆم هەموو لێ ستاند.

**تَوَفّى المُدَّةَ:** گەیشتەکاتی خۆی ٥ ماوەکەی تەواو کرد.

**تَوَفّى عدد القوم:** هەموو خەڵکەکەی سەر ژمێر کرد.

**استوفى فلان حَقَّهُ:** فلانکەس مافی خۆی بەتەواوی وەرگرت ٥ دەگوترێ: (استوفى منه ماله): ماڵی خۆی هەموو لێ وەرگرت.

**المِيفى:** بەرزاییەك لەزەوی ٥ کورەی خشت سورکردنەوە.

**المِيفاءُ:** خاوەن وەفاو وادەو بەڵێن.

**الوافي:** دیرهەمێكو چوار دانقە ٥ هەروا ناوە بۆ شیعرێك هەموو بەشەکانی خۆی تەواو بن‌و کەم‌و کورتی تێدا نەبێ.

**الوافية:** ناوێکە لەناوەکانی سورەتی (الفاتحة).

**الوَفَاةُ:** مردن.

**الوَفْيُ:** شوێنی بەرزی زەوی سەر تەپۆڵکە.

**الوَفِيّ:** تەواوو کامڵ ٥ زۆر خاوەن وەفا ٥ ئەوکەسەی مافی هەموو کەسی لەبەرچاوەو مافی خۆیشی وەردەگرێ.

**وَقَبَت الشمسُ وغيرها من النجوم تَقِبُ وَقْباً:** خۆرئاوابوو.

**وَقَبَ القَمَرُ:** مانگ چووە حاڵەتی گیرانەوە ٥ مانگ گیرا.

**وَقَبَ الظلام على الناس:** تاریکی هاتە ناوەو خەڵکی داپۆشی.

**وَقَبَ عيناه:** چاوی بەقوڵا چوون.

**أوقَبَ:** برسی بوو.

اوقَبَ النخلُ: هێشوە خورماکە رزی، بۆنی کرد.

اوقَبَ الشَّيْئَ: شتەکەی خستە کونێکەوە.

الأوقاب: قوماشی خێمەو کەژاوەو کەرەسەکەیان.

الميقابُ: پیاوێك زۆر بیرەو شلەمەنی تری وەکوو ئاو بخواتەوە ٥ ئافرەتی گێلو ئەحمەق.

سَيْرُ الميقاب: رۆیشتنی بەردەوام بەشەوو رۆژ.

الميقب: (الوَدَعَة): واتە پاڵدانەوەو ئیستراحەت.

الوَقْبُ: گێلو ئەحمەق ٥ خوێڕیو هەتیو مچە ٥ بەرداو؛ کونی بەرد کەئاوی تێدا راوەستێ ٥ یان بیرەئاوێك باڵا پیاوێك یان دوو باڵا پیاو قوڵ بێ ٥ هەموو چاڵاییەکی جەستە وەکوو چاوو بنهەنگڵو قولکەی شانو شتی وا ٥ کونەبانو دەلاقەو دوکەڵکێش.

الوَقباء: دەگوترێ: (رکیة وقباء): بیرێکە ئاوەکەی رۆچووە.

الوَقْبَةُ: بەرداو؛ کونە شاخو بەرد کە ئاوی تێدا راوەستێ.

الـوُقْبِيُ: کەسێـك زۆر حەزی لەهاوەڵیەتی مرۆڤی گێلو ئەحمەق بێ.

وَقَتَهُ يَقِتُهُ وَقْتاً: کاتێکی بۆ دیاریی کرد ئیشەکەی تێدا بکا ٥ دەگوترێ: (وقت اللهُ الصلاةَ): خودا کاتی بۆ نوێژ دیاری کردوە.

وَقَتَ الشَّيْئَ ليوم كذا: شتەکەی بۆ فلان کات دیاریی کرد.

المُوَقِّتُ: ئەو کەسەی خەریکی راگرتنی حیسابی کاتو شتی وایە ٥ شوێنێك کەدیاریی کرابێ بۆ کردنی ئیشێك لەلایەوە.

الوَقْتُ: بەشێك لەزەمەنو کات کە بۆ کارێك دیاری دەکرێ.

وَقَحَ حافر الدابة: سمی وڵاخەکە رەق بوو.

وَقُحَ الرجلُ: پیاوەکە بێ شەرمو حەیا بوو بەلایەوە شەرم نیە چی نیشی خوێڕیەتی هەیە بیکا.

وَقِحَ يوقَحُ وَقَحاً: بەمانا (وَقُحَ)دێ.

وَقِحَ الرجُلُ: پیاوەکە بێ حەیاو بێ شەرم بوو بەلایەوە گرنگ نییە چ شتی خراپو ناشیرین هەیە بیکاو بیڵێ.

اوقح الحافر: سمی وڵاخەکە رەقو پتەو بوو.

وَقَّحَ حافِرَ الدابة: سمی وڵاخەکەی بەپیوو بەزی تواوە رەقو پتەو کرد دوای بەهۆی زۆر رۆیشتنەوە تەنك بوبوو سوا بوو.

**وَقّـعَ الحـوضَ**: حەوزەكـەی چـاك كردەوە كونو كەلەبەری گرتن.

**تَوَقَّعَ**: پتەوو رەق بوو.

**تـوَقَّعَ الرجـلُ**: پیاوەكـە بـێ شـەرمو حـەیا بـوو هیـچی بـەلاوە عـەیب نەبوو.

**المُـوَقَّعُ**: (رجـل مُـوَقَّعٌ): پیاوێـكی بەلاوازییـە ٥ بـەلاو كارەساتی زۆری بەسـەرهاتونو لەبۆتـە دراوەو قـالْ بـووە ٥ (بعـیر مُـوَقَّعٌ): حوشترێـكە زۆری ئیش پێـكراوەو تـەواو مانـدو بووە.

**الوَقاح**: دەگوترێ: (رجلٌ وَقاح الوَجْهِ): پیاوێـكی بـێ شـەرمو حەیایـە بەچـاوو رووە ٥ هـەروا دەگـوترێ: (إمـرأة وقـاح الوجـه): ئـافرەتی بەچاوو رو بێ شـەرم ٥ (رجل وقـاح الذَّنبِ): پیاوێكە زۆر پشو درێـژ بـۆ سواریی هەرگیز بێ تاقەت نابێ.

**وَقِدت النار تَقِدُ وَقْداً وقُوداً**: ئاگرەكە هەلگیرسا.

**وَقِـدَ الـشَيْئُ**: شـتەكە درەوشـایەوە ٥ دەشكوترێ: (وَقِدَت بك زنـادي): كـاری من بـەتۆ رایـی بـوو ٥ یـان خـودا وابكا ئیـشی مـن بـەتۆ رایـی بـێ ٥ واتــە: بەشێوەی دوعا بێ.

**اوقَـدَ الـنـار**: ئاگرەكـەی داگیرسـاند ٥ دەشكوترێ: (أوقد اللّٰهُ ناراً أثَرَهُ) خودا لەشوێنی ئەو ئـاگر بكاتـەوە ٥ واتـە: خـودا بیفـەوتێنێو بیبـاو نـەی هێنێتەوە.

**وَقَّدَ النَّارَ**: بەمانا (أوقدها)دێ.

**إتَّقَدَت النار**: ئاگرەكە هەلگیرسا.

**تَوَقَّدَتِ النارُ**: بەمانا (إتّقدت) دێ.

**توقَّـد الكوكـبُ**: ئەسـتێرەكە درەوشایەوە.

**تَوَقَّدَ فلان**: فلانكەس چوستو چالاك بوو نیشاتی پەیدا كرد.

**تَوَقَّدَ فلان النارَ**: فلانكەس ئاگرەكەی داگیرساند.

**استوقدت النارُ**: ئاگرەكە داگیرسا.

**استوقد النارَ**: ئاگرەكەی داگیرساند.

**المُستَوْقَدُ**: قولكـە ئـاگردان ٥ شـوێنی ئاگر كردنەوە.

**المَوْقِدُ**: شوێنی ئاگر ٥ قولكـە ئـاگردان ٥ زۆپا ٥ كورەخانە.

**الميقـاد**: دەگـوترێ: (زنـدٌ مِيقــاد): چەرخێكە زوو ئاگر دەكاتەوە.

**الوَقـادُ**: دەسـتە چـیلە، سـوتەمەنی بەتایبـەتی نـەوتو غـازو دارو شـتی وا.

**الوَقْدُ**: ئاگر ٥ هەلگیرسانی ئاگر.

**الوَقْدَةُ**: جەنگـەی گـەرما ٥ دەگـوترێ: (طَبَخَـتهُمْ وقـدَة الـصيف): گـەرمای بەتینی هاوین كولاندنی.

**الوَقّادُ:** صيغه موبالەغەی (وَقَدَ)یە ٥ ئـاگر هەلگیرسێن ٥ ئەوكەسەی سوتەمەنی (گاز یان خەلوز یان شتی تر) دەكاتە شەمەندەفەرەوە ٥ كەسێك چراو لۆكزو شتی وا هەلدەكا ٥ دەگوترێ: (قلب وقّاد): دلێكە زۆرو زو نیشات پەیدا دەكاو دەس بەكار دەبێو مل لەئیشی سەرەكی خۆی دەنێ.

**رجل وَقّاد:** پیاوێكی كۆلنەدەرەو لەكاری خۆی بەردەوامە.

**الوَقُودُ:** بەمانا (الوِقادُ) دێ ٥ هەرمادەیەك بەسوتانی هێزێكی گەرمی پەیدا بكا.

**الوَقِيدُ:** بەمانا (الوَقود)دێ.

**وَقَذَ فلاناً (يقذِه) وَقْذاً:** ئەوەندەی لەفلانكەس دا تاشلو كوتی كردو گەیاندییە شارای مەرگ ٥ بەعەرزی دادا خستیە سەر زەوی ٥ بەنەخۆشیو زامداریی لەگۆڕەپاندا جێی هێشت ٥ دەشگوترێ: (وقَذَهُ الغمُّ والمرض).

**وَقَذَ فلاناً النُعَاسُ:** هەنوز بەسەر فلان دا غالب بوو ٥ هەنوزی هاتنێ.

**وُقِذَت الناقة:** حوشترەكە بەناخۆشی دۆشرا شیری نەدا ٥ شیری كەم بوو.

**اوقَذَه:** بەنەخۆشی جێی هێشت.

**وَقَذَ الـصِرارُ الناقـةَ:** گواندێن بەستنەكە شوێنكەی لەگوانی حوشترەكە كرد چونكە توند بەسترا بوو.

**الموْقِذُ:** ئەندامی جەستە وەكوو قولەپێ، شان ئەنیشك .ئەژنۆ ٥ (ك: مواقذ) ٥ دەگوترێ: (ضربه علی مواقذ من مواقذه).

**المُوقَذَةُ من النوق:** ئەو حوشترەیە بێچوەكەی تێی هەلدەكەوێو شیری كەم لێ دێتە خوار لەبەر گەورەیی گواندێنی ٥ ئەم حالەتە دەبێتە هۆی ئەوەی كەلەناو گوانی دا هاوسان دروست ببێ.

**الموقوذ:** نەخۆشی كوشندە كە كەوتبێتە گیانەلاوەوە.

**الموقوذةُ من الشاء:** مەڕێكە بەلێدان گیانی لەدەست دابێ.

**الوَقيذُ:** ئەوكەسەی بێ هۆش دەبێ نازاندرێ ئاخۆ زیندووە یان مردووە ٥ تەمبەڵ ٥ مەڕێك بەلێدان مندار بوبێتەوە ٥ تەمبەلو قونگران ٥ زۆر نەخۆشو گەیشتوو بەحالەتی گیانەلاو.

**الوقيذةُ:** بەردی راخراوو ریزكراو وەكوو رەصیف.

**وَقِرَت أُذُنُهُ (تَقِرُ) وَقراً:** گوێی گران بوون، یان هەر نابیسن.

**وقِرَ فلان وقاراً وقِرَةً:** فلانكەس عاقڵو رەزان بوو.

**وقِرَ في بيته وَقْراً:** لەماڵى خۆى دانيشتو نەچووە دەر.

**وَقِرَ الشَيْئُ في قلبه وَقْراً:** شتەكە لەدڵى دا جێگیر بوو.

**وَقِرَ الله اذنه:** خودا گوێچكەى گران كردن ٥ يان هەربەتەواوى كەڕ بوو ٥ دەگوترێ: (وُقِرَتْ أذني عن سماع كلامه): گوێچكەم قسەى ئەو نابيستێ.

**وَقِرَ فلان العظمَ:** فلانكەس ئێسقانەكەى قەڵشاند.

**وَقِرَتْ اذنه (تَوْقَرُ) وَقْراً:** بەمانا (وَقُرَ)دێ.

**وَقِرَتِ الدَّابَّةُ:** وڵاخەكە بەرد يان شتێكى تر لەسمى داو زيانى پێ گەيى.

**وَقُرَ فلان (يَوْقُر) وقاراً:** فلانكەس عاقڵو رەزان بوو ٥ (فهو وقور).

**أوقرت النخلةُ:** دارخورماكە بارى گران بوو.

**أوقر الدين فلاناً:** قەرزدارى بارى فلانى قورس كرد.

**أوقر فلانٌ الدابةَ:** فلانكەس بارى قورسى لەوڵاخەكە باركرد.

**وَقَّرَ فلاناً:** رێزى فلانى گرت ٥ بەچاوى رێزو شكۆمەندى سەيرى كرد.

**وَقَّرَ الشَيْئَ:** شوێنكەى لەشتەكە كرد.

**وَقَّرَت الأسفارُ فلاناً:** سەفەرو گەڕان بەناو وڵاتان دا ٥ فلانكەسى لەبۆتەداو قاڵى كردو شارەزاى گوزەرانو ژيانى كرد.

**أوْقَرَ فلانٌ الدابّةَ ايقاراً:** فلانكەس بارى گرانى لەوڵاخەكە باركرد.

**وَقَّرَ فلاناً:** رێزى فلانكەسى گرت ٥ بەعاقڵمەندى لەقەڵەم دا.

**وَقَّرَ الشَيْئَ:** شوێنكەى لەشتەكە كرد.

**وَقَّرَ الأسفارُ فلاناً:** سەفەرو گەڕان بەوڵاتان دا فلانكەسى قاڵ كردووە، واى لێ كردوە خۆگربێ بۆ كارەساتو لێزان بێ لەئەنجامدانى كارەكانى دا.

**وَقَّرَ فلان الدَّابَّةَ:** فلانكەس وڵاخەكەى تاقەت كرد، دايكرد، خستيە پشتێرو تەويلەى تايبەتى خۆيەوە.

**اتَّقَرَ:** عاقڵو رەزان بوو.

**استَوْقَرَ:** بارى گرانى هەڵگرت ٥ كۆڵى قورسى لەكۆڵى خۆى دا.

**استَوْقَرَ الإبلُ:** حوشترەكە قەڵەو بوو.

**القِرَةُ:** قورسايى ٥ كاتى نەخۆشى ٥ پيرەمێردى بەساڵا چوو ٥ ماڵو منداڵ ٥ جەڵەبە مەڕو بزن كەژمارەيان كەم بێو شوانو سەگو

کەرە مێینەکی خۆیان لەگەڵ بێ.

**المَـوْقِرُ:** شـوێنی دەشـتایی لـەبنارو پێدەشتی کێو.

**المُـوقِرُ:** دەگـوترێ: (نخلـة مُـوقِرٌ) دارخورمایـەکی بارگرانـە زۆری بەرگرتووە ٥ (ك: مواقر).

**المُـوَقَّرُ:** پیـاوی قـاڵبوی رۆژگـار کـە کارەسـاتو روداو لەبۆتـەیان دابـێو ئەزمونی جۆراو جۆر قاڵیان کردبێ ٥ مرۆڤی عاقڵو کاراما.

**المُـوَقَّرَةُ:** دەگـوترێ: (نخلـة مـوقرة): دارخورمایـەکی بارگرانـە زۆری بەرگرتووە.

**الموقـور:** (شـيئ مرقـور): شتێـکی چاڵچاڵو گرنج گرنجە یان شتێـکە ترینگە ترینگی لێ دێ.

**الموقـورَةُ:** اذن موقـورة: گوێـچکەی گران کەبەکەمی قسە ببیستێ.

**الوَقار:** عاقڵمەندیو لەسـەرە خـۆیی ٥ گەورەییو شکۆمەندی.

**الـوَقْرُ:** قەڵـشتی قـاچ ٥ بەتایبـەتی قەڵشتی پاژنە پێ ٥ شوێنکەو چاڵی لەبەرد یان لەئێسقان یان لەچاو.

**الوِقْرُ:** دەگوترێ: (رجـل وَقُـرٌ): پیـاوی عاقڵو لەسەرە خۆ.

**الوِقْرُ:** کۆڵی گران.

**الـوَقْرَةُ:** یـەکجار ٥ قوڵکـەو چـاڵایی لەبەرد ٥ شوێنکە.

**وَقْرَةُ الدهر:** بەڵاو کارەساتی رۆژگـار ٥ (ك: وقرات).

**الـوَقْرِيُّ:** شـوانی جەڵەبـە مـەڕو بزنـی کـەم کـە گوێدرێـژو سـەگی تایبـەتی خـۆی هـەبێ ٥ مـەردارو ئەوکەسـەی خـاوەنی جەڵەبـە مـەڕو بزنـی کـەم کەشوانو سەگو گوێدرێژی تایبەتی خۆی هەبێ.

**الوَقور:** خاوەن ئەدەبو حیشمەت.

**الـوَقِيرُ:** رێـز لێـگیراو خـاوەن رێـز ٥ ئێسقانی درز بردو ٥ جەڵەبە مـەڕو بزنـی کـەم بەشـوانو سـەگو گوێدرێژەوە ٥ حەوزو چاڵی ئـاو لـە ناوشاخ دا کـەئاوی تێـدا کۆبێتـەوە ٥ دەشگوترێ: (رجـل وقـير): پیاوێـکە قەرز شانی داگرتووە.

**الوَقِيرَةُ:** حەوزو چاڵی ئاو کە لەشاخ دا دروست بـێو زۆر گـەورە بـێ ٥ (أذن وقيرة): گوێچکەی گـران کەبەکـەمی قسە ببیستێ.

**وَقَـسَ فلاناً بـالمكروه:** شـتی ناشـیرینی پاڵ فلانکەس دا.

**وَقَسَ الفاحِشَةَ:** باسی کردەوە ناشیرینو ئابڕو بەرەکەی کرد.

**وَقَّسَ الإبلَ:** حوشترەکەی گروێ کرد.

**الأوقاس من الناس:** کۆمـەڵو تـاقمی

خوێڕیو پڕو پوچو هەتیو مچەو کۆیلە ٥ تۆمەتبارو گومان لێکراو بەوەی کە توشی گروێی بوون.

**الوَقْسُ**: سەرەتای گروێی پێش ئەوەی بەجەستەدا بڵاو بێتەوە ٥ دەشگوترێ: (صار القومُ أوقاساً): خەڵکەکە بوونە هەرەمەکیو کۆمەڵگایەکی تێکەڵو پێکەڵ.

**وَقَشَ الرسمُ (يَقِش)وَقشاً**: وێنەکە کوژایەوە، سڕایەوە.

**وَقَشَ فلانٌ من فلان**: فلانکەس لەفلانکەسەوە عەتاو بەخششی دەستکەوت.

**وَقَشَ له بشيئٍ**: شتێکی پێدا.

**اوقَشَ له بشيئٍ**: شتێکی پێدا.

**وَقَشَ بالنار**: بەئاگر ئامازەی پێ کرد، ئاگری بۆ راوەشاند.

**تَوَقَّشَ الشَيْئُ**: شتەکە کەوتە جمو جوڵ.

**الأوقاش**: خەڵکی هەرەمەکیو تێکەڵ لەچینو توێژی جیاجیا.

**الوَقشُ**: جمو جوڵ، دەنگ ٥ هەست، دەگوترێ: (سمعت وقشة): گوێم لەهەستو چرپەی بوو ٥ عەیبو لەکە ٥ چیلکەو چەوێڵ کەئاگری پێ دەکرێتەوە ٥ هەڵیزگو پڕزو پاڵ.

**الوَقْشَةُ**: جمو جوڵو دەنگو صەدا.

**وَقَصَتْ عُنُقَهُ تَقص وَقْصاً**: ملی شکا.

**وَقَصَت الناقَةُ براكبِها**: حوشترەکە سوارەکەی سەرپشتی گلاند.

**وقص الشَيْئَ**: شتەکەی شکاند.

**وَقَصَ عُنُقَهُ الدينُ**: قەرز ملی پێ شۆڕ کردوە.

**وَقَصَ الشَيْئَ فلانٌ**: فلانکەس عەیبی لەشتەکە گرت.

**وَقَصَ راسَهُ**: سەری بەتوندی راتەکاند.

**وُقِصَ**: ملی باریك کرا.

**وَقِصَ يَوْقَصُ وَقَصاً**: بە سروشتو خیلقەت ملی کورت بوو ٥ (فهو أوقص وهي وقصاء) ٥ دەشگوترێ: (عُنُق أوقص وعنق وقصاء).

**اوقَصَهُ**: وای لێکرد مل کورت بێ.

**وَقَّصَ على ناره**: پڕزو پاڵو توێکڵە دارو شتی وای خستە ناو ئاگرەکە بۆئەوەی زیاتر بڵێسەی هەبێ.

**توَقَّصَ**: خۆی بەمل کورت نیشان دا، لاسایی مل کورتی کردەوە.

**تواقَصَ على بردتِه**: خۆی نوشتاندەوەو عەباکەی یا پەشتەماڵەکەی لەملی خۆی پێچا بۆ ئەوەی نەکەوێ.

**تَوَقَّصَ بِه فَرَسُهُ**: ئەسپەکەی نەرمە غارو گورگە لۆقەی پێ کرد، بەتوندی قاچی بەزەوی دا دەدان.

**الأوقاص**: کۆی (الـوَقَص) ٥ هـەروا بـەمانا پەرتـەوازەیی‌و پـچڕ پـچڕی هاتووە ٥ دەگوترێ: (صاروا أوقاصاً): ئەوانـە لێـك جیـا بوونـەوەو پـچڕ پچڕ بوون.

**المَوْقُوصُ**: مل کورت.

**الـوَقْصُ**: عـەیب‌و لەکـەداریی شـت ٥ لەزاراوەی زانستی عوروزدا لابردنـی پیتـی دووەمـی خـاوەن بزوێنـە لـە کێشی (متفاعِلُن).

**الـوَقَصُ**: لوغەتێـکە لـە (الـوَقْصُ) کـە بریتییـــە لـــە وردە دارو چـــیلکەو چەوێڵ‌و پرزو پاڵ، کە ئاگریان پـێ خۆش دەکرێ هەروا نـاوە بـۆ تـاکی (الأوقـاصَ) کـە لـەبواری زەکـات دا بریتییـــە لـــەو شـــتە زەکـــات لـێ‌کەوتووانەی دەکەونـە نێـوان دوو فـەریزەی زەکاتـەوە زەکاتیـان لـێ ناکەوێ بۆ نمونە کەژمارەی حوشـتر گەیشتە پێنج سـەر دەبـێ مەڕێـك بـدا بـەزەکات ئـەمجار تـا دەگاتـە دە سەر حوشـتر زەکاتیـان لـێ ناکـەوێ، ئـەو حوشـترانەی نێـوان پێـنج‌و دە پێیـان دەوتـرێ (وَقَـص) هەنـدێ لــەزانایانی شــەرع پێیــان وایــە قاعیدەی (وقص) تەنیا لە ڕەشەوڵاخ دا پەیڕەو دەکرێ.

**الوَقِیصَة**: تـاکی (الوقـائص) کـە بریتییە لە دەرکەوتنی ئێسقانی مل بەلای شانەوە.

**وَقَطَهُ یَقِطُهُ وَقْطاً**: ئەوەنـدەی لـێ دا نیوە مردوی کرد.

**وَقَـطَ فلاناً دابّتُهُ**: وڵاخەکە فلانکەسی گلاندو بێ هۆشی کرد.

**وَقَـطَ فلانـاً**: فلانکەسـی بەسـەر سـەردا خست، سەری لەزەوی‌و قاچی بۆ حـەوا ٥ ئەمجار بەمەبەستی چارەسەر بـەدوو وەجبە لەقاچی دا.

**وَقَطَ الأرضَ به**: کابرای خـست، بـەزەوی دادا.

**وَقَـطَ الـشَيْءُ فلانـاً**: شـتەکە بـاری فلانکەسـی قـورس کـرد خـەوی لـێ خـست ٥ دەگـوترێ: (أکلـت طعامـاً فوقطني): خواردنێکم خوارد خەوی لـێ خستم.

**وُقِطَ في راسه**: سـەری گـران بـوو هەسـتی بەقورسایی سەری کرد.

**وَقَـطَ الـصَّخر**: بەردەکـە قولکـەی تێـکەوت‌و ئـاوی تێـدا کۆبـۆوە ٥ بەرداو لەشاخەکە دا پەیدا بو.

**استوقط المکانُ**: شـوێنەکە قولکـەو چاڵی تێدا پەیـدا بـوو بـەهۆی زۆر پێدا ڕۆیشتنی ئادەمیزادو وڵاخەوە.

**المَوْقُـوطُ**: خـپ بـوو ٥ کـوژراو ٥ زۆر تێهەڵدراو.

**الوَقْطُ**: چاڵێکە لەشوێنێکی پتەو ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە ○ (ك: أوقاط).

**الـوَقيط**: کـوژراو ○ خـپ بـوو ○ هەرگیاندارێـك زۆری لـێ درابـێو بریندار کرابـێ ○ بـۆ مێینـەش هەردەگوترێ: (الوقيط) ○ (ك: وَقْطى ووقـاطى) ○ وشـەی (الـوقيط) بەکەسێـك دەگـوترێ شـەو خـەوی زڕابـێو نەنوستبێ بـەو هۆیـەوە بەرۆژ لەشی تێکشکابێو داهێزرابێ ○ چاڵێکە لەشوێنێکی پتەو ئاوی تێـدا کۆدەبێتـەوە ○ (ك: وقطـان، وِقاط).

**وَقَعَ يَقَعُ وَقْعاً ووقوعاً**: کەوت، بەربۆوە.

**وَقَعَتْ الدوابُ**: وڵاخـەکان مۆڵیـان خوارد پاڵ کەوتن.

**وَقَعَتْ الإبلُ**: حوشترەکە پیخی خوارد پاڵکەوت ○ هـەروا دەگـوترێ: (وَقَـعَ الطيرُ على أرض أو شجر): باڵندەکە لەسـەر زەوی یـان لـە سـەر درەخـت نیشت.

**وَقَعَ المطرُ بالأرض**: باران لەزەوییەکە باری.

**وَقَعَ الحقُ**: حەق چەسپا.

**وَقَـعَ القـولُ عليـه**: قـسەکە، بڕیارەکـە چەسپا، واجب بوو لەسەری.

**وَقَـعَ الكـلامُ في نفـسه**: قـسەکە کـاری لەدەروونی کرد.

**وَقَـعَ فـلان في فـلان وقيعـة ووقوعـاً**: فلانکـەس جـوێنی بەفلانکـەس دا غەیبـەتی کـرد قـسەی ناشـیرینی پـێ گوتن.

**وَقَعَ في العمل وقوعاً**: دەستی بەکارەکە کرد.

**وَقَعَ في الشرك**: شیرکی تێدا پەیدا بوو ○ کەوتـە حاڵـەتی هاوبـەش پەیداکردنەوە.

**وَقَعَ في ارض فلاة**: بەناو زەوییەکی چۆڵ دا ڕۆیی.

**وَقَعَ الى كذا وقْعاً**: بـە پەلـە بـەڕێی کـرد، خێرا ناردی.

**وَقَـعَ بالعدوّ وقعاً**: زێـدە ڕۆیـی کـرد لـە کوشـتاری دوژمـن دا دوژمنـی شەپرزەکرد.

**وَقَـعَ الأمـر مـن فـلان موقعـاً حـسناً او سـيئاً**: کارەکـە لای فلانکـەس بـەباش یان بەخراپ چەسپا.

**وَقَـعَ الأمـر عنـد فـلان موقعـاً حـسناً**: کارەکە لای فلانکەس گرنگی باشی پێ درا.

**وَقَـعَ النـصلَ بالميقعـة**: سـەرمتیرەکانی بەئامێری تیژکردن تیژکردن.

**وَقَعَ السيفَ والسكينَ**: شمشێرەکە یـان کێردەکەی تیز کرد.

**وَقَعَتْ الحجارةُ الحافِرَ:** بەرد سمی ولاخەکەی تەنك کرد ◦ دەشگوترێ: (هذه نعلٌ لاتقع على رجلي): ئەمە نەعلێکە بۆ قاچم نابێ، لەگەڵ قاچم ناگونجێ.

**وَقِعَ يَوْقَعُ وَقَعاً:** پێ خواس بوو، گۆشتی قاچی ئازاری بوو بەهۆی رەقی زەوییەکە یان بەهۆی بەردەلانیو شتی واوە.

**وَقِعَ في يدِه:** لەدەستی بووەوە، لەدەستی دەرچوو ◦ پەشیمان بۆوە.

**أوْقَعَ المُغَنِّيَ:** گۆرانی بێژەکە ئاوازو هەوای گۆرانییەکەی لەشوێنی خۆی داناو کێشو ئاوازی شیاوی بۆ دانا.

**أوقَعَ فلان بالأعداء:** فلانکەس زێدەرۆی کرد لەکوشتو بڕکردنی دوژمن دا.

**أوقَعَ بفلان ما يسوءه:** زەبری گورچکبڕو توندی لەفلان دا، قسەی ناشیرینی ئاراستە کرد.

**أوقَعَ به الدَهْرُ:** رۆژگار هێرشی بۆهێنا.

**أوقَعَتْ الروضةُ:** باخەکە ئاوی لەخۆگرتو تێرئاو بوو.

**أوقَعَ فلان الشَيْئَ:** فلانکەس شتەکەی والێ کرد بکەوێ.

**واقعه مواقَعَةً وَوِقاعاً:** شەڕی لەگەڵ دا کرد.

**واقَعَ الأمورَ:** ئیشەکانی نزیك کردنەوە.

**واقع المرأةَ:** لەگەڵ ئافرەتەکە جوت بوو.

**وَقَّعَ الرجلُ:** پیاوەکە بەشێوەیەکی تایبەتی رۆیی.

**وَقَّعَتِ الإبلُ:** حوشترەکە دوای تێراوبوون پیخی خواردو پاڵکەوت.

**وَقَّعَ في الكتاب:** هەندێ پەراوێزو رونکردنەوەی لەسەر کتێبەکە نووسیو راجیع مەرجیعی بۆکرد، زێدەو شتی دوبارەوەبووی لێ لابرد.

**وَقَّعَ الصَّيْقَلُ على السيف:** وەستای شیرگەر دەستی کرد بەمشتو مالکردنی شمشێرەکەو تیژکردنی.

**وَقَّعَ العقدَ أو الصكَّ:** لەلای خواروی گرێبەستەکەوە یان چەکەکەوە ناوی خۆی نووسیو واژۆی کرد.

**وَقَّعَ الشَيْئَ:** گومانی شتەکەی کرد.

**وَقَّعَ ظَنَّهُ على الشَيْئ:** گومانی کەوتە سەرشتەکە ◦ شتەکەی مەزندە کردو دایبەزاند.

**وَقَّعَتْ الحجارَةُ الحافِرَ:** بەردەکە سمی ولاخەکەی بڕی قاشی کرد.

**تواقَعَ الأعداءُ:** دوژمنەکان هەندێکیان لەگژ هەندێکیان راچوون.

**تواقعَ الرجُلان**: دوپیاوەکە شەڕیان بوو.

**توقّعَ الأمرَ**: چاوەڕوانی روودانی کارەکەی کرد.

**استوقَعَ السیفُ**: شمشێرەکە پێویستی بەمشتو ماڵ کردن هەبوو.

**استوقَعَ فلان الأمرَ**: فلانکەس چاوەڕێی روودانی ئەوکارەی کرد لەوکارە ترسا.

**الإیقاع**: ئەوەیە دەنگەکان لەگۆرانی گوتنی بەکۆمەڵ دا بەیەکەوە بگوترێن‌و پاش‌و پێشیان تێدا نەکرێ‌و بەیەکەوە لەتەپڵی گوێچکە بدەن.

**التوقیعُ**: ئەوەیە باران لە هەندێکی وڵات ببارێ‌و لەهەندێکی نەبارێ ٥ ئەوەی سەرۆک‌و پاشاو فەرمانڕەوا لەسەر نامەو شتی وا واژۆی دەکەن، ئیمزای دەکەن.

**توقیع العقد او الصك**: واژۆکردنی گرێبەست یان چەکی پارە کەلەلای خوارویەوە کابرا ناوی خۆی دەنووسێ‌و واژۆی دەکا ٥ ناوە بۆ جۆرە خەتێک ٥ جۆرە ڕۆیشتنێکە.

**المَوْقِعُ**: شوێنی روودانی شت ٥ شوێنی کەوتنی شت‌و چەسپانی لەجێگەی تایبەتی خۆی ٥ دەگوترێ: (وقع الشیئُ موقعه) ٥ (ك: مواقع) ٥ (مواقع القتال): شەرگە ٥ گۆڕەپانی شەڕ ٥ (مواقع القطر): شوێنی باران لێ بارین، باران لێدراو.

**المَوْقِعة**: شوێنی روودانی شت ٥ شەڕو شەڕگە.

**المُوَقَّعُ**: کەسێک توشی بەڵا بووبێ، کارەساتی لێ روودرابێ ٥ حوشترێک زۆر شوێنەواری برینی بەجەستەوە بن ٥ ڕێگای تەخت کراوو خۆشکراو ٥ کێردی تیژکراو.

**المُوَقِّعُ**: کەسێک بەهێواشی پێ لەزەوی بنێ ٥ نووسەری پەراوێز نووس لەسەر نامەو شتی وا.

**الموقوع**: دەگوترێ: (حافر موقوع): سمی وڵاخ کە بەهۆی بەناو بەردو چەو رۆیشتن دا سوابێ‌و تەنک بووبێ ٥ بەردو چەو لە سمی وڵاخەکەی بردبێ.

**الموقوعَةُ**: دەگوترێ: (قدم موقوعة): قاچی پێست ئەستورو پتەوو زل‌و بەهێز.

**المیقَعَةُ**: شوێنێک باز لێی بنیشێ‌و وەگری بێ ٥ ئەو دارە جل شۆرەی کە جل شۆر بەکوتەک جلی لەسەر دەشواو جلەکان دەکوتێ ٥ یان ناوە بۆ کوتەکەکەی کە جلەکانی پێ دەکوتی ٥ چەکوچ‌و شتی وا ٥ نەخۆشییەکە توشی بێچوە ئاژەڵ دەبێ‌و زوربەی کات دەیکوژێ.

**الواقعُ**: ئەوكەسەی بەرداشی ئاش بیراز دەکا ٥ شێوەی شتو روداو وەکوو خۆیو سەرەنجام ٥ دەگوترێ: (أمر واقع و(طیر واقع) ٥ (لَواقع الطیر): هێلانەو شوێنی هەڵنیشتنی باڵندە.

**الواقعة**: رۆژی قیامەت ٥ بەڵای رۆژگار ٥ شەڕو بەرەنگاریبوونەوەی دوژمن ٥ لێکدانی گورچکبڕی یەك لەدوایەك لەگەڵ دوژمن ٥ دەشگوترێ: (رجل واقعة): پیاوێکی ئازایە ٥ چاو نەترسە ٥ لەبواری فەلسەفەدا وشەی (الواقعة): بریتییە لە روداوو شتی پەیدابوو.

**الواقعیة**: لەبواری فەلسەفەدا مەزهەبو رێبازێکە هەوڵ دەدا وێنەیەکی ئەمینو راستگۆیانە بۆ دیمەنی سروشتو ژیان وێنا بکرێ ٥ هەروا رانواندنی بیرو بۆچونو کەشو هەوای روداوەکان بەشێوەیەك تارمایی تێفکرینو بۆروانینی میسالییان پێوەنەبێ ٥ هەروا ناوە بۆ رێبازێکی ئەدەبی کەپشت بەواقیع ببەستێو گرنگی بەوێنە گرتنی بارو دۆخی کۆمەڵگا بدا.

**الوقائع**: ئەحواڵو روداو.

**وَقّاع**: شوێنی لێکەوتنی کۆتایی قەراخی پەردە کە لەکاتی دادانەوەی دا لەزەوی دەدا.

**الوَقْعُ**: دەنگی لێدان لەشت ٥ (رمبە، تەپە، خرمە، تەقە، شڵپە) ٥ دەگوترێ: (سمعتُ وقع المطر): گوێم لەخرمە خرمی باران بوو ٥ (سمعتُ وقع الأقدام): گوێم لەتەپە تەپی قاچەکانیان بوو ٥ هەروا وشەی (الوَقْع): ناوە بۆ بەرزایی کێو ٥ تەنکە هەور ٥ شوێنکەی شت کە رەنگی گۆڕیبێ ٥ بەردە وردە.

**الوَقِعُ**: تەنکە هەور ٥ نەخۆشێك ئازاری هەبێو هاوار بکا.

**الوَقْعَة**: جارێك ٥ لەشەڕدا لێدانی لەسەریەكو بێ پسانەوە.

**وقعة السیف**: بڕینو رۆچونی شمشێر بەناو جەستە دا.

**الوَقَعَة**: بەرد.

**الوَقّاع**: ئەوکەسەی پاشملە غەیبەتی خەڵك دەکا ٥ دەگوترێ: (رجل وقّاع).

**الوَقّاعَة**: بەمانا (الوَقّاع)دێ.

**الوَقیعُ**: شوێنی توندو پتەو کەئاوی لێ رۆنەچێ ٥ دەشگوترێ: (سکین وقیع): کێردێکی تیژە ٥ (حافر وقیع): سمە ولاخێکە رەقو پتەو ٥ یان سمە ولاخێکە بەردو چەو تەنکی کردوە توشی سوانی کردوە ٥

شوێنێکەو روشانی رەنگی شتەکەی گۆڕیبێ.

**الوَقيعة من الأرض:** زەوییەکە توندو پتەوبێ ئاو دانەدا ◊ غەیبەتکردنی خەڵك ◊ زەبرو دەنگی شەڕ.

**وقيعة الطائر:** شوێنی هەڵنیشتنی باڵندەو شوێنی وا کەبەڕوالەت باڵندە وەگری دەبێ بۆلێ هەڵنیشتنی ◊ (ك: وقاع ووقائع) ◊ (وقائع العرب): رۆژانی شەڕو جەنگی نێوان عەرەبەکان.

**وَقَفَ وقوفاً:** هەڵسایە سەرپێ ◊ دوای رۆیشتن راوەستا ◊ (وَقَفَ على الشَيْئ): شتەکەی بینی، بەسەر شتەکەدا ئاگادار بوو ◊ (وقف في المسألة): لەمەسەلەکە کەوتە گومانەوە ◊ (وقف على الكلمة): بزوێنی نەدا بەکۆتایی وشەکە بەبێ بزوێن خوێندییەوەو لەوشەی دوای خۆی دایبڕی ◊ (وقف الحاج بعرفات): حاجیەکان دوای نوێژی نیوەڕۆی رۆژی عەرەفە چونە کێوی عەرەفە ◊ (وَقَفَ فلان على ماعند فلان): فلانکەس تێگەیی فلان چی لایەو چ مەبەستی هەیە.

**وَقَفَ الماشي والجالس:** رۆیندەکە یان دانیشتووەکەی هەڵساندە سەرپێ، وای لێ کرد راوەستێ.

**وَقَفَ فلاناً عن الشَيْئ:** فلانکەسی لەشتەکە مەنع کرد.

**وَقَفَ فلاناً على الامر:** فلانکەسی بەسەر شتەکەدا ئاگادار کرد.

**وَقَفَ الأمْرَ على حضور فلان:** کارەکەی پەیوەست کر بەئامادەبوونی فلانەوە.

**وَقَفَ الدارَ ونحوها:** خانوەکە یان مڵك و سامانێکی تری وەقف کرد لەرێگەی خودادا خەڵکی سودی لێ ببینن ◊ دەشگوترێ: (وَقَفَ الدار على فلان): خانووەکەی لەسەر فلان وەقف کرد ◊ کردی بەموڵکی ئەو بێ بەرامبەر.

**اوقَفَ فلان عن الأمر الذي كان فيه:** فلانکەس وازی لەکارەکەی خۆی هێنا ◊ دەشگوترێ: (كلمته فأوقف): قسەم لەگەڵ کرد بێدەنگ بوو.

**واقَفَهُ في حرب او خصومة:** لەشەڕا چووە پاڵ ئەوو لەگەڵیدا وەستا.

**واقَفَهُ على كذا:** داوای وەستانی لێ کرد لەسەر ئەوە.

**وَقَّفَ الجَيْشُ:** سەربازەکان یەك لەدوا یەك ریز بوون.

**وَقَّفَ الناس في الحج:** لەحەج دا خەڵك شوێن وەستانی خۆیان پەیڕەو کرد.

**وَقَّفَت المرأةُ:** ئافرەتەکە سەروکاری وەقفەکەی خستە ژێر دەستی خۆیەوە.

**وَقَّفَ فلاناً على الشَيْئ:** فلانكەسی بەسەر شتەکەدا ئاگادار کرد.

**وَقَّفَ القارئَ:** قورئانخوێنەکەی فێری شوێنی راوەستان لەسەر ئایەتەکان کرد.

**وَقَّفَ الحديث:** حەدیسەکەی رون کردەوە.

**تواقَفَ القوم في الكفاح:** لەتێکۆشانو بەگژاچوونەوەی زوڵمو ستەم دا خەڵکەکە پاڵپشتی یەکتریان کرد.

**تَوَقَّفَ عن كذا:** لەو ئیشەدا راوەستاو نەیکرد.

**تَوَقَّفَ عليه:** هەوڵی چەسپاندنی دا.

**تَوَقَّفَ فيه:** لەوشتەدا مایەوەو چاوەڕوانی کرد.

**استَوقَفَهُ:** رایگرت، داوای لێ کرد بوەستێ.

**التوقيف:** دەقی شەرع دانەرە لەبڕێ بواردا.

**التوقيفيُّ:** هەرشتێك پاڵ بدرێ بۆ (تەوقیف) ◦ دەگوترێ: (أسماء الله توقيفية).

**الموقف:** ئەوشوێنەی مرۆڤ لێی دەوەستێ.

**موقف المرأة:** ئەوەی لەجەستەی ئافرەت دا بە عەورەت حیساب ناکرێ وەکوو دەستو مەچەكو بەشێکی روخسار کەداپۆشینیان دەبێتە حەرەج بۆ خودی ئافرەتەکەو ناتوانێ بەئاسایی کارەکانی ئەنجام بدا.

**الموقفان:** دوو شادەمارن دەوری کلێچەی ئادەمیزادیان داوە ئەگەر گرژبوون ئادەمیزاد ناتوانێ هەڵسێ ئەگەر بڕان ئادەمیزادەکە دەمرێ ◦ دەشگوترێ: (إمرأة حسنة الموقفين): ئافرەتێکە دەمو چاوو قلو قاچی جوانن.

**المُوَقَّفُ:** پیاوی قاڵبوو لەبۆتەدراوو خاوەن ئەزمون ◦ (رجل مُوَقَّفٌ على الحق): پیاوێکە لەئاست حەق دا ملکەچە.

**المُوَقَّفَةُ:** دەگوترێ: (دابة مُوَقَّفَةُ): ولاخێکە قاچی خەتخەتی رەشی تێدان.

**الموقوف:** شتی وەقف کراو بۆ مزگەوتو خوێندنگای ئایینیو شتی وا.

**الميقاف:** دارێکە کوڵی مەنجەڵی لەکوڵ هاتووی پێ سارد دەکرێتەوە.

**الميقَفُ:** بەمانا (الميقاف) دێ.

**الواقف:** ئەوکەسەی موڵکی خۆی وەقف دەکا ◦ خزمەتکاری کەنیشتە.

**الوَاقِفَة:** قاچ.

**الواقِفية**: پێڕێکن لەصۆفیو بەتاڵخوازەکان.

**الوَقْفُ**: لەبواری خوێندنی قورئان دا دابڕینی وشەیەکە لەوشەی دواوەی ٥ لەزاراوەی شەرعزانان دا وەقف کردنی موڵکە لەسەر کەسێک لایەنێک لەڕێگەی خودادا ٥ بازنەیەك لەمادەی عاج دروستکرابێ یان خرخاڵ لەزیووو شتی وا دروست کرابێ.

**الوقفة**: هەڵوێستە ٥ یەکجار ٥ شكو گومان ٥ (یوم الوقفة): رۆژی راوەستانی حاجیەکان لەسەر کێوی عەرەفە.

**الوَقّافُ**: مرۆڤی لەسەرە خۆ ٥ کەسێك نەچێ بۆ شەڕ دژی دوژمنو خۆبشارێتەوە.

**الوقيفة**: سەگ رەمتێن کەماندوببێ لەسەگ ڕەتاندنەکە.

**الوَقُّ**: جریوەی سیسرەو شتی وا.

**وَقَلَ في الجبل (يقل وَقْلاً)**: بەکێوەکەدا سەرکەوت ٥ قاچێکی چەسپاندو قاچێکی هەڵێنایەوە.

**تَوَقَّلَ في الجبل**: بەکێوەکەدا سەرکەوت ٥ دەشگوترێ: (تَوَقَّلَ في مصاعد الشرف): بەپەیژەو پلیکانەی شکۆمەندی دا سەرکەوت.

**الوَقْلُ**: درەختی (دەوم) درەختێکە گەورەیە لەصەعیدی میصر زۆرە، میوەکەی بەئەندازەی سێوێك دەبێ توێکڵی سورو پتەوە ٥ هەروا بەمانا (بەردەوام)دێ.

**الوَقَلُ**: بەرد ٥ بنکی لقە دارخورما کە وشك بووبێو باش دانە تاشرابێو بنەکەی مابێو مرۆڤ بتوانێ بیکاتە پێپلیکانەو پێیدا سەرکەوێ.

**الوَقِل**: دەگوترێ: (فرس وعِل وَقِلٌ): ئەسپێکە جوان دەچێتە ناو شیوو دۆڵەوە.

**الوَقْلَةُ**: تاکی (الوَقْلُ)ە ٥ دەنکی بەری درەختی وەقل.

**وَقَمَ الرَّجُلَ يقمه وَقماً**: زۆری لەپیاوەکە کرد ناچاری کرد.

**وَقَمَ عن حاجته**: بەناشیرینترین شێوە کابرای موحتاجی جواب کردو پێداویستییەکەی نەدایە.

**وَقَمَ الأمْرُ فلاناً**: فلانکەسی زۆر خەفەتبار کرد.

**وُقِمت الأرض**: زەوییەکە خێڵ چووە ناویو گژوگیاو لەوەڕی هەمووی خوراو بوو بە سوتەمەڕۆ.

**اوْقَمَهُ**: ریشە کێشی کرد، لەبێخ هەڵی کەند.

**وَقَمَ في الشَيْءِ**: درێژەی پێ دا، زۆری لەشتەکە کۆڵیەوە.

**وَقَمَ فلاناً**: هەرِشەی لەفلانکەس کرد ٥ ژێردەستەو ملکەچی کرد ٥ تەحەددای کرد.

**وَقَمَ الصَّيْدَ**: نێچیرەکەی هەنگاوتو پێش ئەوەی سەری ببڕێ نێچیرەکە گیانی دەرچوو.

**وَقَمَ الكلامَ**: قسەکەی جوان هەلگرتو خستییە مێشکی خۆیەوە.

**تَوَقَّمَ الصيادُ**: نێچیرەوانەکە چووە کۆختەکەیەوە.

**تَوَقَّمَ فلاناً**: هەرِشەی لەفلانکەس کردو لێی تورِە بوو.

**تَوَقَّمَ الصَّيْدَ**: نێچیرەکەی کوشت.

**تَوَقَّمَ فلاناً بالكلام**: فلانکەسی بەقسە داگرتو هێرشی کردە سەر.

**تَوَقَّمَ كلامَ فلان**: قسەی فلانکەسی وەرگرتو خستییە مێشکی خۆیەوە.

**الوِقَامُ**: شمشێر ٥ عەصاو گۆچان ٥ قامچی ٥ حەبلو گوریس.

**اوقَنَ الرجلُ**: پیاوەکە باڵندەکەی لەسەر هێلانەکەی خۆی گرت.

**تَوَقَّنَ**: بەمانا (أوقن)دێ.

**تَوَقَّنَ في الجبل**: بەناو کێوەکەدا سەرکەوت.

**الوُقْنَةُ**: هێلانە.

**الموقونة**: ئافرەتی ناوکەژاوەو پارێزراو.

**وَقْوَقَ الرجلُ**: پیاوەکە زەعیفو لاواز بوو.

**وَقْوَقَ الكلبُ**: سەگەکە لەکاتی ترسان دا لوراندی.

**وَقْوَقَ الطائرُ**: باڵندەکە دەنگی لێ هات، قیراندی، گاراندی، چریکاندی، گماندی، قراندی.

**الوَقْوَاقُ**: ترسنۆك ٥ درەختێکە دەرمانی لێ وەردەگیرێ.

**الوَقْوَاقَةُ**: زۆر بڵێو چەقە چەناو ٥ دەگوترێ: (رجل وقواقة وامرأة وقواقة).

**وقى الفَرَسُ من الحفى يقى وقياً**: ئەسپەکە بەهۆی ناڵ نەکردنیەوە بەری سمەکانی سوانو بەحاڵ قاچی لەزەوی دەناو لەرِۆیشتن دەترسا.

**وقى الشَيْئَ وقياً**: شتەکەی پاراست نەیهێشت توشی ناخۆشی ببێو زیانی پێ بگا ٥ دەگوترێ: (وقاه الله من السوء): خودا لەزیان پاراستی.

**وقى الامر وَقياً**: کارەکەی چاك کرد.

**وقاه توقيةً**: چاودێری کردو پاراستی.

**إتَّقى بالشَيْئِ**: خۆی بەشتەکە پاراست ٥ شتەکەی کردە مەتاڵ بۆخۆی بۆئەوەی پارێزراوبێ.

**إتَّقى اللهَ**: لەسزای خودا ترساو خۆی لەوشتانە پاراست کەخودا پێی ناخۆشە.

**إتَّقَى الشَيْئَ**: لەشتەکە حەزەری کردو خۆی پاراست.

**تَوَقَّاهُ**: حەزەری کردو خۆی پاراست ٥ لەحەدیث دا هاتووە (وتَوَقَّ کرائم أموالهم): لەزەکات وەرگرتن دا لەماڵە باش‌و رەسەنەکەیان خۆ بپارێزن‌و ئەوەیان لێ مەسێنن.

**تَوَقَّاهُ**: بەمانا (وقاه)دێ.

**التُّقاةُ**: ترس‌و بیم ٥ (ك: تُقىً).

**التَّقوى**: لەخواترسان‌و پابەند بوون بەفەرمان‌و نەهیەکانی ٥ ترس‌و بیم.

**التَّقِيَّة**: ترس‌و بیم ٥ بەلای شیعەوە ئەوەیە لەکاتی پێویست دا حەق‌و راستی زۆر لێودەیی‌و بەرواڵەت بەتاڵ‌و ناحەق بەحەق بزانێ‌و زەمانە سازی بکەی بەمەبەستی خۆپاراستن لەزیانی بەرامبەر.

**التَّقِيُّ**: خودا پەرست ٥ لەخودا ترس ٥ (ك: أتقياء).

**المُوَقَّى**: ئازاو چاونەترس.

**الـواقي**: باڵندەیەکە لەچۆلەکە گەورەترە، سەرزل‌و دەندوك گەورە جرو جانەوەری بچوك نێچیردەکا وادەبێ چۆلەکەش دەخوا.

**الواقِيَة**: هەرشتێك بیکەیە مەتاڵ‌و دیوجامەو پارێزەری شتی تر ٥ (ك: أواق).

**الوَقَّاءُ**: صیغە موبالەغەیە ٥ واتە زۆر پارێزەر بێ ٥ دەگوترێ: (رَجُلٌ وِقاءٌ): پیاوێکە زۆر خۆپارێزە.

**الوِقايَة**: ئەوشتەی شتی تری پێ بپارێزرێ.

**الوَقِيَّةُ**: لوغەتێکە لە (الأوقية) ٥ (ك: وقايا).

**تكَىَ يَتْكَأُ تَكَأً**: دانیشت‌و پاڵی دایەوە.

**إتَّكَأَ فلاناً**: فلانکەسی لەمەجلیسی خۆی دا دانیشاند ٥ هەڵی نا بۆئەوەی دابنیشێ ٥ دەگوترێ: (ضربه فأتْكَأهُ): لێی داو پاڵی خست یان لەسەر تەنیشتی چەپی رایکێشا.

**اوكَأ على الشَيْئِ**: پشتی بەشتەکەوە دا.

**اوكَأ فلاناً**: کورسی‌و بالیفی بۆ فلانکەس دانا بۆئەوەی لەسەری دابنیشێ‌و پاڵ بداتەوە.

**وَاكَأ على يديه مواكاةً ووِكاءً**: تینی دایە سەر دەستەکانی بەرزی کردنەوەو لەخودا پاڕایەوە.

**تَوَكَّأَ على الشَيْئِ**: خۆی بەسەر شتەکەدا دا.

**توكَّأت الناقة**: حوشترەکە ژان گرتی‌و باراندی.

**التُّكَأةُ**: هەرشتێك خۆتی بەسەرا

بدەی وەکوو عەصاو گۆچانو شمشێر ٥ کەسێك زۆر خۆبخاتە سەرشت، زۆر خۆ بەسەر گۆچانو شتی وادا دا ٥ تەمبەڵو قونگران.

**المُتَّكَأُ**: کورسیو بالیفو شتی وا کەپاڵی پێوە دەی، یان لەسەری دانیشیو پاڵ بدەیەوە.

**المُتَّكِئُ**: کەسێك لەسەر کورسی دانیشێو پاڵ بداتەوە بەپاشی کورسییەکەوە.

**وَكَبَ يكبُ وكباً ووكباناً**: بەهێواشی رۆیشت ٥ هەستاو راست بۆوە.

**وَكَبَ على الأمر**: بەردەوام بوو لەسەر کارەکە.

**وَكِبَ التمرُ**: خورماکە رەنگی رەش بوو گەیشت.

**وَكِبَ الثوبُ**: قوماشەکە چڵکن بوو.

**اوكب فلان**: فلانکەس چووە ناو ریزی کۆمەڵەوەو لەگەڵیان هاوشان بوو.

**اوْكَبَ الامْرَ**: لەسەر کارەکە بەردەوام بوو.

**اوكَبَ الطائرُ**: باڵندەکە خۆی ئامادەکرد بۆ فڕین.

**اوْكَبَ فلاناً**: رقی فلانکەسی هەڵساند.

**واكَبَ على الشَيْئِ مواكبة ووكاباً**: بەردەوام بوو لەسەر شتەکە.

**واكَبَ الامیرَ**: لەگەڵ مەوکیبو کاروانی ئەمیر دا کەوتەڕێو لەگەڵ ئەوان دا سوار بوو.

**واكَبَ المَوْكِبَ**: لەگەڵ قافڵەو مەکیبەکەدا بەڕێ کەوت.

**واكَبَ القومَ**: پێش خەڵکەکە کەوت.

**وَكَّبَ العنَبُ**: ترێیەکە خەریکە رەش ببێو بگا.

**وَكَّبَ التمرُ**: خورماکە لەکاتی گەیشتن دا رەش بوو.

**المَوْكِبُ**: حوشتر سوار، قافڵەیەك حوشتر کە کورتانو تەدارەکیان رازابێتەوە، سوارەکانیان پۆشاکی جوانو رێکو پێکیان لەبەردابێ، هەندێ جار سازو سەمتورو شتی واشیان لەتەك دابێ ٥ هەندێ کەسیشیان پیادەبن ٥ ئێستا بارو دۆخەکە گۆڕاوە لەجیاتی حوشتر ئوتومبیلی جوانو ئاخر مۆدێل بەکاردێ (مەوکیبی مەسعود بارزانی، مەوکیبی سەرەك وەزیران، مەوکیبی سەرەك کۆمار).

**المُوَكَّبُ**: خورمای ئاڵو بۆڵ تێکەوتو بەچقڵو شتی وا کونی تێ دەکرێ بۆئەوەی زو بگا.

**الوَكّابُ**: کەسێك زۆر غەمبار بێ.

**الوَكوبُ**: دەگوترێ: (ظَبيَةٌ وكوب) ئاسکێکە لەجەڵبە ئاسکەکە تەرەنابێ.

**وَكَتَ فِي الشَيْئِ يكت وَكْتاً**: كاری تێ کرد.

**وَكَتَ البُسْرُ**: خورماکە خەریکە ئاڵو بۆڵی تێکەوێو دەنکەی لێ شیرین ببێ.

**وَكَتَتِ الدَّابَّةُ**: وڵاخەکە پەلەی کرد لەقاچ هەڵبرینو قاچ دانان دا.

**وَكَتَ فلان القِربَةَ**: فلانکەس کوندەکەی پرکرد.

**المَوْكُوتُ**: دەگوترێ: (رجل موكوت): پیاوێکە پڕە لەرقو قین.

**الوَكْتُ**: شوێنکەی کەم لەسەر شت کە لەرەنگی خۆی نەبێ ٥ خاڵی سور لەسپێنەی چاودا ٥ یان خاڵی سپی لەرەشێنەی چاودا.

**الوَكّاتُ**: کەسێك هەنگاوی کورت بهاوێو ناقۆڵابڕوا.

**الوكيت**: دوزمانیو فیتنە جۆیی کردن دژی خەڵك لای فەرمانڕەوا.

**اسْتَوْكَثَ**: بەرکوڵی خوارد (خواردنێکی کەمو سوك تاخواردنی تەواو پێ دەگا).

**الوكاثُ**: بەرکوڵی خواردنی پێش نیوەڕۆ.

**وَكَحَهُ برجله**: بەقاچ پانو پلیشی کردەوە.

**اوْكَحَ**: ماندو بوو ٥ سوالکەرەکەی جواب کردو لێی تورەبوو.

**اوْكَحَ عن الأمر**: وازی لەکارەکە هێنا.

**اوكَحَ فِي الحفر**: لەبیر هەڵکەندنەکەدا گەیشتە شاخو تەباری سەخت.

**اوكَحَ العَطِيَّةَ**: بەخششو دەسەندەکەی بڕی.

**اسْتَوْكَحَ**: وازی لێ هێناو چی تر بەخششی نەدایە ٥ دەگوترێ: (سَألَهُ فاستوكحَ): داوای لێ کردو نەیدایە.

**إسْتَوْكَحَ الفِراخُ**: لقە سەوزەوەبووەکانی شوێنە بڕاوی درەختەکە ئەستوربوونو گەورەو پتەوبوون.

**الأوكَحُ**: شوێنی رەقو پتەوی زەوی ٥ بەردو شاخ ٥ گڵ.

**الوُكُحُ**: لقە سەوزەوەبووی شوێنی بڕاوی درەخت کەباش بڕین هەڵیدابێتەوەو گەورە بووبێ.

**وَكَدَ بالمكان يَكدُ وكوداً**: لەشوێنەکە مایەوە.

**وَكَدَ الرَّحْلَ**: بارو بارگەنەکەی شەتەك دا.

**وَكَدَ العَقْدَ**: گرێبەستەکەی کردە دیکومێنتو مۆری کردو شایەتی لەسەر گرتن.

**وَكَدَ الأمْرَ**: لەکارەکەدا بەردەوام بوو خەریکی بوو.

اوكَدَ السَّرْجَ: زینەکەی لەسەر پشتی ئەسپەکە شەتەك دا ٥ دەشگوترێ: (آكد السَّرْجَ).

اوكَدَ العَقْدَ: گرێبەستەکەی پتەوکرد مۆری لێ داو شایەتی لەسەر گرتن ٥ دەشگوترێ: (آكَدَ العَقْدَ).

وكَّدَ السَّرْجَ والعَهْدَ: دەق مانای (أوكدهما) دەگەیەنێ ٥ دەشگوترێ: (أكَدَهما).

تَوَكَّدَ: پتەو بوو جێگیر بوو.

التَّواكيدُ التأكيد: ئەوتیلمە سیرمانەن کە قەپوچکی زینی پێ دەبەسترێتەوە بەملاو بەولای زینەوە.

التوكيد: بەلای زانایانی نەحوەوە ئیسمێکە جەخت لەمانای ئیسمێکی پێش خۆیەوە دەکاتەوە هەمان ئیعرابی ئەوی دەدرێتێ ٥ تەئکید دوجۆری هەیە تەئکیدی لەفزی تەئکیدی مەعنەوی.

المُتَوَكِّدُ: ئامادە باش بۆ کارو سەرپەرشتیاری کار.

المُواكِدَةُ: حوشترێك بەردەوام بێ لەسەر رۆیشتن.

الوكاد: حەبلێکە مانگای پێ دەبەسترێتەوە لەکاتی دۆشینی دا ٥ یان ئەو تیلمە سیرمەیەیە کە قەپوچکی زینی پێ دەبەسترێتەوە بەملاو بەولای زینەوە.

الوُكْدُ: خەفەت، نیازو مەبەست.

الوُكْدُ: هەوڵو تێکۆشانو کردەوە ٥ دەگوترێ: (مازال ذلك من وَكْدِي): تائێستا ئەوە ئیشی سەرەکی منە.

وَكَرَ الطائر يَكرُ وكراً ووكوراً: باڵندەکە چووە ناو هێلانەکەی.

وَكِرَ الظَّبيُ وَكِراً: ئاسکەکە بازی دا.

وكَرَتِ الناقَةُ: حوشترەکە بەجۆرە بازدانێك بازی دا.

وَكَّرَ فلان للقوم: فلانکەس رێگای سەر ئاوی بۆ خەڵکەکە کردەوە.

وَكَّرَ القومَ: نانخواردنی تایبەت بەتەواو بوونی خانوی بۆ خەڵکەکە دروست کرد.

وَكَّرَ السقاءَ والمِكيالَ: گوزەو کوڵێنەو تەنکەرو قسناغو شتی وای پڕکرد ٥ دەشگوترێ: (وَكَّرَ بَطْنَهُ): گەدەی خۆی پڕکرد لەخواردن.

الوَكْرُ: هێلانەی باڵندە کە هێلکەی تێدا دەکاو جوجکی تێدا هەڵدێنێ جا لەکونە شاخ دا بێ یان لەسەر درەخت بێ یان لەشوێنی تر بێ ٥ هەروا وشەی (الوَكْرُ): جۆرێکە لەبازدانو هەڵزەنینەوە.

الوَكَرى: جۆرە رۆیشتنو بازدانێکە ٥

دهگوترێ: (إمـرأة وَكَـرى): ئافرەتێکە کە دەڕوا توند پێی بەزەوی دا دەدا ٥ (ناقة وَكَرى): حوشترێکی کورتی خوگەو بەگوڕە.

**الـوَكْرَةُ:** یەکجار ٥ لانەی باڵندە، هێلانەی باڵندە ٥ جۆرە زیافەتو نانخواردنێکە بەبۆنەی تەواوبونی خانووەوە دروست دەکرێ.

**الـوُكْرَةُ:** رێگای چوونە سەربیرو دوێلاّو.

**الوَكّارُ:** بازهاوێژ.

**الوَكِيرُ:** بەمانا (الوَكْرَة)دێ.

**وَكَزَ فلان (يَـكزُ) وكزاً:** فلاّنکەس بازی دا.

**وَكَـزَ في عَـدْوِه مـن فـزع:** لەڕاکردن دا پەلەی زیاتر کرد.

**وَكَزَ فلاناً:** پاڵی بەفلاّنکەسەوە ناو لێی دا مستە کۆڵەی لێ دا ٥ مستەکۆڵەی لەچەناگەی دا.

**وَكَزَ انْفَهُ:** لوتی شکاند.

**وَكَزَ فلاناً بالرمح:** بەڕمب زەبری لەفلاّن دا.

**وَكَزَ الرمْحَ في الأرض:** رمبەکەی لەزەوی چەقاند.

**وَكَـزَ الـزِّقَّ:** مەشکەکە یان کوندەکەی پڕکرد.

**تَـوَكَّزَ للأمـر:** خۆی بۆ ئیشەکە ئامادەکرد.

**تَوَكَّزَ مِن الطَّعَام:** ورگی خۆی پڕکرد لەخۆراك.

**تَوَكَّزَ على الطَّعَام:** ورگی خۆی پڕکرد لەخۆراك.

**تَـوَكَّزَ علـى عَـصَاهُ:** خۆی بەسەر عەصاکەدا دا.

**الوَكَزَى من النوق:** حوشتری کورتو کوڵەبنە.

**وَكَسَ الشَيْئَ (يَكسُ) وكْساً:** شتەکەی کەم کرد.

**وَكَسَ فلاناً:** زیانی بەفلاّنکەس گەیاند.

**وُكِسَ في تجارته:** لەبازرگانیکردنەکەی دا زەرەر مەند بوو.

**اوكِسَ في تجارته:** بەمانا (وُكِسَ) دێ.

**وَكِّسَ مالَهُ:** ماڵی خۆی کەم کردەوە.

**وَكَّسَ فلاناً:** سەرزەنشتی فلاّنکەسی کرد.

**الأوْكَسُ:** (رَجُـلٌ أوْكَـس): پیاوێکی هیچو پوچو خوێڕییە.

**الوكسُ:** دەگوترێ: (بَرَأتِ الشَجَّةُ على وكـس): برینەکە ماویەتی چاك بێتەوە ٥ مەنزڵێکە لەمەنزڵەکانی مانگ کە تێیدا دەگیرێ ٥ (بيع الوكس): شت فرۆشتن بەزەرەر.

**وَكَـظَ على الأمر يَـكظُ وَكْظاً:** لەسەر کارەکە بەردەوام بوو.

**وَكَظَ الشَيْءَ:** شتەکەی پاڵ پێوەناو بەشتەکەی کێشا ٥ دەری کرد ترۆی کرد.

**واكَظَ على الأمر مُواكَظَةً وَوِكاظاً:** بەردەوام بوو لەسەر شتەکە.

**تَوَكَّظَ عليه الأمر:** ئیشەکەی لێ سوڕا کارەکەی لێ شێوا.

**وَكَعَ البعيرَ يَكَعُ وَكْعاً:** بەهۆی توندی ئازارەکەیەوە کەوتە سەرزەوی.

**وَكِعَت الدجاجَةُ:** مریشکەکە فسی دایەوە بۆ کەڵەشێرەکە.

**وَكَعَ الشاةَ:** گوانی مەڕەکەی لەکاتی دۆشین دا هەڵتەکاند.

**وَكِعَ فلاناً بالأمر:** فلانکەسی عەیبدار کرد.

**وَكِعَ فلان يَوْكَعُ وَكَعاً:** سەری قامکە گەورەی قاچی روی کردۆتە قامکی ناوەڕاستی قاچی بۆئەوەی وێنەی گرێ دروست بکا لەبنکی قامکەکە ٥ ئەحمەق بوو خوێڕیو ناپیاو دەرچوو ٥ (فهو أَوْكَعُ وهي وَكْعاءُ).

**وَكُعَ الرجُل يَوْكُعُ وكاعَةً:** پیاوەکە خوێڕیو هەتیومچە دەرچوو.

**وَكُعَ الشَيْءُ:** شتەکە پتەو بوو توندو ڕەق بوو ٥ (فهو وكوع).

**اوكَعَ الرجُلُ:** پیاوەکە خێرو بێری کەم بوو ٥ کارێکی خراپی ئەنجام دا.

**اوكَعَ القوم:** خەڵکەکە حوشترەکانیان قەڵەو بوونو پێگەیین.

**اوكَعَ الأمْرُ:** کارەکە دامەزرا.

**اوكَعَ فلان في الأمر:** فلانکەس لەکارەکەدا توند ڕەوی کرد.

**اوكَعَ الشَيْءَ:** شتەکەی چەسپاندو جێگیری کرد.

**اوْكَعَ السقاءَ:** دیمکەناوەکەی دامەزراند.

**وَاكَعَ الديكُ الدجاجَةَ:** کەڵەشێرەکە بەمریشکەکەدا فسی.

**إتَّكَعَ الشَيْءُ:** شتەکە پتەو بوو.

**استوكَعَ فلان:** فلانکەس مەعیدەی بەهێز بوو.

**استَوْكَعَ الفِراغُ:** لقە سەوزەوەبووەکانی شوێنی بڕاوی درەختەکە گەورەبوون، ئەستورو پتەو بوون.

**استوكَعَ السِّقاءُ:** دێمکەکە شوێن تەقەڵەکانی هاوسانو ئاویان هەڵمژیو ئاوی لێ ناچێ.

**المِيكَعُ:** دێمکە ئاوی پتەو، کوندە ئاوی پتەو ٥ هۆڕو جەواڵ ٥ ماڵماڵ کەزەوی کێڵدراوی پێ تەخت دەکرێ.

**الوَكْعاءُ:** ئەحمەق ٥ ئازاراوی.

**الوَكيع**: پێشەنگی مەڕ، مەڕێك كە مەڕەكانی تر شوێنی بكەون ◊ حوشتری بەهێزو جەستە دامەزراو ◊ دەشگوترێ: (أمر وكيع): كارێكی قايمو پتەوو بناغە دامەزراوە ◊ قلب وكيع: دڵی بەئاگاو هۆشدار.

**وَكَفَ الماءُ وغيره يكِف وَكْفاً**: ئاوەكە دڵۆپ دڵۆپ داچۆڕا.

**وَكَفَ البيت بالمطر**: بەهۆی بارانەوە سەقفی خانوەكە دڵۆپە دەكا.

**وكَفَتِ العَيْنُ**: چاوەكە فرمێسكی ڕشتن ◊ دەشگوترێ: (وَكَفَتِ العينُ بالدمع).

**وَكِفَ يَوْكف وَكْفاً**: لای داو ستەمی كرد ◊ عەیبدار بوو تاوانی ئەنجام دا.

**وَكِفَ عقلهُ ورأيه**: عەقڵو راو بۆچونی خراپو بێ كەڵك بوو.

**وَكِفَ الماء والدمعُ ونحوهما**: بەمانا (وَكَفَ) دێ.

**اوكَفَ الحامِلُ**: سكپڕەكە نزیكە منداڵی ببێ.

**اوكَفَ فلان فلاناً**: فلانكەس فلانكەسی خستە ناو تاوانەوە.

**اوكِفَ الدّابّة**: وڵاخەكەی كورتان كرد.

**واكَفَهُ**: بەربەرەكانی كرد ◊ روبەڕوی بووەوە.

**وَكّفَ الدّابَة**: كورتانی خستە سەرپشتی وڵاخەكە.

**وَكّفَ الوكافَ**: كورتانی دروست كرد.

**تَوَاكَفَ القومُ**: خەڵكەكە لایان دا.

**تَوَكّفَ البيتُ والسَّطحُ**: هەڵاشەكە، خانوەكە دڵۆپەی كرد.

**تَوَكّفَ فلان لفلانٍ**: فلانكەس بەرەو ڕوی فلان چوو بۆئەوەی پێی بگا توشی ببێ.

**تَوَكّفَ فلاناً**: وادەی دا بەفلان كە بیر لەنیشەكەی بكاتەوەو كاری بۆ جێ بەجێ بكا.

**تَوَكّفَ الأثر**: شوێن پێی فلانی هەڵگرتو بەشوێنی دا ڕۆیشت.

**تَوَكّفَ الخَبَرَ**: چاوەڕوانی هەواڵەكە بوو پرسیاری دەربارەی كردو لێی كۆڵییەوە.

**إستَوكَفَ الماءَ**: هەوڵی دا ئاوەكە دڵۆپ دڵۆپ بێتەدەر.

**الوَكِفُ**: بارانی بەخوڕەم یان بارانی پەڵە.

**الوكافُ**: كورتانی گوێدرێژو وڵاخی تر.

**الوَكْفُ**: ڕاخەری چەرم، كەوڵە كۆن ◊ زوربەی كات كەسێك حوكمی ئیعدامی درابێ لەسەر ئەو جۆرەكەوڵە بەشمشێر لەملی دراوە.

**الوَكَفُ**: بناری كێو.

**الوكُوف من النوق**: حوشترێك هەمیشە شیربداو شیری وشك نەكا ○ (الوَكوُفُ): ناوە بۆ مەڕی شیر زۆر ○ هەورێك كەمكەم باران ببارێنێ.

**الوكيفُ**: خودی دڵۆپە باران.

**وكَلَ باللهِ يَكِلُ وَكْلاً**: پشتی بەخودا بەست.

**وكَلَتْ الدابَّةُ**: وڵاخەكە لەڕۆیشتن وەستاو ماندوو بوو.

**وَكَلَ اليه الأمْرَ وَكْلاً ووكولاً**: كارەكەی بەوسپارد.

**وكَلَ فلاناً الى رايه**: فلانكەسی پاشگوێ خستو پارمەتی نەدا بەبیروڕای خۆی سپارد چی دەكا بیكا ○ لەحەدیث دا هاتووە (اللهم لاتكِلْنا الى أنفسنا طرفة عين): خودایە چركەیەك بێ چاودێری خۆتمان مەكە ○ خۆمان بەخۆمان مەسپێرە.

**اوكَلَ على اللهِ**: بەمانا (وَكَلَ)دێ.

**اوكَلَ على فلان العملَ**: هەموو ئیشەكەی بەئەو سپارد.

**واكَلَتِ الدابَّةُ**: وڵاخەكە خراپ ڕۆیی ○ (رجُلٌ مُواكِل): پیاوێكی زەعیف.

**وكَّلَهُ**: كردی بەبریكاری خۆیو ئەنجامدانی كارەكانی بەئەو سپارد، دەشگوترێ: (وَكَّلَهُ في الأمر): ئیشەكەی بەئەو سپارد.

**إتَّكَلَ على اللهِ**: پشتی بەخودا بەست.

**إتَّكَلَ على فلان في أمر**: پشتی بەفلان بەست لەئیشەكەدا.

**تَوَاكَلَ القومُ**: خەڵكەكە پشتیان بەیەكتر بەست.

**تَوَاكَلَ القومُ فلاناً**: خەڵكەكە فلانكەسیان پاشگوێ خستو وازیان لێ هێناو یارمەتییان نەدا لەسووككردنی ئەو بەڵایەی توشی هاتووە.

**تَوَكَّلَ الرجلُ بالأمر**: پیاوەكە بەرعودەی ئیشەكە بوو ○ قبوڵی وەكالەتەكەی كرد.

**تَوَكَّلَ على اللهِ**: خۆی تەسلیمی خودا كرد.

**تَوَكَّلَ في الأمرِ**: دانی بەبێ توانایی خۆی دا ناوپشتی بەهێزو توانای كەسانی دی بەست.

**التُّكلانُ**: بەمانا (التَّوَكُّلُ)دێ.

**التُّكلَةُ**: بەمانا (الوُكَلَةُ)دێ؛ كەسێك ئیشی خۆی بەخەڵك بسپێرێ.

**المُوَاكِلُ**: بەمانا (الوُكَلَةُ)دێ، دەگوترێ: (رجلٌ مُواكِل): پیاوێكە جوستو چالاك نیە.

**الوَاكِلُ من الخيلِ**: ئەسپێكە بەناخۆشی غاردەدا پێویستی بەئاوزەنگی لێدانو قەمچی هەیە.

**الوِكالُ**: گێلی‌و تەمبەڵی ٥ دەگوترێ:
(فيه وِكال): لاوازیی تێدایە.

**الوَكَالَـةُ**: بریکاری گـرتن، بریکـار بۆخـۆت دیاری بکەی‌و ئیشی پێ بسپێری لەجیاتی تۆ کارەکە ئەنجام بدا ٥ ئیشی بریکارو شوێنەکەی ٥ نوسینگەی وەکیل.

**الوَكَلُ**: ترسنۆك ٥ بەڵاو نەگبەتی ٥ دەسەوەسان‌و هیچ لەدەس نەهاتوو، کارێکی پێ بسپێردرێ ئەنجامی نـاداو داوا لەکەسانی تر دەکا بۆی ئەنجام بدا.

**الوَكِلُ**: دەسەوەسان‌و گێل‌و ترسنۆك.

**الوُكَلَـةُ**: کەسێـکە کارەکـانی خـۆی بەکەسانی تر دەسپێرێ.

**الوَكيـلُ**: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خـودا، بـەمانا بـەرعودەی بـژێوی هـەموو زیندەوەرێـکە ٥ پارێزگـارو چاودێر ٥ بـەرعودەو لەئەستۆگری کـاری خـەڵك ٥ کەسێـك دەبێتـە بریکـاری کەسـانی دیکـەو کـارو بارەکانیان هەڵدەسوڕێنێ ٥ کەسێـك دەبێتـە جێگرو ئیش ڕاپەڕێنی یەکێکی تـر بـەگوێرەی گرێبەستێکی نێوانیان‌و وەکیلەکە دەتوانێ بـەناوی وەکیـل گـرەوە ئیشەکان ئەنجام بدا.

**وَكَمَـهُ عـن حاجتـه يَـكمَهُ وَكْمـاً**: بەتوند ترین شێوە کابرای داواکارو ئاتاجی ڕەتکردەوە داخوازییەکەی جێ بەجێ نەکرد.

**وَكَـمَ الأمْـرُ فلانـاً**: کارەکـە فلانکەسی غەمبار کرد.

**وَكَمَ فلان الكلامَ**: فلانکەس وتی (السلامُ عـيلكِمُ) واتە کافی (عليكم) مەکسور خوێندەوە.

**وَكِـمَ مـن الـشَيْئ يَـكمُ**: لەشتەکە خەفەتبار بوو ناڕەزایی دەربڕی.

**وَكِمَـتِ الأرضُ**: زەوییەکـە لـەوەڕی خـوراو بـوو بەسـوتەمەڕۆو هیـچی وای لـێ نەما خێڵ والـێ بکا تێیـدا بمێنێتەوە.

**وَكَـنَ الرجـلُ يَـكنُ وَكْنـاً**: بـەگورجی‌و تورەیی ڕۆیی ٥ دانیشت.

**وَكَـنَ الطـائِرَ وكنـاً ووكونـاً**: باڵندەکـە چووە کولانەکەیەوە.

**وَكَنَ بَيْضه**: لەسەر هێلکەکانی کڕکەوت.

**تَوَكَّنَ**: جێـگیر بـوو ٥ لەمـەجلیس دا جوان دانیشت.

**المَـوْكِنُ**: ئەوشـوێنەی باڵنـدە تێیـدا لەسەر هێلکەکانی کڕدەکەوێ.

**مَوْكِن الطائر**: هێلانەی باڵندە.

**المَوْكِنَة للطائر**: هێلانەی باڵندە.

**الـوَاكِن**: دانیـشتو ٥ باڵنـدە کـە لەسـەر دارو دیوار هەڵدەنیشێ.

**الـوَكْنُ**: هێلانەی باڵندە لەهەر شوێنێك بێ.

**الوُكْنَة للطائِر**: هێلانەی باڵندە.

**وَكْوَكَ الحَمَامُ**: کۆترەکە خوێندی.

**وَكَـى الصُرَّة ونحوها**: ناوکی بەدەزو بەست.

**أوكى**: رژد بوو، چاو چنۆك بوو.

**أوكى الفرسُ**: ئەسپەکە بازی توندی هاویشت.

**أوكى الصُرّةَ**: ناوکی بەدەزوو گرێ دا.

**أوكى القِرْبَةَ**: دەمی کوندەکەی بەست ٥ دەشگوترێ: (أوْكِ حَلْقَكَ): بێدەنگ بە، دەمت بگرە، هەروا دەگوترێ: (فلان يُوكي فلان): فلانکەس فەرمان دەکا بەفلان کە بێدەنگ بێ.

**استوكى البطنُ**: ورگی گیرا، قەبز بوو.

**استوكت الناقةُ**: حوشترەکە قەڵەو بوو.

**استوكى السِّقاءُ**: کوندەکە پڕبوو.

**الموُكى**: کوندەی دەم بەستراو.

**الوكاءُ**: ئەو بەنەی زارکی کوندەو مەشکەی پێ دەبەسترێ یان دەمی کیسە دراوو هەمبانەی نان و شتی وای پێ دەبەسترێ.

**وَلَبَ يَلِبُ وُلُوباً**: بەگورجی چووە ناوەوە ٥ دەگوترێ: (وَلَبَ فِي الشَيْءِ) يان (وَلَبَ الشَيْءُ اليه): شتەکەی بەدەست گەیشت.

**الوَالِبَةُ**: ئەو نەمامو رووەکەیە کەلەڕەگە ڕووەکەکەوە سەوز دەبێ، وەچەو ڕەچەڵەکی ئادەمیزادو ئاژەڵ.

**وَلَتَهُ حَقَّهُ**: مافی کەم کردەوە.

**اولَتَهُ حَقَّهُ**: مافی ئەوی کەم کردەوە.

**وَلَثَ فلاناً بالعَصَا يَلِثُهُ**: بەعەصا لەفلانکەسی دا.

**وَلَثَ لفلان عقداً**: گرێبەستێکی لاوازی بۆ فلانکەس نووسی.

**وَلَثَ السماءُ القَوْمَ**: ئاسمان بەنمە بارانێك خەڵکەکەی تەڕکرد.

**الوَالِثُ**: دەگوترێ: (شرّ والث): شەڕی بەردەوام، (دين والث): قەرزی قورس و پشت شکێن.

**الوَلْثُ**: وادەو پەیمان لەنێوان خەڵك دا بەبێ مەبەست و بێ نوسین و جەخت کردن لەسەری ٥ وادەی لاوازو بێ گرنگی پێدان ٥ نمەباران، باقی ماندەی ئاو لەبنکی سوراحی دا ٥ باقی ماندەی هەویر لەتەشتی هەویردا ٥ شوێنەواری چاوهێشە لەسەر چاو.

**وَلَجَ الشَيْءُ في غيره يَلِجُ ولوجاً**: شتەکە چووە ناو شتی ترەوە.

**وَلَجَ البيت**: چووه ناو خانوەکەوە ◊ (فهو والِج وهي والِجة).

**وَلِـجَ فـلان**: فلانکەس توشی ئازار بو ◊ (فهو مولوج وهي مولوجة).

**اولَجَهُ**: خستیە ناوی داخلی شتەکەی کرد.

**وَلَّجَ مَالَهُ**: کابرا لەژیانی خۆی دا ماڵو سامانەکەی دا بە هەندێ لەمنداڵەکانی.

**إتَّلَجَ الشَيْئ**: شتەکەی خستە ناوی.

**تَوَلَّجَ فِي البيت وعلى القوم**: چووە ناو خانوەکەوە، چوە ناو خەڵکەکە.

**التَّلَجُ**: بێچووە داڵاش.

**المَـوْلَجُ**: شـوێنی چـوونە نـاوەوە، دەروازە، مەدخەل.

**الوَلِجَةُ**: ئازارێکە توشی مـرۆڤ دەبێ ◊ هـەروا نـاوە بـۆ مـارو مـورو جـڕو جانەوەر.

**الـولاجُ**: دەرگـا ◊ شـیوو دۆڵ ◊ شـوێنی چـڕو سـەختو ناخۆشـی زەوی ◊ کۆڵانو گەڕەك، دەڤەر.

**الوَلّاجُ**: شتێـك زۆر بچێتە ناو شتەوە ◊ دەگـوترێ: (فـلان وَلّاج خَـرّاج): فلانکـەس زۆر دەروژوور دەکـا، هەردەچێتە ژورەوەو دێتە دەر.

**الوَلَجَـةُ**: پـێش بـێلای خـانو ◊ ئەشـکەوتو شـتی وا کـە ڕێبـوار لـەکاتی بـاران بـارین دا بـچنە نـاوی بۆئـەوەی تەڕنـەبن ◊ دەروازە، مەدخەل بۆ چوونە ناو خانوو.

**الوُلَجَةُ**: شتێـك زۆر بچێتە نـاو شـتو بێتە دەر.

**الوَلِجَةُ**: دەستو پێوەنـدو خزمـەتکارو حەرەسـی پیـاو کـە پـشتیان پـێ ببەسـترێو خزمیـشی نـەبن ◊ دەگـوترێ: (هـو ولیجـتکم): ئـەو بـەئێوەوە لکاوەو بۆتـە ئەندامێـکی ئێوە.

**وَلَخَهُ يَلِخُهُ وَلْخاً**: شەبلاغەی لـێ دا.

**اولَـخَ العُـشْبُ**: گیـاو گژەکـەی بـەرز بۆوە، گەورە بوو.

**إتَّلَخَ الأمْرُ**: کارەکە شێواو تێـکەڵو پێـکەڵ بوو.

**وَلَـدَت الأنثـى تَلِـدُ ولاداً وولادة**: سکپڕەکە سکەکەی دانا، دەشگوترێ: (وَلَدَت الجنينَ): زارۆکەکەی بوو.

**اولَـدَتِ المـراةُ**: ئافرەتەکـە کـاتی منـداڵبوونی هـات، کەوتـە نۆمـانگو نۆڕۆژی خۆیەوە.

**اولَدَت الشاةُ**: مەڕەکە زا، بێچوی بوو.

**اولَدَت القابلةُ المراةَ**: مامانەکە سەرو کاری منداڵبوونی ژنەکەی کرد.

**وَلَّـدَ الأنثى**: ئامـادە بـوو بـۆ مامـانی کردنی ئافرەتـە سکپڕەکە بۆئـەوەی

یارمەتی بداو چارەسەری گیرو گرفتەکانی بکاو منداڵەکەی لێ بێتەوە ◦ دەشگوترێ: (وَلَّدَ الشاةَ ونحوها): شوانەکە هەوڵی دا مەڕەکە بەئاسانی بێچوەکەی لێ بێتەوە.

**وَلَّدَ الوَلَدَ**: منداڵەکەی پەروەردە کرد.

**وَلَّدَ الشَیْئ مِن الشَیْئ**: شتەکەی لەشتەکە دەرهێنا ◦ شتەکەی لەشتەکەی تر دروست کرد ◦ بەدیی هێنا.

**وَلَّدَ الکلامَ والحدیثَ**: قسەی دروستکرد، حەدیثەکەی هەڵبەست.

**تَوَالَدُو**: زۆر بوون ◦ زاووزێیان کرد.

**تَوَلَّدَ الشَیْئُ مِن الشَیْئِ**: شتەکە لەشتەکەی تر دروستبوو.

**استولَدَ المراةَ**: ئافرەتەکەی ئاوس کرد .

**اللِدَةُ**: هاوتەمەن، ئەوکەسەی بەیەك رۆژ لەگەڵ یەکێکی تر لەدایکبووبێ.

**المولِدُ**: شوێنی لەدایکبوون ◦ کاتی لەدایك بوون ◦ (ك: موالِد).

**المُوَلَّدُ**: تازە پەیدابوو لەهەرشتێك بێ ◦ (الشعراء المولَّدون): شاعیرانی تازە پێگەیشتوو، یان ئەو شاعیرانەی کەدوا بڵاو بوونەوەی عەرەبەکان بەوڵاتان داو تێکەڵبوونیان بەنەتەوەکانی تر، پەیدابوون، واتە شاعیرەکانی سەردەمی ئەمەوی‌و لەوەدوا دەکرێ ئەو ناوە یان لێ بنرێ.

**المُوَلَّدُ من الرجال**: عەرەبی دوڕەگ عەرەبێك باوکی یان دایکی عەرەب نەبێ ◦ یان کەسێکی ناعەرەب لەناو عەرەب دا لەدایك بووبێ‌و لەگەڵ منداڵە عەرەب دا پەروەردە کرابێ‌و خوی ئەوانی گرتبێ.

**المُوَلَّدُ من الکلام**: هەروشەیەك عەرەبی بێ بەڵام لەبەکارهێنان دا گۆڕانی بەسەردا هاتبێ.

**المُوَلَّدَةُ**: کەسێك لەناوعەرەب دا لەدایك بووبێ ◦ ئەو منداڵە ناعەرەبەی لەگەڵ منداڵە عەرەب دا پەروەردە بووبێ‌و ئاداب‌و ڕەوشتی ئەوانی وەرگرتبێ ◦ هەرشتێك تازە بابەت بێ‌و لەشتێکی تر پەیدا بووبێ ◦ دەشگوترێ: (جاء بِبَیِّنَةٍ مُوَلَّدة): بەڵگەیەکی ناڕاستی هێنا.

**المُوَلِّدُ**: پزیشك کەسەرپەرشتی منداڵبوونی سکپڕێك بکا.

**المولِّدَة**: مامان.

**المَولودُ**: منداڵی تازە لەدایکبوو.

**المیلادُ**: کاتی لەدایکبوون.

**الوالِدُ**: باوك ◦ هەروا ناوە بۆ مەڕێك ئاوس بێ.

**الوَالِدَانِ**: باوك‌و دايك.

**الوَالِدَة**: دايك.

**الوَلَدُ**: لەدايكبوو، هەرشتێك لەدايك بێ نێربێ یا مێ بێ ◦ (ك: أولاد ووِلْدة).

**الوُلْدُ**: بەمانا (الوَلَدَ)دێ.

**الوَلُودة**: دايك ◦ منداڵ زۆر.

**الوَلُودِيَّةُ**: بچوك، منداڵی ◦ كەم بەزەیی، نەشارەزا لەكارو باردا ◦ وشك تەبیاتی.

**الوَلِيدُ**: منداڵ لەوكاتەدا كەلەدايك دەبێ ◦ بەندەو كۆیلە ◦ خزمەتكاری گەنج ◦ (أم الوليد): نازناوی مریشكە.

**الوَلِيدَةُ**: مێینەی (الوَلِيدَ)ە ◦ كارەكەرو چەتیو ◦ كچۆڵە تادەگاتە تەمەنی باڵغ بوون ◦ كچێك لەناو عەرەب دا لەدايك بووبێ‌و خوی كچە عەرەبی گرتبێ.

**الوَلِيدِيَّةُ**: حاڵو ومزعی مرۆڤ لەسەردەمی منداڵی دا ◦ دەگوترێ: (فعل ذلك في وليديته).

**وَلَسَتِ الإبلُ تَلِسُ وَلْساً**: حوشترەكە خێرا رۆیی، لەرۆیشتن دا پەلەی كرد.

**وَلَسَ فلان فلاناً**: فلانكەس فێڵی لەفلان كرد.

**وَلَسَ الحديثَ**: بەكينايەو تەعريض قسەی ئاراستە كرد ◦ (فهو والس).

**اوْلَسَ بالحديث**: بەكينايەو تەعريض قسەی ئاراستە كرد ◦ دەشگوترێ: (وَالَسَتِ الإبلُ): حوشترەكان هەندێكيان لەنەرمە غارو گورگە لۆقەدا پێشبڕكێيان لەگەڵ هەندێكيان كرد.

**والَسَ فلان بالحديث**: بەمانا (أولس به)دێ.

**والَسَ فلاناً**: فێڵی لەفلانكەس كرد ◦ دەشگوترێ: (تَوَالَسَ القوم على الفلان): خەڵكەكە فێڵيان لەفلان كرد.

**الوَلْسُ**: فرت‌و فێڵ ◦ دەگوترێ: (مالي في هذا الامر وَلْسٌ ولا دَلْسٌ): من لەم ئیشەدا نەخیانەتم كردوە نەفێڵ.

**الوَلاَّسُ**: بۆ موبالەغەی (وَلَسَ)دێ ◦ گورگ.

**وَلِعَ يَلَعُ وَلْعاً**: بەهێواشی بازی دا ◦ درۆی كرد.

**وَلَعَ بحقه ولعاً**: مافی خوارد.

**وَلِعَ بە**: عاشقی بوو ◦ دەستی وەردایە كاروباری ئەوەوەو سوور بوو لەسەر ئەزیەتدانی.

**وَلَّعَ فلاناً بە**: فلانكەسی هەڵنا بەكردنی ئەوشتە.

**وَلَّعَ الداءُ جَسَدَ فلان:** نەخۆشییەکە جەستەی فلانکەسی بەڵەك کرد.

**تَوَلَّعَ بە:** عاشقی بوو، دڵی پێوەی نووسا.

**إتَّلَعَتْ فلاناً والِعَةٌ:** فلانکەس ئیشەکەی تەمو مزاوی بوو نازانرێ ماوە یان مردووە.

**إيتَلَعَ قَلْبَهُ:** دڵی دەرهێنا، دڵی لێ ستاند.

**الوَلِعُ:** درۆزن ٥ دەشگوترێ: (وَلَعٌ والِعٌ): درۆیەکی گەورەیە.

**الوَلِعَة:** مێینەی (الوَلِعُ).

**الوَلِعُ:** زۆر عاشقو شەیدا بۆ شتێك.

**الوُلَعَةُ:** کەسێك خۆبداتە شتێك کەپەیوەندی بەئەوەوە نیەو ئیشی ئەو نییە.

**المُوَلَّعُ:** دەگوترێ: (رجل مُوَلَّعٌ): پیاوێکە پەڵە پەڵە بەڵەکی پێوەیە ٥ (برذون مُوَلَّعٌ): هێسترێکە بەڵەکییەکەی درێژو بڵاو بۆتەوە.

**الولوعُ:** زۆر عاشقو شەیدا.

**الوَلِيعُ:** جرۆی دارخورما پەردەیەکە دەنکی چین چینی لەخۆ گرتوون مادەی تەلقیحو تۆمی تێدایە پێش ئەوەی بپشکوێ، دەنکەکانی ناوی چینە مرواری زۆر سپین.

**وَلَغَ الكلبُ وغيره من السباع في الإناء يَلَغُ ولغاً وولوغاً:** سەگەکە یان دڕندەیەکی تر زمانی خستە ناو قاپەکەوەو ئەوەی تێیدا بوو خواردی یان بەقەراخی زوبانی خواردیەوە یان زمانی تێخستو تێیدا گێڕا ٥ دەشگوترێ: (فلان يأكل لحوم الناس ويلغ في دمائهم): واتە فلانکەس پاشملە غەیبەتی خەڵك دەکا.

**أولَغَ الكلبَ:** ئاوی دا بەسەگەکە ٥ ئاوی بۆکردە قاپێکەوە بۆئەوەی بەزمانی بیخواتەوە.

**استولَغَ:** گوێی نەدایە عەیبو عار.

**المِبلَغُ:** ئەو سواڵەتو قاپەی سەگ دەمی تێدەخاو شتی تێدا دەخواو دەخواتەوە.

**الوَلْغَةُ:** یەکجار ٥ دۆڵچەی بچوك.

**وَلَفَ البرق يَلِف وَلْفا ووَلَفاناً:** هەورە بروسکەکە روناکییەکەی درێژەی کێشا، جار دوای جار ڕوناکی دا.

**وَلَفَ الفَرَسُ:** ئەسپەکە شێوە رۆیشتنێك رۆیی هەرچوار قاچی بەیەکەوە دەکەوتنە سەر زەوی.

**أولَفَ الشَيْئُ الشَيْئَ:** شتەکە شتەکەی داپۆشیو بوو بە پەردە بۆی.

**والَفَهُ موالَفَةً ووِلافاً:** پەیوەست بوو پێیەوە.

**توالَفَ الشَيْئُ مُوَالَفَةً:** شتەکە

هەندێکی پاڵی دایە پاڵ هەندێکی.

**الولاَفُ**: جۆرە رۆیشتنێکە هەرچوار پێی ولاخەکە بەیەکجار لەزەوی دەدەن.

**الوَلِیفُ**: هەورە بروسکەی یەك لەدوا یەك.

**وَلَقَ فِي سیرِه**: لەرۆیشتنەکەی دا پەلەی کرد ◦ بەردەوام بوو لەکارەکەدا ◦ دەگوترێ: (وَلَقَ في الکذب): بەردەوام بوو لەدرۆکردن دا.

**وَلَقَ فلاناً**: زەبرێکی سوکی لەفلانکەس دا کەمێك برینداری کرد.

**وَلَقَ فلاناً بالسیف**: بەشمشێر لەفلانکەسی دا.

**وَلَقَ عَیْنَهُ**: زەبری لەچاوی داو کوێری کرد.

**وَلَقَ الکلامَ**: درێژەی بەقسەکە دا.

**وَلَقَ الحدیثَ**: حیکایەتو چیرۆکەکەی دانا، هەڵی بەست ◦ چیرۆکەکەی داهێنا.

**الوَلْقُ**: پەلەکردن لەشت دا بەدو یەکتردا وەکو بازدان لەدوابازدانو بەخێرایی ◦ قسەکردن لەدوایەكو بەخێرایی ◦ خێرا خێرا قسەکردنو درێژە پێدانی.

**الوَلَقَى**: بازدانی توندو بەشیدەت ◦ دەشگوترێ: (ناقة وَلَقی): حوشترێکە خۆشڕۆ.

**اوْلَمَ فلان**: فلانکەس سفرەو خوانی بۆ خەڵك رازاندەوەو بانگی کردن بۆ نانخواردن.

**الوَلْمُ**: زنجیر ◦ قیاسەو کورتانبەستو بەرسینگ بۆ کورتانو زینو رەحلە.

**الوَلْمَةُ**: تەواوی شتو کۆبونەوەی.

**الوَلِیمَةُ**: هەر سفرەو خوانو نان سازکردنێك کە بەبۆنەی بوك گواستنەوەو شتی واوە ساز دەکرێ ◦ (ك: ولائم).

**وَلِهَ فلان یَلِه وَلَهاً**: فلانکەس ئەوەندە خەفەتبار بوو عەقڵی رۆیی ◦ یان لەبەر زۆر عاشقیو سۆزی دڵداری ماتو سەرسام بوو ◦ نالی دەڵێ:

خۆش لەسەرسینەی سەریهەڵداوە دووگۆیی سەربەمۆر
ماتو حەیرانم کە عەرعەر کەی هەناری گرتووە؟

**وَلَهَ**: لێی ترسا.

**وَلَهَتْ الأمُّ الی طفلها**: دایکەکە سۆزی بۆ منداڵەکەی بوو بۆی کورکاند.

**وَلَهَ الصَّبِيُّ الی امه**: منداڵەکە حەزی لەباوەشی دایکی کردوو کڕوزایەوە بۆلای ئەو.

**وَلِهَ یَلِهُ یَوْلَهُ وَلَهاً**: بەمانا (وَلَهَ)ی.

**اولَهَهُ الحُزْنُ والوَجدُ**: سۆزو خۆشەویستیو خەفەت سەرسامی کردوەو عەقڵی بردووە.

**أوْلَـهَ الوَالِـدةَ**: ددايكەكـەى توشى خەفەتو لەهۆشخۆچون كرد بەوەى منداڵەكـەى لـێ ستاند يـان منداڵەكەى توشى دەرد كرد.

**وَلَّهَـهُ الحُـزْنُ والوَجْـدُ**: بـەمانا (أوْلَهَهُ)دێ.

**وَلَّهَ الوَالِـدَةَ**: دايكو منداڵەكەى لێك جياكردنـەوە بـەوە دايكەكـە توشى خەفەتى گەورە بوو.

**إتَّلَـهَ النبيـذُ فلاَنـاً**: بـيرەو مـادە سـڕكەرەكە عـەقڵو هۆشـى فلاَنـى برد.

**تَوَلَّهَ فلان**: بەمانا (وَلَهَ)دێ.

**المُولَهُ**: دەگوترێ: (ماء مُولَـةٌ): ئاوێـكە بـەرەڵاى نـاو زەويەكـە كـراوەو بۆخـۆى پێيـدا بـڵاو دەبێتـەوە ٥ (إمرأة مُولَهَةُ): ئافرەتێكە منداڵى بۆ راناوەستێ هەر زوو لەبارى دەچێ.

**المِيلاَهُ**: بەپەرۆشو خەفەتخواردو بۆ ئەوشـتەى لەدەسـتى داوە ٥ دەگـوترێ: (امراة ميلاه): ئافرەتێـكە زۆر پەرۆشـى منداڵـە لـەدەس چـوومكەيەتىو خەريكـە لـەتاوانى شێت بێ ٥ رەشەباى بـەهێزو هـاژەو هۆژە پەيداكەر.

**وَلْوَلَـتْ المـراةُ وَلْوَلَـةً**: ئافرەتەكـە واوەيلاو هاتو هاوارى كرد.

**تَوَلْوَلَتْ المراةُ**: بەمانا (وَلْوَلَتْ)دێ.

**الوَلْـوَالُ**: دوعـاكردن بـەگريانو واوەيلاوە.

**وَلاَهُ يليه وَلْياً**: لێى نزيك بۆوە.

**وَلِيَهَ يليه وَلْياً**: بەمانا (وَلاَهُ)دێ.

**وَلِيَ الشَّيْئَ وعليه ولاية**: بوو بەخاوەنى شـتەكەو فـەرمانڕەواىو بەسـەرى راگەيشت.

**وَلِـيَ فلانـاً**: پارمـەتى فلاَنـى دا، خۆشـى ويست.

**وَلِـيَ البَلَـدَ**: بـوو بـە فـەرمانڕەواى وڵاتەكەو دەستى بەسەردا گرت.

**وُلِيَـتِ الأرْضُ**: زەوييەكـە بـەبارانى يەك لەدوايەك ئاودرا.

**اولَـى علـى اليتـيم**: رايـسپارد بـۆ چاودێرى هەتيو.

**اولَـى فلانـاً الأمْـرَ**: كارەكـەى خـستە ئەسـتۆى فلاَنكـەس ٥ لـەبوارى هەڕەشەكردنيش دا دەگوترێ: (أولَى لَـك): ئاگاداربـە شـەڕت لـێ نزيكـە خۆتى لـێ بپارێزە.

**والَـى بـين الأمـرين مـوالاةً ووِلاءً**: كارەكانى بەدويەك دا هێنان.

**والَى الشَّيْئَ**: شوێن شتەكە كەوت.

**والَى فلاناً**: فلاَنكەسى خۆش ويست ٥ يارمەتى دا.

**وَلَّى الرُّطَبُ**: خورما گەيومكە خەريكە بەرەو وشكبوون دەچێ.

**وَلَّى الـشَّيْئَ**: پـشتى لەشـتەكە كـرد،

پشتی هەڵکرد ٥ دەگوترێ: (وَلَّى فلان هارباً): فلانکەس پشتی هەڵکردو هەڵاتو قاچاندی.

**وَلَّى الشَيْئَ وعن الشَيْئِ:** پشتی لەشتەکە کردو لێی دوور کەوتەوە.

**وَلَّى فلاناً بودە:** خۆشەویستی بۆ فلان نەماو پشتی لێ کردو ڕقی لێیەتی.

**وَلَّى فلاناً:** یارمەتی فلانکەسی دا، ڕوی تێکردو پێشوازی لێ کرد.

**وَلَّى فلاناً الأمْرَ:** کارەکەی خستە ژێر دەسەڵاتی فلانکەسەوەو ئەوی کرد بەفەرمانڕەوا بەسەریەوە.

**وَلَّى فلاناً الحَاجَةُ:** پێویستیو ناتاجییەکە لای فلان نەما.

**تَوَالَى الشَيْئُ:** شتە یەك لەدوا یەك هات.

**تَوَالَتْ الغَنَمُ عن المعز:** مەڕەکان لەبزنەکان جیابوونەوە ٥ خۆی لەنەوەی ئەوان حیساب کرد ٥ دەگوترێ: (هو یتمولی علینا): ئەو خۆی لێ کردوین بەسەیید نەژادو نەوەی حوسین.

**تَوَلَّى الشَيْئَ:** پشتی لەشتەکە هەڵکرد ٥ دەگوترێ: (تَوَلَّى فلان هارباً): فلان پشتی هەڵکردو هەڵات.

**تَوَلَّى الرطبُ:** خورما شیرین بووەکە خەریکە وشك بێ.

**تَوَلَّى عنه:** پشتی تێ کرد ٥ ڕوی لێ وەرگێڕا.

**تَوَلَّى الشَيْئَ:** پابەندی شتەکە بوو.

**تَوَلَّى فلاناً:** یارمەتی فلانکەسی دا ٥ فلانکەسی خۆش ویست کردی بەگەورەو خۆشەویستی خۆی.

**تَوَلَّى الامر:** کارەکەی لەئەستۆ گرتو پێی هەڵسا.

**استولی علیه:** بەسەریدا باڵادەست بوو ٥ کۆنترۆڵی کرد ٥ دەستی لێی گیر بوو ٥ کەوتە دەستی.

**استولی علی الأمر:** گەیشتە کۆتایی ئیشەکەو باشباش کۆنترۆڵی کرد.

**استولی علی الغایّة:** پێش مەبەستەکە کەوت.

**الأوْلَى:** چاکتر ٥ شیاوتر ٥ گونجاوتر ٥ نزیکتر.

**المُتَوَالِي:** پێڕی شیعە، ئەم ناوەیان لەوەوە بۆهاتووە کەئیمامی عەلیو خێزانو نەوەکانی ئەویان کردوە بەگەورەو ڕابەری خۆیان.

**الموالاة:** ئەوەیە یەکێك پەیمان بدا بەیەکێکی تر.

**الموالیا:** جۆرە شیعرێك بوو لەسەردەمی عەباسییەکان دا پەیدا بوو ٥ (مستفعلن فاعلن مستفعلن فاعلن) دوجار.

**المَولَى**: گەورە، خاوەن، پەروەردگار ◦ سەرپەرشتیار ◦ دۆستو خۆشەویست ◦ هاوپەیمان ◦ میوان ◦ هاوسێ ◦ هاوەڵ ◦ خەزور ◦ خزمی نزیك وەكوو مامو ئامۆزا ◦ ئازادكەر ◦ ئازادكراو ◦ شوێنكەوتوو.

**المَولَوِيُّ**: كەسێك نیسبەت بدرێ بۆلای (المولی) ◦ دونیا نەویستو زانای گەورە.

**المولوية**: پێرێكن لەصوّفیو خۆیان بە شوێنكەوتەی مەولانا (جلال الدين)ی رۆمی دەزانن ◦ هەروا ناوە بۆ كلاوێكی درێژو لەخوری دروستكراو كەجەنابی مەولەوی لەسەری بكا.

**الوَلاءُ**: ملكایەتی ◦ نزیكی ◦ خزمایەتی ◦ یارمەتیدان ◦ خۆشەویستی.

**الوَلايَة**: خزمایەتی ◦ دەگوترێ: (القوم عليه وَلاية): خەڵكەكە هەموویان یەكدڵو یەكگیان لەخێرو شەڕدا هاوبەشن.

**الوِلاَيَةُ**: خزمایەتی ◦ پلانو دەستوورو فەرمانڕەوایی ◦ پاشاو سەرۆك ◦ وڵاتو دەڤەرێك كەفەرمانڕەوا بەڕێوەی بەرێ.

**الـوَلِي**: سەرپەرشتیار ◦ خاوەن ◦ هەركەسێك سەروكاری ئیشێك بكا ◦ یارمەتیدەرو خۆشەویست ◦ هاوپەیمان ◦ خەزور ◦ هاوسێ ◦ شوێنكەوتوو ◦ ئازادكەر ◦ فەرمانبەردار گوێ بیست ◦ دەگوترێ: (المؤمن ولي الله) ◦ بارانی دوابااران ◦ میراتگری پاشایەتی ◦ (ولي العهد) ◦ ولیعەهد.

**ولي المرأة**: ئەوكەسەی بڕیار بەدەستی مارەكردنی ئافرەتەكەیەو ناهێڵێ بەبێ ڕەزامەندیی ئەو ئافرەتەكە خۆبەسەریی خۆی مارەبكا.

**وَلِيُّ اليَتيم**: سەرپەرشتیاری هەتیوو بەخێوكەری ◦ لەبواری ئابوری دا (وەلی) كەسێكە لەقازانجو زەرەردا هاوبەشو بەرپرس بێ ◦ (له الغنم وعيله الغرم).

**الوَلِيَّـةُ**: كورتانو سەرجل ئەگەر بەسەرپشتی حوشترەكەوە بن ◦ هەرشتێك لەپشتی حوشتر بكرێ لەقوماشو شتی وا ◦ ئەو بڕە خۆراكەیە كابانی دنیادیدە دەیشارێتەوە بۆ میوانی كاتی ناوەخت.

**ومَا اليه يَمَا وَمْئاً**: ئاماژەی بۆكرد ◦ قامكی بۆ ڕاداشت.

**اومَأ اليه**: ئاماژەی بۆكرد.

**الوَامِئة**: بەلاو كارەسات.

**ومِدَ عليه يَوْمَدُ وَمَداً**: ڕقی هەڵسا، سوربۆوە.

**ومِدت اليوم والليلة**: رۆژو شەوەکە زۆرگەرم بوون گەرماکەیان توند بوو شنە باشی کەم بوو.

**الوَمَدُ**: زیادبوونو تاوساندنی گەرمای رۆژو شەو ٥ هەوا تەڕییەکە لەجەنگەی گەرمادا لەدەریاوە رودەکاتە ولاتو هەواشی کەمو بێ هێز دەبێ ٥ ئێستا پێی دەگوترێ: (رطوبة).

**الوَمْدَةُ**: بەمانا (الوَمَدُ)دی.

**وَمَزَ بانفه يَمِز وَمْزاً**: بەڕق هەڵسانەوە لوتی خۆی بادا ٥ هەڵیگلۆفت.

**تَومَّزَ في مشيه**: لەرۆیشتن دا پەلەی کرد، بازی دا.

**وَمَسَ الشَيْئ بالشَيْئ يَمِيسُ وَمْساً**: شتەکەی بەشتەکە خوراندو لێکی خستن بۆنەوەی توێکڵەکەی لێ داماڵێ روت ببێ ٥ دەگوترێ: (أومَسَتْ المرأة): ئافرەتەکە زینای کرد، داوێن پیس بوو ٥ خراپەی کرد.

**اومَسَ العِنَبُ**: ترێیەکە نەرم بوو خەریکە بگا.

**المُمِيسُ من النساء**: ئافرەتی داوێن پیس کە هەرکەسێ داوای لێ بکا رەتی ناکاتەوەو خۆی تەسلیم دەکا ٥ (ك: ميامِس وموامس ومواميس).

**المُومِسَة**: بەمانا (المومِسُ)دێ.

**المُوَمَّسُ**: حوشترێك زێربار نەکرابێ، رانەهێندرابێ.

**وَمَضَ البرقُ يمض وَمْضاً**: هەورە بروسکەکە بەهێواشی روناکی دا ٥ (فهو وامِض وهي وامضة).

**اوْمَضَ البَرْقُ**: بەمانا (وَمَضَ)دێ.

**اومَضَ فلان**: فلانکەس تروسکایی بروسکە یان تروسکایی ئاگری بینی ٥ ئاماژەیەکی هێواشی بۆکرد.

**اومَضَتْ المراةُ بعينها**: ئافرەتەکە بەتیلەی چاوی ڕوانی بەدزییەوە سەیری کرد ٥ زەردەخەنەی هاتێ.

**ومِقَهُ يَمِقُهُ وَمْقاً وميقة**: خۆشی ویست.

**وامَقَهُ موامَقة ووماقاً**: هەریەك لەوانە ئەوی تری خۆش ویست.

**توامَقوا**: یەکتریان خۆش ویست.

**تَوَمَّقَ**: خۆشی ویست.

**تَوَمَّنَ فلانٌ**: فلانکەس خاوو خێزانی زۆر بوو، مەسرەفی زیادی کرد.

**ومِهَ النهارُ يَوْمَهُ وَمَهاً**: رۆژەکە زۆر گەرم بوو.

**الوَمْهَةُ**: توانەوەی هەرشتێك بێ.

**ومى يَمِي وَمْياً**: لۆغەتێکە لە (وَمَأ)، بەمانا ئاماژەپێکردنە.

**وَمَى بالشَيْئِ**: شتەکەی برد.

**استومى عليه**: بەسەری دا زاڵ بوو، داگیری کرد.

**الوَمَى**: دهگوترێ: (ما أدرى أي الـومى هـو؟): نـازانم ئـەوە چ بیـچمێـکه چ کەسێـکه؟.

**الــوَنَجُ**: جــۆرە لێدانێـــکی ســازو سەمتورە.

**الوَنَـعُ**: وشـەیەکە ئامـاژەی پێـدەکرێ بۆشتی کەم.

**وَنَمَ الذُّبابُ يَنِمُ وَنْماً**: مێشەکە گوی کرد.

**الوَنَمَةُ**: گوی مێش.

**الوَنيمُ**: گوی مێش.

**الـوَنُّ**: لاوازی ◦ ئــەو ئـامێری سـازەی بەپەنجە لێی دەدرێ.

**وَنــی في الأمــر**: لەکارەکــەدا تــێ شـکا، نەیتوانی بیکا ◦ مانـدوو بـوو وازی لـێ هێنا ◦ دەگـوترێ: (فلان لايَتَـواني يفعـل كــذا): فلانکـەس بـەردەوام ئـەوکارە دەکاو وازی لـێ نەهێناوە.

**وَنَتِ السحابَةُ**: هەورەکە بارانی باراند.

**وَنــى فــلان الكَـمُ**: فلانکـەس قـۆڵی لــێ هەڵماڵی.

**ونــی الـشَیْئَ وعنــه**: وازی لــێ هێنــاو بەجێی هێشت ◦ (فهو وان وهي وانية).

**أوناه**: ماندوی کرد ◦ بێ هێزی کرد.

**وَنَّــی الرَّجُــلُ**: پیاوەکـــە کۆشـــشی دڵسۆزانەی لەکارەکەدا ئەنجام نەدا.

**تَـوَانى في العمـل**: گرنگـی بەکارەکـە نەداو هەوڵی چاکسازیی نەدا.

**توانى في حاجته**: کەمتەر خەمی کرد لەکارەکەی داو گرنگی پێ نەدا.

**المینــی**: بەنــدەر ◦ شـوێنی لەنگــەر گرتنی کەشتی ◦ جەوهەرو کاکڵەی شوشـە ◦ بۆیەیـە کـە مەعـدەن‌و شـتی وای پـێ سـواخ دەدرێ، پێـی بۆیە دەکرێ.

**المیناءُ**: بەمانا (المینی)دێ.

**الــوانی**: جەســته لاواز ◦ کــزە بــای نەسیم.

**الوَنَـــاةُ**: دوڕو یـــاقوت‌و گەوهـــەر ◦ ئـافرەتی شـل‌و مـل کەهەڵدەسـتێ لەبـەر نـازداری بەهێواشـی راسـت دەبێتەوە.

**الــوَنِيُّ**: دوڕو گەوهــەر ◦ ملوانکــەی گەوهەر ◦ جەواڵ.

**وَهَبَ له الشَيْئَ يَهَبُهُ وَهْباً**: شتەکەی پێ بەخشی بەبێ بەرامبەر.

**وَهَبَ فلان فلاناً**: فلانکەس بەسەر فلان دا باڵادەســت بــوو لەبەخــشین دا ◦ دەگــوترێ: (واهبــه فوهَبَــه): هــەروا دەگوترێ: (وهَبَني الله فِداكَ): خودا بمکا بـە قوربـانی تـۆ ◦ هـەروا دەگـوترێ: (هَبْني فعلت كـذا): وابزانـە مـن ئـەوەم کردوە.

**أوهَبَ الشَيْئُ**: شتەکە بەردەوام بوو.

**أوهَبَ فلان للشَيْئِ**: فلانکەس توانـای بەسەر شتەکەدا هەبوو.

**أوهَبَ لفلانٍ الشَيْئَ:** شتەکەی بۆ فلانکەس ئامادەکرد.

**وَاهَبَهُ:** لەماڵبەخشین دا بەسەریدا باڵادەست بوو.

**إتَّهَبَ:** بەخشینەکەی قبوڵ کرد ٥ دەگوترێ: (إتَّهَبَ الهبةَ).

**تواهَبَ القومُ:** خەڵکەکە هەندێکیان شتیان بەخشی بەهەندێکیان.

**استوهب الهِبَةَ:** داوای بەخشندەی لێ کرد، داوای لێ کرد شتی بداتێ ٥ دەگوترێ: (استوهَبَ فلاناً الهِبَةَ).

**المَوْهَبَةُ:** هەورێك باران ببارێنێ لەهەر کوێیەك بێ ٥ زەلکاوی بچوك ٥ بەرداوو چاڵە ئاو لەکێو دا ٥ بەخشش.

**الموهِبَة:** چاڵی ئاوی بچوك‌و زەلکاو ٥ ئامادە باشی ئادەمیزاد بەشێوەیەکی سروشتی‌و خودا داد بۆ داهێنان‌و کاری هونەریی.

**الموهوب:** منداڵ.

**الهِبَةُ:** عەتاو بەخشش کەبێ بەرامبەرو بێ مەبەست بێ لەزاراوەی شەرع دا ئەوەیە یەکێك ماڵ‌و موڵکێك بکا بەموڵکی یەکێکی تر بەبێ بەرامبەر.

**وَهَتَ الشَيْئَ يَهِتُهُ وَهْتاً:** زەختی لەشتەکە کرد، پەستاوتی ٥ پان‌و پلیشی کردەوە.

**أوهَتَ اللحمُ:** گۆشتەکە بۆگەن بوو.

**الوَهْتَةُ:** زەوی لێژو تەلان.

**وَهَثَ في الشَيْئِ يهث وَهْثاً:** چووە ناوشتەکەوەو گیرۆدەی بوو، کۆششی تێداکرد.

**وَهَثَ الشَيْئَ:** بەتوندیی پێی پێدادا.

**تَوَهَّثَ في الأمر:** لەشتەکە دا قوڵبۆوە.

**الوَاهِثُ:** کەسێك خۆبخاتە خەتەرو تەنگ‌و چەڵەمەوە.

**وَهَجَتْ النارُ وَهْجاً ووهيجاً:** ئاگرەکە بڵێسەی سەند.

**وَهَجَتْ اليومُ والليلةُ:** رۆژو شەوەکەی زۆر گەرم بوون.

**أوهَجَ النارَ:** ئاگرەکەی هەڵگیرساند.

**توهَّجَت النارُ والشمسُ ونحوهُما:** ئاگرەکە یان خۆرەکە تاوی ساند.

**تَوَهَّجَ حر النهار:** رۆژەکە زۆر گەرم بوو ٥ دەشگوترێ: (تَوهَّجَ حر النهار): گەرمای رۆژەکە تاوی ساند زۆر گەرم بوو.

**تَوَهَّجَ الجوهرُ:** جەوهەرەکە درەوشایەوە.

**توهَّجتِ رائحة الطيب:** بۆنی عەترو میسکەکە بڵاو بۆوە.

**الوَهَجُ:** گەرمی رۆژی هاوین‌و گەرمی خۆر ٥ بۆنی عەترو شتی بۆنخۆش‌و بڵاو بونەوەی بۆنەکەیان.

**الوَهجان**: گەرمای ڕۆژ ٥ دەگوترێ:
(یوم وهجان): ڕۆژێکی زۆر گەرمە.
**الوَهّاجُ**: زۆر گەرم ٥ زۆر درەوشاوەو بلێسەدار ٥ دەگوترێ: (نجم وهاج وسراج وهّاج).
**الوَهيج من الطيب**: بڵاوبونەوەی بۆنی خۆش‌و شێلانی دەماری جەستە.
**وَهَّدَ له الفراشَ**: جێگای بۆخۆش کرد.
**تَوَهَّدَ الفِراشَ**: جێگای ئیستیراحەتی بۆئامادەکرد.
**تَوَهَّدَ**: چاڵ بوو.
**أوهَدُ**: ناوی ڕۆژی دووشەممەیە.
**الوَهْدُ**: زەوی چاڵ ٥ زەلکاو ٥ چاڵێکی هەلکەندراو.
**الوَهْدَةُ**: زەوی نزم‌و چاڵ.
**وَهَرَه يَهِرُهُ وَهْراً**: خستیە ناو کێشەیەکەوە ڕزگاربوونی لێ ناکرێ.
**وَهَّرَهُ**: بەمانا (وَهَرَهُ)دێ.
**تَوَهَّرَ الليلُ والشتاءُ**: زۆرینەی شەو یان زۆرینەی زستان ڕۆیی.
**تَوَهَّرَ الرَّمْلُ**: لمبەلانەکە داڕوخا، هاڕەی کرد.
**تَوَهَّرَ فلان فلاناً في الكلام**: فلانکەس فلانکەسی ناچار کرد بۆ وازهێنان لەقسەکەی.

**المستوهِرُ**: کەسێک گەرمای خورگێژی کردبێ.
**الواهِرُ**: دەگوترێ: (لهب واهِرٌ): بلێسە ناگرێکی پڕتەو بەخشە.
**الوَهَرُ**: پەرەسانندنی کاریگەری خۆر لەسەر زەوی‌و لێدانی تیشکەکەی لەزەوی بەجۆرێک وادێتە بەرچاو تیشکەکە وەکوو هەڵم جم‌و جوڵ دەکا.
**الوَهْرَةُ**: کەوتنە ناو کێشەو چورتمێکەوە کە ڕزگار بوون لێی زۆر زەحمەت بێ.
**وَهَزَهُ يَهِزُهُ وَهْزاً**: پالی پێوەناو بەهەموو هێزی خۆی مستەکۆڵەیەکی لێدا ٥ دەگوترێ: (وَهَزَ الحيوان): بەقاچی ولاخەکەی هەڵنا بۆ ڕۆیشتن ٥ پێی لێ نا، وردی کردو شکاندی.
**وَهَّزَهُ**: باری قورس کرد.
**تَوَهَّزَ الكلبُ خَلْفَهُ**: سەگەکە لەدواوەی بازی دا.
**تَوَهَّزَ المُثْقَلُ**: بەتوندی‌و بەهێز پێی لێ نا ٥ دەگوترێ: (جاء يَتَوَهَّزُ): بەتەپە تەپ‌و پێ بەزەوی دادان هات.
**الأوْهَزُ**: کەسێک جوان بڕوا، هەرشتێک ڕەوتی جوان بێ.

**المُـوَهِّزُ**: پیاوێـك لەرۆیشتن دا بەتوندی پێ بەزەوی دادا.

**الوَهَـازَةُ**: رۆیشتنی بەشەرمو شكۆ ٥ دەگوترێ: (هي تمشي الوهازة).

**الـوَهْزُ**: تێكسمراوو تۆكمەو جەستە دامەزراو ٥ پیاوی كورتە بالا.

**وَهَـسَ فـلان یهـس وَهْـساً ووهیـساً**: فلانكەس زۆر خۆر بوو، چلێس بوو ٥ لەرۆیشتن پەلەی كرد.

**وَهَسَ علـى عشيرته**: دەستدرێژی كردە سەر هۆزو خێڵی خۆی.

**وَهَسَ الـشَيْئَ**: شتەكەی شكاندو كردی بەناوەنـد لـەنێوان خـۆی و گڵەكـەدا بۆئـەوەی جەسـتەی لەزەوییەكـە نەكـەوێ ٥ بەتونـدی قاچـی پیـاداو كوتایەوە.

**تَـوَهَّسَ**: پەلـەی كـرد لەرۆیـشتن دا ٥ رۆیشت بـە شێوەی رۆیشتنی كۆڵ گران.

**تَـوَهَّسَ الـسائرُ الأرْضَ في مِـشيته**: رێبوارەكـە لەرۆیـشتنی بـەناو زەوی دا زۆری خۆبـاداو خـۆی لەنگانـد وەكـوو شـەل و سـەقەت بەرێـگادا رۆیی.

**الوَهْسُ**: شەڕو نەگبەتی ٥ فیتنەیی.

**الوَهَّاسُ**: شێر.

**الوَهِیـسَةُ**: خواردنێـكی عەرەبـە، بریتییـە لـەوە كوللـە بكوڵێنـدرێ ئەمجار وشك بكرێنەوەو بهاڕدرێن و تێـكەڵ بەچـەوری بكـرێن وەكـوو پەڵوو حەڵوای لێ بێ.

**وَهَـصَ الـشَیْئَ یَهِـصَهُ وَهْـصاً**: بەئـەو پەڕی هێزو تواناوە شتەكەی فڕێ دا ٥ بەتوندی پێی لێ نا ٥ بەزەوی كێشا.

**وَهَـصَ الـشَیْئَ الرخْوَ**: شتە نەرمەكـەی شكاند.

**وَهَصَ الإنسانَ والحیوانَ**: مرۆڤەكە یـان ئاژەڵەكەی خەساند، دەماری نێرایـەتی پڕواند.

**وَهَصَ رأسَه**: سەری بریندار كرد.

**إتَّهَصَ الـشَیْئُ الرَّطْبُ**: شـتە تەڕەكە شكا.

**المَوْهُـوصُ**: دەگـوترێ: (رجـل موهوص): پیاوێـكە ئێسقانی چونە ناویەكەوە، ئێسقانەكانی تێـكگیراون، پاڵیان لێكداوە.

**المُوَهَّصُ**: بەمانا (المَوْهُوصُ)دێ.

**الوَهْـصَةُ**: چـاڵ و چـوێڵی زەوی كەوانەیی بێ.

**الوَهَّـاصُ**: بۆزێـدە رۆیـی لـەمانای (وَهَصَ)دا دێ ٥ بەخـشندەو سـەخی سروشت.

**وَهَـطَ فـلان یَهِـط وَهْطاً**: زەعیـف و لاواز بوو.

**وَهَطَ فلاناً**: زەبری لەفلان دا ○ برینداری کرد.

**وَهَــطَ الــشَيْئَ**: پێــی لەشــتەکە نــا پلیساندییەوە ○ شکاندی ○ هاڕی ○ (فهو موهوط ووهیط).

**اوهَطَ الإنسانَ والحیوان**: مرۆڤەکەی لەپــەل‌و پــۆ خــست ○ بڕستی لــێ بڕی، لاوازی کرد ○ دەگوترێ: (رمــی الطــائِرَ فَأوهطـه): گوللـەی ئاڕاستەی باڵندەکە کردو هـەنگاوتی‌و لەپـەل‌و پۆی خست ○ زەبری کوشـندەی لــێ دا ○ وای بـەزەوی دادا کــە نــەتوانێ هەڵبــستێتەوە ○ شــلەکوتی کــرد ○ لەپەل‌و پۆی خست.

**اوهَطَ جناحَ الطائر**: باڵی باڵندەکەی شکاند.

**تَوَهَّطَ**: بۆموطاوعەی (وَهَطَهُ)دێ.

**تَــوَهَّطَ في الطين**: ڕۆچو بەقوڕەکـەداو گوم بوو.

**تَــوَهَّطَ الفِــراش**: جێــگا نوســتن‌و نوێنەکەی خۆش کرد.

**الوَهْطُ**: کۆمەڵ‌و تاقم ○ لاواز ○ شوێنی تەخت‌و نەرم.

**الوَهْطَــةُ**: یــەکجار ○ زەوی تــەخت‌و نەرمەڵان.

**وَهَــفَ الــنَّصراني يَهِـفُ وَهْفـاً**: کـابرای مەسیحی خزمەتی کەنیسەی کرد.

**وَهَفَ الشَيْئُ وَهْفاً ووهيفاً**: شتەکە نزیك بۆوە ○ دەگوترێ: (خذ ما وهـف لـك): ئــەوەی لێـت نزیکـە ئـەوە بـۆ خـۆت هەڵگرە.

**وَهَفَ النباتُ**: ڕووەکەکە سەوز بوو گەڵای کردو پۆشناخ بوو.

**وَهَفَ الشَيْئُ للقوم**: شتەکە بۆ خەڵکەکە دەرکەوت‌و ئاشکرا بوو.

**وَهَــفَ الــشَيْئُ وَهْفــاً**: شــتەکە فــڕی، بەحەوادا چوو.

**اوهَفَ الشَيْئُ**: شتەکە لەبەرزییەوە دەیڕوانــی ○ بــەرزبۆوە ○ دەگـوترێ: (مــا يوهِــف لــه شــيئ الا أخــذه): هەرشتێـــك بێتـــە بەردەســـتی دەیگرێ.

**الوَاهِــفُ**: مجـــەورو خزمـــەتکاری کەنیشتە.

**الوهَافَــةُ**: پیـــشەی خزمەتـــچیەتی کەنیشتە.

**وَهَقَ الشَيْئَ عنه يهقه وَهْقاً**: شتەکەی لـێ مەنع کرد.

**وَهَــقَ فلانــاً**: کەمەنــدی خــستە ملــی فڵانکەســەوە، حـەبلی سـەر بەقوڵـەی خستە ملی فڵانکەسەوەو گرتی.

**وَهَـقَ الـبعيرُ الـبَعيرَ**: هـەر یـەك لـە دوو حوشترەکە ملیان درێژکردو پێشبڕکێی ڕۆیشتنیان کرد.

**اوهَــقَ الدّابَّــةَ**: کەمەنــدو حــەبلی بەقوڵفـەیی هەڵـدا بـۆ ئـەوەی ملـی ولاخەکەی بکەوێتە ناو.

**واهَقَــهُ**: پێــشبڕکێی لەگــەڵ دا کــرد لەکارەکـەدا ◦ دەشـگوترێ: (واهقـت الناقة الناقة).

**تواهــق الــرجلان**: دوو پیاوەکــــە پێشبڕکێیان کرد.

**تواهقَت الرِّکـاب**: باربـەرەکان ملیـان درێـژکردو کەوتنـە پێشبڕکێ کـردن لە ڕۆیشتن دا.

**الوَهَــــقُ**: حەبلێــــکە سەرێــــکی قوڵفـەکراوە دەهاوێـژرێ بـۆ ملـی ئـاژەڵو مــرۆڤ بۆئـەوەی کەمەنـد بکرێ ◦ (ك: أوهاق).

**وَهَلَ فلان یَهِلُ وَهْلاً**: فلانکـەس سـەهوی کرد.

**وَهَلَ الی الشَیْئ**: خەیاڵی چوو بۆ شتەکە لەکاتێـکدا ئـەو شتێـکی تـری گـەرەك بوو.

**وَهِـلَ الرجـلُ یَوْهَـلُ وَهَـلاً**: لاواز بـوو ◦ ترسا ◦ واقی وڕما.

**وَهِلَ فیه وعنه**: هەڵەی تێدا کردو لەبیری چۆوە.

**وَهَّلَهُ**: ترساندی ◦ زەندەقی برد.

**تَوَهَّلَهُ**: توشی هەڵەکردنی کرد.

**استَوْهَلَ**: لاواز بوو، واقی وڕما.

**المُستَوْهِلُ**: ترساوی گـورجو چوسـتو چالاك.

**الواهِلَةُ**: سـەرەتای شـتو دەسـتەگوڵو نۆبەرەی.

**الوَهْلَةُ**: دەگوترێ: (القیتـه أول وهلـة): بۆیەکەم جار تووشی بووم.

**وَهَـمَ فلان في الشَیْئ والیه یَهِـمُ وَهْماً**: خـەیاڵی بـۆ شـتەکە چـوو وەلحـاڵ ئـەو شتێـکی تـری مەبەسـت بوو.

**وَهَــــمَ الــشَیْئُ**: شــتەکە چــووە نــاو خەیاڵیەوە.

**وَهِـمَ في الحـساب**: لەحیـساب دا هەڵـەی کرد بەسەهو چوو.

**اوهَمَ فلان**: بەمانا (وَهَمَ)دێ.

**اوهَمَ فلاناً بکذا**: گومـانی لەفلانکـەس کرد بەوشتەو بەوە تاوانباری کرد.

**اوهِمَ الشَیْئَ**: شتەکەی هەموو واز لـێ هێنا.

**اوهِـمَ مـن صـلاته رکعـةً**: رکاتێــکی لەنوێژەکە نەکرد.

**اوهَـمَ مـن الحـساب کـذا**: ئەوەنـدەی لەحیسابەکە داگرت.

**اتّهَــمَ الرَّجُــلُ**: پیاوەکــە گومــانی پەیداکرد، شکی لا پەیدا بوو.

**وَهَّمَـهُ غـیره**: یەکێــکی تــر خــستیە گومانەوە.

**إتَّهَمَـهُ بکـذا**: تۆمـەتباری کـرد بـەوە ◦

گومانی خسته سەر، گومانی لەراستگۆیی ئەو کرد.

**تَوَهَّمَ الشَيْئَ**: گومانی شتەکەی کرد ٥ لەخەیاڵی خۆی دا هێنایی‌و بردی.

**تَوَهَّمَ الخيرَ فيه**: هیوای خێرو خۆشی لێ کرد.

**التُهْمَةُ والتُهَمَةُ**: تۆمەتبار کردنە.

**التَهِيمُ**: کەسێك تۆمەتی خرابێتە سەر.

**المُتَّهَمُ والمُتَّهِمُ**: تۆمەتبار.

**الموهوم**: گومانلێکراو ٥ ئەوەی گومانی بۆبچێ.

**الوَهْمُ**: ئەوەی دەکەوێتە خەیاڵو ئەندێشەوە ٥ ڕێگای پان‌و پۆڕ ٥ (ك: أوهام ٥ وُهُمّ).

**وَهَنَ يَهِنُ وَهْناً**: کەوتە کاتی نیوەشەوەوە ٥ یان لاواز بوو لەجەستەدا لەئیش کردن دا.

**وَهَنَ فلاناً**: فلانکەسی لاواز کرد.

**وُهِنَ فلان**: فلانکەس تووشی ئازاری قۆڵ بوو قۆڵ ئێشەی توشهات.

**أوهَنَ**: کەوتە دەورو بەری نیوە شەو.

**أوهَنَ فلاناً**: فلانکەسی لاواز کرد.

**تَوَهَّنَ فلان**: فلانکەس ڕاکشا لەسەر تەنیشت ٥ لاواز بوو.

**تَوَهَّنَ الطائرُ**: داڵە کەرخۆرەکە باڵندە گۆشت خۆرەکە ئەوەندەی گۆشتی لاکە تۆپیو خوارد مڕبوو نەیتوانی بفڕێ.

**المَوْهِنُ**: دەورو بەری نیوە شەو ٥ یان سەعاتێك دوا نیوەشەو.

**المَوْهونُ**: دەگوترێ: (رجل موهون): پیاوێکە لاوازو بێ هەڵمەت.

**الواهِنُ**: ڕەگی ئەستۆ ٥ ئەو ڕەگەی تێدایە کەملی بەشانەوە بەستۆتەوە ٥ دەشگوترێ: (رجل واهِن): پیاوێکە لاوازەو بێ هەڵمەتە.

**الوَاهِنَةُ**: لەڕو لاوازیی ٥ فەقەرەیەکە لەپشتە مل ٥ نەخۆشییەکە توشی قۆڵی ئادەمیزاد دەبێ ٥ پەراسوو ٥ سەرەتای بۆشایی سنگی ئەسپ.

**الوَهْنُ**: زەعیفی‌و سیس بوونی نیشات.

**الوَهنانة من النساء**: ئافرەتی تەمبەڵو بەناز پەروەردە، ئافرەتی شل‌و شێواو.

**الوَهِينُ**: سەرعەمەلە، چاودێری کرێکار.

**الوَهُ**: غەم‌و خەفەت ٥ دەگوترێ: (وَهْ من الوجع) وەی لەئازار.

**وَهْوَهَ في صَوْتِه**: هات‌و هاواری کرد، ناڵاندی.

**وَهْوَهَت المرأةُ**: ئافرەتەکە بەغەمبارییەوە هاواری کرد.

**وَهْوَهَ الأسَدُ في زَئِره**: شێرەکە

نەپراندیو نەڕەی خۆی خواردەوە.

**المُوَهْوِهَـةُ مِـنَ النِّـساءِ:** ئافرەتێـك تووشی هەلاّمەتو بەسێوی بووبێو لەســەرمان چــۆقە چــۆقی پــێ كەوتبێ.

**الوَهْـوَاهُ:** ئەسـپی بەنیـشاتو تیـژڕەو كەلـەهیچ نەوەسـتێ ٥ دەشـكوترێ: (رجل وَهْـوَاهٌ): پیاوێـكە ترسنۆكو بێ ورە.

**الوَهْوَهَةُ:** دەنگێكە لەقوڕگی ئەسپ دا لەكۆتایی حیلكاندنی دا.

**وَهِـــيَ الرجُـلُ یهـي وهیـاً:** پیاوەكـە نەحمەقو گێل بوو.

**وَهِـــيَ الحـائِطُ:** دیوارەكـە شـەقی بـرد خەریكە بڕوخێ.

**وَهِيَ الثَّوبُ:** قوماشە دڕاو كون بوو.

**وَهِـيَ ربـاط الـشَيْءِ:** بـورغی شـتەكە، بەستەرەكە شل بۆوە.

**وهِيَ السَّحَابُ:** هەورەكە دایكردە بارانو بارانی بەلێزمەی هەڵڕشت.

**اوهَاهُ:** لاوازی كرد.

**اوْهَـى یَـدَهُ:** دەسـتی شـكاند ٥ ئـازاری بەدەستی گەیانـد بەشكاندنو شتی وا.

**الاوْهِیَـــةُ:** نێــوان تۆقەســـەری كێـــوو ناوقەدی دۆڵ.

**الوَهْيُ:** درزو شەبەق لەشت دا.

**الوَهْيَةُ:** یەكجار ٥ درزو شەبەق لەشت دا.

**الوَهِیَـةُ:** كاوڕو كۆلكە حوشتری قەڵەوو كەتە.

**الوُهَیَّـةُ:** بـچووككراوەی (الوَهْیَـــة)یــە ٥ كونو كەلەبەری كەم.

**واهـاً:** وشــەیەكە بــۆ سەرسـام بــوون لەشتێـك دەگوترێ.

**وَيْ:** وشەی سەرسوڕمانە لەشتێـك ٥ یـان بـۆ زەجـرو لــی توڕەبـوون بـەكاردێ ٥ دەگـوترێ: (وَيْ لزیـد): بـەمانا ویـلو هاواریش دێ ٥ دەشكوترێ: (وَيْكَ).

**وَیْـــبٌ:** وشــەیەكە وەكــوو (وَیْـــل) وایــە دەگـوترێ: (وَیْبَـكَ وَیْـــبٌ لَــك) ٥ كـە گـوترا: (وَیْبـاً لِهـذا): مانـای تەعـەجوب دەگەیەنێ.

**الوَیْبَةُ:** ئامێرێـكی پێوانەی دانەوێڵەیە ٥ بریتییە لەدو كێلە.

**الوَیْجُ:** مـژان ٥ یـان نـیر لـەنێوان دوگـا جـوت دا یـان مـژانو هەوجاڕەكـە پێـكەوە.

**وَیْحٌ:** وشەیەكی بـەزەیی پێداهاتنەوەیـە ٥ یان هەر بەمانا (الوَیْل)دێ ٥ دەگـوترێ: (وَیحٌ له وویحاً له).

**الوَیْسُ:** هەژاری.

**وَیْـــسٌ:** وشــەیەكە لەشــوێنی بــەزەیی پێداهاتنــەوەدا بــەكاردێ ٥ دەگــوترێ: (وَیْسَهُ ما أملحه).

**وَيْلَـهُ:** زۆری باسـی (الوَيْــل) بـۆ کـرد وەیلبارانی کرد.

**تـــوايَلاَ:** هـــاواری ئـــەو ئـــازارو ناڕەحەتیەی کرد کەتوشی بووە.

**الوَيْـلُ:** نـازڵبوونی شـەڕو نەگبـەتی بۆسەری ٥ وشەیەکە سزا دەگەیـەنێ ٥ شیوێکە لەدۆزەخ.

**الوَيْلَـةُ:** ریـسوا بـوونو فەزیحـەت ٥ دەگـوترێ: (یـا ویلتـا): حەیاچـوو ماڵوێران خۆم.

**وَيْلُمَّهِ:** واتە (وَيْـلٌ لاُمّـه): دەشـگوترێ: (رجل وَيْلُمِّهِ): پیاوێـکی لێهاتوو سەر سورهێنەرە.

**الوَائـةُ:** پیـاوی کورتـە بـاڵا ٥ ئـافرەتی کورتە باڵا (قەزەم).

**الوَيْنُ:** ترێی ڕەش.

**الوَيْنَة:** مێوژی ڕەش.

**وَيْهِ ووَيْهاً:** وشەیەکی هەڵنانـە، کەبتـەوێ یەکێـــك یـــان کۆمەڵێـــك هـــەڵبنێی بۆکارێـك دەڵێـی (وَيْهـاً یـا فـلان) یـان (وَيْهاً يا جماعة الرجال).

آلات موسيقية
كمان أجهر
مزمار
مجوز
ناي
صُرْنابة
سَكسيّة
بوق
بيانو او مِعْزَف
نفير
بوق الصيد
هلبكون
قيثارة
بوق
بيانو او معزف
كمنجة
ماندولينة
أكورديون
أكارينا
مِزْهَر
عود
كِنّارة
طبل صغير
رَباب
دُفّ
بُزُق او طُنْبور
بَنْدير او طبل كبير
طبل وسط
جرَس
قانون
دَرْبُكّة

مقاييس
وَمكاييل
مِتْر معدني مُزْدوج
مِتْر من خشب
مِتْر معدني أتوماتيكي
مِتْر
مِتْر للمساحة
مِسْطرة
مِتْر من قاش
مِتْر من قاش
مكاييل من تنك
دسيمتر مُزْدوج
مكاييل من قصدير
عُشْر مِتْر
او دسيمتر
عيارات صيدلي
مكاييل من خشب
عيارات من نُحاس
عيارات من حديد الصبّ
مِتْر مربّع
مِتْر مكعّب
ستير

اليــاءُ: پيتــى بيــستو ههشــتهمه لهپيتهكانى هيجا، شوێنى دهرچونو لىێ پهيدابوونى نێوان سهرى زمانو ناوهڕاستى مهڵاشووه.

يا: حهرفى نيدايه، وشهيهكه بۆ بانگ كــردن لهكهســێك يــا لهشــتێك بهكاردىێ.

الياردة: پێوهرێكه لهبارى درێژى شتى پــىێ دهپێــورىێ، نزيكــهى ســێيهكه مهتره واته ٣٢-٣٥ بهشه لهمهتر.

يَئِسَ مِنْـهُ: لێـى ناهومێـد بـوو ٥ تـهماعى پێى نهما.

يَئِسَت المرأةُ: ئافرهتهكه نهزۆك بوو ٥ لهسك وهستايهوه.

أَيْأَسَهُ: ناهومێدى كرد.

إتَّأسَ منه: بهمانا (يَئِسَ)دىێ.

إسْتَيْأسَ منه: بهمانا (يَئِسَ) دىێ.

اليَأسُ: تهمـهنى ناهومێـد بـوون ٥ ئـهو تهمهنهى ئافرهت لهعادهى مانگانهى خۆى دهوهستێتهوهو ئيتر ناكهوێتـه حهيزهوه.

يَأْيَــأَ يَأْيَــأَةً: بهخهڵــكهكهى گــوت كۆببنهوه.

يَأْيَأَ بالقوم: خهڵكهكهى بـانگ كـرد بـۆ زيبافهتو دهعوهت.

يَأْ يَأْ بالإبل: دهنگى لهحوشترهكان كرد كه راوهستن.

يَأْ يَـأْ: لاسايى كردنـهوهى دهنگـه ٥ يـان ناوى ئهو دهنگهيه خهڵكى پىێ بـانگ دهكرىێ بۆ كۆبوونهوه.

اليَأْيَــاءُ: دهنگــى باڵندهيهكــه وهكــوو باشوكهوايه.

اليُؤْيُوءُ: باڵندهيهكه وهكوو باشوكه وايه كلكى كورته.

يَبَّبَهُ: وێرانى كرد تهختو تاراجى تێك دا.

اليَبَــابُ: وێرانــه ٥ وڵاتــى چــۆڵو ســـوتهمهڕۆ ٥ دهگـــوترىێ: (أرض يباب): زهوى چۆڵو كهس تێدانهماو بـىێ دارو درهخـتو روهك ٥ (حـوض يباب): حهوزى بىێ ئاو.

يَــبِسَ يَيْـبَسُ يُبْـساً: وشـك بـۆوه، دواى تهڕى وشك بوو.

يَـبِسَ مـابين الـرَّجُلين: نێـوان دوو پيـاوه برادهرهكه پچڕا دهنگێيان لێك دابڕى.

أَيْـــبَسَ: كهوتــه نــاو زهوى وشــكو سوتهمهڕۆوه ٥ يان بـهناوى زهوى چۆڵو سوتهمهڕۆ دا ڕۆيى.

أيبس: قاتو قڕى بوو زهوى بـهروبومى

نەبوو.

أيــبَسَ القــومُ: خەڵكەكــە كــشتو كاڵەكەيان وشكی كرد.

أيبستِ الأرضُ: زەوییەكە كشتوكاڵەكەی وشك بوو.

أيْـبَسَ الـشَّيْئَ: شـتەكەی وشـك كـرد ٥ دەشـكوترێ: (أيْـبَسَ الله يـده علـی سـوطه): خـودا دەسـتی بەقامـچییەكەوە وشـك بكـا ٥ دەشكوترێ: (أيْبِسْ): بێدەنگ بە.

يابَسَهُ: بەتوندو تیژی مامەڵەی لەگەڵ كرد.

يَبَّسَهُ: وشكی كرد ٥ وشكی كردەوە.

إتَّبَسَ: بۆ موطاوەعەی (يَبَّسَهُ)دێ.

الأيْبَسُ: دەگوترێ: (هو أيْبَسُ منـه) ئـەو لـەو وشـك تـرە دەشـكوترێ: (بيـنهم ئـدی أيْـبَسُ): نێوانیـان خـۆش نیـەو دەنگیان لێك دابڕیوە ٥ هەروا وشەی (الأيْبَسُ) نـاوە بـۆ ئێسقانێكی وشـك لەقاچ دا كە دەستی لـێ بدەی ئازارت بدا.

الأيبسان: باریكایی دەستو قـاچ ٥ ئـەو شـوێنەی خـوار بەلەكـەوە تـا قولـە قاپ واتە (لولاك) دەگوترێ: (ضَـرَبَ أيْبَـــسَهُ): زەبــری لــەلولاكی دا، لەباریكایی قاچی دا، لەمەچەكی دا.

الأيَابِسُ: زۆور قولەقاپو زۆور مەچەك ٥ دەگوترێ: (ضَرَبَ الأيَابِسَ): زەبری لەئێـسقانی لـولاكو مەچـەكی دا ٥ هەروا وشەی (الأيَابِسُ) ناوە بـۆ ئـەو شــتەی شمــشێری لەســەر تــاقی دەكرێتەوە.

المِيبَـاسُ: ئەوشـتەی رووەكو درەخـتو شتی تەڕ وشك دەكا.

اليَابِسُ: دەگوترێ: (وجـه يـابِسٌ): روی وشكو بێ خێرە ٥ (سـكران يـابِسٌ): ئەوەنــدە ســەرخۆش بــووە قــسەی بۆناكرێ.

اليَبَـاسُ: دەگـوترێ: (أرطـبٌ أم يبـاسٌ): تەڕە یان وشكە.

يَبَاسِ: شەرمگا ٥ عەورەت.

اليَـبْسُ: دەگـوترێ: (خطـب يـبس، شـاة يبسٌ): مەڕێكە وشكی كـردوە، گوانی وشــك بــوون ٥ (أرض يـــبس): زەوییــەكی رەقو پتــەوە ٥ (مكــان يَـبْسٌ): شـوێنێكە ئـاوی تێـدا بـوو وشــكی كــرد ٥ (إمــرأة يَــبْسٌ): ئافرەتێكی بێ خێرە ٥ هیچو پوچە.

اليَبْسَةُ: دەگـوترێ: (أتـانٌ يَبْـسَةٌ): دێڵە كەرێكی بێ شیرو كزو لاوازە.

اليُبُوسَـةُ: وشـكی، پێـچەوانەی تـەڕی ٥ حاڵــەتو ومزعێكـــە لەشــت دا بەناخۆشی یەكتر دەگرێو شتی لـێ دروست دەكرێ.

مولّد كهربائيّ
وقائص
موسى
وسام
وهق
وظيف
موشور قائم
جذع موشور
موشور خماسيّ
موشور
سطح موشور
السمة
حامل السمة
ياسمين
يكّة
يرنّاء
ينبوت
ياسمين هنديّ
ولوينشيا
يقطينة
ونيلة
ويستاريا
موصول
يمامة
يحمور
يربوع
وطواط
وكر
برقانات
يؤيؤ
وشق
يراع
وعل
بغر

اليَبيسُ: بەمانا (اليابِسُ)دێ ٥ هەرشتێك لە گیاوگژو گەڵاو پرژو پاڵ وشك بێو هەڵوەرێ ٥ دەشگوترێ: (رجل وامرأة يبس): پیاوو ژنێكی بێ خێرن.
يبيس الماء: عەرەقی وشكەوە بوو.
اليتوع: هەر ڕوەكێك شیری هەبێ وەكوو ڕوەكی شنگ ٥ خورشیلكو ئەو جۆرە ڕوەكانە.
يَتَمَ يَيْتِمُ يُتْماً: تاك بۆوە.
يَتَمَ الصَّبِيُّ أو الولد: مندالەكە بێ باوك بوو.
يَتَمَ الصغيرُ من الحيوان أو البهائم: بێچوە ئاژەڵەكە دایكی مندار بۆوە یان لێی دابڕا.
يَتَمَ الفَرْخُ: بێچووەكە زارۆكەكە یەكێك لەباوكو دایكی مرد هەتیوكەوت ٥ (فهو يتيم ويتمان).
يَتِمَ يَيْتَمُ يُتْماً: بەمانا (يَتَمَ)دێ.
يَتُمَ يَيْتُمُ يُتْماً: بەمانا (يَتَمَ)دێ.
أيْتَمَتِ المرأةُ: ئافرەتەكە مندالەكەی هەتیو كەوت.
أيْتَمَ الصَبِيَّ: مندالەكەی هەتیو كرد.
يَتَّمَهُ: بەمانا (أيْتَمَهُ)دێ.
المَيْتَمَةُ من الحروب ونحوها: شەڕو جەنگێكە پیاوی زۆری تێدا بكوژرێو هەتیو زۆر بكا ٥ بۆیە دەگوترێ (الحربُ مَيْتَمَةٌ مَأيَمَةٌ): شەڕ هەتیوو بێوەژن زۆر دەكا.
اليَتْمُ: خەمو خەفەت.
اليَتَمُ: دەگوترێ: (في سَيْرِهِ يَتَمٌ): ڕۆیشتنەكەی وەستانو تەكە تەكی تێدایە.
اليَتِيمُ: مندالی باوك مردو ٥ بێچوە ئاژەڵی دایك نەماو یان لەدایك دابڕاو ٥ هەرشتێك هاوشانی نەبێ.
اليَتِيمَةُ: مێینەی (اليَتِيمَ) ٥ مێینەی بێ باوك ٥ كۆمەڵە لمبەلانی تاقەوە بوو ٥ دوڕو گەوهەری ناوازەو بەنرخ.
الجُمَعَةُ اليتيمة: ڕۆژی هەینی كۆتایی مانگی ڕەمەزان.
يَتَنَتِ الحامل: سكپڕەكە مندالەكەی بوو ٥ سكەكەی دانا بەشێوەیەك قاچی هاتنەدەر ئەمجار سەریو دەستی؛ دەگوترێ: (وضعته أمه يَتْنا).
أيْتَنَتِ الحامِلُ: بەمانا (يَتَنَتْ) دێ ٥ (هي موتن وموتنَةٌ).
يَتَّنَتِ الحامِلُ: بەمانا (أيْتَنَتْ)دێ.
اليَحْمُورُ: كەرە كێوی ٥ گیانلەبەرێكی كاوێژ كارە لەپێری كەڵە كێوییە.
أيْدَعَ الحجَ على نفسه: حەجی لەسەر خۆی واجب كرد ٥ دەشگوترێ: (أيْدَعَ اليمين على نفسه).
يَدَّعَهُ: بەصمغی گوشراو لەدرەختی

(الأيدع) ڕەنگی کرد ◦ دەشگوترێ: (يَدَّعَهُ الصباغ).

**الأيْدَعُ**: گوشراوێکە سورە وەکوو خوێن لەلقی درەختێك دەردەهێندرێ ناوی (الأيـــدع)، بـــۆ داوو دەرمـــان بەکاردەهێندرێ.

**يَدَاهُ يَدِيهِ يَدْياً**: دەستی هەنگاوت.

**يَدِيَ** فـلان يَيْـدِي يـدىً: چاکەی لەگـەڵ دا کرد لاواز بوو، بێ دەسەڵات بوو.

**يَدِيَ** من يده: دەستی نەما، توشی شـەلەل بوو.

**يُدِيَ**: دەستی ئازاری پەیدا کرد.

**يُدِيَ يَدُهُ**: دەستی توشی شەلەل بوو.

**أيْـــدى فلانـــاً**: دەســـتی فلانکەســـی هەنگاوت.

**يَادَاهُ**: دەست بەدەست پێی فرۆشت.

**اليَـــدُ**: دەســـت ◦ بەشـــێك لەجەســـتە لەشانەوە تاسەری پەنجە ◦ دەسکی هەرشـــتێك کەبەدەســـت دەیگـــری وەکوو شوێن دەست گرتنی شمشێر، کلکـە پـاچ، کلکـە خاکـەناز، دەسـکە چـەقو، دەســکە خەنجــەر، قــۆڵی کراس و کەوا، دەسەڵات و هێـزو توانا ◦ هەروا وشـەی (اليَد) بـۆ زۆر مانـای تــر هـاتووە وەکــوو لــەم رســتانەدا دەردەکەوێ: (هُمْ يَدُهُ): ئەوانە تاقم و پێری ئەون ◦ (هُمْ يَدٌ علـى غيرهـم): ئەوانـــە یـــەك ریـــزو کـــۆکن لەســـەر دوژمن ◦ (هو في يَدِي): ئـەوە مـوڵکی منەو لەژێر دەستی من دا یە ◦ (هذه يدي لك): من کەفیلی ئـەو شـتەتم و بـــەرعۆدەی دەبم ◦ (أعطـــى بيـــده): ملکـەچ بـوو دەسـتی دایـەو خـۆی تەسلیم کـرد ◦ (ضَرَبَ يَدَهُ في كـذا): دەستی بەکارەکـە کـرد ◦ (خـرج مـن تحـت يَـدِهِ فـلان): فلانکـەس لـەژێر دەستی ئەو رزگاری بوو ◦ یان لەژێر چـاودێری ئـــەودا پێگـــەیی و بـــوو بەزاناو وەستا ◦ (الأمـر بيـد فـلان): ئەو کارە لەژێر تەصەروفی ئەودایە ◦ (هــو طويــل اليــد): ئـەو سـەخی سروشتە، بەخـشندەیە ◦ (مـشى بـين يديـــــه): لەپێـــشیەوە رۆیـــشت، بەبـــەردەمی دا رۆیـــشت ◦ هـــەروا وشـەی (اليـد) بـۆ زۆر مانـای تـریش بـــەکارهاتووەو قاموســـە درێـــژەکان ئاماژەیان پێ کردون.

**اليَدُّ**: لۆغەتێکە لە (اليَدُ).

**اليَـدَوِيُّ**: دەسـتکرد شـتێك راسـتەوخۆ بەدەست کرابێ و لەکارگەی و شتی وا بەرهەم نەهێنرابێ.

**اليَدِيُّ**: دەست ڕەنگین و لێزان لەشت.

**يَرِعَ يَيْرَعُ يَرَعاً ويَرَاعَةً**: ترسنۆك بوو.

**اليَـرَاعُ**: قەصـەب ◦ قەڵـەم ◦ ترسـنۆکی

وره روخاو ٥ کەسێك نەراو بۆچونی
هەبێ نەعەقڵی هەبێ بێچوی مەڕو
بزن بەساوایی ٥ (کاریلەو بەرخۆلە)
٥ حوباحیب، گوڵە نەستێرە
(حەشەرەیەکە لەتاریکی دا
دەدرەوشێتەوە).
**الیارعة:** تاکی قەڵەم، تاکی حوباحیب ٥
قەڵەمی نوچ ٥ لانەی شێرو بێشەڵان
٥ شمشاڵی شوان ٥ چوزەلە، ترسنۆك
٥ نەحمەق‌و گێل ٥ نوعامە.
**الیَرْعُ:** گۆلکی مانگا کێوی.
**الیَرِعُ:** حەشەرەیەکە وەکوو مێشولە ٥
گۆلکی مانگا کێوی.
**یُرِقَ الإنسان أو الزَرْعُ:** ئادەمیزاد یان
کشتوکاڵەکە تووشی نەخۆشی
(یەرەقان) بوو.
**الیارِقُ:** جۆرە بازی بەندێکە، پانە ٥
دەستبەند.
**الیَرَقانُ:** نەخۆشییەکی فیسیۆلۆجییە
توشی رووەك دەبێ زەردی دەکا ٥
حاڵەتێکی نەخۆشییە لەئادەمیزاددا
ناهێڵێ سفرا بەئاسانی بگاتە ناو
ریخۆڵەو تێکەڵ بەخوێن دەبێو بەو
هۆیەوە ئەنسیجەی حەیوان یان
ئادەمیزادەکە زەرد هەڵدەگەڕێن.
**الیَرَقانة:** جۆرە قۆناغێکی گەشەکردنە
لەهەندێ گیانلەبەردا وەکوو ئەو
قۆناغانەی بەسەر کولەو مێش‌و
مێشولەو شتی وادا تێدە پەڕن.
**الیَرُونُ:** زەهر ٥ مێشکی فیل ٥ تۆماو ٥
تۆوی کەڵ ٥ عەرەقی ولاخ.
**یَرْناُ:** خەنە یان هەر رەنگێك لەرەنگی
خەنە بچێ.
**الیُرَناءُ:** بەمانا (الیَرْنا)دێ.
**یَسَرَ الشَّیْئُ ییسر یَسْراً:** شتەکە ئاسان بوو
٥ ملی دا، ژێربار بوو، هاتە ریزەوە.
**یَسَرَتِ الحامِلُ:** سکپڕەکە بەئاسانی
منداڵی بوو.
**یَسَرَ له فِي الأمر:** کارەکەی بۆ ئاسان کرد.
**یَسَرَ الشَّیْئَ:** لەلای چەپی شتەکەوە هات ٥
لای چەپی شتەکەی گرت.
**یَسِرَ الشَّیْئُ:** بەمانا (یَسَرَ)دێ.
**یَسِرَ فلان:** فلانکەس دەوڵەمەند بوو.
**یَسُرَ الشَّیْئُ:** بەمانا (یَسَرَ)دێ ٥ کەم بوو.
**أیْسَرَ فلان:** بەمانا (یَسِرَ)دێ.
**أیْسَرَتِ الحامِلُ:** بەمانا (یَسَرَت)دێ.
**أیْسَرَ فلاناً:** کەمێك پشووی دا بەفلان‌و
زۆر تەنگی پێ هەڵنەچنی لەداوا
لێکردنی قەرزەکەی مۆڵەتی دایە.
**یاسَرَ:** کەوتە لای چەپیەوە ٥ دەگوترێ:
(یاسَرَ بالقوم): لای چەپی خەڵکەکەی
کۆنترۆڵ کرد.
**یاسَرَ فلاناً:** ئاسانکاری لەگەڵ خەڵکەکە
کرد.
**یَسَّرَ فلان:** فلانکەس ئاژەڵەکانی

بەئاسانی زانو بێچوویان بوو هیچیان بەریان نەهاویشت.

**یَسَّرَتِ الماشِیَةُ:** ئاژەڵەكان زۆر بون ◊ زاوزێو بەروبومیان زۆر بوو.

**یَسَّرَ الشَّیْئَ:** شتەكەی ئاسان كرد.

**یَسَّرَ له كذا:** ئەوەی بۆئاسان كرد ◊ بۆی ئامادەكرد.

**یَسَّرَ فلاناً لكذا:** ئەو ئیشەی بۆ فلان ئامادەكرد.

**یَسَّرَ فلاناً:** فلانكەسی سەركەوتوكرد بۆ ئەو شتە.

**یَسَّرَ الشَّیْئَ:** شتەكەی والێ كرد بەیدەستو ئاسان بێ.

**یَسَّرَ الفرسَ:** بەمانا (یَسَرَهُ)دێ.

**إتَّسَرَ القومُ الجَزُورَ:** خەڵكەكە ئاژەڵەكەیان سەربڕیو گۆشتەكەیان بەشبەش كرد.

**تیاسَرَ:** بەمانا (یاسَرَ) دێ.

**تیاسَرَ فِي كذا:** لەوشتەدا ئاسانكاریی كرد.

**تیاسرَ القومُ الجزورَ:** خەڵكەكە ئاژەڵەكەیان سەربڕیو گۆشتەكەیان دابەش كرد.

**تَیَسَّرَ الشَّیْئ :** شتەكە ئاسان بوو، ئامادەبوو ◊ دەگوترێ: (تَیَسَّرَ للقتال): خۆی بۆ شەڕ ئامادەكرد.

**تَیَسَّرَتِ الأرضُ:** زەوییەكە بەپیت بوو.

**تَیَسَّرَ النهارُ:** رۆژەكەی ساردو سەرما بوو.

**اسْتَیْسَرَ:** بەمانا (تَیَسَّرَ)دێ.

**الأیْسَرُ:** ئاسانتر ◊ چەپ ◊ چەپلەر ◊ چەپنوس.

**التَّیْسُورُ:** دەگوترێ: (دابة حسنة التیسور): وڵاخێكە جوان قاچەكانی دەهاوێ ◊ (فرس حسن التیسور): ئەسپێكە قەڵەوییەكەی لێ جوانە.

**الموسِرُ:** بێ ئاتاجو دەوڵەمەند.

**المَیْسِرُ:** قومار ◊ هەرشتێك یاری بێ ◊ تەنانەت یاری منداڵان وەكوو هەڵماتێنو واغواغێنو شتی وا ◊ شەترەنج.

**المَیْسَرَة:** سەهلو ئاسان ◊ دەوڵەمەندیو بێ ئاتاجی ◊ لای چەپ ◊ لای چەپی سوپا.

**المَیْسِرَةُ:** ئاسانیو بێ ماندویی ◊ دەوڵەمەندی.

**المُیسَّرُ:** زوماوەرد؛ خواردنێكە پێك دێ لەگۆشتو هێلكە یان بابۆڵە نانی تەنكو گۆشت ◊ یان لوقمە قازی.

**المَیْسورُ:** ئاسانو بێوەی.

**الیَاسِرُ:** ئەوكەسەی گۆشتی حەیوانی سەربڕاو لەقوماردا دابەش دەكا ◊ ئەوكەسەی لەقومار كردن دا لەقوداحەكە دەدا.

**اليَسَارُ**: ئاسان و بێ ڕەوەی ٥ دەوڵەمەندیی و خۆشگوزەرانی ٥ لای چەپ ٥ دەگوترێ: (جلست يسار فلان أو عن يَسَاره).

**اليَسَارِيّ**: چەپڕەو توندو تیژ لە ڕاو بۆچون و سیاسەت دا.

**يَسَارِ**: بەمانا (يَسَارُ)دێ ٥ دەگوترێ: (أنظرني حتى يَسَارِ).

**اليَسَارَةُ**: ئاسانی ٥ دەوڵەمەندی.

**اليَسْرُ**: ئاسان ٥ دەگوترێ: (ولادة يَسْرٌ): منداڵبونێکی ئاسان ٥ دەست بەخۆدا هێنان بەرەو خوار.

**اليُسْرُ**: پێچەوانەی تەنگانەو ناخۆشی ٥ دەگوترێ: (الدين يُسْرٌ): ئایین پەیڕەوی کردنی ئاسانە ئەگەر لەخۆتی گران نەکەی.

**اليَسَرُ**: ئاسان ٥ دەگوترێ: (هو يَسَرٌ): ئاسان و نەرمەو نیانە ٥ توندو تیژ نییە.

**اليَسْرَةُ**: لای چەپ.

**اليَسَرَةُ**: مێینەی (اليَسَر) ٥ دەشگوترێ: (عَسْرَاءُ يسرة): ئەو ئافرەتە بەهەردوو دەستی کاردەکا، قاچی پێڕۆ کەبارێك بێ و لەکاردا بێ ٥ نیشانەیەکە بەسمتەوە ٥ نهێنی و چاڵ و چوێڵی بەری دەست.

**اليَسِيرُ**: ئاسان ٥ کەم ٥ بێ نرخ ٥ دەگوترێ: (شيء يَسِيرُ مال يسير).

**اليُوسِفِيُّ**: درەختێکە بەردارە، لەپێڕی (الشذابية)یە لەوڵاتی میسر هەیە، ئەو ناوەشیان بۆیە لێ ناوە چونکە ئەوکەسەی تۆوی ئەو درەختەی هێناوەتە وڵاتی میسر ناوی یوسف بووە.

**الياسمين**: ڕوەکی یاسەمین، گوڵێکی سپی هەیە جوان و بۆنخۆشە.

**اليَشْبُ**: جۆرە بەردێکی درەوشاوەیە بەنرخە ٥ جۆرە سلیکاتێکی درەوشاوەیە ڕەنگی سور یان بوننی یان زەردە.

**اليَشْمُ**: جۆرە کانزایەکی ڕەقە هەیە سپی هەیە سەوزو هەیە ڕەنگی تری هەیە لەسلیکاتی مالیسیۆم و مەغنیسیۆمی نادرەوشاوە پێك دێ.

**اليَعْبُوبُ**: چەمی خوڕو تیژڕۆ.

**يَعَرَتِ الشاةُ أو المِعْزى تَيْعَرُ يُعْراً**: مەڕەکە باڕاندی.

**اليُعَارُ**: دەنگو باڕەی بزن و مەڕ ٥ یان باڕاندنی بەهێز کە مەڕەکە بەهەموو هێزی خۆی بباڕێنێ.

**اليَعَارة**: کێشکردنی کەڵە بۆ کەڵدانی مێینەو نیشاندانیەتی بۆئەوەی بەویستی خۆی کەڵی بدا یان ئەگەر حەزی لێ نەبوو وازی لێ بێنێ.

**اليَعْرُ**: مەرێکە یان بزنێکە لەپەنا چاڵە هەڵکەندراوو تەڵەی دانراودا دەبەسترێتەوە، چاڵەکەش بەشێوەیەکی ئاسایی دادەپۆشرێتو ئاژەڵەکە شوێنەکەی قایمەو دەباڕێنێ درندەکە شێرە یا گورگە بەدەنگییەوە دێ بۆئەوەی بیخوا کاتێك بەخۆی دەزانێ دەکەوێتە ناو چاڵەکەوەو دوایی دەگیرێ.

**اليَعْرَةُ**: بەمانا (اليَعْرُ)دێ.

**اليَعُورُ**: کەڵێکە زۆر ببرێ بۆ پەڕین.

**اليَعُورَةُ**: بەمانا (اليَعور)دێ.

**اليعسوب**: بڕوانە مادەی (عَسَبَ).

**اليعضيد**: بڕوانە مادەی (عَضَدَ).

**اليعفور**: بڕوانە مادەی (عَفَرَ).

**يَغوث**: بتێك بوو پێش هاتنی ئیسلام هۆزی (مەذحیج) دەیانپەرست.

**يَفَخَهُ يَيْفَخُهُ يفخاً**: لەتەپڵە سەری دا، لەتۆقە سەری دا.

**اليافوخ**: تەپڵە سەر مەلاشو ٥ نێوان ناوچاوانو تۆقەسەر ٥ دەگوترێ: (مَسَّ بيافوخه السماءَ) سەری لەئاسمان دا، پلەو پایەی بەرز بۆوە (ركب يافوخ فلان): سواری سەری فلان بوو، واتە بەسەری دا زاڵە.

**اليافوخ من الليل**: زوربەی شەو.

**ضَرَبَ يافوخ الليل**: سەرەتای شەو دەستی کرد بەڕۆیین.

**يَفَعَ الشَّيْئُ يَيْفَعُ يفوعاً ويَفْعاً**: بەرز بۆوە، سەرکەوت.

**يَفَعَ الغُلامُ**: کوڕەکە پێگەیشتو گەیشتە تەمەنی گەنجی، یان خەریکە باڵغ ببێ ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (يَفَعَت البنت).

**يَفَعَ الجَبَلَ**: چووە سەر کێوەکە.

**أيْفَعَ**: بەمانا (يَفَعَ)دێ.

**يافَعَ وَليدةً**: هەتیوەکەی خراپ کرد ٥ (وَلد الميافَعَة): زۆڵ، منداڵی پەیدابوو لەزینا.

**تَيَفَّعَ**: بەمانا (يَفَعَ)دێ ٥ چووە سەر بەرزایی سەر تەپۆلکە، سەرکێو ٥ ئاگری لەکێوکردەوە.

**اليافِعُ**: تەمەنی پێش باڵغ بوون، تەمەنی سەرو بەندی باڵغ بوون ٥ دەشگوترێ: (مجد يافع): واتە سەربەرزیو سەروەریی.

**اليافعات**: کۆی (اليافِعة)یە کە بەمانا کچۆڵەی تازە پێگەیشتو کەلەتەمەنی پێش باڵغ بوون دا بێ ٥ کێوی بەرزو بەئاسمان دا چوو ٥ کاری ئەستەمو قورس.

**اليَفَاعُ**: هەرشتێك بەرزبێ کێوبێ، تەپۆلکە بێ یان هەرشتێکی تربێ.

**اليَفَعُ**: بەمانا (اليافِعُ)دێ ٥ دەگوترێ: (غلام يَفَعٌ).

**اليَفَعَةُ**: دەگوترێ: (غلام يفعة): كوڕێكی گەنجە ٥ (فتاة يفعة): كچێكی گەنجە.

**اليَفَنُ**: پیرەمێردی پۆڵكاو ٥ كەڵەگاكێوی پیر ٥ جوانەگا كەتەمەنی چووبێتە چوار ساڵییەوە ٥ مرۆڤی نائارام‌و چەواشە.

**اليـاقوت**: یاقوت؛ بەردێكی بەنرخەو زۆر ڕەقە لەدوای ئەڵماس لەهەموو كانزایـەك رەق تـرە لەئۆكسیدی ئەلەمنیۆم پێك دێ بەزۆری ڕەنگی رونـی مەیلەو سور یان شین یان زەردە، بۆجوانی‌و خۆ پێ رازاندنەوە بەكاردێ ٥ (ك: يواقيت).

**اليقطين**: بڕوانە (قطن).

**يَقِظَ من نومه يَـيْقَظ يقظـاً**: لەخەو بێدار بۆوە ٥ بەهۆش هاتەوە، شتەكەی لێ رون بۆوە ٥ لەكارەكە حاڵی بوو ٥ وریا بۆوەو بەحەزەرەوە چاوەڕوانی روداو بوو ٥ (فهو يَقِظٌ وهي يَقِظَةٌ).

**أيْقَظَهُ**: بەخەبەری هێنا، وریای كردەوە ٥ ترساندی‌و داوای لێ كرد حەزەربكا ٥ هەڵی ناو هەژاندی، دنەدنەی دا.

**أيقـظ الغبـار**: تۆزی هەڵساند، تۆزو خۆڵی بەرپاكرد.

**تَـيَقَّظَ**: بەمانا (يَقِـظ)دێ ٥ دەگوترێ: (تَيَقَّظَ مِن نومه): لەخەوی بێداری خۆی ڕاپەڕی ٥ هەستی بەشتەكە كرد.

**اسْتَيْقَظَ**: بەمانا (تَيَقَّظَ)دێ.

**اسْتَيْقَظَ فلانـاً مـن نومـه**: فلانكەسی لەخەو ڕاپەڕاند، بێداری كردەوە.

**اليَقُظُ**: (رَجُلٌ يَقُظٌ): پیاوێكی زیرەك‌و وریایە.

**اليَقْظَانُ**: بەمانا (اليَقِظ)دێ ٥ دەگوترێ: (رجل يقظان الفكر) پیاوێكی بیر تیژو وریایە ٥ (إمرأة يقظى).

**اليَقَظَةُ**: هەڵسان لەخەو ٥ بەخەبەریی‌و بەئاگایی، واتە پێچەوانەی حاڵەتی نوستن ٥ دەگوترێ: (ما أنساك في النوم واليقظة): لەحاڵەتی خەوو بێداری دا تۆم لەبیرە.

**يَقِـنَ الشَّيْئُ يَـيْقَنُ يَقْنـاً ويقينـاً**: شتەكە چەسپاوو ئاشكراو رونە.

**يَقِنَ بە**: زانیاری دەربارەی پەیداكردو لێی مەعلوم بوو.

**أيْقَنَه وبە**: بەمانا (يَقِنَهُ)دێ.

**تَيَقَّنَهُ وبە**: بەمانا (أيْقَنَه)دێ.

**إسْتَيْقَنَهُ وبە**: بەمانا (يَقِنَهُ ويَقِنَ بە) دێ.

**الميقـانُ**: دەگوترێ: (رجـل ميقـان): پیـاوێكی خـۆش بـاوەڕە هـەر قسەیەكی بۆ بكرێ پێی بڕوا دەكا ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (ميقانة).

**اليَقَنُ**: (رجل يقن): پیاوێكە هەرچی

ببیسیٰ پێی بڕوا دەکاو بەلایەوە ڕاستە.

**اليَقِنُ**: (رجل يَقِنٌ): بەمانا (يَقَنٌ)دێ.

**اليَقُنُ**: بەمانا (اليَقَنُ)دێ.

**اليَقَنَةُ من الناس**: کەسانێکن بەهەموو کەس بڕوا دەکەن ٥ دەشگوترێ: (رجل يَقَنة) تێ خڕمکە بۆ موبالەغەیە.

**اليَقِينُ**: زانیاری بێ گومان ٥ لەبواری فەلسەفەدا یەقین بریتییە لەوەی نەفس قەناعەتی بەحوکمێك هەبێو بڕواشی وابێ هەرئەوە ڕاستە ٥ هەروا وشەی (اليقين) ناوە بۆ مردن قورئان دەفەرموێ: {وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ}.

**اليَلَبُ**: تیلمە چەرم دەچندرێو تێك دەخرێو دەکرێ بەکلێتەو داپۆشەری سەر ٥ جۆرە مەتاڵێکە لەلبادو شتی وا دروست دەکرێ ٥ پۆلا.

**اليَلَقُ**: ڕەنگی سپی بەگشتی ٥ دەگوترێ: (أبيض يَلَق) هەروا ناوە بۆ مانگای سپی بەتایبەتی.

**اليَلَقَةُ**: بزنی مەرمزەی سپی.

**يَلَّ يَلِلَ يَيَلُ يَلاًّ ويَلَلاً**: ددانی کورت بونو بەرەو ناو دەمی خوار ببونەوە ٥ (فهو أيَلّ وهي يلاّء).

**الأَيَلُّ من الحوافر**: ئاژەڵی کێوی سم کورت.

**اليَلاّء**: مێینەی (الأَيَلّ) ٥ دەشگوترێ: (صفاة يلاّء): بەردی لوسو ڕێك.

**اليَلْمَقُ**: پاڵتۆ یان پۆشاکێك کەلەسەر هەموو پۆشاکەکان لەبەر دەکرێو پشتێنی لەسەر دەبەسترێ.

**يَمَّ يماًّ**: فڕێ درایە ناو دەریاوە.

**يُمَّ الساحِلُ**: ئاو کەنار ڕوبارەکەی داپۆشی.

**يَمَّمَهُ**: قەصدی کرد، چوو بۆلای ٥ دەگوترێ: (يَمَّمَهُ بالرِّمح): بەرمب پەلاماری دا.

**يَمَّمَ المريضُ للصلاة**: نەخۆشەکە مەسحی دەمو چاوو دودەستی کرد، واتە تەیەمومی کرد بۆ نوێژکردن.

**تَيَمَّمَ للصلاة**: دەمو چاوو دودەستی بەخۆڵ مەسح کرد بۆ نوێژ.

**تَيَمَّمَ الشَّيْءَ**: قەصدی شتەکەی کردو هەڵی پشکنی.

**المُيَمَّمُ**: کەسێك زەفەر بێنێو بکاتە مەبەستی خۆی.

**اليَامُومُ**: بێچوە کۆتر.

**اليَمَامُ**: ڕەگەزی باڵندە لەپێری کۆتر ٥ تاکەکەی پێی دەگوترێ (يمامة).

**اليَمُّ**: دەریا ٥ کۆتری کێوی ٥ (ك: يُمُومٌ).

**يَمَنَ بفلان**: فلانکەسی بردە لای ڕاست ٥ لەلای ڕاستییەوە هات.

**يَمَنَ البَلَدَ**: کەوتە لای ڕاستی وڵاتەکەوە ٥ بەلای ڕاستی وڵاتەکەدا ڕۆیشت.

**يَمَنَ فلان آلـه وعلـى آلـه يُمْنـاً**: فلانکەس پیرۆزبایی لەنەتەوەو کەس‌و کارەکەی کرد.

**يَمَنَ اللهُ فلاناً يُمْناً**: خودا فلانکەسی پیرۆز کرد.

**أيْمَـنَ**: لای ڕاسـتی شـتەکەی گـرت ٥ بوردەی یەمەنی لەبەرکرد.

**يَـامَنَ**: لای ڕاسـتی گـرت ٥ لای ڕاستی مەبەست بوو ٥ بۆلای ڕاستی برد.

**يَمَّـنَ**: بـەمانا (يـامَنَ)دێ ٥ ویستی بچێ بۆ یەمەن ٥ بردی بۆلای ڕاست.

**يَمَّنَ علی فلان**: پیرۆزبایی لەفلان کرد.

**تيامَنَ**: لای ڕاستی گرت.

**تَـيَمَّنَ**: خـۆی بـە یەمـەنی لەقەڵـەم دا خـۆی کـرد بەیەمـەنی ٥ دەسـتی ڕاستی یان قاچی ڕاستی بـەکار هێنـا بۆ ئیش‌و کار ٥ مرد.

**تَيَمَّنَ بالميت**: مردوەکەی لەگۆڕدا خـستە سەر لای ڕاستی.

**تَيَمَّنَ بالشَّيءِ**: شتەکەی بـەپیرۆز زانـی‌و لێـی گەشـبین بـوو پێـچەوانەی ڕەشبینی ٥ لەلای ڕاستەوە بۆ شتەکە چوو.

**إسْـتَيْمَنَ بكـذا**: پیرۆزیـی بەشـتەکەوە کردو بەلایەوە پیرۆز بوو.

**استَيْمَنَ فلاناً**: فلانکەسی سوێند دا.

**الأيْمَـنُ**: کەسـێك بەدەسـتی ڕاسـتی شـت دروست بکا ٥ یان بەقاچی ڕاستی.

**الميمـون**: خـاوەنی پـیرۆزی‌و خێـرو بەرەکەت.

**المَيْمَنَةُ**: خێـرو بەرەکـەت ٥ پێـچەوانەی (المَيْسَرَة).

**المُـيَمَّنُ**: ئەوکەسـەی خێـرو بەرەکـەت دەهێنێ.

**اليامن**: خاوەن خێرو بەرەکەت.

**اليَمَـاني واليمـانيُّ**: کەسـێك خـەڵکی یەمـەن بـێ یـان خـۆی بەیەمـەنی لەقەڵەم بدا.

**اليَمانية**: مێینەی (اليَمَاني)یە کەسێك پاڵ یەمەن بدرێ ٥ جو کە گوڵەکەی سور بێ.

**اليُمْنُ**: خێرو بەرەکەت.

**اليُمْنى**: پێچەوانەی (اليُسْرَى).

**اليَمْنَةُ**: لای ڕاست ٥ پێچەوانەی چەپ ٥ جۆرە بوردەیەکی یەمەنییە.

**اليُمْنَةُ**: جۆرە بوردەیەکی یەمەنییە.

**الـيمين**: ڕاسـت ٥ پێـچەوانەی چـەپ ٥ خێـرو بەرەکـەت ٥ هێـزو توانـا ٥ سوێند.

**اليَمِنِيُّ**: ڕاست ڕەو پێچەوانەی چەپڕەو کەسـێك میـانڕەو بـێ‌و حـەزی لەئاسانکاری‌و عەداڵەت بێ لەهەندێ

ولاّت دا نوێنەری حیزبی چەپڕەو لەلای چەپەوە دادەنیشتن‌و نوێنەری ڕاست ڕەوەکان کورسیەکانیان لەلای ڕاستەوە دەبێ.

**اليَنْبُوتُ**: بڕوانە مادەی (نَبَتَ).

**يَنَعَ الثَّمَرُ يَيْنَعُ يَنْعاً**: میوەکە کاتی لێکردنەوەو چنین‌و ڕنینی هات.

**يَنَعَ الشَّيْئُ**: شتەکە ڕەنگی مەیلەو سوری تۆخ بوو.

**أَيْنَعَ الثَّمَرُ**: بەمانا (يَنَعَ)دێ ٥ (فهو يانع ومونع).

**اليانِعُ**: میوەی پێگەیشتوو ٥ هەرشتێك سوربێ ٥ دەشگوترێ: (دم يانع): خوێنی زۆر سور (ثَمَرٌ يانع): میوەی ڕەنگ گرتوو، ڕەنگ گۆڕاو.

**اليَنَعُ**: جۆرە ئاقیقێکە ڕەنگەکەی لە نێوان سورێکی مەیلەو خوێنی تا سورێکی زەرد باو ٥ میروی سور.

**اليَنِيعُ**: ئەو شتەی گەیشتبێتە ئەو پەڕی لەطافەت‌و پێگەیشتویی.

**اليَنَمُ**: تووێ گیا (قطونا) ڕووەکێکە لەولاتی میصرو شام دەڕوێ، بۆ ڕەوان بوون گیروگرفتی قەبزی دەخورێ.

**اليَهْفوف**: بڕوانە مادەی (هَفَفَ).

**يَهِمَ يَيْهَمُ يَهَماً**: شێت‌و شەیدا بوو ٥ (فهو أيهم وهي يهماء).

**الأَيْهَمُ**: مرۆڤی کەڕ ٥ ئازاو چاو نەترس ٥ نەگەڕاوە لەهیچ شتێك‌و چارنەکراو چەنەبەر نەهاتو ٥ بەردی لوس‌و پوس ٥ کێوی بەرز ٥ شاخی سەخت‌و بەرز کەنەتواندرێ بچیە سەری ٥ شەو کە ئەستێرەکانی دیارنەبن.

**الأيهمان**: جوتی (الأيهمَ) ٥ لافاوی زۆرو ترسناك‌و حوشتری چەموش ٥ لافاوو ئاگر.

**اليَهْمَاءُ**: سارای کاکی بەکاکی‌و نەتواندرێ پێیدا بڕۆی ٥ سالّی گرانی‌و قات‌و قڕی‌و بێ دەروویی رون.

**ياهَيَاهِ**: وشەیەکە بۆ بانگ کردن بەکاردێ ٥ وادەبێ ئەم وشەیە نیشانەی تەنییەو کۆی پێوە دەنرێ دەگوترێ: (ياهياهان وياهياهون).

**يَهْيَهَ بالإبل**: بانگی حوشترەکەی کرد.

**يُوحُ**: ناوێکە لەناوەکانی خۆر.

**يوحى**: بەمانا (يوحُ)دێ.

**يَوَّدَ الدَّوَاءَ**: مادەی (اليود)ی تێکەڵ بەدەرمانەکە کرد.

**اليود**: عونصورێکی نافلزییە، ڕەقە ٥ ڕەنگی وەنەوشەیی مەیلەو ڕەشە ٥ دەرەوشاوەیەکی هەیە کە گەرم کرا بەحەوادا دەچێ.

اليوديـــد: پێکهاتەيــەکی کيميائييـــە، بەشەترشـــەڵۆکەکەی بريتييـــە لـــە ئەليود.

ياومـــە مياومـــة: بەرۆژانـــە مامەڵـــەی لەگەڵ کرد ◊ يان بەکرێی گرت.

الأيْوَمُ مِن الأيام: رۆژی کۆتـايی مـانگ ◊ دەشگوترێ: (يوم أيوم): رۆژی درێــژو ناخۆش.

اليَوِمُ: دەگوترێ: (يَـوْمٌ يَـوِمُ): رۆژگـاری درێژو ناخۆش.

اليَوم: رۆژ، ماوەکەی لەخۆر هەڵاتنــەوە بــۆ خۆرئاوابوونــە ◊ هــەروا بــەمانا ئێـــستا دێ ◊ قورئـــان دەفـــەرموێ: {الْيَــوْمَ أَكْمَلْــتُ لَكُــمْ دِيــنَكُمْ} ◊ لــەبواری زانــستی ئاسمانــشوناسی دا وشــەی (يَــوْم) بريتييــە لــەخولێك سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆی دا، کە بەبيستو چوار سەعات ئەنجامی دەدا.

أيـــام العـــرب: رۆژگـــاری شـــەڕە خوێناوييەکانی عەرەب.

أيـــام الله: رۆژگـاری تۆڵەســتاندنەوەی پەروەردگار لەگەڵە ستەمکارە سەر ڕەقەکانی رابردو وەکوو گەلی عادو ثەمودو قەومی لوط.

